# قامووسی زمانی کورد



ع و ب



عەبدورەحمانی زەبیحی



ناوی کتێب : قاموسی زمانی کوردی

نووسەر : عەبدورەحمانی زەبیحی

بڵاوکەرەوە : ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی
(ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی)

تیراژ : ٣٠٠٠

نوێکردنەوەی چاپ : ١٣٦٧

# پێشگۆتن

هێشتا منداڵ بوم گروگاڵی زمانەوانی سەرانسوێی خانوی مێشکمی لێگرتم و دەستی‌کرد بە سەرەتاتکێ و چاوشارکێ دەگەڵم ، هەر دەرسێکی دەم‌خوێند دەمکردە کوردی ، ووشە سەخت و ڕەقەکانم بە کوردی مانا لێدەدایەوە .

دەگەڵ ( هەژار )ی دۆستم کە ئەوسا ( فەقێ ) بو دەمانەویست کە قسە دەکەین کەس تێمان نەگا ، لە کومەڵگای مەهاباتا بە تایبەتی لە ناو ئافرەتانا جورە زمانێکی لاپرەسەنێ باوبو کە دەنگی ( ز ) یا ( سك ) یان لە هەمو کەرتێکی ووشەیەك زیاد دەکرد و بە ڕەوانی گفتو گوی پێدەکرا و ناویان نابو : ( ئەزەتوزو ـ یا ـ ئەسکەتوسکو ) ، ئەمە و نوسین بە حیسابی ( ئەبجەد ) یا بە ووتەی فەقێیان ( خەتی شەجەری ) و ... لەو کارانە بون کە بە چاکی لێیان ڕاهاتبوین و نامەمان بو یەکتری پێ دەنوسی . بەڵام ئەوانە هێچیان تامەزرویی ئێمەیان نەدەشکاند چونکو خەڵکی دیش زور هەبون دەیانزانی و ئێمە شتێکی وامان دەویست تایبەتی خومان بێ .

ئەوجار هەوای دانانی زمانێك !! کە هیچ کەس تێی نەگا یاری بە مێشکمان دەکرد ، ماوەیێکی زور خەریك‌بوین و تا ئەندازەیێکیش سەرکەوتین. ئەمەش ئێمەی خستە سەر ڕێگای بیرکردنەوە لە ووشەکانی زمانی کوردی و چونێتی دروست‌بونیان ، بیرمان لەوە دەکردەوە کە بوچی بە ( بەرد ) گوتراوە ( بەرد ) و نەبێژراوە ( سان ) یا شتێکی تر ... ؟ .

مێشکی ناپوختەی ئێمە ئەوسا توانستی ئەوەی نەبو وەڵامی پرسیاری ئاوا سەیر و سەخت بداتەوە ، بەڵام ئەم گروگاڵە منداڵانەیەی زمانەوانی ئەوەندەی

له باراندا بۆ كه بەرەبەرە و به تێپەڕینی ڕۆژگار بەانخاته سەر ڕچەی ڕاستی زمانەوانی و چاومان بەم مەیدانە پان و بەرینە تۆناوتۆنە هەڵبێنێ و خۆمان ببینینەوە كه به ڕەوتی مێروولە خەریكین لە دەشتێكی كاكی بەكاكیدا پەلدەكوتین و لە دەریاییكی بێ بنی ئەوتۆدا مەلە دەكەین كە نهەنگی تێدا دەخەنكێ .

كاتێ له شاری ( مەهابات ) كه ئەوسا ناوی ( سابلاغ ) بۆ لای مامۆستا ( گیوی موكریانی ) دەرسی زمانی ( فڕەنسی ) م دەخوێنە سەروكارم دەگەڵ قامۆسی فڕەنسی ( لاڕۆس ) پەیدا كرد و هێوای ئەوەی كه ڕۆژێك زمانی كوردیش قامۆسێكی ئاوای هەبێ ، هەمو خولیا و خەیالاتی پێشوی له مێشكم ڕاماڵی و كەشتی كەڵكەڵەی زمانەوانیم لە بەندەرگای قامۆسا لەنگەری گرت .

ئەگەرچی خەباتی سیاسی نێزیكەی هەمو كات و ساتێكی تەمەنی منی بۆ خۆی داگیركرد و له مەڵبەندی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستا ڕەتاندمی ، بەلام نەیتوانی بیری قامۆسێكی كوردی لە مێشكم بسڕێتەوە ، بەڵكو بیری ( قامۆسی كوردی ) بۆ قازانجی خۆی ، له خەباتی سیاسی و له ئێران و توران كردنەكەم كەڵكی وەرگرت .

گەشت و گێل لە گەلێ ناوچەی كوردستانی ئێران و عێراقدا ، چاوپێكەوتن و هاونشینی و گفتوگۆ دەگەڵ كەسانی سەر بە گەلێ تیرە و هۆز و عەشیرەتەكانی كورد ، دەسمایە و سەرمایەییكی زۆر و زەبەندی بۆ ئەو قامۆسەی لە خەیاڵدانی خۆمدا بۆ زمانی كوردیم ڕەچاوكردبو پێكەوەنا . سەفەری دو ساڵ و نیوێم ( سەرەتای ساڵی ١٩٥٦ ـ نیوەڕاستی ساڵی ١٩٥٨ ) بۆ سوریا و تێكەڵی دەگەڵ كوردەكانی ئەوێ فێری یەكێ له سێ لەهجە بنچینەكەی زمانی كوردی ( لەهجەی كرمانجی ) كردم و دەرگایەكی گەورەی بۆ چونە ناو قەلای ( قامۆس ) بۆ كردمەوە .

ئەمەی ئێستا دەیبینن ئەو لاقە كوللەیەیە كه له سەفەری دور و درێژی عومرمدا بۆ ( سولەیمان )ی نەتەوەی كوردم به دیاری هێناوە . پێشینیانی كورد كوتویانە : « كالا له قەد بالایە » و ئەز ناتوانم لەمە ڕەوانتر ببێژم .

ئەگەر ئەم قامۆسە لە بن ڕێسەمەی دەرگای كەوشكەنی پێشخانەی بارەگای زمانی كوردیدا جێگای ببێتەوە ، خۆم بە بەختەوەر دەزانم .

عبدالرحمن زبیحی

# زمانی کوردی لە قۆناغی ئێستادا

کاتێ باس دێتە سەر قامۆسی زمانی کوردێ ، کتومت پێویستێك لە بەرامبەرمان ڕاست دەبێتەوە و داوای جێبەجێکردنی خۆیمان لێدەکا ، ئەویش ئەوەیە کە دەبێ باسێکی خودی زمانی کوردێ بکەین ، دەرێبخەین کە چۆن پێکهاتوە ، تایبەتەکانی بخەینە ڕۆ ، خزمایەتێ دەگەڵ زمانانی تر و شوێنی لە نێو بنەماڵەی زماناندا دیاریکەین . ئەم باسەمان ناتەواو دەبێ ئەگەر نەزانێن زمانانی خزم و دراوسێ چ کارێکیان کردۆتە سەر زمانی کوردێ و زمانی کوردێ چێ لەوان کردوە .

ئەم کارانە بۆ گەلێ زمانانی تر پێویست نیە چونکو ئەو قۆناغانەی لە پێش زمانی کوردێن و دەبێ بیانبڕێ ، ئەوان ماوەیێکی دوور درێژە خستوێانەتە پشت سەر ، بۆ نموونە زمانی عەرەبێ نێزیکەی ١٤٠٠ ساڵە وەك زمانێکی دینێ پیرۆز بە هەمو زانایانی مسوڵمان خزمەتی دەکەن ، تەنانەت گەلێ لە زانایانی کوردیش هەمو ژیانی خۆیان بۆ تەرخان کردوە ، وەکو دەبینێن ئیمڕۆ بۆتە زمانێکی عالەمێ . یاخۆ زمانی فارسێ هەر لە چەرخی چوارەمی کۆچییەوە کەوتۆتە خۆی و ئیمڕۆ بە جۆرێ پێشکەوتوە ئەگەر بێت و دەگەڵ زمانانی پێش ئیسلام پێکیان بگرێن تۆشی سەرەگێژە دەبێن .

بەڵام وەکو دەزانێن چلۆنایەتێکی مێژوویێ نالەبار ، بە درێژایی صەتان ساڵە ، پاشکەوتەیێکی گشت لانەی بەسەر هەمو شتێکی کوردێدا سەپاندوە کە یەکێکیان زمانەکەمانە بە جۆرێ کە نەیهێشتوە تا ساڵانی دوایێ چەرخی نۆزدەهەم ــ کە بۆ یەکەم جار ساڵی ١٨٩٧ ڕۆژنامەی « کوردستان » دەرچوەــ بە شێوەیێکی هەراو و بەربڵاو پێی بنوسرێ ، جاروبارە نەبێ کە لە قولینچکی

حوجرەی مزگەوتێك یا گۆشەی تەکیە و خانەقایەك ، مەلایێ دەستی داوەتە قەڵەم و شیعری بە کوردێ داناوە و بە ئیملای زمانێکی دیکە نۆسیویەتەوە ، گەردەلۆلی زەمانە تەنانەت ئەو جۆرە نۆسراوانەشی دەگەڵ خۆی ڕەپێچەك داوە و بردۆیەتە بیابانی نەبۆنێ و ئەوەی گەیوەتە دەستمان هەر زۆر کەمە .

بە ڕاستی جێگای سەرسوڕمانە کە زمانی کوردێ لە هەنگامەی ڕۆژگارانی ڕابردۆدا کەڵانە دەرباز بوە و ئیمڕۆ لە مەیدانی پێشکەوتندا بەرەو تەکامول پەلدەکوتێ ، مێژۆنیشانمان دەدا گەلێ زمانی وا لە ناو چۆن و ئاسەواریان بڕاوەتەوە کە دەیەکی ئەوەی بەسەر زمانی کوردێ هاتوە بەسەر ئەوان نەهاتوە. جا زمانی کە ئەو هەمۆ تێن و توانەی هەبێ کە هەلسوڕداسۆری چەرخی زەمانە نەیتوانیبێ لە ژێر خۆیدا بێپلێشێنێتەوە ، توانایێ ئەوەشی هەیە زۆر بە خێرایێ گەرد و تۆزی ئەم ڕێگا دۆرە لە شانی خۆی بتەکێنێ و لە ڕێزی زمانانی پێشکەوتۆی ئەم دەور و زەمانەدا جێگای خۆی بکاتەوە .

بەلێ ! ڕاستە لە سەرەتای ئەم چەرخەوە زمانی کوردێ پێی ناوەتە قۆناغێکی تازە و لەو ساوە گەلێ گۆڕانێشی بەسەردا هاتوە ، بەلام ! تا ئەو ڕۆژە دادێ کە بکەوێتە گۆڕانێ و خۆی بگەیێنێتە کاروانی زمانە پێشکەوتەکانی ئیمڕۆ ، دەبێ لە گەلێ هەوراز و نشێوان سەرکەوێ ، بە زۆر شێو و دۆلاندا تێپەڕێ و پێویستێکی زیاد لە ئەندازەی بە خزمەتکردن و پەرەپێدان و گەشە پێکردن هەیە . زمانی کوردێ هێشتا گەلێ کەلێن و کولێنی تاریکی هەیە کە دەبێ بە چرای لێکۆلینەوەی زمانەوانێ ڕۆناكبکرێنەوە و زۆر کەلەبەری تێدا هەیە کە پێویستە دەستی زمانەوانانێ کورد کاریان لەسەر بکا .

ئێمە کە دێین و باسی پاشکەوتەیێ و ناگزۆرێ زمانی کوردێ دەکەین بۆ ئەوە نیە تۆوی ناهومێدی لە دلی هاو نیشتمانانماندا بچێنێن و لە دوارۆژێکی پڕ وورشە و گەشە بۆ زمانی کوردێ ، بێ هیوایان کەین ، نەخێر ! مەبەستمان تەواو پێچەوانەی ئەوەیە و دەمانەوێ کەم و کوڕێ زمانەکەمان بە شێوەیێکی زانستییانە چارەسەربکرێ و بخرێتە سەر ڕێچکەی شەمەندەفەری خۆشڕۆی ئەم زەمانە .

نە ددان بە جەرگی خۆداگرتن و دەرنەبڕینی ئێش و ئازار و نە هاوار و داد و بێداد لە دەس ژان ، تا ئێستا هێچ دەردێکیان دەرمان نەکردوە ، بەلکو تەنیا بە کار و تێکۆشان هەمۆ دەردێك چار دەکرێ .

لە وەختێکا کە هێشتا زمانی کوردێ لە قوژبنی کەمتەرخەمێ نەتەوەی کوردا بۆ ، ڕۆژهەلاتناسانی فەڕەنگێ کەوتۆنەتە لێکۆلینەوە و ساغکردنەوەی، ڕێزمان و قامۆسیان بۆ داناوە و بۆژاندۆیانەتەوە ، کاری ئەم ڕۆژهەلاتناسە

فەڕەنگییانە دەبێ لە لایەن نەتەوەی کوردەوە بە تایبەتی خوێندەواران و زمانەوانانی کورد سپاسی لێبکرێ کە لێشی کراوە .

ئەم قۆناغە تازەیەی کە زمانی کوردی لە سەرەتای ئەم چەرخەڕا دەستی پێکردوە ، ئەرکێکی گرانی بۆ خوێندەواران و زمانەوانانی کورد پێکهێناوە کە دەبێ هەر یەکە بە پێی توانست و لێزانی خۆیان خزمەتی بکەن و باری ڕاستکەنەوە . قورسایی ئەم ئەرکە بەشی زۆری کەوتۆتە سەر شانی زانایانی کورد لە کوردستانی عێراق ، چونکو هەر لە سەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی عێراقەوە هەل و مەرجێکی باش بۆ زمانی کوردی هەڵکەوتوە ، ئەوەی بەرچاو دەکەوێ زانایانی کوردی عێراق لە جێبەجێ کردنی ئەرکی سەر شانیان بەرامبەر کوردی ، کورتیان نەهێناوە .

سەرنجێك لەو گۆڤار و ڕۆژنامە و کتێبانەی لە ساڵانی دوای شەڕی یەکەمدا لە کوردستانی عێراق بڵاوکراونەوە و بەراوەردکردن و هەڵسەنگاندنیان دەگەڵ هاوچەشنەکانیان کە ئیمڕۆ هەر لەوێ بڵاودەکرێنەوە ، زۆر بە هاسانی و ئاشکرایی تێماندەگەیێنێ کە لەم ماوەیەدا چەندە خزمەتی زمانی کوردی کراوە و چەندە هەنگاوی باشی بەرەوپێش هاوێشتوە .

ئەوا هەندێ لەم پێشکەوتنانەی کە زمانی کوردی لە سەرەتای ئەم چەرخەڕا تا ئێستا بە دەستی هێناوە بە کورتی دەخەینە بەر چاو :

**١ ـ لە بارەی ڕێنوسەوە ، نوسێنی کوردی ڕێنوسێکی تایبەتی بە ئەلفوبێتکەی ئیسلامی بۆ خۆی پەیداکردوە ، کە سەرە ڕای هەندێ کەموکوڕی ، تا ڕادەییکی بەرز ، بە هاسانی زمانەکەمانی پێ دەنوسرێ .**

**٢ ـ زمانی کوردی لە شێوەی نوسێنی ( فارسی ) و ( تورکی عوسمانی ) ، یانی ئاخنێنەوەی ووتار بە ڕستەی درێژ درێژی ڕەق و زەق و زاراوی غەیرە کوردی تا ئەندازەییك پا بوتەوە و شێوەییکی تایبەنی ( کوردی نوسێن )ی بە خۆیەوە گرتوە ، ئەگەرچی هێشتا زۆری پێدەوێ تا فێر دەبێن بە کوردی بێر بکەینەوە و ئینجا بیخەینە سەر کاغەز . سەرەڕای ئەوەش پیاو بە ئاشکرا هەست بەوە دەکا کە زمانی کوردی کەوتۆتە سەر ڕچەی ( زمانی ئەدەبی ) و بەرەوپێش دەچی ، کورت و کرمانجی بلەین ئەمامی ( زمانی کوردی ئەدەبی یەکگرتو ) گوڕاوە و شێن بوە ، بەڵام هێشتا پێیدەوی تا دەبێتە درەختێکی خاوەن سایە و لقوپۆپداری ئەوتۆ کە پیاو ماندویی ڕێگای سەختی لە ژێردا لە خۆی دەرکا و لە بن سێبەریدا بحەسێتەوە .**

**٣ ـ دەربارەی ڕێزمانی زمانی کوردی ، هەندێ ووتار و کتێب و نامیلکە هاتونە مەیدان و خەریکی چارەسەرکردنی گیر و گرفتەکانی ( گراماتیکا )ی زمانەکەمان بون ، بەڵام ئەم کارە هێشتا گەلێکی بە بەرەوە هەیە و پێویستی بە**

ووردبۆنەوەیێکی زۆر و بێنەکێشان لە دەریای زمانی کوردیدا هەیە و باسکەمەلەی سەر ئاو کەلکێکی ئەوتۆ نابەخشێ(١) .

٤ ـ چەند قامۆسی جۆربەجۆری کوردیی هاتونە مەیدان ، وا دەردەکەوێ ئەم بەشە زیاتر لە لکەکانی دیکەی زمانەوانیی ، زاناکانی کوردیی بە خۆیەوە خەریك کردوە، چونکو ئەم مەیدانەی ئێستا قسەی تێدا دەکەین مەیدانی قامۆسە بە باشم زانیی ئەو باسەی کە ( دوکتۆر ئەو ڕەحمانی حاجیی مارف )ە کتێبی ( ووشەی زمانی کوردیی )دا لەم بابەتەوە نوسیویتی بۆ شوێنێکی تری ئەم ووتارە ڕاگوێزم چونکو ئەز ناتوانم لەوەی ئەو نوسیویە پوختتر بنوسم .

٥ ـ پاش شۆڕشی تەموزی سالی ١٩٥٨ ، گەلێ خوێندکاری کورد لە عێراق توانیویانە بچنە یەکێتی سۆویت و دەربارەی هەمو لق و پۆپی زمانەوانیی ، لەسەر زمانی کوردیی ، لای کوردناسانی سۆویت بخوێنن و بەرەبەرە دەگەڕێنەوە بۆ وولات. ئەمانە لەبارياندا هەیە گەلێ خزمەتی بەرچاو بە زمانی کوردیی بکەن ، زیاتر لەوەی کە تا ئێستا کردویانە.

٦ ـ هەروەها لە پاش شۆڕشی چاردەی تەموز بۆ جێبەجێکردنی یەکێك لە مافەکانی نەتەوەی کورد ( بەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردیی ـ مديرية الدراسة الكرديه ) دامەزرا و لە کۆلێجی ئادابی دانیشگای بەغداش بەشێکی کوردیی کراوەتەوە و هەروەها لە دانیشگای سلەیمانیی ، گومانی تێدا نیە کە ئەم دەزگایانەش بە نیشانەی ڕۆناك و ڕۆناککەرەوەی ڕێگای پێشکەوتن و گەشەکردنی زمانی کوردیی دەژمێردرێن .

٧ ـ چەند سالێکە ( کۆڕی زانیاری کورد ) بە ڕەسمیی لە بەغدا دامەزراوە ، ئەم دەزگا زانستییە کوردییە ، سەرەڕای تازەییشی توانیویە خزمەتی زمانی کوردیی بکا .

(١) بۆ ئاگادار بونێکی زیاتر لەو کتێب و نامیلکانەی دەربارەی ڕێزمانی کوردیی نوسراوون ، کتێبی ( چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نوسراوە ) نوسینی ( دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ) چاپکراوی کۆڕی زانیاریی کورد ،بەغدا ، ١٩٧٤ تەماشاکەن .

# زمانی هیندوئۆرۆپایی بنەمای گەورەی زمانان

زانستی زمانەوانیی ، هەمو ئەو زمانانەی کە ئیمڕۆ نەتەوەکانی دنیا قسەی پێدەکەن ، بە پێی خزمایەتییان و نیزیکییان لە یەکتر ـ لە باری ڕێزمان و فۆنێتیك و داتاشرانی ووشەکانیانەوە ـ بەش بەش کردوە و هەر بەشەی دەباتەوە سەر بنەمایەك .

دەربارەی ئەم بەش بەش‌کردنە و ناو لێنانیان بیروڕای جیاواز هەن کە ئەم شوێنە بۆ لێدوانێکی دوور و درێژ لەم بابەتەوە ناشێ و تەنیا لەو بنەمایە قسە دەکەین کە بە ڕای هەمو زانایان ڕۆباری زمانی کوردیی لێ هەڵگیراوە و زانایانی زمانەوانیی ناویان ناوە ( هیندوئورۆپایی ) .

ئەو بنەمایە گەورەترین و پان و بەرینترین بنەمای زمانانە و دەریایەکە بۆ خۆی « **چونکو هەمو دانیشتوانی ئورۆپا و ئەمریکا و ئوسترالیا و جنوبی ئەفریقا قسەی پێدەکەن ـ کۆمەڵێکی کەمی لە ئورۆپا لێدەرچێ کە بە زمانی باسکیی یا فینلاندیی یا مەجەریی یا تورکی و ئەو جۆرە زمانانە قسە دەکەن و دانیشتوانی ئەسلیی هەر دو ئەمریکا و ئوستراليا و جنوبی ئەفریقا نەبێ کە زوربەیان لە ناو چون و بێجگە لە ژمارەیێکی کەم کەسیان نەماوە و ئەوانێش بەرەو فەوتان دەچن ـ هەر وەها بەشێکی گەورەی خەڵکی ئاسیا پێی دەدوێن (هیند ، فارس ، ئەفغانستان ، کوردستان ، قەفقازیی ناوەڕاست ... تاد .** »(١)

ئاخۆ هیندوئورۆپایی کە دایکی ئەم هەمو زمانە زیندوانە و گەلێ زمانی مردوشە ، چیە ؟ ناوی هیندوئورۆپایی ناوێکە زمانەوانانی فەڕەنگی دایان ناوە بۆ زمانێکی گۆیا لە زەمانێکی زۆر کۆندا ، کۆمەڵێ ئادەمیزاد کە لە مەڵبەندێکی نەزانراو پێکەوە ژیاوون ، قسەیان پێکردوە . پاشان لەبەر هۆیەکی کە ڕەنگە سارد و سەرمای دوامین سەهۆڵبەندانی گەورەی زەویی بۆ بێ مەوتەنی ئەسڵیی خۆیان بەجێ‌هێشتوە و کۆمەڵ کۆمەڵ بە دەور و بەری خۆیاندا بڵاوەیان لێکردوە و بە دوای جێگەی حاوانەوەی خۆیان و ئاژەڵ و ماڵاتەکانیاندا هەڵوەدابون . ئەم کۆمەڵانەش لە ڕێگا لێك ترازاون و هەر دەستەیەی ڕوی کردۆتە لایەك .

ئەم شەپۆلانەی کۆچ و کۆچباریی ، کاتێ کەوتونە ڕێ ، شوێنێکیان بۆ خۆیان ڕەچاو نەکردوە کە لێی نیشتەجێ بن ، چاتر بڵێین ڕەنگە هەر نەیانزانیبێ هیچ جێگایێکی تر بێجگە لە مەڵبەندی ئەسڵیی خۆیان لە دنیادا هەیە

---

(١) د. عەلی عەبدولواحید وافیی ، علم اللغة ، چاپ شەشەم (دار نهضة مصر للطبع والنشر) ، ١٩٦٧ ، ل ١٨٢ و ١٨٣ .

تاجێیان پێ لەق بوە و هەڵقەندراوون . جا بۆیە لە هەر ئەرزێکی جێگای خۆیان و ماڵاتیان بۆبێتەوە بارگە و بنەیان لێخستوە و ماوەیێك پاڵیان لێداوەتەوە . لەو خێڵاتە ئەوانەی ڕۆیان دە ئاسیا کردوە هەروا بە لەوەڕ هاتۆن و بەرەبەرە پامێر ( بانیدنیا ) و هیندوستان و ئێران و کوردستانی ئیمڕۆیان داگرتوە ، ئەمانە لە مێژۆدا بە خێڵاتی ( ئاریایی ) ناوبانگیان دەرکردوە .

ئەم خێڵاتە کەنگێ وەڕێکەوتۆن ؟ چەند سەدەیان پێچوە تا گەیشتۆنەتە ئەو شوێنانەی یەگجارەکی تێیاندا نیشتەجێ بۆن ؟ لە سەرەتاوە بە چ زمانێ قسەیان کردوە ، یا جۆرێکیتر بڵەین ئەوەی ئیمڕۆ پێی دەووتری زمانی ( هیندو ئورۆپایی ) چ بوە ؟ لەو کۆچ و کۆچباریەدا چ گۆڕانێکی بە سەرا هاتوە ؟ ئەمانە هەمۆیان ئەو پرسیارانەن کە تا ئێستا هێچ وەلامێکیان نیە ، یا وەڵامێکی ئەو تۆیان نیە کە پیاو دڵنیابکات ، ڕەنگە لەمەودواش هەروا بێ وەڵام بمێننەوە ، بۆیە ناچارین بەوەندە ڕازێ بین کە مێژۆ بۆی خستۆینە ڕۆ .

ئەو زانایانەی کە ناوی هیندو ئورۆپاییان داهێناوە ، ئەو زمانە نەزانراوەیان کردۆتە چەند لکێك کە هەر لکەی زمانی چەند نەتەوەی ئیمڕۆی لێکەوتۆتەوە . یەکێ لەم لکانەیان ناوناوە خێزانە زمانی ( ئاریایی ) یا ( هیندوئێرانی ) و ئەوێشیان کردۆتە دۆ دەستەی گەورە :

١ ــ دەستەی زمانەکانی هیندێ

٢ ــ دەستەی زمانەکانی ئێرانی(٢)

و سێ قۆناغی مێژۆییان بۆ دوەمیان دیاریکردە :

١ ــ دەوری کۆن ، زمانی : مادێ ، ئاوێستایی ، پارسێ کۆن

٢ ــ دەوری ناوەڕاست ، زمانی : پارتێ (فرثی) ، پەهلەوێ .

٣ ــ دەوری تازە ، زمانی : فارسێ ، کوردێ .

لێرەدا هەر ناوی ئەم زمانانەمان هێناوە و لە هەریەکەیان ئەوەندەی پێویست بێ دەدوێین کە پێوەندیان بە باسەکەمانەوە هەیە ، دەنا لە هەر دەورێدا زمانیتریش هەن .

---

(٢) « زمانەکانی ئێرانێ » ناوێکە بۆ دەستەیەك لە زمانانی هیندو ئورۆپایی ــ کە زمانانی : ئۆسێتی و ئەفغانی و فارسێ و تاجێکی و کوردێ و تاتێ و تالشی و .. تاد و لە زمانانی کۆن ئاوێستایی و سوغدێ و خوارەزمێ و ئیسکێتی و گەلێکیتر دەگرێتەوە ــ برەوی پەیداکردوە ، ئەم زاراوەیە وێڕای ئەوەش کە زۆر لە گوێ نیە ، ئێستا ناتوانین ووشەیێکیتری لەجێ دانێین . بەکارهێنانی صفەتی ئێرانی لەوانەیە والێك بدرێتەوە کە مەبەست زمانی وولات و دەولەتی ئێران یەعنی ( فارسێ )یە ، کەچێ وەکۆ بۆ هەمۆکەس ئاشکرایە و پاشانیش قسەی لێدەکەین ... زاراوەی ( ئێران ) بە شێوەی کۆنی یەعنی (ئاریانا) لەسەرەتاوە ( فارس )ی نەگرتۆتەوە ( أ. م. دیاکۆنۆف ، مێژۆی ماد ، وەرگێرانی : کەریم کەشاوەرز بە فارسێ ، بنگاه ترجمه و نشر کتاب ، تاران ل ــ ٥٨١ ) .

# زمانی مادەکان چ بوە ؟

خێڵاتی ئاریێ کە ڕویان کردۆتە ڕۆژهەڵاتی ئیمڕۆ ، پێش ئەوەی لێك جودابینەوە ، ماوەیێك پێکەوە لە شوێنێك نیشتەجێ بوون کە « ئاوێستا » بە ( ئەئیریەنە ڤە ئیجە هـ = ئێران ویج )ی ناو دەبا ، پاشان هێندێکیان بەرەو هیندوستان شۆڕ بونەوە و ئەوانی دیکەش بەرەو ئێرانی ئێستا هاتون . وێ دەچێ ئەو زمانەی کە پێی دەلێن ( هیندوئێرانی ) و لکێکە لە لکەکانی زمانی نەزانراوی ( هیندو ئوڕوپایی ) ، ئەو زمانە بێ کە ئەو خێلاتە ئاریاییانە لە نیشتمانی دوەمیاندا قسەیان پێکردوە .

ئەوانەی بەرەو هیندوستان چون یادگارێکی بە نرخیان لە خۆیان بەجێ هێشتوە ، ئەویش کتێبی ( ویدا )یە کە بە زمانی سانسکریتی نوسراوە و « ... دەتوانین بلێین کە کۆکردنەوەی ــ ویدا ــ لە دەوروبەری ۳۰۰۰ ساڵ پێش عیسادا کوتایی هاتوە ... »(۱) . زمانی سانسکریتی کە ( ویدا )ی پێ نوسراوە ئەوەندەی تا ئێستا لێمان ڕونە ، وە چی ڕاستە و خۆی ( هیندو ئێرانی )یە و زمانێکی‌تریان لە نێواندا نیە و ئەمە شتێکە نە زمانی ( مادی ) دەتوانێ بیبێ و نە ئێمەش بۆمان دەلوێ ئیدیعای بکەین ، چونکو ( ماد )ەکان کە بە شێك بون لەو خێڵاتەی بەرەو ئێرانی ئێستا هاتون ، بۆ یەکەم جار لە ساڵی ۸۳۵ی پێش عیسا لە بەردەنوسەکانی پاتشایانی ( ئاشوری )دا ناویان هاتوە و لە چەرخی حەوتەمی پێش عیساوە زمانەکەیان توانیویە ببێتە زمانی موشتەرەکی هەمو ئەو هۆز و تیرە و خێڵانەی کە لە خاکی ( ماد ) دەژیان و هەروەها زمانی ڕەسمی ئیمپڕاتۆری گەورەی ماد . ئەمە دەگەڵ سەرەتای زمانی سانسکریتی ۲۳۰۰ ساڵێکی بەینە و زۆر ئاشکرایە کە لەم ماوە دور و

---

(۱) د. معین ، فەرهەنگی فارسی (تاران) ، ج ٥ ، ل ۸۱۰ .

درێــژەدا ، ئــەو زمــانەی لە پێشــدا ( مــاد )ەکان قســەیان پێــکردوە – هیندوئێرانی – دەبێ گەلێ گۆڕانی بەسەردا هاتبێ، بە تایبەتی کە لە نیشتمانی تازەیاندا تووشی زۆر شتی وا هاتوون کە لەو سەردەمەدا و بــە حوکمی پلەی گەشەکردنی ئابوری و کۆمەلایەتی ، خۆیان نەیانبوە و نەیانتوانیوە بیان بێ . بە لای منەوە لەو ملە و بەربەرەکانییەی ( ماد )ەکان دەگەڵ خەڵکی ئەسـڵی نیشتمانی تازەیانا کردویانە و سەرێش کەوتوون ، زمانەکەیان لە خۆیان نەرمتر بوە و تازادەییکی باش سەری بۆ ئەو زمانانەی ئەوسا لەو مەڵبەندەدا باو بوون ( ئۆرارتو ، هوری ، گوتی ، لۆللۆ ، کاسی )دانواندوە و هەر وەك ئەو شتانەی نەیانبوە لەو خەڵکانە فێربوون ناوەکانیشیان هەر لێوەرگرتوون ، ئەوە کارێکە هەموو نەتەوەیێك لە هەموو دەور و زەمانێکدا کردویەتی و دەیکا .

جا زمانی مادی کە وەکو پاشان باســیدەکرێ زۆر کەمی لێدەزانین و بێجگە لە گەشــەکردنی تەبیعی ٢٣٠٠ ســاڵەی ، لەســەرچاوەی زمانانی ناوچەیێش خۆی دەوڵەمەند کردوە ، هەروەك ناتوانێ وەچی ڕاســتەوخۆی زمانی ( هیندوئێرانی ) بێ ، هــەروەها ناشــتوانێ لە ڕێبازی گەشەکردنی خۆیدا – لە قۆناغی ( هیندوئێرانی )ڕا تــا دەگاتە قوناغی ( زمانی ڕەســمی ئیمپڕاتۆری ماد ) – بــە لانی کەمەوە بە قۆناغێکیتردا تێنەپەڕیبێ . ڕەنگە لێرەدا زمانی ( ئاوێســتایی ) بێران بۆ لای خۆی ڕابکێشی و بە شــکڵی ئەو قۆناغەی بخاتە بەرچاوان ، بــەلام ( ئاوێســتایی ) لە لانی زمانی و زەمانی ئەوەندە لــە زمانی مادی نێزیکە کــە هەندێ کەس هــەر بە مادی دەزانن و هیندێکیتریش بە لەهجەیێکی ( مادی ) دادەنێن ، بۆیە بۆ ئەوە دەست نادا ئەو قۆناغە ڕاستەخۆیە بێ کە دەکەوێتە نێــوان زمانی ( هیندوئێرانی ) و زمانی ( مادی ) ، بەلام بەو حاڵەشەوە دەشــێ قۆناغێکی دوەم بێ ، هەر چۆنێ بێ ئەمانە شتێکن کە زانست لە دواڕۆژا ڕۆنیان دەکاتەوە و بەم هیوایە وازیان لێدێنین و دەچینە سەر باسی خودی زمانی مادی کە مەبەستی ئەم بەشەی باسەکەمانە .



تا ئێستا ئاسارێکی کۆنینەی کە بە زمانی ( مادی ) نوســرابێ ( وەکو بەردەنوسی پاتشایان ) نەدۆزراوەتەوە تا تێمان بگەیێنێ ئەو زمانە چۆن بوە ، هۆی نەدۆزرانەوەی ئاسار و بەردەنوسەکان ئەوەیە کە « **هێشــتا لە شوینەواری مــادەکان تەنانــەت شــارێك نەخراوەتــە ژێر هــەڵکۆلین** »(٢) و هەرچێــکی کــراوە لــە سنورەکانی خاکی ماد بوە . بۆیە بۆ نیشاندانی نموونەی زمانی مادی بێجــگە لە

(٢) دیاکونۆف ، سەرچاوەی پێشوو ، ل – ١١ .

ووشه و ڕستەی بەردەنوسەکانی ( هەخامەنشی ) یا ئەوانەی بە هۆی کتێبی یۆنانی و شتی تر پێمان گەیشتوە ، شتێکمان بە دەستەوە نیە .

بەردەنوسە بەناوبانگەکەی ( داریوش ) لە ( بێستون ) بە سێ زمان نوسراوە و دەمێك بۆ ئەمە دەزانرا کە دۆ ڕێزیان بە زمانی ( پارسی ) و (بابلی)یە و تا ماوەیێکی زۆریش گومانی ئەوە دەکرا کە بەشی سێیەمی ئەو بەردەنوسە بە زمانی ( مادی ) بێ ، بەڵام دۆزرانەوەی ئاساری ( عێلامی ) لە ( شوش ) دەری‌خست کە ئەم بەشە بە زمانی ( عێلامی ) نوسراوە نەك بە (مادی) و « **بە سەریەکەوە ، ئەو بیرە بە مێشکا دێت کە زمانی ئەدەبی بەردەنوسەکانی هەخامەنشی لە ژێر تەئسیری بە هێزی زمانی مادیدا ــ کە لە پێشدا وەك زمانێکی ئەدەبی لێهاتبۆ ــ نوسراوون .... ئاشکرایە تەنیا لە حالەتی هەبونی ووشەی موشتەڕەکی زۆر لە هەر دۆ زماناندا ، مومکین بۆ ئەم دیاردەیە ڕۆ بدات کە لە ئەنجامیدا زمانی بەردەنوسی هەخامەنشیکان وەك دەردەکەوێ ، لە باری ووشەوە ، لە زمانی مادی نێزیکتر بوە تا زمانی گفتوگۆی پارسییەکانی کۆن و لەوەڕا دەتوانین تێبگەین کە بۆچی بەردەنوسە کەی داریوشی یەکەم لە بێستون ــ کە لە سنوری ماد و عیللامئیدا لە ڕەوەزێك هەڵکەندراوە ــ مەتنێکی تایبەتی بە زمانی مادی نیە . بێگومان مادەکان لە قسەکانی بەشی یەکەمی ئەو بەردەنوسە ، یەعنی ئەوەی بە زمانی (پارسی کۆن) نوسراوە و تا ڕادەیێکیش بەشی دوەمی یەعنی عێلامیەکەی حالی دەبون**»[٣] .

ئەوە پێشان دەدا کە زمانی ( مادی ) لە کاتی دەستەڵاتی ئیمپراتۆرێتی ( ماد ) ا تەئسیرێکی گەورەی کردۆتە سەر زمانی پارسەکان ــ زمانی ڕەسمی دەوڵەتی هەخامەنشی لە دوایدا ــ و گەلێ ووشەی تایبەتی زمانی (مادی) فڕێ داوەتە ناو زمانی ( پارسی ) ، سەرەڕای زۆر ووشەی موشتەڕەکی زمانە ناوکۆییەکەیان ــ هیندوئێرانی ــ کە لە هەر دۆ زمانەکەدا ماوەتەوە .

« **لە ئەنجامی شی کردنەوەی زمانەوانیدا دەرکەوتوە کە زاراوەکانی ئیداری و دەوڵەتی وەکو : «شا» (خشایەثییە) و « ساتراپ ــ خشەثرەپاڤا (ن) »[٤] و هەروەها زاراوەی کشتوکالی وەکو ( ئەسادرەف ؟ ) ، ووشەی دەربارەی باوەڕ وەك « فەڕنە » یانی « هێزێکی جادوێی و شانازی شاهانە و بەختیاری ( هس : بەت‌فەڕ ، بێ‌فەر لە کوردی ئێستادا ــ ر. ز ) و ناوی خوا «میترا» و زاراوەی ( ئەنی یاهەبەگاهە )کە مەعنایەکی دینی هەیە ( مادی ) ن . زاراوەکانی « مقەددەس » (برەئیزمەن) و « ئیهانەت و فشار » (زورە) و بەردی لاجیوەرد ( کەسەکە ) و ئیتر مادی یا باختەرین . سەرنج‌ڕاکێش ئەوەیە کە ناوی هیندێ لە قەبیلەکانی ئێرانی مادین ، هەر چۆنی بێ ناوی دۆ عەشیرەتی « ماسپی » «ساگارتی» مادین (لە یەکێکیاندا توشی تەرکیبی غەیرە پارسی « سپ » دەبین و لەوی دیکەیاندا لە باتی شێوەی پارسی « ئاتەگەرتییە »دە شکلی مادی «ئەئەگەرتییە») هەڵدەنگوین بە مانای «بەردهەڵقەمن» و «ئەشکەوت‌نشین» . بەڵام**

---

(٣) دیاکۆنۆف ، سەرچاوەی پێشو ، ل ٥٤/٥٥ .

(٤) ساتراپ محرفی یۆنانییە و ئەسڵی ووشەکە بە مانای (محافظ) و (حوکمدار)ە .

**له هەمۆی سەیرتر ئەوەیە کە خودی ناوی فارس (پارس) مادییە. »[٥]**

**« لە زمانی پارسی کۆن ( فارسی هەخامەنشی )دا هەندێ ووشە (وەك لەسەرەوەتر باس‌کرا ، زور نەك هەندێ ووشە ــ ر. ز. ) لەو زمانە ( مەبەست زمانی مادییە ــ ر. ز. ) خوازراوەتەوە، ڤیسپەزەنە ( هەمۆ خەلك ، هــەمۆ جۆرە خەلکی ) و هەروەها ووشــەی : پەئیریدەئیزە ، لە ئاوێستا و پارسی کۆندا بە قسەی مامۆستا (بێنۆنیست) بە ئەسڵ مادییە ، چونکو دەبوایە لــە پارسی کۆندا (پرەدیدە) بەکاربێت ، ئەم ووشــەیە لە لۆغەتــدا مانای جێــگایێکی دەورەدراو ، حەوشەی دابیرییە و بە مەجاز مانای باغ و بێستان دەدا . ووشەی (پاردۆس)ی ئەرمەنی ( وەك لە ئەرمنیانم بێستوە ــ پاردێس ــ دەڵێن ، ر. ز. ) بە مانای باغ و بێستان و (فردوس)ی عەرەبی هەر لەم‌ڕێشەیەن »[٦] .**

هەروەها دوکتۆر ( معین ) لە پەراوێزێ کە بو ووشـەی ( پالێز )ی فارسی بە مانای بێسـتان ، نۆسـیویە کوتۆیە : « ٦ــ ئەویـستا (ئاوێستاڕاسته ، ر. ز) پەئیریدەئیزە ( باغ ) ، **پارسی کۆن (بەتەلەفوزی یۆنانی) پاڕاذیسۆس، کوردێ : پارێس ( بی گومان مەبەستی « پەرێزە ، ر. ز. ) ، ئەرمەنی : پەرتێز و معربەکەی (فردوس)ە »[٧] .**

ئەم ووشەی ( پەئیریدەئێزە )ی مادێ ئەوەندەی من بزانم سی ووشـــەی لە کوردێ ئێستادا ( لەهجەی ناوەندێ ) لێ‌کەوتۆتەوە ، یەکیان ( پەرێز ) کە باس‌کرا ، دوەمیـــان ( پەرژێن ) و ســێیەمنیێش ( پـــاردە )یە بـــە مەعنای حەوشەیێکی بە بەرد یا دڕك دەورەدرابێ .

ئەوانەی سەرەوە و هەندێ ناوی پاتشـــایان وەکێ : « دەیا ئوکۆ » و « هوڤەخشـــەتەرە » و ناوی « هەنگ‌متـــەنا » ( هەمەدان ) ، « ڤەزەرکە » « گەورە » و « ئەسەن » ( بەرد ) نمۆنەی ووشەی زمانی مادێن .

سالی ١٩٧٥ لە ( هەنگمتەنا ) پایتەختی ( ماد )ەکان کۆشکێکی گەورە لە ژێر خاك دەرکەوتوە ، ڕۆژنامەکانی ئێران نۆسـیبۆیان : تەختی جەمشـید ( پێرس پۆلیس )ێکی تازە لــە هەمەدان دۆزرایەوە . بێ‌گومـان دەبێ ئەوە کۆشك و تەلاری پاتشاکانی ( ماد ) بێ و هێوامان ئەوەیە ئاساری نۆسراوی ( مادێ ) لێ‌دەرکەوێ و تێشکێکی تازە بخاتە سەر زمانی ( مادێ ) و تاڕادەیێك لە دەست کوتان لە تاریکایی مێژۆدا ڕزگارمان کات .

---

(٥) دیاکۆنۆف ، سەرچاوەی پێشو ، ل ٩٠/٩١ .

(٦) د. معین ، بورهانی قاتیع ، (کتابفروشی ابن سینا) ، تاران ، ج ١ «مقدمه» ل . چاردە .

(٧) د. معین ، سەرچاوەی پێشو ، ج ١ ، ل ٣٥٩ .

# زمانی ئاوێستایی

ئەم زمانە یەکێکە لە زمانە کۆنەکانی خێزانە زمانی ( ئێرانی ) و ئاوێستای زەردوشت تەنیا بەڵگەی نوسراوی ئەم زمانەیە و هەر بۆیەش ناوی (ئاوێستایی) بە سەردا براوە .

هەمو زانایانی زمانەوانی لەو باوەڕەدان ئەو بەشەی ( ئاوێستا ) کە مەشهورە بە ( پێنج گات ) و خودی زەردوشت بە شیعر دایناوە ، لە باری ووردەبابەتی زمانەوانییەوە لە هەمو بەشەکانی دیکەی ( ئاوێستا ) کۆنترە و پێش ئەوەی نوسێنەوە بە خۆیەوە ببێنێ ماوەیێکی دور و درێژ دەماو دەمی کردوە و « **بە لەهجەیێکی تایبەتی و بە زمانێکی دورکەوتەی کۆنتر لە پارسی کۆن (فارسی هەخامەنشی ) و نێزیکتر لە زمانی (وێدا)کانی هیندی نوسراوەتەوە . ئەم چەشنە ئاساری دەماودەمە لە ڕۆژهەڵاتی نێزیك و لە وولاتانی تریشدا بینراوە و پێوەندی کۆمەڵایەتی نێوەی یەکەمی هەزارە ساڵەی پێش عیسا دەنوێنێ . گومانی ئەوە ناکرێ کە ( گات )ەکان دەسبەجێ پاش پەیدابونیان نوسرابنەوە ، زۆر زۆری تێدەچێ ماوەیێك بە هۆی ( کاهین ) و پەیڕەوانی ئەم ئامۆژگارییانە دەماودەمی کرد بێ و سینگ بە سینگ هاتبێتە خوار تا پاشان ویڕای کۆنترین بەشەکانی «ووردەئاوێستا» و تەنیا ئەو کاتەی پاش داریوشی یەکەم ( مر. ٨٦؛ پێش عیسا ، ر. ز. ) خەتی ئێرانی لەسەر بنەمای ئەلفوبێتکەی (ئارامی) بو بە باو ، «گات»ەکانیش نوسرانەوە »(١)** .

زوربەی ئەو زاناو ڕۆژهەڵاتناسانەی خەریکی ساغکردنەوەی (ئاوێستا) بون ، ڕایان وایە زمانی ئاوێستایی یەکێکە لە زمانەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی خێزانە زمانی ئێرانی و زەردوشت کتێبەکەی خۆی لە دەور و بەری چەرخی حەوتەمی پێش عیسا لە باکتێریا ( باختەر = بەڵخ ) نوسیوەتەوە . بەڵام پرۆفیسور (پوردااود) مامۆستای دانیشگای تاران و ئاوێستازانی بە ناوبانگی

---

**(١) دیاکۆنۆف ، سەرچاوەی پێشو ، ل ـ ٦٢ .**

ئێرانی لە سەرەتایەکدا کە بۆ « یەسنە »ی ــ بەشێکە لە ئاوێستا ــ نوسیوە دەڵێ : **لە ناو دەنگ و باسی مێژونوسانی یونان و رۆما خەبەری ( خسانتوس ) دەربارەی زەمانی زەردوشت جێگای باوەڕە و دەتوانین دەرکەوتنی پێغەمبەری ئێران لە دەوروبەری سالی ۱۰۸۰ی پێش عیسا بزانین »**(۲) .

هەروەها کەم زانا و مێژوزان و کۆنینەناس هەن کە باوەڕیان وا نەبێ ( زەردوشت ) خەڵکی ڕۆژئاوای ( ماد ) نەبێ ، بــە جۆرێکی‌تر ، گەلێکیان ڕایان وایە کە ( زەردوشت ) لە دەوری دەریاچەی وورمێ ( چەئێچەستە ) لە کوردستانی‌ئێستای ئێر'ن لە دایك بوە، بەڵام کاتێ باس هاتە سەر ئەو زمانەی ئاوێستای پێ نوسراوە ، کەمیان بۆ ئەوە دەچن کە ( زەردوشت ) ئاوێستای بە زمانی مەوتەنی ئەســڵی خۆی یەعنی زمــانی ( مادێ ) نوســیبێ. و ئەوە **« مەوزوعێکە زۆری گفتوگۆ لێ‌کراوە ، زۆرتر ڕێی تێدەچێ کە زمانی ئاوێســتایی لەهجــەیێکی (مادێ) بێ تا خوراسانێ (باکتیریایێ ، ر. ز. ) »**(۳) .

مەســەلەی ( مادێ )بون و نەبونی ئەو زمانەی کە ئێســتا پێی دەڵەن (ئاوێستایی) شتێکە هەروا دەمێنێتەوە تا ئەو ڕۆژەی دەربارەی زمانی (مادی) زانیارێکی ئەوەندە زۆر دەکەوێتە بەر دەستی زانایان کە بتوانن دەگەڵ زمانی (ئاوێستایی) بەراوەردی بکەن و هەڵێ‌سەنگێنن و ڕای خۆیانی لەسەر دەربڕن جا بۆیە ئەم مەبەستە بە هومێدی ئەو ڕۆژەهەڵدەگرین و بۆ ئــەوەی بزانــین ئاوێستایی چ جۆرە زمانێك بوە هەندێ لە تایبەتەکانی دەخەینە بەر چاو .

**۱ ــ ئەو زمانەی (ئاوێستا)ی پێنوسراوە هێشتا نیشانەی مەصدەر (دن ، تن ، ین ، ون ، ان ) وەکو ئێستا لە زمانی کوردێ و فارسیدا دەبێندرێ ، تێیدا بە دێ نەهاتوە و تەنیا ماکی فیعل هەبوە : دا (دان) ، پەرە رەئێث (مردن) ، فراثوەرێس (خولقاندن) ، بەو (بون) ٔ نیهەد (دانیشتن) (تە : پوورداوود ، یەسنا ، ج ۱ ، ل ــ ۱۳٤ ) .**

**۲ ــ هێشتــا دەنــگی (ل)ی تێــدا پەیــدا نەبــوە و دەنــگی (ث) و (ذ) و (س) و (ز) و دودەنگی (ن)ی هەبوە کە یەکیان گن بوە .**

**۳ ــ سنوری نێوان کەرتەکان** Syllables **هەر ماوون و هەر کەرتــەی بە جیــا دەخوێندرێتەوە ، ئەمە مانای ئەوەیە کە ووشــەی ئاوێستــایی لە ســەرەتای دروستبونی خۆیدا بوە ، کە دەڵەین (سەرەتا) مەبەستمان ئەوەیە (مــاوە)یێکی**

---

(۲) پوورداوود ، یەسنا ، چاپ دوەم تاران ، ج ۱ ، ل ۱۱۰ .

(۳) پوورداوود ، سەرەتای بورهانی قاتیع ، ج ۱ ، ل ــ چوار .

ئەوتۆ بەسەر بەکارهێنانێدا تێئەپەڕێوە کە بۆ توانەوە و قاڵبۆنی ووشەیێك و سوانی دەنگە دڕ و نالەبارەکانی پێوێستە ، جا ڕەنگە بگاتە هەزار سالێش و ڕەنگە صەت سالێشی پێ نەوێ . ئەو نالەبارییە لە ئەنجامی تێکهەڵەنگوتن و پێکەوە نوسانی دۆ دەنگی دوایێ و هەوەڵێ دۆ کەرتان پەیدا دەبێ .

ئێمە لە پێشەوە دیتمان ووشەی (پەئیریدەئیزە) ی مادێ چۆن لە کوردێ ئیمڕۆدا بۆتە (پەریز) ، نەك هەر شکلی ووشەکە گۆڕاوە و لە شەش کەرتەوە بۆتە دۆ کەرت بەڵکۆ مەعناشی زۆر گۆڕانی بەسەردا هاتوە . جا ووشەکانی لە (ئاوێستا)دا دەبێنرێن گەلێکیان لەم بابەتەن . بۆ نمۆنە سەرنجێکی ئەم ووشانە بدەن : چە ئیچەستە ( دەریاچەی وورمێ کە لای زەردوشتیەکان پیروزە ) ئیمڕۆ بۆتە چێچەست ، مائۆنگهە ( مانگ ) ، هەزەنگرە (هەزار) ، گەئۆپە ( گەپ ) ، ئەشتائیتی ( هەشتا ) ، رەئۆخشنێ (ڕۆشنێ) ، دەئێنا ( دێن ) ، زەرەتهوشترە ( زەڕدوشت ) .

٤ ــ تەرکیبی دۆ دەنگی (س. پ) کە پێشان ووتمان لە تایبەتەکانی زمانی (مادێ)یە ، لە ووشەی ئاوێستاییدا بەر چاوە : سپێنتە ( پیرۆز ، مقەددەس) ، سپێنیشتە ( پیرۆزتر ) ، سپاتە ئورونۆ ( تولە ، بەچکەی صەگ ) .

٥ ــ باوەڕی دۆ خودایێ ، باوەڕێ بە ( ئاهۆرامەزدا ) و ( ئەنگرە مەئینیو ) کاری کردۆتە سەر زمانی ئاوێستایێ و گەلێ ووشە ( فیعل ، ناو ، صفەت ) مەدلۆلەکەیان تەنیا بۆ کار و چتی سەر بە ( ئاهۆرامەزدا ) و بەشێکی تریش هەر بۆ کاری سەر بە ( ئەنگرە مەئینیو = ئەهریمەن )دە کاردەکرێن : فراثوەرێس ( خولقاندنی ئاهۆرایێ ) و فراکەرێت ( خولقاندنی ئەهریمەنێ ) ، زەن (زایینی گیانداری چاك ) و هەف ( زایینی گیانداری خراپ ) ، ئەئۆج ( ووتنیچاك ) و دەڤ ( ووتنی خراپ ) ، پەرە رەئێث (مردنی گیانداری سەر بە ئاهۆرا ) و ئەڤەمەر (مردنی ئەوانەی سەر بە ئەهریمەنن ) ، ڤەغدەنە ( سەر ، کەللەی شتی ئاهۆرایێ ) و کەمێرێذە ( ئێئەهریمەنێ ) ، نیهەد ( دانیشتنی ئاهۆرایی ) و هەندڤەر (دانیشتن یا سەرنخۆن بۆنەوەی ئەهریمەنێ ) ، بەئوذی ( بۆنی خۆش )و گەئینتی ( بۆنی ناخۆش ) ، ڤەچ (قسەی ئاهۆرایێ) و دەئو ئیثری (قسەی ئەهریمەنێ)(٤) .

---

(٤) ١ ــ بۆ ئەم ووشە ئاوێستاییانەی لەم باسەدا بنوارنە : پۆرداوود یەسنا ، ( انجمن ایرانشناسی ) ، تاران ، ج ١ ، ل ــ ٢٣٤ و ....

ب ــ ئیستاش هەندران ( بهەندرێن ) بۆ ئارام بونەوە و دامرکاندنەوەی جموجۆڵێکیپیاو ئازاربدا ، بەکاردێت . زان بۆ ئادەمێزاد و گیانلەبەری پاك و ترەکێن ( بۆ صەگ و بەراز و .... ) و مردن ( بۆ مسوڵمان ) و ئاوابۆن ، زایەبۆن ، وونبۆن ( بۆ غەیرە مسوڵمان ) و تۆپێن ، منداربۆنەوە ، سەکەتبۆن ( بۆ گیانداری تر ) لە زمانی کوردێدا باوە .

**٦ ـ ئەو ( موغ )انەی (دینديپیرهـ) ئەلفوبێتکەی زمانی (ئاویستایی)یان ڕێکخستوە ، ١٤ نیشانەیان بۆ دەنگبزوێنەکان vowels داناوە و بۆ هەندێ دەنگەکان لە سەرەتا و ناوڕاست و دوایی ووشەدا پیتی تایبەتییان دیاریکردوە .**

ئەمانە هەموی ، بە لای منەوە نیشانەی کۆنێ زمانی ئاوێستاییێن کە ئەوەندەی (تطوّر) نەکردوە ، ووشەیێك بە تەنیایێ بتوانێ مەدلولی خۆی ئەدا بکا ، بەلکو بۆ تێگەیاندنی دەلالەتی ووشەکان بە تایبەتێ ئەوانەی لێك دەچن پێویست بوە لە (خانی دەنگ = مخرج الحرف) و ڕەنگە (ئیشارە)ی دەست و .. یارمەتێ وەربگرن کە پاشماوەی قۆناغەکانی سەرەتایێ زمان پشکوتنی ئادەمیزادن .

ئێمە لەم زەمانەدا ووشەکانی (ئاوێستا) و هەمو زمانە مردوەکان بە دەزگای دەنگی ( جهاز النطق ) ئیمرۆ ـ نیزیکەی ٢٧٠٠ ساڵ پاش ئاوێستا ـ تەلەفوز دەکەین کە شکی تێدا نیە لە باری فیزیۆلۆژیشەوە (فسلجە) لەم ماوە زۆرەدا گۆڕانێکی هەر بەسەر هاتوە و (شریتی مسجّل )یشمان بە دەستەوە نیە تا بزانین (موغ)ێك لە ئاتەشگەدە ئاوێستای چۆن خوێندۆتەوە ، داخوا ئەگەر (یەکێکیان) زیندوبێتەوە و گوێی لێبی هەزار و یەك غەلەتمان لێناگرێ یا گەلێکمان پێپێناکەنێ ؟ . یەکێکی تر لە تایبەتەکان زمانی ئاوێ ستایێ تەسریف‌کردنی صفەت و زەمێر و ناو یا بە گشتێ دەزگایەکی پان و بەرین و ئالۆزی تەسریفە کە « **ئەگەر لەوان زەمانانەدا نوسراوی ئەدەبێ حازر بەدەست نەبوایە کەس نەیدەتوانی شکلی مردوی پاشبەندەکانی تەسریفی ناو و فیعل و دیفتۆنگەکان و عناصری لەیەکچو کە تایبەتێ زمانی ئاوێستایی بۆ زیندوکاتەوە »(٥) .**

ئەمەش پارچەیەکە لە نوسینی ئاوێستایێ کە شێوەی ڕێکخستنی ڕستەمان پێشان دەدات و لە لاپەڕەی ١٢٢ ی «بارامیەشت» کە بەشێکی ئاوێستایە و (م. ئەوڕنگ) لێی کۆلێوە تەوە ، وەرگێراوە .

**پەئیتی دیم پێرێسەت زەرەتهوشترۆ**
**کەت زی ئەستی ئەهورە مەزدە**
**ڤیرێتهرە غنەهێ ئەهورە ذاتەهێ**
**دائیتیۆتیمە یەسنەس چە ڤەهمەس چە**
**ئەشات هەچە یەت ڤەهیشتات .**

ماناکەی بە کوردێ دەبێتە :

پاشان زەڕدوشت لەوی پرسێ ، ئەی ئاهۆرامەزدا بەڕاستی کامەیە چاکترین ستایش و عیبادەتی سەرکەوتنی هەرە چاکی ئاهۆرا دابێتێ .

---

(٥) ١ ـ دیاکۆنۆف سەرچاوەی پێشو ، ل ـ ٤٧٠ .

ب ـ مەبەست « لەوان زەمانانەدا » زەمانی دانانی ( وەندیداد ) بەشێکی ئاوێستایە .

ئەم باسە زۆری درێژەکێشا و خەریکە ببێتە لێکۆڵینەوەیێکی زمانی ئاوێستایی و لە چوارچێوەی سەرەتای قامۆسێك دەرچێ ، بەڵام ڕەنگە خوێنەری بەڕێز قسەی دەگەڵ قسەم بێ ئەگەر بڵێم دۆ زمانی زۆر کۆنی مادی و ئاوێستایی کە گومانی تێدا نیە ، ئەو کانی و سەراوانەن شەقەجۆی زمانی کوردی ئیمڕۆیان لێ هەڵگیراوە ، ئەوەندە دێنن کە نەختێك زیاتر لە شتی دی خۆیان پێوە ماندوکەین و لێیان بدوێین .

هەر چۆنێ بێ ئەم باسە لێرەدا دەبڕینەوە و دەچینە سەر باسی زمانێکی تر کە لامان وایە هەم سەرچاوەکانی زمانی کوردی (مادی ، ئاوێستایی) کاریان دەویکردوە و هەم ئەویش کاری دەوان کردوە .



# زمانی پارسی کۆن

ئەم زمانە ، زمانی ئەو خێڵە (ئاریایی)یانەیە کە پاش گەیشتنە خاکی ئێرانی ئێستا ، لە ناوچەیێکی کە ئیمڕۆ پێی دەڵێن (فارس) نیشتەجێ بون و ناوی خۆشیان بە سەر مەڵبەندەکەدا[1] بڕی و بە (پارس = فارس) ناوبانگی دەرکرد کە وەکو لە پێشدا باسمان‌کرد خۆی ووشەیێکی (مادی)یە ، مەڵبەندەکەش لە کاتی ئیمپڕاتۆرێتی (ماد)ا بەشێك بو لەو ئیمپڕاتۆریە و بۆیە زمانی مادی کە زمانی ڕەسمی دەوڵەتی ماد بوە زۆر کاری کردۆتە سەر ئەم زمانە و کاتێ لە ساڵی ٥٥٩ی پێش عیسادا ئیمپڕاتۆرێتی (ماد) بە دەستی (کۆرش) ڕمێنرا و ئیمپڕاتۆرێتی (هەخامەنشیان) دامەزرا ، زمانی پارسی کۆنیتش بو بەزمانی ڕەسمی دەوڵەت، ئەوجار نۆرەی ئەوە هات کە ئەو کار بکاتە سەر زمانی مادی .

ئاساری نوسراوی زمانی پارسی ، بەردەنوسەکانی پاتشاکانن کە لە هەموییان بە ناوبانگتر بەردەنوسەکەی (داریوش) ە کە لە شاخی بێستون هەڵکەندراوە ، ئەمەی خوارەوە نمونەی زمانی ( پارسی )یە و بەشێکە لە بەردەنوسی (خشایارشا)ی یەکەم کە بە بەردەنوسی (دێو) مەشهورە .

**نوتا ئەنتەر ئەنیتا دەهیاڤا ئاهە یەدا تیە پەروڤەم دەئیڤا ئەیەدی پەساڤە ڤەشنا ئەهورەمەزدەها ئەدەم ئەڤەم دەئیڤەدانەم ڤیەکەنەم ئوتا پەتیەزبەیەم دەئیڤا ما یەدیەئیشە پەروڤەم دەئیڤا ئەیەدی ئەڤەدا ئەدەم ئەهورە مەزدام ئەیەدەئی .**

بە کوردی ماناکەی دەبێتە :

لەم وولاتانە بو کە پێشان خوایانی درۆزنە ( دێوە ) دەپەرستران ، ئەو کاتە بە ئیرادەی ئاهۆرامەزدا من ئەو خانەی خودایانی درۆزنەم تێکدا و ڕامگەیاند تۆ نابێ خودایانی درۆزنە بپەرستی ،

ئەو شوێنەی جاران خودایانی درۆزنەی لێ‌دەپەرستران ، هەر لەو شوێنە من ئاهۆرامەزدام پەرست(١) .

وەك دەزانین بەردەنوسەکانی پاتشایانی هەخامەنشی بە خەتی بزماری نوسراوون و « ئێستا زاندراوە کە خەتی بزماری (پارسی‌کۆن) لە زەمانی (کورشی دوەم) و ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێش عیسا زۆر ڕەواجی هەبوە . ئەم قسەیەش هەر قبوڵناکرێ کە ئیمپڕاتۆری گەورەی (ماد) نوسینیان نەبوە و (پارس)ەکان بۆیانە ، واز لەوەش بێنین کە خەتی بزماری «پارسی کۆن» دەگەڵ خەتی بزماری «بابلی» و «عیلامی» زۆر لێك جیاوازن. هەرچەندە وا وێدەچێ کە دەگەڵ خەتە بزمارییەکانی ئاسیا یەك سەرچاوەیان هەبێ ، بەڵام ناتوانین بڵێین ڕاستەوخۆ لەوان وەرگیراون . ئەم قسە مانای وایە کە لەم ناوەدا چەند ئاڵقەیێکمان لێ وونە و زیاتر گومانی ئەوە دەکرێ کە خەتی بزماری «مادی» و «ماننایی» ئەو ئاڵقە وون و نەزانراوانە بن .

پاشان ، ڕێکخستن و شێوەی ئینشای بەردەنوسەکانی پارسی کۆن ( بە تایبەتی دابەش‌کردنیان بە چەند بەش و دەست پێکردنی هەر بەشێك بە ڕستەی : « فلانە پاتشا وا دەڵێ ») لە بابل و عیلام وەرنەگیراوە ، بەڵکو لە «ئۆڕارتو» خوازراوەتەوە و ئەوە خۆی وا دەگەیێنی کە لێرەش‌دا شوێنی بەتاڵ و بۆشایی هەیە و ئەو شوێنە بەتاڵانە دەتوانن تەنیا لەوحەکانی پاتشایانی ماننایی و مادی ، بن و هیچی تر . ئەو بەڵگانەی سەرەوە نیشان دەدەن کە پارسەکان (ئێرانیکان) خەتی بزمارییان لە (ماد)ەکان وەرگرتوە »(٢) ئەوە بۆمان دەردەخا کە تەئسیری زمانی (مادی) لەسەر زمانی (پارسی) هەر فڕێدانی ووشە نەبوە بەڵکو خەت و ئەلفوبێتکەش دەگرێتەوە .

ئێستا باسی سێ زمانانمان تەواوکرد کە لە لای زانایانی زمانەوانی بە زمانانی دەوری کۆنی خێزانە زمانی (ئێرانی) مەشهورن ، ئەو سێ زمانە «ئاوێستایی» و «مادی» و «پارسی‌کۆن» بون ، وەکو ڕونمان کردەوە زمانی «ئاوێستایی» لە «مادی» و «پارسی» کۆنتر دێتە بەر چاو .



(١) ئەم پارچەیەی زمانی پارسی لە «فەرهەنگی فارسی» دوکتور معین ، ج ١ ، ل ـ شەش ( مقدمە ) وەرگیراوە .

(٢) دیاکونۆف ، سەرچاوەی پێشو ، ل ـ ٤٥٢ .

# دەوری ناوەڕاستی خێزانە زمانی ئێرانی

دەگەڵ ڕوخانی ئیمپڕاتوریتی هەخامەنشی بە دەستی ئەسکەندەری مەقدونی (٣٣١ پ. عیسا ) دەوری کۆنی زمانانی ئێرانی دوایی دێت وئەوجار نۆرەی ئەو گەلە زمانە دادێ کە بە زمانانی دەوری ناوەڕاست ناویان دەرکردوە و «دژوارە کە بڵێین زمانانی ناوەڕاست لە کەنگێڕا دەستیان پێکردوە ، بەڵام لە بەردەنوسەکانی پاتشایانی ئاخر و ئۆخری هەخامەنشیڕا دەتوانین تێبگەین کە زمانی پارسی کۆن هەر لەم دەورەڕا دەستی داوەتە ساکاربون و هەڵەی قەواعیدی ئەو بەردەنوسانە دیارە نیشانەیەك بێ کە باوی ئەوە نەماوە گوێ بدەنە ڕێزمان ، بۆیە دەتوانرێ دوایی دەوری هەخامەنشیکان (دەوروبەری چەرخی چوارەم پێش عیسا ) بە سەرەتای دەرکەوتنی پارسی ناوەڕاست (پەهلەوی) دابنرێت . »(١)

زمانانی دەوری ناوەڕاستی خێزانە زمانی ئێرانی ئەمانەن : پارتی ، پارسی ، خوارەزمی ، خوتەنی ، سوغدی . دوزمانی پارتی و پارسی هەردوکیان بە (پەهلەوی) ناوبانگیان دەرکردوە ، چونکو لەو زمانانە ئەوی ڕاستەوخو پێوەندی بە زمانی کوردییەوە هەبێ هەر پارتی و پارسییە ، بۆیە لەم گەلە زمانە هەر باسی ئەم دوانەیان دەکەین .

---

(١) د. معین ، فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ــ نو «مقدمە» .

# زمانی پارتی « پەهلەوی »

زمانی پارتی زمانی خێلاتی ئاریایی (پارت)ە کە لە خاکی خۆراسانی گەورەی ئەوێ زەمانیدا نیشتەجێبۆن و لە سالی ٢٥٠ی پێش عیساوە دەستەلاتی حکومەتی خۆیان لەو مەلبەندەدا دامەزراند و پاش لە ناوبردنی دەزگای دەستەلاتی یۆنانیکان ، دەستیان بە سەر هەمۆ میراتی هەخامەنشیدا گرت و جێگەی یۆنانەکانیان گرتەوە پێتەختەشیان لە شاری هێکاتۆم پیلۆس (صەت دەروازە)کە ئیمڕۆ (دامغان)ی لە شوێن بنیات نراوە ، گواستەوە بۆ تیسفۆن (مەدابین) .

زمانی ئەم (پارت)انە لە زمانەکانی باکوری ڕۆژاوایی خێزانە زمانی ئێرانییە و زانایانی زمان و کۆنینەناس بە (پەهلەوی ئەشکانی) یا (پەهلەوی باکوری) و هەندێ جارێش بە پارتی ( = فرثی ) ناودەبەن و دەگەل زمانی مادی بە دەستەیەکیان دادەنێن .

کۆنترین ئاساری ئەم زمانە کە تا ئیستا کەوتۆتە دەست «ئەسنادێکە کە لە هەورامانی کوردستان دۆزراوەتەوە و لەسەر پێستی ئاسك نۆسراوون یەکێکیان هی ٨٨ سال پێش عیسایە کە بە خەت و زمانی یۆنانی و لە پشتەکەی چەند ووشەیەك بە خەتی پارتی نۆسراوە و تازە تر دیاردەکا ، بەلگەی دوەم ئی ٨٨ سال پێش عیسا یا ١٢ سال پاش عیسایە (بەستە بەوەی مێژۆی دێڕی یەکەم ٣٠٠ یا ٤٠٠ بخوێنێنەوە ) و هەمۆی بە پارتییە .»(٢) بەشێکی بەردەنۆسەکەی (نەرسی) پاتشای ساسانێش لە (پەیکولی) بەم زمانەیە .

زمانی پارتی زمانی ڕەسمی دەولەتی ئەشکانی بوە و بە هۆی دەستەلاتی سیاسی ماوەی ٤٧٠ سالی لە هەمۆ خاکی ئیمپڕاتۆرێتیەکەیاندا لە برەودا بوە و لە هەمۆ کەلێن و قوژبنی وولاتا بەکارهاتوە ، هەر وەکۆ باسمان کرد کۆنترین بەلگەی لە کوردستان دۆزراوەتەوە .

---

(٢) د. معین ، فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ـ ٩ «مقدمه» .

# ئەو زمانانەی ناویان ناوە

## پەهلەوی ساسانی

زمانێکی پاش ئاڵ و گۆڕبونی دەستەڵات لە ئەشکانیەکانەوە بۆ ساسانیان، وەبرەو کەوتوە ئەو زمانەیە کە زانایانی زمانەوانی بە (پەهلەوی ساسانی) یا ( پەهلەوی جنوبی ) ناودەبەن کە گویا هەر وەك (پارستی کۆن) لە دەستەی جنوبی رۆژئاوایی خێزانە زمانی ئێرانی حیساب دەکرێ .

ئەم لکەی زمانی پەهلەوی پاش ڕوخانی دەستەڵاتی ئەشکانیان (٢٢٤ پاش عیسا) بەرە بەرە جێگەی لکەکەی تری (پەهلە باکوری «ئەشکانی» = پارتی « فرثی » ) خۆی گرتوەوە و تا ٦٥١ی پاش عیسا کە (یەزدگورد) ئاخرین پاتشای ساسانی کوژراوە ، زمانی ڕەسمی بوە و بە پێچەوانەی زمانی مادی و پارسی کۆن ، یەلگەیێکی نسبتا زۆر (بەردەنوس و کتێب) بەم زمانە بەدەستەوە هەیە و« درێژترین بەردەنوسی ساسانی ، بەردەنوسی ( پەیکولی )یە لە کوردستان ، باکوری ( قەسری شیرین ) و بەدو زمانی ڕەسمی ئەو زەمانە ، زمانی پەهلەوی ئەشکانی و زمانی پەهلەوی ساسانی لە لاتەنیشتەکانی بورجێکی چوارگوشە نوسراوە ، وینەی پاتشا ( نەرسی ) لە هەر چوار تەنیشتی بورجەکە نەخش‌کراوە . بەڵام ئەم بورجە رماوە و قاعیدەکەی نەبێ هیچی لە شوێن خۆی نەماوە(٣) .

بێجگە لە بەردەنوسان ، گەلێ کتێب و نامیلکەش بە زمانی پەهلەوی ساسانی لە فەوتان ڕزگاربون و ئێستا بە دەستەوە ماوون ناوهێنانی هەموان کەلکێکی ئەوتۆی نیە ، بۆیە باسی یەکێکیان دەکەین ، ئەویش نامیلکەیێکە ناوی (کارنامەکی ئەرتەخشێری پابەکان)ە کە چۆنێتی بە پاتشایی گەیشتنی (ئەردەشێری یەکەم) بنیادنەری پاتشایەتی ساسانیان و کارەکانی باس دەکا . بۆ نمونەی زمانی پەهلەوی ساسانی پارچەیەکی دەخەینە بەر چاو:

« ساسان شوبانی پاپەك بوت و هەمغار نەپاك گوسپەندان بوت و ئەژ توخمەکی دارای‌دارایان بوت و ئەندەر دوشخقەتاییهی ئەلەکسەندەر ، نەفی فریگ نیهان‌رەویشنیە ئێستات و نەپاك کورتیبان شوبان رەفت » .

بە کوردی دەبێتە :

ساسان شوانی بابەك بۆ هەمیشە دەگەڵ مەڕان بۆ لە توخمی دارای کوری دارا بۆ لە (دەوری) پاتشایی خراپی ئەسکەندەردا ئەو ڕای‌کرد و خۆی شاردەوە و دەگەڵ شوانانی کورد ڕویشت.

لە شوێنێکی تری ئەم نامیلکەیەدا باسی شەڕی ئەردەشێر دەگەڵ کوردان دەکا و دەڵێ :

---

(٣) ئار تور کریستێنسین ، ئێران لە دەوری ساسانیاندا ، وەرگێرانی یەحیا خەشاب « عەرەبی » ، ل — ٣٧ .

« ئەپەر کاریژاری ئەرتەخشیر ئەپاك کورتان و ستۆب بۆتەنی ئەفێ . پەس ئەژ ئان وەس سپاه ، گوند زاوول ئەفێ هەمکەرت ، کاریژاری کورتانشاهی مادێك فروفت . وەس کاریژار ، خۆندێژیشنیە بۆت و سپاهی ئەرتەخشیر ستۆبیە پەتگرفت » .

ماناکەی بە کوردێ ئاوایە :

دەربارەی شەڕی ئەردەشێر دەگەڵ کوردان و مەغلۆب‌بۆنی وێ. پاشان سوپای ئازای زۆری لە (زابول) پێکەوەنا و بۆ شەڕی کوردان شای ماهێ بە ئەشتاو ڕۆی ، شەر و خوێن ڕێژیکی زۆر بۆ سوپای ئەردەشێر شکا .

ئەوانەم لە نامێلکەیێك وەرگرتوە کە نۆسەر و مێژۆزانی ئێرانی ( سەیدئەحمەدی کیسرەوێ تەورێزێ) پەهلەویەکەی و فارسییەکەشی بە خەت و ئیملای فارسێ بلاو کردۆتەوە ، وەکۆ دەزانن ڕێنۆسی فارسێ کەم و کوڕی زۆرە و تەنیا بە سەلیقە پیاو دەتوانێ ووشەیێکی فارسێ ، ڕاست بخوێنێتەوە ، جا زمانێکی مردۆی وەکۆ پەهلەوێ لەوێ بوەستێ بۆیە ناچار بۆم ووشە پەهلەویەکان لەبەر فەرهەنگەکەی دوکتۆر (فرەوشی) ساغ‌کەمەوە و بە ئیملای کوردێ بییان نۆسم ، دەمێنێتەوە سەر مانا ، من ئەوەی (کیسرەوێ)م هەروەکۆ خۆی وەرگێڕاوەتە سەر کوردێ ، بەڵام وادەردەکەوێ لە مانالێدانەوەکەیدا ووردنەبوە یا نەی‌وێستوە ووردبێ و بە ئانقەست و لەژێر پەردەی وەرگێڕانی (دەقاودەق)دا ووردە بابەتێکی لە (نص)ە پەهلەوێکەدا هەیە ، تێ‌بردوە ، ئەوانەی ئەم نۆسەرە بەناوبانگە دەناسن یا نۆسینەکانیان دیوە ، دەزانن وەختێ باس هاتە سەر (کورد) خوالێخۆش‌بۆ (کیسرەوێ) ئەوەی لە باراندا هەبۆ ، دۆ و دۆشاو تێکەڵ‌کا و هەزار شەق دە ئەمانەتی عیلمێ هەڵبدا .

وەکۆ دەزانێن لەسەر ئەو مەسەلەیە کە (ماد)ەکان باپیرانی (کورد)ی ئیمڕۆن یان نا ، مێژۆزان و زمانەوان و زانایانی کۆنینەناس بیروڕای جۆربەجۆریان هەیە و لەم سەرەتایەدا هیندێك لەم بابەتە دواوین و « جا بەو جۆرەی لەو نصە پەهلەویانەی پێشۆتر وەرمان گرت ، پیاوتێدەگا ، دانەری (کارنامەك) کە لە دوایێ چەرخی شەشەمی پاش عیسادا ژیاوە ، ماد و کوردێ بەیەك نەتەوە داناوە هەروەکۆ لەپێشدا باسمانکرد»(٤) . بەڵام کاتێ کیسرەوێ دێتە سەر (کورتان شاهی مادێك) بە ( کوردانشای‌ماهێ ) مانالێدەداتەوە ، هەروەکۆ (کوردانشا) ناوی پیاوێکی مادێ بۆبێ و بەمجۆرە لە ئیعتیراف بە یەکێتێ (کورد) و (ماد) خۆی دەپارێزی و لە قاعیدەیێکی ڕێزمان

---

(٤) مامۆستا تۆفیق وەهبێ ، ئەسلی کورد و زمانیان « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » بەرگی دوەم ، بەشی‌دوەم ، ل ـ ٥ ، ( بەشی عەرەبێ ) ، ١٩٧٤ .

که (پەهلەوی) و (کوردی) و (فارسی) هەرسێکیان تێیدا شەریکن ، بۆ ئامانجێکی دوور لە زانست ، کەلکی وەرگرتوە و ئەویش ( پێشخستنی صفەتەلە مەوصوف ) ، لە فارسیدا دەڵێن : شاهەنشاه ( شاهان شاه = شاهی شاهان = پاتشای پاتشایان) ، پیرمەرد = مەردی پیر ، شامگاه وەختی شەو . لە کوردیشدا : گەورەکچ ، سەرەژن ، کۆنەدێ ، پیرەمەڕ ، تازەبوك .

ئەگەر لە باتی (کورتان شاهی مادیك) بڵەین (شاهەنشاهی مادیك) ماناکەی بێجگە لە (پاتشای پاتشایانی مادی) نابێتە هیچ شتێکی تر ، جا کە وابی بۆ (کورتان شاهی مادیك) نەبێتە (پاتشای کوردانی مادی) کە هەر ئەمەش مانا ڕاستەکەیەتی و لەو باوەڕەش دانیم کە ( کیسرەوی ) بە سەهو چوبێ بەڵکو بە ئانقەست وای کردوە ، خوالێی خۆش بێ .

ئەوا لە خوارەوە سەر لە نوێ ئەو پارچە (پەهلەوی)یە ، بەو جۆرەی کە من تێی گەیشتوم وەردەگێڕمەوە سەر کوردی : **« لەسەر شەڕی ئەردەشێر دەگەڵ کوردان و تێشکانی وی ـ پاشان ئەو زۆر لەشکر و سەربازی لە ( زاوول ) پێکەوە ناو بۆ شەڕی پاتشای کوردانی مادی وەڕێکەوت »**(٥) .

# بەسەرهاتی زمانی پەهلەوی ئەشکانی

دەربارەی بەسەرهاتی زمانی پەهلەوی ئەشکانی بیروڕای جۆربەجۆر دەربڕاوە ، دوکتۆر معین لە سەرەتای فەرهەنگەکەیدا دەڵێ : «لەهجەکانی ئێستای ئێران هێچیان بە وەچی ڕاستەوخۆی زمانی (پارتی) حیساب ناکرێن ، لەهجەکانی ئیمڕۆی خوراسان سەرپاك لەهجەی زمانی (پارسی)ن و زمانی ئەسڵی ئەم مەڵبەندانە لەبەر هجومی خێڵاتی جیاجیا و دەسەڵاتی زمانی رەسمی دەورانی ساسانیان لەناوچوە ، بەڵام زمانی (پارتی = فرثی) لە دەوری حکومەتی ئەشکانیان و پاشانیش ، کاری دە زمانی (پارسی ناوەڕاست) کردوە و

(٥) « وەڕێکەوت »م بەرامبەر ووشەی «فروفت» هێناوە کە کیسرەوی بە ( شتافت )ی فارسی بە مانای ( بەپەلەڕۆیشت )ی داناوە ، ( شتافتەن )ی فارسی لە ( ئۆشتافتەن )ی پەهلەوی وەرگیراوە و هەر لە ( کارنامەک )دا گەلێجار دەکارکراوە ،ئێمەش لە کوردیدا ( ئەشتاو ، هەشتاو )مان هەیە کە ڕەنگە کۆنتربێ لە (ئۆشتافتەن)ی پەهلەوی ، بەڵام (فروفت)وا تێدەگەم بەروبۆی ئیملای فارسی بێ یا کیسرەوی خراپی خوێندبێتەوە چونکو مەصدەرێکی پەهلەوی ئاوا نیە و ڕێی دەچێتی ( فرەفێت ) بێ لە مەصدەری پەهلەوی ( فرەفێتەن ) بە مانای لە جموجولدا بون ، شەپۆلدان ، جاریبون ، بارین ( تە : فرە ، پفا ـ ١٦٠ ) هەر بۆیەش من ئەم ووتەیەم بە ( وەڕێکەوت ) مانا لێداوەتەوە .

نیشانەی ئەم کارتێکردنە لە زمانی فارسیی ئیمڕۆشدا دەتوانین ببینین .»(٦)

هەر بەڕاستی سەیرە ، زمانی نیزیکەی ٤٧٠ ساڵ زمانی ڕەسمیی وولاتێکی پان و بەرین بوبێ و هیچی لێ نەکەوتبێتەوە و بە جاریێ شوێنەواری کوێربوبێتەوە .

زمانی پەهلەویی ئەشکانیی وەکو باسمانکرد زمانی خێلاتی ئاریی (پارت)ە کە پاش ئەوەی گەیشتونە ئەو خاکەی ئیمڕۆ ناوی (ئێران)ە لە باکتریا (خۆراسانیگەورە)دا جێگیربون و ناوی خۆیان لە قالبیی ( پەرتهوە ــ یا ــ پەرثوە)دا بەسەر نیشتمانی تازەیاندا سەپاند تا ئەو کاتەی نۆرەیان گەیشتە سەر و بونە میراتگری دەستەلاتی یونانییەکان ، لەو قوناغەدا زمانەکەیان بە (پەهلەویی) کە ئەنجامی تطوّری ووشەی (پەرتهوە)یە ناسراوە و ئەم ناوە بەسەر زمانی ڕەسمیی ساسانییشدا سەپاوە ، لە بارەگای پاتشایانی ساسانیی دا گەورە پیاوانی دو بنەماڵەی (قارن) و (سورێن) کە بنەچەکەیان دەچوەوە سەر (پارت)ەکان نازناوی (پەهلەویی)یان هەبو .

دەلێن زمانی ڕەسمیی ساسانییەکان کە بە (پەهلەوی ساسانیی) مەشهورە لە زمانی پارسیی کون کەوتوتەوە ــ ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ساسانیی خۆیان دەچونەوە سەر هەخامەنشییان ــ کە ئەویش بە حیسابی زمانەوانانی ئیمڕۆ یەکێکە لە زمانەکانی جنوبیی خێزانە زمانی (ئێرانیی) ، لە حالێکا زمانی (پارت)ەکان لە زمانانی باکوری ڕۆژاوای ئەو خێزانە زمانە حیساب دەکرێ . لێرەدا ئەم پرسیارە دێتەپێش بۆچی هەردوکیان ناوی (پەهلەویی)یان لێنراوە ! ؟ . پرۆفسور پوورداوود فەرق و جیاوازیی بۆ ئەم دو زمانانە دانانیی و دەلێ « **پەهلەویی نو صەت ساڵ بە ڕەسمیی درێژەی کێشاوە ، یەعنی لە ٢٥٠ ساڵ پێش عیسازا دەگەڵ هاتنە سەرکاری ( ئەشکی یەکەم ) سەرۆکی خێزانی ئەشکانییان کە لە ( پارت = خوراسان ) هەلستا ، تا ٦٥١ی پاش عیتسا ( ٣١ی کوچی ) کە سالی کوژرانی ( یەزدگورد )ی سێیەم دوامین پاتشای بنەماڵەی ساسانییانە ، کە خەلکی ( فارس ) بون »(٧) .**

ئەم قسە ئەوە دەگەیێنیێ کە (پەهلەویی ساسانیی) و (پەهلەویی ئەشکانیی) ئەوەندەیان فەرق نەبوە کە دەوری دەستەلاتیان لێك جیابکرێتەوە ، لەلایێکی دیکەشەوە (یەکناو) بۆ دو زمان تەنیا وەختیێ ڕەوایە کە لەگەلێ بابەتی زمانەوانییەوە بەتایبەتی لە باری گراماتیکاوە تا رادەیێکی زۆر وەکو یەکبن . دەنا لام وا نیە هەر کارتێككردن و فڕێدانی ووشە و زاراو بۆ ناو یەکتر ، دو زمانان وا لێبکا ئەوە هەلبگرێ یەکناویان لێبنێن ، بەتایبەتیێ ئەگەر بێر لەوە

---

(٦) د. معین ، فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ــ دە «مقدمە» .

(٧) پوورداود ، « زبانها و لهجەهای ایرانی » ، بورهان ، ج ١ ، ل ــ هەشت «مقدمە» .

بکەینەوە ئەویٚ دەمیٚ ئەم کێش و پێوانە زانستییە ووردەی ئیستا هەیە ، بەدەستەوە نەبوە کە لە ئەنجامی لێکدانەوەیێکی زانستیٚ ناوی (پەهلەویٚ) بەسەر زمانی دەوری (ئەشکانیٚ) و (ساسانیٚ)دا ببڕن و تەنیا وەکیەکێکی زۆر بەرچاو لەباریٚدا هەبوە ببێتە هۆی ئەم ناولێنانە .

ئەگەر ئەوەش بێنینەوە بەرچاو کە پاتشایانی ساسانیٚ گەلیٚ لە بەردەنوسەکانیان بە دوزمانی پەهلەویٚ (ئەشکانی) و (ساسانیٚ) نوسیوە کە نەخشی (پەیکولیٚ) یەکێکیانە ، تێدەگەین کە زمانی پەهلەویٚ ئەشکانیٚ ئەوەندە لە ناو خەلکاباو بوە بۆئەوەی خەلکیٚ باش دە قسەی پاتشا بگەن بە (زمانیخۆیان) بۆی نوسیون و وەکو زمانێك ئەوەندەی ئەهمیەت هەبوە ، پاتشا شانبەشانی زمانی رەسمیٚ دەولەت پێی بنوسیٚ و بەیادگار بۆ پاش خۆی بەجێی بهێلیٚ و «... لەدوای پەهلەویٚ ئەشکانیٚ کە ساسانێکان هاتنە سەر تەختی ئێران لە خوارۆی ئێراندا ، زمانی ( فارسیٚ ـ پەرس ) لەو دەمەوە بۆ بە هەوێنێکی زمانێکی پەسەندی تر (دەستکرد)ی ئێرانیٚ کە هەمو سامانی نوسراوی ئەشکانیٚ گرتە خۆی ...»(٨) .

لە هەمو ئەوانەی باسکران ڕەنگە بتوانین ئەمانەی خوارەوە ئیستینتاج بکەین :

**١ ـ زمانی پەهلەویٚ ساسانیٚ هەر زمانی پەهلەویٚ ئەشکانیٚ بوە و بە (پارسیٚکۆن) موتوربەکراوە ، سەرەڕای ئەوەش زۆر ووشەی ئارامی تێکەڵبوە کە دەنوسران و لە خویندنەوەدا فارسیەکانیان دەخوێندرایەوە ( هوزواریش ) .**

**٢ پەهلەویٚ ساسانیٚ هەر زمانی ڕەسمیٚ و ئەدەبیٚ بارەگای پاتشایان بوە و خەلك بە زمانە ناوچەییێکانی خۆیان قسەیان کردوە .**

**٣ ـ زمانی پارسیٚ کۆن پاش ڕۆخانی ئیمپڕاتۆریێتیٚ هەخامەنشیٚ ( لە دەوری دەستەلاتی یۆنانیٚ و ئەشکانیٚ و ساسانێدا ) لە ناو خەلکی ناوچەی ئەسلیٚ خۆی (پارس) و هەندیٚ شوێنی دەرەوەی ئەو ناوچەیەش تطوری ئاسایێ خۆی درێژە پێداوە و لە دەوری ساسانێدا بە ناوی زمانی (دەریٚ) ناسراوە و « بیروڕای بلاو ئەوەیە کە پاش هاتنی عەڕەبان بۆ ئێران ، زمانی پەهلەویٚ هەندیٚ گۆڕانی بە سەردا هات و بەرە بەرە بۆ بە زمانی فارسیٚ ئێستا ، بەلام لەم دوایانەدا بیروڕایەکی تر پەیدابوە کە دەلیٚ : زمانی فارسیٚ لە دەورەکانی پێش ئیسلامێشدا ـ شان بە شانی پەهلەویٚ ـ هەبوە »(٩) .**

---

(٨) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمیٚ ، لەکوێوە دەستبکەین بە دەستوورسازیٚ ێزمانی کوردیٚ ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەندیبەکەم ، سالی ١٩٧٣ بەغدا ل ـ ١٩٨ .

(٩) د. معین ، بورهان ، ج ١ ، ل ـ بیستوحەوت (مقدمه) .

لەو قسانە بۆمان دەردەکەوێ کە پەهلەویێ ئەشکانی و ساسانی هەر ئەوەندەیان فەرق بوە کە ئێ دوەمیان هەر وەکو دوکتۆرە پاکیزە ڕەفیق حیلمی دەڵێ هەوێنێکی لە زمانی ئەسڵی ساسانیان (پارسیێ کۆن) تێکراوە ، ئەگینا هەر پەهلەویێ ئەشکانی بوە و پارسیێ کۆن ڕچەی تطوّری خۆی درێژە پێداوە و لە زەمانی ساسانیاندا بە ناوی زمانی (دەرێ) یا (پارسیێ دەرێ)یا وەکو فەرەنگی ناویان لێناوە (پارسیك) ، قسەی پێکراوە .

وەکو لە مێژوودا باسکراوە نەخشی مۆری نەوشیروان (کیسرا) ئەم ڕستەیە بوە «هەرەك ڕەوەذ چەڕەذ و هەرەك خوسپەذ خواب بینەذ» کە بە زمانی (دەرێ)یە و بە کوردێ دەبێتە : (هەر کەس بڕوا ـ بجوڵێ ـ دەڵەوەڕێ ـدەخواـ و هەر کەس بخەوێ خەونان دەبینێ) و «زمانی پارسیێ تازە یەکەمجار لە ڕۆژهەڵاتی ئێرانی ئیسلامێ بلاوبۆوە ، چونکو زمانی خەڵکی ڕۆژاوا و باکوری ئێران لە چەرخەکانی سەرەتای ئیسلاما پەهلەویێ و لەهجەی ناوچەیێ بوە »(١٠) .

ئەوا زانیمان کە زمانی (پارسیێ کۆن) لە دەوری ساسانیاندا بۆتە زمانی (دەرێ) و پاش بلاوبونەوەی ئیسلامەتێ لە قۆناغێکی تری تطوّری خۆیدا بۆتە زمانی (فارسیێ) ئیمڕۆ ، ئەدێ زمانی پەهلەویێ کە وێڕای زمانە ناوچەیێکان لە ڕۆژاوای ئێرانی سەرەتای ئیسلام قسەی پێکراوە ، چێ بەسەر هات ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە **... پەهلەویێ ئەشکانی بێ شك نەتواوەتەوە یا لە بڕ نوقمی دەریا نەبوە ... ماوە و لە کاتی ساسانیانیشدا هەر بە نرخ بوە چونکو ساسانی ئایینی ئێران و بیر و هۆشی هەمو بەو شێوەیە نوسراوە تاماوەییێکی زۆریشی دوای ئەشکانییەکان هەر پێی نوسراوە دیارە لە شێوەی ناخاوتندا هەر زندوبوە و نەفەوتاوە ...»(١١) .**

و لە دوایێدا کە دەستەڵاتی سیاسیێ ئیسلامەتێ دامەزراوە ، ئەویش وەك زمانی (دەرێ) بە قۆناغی تازەی تطوّری تەبیعی خۆیدا جمیوە و لە کوردستان بۆتە بنەمای یەکێ لە لەهجەکانی ئێستای زمانی کوردێ کە لەهجەی جنوبییە .



---

(١٠) د. معین ، بورهان ، ج ١ ، ل ـ بیست و هەشت «مقدمە» .

(١١) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمێ ، سەرچاوەکەی پێشو ، ل ـ ١٩٥ .

# زمانی کوردی

که دەڵەین زمانی کوردی ، مەبەست ئەو زمانەیە کە ئێستا کورد قسەی پێدەکەن . هەر وەکو پێشان باسمان کرد گەلێ زمـانەوان و ڕۆژهەڵاتنـاسی فەرەنگی دەگەڵ زمانی کوردی خەریك بون ، زوربەی ئەو زانایـانەی کە بـە شێوەیێکی گشتی یا تایبەتی لە زمانی کوردی دواون گوتویانە کە ئەم زمـانە لە بنەمای زمانەکانی هیندوئوروپایی و بنەماڵـەی هینـدوئێرانی و لە خێزانـە زمانی (ئێرانی)یە و دەگەڵ زمانی (فارسی) خزمایەتی نێزیکی هەیە .

جا زمانی کوردی کە ئەوە حاڵێتی چۆن پەیدابوە ؟ ئاشکرایە زمانی هەمو وولاتی زمانی دانیشتوانی وولاتـەکە دەبێ ، ئـەگەر ڕوداوەکانـی مێژویـی ئاڵوگۆڕێکی نەتەوەیییان لە وولاتەکەدا پێك نەهێنابێ ئەوا زمانەکەش هـەر زمانی دانیشتوەکانی کۆنی وولاتەکەیە و پێچەوانەی ئەمەش پێچەوانە دەبێ . جا با بزانین مەسەلەکە بۆ زمانی کوردی چۆنە ؟ .

ئەم وولاتـەی کە پێـی دەڵێن کوردستـان و نەتەوەی کوردی تێـدا دادەنیشی ، پاشماوە و ئێسکلێتی ئینسـانی دەوری قـەدیمی بەرد ( العصر الحجري القديم )ی لێ دۆزراوەتەوە و « ئەو ئێسـکلێتانەی لە ئەشـکەوتی ( شانەدەری ) دۆزراونەوە ، ئەهمیەتێکی زۆر گەورەیان هەیـە چونکو یەکەم جارە کە لە عێراق ئیسکلێتی ئینسانی ( دەوری قەدیمی بەرد ) دەدۆزرێتەوە کە ٦٠ هەزار ساڵ پێش ئێسـتا کوردسـتانی عێراقی کردوتە نیشـتمانی خۆی »(١) .

---

(١) مامۆستا تەها باقر ، چەرخەکانی پێش مێژو لە ژیاری مێسوپۆتامیادا لەبەر ڕۆشنایی پشکنینی شوێنەوارەکانی کوردستانی عێراقدا ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی یەکەم ، بەندی یەکەم ، ساڵی ١٩٧٣ ، بەغدا ، ل ٥٩١ .

شێصت هەزار ساڵ لەوەی پێش ئەو شوێنەی ئێستاناوی کوردستانە ئاوەدان بوە و دیارە خەڵکەکەشی زمانێکیان هەبوە پێی بدوێن ، بەڵام چونکو باسی ئەو زەمانە کاری زانایانی کۆنێنە ناسە ( علماء الآثار ) بۆیە بە خێرایی تێشکی هەتاو پەنجا و حەوت هەزار و دوصەت ساڵێك بەسەر باڵی زەماندا بەرەوپێش دەخوشێن و خۆمان دەگەیێنێنە ئەو دەور و زەمانەی کە خێڵاتی ( ماد ) گەیشتونە ( ئێران )ی ئێستا و ڕۆژاوای ئاسیا و توشی چەند نەتەوەیێکی خۆجێیی ( لۆللۆ ، گۆتی ،کاسی ، شوباری = خوری یا هوری ) بون کە لەو دێوە و دێوی چیای زاگرۆس ، تا ڕادەیێکی باش ژیانی خۆیان ڕێکخستبو ، دەولت و شارستانەتێکی نیمچە پێشکەوتویان هێنابوە وجود .

مادەکان لە ماوەی ۲۰۰ ساڵێکا هەمو ئەوانەیان تێکەوە پێچاوە و لە ساڵی ٦١٢ی پێش عێسا ئیمپڕاتۆرێتی گەورەی ( ماد )یان دامەزراندوە و زمانی مادی بوتە زمانی ڕەسمی . لەو ڕۆژەڕا تا ئەو کاتەی ئیسلامەتی لە کوردستان بڵاوبوتەوە سێزدە قەرنی بەینە ، لەم ماوە درێژەدا خاکی مادی گەورە و پچوك و ئەو خاکانەش کە خراونە سەر خاکی ماد لە باری عەسکەری و سیاسییەوە گەلێ دەستاو دەستی کردوە و دەستەڵاتی سیاسی کەوتوتە دەستی نەتەوە و خەڵکی جۆربەجۆر کە زمانیان دەگەڵ زمانی مادەکان لێكجیابوە و هەر دەسەڵاتێك هاتوە زمانی خۆی وەکو زمانێکی ڕەسمی بەسەر وولاتدا سەپاندوە، لە هەل و مەرجی ئەوان ڕۆژگاراندا کە هەمو بابەتەکانی کۆمەڵایەتی کاڵ و کرچ و نەمەیوبون ، ئەم دەستەڵات گۆڕکییە ناتوانێ لەسەر ئەو بابەتانە بێ تەئسیر بێ و کاریان تێ‌نەکا . مێژو گەلێ ڕوداوی وای لەبیرە کە دەستەڵاتی سیاسی لە وولاتێك بوتە هۆی گۆڕانی بنەڕەتی نەتەوایەتی ئەو شوێنە ، زمان هەر لەوێ ڕاوەستێ . شوێنەواری کارتێکردنی دەسەڵات گۆڕکێ لە ڕۆژهەڵاتی خاکی ئیمپڕاتوری ( ماد )ا ئیمڕۆ بە ئاشکرا دەبێندرێ ، بەڵام لە ڕۆژاوای ( ماد ) ئێشەکە پێچەوانەیە و نەك هەر وەکو خۆی ماوە بەڵکو دەستەڵاتی ( ماد )ان چلۆنایەتی نەتەوەیی و زمانی هەندێ شوێنی کە پاشان خراوەتە سەر خاکی ماد ، گۆڕیوە و هێناوێتە سەر ڕچەی تطوری مادی و شان بە شانی بەشەکانی ڕۆژاوای ماد تطوری پێکردون .

زوربەی مێژوزانانی بە ناوبانگ لەو باوەڕە دان کە ( کورد )ی ئیمڕۆ نەوەی (ماد)ەکانی دوێنێن« **ئەگەر کورد نەوەی مادەکان نەبن ئەدی نەتەوەییێکی وا کۆن و بەدەستەڵات چی بەسەر هات و ئەو هەمو هۆز و تیرەی کورد ، کە بە یەك زمانی ئیرانی و جیاواز لە زمانە ئیرانییەکانی دیکە قسە دەکەن ، لە کوێوە هاتون . »(۲)**

(۲) پڕوفسۆر مینۆرسکی ، کوردنەوەی میدێکانن ، وەرگێڕانی د. کەمال مەزهەر ئەحمەد ، **گۆڤاری کۆری زانیاری کورد ، بەرگی یەکەم ، بەندی یەکەم ، ساڵی ۱۹۷۳ ، بەغدا ،** ل ٥٦٣ .

ووتمان زمانی هەر وولاتێك ـ ئەگەر ڕۆداوەكانی مێژۆ نەیانگۆڕیبێ ـ زمانی دانیشـتوانی كۆنی وولاتەكەیە ، وەكۆ باسـكرا ڕۆداوەكانی مێـژۆ ، دەستەلاتی گۆركێی سێزدە قەرن نەیتوانیوە لە بەشی ڕۆژاوای ( ماد )ا شتێ بگۆڕێ و دانیشتوانی ئەم بەشەی ( مادستان )ی كۆن ئیمڕۆ كوردن كە «نەوەی مێدیكانن » ئاخو ! بێجگـە لەوەی كە بڵـەین زمانی ( كوردێ )ش لە بنەڕەتا ئەنجامی گۆڕان و گەشەكردن و پەرەسەندنی زمانی ( مادێ )یە ، شتێكی ترمان لە دەست دێ ؟ نەخێر ! چونكۆ هەمۆ بەڵگەیێكی مێژۆیی كە زانایان ـ تەنیا بۆ مەبەستی خزمەتی زانست ـ داویانەتە بەر لێكۆڵینەوە و لێكدانەوە ، تا ئێستا هەر ئەو حەقیقەتەیان ئاشكرا كردوە كە زمانی (كوردی)ئیمڕۆ بەر و بۆی تطور و تەكامولی زمانی (مادێ) دوێنێیە .

وەكۆ دەزانێن (زمان) دیاردەیێكی زیندۆی كۆمەلایەتییە ، بە پێی قانونی تایبەتی خۆی دەگۆڕێ ، گەشە دەكا و پەرەدەستێنێ و لەم ڕەوتی تەكامولەی خۆیـدا زمانانی تر كاری تێدەكەن و ئەوێش كاریان تێـدەكا و جاری واش هەڵدەكەوێ لەم ڕێگەیـەدا دەمرێ . جـا زمانی (مـادێ)ش لەم قـاعیدەیە دەرنەچوە و لە هەمۆ ئەو زمانانەی بە هۆی دەسـتەلاتی سـیاسی ، لە خاكی (ماد)ا زمانی ڕەسمی بۆن تەئسیری قبۆل كردوە و تەئسیرێشی تێكردۆن و بە زیندۆیی گەیشتوتە ئیمڕۆ .

بە تایبەتی زمانی پارتی ( فرثی = پەهلـەوی ئەشكانی ) ، كە بـە ڕای زانایانی زمان دەگەڵ زمانی مادێ لە دەستەزمانی ڕۆژاوای باكوری خێزانـە زمانی (ئێرانی) حیساب دەكرێن ، لەوانی دیكە زیاتر كاری كردۆتە سەر زمانی (مادی) و شوێنەواری ئەم كار تێكردنە ـ وەكۆ پاشان باس دەكرێ ـ ئیمڕۆ لە لەهجەی جنۆبی زمانی كوردیدا دەبێندرێ .

دەگەڵ ڕۆخانی ئیمپڕاتۆرێتی ساسانی و بڵاوبۆنەوەی ئیسـلامەتی لـە كوردستان قۆناغێكی نوێ بۆ زمانی كوردێ دەس پێدەكا ـ كە بە جیا باسـی دەكەین ـ جا ئێمە لە زمانی (مادێ) ئاخرو ئۆخری دەوری ساسانی بەڵگەیێكی نۆسراومان بە دەستەوە نیە تا بتوانێن بە ووردی ڕایەكی لەسەر دەربڕێن ، بەلام ئەمە ڕێگەی ئەوەمان لێ ناگرێ بڵەین : ئەو زمانە لەو زەمانەدا ، زمانی (مادێ) بوە كە لە چاو زمانی زەمانی دەستەلاتی ئیمپڕاتۆرێتی ( ماد ) تطورێكی ١٣٠٠ ساڵەی بەسەردا هاتوە . هەر بەو نیسبەتەی كە زمانی ( پارسی كۆن ) تطوری كردوە و بۆتە زمانی ( دەری = پارسێك ) و ئامادەیی ئەوەی پەیداكردوە زمانی ( فارسی )ئێستای لێبكەوێتەوە ، مەنتیقی سەلیم ئەوە دەسـەپێنێ كە زمانی ( مادی )ش تطوری كردبێ و ئەوەندەی گۆڕانی زمانەوانی بەسەردا هاتبێ و وەها ساكار بۆبێتەوە بۆ ئەوە دەست بدا زمانی ( كوردێ ) ئیمڕۆی لێپەیدابێ .



# زمانی کوردی پاش ئیسلام

هێشتا نیوەی یەکەمی چەرخی حەوتەمی عیسایی تەواونەبو کە دینی ئیسلام و لەشکری ئیسلام گەیشتنە ناوجەرگی ئیمپراتۆریتی ساسانی و لە ماوەی چەند سالێکا هەلیان تەکاند .

بلاوبونەوەی ئیسلامەتی لە بەشەکانی ئەو ئیمپراتۆریتیەدا ، لە هەر لایەکەوە و بە هەر بارێکدا تەماشای دەکەی ، ژیانی ماددی و رۆحی خەلکی خستۆتە دەورانێکی تازە : دەستەلاتی سیاسی پێشوی کە لەسەر بناغەی (چوارچینە) ی پڕ لە فەرق و جیاوازی دامەزرابو گۆڕیوەتەوە بە جۆرە دەستەلاتی کە لەسەر تەمەلی ( وامرهم شوری بینهم ) بنیات نراوە . دینی زەردۆشت کە (موغ)ەکان بۆ قازانجی خۆیان و دەستەلاتداران ، شێواندبویان شوێنی خۆی بۆ دینێکی تازەی خەلك ڕاکێش چۆلکرد کە عەرەبێکی (بەدەوی) وپاتشایەکی (غەسسانی) بەرامبەر یەکتر دادەنا .

لە لانی زمانیشەوە (ئاوێستا) و (ئاوێستایی) کە زیاتر لە سێزدە چەرخان بۆ تەئسیرێکی بەرچاویان لە سەر (خەلك) و (زمانی خەلك) دەکرد ، پاشەوپاش کشانەوە و ئەو ئەرکەیان بۆ (قورئان) و (زمانی قورئان) بە جێ هێشت .

دینی ئیسلام ئەرکی وای تێدابو کە دەبوایە خەلك وەکو پێویستێکی دینی جێبەجێیان بکەن و لە دینەکەی پێشویان‌دا نەبو ، بۆیە دەبو ناوی ئەم ئەرکە دینییانە لە زمانی دینی تازە وەربگرن ، هەروەك وەریان گرتوە .

زمانی دینی تازە (دەنگ)ی وای تێدابو کە لە زمانەکانی (ئێرانی)دا بەرچاو نەدەکەوت ، گومانی تێدا نیە کورد یا فارسێکی سەرەتای ئیسلامەتی

تا ماوەیێکی زۆر نەیتــوانیوە ئــەوان دەنگانە وەکۆ عەرەبێك تەلەفــوز بــکا ، فارسەکان و گەلێ نەتەوەی مسولمان ئێستاش ئەو دەنگانەیان وەکۆ خۆی بۆ ناگوترێ . بەڵام کورد دەنگی ( ض )ی لێدەرکەی ئەوانی دێکەیان بە چاکێ بۆ دێ و دەیلێین ، بە جۆرێ کە وەکۆ دەنگێکی ئەسڵی زمانی کوردیان لێهاتوە ، نەك هەر ئەوەندە و بەس بەڵکو گەلێ ووشــەی پەتێ کوردێش هەنــدێ لە دەنگەکانیان ــ ( ك ، یا گـ )ی کوردێ بە ( ق )ی عەرەبێ ــ گۆڕیوەتەوە بەو دەنگانەی کە زمانی دێنی تازە هێناونیە کوردستان .

بــە کورتێ ، بڵاوبۆنەوەی ئیســلامەتێ لە بەشــەکانی ئیمپڕاتۆرێتی ساسانێ ، تۆماری دەورانی ناوەندی تطــوری زمانەکانی ( ئێرانێ ) تێکەوە پێچاوە و تا یەك دۆ سەدە پاش ئیسلام زمانی عەرەبێ کە زمانی دێنی تازە بۆ لە جێگەی زمانی پەهلەوێ بۆ بە زمانی ڕەسمێ دەستەڵاتی سیاســێ و دێنێ و ئەدەبێ . ئەوجار دەورانی تازەی گەشەکردنی ئەم زمانانە دەست پێدەکا .

شك لەوەدا نیە کە زمانانی ناوچەیێ بەشەکانی ئەم ووڵاتە تازە مسۆڵمانە ، لە باو نەکەوتۆن چونکۆ زمانی گفتوگۆی خەڵك بۆن و تطوری خۆیان لە هەل و مەرجێکی تازەدا درێژە پێداوە .

تەفاعولی زمانە ئێرانییەکانی ئاخروئۆخری دەوری ساسانێ و سەرەتای ئیسلام و لەهجەکانیان ، لە ناو خۆیان و دەگەڵ هەل و مەرجی تازە ، لە دەوری تازەی تطوری ئەم زمانانەدا لە ڕۆژهەڵاتی ئێران ( فارسێ تازە ) و لە ڕۆژاواشی ( کوردێ ) لێکەوتۆتەوە کە هەر دۆکیان کۆمەڵێ لەهجە و بنلەهجەیان هەیە « پاش بڵاوبۆنەوەی ئیسلام ، فارسێ نوێ لەهجەیێك بۆ کە بە پێی بناغەی زۆر کۆن دەگەڵ لەهجەکانی تر تێکەڵ بۆ ، ئەو تێکەڵاوییە پێشــان زەمانی ساسانییەکانیش ، ڕۆی دابۆ »(١) فارسەکان زۆتر لە کوردان کەوتنە خۆ و زمانەکەیان بۆژاندەوە و دەستیان بەنۆسێنکرد ، وادیارە کتێبی ( شانامەی ئەبومەنســۆرێ ) کە خۆی لە ناوچوە و تەنیا ســەرەتاکەی بە دەســتەوە ماوە ، ئەگەر یەکەم کتێب نەبێ ، کۆنترێن کتێبێکە بە زمانی فارســێ تازە نۆسراوە ( ساڵی٣٤٦ی کۆچێ ٩٦٧ی عیسایێ ) و لە فەوتان رزگاربوە .

کۆنترێن بەڵگەی نۆســراوی کوردێ لە دەوری تازەدا چوارێنەکانی ( بابا تاپەری عوریان )ە(٢) کە لە سەرەتای چەرخی یازدەهەمی عێسایێ لە ( هەمەدان )ی ئێستا ــ هەنگمتەنای پاتەختی مادەکان ــ بە لەهجەی جنۆبێ داناوون .

---

(١) د. معێن ، بورهان ، ج ١ ، ل ــ ٢٥ و ٢٦ .

(٢) بۆن و مردنی (بابا) بەڕاستی نەزانراوە ، هەندێ نۆسێویانە لە ساڵی (٤١٠)ی کۆچێ مردوە و هەندێکێش دەڵێن (توغرولشای سەلجوقی) لە ٤٤٥ی کۆچێ لە هەمەدان چاوی پێکەوتوە .

بەنیازی نێزیك کردنەوەیان لە فارسی ، گەلی دەسکاری ئەم چوارێنانە کراوە ، بەلأم هیچ گومانی تێدا نیە کە ( بابا ) چوارێنەکانی خۆی بە شێوەی ئەو چوارێنە فولکلۆرییانەی کە لەو سەردەمەدا بە ناوی ( فەهلەوی = پەهلەوی ) ناسراوون ، گوتوە .

بۆ ئەوەی بزانین ( فەهلەوی ) چ بوە گوێ لە دوکتۆر معین دەگرین کە دەلێ : « فەهلەویەمعر : پەهلەوی) ... ٣- شیعرێکی بە یەکێ لە زمانە ناوچەییەکانی ئێران (بێجگە لە زمانی ئەدەبی و ڕەسمی) لەسەر وەزنێك لە وەزنەکانی عرۆز یا وەزنی هیجایی دانرابێ و بەشێکیان لە قالبی (دۆبەیتی)دان(٣) .

فەهلەوی یا فەهلەویات بە هەوای تایبەتی وەکو گۆرانی خوێندراونەوە و ئەو هەوایە جاروبار هەر ( پەهلەوی ) و هەندێ جاریش ( ئۆرامە ، ئۆرامەن و ئۆرامەنان )یان پێگوتوە و « ئۆرامەن ( ئۆرامەنان ) هەوایەکی کۆنی مۆسیقایە وەکو بەحری (هزجی‌مسدس) دەچێ ، فەهلەویاتیان پێ دەکوت»(٤) .

ڕەنگە زۆر خۆماندوکردنی پێ نەوێ بۆ ئەوەی بزانین ( ئۆرامەنان ) شێوەی فارسی (هۆرامەنان)ی کوردییە و دەگەڵ ووشەی (هەورامان)یەکن
هۆرامەنان ، هۆرئامانان [ هۆر + ئامان ( هاتن ) + ٢- ئان/٢ ]
کاتی خورهەلأت . هەروەکو دەڵەین : بەیانان ، ئێواران ، ....
وەکو دەزانین کاتی خۆرهەلأت تا نیوەڕۆ ، یەکێك بوە لەو پێنج کاتەی ( زەڕدوشت ) دایناوە بۆ عیبادەت و دوعای تایبەتی خۆی هەیە کە ئەمەی خوارەوە پارچەیەکێتی و چەند جار دوپاتە دەکرێتەوە .

« نمۆ هڤەرە خشەئیتە ئۆرڤەد ئەسپائی »(٥) مانای دەبێتە نمێژ بۆ هۆر ( خۆر ، هەتاو )ی دەدرەوشێتەوە ئەسپ تیژ ( خۆش ڕۆ ، خۆش بەز )ە .

بێ گومان ئەم دوعایەش وەکو هەمو عیبادەتی زەڕدوشتیان ، بە هەوایەکی تایبەتی ، جا یا بە دەنگی بلیند یا بە ( زەمزەمە ) خوێندراوەتەوە و دەشێ خەڵك پێیان‌گوتبێ نوێژ یا عیبادەتی ( هۆرئامانان ) و ئاشکرایە کە پاش بلأوبونەوەی ئیسلامەتی ( دوعا ) و ( عیبادەت )ەکە هەر دوکیان لە باو کەوتون ، بەلأم ( هەوا ) کە لە ناو خەڵکا هەر ماوە و کەم‌کەمە بۆتە هەوای گۆرانی و ( فەهلەویات ) یان پێ‌کوتوە ، بە لای منەوە ( هۆرە ) کە ئێستا یەکێکە لە هەواکانی گۆرانی کوردی ، هەر ( هۆرئامانان )ەکەیە کە بەشێك لە ناوەکەی پاراستوە و ، وەك ( ئەڵلاوەیسی ) بە تەواوی ناوی نەگۆڕاوە .

---

(٣) د. معین ، فەرهەنگ ، ج ٢ ، ل ــ ٢٥٨٨ .

(٤) د. معین ، فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ــ ٤٠٠ .

(٥) مۆبەد ئەردەشیر ئازەرگوشەسپ ، ووردەئاویستا ، (چاپی ڕاستی) ، تاران ل ــ ٤ و ١٧ .

له لەهجەکانی تری زمانی کوردیٚ نوێ تا چەرخەکانی ١٧ و ١٨ شتێکی نوسراومان بە دەستەوە نیە و هەرچیٚ هەیە ( فۆلکۆر )ە کەوێرای تێپەڕینی ڕۆژگار و بە سەر دەم و زارانەوە گەلیٚ گۆڕانی بەسەردا دیٚ وڕەنگی ئەسلیٚ دەشۆرێتەوە و ڕەنگی زەمانێکی معینی لێدەدریٚ ، ئەویٚ کە لە کەرەستەی فۆلکۆریٚ نەتەوەیێکدا نەگۆڕیٚ ( جەوهەر )ە و تا ئەو ڕۆژەی دەخرێتە سەر کاغەز ( شکلّ )ی لە گۆڕانێکی دایمیدایە . جا بۆیە فۆلکلۆری کوردیش لە بارەی لەهجەکانی تری زمانی کوردیٚ لە چەرخەکانی سەرەتای ئیسلاما هیچ شتێکمان بەدەستەوە نادات .

ئەم وەزعەی زمانی کوردیٚ ئەنجامی گەلیٚ هۆی سیاسیٚ و کۆمەلاّیەتیٚ و دینییە و ئەویٚ دوایی بە لای منەوە لە هەموان کاریگەر تر بوە ، چونکو پاش بلاّوبونەوەی ئیسلامەتیٚ لە کوردستان ، کورد ئەوەندەیان دلّ بە دینی تازە خۆش بوە کە زانایانی کورد هەمو توانستی خۆیان بۆ تێگەیشتن و تێگەیاندن، بۆ گەشەپێکردن و پەرەپێدانی دینی ئیسلام تەرخان کردوە و هەمو شتێکی تریان بە لاوە ناوە ، دیارە ئەمەش گەلیٚ ئەنگێزەی بە تەووژمیٚ هەبوە کە لێدوان و لێکۆلّینەوەیان ئەرکی مێژوزانانە .

ووتمان چوارینەکانی (بابا) کۆنترین بەلگەی نوسراوی کوردییە کە بەدەستەوە ماوە ، بەلاّم بۆ ئەو ئاسارەی لەناوچون ووتەیێکی دوکتور عبدالحلیم منتصر دەخەینە بەرچاو .

دوکتور لە ژمارە ٢٠٠ی مانگی تەموزی سالّی ١٩٧٥ی گۆڤاری «العربی» چاپی کوێتدا ووتارێکی بەناوی «ابن‌وحشیة و کتابه في الفلاحة و هو أقدم الکتب في العربیة » نوسیوە دەلیٚ : « ... و انه نقل أکثر کتبه من اللغة النبطیة ، ولم ینشر من تألیفه في اللغة العربیة سوی « شوق المستهام في معرفة رموز الأقلام » وقد ذکر في آخر کتابه هذا انه ترجم من اللغة الکردیة ، کتاباً في علل المیاه و کیفیة استخراجها و استنباطها من الأراضي المجهولة الاصل » .

مامۆستا (گیوی موکریانی)ش لە فەرهەنگی مەهاباددا (ل ٧٧١ و ٧٧٢) ئەم باسەی درێژتر بەیانکردوە و بە پێی نوسینی ئەوان (ابن‌وحشیە) کتێبی (شوق المستهام ... )ی لە ٢٤١ی کۆچیدا نوسیوە ، دیارە کە لەدوایی ئەمکتێبەیدا باسی وەرگێڕانی کتێبێکی کوردیٚ دەکا ، ئەمکاری دەکەوێتە پێش نوسینی ( شوق المستهام ) و کتێبیٚ لە سالاّنی سەرەتای چەرخی سێیەمدا بەدەست خەلکەوە بوبیٚ هیچ نەبیٚ دەبیٚ چەندسالیٚ بەسەردانانیدا تێپەڕیبیٚ بویە ئەمکتێبە کوردییەی ( با ناوی لیٚبنێین ئاونامە ) کە (ابن‌وحشیە) کردویە بەعەرەبی بەلانی کەمەوە دەبی لە سالانی دوایی چەرخی دوەمدا داندرابیٚ .



# لەهجەکانی زمانی کوردی

« عامیلێکی بنجی هەیە کە پیاو سەری لێی سوڕدەمێنێ و یەکێتی کۆنی کوردان پێشاندەدا ، ئەویش زمانەکەیانە کە چەندێ لەهجەکانی فەرقیان هەبێ هێشتا لەباری دەنگ و ڕێزمانەوە یەکزمانە و زمانێکی ئێرانییە ، ئەگەرچی تا ئەندازەیەك دەگەڵ زمانی گەورەی ئێرانی فەرقی هەیە »(١) .

بەڵێ ! زمانی کوردی لەهجەی جۆربەجۆری هەیە ، ئەو لەهجانەش دەگەڵ یەك فەرقیان هەیە . بەڵام وەنەبێ زمانی کوردی بەم حاڵەیەوە (هەبونی لەهجەی جۆربەجۆر ) لە زمانانی تری دنیا تاقبوبێتەوە . ئەو کەسانەی سەروکاریان دەگەڵ زمانان و زمانەوانی هەیە ، زۆرچاك دەزانن کە تەنانەت پێشکەوتوترین زمانەکانی دنیاش لەهجەیان هەیە .

نێزیکترین زمان لە کوردی فارسییە داخوا لەهجەی لێبڕاوە ؟ دوکتور معێن دەسەرەتایەکیدا کە بۆ قاموسی (بوڕهانی قاتیع)ی نوسیوە زیاتر لە پەنجا لەهجەی حیساب کردوە(٢) ئەو ئینگلیسییەی کە لە (لەندەن) و (وێلز) و ( سکۆتلاند ) قسەی پێدەکەن دەگەڵ یەك ئەوەندەیان فەرق هەیە کە ئەوانەی لەلاوە فێری ئینگلیسی بون تۆشی سەرەگێژەبکا .

هەبونی لەهجە ، ئەگەر لە زمانانیترا دیاردەیێکی تەبیعی بێ ، لە زمانی کوردیدا ئەم تەبیعی بونە دەگاتە لوتکەی هەرەبەرز ، چونکو گەلێ زمانی وا هەن

---

(١) پروفیسور مینوڕسکی ، سەرچاوەکەی پێشو ، ل ــ ٥٦٣ .

(٢) د. معێن ، بورهان ، ج ١ ، ل ٣٧ ــ ٤١ .

به ڕاستەوچەپەدا خۆمانە و بێگانە خزمەتیان کردوە و دەیکەن و هێشتــاش فەرقی لەهجەیان لێنەبڕاوە ، ئیتر دەبێ چاوەڕوانی چیبێن کە زمانی کوردێ، بەم هەمۆ بێخزمەتییەوە ، حاڵی لەوەی باشتربێ کە ئێستا هەیەتی .

لەهجە ، لە زماناندا بەروبـوی گەلێ هۆیـانە کە هیندێکیـان ڕەنگە بە کۆششتی ئینسان لەناوبچن ، بەڵام هیندێکیان ، بەلای منەوە لە هەل و مەرجی ئێستا و دوارۆژێکی نێزیکیشا ، لەوانە نێن قورسایێ خۆیان لەسەر زمانەکەمان لابدەن، لەوەش زیاتر ، دەتوانم بڵێم نەك هەر زمانی کوردێ بەڵکو پێشکەوتەترین زمانی زیندوی سەر زەویێ ، ئەوەی لە باراندا نیە کە خۆی لە هەبۆنی (لەهجە) ڕزگارکات . من ئەو قسانەم نەدەکرد ئەگەر گوێم لێنەبا هەندێ خوێندەواری کورد ، وەکو عەیبێکی گەورە و کەمایەسـێکی دە تۆلەکردنەوە نـایەت ، لـە لەهجەکانی زمانەکەمان دەدوێن .

لەناوبردنی لەهجەکانی زمانەکەمان ئەوکارە نیە کە وەکو پێویســتێکی نەتەوایەتێ لەبەردەمی زانایان و خوێندەوارانی کورد خۆڕادەنێ ، بەڵکو ئەوەی وەکو پێویست ، ئەوێش پێویستێکی گەورە و ئەرکێکی گران ، خۆی دەنوێنێ هێنانە وجودی زمانێکی یەکگرتوی نوسێنە ، کە هەروەکو لە شوێنێکی تری ئەم پێشەکیەدا ئیشارەمان بۆ کرد لە سەرەتای ئەم چەرخەوە تائێستا ، بـە تایبەتێ لە کوردستانی عێراق ، هەنگاوی باشی بەرەوپێش هەڵهێناوەتەوە و د امەزرانی دەزگای جۆربەجۆری زانستێ بۆ زمـانی کوردێ لە کوردســتانی عێراق ، چاوەڕوانی گەلێ خزمەتیان لێدەکرێ ، کە لە پێناوی جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە نەتەوایەتییە دەبێ بێکەن .

ئەم لاباسە لێرە دەبڕمەوە و دەگەڕێمەوە . سەر ئەسڵی مەبەست کـە باسی لەهجەکانی زمانی کوردیە . ووتمان زمانی کوردێ لەهجەی جیاجیای هەیە ، پەیدابۆنی ئەم لەهجانە وەکو ئێ هەمۆ زمانێکی تر ، گەلێ هۆی هەیـە کە باس‌کردنیان بۆ ئێرە دەست نادا ، تەنیا هۆیەکە کە بە لای منەوە کارێـکی گەورەی لە پەیدابۆنی لەهجەکاندا کردوە و لەوانەیە کە زمانانی‌تر ئەوەیان هەر نەبۆبێ یا کارێکی ئەوتۆی نەکردبێتە سەریان ، بۆیە هەر باسی ئەم هۆیەیـان دەکەم ، بەڵام جارێ بابزانین لەهجەکانی زمانی کوردێ کامانەن ، پاشان دەچینە سەر باسی هۆی پەیدابۆنیان .

دەربارەی لەهجەکانی زمانی کوردێ گەلێ قسەکراوە و هـەر کەسـە بەجۆرێ بەرەنگاری ئەم مەسەلەیە بوە و بەلای منەوە بەشی زۆری ئەو قسانەی کە تا ئێستا لەسەر لەهجەکانی زمانی کوردێ کراون لەژێر تەئسیری بیـرو لێکدانـەوەی ڕۆژهەڵاتنـاسانی فەڕەنگیدابوە و « **ئـەوەی لە گشـت لیکۆڵینـەوە و کۆششتی بێپسانەوەی زانایانی ئوڕوپایێ دێتە دەست ئەوەیە کە کارێکی گشتێ لەسەر هەمـۆ**

**لەهجەکانی کوردیّ پێویستە کە تا ئێستا نەکرابوّ ، چونکوّ ئەو دەستە زانایانە زوّریان لێ دەرەوە بوّن و سەرەڕای ئەوەی زوّرێش تێدەکوّشان ، بە گیانی زمان و ئاهەنگی ڕاستی ووشە و تەلەفوزی دروستیان ئاشنا نەبوّن و بە چاکێ سەرەودەریان لێنەدەکرد و هەروەها بوّ لێکوّلێنەوەی لەهجەیەك هەندێ گوّشەیان دەگرت و لێی ووردەدەبوّنەوە و لایەنەکانی تریـان بەلاوە دەنـا ، یاخـوّ ئەوەی دەربارەی ئەو لەهجانە بە زەینیـاندا دەهات دەیتوانی تەنیـا لانێکی ئەو لەهجانە بگرێتەوە ، جا بوّیە کارەکانیان زوّرجاران ناتەواوبوّ ، هەندێجار ڕێی لە ئینسان دەگـوّڕێ و گەلـێ جـارێش ئینسانی توّشی سەرەگێژە دەکرد بەلاّم ئینکاری ئەوە ناکرێ کە ڕەووشتی لێکوّلێنەوە و شێوەی کاری ئەوان ڕەووشتێکی پەسند و بەرز بوە ، ئەگەر ئەهلی زمانەکە ڕەووشتی ئەوانیان ڕەچاوکردبا ئەو نەتیجەی وەردەگیرا هەزاران کەڕەت زوّرتر دەبوّ ))(٣) .**

دوکتوّر موکریّ نیشانەکەی پاش پێکاوە ، ئەگەر لێزانانی کورد بەشێوەی کاری فەڕەنگیان بێنە مەیدان و لە لەهجەکانی زمانی کوردیّ یا هەر بابەتێکی دیکەی زمان بکوّڵنەوە ، بە مەرجێ خوّیان لە تەئسـیری بیروڕای زانـایانی فەڕەنگیّ ڕزگار کەن و دەست کەن بە لێکوّڵینەوەیێکی (مەیدانیّ) دەگەنە ئەنجامی وەها ، کە زوّری بەسەر ئەو ئەنجامانەدا هەبێ زانایانی فەڕەنگی بەدەستیان هێناوە ، ئەگەر جێگاکە مناسب‌با گەلێ لەو شتـانەم بـاس‌دەکرد کە ڕەنـگە هەریەکەیان لەوانە بێ زاناترین ڕوّژهەلاّتناس بە هەڵە بەرێ و بێ‌ئەوەی هێچ نیازێکی خراپی هەبێ بێگەیێنێتە نەتیجەی غەڵەت .

ئینجا با بزانین لەهجەکانی زمانی کوردیّ چێن ؟ . ئەگەر سەرنجێك لـە مەڵبەندی دەستەلاّت و فەرمانڕەوایی زمانی کوردیّ بدەین ، لە باری شێوەی قسەکردنەوە سێ ناوچەی لێك‌جیاوازمان دەکەوێتە بەرچاو .

١ ـ لە کەنارەی ڕوّژاوای گوّلی وورمێ‌ڕا ، دەق لەو شوێنەڕا کە ناوچەی (دزەی‌دوّلێ) و (سندوّس) لێك‌جیادەبنەوە ، بە خەیاڵ خەتێك دەس‌پێدەکەین و بە پشت (شنوّ) یەیدا تێدەپەڕێنێن و دەیهێنێتنە باکوّری (ڕەواندز)یّ و هەروا بەرەو ڕوّژاوا تا دەگاتە (ئاکرێ) و (دهوّك) و (زاخوّ) و (شەنگار) و بە نێـوان (قامێشلێ) و (حەسەکە)دا دەربـازی دەکەیـن بوّ جنـوبی (دەربـاسییە) ، (راس‌العێن) و دەیگەیێنێنە (عفرێن) و (چیای کورمانجا) .

٢ ـ هەروەها بە خەیاڵ خەتێك لە مەڵبەندی ڕوّژاوای (هـەمەدان)ەوە هەڵدەگرێن و بە باکوّری مەڵبەندی (کرماشان)دا دەربازی دەکەین تا دەگاتەوە ڕوّباری (دەجلە) .

ئەم دوّ خەتە خەیاڵییە هەموّ ئەو مەڵبەندەی بە زمانی کوردیّ قسـەی

---

(٣) د. محەممەدی موکریّ ، گوّرانیّ یا ترانەهای کوردیّ ، تاران ، کتێبخانەی دانش ، ١٩٥٧ ، ل ٨ .

تێدا دەکرێ دەکاتە سێ بەش ، کە لە هەربەشەیاندا لەهجەیێکی سەرەکی زمانی کوردی زاڵە :

۱ ـ **لەهجەی باکوری** ـ دەکەوێتە باکوری خەتی یەکەم، ئەو بن لەهجانەی تێدا بەدیدەکرێ : هەرکی ، شکاکی ، جەلالی ( بایەزیدی ) ، هەکاری ، بۆتی جزیری ، عفرینی ، دومبلی ، بادینی ، ...

۲ ـ **لەهجەی ناوەندی** ـ دەکەوێتە جنوبی خەتی یەکەم و باکوری خەتی دوەم و بە غەلەتێکی مەشهور پێی دەڵێن لەهجەی سۆرانی ، کە ئەوی راست بێ (سۆرانی) بن لەهجەیێکی لەهجەی ناوەندیە . لەم مەلبەندەدا ئەو بن لەهجانە هەن : موکریانی، سۆرانی، سلەیمانی، شوانی، جافی، سنەیی، گەرۆسی، ..

۳ ـ **لەهجەی جنوبی** ـ لە جنوبی خەتی دوەم لەهجەی جنوبی زمانی کوردی زاڵە کە ئەم بن لەهجانەی تێدا بەدیدەکرێ : کرماشانی ، کەلوڕی ، کولیایی پێرەوەندی ، لەکی و لوڕی ...

(لوڕی) دەکەوێتە بەشی هەرە خوارۆی مەلبەندی زمانی کوردی ، دەربارەی ئەم بن لەهجەیە هەرکەسەی هاتوە قسەیێکی کردوە ، شەرەفخانی بتلیسی لە ( شەرەفنامە )دا بە یەکێك لە چوار لەهجەی گەورەی زمانی کوردی دادەنێ ، هیندێك زاناو ڕۆژهەلاتناسی فەڕەنگی و ئێرانی بە لەهجەیێکی زمانی فارسییان داوەتە قەڵەم ، دوکتور کەمال فوئاد ڕایەکی تری هەیە و دەڵێ : « ... لە ڕوی ڕێزمانەوە (لوڕی) بە زمانێکی (ئێرانی باشوری ـ ڕۆژاوایی) دائەنرێت ، بەلام فارسی نیە ، بەلکو زمانێکی سەربەخۆیە ، بەشی یەکەمیان (بەختیاری) وەکو لە ڕوی زمانەوە (کوردی) نیە خۆشیان لە ڕوی نەتەوەییەوە بە کورد نازانن ، بەلام دوەمیان ، بەتایبەتی لە عێراق ، لەبەر گەلێك هوی مێژوی و سیاسی و ئابوری لە ڕوی نەتەوەییەوە لە کورد جیاناکرێنەوە ، هەتا لە ڕوی زمانەوە لە ئەنجامی تێکەلاوبونەوە زۆریان لە (کوردی ڕۆژهەلاتی ) وەرگرتوە . »(٤)

ئەم مەسەلەیەی (لوڕی) کوردیە یا کوردی نیە ، مەسەلەیێکە پێویستی بە لێکۆلینەوەی زانستی ، دوڕ لە هەست و عاتیفەی نەتەوایەتی و دوڕ لە تەئسیری قسە و ناوبانگی فلانە ڕۆژهەلاتناسی فەڕەنگی یا زانای غەیرە فەڕەنگی هەیە ، لێکۆلینەوەیێکی کە کوردایەتی کوێرانە دۆ و دۆشاو تێکەل نەکاو هەر بە وێکچونی چەند وشەیێکی کوردی و لوڕی ، لوڕی نەکا بە کوردی . لێکۆلینەوەیێکی واش کە هەر لەبەر ئەوەی چەند وشە یا شێوەی

---

(٤) د. کەمال فوئاد ، زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نوسینیان ، (گوڤاری زانیاری)، ژمارە ٤ ، بەغدا ١٩٧١ ، ل ـ ٢٢ .

بەکارهێنانی هەندی فیعل دەگەڵ فارسی دەشوبهێنە یەك یا فلآنە ڕۆژهەڵاتناس و زمانەوان ، وای کوتوە ، نەکرێ بە ڕایەکی وا قایم و پتەو کە دەهەڵوەشانەوە نەیێت و (لوڕی) لە کوردی دابپچڕێ ، بە کورتی و بە کوردی ئەم مەسەلەیە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیێکی مەیدانی هەیە و تا ئەوکاتە بەلای منەوە (لوڕی) هەر لە کوردی نێزیکترە تا فارسی ، پێویستە ئەوەش بڵێم کە مەبەستی من لێرەدا ئەو بەشەی (لوڕی) نیە کە (لوڕی پچوك) قسەی پێدەکەن و بە لەهجەی (فەیلی) مەشهوورە ، چونکو ئەمەیان جێی ئەوەی تێدا نابێتەوە کە سێ و دوێ لێ بکرێ ، بە ئاشکرا بە بەرچاوی خۆمانەوە (فەیلی) بە کوردی قسەدەکەن و خۆشیان بە کورد دەزانن ، بەڵکو لەوەش زیاتر هەر خۆیان بە کورد دەزانن و هەموو کوردی تر یا بە (جاف) یا بە (لەك) دادەنێن . پرسیاری « کوردێکی یا جافێکی» ، ووتەی «یە جافێکە و دویم دێرێ» و لاتاوی «لە کەتڕن» ڕێگای هەموو شك و دوودڵییەك لەم بابەتە ، دەبڕنەوە .

ئەوەش هەر ڕاست نیە کە «لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونەوە زۆریان لە (کوردی ڕۆژهەڵاتی ) وەرگرتوە »(٥) . لوڕ بە کچ دەڵێن «دوێت» و بە منداڵ «زارۆڵە»، لە کرمانجی یا لەهجەی باکوریدا «دۆت» و «زارۆ»یە ، خۆ هیچ پێویست بەوە ناکا بەڵگە بهێنینەوە کە لوڕێکی لە پشتکۆی لوڕستان دەژی ــ نەك فەیلی کە لە بەغدا زۆرن ــ لەوانەیە بابەڵبابێتیشی کوردێکی زاخۆیی بەچاو نەدیتبێ تا (دۆت و زارۆ)ی لێ وەربگرێ ، مەعلوومە پێچەوانەی ئەوەش هەر ڕاستە .

بەڵێ ! کە دەڵێم تا ئەو ڕۆژەی لێکۆڵینەوەیێکی (مەیدانی) ــ دوور لە هەست و عاتیفە و دوور لە ئامانجی کە پێوەندی دەگەڵ زمانەوانی نەبێ ــ مەسەلەکە ڕۆشن دەکاتەوە من لوڕی هەر لە کوردی نێزیکتر دەزانم ، وەکو لە پێشدا ووتم مەبەستم لوڕی پچووك نیە ، بەڵکو لوڕی گەورەیە ، لوڕی بەختیارییە .

دوکتور معین لە پێشەکییەکدا کە بۆ قاموسی (بورهانی قاتیع)ی نووسیوە ، وەکو لەهجەیێکی زمانی فارسی لە (لوڕی) دواوە و ئاوا دەڵێ :

**«٢١ ــ لوڕی ، لە لوڕستان و ئەویش شامیلی گەلی بن لەهجەیە و (بەختیاری) دەگەڵ وی خزمایەتی هەیە »**(٦) . هەر لە پێش ئەوەدا لە لاپەڕەی ٣٧ی پێشەکییەکەیدا دەڵێ :

**«بێجگە لە زمانەکانی ئێرانی کە لە دوو ووتاری پێشوودا باسیان‌کرا ، کۆمەڵێ (نیوەزمان) هەن کە پێیان دەڵێن لەهجەی ئێرانی ، ئەغلەبەی لەهجە ئێرانییەکان تا ئێستا لە قەڵەمڕەوی خۆیاندا**

---

(٥) د. کەمال فوئاد ، سەرچاوەی پێشوو .

(٦) د. معین ، بورهانی قاتیع ، «مقدمه» ، ل ــ سی‌ونۆ .

**ماون و قسەیان پێدەکرێ ، هۆی مانەوەی ئەم لەهجانە ئەوەیە ، ئەوانەی پێیان دەدوێن زۆریان دڵ پێیانەوەیە و دوورێشن لە تێکەڵاوێ و هەستان و ڕۆنیشتن دەگەڵ خەڵکی شارەکان و خوێندەوارێ فارسیشیان نیە ... » .**

کەوابێ ! لوڕێ و بەختیارێ پێکەوە خزمن و نێوەزمانی ئێرانێن و خەڵکیش قسەیان پێدەکەن چونکێ فارسێ نازانن ، ئەمە پێمان دەڵێ کە ئەم نێوەزمانانە فارسێ نێن ، جا کە (بەختیارێ) فارسێ نەبێ و خزمی (لوڕێ)ش بێ — بە شایەدێ زانایەکی بەناوبانگی (فارس) — (لوڕێ)ش خۆی کوردێ بێ ، هێچ ڕێگایەك نامێنێتەوە کە بە شێوەیێکی دوور لە زانست یا بۆ مەبەستێ کە هێچ پێوەندێ بەسەر زانستەوە نیە ، زمانی (بەختیارێ) لە کوردێ دابپچرن ، سەرەڕای ئەوەش من بڕیاری دوایێ هەر بۆ لێکۆڵینەوەی (مەیدانێ) دوور لە هەست و عاتیفەی نەتەوایەتێ و دوور لە ئامانج و مەبەستی نازانستێ ، بەجێدەهێڵم و ئەم باسە بە ووتەیێکی مامۆستا (عەلێ سەیدۆ گۆرانێ) دەبڕمەوە کە لە ئەنسێکلۆپێدیای تورکێ وەرگرتوە و دەڵێ : **« هیندێك زانایانی زمان ڕایان وایە کە (لوڕێ) دەگەڵ (بەختیارێ) ، دەکرێ بە لەهجەیێك لە لەهجەکانی کوردێ دابنرێن و ئەوان زۆر نێزیکن لە کۆمەڵە (کوردێ) جنۆبێ »(٧) .**



من دە پازدە ساڵێك دەبێ بیر لە مەڵبەندی لەهجەکانی کوردێ دەکەمەوە و گەیشتۆمە ئەو ئەنجامەی کە لەسەرەوە باس‌کرا و بە تەئکیدەوە دەڵێم لەم‌بابەتەوە هێچ‌شتێکم نەخوێندبۆوە تا ئەم دوایانە کە ووتاری «ئەسڵی‌کوردوزمانیان» ی مامۆستای‌مەزن ( تۆفیق وەهبی )م لە گۆڤاری کۆڕی زانیاریدا خوێندەوە ، دەڵێ : یەکەم جار ئەوان مەڵبەندی لەهجەکانیان دیارێ کردوە .

مێژۆ گەلێ ڕۆداوی وای لەبێرە دۆ کەس لە دۆ شوێنی دوور لە یەکتر لە مەسەلەیێکدا گەیشتۆنە یەك نەتیجە ، یا یەك شتیان ئیختیڕاع کردوە ، سەرەرای ئەوەش دەڵێم « فضل شاگرد هنرمند باستاد رسد » .

---

(٧) عەلێ سەیدۆ گۆرانێ ، لوڕ و لوڕستان ، «گۆڤاری کۆری زانیاری کورد» ، بەرگی ٢ ، بەشی ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١١٢ (عەرەبێ) .

# لەهجەکانی کوردی چۆن پەیدابون ؟

ئەودەمەی (کورش)ی پارسی لە سالی ٥٥٩ی پێش عێسادا دەستەلاتی ئیمپراتۆرێتی (ماد)ی تێکەوە پێچا و ئیمپراتۆرێتی (هەخامەنشی) دامەزراند خێلاتی مادی ئەوەندەی بڕیان کردبو ، بەرەو ڕۆژاوا و باکوری ڕۆژاوا ئاژۆتبویان و سنوری ڕۆژاوای دەستەلاتی (ماد) لە سنوری (سارد) و (لیدی) و (بابل) دەگەڕایەوە ، کە لە مەرکەزی دەستەلات و پاتەختی ئیمپراتوری (ماد) یەعنی ئەو جێگەیەی ئێستا پێی‌دەلێن (هەمەدان) گەلی دور کەوتبۆوە .

گومانی تێدا نیە ، لە جەنگەی توانایی حکومەتی (مادی)دا ، زمانی (ماد)یش وەکو زمانێکی ڕەسمی ، کەم و زۆر دەزمانی خەلکەکانی وولاتی پان و بەرینی (ماد)ا کاریگەر بوە ، بەلای منەوە ئەو کارتێکردنە ناتوانی دەگەل دور و نێزیکی زمانانی کارتێکراو لە مەرکەزی دەستەلاتی ڕەسمیدا متناسب نەبێ . ئالەم قۆناغەدا تەئسیری زمانی مادی لەسەر زمانی خەلکی (پارس) زورتر بوە تا زمانی مەلبەندەکانی هاوسنور دەگەل (سارد) و (لیدی) و ... هەر ئەم چلونایەتییە بەنیسبەت زمانی پارسی کون (هەخامەنشی) و پەهلەوی (فرثی : زمانی ئەشکانیان) و هەروەها ئەوەی پێی دەلێن (پەهلەوی ساسانی)ش هەر ڕاستە ، وەکو لە شوێنیکی تری ئەم پێشەکییەدا باسمان‌کرد ، ئەمانە زمانی ڕەسمی و ئیداری بون نەك زمانی قسەکردنی هەمو خەلکی مەلبەندەکانی ئەو دەولەتانە ، سەرەڕای ئەم ڕاستیەش ناتوانین بلەین ئەم زمانانە کە یەك بەدوای یەکدا زمانی ڕەسمی حکومەتانی بون کە هەر یەکیان میراتگری هی پێش‌خۆی بوە و دەستەلاتی بەسەر شوێنەواری دەستەلاتی پێش‌خۆیدا کێشاوە ، ناتوانین بلەین ئەو زمانانە لەسەر زمانانی کە خەلك قسەیان پێکردوە ، بێ‌تەئسیر بون ، بەلام ئەم تەئسیرە چۆن و چەند بوە ؟ و لە پەیدابونی لەهجەکانی کوردیدا چەندە کاریگەر بوە ؟ لە دوایدا باسیان دێت .



بەڕای من دەربارەی پەیدابونی لەهجەکانی زمانی کوردیێ ، دەبێ پاش ڕۆخانی دەستەلاّتی (ماد)ەکان دەستپێبکەین ، چونکو لەو کاتەڕا و پاش ئەودەمەیە کە عامیلێکی غەوارە و ناتەبێعی دەستدەکا بە تەئسیرکردن لەسەر زمانی (مادیێ) و کەم و زۆر کاری تێدەکا ، ئەگەرچی نابێ ئەوەمان لەبێر بچێ کە عامیلی جوغرافیایێ و بەرهەلستی تەبێعیێ ـ تەنانەت لەو کاتەش‌دا کە زمانی مادیێ لە (هەگمتەنا) وەکو زمانێکی ڕەسمیێ لەهەمو مەلبەندی دەستەلاّتی مادەکاندا کارێگەربوە ـ دەبێ توانیبێتی شتێك لە (تەئسیر) کەم‌کاتەوە و ئەو گۆڕانانەی کە لە ناوەندی حکومەتدا بەپێی گەشەکردن و گۆڕانی هەمێشەیێ ، پەیدابونی ووشەو زاراوەی نوێ ، سادەبونەوەی ووشەکان و لێك و لوس بونیانی دەسەپاند ، لە شوێنە دورەکان بێ تەئسیر بکا یا ببێتە هۆی تطورێکی سەربەخۆ ، یا هێچ نەبێ ڕاوەستانی زمانی ئەو شوێنانە ، ئاشکرایە کە ڕاوەستانی ( مطلق ) مەبەست نیە ، بەلکو بزوتنەوە و گۆڕانێکە ، کە لەچاو گۆڕان و گەشەکردن لە پاتەختی ماد و مەلبەندانی نیزێکیدا ، وێرای لەبەر چاو ڕاگرتنی کەمی و سستیێ هاتوچۆ و هەبونی کۆسپ و بەرهەلستی جوغرافیایێ ، دەحوکمی ڕاوەستان و نەبزوتن‌دایە .

ئەم حالە بۆ زەمانی دەستەلاّتی (ماد) ئەوەندە کارێگەر نیە وەك بۆ دەورانی دەستەلاّتەکانی پاش (ماد) ، چونکو ئەوکاتە زمانی مادیێ ـ هەر وەکو لە شوێنیکی‌ترا باسکراوە ـ هەر زمانی دەستەلاّت نەبو ، بەلکو زمانی خەلکیش بو ، ئەو سەردەمە (مۆثر) و (مۆثر فیە) لەیەك نەوع بون ، بەلاّم پاش ڕۆخانی دەستەلاّتی (ماد)ەکان و دامەزرانی دەزگای ئیمپڕاتۆرێتیێ (هەخامەنشیان) و ئەو دەستەلاّتانەش کە بە شوێن ئەوا هاتون ، کار لە جێیەکی دیکەیە ، لەم حالەتانەدا زمانێکی بێگانە زمانی ڕەسمییە و دەیەوێ کاربکاتە سەر زمانانی‌تر و ملە و بەربەرەکانیەکی لە نیوان زمانانذا بە ئاسایی دادەنرێ دێتەکایەوە و « ... **لە نێوان زمانانذا ، تێك هەلەنگوتن و بەربەرەکانێ و ملانێ بۆ مانەوە ( تنازع للبقاء ) و هەوڵ و تەقەلای سەرکەوتن و خۆسەپاندن ڕۆدەدا ، هەر ئەو جۆرەی لە نێوان زیندواندا هەلدەکەوێ ، ئەنجامی ئەو ملە و بەربەرەکانییە بەپێی حالات دەگۆڕێ ... ئەم ملانێیە زۆر سەبەبی هەن لە هەموان گرینگتریان دوێن : یەکیان ئەوەیە خەلکی بێگانە کە بە زمانێکی جودا لە زمانی خەلکی وولاّت قسەدەکەن بێنە وولاّتەوە ، دوەمیان جێرانەتیێ دو نەتەوەیە کە زمانیان لێك جیابێ ...**»(1) .

ئەم چلۆنایەتییەی دوکتوڕ عەلیێ عەبدولواعید باسیێ دەکا ، بۆ زمانی کوردیێ لە ڕۆخانی ئیمپڕاتۆرێتی (ماد)ەوە دەستپێدەکا و بە ڕۆخانی ئیمپڕاتۆرێتی (ساسانی) و بلاّوبونەوەی ئیسلامەتیێ لە کوردستان دەبڕێتەوە ،

---

(1) د. عەلیێ عەبدولواحید ، سەرچاوەکەی پێشو ، ل ـ ٢٠٩ .

ئەم ماوەیە بە قۆناغی ناوەندیٚ زمـانی کوردیٚ دەژمێردریٚ ، لـەم قۆناغـەدا زمانانێك لە برەودا بوٚن و دەستەلاتی ڕەسمیٚ بوٚن کە سەرەڕای خزمـایەتیٚ ، دەگەڵ زمانی کوردیٚ یەك نەبوٚن و پێشوٚتر لە کاتیخۆیدا ، زمانی مادیٚ گەلیٚ کاری تێکردوٚن و کارتێکردنی ئەوانیٚش کە دەستەلاتیـان کەوتوٚتەدەست دە زمانی مادیدا ، بەرهەڵستی زۆری لەپێش بوە :

١ ــ مقاوەمەتیٚ مادەکان بوٚ لادان و ڕوٚخـاندنی دەسـتەلاتی سـیاسیٚ هەخامەنشیان لەسەر خوٚیان ، کە لەو شوٚرش و سەرکێشیانەدا بەدیٚدەکریٚ مادەکان کردوٚیانە و دیاکۆنۆف هەندێکیانی بـاسکردوە و ئەمـە یەکێکیـانە :
**« ... پیاوێکی مادیٚ کە نێوی (فرە ئۆرتیس) بوٚ خوٚی بە (خشەثریتە)ی دوەم و لە بنـەماڵەی (کیاکسار = هوفەخشترە) دادەنا ، سەرکردەی یەکێك لە شوٚرشـەکان بوٚ ، خەڵـکی (مـاد) و (پارت) و (هیرکانیە)ش پاڵیان وێدا ، وادیارە خەڵکی ئەرمەنستانیٚش کە ڕەنگە پێشتر دەستیان دابێتە شوٚرش یارمەتیٚ ئەویان دەدا ... »**(٢)

٢ــ بەرهەڵستی جوغرافیایی و تەبیعیٚ و ئامرازەکانی هاتوچوٚی ئـەو زەمانە لەوانە نەبوٚن کە ماوە بدەن کاریگەریٚ زمانانی ( پارسیٚ کوٚن ، پەهلەویٚ « ئەشکانیٚ » و زمانی ساسانیان « پارسی »(٣) ) بگاتە هەموٚ لایەکی وولاتەکە و زمانی ( مادیٚ ) لە عەرزیٚ بدەن .

بوٚیە لەم قوٚناغەدا ، بـوٚ بەروبـوٚی تەئسـیری زمانانی ڕەسـمیٚ سیٚ دەستەلاتی : هەخامەنشیٚ ، ئەشکانی ( فرثیٚ ) و ساسانیٚ لەسەر زمانی (مادی) ، دەبی هەر لە دەوروبەری نێزێك پێتەختەکانیان ( پێرسپوٚلیس ــ تیسفوٚن ) و شارە گەورەکان بگەڕێین کە لە جنوٚبی خاکی ئیمپراتوٚرێتیدا هەڵکەوتبوٚن و هەتا بەرەو باکوٚر بچین ئەم تەئسیرە کەمتر دەبێتەوە ، هەروەکوٚ دەستەلاتی سیاسێتیشیان بـەم پیٚ و دانـە ڕوٚی لە کزیٚ کردوە و « .... وولاتی ماد لە ئیمپڕاتوڕی هەخامەنشیاندا وەزعێکی تایبەتی هەبوە و ساتڕاپەکانی ــ هێچ نەبیٚ جارجارە ــ پارسیٚ نەبوٚن ، بەڵکـوٚ خەڵکی ئەسڵیٚ وولات یەعنی مادیٚ بوٚن ، بوٚ نموٚنە ( ئاربا‌ك ) ساتڕاپی ماد لە زەمانی ئەردەشێری دوەمدا ( ٣٨٣ ــ ٣٧٩ پێش عیسا ــ ر. ز ) بیٚ چەند و چوٚن مادیٚ بوە ، وادێتـە بەرچاو کە ( ئاتروپات ) دوامین ساتڕاپی ئەو وولاتەش لە دەورانی هەخامەنشیاندا هەر مادیٚ بوە »(٤) .

---

(٢) دیاکوٚنوٚف ، سەرچاوەکەی پێشوٚ ، ل ــ ٥٣٤ .

(٣) « ئەم زمانە وەکوٚ بوٚتە باو پێیٚ دەڵێن (پەهلەویٚ) ، بەلام هێرتسفێلد و هیندیٚ ئێرانناسانیتر زاراوەی (پەهلەویٚ) کە لە ووشەی (پەرثەڤ ــ پارتیٚ) دادەتاشریٚ بوٚ زمانی پارتیٚ بەکاردەبەن و زمانی دەوری ساسانیانیان کە ئەسلەن زمانی جنوٚبی ئێرانە ناوناوە (پارسیٚ) .
[ د. معین ، فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ــ سێزدە (پەراوێز ) ] .

(٤) دیاکوٚنوٚف ، سەرچاوەکەی پێشوٚ ، ل ــ ٥٤٠ .

بەو پێیە دەتوانین بڵەین ، بەڵکو بە چاوێش دەبینین کە لەو قۆناغەدا زمانی ( پارسی کون ) لە ڕۆژھەڵات و ڕۆژھەڵاتی جنوبی وولاتی ( ماد )ا کارێکی تەواوی دە زمانی ( مادی )کردوە و بە جارێ بەسەرێدا زاڵبوە و کردویەتە فارسی ، بەڵام لە ڕۆژاوا و باکور و جنوبی ڕۆژاوا کار بەشێوەیێکی ترە :

أ- لە باکوری ڕۆژاوای خاکی ( ماد ) ، ئەوەی ئێستا مەڵبەندی لەھجەی باکوری زمانی کوردیە ، تەئسیری زمانانی ڕەسمی ئەم قۆناغە ئەوەندە نیە و زمانی ( مادی ) لەو مەڵبەندەدا ھەر لەو ڕۆژگارانەوە ( بەڵکو پێش ڕوخانی دەستەڵاتی مادیش ) ڕێگای گەشەکردن و گۆڕانی تایبەتی گرتوە ، ھەر چەندە من وای بۆ دەچم کە ئەم گۆڕان و گەشەکردنەش ھەر زۆر سست بوە ، شێوەی درکاندنی دەنگەکان بە گشتی و ھەندێ دەنگێش کە بە ھێزی خانی دەنگ ( مخارج الحروف ) دەدرکێندرێن چ گۆڕانێکی ئەوتویان بەسەرا نەھاتوە ، ڕەنگە ئەو ڕۆژەی کە زمانی ( مادی )وەکو ئاوێستایی و پەھلەوی و پارسی بناسرێ و ڕونببێتەوە ، بۆ دنیا دەربکەوێ کە دەگەڵ لەھجەی باکوری زمانی کوردی ئێستا ئەوەندەیان فەرق نیە .

ب- زمانانی دەستەڵاتەکانی پاش دەستەڵاتی ماد ، لە مەڵبەندی لەھجەی ناوەندی ئێستای زمانی کوردیدا ، زیاتر لە ئی باکوری و کەمتر لە ئی جنوبی کاریان دەزمانی مادی کردوە . ئەم مەڵبەندە لەبەرئەوەی سەرەڕێی گەلێ لەشکرکێشییان بوە کە لە باکور و ڕۆژاوایەوە بۆ ڕۆژھەڵات و جنوبی لە مێژودا ڕویداوە ـ شەڕەکانی ئێران و ڕۆم و ئێران و یونان و ... ـ و مەڵبەندێکی پڕ لە جموجوڵ و بزوتنەوەی سیاسی و بازرگانی و سوپایی بوە ، بۆیە لە باری زمانێشەوە ھەر ئەو خاسیەتانەی تێدا پەیدابوە .

گۆڕانی دەنگەکانی زمان ، سوان و گەلێ جار لەناو چونی دەنگەسست و فشەڵەکان ، لەناوچونی قوڕت و کەندوکلۆیی خانی دەنگان و لە ئەنجامی ئەوەشدا لەناوچونی درێ تەلەفوز ، ھەمو ئەوانە بە تێکڕایی توانایی و لێھاتویی زمانی لەم مەڵبەندەدا بۆ گۆڕان و گەشەکردن زیادکردوە و کوسپ و بەرھەڵستەکانی سەرڕێگای ئەم گۆڕان و گەشەکردنەشیان تەخت کردوە ، دەبێ لەبەر چاومان بێ کە ئەو مەڵبەندەی مێژو بە ھەمو کارەسات و ئاڵ و گۆڕەکان و توانایی خۆیەوە ، ئیمڕۆ کردویەتە مەڵبەندی لەھجەی ناوەندی زمانی کوردی ئێستا ، لەو ڕۆژگارە مێژوییەدا کە لەھجەکانی کوردی تازە دەگۆران، ئەوەندەی ئێستا پان و بەرین نەبوە و لە باشترین ئەحوالا لە سنوری مادی پچوك تێنەپەڕیوە کە دوای ھجومی ئەسکەندەری مەقدونی بۆ

سەر ئیمپڕاتۆریێ هەخامەنشی ، حۆکمدار (ساتڕاپ)ی ئەو مەڵبەندە (ئاترۆپات)ی مادیێ دەوڵەتێکی سەربەخۆی تێدا دامەزراند و «گومان نیە کە ئاترۆپات پیاوێکی لێهاتو بـو بەڵام ئەگەر یاسـای باڵاکردنی مەنتیقیێ مێژو (قانون تكامل المنطقی) لەناو خێلات و هۆزەکانی مـادا هەندێ هێزی معیّنی نەهاروژاندبا، لێهاتویێ و لێوەشاوەییێ شەخسیێ ئاترۆپات نەیدەتوانی وولاتی سـەربەخۆی ماد بێنێتـە وجود »(٥)

ج- ناتوانێن حاشا لەوە بکەین کە زمانانی دەستەڵاتدار لەم قۆناغەدا لەسەر مەڵبەندی لەهجەی جنوبی ئێستای زمانی کوردیێ ـ ئەگەر دەگەڵ مەڵبەندەکانی دیکە بەراوەردی‌کەین ـ زیاتر کارێگەر بون و هەر بە تێپەستاوتنی ووشەکانی خۆیان دانەکەوتون بەڵکو هەندێ جار شێوەی داڕشتنی ڕستە و بەکارهێنانی فیعل و زەمیرەکانیش دەگرێتەوە ، هەر ئەوەشە هەندێ ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنگیێ ـ کە یان کوردیان هەر نەزانیوە یان ئەگەر زانیبێشیتیان لە ڕێگای فارسییەوە فێریێ بون و شکیش لەوە ناکرێ کە لە ژێر تەئسیری زمانی فارسیدا بون ، چونکو فارسیێ سەعدیێ و فیردەوسیێ و خەیامی لە خوانا هەبوە و کوردیش فەقیر و نەدار ـ وا لێکردوە کە ئەم لەهجەیەی زمانی کوردیێ ـ هیچ نەبێ یەك دوبەشیێ ـ بە لەهجەیێکی زمانی فارسیێ بزانن و ئەگەر زۆر خۆیان پاراستبێ و نەیانویستبێ هەمو دەرگایەك داخەن ووتویانە لە خێزانە زمانی جنوبی ڕۆژاو'ی زمانانی ئێرانییە بێ ئەوەی حیساب بۆ ئەو تەئسیرە بەتێن و تەووژمە بکەن کە لەبەر نێزیکی ئەم مەڵبەندە لە پێتەختەکانی پاتشـایانی هەخامەنشیێ و ساسانیێ ، زمانەکانیان کردویەتە سەر زمانی خەڵك لەم مەڵبەندەدا .



بڵاوبونەوەی ئیسلامەتیێ لە خاکی ئیمپڕاتۆرێتی سـاسانیان و ڕوخانی دەستەڵاتی سیاسـیێ ئەم دەوڵەتە گەورەی ئەوێ ڕۆژێی دنیا ، دەسـتەڵاتی زمانی ڕەسـمیێ ( پارسیێ ناوەنـدیێ )شی لە ناو برد و زمانەکانی خۆجێییێ وولاتەکەی لە تەئسیری ئەم زمانە ڕزگارکرد .

هەر وەکو لە شوێنێکی تری ئەم سەرەتایەدا باسمان کردوە ، یەکەمین کتێب بە زمانی فارسیێ نوێ لە سالی ٣٤٦ی کۆچیدا نوسراوە ، ئەمە تێمان دەگەیێنیێ کە زمانانێکی لە گۆشە و کەناری خاکی ئیمپڕاتۆری سـاسانیدا قسەیان پێدەکرا ، زمانی ڕەسمیێ خۆشیێ ، لەم ماوەیەدا کەوتونەتە سەر ڕچەی

---

(٥) دیاکۆنۆف ، سەرچاوەکەی پێشو ، ل ـ ٥٥٤ .

گەشەکردن و گۆڕانێکی ئازادانە ، بێ ئەوەی زمانێکی خزمی خۆیان کاریان تێ بکا و تطوری خۆشی بە سەر ئەواندا بسەپێنێ ، هەر بۆیەشە لە چەرخی ۹ و ۱۰ ی پاش عێسادا کە سەرەتای قۆناغی تازەی زمانەکانی ئەو ناوچەیەیە ، خەڵکی ڕۆژهەلات و ڕۆژاوای ئێرانی ئەوسا دە زمانی یەکتری نەگەیشتون

**« زمانی ئێستای ئێمە کە لە دەوری ئیسلاما هەمیشە پێیان کوتوە زمانی دەری و ئیحتیمالێکی نێزیك لە یەقین دەدرێ کە لە دەورەکانی پێش ئیسلامیشا هەر ئەم ناوەی هەبوبێ و لە دەوری ساسانیانڕا خەلکی ئێران کە لە باکور و ڕۆژاوا و جنوبی (ڕەی)بون هەمو بە زمانی پەهلەوی قسەیان کردوە و ئەوانەی لە ڕۆژهەلاتی (ڕەی)بون بە زمانی (دەری) دواوون ... لە زەمانێکدا کە (دەری) دەستی کردوە بە بلاو بونەوە خەلکی قەلەمڕەوی زمانی پەهلەوی هەستیان کردوە کە پێویستیان بە کتێبی وا هەیە زمانی ( دەری )یان فێر کا و ئەوە سەرەتای فەرهەنگ نوسینی زمانی فارسی ئێستا ، یەعنی زمانی (دەری)یە .»(٦)**

ئەگەر بمانەوێ وەزعی مەلبەندی ئێستای دەستەلاتی زمانی کوردی لەو سەردەمەدا کە مامۆستا سەعید نەفیسی باسی کردوە بە شێوەیێکی وا ڕۆشن کەینەوە کە پچێتە ئەقلەوە دەبێ بلەین :

١ــ لە مەلبەندی ئێستای لەهجەی باکوریدا ، زمانی مادی لە برەو دابوە ، کە ئاوێستایی و زمانانی خۆجێیی و دەروجێران ، کەم و زۆر ، کاریان تێکردوە و زمانانی پارسی کۆن ، پەهلەوی ئەشکانی و ساسانی و پارسی ( دەری ) تەئسیرێکی ئەوتۆیان لەسەر زمانی ئەم مەلبەندە نەبوە .

٢ــ لە مەلبەندی ئێستای لەهجەی ناوەندیدا کە ئەو کاتە لە ئێستا پچوکتربوە ، زمانی مادی لە کارابوە کە ئاوێستایی و پەهلەوی و لە قەدەر حالێش پارسی کاریان تێکردوە ، کە ئەمانە خۆیان هەر لە دەوری ئیمپڕاتۆری ( ماد )ەوە لە ژێر تەئسیری زمانی ( مادی ) دابون و گەلێ ووشەی پەهلەوی یا پارسی کە لە قۆناغی ناوەندیدا هاتونە ناو زمانی مادی ، بە ئەسڵ مادی و ئاوێستایین چونە ناو زمانی پارسی کۆن و فرثی و پاشان لە دەوری ئەشکانی و ساسانیدا گەڕاونەوە بۆ ناو زمانی مادی .

٣ــ لە مەلبەندی لەهجەی جنوبیدا ماکی بنچینەیی زمانی مادییە کە لە دەوری هەخامەنشیاندا پارسی کۆن و لە زەمانی ئەشکانیان و ساسانیانیشدا زمانی پەهلەوی و پارسی ناوەندی تەئسیرێکی بە تینیان تێکردوە .

پێویستە ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە خودی زمانی مادی بەسەر هەمو ئەو زمانانەی پێش دامەزرانی ئیمپڕاتۆری ( ماد ) لە خاکی ( ماد )ا برەویان

---

(٦) مامۆستا سەعید نەفیسی ، فەرهەنگەکانی فارسی «سەرەتای بورهانی قاتیع» ، ج ١ ، ل ــ شێصت و حەوت .

هەبوە ، زاڵبوە ، بۆیە ئەو ڕۆژەی زمانی مادیَ ساغدەبێتەوە ، لە ڕێشەی زمانانی گۆتی ، هوری ( خوری ) ، ئۆڕارتویی ، کاسی ( کاشی ) گەلیَ وشەی تێدا بەدیَ دەکرێت کە شکلی وشەی ( مادیَ )یان بە خۆوەگرتوە و ئێستا لە ناو لەهجە و بنلەهجەکانی زمانی کوردیدا دێن و دەچن .

هەروەها ، دەوری دەستەڵاتی ئەسکەندەر و جەڕەناڵەکانی لە سەر خاکی ئیمپڕاتۆری هەخامەنشی و کوردستانیش ناتوانیَ لە باری زمانیشەوە کاریگەرنەبوبیَ، شارستانێتی یۆنانیَ لە ئێرانی ئەوان زەمانانداَ ،بە زۆریَ کاریَ لە سەر ژیانی چینی ئەریستۆکڕات و دەسەڵاتداران کردوە و تەنانەت پاتشایانی ئەشکانیَ کە جێگەی دەستەڵاتی یۆنانییانیان گرتەوە ، تا ماوەیێکیش لە ژیانی خۆیان و دەربار‌دا لاسای ئەوانیان دەکردەوە و پاشان سەر لەنویَ گەڕانەوە سەر داب و دەستوری ئاریایی ، بەڵام ژیانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ لە لایەن شارستانێتی یۆنانییەوە ، کاریکی ئەوتۆی تیَنەکراوە و لەسەر ڕچەی با و باپیران لای نەداوە و هەر نەشیان توانیوە لابدەن چونکو کەرستە و مایەی ئەم لادانەیان نەبوە ، جا کاریکی زمانی یۆنانی کردویە لەسەر پێویستەکانی ژیانی ئەریستۆکراتی بوە نەك ئیَ خەلکی ڕەش و ڕوت ، کە ئەویش بە بادانەوەی پاتشایانی ئەشکانیَ و گەڕانەوەیان بۆ سەر ڕێ و شوێنی باپیران ، زوربەی لە بیر چۆتەوە . بۆیە بە لای منەوە بۆ شوێنەواری زمانی یۆنانیَ لە کوردیدا دەبیَ لە ناوی چیا و چۆل و شیو و دۆڵ و ڕوبار و ئاوایی و ... بگەڕێین کە شك نیە یۆنانیەکان ، بۆ مەبەستی جۆر بە جور ـ زیاتریش سوپایی ـ ناوی خۆیان لەو جۆرە شتانە ناوە . تەنیا وەکو نمونەیەك باسی دەکەم زۆر ڕێی دەچێتیَ کە ناوی : ماکۆس ، نەلۆس ، قەندیل ، هەرتەل ئەسڵیان یۆنانیَ بیَ .

بە ڕای من لەهجەکانی ئێستای زمانی کوردیَ لە چلۆنایەتێکی ئاوادابون کە ئیسلامەتیَ ڕوی کردۆتە کوردستان و قۆناغی ناوەندیَ زمانەکانی ئێرانیَ تێکەوەپێچاوە ، لە چلۆنایەتێکی ئاوا یا نیزیك بەو ، قۆناغی تازەی زمانی کوردیَ دەست پیدەکا و لەهجەکانی دەستیان کردوە بە گەشەکردن و گۆڕان . لەم قوناغەشدا مەلبەندی لەهجەی ناوەندیَ هەر لەبەر ئەو هۆیانەی کە پێشوتر باسیانکرا ، زیندویەتی زیاتر بوە و زورتر ئامادەیی هەبوە بۆ گەشەکردن ، هەر بۆیەش مەلبەندەکە پان و بەرینتر بوە و خودی لەهجەی ناوەندیش تەشەنەی کردوە و لە سنوری جارانی تێپەڕیوە ، هەر ئێستا لە سنوری مەلبەندی لەهجەی ناوەندیَ دەگەڵ دوَ لەهجەی باکوریَ و جنوبی ، دوَ ناوچەی زمانیَ سست و فشەڵ بەدیَ دەکریَ ، کە یەکەمیان گەلاز (لە پشتی شنۆیە) ، باکوری ڕەواندزیَ ، میرگەسور و ئاکریَ دەگرێتەوە لەم شوێنانەدا نە لەهجەی باکوری تەواو نە لەهجەی ناوەندیَ تەواو برەوی هەیە . دەگەل لەهجەی جنوبیش حالێکی ئاوا هەیە ، لە تیسمالکە ئەرزیکدا کە دەکەوێتە

باکوری کرماشان ، قەسری شیرین و خانەقین زمانەکە نە لەهجەی ناوەندیە و نە جنوبی . ئەمە نیشانمان دەدا کە چۆن لەهجەی ناوەندی زمانی کوردی ، لەبەر هۆیەکانی زاتی و مەوزوعی ، لە مەلبەندێکی پچوك ( نسبیاً ) ڕا دەستی کردوە بە گەشەکردن و تا هاتوە مەلبەندەکەی پان و بەرینتر بوە و ئیستاش ئەم کارە هەر درێژەی هەیە .

لەم قۆناغە تازەدا ، لەهجەکانی زمانی کوردی گەشەیان کردوە و چاتر دەقیان گرتوە ، زمانی ڕەسمی دەستەڵاتەکانی سیاسی تا ماوەی سی چوار چەرخان هەر عەڕەبی بو کە زمانی دینی تازەش بو ، چونکو ئەم زمانە لە بنەمادا دەگەڵ زمانی کوردی جیاواز بو ، لەوەش گرینگتر چونکو دەستەڵات لەم ماوەیەدا دەستەڵاتی دینی ـ سیاسی بوە ، بۆیە زمانی عەڕەبی لەم قۆناغەدا هەر ئەوەندەی کار دە زمانی کوردی کردوە کە دینی تازە بۆ بڵاوبونەوەی خۆی پێویستی پی هەبوە و هۆی هەرە بنچینەیی دەقگرتنی فەرق و جیاواری نێوان لەهجەکانی کوردی ، هۆیەکانی جوغڕافیایی و کۆمەڵایەتی و کەمی هاتوچۆیە .

هەر لەم قۆناغەدایە ـ وەکو مێژو نیشان دەدا ـ مەلبەندی زمانی کوردی بۆتە پێخوستی پەلاماری مەغۆل و تاتاران ، دەستەڵاتی سەلجوقی و ئەتابەگان ئەم مەلبەندەشی گرتۆتەوە ، شەڕوشۆری نێوان پاتشایانی (سەفەری) و (عوسمانی) بڕانەوەی نەبوە و شەڕ و هەرای مێژویی (ئێران) و (ڕۆم)ی وەبیر هێناوەتەوە ، سەرکەرتنی لایەکیان دەبو بە بەهانە بە دەستی لایەکەی دیکەوە بۆ تۆلەکردنەوە و نەیدەهێشت تەمی پەلامار و ڕاکردن ، سەرکەوتن و تێشکان لە سەر ئەم مەلبەندە بڕەوێتەوە و لە زەمانی سولتان سولەیمانی قانونی ڕا دەبی هۆی سیاسیش بخەینە سەر هۆیەکانی دەقگرتنی لەهجەکانی زمانی کوردی .

زۆر ئاشکرایە ئەم هەمو ڕوداوانە و گوریس کێشەکێیەی بۆ داگیرکردن لە نێوان دەستەڵاتە سیاسییە گەورەکانی نەتەوە و خێڵاتی جیا جیا کە بەسەر ئەم مەلبەندە هاتوە ، ناتوانی لەسەر زمانی کوردی بی تەئسیر بی ، بۆیە ووشەی زمانی (مەغۆلی) و (ترکی)ش لە زمانی کوردیدا دەبینین ، بە تایبەتی لە ناوی ئاوایی و چیا و چۆلاندا . گەلی لەو فەڕەنگییانەی کە بە کوردستانا تێپەربون یا باسیانکردوە چونکو (شارەزا) و (سەرچاوە)کانیان (عوسمانی)بون ( داغ )ێکیان بە دوای ناوی گەلی کێوانەوە ناوە کە بە ترکی مانای (چیا)یە ، قەندیل‌داغ ، ئەزمەرداغ ، ئاجداغ و ... و ... کەم نین ، تەنانەت ئەم ( داغ ، داغ )ە لە کتێبی جوغڕافیای فارسیش‌دا هەر دەبیندری .

ئیمڕۆ لەهجەکانی زمانی کوردی ، تەنانەت لە چاو پەنجا ساڵ لەمەو

پێشتیش ، جیاوازیان گەلێ کەمتر بوە ، ئەوەش بۆیەیە زۆر بەرهەڵستێ تەبیعی کە لە سەر ڕێگای زمانی کوردێ هەبوون لە گۆڕێ نەماوە ، جاران سەفەر و هاتوچۆ لە ناو خەڵکا ئەوەندە کەم بۆ ، کەم کەسی خەڵکی سلەیمانێ هەبۆ یەکێکی زاخۆیێ دیتبێ ، یا کوردێکی خەڵکی ڕەواندز (لوڕ)ێکی چاو پێکەوتبێ ، یاخۆ ( پیاگ )ێکی سنەیێ و کرماشانێ دەگەڵ (مرۆ)یەکی شکاك و جەلالێ لای (ماکۆ) تۆشی یەك هاتبن ، بۆیە ئەگەر بە ڕێکەوت کرماشانیەك دەگەڵ زاخوییەك لە شوێنێکا کۆ ببانەوە تێك نەدەگەیشتن .

بەلام ئێستا ! خێرایێ هۆیەکانی هاتوچۆ ، هاسانێ سەفەر ، ڕادیۆ ،... ... و چلۆنایەتێ ئابوریێ و کۆمەلایەتێ وای کردوە کە نەك هەر خەڵکی مەڵبەندێکی زمانێ بتوانن زۆر یەکتر ببینن ، بەڵکو ئەگەر لە چەرخی نۆزدەهەما بێجگە لە ڕۆژهەلاتناسێ یا قەشەیێکی مەسیحێ کە ڕێیان دەکەوتە کوردستان ، کورد ئورۆپاییکیان نەدیتبۆ ، ئێستا قوتابێ ، بازرگان و دنیاگەڕێ ئافرەت و پیاوی کورد ، زۆر وولاتانی دنیایان دیوە ، ئێستا کوردێکی زاخۆیێ کە یەکێکی خەڵکی سلەیمانێ دیت لێك حالێ دەبن و کوردێکی مەهابادێ ئەگەر شکاکێکی دیت وەکو جاران بە (ئازربایەجانێ) پێکەوە نادوێن و ڕاستەوخۆ بە کوردێ قسە دەکەن و تێکیش دەگەن .

لەم مەیدانەدا ئەوە لە بیر ناکەین کە ڕەسمیبۆنی زمانی کوردێ لە کوردستانی عێراق و هەبۆنی ڕۆژنامە و کتێب و گۆڤار ، خوێندن بە زمانی کوردێ و دەزگای جۆربەجۆری فەرهەنگێ (سەقافێ) کوردێ دەورێکی گرینگیان لە نێزیك‌کردنەوەی لەهجەکانی کوردیدا گێڕاوە ، سەلماندنی ئیدارەی ( حوکمیزاتێ )بۆ مەڵبەندی کوردستان خێرایێ ئەم دەورە بە تەووژمتر دەکا و زمانی کوردێ بە هەنگاوی گەورە بەرەوپێش دەبا و گەشەی پێدەکا و لە هەر لایەکەوە تەماشای ئەم مەسەلە و لك و پۆپەکانی بکەین چالاکێ و خەباتی زانایان و خوێندەوارانی کورد هۆیەکی سەرەکییە بۆ گەشەکردنی زمانی کوردێ .

لە سەرەتای چەرخی شازدەهەمەوە ـ ئەگەر پێشتریش نەبێ ـ زمانی کوردێ بە هەمو لەهجەکانییەوە ، کەوتۆتە بەر کارتێکردنی فەرهەنگی (سەقافەت) فارسێ و تورکێ کە خۆیان بە توندی لەبەر تەووژمی فەرهەنگی عەرەبیدا بۆن ، لێرەدا مەبەست ئەو کارتێکردنە نیە کە زمانی عەرەبێ وەکو زمانێکی دینێ لەسەر فارسێ و تورکێ و کوردیش هەیبۆ . پاش دامەزرانی دەستەلاتی سۆڤیاتێ لەسەر خاکی ئیمپڕاتوریێ کۆنی ڕۆسیا و لە دوای دامەزرانی دەولەتی عێراق ، دەبێ تەئسیری فەرهەنگی ڕۆسێ و تا ئەندازەیێکیش ئەرمەنێ و هەر وەها تەئسیری فەرهەنگی عەرەبێ بە شێوەی ڕاستەوخۆ ، بخەینە سەر تەئسیری فەرهەنگی فارسێ و ترکێ دە زمانی کوردیدا .

دنیای ئیمڕۆ تەنانەت لە چاو دنیای پێش شەڕی دوەمێش زۆر فەرقی هەیە و فەرهەنگی نەتەوەکانی دوڕ لە یەکی دنیا ، ڕێگای کار تێك‌کردنیان بۆ تەخت بوە ، بۆیە فەرهەنگی فارسیٚ و عەڕەبیٚ و ترکی کە ناتوانن لە فەرهەنگی میللەتانی تر تەئسیر قبوڵ نەکەن ، کەم و زۆر ئەو تەئسیرانە دەگوازنەوە بۆ ناو فەرهەنگی کوردیٚ ، جا ئەگەر بە دەیان ووشە لە ڕێشەی عەڕەبیٚ ، فارسیٚ ، ترکیٚ و زمانانی فەڕەنگی دە زمانی خۆمـاندا دەبـینێن نەشتێـکی سـەیرە و نەعەیبیشە وەکوٚ هەندیٚ خوێندەواری کورد بیری لێدەکەنـەوە ، نەك هـەر ئێستا ، کە دنیا زۆر پچوك بۆتەوە و فەرهەنگ و زمانی نەتەوەکان لە جاران زیاتر و هاسانتر کارتێك دەکەن ، بەڵکوٚ لە کۆنەوە ئەم کارتێکردنە هەر هەبوە ، (هوزواریش) ئەوان ووشە ئارامییانەبۆن کە تێکەڵ زمانی دەوری ساسانیـان ببۆن و **« بە خەتی پەهلەویٚ دەنوسران و لە کاتی خوێندنەوەدا تەرجەمە پەهلەوییەکەیان دەخـوێندرایـەوە ، وەکـو دەیانوسـی ( مەلـکا ) و دەیـانخوێندەوە ( شـاه ) »**(٧) و کەسێش تەنانەت شاهەنشایانی ساسانی خۆشیان پێیان عەیب‌نەبوە .

هەر ئەو خوێندەوارانەی کە ووشەی بێگانە لە زمانی کوردیدا بە عەیب دەگرن ، هێچ ئاگایان لەوە نیە کە خۆیان کوردیٚ بە پێـی ڕێزمـانی زمـانێکی دیکە دەنوسن(٨) و بەوەش داناکەون نوسینەکانیـان بە تەرجەمـەی زاراوەی تر داخنن ، کە ئەگەر هۆیەك هەبیٚ بۆ بیٚ هێز و پێز کردنی زمانێك ئەو جۆرە شتانەن نەك ووشەی ڕۆتی زمانانی تر کە ڕەوتی مێژوٚ و پەیدابونی هـەزاران شتی وا کە ژیانی ئیمڕۆ پێویستی پێیان هەیە و ئێمە خۆمان نەمان‌بوە و ئێمەش دروستمان نەکردۆن تا ناویان لیٚ بنێین و بە ناچـاریٚ خۆیـان و ناوەکانیـان وەردەگرێن و نەك هەر خەڵکی شاران کە زیاتر دەگەڵ شارستانێتی ئیمـڕۆ سەروکاریان هەیە ، بەڵکوٚ خەڵکی لادێش دەیانلێن .

سەرەڕای ئەمانە هەموٚی ، هەر زمانێك کە ووشەیێك لە زمـانێکی تـر دەخوازێتەوە دەستکارێکی هەر دەکا و دەیهێنێتە سەر شێوەی خۆی ، خەڵکی سادەی نەخوێندەوار کە هێچ ئاگایان لە ڕێزمـان و زمانەوانـی نیـە و بـەم حاڵەشەوە چاکترین و ڕاسترین پێوانەشن بۆ ڕاستیٚ و چەوتیٚ هەموٚ بابەتێکی زمانەوانیٚ ، ئەم خەڵکە سادەیە بیٚ ئەوەی هەر هەستێش بە کردەوەی خۆیان بکەن ، ووشەی بێگانە وەردەگرن و لە بۆتەی زمانی خۆیاندا قـاڵبیٚ دەکەن و سەرلەنوی دایدەڕێژنەوە و بە کاری دێنن و هەندیٚ جار بۆ مەبەستێکی دە کار دەکەن کە فڕی بەسەر ئەو مانایانەوە نیە کە لە زمانە ئەسڵییەکەدا هەیبوە .

---

(٧) د. معین ، فەرهەنگ ، ج ٤ ، ل ـ ٥١٣٩ .

(٨) ئەم قسـەیە هەروا لە خۆڕایی ناکەم ، بەڵکوٚ ئەگەر وێستبام نمونەی ئەم کارە بخەمە بەرچاوان پێویستی بە ماندوبۆن نەبوٚ .

ئەوەی کوردی عێراق پێی دەڵەن (سەیارە) و لە عەرەبی وەرگیراوە ، ناوە ئورۆپاییەکەی (ئۆتۆمۆبێل Automobile )ە و کوردی ئێران ناویان ناوە (ترومبێل) و کوردی عێراق (ئۆتمەبێل) یا (ئۆطمەبێل)یشی پێ دەڵێن و لە سوریا (ترومپێل)ە ، ئەوجار ووشەی (ماشێن Machine )کە لە فارسیدا بە (سەیارە)ی دەڵێن ، کورد کردویانەتە (ماشێن) لە باتی (ترومبێل) و (مەکینە) لە بەرامبەر مانای ئەسلی ووشەکەدا و (ئۆتۆماتیك Automatique بە مانای هەر شتێکی لە خۆوە ئیش بکا یا بۆ خۆی بجوڵێ ، کوردی سادەی نەخوێندەوار کردویانەتە (تەماتێر) بۆ چەك ، داخوا ووشەی (ماڵ)ی کوردی یا (ماف) بە مانای هەق کە لە (مال ، مافیە)ی عەرەبی وەرگێراوون ، ماناکانیان هیچ پێوەندێکیان بە مانا عەرەبیەکەیانەوە هەیە ؟ .

★ ★ ★



# گۆرانی «هەورامی» زازا

لە مەڵبەندی لەهجەی باکوری و ناوەندی زمانی کوردیدا دو دورگەی زمانی هەن کە سەرەڕای دوری لەیەکتر پیاو بە هاسانی دەتوانێ بڵێ لە ئەسلا یەکن ، ئەویش (زازایی)یە لە باکور و (گۆرانی)یە لە (ناوەندی)دا ، ئەمەی ئاخریان زیاتر بە (هەورامی) ناوی دەرکردوە چونکو گەورەترین ناوچەیێکی تێیدا رەواجی هەیە (هەورامان)ە ، بێجگە لەوەی لە (ڕێژاو) و (کەنەوڵە)(١) و لە ناوعەشیرەتی (باجەلان) و (زەنگنە) و (شەبەك)یش قسەی پێدەکرێ ، زازاییش لە (پالو) ، (کۆر) و (چەبەخچور) لە برەودایە .

من لەسەر ئەم دو بنلەهجەیە تا ڕادەیێك گەیشتومە هەندێ ئەنجام و گومانم لەوەدا نیە کە (کوردی)ن ، بەڵام چونکو لێکۆڵینەوەکەم بە لای خۆشمەوە هێشتا کاڵ و کرچە ، وازم لەوەی هێنا کە لەم سەرەتایەدا بڵاوی کەمەوە و هەڵیدەگرم بۆ مەیدانێکی تر .

---

(١) دوناوچەیبچوکن لە مەڵبەندی لەهجەی جنوبیدا .

# دەربارەی «دەنگ»ی کوردی

هەردەگەڵ ووتت قامۆس ، هەمۆ کەسێ کتێبێکی دێتەبەرچاو کە باسی هەمۆ شتێ دەکا و مەتەڵی کوردێ «قسەی وا دەکا قامۆس نایگرێ» لەم باوەڕە پەیدابوە کە دەبێ قامۆسی هەمۆ شتێکی تێدابێ و هەر بۆیەش شاعیری فڕاوێژ (هەججاو)ی کورد شێخ ڕەزای تاڵەبانێ گوتویە «قسەی واتە پێدەڵێ قەت نەیگرێ قامۆس» . بەڵام ئەوەی کە ناوی قامۆس دەیخاتە مێشکی خوێندەواران، دەگەڵ ئێ نەخوێندەواران ، جیاوازە ، پیاوێکی تەنانەت نێمچە خوێندەوارێش هەر دەزانێ قامۆس کتێبێکە لە (ووشە) دەدوێ ، (ووشە) بە بێر هەمۆ خوێندەوارێك دادێ ، ئەمما ئەوەی کە (ووشە) لە چێ پێکهاتوە و چۆن پێکهاتوە ؟ کارێکە تەنیا ئەو کەسانە بێری لێدەکەنەوە کە سەروکاریان دەگەڵ زانستی زمانەوانێ هەبێ و خەڵکی تر ووشەیان لەلا (شت)ێکە مانایەکی هەیە و مەبەستێ خۆیان پێ‌دەردەبڕن .

هەمۆ (کل ّ)ێك لە (جزء)ان پێکدێ و (جزء)ەکانێش دەشکێنەوە تادەگاتە سەر ئەو (جزء)ە پچکۆڵانەیەی بە چاو نابێندرێ و گەورەزانایان لە زەمانانی کۆنەوە ناویان‌نابو (جزء لایتجزی) بە مانای (جزء)ێکی وا کە بەش ناکرێ و لەم زەمانەی ئێمەدا (ئاتۆم)ی پێدەڵێن ، جا هەروەکۆ دەزانێن (ئاتۆم)ێش کە ساڵەهای ساڵ بۆ وەك قەڵایێکی پۆڵایێن لە مەیدانی شارستانێتیدا سەرکێشێ دەکرد و دەگرتن نەدەهات ، لە ئاخروئۆخری جەنگی دووەمدا بە دەستێ زانایانی ئادەمێزاد (فتح)کرا و وەك بۆمبێك دەنگی‌دایەوە و کۆمەڵگای ئینسانێ !! لە دۆ شاری (هێرۆشیما) و (ناگازاکێ) زیاتر لە ۱۲۰ هەزار (ئینسان)ی کردە گاووگەردۆنی ئەم سەرکەوتنەی خۆی کە یاخوا هەر سەرنەکەوتبا .

زمانی هەمو نەتەوەکانی سەر ڕوی ئەم زەمینە ، وەکو دیاردەیێکی کومەلایەتی وایە و (کل)یکە کە لە (جزء)ان پێکهاتوە ، ئاتومی زمانان دەنگەکانی هەر زمانێکە ، ئەگەر مەسەلەکە نەختی زیاتر خوردکەینەوە دەبێ بلەین کە ئاتومی زمانانیش ئەو ( جزء لایتجزی )یە نیە وەکو دێتە بەرچاوان ، چونکو زانستی فیزیا دەمێکە ڕونی کردوتەوە (دەنگ) لە لەرینەوەی شتێك پەیدا دەبێ ( ذبذبات الصوتیة ) ، وەك دەبینین ئەو ئامرازانەی موسیقی کە (ژێ)یان هەیە وەکو تار ، عود ، کەمانچە ، ... تا بە ئامرازیکی تایبەتی ، میزراب (بو تار و عود) و ئارشێ (بو کەمانچە) لە تەلەکانیان نەدەن و نەیانلەرێننەوە دەنگیان لێوەنایە ، لە مەسەلەی دەنگەکانی زمانێکدا ئەو ئامرازەی موسیقا گەروی ئینسانە کە هەندێ (ژێ)ی تێدایە ( الأوتار الصوتیة ) و بە (هەوا)یەکی لە دەرونڕا دێتەدەر دەکەونە لەرینەوە ، بە زیادی دەزانم لەمە زیاتر خوێنەرانی خوشەویست دەگەل خوم ڕەکێشکەم و بچینە قوناغێکی کە لە پێش (لەرینەوە)دایە و پێکەوە بکەوینە باسکە مەلە لە ئوقیانوسی ئەوەیدا کە پێی دەلێن بزوتنەوە (الحرکة) کە بنجوبناوانی هەمو شتێکە و (ژین) خوی بزوتنەوەیە ، تەنانەت (مردن)یش بڕانەوەی بزوتنەوە ('لسکون) نیە ، چونکو دوای مردنیش شێوەی (استحالە) لە حالێکەوە بو حالێکی تر وەردەگرێ ، بویە کورت و کرمانجی دەلێم دەنگەکانی هەر زمانێك لە لەرینەوەی ژێیەکانی دەنگی گەروی ئەم ئینسانانە پەیدادەبێ کە بەو زمانە قسەدەکەن و ئەم لەرینەوە بە پێچوپەناکانی ناوقوڕگ و دەمی ئینساندا تێدەپەڕێ تا دەگاتە ئەوشوێنەی هەردو لێو پێکەوە دەنوسێن .

لێرەدا دو مەسەلەمان لەبەردەم قوتدەبێتەوە ، یەکەمیان ئەوەیە کە لەرینەوە هەر لەرینەوە و هەر (ژێ)یە دەلەرێتەوە ، ئەدێ بوچی زمانی نەتەوەکان لە دەنگێکیان زیاترهەیە ؟ بو وەلامی ئەم پرسیارە دەبێ پەنابەرینە بەر ئامرازێکی موسیقی خومانە کە کونترین ئامرازی موسیقایە و ئەگەر بلێم شوانانی کورد دایانهێناوە ڕەنگە لە ڕاستی لامنەدابێ ، ئەو ئامرازە (بلوێر)ە ، هەمو دیومانە و دەزانین کە لە قامیش دروستدەکرێ و حەوت کونی تێدایە ، بلوێرژەن قامکی لەسەر کونەکان دادەنێ و فوی پێدادەکا ، بە جولاندنی پەنجەکانی لە (فو) شەپولی دەنگسازدەکا و بە گواستنەوەی پەنجەی لەسەر کونێك بو کونێکی تر یا زوروکەم لابردنی قامك لەسەر کونەکان دەنگی جوربەجور پەیدادەبێ و هەر ئاواز و نەغمەیێکی مەبەستی بێ دەیژەنێ .

گەروی ئینسان و پێچ و پەناکانی ناودەم تا دەگاتە دیوی دەرەوەی دو لێوان کاری بلوێرەکە دەکەن کە ئەو هەوایەی لە دەرونەوە دێ و لە (ژێ)یەکان دەدا و بە فەرمانی مێشك بە شوێنە جیاجیاکانی ئەم دالانەدا تێدەپەڕێ و (دەنگ)ی جیاجیا بو (زمان)ێك دروست دەکات ، لێرەدا کونەکانی بلوێر ئەو

شوێنانەن کە پێیان دەڵەین (خانیدەنگ) و بە عەرەبی ناویان (مخارج الحروف)ە.

مەسەلەی دوەم ئەوەیە : ئادەمیزاد هەر ئادەمیزادە و هەر گەرۆی ئادەمیزادە دەنگ دروست دەکا ، ئەدیٚ بۆچی دەنگەکان لە زمانی هەمو نەتەوەکانی سەر زەوییندا وەك یەك نیین ، بە جۆرێکیتر بلەین بۆچی هەندیٚ زمان هیندیٚ دەنگیان هەیە و هەندێکی تر نییانە ؟ بۆ وەلامی ئەم پرسیارە دەبیٚ لە خودی ئادەمیزاد ووردبینەوە ، سەرەرای ئەوەی (کلیات)ی هەمو ئینسانەکان وەکو یەکە و هەمو ئینسانێك دوولاق و دو دەستی هەیە ، بە دو چاوان دەبینیٚ و بە دو گوێیان دەبیسیٚ ، بەلام داخوا هەمویان وەك لە یەك قالب دەرهاتبن وان ؟ لوتی هەمو ئینسانیٚ هەر لوتە و کاری لوت دەکا ، بەلام شکلیان وەکو یەکە ؟ هەروەها چاو ، دەست ، ... داخوا ژێیەکانی گەرۆی هەمو ئینسانەکان وەکو یەك ئەستور یا بارێکن ؟ توانی لەرینەوەیان وەك یەکە ؟ ئایا ئەو هەوایەی لە دەرونرا دێتە دەر و لە ژێیەکانی دەنگدەدا لە هەمو ئینسانەکاندا یەك تەووزمە ؟ با نەختێکی تر مەسەلەکە رونترکەینەوە ، بلوێرێکی قامیشەکەی باش گەیشتبیٚ و چاك ووشك بوبیٚ ، کونەکانی هەموی خشت و بە یەك ئەندازە بن و دورونیزیکییان لە یەکتری لە ئەندازەبیٚ ، دەگەل بلوێرێکی کە ئاوا نەبیٚ ، دەنگیان وەك یەك نابیٚ .

ئادەمیزادیش وەکو مەوجودێکی زیندو کە هۆیەکانی دەوروبەری خۆی کاری تێدەکەن ، هەربەم جۆرەیە ، ئەوەی وایکردوە خەلکی وولاتانی گەرمی ئەفریقا پێستیان رەش و ئەستور بیٚ و مۆیان قرژ و لێك هالاوبیٚ و خەلکی وولاتانی سەرۆی ئەوروپا پێستیان سپیٚ و تەنك بیٚ و ... وەلامێکە بە پیداویستی ژیانی تەبیعیٚ ئادەمیزاد دراوەتەوە ، جا هەر هەندیٚ هۆی لەم بابەتەیە کەوا دەکەن گەرۆی ئینسانەکانی هەندیٚ لە نەتەوەکان هەندیٚ دەنگی لیٚبێتەدەر و ئیٚ هیندێکیتر نەتوانی ئەم دەنگانە سازبکا .

نابیٚ لەو قسانە وا تێبگەین کە بەعزە دەنگێك مەخسوسی بەعزە زمانێکن و میللەتەکانی دیکە ناتوانن ئەو دەنگانەیان لە زمانەکەیاندا بیٚ ، (دەنگ)یش لە زماناندا دیاردەیێکی زیندوە ، پەیدادەبیٚ و گەشەدەکا و دەگوریٚ و لە ناویش دەچیٚ .

زمانی ئاوێستایی کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی زمانی کوردیٚ دەنگی (ل)ی نەبوە ، دەنگێکی هەبوە لە دو دەنگی (ت ، ه) پێکهاتوە کە ئێستا هەندیٚ کەس وەکو (ث)ی عەرەبی یا Th ئینگلیسی دەیخوێننەوە و بەعزێکیش (تھ.)ی تەلەفوزدەکەن ، وەکو ووشەی ( پەرتھوە ) کە ناوی یەکێك لە خێلاتی ئەشکانی بوە ، گەلیٚ کەس بە (پەرثوە)ی دادەنێن و بە عەرەبی ( فرثی )یە ، هەروەها لە زمانی ئاوێستاییدا دەنگی ( ذ ) و دەنگێکی تێکەلاوی

(خ ، ڤ) هەبوە ، ئێستا لەو زمانانەدا کە ئاوێستایی کاریتێکردوێ ئەو دەنگانە نەماوون ، لە سەرەتای بۆژانەوەڕا تا پەلاماری مەغۆلەکان ، دە زمانی فاسێدا دەنگی ( ذ ) هەبوە و ئەوەندە زۆربوە پیاو سەری لێشێواوە کە فلانە ووشە دەبێ بە (دال) بنوسرێ یا بە (ذال) تا (خواجە نەسیری تۆسێ) وەزیری (هەلاکۆ) دەستۆرێکی بۆ دانا ، ئەم دەنگە بەرەبەرە لەناوچوە و ئێستا بێجگە لە ووشەی عەڕەبێ خوازراوەدا نەبێ نابێندرێ .

لە زمانی کوردێدا نەك هەر دەنگی (ل) پەیدابوە بەڵکو (ڵ)یشی زیادکردوە کەچێ ئێستاش لە بن لەهجەی (کۆیە) و هەندێ ناوچەکانی هەولێرێدا زوربەی دەنگی (ل ، ڵ) وەکو (ر) تەلەفوزدەکەن و هیندێك لە خەڵکی کۆیە کە دەیانەوێ وەکو خەڵکی سلەیمانێ قسەبکەن ، لایان وایە هەمو (ر) یەك بکەنە (ل یا ڵ) ، بۆ نمونە ووشەی (شقارتە) دەگەنە (شقاڵتە) .

نمونەیێکی دیکە باسکەین ، هەر نوسراوێکی پەهلەوێ یا ئاوێستایی کە تا ئێستا زانایان خوێندویانەتەوە دەنگی (ص ، ع ، ق)یان تێدا نیە ( ئەگەر وای دابنێین کە تەلەفوزی ڕاستی دەنگەکانی پەهلەوێ و ئاوێستاییمان بەدەستەوەیە) بەڵام ئێستا ووشەی کوردێ کە بە (ق) دەستپێدەکرێن یا (ق)یان تێدایە ، هێچ کەمتر نێن لەوانەی بە دەنگێکی ڕەسەنی کوردێ دەستپێدەکرێن و هەروەها (ع)یش کەم نیە ، کەچێ بێجگە لە چەند ووشەیێکمان دەستناکەوێ کە بە (ژ) دەستپێبکا و ئەگەرچێ ئەم دەنگە لە دەنگە ڕەسەنەکانە ، لە پەهلەوێ و ئاوێستاییشدا هەر کەم بوە .

دەربارەی دەنگی (ص)یش دەبێ بڵەین کە لە کوردێ ئێستادا ، دەنگێ هەیە لەم دەنگە بچێ ، ئەوی ڕاست بێ ناتوانێن دەقاودەق بە ( ص )ی عەڕەبێ دابنێین ، بێجگە لە چەند ووشەیێکدا وەکو (صەگ ، صەت ، ... ) و زیاتر ئەم بۆرە دەنگی ( ص )ە وەختێ پەیدادەبێ کە دەنگی ( س ) دەکەوێتە پێش دەنگی ( ت ) ، سەرەڕای ئەوەش ناتوانێن خۆمان دڵنیابکەین کە دەنگی ( س ) لە زمانانی پەهلەوێ یا ئاوێستایێ و مادێدا ، هەروەك ( س )ی کوردێ ئێستا لە دەم هاتۆتە دەر و هێچ نەبێ جاروبارە و لە جێرانەتێ هەندێ دەنگی دیکەدا فێتکە و ئاوازەیێکی لێپەیدانەبوە و لە دەنگی ( ص )ی عەڕەبێ نێزیکی نەکردۆتەوە .

دەنگی ( ح )ش یەکێکە لەو دەنگانەی کەمۆری ناڕەسەنێ لە ناوچەوانی دەدرێ ، من لەبەر ئەوەی بڕوام وایە کە « نان ئەو نانەیە ئیمڕۆ لە خوانە » بۆیە هەر دەنگێکی ئیمڕۆ کورد ، کوردی سادەی لادێیێ و نەخوێندەوار دەیلێن ، با لە زمانی باوباپیرا نێشماندا نەبوبێ بە دەنگێکی کوردێ دەزانم چونکو وا تێدەگەم کە (ضرورت) وایکردوە ئەم دەنگەبێگانەیە بێتە ناو زمانی

کوردیَ ، چەند سەیردەبیَ لە ووشـەیێکی کوردیـدا کە ئیمرۆ بـە ( ق ) دەستپێدەکا یا (ق)ی تێدایە بە بەهانەی ئەوەی کە ئەم دەنگە دەنگێکی ڕەسەنی کوردیَ نیە ، بێنین بێکەنیە ( ک ) یا ( گ ) ، ئەم کارە یەعنی قەڵەمبازێکی چوار صەت و پێنج صەت سالیَ بۆ پاشەوە ، چونـکو لە لێکۆلینـەوەی زمـانەوانیَ دەردەکەویَ گۆڕانی دەنگێك بە دەنگێکی تر ئەوەندە ساڵەی وەخت لازمە .

چاوتان لێبیَ : ووشەی ( قشـقەڵە )ی موکریانیَ و ( قشـقەڕە )ی سلەیمانیَ یاخۆ ( قەل ) و ( قسە ) ئەگەر ( ق )ی نارەسەنمان کرد بەو دەنگەی پیَدەلەین ڕەسەن ، چیانبەسەردیَ ، سوك و هاسان دەبنە : گشگەرە ، گشگەڵە ، کسە ، گسە ، کەل ، گەل ، ... ، ... ، داخوا کامە کوردیَ لادێیَ یا زانا و خوێندەواریش بە بیستنی ئەم ووشانە شتێکیان لیَ حالیَدەبیَ بۆیە بەلای منەوە مەسەلەی دەنگی ( ڕەسەن ) و ( نارەسەن ) لە گۆڕیَنیە و ئێمە لە بەرامبەر حالەتێکی ( دێفاکتۆ ) داین سەرەڕای ئەمەش « ... لەو نوسینانەی کە لە گردی ( شمشـارە )ی نێزیك ڕانیـە دۆزراونەتـەوە ناوی ( حێش ، حینە ، قەبرە .. ) هەیە بەپێی ئەو ووتارانەی کە باسی دۆزینەوەکان دەکات ناوچەکە ناوچەیێکی ( خۆری ) بوە . جا ئەگەر ساغ بێتەوە کە ئەم ووشانە ناوی ( خۆریَ )ن و خۆرێش بە کورد دەربچن دەردەکەویَ لەو دەمانەدا ( ۱۷۰۰ پ. ز ) دەنگی ( ح ، ق ) لە کوردیدا هەبوە »(۱) .

من کە هێندە باسی ڕەسەنیَ و نارەسەنیَ ( دەنگ ) دەکەم ، نامەویَ خوێنەران وا بیربکەنەوە کە ئیَ وا هەن دەیانەویَ ئەو دەنگانەی بە خەیالی خۆیان نارەسەنن لە زمانی کوردیَ دەراوێن ، نەخیر مەسەلەکە وا نیە زۆرێش شوکرانەی دەویَ کە وانیە و مەسەلەی دەراوێشتنی شتی نارەسەن لە زمانی کوردیدا تا ئێستا لە سنوری دەراوێتن و ڕامالێنی ( ووشـە )ی نارەسـەن تێنەپەڕیوە و بەنیسبەتی دەنگی نارەسەن ! هێندەی تەشەنە نەکردوە ، بەلاَم لەوە دەترسێم کە ئـەو درم و پەتایەی دەربارەی ووشـە هەیـە و دەگەل ( دەنگ )ەکانێش سەرەتاتکێیەتیَ زیـاتر بلاَوببێتەوە . هەر ئێسـتا هەندیَ نوسەری کورد لە نوسینی ( ع ) سلّ دەکەنەوە ، خۆ باسی ( ص ) هەر ناکریَ ، خۆیان ناینوسن هێچ ئەگەر یەکێکێش بێنوسیَ لە دلیان گران دیَ .

( دەنگ ) بەردی بناغەی هەمۆ زمانێکە و ئەو دەنگانەی ئیمڕو لە زمانی کوردیدا هەن ( ڕەسەن و نارەسـەن ) بەروبۆی تطوری صەدان سـاڵە کە پێداویستیَ زمانەکەمان سەپاندۆیەتیَ و لەقاندنی بەردی بناغەی دێوار یا خانۆ

---

(۱) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردیَ لەبەر ڕۆشنایێ فۆنێتێکدا ، ل ـ ٥١ ، کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ۱۹۷٦ .

باش نیە ، من لەوە دەترسم خوای نەخواستە ئەوکارەی لە ملە و بەربەرەکانێ دوور و درێژدا ، زمانەکەمان تییدا سەرکەوتوە و نەیارانی زمانی کوردێ نەیانتوانیوە لەناوی‌بەرن ، بە دەستی یارانی ( متعصب ) سەربگرێ و زمانی کوردێ لە گرێژەنە بچێ و چیڕۆکی وورچەکەی مێشی لە خاوەنەکەی دەردەکرد و گاشە بەردێکی مالێ بە مێشەکەدا ، سەری خاوەنەکەشێ دەگەڵ پان‌کردەوە ، لە ئێمە ڕۆ بدا .

تعصب ، خۆی لە خۆیدا شتێکی خراپە لە هەر کارێکابێ و بۆ هەر چێکێ‌بێ ، لە سالانی دوای شۆرشی چاردەی تەموزەوە و بەلکو پێش ئەوێش تعصبی ووشە داتاشێن پەیدابوە ، هەر کەسێ دەستی قەڵەمی گرتوە ، لەبەرخۆیە دەستی کردوە بە ووشە داتاشێن ، گەلێکیان هەر تەرجومەی ووشە یا زاراوەیێکی بێگانە بوون کە حەزیان لێ نەکردوە . داتاشێنی ووشەی تازە بۆ زمانێك ، بەتایبەتێ لەم زەمانەدا کە هەموو ڕۆژێ شتی تازە دێتە گۆڕێ ، کارێکی خراپ نیە هێچ ، بەلکو پێویستیشە ، بەلام بەمەرجێ دەگەڵ دەستوری زمانی کوردێ بگونجێ نەك هەر کەس دەستێ قەلەم بگرێ هەق بداتەخۆی بەڕاستە و چەپەدا وەك ئاشی کرێوە ووشە دەرفرتێنێ ، یا زاراوەی زمانێکی‌تر وەرگێرێتە کوردێ کە ئەمەیان هەر ئێجگار ئێشێکی نالەبارە . بۆ نموونە باسی دەکەم لە زمانی عەرەبێدا زاراوەی ( القیام بـ ... و قام بەو ...) هەیە کە دەگەڵ زمانی عەرەبێ ئێستا گونجاوە ، نازانم کەنگی ئەم زاراوەیە کراوە بە کوردێ و بوتە (پێ‌هەلسان و پێی‌هەلسا و ...) کەسێش نەبوە بپرسێ : ( ئەوەی دانیشتبو دەستی دا گۆچانەکەی و پێی هەلسا ، یا خەوتبو بە دەنگی تەق و هۆڕ لە خەوی شێرێن هەلسا) بەلێ کەس نەبوە بلێ (هەلستان)ی کوردێ ، ئەگەر مانایەکێ (القیام)ی عەرەبێ بێ یایەکێك لە ماناکانی (القیام)ی عەرەبی بێ ، قەت ئەوە ناگەیێنێ هەمو لقوپۆپی یەکێکیان بۆ ئەوێتریان دەستدەدا ، بەتایبەتێ ئەگەر زاراوێش بێ . ئەم جۆرە شتانە نارەسەنن نەك (دەنگ) یا (ووشە)یێکی سالەهایە لەناو زمانی کوردیدا جێگای خۆی کردوتەوە و بوتە بەشێك لە زمانەکەمان .

ئێستا کە باسی داتاشێنی ووشە هاتوتە پێشێ ، ڕەنگە خراپ نەبێ بەسەرهاتی داتاشینی ووشەیەك بگێڕمەوە کە سێ سالێکی بەسەرچوە . سالی ١٩٤٣ بو لە شاری تەورێز ، خەرێکی چاپ‌کردنی گوڤاری «نیشتمان» بوم ، لە سوریارا ڕۆژنامەی (ڕۆژا نو)م بۆ هاتبو ، ووتارێکی تێدا بو کە لە دواییەکەیدا نوسرابو : «بەرواری ـ ر ـ ر ١٩٤٣» و پاشانێش ناوی (نوسەری ووتارەکە) ، لەو سەردەمەشدا ڕەسم وابو نوسەرانی ئێران یا شاعیرەکان لە دوایێ نوسێنەکانیاندا ووشەی (بتاریخ) و پاش ئەوێش ڕۆژ و مانگ و سالی نوسێنی ووتار و شیعرەکانی خۆیان دادەنا . کاتێ ئەم دوانەم پێکەوە بەراوەرد

کردن ، ووشەی (بەرواری) دەگەڵ (بتاریخ) بەرامبەر دەوەستان ، من بێ خەبەر لەوەی (بەرواری ناوی مەڵبەندێکە) ، (کەو)م لێبوو بە (زڕەکەو) و (بەروار) بە (تاریخ) ، ئیتر لەو سەعاتەوە هەروەك دوو (ڕێوی)م دەکونێکدا دۆزیبێتەوە وابوو ، هەرچی بەدەستی من چاپ دەکرا ، پێویست با یا نەبا وام ڕێك دەخست ئەم ووشە نایابەی خۆم دۆزیبوومەوە جێگایەکی دەستکەوێ خۆی تێ پەستێوێت .

وەکوو دەبینن ، ئەم ووشە بێ دایك و بابە ، دایکی (جەهل و نەزانین) و باوکی (تعصّبی کوێرانە)یە و خۆم لەو ڕۆژەوە کە هەستم پێکردوە ، وازم لە بەکارهێنانی هێناوە و ئەم چیرۆکەشم بۆ گەلێ کەس گێڕاوەتەوە ، بەڵام بە داخەوە هێشتا خەڵك هەن دەستبەرداری نەبوون . جا ووشەی لەم بابەتە ، کەم نەکەوتوونە زمانەکەمان : (واتا) و (گوزارە) لە باتی (مەعنا) ، (ڕاڤە) لە شوین شەرح و تەفسیر ، (ڕاژە) بەمانای خزمەت کردن ، (تەخشە لاکوم) جموجۆڵ ، (سپێد بالا) و (سپێد پەهنا) لە جیاتی (فەجری کاذب و فەجری صادق) ، گومانم نیە ئەم ووشە گەلە و دەیانی لەم بابەتە دایکیان دەگەڵ (بەروار)ەکەی گۆڕین یەکە ، بەڵام ڕەنگە باوکیان جیا بێ یا هەر باوکیان نەبێ و بە نەفەسی ( روح القدس ) گورابن .

من بە تەمای ئەوە نەبووم خۆ لە قەرەی ئەم باسە بدەم ، بەڵام قەڵەم سەرکێشی کرد و هەر ئەوەندە کەوتەڕێ خەریك بوو پڕکێشیش بکا و پێ لە بەڕەی خۆی زیاد ڕاکێشێ بۆیە ناچار بووم لغاوی بە دەمدا بدەمەوە و لە سنووری خۆیدا بیوەستێنم و بیگێڕمە سەر باسی (دەنگ)ەکانی زمانی کوردی کە ووتمان ئەو دەنگانەی ئێستا لە زمانی کوردیدا بەدەمدا دێن بەروبووی گۆڕان و گەشەکردنی صەتان ساڵە و پێداویست سەپاندوونی ئیتر پێی ناوێ خۆمان بە (ڕەسەنی) و (نارەسەنی)یانەوە خەریك کەین و باشترئەوە کە ئەم خۆ ماندووکردنە بۆ زیاتر پێشخستن و گەشەپێکرنی زمانەکەمان تەرخان بکرێ .

پاش ئەو هەموو درێژەپێدانە دەگەڕێینەوە سەر (دەنگ)ەکان ، بەلای منەوە ئەم دەنگانە لە زمانی کوردی ئێستادا هەن .

| ژمارە | پیت | تەلەفوز | ناو |
|---|---|---|---|
| ١ | ء | ، | هەمزە |
| ٢ | ب | bi | بێ |
| ٣ | پ | pi | پێ |
| ٤ | ت | ti | تێ |
| ٥ | ج | ci | جێم |
| ٦ | چ | ,Ci | چێم |
| ٧ | ح | 'Hi | حێ |
| ٨ | خ | xi | خێ |
| ٩ | د | di | دال |
| ١٠ | ر | Ri | رێ |
| ١١ | ڕ | 'Ri | ڕێ |
| ١٢ | ز | zi | زێ |
| ١٣ | ژ | Ji | ژێ |
| ١٤ | س | Si | سێن |
| ١٥ | ش | 'Si | شێن |
| ١٦ | ع | 'I | عەین |
| ١٧ | غ | GHi | غەین |
| ١٨ | ف | Fi | فێ |
| ١٩ | ڤ | Vi | ڤێ |
| ٢٠ | ق | Qi | قاف |
| ٢١ | ك | Ki | كاف |
| ٢٢ | گ | Gi | گاف |
| ٢٣ | ل | Li | لام |
| ٢٤ | ڵ | 'Li | ڵام |
| ٢٥ | م | Mi | مێم |
| ٢٦ | ن | Ni | نۆن |
| ٢٧ | و | Wi | واو |
| ٢٨ | هـ | Hi | هێ |
| ٢٩ | ی | Yi | یێ |

بۆ خاتری لەهجەی هەرە گەورەی زمانی کوردیّ (لەهجەی باکوریّ) دەبیّ دوّ دەنگی ( ط ) و ( ظ )ش بێنێنە ناو حیسابەکەمانەوە ، وەکو دەزانێن ووشە گەلیّ کە لە لەهجەی ناوەندێدا بە (ڤ) دەستپێدەکرێن یا دەنگی (ڤ)یان تێداهەیە بە پەنجە دەژمێردرێن ، کەچێ نەبێستراوە کەسێ ڕەخنەی هەبێ لەوەی (ڤ) لە ڕێزی دەنگەکانی کوردیّ حیساب دەکریّ ، گومانم نیە زۆرتر لەبەر ئەوەیە کە لە لەهجەی باکورێدا (ڤ) کەم نیە ، جا ئەگەر دەنگێکمان لەبەر ئەو هۆیە قبوڵکرد هێچ دەلیلێکمان بەدەستەوە نامێنێ لەبەر عەینی سەبەب دوّ دەنگی ( ط و ظ ) قبوڵ نەکەین کە ئەگەر لە دەنگی (ڤ) زۆرتر نەبن کەمتر نێن ، هەروەها دەنگی (ص) لە لەهجەی باکورێدا زۆرە و لە لەهجەی ناوەندێشدا وەکو لە پێشەوە باسمانکرد هەیە . بەلای منەوە دەبێ ئەم دەنگانەش بهێنرێنە ناو دەنگەکانی کوردییەوە ، بەم جۆرە دەنگەکانی زمانی کوردیّ ژمارەیان دەبێتە ٣٢ دەنگ .

خانی دەنگی زمانان (مخرج الحرف) لە بنی ئەوکڕا دەستپێدەکا و لە حاستی ئەو جێگەیەی دوّ لێوپێکەوە دەنوسێن (بە دێوی دەرەوەدا) دەبڕێتەوە، بۆیە لە هێچ زمانێکدا (دەنگ)ێك بە تەنیایێ لە نێوانی دوّ لێوان ناترازێ و نایەتە دەرێ ، ئیللا لە هەوادا پەڕش و بلاّو بێ و بکوژێتەوە . ئەدێ کەوایە چۆن گوێمان لە قسان دەبێ ؟ ئەگەر بمانەوێ زۆری درێژە نەدەینێ ، دەبێ بڵەین ( دەنگ بزوێن )ەکان ئەوانەی بە زمانی ئینگلیسی پێیان دەڵێن Vowels

بارمەتی (دەنگ)ەکان دەدەن و لە نێوان دوو لێوانەوە ڕایان دەکێشنە دەرێ و دەشیانپارێزن نایەڵن لە هەوادا بپوچێنەوە .

بۆ ئەوەی بزانێن ئەم دەنگبزوێنانە چن و کاری خۆیان چۆن ئەنجام دەدەن ، واباشە چاوێك بەکاری ڕادیۆدا بخشێنێن کە لە دوورەوە (لە ئیستگەی ڕادیۆ )ڕا دەنگمان بۆ دێنێ : کەسێك لە ئێستگەیێکی ڕادیۆ لە پشت میکرۆفۆنەوە قسەدەکا ، ئەم قسانە لە دەزگاکانی ئێستگەدا دەبنە شەپۆلی (دەنگ) و (ئاریەڵ)ی ئیستگە پالیان پێوەدەنێ بۆ ناو (هەوا) ، بەڵام ئەم شەپۆلانە توانایێ ئەوەیان نیە زۆر بڕ بکەن و بگەنە ڕادیۆکانی ئێمە و چەشنی شەپۆلی (دەنگ)ەکانی زمان لە هەوادا دەکوژێنەوە ، بۆیە لە هەموو ئێستگەیێکی ڕادیۆدا جۆرێك شەپۆلی تر دروستدەکرێ کە پێی دەڵێن شەپۆلی بارکراو ( الأمواج المحملة ) یا شەپۆلی باربەر ( الموج الحامل ) و شەپۆلی قسەکان لەم شەپۆلانە باردەکەن و بە ڕێگای (ئاریەڵ)دا بۆ ئێمەیان دەنێرن ، ئەوجار دێنە ناو ڕادیۆ چکۆلەکانمانەوە و لەوێدا (شەپۆلی قسە) و (شەپۆلی باربەر) لێك جیادەکرێنەوە شەپۆلی باربەر ڕێگای لێدەگیرێ و شەپۆلی قسان بەرێدەکرێن بۆ (دایرەیێکی کارەبایێ) و دەکرێنەوە دەنگ و بەهێز دەکرێن ، ئینجا دەدرێن بە میکرۆفۆنی ڕادیۆکەو ئێمە گوێمان لە قسەکان دەبێ ، بێ ئەوە بیری لێ بکەینەوە کە ئەو قسانە بە چەند قۆناغی سەیردا تێپەڕیون .

هەرچەند بە دووپاتەکردنەوەش حیساب بکرێ،ناچارێن بۆ بەراوەردکردنی (کاری ڕادیۆ) و (کاری دەنگ بزوێنەکانی زمان) ، بڵەین : هەوایەکی بە فەرمانی مێشك لە دەروونرا دێتەدەر ، (ژێ)یەکانی دەنگ وەلەرێن دەخا ، ئەو لەرەلەرانە بەرەو (خانی دەنگ)ەکان ڕادەدا و لە هەر (خان)ێکدا دەنگێك دروستدەبێ ، ئەوجار (دەنگ)ەکان بەرەو دەرەوەی دەزگای دەنگسازێ پاڵ پێوەدەنێ تا دەیانگەیێنێتە سنووری خانەکانی دەنگ (شوێنی پێکەوە نوسانی دوولێو بە دێوی دەرەوەدا) ، ئا لەم شوێنەڕا کاری (هەوا) کە دەگوڕێ ، تا ئێستا دروستکردن و ڕادانی دەنگ بوو لەناو دەزگای دەنگسازێدا و لەمە بەدوا ئەوکارە دەکا کە (شەپۆلی باربەر) لە ڕادیۆ دادەیکرد ، دەنگێ کە لە خانی دەنگ و لەناو دەزگای دەنگسازێدا دروست بوە دەخۆیەوە دەپێچێ و دەیهێنێتە ناو هەوای ئازاد و لیوەکان و زمان بە فەرمانی مێشك دەستدەکەن بە جوڵانەوە بەولاولای خۆیاند و ڕێگای تایبەتێ بۆ (دەنگ) دەکەنەوە ، ئەندازەی بزووتنەوە و زۆر و کەمێ ئەم بزووتنەوەیەی زمان و لێوان بۆ ئەولاولای خۆیان (لای سەرەوە ، پێشەوە ، پشتەوە) دەنگ بزوێنی جۆربەجۆری زمانەکانی لێ پەیدادەبێ کە ڕەوتی مێژوویێ و گۆڕان و گەشەکردن تا ئێستا دیاریێ کردوون ، ئاشکراشە لەم گەشتە مێژووییەی زماناندا گەلێ (دەنگ) و (دەنگ بزوێن)ی کۆن کەڵکیان بڕاوە و لە مەیدان چوونەدەر و گومانی تێدا نیە کە ئەم کارەی مێژوو نابڕێتەوە و هەمیشە شتی کۆن لەناودەچن و تازە جێگایان دەگرنەوە .

ئێستا دەتوانین دەنگ بزوێنەکان بەشێوەیێکی گشتی بناسین ، دەنگ بزوێنەکان وەکو دەنگەکانی زمان لە لەرینەوەی ژێیەکانی دەنگ و لە ئەندەرونی دەزگای دەنگسازیدا دروست نابن ، بەلکو هەوایەکی کە دەگەڵ (دەنگ) لە دەم دێتەدەر هەوای دەوروبەری خۆی دەشڵەقێنێ و بەهۆی جوڵانەوەی زمان و لێو باریکەرێیەکی بێ‌هەوا لە دەرەوە دەکاتەوە تا دەنگەکەی پێدابڕوا و لە هەوادا نەپۆچێتەوە .

چونکو هەمو دەنگێك خانێکی هەیە کە تەلەفوزی مومکین دەکا و لە دەنگەکانی دیکە هەڵی داوێرێ و دەنگ بزوێنەکان بێ ئەوەی دەنگێکیان لەپێشەوە بی تەلەفوز ناکرێن و زانایانی زمانیش سورن لەسەر ئەوەی کە دەنگ بزوێنەکان خۆشیان هەر (دەنگ)ن ، دەبێ (خان)یان هەبێ بەڵام ئەم (خان)انە لە دەرونی دەزگای دەنگسازیدا (ئەوك ـ دوایی دولێو) نین و دەکەونە دەرەوەی ئەم دەزگایە ، بۆیە دەڵێین خانی دەنگی دەنگ بزوێنەکان ( خان )ێکی (سەلبی)یە لە حاڵێکدا کە دەنگەکانی هەمو زمانەکان (خان)ی (موجیب)یان هەیە کە دەکەوێتە دەرونی دەزگای دەنگسازی .

دەربارەی دەنگ بزوێنەکانی زمانی کوردی ئێستا ، دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف هەشت بزوێنی بەدی‌کردوە(٢) بەم جۆرە :

ا ، ە ، ێ ، ی ، ۆ ، و ، وو

a , e , ê , î , o , u , û

لەوانە ( i ، ) تایبەتی زمانی کوردییە و فرە زاناگی کورد مامۆستا تۆفیق وەهبی لەکاتی خۆیدا (ی)ەکی کورتی کردوە بە نیشانەی ، بۆ نمونە نوسیویتی «هەندێ لەم جوملانە کورتین»(٣) کە بە رێنوسی ئێستا دەبێ بنوسین (هەندێ لەم جوملانە کورتن) ، پاشان هەر مامۆستا وەهبی خۆی (وادەزانم لە ساڵەکانی ١٩٣٠دا) ناوی ناوە (بزوێنە کوردی) .

بەلای منەوە ئەو کۆسپەی لە وشەی (کورتن)دا لە نێوان دو دەنگی (ت) و (ن) هەستپێدەکری و لە دەیان وشەی تریشدا هەر بەرچاو دەکەوێ ئەنجامی قرتان و جیابونەوەی (دەنگ)ە لە (خان)ی خۆی ، چونکو ئەگەر دەنگ بزوێنێکی بەدودا هات ئەو کۆسپە نامێنێ وەکو لە وشەی (کات) یا (کار)دا

---

(٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر رۆشنایی فۆنەتێکدا ، کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ل ـ ٢٥ ، ١٩٧٦ .

(٣) تۆفیق وەهبی ، دەستوری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل ـ ١٠ .

دەبێندرێ ، بەڵام لە ووشەی (کردن)دا لەبەر ئەوەی (دەنگ)ێکی بەدوودا هاتوە کۆسپەکە بەچاکی هەستی پێدەکرێ .

ئەم قسانەم نابێ وا لێك‌بدرێتەوە کە من لەو ڕایەدابم ئەم (کۆسپ)ە نابێ بە (بزوێن) یا (دەنگ بزوێن) حیساب بکرێ ، بەڵکو هەر وەك مامۆستا تۆفیق وەهبی دۆزیویەتەوە (بزوێن) و (بزوێنە کوردی)شە .



# گیروگرفتی رێنوسی کوردی

ئادەمیزاد لە سەرەتای ژیانی شارستانێتی خۆیدا بیروڕای خۆی هەر بە قسە دەربڕیوە کە دەموودەست لە هەوادا بێ‌سەروشوێن دەچۆ ، پێشکەوتن و گەشەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و پان و بەرین بونی پێوەندیەکانی نێوان میللەتان بەتایبەتی پێوەندی ئابوری و ئاڵ و گۆڕی شتومەك لەسەردەمێکی مێژوییدا گەیوەتە پلەیێکی وا کە پێویستی بە نەخش‌کردنی قسە لەسەر ( شتێ ) پەیدا کرد تا بنێردرێ بۆ دور یاوەکو بەڵگە هەڵبگیرێ ئەمە بۆتە هۆی پەیدابونی نوسین . ئەوەندی مێژو تائێستا ڕونی‌کردۆتەوە ، یەکەم جار (سۆمەر)ێکان ٣٥٠٠ ساڵ پێش عیسا لەسەر (قوڕ) و پاش ئەوانیش بە ٥٠٠ ساڵ (میسر)ێکان لەسەر (پاپیرۆس) نوسیویانە .

نوسینیش وەکو گەلێ شتی دیکە بە گەلێ قۆناغاندا تێپەڕیوە ، هەر لە نوسینی پێچەلپلۆچی (هیرۆگلیفی) و (بزماری) ڕابگرە تا دەگاتە (ئەلفوبێتکە)ی سادەی ئیمڕۆ لە دنیادا باوە و هەر پیتەی دەنگێك لە دەنگەکانی زمانان پیشان‌دەدا و « **ژمارەییێکی کەم‌نەبێ زمانانی ئینسان ماوەی نەخش‌کردنیان دەست نەکەوتوە و زوربەیان هەر بەسەر دەم و زارانەوە هاتوچۆیان کردوە ، مەرجی بنچینەیی بۆ ژیانی زمانێك ئەوەیە قسەی پێ‌بکرێ نەك نەخش بکرێ** »(١) جا زمانی کوردی ئەلەو زمانانەیە کە لە قۆناغی تازەیدا بەشێوەییێکی پان و بەرین ( نسبیاً ) دەرفەتی نەخش‌کران ( نوسران )ی بۆ هەڵ‌نەکەوتوە مەگەر لە سەرەتای ئەو چەرخەدا نەبێ ، بەڵام وەکو دەزانین بە درێژایی مێژوی پەیدابونی خۆی ژیاوە و گەشەی‌کردوە .

زمانی کوردی ئێستا ، بۆ نوسینی خۆی ئەلفوبێتکەییێکی هەڵبژاردوە کە زوربەی نێزیك بە گشت نەتەوە مسوڵمانەکان پێی دەنوسن ، نوسینی کوردی

---

(١) د. عەلی عەبدولواحید وافی ، سەرچاوەکەی پێشو ، ل ٢٤٥ .

له سەرەتای ئەم چەرخەڕا تا ئیمڕۆ گەلێ گۆڕانی بەسەرداهاتوە ، زۆر کەم‌وکوڕی کە لەسەرەتادا تێیداهەبۆ ، لە گۆڕی هەلگێراوون ، بەلام هێشتا لێی نەبڕاوە و ئەلفوبێیەکەی پێویستی بە دەسکاریێ هەیە ، ئەم پێویستییە هەندێ خوێندەواری کوردێ والێکردوە جاروبار بێر لە گۆڕێنێکی بنەڕەتی ئەلفوبێی کوردێ دەکەنەوە و پێشنیاردەکەن کە کوردێ بە خەتی لاتینی بنۆسرێ و هەر ئێستا لە هەندێ شوێن ئەوەندەی ماوەی نۆسین بە کوردێ هەبێ بە لاتینی دەنۆسن .

بەلای منەوە گیروگرفتی نۆسینی کوردێ لەوەدانیە کە ئەم ئەلفوبێتکەی ئێستامان کورتێ دێنێ و بە کەلکی ئەوە نایە پێی بنۆسین ، بەلکو لەوەدایە کە بەو جۆرەی پێویستە نەمانتوانیوە ئەلفوبێیەکە دەگەل تایبەتێکانی زمانەکەمان ڕێك‌بخەین و بەپێی ئەم تایبەتییانە سەنگ و سۆکێ تێدابکەین ، وا دەزانم ئەمەش بەروبۆی لاسایێ‌کردنەوەیێکی ناچاریە ، وەکو دەزانین پێشەنگی نۆسینی کوردێ (مەلا) و (میرزا)کانی کوردن ، ئەوانە بێجگە لە خوێندنی زانستەکانی دینێ کە بە زمانی عەڕەبێ بۆ ، وەکو زمانێکی فەرهەنگێ (سەقافێ) ئەو زەمانە ، گەلێ کتێبی فارسیشیان وەکی : گولستان و بۆستانی شێخی سەعدێ ، شانامە ، خەمسەی نیزامی ، مەسنەوی و . . . دەخوێند ، تەنانەت لە حوجرەی مزگەوتەکانی تورکیای عوسمانیش کە زمانەکەیان تا ڕادەیێکی زۆر لەژێر تەئسیری فارسێ و عەڕەبێدا بۆ ، ئەم جۆرە کتێبە فارسییانە دەخوێندران ، تەئسیری فەرهەنگی فارسێ لەسەر مەلا و خوێندەوارانی کورد لە هەمۆ شوێنێك ، وای لەوانە کردبۆ کە ئەگەر شعری شاعیرانی کورد ــ کە یەکەم نۆسینی قۆناغی تازەی کوردیە ــ یان دەنۆسیوە بە (ئیملا)ی فارسێ بۆ ، سەرنجێك لە نۆسینەکانی کوردێ سەرەتای ئەم چەرخە و دەستنوسەکانی دیوانی شاعیرانی کورد بۆمان دەردەخا هەرچەند زمانەکە کوردیە بەلام شێوەی (ئینشا) و (ئیملا)ی یا فارسییە یا تورکێ کە ئەمەی ئاخریان خۆی لەژێر تەئسیری فارسیدا بوە .

فارسێ و تورکێ هەر بەو خەتە دەنۆسرێن کە کوردێ پێ‌دەنۆسرێ و لە ڕێکخستنی ئەلفوبێیەکەیاندا دەگەل تایبەتییەکان و پێویستی زمانەکەیان تۆشی هەلەی گەورە بۆن و گیروگرفتی زۆر بۆ پەیداکردۆن . ئێستاش فارسێ ، بە سەلیقە یا بە زەبری چاك‌زانینی ڕێزمان نەبێ ، مومکین‌نیە ڕاست بخوێندرێتەوە و کەم‌وکوڕی نۆسینی لە کوردێ زیاترە .

سەید حەسەنی تەغێ زادە نۆسەر و ئەدیبی ئێرانێ ، لەپێش شەڕی دوەمدا نامیلکەیێکی لەسەر ئەم گیروگرفتانە نوسیبو ، وەکو نمۆنەیێك ناوی خۆی (حەسەن)ی هێنابۆ کە بە شێوەی فارسێ (حسن) دەنۆسرێ و گوتبۆی ئەگەر تەنیا نوختەی (ن)ەکەی بۆ دانەندرێ وبنۆسرێ (حس) ئیحتیمالی ئەوەی

هەیە ٦١٩ جۆر بخوێندرێتەوە(٢) ، بەڵام (حەسەن)ی کوردێ تەنیا شەش ئیحتیمالان هەڵدەگرێ کە یەکێکیان ڕاستەکەیەتێ .

یەکەم ڕۆژنامەی کوردێ بە ئیملای تورکێ نوسراوە و لەپاش شەڕی یەکەمینەوە کە لە خاکی دەولەتی تازەی عێراق ، نوسینی کوردێ بە شێوەیێکی ڕەسمی و بەرێن دەستیپێکردوە ، لە سەرەتاوە بە ئیملای فارسێ دەنوسرا ، ئاشکرایە کە لە ڕێگەی لاسایێکردنەوەی ڕێنوسی فارسێ و تورکێ هەمو کەموکوڕێ و گیروگرفتەکانی نوسینیشیان هاتوتە ناو نوسینی کوردێ و لە ماوەی ئەم حەفتا هەشتا ساڵەی دوایێدا بەرەبەرە هەستەبەم گیروگرفتانەی نوسێن کراوە ئەوەندەی مومکین بوبێ لە گۆڕێ هەڵگێراوون و ئەلفوبێیەکە زیاتر و باشتر دەگەڵ تایبەتییەکانی زمانی کوردێ گونجێنراوە .

لەم قۆناغەی ئێستادا گیروگرفتی نوسینی کوردێ دەگەڕێتەوە سەر هەندێ ووردەبابەتی فۆنێتیکی و دەتوانم بڵێم هەر (دەنگ بزوێن)ەکان دەگرێتەوە چونکو زۆر خۆماندوکردنی پێناوێ بۆ ئەوەی ڕونبێتەوە کە پیتەکانی ئەلفوبێی ئێستامان زۆرچاك لەباریاندا هەیە (دەنگ)ەکانی زمانی کوردێ بنوێنن ، چاکترێن بەڵگە بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە کە ئێمە تەنیا دو دەنگی ( ڕ ، ڵ )مان هەیە کە ناچاربوبین نیشانە لەسەر پیتەکانیان دانێین .

هەندێ ڕەخنە ئاڕاستەی ئەم ئەلفوبێتکەیە دەکرێ ، وەکو : زۆری نوختە لەسەر پیتەکان ، و یەکچونی شکڵی هەندێ لە پیتەکان ، لە کاتی نوسینا دەبێ زۆرجار دەست یا قەڵەم لەسەر کاغەز هەلبگیرێ ، .. و ... گومان دەوەدانیە کە ئەم ڕەخنانە هەمویان ڕاستن و نوسینی کوردێ پێویستی بە دەستکاریێ هەیە ، بەڵام خۆ ئەوەش دەزانێن پیویست شتێکە و ئیمکانی وەدیهاتن یا وەدیهێنانێشی شتێکی دیکەیە و دەبێ بەکاوەخو کاری بۆ بکرێ ، سەرەڕای ئەوەش ئەم ئەلفوبێتکەیە ، ئەگەر کەموکوڕێ و ناتەواوێ هەیە محسناتیشی هەیە و دۆزینەوەی چارە بۆ هەندێ گیروگرفتی ڕێنوسەکە لام‌وایە وای‌لێدەکا بۆ کوردێ نوسێن لە ئەلفوبێتکەی زمانانیتر چاتربێ .

ووتمان ئەم ئەلفوبێتکەیەی ئێستا کوردێ پێدەنوسێن پیتەکانی پڕ بەپێستی دەنگەکانی زمانی کوردێن ، بەڵام کە هاتینەسەر دەنگ بزوینەکان ئێشەکە دەگۆڕێ و ئەوێ ڕاستبێ بەشی هەرە زۆری گیروگرفتی نوسینی کوردێ دەگەڕێتەوە سەر ئەو پیتانەی بۆ (دەنگ بزوێنە)ەکان دیارکراوون . وەکو دەزانن چوار پیتی (ئەلف) و (واو) و (هێ) و (یێ) بۆ حەوت (دەنگ بزوێن)ی a ، e ، ê ، î ، o ، u ، û کەلکیان لێ وەردەگیرێ، جا دو دەنگ بزوێنی A ، E

(٢) نازانم ژمارەکەم باش لەبیرماوە یان نا ، بەڵام دڵنیام لەوە زیاتری نەنوسێبێ کەمتری نەنوسیبو .

کە بە (ئەلف و هێ) دەنوسرێن گیروگرفتێکی ئەوتۆیان نیە مەگەر دەنگی ( هـ ) نەبێ کاتێ دەکەوێتە دوایێ ووشەیێك و پێویستە دەنگی دەربچێ ، ئەوانیتر لە نوسینا سەر لەپیاو دەشێوێنن و هەرکەسە بە جۆرێکیان دەنوسێ ، هێندێك بە دوو (واو) و دوو (یێ) و هێندێکیتر بە (واو) و (یێ)ی نیشانە لەسەر و هەڵدەکەوێ سێ چوار (واو) یا دوو سێ (یێ) بە شوین یەکترا وەکو قاز و قولینگ ملەقوتە دەکەن .

لەم دوایانەدا کۆڕی زانیاری کورد (ۆ) لەباتێ (û) و (ێ)ی لەجیاتی (î) پەسندکرد بەمکارە ئەم دوو دەنگ بزوینەش تا ڕادەیێك چارەیێکیان بۆ دۆزرایەوە، دەمێنێتەوە دەنگ بزوێنەکانی کە کاری ژێر و بۆر (کسرة و ضمة) دەکەن هێشتا دەگەڵ پیتی نیشانەی دەنگی (واو) و (یێ) شکڵیان یەکە و تەنانەت نیشانەیێکیشیان بۆ دیاری نەکراوە .

سەرنجێکی پچوك بۆمان دەردەخا کە لە هەشت دەنگ بزوێنی زمانی کوردی چواریان دەگەڵ دەنگی (یێ) و دوویان دەگەڵ (واو) وێکدەچن . لەپێش هەموشتێکدا مەسەلەکە ئەوەیە کە لە شکلی (دەنگ) بۆ (دەنگ بزوێن) کەڵك وەرگیراوە کە باوەڕناکەم لە هێچ ئەلفوبێتکەیەکدا ئەوە هەبێ ، لەلایەکی دیکەوە نەبونی هێچ ئیشارەیەك بۆ (ژێر و بۆر) کە بە (ی ، و) دەنوسرێن ، بە یەکجاری وەکو دەنگی (واو) و (یێ) دەیانخاتە بەرچاوان و سەرەڕای ئەوانەش بۆ (بزوێنە کوردی) هێچ پیتێك لە ئەلفوبێیەکەماندا نیە .

(دەنگ) و (دەنگ بزوێن) دەستکردی ئینسان نین و بۆیەش کەسێ بە هەر زمانێك قسەبکا بۆی‌نیە و نابێ دەستکاریان بکات ، وەك یەکێك بێت و هەر لەخۆیەوە بڵێ فلانە دەنگم قبوڵە و فیسارە دەنگ بزوێنم ڕا لێ‌نیە ، بەڵام پیتەکانی ئەلفوبێتکە ، ئادەمیزاد بۆ ڕاپەڕاندن و هاسانکردنی کاروباری خۆی دایهێناون ئەگەر ئەم ئەرکەیان پێ جێبەجێ نەکرێ ئەودەمە دەستکاریکردن یا گۆڕینیان دەبێتە پێویست ، وەکو لەسەرەوەتر باسمانکرد ئێمە ئێستا بەدەست بەشێکی پچوکی (دەستکرد)ی خۆمانەوە گرفتارێن و هەرچەند نوسەرێ بە جۆرێك و ڕێنوسێك دەنوسن .

من لەم بابەتەوە پێشنیارێکی دوورودرێژم نیە ، بەڵام ئەوەندە دەزانم وەکو نیشاندرا ، هەمو گیروگرفت و هەمو پاشاگەردانی نوسینی کوردی لەسەر هەشت دەنگ بزوێن کۆدەبێتەوە کە یەکیان (بزوێنە کوردی) هەر هێچی بۆ نەکراوە و دراوەتە دەست سەلیقەی خوێنەران و حەوتەکەی باقیش ، ئێستاش بەستەیە بە سەلیقەی نوسەران چۆنیان دەنوسن خۆیان دەزانن .

ئەمەش بەلای‌منەوە دوو هۆی بنچینەیی هەیە، یەکەمیان ئەوەیە کە فەرقی (دەنگ) و (دەنگ بزوێن) نەکراوە ، دووەم ئەو پیتانەی بۆ دەنگ بزوێنەکان

دیاریکراون بێجگە لە (ئەلف) ، لە زمانی عەڕەبیدا نیشانەی دەنگن کە لە زمانی کوردیشدا ئەو دەنگانە هەن و هەر ئەو پیتانەیان بۆ تەرخانکراوە . گومان لەوەدا نیە بە خۆماندوکردنێکی کەم لەم گیروگرفتە رزگار دەبین و چیدی بەدەس (دەستکرد)ی خۆمانەوە نانالێنین . تا کەموکوڕیی ڕێنوسی ئێستا چارەیێکی دەکرێ ، وا دەزانم قبوڵکردنی ڕێنوسێکی (موحد) کە هەمو نوسەرێك قبوڵ بکا پێی بنوسێ ، واجبێکی نەتەوەیی و زانستی هەمو خوێندەوار و نوسەرێکی کوردە .



د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# فەرهەنگ نوسی*

فەرهەنگ ـ ئەو کتێبەیە ، کە وا وشەی تێدا تۆمار کراوە . جگە لە ریز کردنی وشە ، هەروەها لێی کۆڵراوەتەوە و مانای رۆنکراوەتەوە و لێکدراوەتەوە و شیکراوەتەوە و زانیاری دەربارەی چۆنێتی نوسینیان و بە دەما هاتنیان و پەیدابونیان ... دراوە .

هەرچەندە فەرهەنگ جۆری زۆرە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ دو جۆری سەرەکی جیا بکرێتەوە : یەك ـ فەرهەنگی ئینسکلۆپیدێ ، دو ـ فەرهەنگی فیلۆلۆژێ . فەرهەنگی ئینسکلۆپیدێ سەبارەت بە رودداو و دیاردە و خەڵك ... هتد دەدوێ . هەرچی فەرهەنگی فیلۆلۆژییە لە وشە دەکۆڵێتەوە ، واتە وشە کە دانەی زمانە کەرەستەی سەرەکی فەرهەنگی فیلۆلۆژییە .

لە فەرهەنگی ئینسکلۆپیدید خاسیەتی رێزمانی وشە و نیشاندانی چۆنێتی بەکارهێنانی و پەیدابونی و دروست بونی و چۆنێتی دەوری لە رستەدا ... بەر چاو ناکەوێ ، بەڵکو کاری سەرەکی لە لێکدانەوەی وشەدا ، رونکردنەوەی ئەو دیاردەیەیە کە وشەکەی لێوە هاتوە . بەڵام لە فەرهەنگی فیلۆلۆژیدا بە شێوەیەکی سەرەکی ، گرنگی بە وشەکە خۆی دەدرێ و مانای

* ئەم ووتارەی دوکتور ئەورەحمان لەسەر ئیزنی خۆیان لە کتێبی ووشەی زمانی کوردی وەرگێراوە و بەسوپاسی خۆمەوە لێرەدا بلاو دەکرێتەوە .

لێك‌دەدرێتەوە و حاڵەتی رێزمانیٖ دەنوسرێ و سەرچاوەی پەیدابونی نیشان دەدرێ و چۆنێتی بەکارهێنانی بەدیار دەخرێ .

فەرهەنگی ئینسکلۆپیدیٖ جۆر جۆرە ، وەك : ئینسکلۆپیدیٖ گەورە ، ئینسکلۆپیدیٖ بچوك ، ئینسکلۆپیدیٖ پزیشکیٖ ، ئینسکلۆپیدیٖ تەکنیکیٖ ... هتد .

فەرهەنگی فیلۆلۆژیٖ بە گوێرەی مەبەست و شێوەی لێکدانەوە و رۆن‌کردنەوەی کەرەستەی زمان ، دەتوانرێ بەسەر چەند جۆرێکدا دابەش بکرێ :

ئەو فەرهەنگانەی بە کەرەستەی زمانی زگماك ، مانای وشەی زمانێکی بێگانە لێك‌دەدەنەوە ، یاخود بە پێچەوانەوە ـ واتە بە کەرەستەی زمانێکی بێگانە ، مانای زمانی زگماك لێك‌دەدەنەوە . ئەم جۆرە فەرهەنگانە ، چۆن بۆیان هەیە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکیتر بن ـ واتە دوٖ زمان بن ، هەروەها بۆشیان هەیە لە زمانێکەوە بۆ چەند زمانێکی دیکە بن ـ واتە فرەزمان بن .

ئەم جۆرە فەرهەنگانە ( بە وێنە : فەرهەنگی کوردیٖ ـ عەرەبیٖ ؛ فەرهەنگی عەرەبیٖ ـ کوردیٖ ؛ فەرهەنگی کوردیٖ ـ ئنگلیزیٖ ؛ فەرهەنگی ئنگلیزیٖ کوردیٖ ؛ فەرهەنگی کوردیٖ ـ روٖسیٖ ؛ فەرهەنگی روٖسیٖ ـ کوردیٖ ؛ فەرهەنگی کوردیٖ ـ عەرەبیٖ ـ فارسیٖ ... هتد ) تا رادەیەك لە کاری فەرهەنگ‌نوٖسیٖ کوردیدا گرنگییان پیٖدراوە و ژمارەیەك فەرهەنگی کوردیٖ ـ بێگانە ، بێگانە ـ کوردیٖ نوٖسراوە .

لەتەك ئەو جۆرە فەرهەنگانەدا ، هەروەها فەرهەنگ هەن کە وشەی زمانێك بە کەرەستەی هەمان زمان لێك‌دەدەنەوە . ئەم فەرهەنگانەش چەشنی جیاوازیان هەیە ... بەداخەوە لە کاری فەرهەنگ نوٖسیٖ کوردیدا ، گرنگی بەم جۆرە فەرهەنگانە کەم دراوە(١) .

ـ ١ ـ

دەمێکە دەست بە کاری فەرهەنگ نوسیٖ کوردیٖ کراوە و دانەری یەکەم فەرهەنگی کوردیٖ کورد بووە . لە ساڵی ١٠٩٤ی‌ك ـ ١٦٨٣/١٦٨٢ی زدا

(١) لەو باسەدا کە لێرەوە دەستی پیٖ دەکەین ـ واتە لە باسی ئەو فەرهەنگانەدا ، کە هەر لە زوەوە تا ئەمڕۆ لە مێژۆی فەرهەنگ نوٖسیٖ کوردیدا دانراون ، ئەو راستییەمان بۆ روٖن دەبێتەوە .

شاعیری مەزنی کورد ئەحمەدی خانێ لە ژێر ناوی (نەوبەهار)دا فەرهەنگۆکێکی بە شیعر بۆ یارمەتیێ دانی منداڵانی کورد لە فێربوونی زمانی عەرەبیدا نوسیوە و لە سەرەتادا پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە :

نە ژ بو صاحب رواجان
بلکی ژ بوچوکی د کرمانجان
ئەم فەرهەنگە چەند جارێك لە چاپ دراوە :

یەك ــ لە پاشکۆی فەرهەنگەکەی یوسف ضیاءالدین پاشای خالدیێ(٢) و دوێ ــ لە کتێبەکەی (لی‌کۆك)ی زانای ئەڵماندا(٣) ...

یەکەم فەرهەنگی کوردیێ کە لە لایەن ئەوروپاییەکانەوە نوسرابێ ئەو فەرهەنگە ئیتالیایێ ــ کوردییە کە قەشەی ئیتالیایێ (ماوریزۆ گارزۆنی Maurizio Garzoni )لە ساڵی ١٧٨٧ دا لە ڕۆما لە پاشکۆی ئەو کتێبەدا کە لە بارەی زمانی کوردییەوە نوسیویەتی بڵاوی کردۆتەوە(٤) . ئەم فەرهەنگە دەور و بەری پێنج هەزار وشەی ئیتالیایێیە کە ماناکانیان بە شێوەی کوردیێ ئامێدیێ لێك دراوەتەوە و لە چۆنێتیێ شەرح و روونکردنەوە و دانی مانای وشەدا بە نیسبەت ئەو دەمەوە زۆر سەرکەوتووە وتەنانەت لەگەڵ ئەوەشدا کە نزیکەی (٢٠٠) ساڵێك بە سەر لە چاپدانیدا تێپەڕیوە ، هێشتا سوود و کەڵکی هەر بەردەوامە .

لە ساڵی ١٢١٠ی‌ك ــ ١٨٩٥ی ز دا شیخ مارفی نۆدێ لە ژێر ناوی ( احمدی )دا بە شیعر فەرهەنگۆکێکی عەرەبێ ــ کوردیێ داناوە . ئەم فەرهەنگۆکە هەر لە ساڵی ١٩٣٦دا دوێ جار لە چاپ دراوە : یەك ــ لە سلێمانیێ(٥) ، دوێ ــ لە بەغدا(٦) . پاش ئەوەش گەلێ جاری تر لەچاپ دراوەتەوە .

لە پاش نوسینی ئەو چەند کارەی لە سەرەوە ناومان بردن تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە لەم رووەوە هێچ شتێکی وەها نەنوسراوە کە شایانی باس بێت . ئەوەی کە هەبێت تەنها ئەو دوێ سەد وشەیەیە کە لە لایەن ریچ(٧) و ئەو ٢٧٣

---

(٢) یوسف ضیاءالدین پاشا الخالدی المقدسی ، الهدیە الحمیدیە في اللغة الکردیە ، استانبول، ١٣١٠ هـ ــ ١٨٩٣ م .

(٣) Le Coq, Kurdische Texte, Berlin, 1903 ; T. I. II.

(٤) Maurizio Garzoni, Grammatica e vocabolario della lingua Kurda, Roma, 1787.

(٥) شێخ مارفی نۆدێ ، احمدی ، سلێمانی ، ١٩٣٦ .

(٦) شێخ مارفی نۆدێتی ، احمدی ، بەغدا ، ١٩٣٦ .

(٧) C. J. Rich, Narrative of a residence in Koordistan and on the site of ancient Niniveh, ...... London, 1836 - 1837, pp. 394 - 398.

یەیە لە «فەرهەنگی بەراوردیێ هەمۆ زمان و شێوەکان »دا تۆمارکراوە[٨] .

لە سەرەتای نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەدا لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردیێ بە گشتیێ و نۆسینی فەرهەنگ بە تایبەتیێ کەوتە برەو . لە ساڵانی ١٨٥٦ و ١٨٥٧ و ١٨٥٨ دا رۆژهەڵاتناسی بە ناوبانگ ، زانای گەورەی رۆس — پێوتر لێرخ سیێ کتێبی لە بارەی کورد و کوردستانەوە بڵاوکردەوە[٩] . کە تا ئەمڕۆش لە کتێبخانەی کوردناسیدا هاوتایان کەمە و بە سەرچاوەیەکی رەسەن دەژمێررێن . لە کتێبی سێیەمیدا فەرهەنگێکی کوردیێ (کرمانجیێ ژۆرۆ) — رۆسیێ ( ل ١ — ٨٤ ) ، وە کوردیێ ( زازا ) — رۆسیێ ( ل ٨٥ — ١٠٨ ) لە چاپ داوە .

ئا. ژابا جگە لەو خزمەتەی کە لە تۆمار کردنی فۆلکلۆر و لێکۆڵینەوەی کورد و زمانەکەیدا کردۆیەتی ، لە نۆسینی فەرهەنگی کوردیدا کارێکی گەورە و خزمەتێکی بیێشوماری کردوە . ئەم زانایە خاوەنی یەکەم فەرهەنگی کوردیێ — فەرەنسیێ یە کە لە پاش خۆی بە فەرمانی ئەکادیمیەی رۆسیێ لە ساڵی ١٨٧٩دا فێردیناند یوستیێ بڵاوی کردەوە[١٠] . ئەم فەرهەنگە بریتیە لە (٤٦٣) لاپەڕە و (١٥) هەزار وشەی کوردیێ کە جگە لە لێکدانەوە و شەرح کردنیان لە داڕشتن و دروست بۆن و پەیدابۆنیان کۆلیوەتەوە و هەروەها لەگەڵ وشەکانی فارسیێ و عەرەبیێ و تورکیدا بەراوردی کردوون .

ئا. ژابا هەروەها دۆ فەرهەنگی تریشی داناوە : فەرەنسیێ — رۆسیێ — کوردیێ ، وە کوردیێ — فەرەنسیێ — رۆسیێ کە هێشتا بە دەستنۆسیێ ، ماونەتەوە و لە ئارشیفی ئەکادیمیەی زانستیێ سۆڤێت لە لێنینگراد هەڵگیراون.

---

(٨) П.С. Палас. Сравнительные словари всех языков и наречий, СПб., 1787, ч. I, № 77

( پ. س. پالاس ، فەرهەنگی بەراوردیێ هەمۆ زمان و شێوەکان ، پیترسبورگ ، ١٧٨٧ ) .

(٩) П. Лерх. Исследования об иранских курдах и их предках северных халдеях, СПб.. 1856. 1857. 1858

( پ. لێرخ ، لێکۆڵینەوە لە بارەی کوردەکانی ئێران و خالدیەکانی سەرۆی باو باپیرانیانەوە، پیترسبورگ، بەشی یەکەم ١٨٥٦ ، بەشی دوەم ١٨٥٧، بەشی سێیەم ١٨٥٨ .

(١٠) A. Jaba, Dictionnaire kurde - francais, StPetresbourg, 1879.

س. ری ـ میسیۆنێر (مبشر)ی ئەمەریکایی ماوەیەکی درێژ لە نـاوچەی هەکاری ژیاوە و سالی ۱۸۷۰ کورتەیەکی رێزمـانی کوردی بلاوکردۆتەوە(۱۱) لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا فەرهەنگۆکێکی بیست لاپەڕەیی کوردی ـ ئینگلیزی نوسـیوە .

نزیك کۆتایی سەدەی نۆزدە رۆژهەلاتناس ـ ئا. سۆتسین کتێبێکی لـە بارەی رێزمانی کوردیەوە بلاوکردەوە(۱۲) کە بەشـی سێیەمـی بریتییە لـە فەرهەنگۆکێکی کوردی ـ ئەلەمانی ( ل ۲۸۱ ـ ۳٤۱ ) .

لە کتێبەکەی س. ئا. یەگیزارۆڤدا کە لە بارەی ئەتنۆگرافیای کوردەوە نوسیوێتی(۱۳) ، چاومان بە دوو فەرهەنگۆك دەکەوێ : یەك ـ کوردی ـ رۆسی ( ل ۱ ـ ٦٥ ) ؛ دوو ـ رۆسی ـ کوردی ( ل ٦٦ ـ ۱۲۲ ) . یەکەم دەوری سێ هەزار ، دووەم ـ چوار هەزار وشەیەکی تیایە .

سالی ۱۸۹۳ یوسف ضیائەددین پاشای خالدی فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی لە ئەستەمبوڵ لە چاپ دا(۱٤) . ئەم فەرهەنگە ، کە (۳۱۹) لاپەڕەیـە ، لە سامانی فەرهەنگ نوسی کوردیدا کارێکی بە نرخە . . .(۱۵)

---

(۱۱) S. A. Rhea, Brief Grammar and vocabulary of the Kurdish Language of the Hakari district in (( Journal of the American Oriental Society )) , New Haven, 1872. Vol. X.

(۱۲) E. Prym and A. Socin, Kurdische Sammlungen, Abt I. II, S. Pbg, 1887 - 1890.

(۱۳) С.А. Егизаров. Краткий этнографический очерк курдов Эриванской губернии, "Записки Кавказского отдела Императорского Русского географического общества", книжка XIII, выпуск 2, Тифлис, 1891

س. ئا. یەگیزارۆڤ ، مێژۆیەکی ئەتنۆگرافی کورتی کوردی پارێزگای یەریڤان ، «هەوالەکانی لقی قەفقاسـیای کۆمەلی جوگرافیایی رۆسی ئیمپراتۆری » ، تفلیس ۱۸۹۱ .

(۱٤) سەرچاوەی ناوبراو ، یوسف ضیاءالدین پاشا الخالدی المقدسـی ، الهدیـة الحمیدیة في اللغة الکردیة ، استنبول ، ۱۳۱۰ هـ ـ ۱۸۹۳ م .

(۱۵) بۆ وەرگرتنی زانیاری پتر لە بارەی ئەم فەرهەنگەوە ، بڕوانە : مامۆستا نەجمەددین مەلا ، گەنجینەیەکی پڕ گەوهەری کوردان ، گۆڤاری «رۆژی نوێ» ، ژ ۱۲ ، سلێمانی ، ۱۹٦۰ ، ل ۲۱ ـ ۲۵ .

میجەر سۆن لە پاشکۆی ئەو کتێبەی لە ساڵی ١٩١٣دا لە لەندەن بڵاوی کردۆتەوە(١٦) ، فەرهەنگۆکێکی ئینگلیزیێ ـ کوردیێ ( ل ١٧٠ ـ ٢٨٩ ) داناوە . هەروەها لەو کتێبەشدا کە لە ساڵی ١٩١٩دا لە بەغدا لە چاپ دراوە(١٧) ، فەرهەنگۆکێکی ئینگلیزیێ ـ کوردیێ جەفتا لاپەڕەیی نوسیوە .

ساڵی ( ١٩١٦ )ش ف. نیکیتین فەرهەنگۆکێکی رۆسیێ ـ کوردیێ لە ورمیێ بڵاوکردەوە(١٨) و دوای ئەوە بە سێ ساڵ کتێبی رێزمانی میسیۆنێری ئەمەریکایی ل. و. فۆسۆم دەرچو(١٩) ، کە فەرهەنگۆکێکی شازدە لاپەرەیێ لەگەڵدا بڵاوکردۆتەوە ( ل ٢٦٢ ـ ٢٧٨ ) .

ـ ٢ ـ

## پاش شەڕی یەکەمی جیهان

### لە کوردستان :

لە ساڵانی ٣٠ی سەدەی بیستەمدا دەورێکی نوێ لە مێژوی فەرهەنگ نوسیێ کوردیدا دەست پیدەکات و ئەمەش یەکێك بۆ لە ئەنجامەکانی قوڵ بونەوەی هەستی نەتەوایەتیێ کە یەکێك لە بەرهەمە رۆشنبیرییە گرنگەکانی بریتیێ بۆ لە بایەخ پێدانی خوێندەوارانی کورد خۆیان بە لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەب و مێژوی گەلەکەیان . کاری فەرهەنگنوسیێ تا ساڵانی پەنجا لە چوارچێوەیەکی سست و سادە و ساکاردا مایەوە و ئەوانەی لەو ماوەیەدا بڵاوکراونەتەوە و شایانی باسن بریتین لە : یەکەم ـ لیستەی ئەو زاراوە کۆمەڵایەتی و سیاسیانەی جەلادەت عالی بەدرخان لە ساڵانی سیدا لە بەشێکی تایبەتیێ گۆڤاری «هاوار»دا لە ژێر ناوی « فەرهەنگۆك »دا بڵاوی کردۆتەوە ؛ دووهەم ـ ئەو زاراوانەی مامۆستا عەلادین سەجادیێ لە گۆڤاری « نزار »دا

(١٦) E. B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913.

(١٧) E. B. Soane, Elementary Kurmanji Grammar, Baghdad, 1919.

(١٨) В. Никитин. Краткий русско-курдский военный переводчик, Урмия, 1916

( ف. نیکیتین ، فەرهەنگی جەنگیێ رۆسیێ ـ کوردیێ ، ورمیێ ، ١٩١٦ .

(١٩) L. O. Fossum, A practical Kurdish grammar, Minneapolis, 1919.

بلاوی کردۆتەوە ؛ سێهەم ــ فەرهەنگۆکەکەی مامۆستا شاکر فەتاح کە ساڵی ١٩٣٤ لە چاپی‌داوە[٢٠] ؛ چوارەم ــ ئــەو فەرهەنگە عەرەبی ــ کوردییەی ، شاعیری کورد مامۆستا عەبدوللا زێوەر ساڵی ١٩٤١ دایناوە[٢١] ...

لە ماوەی ئەم بیست ساڵەی دواییشدا هەندێ مامۆستای دڵسۆز لەم مەیدانە پیرۆزەدا هەنگاوی گەورەیان ناوە و ژمارەیەك فەرهەنگی بایەخداریان بلاوکردۆتەوە و کاری فەرهەنگ نوسی کوردی پێشکەوتوە و پەرەی سەندوە و گەشەی کردووە .

مامۆستا گیو موکریانی دەورێکی گەورە و بەرزی لە مێژوی فەرهەنگ نوسی کوردیدا بینیوە و دەها ساڵ لە ژیانی لاوی و پیری بەو کارەوە بردۆتە سەر و لە ئەنجامدا چەند فەرهەنگێکی داناوە :

« رابەر » ــ فەرهەنگێکی قوتابخانەیی عەرەبی و کوردییە ، لە ســاڵی ١٩٥٠دا لە چاپخانەی کوردستان لە هەولێر دەرچووە[٢٢] . ئــەم فەرهەنگە نزیکەی (١٥) هەزار وشەی عەرەبییە ، کە ماناکانیان بە کوردی لێدراوەتەوە . لە کردنەوەی مانای وشە ، لە وەرگێڕانی وشە عەرەبییەکاندا بۆ کوردی ، لە شەرح کردنی ئەو وشە عەرەبیانەی لە کوردیدا بەرامبەریان نییە بە تێکڕایی سەرکەوتوە . هەرچەندە پتر لە ٢٠ ساڵ بە سەر دەرچوونی ئەم فەرهەنگەدا تێپەڕ بوە ، بەلام تاکو ئێستا سود و کەڵکی هەر بەردەوامە .

لە ساڵی ١٩٥٥یشــدا فەرهەنگێکی کوردی ــ عەرەبی ــ فارسـی ــ فەرەنســی ــ ئینگلیزی لە ژێر نــاوی « کوڵکەزێڕینە »دا بلاوکردەوە[٢٣] . وشەکانی ئەم فەرهەنگە بەسەر (٥٩) باسی بچوکدا دابەش‌کراون و لە هەر باسێکدا زوربەی ئەو وشــانە بەرچاو دەکەون کە پەیوەندیان بــەو باسەوە هەیە . هەرچەندە لەم فەرهەنگەدا ناتەواوی و کــەم و کورتی هەیە ، بەلام

---

(٢٠) شاکر فتاح ، فەرهەنگۆك ، ئینگلیزی ــ کوردی و کوردی ــ ئینگلیزیە ، رەواندوز ١٩٣٤ .

(٢١) ئەم فەرهەنگە کە تەرجەمەی فەرهەنگی « اختری »یە ، وەك دانەر نوسیوێتی لە بیست و پێنجی مانگی تەموزی ١٩٤١دا تەواو بوە . بەلام بەداخەوە تاکو ئێستا لە چاپ نەدراوە و بە دەستنوسی ماوەتەوە . ئەم دەستنوســە کە دو دەفتەری گەورەیە لە کتێبخانەی « کۆڕی زانیاری کورد »دا پارێزراوە .

(٢٢) گیو موکریانی ــ «رابەر» ، فەرهەنگێکی قوتابخانەیی عارەبی و کوردییە ، هەولێر، ١٩٥٠ .

(٢٣) گیو موکریانی ــ « کوڵکەزێڕینە » ، کوردی ــ فارسی ــ عەرەبی ــ فەرنسی ــ ئنگلیزی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ١٩٥٥ .

(٢٤) گیو موکریانی ــ « کوڵکەزێڕینە » ، کوردی ــ فارسی ــ عەرەبی ــ فەرەنسی ــ ئنگلیزی ، چاپی دوەم ، هەولێر ١٩٦٦ .

دەتوانرێ بەشی زۆری ئەو ناتەواوییانە بخرێتە ئەستۆی دواکەوتنی زانستی فەرهەنگ نوسیٖ کوردیٖ لەو سەردەمەدا .

مامۆستا گیو موکریانیٖ لە ساڵی ١٩٦٦دا چاپی دووەمی «کۆلکەزێرینە»ی دەرکرد(٢٤) . چاپی دووەم بریتییە لە هەڵبژێریٖ و پترکردن و هەروەها لەگەڵ چاپی یەکەمیدا گەلێك جیاوازیٖ هەیە و زۆر لەو کەم و کورتییانەی لە چاپی یەکەمدا هەبوٖن چارکردوە .

ساڵی ١٩٦١یش فەرهەنگێکی کوردیٖ ـ عەرەبیٖ لەژێر ناوی فەرهەنگی « مەهاباد »دا بڵاوکردەوە(٢٥) . ئەم فەرهەنگە چ لە بارەی زۆریٖ وشەوە و چ لە بارەی شێوە و شێواز و جۆری دانانیەوە ، گەلێك باشترە و کەم و کورتیٖ کەمترە وەك لەوانەی پێشوٖی . ژمارەی وشـە کوردییەکانی ئەم فەرهەنگە نزیکەی (٣٠) هەزار وشەیە ــ واتە دوٖ ئەوەندەی فەرهەنگی « رابەر »ە . لە جۆری ریزکردن و رێکخستنی وشـەکاندا و لـە چۆنێتیٖ لێكدانـەوە و یەکالاکردنەوە و دانی مانای وشەدا لەسەر رێگایەکی نویٖ و راست و جوان رۆیشتوە .

جگە لـەو فەرهەنگانەی باسـمان کردن ، مامۆسـتا گیـو موکریانیٖ فەرهەنگی « کوردستان »یشی داناوە . ئەم فەرهەنگە کە کوردیٖ ـ کوردییە هێشتا لە چاپ نەدراوە(٢٦) .

سـاڵی ١٩٥٥ مامۆسـتا عیززەددین مەلا مسـتەفا « فەرهەنگۆك بۆ قوتابییانی کورد »ی بڵاوکردەوە(٢٧) . ناوەرۆك و مەبەسـتی ئەم بەرهەمە ، وەك دانەر خۆی لەسەر بەرگ و لە پێشەکییەکەیدا پەنجەی بۆ راکێشاوە ، لێـکدانەوەی مـانای وشـە عەرەبییەکانی کتێبی خوێندنەوەی عەرەبیٖ پۆلی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی و ئاسان کردنی کار و پاشەکەوت کردنی کاتی قوتابییانی کوردە لە تێگەیشتنی ئەو وشانەدا ، کە لە پاشکۆی کتێبەکانیاندا تۆمار کراون .

شێخ محەمەدی مەردۆخ کە زانایەکی بە ناوبانگ و ناسراوی کوردە ، لە مەیدانی دانانی فەرهەنگی کوردیدا هەوڵ و کۆششێکی زۆری داوە . ئەوەی شایانی باسـە ئەوەیە کە فەرهەنگێکی « کوردیٖ ـ فارسـیٖ ـ عەرەبیٖ » لە

---

(٢٥) گیو موکریانیٖ ـ « مەهاباد » ، فەرهەنگێکی قوتابخانەییٖ کوردیٖ و عـەرەبییە ، هەولێر ، ١٩٦١ .

(٢٦) بۆ وەرگرتنی زانیاریٖ پتر لە بارەی فەرهەنگەکانی مامۆستا گیو موکریانییەوە ، بڕوانە : ئەورەحمانی حاجیٖ مارف ، چالاکیٖ مامۆسـتا گیو موکریانیٖ لـە مێژوٖی فەرهەنگ نوٖسـینی کوردیدا ، رۆژنامەی « هاوکاریٖ » ، ژ ١٠٠ ــ ١٠٤ ، بەغدا ، ١٩٧٢ .

(٢٧) عیززەددین مەلا مستەفا ، فەرهەنگۆك بۆ قوتابیانی کورد ، بەغدا ، ١٩٥٥ .

سالی ١٩٥٦دا لە تاران لە چاپ داوە(٢٨) . ئەم کارەبەراستی کۆششێکی گەورە و نوسراوێکی بەنرخ و نایابە و کەلێنێکی گەورەی لە کاری فەرهەنگ نوسی کوردیدا پڕکردۆتەوە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند کەم و کورتییەکی تێدا دەبینرێ ، وەك ئەوەی کە هەندێ وشەی دروســت کراو کەوتوەتە ناو فەرهەنگەکەوە کە لە زمانی کوردیدا نین و لەگەڵ دەستوری زمانی کوردیدا ناگونجێن ، یاخود ژمارەیەك وشەی عەرەبی و فارسی وەهای تۆمار کردوە کە کورد بەکاریان ناهێنن . لە لێکدانەوە و شەرحی وشەشدا ناتەواوی و ئاڵۆزی دەبینرێ . ناتەواوی هەرە گەورەی ئـەم فەرهەنگە ئەوەتە کـە بە دەســت نوسراوەتەوە و بە زەنکۆگراف لەچاپدراوە . نوسینەوەکەشی بەشێوەیەکی فارسی شکستەیە . ئەوەش بوە بە هۆی ئەوە کوردی عێراق کە فارسی نازانن لە سنوورێکی تەسکدا نەبێ کەڵکی لێ وەرنەگرن ... بەڵام هێشتا ئەم کەم و کورتییانە ئەو کارە بە نرخە بێبایەخ ناکەن .

تاوەکو سالی ١٩٦٠ فەرهەنگێکی کوردی ـ کوردیمان نەبو . هەست و چالاکی مامۆستا شـێخ محەمەدی خاڵ ئـەم کەلەبەرەیان بۆ پڕ کردینەوە . ئەوەبو لە سالی ١٩٦٠ ـ ١٩٦٤دا بەرگی یەکەم و دووەمی فەرهەنگی «خاڵ» دەرچو(٢٩) ، کە تا کۆتایی پیتی (ڤ) دەگرێتەوە. مامۆستا خاڵ باشماوەکەشی خستوەتە ژێر چاپەوە .

فەرهەنگی « خاڵ » یەکێکە لـە فەرهەنگە سەرکەوتوەکانی کوردی و بەرهەمێکی بەنرخ و بایەخدارە و بە گشتی لەسەر شێوەیەکی جوان و راست دانراوە و گەلێك لەو گرانی و ناتەواوییانەی کە لە فەرهەنگەکانی پێش ئەودا هەبون ئەم ئاسانی کردون و پڕی کردونەتەوە .

بۆ لێکدانەوە و کردنەوەی مانای وشە نوسەر چەند رێگایەکی راست و زانستی گرتوە . بۆ ئەو وشانەی کە بتوانرێ بە یەك وشە مانایان نیشان بدرێ نیشانی داوە . ئەو وشانەش کە پێویستیان بە شەرح بوبێت شەرحی کردون. لە زۆر شوێنیشدا بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتن لە مانای وشـە و بۆ فێربونی بەکار هێنانی وشە ، وەك نمونە رستەی ئاسان و رێك و پێکی هێناوەتەوە...

هەرچەندە چـەند ناتەواوی و کەم و کورتییەکی کەم لـە « فەرهەنگی خاڵ »دا هەیە ، بەڵام ئەو ناتەواوییانە بـە جۆریك نین لە نرخی فەرهەنگەکە کەم بکەنەوە . بە گشتی فەرهەنگی «خاڵ» فەرهەنگێکی سەرکەوتوە و کارێکی گرنگ و پێویستە ، بەرهەمی رەنجی چەند ساڵەی مامۆستا خاڵە لە نواندنی

---

(٢٨) شێخ محەمەدی مەردۆخ ، فەرهەنگی « مەردۆخ » ، تاران ، ١٩٥٦ .

(٢٩) شێخ محەمەدی خاڵ ، فەرهەنگی « خاڵ» ، ب ١ ـ ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ـ ١٩٦٤ .

هونەرێکی بەرز لە دانانی یەکەم فەرهەنگدا لە کوردییەوە بۆ کوردی(٣٠) .

ساڵی ١٩٦٢ مامۆستا عەلائەددین سەجادی فەرهەنگێکی « کوردی ــ عەرەبی ــ فارسی » بڵاوکردەوە(٣١) مامۆستا لەم نوسراوەدا جگە لە پێشەکی کە بە هەر سێ زمان ــ واتە کوردی عەرەبی و فارسی نوسیویێتی ، بە تایبەتی لە کەم و کورتی و چەلـەمەی ئیملای کوردی دواوە ، هەروەها لـە ( ١٥ ) لاپەڕەیەکدا لە سەر ڕێزمانی کوردی نوسیوە و لە چەند شتێکی پێویست و سەرەتایی بۆ فێربونی زمان و بەکار هێنانی فەرهەنگ کۆڵیوەتەوە .

نوسەر وشەکانی ئەم فەرهەنگەی بەسەر (١٧) باسی فراواندا دابەش کردوە و ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە لە هەر باسێکدا زوربەی ئەو وشانە بەر چاو دەکەون کە پەیوەندییان بە سەرباسەکەیانەوە هەیە و بێگومان ئەمەش یەکێکە لە رووە چاکەکانی فەرهەنگەکە ... بەڵام بەداخەوە هەندێك کەم و کورتی بەر چاو دەکەون کە بوون بە هۆی ئاڵۆزکردن و شـێواندنی هەندێ ڕۆی ئەو نوسراوە . بە وێنە دەبینین لە ریزکردنی وشەکاندا نارێکی زۆرە و ئەمەش بووەتە هۆی زەحمەت کێشان لە دۆزینەوەی وشەدا . هەروەها زۆر جار لە ژێر سەرباسەکاندا وشە دەبینرێن کە پەیوەندییان لەگەڵ سەرباسەکەدا نییە یاخود زۆر وشە کە پەیوەندییان هەیە و کەچی نەنوسـراون . ئەمانە و چەند ناتەواوییەکی‌تر ، وەك دوپاتکردنەوە لە تۆمارکردنی وشەدا و هەڵەی ئیملا ... دەبینرێن .

« فەرهەنگا کوردی » ، کە مامۆسـتا جگەر خوێن دایناوە ، لە ساڵی ١٩٦٢دا بەرگی یەکەم و دوەمی لە بەغدا چاپکراوە(٣٢) .

ئەم فەرهەنگە کـە کوردی ــ کوردییە و بە شـێوەی کرمانجی ژوروە بێشك دەوری خۆی بینیوە و دەبینی ، بەڵام بەداخەوە لەم فەرهەنگەدا کەم و کورتی و ناتـەواوی ئێجگار زۆرە . ئەگەر ئـەم فەرهەنگە لەگەڵ فەرهەنگی « رابەر »ی مامۆستا گیو موکریانی ، کە لە ساڵی ١٩٥٠دا دەرچووە، یا لەگەڵ فەرهەنگی « خاڵ »ی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ، کە بەرگی یەکەمی لە

(٣٠) لە ژمارە ١٩ ــ ٢٢ی ساڵی ١٩٧١ی رۆژنامەی « هاوکاری »دا لـە ژێر ناوی « فەرهەنگی خاڵ »دا ، وە لە ژمارە ١٠٥ ــ ١٠٨ی ساڵی ١٩٧٢ی هەمان رۆژنامەدا لە ژێر ناوی « چەند رۆنکردنەوە و بەلگە و تێبینییەکی نوێ دەربارەی فەرهـەنگی خاڵ »دا زنجیرەیەك وتارم لە بارەی فەرهەنگی ناوبراوەوە بڵاوکردوەتەوە و بە دوور و درێژی باسـی زۆر ڕۆی ئەو کارەم تیا کردوە .

(٣١) عەلائەددین سەجادی ، دەستور وە فەرهەنگی زمانی کوردی ــ عەرەبی ــ فارسی ، بەغدا ، ١٩٦٢ .

(٣٢) جگەر خوێن ، فەرهەنگا کوردی ، ب ١ ــ ٢ ، بەغدا ، ١٩٦٢ .

سالی ۱۹٦۰دا بلاوکراوەتەوە بەراورد بکەین ، ئەوە دەبینین کە کەم و کورتی « فەرهەنگا کوردی » گەلێك زۆرترە وەك لەو دوو فەرهەنگەی لە سەرەوە ناومان بردن ، لەگەڵ ئەوەی فەرهەنگی مامۆستا جگەر خوێن لە پاش فەرهەنگی « رابەر » و « خاڵ » دەرچوە . لێرەدا وا دەردەکەوێ کە مامۆستا جگەر خوێن سوودی لەو فەرهەنگە کوردیانە نەبینیوە کە لەپێش فەرهەنگەکەی ئەو دەرچوون و زۆر کاری ئاڵۆزیان خاوکردۆتەوە و بەسەر گەلێك کۆسپدا سەرکەوتون(۳۳) .

موسا عەنتەر سالی ۱۹٦۷ لە ئەستەمبوڵ فەرهەنگێکی کوردی ـ تورکی لە چاپدا(۳٤) . ئەم فەرهەنگە ، کە یەکەم فەرهەنگە لە کوردیەوە بۆ تورکی ، دەور و بەری (۱۰) هەزار وشەیەك دەبێت . جگە لەوە ، دانەر لە پاشکۆی ئەم نوسراوەدا هەندێ لە دەنگەکانی زمانی کوردی دواوە .

سالی ۱۳٤۷ ی. ش. ـ ۱۹٦۸ی ز لە تاران م. ئەورەنگ بەرگی یەکەمی « فرهنگ کردی »ی بلاوکردەوە(۳٥) ، کە تەنیا پیتی ( آ ـ ب ) دەگرێتەوە . لەم بەرگەدا ٦٤۰۰ وشەی کوردی تومار کراوە و بە شێوەیەکی باش مانایان بە فارسی لێکدراوەتەوە . ئەم فەرهەنگە کە کوردی ـ فارسییە، کارێکی سەرکەوتو و نایابە ... نوسەر بۆ بەجێهێنانی ئەم ئەرکە ، سوودێکی زۆری لە کاری فەرهەنگ نوسی کوردی ( بە تایبەتی لە فەرهەنگی خاڵ و مەردۆخ و « مەهاباد »ی گیو موکریانی و تۆفیق وەهبی ) وەرگرتوە(۳٦) .

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسیش ، سالی ۱۹۷۰ فەرهەنگێکی عەرەبی ـ کوردی بە شیعر لە چاپ دا(۳۷). ئەم فەرهەنگە، کە لەسەر شێوەی فەرهەنگی « نەوبەهار »ی ئەحمەدی خانی و « ئەحمەدی »ی شێخ مارفی نۆدێ دانراوە، بەرهەمێکی بەنرخە لە کاری فەرهەنگ نوسی کوردیدا بەنیازی منداڵان فێرە وشەی عەرەبی کردن . ئەم نوسراوە بریتییە لە (۱۱۲) لاپەڕە و چەند باسێکی گرنگ و پێویست .

---

(۳۳) بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو سەبارەت بەم فەرهەنگە ، بڕوانە : ئەو زنجیرە وتارەی کە نوسەری ئەم باسە لە ژمارە ۱۲۷ ـ ۱۳۸ی سالی ۱۹۷۲ی رۆژنامەی « هاوکاری »دا لە ژێر ناوی « فەرهەنگەکەی مامۆستا جگەر خوێن »دا بلاوی کردوەتەوە .

(۳٤) Musa Anter, Ferhanga Kurdi - Tirki, Istanbul, 1967.

(۳٥) م. اورنگ ، فرهنگ کردی ، تهران ، ۱۳٤۷ .

(۳٦) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ل ٥ .

(۳۷) مەلا عبدالکریمی مدرس ـ « دوو ڕشتە » ، فەرهەنگێکی عەرەبی و کوردییە بە هەڵبەست ، بەغدا ، ۱۹۷۰ .

سالی ۱۹۷۱ ماموّستا عەبدولقادر بەرزنجی « فەرهەنگی زانیاری »(۳۸) ، سالی ۱۹۷۲ ـ ۱۹۷۳ ماموّستا مەعروف قەرەداغی « فەرهەنگی کشت و کاڵ »(۳۹) و سالی ۱۹۷٤ ماموّستا کەمال جەلال غەریب « فەرهەنگی زانیاری »(٤۰) یان بلاّوکردەوە . بیّگومان ئەم سیّ فەرهەنگە کاریّکی گەورە و پیّویستن و جیّگای خوّیان لە کتیّبخانەی کوردیماندا بەگشتی و سامانی فەرهەنگ نوّسیماندا بە تایبەتی گرتووە و هەروەها کەلیّنیّکی باشیان پرّکردوّتەوە . هەرچەندە لەم سیّ فەرهەنگەدا هەندیّ کەم و کورتی هەیە ، بەلاّم وەك تەجروبەی یەکەم لەو مەیدانەدا سەرکەوتوویی خوّیان نیشان داوە .

لەم دوّ سیّ سالەی دواییدا(٤۱) ، ماموّستا محەمەد ئەمینی میسری سەیدیان لە مەهاباد فەرهەنگوّکیّکی کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی بلاّوکردەوە(٤۲) . ئەم فەرهەنگوّکە ، بە تایبەتی لە شیّوازی ریّکخستنیدا و لە چوّنیّتی لیّکدانەوەی مانای وشە کوردییەکانیدا کەم و کورتی زوّر تیّدایە . بەراستی ئەم بەرهەمە لەچاو کاری فەرهەنگنوّسی کوردی ئەمروّدا ، کاریّکی زوّر سادە و ساکارە .

ئەوەی پەیوەندی بە دارشتن و دانان و دوّزینەوە و هەلبژاردن و وەرگیّرانی زاراوەوە هەبیّت ، ئەوەیە کە تا سالاّنی ٦۰ ئەم کارە بە شیّوەیەکی سست و سادە و ساکار بوّ ، بەلاّم لە شوّرشی چواردەی تەموّزەوە پیّش کەوت و پەرەی سەند . بەرهەمی ئەم دەورە بریتییە لە : ئەو زاراوە زانستییانەی لە لایەن چەند لیژنەیەکی تایبەتی جیاوازەوە دانراون و داریّژراون و لە چەند ژمارەیەکی سالی ۱۹٦۰ ی گوّڤاری « روّژی نوێ »دا بلاّوکراونەتەوە . راستە لە وەرگیّران و دارشتن و داتاشینی ئەم زاراوانەدا ناتەواوی و کەم و کورّی ئیّجگار زوّرن ، وەك لە وتارەکەی ماموّستا جەمال نەبەزدا(٤۳) کە رەخنەی تیا

(۳۸) عەبدولقادر بەرزنجی ، فەرهەنگی زانیاری ، سلیّمانی ، ۱۹۷۱ .

(۳۹) مەعروف قەرەداغی ، فەرهەنگی کشت و کاڵ ، ب ۱ ـ ۲ ، بەغدا ، ۱۹۷۲ ـ ۱۹۷۳ .

(٤۰) کەمال جەلال غەریب ، فەرهەنگی زانیاری ، عەرەبی ـ کوردی ، ب ۱ ـ ۲ ، سلیّمانی ، ۱۹۷٤ .

(٤۱) ئەم فەرهەنگوّکە دەست خەتە و زەنگوگرافی وەرگیراوە . نە سالی نوّسینی و نە سالی بلاّوکردنەوەی لە هیچ شویّنیّکدا توّمار نەکراوە . بەداخەوە ، نەمانتوانی سالی نوّسینی دەست نیشان بکەین . هەرچی سالی بلاّوکردنەوەیەتی ، لەو رایەداین کە ئەم دوّ سیّ سالەی دوایی بیّت .

(٤۲) موحەمەد ئەمینی میسری سەیدیان ، خود آموز سه زبان ، کردی ـ فارسی ـ عەرەبی .

(٤۳) جەمال نەبەز ، زاراوەکانی لیژنەی ریاضیات لە ژیّر وردەبینی لیّکوّلینەوەدا ، گوّڤاری «روّژی نوێ» سالی ۱۹٦۰ ، ژ ٦ ، ل ۱۰۲ـ۱۰۹ ؛ ژ ۷ ، ل۱۱۲ـ۱۲۱ ؛ ژ ۸ ، ل۸۵ـ۹۱ .

له زاراوه‌كانی لیژنه‌ی ریاضـیات گرتوه ـ خراوه‌ته پێش چاو ، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئـه‌م به‌رهه‌مه ده‌وری خۆی بینیوه و ده‌بینێ . دوا بـه دوای ئه‌م زاراوانه له لایه‌ن نه‌قابه‌ی مامۆستایانی سلیمانییه‌وه فه‌رهه‌نگۆكی «زاراوه‌ی زانستێ » ده‌رچۆ كه ۹۷ لاپه‌ڕه‌یه . مامۆستا غه‌فور ره‌شـید له زاراوه‌كانی به‌شی جوگرافیا كۆلیوه‌ته‌وه و ره‌خنه‌ی به‌جێی لێ گرتووه(٤٤) .

له سالی ۱۹٦۰دا مامۆستا جه‌مال نه‌بەز له ژێر ناوی «هه‌ندێك زاراوه‌ی زانستی »دا فه‌رهه‌نگۆكێكی له چاپ دا(٤٥) . له سالی ۱۹٦۰ ـ ۱۹٦۱یشدا به رۆنیۆ سه‌د نوسخه‌یه‌كی كتێبێكی له ژێر ناوی « فه‌رهه‌نگۆكی زانستی »دا بلاوكرده‌وه(٤٦) . یه‌كه‌م ـ نزیكه‌ی سێ سه‌د ، وه دووه‌م ـ ده‌ور و به‌ری سێ هه‌زار زاراوه‌یه‌ك یان تیایه .

دوای بلاوبۆنه‌وه‌ی ئه‌و چه‌ند به‌رهه‌مه‌ی له سه‌ره‌وه ناومان بردن، ماوه‌ی ده سالێك له‌م رووه‌وه هیچ شتێكی وه‌ها له چاپ نه‌دراوه كه شـایانی باس بێت . به‌ڵام له رێكه‌وتنه مێژوییه‌كه‌ی مارتی ۱۹۷۰ وه دێـسان هه‌سـت به بزوتنه‌وه‌ی ئه‌م كاره ده‌كه‌ین :

سالی ۱۹۷۱ لـه لایه‌ن لیژنه‌یه‌كی تایبه‌تییه‌وه ، كه ژماره‌یه‌ك له زانا و كوردێ زانی به توانا هاوبه‌شییان تێـدا كردوه فه‌رهه‌نگۆكێك كه بریتییه له كۆمه‌ڵێك وشـه و زاراوی عه‌ره‌بێ ـ كوردێ لـه ژێر ناوی « فه‌رهه‌نگۆكی زاراوه‌ی پارێزگای سلیمانێ »دا له چاپ درا(٤٧) . ئه‌م فه‌رهه‌نگۆكه نزیكه‌ی (١٤٠٠) وشه‌یه‌ك ده‌بێت و بۆ مه‌به‌ستی نامه نوسین له نێوان دام و ده‌زگاكانی فه‌رمانڕه‌وایدا دانراوه(٤٨) .

به‌ڕێوه‌به‌رێتی گشتی خوێندنی كوردێ له ژماره (٤)ی سالی ۱۹۷۲ی گۆڤاری « په‌روه‌رده و زانست »دا كه ۱۹٦ لاپه‌ڕه‌یه ، فه‌رهه‌نگێكی كوردێ ـ عه‌ره‌بێ بلاوكردۆته‌وه(٤٩) . كه بریتیه له‌و زاراوانه‌ی بۆ قوتابخانه‌كان پێویستن .

---

(٤٤) غه‌فور ره‌شید ، سه‌رنجێك له په‌راوی زاراوه‌كانی زانستی كوردێ ، گۆڤاری «رۆژی نوێ» ، سالی ۱۹٦۰ ، ژ ۱۲ ، ل ۲۷ ـ ۳٥ .

(٤٥) جه‌مال نه‌به‌ز ، هه‌ندێك زاراوه‌ی زانـستی ، سلێمانێ ، ۱۹٦۰ .

(٤٦) جه‌مال نه‌به‌ز ، فه‌رهه‌نگۆكی زانـستی ، هه‌ولێر ، ۱۹٦۰ ـ ۱۹٦۱ .

(٤٧) زاراوه‌ی پارێزگای سلێمانێ ، ۱۹۷۱ .

(٤٨) بۆ وه‌رگرتنی زانیاریێ پتر له باره‌ی ئه‌م فه‌رهه‌نگۆكه‌وه بڕوانه : ئه‌وڕه‌حمانی حاجێ مارف ؛ چه‌ند سه‌رنجێك ده‌رباره‌ی زاراوی پارێزگای سـلێمانێ ، رۆژنامه‌ی « هاوكاری » به‌غدا ، ۱۹۷۳ ، ژ ۱٦۱ ـ ۱٦۲ .

(٤٩) بڕوانه : گۆڤاری « په‌روه‌رده و زانـست » ، به‌غدا ، ۱۹۷۲ ، ژ ٤ .

سالی ١٩٧٤یش له ژماره (٧ ـ ٨)ی هەمان گۆڤاردا ، تێکڕای ئەو زاراوانەیان کۆکردۆتەوە، کە له فەرهەنگۆکی کتێبی قوتابخانەکاندا بلاّویان کردوەتەوە(٥٠).

کۆڕی زانیاری کورد بـه شێوەیەکی زانسـتی و فراوان گرنگی بـەم مەسەلەیە داوه و چاکی مەردایەتی بەلادا کردوه. و ڕێبازێکی زانسـتی دیار کردوه بۆ ئەوەی له سـنوری تواناندا بتوانێت بەرهەمێکی کامڵ بخاته بـەر دەست . تاکو ئێستا له کۆڕی زانیاری کوردا ژمارەیەکی زۆر لـه زاراوی کوردی هەڵبژێرراون و دارێژراون و داتاشـراون . ئەنجامی ئـەو هەوڵ و کۆششەش ، ئـەو چوار لیسـتەیەیە ، کە له هـەر چوار ژمارەی گۆڤاری کۆڕدا(٥١) و به سـێ کتێبی سەربەخۆ(٥٢) . بلاّوکراونەتەوه . ئەگەر کەم و کورتییەکی کەم له کاری ئەو زاراوانەدا هەبێ ، خۆ ڕووه باشەکەی و پوختی و نایابییەکەی و شێوه زانستییەکەی به جۆرێکه ، که تا ئەمڕۆ له کاری زاراوی کوردیدا هاوتای نییه .

جگه لەو فەرهەنگ و فەرهەنگۆکانەی له سـەرەوه ناومان بردن ، لەم ڕووەوه هەندێك کار هەن کـه به دەسـتەوەن . ئەوەی لـه ناویاندا سەرنج ڕادەکێشێ و پێویسته پەنجەی بۆ ڕابکێشین ، فەرهەنگی یەکگرتوی کوردی ـ کوردییه ، که لیژنەی فەرهەنگی کۆڕی زانیاری کورد خەریکه دای ئەنێ . به گوێرەی ئەو نەخشەیەی بۆی کێشراوه ، دەبێ ئەم فەرهەنگه . گەورەترین و زانستیترین فەرهەنگی کوردی بێت و هەموو وشەکانی کوردی به شێوەکانیەوه بگرێتەوه .

## له یەکێتی سۆڤیێت :

بایەخ دان به کوردناسی له ڕۆسیادا دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئەوەندەی تر پەرەی سـەند و بوونی کەمینەیەکی کورد لـەم ولاتەدا و ئەو گۆڕانه هەره

(٥٠) بڕوانه : گۆڤاری « پەروەرده و زانست » ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ژ ٧ ـ ٨ .

(٥١) بڕوانه : «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ل ٤١٩ ـ ٥٢٦ ؛ بەرگی دوەم ، ل ١٦٦ ـ ٢١٨ .

(٥٢) زاراوی کارگێڕی ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ ، پێشەکی و ڕێکخستنی د. کەمال مەزهەر ، بەغدا ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ ؛ زاراوی هەمەچەشنه ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ، پێشەکی و ڕێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ١٩٧٤ ؛ زاراوی هەمەچەشنه ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ، پێشـەکی و ڕێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ١٩٧٤ ؛ لیسـتەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ، پێشەکی و ڕێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ١٩٧٥ .

گەورەیەی بە سەر ژیانی نوێیاندا هات بۆتە هۆیەکی گرنگ و نوێی گەشە کردن و پێشکەوتنی کوردناسی سۆڤێت و یەکێك لە ئەنجامە هەرە گرنگەکانی ئەوەبو کە پاش ماوەیەك ڕۆڵەکانی ئـەم کەمینەیە خۆشـیان چاکیان لێ‌کرد بەلادا و چالاکانە هاتنە کۆڕەوە .

پەرەسـەندنی فەرهەنگ‌نوسـێ ، بێ‌گومان هەروەها بەسـتەیە بـە پەرەسەندنی کوردناسێ سۆڤێت خۆیەوە و لە ڕاستیدا یەکێکە لە رووە هەرە دیار و گەشەکانی . بۆ نمونە دەبینین :

سالی ۱۹۳۳ لە یەریڤان فەرهەنگێکی ئەرمەنێ ـ کوردێ(٥٣) ، وە سالی ۱۹۳٥ فەرهەنگۆکی زاراوەی ئەرمەنێ ـ کوردێ(٥٤) بلاوکرایەوە . یەکەمیان نزیکەی (۳۰۰) لاپەڕە و دووەمیان دەور و بەری (٥۰) لاپەرە دەبێ . هەر چەندە نوسەرانی ئەم دوو فەرهەنگە هەندێك وشەی کوردێ وایان داڕشتوە کە لەگەڵ دەستوری زمانی کوردیدا ناگونجێن ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوو فەرهەنگە دەوری خۆیان بینیوە .

سـالی ۱۹٥۷ فەرهەنگێکی نوێی ئەرمەنێ ـ کوردێ بلاوکرایەوە(٥٥) . ئەم فەرهەنگە بریتییە لە (۳٥۲) لاپەڕە و (۲۳) هەزار وشەیەك. هەر چەندە ئەم فەرهەنگە لە گەلێ رووەوە لەوانی پێشو چاکتر و سەرکەوتوترە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کەم و کورتێ زۆرە ، بە تایبەتێ لەوەی کە بەشە کوردییەکەی گەلێك وشەی رۆسـێ و ئەرمەنێ وەهای تێ‌کەوتوە کـە کورد بەکاریان ناهێنن و هەروەها بە زۆر پاشگری ( ی ، تی ، چی )یان لکاندوە بە هەندێك وشەوە و وشەی چەوت و ناڕاستیان لێ دروست کردوە .

هەر لە هەمان سالدا دوو فەرهەنگی دیکە بلاوکرانەوە ، یەك : رۆسێ ـ کوردێ(٥٦) ، دوو : کوردێ ـ رۆسێ(٥٧) . فەرهەنگی یەکەم کە دوکتۆر ئی.

---

(٥٣) خەبەرناما ژ زمانێ ئەلەبی ـ کورمانجی ، رەوان ، ۱۹۳۳ .

(٥٤) خەبەرناما تێرمینۆلۆجیێ ئەلەبی ـ کورمانجی ، رەوان ، ۱۹۳٥ .

(٥٥) سەمەندێ سیابەند ، ئارامێ چاچان ، خەبەرناما ئەرمەنی ـ کوردێ ، یەریڤان ، ۱۹٥۷ .

(٥٦) И.О. Фаризов. Русско-курдский словарь, Москва, 1957

( ئی. ئۆ. فارێزۆف ، فەرهەنگی رۆسێ ـ کوردێ ، مۆسکۆ ، ۱۹٥۷ ) .

(٥۷) Ч.Х. Бакаев. Курдско-русский словарь, Москва, 1957

( چ. خ. باکاییڤ ، فەرهەنگی کوردێ ـ رۆسێ ، مۆسکۆ ، ۱۹٥۷ ) .

فاریزۆڤ دایناوه بریتییه له (٧٨٢) لاپەڕه و (٣٠) هەزار وشەیەك . فەرهەنگی دووەم که دوکتۆر چەرکەزی بەکۆ ( باکایێڤ ) دایناوه بریتییه له ( ٦١٨ ) لاپەڕه و (١٤) هەزار وشەیەك . هەر یەك لەم فەرهەنگانە کەلێنێکیان پڕکردۆتەوه و شوێنی دیاریان له کوردناسیی سۆڤێتدا وەرگرتووه .

کوردناسی بەناوبانگ و ناسراو قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێڤ ) له سالی ١٩٦٠دا فەرهەنگێکی کوردی ( کرمانجی ژۆرو ) ـ ڕوسی له چاپ دا(٥٨) . که بەرهەمی ڕەنجی چەند سالی بو . دانانی ئەم فەرهەنگه دەستکەوتێکی گەورەیه له کاری فەرهەنگ نوسی کوردیدا و هەر لەبەر ئەوەشە شوێنێکی بەرزی له مێژوی فەرهەنگ نوسیماندا گرتووه .

نوسەر بۆ کۆکردنەوەی وشه هەولێکی زۆری داوه و گەلێك سەرچاوەی هەمەجۆرەی بۆ ئەم مەبەستە بەکار هێناوه و وشەی لە زوربەی بەشه دیالێکتەکانی کرمانجی ژۆرو ( و کەمێك له کرمانجی خوارۆش ) دەرهێناوه و بەم جۆره توانیوێتی دەور و بەری (٣٤) هەزار وشەیەك کۆبکاتەوه که بەشێکی زۆری وشەکانی دیالێکتی کرمانجی ژۆرو پێك دەهێنن و ئەمەش یەکێکه له هۆی سەرکەوتویی فەرهەنگەکه .

مامۆستا کوردۆ لە چۆنێتی وەرگێڕان و لێکدانەوەی مانای وشەکانی فەرهەنگەکەیدا له هەمان کاتدا هونەرێکی بەرزی نواندوه و به زمانێکی ڕەوان و ئاسان ، به وشەی بەرانبەری پڕ به پێستی خۆی شەرحی وشەکانی کردوه و مانایانی لێکداوەتەوه و هەر وشەیەك چەند مانای هەبێت هەمو ماناکانی به ڕوسی نوسیوه . بەمه و هەروەها به هێنانەوەی گەلێك پەندی پێشینان و قسەی نەستەق توانیوێتی دەوڵەمەندی زمانی کوردی نیشان بدا . له لایەکی ترەوه مامۆستا کوردۆ زوربەی وشەکانی فەرهەنگەکەی خستۆته ڕستەوه و بۆ ڕوسی وەری گێڕاون و لەم ڕێگەیەوه تێگەیشتن و بەکار هێنانی وشەکانی ئاسان کردوه ، خۆ ئەگەر وشەیەکی کوردی بەرانبەری له ڕوسیدا نەبی ئەوه به شەرحێکی کورت ئاشکرا مانای ئەو وشەیەی داوه به دەستەوه .

ئەم فەرهەنگه به یەکێك له فەرهەنگه بەرزەکانی کوردی دەژمێررێت و تەنانەت ئی. ئی. تسوکەرمان دەلی : « گەورەترین نوسراوی زانستییه له

---

(٥٨) К.К. Курдоев. Курдско-русский словарь, Москва, 1960

( ق. کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی ـ ڕوسی ، مۆسکو ، ١٩٦٠ ) .

کاری کوردناسیٖ سۆڤێتدا(٥٩) » .

نزیکەی دە ساڵێکە چەند کارگێڕێکی بەشی کوردییەکەی لێنینگراد بە سەرۆکایەتی قەناتی کوردۆ خەریـکی دانانی فەرهەنگێکی کوردیٖ ( کرمانجیٖ خوارێ ) ــ ڕۆسین و ئێستا ئامادەکراوە بۆ چاپ . ئەم فەرهەنگە کە نزیکەی ٣٠ هەزار وشـەیەکی کوردییە و کارێکی سـەرکەوتۆ و نایابە و هەوڵێکی زۆری لەگەڵدا دراوە و بۆ نۆسینی سۆد لە گەلێك سـەرچاوە وەرگیراوە .

دوکتۆر مەکسیمی خەمۆ کە کارگێڕی بەشی کوردییەکەی یەریڤانە چەند ساڵێکە خەریکی دانانی فەرهەنگێکی فرێزیۆلۆژیٖ کوردیٖ ــ ڕۆسییە و بێ‌شك ئەمە کارێکی پێویست و شایانە(٦٠) .

لە کۆتاییٖ ئەم بەشـەدا دەمەوێ سـەرەنجی خوێنەر بۆ ئەوە رابکێشم کە دەستنۆسی ئەو فەرهەنگە کوردیٖ ــ ڕۆسییەی ئاکادیمیٖ ئی. ئا. ئۆربیلیٖ لە ساڵانی بیستا نۆسیوێتی ئێستا لە لایەن کارگێڕانی بەشی کوردیٖ لێنینگرادەوە ئامادە کراوە بـۆ چاپ . بەو وتارەدا کە ئی. ئی. تسـوکەرمان و ژ. س. موسیلیان لە بارەی ئەم فەرهەنگەوە نۆسـیویانە وا دەردەکەوی کە کارێکی بایەخدار و نایاب و گرنگە(٦١) .

---

(٥٩) И.И. Цукерман. Очерк курдской грамматики, Москва, 1962, стр. 35

( ئی. ئی. تسوکەرمان ، ڕێزمانی کوردیٖ ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ) .

(٦٠) نۆسەری ئەم وتارە دەستنۆسی ئەو دۆ فەرهەنگە ــ واتە ئەوەی لە لێنینگراد بە سەرۆکایەتیٖ قەناتی کوردۆ نۆسراوە و ئەوەی لە یەریڤان مەکسیمی خەمۆ خەریکێتی ــ بینیوە .

(٦١) И.И. Цукерман, Ж.С. Мусаэлян. Курдско-русский словарь акад. И.А. Орбели, "Тезисы докладов II-й годичной научной сессии ЛО ИНА", март 1966, стр. 69-70

ئی. ئی. تسوکەرمان و ژ. س. موسیلیان ، فەرهەنگی کوردیٖ ــ ڕۆسیٖ ئەکادیمی ئی. ئا. ئۆربیلیٖ ، « کورتەی وتارەکانی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیٖ لێنینگراد » ، مارت ١٩٦٦ ، ل ٦٩ ــ ٧٠ .

**له ئەورۆپا :**

سالی ۱۹۲۰ ئاغا بطرس ئەلۆ لە ژێر ناوی «ڕێزمان و فەرهەنگی ئاسوری و کوردی و یەزیدی »دا کتێبێکی بلاوکردەوە(٦٢) ، نزیکەی (۹۰) لاپەڕەیەك دەبێت. بەشێکی کەمی ئەم نوسراوە دەربارەی ڕێزمانە و ئەوی کەشی فەرهەنگە .

لە پاش دەرچونی کتێبەکەی ر. ف. جاردین کە دەربارەی ڕێزمانی کوردی نوسیوێتی و لە سالی ۱۹۲۲دا لە بەغدا بلاوی کردۆتەوە(٦٣) و فەرهەنگۆکێکی کوردی ـ ئینگلیزیشی تیابە ، (ل ٥٥ ـ ١١٤) ، لە کوردناسی ئەوروپادا بۆ ماوەیەك هەست بە سستی و بێ بەرهەمی دەکرێت ، بە تایبەتی لە مەیدانی فەرهەنگ نوسیدا و تا ئەم سالانەی دوایی لەم بارەیەوە هیچ شتێکی وەها بلاو نەکراوەتەوە کە شایانی باس بێت . ئەوەی کە لەم ماوەیەی دواییشدا هاتبێتە کایەوە ئەمانەن :

سالی ۱۹٦٥ جویس بلو فەرهەنگێکی کوردی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی لە پاریس بلاوکردەوە(٦٤) . لەم فەرهەنگەدا هەندێ کەم و کورتی بەرچاو دەکەوێ، وەك ئەوەی گەلێك وشەی پێویست و ئاشکرا نەکەوتونەتە ناوەوە و هەروەها هیچ رستە و نمونەیەك بۆ ڕونکردنەوەی مانا و بەکارهێنانی وشە نەهێنراوەتەوە ... لەگەل ئەوەشدا ئەم فەرهەنگەکارێکی نایاب و بایەخدارە و کەلك و سودی زۆرە و لە مەیدانی کوردناسیدا ناسراوە .

ئەوەی شایانی باس و قەدر زانین بێت ئەوەیە لە سالی ۱۹٦٦ دا زانای بە ناوبانگی کورد مامۆستا تۆفیق وەهبی بە هاوکاری س. ئەدمۆنس فەرهەنگێکی کوردی ـ ئینگلیزی لە لەندەن بلاوکردەوە(٦٥) . ئەم فەرهەنگە یەکێکە لە کارە مەزنەکانی کوردناسی بە گشتی و یەکێکە لە فەرهەنگە

---

(٦٢) Agha Petros Ellow. Assyrian, Kurdish & Yizidis, Indexed Grammar and Vocabulary, with a few Grammatical Notes. Baghdad, Government Press, 1920.

(٦٣) R. F. Jardine, Bahdinan Kurmanji, a Grammar of the Kurmanji of the Kurds of Mosul division and surrounding districts of Kurdistan. Baghdad, 1922.

(٦٤) Joyce Blau, Dictionnaire Kurde - Francais - Anglais, Paris, 1965.

(٦٥) Taufiq Wahby and C. J. Edmonds. A Kurdish - English dictionary, London, 1966.

سەرکەوتووەکانی کوردیی بە تایبەتی . لەم فەرهەنگەدا گەلێك کاری ئالۆز و نائاشکرا لە ڕێگایەکی زانستییەوە یەکالا کراوەتەوە . بەنرخی و نایابی ئـەم کارە لە کوردناسیدا دەنگێکی باشی داوەتەوە .

لەم فەرهەنگەدا بەشێکی زۆری وشەکان خراونەتە ناو ڕستەی کورت و ئاسانەوە ، بەمە مانای وشەکان باشتر ئاشـکرا بوون و بۆ خوێنەریش لەم ڕێگەیەوە ڕوون بوەتەوە چۆن ئەو وشانە لە ڕستەدا بەکار بهێنێ . نوسەرانی ئەم فەرهەنگە بەمە لەگەڵ ئەو ڕایەی فەرهەنگنوسی نـاسراوی ڕوس ئـەکادیمی ( ل. ف. شێربا )دا یەك دەگرنەوە کە دەڵێ : بەینی وشەی زمـانێك لەگەڵ زمانێکی تر تەنها ئەوە نییە کە بەرامبەر یەکن و هاوواتان ، بەڵکو پەیوەنـدی ئالۆز و جیاوازیش لە شێوەی بەکار هێنانیاندا هەیە(٦٦) .

جگە لە چەند کەم و کورتییەکی زۆر کەم کە لەم فەرهەنگەدا دەبینرێ ، ئەوەی لەگەڵ ڕای من نەگونجێ ئەوەیە کە لە ڕێکخستنی فەرهەنگەکەدا تەنیا ڕەگی وشەکان نوسراوە و ئێنجا ئەو وشانەی لێیانەوە دروست دەبن لە دوایانەوە هاتون . بە بیری من پەیـڕەوی کردنی ئەم ڕێبـازە کە هەندێـك لە زانـایانی ڕۆژئاواش لە سەری ڕۆیشتون ، هەرچەند کاری چاپ ئاسان دەکات ، بەڵام دۆزینەوەی وشە لە فەرهەنگی کوردیدا ئاسان ناکات . هەروەها لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ لێکۆڵینەوە لە مەسەلەی زانستی وشـە Lexicology لە زمـانی کوردیدا زۆر کەمە دور نییە هەندێ وشە بە هەڵە نەکەونە ژێر ڕەگی خۆیانەوە.

لە ئەمەریکاش پەرتگای جیهانی (world publishing company) لە سالی ١٩٦٥ دا فەرهەنگۆکێکی ئینگلیزی ــ کوردی (٣٠) لاپەڕەیی بلاوکردەوە(٦٧) . ئەم فەرهەنگوکە بۆ گەریدەکان دانراوە و شەش قەوانی لەگەڵدایە .

لە سالی ١٩٦٧ یشدا ئەرنست مەکارۆس فەرهەنگێکی کوردی ــ ئینگلیزی لە چاپ دا(٦٨) . بەداخەوە کەم و کورتی و ناتەواوی لەم فەرهەنگەدا ئێجگار

---

(٦٦) Л.В. щерба. Опыт обшеи теории лексикографии, "Известия ОЛЯ АН СССР", № 3, Москва, 1940

( ل. ف. شێربا ) تیۆری فەرهەنگنوسی ، « هەوالەکانی ئەدەب و زمان لە ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت » ، مۆسکو ، ١٩٤٠ ، ژ ٣ .

(٦٧) Kurdish, The world publishing company, Cleveland and New York, 1965.

(٦٨) Ernest N. McCarus. A Kurdish-English dictionary, dialect of Sulaimania, Iraq. Ann Arbor ( Michigan ), 1967.

زۆره ، به تایبەتی له وەرگێڕان و لێکدانەوەی مانای وشه و له ریزکردنی وشه کوردییەکان و له ئیملادا ... هتد .

تائێستا نزیکەی(٥٠) فەرهەنگ و فەرهەنگۆکی کوردی بڵاو کراوەتەوە(٦٩) ـ واته گەنجینەیەکی بچوکمان هەیه . هەرچەنده زوربەی ئەم فەرهەنگانه ، لەبەر گەلێك هۆی ئاشکرا ، له سەر شێوه و رێگایەکی زانستی دانەنراون ، لەگەڵ ئەوەشدا به نیسبەت کاری فەرهەنگنوسی کوردییەوه چەند هەنگاوێکی گەوره نراوه و ژمارەیەك فەرهەنگی سەرکەوتومان هەیه .

به نیسبەت فەرهەنگه کۆنەکانەوه به بیری من دوانیان سەرکەوتون : ئەوانیش فەرهەنگی ئیتالیایی ـ کوردی (ماوریزۆ کارزۆنی) و کوردی ـ فەرەنسایی (ئا. ژابا) ن .

وەك ئاشکرایه ، ماوەیەکه کاری فەرهەنگنوسی کوردی خەریکه جێگەی شایانی خۆی له ژیانی رۆشنبیری و زانستی گەلی کورددا دەگرێت و هەندێك مامۆستای دڵسۆز ، وەك : تۆفیق وەهبی ، قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) ، شێخ محەمەدی خاڵ ، گیو موکریانی ، مەردۆخ ، عەلائەددین سەجادی ، چەر کەزی بەکۆ (باکایێف) ، جەمال نەبەز ، ئیڤان فاریزۆڤ ، سەمەندی سیابەند ، جگەر خوێن ... هتد لەم مەیدانه پیرۆزەدا هەنگاوی گەورەیان ناوه . ئەم مامۆستایانه له دەرگایەکی فراوانەوه چونەته ناو مێژوی رۆشنبیری کوردەوه ، بەوەی هەر یەکەیان له سنوری توانای خۆیدا ئەوەی له باریدا بووه بۆ پاراستنی زمانی نەتەوەکەی دڵسۆزانه جێ بەجێی کردووه و گەلێك رۆژهەڵاتناسی بێگانه باسی نرخی فەرهەنگەکانی مامۆستایان : تۆفیق وەهبی و قەناتی کوردۆ و شێخ محەمەدی خاڵ یان کردوه .

هەر چەنده له کاری فەرهەنگنوسی کوردیدا هەندێ کێشەی ئاڵوزی زانستی وشه Lexicology بەگشتی و زانستی فەرهەنگنوسی Lexicography به تایبەتی چارکراوه ، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك کێشەی تری زانستی وشه و زانستی فەرهەنگنوسی له زمانی کوردیدا هێشتا بیر و نوکی قەڵەمیان نەگەیشتوەتێ .

وەك ئاشکرایه ، کاری فەرهەنگنوسی به دو رێچکەدا تێدەپەڕێ : یەك ـ تیۆری ، دو پراکتیك. یەکەمیان رێژەوێکی تیۆری لەسەر شێواز و لێکۆلینەوەی زانستی دەهێنیته بەرهەم ، دوەمیش ئەو رێژەوه تیۆرییه له دانانی فەرهەنگدا تطبیق دەکات . له نێوان ئەم دو رێچکەیەدا پەیوەندی به هێز هەیه توند پێکەوه

---

(٦٩) شایانی باسه زوربەی ئەو فەرهەنگه کوردیانەی لەم وتارەدا ناویان براوه لە کتێبخانه رازاوەکەی « کۆڕی زانیاری کورد »دا هەن .

بەستراون و هەنگاو   بە هەنگاو لەتەك یەك دەڕۆن . فەرهەنگ نوسێك تەنها بە پراكتیك و زانینی خۆی لە دانانی فەرهەنگدا سەر ناكەوێت . بۆ ئەم مەبەستە پێویستە ئاوڕ لە ڕێزەوی تیۆریی بداتەوە . تیۆریی ڕوتیش ــ واتە بێ سـود وەرگرتن لە پراكتیك ئەنجامی بە كەڵكی نابێت .

ئەوەی لەم بارەیەوە شایانی باسە ، ئەوەیە لە دانانی هەندێ فەرهەنگی كوردیدا سود لە تیۆریی فەرهەنگنوسی وەرگیراوە ، بە تایبەتی لە فەرهەنگی ماموستایان : توفیق وەهبی و قەناتی كوردۆ ... دا ، كە لە ڕێگای هەوڵ و كۆشش و زانین و تەجروبەی خۆیانەوە گەیشتونەتە ئەنجامی بەكەڵك . بەڵام بە داخەوە ، دەربارەی زانستی فەرهەنگنوسی هیچ شتێكی ئەوتۆ بە زمـانی كوردیی نەنوسراوە و ئەمەش كۆسپێكی گەورەیە لە ڕێـگای فەرهەنـگنوسە بەڕێزەكانماندا .

وەك ئاشكرایە ، زمانی كوردیی بە تایبەتی لە كوردستانی عیراق وردە وردە بەرەو پێشـەوە دەڕوات بەڵام پێویـستە لەگەڵ ئەو پێشكەوتنەشدا تیۆریی فەرهەنگنوسی هەنگاوی خۆی بهاوێژێ و بە هاوكاریی پراكتـیك و تیـۆریی فەرهەنگی نایاب و بەنرخ بێتەكایەوە .



# ئەم قامۆسە

ئەم قامۆسە لەو ڕۆژەوە کە هەر بیرێك بەڵکو خەیاڵێك بۆ ، ئەویش خەیاڵی یەکێکی وەکو منی هیچ لەباراندا نەبۆ ، تائێستا کە ڕۆژگار کردۆیەتە حەقیقەتێك و خستۆیەتە بەردەستی خوێنەرانی خۆشەوێست ، لەم ماوە دوور و درێژەدا ، ئەم قامۆسە خەیاڵییە گەلێ گۆڕانی خەیاڵێشی بەسەردا هاتوە ، بەڵام هەمۆ شتێك سنوری هەیە و تەنانەت خەیاڵێش لە سنوری (هەمۆ شتێك ) بەدەر نیە .

سنورێکی (خەیاڵی قامۆس)ی منی لێدەگەڕایەوە و هەقی ئەوەی نەدەدا بەخۆی بێپەڕێنی ، قامۆسێکی فەڕەنسێ بۆ کە ناوی ( لاڕۆس )ە و هەرچەندێ کە بیری لێدە کەمەوە و بۆم دەردەکەوێ چەندە بەرز فڕیوم کە ویستومە قامۆسی (من !) وەکو (لاڕۆس) بێ بەخۆم دادەشکێمەوە کە چۆن ئەو هەقەم داوە بەخۆم هەر بیر لە دانانی قامۆس بکەمەوە ، قامۆسێکی وەکو (لاڕۆس) لەوێ بوەستێ ، بەڵام دڵخۆشێ خوم بە مەتەڵێکی فارسێ دەدەمەوە کە دەڵێ : « ئارەزۆ بۆ جحێڵان عەیب نیە » ، منێش ئەوسا کە ئەو بەرزە فڕییەم کردوە (جحێڵ) بۆم پاشانێش بۆتە تەوق و چۆتە ملمەوە .

ئەگەر تا ئەو ساڵانەی دوایێ ( لاڕۆس ) تاقە ( نوختە )یێکی ڕۆناك بۆ چاووم تێبڕێبۆ ، لەم دوایانەدا ( هەوێ )یەکێ بۆ پەیدابۆ ، بۆن بە دۆ (نوختە)، ئەو نوختە تازەیە ( فەرهەنگی فارسێ ) خوالێخۆشبۆ ( دوکتۆر محەممەدی معێن ) بۆ ، بەڵام دوایێ بۆمدەرکەوت کە من ( خێڵ ) بۆم و یەکم بە دۆ دیوە ، دوکتۆر معێنێش یەکێك لەو قامۆسانەی وەبەردڵی کەوتوە ( لاڕۆس ) بوە و دەڵێ : « لەم ناوەدا زیاتر ڕۆمان دە لاڕۆسی پچۆك بوە کە ئێرانێ بەتەواوێ پەسندیانکردوە »(۱) سەرەڕای ئەوەش لەبەر خزمایەتی نێزێکی زمانی کوردێ و فارسێ دەبێ بڵێم کە ( فەرهەنگی فارسێ ) دوکتور معێن لە هەمۆ

(۱) د. معین ، فەرهەنگ ، ج ۱ ، « مقدمە » ، ل ـ چلوهەشت .

هاوچەشنەکانی خۆی زیاتر بەکارم هاتوە و زۆرتر کەڵکم لێ وەرگرتوە ، بۆیە دەتوانین ئەم قامۆسە بە ئامێتەیێکی لاسایی کردنەوەی ( لارۆس ) و (فەرهەنگی فارسی ) دابنێین .

ئەم قامۆسە ئەگەر هیچی بۆ ڕێکنەکەوێ تەواوبوَن بەخۆیەوە ببینێ ، زیاتر لە چل هەزار ووشەی زمانی کوردی ( لەهجەی ناوەندی ) تێدا دەبێ . خۆی لە سەرەتایەك و ( ووشەنامە )کە پێکهاتوە و سەرەتاکەی ئەم باسانەی تێدایە : پێشگوتن ، زمانی کوردی لە قۆناغی ئێستایدا ، هیند و ئورۆپایی بنەمای گەورەی زمانان ، زمانی (ماد)ەکان چ بوە ؟ ، زمانی ئاوێستایی زمانی پارسی کۆن ، دەوری ناوەڕاستی خێزانە زمانی ئێرانی ، زمانی پارتی (پەهلەوی) ،ئەوەی ناویان‌ناوە پەهلەوی ساسانی، بەسەرهاتی زمانی پەهلەوی ئەشکانی ، زمانی کوردی ، زمانی کوردی پاش ئیسلام ، لەهجەکانی زمانی کوردی ، لەهجەکانی کوردی چۆن پەیدابوَن ؟ گۆرانی (هەورامی) — زازا ، دەربارەی (دەنگ)ی کوردی ، گیروگرفتی ڕێنوَسی کوردی، فەرهەنگ نوَسی « د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف » ، ئەم قامۆسە ، سەرچاوەکان ، خانۆکی کورتەنیشانەکان و پاشەبەرەی قسان .

هەرکاتێ صفەتی (خەیاڵی) وەپاڵ ئەم قامۆسە دەدەم وەنەبێ لە ڕاستی لامدابێ ، چونکوَ ئەوی ڕاستبێ تا ساڵی ۱۹۷۰ هەر خەیاڵی ڕوَت بوَ ، هەندێ یادداشتی پەرش‌وبلاوی ڕێکنەخراو ، لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی هەندێ ووشە کە هێشتا تێکنەکرابوَنەوە و تەنانەت لە دەفتەرێکیشدا نەنوَسرابوَنەوە، بەم حاڵەوە خۆم وەکوَ دۆستێکی جگەرەکێشی خۆم دەهاتە بەرچاو کە قەت جگەرەی نەدەکڕی و پێمان دەگوت « فلانکەس لە کەرەستەی جگەرەکێشان تەنیا دوَ لێوی هەیە » ، منێش لە کەرەستەی قامۆس‌دانان ئەوەم هەبوَ کە لەسەرەوە باسمکرد ، بەلام هەروەکوَ لە ( پێشگوتن )ی ئەم سەرەتایەدا ووتم بەرزونزمی ڕۆژگار مێشکی ئاخنێبوَم و زۆر شتی تێدا کۆکرد بۆوە .

ساڵی ۱۹۷۰ من دەستم بەتاڵ بوَ ، دەستمکرد بە تەماشاکردن و بەراوەردکردن و هەڵسەنگاندنی قامۆسەکانی کوردی ، دۆستێکی کۆنم یارمەتێکی شایانی سوپاسی دام و ( فێش )ەکانی سازکرد و خستنیەوە سەریەك و ڕێکی‌خستن ، ئەنجامی ئەم کارە ٥٢ بەرگ ( فێش ) بوَ کە ووشە (جامد)ەکان هەریەکەیان لەسەر فێشێك نوَسرابوَن و ( مشتق )ەکانیان هەلگیرابوَن بۆ وەختێ کە کاریان لەسەر دەکرێ ، هەر بۆیەش (فێش)ەکانی دەنگی ( هەمزە ) کە لە پێشدا چوار بەرگ بوَن دوای تەواوبوَن ژمارەیان گەیوەتە ۱۰ بەرگ .

وەختێ ئەم کارە تەواوبوَ کەوتمە سەروکاری ڕازاندنەوە و مانا لێدانەوەی ووشەکان ، وادیارە زەمانە حەزی نەدەکرد ئەم قامۆسە هەروا زوَ دنیای ڕوَن

بەچاوی خۆی ببینێ ، بۆیە لەم مەرحەلەیەدا تۆشی دۆ دڵێکی سەیری کردم و من کە تا ئەو کاتەش هەر چاووم بڕیبوە دانانی ووشەنامەیێکی ئاسایێ ، ئەوجار خەیاڵم کەوتە سەر پێکەوەنانی قامۆسێکی ئیشتیقاقێ ( ئێتیمۆلۆژێ ـ Etymologie ) و بێ ئەوەی سێودۆی لێبکەم دەستمپێکرد و لە ماوەی ساڵ و نیوێکدا فیشەکانی دۆ دەنگی ( هەمزە ) و ( بێ )م بەوجۆرەی بۆ قامۆسێکی ئیشتیقاقێ دەستبدا ڕێکخست ، لەناکاو هەروەکۆ یەکێکی لە سەرخۆشێکی ٘گەورە ئەغیار بۆبێتەوە بیرم لێکردەوە : هەیاران ! نەتەوەی کورد و زمانی کوردێ لەم قۆناغەدا پێویستیان بە قامۆسێکی ئیشتیقاقی هەیە ؟ یا نە خۆ ئەوەی مەبەستی گشت لایەکە قامۆسێکە کە باسی ووشەکانی زمانی کوردێ بکا ، بەڵام تەنیا هەر ڕێزکردنی ووشە نەبێ ، بەڵکۆ قامۆسێك بێ وەڵامدەرەوەی پێویستەکانی ئەم قۆناغەی ئێستامان بێ . ئەم پرسوڕایە «ڕێسەکەی لێکردمەوە خورێ» و سەرلەنوێ دەستم کردەوە بە ڕێکخستنەوەی (فیش)ەکان لەسەر بناغەی قامۆسێکی سادەی زمانی کوردێ ، کە هەر بە کوردێ و بە شێوەیێکی زانستێ ـ ئەوەندەی ئەقڵم پێدەشکێ ـ ووشەکان مانا لێبداتەوە ، ئەنجامی هەمۆ ئەو هەیت و هۆتە ئەمەیە کە لەبەر دەستتانە و بەم جۆرە کاری لەسەرکراوە کە لە خوارەوە باستان بۆ دەکەم .

## أ ـ ووشە :

١ ـ ئەم قامۆسە ژمارەیێکی زۆر ووشەی کوردێ و ئەوانەی لە زمانانی دیکەڕا (فارسێ ، عەڕەبێ ، ترکێ و زمانانی فەڕەنگێ) هاتۆنەتە ناو زمانەکەمان، تێدایە .

٢ ـ ووشەکان بە تەرتیبی ئەلفوبێ بەدوای یەکا ڕێزکراون و هەوڵدراوە ئەم تەرتیبە تا دوامێن پیتی ووشەکە بگرێتەوە .

٣ ـ هەمۆ ووشەیێك ، سادەبێ یا تێکەڵ ( مرکب ) ، کوردێ بێ یابێگانە، بە (ماك)ێك داندراوون و هەریەکە لەشوێنی خۆیاندا نۆسراون . ئەگەر ووشەیێکی کوردێ و یەکی بیگانە یەك شکڵ بن، ووشە کوردیەکە پێش‌خراوە و بەگشتێ ووشەهاو شکڵەکان Homonyme بە ژمارەی ١ و ٢ و ... کە لە پێشیانەوە داندراوە لێك هەڵاوێردراون .

٤ ـ ووشەیەکی لەباری ( ڕێزمان )ەوە لە (کار)ێك زیاتری هەبێ ، یەعنی ئەگەر ووشەیەك هەم ( ناو ) بێ و هەم ( صفەت ) بە ماکێك حیساب‌کراوە ، بەڵام بەجیا مانا لێدراوەتەوە .

٥ ـ ووشەی تێکەڵ ئەگەر لە حاڵەتی ( ئیزافە ) دابێ لەژێر ماکێکدا نۆسراوە ( ئاوی عەینەمەل ، لەژێر ماکی ئاودا ) بەڵام ئەگەر ( معطوف ) بێ

( ئاووگل ) وەکو ماکێکی سەربەخۆ بە حیساب هاتوە .

٦ ـ ئەم ووشانەی بە ( بێ ، نا ) لە ووشـــەی‌تر داتاشراوون بە ماکی سەربەخۆ هاتونە حیساب .

٧ ـ هەمو ووشەیێکی کە بەهۆی پێشبەند و پاشبەندان دروست بوبێ یا لە تەرکیبی بەشـــێکی ووشەیێك دەگەڵ بەشـــێکی ووشەیێکی‌تر ، یا هـــەر تێکەڵبونی دو یا چەند ووشە پێکهاتبێ بە ووشەی تێکەل ( مرکب ) داندراوە .

٨ ـ مەصدەرەکان ئەگەر سادە بن وەکو ماکێکی سەربەخۆ نوسراون ، بەڵام ئەگەر پێشبەندی فیعلیان هاتبێتەسەر : (أ) ئەگەر پێشبەندە کەی لابرێ ئەوەی دەمێنێتەوە خۆی مەصـــدەرێك بێ و مانای هەبێ ، ئەوا مەصـــدەرە تێکەڵەکە لەژێر ماکی ئەوا داندراوە . (ب) ئەگەر دوای لابردنی پێشبەندەکە ئەوەی دەمێنێتەوە هیچ مانایەك نەدا ، ئەوا خۆی وەکو ماکێکی ســـەربەخۆ لەجێی خۆیدا ڕێزکراوە . بو ( هەلگرتن ) و ( هەڵبڕین ) لە ژێر ماکی (گرتن) و (بڕین)دا ، بەڵام بو (هەڵسەنگاندن) و (تێوورو کان) هەریەکە لە شوێنی خۆیاندا، دەبێ بگەڕێین .

٩ ـ ووشـــەی عەڕەبێ کە لـــە زمانی کوردیدا هـــەن ، وەکو ماکێکێ سەربەخو بە ئیملای کوردێ نوسراون ، بەڵام لەنیوان دو ڕاستە کەواناندا [ ] جۆری نوسینیان بە عەڕەبێ دوپاتە کراوەتەوە .

١٠ـ ئەو زاراوانە ( مصطلحات )ی کە لە ووشەیەك کەوتونەتەوە ، بە پێتی ڕەش لەژێر ماکی ووشەکەدا هاتون . « ئاو لە دینگدا کوتان » لەبن ماکی (ئاو)دایە .

١١ـ ووشەیەك کە لە بن لەهجەکاندا هەندێ دەنـــگی ئالوگوڕ بوبێ یا جەڕابێ ( تەحریف کرابێ ) هەریەکەیان وەکو ماکێکی ســـەربەخو لە شوێنی خۆیان نوسراون بەڵام ماناکانیان حەواڵەکراوە بو یەکێکیان .

١٢ـ ناوی مەصدەر ، حاصل مەصدەر ، ناوی فاعیل ، ناوی مەفعوڵ ، صفەتی فاعیلی و مەفعوڵێ هەریەکەیان وەکو ماکێکی سەربەخو حیساب کراون

١٣ـ ئەو مەصدەرانەی لە عەڕەبێڕا هـــاتونە ناو کوردێ دو جـــورن ، أ ) ئەوانەی بەتەنیایێ دەکارناکرێن و دەگەڵ مەصدەرێـــکی کـــوردێ یـــا زیـــاتر ، مەصدەری تێکەڵدروستدەکەن ، وەکو : ئیستیعمال‌کردن ، ئیحتیمـــال‌دان و ئیحتیمال‌هەبون ، ئەمانە هەریەکەیان واحیدێکی سەربەخو حیســـابن . ب ) ئەوانەی لە عەڕەبیدا مەصدەرن و لە کوردیدا هەم بەتەنیایی و هەم دەگـــەل مەصدەرێکی کوردێ دەکاردەکرێن ، بەتەنیایی وەکو ناوی مەصدەر و دەگەڵ مەصدەرە کوردییەکەش وەکو مەصدەری تێکەڵ تەماشاکراوە .

## ب ـ ئەسلی ووشە :

١ ـ ئەسلی هەر ووشەیەکی کوردێ لە ئاوێستایێ و پەهلەوێدا ـ ئەوەی بەدەستەوە هاتبێ ـ هەر دوای ووشەکە لە نێوان دوێ ڕاستەکەواناندا [ ] نیشـانـدراوە .

٢ ـ ئەسلی ووشەی بێگانەش هەر لە نێوان دوێ ڕاستەکەواندا خراوەتە بەرچـاوان .

٣ ـ ووشەیێکی عەڕەبێ ئەگەر بە تەحریفکراوێ لە کوردیدا بـاوبێ ، ئەسلە تەحریفنەکراوەکـەی پاش دانـانی کورتەنیشـانی (محـر.) لەنـێو ڕاستەکەواناندا نوسراوە .

٤ ـ ئەگەر ووشەکە تێکەڵ‌بێ و لە ووشەیێکی عەڕەبێ و یەکێ کوردێ دروست‌بوبێ بە کورتەنیشـانی [عا. کو ] و ئەگەر پێچەوانەش‌بـێ [کو. عا.] دیارکراوە ، هەروەها ووشەی تێکەلی کوردێ ـ هەر زمانێکی‌تر .

٥ ـ کەرتەکانی ووشە گەلی تێکەڵ لێك جوداکراونەوە و لـە نێـوان دوێ ڕاستەکەواناندا بەهۆی (+) تێکم کردوێنـەوە .

٦ ـ ئەوەندەی لە توانستا بوبێ ئەو مەلبەندەی ووشەکەی تێدا بـاوە بە کورتەنیشـانەی تایبەتێ لە نێوان کەواناندا ( ) دەست‌نیشـان کراوە .

## ج ـ ڕێزمـان

١ ـ ووشەکانی هەر زمانێ بەپێی ئەو کارانەی لە تەواوکردنی قسـەدا ئەنجامی دەدەن ، بەش‌بەش کراون و هەر بەشەی ناوێکی لێ‌نراوە ، دیاریکردنی جێگای هەر ووشەیێك لە یەکێ لەم بەشانەدا ، بۆ قاموسی ئیمڕۆ بۆتە پێویست، هەروەك دەزانێن ئەو قاموسانەی کوردێ کە تا ئێستا نوسراون گوێیان نەداوەتە ئەم لایەنە و بۆ یەکەم جار فرەزاناگی کورد مامۆستا توفیق وەهبێ لە (فەرهەنگی کوردێ ـ ئینگلیسی)کە دەگەل مێستەر ئێدمۆنـس پێکەوە دایاننـاوە ، ئـەم کارەیان کردوە .

لەم قاموسەدا کە (کوردێ ـ کوردێ)یە منێش بۆ یەکەم جار جێگەی هەر ووشەیەکم لەناو بەشەکانی ووشە دەست‌نیشان کردوە و بە کورتەنیشـانـەی تایبەتێ لەناو کەواناندا ( ) نوسیومە . زۆر دەترسم کە نەم‌توانیبێ ئـەم کارە بەچاکێ ئەنجام‌بدەم ئەگەرچی کەلکێکی زۆرێشم لە (فەرهەنگی کوردێ ـ ئینگلیسێ) وەرگرتوە ، هەرچۆنێ بێ دەمێنێتەوە سەر ڕای خوێندەوارانی کورد تا لەم بابەتەوە چێ بلێین .

٢ ـ ئەو زاراوانەی بۆ بەشەکانی ووشــە بەکارم‌هێنــاون هێندێکیــان ئاشکرا و ڕۆنن ، بەڵام واتێدەگەم بەشێکیان پێویستیان بە ڕۆن‌کردنەوەیێکی پچکۆلانە هەبێ کە لە خوارەوە دەیخەمە بەرچاوی خوێنەران . بە ئانقەســت زاراوە عەڕەبییەکانم بەکارهێناوە ، چونکو نەم‌وێستوە خۆم بەهێچ کامێك لەو زاراوانەی ڕێزمانی کوردیٚ کە تازە داتاشراون ببەستمەوە .

● **ئامراز (أداة)** ـ ووشەیێکە خۆی مانایەکی سەربەخۆی نیە و بۆ مەبەستێــك وەکو : پرسیار ، بانگ‌کردن ، تەعرێف و . . . لە ڕستە یا سەروبنی ووشەیێکدا دەکاردەکرێن .

● **بەند (قید)** ـ ووشەیەکە ، ناوەرۆکی ڕستە : فیعل ، صفــەت یــا هــەر ووشەیێکی دیکە ( بێجگە لە ناو یا ئەوەی جێــی ئەویٚ گرتــوە ) بە زەمــان و مەکان ، حاڵەت یا ئەندازە ببەستێتەوە .

● **پاشبەند ، پێشبەند ، پێشبەندی فیعل** ـ کەرتی پچــکوڵەن خۆیــان بــە تەنیایی هیچ مانایان نیە (بەلای منەوە ئێستا وایان‌لێهاتوە ، دەنا لە کۆنا ووشەی تەواو بۆن و ماناشیان هەبوە ، بەڵام هەندێ دەنگی فشەڵ و سستیان تێدابوە لەناوچۆن و مانایان نەماوە) و دەچنە سەروبنی ووشەیێکەوە و مەدلولێــکی نویٚ لە ماناکەیان زیاد دەکەن .

● **حاصڵ مەصدەر** ـ ووشەیەکە نیشانەی مەصدەری پێوە نیە و لە فیعلیش دانەتاشراوە و مانای ئەنجامی کارێك دەدا کە لە مەصدەرێك پەیدادەبێ .

● **ئیسمی مەصدەر** ـ ووشەیێکە لە فیعل دادەتاشرێ و مانای مەصدەر دەدا ، نە مەصدەرێشە و نە ڕێشەی فیعل . فەرقیان دەگەڵ حاصل مەصدەر ئەوەیە کە ئەمەیان لە فیعل دادەتاشرێ و ئەویان نا .

● **شێوە ڕستە** : ووشەیەکە مانای ڕستەیێکی تەواو دەدا بەلای منەوە ئەوەش تێپەڕبۆنی ڕۆژگار قالبی‌کردوە و بە چەشنی ووشەیێك بەجێی هێشتوە ئەگینا لە ووشەیێك زیاترە و ڕەنگە هیندێکیان هەر ڕستەی تەواوێش بۆبن .

● **مەصدەری داتاشراو** : ڕەگی فیعلی مەصدەری زمــانێکی دیــکەیە کە بــە نیشانەی مەصدەرەکانی کوردیٚ کرایێتە مەصدەر ، لە لەهجەی باکوریدا زۆرە و لە ناوەندیدا کەم . :: عاملاندن ، فامێن ، جەڕباندن ، طەمرانــدن ، لەبطین ، قوصــاندن .

## د ـ مانای ووشە

١ ـ بۆ مانــا لێدانــەوە و شەرح‌کردنــی ووشـــە هــەوڵدراوە زۆر درێژنەکرێتەوە . تێبـ ـ أ ) ئەگەر پێویستی بە درێژەپێدان بوبێ لە تێبینێدا

لەسەری ڕویشتوین . ب) هەندێ ووشە کە تاریفێکی زانستییان هەیە (وەکو ئاو . . . ) هەروەکو (لاڕۆس و (معین) کردویانە پاش مانا لێدانەوەی سادە ، بە تێبینێ ئەو مەبەستەش جێبەجێ کراوە . ج) ووردە سەنعات ، ئامرازی کار و هەندێ (یاریێ) کە لە کوردستان هەن یا هەبون ، زانستی تازە خەریکە ڕایاندەمالێ و لەبیرانیان دەباتەوە ، بۆ ئەوەی شوێنەواریان کوێر نەبێتەوە لە تێبینێ ووشەی مەبەستدا باس کراون .

٢ ـ ئەگەر ووشەیەك فرەمانا Polysemantic بێ و ماناکانی بۆ مەبەستی جیاوازبن بەژمارە لێك جوداکراونەوە .

٣ ـ ووشە گەلی هاومەعنا Synonyme یەکیان حەوالەی یەکێکی تر کراوە کە مەشهورتر و باوترە، بەلام لەبەر ئەوەی کە هیچ مەعلوم نیە ئەم قاموسە کەنگێ تەواو دەبێ، ئەگەر لەم بەشەی ئێستادا ووشەیێك هەبێ هاومەعناکانی بە (دەنگ)ێکی تر دەست پێبکەن ، ئەمەی ئێرە (با زۆریش باو نەبێ) مانای لێدراوەتەوە و هەڵنەگێراوە بۆ ئەوانیتر .

٤ ـ مانای حەقیقی هەر ووشەیێك لە پێشەوە و ئەگەر مانای مەجازیشی هەبێ بەدوای ئەوا باسکراوە .

٥ ـ ووشەگەلی عەڕەبێ ، ئەگەر بە مانای حەقیقی خۆیان لە کوردیدا دەکارنەکرێن ئەوا لە پێشدا ماناکە لە باری زمانەوە ( لغوي ) نوسراوە و ئەوجار لە کوردیدا بۆچێ دەکاردەکری دیاریێ کراوە .

٦ ـ لە ئاخری هەر ووشەیێك هاوماناکانی لە بن لەهجەی ناوەندیدا و بەپێی لێزانین و توانستیش ئی بن لەهجەی باکورێ و جنوبێ نیشاندراون .

٧ ـ بۆ زیاتر ڕۆنکردنەوەی مانای ووشەیێك هەندێ جار لە ووشەی ( دژمانا ) کەلك وەرگیراوە .

## هـ ـ شایەد و نمونە :

١ ـ شایەد بەو مانایەیە کە نیشانمان دەدا فلانە ووشە لە زمانی کوردیدا دەکاردەکرێ یان نا ؟ بۆ ئەم مەبەستە لە شیعری شاعیران و نوسینی نوسەرانی کورد ، پەندی پێشینیان و کینایە و گورانێ کەلکم وەرگرتوە کە پاش ئەم نیشانەیە ( □ ) لە نێوان دو کەوانەی پچکولەدا « . . . » نوسیومن و سەرچاوەکانیشیان دیاری کراوە .

٢ ـ مەبەست لە نمونە ئەوەیە شێوە و جۆری بەکارهێنانی ووشەیێك لە ڕستەی کوردیدا پێشانبدا ، بۆ ئەم کارە زیاتر خۆم ڕستەیێ یا زیاترم ڕێكخستوە و لە دوای نیشانەی ( :: ) نوسیومە .

٣ ـ لەسەر پێشنیاری د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف لە باری ( زانستی ڕستە = فرازولۆژی )شەوە لەم قامۆسەدا هیندێ کار کراوە ، بەڵام بەداخەوە ئەوەندە کەمە شایانی باس‌نیە هیوام وایە لە بەشەکانی‌ترا تێی هەڵبێنمەوە .



# پاشە پەرەی قسان

ئەوا ئەم سەرەتایە تەواوبۆ ئیتر قامۆس دەست‌پێدەکا ، ئەز هەوڵم داوە و هیواشم وایە قسەیێکی وام نەکردبێ بۆنی ئەوەی لێبێ کە ئەم قامۆسە هیچ کەم‌وکورتی نیە و لە هەمۆ بابەتێکەوە نیشانەی پێکاوە . ڕەنگە هیچ کەس وەکۆ خۆم نەزانێ و نەشتوانێ بزانێ کە چەندەی ناتەواوێ هەیە ، ناچارم لێرەدا قسەی خوالێخۆشبۆ دوکتۆر معین دۆپاتەکەمەوە کە دەڵێ : « ئەم قامۆسە ئەوە نیە کە ئەز وێستۆمە ، بەڵکۆ ئەوەیە کە توانیومە .» و هەر ئەوەندە بەسە بۆ تێگەیشتنی کەم‌وکورییەکانی ئەم قامۆسە کە بەروبۆی ئەوەیە لە دەستم هاتوە ، ئەگەرچی جاروبارە لەوەش دەکەومە شکەوە ، چونکۆ لێم ڕۆنە نەم‌توانیوە و بۆم نەکراوە هەمۆ توانستی خۆم بۆ ئەم کارە تەرخان کەم .

بەڤین خوێندەوارانی کورد دەگەڵم هاوڕا دەبن ئەگەر بڵێم بە سەتان ناوی گژ و گیا و گوڵ ، دار و درەخت ، کوچك و بەرد ، یاری و گاڵتە و گەپ ، ناوی چێشتان و خواردن و خواردنەوە و زاراوەی داب و دەستوری کۆمەڵایەتی ، لە کوردەواریدا هەن کە بۆم نەلواوە بیان‌زانم و هەر بۆیەش ڕێگەیان نەکەوتۆتە ناو ئەم قامۆسەوە ، خۆ ئەگەر ئەوەش بێنینە بەرچاو کە ئەم جۆرە شتانە لە ناوچە جیاجیاکانی زمانی کوردیدا ناوی جیاجیایان هەیە ، ئەوا ئەو شتانەی کە ئەم قاموسە نایانگرێ خۆ لە هەزاران دەدەن ، **کاری تاکە ئینسانێك هەرچۆنێ‌بێ ناتەواوە و کاری تەواو کاری کۆمەڵە .**

# سەرچاوەکان *

١ ـ **ئەفسانەی چیای ئاگری** : بەشار کەمال ، شوکور مستەفا کردوٚیە بە کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ . [ئەفسانە] .

٢ ـ **ئینجیل** (لوٚقا ، مەتی ، مەرقوٚس ، یوٚحەننا) ، (بن لەهجەی موکریانی)، « بیبل سوٚسائیتی ئەمریکا و بریتیش فورن بیبل سوسائیتی » بلاویان‌کردوٚتەوە ، نیوٚیوٚرك ، ١٩١٩ [ ئینجیل (...) ] .

٣ ـ **ئینجیلا لوٚقا** (لەهجەی کرمانجی) ، « جڤاتا کتێبا مقەدەس یێ یەکبوٚیی » بلاوی‌کردوٚتەوە ، بیٚروٚت ، ١٩٥٣ .

٤ ـ **بخشی از فرهنك اوستا** و تطبیق آن با فارسی و کردی : موبد فیروز آذر گشسب ، تهران ، ١٣٣٧ ش .

٥ ـ **برهان قاطع** « بضمیمهء فرنگ دساتیر » ابن خلف تبریزی ، « محمد عباسی پیاچوٚتەوە » ، تاران ، ١٣٤٤ ش .

٦ ـ **برهان قاطع** : محمد حسین بن خلف تبریزی متخلص ببرهان ، لەژێر چاوەدێری «دوکتوٚر محەممەد معین» ماموٚستای زانکوٚی تاران ، ( ٥ بەرگ ) ، چاپی دووەم ، تاران ، ١٣٤٢ ش .

٧ ـ **پاشمەرگەی قانیع** : «کورتە مێژوٚیەکی ژیانییە لەگەڵ هەندێك لە هەلبەستەکانی» ، «لێکوٚلینەوە و سەرپەرشتی لەچاپدانی ـ ووریا قانیع » ، سلەیمانی ، ١٩٧٠ .

٨ ـ **پەندی پیٚشینیان** : شیٚخ محەممەدی خاڵ «کوکردنەوەیان و ڕاستکردنەوە و مەبەس‌لیٚدانەوە و چیٚرۆك بوٚ نوٚسینیان » ، چاپی دووەم ، سلەیمانی ، ١٩٧١ . [پەند] .

٩ ـ **پەندی کوردی** : عومەر شیٚخەڵا دەشتەکی ، هەولیٚر ، ١٩٧٢ .

١٠ـ **پیٚکەنیٚنی گەدا** : حەسەنی قزلجی ، «بلاوکراوەکانی بنکەی پیٚشەوا » ، ١٩٧٢ . [پیٚکەنین ] .

١١ـ **پیٚرەمیٚردی نەمر** : محمد رەسوڵ (هاوار) ، بەغدا ، ١٩٧٠ . [پیٚرەمیٚرد].

---

* ئەم ووشانەی لە دوای ناوونیشانی سەر چاوەکانەوە لە ناو ڕاستەکەوانەاندا نوٚسراون ، کورتەنیشانی سەرچاوەکانن .

١٢ـ **تحفه مظفريه ،** ئۆسکارمان ، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانەوە سەر ڕێنوسی کوردی هیمن موکریانی ، ب ١ و ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ . [تحفه].

١٣ـ **چیرۆکەکانی مەم :** محەمەد مەولود ، بەغدا ، ١٩٧٠ . [چیرۆکەکان] .

١٤ـ **حاجی قادری کۆیی :** مەسعود محەمەد ، (سێبەش) ، بەغدا ، ١٩٧٣ و ١٩٧٤ و ١٩٧٦ . [ حاجی ] .

١٥ـ **دەچیرۆك :** دوکتۆر کاوس قەفتان ، بەغدا ، ١٩٦٩ . [چیرۆك] .

١٦ـ **دەستور وە فەرهەنگی زمانی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی :** عەلائەددین سەججادی ، بەغدا ، ١٩٦٢ .

١٧ـ **دیاری مەلا محەممەدی کۆیی :** چاپی چوارەمین ، «گیوی موکریانی چاپ و بلاوی کردۆتەوە» ، هەولێر ، ١٩٦٩ . [مەلا.] .

١٨ـ **دیوانی ئەحمەد موختار بەگی جاف :** چاپی دووەمین ، «بلاوکراوەوەی : گیوی موکریانی» ، هەولێر ، ١٩٦٩ .

١٩ـ **دیوانی ئەدەب (عبدالله بەگی مصباح الدیوان ) :** چاپی سێیەمین ، «بلاوکراوەوەی : گیوی موکریانی» ، هەولێر ، ١٩٦٦ . [ئەدەب] .

٢٠ـ **دیوانی حاجی قادری کۆیی :** گردوکۆ و بلاوکەرەوە «گیوی موکریانی» ، هەولێر ، ١٩٥٣ . [حاجی قادر] .

٢١ـ **دیوانی دلدار :** یونس ڕەئوف ، چاپی دووەمین ، «بلاوکراوەوەی گیوی موکریانی» ، هەولێر ، ١٩٧١ . [دلدار] .

٢٢ـ **دیوانی سالم (عبدالرحمن بەگی صاحبقران) :** چاپی دووەم ، «بلاوکراوەوەی : گیوی موکریانی» ، هەولێر ، ١٩٧٢ . [سالم] .

٢٣ـ **دیوانی سەلام :** شێخ سەلامی شاعیر ، بەغدا ، ١٩٥٨ . [سەلام] .

٢٤ـ **دیوانی شێخ ڕەزای تالەبانی :** «علی الطالبانی کۆکەر و چاپکەری ئەم دیوانەیە » ، بەغدا ، ١٩٤٦ . [رەزا] .

٢٥ـ **دیوانی طاهر بەگی جاف :** «بلاوکراوەوەی : گیوی موکریانی» ، هەولێر ، ١٩٦٦ .

٢٦ـ **دیوانی مەندەلاوی** (پرر وەخوێن) ، مەلا خضر محمود المندلاوی ، بەشی یەکەم ، کەرکوك ، ١٩٧١ .

٢٧- **ديوانى مەولـەوى** (سـەيد عبدالرحيم تـاوگۆزى) : «كۆكردنـەوە و لێكۆڵینەوە و لێكدانەوە و لەسەرنوسینی مەلا عبدالكريمـى مدرس» ، بەغدا ، ١٩٦١ . [مەولەوى] .

٢٨- **ديوانى نالى** (شاعر شهير كرد) ، «عەلى مقبل» بڵاوى‌كردۆتەوە ، سنه ، ١٣٢٧ ش . [نالى] .

٢٩- **ديوانى نالى** (مەلا خدرى ئەحمەدى شاوەيسى مكايەلى) : لێكۆڵینەوە و لێكدانەوەى مەلا عبدالكريمى مدرس و فاتح عبدالكريم ، محمـدى مەلا كەريم پیاچوەتەوە ، بەغدا ، ١٩٧٦ . [نالى] .

٣٠- **ديوانى نالى (مەلا خضرى شارەزورى)** ، «بلاوكراوەوەى گيوى موكريانى» ، هەولێر ، ١٩٦٢ . [نالى] .

٣١- **ديوانى وەفايى** (ميرزا رەحيم) : «گيوى موكريـانى بڵاوى‌كردۆتـەوە» ، هەولێر ، ١٩٥١ . [وەفايى] .

٣٢- **زمانى كوردى لەبەر رۆشنايى فۆنەتیكدا** : د. ئەورەحمانى حاجى مارف ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

٣٣- **زەمبيل فرۆش** : مرادخانى بايەزيدى ، «بلاوكراوەوەى گيوى موكريانى» ، هەولێر ، ١٩٦٧ .

٣٤- **ژانى گەل** : (چیرۆك) ، سلەيمانى ، ١٩٧٢ . [ژان] .

٣٥- **سروشت و دەرون** لەگەڵ ئۆپەرێتى ئەنجامى ياران : گۆران ، سلەيمانى ، ١٩٦٨ .

٣٦- **سەرنجێك لە دەروازەى فۆلكلۆرى كوردەوە** : نەقابەى مامۆستايان ــ لقى هەولێر ، بەغدا ، (سالى لەچاپدانى لەسەر نەنوسراوە) .

٣٧- **شەرەفنامە** : شەرەفخانى بدليسى ، هەژار كردويە بە كوردى ، نەجەفى پيرۆز ١٩٧٢ (لەسەر بەرگەكەى نوسراوە ١٩٧٣ و لە دێوى ژورەوەى ١٩٧٢) .

٣٨- **شيرين و خوسرەو** : خانـاى قوبـادى ، محـەممەدى مـەلا كەريـم ساغى‌كردوەتەوە و فەرهەنگى بۆ رێكخستوە و پێشەكى بۆ نوسـيوە ، بەغدا ، ١٩٧٥ . [خانا] .

٣٩- **علم اللغة** : دوكتۆر عەلى عەبدولواحيد وافى ، چاپى شەشەم ، قاهيرە ، ١٩٦٧ .

٤٠ـ **عمر خيام** (چوارينەكانى) ، گۆڕينى سەلام ، بەغدا ، ١٩٥١ . [خەيام] .

٤١ـ **الفرائد الدرية للطلاب** (قاموسى عەرەبى ـ فرەنسى) ، ج. ب. بيلۆ ، چاپى بيست و يەكەم ، بێروت ، ١٩٦٨ .

٤٢ـ **فرهنگ اورنگ** (عربى ـ فارسى) : سرگرد اورنگ ، تهران ، ١٣٣٧ ش.

٤٣ـ **فرهنگ بهدينان** : (لهجەءزردشتيان يزد و كرمان) : جمشيد سروش سروشيان ، تهران ، ١٩٥٦ .

٤٤ـ **فرهنگ پهلوى** : دكتر بهرام فرەوشى ، تهران ، ١٣٥٢ ش . [پفا]

٤٥ـ **فرهنگ عميد** : حسن عميد ، ج ١ و ٢ ، تهران ، ١٣٤٣ ش .

٤٦ـ **فرهنگ فارسى** : دكتر محمد معين ، (پنج جلد) ، تهران ، ١٣٤٢ و ١٣٤٣ و ١٣٤٥ و ١٣٤٧ ش . [فەرهەنگ] .

٤٧ـ **فرهنگ فرانسه بفارسى** : ن. گلستانى ، چاپ ششم ، تهران ، ١٣٣٨ ش .

٤٨ـ **فرهنگ مصور فارسى ـ انگليسى** : على اصغر كاوسى برومند ، تهران، ١٣٤٦ ش .

٤٩ـ **فقه اللغة** : دوكتۆر عەلى عەبدولواحيد وافى ، چاپى شەشەم ، قاهيرە، ١٩٦٨ .

٥٠ـ **فۆلكلۆرى كوردى** : محمد تۆفيق ووردى ، بەشى سێيەم و چوارەم ، نەجەف ، ١٩٧١ .

٥١ـ **فەرهەنگا كوردى** : جكەرخوێن ، (٢ بەرگ) بەغدا ، ١٩٦٢

٥٢ـ **فەرهەنگا كوردى ـ ڕۆسى** : ق. كوردۆ ، مۆسكۆ ، ١٩٦٠ . [كف.] .

٥٣ـ **فەرهەنگى خاڵ** : شێخ محەممەدى خاڵ (٣ بەرگ) ، سلەيمانى ، ١٩٦٠ ـ ١٩٦٤ ـ ١٩٧٦ . [خا.] .

٥٤ـ **فەرهەنگى كشتوكاڵ** : مەعرۆف قەرەداغى مردۆخى ، (٢ بەرگ) ، بەغدا، ١٩٧٢ ـ ١٩٧٣ . [كشت] .

٥٥ـ **فەرهەنگى مەهاباد** : گيوى موكريانى ، چاپى يەكەمين ، هەولێر ، ٢٥٧٣ كوردى . [مەهاباد] .

٥٦ـ **قامۆسى ڕۆسى ـ كوردى** : ئى. ئۆ. فاريزۆف ، مۆسكۆ ، ١٩٥٧ . [فز.] .

٥٧ـ **قەڵای دمدم (چیرۆك)** : عەرەب شەمۆ ، شوکور مستەفا کردوویە بە کرمانجی خوارۆ ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٥٨ـ **کتاب فرهنگ مردوخ** : شیخ محمد مردوخ کردستانی ، ج ١ و ٢ ، تهران ، (سالی لەچاپدانی نەنوسراوە) . [مردۆخ] .

٥٩ـ **کوردواری** : عەلائەددین سەججادی ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

٦٠ـ **کۆلکەزێرینە** : (کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی فەرەنسی و ئینگلیزی) ، گیوی موکریانی ، چاپی دووەمین ، هەولیر ، ١٩٦٦ .

٦١ـ **گزارش بهرام‌یشت** یاپیروزی نامه : مراد اورنگ ، تهران ، ١٣٤٣ ش . [بەهرام] .

٦٢ـ **گورانی یا ترانەهای کردی** : دکتر محمد مکری ، تهران ، ١٩٥١ .

٦٣ـ **گولستان** : شاکاری سەعدی شیرازی ، «مەلامستەفا سەفوەتی حاجی مەلا رەسوڵ کردویە بە کوردی» ، «دوکتۆر عیززەدین مستەفا رەسوڵ لەگەڵ چەند وەرگێرانی ترا بەراوردی کردوە و بڵاوی‌کردۆتەوە» ، بەغدا، ١٩٦٨ .

٦٤ـ **گوڵاڵەی مەریوان** : قانیع ، چاپی دووەم ، «سەرپەرشتی لەچاپدانەوەی وریا قانیع» ، سلەیمانی ، ١٩٧٠ .

٦٥ـ **گوهرهای نهفته** یا «رازهایی ازآوستا» : ، مراد اورنگ ، تهران ، ١٣٤٤ ش .

٦٦ـ **گەنجینەی فۆلکلۆری کورد** (کۆمەڵێك لاوك و حەیران) ، محمدی مەلا کەریم ، بەغدا ، ١٩٦٨ .

٦٧ـ **لاوك و پەیام لەگەل شیعری گەپ** : گۆران ، سلەیمانی ، ١٩٦٩ .

٦٨ـ **لغت فرس** : اسدی طوسی ، «بکوشش محمد دبیرسیاقی» ، تهران ، ١٣٣٦ ش .

٦٩ـ **المنجـد** (في اللغة و الأدب و العلوم) : لويس معلوف ، الطبعة الثامنة عشرة ، بیرۆت ، ١٩٦٥ . [ منجد ]

٧٠ـ **مەم و زینی خانی** : هەژار کردویە بە موکریانی ، بەغدا ، ١٩٦٠ . [زین]

٧١ـ **مەهدی‌نامە** : ابن الحاج (مەلا محەممەدی حاجی حەسەن) ، «لێکۆڵینەوە و پێشکەش‌کردنی محەممەد عەلی قەرەداغی» ، «پیاچونەوەی شوکور مستەفا » ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٧٢ـ **مێژوی ئەدەبی کوردی** : عەلائەددین سەججادی ، چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧١ . [مێژو] .

٧٣ـ **وشەی زمانی کوردی** : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٧٤ـ **هێندێ لە هەڵبەست و بەیتەکانی عەلی بەردەشانی** : محەممەد توفیق وردی ، نەجەف ، ١٩٧٢ . [بەردەشانی] .

٧٥ـ **یادداشتهای پنج گاتها** : ابراهیم پورداود ، ج ٢ ، تهران ، ٢٥٦٩ مادی ـ ١٣٣٦ ش. [ یگد ] .

٧٦ـ **یسنا** ( بخشی از آوستا ) ، ابراهیم پور داود ، (٢ جلد) ، ١٣٣٧ ـ ١٣٤٠ ش . [یەسنا] .



٧٧ـ
JABA M. AUGUSTE, **DICTIONNAIRE KURD FRANCAIS,** publié par M. FERDINAND JUSTI, St. Petersbourg, 1879.

( م. ئوگوست . ژابا ، قامۆسی کوردی ـ فرەنسی ، م. فێردینان ژوستی بلاوی کردوتەوە ، سان پیتر سبۆرگ ، ١٨٧٩ ) . [ ژابا ]

٧٨ـ
LEBRUṄ L. & TOISOUL J., **DICTIONNAIRE ETYMOLOGIQUE** de la langue **FRANCAISE,** PARIS, 1937.

(ل. لێبرون و ژ. توازۆل ، قامۆسی ئێتیمۆلۆژی « ئیشتیقاقی » زمانی فرەنسی ، پارێس ، ١٩٣٧ ) .

٧٩ـ
LIBRAIRIE LAROUSSE, Nouveau **PETIT LAROUSSE** en couleurs, PARIS, 1969.

( کتێبفرۆشی لارۆس ، لارۆسی پچۆکی تازەی ڕەنگاوڕەنگ ، پارێس ، ١٩٦٩ ) . [ لارۆس ]

٨٠ـ
WAHBY TAUFIQ & EDMONDS C. J., A KURDISH - ENGLISH DICTIONARY, OXFORD, 1966.

( توفیق وەهبی و س. جی. ئێدمۆنس ، فەرهەنگی کوردی ـ ئینگلیسی ، ئۆکسفۆرد ، ١٩٦٦ ) . [ هبێد ] .

# کورتە نیشانەکانی ڕێزمان کە لەم قامۆسەدا بەکارهاتوون

| نیشانە | لەباتی |
|---|---|
| ئە . | ئامراز ( أداة ) |
| ئمت . | ئامرازی تێکەڵاو (أداة المركب) |
| ئیز . | ئیزافە |
| با . | بادینانی (بن لەهجە) |
| بک . | باکوری ( لەهجە ) |
| بگ . | بانگکردن ( النداء ) |
| بن . | بەند ( القيد ) |
| بنت . | بەندی تێکەڵاو (قيد المركب) |
| پە . | پاشبەند |
| پبت . | پاشبەندی تێکەڵاو |
| پە . | پەهلەوی ( زمان ) |
| پێب . | پێشبەند |
| پێبف . | پێشبەندی فیعل |
| تب . | پیتی تێکبەستن ( حرف الربط ) |
| تت . | تازە داتاشراو ( ووشە ) |
| تە : | تەماشاکە |
| تو : | ترکی ( زمان ) |
| تێب . | تێبینی |
| جف . | جافی ( بن لەهجە ) |
| جە . | جەمع |
| جمی . | جەمعی |
| جن . | جنوبی ( لەهجە ) |
| حمص . | حاصل مەصدەر |
| ریـ . | ڕیشە |
| ز . | زەمیر |
| زا . | زازایی ( بن لەهجە ) |
| ست . | ئاوێستایی ( زمان ) |
| سن . | سنەیی ( بن لەهجە ) |
| سیە . | سلەیمانی ( بن لەهجە ) |
| شر . | شێوەڕستە |
| شن . | شنۆیی ( بن لەهجە ) |
| صە . | صفەت |
| صت . | صفەتی تێکەڵاو (الصفة المركبة) |
| صفا . | صفەتی فاعیلی |
| صمف . | صفەتی مەفعولی |

| نیشانە | لەباتی |
|---|---|
| عا . | عەرەبی ( زمان ) |
| فا . | فاعیل ( اسم الفاعل ) |
| فر . | فارسی ( زمان ) |
| فە . | فیعل |
| فج . | فیعلی مەجهول |
| فی . | فەیلی ( بن لەهجە ) |
| کئێر | کوردستانی ئێران ( زمانی ) |
| کتو | کوردستانی ترکیا ( زمانی ) |
| کعر | کوردستانی عێراق ( زمانی ) |
| کك | کەرکوکی ( بن لەهجە ) |
| کن . | کینایە |
| کو . | کوردی ( زمان ) |
| کی . | کۆیی ( بن لەهجە ) |
| لا . | لازم ( مەصدەر ) |
| مت . | متعدی ( مەصدەر) |
| مج . | مەجاز |
| محر . | تەحریفکراو ( المحرف ) |
| مصت . | مەصدەری تێکەڵاو ( المصدر المركب ) |
| مصش . | مەصدەری داتاشراو |
| مف . | مەفعول ( اسم المفعول ) |
| مک . | موکریانی ( بن لەهجە ) |
| نـا . | ناو ( اسم ) |
| نت . | ناوی تێکەڵاو ( الأسم المركب ) |
| ند . | دەنگە ناو ( اسم الصوت ) |
| نس . | نیسبەت ، نیسبی |
| نمص . | ناوی مەصدەر ( اسم المصدر ) |
| هس . | هەڵیسەنگێنە ( قارن ) |
| هل . | هەولێری ( بن لەهجە ) |
| هو . | هەورامی (بن لەهجە ) |
| ★ | هاوتا ( المرادف ) |
| :: | نموونە ( مثـال ) |
| □ | شـابەد |
| // | دژ ( الكلمة المضادة ) |
| ● | ڕستەی ساز و ئامادە لە زماندا. |

## کورتە نیشانەکانی ناوی : سەرچاوە ، دانەر ، بلاوکەرەوە ، ...
## کەلەم قامۆسەدا دەکارکراون

| نیشانە | ناوی سەرچاوە ... و ژمارەی لە لیستەی سەرچاوەکاندا | |
|---|---|---|
| ئەدەب | دیوانی ئەدەب | ١٩ |
| ئەفسانە | ئەفسانەی چیای ئاگریَ | ١ |
| ئەورەنگ | مراد اورنگ ( محقق ) | — |
| ئینجیل (     ) | ئینجیلی (لۆقا ، مەتی ، مەرقۆس ، یوحەننا) | ٢ |
| ب | بەرگ ، بەش | — |
| بەردەشانی | هیندی لە هەڵبەست و بەیتەکانی ... | ٧٤ |
| بەهرام | گزارش بهرام‌پشت | ٦١ |
| پد. | پرۆفسور ئیبراهیم پور داوود | — |
| پفا. | فرهنگ پهلوی | ٤٤ |
| پەند | پەندی پێشینیان | ٨ |
| پێکەنین | پێکەنینی گەدا | ١٠ |
| پیرەمێرد | پیرەمێردی نەمر | ١١ |
| تحفە | تحفەء مظفریە | ١٢ |
| ج | جلد | — |
| چیرۆك | ١٠ چیرۆك | ١٥ |
| چیرۆکەکان | چیرۆکەکانی مەم | ١٣ |
| حاجی | حاجی قادری کۆیی | ١٤ |
| حاجی قادر | دیوانی حاجی قادری کۆیی | ٢٠ |
| خا. | ١ــ ماموستا شێخ محەممەدی خال | — |
| | ٢ــ فەرهەنگی خاڵ | ٥٣ |
| خانا. | شیرین و خوسرەو | ٣٨ |
| خەییام | عمر خیام | ٤٠ |
| دڵدار | دیوانی دڵدار | ٢١ |
| ڕەزا | دیوانی شێخ رەزای تالەبانی | ٢٤ |
| زین | مەم‌وزینی خانی | ٧٠ |
| ژان | ژانی گەل | ٣٤ |
| ژابا | قاموسی کوردی ــ فرەنسی | ٧٧ |
| سالم | دیوانی سالم | ٢٢ |

| نیشانە | ناوی سەر چاوە ... و ژمارەی لە لیستەی سەرچاوەکاندا | |
|---|---|---|
| سەلام | ١ـ شێخ سەلامی شاعیر | ـ |
| | ٢ـ دیوانی سەلام | ٢٣ |
| فز. | قامۆسی ڕۆسی ـ کوردی | ٥٦ |
| فرە. | دوکتۆر بەهرام فەڕەهوەشی | ـ |
| فەرهەنگ | فرهنگ فارسی | ٤٦ |
| کشت | فەرهەنگی کشتوکاڵ | ٥٤ |
| کۆڕ | کۆڕی زانیاری کورد | |
| کف. | ١ـ پڕوفسۆر قەناتی کوردۆ (کوردوییف) | ـ |
| | ٢ـ فەرهەنگا کوردی ـ ڕۆسی | ٥٢ |
| گە. | ماموستا گیوی موکریانی (دانەروناشر) | ـ |
| لاڕۆس | قامۆسی فرەنسی | ٧٩ |
| مردۆخ | کتاب فرهنگ مردوخ | ٥٨ |
| معر. | ماموستا شێخ مارفی قەرەداغی | ـ |
| معین | دوکتور محەممەدی معین (دانەر ، محقق) | ـ |
| مکب. | مامۆستا مەلا کەریمی بیارە (دانەر ، محقق) | ـ |
| مقبل | مامۆستا عەلی مقبل ( ناشر ) | ـ |
| منجد | المنجد في اللغة والادب والعلوم | ٦٩ |
| مەلا | دیاری مەلا محەممەدی کۆیی | ١٧ |
| مەسعوود | مامۆستا مەسعوود محەممەد (دانەر) | ـ |
| مەولەوی | دیوانی مەولەوی | ٢٧ |
| مەهاباد | فەرهەنگی مەهاباد | ٥٥ |
| مێژوو | مێژووی ئەدەبی کوردی | ٧٢ |
| نالی | دیوانی نالی | ٢٨و٢٩و٣٠ |
| وەفایی | دیوانی وەفایی | ٣١ |
| هبێد | فەرهەنگی کوردی ـ ئینگلیسی | ٨٠ |
| یگد | یاد دا شتهای پینج گاتها | ٧٥ |
| یەسنا | یسنا | ٧٦ |



## تەرتیبی ئەلفوبێتکەی کوردی ، بەو جۆرەی کە ووشەکانی ئەم قاموسەی پێ ڕێزکراوە (١)

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ء | [ ا ] | ب | پ | ت | ج |
| چ | ح | خ | د | ر | ڕ | ز |
| ژ | س | ش | (ص)(٢) | ع | غ |
| ف | ڤ | ق | ك | گ | ل |
| ڵ | م | ن | و | [ و = بۆر ] | [ ۆ ] |
| [ و̄ ] | هـ | [ ە ، ە = سەر ] | ی | | |
| [ ی = ژێر ] | [ ێ ] | [ی̄ ] . | | | |

(١) دەنگ بزوێنەکان لەناو ڕاستەکەواناندا نوسراون .

(٢) دەنگی (ص) هەروەکو لە سەرەتاکەدا باسکراوە بەلای منەوە بەلایەنی کەمەوە لە چەند ووشەیێکدا هەیە ، بۆیە وەکو دەنگێکی هێشتا بە تەواوی ساغ نەبۆتەوە لە ناو کەوانەدا نوسراوە .



**( ء )** ـ دەنگێکە لـە دەنگەکانی زمانی کوردیٚ ، لە گەروٚرا دیٚتەدەر و لە ئەلفوبێتکەی ئیسلامیدا کە ئێستا زمانی کوردیٚ پیٚدەنـوسریٚ ، ناوی ( هەمزە )یە .

**تێبـ** ـ زوٚر کەس ئەم دەنگـە هەر بە ( ئەلف ) دەزانن لـە حالێکا کە ( ئەلف ) بـە بزوێن حیسـابە و بە تەنیاییٚ تەلەفوز ناکریٚ .

**١ ـ ئا ـ** یەکەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردییە کە بـە خەتی لاتینیٚ بنوسریٚ و دەنگێك پیٚشان دەدا کە لە تێکەڵاوبونی ( هەمزە ) و ( ئەلف ) پێکهاتوە .

**٢ ـ ئا ـ** ١ ـ ( بنـ . ) بەڵیٚ ، بەو جوٚرەیە کوتت ، وەڵامی پرسیارە بە ئیجاب ، بەڕاستزانینی قسەی کەسێکە :: چوٚیە مـالی خالت ؟ ـ ئا ، بچین بوٚ مەکتەب ؟ ـ ئا ،

□ زوانت وەختیٚ ئیزنش تەلەب کەرد لاڵ کەی نمەبوٚ چەنیٚ (ئا)ش ئـاوەرد ( مەولەویٚ : مکبـ ـ ١١٦ ) ٢ ـ (ئم.) بـوٚ سـەر سـوڕمـان و گومان و پرسـیارە :: چوٚیـە مالی خالت ؟ ـ ئا !؟ **ئائا** . تەئکیـدیٚکی زیاتر پیٚشان دەدا // نا . نانا . نەء

**٣ ـ ئا ـ** ( پبـ. ) . ( سیم. ) ١ ـ پاشبەندی ئامـرازی ( زەرف )ە ، پاش ئـەم ووشەیەی کە بـە دوای ( لە )دا دیٚت ئەمـەش بە دوایـەوە دەنوسریٚ :: لە قاموٚسا هەیە ، نانی لە مالا نیە . ٢ـ (ئم.) ، (سیم.) بوٚ پرسیار و هاندانە و لە پیٚش هەندیٚ ووشەوە دەگوتریٚ :: ئاخوٚ ، ئـادەی ★ دا .

**٤ ـ ئا ـ** ( ئیز. ) لە لەهجەی باکوریٚ زمـانی کوردیدا ئامـرازی ئیزافەیە بوٚ میٚیینە :: کەچا من (کچی من) ، خـوٚها تە (خوشـکی توٚ) ، مەهێنا ئوٚسوٚ ( ماینی ووسوٚ ) .

**٥ ـ ئا ـ** ( نـا. ) ، ( کئێر.) کورتەی ووشەی ( ئاغا )یە :: ئامیرزا حەسەن ، ئایی فرٚوهیر .

**٦ ـ ئا ـ** (پبـ.) بـە دوای ڕیٚشەی فیعلـەوە دەنوسریٚ و دەیکا بە صفەتی فاعیلیٚ :: بێنا (لەبێنێن) ، توانـا (لە توانیـن) ، خـوٚرا ( لە خواردن ) ، ڕەوا ( لە ڕوٚیین ) ، زانا ( لە زانین ) ، گـیرا ( لە گـیران یا گرتن ) .

**١ ــ ئاب ــ** [ فـر. ] ، ( نـا. )
١ ــ ئاو . ٢ ــ ڕەونەق ، وورشە و بریسکەی هەندێ شت :: تێـغی ئابدار .

تێبـ ــ ئەم ووشەیە بە مەعنـای ئەسڵی خۆی (ئاو) لە کوردیدا ، بـە تەنیـایی بەکارناهێنرێ ، بـەڵام لە تەرکیبدا دەچێتە سـەروبنی ووشە :: ئابڕۆ ، تێزاب .

**٢ ــ ئاب ــ** [سوریانی ، عیبری] ، ( نا. ) مانـگی هەشـتەمی سـاڵی ڕۆمی ، دەکەوێتە نێوان تەمموز و ئەیلول . ★ ئاغستۆس ، ئۆت .

**ئابـات ــ** ( مکـ. ) ، ( صـ. ) ئـاوەدان .

تێبـ ــ ئەم ووشەیە بە تەنیایـی دەکار ناکرێ ، دەگەڵ ناوێك تەرکیب دەبێ و ناوێکی‌تازە دروست دەکا بۆ ناونـانی ئـاوایی و دێهـات ، لـە کوردسـتـان :: حاجیـابات ، حەسەنابات ، عەلیابات . ★ ئاوا .

**ئابان ــ** [ فر. ] ، ( کئێـر. ) ، ( نا. ) مانـگی هەشـتەمی سـاڵی ئێرانی ، دووەم مانگی پاییز ( ٢١ی تشرینی یەکەم ــ ٢٠ تشرینی دوەم )، ★ خەزەڵوەر .

**ئابجۆ ــ** ( مکـ. ) ، ( نتـ. ) تم : ئاوجۆ .

**ئابخانە ــ** [١ــ ئاب/١ + خانە]، [ فـر. کـو. ] ، ( نتـ. ) چـاوگە ژوورێکـە بۆ دەسـتبەئاوگەیاندن تەرخـان دەکـرێ ★ ئابـدەست ، ئابدەستخانە ، ئاوخانە ، ئاودەست ، ئەدەبخانە . ( بکـ. ) ئاڤرێژ . ( فیـ. ) ئاودەستخـانە ، پێشـاو ، سەراودەشت ، کەنـاراو .

**١ ــ ئابدار ــ** [ ١ ــ ئـاب /١ + دار ] ، [ فـر. کـو. ] ، ( نتـ. ) کەسێکی لـە دیوەخانی میـرەکان و دەرباری پاتشـایان و شوێنی تـری وەکو ئەمانە ، کاری سازکردنی چاو قـاوە و شـەربەت و ...ی پێ ئەسپێررابێ . ☐ « .... دەهاتە کن ئەولادی شازۆسـتەم‌بەگان سێ ساڵان دەبۆ بە سەقفا و سێ‌یان دەبۆ بە ئابدارە». ( تحفە : ج٢ ــ ١٩٤ ).

**٢ ــ ئـابدار ــ** [ ١ ــ ئـاب/٢ + دار ] ، [ فـر. کـو. ] ، ( نتـ. ) بەڕەونـەق ، خاوەنجـەوهەر ( بۆ تێغ ) .

**ئابدارباشی ــ** [ ١ــ ئـابدار + باشی (تو = سەری) ] ، [ کو. تو. ] سەرۆکی هەمـوو ئەو کەسـانەی لە ئابدارخانە ( تم :ــ ) ئیش دەکەن .

**ئابدارخـانە ــ** [ ١ــ ئـابدار + خانە] ، [ فر. کو. ] ، ( کئێـر. ) ، (نتـ. ) ١ ــ چاوگە ژوورێکە لە کۆشکی پاتشـایان و مـاڵە دەوڵەمـەند و دەرەبەگاندا ، بۆ سـازکردنی چا و قاوە و شەربەت و ئەو جۆرە شتانە تەرخـان دەکـرێ . ٢ ــ هەمـوو کەرەسـتە و نۆکـەر و بارەبـەری دەزگای خواردن و خواردنـەوە کە پاتشا و ئەمیر و گەورەپیاوان دەگەڵ خۆیان دەیانبردە سەفەران .

**ئابدۆزەك ــ** [ ١ ــ ئاب/١ + دۆز = دز + ١ ــ ئەك/٢ ] ، ( کئێر. ) ، ( نتـ. ) ئامرازێـکە لـە شـووشە و لاستیك و پلاستیك دروستەکرێ، دەرمانی تراوی پێ دەکەنە ناو لەشی

ئینسانەوە . ★ سێرینگ ، (کعر.) شرێنقە .

**ئابدەست** ــ [ ١ ــ ئاب/١ + دەست] ، [فر. کو.] ، ( کعر. ) ، ( نت. ) تم : ئابخانە .

**ئابدەستخانە** ــ [ ئابدەست + خانە ] ، [ فر. کو. ] ، ( کعر. ) ، ( نت. ) تم : ئابخانە .

**ئابڕوو** ــ [ ١ ــ ئاب/١ + ڕوو ] ، [ فر. کو. ] ، ( نت. ) ١ ــ ڕەونەقی ڕوو ، وورشە و گەشەی دەموچاو ٢ ــ ( مج. ) سەر بڵیندی ، شەرەف ، نامووس ، حەیا . تێب ــ ئەگەرچی مەعنای دوەم مەجازە ، بەڵام ئەم ووشەیە لە کوردیدا هەر بەم مەعنایە بە کاردەهێنرێ و هیچی‌تر .

**ئابڕووبران** ــ ( مصت. مت. ) بێ‌حورمەت‌بوونی کەسێك بێ ئەوە ( فاعیل )ی کارەکە دیار بێ .

**ئابڕووبراو** ــ ( نمف. ، صت. ) کەسێکی ڕیسوا کرابێ .

**ئابڕووبردن** ــ ( مصت. مت. ) بێ قەدر و حورمەت‌کردن و سووك و چرووك‌کردنی یەکێك ★ بێ شەرەف‌کردن ، ڕیسواکردن ، سەرشۆڕکردن ، شەرەف‌شکاندن .

**ئابڕووبەرە** ــ [ ئابڕوو + بەر (لەبردن) + ٣ ــ ئە/٢ ] ، ( صفا. ) ١ ــ کەسێکی ببێتە مایەی ڕیسوابوون، یەکێکی کاری وا بکا شەرەفی یەکێك یا چەند کەسێکی تری پێ بچێ . ٢ ــ کار و کردەوەیێکی پیاو سووك بکا یا عەیبەی بێنێتە سەر . :: دایکم ! ئەم منالە ئابڕووبەرەیە لە چی دەگێڕێ ، کچی وەرە دانیشە هەی ئابڕووبەرە !

**ئابڕووتکان** ــ ( مصت. لا. ) تم : ئابڕووچوون .

**ئابڕووتکاو** ــ ( صمف. ) کەسێکی نامووسی چوو بێ ، تووشی سووکی و سەرشۆڕی بوو بێ .

□ « ڕۆژی تەرزە ، چەندە مێنای دڵشکێن و سەرشکێن »
« ڕۆژی باران ، چەند شڕە ، بێ‌عیسمەت و ئابڕووتکاو »
( نالی : گم ــ )

**ئابڕووچوون** ــ (مصت. لا. ) سووك بوون لەناو کۆمەڵا ، بێ قەدر و حورمەت بوون لەبەر چاوی خەڵك . ★ ئابڕووتکان .

**ئابشار** ــ [ ١ ــ ئاب/١ + شار ( ند. ) ] ، [ فر. ] ، ( نت. ) ، ١ ــ تم : ئاوشار

□ « ئەم بەچاو ( درّ ) و بەسەر لەعلی ( هدیّة ) بۆدەبا »
« ئەو بەتف دەیکا بە مێزابی شکستەی ئابشار »
( نالی : مقبل ــ ١٥ )

٢ ــ چوونی توپ لە یاری (والیبال)دا، بە هەڵمەت و تاو بۆ مەیدانی بەرامبەر و شۆڕبوونەوەی بە ڕژدی بە کەنار تۆڕەکەدا ★ ( کعر. ) کەبباسی ( عا. ) .

**ئاب و تاب** ــ [ ١ ــ ئاب/٢ + + تاب ] ، [ فر. کو. ] ، ( نت. ) ١ ــ ڕازاوە و بە ڕەونەق :: بە ئاب و تابێکەوە قسەکانی گێڕایەوە . ٢ ــ تاووتوێ و گەرما .

□ « لە ئاب و تاب و ئەشك و ئاهی

خۆمـدا بۆمە بریـانێ »
« لەباتێ پوختـەگێ سـۆتام و
هێشتا پێم دەلێن خامە »
( نالی : گم. ) ★ ئاووتاو .

**ئابۆر ــ** (بک.) ، (نـا.) حـەیا ، داوێنپاکێ ، شانازێ ، شـەرەف ، نامۆس :: مئابۆرکر (من ئابۆرم کرد) : ڕێکم خسـت ، تەرتیبـم کرد ، بە خۆشێ و دۆستانە بڕیمەوە ( کار و مەسەلە) ، دەفعم کرد (پارە) تم : بـە ئابۆر ، بێ ئابۆر . تێب ــ ئەم ووشەیەم هەروەکو خۆی لەبەر قامۆسـەکەی ( ژابا JABA ــ٢ ) نۆسیوەتەوە کە بەو مەعنایانەی سەرەوەی هێنـاوە و ( مئابۆرکر )و مەعناکانیشی لە زمـان ( سۆسێن SOCIN ) گێڕاوەتـەوە. ( کـارومەسـەلە )و ( پـارە ) بـۆ ڕۆنترکـردنی مەعنـاکانی مـن لێم زیادکردوە . هس : ئابڕۆ .

**ئـابۆرێ ــ** ( تد. ) ، ( نـا. ) ــ چاوەدێری ڕاگرتنـی ڕێـك و پێکی داهات و خەرجـی ماڵ ، ئیـدارە و دەوڵەت . ئیقتیصاد . تێب ــ نـازانم ئەم ووشەیە لە کوێڕا هاتوە و چۆن داتاشراوە، بەڵام ئەوەندە بڵاو بۆتەوە، بەم مەعنایە جێگای خۆی کردۆتەوە .

**ئابۆنە ــ** (فەرەنسێ) ، (نا.) ١ــ پارەیەکی پێشەکێ دەدرێ بە ئیدارەی ڕۆژنامە و گۆڤـاران و تا مـاوەیەك ڕۆژنامە بۆ خاوەنی پارەکە دەنێرن . ٢ــ پارەیەکـە ئەندامـانی (یـانە)و ( نەقابە ) و ( پارتێ )یەکان مانگانە یـا ساڵانە دەیدەن .

**ئاپۆرە ــ** [ئا + پۆرە] ، (تد.) ، (مکـ.) کۆمەڵ و جەماوەری خەڵك کە دەورەیان لە شتێك دابێ :: ئاپۆرەی خەڵکەکە بەرەو مزگـەوت ڕۆیـین . هس : پۆرە ، لاپۆرە ، لاپرەسەن .

**(ــئات)ــ** (ئم.) ئامرازی جەمعە و بە دوای ناوەوە دەنوسێت:: ئاغاوات، بـاغات ، ترشیات ، حەشـامات ، خێلات، دێهات، شامات، شێرنییات، عێلات ، کێوات ، ماڵات ، مێوەجات ، مێوەهات . تێب ــ ئەگەرچـی ئەمـە نیشانەی جەمعە لە زمانی عەرەبێدا ، بەڵام لە زمانی کوردێشدا ئەوەنـدە دە کار دەکرێ ، پیاو دەخاتە شکەوە لەوەی کە ڕەنگە ئـامرازێکی تـری جەمعی کوردێ بێ . لەبەر گرانی دوا پێتی هەندێ ناو ، جاروبارە (ج ، و، ه) یەکێکیان دەخرێتە نێوان (ناو) و ( ئامراز )ەکەوە ★ (ــ ئان) .

**ئاتاج ــ** [=عا : ئیحتییاج] ، (نا.) کەسـێکی پێویسـتێ بە شـتێك یا کەسێك هەبێ ، لە شتێکی کەم بـێ کەمایەسێ هەبێ. □ « خوا ئاتـاج و موحتاجی دەرکی نامەردت نەکـا » :: ئاتاجی نانێکە ★ موحتاج .

**ئاتاجی ــ** ( صـ.) تم : ئیحتییاج.

**ئاتموسـفۆڕ ــ** [= فەرەنسـێ : ئاتمۆسـفێر] ، (نـتـ.) ، (کئێـر.) ١ــ ئەو هەوایەیە کـە دەوری زەوێ داوە و لە چەند گاز (غاز) ی جیاجیا پێکهـاتوە : ٧٨٪ ئـازۆت ، ٢١٪ ئۆکسیژێن و ئەویتریشی : ئارگۆن ، هیدرۆژێن و هیلیۆم و چەند گازێکی ترە . (عـا.) جـو . ٢ــ واحیـدی قورسایێ کە هـەوای دەوری زەوێ دەیخاتە سەر زەوێ و هەمـێ ئـەو شتانەی لە سەر زەوێـن و بە قەدەر

قورسایی لوولەیێکی پڕ لە جیوەیە کە ٧٦ سانتیمەتر درێژ و بنەکەشی سانتیمەترێکی چوارگۆشە بێ ( الضغط الجوّی ) و بە شێوەیێکی مامناوەندی دەکاتە ١٠٣٣ گرام لە سەر هەر سانتیمەترێکی چوارگۆشە . تێب ـ ئەم ووشەیە لە ڕێگای زمانی فارسیڕا هاتۆتە ناو زمانی کوردی لە کوردستانی ئێران ، لە ٢ ووشەی یۆنانی ئاتمۆ (= هەڵم ، بوخار) و سفێر (= گۆ ، کورە) پێکهاتوە . تە : لارۆس ٧٧ .

**ئاتۆم** ـ [ فەرەنسی ] ، ( نا. ) ، ( کئێر. ) تە : ئەتۆم .

**ئاتەش** ـ [کو . فر.] ، [ ستە : ئاتەر . پە : ئاتەرش] ، (نا.) ئاگر ، ئاوور . تێب ـ ئەگەرچی ئەم ووشەیە لە هەندێ ناوچەی کوردستان بەکاردێت بەڵام زیاتر لە ووشەی تێکەڵاودا دەبێندرێ .

**ئاتەشبازی** ـ [ئاتەش + بازی] ، ( حمص. ) هەڵدانی فیشەکەشیتە و تەقەمەنی ڕەنگاوڕەنگ و جۆربەجۆر لە جێژن و ئاهەنگاندا ، بۆ کەیف و خۆشی ☐ « ئاتەشبازی بە کونگی خالی ناکرێ » .

**ئاتەشپارە** ـ [ئاتەش + پارە = پارچە] ، (صت.) ، (مک.) تە : ئاگرپارە .

**ئاتەشپەرست** ـ [ ئاتەش + پەرست (لەپەرستن) ] ، (نفا.) ١ـ ئەو کەسەی ئاگر دەپەرستێ ، ئاگر بە خودا دەزانێ یا لای پیرۆزە ٢ـ ئەوەی دینی زەردوشتی سەلماندبێ ، زەردوشتی . ★ ئاگرپەرست ، ئاوور پەرست .

**ئاتەشپەرستی** ـ [ ئاتەش + پەرست + ٢ـ ئی ] ، (حمص.) تە : ئاگرپەرستی .

**ئاتەشخان** ـ [ ئاتەش + خان = خانە ] ، (نت.) ، (سن.) **تونخانەی** حەمام . تێب ـ شوێنێکی تایبەتییە بە تەنیشت حەمامەوە ، ڕاهۆلێکی تێدایە تیانی حەمامی لەسەر دامەزراوە و لە ژێرەوە ئاگر دەکرێ و حەمام گەرم دادێنێ ★ تونخانە ، تونگخانە ، ئاگرخانە/٢ ، ئاوورخانە/٢ .

**ئاتەشخانە** ـ [ئاتەش + خانە ]، (نت.) ١ـ تە : ئاتەشکەدە ☐ « جە یاقوت و لاڵ ، جە گەوهەر دانە » « کەردن گەنج وەقف ، پەی ئاتەشخانە » ( خانا ـ ١٥٧ ) ٢ـ (مک.) جێگای ئاگری سەماوەر ★ ئاگرخانە/٣، ئاوورخانە/١. تێب ـ لە ناوەڕاستی کوپی سەماوەردا کە ئاوی تێدەکرێ ، لولەیەك هەیە بنی بە پارچە ئاسنێکی کون کون گیراوە، ئاگر و خەڵوزی تێدەکرێ و ئاوی ناو کوپی سەماوەرەکە وەکوڵ دێنێت .

**ئاتەشکێش** ـ [ئاتەش + کێش (لەکێشان)] ، (نت.) ئامرازێکە وەکو خاکەندازێکی پچوك وایە دەمەکەی توزێ بە دیویێکا نوشتاوەتەوە ، پۆلوی ئاووری لە پشتەوەی سۆبەی دارانڕا پێ دەکێشنە پێشەوە یا پێی دەردەدەن .

**ئاتەشگا** ـ [ئاتەش + گا = جێگا] ، (نت.) ١ـ تە : ئاتەشکەدە .

٢ــ نـاوی شــاخێکە لە نـاوچەی تاوگۆزێ .

**ئاتەشگەدە** ـ [ئاتەش + گەدە] ، (نت.) شوێنێکە پێڕەوانی دینی زەردوشت ئاگریان تێدا ڕادەگرت . جێگای بە جێ گەیاندنی ڕێوشوێنی ئایینی دینی زەردوشت ★ ئاتەشخانە/١ ، ئاتەشگا/١ .

**ئاتەشگەردان** ـ [ئاتەش + گەردان] ، [ فر. کو. ] ، (نت.) ئامرازێکە لە تەلی بارێك دروست دەکرێ ، وەکو پیالەیێکی کون کون وایە کورتە زنجیرێکی تێدەخرێ ، خەلوزی تێدەکەن و چەند پشکۆ ئاگری دەخەنە سەر و هەلیدەسوڕێنن تا دەگەشێتەوە دەبێتە سکل . زیاتر بۆ سازکردنی ئاگری سەماوەر بەکاردێت ★ تاولەمە (تو.) .

**ئاتەشەك** ـ [ئاتەش + ١ـئەك /١] ، (نت.) نەخۆشی فەرەنگی . تێب ـ ئەم نەخۆشییە لە ئەنجامی هەلسان و ڕۆنیشتن دەگەل یەکی سیفلیساویدا، یا بەکارهێنانی قاب و قاچاغ و هەر شتێکی تری کە ئەو بەکاری هێنا بێ ، هەروەها بە هۆی دەست تێکەل کردنی پیاو و ژنەوە کە یەکێکیان سیفلیسدار بێت توشی عیسانی ساغ دێ ، لە باوك و دایکی سیفلیساویشەوە بە میرات بۆ منالیان بەجێ‌دەمێنێ . پاش ئەوەی میکرۆبی سیفلیس دەچێتە لەشی ئادەمیزادەوە ئەگەر زۆ چارەی نەکرێ لەوانەیە بیداتە چاوی‌و کوێری بکا★ ئاگرە/١، سیفلیس، فەرەنگی،هاولە فەرەنگی.

**١ـ ئاتەشی** ـ [ئاتەش + ٣ـی] ، (صت.) ١ـ هەرچی بە رەنگ یا تەبیعەتی ئاگر سوور یا گەرم بێ :: یاقوتی ئاتەشی ، سووری ئاتەشی. ٢ـ (کن.) ئینسانی توڕە و تۆسن ، توندەمیزاج :: ئەم پیاوە ئاتەشی میجاز (میزاج)ە .

**٢ـ ئاتەشی** ـ (نت.) ، (مک.) جۆرە گولەباغێکە ، ڕەنگی سووری مەیلە و بنەوشە و بۆنی لە گولی گولاو کەمترە و گولاویشی لێ‌ناگیرێ.

**ئاتەگ** ـ (نا.) ، (مک.) ١ـ داوێنی کەوا و کورتەك و مرادخانی کوردی و چاکەتی فەرەنگی لە لای پێشەوە ★ شاقەل . ٢ـ لای خوارەوەی شاخ و کێو :: سوارەکان بە ئاتەگی شاخەکەوە بوون. (بکـ.) : ئەتەك ( تم : ژابا ـ ٢ ) ٣ـ (نا.) ، (کعر.) ژێر کراسی ژنانە . تێب ـ ئەم وشەیە لە زمانی تورکی و ئازربایەجانیشدا بەم مانایەیە و بە شکلی (ئەتەگ ، ئەتەی) بەکاردێ.

**ئاجودان** ـ (فرەنسی) ، (کئێر.)، (نا.) ١ـ ئەفسەرێك کە لەبەر دەستی ئەفسەرێکی گەورەدا بێ ، یارمەتیدەری بێ . ٢ـ ئەفسەرێك کە لەبەر دەستی سەرۆکی دەولەت بێ و کارێکی تایبەتی پێ ئەسپێردرابێ :: ئاجودانی سەرۆك جەمهور بۆ کاروباری وولات ، ئاجودانی نیزامی. ٣ـ بۆ ڕێزلێنان و حورمەت گرتن ، بەو پاسەوانانەی دەرەجەیان لە نەفەر گەورەتر و لە ئەفسەر پچوکترە دەگوترێ ★ باش ، باشچاوەش ، عەرێف . تێب ـ ئەم وشەیە لە

زمـانی فرەنســێدا دەرەجــە یەکی سەربازییە و یەکەم و دوەمی هەیــە (ئاجودانی یەکەم ، ئاجودانی دوەم) و دەکەوێتە•نێوان (عەرێف) و (نـاییب زابت) . یا (گرۆهبـان و سـێتوان سێ). بەڵام لە کوردستانی ئێران کە لە زمانی فارسێڕا پەڕیوەتە ناو زمانی کوردێ هــەر بــەو ســێ مــانایانە بەکاردێت کە باس کران .

**ئاجور ــ** (نا.) خشتی ســور ، خشتێکی لە کورەدا سور کرابێتەوە تێبـ ــ ئەم ووشە لە ئەسڵا ( ئاگور ) بووە و عەرەب وەریان گێڕاوە و سەر لە نوێ گەڕاوەتــەوە ناو کــوردێ و فارسێ . هس : گوراسن .

**ئـاجێل ــ** (فـر.) ، (نـــا.) ، (کنێر.)بادام و بستە و فندق و ناوکە کولەکە و نوك و ئەو جۆرە شتانە کە بۆ خواردن و ترۆکاندن بۆ ئەدرێن. ★ چەرەز .

**ئاچــغ ــ** [تو : ئاچماغ ، ئاچمق = کردنەوە .] ، (صـ.) ١ــ ڕەنگی کاڵ :: سوری ئـاچغ ، شــێنی ئاچــغ ، تۆزێ ئـاچفتر با جوانتــر دەبـوَ . // ڕەنگی تاریك ، تۆخ ، تونــد ٢ــ کراوەوە ، دانەخراو (دەرگا) .

**ئاچوغ ــ** (تو.) ، (ـ .) تم : ئاچغ

**ئاچەر ــ** [تو : ئاچماغ، ئاچمق]، (نا.) ١ــ کلێلی قفڵ. ٢ــ سپانــەی فێتەرێ ★ کلێل ، هــاچەر . (بکـ.) مفتێ (مفتاح) .

**١ــ ئاخ ــ** (نـد.) ١ــ لە کــاتی ئازار پێکەیشتندا دەکوترێ :: ئـاخ پشتم ٢ــ بۆ دەربڕێنی کزۆزانەوە و خەم و خەفەت و بێ دەســەڵاتــێ :: ئاخ چبکەم ، ئاخ چێم بە خۆم کرد، ئاخ برا زۆر ★ ئاه/١ .

**٢ ــ ئاخ ــ** (نـا.) ، (بکـ.) ١ــ خاك و خۆڵ، تۆز. **ئاخی بارۆد** (خاکی بارۆت) شۆرە . تێبـ ــ ئــەم ووشەیە لە لەهجەی ناوەندێ زمانی کوردێدا لە بیرچۆتەوە و تەنیــا لە هەنــدێ مەڵبەند ، زیاتر لە هەولێر و دەور و پشــتی لە ووشــەی (ئــاخەلێوە)دا ماوەتەوە کە ئەمەشیان لە موکوریان و هێندێ نــاوچەی تر هــەر بۆتــە (خاکەلێوە) .

**ئاخافتن ــ** (مصـ. لا.) قسەکردن دەگەڵ کەسێ ، گفتوگۆ ، ووتووێژ.

**ئاخــدار ــ** (صفــا.) ١ــ ئــاخ هەڵکێش ، کەسێکی ئاخ هەڵبکێشێ ٢ــ (کنـ.) کەســێ خەم و خــەفەتی هەبێ ، دڵبریندار .

☐ ئــاخ ، چــراخ ! چ ئــاخ ؟ ئــاخ بــــەی ئــــاخدارێ
چون من خـــاترخار ، خەمبار ، داخـــــــــــداری

(مەولەوێ : مکبـ ــ٥٥ )

**١ــ ئاخر ــ** [ عا : آخر.] ، (نا.) ١ــ ئەنجام و دوایێ کارێ یا شــتێك :: با بزانێن ئەم کارە ئاخری بەچــێ دەگا . ئــاخری ئەم مــانگە دەچێتە بەغدا . ☐ « صەت ساڵ بکەی بێگانە پەرســـتێ ، ئاخرییەکــەی دێنــێ نشوستێ » .

شۆڕەژن من لە هەوەڵ پێم نەکوتــی
ئاخرێ حەزرەتی شێخ تێت ئەکوتــی

( مەلا : گمـ. )

٢ ــ دوایێ ، دوارۆژ ، عــاقیبەت :: ئاخر شەڕ . ئاخرت خێر بێ .

**٢ ــ ئاخر ــ** [ عا. ] ، ( ئم. ) بۆ سەرکۆنەکردن ، لۆمە یا داوای نەکردنی کارێك . □ « کوڕە ئاخر وازی لێبێنە » ، « ئاخر لە سەر چیم هەیە غەیانێ » .
( تحفه : ج٢ ــ ٢١٥ )
:: ئاخر ئەمە کاری کاری کردنێیە ؟ ئاخر نەچێ باشترە .

**٣ ــ ئاخر ــ** [ عا. ] ( صە. ) هەر شتێکی لە چاو هاوچەشنەکانی خۆی لە دوای هەموانەوە بێت :: ئاخر شەوی پاییز ، ئاخر ڕۆژی جەژن ، نەرێمان ئاخر کەس بۆ هات. // هەوەڵ ، یەکەم .

**ئاخربوون ــ** [ عا . کو. ] ، (مصت. لا. ) دوایی‌هاتن ، خراپ‌بوون ، تێکچوون ( هەر بۆ دنیا ) :: « کە جرجال هەستا نیشانەی دنیا ئاخربوونە » .

**ئاخرخێر ــ** [ عا. ] ، ( صت. ) ١ ــ پیاوێ کە کاروبار و ژیانی بە چاکێ و خۆشێ دوایی بێت . ٢ ــ کەسێ کە دوایی تەمەنی بە دیندارێ بەرێتە سەر ● « ئاخری خێربێ » ، ( کن. ) بۆ باش نەبوونی چلۆنایەتێ ( ئێستا )ی کەسێ □ « وەفایێ ئاخر خێربێ دەمێکە بێ سەر و شوێنە . » . // ئاخرشەڕ .

**ئاخرزەمان ــ** [ عا. کو. ] ، (نت.) ١ ــ دوامێن دەوری دنیا کە لە پاشان بە پێی قسە و حوکمی دێن قیامەت دادێ و دنیا خراپ دەبێ . ٢ ــ (کن.) ڕۆژگاری ناخۆش و پڕ ئاژاوە کە کەس ئاگای لە کەس نەبێ و هەر کەسە دە هەولی خۆیدا بێ . □ « ئەی خودا لەو ئاگربارانە ، ئەی خودا لەو ئاخرزەمانە » .

**ئاخرشەڕ ــ** [عا. کو] ، (صت.) ١ ــ کەسێك کە لەدوایی تەمەنی خۆی و کاتی پیریدا دەستی کردبێتە کاری پێچەوانەی دێن. ٢ ــ پیاوێ کە لە دوایی ژیانی خۆیدا تۆشی بەلا و ناڕەحەتێ و نەدارێ هاتبێ . // ئاخرخێر .

**ئاخروئۆخر ــ** دوایی کارێك یا شتێك :: زستان ئاخروئۆخرێتی .

**ئاخرەمێن ــ** [ ئاخر + ٢ ــ ئەم + ئێن ] ، [ عا. کو. ] ، (صت.) تم : ٣ ــ ئاخر .

**١ ــ ئاخرێ ــ** [ئاخر + ٣ــئێ]، [ عا. کو. ] ، ( صت. ) دوامێن شت ، ئێ دوایی :: کتێبەکەی هەرە ئاخرێ .

**٢ــئاخرێ ــ** [ئاخر + ١ــئی/٢]، [ عا. کو. ] ، ( ئم. ) بۆ لۆمە و سەرکۆنە کردنە لە سەر کردنی کارێك کە لە پێشدا داوای نەکردنی کرابێ :: ئاخرێ هەر چۆی ، ئاخرێ شکاندت ، ئاخرێ وای لێدەکەی بە کەلکی هیچ نەیەت .

**ئاخرێ و عاقیبەتێ ــ** لە ئەنجامدا لە نەتیجەدا ، هەر ...

**ئاخلە ــ** ( نا. ) ، ( سن. ) ١ ــ دایرەیێکە هەندێ شەوان بە هۆی هەلم و هالاوێ کە لە زەوێ هەلدەستێ دەورەی مانگ دەدا . ★ خەرمانە . ٢ــ دیوارۆکەیەکە لە لادێ بە قوڕ و بەرد یا تەپالە یا هەر قوڕ دروستی دەکەن و ئەو سەرەوسەرەکەی

دەگاتــەوە یــەك ، زۆریش بــەرز نابێتــەوە . کا و گژ و گیــا و ئەو جۆرە شــتانەی تێــدا زۆ دەکــەن (مخ.) . تێبـ ـ بـە لای منـەوە ئەم وشەیە هەر ئالقەیە و گۆڕاوە .

**ئاخلەدان ــ** [ ئاخلە/١ + دان ]، ( مصتـــ . لا . ) ، ( ســـــذ . )
١ ــ خەرمانەدانی مانــگ ، دروست بونی ئاخلــە لــە دەوری مانــگ .
٢ ــ پاپــۆکە خـــواردنی مـــار .
٣ ــ کۆبونەوەی خەڵك وەکو دایرە لە دەوری شتێك یا کەسێك .

**( ــ ئاخن ) ــ** ( پـ. ) ڕێشـــەی مەصدەری ئاخنتێنە ، وەکو پاشبەند بە دوای ناوەوە دێت و ناوێکی تازە یــا صــفەتی لێ دروســت دەکــا :: گلۆیناخن ، ناواخن .

**ئاخندراو ــ** تە : ئاخنراو .

**ئاخنران (ئاخنــدران) ــ** ( مصە. متە.) باش داگیرانی دەفرێکــی وەك جەواڵ ، هۆڕ ، پێستە پەنیر .... لە ماددەیەك :: ئەم تا تۆتنە بۆچی وا ئاخنراوە دەترسم گەرم دابێ .

**ئاخنــراو ــ** ( صمف. ) حـــاڵی دەفرێکی باش داگیرابێ .

**ئاخنین ــ** (مصە. متە.) پــڕکردن تێپەستاوتن ، بەو جــۆرەی لۆکە یا خورێ دەخرێتە ناو لێفە و دۆشەگ یا کەلوپەل دەخرێتە ناو هەمبانەوە :: کولانەی مرێشکەکان چاك باخنە ، هەر ئێستا گلوێنەکە داخنم و دەست دەکــەم بە نــانکردن . **تێئاخنین ــ** ( مصتە. متە. ) ١ــ ئاخنتێن لە ســەرڕا بۆ خوار. ٢ــ (مجـ.) لە ڕۆی گــاڵتە یا دلگرانییەوە بــۆ زۆر خواردن .

:: ئــەرێ حەمە ئەوە بــۆ هێندەی تێداخــنێ دەڵــەی تێرەنــەخۆرەت گەیــوەتێ . ● « دەڵێی عێســـا گرتویە و مۆسا تێی ئاخنیوە» (کذ.) بۆ پیاوی زۆر قەڵەو. //هەڵاخنتێن .

**هەڵاخنتێن ــ** [ هەڵ + ئــاخنتێن ] ، (مصتـ. متـ.) ١ ــ کەڵەکەکردنی شت بەسەر یــەکا ، قــەڵا پەچنکــردن (هبید.) ٢ــ پڕکردنی دەفر یــا هەر چێکی وەکو دەفــر بێ لە ژێــرڕا بۆ سەرەوە . // تێئاخنتێن .

**ئاخنتێنەوە ــ** ( مصتـ. متـ. ) هەر بە مەعنای ئاخنتێن هاتوە بەڵام بۆ ئەو جۆرە شتانەی کــە ماوەیەك لە ناو دەفرەکەدا بمێننــەوە :: حەسەنی پێرەی هەمــۆ ســاڵێ چــل پێستە پەنیری داخنییەوە ، ئەوساڵ دۆ کۆپە پەنیــر و ســێ کۆپــە شــیرێژمان ئاخنتێوەتەوە .

**ئاخوا ــ** [ ٣ــ ئــا/٢+ خــوا ]، (ئمتـ.) ، (سیمـ.) ئامرازی پرســیــار کردنە . :: ئاخوا نەرێمان کەنگێ بــە سەفەر دەچێ ؟ ئاخوا وەتمان چۆ بۆ ئاشێ ؟ بڕۆ بزانە ئاخوا دەڵێ چێ و ناڵێ چێ؟ ★ ئاخۆ ، دئخۆ ، داخوا ، داخودا ، ئایا .

**ئاخوداخ ــ** (نتـ.) ئــاه و ناڵــەی تێکەڵ بە نێمچە گریان و کڕۆزانەوە و زیاترێش لە جارێك .

**ئاخوڕ ــ** [ستـ : ئا ــ کوەرە ، پە : ئاخوەر ] ، (نا.) جێگــایەکە لە نــاو پێگە و تاوڵەدا ، بە خشت یا بەرد و قوڕ هەڵێدەبەستن وەکو قوڵکەیەك وایە کە هەندێ لە زەوێ بەرز بێ ، ئالێکی بۆ وولاغ تێــدەکەن ، دەکرێ

ڕێزڕێك بە تەنیشت یەکەوە هەڵببەسترێن یا یەکێ درێژۆکە هەڵبەستن و چەند وولاغی لە سەر ببەستنەوە . ★ (بک.) ئافر ، ئافەر، ئاخل (ژابا ـ کف.) ، (هو.) ئاو ـ وڕ، دەمکە .

**ئاخون/ند ـ** [ ئا ( پێ ) + خوند (لەخوداوەند یا لە خوێندن )ـ معین]، (نت.) ، (کئێر.) مەلای شیعان .

**ئاخۆ ـ** (ئمت.) ، (سیم.) تە : ئاخوا .

**ئاخۆران بخوران ـ** (نت. ، مت. )، (سیم.) ١ـ چلۆنایەتیِ ئێتشی کەسێ، وولاتێ یا ئیدارە و ڕێکخراوێك کە هیتچی بەسەر هیتچەوە نەبێ . ٢ـ پشێوێ و بەربەشۆێ ٣ـ کەس ئاگا لە کەس نەبۆن . ٤ـ هەر کەسە بۆ خۆ بۆن ★ (مک.) ئاخوران زاخوران .

**ئاخۆران‌زاخۆران ـ** (نت. ، صت.) ( مک.) تە : ئاخۆران بخۆران . **تێب ـ** زاخورانی عەشیرەتێکی کوردن لە مەلبەندی هەوشاری کوردستانی ئێران .

**ئاخەبان ـ** [ ٢ـ ئاخ + ٣ـ ئە/٢ + بان] ، (نت.) ١ـ داپۆشینی سەربانی خانۆ بە گڵ و خۆڵ پاش دارەڕا کردن و پێش سواغدان★ گلەبان . ٢ـ (بک.) هاوشارێ ، خەلکی وولاتێك ، هاونیشتمان (!) ( کف ـ ٤١ ) ٣ـ ( هل. ) چاوەخانوێکی سەربانەکەی تەخت بێ .

**ئاخەلێوە ـ** [ ٢ـ ئاخ + ٣ـئە /٢ + لێو + ٥ ـ ئە /١ ] ، ( هل. ) یەکەم مانگی بەهار (لە ٢١ی مارت تا ٢١ی نیسان ) ★ (مک.) خاکەلێوە . (کئێر.) فەروەردین . هس (بک.) ئاخلیفە ( یەکەم ڕۆژی بەهار : ژابا ـ ٤ ) .

**ئاخ‌هەلکیشسان ـ** [١ـ ئاخ + هەڵ + کیشان]،(مصت. لا.) هەناسە هەلکیشانی تێکەڵ بە کرۆزانەوە و ناڕەحەتێ . بە ووشەی (ئاخ) دەست پێدەکا و بە ڕستەیێ کە هۆی ناڕەحەتییەکە پێشان دەدا ، دەبڕێتەوە :: ئاخ لە دەست منالی ئەم زەمانە .

**ئاخێز ـ** [ئا + خێز] ، (نت.) حالەتێکە ، کەسێکی دانیشتبێ وا نیشان بدا کە دەیەوێ هەڵبستێ بەڵام هەڵناستێ و تۆزێ لە جێی خۆی دەجوڵێ .

□ بانۆ ئێد شنەفت نە جا کەرد ئاخێز
بۆسا پای سەرێر ئەوڕەنگ پەروێز
( خانا ـ ١٤١ )

**ئاخێزکردن ـ** (مصت. لا.) هیندێك لە جێگەی خۆ جوڵان و نیشاندانی ئەوەی کە یەکێك دەیەوێ لەبەر کەسێکیتر هەڵبستێ :: کە حەسەن هاتە ژوورێ شەرێف ئاخێزێکی بۆ کرد .

**ئاداب ـ** [ عا. ] ، (نا.) ڕێ و شوێنی کۆمەلایەتێ ★ داب ، دەستۆر . تێب ـ ئەم ووشەیە بەم شێوەیە تەنیا خوێندەواری کورد بەکاری دێنن و بە گشتێ لە ناو لادێ و نەخوێندەواران بۆتە (داب) .

**کلیەی ئاداب ـ** [ عا. ] ، ( نت. )، ( کعر. ) ئەو بەشەی دانیشگا (جامعة)کە بۆ خوێندنی ئەدەبیات

تەرخـانە .

**ئـادار** ـ [سوریـانی] ، (نـا.) شەشەمین مانگی ساڵ بە حیسابی سوریانی و سـێیەمێن مـانگە بـە حیسابی ڕۆمی ، ئاخرملنگی زستان بـە حیسابی نەورۆز ( ٢١ ) روژی ئەم مانگە وەبەر خـۆی ئـەدات . □ « مانگی ئاداری ، بباری هەتا گوێـی داری ، هێچی نامێنی هەتا ئێواری» . ★ ئازار ، مارت ، مارس . هـادار ( ژابا ـ ٤ ) .

**ئادرێس** [فرەنسی] ، (نـا.) ، (کئێر.) ١ـ ناونیشانی ماڵ یا جێگای کـار و کاسبی کەسـێك . ٢ـ ناونیشـانێکی لە سـەر نـامە یـان تێلگراف دەنوسری تا بگاتە دەسـتی ئەو کەسی مەبەسـتە. ★ (کعر.) ئەدرەس ، عینوان/١ .

**ئـادەم** ـ (نا.) یەکەم ئینسانـی کە لـە سـەر زەوی پەیـدا بـوە . قورئان و تەورات باسی دەکەن : خوا دروستی کرد و دەگەڵ ژنەکەی لـە بەهەشتا داینیان ، پاشان لە سـەر نافەرمانی فڕێی دانە سـەر زەوی و هەمو ئینسان بنێچەی ئەون .

**ئادەمی** ـ [ئـادەم + ٣ـئـی] ، (صـ.) ئینسان کە لە ناو گیـاندارانی سەر زەویـدا لە بـاری مێشـك و تێگەیشـتنەوە لـە هـەموان پێشکەوتو ترە .

**ئادەمیزاد** ـ [ ئادەمی + زاد] ، (نتـ.) ئـەو گیاندارانـەی لە ئـادەم کەوتونەتەوە ، نەتـەوەی ئـادەم ★ ئینسـان ، بنیادەم ، بەشـەر .

**ئادەی** ـ [ئـا + دەی] ، (ئمتـ.) (سیـە.) ئامرازی هاندانـە بۆ کردنی کاری :: ئا دەی پڕ دەنە پێلی ، ئـا دەی هەڵسـە سـەر پێ ، ئـا دەی تۆزی بچۆ بەو لاوە ★ دا دەی، دەی، یـالـلا .

**(ـ ئار)** ـ (پبـ.) پاشبەندێکـە ئەم مەبەستانە پێکدێنی : ١ـ دەگەڵ ڕێشـەی هەندی مەصدەران تەرکیب دەبی و دەیانکا بە ئیسـمی مەصدەر :: پرسیار، دیدار، کردار، کوشتار. ٢ـ بە دوای ڕێشـەی مەصدەرەوە دەنوسی و دەیکا بـە فاعیل ( نـاو یا صفەت) :: فرۆشیار، کڕیار . ٣ـ بە دوای ڕێشـەی مەصدەرەوە دەلکی و دەیکا بە ناو :: بڕیار، زانیار، مردار. ٤ـ لە ڕێشـەی هـەندی مەصدەر صـفەتی مەفعولی سـاز دەکا . :: گرفتار . ٥ـ دەگـەڵ نـاو تەرکیب دەبی و ناوێکی تازەی لی پێکدێنی :: بنار ، ژەنگار . **تێبـ** ـ لە هـەمو ئەو حاڵەتانەدا کە یەشێکی ووشە تازەکە ڕێشـەی مەصـدەر بی یەکـەم پیتی نیشانەی مەصدەر رەگـەڵ ووشـە تازەکە دەخری :: کڕین : کڕ (ڕێشە) + ی (یەکەم پیتی نیشانەی مەصدەر + ئار ( پبـ . ) = کریـار . کوش ( ڕێشـە ) + ت (یەکەم پیتی نیشانەی مەصدەر ) + ئار ( پب . ) = کوشتار.

**ئارا** ـ ( نـا . ) ، ( مک . ) ١ـ پەیوەندی دۆستایەتی و ناسیاوی دو کەس دەگەڵ یـەکتر :: حەسـەن و شێرکۆ ئارایان پێکـەوە نیـە . ٢ـ ( مجـ . ) حەزکردن لـە خواردەمەنی یا هەر شـتێکیتر :: نەوزاد دەگەڵ پەنێر ئارای نیە ( حـەزی لی ناکا و

نایخوا ) ، کاك جەمال دەگەڵ مرتیشك ئارای باشە ( حــەزی لێ دەکـا ) . ٣ـ نێوان ، مابەین ، دوری دوو شت لە یەکتر . تێبـ ـ ئەم ووشەیە لـە ئەسلا بە مەعنای سێیەم ( دوری دوو شتی ماددی لە یەکتر ) بـوە ، بەلام بەرەبەرە جێگەی بـۆ ئەوانیتر چۆڵ کردوە . لە زمانی لاتینیدا AREA بە جێ‌خەرمان کوتراوە و هـەر ئەم ووشەیە لە زمانی ئینگلیسیدا هەیە و بە ( مەسـاحەت ، مەلبەند ، دالانی تەنگی درێژ کە لە ناو ماڵەوە بچێ بۆ ژێرخان و ژێر زەمینان ) دەکوترێ ، لە تورکی ئازربایەجانیدا هـەر بـە مەعنـای سـێیەم وەرگێـراوە ★ پەیوەندی ، نێوان . هس : ئاران .

**ئارام ــ** [ ئا + رەم ] . ١ـ (ند.) ئۆقرە ، ئیسراحەت ، تابشت ، توانا، حــەجمێن :: ژانەسـەر ئـارامی لێ‌هەلگرتبو، لە تاو ئێشی برینەکەی هیچ ئارام ناگرێ. ٢ـ (صە.) هێمن ، لەسەرخۆ . // تۆرە و تۆسن :: مام نادر پیاوێکی ئارامـە . ٣ـ کش و مات ، بێ هەست و خوسـت ، بێ تەقە و رەقە ، بێ شەر و شۆر ، بێ قرە و برە :: چەند رۆژێکە دنیا زۆر ئارامە ، ماڵ وەك مـاڵی کاك برایمی ئارام هەر نەبوە ، منداڵینە ئارام بن دەنا دێم لێتان دەدەم ، ئارام دانیشـە ٤ـ ( بن . ) بە ئاسپایی ، لە سەرخۆ، بە یەواشی :: ئارام ئارام لێی چومە پێش . تێبـ ـ بە قسـەی دوکتۆر معین ( فەرهەنگ : ج ١ ، ل ــ ٤٠) و پـوورداوود ( یگد ، ج ٢ ، ل ــ ٥٤ ) ئەم ووشەیە لە مەصدەری ئاوێستایی ( رەم ) بـە مەعنای حەسـانەوە و پێشبەندی تەئکید ( ئا ) پێکهاتوە و سانسکرێتییە کەی (رامەیەتی)یە (تە: معین ، بورهان ، ج ١ ، ل ــ ٣٠ ) .

**ئارام‌بون ــ** ( مصد. لا. ) ١ ــ بێ دەنگ‌بـون ، لـە جوڵەکـەوتن . ٢ ــ برانـەوەی شـەر و هـەرا و ئـاژاوە . ٣ ــ نیشـتنەوەی رق و تورەیی . ٤ ــ بەس‌کردن لە گریان و هــەرا و هــوریا و قیــژەقیژ . ٥ ــ شکانی ژانی بـرین و کەم بون یـا دامــرکانی ئێش و ئــازاری نەخۆشی .

**ئارام‌گرتن ــ** ( مصد. لا. ) تە : ئارام‌بون ١ و ٣ و ٤ .

**ئارام لێ‌بـران ــ** ( مصد. لا. ) ناڕەحەت بون بە هۆی ژان و ئێش و نە خۆشــی یـان خەم و پـەژارە و خەیاڵاتەوە :: چەنـد رۆژە نەوزاد سورەکوانێـکی لێهـاتوە ئـارامی لێ‌بـراوە ، لە تاو پێـرۆت ئارامم لێ‌بـراوە ، ئەوەندەی پـەرۆش بو ئـارامی لێ‌بـرابو ★ ئـارام لێ‌هەلگیران .

**ئارام‌لێ‌بـرین ــ** ( مصد. متـ. ) کارێکی، ناڕەحەتی فیکری و جیسمی بەسـەر کەسـێکی دێنـێ :: ئـەم سورەکوانە ئارامی لە نەوزاد بڕیوە . ★ ئارام لێ‌هەلگرتن .

**ئارام لێ‌هەلگرتن ــ** (مصد. متـ.) تە : ئارام لێ‌برین .

**ئارام‌لێ‌هەلگیران ــ** (مصد. متـ.) تە : ئارام لێ‌بران .

**ئارامی ــ** [ ئارام + ٣ ــ ئی ] ، (صتـ.) حاڵەتی هێمنی ، بێدەنگی ،

بێ هەست و خوستێ ، بێ شەڕ و شۆڕێ .

**ئاران** ــ ( ص. ) ١ ــ ( مک. ) زەوێ یا مەڵبەندێکی بێ گرد و تەپۆڵکە ، کە زۆر گەورە نەبێ . دەشتایێکی پچۆك □ « مەڕی ئاران وەکو مەڕی کوێستانێ نیە . » ٢ ــ (سن.) نەرمان ، تەخت (مخ. جا ــ ٦) . ٣ ــ ( نا. ) چیمەن ، لەوەڕگە ( کف : ٤٨ ) تێب ــ لە زمانی فرەنسێدا ( ئارێن ) کە لە (ئارێنا = زیخ)ی لاتینێ وەرگیراوە. بە مەیدانی زۆرانبازێ دەڵێن کە لە دەوری ڕۆمانییەکاندا ، لە ناوەندی ( ئامفی تیاتر )دا تەخت دەکرا و زیخیان تێدەکرد و (گلادیاتۆر) زۆرانیان تێدا دەگرت ( تە : لارۆس ــ ٥٦ ) .

**ئاراو** ــ [ ئار ؟ + ئاو ] ، (نت.) ، (مک.) کەفاو و صابۆناوێ کە پاش جل شوشتن لە سوێنە و تەشتا دەمێنێتەوە تێب ــ ماڵە فەقیری کورد ئەو کەلوپەلەی زۆر دەربەستی خاوێنێ نەبن لە (ئاراو)دا دەیشۆن ، ماڵە دەوڵەمەندەکانیش جل و شتومەکی خزمەتکار و دەست و پێوەندیان . ★ (بک.) ئاراف :ــ بێجگە لەم مەعنایەی کە لە سەرەوە باس‌کرا ، بە ئاو یا صابۆناوێکیش دەڵێن کە بۆ جل‌شوشتن ئامادە کرابێ (تە : کف ــ ٤٨) .

**ئارج** ــ ( نا. ) ، ( بک. ) جۆرە قامیشێکی ناوپڕە کە ڕاست هەڵدەستێ، ڕەنگی جوان و ئاودارە، شلکە و تا ٢٠ مەتر بەرز ئەبێتەوە . گەڵای وەك دارخورمایە ، لە شوێنی گەرم وەکو هیندستان زۆرە ، هەر مەشهورە بە قامیشی هیندێ ، ڕمب ، دار دەست و کوچانی لێ دروست دەکرێ، گەڵا و توێکڵەکەشی دەکرێ بە ڕایەخ ★ حەیزەران .

**ئارخەیان** ــ [ تو. ] ، (ص.) ، ( مک. ) تە : ئەرخەیان .

**ئارد** ــ [ پە. ئارت ] ، ( نا. ) ١ ــ ماددەیەکە لە هاڕینی گەنم پەیدا دەبێ و دەکرێ بە نان . ٢ ــ هاڕاوەی هەموو دانەوێڵەیێکی تر وەکو : جۆ ، برنج ، گەنمەشامێ ، نۆك .... ٣ ــ ووردە و خاکەی هەندێ شت بێجگە لە دانەوێڵە . :: ئاردی بەهارێ ، ئەم ئاردە نانی باش لێ دێ . ★ ( بک. ) ئار . ئەرڤانٚ ( ژابا ــ ٦ ) تێب ــ ئەم ووشەیە بە تەنیایێ هەر هاڕاوەی گەنم دەگەیێنێ ئەگەر مەبەست شتێکی تر بێ پێویستە ناوی ماددەکەشی بخرێتە سەر :: ئاردی جۆ ، ئاردەنۆك ، ئاردەتێ ، ئاردەمشار .

**ئارداوێ** ــ [ ئارد + ئاوێ ] ، (صت.) حاڵی کەسێکی تۆزی ئاشی لێ نیشتبێ و سپێ بچێتەوە . ●«شانی خۆی ئارداوێ دەکا» (کن.) ئەو کەسەیە کارێکی نەکردبێ ، بەڵام وای نیشان بدا کردوێە . ئەو کەسەی لە هیچی نەبوو خۆی تاوانبار پیشان دەدا .

**ئارداویژ** ــ [ ئارد + هاویژ (هاویشتن) ] ، (نت.) کاری فڕێدران و هاتنەدەری ئارد لە

نێوان دوو بەرداشی ئاشەوە :: ئارداوێژی ئاشی ئاگر چاترە لە ئاشی ئاو ( زۆرتر دەهاڕێ ) ★ ئاردەشان .

**ئاردکێش** ـ [ ئارد + کێش (کێشان) ] ، (نت.) ئامرازێکە وەکوو بێڵ و خاکەناز لە ئاشا بۆ کۆکردنەوەی ئارد و دوورخستنەوەی لە دەوری بەرداشەکان بەکاردێت .

**ئاردماڵك** ـ [ ئارد + ماڵ (ماڵینەوە) + ئك ] ، (نت.) ئامرازێکە ( تۆپەڵێ پەڕۆ و پاڵ ) پاش تەواو بوونی کاری ئاش و ڕاوەستانی ، دەوروبەری بەرداشەکانی پێدەماڵنەوە و خاوێنی دەکەنەوە .

**ئاردوڕۆن** ـ ( نت. ) ، ( سن. ، سیم. ) خواردەمەنییەکە لە ( ئارد ) و ( ڕۆن ) و کەمێ شەکر یا دۆشاو ، دروستی دەکەن و دەیدەن بە ژنی زەیستان تاتینی بێتەوە بەر . ★ ( مک. ) مێوانێ .

**ئاردەبارە** ـ [ ئارد + ە ـ ئە/١ + بار + ە ـ ئە/١ ] ، ( نت. ) ، ( سیم. ) هەندێك ئاردە زیاد لە مزەی ئاش ، ئاشێر دەیدا بە ئاشەوان ★ ئاردەوارە ، ( مک. ) قڕەمزە . تێبـ ـ ( بارە ) کە لەم وشەیەدا هاتوە دوو ڕێی دەچێتێ ، یەکیان کە بە مانای (بەهرە) و ئەوێتریان ( بار + ە ـ ئە/١) بێ کە ئەو دەمە مانای وشەکە دەبێتە ( هەقی بار کردنی ئارد ) ، بە لای منەوە ئەمەیان نێزیکترە لە ڕاستێ .

**ئاردەبرنج** ـ [ ئارد + ە ـ ئە/١ + برنج ] ( نت. ) برنجی هاڕاوە .

**ئاردەبێژ** ـ [ ئارد + ە ـ ئە/١ + بێژ ] ، ( صت. ) شتێ زۆر وورد هاڕابێتەوە ، وەك ئاردی دابێژراو وا بێ . تێبـ ـ تەنیا مامۆستا وەهبێ ئەم ووشەیەی نوسیوە ، خاڵ و مردۆخ و گیو باسیان نەکردووە . هس : ئالەبێژ .

**ئاردەتو** ـ [ ئارد + ە ـ ئە/١ + تو ] ( نت. ) توی ووشکی کڕەکراو . تێبـ ـ لە هەورامان تو ئیشك دەکەنەوە و کڕەی دەکەن ( تازۆر وورد نەبێ ) وەکوو مێوژ و مێوەی ئیشکی تر هەڵدەگیرێ بۆ خواردنی زستان یا بۆ فرۆتن ، یەکێکە لە حاصلاتی هەورامان .

**ئاردەجۆ** ـ ( نت. ) هاڕاوەی جۆ

**ئاردەشان** ـ [ ئارد + ە ـ ئە/١ + شان (وەشاندن) ] ، ( نت. ) ، (سن. ، هو.) تم : ئارداوێژ

□ هەنی چێش واچوَن ، چوَن مەکەرۆ ، چوَن گەرد ئاردەشان ، ئاسیای گەردوَن ( مەولەوێ : مکبـ ـ ٢٤٩ ) .

**ئاردەڵ** ـ ( نا. ) ، ( سن. ) پێشخزمەت ، فەڕاش ، گزێر ، یاساوڵ . تێبـ ـ ١ : فەرمانبەرێك بوە لە بەردەستی والییەکانی ئێرانیدا ، فەرمانەکانی والێ هەرچێ بوبن بە دەستی ئەو جێبەجێ کراون . ٢ ـ بە قسەی دوکتۆر معین ئەم ووشەیە (ئۆردیناریتسێ)ی ڕۆسییە ، لە کوردێ و فارسیدا وای بەسەرهاتوە ★ ئەردەڵ ، ( کعر. ) وەردیان .

**ئاردەلان** ـ ( نت. ) تم :

ئەردەڵان .

**ئاردەڵۆکە** ـ [ ئارد + ئەڵ + ئۆکە ] ( نت. ) ١ ـ ئاردێ کە لە ناو قۆلکەی ئاش دەمێنێتەوە .

□ کاسە بۆیە لازمە تا ئاردەڵۆکی دەربدا سەولی بۆیە لازمە نەك جۆگەلەی بێتبا بە تاو ( نالی : گم. ) ٢ ـ جۆرێ بەفرە ، کلۆی ووردە کە دەستی لێبدرێ وەکو جۆرەکانی تری بەفر دەست تەڕ ناکا و بە هاسانێش تۆپەڵ نابێ .

**ئاردەمشار** ـ [ ئارد + ە ـ ئە/١ + مشار ] ( نت. ) ووردەی دار و تەختە کە پاش بڕینەوەیان بە مشار ئەکەوێتەوە .

**ئاردەنۆك** ـ [ ئارد + ە ـ ئە/١ + نۆك ] ( نت. ) هاڕاوەی نۆك .

**ئاردەوا** ـ [ ئارد + ە ـ ئە/١ + وا (= با = چێشتی شل و تراو) ] ، ( نت. ) ، ( سن. ) شۆربای ئاردی گەنم ★ پەڵۆ ، پەڵۆلە .

**ئاردەوارە** ـ ( نت. ) تم : ئاردەبارە .

**ئارمانج** ـ ( نا. ) ، ( بک. ) تم : ئامانج .

**ئارمۆش** ـ ( نا. ) ، ( هل. ) تم : ئاوریشم .

**ئاروان** ـ [ ؟ ] ، ( نا. ) ، ( مک. ) ووشترێکی سێ بەهاری دیبێ ، نێر یا مێ ★ بەرزە. تێب ـ ئەرۆنە ، ئەرونە زەڕدوشتییەکانی ( یەزد ) و ئەروانە ، زەڕدوشتییەکانی (کرمان) بە ووشتری مێ دەڵێن کە حەوت سالی زیاتر بێ ( تم : فرهنگ بهدینان : جمشید سروش سروشیان

ـ ە ) .

**ئاروان لۆك** ـ ( نت. ) ، ( مک. ) ووشتری نێر کە چوار بەهاری دیتبێ .

**ئاروان ووشتر** ـ ( نت. ) ، ( مک. ) ووشتری مێنگەی چوار بەهار دیتو .

**ئاروانە** ـ [ئاروان + ە ـ ئە/١] ( نت. ) ، ( مک. ) ووشترێکی ( چ نێر چ مێ ) چوار بەهاری دیتبێ .

**ئارۆ** ـ ( نا. ) ، ( کی. ) تم : خەیار ، هارۆ ، هارویێ .

**ئارەخچن** ـ (نت.) تم : ئارەقچن

**ئارەزۆ** ـ [ پە : ئارزۆك ـ یا ـ ئارزۆك ] ، ( نا. ) ١ ـ ئیشتیای خواردەمەنێ :: ئارەزۆی گۆشت ئەکا ، ئارەزۆت لە چییە بڵێ بۆت لێنێن . ٢ ـ ئیشتیای دیتنی دۆست و خزم و کەس و کار :: ئارەزۆی باوکی دەکا ، ئارەزۆی مالی خاڵت ناکەی ؟ هەر بە ئارەزۆی مەهابادەوەم . ٣ ـ ئاوات ، مەبەست، دلخواز ( هەرچێکیبێ ) :: دەمێك بۆ بە ئارەزۆی ئەم سەفەرەوە بۆم ، نەرمێن بە ئارەزۆی خۆی گەیێ ئاخرێ ملوانکەی کڕێ .

**ئارەزۆکردن** ـ ( مصت. مت. ) هەستکردن بە ئیشتیای شتێك ، دڵ لە دۆی شتێك بۆن .

**ئارەزۆمەند** ـ [ ئارەزۆ + مەند (پب.) ] ، (ص.) حالی کەسێکی ئارەزۆی کارێك یا شتێك یا کەسێکی تر بکا .

□ مەدیان گوڵاڵان نە پای دەربەندان ئەو یەك تەر وێنەی ئارەزۆمەندان

( مەولــــەویی : مکبـ ــ ٤٣١ ).
**١ ــ ئارەق ــ** [ عا : عرق] ، (نا.) تراوێکە لە ئەنجامی گەرمای ماددیی ، سروشـــتیی یا دەســتکرد ، یاخـــۆ کارەسـاتێکی نەفســی ( وەکــو تۆرەبون ) ، یا ماندوبونی لەش ؛ لە کۆمەڵێ لۆ ( غدّة ) کە لە ناو پێستی لــەش دان و ژمارەیـــان دەگاتــە دۆمیلیۆن ، لــە کونە ووردیلــەکانی پێستی لەش دێتە دەر . لە کاتی نەخۆشیدا نەبێ ئارەقی لەش وەکو ئــاو بــێ ڕەنــگە ، ئــارەقی هــەر جێگایەکی لەش بۆنێکی تایبەتی هەیە کە دەگەڕێتەوە سەر وجودی ترشی کیمیایی ( ئەسید = حامض ) لە ناو ئارەقەدا . ٩٩٪ی ئارەق ( ئاو )ە و باقی ماددەی کیمیـــایی مەعدەنی و عوزویە کە لە هەمـــوان گرینگتریان ( یورە )یــە . ئینســـانی باڵق لــە سەعاتێــکا ٣٠ــ٤٠ گــرام ئــارەق دەکاتــەوە ، ئارەق‌کردنــەوە دەبێتە هۆی پاك بونەوەی خوێن لە خڵت و خاڵ . تێبـ ــ وا دیارە کوردیی ئــەم وشەیە ، لە لەهجەی ناوەندیدا لە بیــر چۆتــەوە ★ ١ ــ ئارەقــە ، عەرەق ، ( بک. ) خــو ، خۆیدان .
● **ئــارەقی ڕەش‌وشــێن دەردان** [ مصت. لا. ] ، ( کن. ) زۆر ماندو بون ، زۆر خۆماندوکردن بە ئێش یا قســە و کــاری فیکرییــەوە :: تا کتێبخانــەکەم ڕێــکخست ئــارەقی ڕەش و شــێنم دەردا ، شاسوار تا مەسەلەکەی جەبری حەل کرد ئارەقی ڕەش و شێنی دەردا. « . . . . . شێخ سەعیدی ســەبێلان چەنــد ڕۆژێ دوکانی دانەنا ، لێمان پرسی ئاغا ! لە کوێ بــوی ؟ ووتی : خێڵێــکی جنۆکەی کافر هاتبــون لە دەرەوەی ( سابلاغ ) هەڵیــا ندابو ، نیــازیان خراپ بو ، چومە گیانیان تا دەفعم کردن ئارەقی ڕەش و شێنم دەردا » ( بیرەوەریی خۆم ) . **ئارەقی ڕەش و شێن ڕشــتن** [ مصتـ. لا. ] تم : ئــارەقی ڕەش و شــێن دەردان . **ئارەقی ڕەش‌وشێن کردن** [ مصت. لا. ] تم : ئـــارەقی ڕەش‌وشـــێن دەردان .

**٢ ــ ئــارەق ــ** [ عا : عرق ] ، ( نا. ) ١ ــ خواردنـــــــەوەیێکی ئالکۆلــداره ، ٧٠ ــ ٥٠٪ ئــالکۆلی تێدایە، خواردنەوەی پیاو سەرخۆش دەکا . بە شێوەیەکی تایبەتی ( تم : ئارەق‌گرتن ) لە ترێ ، کشمیش ، خورما و هەندێ مێوەی تر دەگیرێ . تێبـ ــ ووشەی ئــارەق بە تەنیایــی ئارەقی تــرێ ، کشمیش و خورما دەگەیێنێ بۆ ئارەقی مێوەی تر دەبێ ناوی مێــوەکەی دەگــەڵ بگوتــرێ :: ئارەقی ئالوباڵو ، ئارەقی سێو . ٢ ــ جەوهەری هەندێ گژوگیایە کە بە شێوەی تایبــەتی و بۆ مەبەستی جیاجیا ئەگیرێ :: ئارەقی جاترە ، ئارەقی شاتەرە. تێبـ ــ جگە لە گوڵاو کە بۆ بۆنخۆشی دەگیرێ ، مەبەستی گرتنــی ئــارەقی گژوگیــا ، لــە کوردســـتان ، بــۆ داوودەرمـــانە . **ئارەقی جاترە :** [ عا. کو. ] ، ( نت. ) ئارەقێکە لە جاترە (تم:ــ) کە گیایەکی بۆ نخۆشی کوێستانە ، دەگیرێ و بۆ زگ‌ئێشــەی جۆربەجۆر ئەخورێتەوە ،

تامی وەکو نەعنە وایە بەلام تاڵ و تیژترە ، خواردنەوەی قڕقێنە دێنێ بۆیە بۆ تەعبئونیش (ئینتەلا) بەکاردێت. **ئارەقی شاتەڕە** [عا. کو.] ( نت. ) ئارەقێکە لە گیای شاتەڕە ( تم : ـ ) ئەگیرێ و بۆ هێندێ نەخۆشی پێست بەکاردێت . ئەو شوێنەی مەبەست بێ یا بە لۆکە ئارەقی لێ دەدەن یا خەنەی پێ دەگرنەوە و دە شوێنە نەخۆشەکەی دەدەن .

**ئارەقاوی** ـ [ ١ـ ئارەق + ٢ ـ ئاوی ] ، ( صمف. ) حاڵی کەسێکی زۆری ئارەقە کردبێ و جلك و لەشی تەڕ بێ :: شامار هەمو لەشی ئارەقاوی بۆ خۆی کرد بە ژورا، هەمو گیانت ئارەقاویە تا ئیشك نەبێتەوە دەرمەکەوە .

**ئارەق پێ کردن** ـ [ ١ـ ئارەق + پێ + کردن ] ، (مصد. مت.) ١ ـ خەجاڵەت کردنەوە و بە شەرمدا خستنی یەکێك . ٢ـ ترساندن و تۆقاندن . ٣ـ پارە ئەستاندن لە کەسێ بە نێوە زۆر و نێوە خواهیشت :: ئیمڕۆ حەسەن ئارەقی بە شیرکۆ کرد پێنج دینـاری لێ ئەستاند ★ ئارەق پێ کردنەوە .

**ئارەق پێ کردنەوە** ـ ( مصد. مت.) تم : ئارەق پێ کردن .

**ئارەقچن** ـ [ ١ـ ئارەق + چن ( چنین )]، ( نت. ) کلاوێکە لە پارچە و قوماش دەیدرون یا لە بەن و دەزو دەچنرێ و دەکرێتە سەر ، هەر تەپلە سەر دادەپۆشێ . ★ ئارەخچن ، تەقیلە .

**ئارەقخۆر** ـ [ ٢ـ ئارەق/١ + خۆر ( خواردن )] ، ( صفا.) ، ئەو کەسەی هەمیشە ئارەق دەخواتەوە .

**ئارەق دەردان** ـ [١ـ ئارەق + دەر + دان ] ، (مصد. لا.) ، تم : ئارەق کردن .

**ئارەق ڕشتن** ـ (مصد. لا.) ١ـ تم : ئارەق کردن . ٢ـ(کن.) ماندوبون و زەحمەت کێشان بە کارێکەوە .

**ئارەق کردن** ـ (مصد. لا.)، ١ـ هاتنە دەری ئارەقە لە لەشی ئینسان. ٢ـ (کن.) گەرمابون ، بە خۆدا شکانەوە ، خەجاڵەت بونەوە ★ ئارەق دەردان ، ئارەق ڕشتن/١ ، ئارەق کردنەوە .

**ئارەق کردنەوە** ـ (مصد. لا.) ، تم : ئارەق کردن .

**ئارەق کێشان** ـ [ ٢ـ ئارەق + کێشان] ، ( مصد. مت.) ، تم : ئارەق گرتن .

**ئارەق گرتن** ـ [ ٢ـ ئارەق + گرتن ] ، (عا. کو.) ، (مصد. مت.) دروستکردنی ئارەق . تێب ـ ١ دروستکردن و فرۆتنی ئارەق تا ئەم دوایانەش لە کوردستان پێشەی تایبەتی فەلە و جولەکە بو،موسوڵمان بە ئاشکرا ، خۆیان لە قەرەی ئەم ئێشە نەدەدا . شێوەی گرتنی ئارەقی خواردنەوە و ئارەقی گژوگیا تۆزێ لێك جیابون . ٢ـ بۆ گرتنی ئارەقی خواردنەوە لە پێشدا ترێ دە تەشت یا شوێنێکی تایبەتیدا بەپێ دەشێلن و دەپلێشێننەوە تا دەبێتە تلپە و ئاو ، دایدەپۆشن و لێی دەگەڕێن تا

دەترشێ (تخمّردەکا) ئەو جار دەیکەنە مەنجەڵێکی زەلامەوە و سەرێ بە سەر پۆشێکی تایبەتێ دەگرن و بە قوڕ یا هەر شتێکی تر هەناسەی لێ دەبڕن ، لە لایێکی ئەم سەرپۆشەوە لوولە یا مەسینەیەك قایم کراوە و دەورەی ئاوی ساردە ، ئەوجار ئاگرێکی باش لە ژێر مەنجەڵەکە دەکەنەوە ، گەرما و تینی ئاگر تلپ و تالی ناو مەنجەڵەکە دەکا بە هەڵم و بە لوولەکەدا دەردەچێ ، چونکە خۆی گەرمە و ڕێگای دەرچوونی سارد ، دەبێتەوە ئاو ، تك‌تك ئەتکێتە قاپێکەوە کە لەبەر لوولەکە داندراوە . بۆ گرتنی ئارەقی گژوگیاش ئەم شێوەیە بەکارهێنراوە و شێوەی تایبەتێش هەبوە : ناو مەنجەڵێکی گەورە پڕ دەکەن لە گیای مەبەست و ئاوی کەم تێدەکەن ، دفرێك لە ژوورەوە لە سەر گیایەکە دادەنێن و تەشتێ دەخەنە سەر مەنجەڵە گەورەکە و دەورەی قوڕ دادەدەن و تەشتەکە پڕ دەکەن لە ئاوی سارد هەڵمی گژوگیایەکە لە بنی تەشتەکەدا و لەبەر ساردێ دەبێتەوە ئاو کە دەتکێتەوە ناو دەفرەکەی ناوەوە .

**ئارەقگیر ــ** [ ١ــ ئارەق + گیر ( گرتن )] ، ( نت. ) ١ــ پارچە لبادێکە لە ژێر زینەوە لە ئەسپ دەکرێ و ئارەقەی هەڵدەچنێ . ٢ــ (کئیرژ.) کراسێکی تەنکی چندراوە ، لە بن کراسەوە دەبەر دەکرێ بۆ ئیشك کردنەوە و هەڵچنینی ئارەقەی لەش ★ (کعر.) فانێلە .

**١ ــ ئارەقە ــ** [ ١ــ ئارەق + ەــ ئە/١ ] (نت.) تە : ١ــ ئارەق .

**٢ــ ئارەقە ــ** [ ؟ ] ، (نا.) ، (سن.)دارێکە لە دیواری هەڵدەکێشن بۆ ئەوەی قایم تر بێ ★ (سن.) دیمەك. تێب ــ ١) دیوار چ بە خشت و بەرد یا مۆرە بێ پاش ئەوەی هەندێ بەرز دەبێتەوە ئالوودار یا هەر پارچە دارێکی تری لە سەر دادەنێن و دێسان هەڵیدەستێنن و هەروا ناو بە ناو دارێکی تێدەخەن ئەمەش بۆ ئەوەیە کە دیوارەکە لە سەریڕا بۆ خوارەوە شکست نەیێنێ . بابلییەکان بۆ ئەم کارە قامیشیان دە کارکردوە . ٢) لە قامووسەکانی کوردێ کە لەبەر دەستم بوون (مردۆخ) ئەم ووشەیەی نووسیوە و مەعنا فارسییەکەی بە ( مەهار ) و ( ئەرەقە ) لێکداوەتەوە و بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەش نووسیوێتی ( تیر توی دیوار ) یەعنی : داری ناو دیوار ، بەڵام قامووسەکانی فارسێ ( ئەرەقە ) هەر ناگرن و (مەهار)یش لە فارسیدا هەر بە مەهاری ووڵاخ دەگوترێ و هیچیان بە ( داری نێو دیوار ) نەکوتراون . ( خاڵ )یش ئەم ووشەیەی بە دوو مانای ( ١ــ ئارەقە ) و مەهاری ووڵاخ نووسیوە .

**ئارێ ــ** ( ئم . ) ١ــ بۆ تەئکید و بەڕاست زانین .

□ ئارێ واجبەن ، تانەی بەدکاران
پەی گەرمێ بازاڕ ، عەشق دلداران .

( مەولەوێ : مکب ــ ٤٣٩ )

★ ئا ، با ، ئەرێ/٢ ، (بک .) ئارێ، ئەرێ ( کف ــ ٤٩ ، ٢٣٨ ) ، ئەرێ ، هەرێ ( ژابا ــ ٦ ) . ٢ــ بۆ شك و

گومان و سەرسوڕمان :: ئیمڕۆ خاڵم پێنج دیناری دامێ . ئاریێ ! (سەیرە هیچ باوەڕ ناکەم ) ★ ئەرێ/٣ .
**ئاریێ ئاریێ :** بۆ تەئکیدی زۆر بەکاردێت □
یار دڵی خوێنێن و چاوی پڕ لە
گریانی دەوێ ئاریێ ئاریێ ، گوڵ
لە باخان ئاوی بارانی دەوێ
(نالی : گم ـ ٩٢) **ئاریشەللا :** [ئارێ + شەللآ = عا : انشاءالله] ، (سیم.) بۆ شك و گومان لە ڕاستی قسەیەك و بە ئاواتی ڕاستبونی ، بەکاردێت :: ئاریشە للآ وا بایە ( وانیە ، باوەڕ ناکەم وا بێ . )
**ئاریێ ـ** ( نمصـ . ) ، ( بك . ) کۆمەگ، یاریدە. **ئاریێ کردن :** (مصت. مت.) یارمەتیدان ، کۆمەگ کردن ★ ئالیێ (ژابا/٦ ، كف ٤٤ ) ، هاریێ (كف ٢٩٨ ) . **تێبـ :** ئەم ووشەیە و چەندێکیتر کە هەر لەمە وەرگیراون ، لە ساڵانی شەڕی دوەمەوە لە نوسینی سیاسیدا بەکارهێنراون .
**ئاریباریێ ـ** ( نت . ) ، ( کیـ . ) هەڵوچە ، هەڵوژە . هس : ئاڵوباڵو .
**ئاریکار ـ** (نا . ، صفا .) ، (بك.) کەسێکی دەستی یەکێتر بگرێ و لە جێبەجێ کردنی ئیشێکا کۆمەگی پێ بکا . ★ هاریکار ، یاریدەدەر ، تە : ئاجودان .
**ئاریکاریێ ـ** (نمصـ . ) کاری یاریدەدان ★ هاریکاری . **ئاریکاری خواستن** ( مصت . لا . ) داوای کۆمەگ کردن ( ژابا ـ ٦ ) .
**ئاریلە ـ** ( صـ . ) پیاوی ژنانێ ، پیاوێکی ڕەووشت و خوی ژنانە بێ .

★ ژنانیلە . هس : ئاڵێ . تێبـ ـ تەنیا مامۆستا وەهبیێ ئەم ووشەیەی نوسیوە .
**( ـ ئاڕا ) ـ** ( پبـ . ) دەگەڵ ناو تەرکیب دەبێ و دەیکا بە فاعیل
□ تا سولەیمانان نەچونە سەدری
تەختی ئاخیرەت ئەحمەدی
موختاری ئێمە شاهی تەختئاڕا
نەبو
( نالێ . گم . )
جامت جەم ئاسا لەبڕێز کە جە
مەی پێم نۆشکەر وە یاد بەزم
ئاڕاکەی کەی
( مەولەوێ . مکبـ . )
**تێبـ ـ** ئەم پاشبەندە لە ( نمصـ . )ی ئاڕایشت یاخۆ لە مەصدەری ( ئاڕاستەن )ی پەهلەوێ کە ئێستاش لە فارسیدا هەر بەکار دێت و بە مەعنای ڕازاندنەوەیە ، وەرگیراوە ، بچێتە سەر هەر ناوێك دەیکا بەصفەتی فاعیلێ بۆ ناوێکیتر :: شاهی تەختئاڕا = شایەك ، کە تەخت دەڕازێنێتەوە، لەوانەیە تەخت زینەتی لەوێ وەردەگرێ .
بەڵام تەرکیبەکە بە تەنیایێ دەبێتە ناوی فاعیل :: بەزمئاڕا = کەسێکی مەجلیسی کەیف و بەزم سازدەکا و گەرمی دادێنێ .
**ئاڕاستە ـ** [ پهـ : ئاراستەك ] ، ( نمف . ) ، ( سیم . ) ١ـ ڕازاوە . ٢ـ ڕێكوپێك کراو . ٣ـ ڕێکخراو ( لە شکروسوپا ) . ٤ـ ئامادە . **تیبـ :** هەر وەکو لە ووشەی ( ئاڕا )دا باس کرا مەصدەری ( ئاڕاستەن )ی پەهلەوێ

لە کوردیدا بۆتە ڕازاندنەوە ، بەڵام ئـەم ( نمف. )ەی وەکـو خـۆی لێ بەجێ‌مـاوە ، کـە لـە سـلەیمانێ بـەکاردێت و لـەگـەڵ ( کـردن ) مەصـــــدەرێکی تێکـــــەڵی لێ‌دروست‌کراوە .

**ئاڕاستە کردن** ـ (مصت . .مت .)، ( سیم. ، کعر. ) ١ـ ڕۆی چەك ، خەبات یا قسە دە کەسێك، ڕێژیمێك یا بیروباوەڕێك‌کردن :: بزوتنەوەی نەتەوایەتێ کـورد ، خەباتی خـۆی ئاڕاستەی ئیمپریالیستەکان کردوە. ٢ـ پیشاندانی ڕێگای کارێـك بـە یەکێك یا کۆمەڵێك، تەوجیە :: پارتێ ئەندامەکانی خـۆی بـە ئامۆژگاریێ پێشکەوتوانـە ، ئاڕاسـتە دەکرد . ٣ـ حەواڵەکردنی قسـە و توانج و جوێن و مست و تێلا و ئـەو جۆرە شتانە بۆ یەکێك :: خـولە مستێکی ئاڕاستەی جوامێر کرد .

**ئاڕاییش** ـ [ پە : ئاڕاییشن ] ، ( نمص . ) ١ـ ڕازانـــدنـــەوە . ٢ـ جوان و ڕێك و پێك کردنی شتێك یا کەسێ . ٣ـ خشڵ و ئەسـپابی جوانێ بـە خـۆوەکردن ☐ « کچی پاتشای بە حـەوت قەڵـەم خـۆی ئاڕاییشن دابـو . . . » **تێبـ** : ئـەم وشەیە لـە دوای ( ش )ەکەیـەوە (ت)یەکێ هەیە، بەڵام لە بەر قورسێ، یـان فڕێ دەدرێ یـان بـە حـاڵ دەردەکەوێ ☐ .

چیشبەن ئاڕاییش سەر تا وە دامان
مەر خاڵۆم وەعەزم سەیرتان ئامان
( مەولەوێ : مکبـ ـ ١٤١ )

**ئاڕاییشدان** : ( مصت. مت.) تە : ئاڕاییش . **خۆ ئاڕاییش‌دان** : خـۆ جوان‌کردن،خۆ ڕازاندنەوە (بۆ ژنان) . **حەوت قەڵەم خۆ ئاڕاییش‌دان** : خۆ جوان‌کردنی ژنان بـە حەوت جۆرە کەلوپەلی خۆڕازاندنەوە : ١ـ خەنە . ٢ـ ڕەنگ ( وەسـمە ) . ٣ـ کـل ٤ـ سوراو. ٥ـ سپیاو . ٦ـ خاڵ . ٧ـ مێل .

**ئـاڕفتە** ـ [ ئـا + ڕفتـە ] ، ( نمف. ) ، ( سنـ. ) تێك تەپیو ، ڕۆخاو ، وێران ★ ( مک . ) ڕفتە . هس : ( بک . ) ئـاروەدە : بێکـارە ، خوێڕێ ( تە : ژابا ـ ٦ ) و : کەفتە و ڕەفتە .

**ئاڕۆ** ـ [ ئا + ڕو ] ، ( بنت . ) ، ( هو . ) تە : ئیمڕۆ ☐
ئاڕوشیم سەرکۆی گلکۆی‌تازەی لەیل
جەدیدەم واران ئەسرێنان چون‌سەیل
( ؟ )

**١ـ ئازا** ـ (صـ .) ١ـ بەجەرگ، دلیـر ، نـەترس ( بەگشـــتێ ) . ٢ـ کەسـێکی لـە شـەڕا چـاوی نەترسێ و جێـگای خـۆی بـەجێ نـــەهێڵی . ٣ـ ( مجـ . ) خیـرا ، چوست و چالاك :: ئازاکە ، دەی لە مامت کەوێ بڕۆ بـەڵام ئازا بێیەوە (خیراوەرەوە) . ٤ـ ساغ، بی‌عەیب. :: گوێزی ئازا، حەسەن وەك گوێزی ئازای لێهاتوە . // پـوت ، پوچ ، پوچەڵ ، نەخۆش . ٥ـ تە : ئازاد :: گەردنت خۆش و ئازا بێ ، « ئازا و ڕزگاری قاپێ خولای بی . »

**٢ـ ئازا** ـ [ = عا : اعضـاء ] ، ( نا. ) ئەندامی لەشی گیانداران بـە تایبەتێ ئادەمیزاد :: هـەمو ئـازای

بەدەنی تێك‌شکابێ ، ئازای لەشی هەلاهەلا بێ □
جەو ساوە نیەت ڕۆزەم ئاوەردەن
هیچ ئازام جەهیچ زۆرەش‌نەوەردەن
( مەولەوی : مکب ــ ٤٨ )
**تێبـ :** ئەم ووشەیە لەشێوەی جەمعی عەرەبێدا هاتۆتە زمانی کوردییەوە ، وەکو ( مفرد ) بەکار دێت . بۆ جەمع کردنەوەی ووشەی ( هەمۆ )ی دەخرێتە پێش . ★ ئەعزا/١ ، ئەندام/١

**ئازاد ــ** [ ستە : ئازاتە . پە : ئازات ] ، ( صە . ) ١ــ کەسێکی بەندە و عەبد نەبێ ، زەرخرێدی کەسێکی‌تر نەبێ ، دیل و ئێخسیر نەبێ ★ سەربەست . ٢ــ میللەتێك یا وولاتێکی لە ژێر دەستی بێگانانـدا نەبێ ، سەربەخۆبێ . ٣ــ ئافرەتێکی ڕوی خوی دانەپۆشی و شەرم لە پیاوان نەکا ٤ــ ناوە بۆ نیرینە . **تێبـ :** ئەم ووشەیە شکلێکی کونتری ( ئازا )یە کە بە مانای ( شجاع )ە . هس : زات = جورئەت ( کوردی ) ، ئەسەد = شێر ( عەرەبی ) .

**ئازادکردن ــ** ( مصد. متە. ) ١ ــ بەرەڵلاکردنی یەکێك لە بەندیخانە و دیلی و ئێخسیری . ٢ ــ پساندنی پێوەندی بەندەیی و غولامێتی لە ئەستۆی کەسی ، دەرهێنانی تۆقی عەبدایەتی لە ملی ئەو کەسانەی ( عەبد )ن . ٣ ــ ڕزگار کردنی وولاتی لە دەس بێگانە . ٤ــ داماڵینی بەندوداوی ماددی و مەعنەوی لە کەسێك یا لە شتێك :: ئازاد ! ( وەڵامی سلاوی عەسکەرییە لە سوپای ئێران و کەوتۆتە ناو زمانی کوردییەوە ، وەکو ئەو سەربازەی سلاوی نیزامی بۆ ئەفسەرەکەی دەکا ، بەستراپێتەوە . ) ، شۆڕشی چاردەی تەموز ، عێراقی لە دەست ئیمپڕیالیزم ئازاد کرد . ٥ ــ (مجـ.) تەلاقدان و بەرەڵلاکردنی ژن .

**ئازادی ــ** [ پە : ئازاتیهـ ] ، (حمصـ.) بەندە و عەبد نەبون ، جلەو بەدەست‌خۆوەبون ژێردەستەی کەس نەبون ★ ڕزگاری . (بکـ.) ئازاهی .

□ ئازادی ، سەربەخۆیی و مێری و گەورەیی
داوا دەکەین بە زار و زمان و ددان و لێو
( سەیفی قازی )

**ئازادیخوا ــ** (نفـا.) تمـ : ئازادیخواز .

**ئازادیخواز ــ** [ ئازادی + خواز (خواستن) ] ، (نفا.) ئەو کەسەی ئازادی دەوێ ، ئەوەی بۆ ئازادی وولات یا میللەت یا بیروباوەڕی ( ئازادی گشتی ) خەبات دەکا :: ئازادیخوازان لە پێناو ئازادی نەتەوەی کوردا بە گژ ئیمپڕیالیزم و نۆکەرەکانیدا دەچن .

**ئازادیخوازانە ــ** [ ئازادی + خوازی + ئانە ] ١ ــ (صتە.) هەر کار و کردەوە و شتێکی پێوەندی بە ئازادیخوازییەوە هەبێ :: خەباتی ئازادیخوازانەی میللەتان ، مەقالە ئازادیخوازانەکانی ڕۆژنامەی « نور » بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەی

کورد . ٢ ــ [ ئازادیخواز + انه ] ، (بند.) وەکوو ئازادیخوازان ، بە شێوەی ئەو کەسانەی ئازادیتیان دەوێ :: ئازادیخوازانه بیر لە مەسەلەکە بکەوە. تێب : ئەم ووشەیە ئەگەر (صفەت) بێ لە ووشەی ( ئازادیخوازی ) وەردەگیرێ و لە جوملەدا پاش ناو دێت و لە ئەسلا دەبێتە ( ئازادیخوازیانە ) بەڵام دەنگی ( ی )ەکە لەبەر قورسی دەکەوێ . بەڵام ئەگەر ( بەند = قید ) بێ لە وشەی (ئازادیخواز) دادەتاشرێ و هەمیشە پێش ناو دەکەوێ .

**ئازادیخوازی** ــ ( حمص. ) خەباتکردن لە پێناو سەربەستیدا ، لایەنی ئازادی گرتن .

**١ ــ ئازار** ــ [ پە : ئازار ] ، (نا.) ١ ــ ئێش ، ژان :: سوورەکوان ئازاری زۆرە ، ئەم منالە لەو جێگە بەرزەڕا کەوتەخوار کەچی ئازاری نەگەیێ . ٢ ــ نەخۆشی گیانداران جگە لە ئینسان :: مریشکەکان ئازاریان تێکەوتوە . ٣ــ نەخۆشی ئادەمیزاد ، ئەوانەی زۆ تەشەنە دەکەن و خەڵك زۆر دەکوژن ( تاعون ، کولێرا ... ) تێب ــ مەلبەندی سابلاغ ، سالی ١٣٣٦ی کۆچی کولێرای تێکەوتوە ئێستاش بە ( سالی ئازاری ) مەشهورە ٤ ــ ئەزێت ، جەزرەبە ، عەزاب ، ئێش و ژانێکی پیاو لە پاش ماندوبون ، لێدان و کارکردن هەستی پێدەکا . □ « بنوێسن وەبان سەنگی مەزارم ، شەهیدی عەشقم مەدەن ئازارم » . (فۆلکلۆر) .

**ئازاری سی** [ ئازار + سی ] (نت.) ، (سنـ.) تە : / **ئازاری سیل** [ ئازار + ا ــ ئی + سیل = عا : سل ] ، (کو . عا.) ، (نت.) ، (مکـ.) نەخۆشییەکە زیاتر لە سیپەلاك دەدا و پیاو زەبون دەکا و تا دێ بارێکتر و بێ هێز تر دەبێ و ئەگەر چارەی نەکا دەیکوژێ . ★ ئازاری سی ، تەبەرکولۆز (فرەنسی) ، دەردەبارێکە ، سیل ، سێل و دیق. تێب ــ ئەم نەخۆشییە بە هۆی ( باسیل )ێکەوە پەیدا دەبێ کە لە ئالکول و ئاسیدا خۆ ڕادەگرێ ، دەتوانێ لە هەموو ئەندامەکانی لەشا سەر هەلبدا ، بەلام زیاتر لە ناو (سی) پەیدا دەبێ . باسیلی ئەم نەخۆشییە چونکوو ( کۆخ )ی ئەلمانی دۆزیویەتەوە مەشهورە بە ( باسیلی کۆخ ) لە بەلغەم و تفی نەخۆش و ئەو ئەندامەی کە توشی هاتوە دەبێندرێ . میکرۆبی سیلی پاتال ــ گا ، مانگا ــ لە ئینسانیش کار دەکا و خواردنەوەی شیری مانگای سیلاوی پیاو توشی ئەم نەخۆشییە دەکا . جاران سیل دەردی بێ دەرمان بوو زیاتر بە ڕۆنی ماسی دەرمان دەکرا ، بەلام ئێستا باش چارەی دەکرێ .

**٢ ــ ئازار** ــ [ = عا : ئاذار ، لە سوریانی ] (نا.) ، (کعـر.) تە : ئادار .

**ئازاردان** ــ [١ ــ ئازار + دان] ، (مصد. متـ.) ئێشگەیاندن بە کەسێك چ بە لێدان چ بە قسە یا هەر شتێکی تر :: کەوشی تەنگ قاچ ئازار دەدا ،

قسەی ئەم کابرایە هێندە ڕەقن دڵی پیاو ئازار دەدەن .

**ئازاکردن** ـ [ ١ـ ئازا + کردن ] (مصت. لا.) ١ ـ (سنـ.) خێرایی کردن لە کارێکا ، تالوکەکردن . ٢ ـ (مصت. مت.) خۆشبوون لە هەق :: گەردنی ئازا بکەن . **خۆئازاکردن** : خۆنەترس پێشاندان ، کارێکی وا کردن کە خەڵك هەست بە جەربەزەیی بکەن :: وەرە دانیشە هێندە خۆتمان لێ ئازا مەکە .

**ئازاڵە** ـ (نت.) ، (سنـ.) سوتەمەنی لادێی کوردەواری : تەپاڵە و پشکەڵ و دەوە ... ★ تەپاڵە . هس : (بکـ.) ئێزنگ .

**ئازایانە** ـ [ ١ ـ ئازا + ئانە ] ، ١ ـ (صت.) کار و کردەوەیەکی ئازایەتی تێدابێ :: هەڵمەتێکی ئازایانەیان بردە سەر سەنگەری دوژمن . ٢ ـ (بنت.) بە شێوەیێکی ئازایەتی، وەکو یەکێکی ئازا :: ئازایانە هەڵیان کوتا سەر تانکە بۆر ، کوڕینە ئازایانە ئەم ئێشە ڕاپەڕێنن . تێب : ئەم ووشەیە ئەگەر صفەت بێ لە پاش (ناو) دێت و ئەگەر (بەند)یش بێ دەکەوێتە پێش فیعل .

**ئازایەتی** ـ [ ١ ـ ئازا + ئەتی ]، (حمصـ.) نەترسان ، بەجەرگبوون :: ئەو ئازایەتی ئێوە دەینوێنن لە دەس کەم کەس دێ ، ئازایەتی مەلا عەولای جوتیار دە گێڕانەوە نایە .

**ئازایی** ـ [ ١ ـ ئازا + ٢ ـ یی ] (نمصـ.) خۆڕاگرتن و ڕاوەستان بەرامبەر خەتەر و مەترسی ، بەرانبەر ئێش و ئازار و بەسەرهاتی ناخۆش :: ئەمە ئازایی پێ نالێن پیاو خۆی بخاتە مەترسییەوە ★ (بکـ.) ئازاتی ، ئازاهی .

**ئازوباز** ـ (نت.) ، (سیمـ.) تم : ئازوبەزە .

**ئازوبەزە** ـ [ ئاز + و + بەزە ] (نت.) ، (سیمـ.) جوملەیێکە بۆ پاکانەکردن لە مەسئولیەتی کردەوە و ئاکار و قسە بەکاردێت کە یەکێك دەربارەی کەسێکی تر کردبێتی و کابرا وا بزانێ کە بەم کردەوە یا قسەیە زیانی پێدەگا و بە ئانقەست وای دەگەڵ دەکرێ یاخۆ شتێك ڕۆی نەدابێ بەڵام کابرا وای چوبێتە مێشکەوە :: ئازوبەزەت بە ملم ئەگەر نیازم خراپ بوبێ لەگەڵت ، ئازوبەزەی تۆم بە ملی ئەگەر شتی وام لەدەم دەرهاتبێ ★ ئازوباز ، (مکـ.) ئەز . تێب ـ بە لای منەوە ئەم ووشەیە لە ئاز (پهـ : ئاز = پێداویستی ، تەماح ، ئارەزو ) و بەزە ( پهـ : بەچەك = تاوان ، زوڵملێکردن ) پێکهاتوە .

**ئازۆخە** ـ (نا.) ، (سنـ.) تم : ئازۆقە .

**ئازۆقە** ـ [ ئاز + ئۆقە = ئۆکە ] (نت.) ، (مکـ. ، کئێر.) دانەوێڵە و ڕۆن و خواردەمەنی تر کە بۆ چەند مانگ یا ساڵ یا فەسڵێك لە ماڵ دادەنرێ . :: ئازۆقەی ئەو ساڵمان داخستوە ، لە کوردەواری چەند ڕۆژێکی بمێنێ بۆ ڕەمەزان ئازۆقەی تایبەتی ئەم مانگە دادەخەن . ★ تفاق ، زەخیرە تێب ـ دوکتۆر معین لە فەرهەنگی فارسیدا (جا ،

ل-٤٩) ئەم ووشەیە دەباتەوە سەر ( ئازۆق ، ئازۆق )ی تورکیٚ ، کەچیٚ سەر و گوێلاکی ووشەکە بە لای منەوە لەوە نەدەچوٚ . تا لە قامۆسەکەی ( ژابا JABA )دا (ل-٧) تۆشی ووشەی ( ئازپێش ، ئازچیٚ ) هاتم بە مانای ( ئاشپەز ، ئاشچیٚ ) . هەروەها خوالیٚخۆشبوٚ (پۆرداوود) کە (گاتها)ی ئاویستای وەرگێڕاوە و لێکیداوەتەوە لە لاپەڕەی ٤٤٦ی بەرگی دوەمی « یادداشتهای گاتها » ئاوا دەلیٚ : « ... ئازوٚتیٚ = ئازوٚئیتی : لە ئەسلا بە مەعنای ( چەوریٚ )یە ، بەلاّم زۆر جار مەبەست خواردەمەنێیە لە بەرامبەر خشویذە کە خواردنەوەیە ... » جا ئەگەر (ئازۆقە) لە (ئازوٚئیتیٚ) ئاوێستایی وەرنەگیرابیٚ سەیرە .

**ئازۆقەداخستن** ـ (مصت. مت.) ، (کئێر.) کڕین یا پەیداکردنی خواردەمەنی ، ئەوەندەی بەشیٚ ماوەیێك بکا و عەمبار کردنی .

**ئازەر** ـ [ پە : ئاتور ] ، [فر.] ، (نا.) ، (کئێر.) مانگی نۆهەمی سالّی ئێرانییە کە لە نەورۆزێرا دەس پێدەکا ، سێیەمین مانگی پاییزیٚ ، دەکەوێتە نێوان ٢١ی تەشرینی دوەم و ٢١ی کانوٚنی یەکەم ★ ئاگردان ، سەرماوەز ، سێخوار ، سێخوارلەپشت ، قەوسی پاییزیٚ . تێب ـ ئەم ووشەیە خۆی بە مانای ئاگرە و ناوی یەکێکە لە (ئێزەد)ەکانی دینی زەڕدوشت ، هەروەها ناوی باوك یا مامی ( برایم پێغەمبەر )ە کە

هێندیٚ کەس بە زەڕدوشتیٚ دەزانن .

**ئازیز** ـ [= عا : عزیز] ، (صە.) خۆشەوێست ، لەبەردلاّن

□ ئازیز دیارەن وادەی لوامەن
ئەلوەدای ئاخر ئەوەنامامەن
( مەولەویٚ : مکب ـ ٥ )

★ ئەزیز ، عازیز ، عەزیز .

**ئازیزە** ـ [ ئازیز + ٥ ئە/١ ] ، (نت.) ناوی مەقامێکی کلاسیکی کوردییە .

**ئازیەت** ـ [ = عا : عزاء ] ، (نا.) سەرەخۆشیٚ ، تازیە .

□ شێرێنی قامەت قیامەت نەوەرد
سەلاّی فەرز بەرگ ئازیەتی
ئاوەرد
(مەولەویٚ : مکب ـ ١١١)

★ پرسە ، (بکـ.) بەهیٚ .

**ئازیەتبار** ـ (صت.) کەسێکی مردوٚی لیٚ مردبیٚ . تازیەدار .

**ئازیەتباریٚ** ـ (حمصە.) لە حالّی تازیەداریوٚن .

**ئازیەتیٚ** ـ [ ئازیەت + ٣ ـ ئیٚ ] (صت.) هەرچی پێوەندیٚ بە تازیەوە هەبیٚ .

□ ئەوێچ تا مانگیٚ شەڕاب نەنۆشا
بەرگ سەوادی ئازیەتی پۆشا
( خانا ـ ٤٢٥ )

**ئاژاشکە** ـ [ ئاژ + ئاژ + کە ] ، (نت.) ، ( هۆرێنوشێخان ) ١ ـ مۆچڕك . ٢ ـ پشێویٚ فیکریٚ ٣ـ ( جافیٚ ، گەرمیان ) باوێشك :: ئاژاشکە گرتویە تێب : بەلای منەوە (ئاژ)ی ئەم ووشەیە دەگەلّ ڕیشەی فیعلی هەژاندن (هەژ) یەکن و لە (ئاژ)ی دوەمدا دەنگی ( ژ ) یەکە بە

جیرانەتی ( ك ) بۆتە ( ش ) .
**١ـ ئاژاڵ ـ** ( نـا . ) حەیوانی ووردە ، مـەڕوبـزن :: ئـەم ئاژاڵەتان بۆچی کردۆتە گەنمەکەوە، ئەم دێیە لەوەڕی باشە بۆیە ئاژاڵی بە کەیفە . ★ ئاژەڵ .
**٢ ـ ئـاژاڵ ـ** ( نا . ) ، (سنە.) ١ ـ سەوزەگیا . ٢ ـ ووردە دار و چێو . ٣ چڕوچێلکە . ٤ ـ پۆش و پەڵاش. تێبـ ـ مردۆخ ئەم ووشەیەی هەر بـەم مەعنـایە هێنـاوە و لە ( ١ ـ ئاژاڵ ) نەدواوە . لە فارسیدا ( ئاخال ، ئاشخال ، ئاشغال ) بەو مەعنـایە و ( شتی بێکەڵـك )یش هاتوە . ( تم : معین ـ فەرهەنگ ، جا ـ٦٠) . هس : ئاژار = پیت و بەرەکەتی زەوی ( تم : ژابا ـ ٧ ) .
**ئاژان ـ** [ فرەنسـی ] ، (نا.) ، ( کئێر ) ئـەندامی پۆلیســـخانەی شـارێك :: ئـاژان لەبـەر دەرکی حەمامی ڕادەوەستان و چارشێوی ژنانیان دەدڕی ، ئەوەیان ناو لێنابۆ ئازادی ژنان ★ پاسەوان، پۆلیس، شورتی. تێبـ ـئەم ووشەیە لەزمانی فرەنسیدا بە مەعنای ( نوێنەر )ە جا نوێنەری هەرکەس یا هەرچی بێ ، ئەوەی بە مەعنـای پۆلیس هاتوە ( ئاژان دوێ پۆلیس )ە کـە دەبێتە نوێنەری شارەوانی ، بەڵام لەبـەر درێژی هەر ئـاژان دەکوترێ و لە تەشـکیلاتی دەولـەتی ئێرانیشـدا کورتەکەی وەرگێـراوە و هەر بەم جـۆرەش هاتۆتـە ناو زمـانی کوردییەوە .
**ئاژانخانە ـ** [ ئاژان + خـانە ] ، [ فرەنسی. کو.] ، (نت.) دایـیرەی پۆلیسی شـارێك ★ پۆلیسخـانە ، شارەوانی ، شورتە ( عا. ) .
**ئاژاوڵە ـ** ( نا.) ، ( سنە.) تم : ئـاژاوە .
**ئاژاوە ـ** [ ؟ ] ، (نا.) ١ـ حاڵەتی شێواوی و پشێوی شار یاووڵاتێك کە هەر کەسە بۆ خۆی حیساب بێ و هەرچی ویستی بیکا ، بێ ئەوەی گوێ بداتە قانون . ٢ـ هـەرا و هوریا و بەگژ یەکا چونی منالان لە مالێکدا . ٣ـ بە گـژ یەکـا چـونی خەڵکـی شوێنێکی دیاری ( بازاڕ ، ماڵ ... ) . ٤ـ بەر بە شۆڕی و فیتنە و ئاشوب بە گشتی . ★ ئاژاوڵە ، ئاشـوب ، پشێونە ، پشێوی .
**ئاژاوە تێخستن ـ** ( مصت. مت.) سـازکردنی هـەرا و هوریـا و بەربەشۆڕی لە جێگایەك :: ئەم گەڕەکە چەند ئـارام و خـۆش بـو ، ئـەم سەرسەرییانە ئاژاوەیان تێخستوە .
**ئاژاوەچی ـ** [ ئاژاوە + چی ئە: فا. تورکی ] ، [کو. تو.]، ( نفا.) تم : ئاژاوەگێڕ .
**ئاژاوە خستنەوە ـ** ( مصت. مت.) تم : ئاژاوە گێـڕان .
**ئاژاوەگێڕ ـ** [ ئـاژاوە + گێـڕ ( گێڕان )] ( نفا.) ئەو کەسـەی هەرا دەنێتەوە ، ئەوەی ووڵات دەشێوێنێ ★ ئاژاوەچی ، ئاشۆبگێڕ .
**ئاژاوەگێـڕان ـ** ( مصت. مت.) سـازکردنی فیتنـە ، بەرپاکردنی ئاشـوب ★ ئاژاوەخسـتنەوە ئاژاوەنانەوە . ئاشوبگێڕان .
**ئاژاوەنانەوە ـ** ( مصت. مت.) تم :

ئاژاوەگێڕان .
**ئاژداد** ــ [ = عا : اجداد (جدّ) ]، ( نا. ) ، (سیە.) باوباپیر ، باپیران. □ « ... بابە وازمان هێنا سەریان بە گۆڕی ئاژداد و ئابایان ...» ( بلە : ژان ــ ٧٣ ) .
**ئــاژن** ــ [رڕ. فە. (ئــاژنین) ] ، ( پە.)١ــ بە دوای (ناو)ەوە دەنوسێ و صفەتی مەفعولی لێ دروستدەکا. :: دەرزیئاژن (دەرزیباژن) ، سوژنئاژن ( سوژناژن) . ٢ــ ئیسمی ئالەت ساز دەکا :: ددانئاژن ( وا دەزانم هــەر ئەم ووشەیە هەبێ) .
**ئاژنکردن** ــ (مصد. مت.) ، (مک.) دابەشکردنی ئاو لە (ماکاو)ڕا بۆ ناو دێراوی کشتو کاڵ و شێنــاوەرد . تێبــ ــ رەنگە لە ئەسڵا ئاو ئاژنکردن بوبێ و کورت کرابێتەوە .
**ئاژنین** ــ [ مصد. مت.] نەشتەر و درەوشە و سوژن یا هەر ئامرازێکی نــوك تیژ چــەند جــار دە شــتێك ڕاکردن و دەرهێنــانەوەی :: ئارام نەبێ دێم بەم ســوژنە هەمو گیانت داژنم ( دەئاژنم ) .
**ئــاژۆتن** ــ (مصد. مت.) ، (بک.) ١ــ لێخوڕینی ئەسپ و هەمو جۆرە وولاغ و گیانداری . ٢ــ لێخوڕینــی ئوتۆمبێل و تراکتــور و ئەو جــۆرە شتانە (پاش ئەوەی ئوتۆمبیل و ... لە کوردستانی عێراق پەیدابوە ، بــە کار دێت ). ٣ــ شــتێك وە پێــش خــۆدان و بۆ پێشــەوە ڕادانــی :: ڕانەکەمان ئاژۆت ، جۆتەکەی باژۆن (بئاژۆن) . ٤ــ (کن.) خێرا ڕۆیین □ « صبح حەیا ئێتفاری باژۆین » ، ( ژابــــا ــ ٨ ). **ئاژۆتنەســـەر** . هەڵکوتانەســـەر ، پەلامــــاردان ، هێرشبردنەســـەر . **ئاژۆتی** [نــە + ئاژۆتی ] ، (صت.) زەوییێکی بەکەڵکی کێڵان نەبێت . (تم : ژابا ــ ٤١٤ ). تێبــ ــ وەکو دەبێندرێ ئەم ووشەیە لە دو بەش ــ ( نە ، نا ) کە ئامرازی (نەفی)یە و(ئاژۆتی)لە قالبی (نمف.)ی مەصدەری (ئاژۆتن)دایە ــ پێکهاتوە و دەبێ مەعناکەی (نەکێڵدراو) بێ نەك ئەوەی بە کاری کێڵان نایە . ★ ڕانن ( جنـ.) ، لیخورتین ، هاژۆتن . تێبـ : « ... (ئێتژا) کە بە مانای تێکۆشان و دلنیایی و غیرەتــە لە بەنــدی ١٠ی هاتی ٤٩ و بەندی ٨ی هــاتی ٥٠ و بەندی ١ی هاتی ٥١ توشی دێین و لە بەنــدی ٥ی هــاتی ٤٩دا مــــانای بەختیاری و بە ئامانج گەیشتن یــا بەری تێکۆشان و ئەنجامی هــەوڵ و کۆششــە کە دەکا بە ئامانج گەیــین و بە ختیــاری ، (ئــاژو)ش هــەر بەو مەعنایە لە بەندی ٧ی هاتی ٥٣دا بە کار هاتوە ... » (پد : یگد ــ ١٧٧ )
**ئاژۆدان** ــ [ئاژۆ + دان]، (مصد. مت.) بردنە دەرەوەی ئاژاڵ بە شــەو بۆ لەوەڕاندن ، لەوەڕاندنی شەوانەی ئاژاڵ لە کێو :: ئەمە چەند ڕۆژێکــە ڕانەکە ئاژۆ دەدەین ★ شەوبەکێــو
**ئاژەڵ** ــ ( نا. ) ، (مک.) تم : ١ــ ئاژاڵ .
**ئاژەڵــدار** ــ [ئــاژەڵ + دار] ، (صفا.) کەسێکی ئاژەڵی هــەبێ ، خاوەنی حەیوانی ووردە ★ مەڕدار.
**ئــاژەڵداری** ــ (حمص.) کــار و پێشەی ئەو کەسەی مەڕ و ماڵات بە

خێو دەکا .
**ئاس** ــ [ لاتینی ، فرەنسی] ، (نا.) یەکێکە لە ٥٢ پەڕی قومار کە تاقە خاڵێکی لەسەرە و هەر دەستە پەڕێك چواری لەوانە تێدایە ★ ( کنێر ) تەککە ، (کعر.) بیللی (تو.). تێب ــ ئەم ووشەیە ناوی واحیدی پارە و پێوانە و کێشانەی کۆنی ڕۆمانێکان بوە و لە لاتینی وەرگیراوە کە مەعنای ( فلس ، شایی )یە ( تە : لاڕۆس ــ ٦١ ) .
**( ــ ئاسا )** ــ (پب.) دەگەڵ ناوان تەرکیب دەبێ و دەیانکاتە (صفەت) و مەعنای : بە ڕەووشتی ، بە شێوەی و بە جۆریان لێ زیاد دەکا .
□ «ئەلا ئەی نەفسی بۆم
ئاسا هەتاکەی حیرسی وێرانە»
«لەگەڵ ئەم عیشقبازانە
بــڕۆ ئـــازانە بــازانە »
( نالی : گم ــ ٥٤)
★ وەك ، وەکو ، وەکی . **ئاسایی**
١ــ ( صە.) ئیعتییادی ، عادەتی ، مەعمولی ، تەبیعی ، وەکوباوە :: پاش بۆمباران ژیانی ئاسایی لە شارەکە دەستی پێکردەوە ، شەڕ باری ئاسایی ژیان نیە . ٢ــ (ئە.) بۆ وێکچون و وێکچواندن بە کار دێت :: خۆت ئاسایی . جەندرمە ئاسایی هێشتا نەهاتبوە ژوری ماڵەوە ، پەلاماری دا مریشکێکی گرت و سەری بڕی . هس : **لاسا** .
**١ــ ئاسار** ــ ( نا.) ، (سن.) تە : بناغە . □ « ئاساری لەسەر پاداری نەماوە. » ، « ... **ئەگەر** مام غەلیفە بزانێ ئاسارمان دەبڕییە.» ( تحفە : ج ٢ ــ ١١١). **تێب** : ئەم ووشەیە دەگەڵ ( آثار )ی عەرەبی کە کەوتۆتە ناو زمانی کوردییەوە جیاوازە . ڕەنگە دەگەڵ ئاسال ، بە مانای پایە و بناغە ( تە : بورهان ، عەبباسی ــ ٤١ ) لە یەك ڕێشە بن . هس : ئاسەوار .
**٢ــ ئاسار** ــ [ = عا : آثار ] ، ( نا.) ١ــ نیشانە و شوێنەوارێکی لە شتێك مابێتەوە □ «وا ئەزانم مۆززیوی پێستی دەباغجانە بۆ » « چونکو ئاساری کەتیرە و جەوت و مازوی پێوە بۆ » (ڕەزا ــ ٣٥ ) ٢ ــ پاشماوەی سەنعات و خانو ، ئەشکەوت و نوسینی سەر تاشە بەردان،سکە و کەلوپەلی جۆربەجۆر کە لە ژیانی شارستانیتی کۆنی ئادەمیزاد بە جێماوە و لە ژێر خاك دەدۆزرێنەوە و لە عەنتیکەخانە دادەنرێن :: بەردەنوسەکەی پەیکولی ئاساری ( نەرسی ) پاتشای ساسانییە. ئەشکەوتی کەرەفتو لە سەر ڕێگای (سنە) و (سەقز)ە یەکێکە لە ئاسارەکانی کوردستان . **تێب** : ئەم ووشەیە بە شێوەی جەمع لە عەرەبیڕا هاتۆتە ناو زمانی کوردی ، بەلاَم وەکو (مفرد) دە کار دەکرێت .
**ئاسان** ــ [ پە : ئاسان ] ، (صە.) بێ‌گیروگرفت ، بێ نارەحەتی // دژوار . :: جا ئەمە چیە هەر لێی ئاسانتر نیە ، مەسەلەکەی (جەبر) ئەوەند ئاسان بۆ خێرا هەڵیان هێنا ، شۆڕش بۆ ئازادی هێندەش ئاسان نیە . ★ هاسان ، سانا .
**ئاسانبۆن** ــ ( مصت. لا.)

لەناوچوونی گرانی و دژواریی کارێك ، بە جۆرێك پێکهاتن و جێبەجێبوون و چارەکردنی زەحمەتی تێدا نەمێنێ . :: لەوەتی پەنسیلین پەیدابوە چارەی فەرەنگیش ئاسان بوە .

**ئاسانسۆر** ـ [ فرەنسی ] ئامرازێکە لە خانوبەرە بەرزەکاندا شوێنی تایبەتی بۆ دەکەن و لە نهۆمێکرا بۆ نهۆمێکی تر لە باتی پلێکان پێی سەردەکەون یا دێنەخوار .

**ئاسان کردن** ـ [مصت. مت. ] لەناوبردن و لادانی دژواریی و گیروگرفت لە سەر رێگای کارێك . :: قامۆس تەرجەمە ئاسان دەکا .

**ئاسانە** ـ (نت.)، (سن. ، هو.) تم : ئاستانە .

□ « من شەوێ نالەم
جۆش ئاوەردە بۆ »
« سەگی ئاستانەت
بێدار کەردە بۆ »
( مەولەویی : مکب ـ ٦)

**ئاسانی** ـ [ پە : ئاسانیە ] ، ( حمص. ) چلۆنایەتی کار یا قسە و باس و مەوزوعێك ، کە پیاو بتوانی بە بێ زەحمەت و خۆماندووکردن بێکا یان تێی بگا. :: بە ئاسانی وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە، ئوتۆمبێلەکەمان بە ئاسانی لە چاڵەکە هێنایەدەر . ★ هاسانی ، (بک.) ساناییی ، ساناهی .

**ئاسایشت** ـ [ پە : ئاسایشن]، (نمص.) ١ـ تم : حەسانەوە . ٢ـ هێمنی و ئارامی ، بێ قرە و بزەیی :: پاتشام بە سلامەت دنیا ئەمن و ئاسایشە . ، ئەم منداڵانە ئاسایشیان لەم ماڵە هەڵگرتوە . تێب ـ ١ـ پیتی (ت)ی دوایی ئەم وشەیە لە قسەکردنا لەبەر قورسی دەکەوێ یان بە حاڵ دەنگی دەردەکەوێ . ٢ـ مەصدەری ئەم وشەیە کە لە زمانی کوردیدا بۆتە ( حەسانەوە ) ، ئەم ( نمص.)ە و ( نمف. )ی ئاسوودە و ( حمص. )ی ئاسانی و (ص.)ی ئاسانی لەپاش بە جێماوە، لەفارسیشدا دوو مەصدەری ( ئاسایدەن ) و ( ئاسوودەن )ی هەیە.

**ئاسپایی** ـ ( ص. ) تم : ئەسپایی . **بە ئاسپایی** : (بنت.) تم : بە ئەسپایی .

**ئاست** ـ [ أ ] ، ( نا. ) ١ـ جێگا ، شوێن :: لە ئاستی خۆت دانیشە ، لە ئاستی خۆی نەبزووت ، دوێنێ هەر لەم ئاستە تووشی نەرێمان بوین . ٢ـ ( مج.) بەرامبەر ، رووبەروو ، لا ، بە نیسبەت :: لە ئاستی کاك پیرۆلی دڵت هیچ غایلە نەکا، پێژێ بە ئاستی ماڵی ئێوەدا تێپەڕین . ★ حاست ، عاست .

**ئاستانە** ـ[ ئاست + ٢ـ ئان/١ + ٥ ـ ئە/١] (نت.) ، (سن.) ١ـ پێشخانە ، کەوشکەن . ٢ـ (مج.) قاپیی گەورەماڵان ، دەرگای شێخ و مشایەخ و پیاوانی بەدین. ★ ئاسانە.

**ئاستەڕ** ـ [ پە : ئاستەر] ، (نا.)، (مك.) ١ـ پارچەیەك قوماشە، لەدیوی ناوەوە بە کەوا و چاکەت و ئەو جۆرە شتانەوە دایئەدروون. ٢ـ تویژاڵێ رەنگە کە لە پێشدا دەیدەن لەو شتانەی بیانەوێ رەنگیان بکەن ، وەك دەرك و پەنجەرە و دار و دیوار ،

باش ووشكبۆنەوەی دەســتێكی تر رەنگی خەستی لێئەدەن . ★ (سنـ.) ئاسەڕ . ئەستەڕ ، بەر .
**ئاستەم ــ** [ پە : ستەھمەك.] ، [ ئا + ســتەم ] ، (نتـ.) (مكـ.) تە : بە ئاستەم . ★ حاستەم ، عاستەم.
**بەئاستەم :** (بنتـ.) میقدارێكی كـەم مەودایێكی كورت ، مەســافەی زۆر كـەم ، تۆزیـك ، نەختێـك . :: بە ئاستەمێكی مـابۆ بـەر ئوتۆمبێـل بكەوێ، بە ئاستەم لە بەری ھەڵستا ، بە ئاستەم و دۆ بەڵا قوپاوە . ھـس : ئەستەم ، ستەم .
**ئاسك ــ** [ ستـ : ئاسۆ ] ، (نـا.)
١ــ گیاندارێكە كاوێژ دەكا ، دەست و قاچی باریك و درێژن، چاوی ڕەش و جوانە ، خێرا ڕاكردنی بە ناوبانگە ، گۆشتی ناسك و خۆشە . ٢ــ (مجـ.) خێـرا ، تیـژڕۆ ، خۆشـــبەز :: ئەسپەكەی شامار دەڵەی ئاســكە ، حەمەمێن برۆسكە ھێندە خێرایە ھەر دەڵەی ئاسكە. **تێبـ ــ** ئەم ووشەیە لە (ئاسۆ)ی ئاوێستایێ بە مەعنــای خێرا و چاپوك كەوتۆتەوە . **ئاسكۆڵ** [ ئاسك + ئۆڵ ] (نتـ.) ناوە بۆ كچان ( = ئاسكی پچۆك ) ★ (جنـ.) ئاسێ. جەیران ، خەزاڵ .
**ئاسمــان ــ** [ ستـ : ئەســمەن ، پە : ئاســمان ] ، ( نــا.) ١ــ ئــەو شێنایێیە پان و بەرێــن و بێ بــن و بناوانەی كە لە ژۆر سەرانە و مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەكانی تێدا دەخولێنەوە یــا ڕاوەســتاون . :: پچێتــە بەڕپەڕۆچكەی ئاسمــانێ دەیھێنمـە خوارێ .

☐ « وەك شێفەلەتە چۆن
نەبـم لـەت لـەت »
«ئاسمان بەرز و دەسا
زەوی ســـــەخت »
( سەلام ــ ١٧٦ )

٢ــ جێگای پیاوچاكان :: عیسا چـۆ بۆ ئاسمانان ، مەلایێكەت لە ئاسمانان ھاتنە خوار. ★ عاسمان ، ( بكـ. ) ئەزمان ، ئەزمێن ، عەسمان ، (زازا) ئاسمییە ( تە : ژابا ــ ١٠ ). **ئاسمان و ڕێسمان** ( صتـ. ) ١ــ نارێك ، نالەبار. ٢ــ قسە ، كار یا شتێ سـەروبنی پێكـەوە نە نۆسـێ . ٣ــ وەڵامێـك پێوەندێ بە پرسـیارەوە نەبێ . ٤ــ حاڵی دۆ شتی جیاواز لە یەكتـر :: ئـەم فەرمایشـتانەی ئێـوە ، وە ئاسـمان و ڕێســمان دەچــن . جوابێكـــــی دایـــــــەوە ئاسمان و ڕێسمانێش نەبۆ ، قسەی وای دەكرد ئاسـمان و ڕێسمانی چێ ؟

☐ « بە حاتەم گەر بكەی تەشبیھی
ئەم ئاغایە بێ عەقڵێ »
« كە فەرقی ئـەم لەگەڵ ئەو
ئاسمان و ڕێسمانێ بۆ »
(ڕەزا ــ ٣٣) **چۆن بە ئاسمانا :** (كنـ.)
١ــ خێرا و گـورج و گـۆڵ و بـە تۆڕەیـێ، لە حـاڵی دانیشـتنەوە ھەستانە سـەرپێ. ٢ــ زۆر تـۆڕە بۆون و ئەرز بە خۆوە نەگرتن ، لـە شوێنی خۆ جۆڵە جۆڵ و گوڕەگوڕ كردن :: ھەر گوێی لە قسەكان بۆ وەك فێتشەكە شێتە چۆ بە ئاسمانا .
**ئاسمانە ــ** [ ئاسمان + ە ــ ئە

ا/ ] ، (نت.) ، (سن.) مێچی خانوو .
**ئاسمانەی دەم** : (نت.) ، (سن.)
تە : مەلاشوو .
**ئاسمانی** ـ [ ئاسمان + ٣ـ
ئی ] ، (صت.) ڕەنگی وەك ڕەنگی
ئاسمان ، شـتێنێکی کـاڵ .
★ عاسمانی .
**ئاسن** ـ ( نا. ) مەعدەنێـکی
کەوەڕەنگە لە زۆر سەنعاتەکانی ئەم
زەمانەدا دە کار دەکرێ ، ئادەمێزاد
لە زۆر کۆنەوە (٣٠٠٠ ساڵ پێش
عیسا ، لـە ئۆر جنوبی عێـراق )
ئاسـنی ناسـیوە و دۆزێنـەوەی
کارێـکی گـەورەی کردۆتـە سەر
ژیانی کۆمەڵایەتی و شارستانێتی و
بەرەو پێشـی ڕاداوە . ئاسـن بە
خالیسی لە کانا دەست ناکەوێ و
لە شکلی چەند جۆرە ( بەرد ) دایە
کـە لـە کـوورەی زۆر گەرمـدا
ئاسـنەکەیان لێ جیائەکەنـەوە .
ئاسنی خالیس لـە ٨٠٠ دەرەجـە
گەرمایێدا سوور دەبێتەوە و نـەرم
دەبـێ ، لـە ١٥٣٠ دەرەجەشـدا
دەتوێتەوە ، کارەبا بە هاسانی بـە
ئاسندا تێدەپـەڕێ و دەیـکاتە
( میقناتیس ) ، لە هـەوای نمدارا
زۆر زوو ژەنگ هەڵدێنێ و دەڕزێ ،
جا بۆ ئەوەی ( شە ) نەیڕزێنێ ،
ماددەیێکی تـری ژەنـگ نەهـێنێ
تێهەڵدەسوون ، ئەو ڕەنگە سوورەی
بـە شێلمانانـەوە دەیبێنێـن بـۆ
ئەوەیە . ★ (بک.) هاسن ، هەسن ،
حەسـن ( تمـ : کفـ ـ ٣٤٤ )
تێبـ ـ ١ـ پۆرداوود ئاوێستایی
ئەم ووشەیەی بە (ئەیەنگە) داناوە
(یگـد : ج٢ ، لـ٨٦) و ژابـا بـە
( هەئۆسەفنە ) (تە : ژابا ـ ٤٣٩)
هەر ژابا خۆی بە تەنیشت ووشە
ئاوێستاییێکەوە پرسـەکێکی ( أ )
داناوە . دوکتـۆر معـین لە زمـان
« بار تۆلە »ڕا (ئەیەهـ) دەگێڕێتەوە
( تە : بورهان ، جا ، لـ٧٠ ) بە
لای منەوە ئەوەی پۆرداود نیزیکترە
لە ڕاستی . ئەگەرچی من وای بۆ
دەچم کە ( ئەسەنگهە ) بە مانـای
« بەرد » ئەم ووشە ئاوێستاییێیە
بێ کە ( ئاسـن ) و (سەنگ)ی لـێ
کەوتبێتەوە . پەهلەوتیەکەی بـە
ڕای زۆران هەر ( ئاسن )ە ٠ ٢ )
دەنگی ( س ) لە ووشـەی ئاسن و
لك و پۆپەکانیـدا (س)ی تـەواو
نیە بەڵکو دەنگێکە لە نێوان ( س )ی
کوردی و (ص) عەرەبی ، پێویستی
بە لێکۆڵینەوە هەیە . **ئاسنی‌سارد کوتان**ـ(کن.) کاری بێ نەتیجەکردن،
چونـکو هەتـا سـورنەکرێتەوە
چەکوچ کاری لێناکا .
**ئاسـنجاو** ـ [ أ ] ، (نتـ.) ،
قاپ و قاچاغی مس و زەرد یا هەر
مەعدەنێکی‌تر کە لـە ماڵێکا هەبێ
:: ئاسـنجاوی ئـەم مـاڵە بـاری
ئێستریێکە . ★ (هل.) هێربار .
**ئاسنگەر** ـ [ ئاسن + گەر ] ،
[ پهـ : ئاسـنکەر ] ، (نت. ، صت.)
ئەو کەسـەی ئاسـن لە کـوورەدا
سووردەکاتەوە و دەیکوتێ و ئامرازی
جۆر بە جۆری ( گاسن ، پێمەڕە ،
ناڵ ... ) لـێ دروست دەکـا .
:: وەسـتا سـمایلی فەرهـادی
ئاسنگەرێکی باش بوو ، هۆ کابرای

ئاسنگەر تا ئێره وەرە . ★ ئاهینگەر (بکە.) هاسنگەر (ژابا ـ ٤٣٩) ، هاسنکەر (کف ـ ٣٠٠) .

**ئاسنگەری ـ** ( حمص. )
١ـ پیشه و کاری ئاسنگەر ٢ـ (کن.) تەقه تەقی زۆر . :: منداڵینه ئەوه چیه دەڵەی ئاسنگەری دەکەن .

**ئاسنەواڵه ـ** [ئاسن+ ە +ئە/١ + واڵه ؟ ] ، (نت.) تەڵ و بزمار و لەت و پەتی مەکینه شکاو ، هەر شتێکی تریش کە لە مەعدەن دروست کرابێ و بێ کەڵك بۆ بێ . :: ئەم هەمو ئاسنه واڵەیه چیه لێره کۆت‌کردوتەوه . ( عا. ) قراضه .

**ئاسنین ـ** [ ئاسن + ئین ] ، (صت.) هەر شتێکی لە ئاسن دروست‌کرابێ. :: کاڵه و گۆچانی ئاسنین . ئەسپەئاسنینه .

**ئاس و پەلاس ـ** [ ئاس ( = پە : بەرد ) + پەلاس (کوێن) ] ، (کن.) ڕوت و قوت ، نەدار و بەرێشان ● «ئاس و پەلاس ئازا لەوەندەی » : سوێند بە ئاس و پەلاس (ڕوت و قوتی) هێچ ، « بە ئاس و پەلاسدا چو کوتی ئاگام لێ‌نیه » : سوێندی خوارد ( بە ڕوت و ڕەجاڵی خوی ) کە ئاگای لە فلانه کار یا شت نیه . تێب ـ مەبەست ئەوەیه هێنده ڕوت و نەداره بەرد (ئاس) سەرین و کوێن ( پەلاس ) ڕایەخ و پێخەفێتی .

**ئاسو ـ** [نا.] ١ـ ئەو شوێنەیه کە وا دێته بەر چاوان ئاسمان لەوێ بڕاوەتەوه و بە زەویەوه نوساوه و لە دوای ئەوەوه چاوی ئینسان هەتەر ناکا . :: مانگ سەری لە ئاسو هێنایه دەر . ٢ـ (مجـ.) مەیدان و بەرینایی کار و چالاکی ، لە هەمو بابەتێك . :: ئاسوی زانین و تێگەیشتنی ئادەمیزاد هەروا بەرز ئەبێتەوه ، ئاسوی سیاسی ڕوژهەڵات تاریکه . ٣ـ (مجـ.) سنوری دو چلونایەتی کومەڵایەتی . :: ئازادی و بەختەوەری نەتەوەی کورد وا لە پشت ئاسوی برایەتی کورد و عەرەب . ٤ـ ناوه بو کوڕان . تێب ـ مانای ٢و٣ تازه داتاشراون و زیاتر لە نوسینی سیاسیدا به کاردێن . ★ ئاسوگ .

**ئاسوگ ـ** [ ئاسو + گه ] ، (نت.) ، (مکـ.) تم : ئاسو .

**ئاسوده ـ** ( صمف. )
١ـ حەساوەوه . ٢ـ بێ خەم و خەفەت . ٣ـ بێ قڕه و بڕه ، بێ جموجول ، ئارام و بێدەنگ . ٤ـ بێ گیروگرفت ، دور لە ناڕەحەتی . :: چایەکی خواردەوه و جگەرەیێکی کێشا ئاسوده بو ، تا چاوی پێ نەکەوت دڵی ئاسوده نەبو ، خوزگەم بە خوی کە منداڵی نیه چا نیه ئاسودەیه ، منداڵینه ئاسوده دانیشن ، چابو مرد بو خوی ئاسوده بو . تم : ئاسابیشت .

**ئاسوده‌بون ـ** (مصت. لا.) ١ـ لە کول بونەوەی گیروگرفت . ٢ـ ماندوحەسانەوه .

**ئاسوودەکردن ـ** (مصت. متـ.) ١ـ گیرو گرفت لە کۆڵ یەکێك کردنەوە. ٢ـ بارسووك کردن و حەساندنەوەی ( ماددیی و مەعنەویی ) کەسێك . ٣ـ ( کنـ. ) کوشتن و لە ناوبردن :: بیبەن ئاسوودەی کەن (بیکوژن) .

**ئاسوودەیی ـ** [ ئاسوودە + ٢ـ ئی ] ، ( حمصـ.) ١ـ حاڵەتی بێ گیروگرفتی . ٢ـ سەر سووکی و بێ قرە و برەیی . ٣ـ ئارامی و بێ شەر و شۆری .

**ئاسەر ـ** ( نا. ) ، ( سنـ.) تە : ئاستەر .

**ئاسەوار ـ** [ ؟ ] ، ( نتـ. ) ، (مکـ.) نیشانەیێکی ماددیی کە لە کەسیی ، خێزانی ، عەشیرەتی یا نەتەوەیێك و گیاندارانی تر دەمێنێتەوە و بەڵگەی بوونیانە . :: هەیهو ! چەند لە مێژە مردوە هەر ئاسەواریشی نەماوە ، گەلێك نەتەوە لە مێژوودا ناویان هەیە بەڵام ئێستا ئاسەواریان براوەتەوە . □ «کشە، کش !، رەببی ئاسەوارت بڕێ » ( رستەیێکە بۆ دەرکردنی مریشکان بە کاردێت ) .

**ئاسیا ـ** ( نا.) یەکێکە لە پێنج ئیشکانییە گەورەکانی دنیا ، بە تەواوی لە بەشی (نیوەی باکوری) کورەی زەویدا هەڵکەوتوە ، لە هەموو ئیشکانییەکانی تر گەورە ترە و ٤٤ میلیۆن کیلۆمەتری چوار گۆشە یانە و لە هەموانیش خەڵکی زۆر تر تێدایە . (١٩٠٠ میلیۆن کەس ، لە ساڵی ١٩٦٩ ـ تە : لارۆس ـ ١٠٤٢ ) .

**ئاسیاو ـ** [ پە : ئاسیاپ ] ، [ ئاس ( لە ئەسانە : ستـ = بەرد) + ١ـئی+ئاو]، (نتـ.) تە : ئاش .

**ئاسیاوان ـ** [ ئاسیاو + وان ] ، ( صتـ. ) تە : ئاشەوان .

**ئاسێد ـ** (فرەنسی) ، (کئێر.) ، ( نا. ) تە : ئەسید .

**ئاسێدە ـ** [= عا : عصیدة ] ، ( نا.) ، ( مکـ.) خواردەمەنییەکی شیرنە لە ئارد و رۆن و دۆشاو دروست ئەکری. **تێبـ ـ** ١) ئاردەکە لە رۆنا سوورئەکەنەوە و دۆشاوی دەکەن بە سەرا ، لە سەر ئاگر دەمێنێتەوە تا باش تێکەڵاو دەبێ و پەیت دەبێتەوە . ٢) ئەم ووشەیە لە موکوریان زیاتر لە ناو مەنگوڕان باوە .

**ئاسێو ـ** ( نا.) ، ( سنـ.) ئازار بەڵا ، زیان .

**١ ـ ئاش ـ** ( نا.) ١ـ دەزگایەکە ، گەنم ، جۆ و دانەوێڵەی تری پێدەهارن و دەیکەن بە ئارد ، یا بۆ مەبەستێکی تر ووردی دەکەن. کۆنترین جۆری کە تا ئێستاش لە کوردستان هەر ماوە ، ئاشی ئاوە کە دوو بەرداشی خڕی هەیە لە سەر یەك دادەندرێن ، بەردەکەی بنەوە ناجوڵێ و ئەوی سەرەوە بە زەبری ئاوێ کە بە تەووژم بە دۆڵاشدا دێتە خوار و لە پەرەی تەمبوورە دەدا دەسوڕێتەوە . ٢ـ ئەو شوێنە یا ئەو خانوەی کە ئەم دەزگایەی تێدا دەنێنەوە . ★ ئاسیاو . ( زا.) ئاریش (تە: ژابا ـ ٥). **ئاش بەرەمبێنە:** دان زۆر هاتوە بۆ هارین . // ئاش بەتاڵ . **ئاش بەری هاتوە :**

ئەوەندی هاڕیوە قوڵکەی ئاش پڕ
بوە لە ئارد. **ئاش‌دەکڕێ** : دان کەمتر
لە پێویست لە (کەوتیژە)وە دێتە
خوار و بەرداشەکان لێك دەخشێن.
**ئاش دەمێژێ** : کونی بەرداشی
ژێرەوە کراوەتەوە و دانی پێدا
دەچێتە خوار . **ئاش فیتچقە دەکا** :
دولاش کونی تێ‌بوە و ئاو بە تەووژم
لە کونەکەڕا دەردەپەڕێ . **ئاش
کەمەرە دەکا** : دان خاوە و لە باتی
هاڕین و کردنی بە ئارد ، دەیجوێ و
**قەڵت** و بڕی دەکا . **ئاشی ئاگر** :
( نت.) مەکینەیەکە تازە داکەوتوە و
جێگای ئاشی ئاوی گرتوتەوە ،
بە ماتۆڕێکی تایبەتی یا کارەبا
ئیش دەکا و هەمو ئەو ئیشانە
ڕادەپەڕێنێ کە جاران بە ئاشی ئاو
دەکرا . **تێبـ ـ** کاتێ ئەم مەکینەیە
هاتوتە کوردستان خەڵك ناویان
لێناوە و ئەم ووشەیە پەیدابوە ★
ئاشی ئاوور ، ئاشی مەکینە .
**ئاشی ئاو** : ( نت.) جۆرە ئاشێکە لە
کوردستان باوە و بە ئاو دەگەڕێ ،
کە دەڵێن ( ئاش ) مەبەست ئەم
ئاشەیە . **ئاشی ئاوور** : ( نت.) تم :
ئاشی ئاگر . **ئاشی با** : ( نت.) جۆرە
ئاشێکە لە وولاتانی تر (زیاتر لە
ئەوروپا ) هەبوە و لە باتی ئاو بە
( با ) گەڕاوە . **ئاشی قاوە** : ( نت .)
مەکینەیەکی بچوکە ١٥ ـ ٢٠
سانتیمەتر درێژێ و پانێ و بەرزایی
دەبێ ، لە ماڵان ئاڵەت و بەهارات و
قاوەی بۆ دراو و ئەم جۆرە شتانەی
پێدەهاڕن ، بە دەست با دەدرێ .
**ئاشی کڕێوە** ـ ١ـ ( نت.) ، ( مکـ.)
ئاشی زۆر خێرا ، ئاشێکی
بەرداشەکانی خێرا بسوڕێنەوە ئارد
زۆر دروست بکا. ٢ـ (کن.) أ) خێرا
خێرا قسەکردن و نۆرەی کەس
نەدان :: ئەوە چییە دەڵەی ئاشی
کڕێوەی ، دە نۆرەی مەش بدە
با دوو قسە بکەین . ب ) زۆر بە پەلە
خواردن :: ماشەڵڵا حەسەن دەڵەی
ئاشی کڕێوەیە هێچی بۆ منداڵەکان
نەهێشتەوە . **تێبـ ـ** ئاشی کڕێوەی
ئاشێکی گەورەی ڕێك‌وپێك و بە
ناوبانگ بوە لە دێی (سەردەرابات)ی
نێزیکی ( مەهابات ) زۆر خێرا و
زۆری هاڕیوە ، لە کاتی گەڕانیا وەها
خێرا ئاردی فڕێداوە زۆری
ئاشەکەی پڕ کردوە لە تەپ و تۆزی
ئارد هەر وەك بەفر ببارێ و
(کڕێوە)ی بکا . جا ئەو ناوەیان
لێناوە و بۆتە کینایەش بۆ خێرایی .
**ئاشی مەکینە** ـ (نت.) تم : ئاشی
ئاگر .

**٢ـ ئاش** ـ ( نا.) ، ( کك.)
چێشتێکی شلە ، لە گۆشت و
سەوزەیەك ( وەکو : بامێ ، باینجان
کولەکە و ... ) دروست‌دەکرێ و
دەگەڵ قبۆڵی و پلاو دەخورێ . ★
( سیم.) شلە . (کئێر.) خۆرشت.
٢ـ (سن.) هەمو چێشتێك . ٣ ـ
( کئێر.) چێشتێکە لە برنج و سەوزە
گیایەکی کوڵاو (پنگ ، جەعفەری ،
کەرەوز ، کەوەر ... هتد.)
دروست‌دەکرێ و ماست یا
دۆکەشکی خەستی تێکەڵ ئەکەن ،
ئەگەر ویستیان گۆشت یا جەرگ و
دڵیش ئەجنن و لەگەڵی دەیکوڵێنن

، جاروباره پیاز و ڕۆنیشی بە سەرا ئەکەن . تێبـ ـ ئەم وشەیە بە مانای سێیەمی لە فارسیڕا هاتۆتە ناو کوردیێ . ★ دۆکلیو .- هس ئاز ( تم : ئازۆقە ) .

**ئاشاخە ( غە ) ـ** [= تو : لای خوارەوە ] ، ( صت. ) ، (مک.) هەمۆ شتێکی خراپ و بێکەڵك .

□ « دیسان بۆی تێنام لێفەی
ئاشاخە »
لینگی بە ملم وێنەی
دۆشاخە »
[ ؟ ]

تێبـ ـ لە مەڵبەندی سنە بە تایبەتێ بۆ مێوەی گەندە و خراپ بە کار دیت. ★ ( سن. ) داشاخە .

**ئاشانە ـ** [ ١ـ ئاش + ئانە/٣]، ( نت. ) باجێکە ، ئاغا و دەرەبەگەکان لەو ناوچە و مەڵبەندانەی ، خوردە مالیکییان تێداباوە ، لەو کەسانەی دەستێنن کە بۆ خۆیان ئاشدەنێنەوە و بە پێی زۆر و کەمێ مزەی ئاشەکە دیاریدەکرێ .

**ئاشبگیر ـ** [ ١ـ ئاش + ب ( پێبـ. ) + گیر (گرتن) ] ، ( نت. ) چۆنی چەتە و دز بۆ سەر ئاش و گرتنی ئاشەوان و بردنی گەنم و دانەوێلە و هەرچێ لە ئاشدا هەبێ ، تالانکردنی ئاش . هس : خانەبگیر .

**ئاشبەتاڵ ـ** ڕستەیێکە هەر کاتێ ئاش دانی نەما بۆ هاڕین ، ئاشەوان بە دەنگی بەرزی وەکو هاوار دەیلێ و خەڵکی ئاگادار دەکا تا هەرکەس باراشی هەبێ بیبا بۆ هاڕین . **ئاشبەتاڵکردن ـ** (مصت. مت.) ١ـ بانگەوازی ئاشەوان و ئاگادار کردنی خەڵك لە ئامادەبێ ئاش □ « ... ئاشبەتاڵی بۆ بکە گەر تاقەتی ...» ، (ڕەزا ـ ٧٥ ) ٢ـ ( کن. ) واز لە کاری هێنان و بە جێهێشتنی بە نیوە و نیوەچڵی :: هەر تاقە ڕۆژێ بە کارەکەوە خەریك بۆن و ئاشبەتاڵیان لێکرد. تێبـ ـئەم مەعنایەی تەواو پێچەوانەی ( ئاشبەتاڵ )ە کە هاواری ئاشەوانە و داوای ئێش دەکا ، کەچێ لێرەدا دەست لە ئێشهەلگرتن دەگەیێنێ .

**ئاشپەز ـ** [ ٢ـ ئاش + پەز] ، ( نفا. ) ( کئێر. )ژن یا پیاوێ کە پیشەی چێشتلێنان بێ . ★ (هەکاریێ) ئازپێش . (بک.) ئازچێ ( تم : ژابا ـ ٧ ) . ( کعر. ) ئاشچێ، چێشتکەر .

**ئاشپەزخانە ـ** ( نت. ) ، (مک.) ئەو ژورەیە کە لە مالان بۆ چێشت لێنان تەرخان دەکرێ و کەلوپەلی چێشتلێنان و قاپ و قاچاغێشی تێدادادەنرێ . ★ (سیم.) مۆبەق.

**ئاشپەزێ ـ** ( ١ـ ئاش + پەز + ٢ـ ئێ ] ، ( حمص. ) چێشتلێنان ، کارێکی ئاشپەز دەیکا .

**ئاشت ـ** (ص.) حاڵەتی نێوان دۆ یا چەند کەس ، دەستە ، بەرە و دەوڵەت کە ناخۆشێ و ناکۆکێ یا شەڕ و کوشتاریان لە نێواندا نەبێ. :: سۆسیالیزم و سەرمایەداریێ ناتوانن پێکەوە ئاشت بن . ئێستا ئەڵمانیا و فەڕانسە ئاشتن .

**ئاشتبۆنەوە ـ** (مصت. لا. )

ڕێککەوتنـەوەی دوو لا کە پێکـەوە ناکۆکییان هەبێ :: ئەم ئاشتبوونەوەیانم بە کەیفە بوو . لە خۆڕا دەنگیان لێك گۆڕی بوو لە خۆشیانەوە ئاشتبوونەوە.

**ئاشتکردنەوە ــ** ( مصد. متە.) ڕێکخستنەوە و پێکهێنـانەوەی دوو یا چەند کەس ، دەسـتە و بەرە و خێزان و دەوڵەتان ، کە نێوانیـان ناخۆش بێ ، دەنگیان پێکەوە نەبـێ یا لـە حـاڵی شـەڕدا بـن . :: ئاشتمانکردنەوە . ئاشتکردنەوەیان باشـە . هـەر چـۆنێ بـوو ئاشتیانکردینەوە . ئەمریکا هەرچی دەکا عەرەب و ئیسرائیلی پێ ئاشت ناکرێتەوە .

**ئاشتی ــ** [ ستە : ئاخشتی . ، پە : ئاشـتیه ] ، (حمصە.) ١ــ لـە بیربردنـەوە و لـە بیرچوونـەوەی ناخۆشی و ناکۆکی نێوان دوو کەس یا زیـاتر . ٢ــ نەبـوون ، نەمـان و بڕانەوەی شەڕ و شـۆر لە نێـوان دەوڵەتان ، یا لە مەڵبەند و ناوچە و جێگـایەکدا :: پـاش تێکشـکانی فاشیزم ، ئیمپڕیـالیزمی ئەمریکـا ئاشتی دنیای تێکداوە . ● «تەبەکی پڕ ئاشتی ماڵییە » ( کنە.) تێری و تەسەلی بەری شەڕ و شۆڕ دەگرێ .

**ئاشتیخواز ــ** ( نفا.) ، ( تتە.) ١ــ ئەو کەسەی حەز لە شەڕ ناکا . لایەنگیـری ئاشـتی ٢ــ ئەنـدامی ( ڕێکخراوی ئاشتی جیهانی ) کە لە پاش شەڕی دوەم دامەزراوە و دژی شەڕ خەبات دەکا .

**ئاشچی ــ** [ ٢ــ ئاش + چـی ( ئە. فا.) ] ، [کو. تو.] ، ( نفا.) ، ( کعر.) تە : ئاشپەز .

**ئاشخانە ــ** [ ٢ــ ئاش + خانە]، ( نتە.) ، (کعـر.) دوکـان یا هـەر شوێنێکی دی کە چێشتی بۆ فرۆتن لێ حازر دەکەن ★ چێشـتخانە ، ڕەستۆڕان، لۆقەنتە، مەتعەم (عا.).

**ئاشرمە ــ** ( نـا.) ، ( سـنە.) تەکەڵتوی زین ، نەرمەزین . **تێبـ ــ** مردۆخ ئەم ووشەیەی بەم جـۆرە نوسـیوە ( تە : ج ١ ، ل ــ ١٤ ) و دوکتور معینیش لە (فەرهەنگ : ج ١ ، ل ــ ٦٠ ) وەك ووشـەیێکی فارسـی هێناوێـتی و ئـاوای سـاغکردۆتەوە : [ ئـاذرەم = ئادرەمە = ئاترەمە = ئاشورمە ] و گەلێ مەعناشی لێداوەتەوە . جـا نازانم ( مردۆخ ) خۆی ئاسایی ، بۆ نێزیك کردنەوە کوردی لە فارسـی ئەم ووشەشی لە فارسیڕا هێنـاوە یاخۆ خەڵکـی لادێ لە مەڵبەنـدی ( سنە ) بە کـاری دێنـن . بە لای منەوە ئەم ووشەیە زیاتر لە تورکی دەچێت تا کوردی و فارسی .

**ئاشفتە ــ** ( نمفە.) ، ( سـنە.) ١ــ پەرێشان ، پەشۆکـاو . ٢ــ شێواو ، ئاڵۆز ، تێکەڵ و پێکەڵ . □ « بەڵێ دز بازاڕ ئاشفتەی ئەوێ» ( تایەر هاشمی ) . هس : ئاشوب .

**ئاشق ــ** [= عـا : عـاشق ] ، ( نفا.) ١ــ پیاو یا ژنێ کە حەز لـە ژن یا پیـاوێك بکا . ★ دڵـدار . □ « گەوهەرێ هەی گەوهەرێ ! ، گەوهەر مەڕۆ لە دواتم . گەوهـەر وە قوڕئان قەسەم ئاشقی باڵاتم» . ٢ــ ( مکـ. ) گـۆرانی بێـژی

ئازربایەجانێ ، کە بە خۆی و (ڕوبابە) کەیەوە بە چاخانە و دێهاتدا دەسوڕێتەوە و گۆرانێ دەڵێ . ★ شایەر .

**ئاشقەوماشقە** ـ [= عا : عاشق و معشوق ] ، ( نت.) ١ـ دوو کەس کە حەز لە یەکتر بکەن . ٢ـ ( مج.) دوو کەس کە دۆستایەتییان زۆر گەرم بێ و هەمیشە پێکەوە ببیندرێن :: ئەوە چییە ! ئەم دوانە هەر دەڵەی ئاشقە و ماشقەن . ٣ـ نێرە و مێیەی (مار) لە حاڵی لێکهاڵانا :: ئەم کونە ئاشقە و ماشقەیێکی تێدایە چەند جار دیتویانن .

**ئاشکرا** ـ [ ست : ئاڤیشیە . و : هەئیتهیە . ـ پە : ئاشکاراك. ] ، ( صە.) چلۆنایەتێ کار ، مەسەلە یا شتێك کە ئەوەندە ڕوون و بێ گرێ و گۆڵ بێ ، پیاو بە هاسانێ سەرە و دەری لێ بکا و تێی بگا . :: ئاشکرایە خوێندن باشە . وەك ڕۆژ ئاشکرا بوو ئەو کارە سەر ناگرێ . // نهێنێ . **تێبـ** ـ پۆرداوود ئەم ووشەیە دەباتەوە سەر ئەو ووشانەی لە سەرەوە نیشانمان داون ( تە : پد. یگد. ج ٢ـ ل ٨٣/١٢٠/٣٣٧ ) و ژابا (تە : ل ـ ١١) هەر (ئاڤیشیە)ی نوسیوە مۆبەد فیترۆز آزەر گوشەسب بۆ ئەم ووشەیە ووشەی ( ئەشکەرە )ی هێناوە و دەشنوسی: « لە کوردیشدا ( ئاشکار ) دەڵێن» (تە: بخشی از فرهنگ اوستا ـ ١٥).

**بە ئاشکرا** ـ ( بنت.) ١ـ بێ پێچ و پەنا . ٢ـ بێ دەرز دامان . ٣ـ بە دەنگی بەرز . ٤ـ بێ داپۆشین و پەردەبەسەردادان . :: ئەمریکا بە ئاشکرا شەڕ بە دنیا دەفرۆشێ . ● « بانگی محەممەدی بە ئاشکرا خۆشە » : کاری چاك نابێ بشاردرێتەوە . «مانگا بە دزێ کەڵ دەگرێ ، بە ئاشکرا دەزێ » : هیچ شتێك تا سەر دە پەردەدا نامێنێتەوە .

**ئاشکرابوون** ـ [ مصت. لا.] ١ـ دەرکەوتنی نهێنێ کارێك ، قسەیەك یا مەسەلەیەك . ٢ـ لاچوونی پەردە لە سەر ئێشێکی نهێنێ . ٣ـ ڕوونبوونەوەی مەسەلەیەك . :: ئیمڕۆش نەبێ سبەینێ هەر ئاشکرا دەبێ . بەم کردەوەیان ئەوانی پێشوشیان لێ ئاشکرا بوو . ئێستا زۆر چاك ئاشکرا بوە دوژمنی میللەتی کورد کێیە . **لێكئاشکرابوون** ـ [ لەیەك + ئاشکرابوون] ، (مصت. لا.) ١ـ دەرکەوتنی حەقیقەتی دوو کەس، دوو دەستە یا زیاتر بۆ یەکتر. :: هەر شەبەقی دا ، دۆست و دوژمن لێکئاشکرا دەبن . ٢ـ یەکتر ناسینەوەی دوو یا چەند کەسێ . :: پاش ئەوەی تێك خوڕێن لێکئاشکرا بون .

**ئاشکراکردن** ـ ( مصت. مت. ) ١ـ دەرخستنی نهێنێ کارێك ، قسەیەك یا مەسەلەیەك لە لایەن کەسێکەوە . ٢ـ داماڵینی پەردە لە سەر کارێکی تا ئەو کاتە کەس نەیزانیبێ . ٣ـ ڕوونکردنەوەی مەسەلەیەك :: کەس بە جێگای چاپخانەکەی نەدەزانێ خولە

ئاشكراى كرد . كەس ئاگاى لـەم كەين و بەينە نيە تۆ بۆچى ئاشكراى دەكەى . حوكمى زاتى مەسەلـەى كوردى بۆ دنيـا ئاشـكرا كـرد . **پێئاشـكراكردن ــ** ( مصـتـ. متـ. ) ئاشكراكردنى مەسەلـەيێكە ، بـە هۆى كەسێكەوە كە ئاگاى لێ هەيە . جا بە هەوڵ و تەقەلا ، يا بە هـەر شێوەيێكى تر بێ . :: بە زەبـرى تێلا ، دزێكەيـان بە خـدر ئاشـكـرا كرد . هيتلەرێكان پارتێزانەكانيـان سەرەوبن هەڵداوەسـێ ، هێشـتا نەياندەتوانـێ هيچيـان پـێ ئاشكراكەن .

**ئاشـــكرايێ ــ** ( حمصـ. ) چلۆنـايەتێ شـتێ يـا كـار و مەسەلەيێكى بـێ گرێ و گـۆڵ . سادەيێ و ڕۆنێ و بێ پێچ و پەنايێ. :: ئاشكرايێ لەمەە زياتر ! كە خۆى پێى لێدەنێ . **بە ئاشكرايێ ــ** (بنتـ.) تم : بـە ئاشـكرا ( ئاشـكرا ) . **ئاشـكرايێلێگوتن ــ** دەرخسـتنى نهێنێ مەسەلە و كارێك ، كە دۆ يا چەند كەس بێزانن ، لە لايەن يەكێك لە خۆيانەوە . :: ئاشكرايێ لێ بلێ يا بە خۆيدا بشكێنەوە . ★ ڕاستێ لێ گوتن . ئيعتيـڕاف لـە سـەر كردن .

**ئاشكێڕ ــ** [ ١ــ ئاش + كێـڕ ( كێڕان ) ] ، ( صفـا. ) ئەوەنـدە ( ئاو )ەيە كە ئاشێك دەخاتە گەڕ ، ئەويش بەندە بە گەورە و پچۆكێ و تەنكـێ و ئەسـتۆرێ بەرداشـى سەرەوە و ڕژدێ و ناڕژدێ دۆڵيانى ئاشەكەوە. :: جۆگەى تەينال حەوت ئاشكێڕ ئاوى پێدا دێ .

**ئاشنا ــ** [ ستـ : ئاخشنا . پە : ئاشـناك ] ، ( صـ. ) ١ــ ناسيـاو ، كەسێكى پياو ناسيـاوێ دەگەڵـێ هەبێ ، بەڵام نەگەيشتبێتە ڕادەى دۆستايەتێ . ٢ــ ( مكـ. ) دوكاندار يـا كاسبێكى كە پيـاو هەمێشـە كەڵوپەلى پێويستى خـۆى لـەوێ بكڕێ ، يا پێچەوانەى ئەمـە . ٣ــ ( مجـ. ) ، أ ) پێوەند ، مەيـل . :: دەگەڵ نـان و پەنێـر ئاشنـانێم . ب ) ، ( هو. ) نێزيكى و ناسيـاوێ دەگەڵ جێگا و شوێنێك .

□ « چەم وە گەرد ڕاى كێ ڕۆشنا بۆ » « لەب وە ياگەى پاى كێ ئاشنا بۆ »

( مەولـەوێ : مكـ ــ ٤٢٧ ) . ★ بێگانە، غەوارە . **ئاشنا پەيداكردن ــ** ( مصتـ . تـ . ) تم : ئاشناگرتن ١ و ٢ . **ئاشـــناگرتن ــ** (مصـتـ. متـ. ) ١ــ سەرەتاى ناسياوێو دۆستايەتێ دەگـەڵ كەسـێ داخسـتن ٢ــ دوكاندارێك ڕەچـاوكردن بـۆ شت لێكڕين يا پێ فرۆشتن . :: وا دياره تازە ئەم ئاشـنايەت گرتـوە ئاشنايـەكى باشـت گرتـوە ، لـە سەوداخۆشـى دەچێ . **ئاشـنا و ڕۆشنا ــ** [ ئاشنا + و + ڕۆشـنا ( = ڕۆ + شنـاس ) ] كۆمەڵـە ناسياوى كەسـێك ، هـەمۆ ئـەو كەسانەى كـە يـەكێك ناسـياوى دەگەڵيان هەيە. ::ئەم هەمۆ ئاشنا و ڕۆشنايەت لە كوێ بۆ ؟ خدر ئاشنا و ڕۆشناى زۆرە. **تێبـ .** ڕۆشنا هەر وەكۆ نيشاندراوە ، بـە لاى منەوە

له ( ڕۆ + شناس ) پێکهاتوه، یەعنی ئەوەی هەر بە ڕۆ دەناسرێ و دۆستایەتێکی ئــەوتۆی دەگــەڵ نەگیرابێ . ( ڕۆشنا ) بە تـەنیا بە کارنەهاتوه .

**ئاش نانــەوە** ــ [ ا ــ ئاش + نانـــەوە ] ، ( مصـت . مت . ) ١ــ دروست‌کردنی ئاش :: پیرۆت وەستایەکی باشی هێناوە ئاشی پێ دەنێتەوە . مام گدرۆن خەریکی ئاش نانەوەیە . ٢ــ ( کن . ) سازکردنی گیرەوکێشە و گرفتاریێ بۆ کەسێ :: ئەم کابرایە ئاشـێکی بـۆ ناوینەوە هەرچێ دەکەین ڕزگاریمان نایە .

**ئاشنایانە** ــ [ئاشنا + ئانە/١] ، ( صت . ، بنت . ) وەکو ناسیاو . بە شێوەی ناسیاوان . :: ئەم کارەتان لە ئاشنایانە نەدەچـوو . ئاشنایانە قسەیان دەگەڵ بکەن .

**ئاشنایەتێ** ــ [ ئاشنا + ئەتێ ] ، ( حمص . ) ١ــ پێوەندێ ناسیاوێ نێوان دوو یا چەند کەسێ. ٢ــ (مج.) ئیشـتیبالیێبـوون ، دڵتێچـوون ـ ( بۆخواردن ) ، عەلاقــە ، پێوەندێ ( دەگەڵ شتێ ) :: پیرۆت ئاشنایەتێ دەگەڵ دۆلمە خۆشــە .

**ئاش‌وماش** ــ ( نت . ) ، (سیم.) ووتەیەکە منداڵان کاتێ قسە دەگەڵ یەك دەبڕنــەوە ، دەیڵێن ، وەکـوو بیانەوێ بڵێن : هێچمان لە هێچ ، یا هەر کەسە لە ماڵی خۆی .

**ئاش وەســتا** ــ ( نت . صت . ) ئەو کەسەیە دەزانێ ئاش بنێتەوە و ئەگەر خراپیش بوو چاکی کاتەوە . :: مام ئۆمەر ئاش وەســتایەکە وەکـوو خـۆی نـابێتەوە . مـام خـدری ئاش‌وەستا .

**ئاش‌وەستایێ** ــ (حمص .)ئیشی ئاش‌وەستـا . کـاری نـــانەوەو چاکردنــەوەی ئـاش . :: ئـەرێ کاکەسەنی دێبۆکرێ ئێستاش هـەر ئاش‌وەستایێ دەکـا ؟ .

١ــ **ئاشۆ** ــ ( نا . ) ، ( سنـ . ) تە : ئاشۆب .

٢ــ **ئاشۆ** ــ ( نا . ) (سـنـ.) . هەوا و جەڕاحـەتێ کە لە کـوان و برینانـدا کۆ دەبێتــەوە ★ چڵك . زۆخ . زۆخ . کێم . هەوا .

**ئاشۆپاشۆ** ــ [ ؟ ] ، ( صت . ) ، ( سن . ) خەونی ئاڵۆز و ناخۆش :: هەر کەس شـەو فرە بخوا ، خەوی ئاشۆپاشـۆ دەبینێ . ★ ( مک . ) هاتەران پاتەران . ( سن . ) هەڵێت پلێت .

**ئاشۆب** ــ ( نا . ) ١ــ ئاژاوە و پشێوێ ٢ــ هەرا و هۆریا و حاڵەتی تێکچوونی ئاسایشت . ٣ــ کاری بە کۆ یەکا چوون و تێك بەربوونی خەڵك.

□ « ئەم تاقمــە مومتــازە کــەوا
خاسـەیی شاهن » « ئاشـۆبی
دلـێ مــەملەکەت و قـــەلبی
سوپاهن »

( نالی : گە ــ ٣٤ ) ★ ئـاژاوە . ( سن . ) ئاشۆ ، ئاشێو . پشێو نە ، پشێوە ، پشێوێ . هس : ( بک . ، ئاشێو = قــازانجی نـاڕەوا ( تە : ژابا ــ ١١ )

**ئاشــۆبگێڕ** ــ ( نفـا . ) تە : ئاژاوەگێڕ .

**ئاشۆبگێڕان** ــ (مصـت . لا.) تە :

ئاژاوەگێڕان .
**ئاشوبگێڕێ** ـ (حمص .) کارێکی پیاوی ئاشوبگێڕ دەیکا . :: پیاوی چا بە واز لەم ئاشوبگێڕییە بێنە .
**ئاشوبنانەوە** ـ ( مصت . لا. ) تە : ئاژاوەنانەوە .
**ئاشەبەتەندوورە** ـ [ نت . ] ، تە : ئاشەبەتەنوورە .
**ئاشەبەتەندووری** ـ [ نت . ] تە : ئاشەبەتەنوورە .
**ئاشەبەتەنوورە** ـ [ ١ـ ئاش + ٥ ـ ئە/١ + تەنوور + ٥ ـ ئە/١ ] ، ( نت. ) ، ( سیم. ) یارێیەکی کوردەوارێ منالآنەی فولکلۆرییە .
**تێبـ** ـ منالەکان دەبن بە دوو دەستە و مامۆستاکانیان لێك ( دادێنن ) ، هەر لایەکیان تێکەوت ( دادەبێ ) : منالەکانی ئەم دەستەیە ( هەر چەندکەسێ بن ) لە دەوری یەك ئالقە دەدەن و سەر بە سەری یەکەوە دەنێن . منداڵەکانی دەستەکەی تریش بە دەوریاندا هەڵدەخولێن و هەوڵ ئەدەن خۆ باوێنە سەر پشتیان و هەر کەس توانی (سواربێ) تا دەستەی تێکەوتوو ( هەڵدەستێتەوە ) دانابەزێ . مامۆستای دەستەی ( تێکەوتوو )ش بە دەوری هاوڕێکانی خۆیدا سووڕ ئەخوا و دەیانپارێزێ تا ئەوانیتر نەتوانن سواریان بن . ئەگەر مامۆستای دەستەی تێکەوتوو توانی دەست یا لاقی لەمنالێکی دەستەکەی تر بدا (پیسی کا) ئەوا ئەوجار ئەوان تێدەکەون و دەستەکەی تر هەڵدەستێتەوە. ★ ئاشەبەتەندوورە.

ئاشەبەتەندووری . ( سن .)
ئاشەتەنووری . ( مک. ) کەری سووری پشتدرێژ .
**ئاشەتەندوورە** ـ [ ١ـ ئاش + ٥ ـ ئە/١ +تەندوور+٥ـئە/١ ] ، (نت .) . (مک .) ئاشێکی (تەندوورە)ی هەبێ ، ئاشێکی دۆلآشەکەی لە باتێ ئەوەی لە دار و تەختە ، یان هەر جۆگەیێك بێ ، بە بەرد و قسڵ هەڵدەبەسترێ و لە دۆلآشی دیکە زۆرتر دەچێتە سەر(تەمبوو). ئەمەش بۆ ئەوەیە ئاو بە فیڕۆ نەچێ و کەمتریش پێویست بێ بۆ وەگەڕخستنی ئاش . ★ ( سیم . ) ئاشەتەنوورە .
**ئاشەتەنوورە** ـ ( نت .) ، (سیم.) تە : ئاشەتەندوورە .
**ئاشەتەنووری** ـ [ ١ـ ئاش + ٥ ـ ئە/١ + تەنوور + ٤ ـ ئێ/٢ ] ، (نت .) ، (سن .) تە : ئاشەبەتەنوورە.
**ئاشەوان** ـ [ ١ـ ئاش + ٣ ـ ئە/٢ + وان ] ( نت . ) ئەو کەسەی لە سەر ئاش دادەنیشێو چاوەدێرێ هاڕینی دان دەکا . ئەوەی ئیدارەی ئاشی بە دەستە . ★ ئاسیاوان . ( بک . ) ئاشڤان ، ئاشڤانچێ ( کف ـ ٥١ ) ، ( زا . ) ئارەوانچێ ( ژابا ـ ٦) قەڕاش (جخ : ج ٢ ، ل ـ ٢٣٢)، کەڕاش ( ژابا ـ ٣٢٨ ) .
**ئاشەوانێ** ـ [ ئاشەوان + ٢ ـ ئێ ] ، ( حمص . ) ئیشی ئاشەوان، لەسەرئاش دانیشتن و سەرپەرشتێ کردنی ئیش و کارەکانی . :: مام خدر حەوت ساڵان لە دێی (خاتوخاس) ئاشەوانێ

کرد .

**ئاشێز** ـ [ ١ـ ئاش + هێز = هار ( هاڕین ) ] ( نفا . ) ئەو کەسەیە باراش دەباتە ئاشێ بۆ هاڕین .

**ئاغا** ـ [ = مەغۆلی : گەورە ، سەروەر ] ، ( نا . ) ١ـ لەقەبێکە بە دوای ناوی خاوەن مڵك و سەرۆك عەشیرەتەکانەوە دەنـدرێ :: باپیراغای مەنگوڕ . حەمەداغای مامەش . بابەکراغای پژدەری . حەماغا ( حەمەداغا )ی کۆیە . شێخ محەمەدداغای وەلاشێ . حەمەداغای مێرگەسوڕێ . تێب ـ ا ) ئەگەر ئەم کەسە لەقەبێکی تری وەکو ( بەگ ) و ( خان )یشی هەبێ ، ( ئاغا ) کە دەخرێتە پێش ناوەکەی :: ئاغا مۆمن بەگی یەکشەوەی . ئاغاخەلیل‌خان . ئاغاحەمەدبەگ ب) لە هەندێ‌مەڵبەندی کوردستان وەکو سەقز و سنە ، بێ ئەوەش هەر لە پێش ناو دادەندرێ :: ئاغاحەسەنی بازێبلاغی . ٢ـ بـۆ ئیحتیـرام دەخرێتە پێش ناوی دەوڵەمەندەکانی ناو شاران . :: ئاغامیرزاڕەحمەتی شافیعی . ئاغا میرزا سالحی شاتری . ٣ـ (کئێر.) لە نامە بۆ نوسێن و قسە دەگەڵ یەکێکاکردن، بـۆ ڕێزلێنـان و حورمەت‌گرتن (ئیزافە) دەکرێتە سەر ناوەکەی . ئاغایی میرزا حوسێن ئاغایی زەڕگەری . تێب ـ ( أ ) لـە قسەکردنا (ئاغا) کـە کـورت دەکرێتەوە و دەبێتـە ( ئا ) تم : ( ٥ ـ ئا ) ب ) ئەم ووشەیـە لـە کوردستانی ئێران بـە ( ق ) دەنوسرێ : ئاقا ، چونکو ئـەگەر بە ( غ ) بنوسرێ لە فارسیدا مەعنای ( خواجەی خەسێنراو ) دەبەخشێ . ٣ـ بـە نیشـانەی گەورەیی و بە گەورەزانین دەخرێتە پێش ناوی ( سەید )ان :: ئاغاسەید جامی . ئاغاسەیدعەلی . ٤ـ داشێکی ( دامـە )یە ، کـە لەبەری یەکێك لە یاری‌کەرەکانەوە توانیبێتی بگاتە ڕێزی هەرە دوایی بەرەکەی تـر و هـەقی ئـەوەی دەدرێتێ کـە ئەوەنـدەی بـەری بەرەڵلا بێ بـڕوا ( چەند خـان بە جارێك ببـڕێ ) :: هـەر وا زۆ ئاغات کـرد . ئاغاکەم دێنمـەوە بەری خـۆم . ئاغاکـەت دەدەمێ بیخۆ . ★ دامە .

**ئاغابانـو** ـ (نت.) ، (مک.) قوماشێکی لۆکـەیە ، یا دێغ‌دێغی ڕەش و سپییە یـا گوڵ‌گوڵ بـە ئەندازەیێکی تایبەتی و چوارگۆشـە دروسـت دەکـرێ و پیـاوان لە سەری دەبەسـتن ، لە هێنـدێك شوێن لە بـاتی ڕەش و سـپی ، سوور و سپی باوە . ★ جامانە ، جامانی ، جمەدانە ، جمەدانی . ٢ـ هەر ئەو قوماشـەیە و تۆزێ باشترە ، بە ئەندازەی تایبەتی بڕبڕ نەکراوە و چەشنی قوماشی تر بە تۆپە ، ژنان دەیکـەن بە کـراس . ★ ئاغەبانۆ .

**ئاغاژن** ـ (نت.) ئافرەتی ، کە ژنی سەرۆك عەشیرەت یا خاوەن مڵـك یـا هـەر کەسێکی تر بـێ کە ( ئاغا )ی پێ بگوترێ :: ئاغاژن

ئایشێ ، ئاغاژن مرۆت .
**ئاغاکردن** ـ [ مصت. مت. ] ، (مک.) گەیاندنی داشێکی دامە لە بەرێکەوە بۆ ئاخر ڕێزەکانی ئەوبەر ، کردنی یەکێک لە دارەکانی دامە بە ئاغا . :: هەر ئێستا ئاغای لێدەکەم . نەمزانی کوێڕا ئاغات کرد . ★ دامەکردن .
**ئاغایانە** ـ ( ئاغا + ئانە ) ١ـ (نت) باجێکە ، دەرەبەگ و خاوەنملك لە ناوچەیەکدا کە خۆیان ملکیان تێدا نەبێ بەڵام دەستیان بە سەر مەلبەندەکەدا بڕوا ، لە جوتێرەکان و خەڵکی لادێی دەستێنن . ٢ـ (صت.) ئەوەی لە ئاغا دەوەشێتەوە ، کارێکی بۆ ئەوە بێ بۆ ئاغا بکرێ یا هەر ئاغا بیکەن . :: ئەم فێز و ئیفادەی ئاغایانە بۆ تۆ نەهاتوە . ڕاوێکی ئاغایانەمان کرد . ٣ـ (بنت.) بە شێوەی ئاغایان ، وەکو گەورەپیاوان ، وێنەی جوامێران . :: ئاغایانە وازمان لێبێنە . ئاغایانە دانیشە .
**ئاغایەتی** ـ [ ئاغا + ئەتی ] ، (حمص.) ١ـ ملکداری ، سەرۆکایەتی عەشیرەتان :: ئاغایەتی لەم زەمانەدا باوی نەماوە . مالی حەمەداغای چەند پشت ئاغایەتی مامەشانیان کردوە . ٢ـ چۆنێتی و پایەی ئاغا ، گەورەیی . :: ئاغایەتی هەر لە خۆی دەوەشێتەوە ، ئاغایەتی کارێکی هەر وا هاسان نیە . ★ ئاغایی .
**ئاغایی** ـ [ ئاغا + ئی ] تە : ئاغایەتی .
**ئاغزۆنە** ـ [ ئاغ ١ + زۆنە = زوانە ] ، (نت.) ئالقەییەکە ، لە مەعدەن ، شاخ یا ئێسك و ئەو جۆرە شتانە ، بە شکلی دایرە یا چوارگۆشە و .... دروست دەکرێ ، لە ناوەڕاستیا تێزمالکێکی لە عەینی ماددە پێدا ڕایەل کراوە . وەکو قوتری دایرە (تم : پردەلە ) ، ئەمەشیان (زمانە)یێکی تێدەخرێ . ئەم ئامرازە دەخرێتە سەری پشتێندی قایش ، هەمیان ، بەندەسەعات و فیشەکدان و گەلێ شتی لەم بابەتە و لە پشت یا هەر شوێنێکی تر توند دەکرێ . ★ ئالقەزۆنە ، ئاوزۆنە . (بک.) ئاغزۆم ، ئافزۆم ( ژابا ـ ١٢/١٥ ، کف ـ ٤٢/٥٤ ) .
**ئاغزە** ـ [ = تو + ئاغز : دەم ، زار + ٥ ـ ئە/١ ] ( سنە. ، کعر. ) پارچە کاغەزێکی بچکۆلەیە ، لە سەرێکەوە کۆل دەبڕن و لولی دەدەن دەیخەنە بنی قامێشە جگەرەوە بۆ ئەوەی کە تۆتنیان تێکرد نەڕژێتە خوار و لە وەختی کێشانی جگەرەشدا کاری دارجگەرە دەبێنێ . ★ بنك . بنکەجفارە . دەمە .
**ئاغستۆس** ـ [ = لاتینی : ئۆگوستوس ] ، (نا.) تم : ٢ـ ئاب .
**ئاغلەب / بە** ـ [ محر . عا : اغلب ] ، (مک.) ، (ص.) تە : ئەغلەب .
**ئاغە** ـ (نا.) ، (هل. ، سنە. ) تە : ئاغا . :: مالی کاکەخانی

ئاغەنە (ئاغان) .
**ئاغەبانۆ** ــ (نـ.) تم : ئاغابانۆ .
**ئاغــــەڵ** ــ (نــا.) ، (مکـ.)
١ــ ئەشکەوتی تەبیعی یا دەسکرد لە کێو ، یا چاوە خانوێك لە ناوماڵ کە بۆ داکردنی مەڕ و ماڵات تەرخان دەکـرێ . ٢ــ چـوار دیوارێـکی ســەردانەپۆشراو لـە دەشت ، بۆ داکـردنی مــەڕ و مــاڵات . لــەو شوێنانەی زۆر سارد نیە و بەفر ، یا هەر نابارێ یاخــۆ نامێنێتەوە ، هە مناهێڵێ مــاڵات بە دەشتا بڵاو ببێتــەوە و هــەم بــای ســاردی زســتانیش کەســتێرەیان نــاکا . ٣ــ جێـگایێکی تایبەتیــە ، لــەو شوێنانــەی بەردیــان کەمــە بـۆ داکردنی مەڕ و مــاڵات بە (چەپەر) دەیکەن . ★ غەڵ .
**ئافات** ــ [= عا. جمی : آفت] ، (نا.) بــەڵا ، زەرەر و زیــان ( بۆ کشتوکاڵ ) ، نەگبەتێ . نەخۆشێ ( بۆ ئاژاڵ و پاتاڵ ) :: دەغڵەکەی ماڵی مام خدرێ ئافــاتی زۆرە . هـــەرچێ حەیوانیشـــیان هەبــۆ ئەمساڵ ئافاتی گەیشتۆتێ .
□ « تاقانــە یەتیمــی خەڵـــەفی
قەتــرەیی نیســـــان »
« تۆ خۆش بی ، ســـەدەف بۆ،
بەنیدات دووربی لە ئــافات » .
( نالێ : مقبل ــ ١٠ )
تێبـ ــ ئەم ووشە عەرەبیيە ، بە شێوەی ( جەمع ) هاتۆتە نــاو زمانی کوردێ ، بــەڵام زیاتر وەك ( مفرد ) بەکاردێت .
**ئافاق** ــ [= عا. جمی : افق] ، (نا.) ١ــ تم : ئاسۆ .
□ « لە ئافاقی ژیــانی ناهومێدیتم
خەندەکەی بــابی »
« فریشـــتەی پــاکی هێوامی
نیشاندام کە بیدوێنم »
( دلدار ــ ٥٢ )
٢ــ دنیا .
□ « ئاخــر نــە ئافــاق ســـەدای
عەشق ئەو »
« بــەرز بی چون خــوڕۆش ،
کۆس کەیخوسرەو »
( خانا ــ ٣٥٤ )
**ئافتا** ــ [ئاف = ٢ــ ئاو + تا] ، (نـ.) هاوتا ، هاوچەشن ، وێنە .
□ « ئەگەر چاوی خۆم بە پایەزێنێ هەڵدێنــایە ئــەو خاتۆنــەم دێ و ئافتــای کاکەمـــەمی جوانــە . »
( تحفە : ج ١ ــ ٢٢٦ ).
**ئافتاب** ــ [ فــر. ] ، (نــا.)
١ــ خۆر ، هەتــاو ٢ــ نــاوە بــۆ ئافرەتان . تێبـ ــ ئەم ووشەیە لە زمانی کوردیدا ، بە تەنیایێ هەر بە مەعنای (٢) دەبینــدرێ ، بەڵام لە تەرکیبدا ، ئەوێش کەم ، هەیە .
★ ئافتاو .
**ئافتابگەردان** ــ [ ئافتــاب/١ + گەردان = وەرگێڕ ] ، [فر. کو.] (نـ.) ، (مکـ.) پێشــچاوکەیەکە لە چەرم یا مقەبا ــ بە شکڵی مانـگی کەمتر لە حەوت شەوە ــ دروستی دەکــەن و ئــەو سەرەوسەرەکەی بەنێکی تێــدەخەن . لــە وەختــی دروێنە یا کاری دێــکەی کشتوکاڵا جۆتیاران لە ناوچاوانیانی دادەنێن و لە پشتە سەریان گرێی دەدەن تا

تێشکی هەتاو لە دەم و چاویان نەدا .

**ئافتابپەڕ** ــ [ ئافتاب + پەڕ ( پەڕین = دوورکەوتنەوە ) ] ، [ فر. کو. ] ، (نت.) ڕۆژاوا ، تاوپەڕ .

☐ « تا وەخت غوروب وادەی ئافتابپەڕ »
« پەڕان تەر جە نەخش ، پەڕ داڵ گوڵزەڕ »
( خانا ــ ١٩٤ )

**ئافتاو** ــ [ ئاف + تاو ] ، (نت.) ، (سنە. ، سیمـ. ، مکـ. )
١ــ تم : ئافتاب /١ ☐ « سبحەینێ ئەگەر ئافتاو دەرپەڕییە ، ماڵماڵ ئەوێ ڕۆژێ دەهاتە بازاڕییە » (تحفـه : ج٢ ــ ١٦) ٢ــ تمـ : ئافتاب/٢ .

**ئافتاوپەڕ** ــ (نت.) تمـ : ئافتاب پەڕ .

☐ «چۆگە هەم خەرگەی خوسزەوی گوڵزەڕ»
« کەردشان وە پا وەخت ئافتاوپەڕ »
( خانا ــ ١٨٨ )

**ئافتاوە** ــ [ ئاف + تاو + ە ــ ئە/١ ] ، (نت.) دەفرێکە ، لە تەنەکە ، مس ، زەرد یا وەرشەو دروست دەکرێ ، بۆ دەست و چاو شوشتن و دەستنوێژ هەڵگرتن بەکاردێت . ★ مەسینە .

**ئافتاوەدار** ــ [ئافتاوە + دار ]، (نت.) خزمەتکارێکی لە دیوەخانی میران و ئاغایان و دەربارەی پاتشایان ، بۆ هەڵگرتنی ئافتاوە و ئاو بە دەستی خەڵکدا کردن ، تەرخان کرابۆ .

☐ « من کەمتەر کەنیز پەرستار تۆم »
« من ئافتاوەدار ، خزمەتکار تۆم »
( خانا ــ ٢١٩ )

**ئافتاوە و لەگەن** ــ ئافتاوە و قاپێکی دیکەیە لەعەینی مەعدەن ( لەگەن ) کە دەستی لە سەر دەشۆرێ ، بۆ ئەوەی ئاوەکە نەڕژێتە سەر ئەرز یا فەڕشان :: دەستێك ئافتاوە و لەگەنی مسواری جوانیان هەبۆ .

**ئافتۆمات** ــ (نا.) ، ( کئێر. ) جۆرێك چەکی شەڕە ، لە تفەنگ بچوکترە و لە دەمانچە گەورەتر ، بۆ هەڵگرتن سوکە و فیشەك زۆر دەخوا ، هەر جارێك مێلی ڕابکێشرێ ئیتر پێویستی بەوە نیە پاش تەقاندنی هەر فیشەکێك ــ وەکو تفەنگی تر ــ جارێکی تر مێلی ڕابکێشن و فیشەکی بەرنەبەر. هێندێکیان بۆ تەقاندن دەرەجەیان هەیە ، یەك یەك ، یان دو دو ، یان هەرچی فیشەکی تێدابێ هەموی بە جارێك دەردەکا . کلاشینکوف و ستێن ئافتۆماتن . تێب ــ ئەم وشەیە هەر عەینی وشەی ( ئۆتۆمات )ی فڕەنسییە کە لە ( ئۆتۆماتۆس )ی یۆنانی وەرگیراوە و مەعنای ئەوەیە : ( لە خۆیەوە کار دەکا ، لە خۆیەوە دەبزوێ ) . لە شەڕی دوەمدا کاتێ ( ئوردوی سور ) هاتۆتە کوردستانی ئێران ئەم وشەیەش بە شێوەی ڕوسییەکەی

هاتۆتـە نـاو زمـانی کـوردیّ ★ تەماتیـر ، تەماتیـك (کەر.) تۆمێکەن . هس : ئافتاب ، ئافتاو بە مەعنای : لە خۆیەوە دەدرەوشیّ یا لە خۆیەوە گەرم .

**ئافراندن ــ** [ ست : ١ــ فـرا ، ئوەرێس . ٢ــ فـرا ، کەرێت . پە : ئافرێتـەن ] ، (مصد. متە.) ، (بکـ.) دروستکـردن ، داهێنان ، خەلقکـردن ( تە : ژابـا ــ ١٣ ) داتاشین . تێبـ ــ دوّ ڕێشـەکەی ئاویستایی یەکەمیان بۆ ئەو شـتە چاك و بەکەڵکانەیە کە (ئاهۆرامەزدا)، خەلقیان دەکا و دوّهەمێش بۆ شتی خراپ و بیّخێر کە ( ئەهرێمەن ) دایاندێنیّ . ( تە : پد. یەسنە . جا ــ ٢٤٣ ) .

**ئافڕ ــ** (نا.) ، (زا. ، هو. ) تە : ئاخوڕ .

**ئافرەت ــ** (نا.) ١ــ جسـنی مێیینـەی ئادەمیـزاد . ژن :: ئافرەتێکی چاکە ( ژنێکی چاکە ) . ٢ــ هەنـدیّ پیاو کە نـاوی ژنی خۆیان نابەن بەم وشەیە بانـگی دەکەن :: ئافـرەت چێمان هەیە بۆ نێـوەڕۆ . ★ عافـرەت . هس : (١) ئافرودیـزیاك ( ئینگلیسـی ، فڕەنسی ) = ئەو دەرمـانانەی کە توانایی جوّتبوّن زیاد دەکەن و لە ( ئافرۆدێت )ی یوّنـانی وەرگیراوە کە بە خـوای جوانیّ و دلّـداریّ مەشـهوّرە و لای ڕوّمانیّـکان بۆتە ڤێنوّس . (٢) عەوڕەت ، عفرێت . (عا.) .

**ئافەرێدە ــ** [ پە : ئافرێتەك ] ، ( نمف.) خەلق کراو ، دروست کراو، مەخلوّق :: هەموّمان ئافەرێـدەی خودایەکێـن ، هێـچ ئافدرێـدەی خولّای بە حـالّی جوامێر نەبـیّ . تێبـ ــ ئەم ووشـەیە لە قالّبی ئیسمی مەفعـوّلدا لـە ( موکوریـان ) و ( سلەیمانیّ ) و ( سنە ) بەکاردێت ، بەلّام مەصدەرەکەی لە بیر چۆتەوە و بە هۆی فیعلی موسـاعیدی (کردن) مەصدەرێـکی تێکەلّـی لـیّ دروستکراوە ، بەلّام لە لەهجـەی باکوّرێـدا ( ئافرانـدن ) ( تە : ــ ) هەیـە .

**ئافەرێدە کردن ــ** (مصتە. متە.) لە نەبوّنەوە دروستکردنی شتێك . داهێنان . خەلقکردن . □ « بـەو خودایـــەی هەموّمـــانی ئافەرێدەکردوە . » .

**ئافەرێم ــ** ( نا.) ، (مکـ.) تە : ئافەرێن .

**ئافەرێن ــ** [ ســت : ئـافرینە، ئافریڤەنە . پە : ئـافرێن ] ، (ئم.) بەمانـای : زۆر چـاکە ، باشــە ، پەسـندە ، باشـتکرد و بۆ ئـەم مەبەستانە بەکـاردیّ : ١ــ یەکێـك کارێکی کردبیّ و بە لای یەکێك یـا چەند کەسێکی ترەوە باشی کردبیّ ، بۆ دەربڕێنی ڕازیبـوّنی خۆیـان و هاندانی و دلّخـۆشکردنی ئـەو ، پێی دەلّێن ئافەرێن . ٢ــ لە ئێران قوتابێکی ئەرکەکـانی بە چـاکیّ و ڕێكوپێکی جیّبەجیّ بکا ، مامۆستای لەسەر دەفتەرەکەی بۆی دەنوّسیّ ئافەرێن . ٣ــ بۆ دەربڕێنی ناڕازێتیّ لە کردەوە و ڕەفتاری کەسیّ یا لـە

کـارێکی کردوّیـه ، به ڕاوێـژی سەرسوڕمانەوە دەکوترێ . :: هەی ئافەرێن ! بۆ کارێ‌کردت ، هەزار ئافەرێن ! بۆ ئەم ئازایەتیبە . ٤ــ ناوە بۆ ئافرەتان ★ ئافەریم . // نەفرێن ( = نەئافەرێن ) .

**ئافەرێن لێکردن** ــ ( مصد. مت.) بە کەسـێ ووتـن ئـافەرێن . :: ئێشەکەی ئەوەندە بە ڕێ و جێ بۆ هەمۆ بە جارێك ئافەرێنیان لێکرد.

**ئاقـار** ــ [ ؟ ] ، ( نا.) ، (مک. سـ. ) دەوروبـەر ، نێزیکـان ، جێگەوشوێن :: لەوان ئاقارانە . لە ئاقاری ماڵی خۆیـان ، لە ئاقـاری ( چوارتا ) تۆشی کاروانەکە بۆین . هس : ( عا.) عقار .

**ئاقڵ** ــ [ = عا : عقل ] ، (نا.)، (مک.) ١ــ هۆش، فام ، تێگەیشتن :: ڕۆڵە ئـاقڵت‌بێ. ٢ــ [= عـا : عاقل]★ئەقل.٢ــ(ص.) ا) ووشیار، تێگەیشتو ، زانا :: ماشەڵلا کوڕی من ئاقڵە . ب ) ئارام ، بێ‌قرەوبرە، بێ‌هەست‌وخوسـت . :: منـاڵێنە ئـاقڵ دانیشـن . **بـاقڵ** ــ [ بە + ئاقڵ /١ ] ، ( کو. عـا. ) ، ( بنت.) بەوجۆرەی کە ڕێی تێدەچێ، بەشێوەیێکی ئەقل لێکی‌دەداتەوە ، وەکو خەیاڵی لێدەکرێ ، وادیارە ، وادەردەکەوێ. :: باقڵ ئیمشەوێش هەردەبارێ ، بـاقڵ ئەوسـاڵ زور گەرم دەبێ . باقڵ سبەینی وەڕێ دەکەون . **باقڵم** ــ [ باقڵ + م (ز) ]، ( کو. عا.) ، (بنت.) تم : باقڵ ( هەمۆ مەعناکـانێ ، بەڵام بەوجـۆرەی کە یەکێك خۆی تێی‌دەگاو بەیەکێکی‌تری دەڵێ) :: باقڵم (بەعەقڵی‌من) ئیمشەو هەردەبارێ .

**ئاقڵانە** ــ [ئاقڵ/٢ + ئانە/١] ، ( عا. کو.)، (بنت.) بەشێوەی یەکێکی عاقڵ ، وەکو کەسێکی تێگەیشتو . :: هەرچێ پێیی بسپێرن ئاقـڵانە ڕایدەپەڕێنێ ، ئەم‌کـارە ئاقڵانەیـە لەدەست هەموکەس نایێ ، خۆ دنیا خرانابێ جارێك ئاقڵانە بجوڵێتەوە.

**ئاقڵ بڕێن** ــ (مصد. لا.) ، (عا. کـو.) ، ( مکـ.) تێگەیشـتن و قبۆڵ‌کردنـی کارێك یامەسـەلەیێ بەوجۆرەی کە باسـی‌دەکەن ، یـا بەوچەشـنەی کـە پیـاو خـۆی تیێ‌گەیشتوە و بۆخەڵکی باس‌دەکا. :: ئاقڵ نای‌بڕێ ئەو پیاوە شـتی‌وا بکا . هەرچۆنێکی ئاقڵی بڕێ وادەکا. ئا بەم جۆرە ئاقڵ دەی‌بڕێ . ئاقڵی وای بڕیوە لۆمـەی مەکەن . هێچ ئاقڵم نەی‌دەبڕێ ئەم‌کارە وابـێ . ★ ئاقڵ گرتن . چۆنە ئەقلەوە .

**ئاقڵ بۆن** ــ ( مصد. لا.) ( عا. کو. ) ، ( مک.) ١ــ بـۆنە خـاوەن هۆش ، هۆش هاتنەوە بەر ، هەست کردن و تێگەیشتن ، پێ‌زانێن. ٢ــ تەمبێ‌گرتو بـۆن ، دەست‌کێشانەوە لە کارێك ، وازهێنان لە کردەوەیێك :: شێرکو ئێتر ئاقڵ بـوە چێـدی قومار ناکا . هەرچێ هەیبۆ بە ڕایسز دۆڕاندی ئێستا بۆمان ئاقڵ بوە .

**ئاقڵ پێشکـان** ــ ( مصد. لا.) ( عـا. کو.) ، ( مک.) سـەرەودەر کردن لە کاران ، لە مەسەلەیەك ، لـە زانسـتێك ، لێزانـین . :: جەوهەر ئاقڵی بەوشتانە ناشکێ ،

هیچ نەمدەزانی خدر ئاوا ئاقڵی بە شیعر دەشکێ ، جوامێر ئیتر گەورە بوە ئاقڵی بە چاکەر خراپە دەشکێ.

**ئـاقڵ تێکچوون** ــ ( مصد. لا.) ( عـا. کو.) ، ( مک.) ١ــ شـێوانی ئـاقڵ ، لە دەسـتچوونی هەسـتی تێگەییشتن و سەرەودەر کردن لـە کاران ، لێکنەکردنـەوەی چـاکەو خراپـە . ٢ــ ( کن.) شـێتبوون ، خەرفـان .

**ئـاقڵ کردن** ــ ( مصد. مت.) ، ( عا. کو. ) ، (مک.) ١ــ تەمبێکردنی کەسێك ( بە قسە یا هەر کـارێکی مەعنەوێ کە بێئێشێنێ ، یـا بـە لێدان‌و پێگەیاندنی زەرەری ماددێ) :: وەهای بەگژ داچوو بۆ حەوتپشتی ئاقڵ کرد . دارونەداری لێ بردەوە، بۆ بابەڵبابی ئـاقڵ کرد ٢ــ دابـین کردنی منالاّن و بێدەنـگ کردنیـان ( بە لێدان یا هەڕەشەر گوڕەشـە ) :: بێدەنگ بن دەنـا بـانگێ دەکـەم ئاقڵتان کا . ★ عاقڵ کردن .

**ئـاقڵ گرتن** ــ ( مصـد. لا.) ، ( عا. کو.) ، ( مک.) تە : ئاقڵ بڕین .

**ئاقڵێ** ــ [ئاقڵ/١ + ٢ــئێ] ، ( عـا. کو.) ، ( حمـصـ.) ، ( مک.) ١ــ تێگەییشـتویی ، زیرەکـێ ووریایێ . ٢ــ ( مجـ.) چاك ، چاکە. :: زۆر ئاقڵێ کرد کە دەنگی نەکرد، دەنا لێیان دەبوو بەشەڕ . ئەم ئێشـەی ئاقڵێ بوو . ئەم ئاقڵییەی ئەو شێت‌و شوورە کردوویـە کەس نـایکا . ★ عـاقڵێ .

**ئاقیدە** ــ [ = عا : عقیـدة ] ، ( نا.) ، ( مک.) تە : ئیعتیقاد .

**ئاقیق** ــ [= عا ـ عقیق ] ، (نا.) بەردێکە ، چەند جـۆری هەیـە ، لەوانە هیندێکیان لە ڕێزی بـەردە بەقیمەتەکان دەژمێردرێن و زیـاتر دەکرێتـە نەقیمـی ئەنگوسـتیلە و ملوانکە. . .بۆ خۆڕازاندنەوەی ژنان، جـاران مۆریشـیان لێ دروسـت دەکرد . بەردێکی ئاودار و جوانە ، گەلێ ڕەنگـی هەیـە ، لە هەمـوان پەسندتری ( سووری ئاتەشی )یە و جۆرێکی تریشـی ( دڕۆبا )یە . لـە باری کیمیاییەوە ئەم بەردە بەردیکی ( سێلیسـی )یـە و چەنـد زەڕە ( مۆلیکول ) ئاوی تێدایە کە ژمارەیان لە ١٨ تێنـاپەڕێ و لە جۆرەکـانی ئاقیق دا کەم و زۆر دەبێ ، ئەگـەر بێهاڕنەوە و بەسەر ئاگری وەرکـەن وەکو خوێ قرچەقرچ دەکا ، ئەوە ئاوەکەیەتی کە دەبێتە هـەلم . لـە بەردی تر سووکترە و جاروبارە هێندە سووك دەبێ کە سەرئاو دەکـەوێ ، لە کوردستان هەندی نەوعی هەیە .
★ یاقیق . **ئاقیقی ڕەش (سەوز)** ــ (نت.)بەردێکی سەوزی مەیلەو ڕەشە، وەك ووردەشووشەی بوتڵی شکـاو دەچێ ، لەتیرەی ئەو بەردانەیە کە لە ئەنجامی ئاگرپژێنی هـەندێ کێو پەیدابوون ، زور سـەخت و ڕەقـە وەك تێفێتش دەبـڕێ ، ئادەمیزادی دەوری‌بەرد چەك و هەندی شتی‌ترێ ( سەرنێزە ، کێرد ، سـەرەرمب و دەمەداس . . .) لەم بەردە کـە لـە گەلێ شوێنی کوردسـتـان دەسـت دەکەوێ ، دروستکردوە .

**( ــ ئـاك )** ــ ( پد.) بـەدوای

ڕێشەی فیعلەوە دەنوسێ و دەیکا بە ناوێ کە مەعنای ( بەکارهـاتن ، بـە کەلكهـاتن ) دەدا :: پۆشـاك ( شتێکی بە کەلکی پۆشـتین بێ ) ، خۆراك ( هەرچی بەکەلکی خواردن بێ ) .

**ئاکابر** ــ [= عا : اکابر ( اکبر ) = گەورەکـان] ، ١ــ (صـ.) ( مکـ.) پیاوی بەساڵا چو ★ ئیختیبار ٢ــ (نا.) پیاوی گـەورە و بـەڕێز لـە کۆمەڵدا ★ ئەشراف ، ئەعیان .

**ئاکابرانە** ــ [ئاکابر + ئانە/١] ، [عا. کو.] ، (بنـ.) ١ــ ئەوەی لـە پیاوی ئاکابر دەوەشێتەوە ، کـاریکی پیاوی ئاکابر بیکا. :: ئەم کوڕە بەم منالێ خۆیـەوە کارێـکی هێنـدە ئاکابرانەی کردوە ، پیـاو سـەری سوڕ دەمێنێ . ٢ــ بەشێوەی پیاوی ئاکابر ، وەکو ئاکابران . :: کـوڕم تـۆزێ ئاکـابرانە دانیشـە ئـەم جوڵەجوڵەت لە چیە ؟ .

**ئاکـادێمێ** ــ [ = فرەنسـی : ئاکادێمی . لە یۆنانێ وەرگیراوە ] ، ( نا.) ١ــ شوێنێکی تایبەتیبە کـە لەوێدا بەکردەوە فێری زانست یا فەننێك دەبن . :: ئاکادێمی جەنگ ، ئاکادێمی شۆڕش . ٢ ــ ئەنجمەنێکە لەوێدا : ئەدیب و زانا و هونەرمەند کۆدەبنـەوە و بـۆ پێشخسـتن و پەرەپێدان و ڕێکخستنی بەشـێکی دیارێ لە بەشەکانی زانست ڕاوێژ دەکەن و بڕیارڕ دەدەن . :: ئاکادێمی فەرەنسا : بۆ نوسێن و ڕێکخستنی قامۆس لە ٤٠ ئەنـدام پێکهـاتوە ، ساڵی ١٦٣٥ لەلایەن ( ڕێشێلیۆ ) دامـەزراوە . ئاکـادێمی زانسـت ( علوم ) : بۆ لێکۆڵینەوەی مەسایلی ریازێ و فیزیا و کیمیا ، ... هتد ، سـالی ١٦٦٦ ( کولبێـرت ) لە ٦٦ ئەندام و دوێ سکرتێری هەمێشەیـی پێکیهێناوە ( تە : لاڕۆس ــ ٩٩٤ ) .

ئاکادێمی علومی سۆڤێتی : بەرزترین شوێنی زانستییە لە یەکێتی سۆڤێت (تە : کورتەی قاموسی سیاسی ــ٧) .

**تێبــ** ــ أ ) ئەم ووشـەیە لە ناوی دانیشگـایەك وەرگێـراوە کـە (ئیفلاتون) لە باغی ( ئاکادێمۆس )ی نیزێك شاری ( ئـاتێن ) پـاتەختی یۆنان دەرسی فەلسـەفەی تێـدا دەکوتەوە و بەناوی باغەکەی کردبێ . ب ) بەرامبەر بە مەعنـای دوەمی ئاکادێمی، (مەجمەعی عیلمێ کوردێ) لەبـەغدا ، ووشـەی ( کـۆڕ ) ی دانـاوە و نـاوی خۆشـی نـاوە : ( کۆڕی زانیـاری کورد ) .

**ئاکار** ــ ( نمصـ.) ، ( مکـ.) ١ــ خـو ، ڕەووشـت ٢ــ کـردەوە :: ئاکاری باش نیە ، لە ئاکـاری ڕازی بون .

**ئاکام** ــ ( نـا.) ١ ــ دوایـی و ئەنجامی هەرشتێ ٢ــ وادەی مردنی کەسێ □ « زیندە بە ئاکامە » .

**ئاگا** ــ [ پە : ئاکاس .] ، ( نا.) ١ــ خەبەر، هەست□«ئاگا و خەبەرم لە مردنی خۆم هەبـێ ، لەو کـارە نەبێ . » ● « ئاگای لە مەحموێدی بێ زەواد نیە » ( کنـ.) أ ) بـۆ گێلـێ و تێنەگەیشتوێی کەسێ . ب ) بۆ بێ خەبەرێ کەسێ لەکارێ.٢ــ(صفا.)، (سنـ.) تە : ئاگادار/١ ★ (بکـ.) ئاگاە

( تە : کف ــ ٣٩) ، های (کف ــ ١٠٣).
**بەئاگــا هــاتن ــ** ( مصتـ. لا.) تە : ئاگابۆنەوە . **وەئاگا هاتن ــ** ( مصتـ. لا.) تە : ئاگابۆنەوە .
**ئاگــابۆنەوە ــ** ( مصـتـ. لا.) وەخەبەر هاتن لەخەو یا لە مەستی، وەهۆش هاتنەوە لە بێهۆشیێ ، کە بەسەر یەکێکا هــاتبێ جـا لەبـەر هەرچێکێ بێت :: خەوێ زۆر سۆکە لە خشپەی پێ ئاگــای دەبێتەوە . پیاوی سەرخۆش بۆ ئاو خواردنەوە ئاگای دەبێتەوە . ئـەوە نێوەڕۆیــە دلێر هێشتا ئاگای نەبۆتەوە . کــە عەمەلیاتیان کرد شــەو و ڕۆژێکــی پێچۆ یاللاّ ئاگایبۆوە . ★ ئاگاهێ ( هو.) ، بەئاگا هاتن ، وەئاگا هاتن.
**ئاگادار ــ** ١ــ ( صفا.) حـالی کەسێکی بە شتێك یا کارێك بزانێ ، خەبــەرداری بــێ :: هــەر خــۆی ئاگاداری ئەم ئێشـە بۆ . هەر ئاگادار نەبۆن لەدەرەوە چباسە . ★ (سنـ.) ئاگا/٢ ٢ــ (نفا.) کەسێکی یەکێك یا شتێك دەپارێزێ :: خوا ئاگاداری بێ ئاگاداری مندالەکان بە .
**ئاگادار بــۆن ــ** ( مصتـ. لا. ) بــە باسوخــواس ، کارێــك یــا مەسەلەیێك زانێن ، خەبەردار بۆن . ★ ئاگالێهەبۆن .
**ئاگــادار کردن ــ** ( مصتـ. متـ.) خەبەردار کردنی کەسێك لەکارێك ، لە باسـێك یـا لە مەســەلەیێك ، ڕاگەیاندنی خەبەرێ(لەبابەت هەرچێ بێ ) بەکەسێ . :: ئاگاداری کاووس بکەن ئاگای لەخۆی بێ . پێش ئەوەی منبچم خەسرەو ئاگاداری کردبۆ .

**ئاگــاداریێ ــ** ( حمـصـ.) ١ــ زانێن ، خەبەرداریێ :: بە ئاگاداریێ دۆکەسان پارەکەی بدەنێ . ٢ــ تە : ئاگاداریێ کردن .
**ئاگاداریێ کردن ــ** ( مصتـ. متـ.) تە : ئاگــا لێبــۆن . :: ئاگــاداریێ منالەکانیبکەن با پەرتەوازە نەبن . ★ ئاگاداری/٢ .
**ئاگا کردن ــ** (مصتـ. لا.) هەست پێکردن،پێ زانێن:: دەیگوت هەرچێ دەمــار لــە لەشێدایــە هەمـــۆی ئاگادەکا . لەشێ هێنــدە سڕ بــوە ئاگری پێوەنێی ئاگا ناکا .
**ئاگا لێبــۆن ــ** ( مصتـ. متـ. ) چـــاوەدێری کـــردن ، بـــالێ بەسەرکێشان و پاراســتنی کەسێ یا کەسانی و شــتێ :: ئاگــات لــە مندالەکان بێ مەیــەلە ( مەهێلــە ) بێحەیایێ بکەن . ئاگات لە باخچەکە بێ مرێشك نەچنە ناوێ . ئاگایەکتان لە دوکــانەکەم بێ تادەچــم نوێــژ دەکەم. ئاگایەکت لێمان بێ .
**ئاگا لێهەبۆن ــ** ( مصتـ. لا. ) تە : ئاگادار بۆن . :: ئاگات لێیــە ( لێ هەیە ) چۆن ئاوڕێشــی یــەك بۆن . خوا لەوسەرە ئاگای لێیە من دەستم لەم ئێشــەدا نیــە .
**ئاگاهێ ــ** ( حمصـ.) ، ( هو.) ١ــ تە : ئاگا بۆنەوە □ « دلە وادەی صوبح نەو وەهارانەن » « وەخــت ئاگاهێ دەردەدارانەن » ( مەولەوێ : مکبـ ــ ٢٤٧ ) . ٢ــ تە : ئاگادار /١ □ « هەوای کۆتایێ نــالەی وێــت بیەن » « وە تێرێ هەنی ئاگاهێــت نیەن » ( مەولــەوی : مکبـ ــ ٤٦٣ )

**ئاگایی** ـ ( حمصـ.)، ( سنـ.) ١ـ تم : ئاگا . ٢ـ لێزانین ، سەلیقـە پێشکان . سەرڕشتە .

**ئاگر** ـ ( نا.) ١ـ ڕووناکی و گڕ و گەرمایەکی لە سووتانی سووتەمەنی ( دار ، خەڵوز ، نەوت ، گاز و..) بەدەست دێت و بۆ ڕزگار بوون لە سەرما و بۆ چێشتلێنان و مەبەستی جۆربەجۆری ژیان ، کەڵکی لێ وەردەگیرێ . ٢ـ ( مجـ.) ، أ ) گەرما ، گەرمای نەخۆشی :: هەموو گیانی دەڵەی ئاگرە دایبسێ ، کە نێوەڕۆ داهات دنیا دەبێتە ئاگر . ب ) ڕق و توڕەیی ، توڕە بوون :: جاری قسەی دەگەڵ ناکری ئاگری لێ دەبارێ . ج ) شەر و جەنگ ، فیتنە و شەڕ و شوڕ :: هیتلەر ئاگرێکی کردەوە دنیای سووتاند و خۆشی سووتا . د ) چەك و تەقەمەنی :: هەموو گیانی خۆی کردۆتە ئاگر . ★ ئاتەش ، ئاوور ، ئاهێر . **ئاگری بن کا** ـ ( نتـ.) ، ( کنـ.) کەسیکی لە سەرەوە خۆی پیاو چاك نیشان بدا و لە ژێرەوەش نێوانی خەڵك تێك بدا یا خراپە بکا . کەسێکی شەڕ و هەرا سازکا و ئاژاوە بنێتەوە :: لاچوو لەبەرچاومان مەمێنە هەی ئاگری بن کا . چوون ئەم کابرایە لەم خەڵکە بۆتە ئاگری بن کا . ★ ئاگری ژێرکا . ئاوری بن کا . **ئاگری بێ ئامان** ـ ( نتـ.) ، ( کنـ.) بەڵا و چەرمەسەرێکی چارەکردنی گران بێ یا هەر نەکرێ . ◻ « ڕەببی ئاگری بێ ئامانیان تێ بەربی » . **ئاگری ژێرکا** ـ ( نتـ.) ، ( کنـ.) تم : ئاگری بن کا . **ئاگری قودرەت** ـ ( نتـ.) ، (کنـ.) ١ـ قەزا و قەدەر ، بەڵای لابەلا :: ئاگری قودرەتێیان تێبەربێ . ٢ـ ئادەمیزادی بزۆز و نەسرەوت بەتایبەتی منداڵ :: ئەوە بۆ دانامەزرێی ، هەی ئاگری قودرەتێ . ٣ـ پیاوی کار لەدەستهاتوو ، ئازا و شەڕکەر . :: دەڵەی ئاگری قودرەتییە هیچی لەبەر دەستی عاسی نابێ ، وەك ئاگری قودرەتی وایە ، غەنیمی پەنجا سوارانە . ★ ئاوری قودرەت .

**ئاگرباران** ـ ( نتـ.) ، ( کنـ.) ١ـ گەرمای بێ ئەندازە . ٢ـ داباراندنی گوللە لە شەڕدا ، دەستڕێژکردنی چەندکەس وێکڕا .

**ئاگرباران کردن** ـ ( مصتـ. متـ.) بۆمبا ، گوللەی توپ و تفەنگ و هەرچی لەم بابەتە بێ بە سەر جێگایەك یا کەسێکدا بەردانەوە .

**ئاگربارانە** ـ [ ئاگرباران + ە ـ ئە/١ ] ، ( نتـ.) هەوایەکی گورانی کوردییە . ◻ « ئەی خودا لەم ئاگربارانە ، ئەی خودا لەو ڕێزە خاڵانە ، یار بەبێ تۆ ماڵم وێرانە. » ( فۆلکلۆر ) .

**ئاگربازی** ـ ( حمصـ.) ، (سیمـ.) تم : ئاتەشبازی .

**ئاگربردن** ـ ( مصتـ. لا.) بەهاسانی ، داگیرسان و زوو ئاگرگرتنی شتێك یا ماددەیێك . :: ئەم گوێنێیە تەڕە ئاگر نابا . پووشوکەی کوێخاحەسەن ئاگری چاك دەبرد . باڕووت خێرا ئاگر دەبا.

**ئـاگربڕ ــ** ( نتـ. ) ١ــ كـاری كوژاندنـەوە و بەرگرتـن لـە تەشەنەكردنی ئاگرێ كە بەر دەبێتە خەرمان و ڕەز و ئەو جۆرەشتانە .

**تێبـ ــ** لە كوردسـتان بـاوە كـە ئاگركەوتـەوە ، خـەڵكی ئـاوایی كۆدەبنەوە و لـك‌وپۆپی داری تـەڕ دەبڕن و لە چواردەورەی ئاگرەكەوە بەردەبنـە شـۆڵێدانـی و ئـەو شوێنانەی ئاگریان تێبەربوە لەوانەی هێشتا نەیانگـەیوەتێ دادەبـڕن ، بەم جۆرە پێش بە تەشەنەكردنـی دەگرن و نایەڵن دەوروبەری خـۆی بسوتێنێ ، لـەو جێگایـانەش كـە داروباری نەبێ ، بە دەوری ئاگرەكەدا وەكو جۆگە ئەرز هەڵدەقەنن . ٢ــ ( تـ. ) ڕاگرتنی شەڕ لە نێوان دو هێز كە پێكەوە بـە شـەڕ دێـن . ٣ــ بەرگرتنـی تەشـەنەی هـەرا و دەمەقالێ نێوان دو یا چەند كەس .

**ئاگربڕكردن ــ** ( مصـ. متـ. ) ، كوژاندنەوەی ئاگرێكی دەكەوێتەوە بەو شێوەیەی لە (ئاگربڕ)دا باس‌كرا.

**ئاگربەربونەوە ــ** (مصـ. لا.) ، ( سیمـ. ) پەیدابـونی سـوتمان لـە شوێنێك ، ئاگر دەجێكا یەك بەربون :: لـە لای خەرمانەكـانئاگرێ بەربوتەوە هەرچـی دەكەن بۆیـان ناكوژێتەوە .

**ئاگربەردانەوە ــ** (مصـ . متـ .)، ( سیمـ . ) ئاگرتێبەردان ، سوتمان پەیداكردن لە شوێنێ . :: چەتەكان ئاگرێكیـان بەردایـەوە خێـرا كوژاندیانەوە .

**ئاگرپارە ــ** [ ئاگر + پـار ( = پارچە ، لەت ) + ە ــ ئـە/١ ] ، (صـ.) ١ــ بزۆز ، دڕ ، شەڕانی ، هاروهاج ( منـداڵ ) ٢ــ زیرەك ، بەكار ، لێهاتو ( گەورە یا پچوك ) ★ ئاتەشپارە .

**ئاگرپەرست ــ** ( نفا . ، صفا .) تە : ئاتەش‌پەرست .

**ئاگرپـەرسـتی ــ** ( حمصـ . ) ١ــ پەرستن ، عیبادەت‌كردنی ئاگر و بـە خـودا زانینـی . ٢ــ دینـی زەردوشتی ★ ئاتەش‌پەرستی .

**ئاگرپێوەنان ــ** (مصـ. متـ.) تە : ئاگر تێبەردان/١ .

**ئاگرتێبەربون ــ** (مصـ. لا.) ١ــ ئاگر گرتن و سوتانی شـتێك بێئەوەی یەكێك بە دەست یا لـە ئانقەست بیسـوتێنێ . :: ئوتۆمبیلەكەی ئاگری تێبەربو ، كوڕە هێندە لـە سۆبەكە نێزیك مەكەوە با ئاگرت تێبەرنەبێ .

★ ئاگرگرتن/١ . ٢ــ ( كنـ.) ، ١ ) سوتان و فەوتان ، لەناوچون :: كوڕە دانیشـە هەی ئاگرت تێبەربێ ، یاخوا ئاگر دە عومر و ماڵیان بەر بێ . ب) ناڕەحەت‌بون ، لەبەر زگ پێسوتان و بەزەیی‌هاتنەوە بە حاڵی یەكێكدا . :: پیاو هەر نەیبێنێ چاكە ، ئاگری تێبەردەبێ ، ئاگرم بۆی تێبەربو ج) تە : ئاگرگرتن/٢ .

**ئاگر تێبەردان ــ** (مصـ. متـ.) ١ــ ئاگر بە سوتەمەنی،یا هەرشتێكی ترەوە نان، بەمەبەستی ئاگركردنەوە، یا زیان‌پێگەیاندن :: زۆر سەرمایە ، خێرا سۆبەكە ئاگرتێبەردە . هەندێ پوش‌وپەڵاشمان ئاگرتێبەرداو خۆمان

پێ ووشــك كردەوە . ٢ـ ( كن . ) زڕهەڵساندن و تووڕەكردنی یەكێك بەقســە یـا بـەكردەوە :: ئــەوە چت‌پێ‌گوتوە وا ئاگرت‌تێ‌بـەرداوە . ئەم قسەیە چبـۆ كردت ئاگرت دەم ( دەئەم ) كابرایە بەردا . ٣ـ (كن . ) أ) زیانی ماددیێ و ئازاری مەعنەویێ بەكەســێ یاشــوێنێك گەیـاندن :: لەشكری ئــەمەریكا هــەمۆ وێتنامی ئاگر تێ‌بەردا و سوتاندنی. ئەوەندەمان پێ خەرج‌كرد ئـاگرمان تێ‌بــەردا . ب) ئێجـادی حــاڵەتی بــەزەیی پێداهاتن و زگ‌پێ‌سوتان لە دڵــی كەسێكدا :: هێنـدە دەكرۆزێتەوە ئاگر دەپیاو بـەردەدا . ● « ڕەببی ئاگر دە گیانی بەربێ» تۆك و نزایە و كینایەی داوای مردن و لەناوچونی كەسیكە . ★ ئـاگرپێوەنان ، ئاوور تێ بەردان .

**ئاگر تێ‌چوون** ـ ( مصد . لا . ) ١ـ تم : ئاگرگرتن/٢، ئاگرتێ‌كەوتن. ٢ـ ( كن . ) بەغیلی بردنی كەسێك بە كەسێكی‌تر :: هــەر باســی پیاوەتی حەسەنمان كرد ، ئەو ئاگری‌تێ‌چوو . یەكێك بەكۆك و پۆشــتەیێ ببینــێ ئاگری تێدەچێ . نەمانزانی بۆچی وا ئاگری تێ‌چوبوو .

**ئاگر تێ‌كەوتـن** ـ (مصد. لا.) تم : ئاگرتێ‌بەربوون /١ .

**ئاگر چوونە گیان** ـ (مصد . لا.)، ( كن . ) ١ـ تم : ئاگرتێ‌بـەربوون/٢ ٢ـ تم : ئاگرگرتن/٢ .

**ئاگرخانە** ـ ( نت . ) ، ( سیم . ) ١ـ كورەی ئاسنگەران كـە ئاسنی تێدا ســور دەكەنــەوە . ٢ـ تم : ئاتەشخان . ٣ـ تم : ئاتەشخانە ★ ئاوورخانە ، تونخانە ، تونگخانە .

**ئاگرخۆرە** ـ [ ئــاگر + خــۆر ( خواردن ) + ە ـ ئە/١ ] ، (نت.) ، ( سن . ) تم : قەقنەس . ( تم : مخ : ج ١ ـ ١٧ ) .

**ئاگرخۆش‌كردن** ـ (مصد. مت.) ١ـ دەست تێدان‌و تێك‌وەردانی ئاگر ( كۆكردنــەوە و خستنەســەریەكی سوتەمەنی ناو سۆبە و ئاگردان ) تا بـاشتر بســوتێ. ٢ـ تێك‌وەردانی ئاگری خەڵوز و تەپاڵە و ... تـا خۆڵەمێشەكەی لەسەرلاچێ و تێنی زۆرتربێ . ٣ـ (كن .) قسە هێنان و بردن لەنێوان دوكەسا كـە نێوانیان ناخۆش‌بی ، ناخۆشتركردنی نێوانی دوكەس ، فیتنەیێ كردن .

**ئاگر خۆشكەر** ـ [ئاگر + خۆش + كــەر ( كردن ) ] ، ( صفا . ) ، ( مك . ) كەسێكی فیتنــەیێ دەكا ، یەكێكی دەبێتە هۆی نێوان‌ناخۆشیێ و بەشــــەڕهــــاتنی خــــەڵك :: ئاگرخۆشكەری وا هــەر نابێتەوە ، ئەوەندەی مســت لــە چاوان دەی شـارێكی بەشـەڕ دەدا . پیـاوی ئاگرخۆشكەر هەمێشــە ڕۆزەردە .

**ئاگر خۆشكەرە** ـ (نفا.) ، (مك.) ئــەوەی ( كەســێ ، شــتێ ، یا كردەوەیێــك ) كـە ببێتــە مایــەی بەرپابونی شەڕوشور و فیتنە لەناو خەڵكـا ، یـا لــە شــوێنێك :: ئاگرخۆشكەرەی ئەم دێیــە ، ئــەم هەتیــوەیە ، ئاگرخــۆشــكەرەی ناومیللەتان ئیمپریالیزمە .

**١ـ ئاگردان** ـ [ ئــاگر + دان

( ئم . ) ] ، ( نت . ) ١ـ قوڵکەیەکە ، لە تەختی ژۆری ناوماڵان هەڵی دەکەنن ، تەنیشتەکانی لێكولوس دەکەن ( سواغی ئەدەن ، یا لەتکەسوێنە و سوالەتی تێدەگرن ) و ئاگری تێدا دەکەنەوە ، یا لە لاوە بۆیدێنن . جۆرێکی‌تریشی لەباتی هەڵقەندن ، کەرۆکەیەك بە بەرد یا خشت هەڵدەبەستن ( ئەمەیان زیاتر لەمزگەوتان و دیوەخانی ئاغایان ) بۆ گەرم‌کردنی ژوور★ ئاوورگ، کوانو، گۆڕك ، گۆڕکە . ٢ـ تم : ئازەر .

**٢ـ ئاگردان** ـ [ ئاگر + دان ( فیعـ.) ، ] ( مصت . متـ. ) ١ـ تەقاندنی چەك (دەمانچە، تفەنگ، تۆپ ، . . . ) :: کە ئێوارە داهات دەستیان دەکرد بە ئاگردانی ئەو تۆپە زلانە و نەیاندەهێشت خەڵك ئاسوودەبن . ٢ـ بەقسە و فێشاڵ یەکێك لەمەیدان دەرکردن :: کابرایان هەر بەجارێ ئاگردا و قسەی پێ‌نەکرا .

**ئاگرکردن** ـ ( مصت . مت . ) لەشوێنێکی تایبەتی ئاگرکردنەوە و ناوبەناو سووتەمەنی هاوێشتنە سەری بۆ گەرم‌کردن یا هەر مەبەستێکی‌تر . :: تۆنچی تۆنخانەی حەمام ئاگردەکا . دیزە و گۆزە دەخەنە کلەوە و چەند شەو و ڕۆژ هەر ئاگرێ‌دەکەن تا سووردەبنەوە .

**ئاگرکردنەوە** ـ ( مصت . مت . ) ١ـ هەڵکردنی ئاگر بۆهەر مەبەستێك بێ :: خێرا ئاگرێکمان کردەوە و خۆمان ئیشك‌کردەوە . دەی کچی چاك زوو ئاگرێ بکەوە و هێلکە و ڕونێکمان بۆ بکە . ئەمە لای خۆتان ئاگرتان کردۆتەوە ، دۆکەڵ کوێری کردین . ٢ـ ( کن . ) أ) بەرپا کردنی فیتنە و شەڕ و شۆڕ :: هیتلەر ئاگرێکی کردەوە دنیای سووتاند . ب) هار و هاجی‌کردنی منداڵان و دابێن نەبونیان :: منداڵ ! ئەو ئاگرە چییە کردۆتانەوە ، ڕۆکەون بۆخۆتان . ★ ئاگرنانەوە .

**ئاگر کەوتنە گیان** ـ ( مصت . لا . ) ١ـ ئاگر دە لەشی کەسێك بەربون. ٢ـ (کن .) أ) ئاگرگرتن/٢ . ب) کەوتنە تالوکە و جێکە بەخۆ نەگرتن . ئارام لێ هەڵگیران .

**ئاگر کەوتنەوە** ـ ( مصت . لا . ) تم : ئاگر بەربونەوە .

**ئاگرگرتن** ـ ( مصت . لا. ) ١ـ ئاگر تێ بەر بون/١ . ٢ـ (کن .) تۆڕەبون و هەڵچون ، ڕق‌هەڵسان و سووربونەوە :: هەرکوتت ئەم ئێشە وانابێ ئاگر دەگرێ . ★ ئاگرتێ بەربون/٢ ج .

**ئاگر گەشاندنەوە** ـ (مصت. مت.) ١ـ باوەشێن کردنی مقەڵێ یا ئاگردانێ ـ کە خەڵوزی تێکرابێ و چەند پۆڵوی خرابێتە سەر ـ تا سکڵەکان هەمو ڕەژییەکە بگرنەوە و بیکەنە یەکپارچە ئاگر . ٢ـ هەڵسووڕاندنی ئاتەشکەردان هەر بۆ ئەم مەبەستە . ★ ئاگر گەش کردنەوە .

**ئاگر گەش کردنەوە** ـ ( مصت . مت . ) تم : ئاگر گەشاندنەوە .

**ئاگر گەشکەرە** ـ [ ئاگر + گەش + کەر ( کردن) + ە ـ ئە/١ ]

( نت.) تم : ئاتەشگەردان .

**ئاگرگەشکەرەوە ــ** [ ئاگر + گەش + کەرەوە (کردنەوە) ] ١ــ (نت.) تم : ئاتەشگەردان . ٢ــ (نفا.) تم : ئاگرگەشەوکەر/٢ .

**ئاگر گەشەو کەر ــ** ١ــ ( نت . ) تم : ئاتەشگەردان . ٢ــ ( نفا . ) ئەو کەسەی ئاگر دەگەشێنێتەوە .

**ئاگرگیرە ــ** [ ئاگر + گیر (گرتن) + ٣ــ ئە/٢ ] ، ( نت . ) ، ( سن . ) سۆتەمەنێکی کەم کەگورج ئاگربگرێ، بۆ ئەوەی ئاگرێکی گەورەتری پێ بکەنەوە ★ دەس ئاگر ( دەساگر ) ، دەستەچێلە ، چاوگە .

**ئاگر لێبارین ــ** [ ئاگر + لێ ( لە + ی = ز ) + بارین ] ، (مصد. لا . ) ، ( کن . ) بەلا بەسەر هاتن ، تۆشی نارەحەتێ بۆن . ● « ئاگری لێبارێ » تۆك و نزایە .

**ئاگرنانەوە ــ** ( مصد . مت . ) تم : ئاگر کردنەوە/١ و ٢ .

**ئاگرودۆ ــ** [ ئاگر + و + دۆ ( دۆکەڵ )] ، ( نت.) ١ــ ( هل.) تم : ئاووردۆ ٢ــ ( سیم.) ، ( کن.) ئاگردان ( بەنیشانەی ئاوەدانێ ماڵ و بنە مالە و خێزان ) تم : ( هێد ــ ١ ) ★ وەجاغ .

**ئاگر و دۆ بڕان ــ** ( مصد . لا . ) ماڵویران بۆن ، ئاسەوار نەمان ● «ئاگر و دۆی بڕێ» ماڵێ ئاگری تێدا نەکرێتەوە و دۆکەڵی لێ هەڵنەستێ ( بەو مانایەی کە کەسی تێدا نەمێنێ کە پێویستی بە ئاگر هەبێ . ) .

**ئاگرۆچکە ــ** [ ئاگر + ئۆچکە ] ، ( نت . ) ئاگری پچۆك، ئاگرێکی منالان بە پۆش و پەلاش و چڕوچێلکە دەیکەنەوە. ★ ئاگرۆکە، ئاورۆچکە.

**ئاگرۆکە ــ** [ ئاگر + ئۆکە ] ، ( نت . ) تم : ئاگرۆچکە .

**ئاگرە ــ** [ ئاگر + ە ــ ئە/١ ] ، (نت.)١ــ نەخۆشێکی تایبەتێ پێستە، زیاتر منالێ تۆش دەبن ، لەپێشدا لالفاوە و چەناگە دادەگرێ و پاشان دەپەرێتە جێگای‌تر . ئەو شوێنانەی کە تۆش دەبن زێپکەی وورد دەر دەکەن و زنچکاوێکی زەردیان لێدێت ★ ئاگرەکە ، ئاورە . **تێبـ ــ** پێش بلاو بۆنەوەی دوکتور و دەرمانی تازە ، ، لە کوردەوارێ ئەم نەخۆشییەیان بەمجۆرە چارەدەکرد : أ) ترشاوێکی خەستی سماقیان دەگرتەوە و ڕۆیان دەکردە سەر ئەرز ، دەستی دەکرد بە کەف و کوڵ ، کەفەکەیان لە برێنەکان دەدا ویشکی دەکردن . ب) شوانێکی حەوت ساڵ شوانێ کردبێ ، بە ئەستێو بەرد چەند پڕیشکێك ئاگری لەسەر برێنەکان دەکردەوە ، لایان وابۆ چاك دەبێتەوە ، رەنگە ئێستاش لە گەلێ شوێنی کوردستان هەر بەم جۆرە چارەی بکەن . ٢ــ تم : ئاتەشەك ( تم : هێد : ل١ ، مخ : ج ١ ، ل ــ ١٨ ) .

**ئاگرەکە ــ** [ ئاگر + ١ــ ئەك/١ + ە ــ ئە/١ ] ، ( نت ) ، ( هل . ) تم : ئاگرە/١ .

**ئاگرەگڕە ــ** [ ئاگر + ە ــ ئە/١ + گڕ + ە ــ ئە/١ ] ،(نت .) ئاگرێکە بە سۆتەمەنێکی وەکو ( گوێنی ) کرابێتەوە ، کە هەر گڕی هەبێ و

سكڵ نەخاتەوە. تێبب ــ منالآن کاتێ ئاگرێکی وا دەکەنەوە بە دەوریدا هەڵدەسوڕێن و چەپلە لێدەدەن و ئەم گۆرانیە دەڵێن : « ... ئاگرە گڕەی خۆمانە ... » ★ ئاورەگڕە .

**ئاگرتین ــ** [ئاگر + ئین ] ،(صت.) هەرشتێ وەکو ئاگر ، لە بارێکەوە پیاو گەرم دابێنێ . :: ڕەووشت و خوّی ئاگرتین ( توڕەیی و تۆسنی ). فرمێسکی ئاگرین ( فرمێسکی گریانی بە کوڵ ) . شیعری ئاگرتین (شیعرێ کە پیاو هان بدا و بیهێنێنە جۆش).

**ئالك ــ** ( نا . ) تم : ئالێك .

**ئالکۆل ــ** [= فرەنسێ : ئالکۆل . ( لە ــ الکحول ــ ی عەرەبێ وەرگیراوە . ] ، (نا.) ، (کێر.) تراوێکی کیمیاییە ، لە هیدڕۆژێن و ئۆکسیژێن و کاربۆن پێکهاتوە ، وەکو بەنزین بە هەوادەچێ ، خێرا ئاگر دەگرێ ، تامی تیژە و بۆنی گرانە ، دەم دەسوتێنێ ، لە ۷۸ دەرەجە گەرمایێدا دەکوڵێ و لە ۱۱۲ ی ژێر سفردا دەیبەستێ ، گەلێ چەشنی هەیە ، لە هەموان بە ناو بانگتری دوانن . یەکەمیان ئالکۆلی سپێیە کە ناوی کیمیایێ ( ئالکۆل ئیتیلیك )ە و کەم و زۆر لە هەمو جۆرە خواردنەوەیێکی وەکو بیرە و ئارەق و ...... دا هەیە ، ڕەنگی وەکو ئاو وایە ، بۆنی ناخۆش نیە ، هەندێ تفت و تاڵە و دەم دەزوڕێنێتەوە ، ئارەق و شەراب و ... کە پیاو سەرخۆش دەکەن لە بەر ئالکۆلەکەیانە . دوهەمیان : ئالکۆلێکە لە ( دار ) دەگیرێ بۆیە (ئالکۆلیدار)یشی پێ دەڵێن ، بۆ خواردنەوە ناشێ ، سەنعاتکار و دوکتۆرەکان بۆ ئیشی جۆر بە جۆر کەلکی لێ وەردەگرن . ★ ئیسپیرت . ئیسپیرتۆ . کحوّل (عا.)

**ئالکۆلی ــ** [ ئالکۆل + ۳ــ ئێ ] ، ( فرەنسی . کو . ) ، ( صە . نا . ) ، ( کێر . ) ١ــ کەسێکی زۆر ئارەق و شەراب و ئەو جۆرە شتانە بخواتەوە و لێی بۆبێ بە خو بۆی تەرخ نەکرێ:: پیاوی ئالکۆلی دەستی لەرزۆك دەبێ . سۆران هەر بە جارێك بۆتە ئالکۆلی ، بەیانیش دەخواتەوە . ۲ــ ئەو شتانەی لە تەرکیبیاندا ئالکۆل هەبێ :: ئاوجو خواردنەوەیێکی ئالکۆلییە بەلآم پیاو هێندە سەرخۆش ناکا . ۳ــ ئەو ئامرازانەی بە ئالکۆل ئیش دەکەن :: تیرمۆمەتری ئالکۆلی. پریمۆزێکی ئالکۆلیمان هەبو گوم بو.دوکتۆرەکان ئامرازەکانیان بە چرای ئالکۆلی ڕادەدێرن تا میکرۆبەکەیان لە ناو بچێ .

**ئالوچە ــ** [ ئالو + چە = ئالوی بچوك ] ، ( زا . ) ، ( نت . ) تم : هەڵوچە . هەڵوژە . هس : ئالو .

**ئالودە ــ** ( فر . ) ، ( نمف . ) ١ــ گیرۆدەی شتێك ، کەسێك یا کارێك . :: ئەم منالە زۆر ئالودەی دایکێتی ، پیاو خوی ئالودەی جگەرە نەکا باشە . □ «وەك سۆفیی سافێ مەبە ئالودەیی دنیا »

« بێهودە مکەددەر مەکە سەرچاوەیی مەشرەب »

( نالی : گم ــ ١٢ )

« سا خاسەن ئەمجار ، شـوم سیابەخت »
« تۆ ئالودەی دەرد ، مـن زامـان سەخت »
( مەولەوی : مکب ـ ٢٥ )
٢ـ حالی شتێك كە لـە شتێکیتر خشـابێ یاکەوتبێتـە ناویـەوە ئاسارێکی پێوە لکا بێ .
□ « ئالودە نەبێ تا بە زەبونکیرتی خوێنم »
« بۆ کوشتنی من دامەنی پاکی لە کەمەردا »
( نالی : گە ـ ٨ )
★ (بکـ.) لەوتێ ( = عا : ملوث ) .
**ئالـەت ـ** [ = عا : آلـة ] ، (نا.) ١ـ ئامراز بۆ پێکهێنانی کارێك یا جێبـەجێ کـردنی مەبەستێك :: هـەوجارڕ ئالـەتی جوتـە . کونەپەرسـت ئالـەتی دەسـتی ئیمپریالیزمە . ٢ـ (کنـ.) ئامرازی پیـاوەتی و نێرینـەیی ئادەمیـزاد ( چونکە ناو هێنانی بە بێ ئەدەبی دەزانرێ ) .
**ئالێ ـ** [ پە : ئالەك ] ، (نا.) ، (بکـ.) لا ، لایەك ، مەڵبەند ، کەرخ ، تەڕەف :: ئالیـدار ( لایەنگیـر ) ، ئالییێ مالێ (لای ماڵەوە ، حەرەم)، ئەز دچم ئالییێ دیاربـەکرێ ( من دەچمە لای دیاربەکرێ ) .
**ئالێك ـ** [ = عـا : عەلیق ] ، (نا.) ژەمە کا و جۆیەکە ، ئەکرێتە بـەر وولاغی بـەرزە و ئێسـتر و گوێدرێژ . :: وولاخەکانم ئالێـك نـەداوە ، ئـەوە هێشـتا ئالێکت نەکردوتـە بـەر ئەسـپەکە ؟
□ « خـاوەنی ئالێـکی نالێـم پێ نەداوە موتڵەقا » « داویەتێ ئەمما وەکو بیسـتومە قـوتی لایەموت » (رەزا ـ ١٠) .
**ئالێكدان ـ** (مصدـ. متـ.) کاو و جۆ ، کردنە بەر وولاغان . :: با ئالێك بـدەم جـا دێم . خێـرابن ئالێك بدەن تا برۆین .
**١ـ ئـاڵ ـ** [ پە : ئـاروس ] ، (صـ.) ڕەنـگی سـوری گـەش . :: پێوازەکە ئەوەندە سورکەوە تا ئاڵ دەبێ . وەکو دەنکی هەنار ئاڵە . ئەوەندە ئاڵە ئاوی چاوی پیاو دەبا .
□ « لە ئەشـکی خوێن بـە یادی لێوی ئاڵت »
« کەنارم بو بـە کانی لەعل و یاقوت »
( سالم : گە ـ ٤٩ )
**٢ـ ئـاڵ ـ** ( سیمـ. ، سنـ. ) تمـ : ١ـ ئالـە . **ئاڵیزەنـگان ـ** [ ئـاڵ + ١ـ ئـی + زەنـگ ( شەوەزەنـگ ) + ٢ـ ئـان /١ ] ، ( نتـ. ) ، ( مکـ.) ١ـ ئەو مەوجـودە خەیالییەیـە کە پێی دەلێـن ئـاڵ ( تمـ : ١ـ ئالە ) ● « لە قسان ئالێ زەنگـانە ، لـە کـاران ڕێـخ بـە لینگـانە » ، ( کنـ.) بـە کەسـێ دەگوترێ کـە بـە قسـە هێچـی نەهێشـتبێتەوە و بە کردەوەش هێچی لە دەست نەیێ . ٢ـ ( کنـ.) خێرا ، چـاپوك .
**٣ـ ( ـ ئاڵ ) ـ** ( پـ.) بە دوای ناوەوە دەنوسێ و مەعنای وێکچون یا نیسبەتی لێ زیاد دەکا و دەیکـاتە ناوێکی تازە :: پاتاڵ ، چاڵ ، چەتاڵ

چەنگاڵ ، فتیشاڵ ، قرژاڵ ، ( بکـ.) کێفژاڵ ، هەرزاڵ .

**١ ـ ئالآ ـ** (نا.) ١ـ پارچەیەك قوماش هەرچێکی بێ و هەر چەندێك بێت :: ئالەبێژ ( ئالآبێژ ) ، ئالەبوك ، ★ والآ . ٢ـ پارچە قوماش یا کەولێك بوە ، بە سەری ڕمب و نێزەوە دەکرا و شکلی گیاندار یا شتێکی تری لەسەر دەکێشرا . زەمانی کۆن نیشانەی لەشکر و ئۆردوی جیاجیا بوە ، هەر لەشکرێ هەولێ دەدا ، لەشەڕا ئالآی لەشکری دوژمن بگرێ یا بێخا ، کەوتن یا گیرانی ئالآی لەشکرێك شکستی تێدەخست، لە چەرخی نۆزدەهەمڕا، ئالآ بۆتە نیشانەی گەلێ ڕێکخراو یا دەزگای تریش ، لە هەموان موهیمتر بۆتە نیشانەی سەربەخۆیی نەتەوەکان و ڕەنگاو ڕەنگیش بوە :: ئالآی نەتەوە یەکگرتوەکان . □ « دیارە ئەم ئالآیە شابالی پەرێ ئازادییە » « دەیشەکێنێ بای فەڕەح دەشکێ سوپای ڕەنج و کەدەر » ( هەژار ) ★ بەیداغ .

**٢ـ ئالآ ـ** ( نا.) ، ( هو.) تم : قەلەم . □ « ئالآگرت بە دەس خورشیدی خاوەر » « نۆسیا بولای بەهرۆزی سەروەر » ( خورشیدی خاوەر : دلی‌دلی ) .

**ئالآت ـ** ( نا.) ، ( مکـ.) تم : ٢ـ ئالەت .

**ئالآچغ ـ** [= تو : ئالآچیق ، ئالاجق ، ئالآجو] ، (نا.) ، (مکـ.) هۆدەیەکە بۆ دانیشتن ، دیوارەکانی لبادە و لێك دەدرێن و کاتی ماڵگواستنەوە لێك جیادەکرێنەوە . **تێبـ ـ** ئەم جۆرە خانوە تەنیا لە ناو خێلاتی ( شوقاق ) باوە ، کە عەشیرەتێکی کۆچەری ئازربایەجانێن و هاوێنان زۆ دەکەنە کوێستانەکانی کوردستان و زستانان دەگەڕێنەوە پێدەشتان ، فەقیرەکانیان لە ( زنج )اندا دەژین و دەولەمەندەکانیشیان لەم جۆرە خانوانەدا ، لەوانەیە لە ( تەتەر )انیان وەرگرتبێ و ڕەنگە خۆشیان هەر پاشماوەی ئەوان بن .

**ئالآیی ـ** [ ١ـ ئالا /٢ + ٣ـ ئی ] ، ( صت.) ، ( سنـ.) شتی ڕەنگاوڕەنگ ، هەر شتێ چەند ڕەنگی هەبێ ★ ئاڵ و والآ . **تێبـ ـ** وا دیارە لەبەر ئەوەی کە هەمۆ ( ئالآ )یەك لەم زەمانەدا زیاتر لە ڕەنگێکی تێدایە ، ئەم ووشەیە بەم مانایە هاتۆتە مەیدان .

**ئاڵبردنەوە ـ** [ ٢ـ ئاڵ + بردنەوە ] ، ( مصت. لا.) مردنی ژنی زەیستان یا مندالەکەی ، لە دوای زانی تا چەند ڕۆژێ . :: ئاڵبردیەوە ، شەوارەی بۆ بگرن با ئاڵ نەیباتەوە .

**ئاڵبۆنەوە ـ** [ ئاڵ ( ؟ ) + بۆنەوە ] ، ( مصت. لا.) لە کار کەوتنی ددانی ئادەمیزاد و توانای جۆنی خواردەمەنێ نەمانی . تێبـ ـ ١ ) ئەم فیعلە هەر بۆ ددان بە کاردێت و مانای ( ئاڵ ) دەگەڵ سێ هاوتاکەی کە لە پێشدا باس‌کران جیایە و بۆم مەعلوم نەبۆ چیە . ٢ ) لە ناو کوردەواریدا باوە دەڵێن

ئەگەر یەکێك ددانی ئاڵ بێتـەوە ، دوو سێ گەڵای دار قەیسی بجاوێ چاك دەبێتـەوە . ٣ ــ سـەعدی شـاعیری گەورەی فـارس دەڵێ : « ... هەموو کەس ددانی بە ترشی ئاڵ دەبێتەوە ( قـازی ) نەبێ ، بـە شیرنـی . » ( گولسـتان : بـابی هەشتەم ) .

**ئاڵتوون ــ** [ تو . ] ، (نا.) ، (کەر. ، سەردەشت ، بانە ) ١ــ زێڕ . ٢ــ ( مک.) ناوەبۆئافرەتان . ٣ــ ناوی دوو گوندانە لە پەنا شاری سەقز .

**ئاڵتی‌رەم ــ**[تو : ئاڵتی = شەش + کـو : رەم = درەم ] ، ( نـت.) ، ( کەر.) ئەندازەیێکە بۆ کێشـانەی شت ، بەشێکە لە ٦٤ بەشی هۆقە، بە هۆقەی سـلەیمانی دەکـاتە ٥٥ گرام .

**ئاڵچاخ/غ ــ** [ = تو : ئاڵچاق : نزم ] ، ( صـ.) ، ( سیـم.) پیـاوی بێ قیمـەت ، سـووك و چـرووك ، کەسێکی لە ناو کۆمەڵدا حورمەتی نەگیرێ :: ئەگەر ئاڵچـاخ نەبایـە تەماحی دە مالی هەتیوان نەدەکرد . کەسێ ئاڵچاخ نەبێ خراپەی قەومی خۆی ناکا .

**ئاڵدوز ــ** [= تو : یـاڵدز ] ، ( نا.) ، ( سیم.) ڕووکێشی زێڕ یـا زیو کە بە سەر خشڵ و ئەو جۆرە شتانە کێشرابێ ، تا وەك ئاڵتوون و زیو دیاری بکا . □ « ئاسنگەرم بۆ بێنن بە مشتەرییە ، بۆم دروس بکا ڕەکێفـی ئاڵـدووز ، دانەلغـاوی مرواریـیە .» ( تحفە : ج ٢ ، ل ــ ١٦٥ ) . ★ ئاوەزێڕ ، ئاوەزیو .

**ئاڵدوزکـاری ــ** ( تو. کو.) ، ( حمـصـ.) ، ( سـیـم.) پیشـەی ڕووکەش کردنی مەعدەنان بە زێڕ یـا زیو .

**ئاڵدووزکردن ــ** ( تو. کـو.) ، ( مصـــت. مـــت.) ، ( ســیـم.) ڕووکێش‌کردنی مەعدەنێك بە زێڕ یـا زیـــو . ★ ئـــاوەزێـڕکردن . ئاوەزیوکردن .

**ئـاڵشت ــ** ( تو . ) ، ( نمصـ.) . ( کەر.) گۆڕین ، گۆڕینەوە ، ئاڵ و گۆڕکردن . :: نۆبە چێکان هەر دوو سەعات جارێك ئاڵشت دەبـوون . ئەسپە کوێتم بەم ئێســترە بـۆزە ئاڵشت‌کرد .

**ئاڵشك ــ** ( ؟ ) ، ( نا.) ، (سـ.) تە : زوقم ( مخ : ج ١ ، ل ــ ٣٠ ) .

**ئاڵشوێرش ــ** (تو.) ، (نمصـ.) . تە : ئاڵوویر . **تێبـ ــ** ئەم ووشـەیە لە دوو مەصـدەری تورکی ( ئـالمق ، ئالمـاغ = کڕیـن ، ئەستـاندن ، وەرگرتن ) و ( وێرمق ، وێرماغ = دان ، تەسلیم‌کردن ) وەرگیراوە و لە گەلێ مەلبەندی کوردستان بڕەوی هەیە .

**ئاڵف ــ** [ = عا : علف ] ، (نا.) گیای ئیشك کە زستانان لە ماڵەوە دەدرێ بە مەڕ و مـاڵات و پاتـاڵ و بەرزەووڵاغ .

**ئاڵفانە ــ** [ ئاڵف + ئانە/٣ ] ، ( نتـ.) یەکێکـە لـە باجەکـانی دەرەبەگایەتی ، کە لەباتی هەقی ئەو ئاڵفـەی لادێییکـان بۆ زسـتـان دایدەخەن لێیان دەستێندرێ .

**ئاڵفتە ــ** ( نمف.) ، ( مک.) تە :

ئالۆدە . :: شاباز ئالفتەی ڕۆمـان خوێندنەوە بوە و دەرس و دەوری وەلا ناوە . تێبە ــ ئەم ووشـەیەش لە زمانی کوردیدا مەصدەرەکەی لە بیر چۆتەوە و لەوانەیە ، بەکەندەردۆ بە بیراندا بێ کە لە ( الفة )ی عارەبێ وەرگیـراوە ، بـەڵام مەصـدەری ( ئالوفتەن ) بە مەعنای (عاشق‌بۆن ) کە لە فارسیدا هەیە و زۆر زۆر کەم دە کاردەکرێ ، ئەم گومانە ناهێڵێ .

**ئالف‌جاڕ ــ** [ ئالف + جاڕ ] ، ( عا. کو.) ، ( نا.) ، ( سن.) ئـەو شوێنەیە گیای وای لێ دەڕوێ بـۆ ئالف دەست دەدا و ماڵاتیشی لـێ دەلەوەڕێ . ★جێ لەوەڕ، لەوەڕگە.

**ئالقە ــ** [ = عا : حلقة ] ، (نا.)، ( مک. ) ١ــ هەر شتێکی خڕی وەکو (دایرە) کە ناوەڕاستەکەی بەتاڵ‌بێ ، دار ، تەل یا شیشی ئاسن کە وەکو دایـیرە داهێنـدرا بێتـەوە و ئەوسەرەوسەرەکەی گەیشتبێتەوە یەك . ● « دەستی بە ئالقەی کابە گرتوە . » ( کن . ) حاجییە ، چۆتە حەج .★ ئەڵقە . ( سن . ) ئاخڵە ٢ــ ئەنگوستیلەی زێـڕ ، زێـو یا پلاتین، بە بێ‌نەقیم کە لەم دوایانەدا بۆتە باو ، کوڕ و کچ پـاش ئەوەی بۆنـە دەزگیـرانی یـەکتری ، دە دەستیانی دەکـەن . ٣ــ کۆبۆنەوەی خەڵك لە دەوری کەسێ یا شتێ :: ئالقەی زیکر ( ذکر ) لە تەکیەی شێخ بـابـا .

**ئالقەتیز (تیبس) ــ** [ ؟ ] (نا.) ، ( مک . ) گیایەکی دەشتەکییە ، زۆر بەرز نابێتەوە ، هەمیشە تەنانەت لە ژێر بەفریشدا دەمێنێتەوە و شینە، ساقەتی نیو سـانتیمەتر ئەسـتۆر دەبێ و قەف قەفە ، لە شکاندنەوەدا شیری لێ‌دەتکێ ، دلۆپێ لەم شیرە بە چەند کلۆ قەنددا دەکەن و لە باتێ دەرمانی ڕەوانێ ( مسهل ) بەکاری دێنن زۆر کاریگەرە . تێبـ ــ بە لێکدانەوەی من ئەم ووشـەیە هیچ پێوەندیکی بە ( ئالقـە ) و ( تیز = تیژ)ەوە نیە و زیاتر لە یۆنانێ دەچێ، تەنیـا گیایەکی لـە قامۆسـەکانی فارسیدا بەرچاوم کەوت کە بۆنـی ئەوەی لێبێ ( ئالقەتیز )ی کوردییە ( بخور مریم )ە کە دوکتۆر معین پاش ئەوەی بە ( گوڵی نیگونسار = گوڵی سـەرەونخۆن )ی مـانا لێدەداتەوە (تم : فەرهەنگ ، ج١ ، ل ــ ٤٧٨ ) لەباسـی ( گـوڵی نیگونسـار )دا ( فەرهـەنگ ، ج٣ ، ل ــ ٣٣٥١ ) وای باس دەکا : « .... لە بنی ئـەم گیایـەدا ماددەیـەك هەیـە ( سیکلامین )ی ناوە کە بـۆ ڕەوانێ زۆر کاریگەرە ... » ، (مردۆخ)یش ( بخـوری مرێـم )ی نۆسـیوە و هاوتایەکی بە (چەنگی مرێم) دادەنێ، ئەوجار لە باسی چەنگی مرێمدا بە عەرەبێ ( بخور الاکراد )ی مـانـا لێداوەتەوە ( تم : مخ . ج٢ ، ل ــ ٥٧٨) . (المنجد)ی عەرەبیش یەکێك لە هاوتاکانی بخوری مرێم بە ( بخور الاکراد ) ناو دەبا ( تم : المنجد ــ ٢٧) شـەلوارپەکۆڵ .

**ئالقەڕیز ــ** [ عا. کو. ] ، (نت.) ١ــ چەند ئالقەیەکە لەئاسن دروست کراون وەکو زنجیر تێك دەکرێنەوە ،

سەرێکی لەتایەکی دەرگا دائەکوترێ، سەرەکەی‌تری پارچە ئاسنێکی درێژۆکەی کون یا ئاڵقەیێکی پێوەیە دەکرێ بە سەر ( دۆلایێ )دا ، کە لە تایەکەی تری دەرگا ( ئەگەر دۆ تایێ بێ ) یا لە چوارچێوەی دەرگا داکوتراوە ، بۆ داخستن و قفڵدانی دەرگا بە کار دێت . ٢- هەر جۆرە ئامرازێکی تر کە بەم شێوەیە بۆ داخستنی دەرگا لە مەعدەن دروست‌کرابێ . شکڵی هەر چونێك دەبی ببێ .

**ئاڵقەرێزکردن** - ( مصت . مت . ) داخستنی دەرگا ، هەڵپێکانی دەرگا ، هێنانی ئاڵقەرێز لە تایەکی دەرگاوە بۆ تایەکەی تر یا بۆ سەر چوارچێوە و کردنی بە دۆ لایێدا .

**ئاڵقەزۆنە** - [ ئاڵقە + زۆنە = زوانە ، زمانە ] ، ( عا. کو. ) ، ( نت. ) ، ( مک . ) تە : ئاغزۆنە .

**ئاڵقە لە گوێ** - [ عا. کو. ] ، ( صت . ) ١- گوێ‌لەمست ، گوێ‌ڕایەڵ ، کەسێکی بە قسەی کەسێکی تر بکا . ٢- ( کن . ) بەندە ، غولام ، عەبد . **تێب** - لە دەورانی بەندەداریدا کە مرۆڤ وەکو کاڵا - دەکڕدرا و دەفرۆشرا بۆ ئەوەی ( بەندە ) و ئەوانەی عەبد نەبۆن لێك جیابکرێنەوە ، ئاڵقەیێکیان لە گوێچکە یا ملی ( بەندە ) کان دەکرد. چێ بووترایە : بەندە و عەبدی فلان کەس یا بیان‌گوتبا : ئاڵقەلەگوێی وەکو یەك بۆ . ★ ئەڵقەبەگوش ، ئەڵقەلەگوێ .

**ئاڵك** - ( نا. ) ، ( سن . ) تە : ئاڵتو .

**ئاڵ و بۆڵ** - [ ئال ؟ + و + بۆڵ ] ، ( صت . ) حاڵی بەرسێلە کە ئاوی تێ‌گەڕابێ بەڵام هێشتا بە تەواوێ نەگەیبێ و تامی بە لای ترشێدابێ ، حاڵەتێکە لە نێوان بەرسێلەیێ و ترێی گەیبودا ، شکڵی ترێی پەیداکردوە (بۆتە بۆڵ) و تامی بەرسێلە دەدا . تێب - ڕەنگە (ئاڵ)ی ئەم ووشەیە و ( ئاڵ )ی ئاڵبۆنەوە پێوەندێ و خزمایەتییان پێکەوە هەبێ .

**ئاڵوبۆڵ بۆن** - ( مصت . لا. ) ئاوتێکەڕان و ترش‌وشێرن بۆنی بەرسێلە ، گەیشتنە حاڵەتی ئاڵوبۆڵی .

**ئاڵوگۆڕ** - [ ئاڵ = ( ئالمق ، ئالماغ : وەرگرتن ، کڕین ) + و + گۆڕ ( گۆڕینەوە ) ] ، [ تو . کو. ] ، (نمص.) گۆڕینەوەی شتێك بە شتێك لە جسنی خۆی :: جێگاکانتان ئاڵوگۆڕکەن ، دیارە ئوتۆمبیلەکەت ئاڵوگۆڕکردوە .

**ئاڵووالا** - [ئالا + و + والا] ، (صت.) ، تە : ئالایێ .

**ئاڵوویر** - [ ئاڵ (ئالمق) + و + وێر (وێرمق) ] ، [تو.] ، (نمص.) ، (مک.) سەودا و مامەڵە ، کڕین و فرۆتن . تێب - ئەم ووشەیە لە ڕیشەی دۆ مەصدەری تورکێ (ئالمق بە مانای : وەرگرتن ئەستاندن و کڕین) و (وێرمق بە مانای : وێدان) پێکهاتوە ، لە سەودای ناو بازاڕا لادێیەکانیش بە کاری دێنن .

**ئـالۆ** ـ [ أ ] ، ( نا. ) ، ( سن. ) تم : خاڵ ★ لالۆ. تێبـ ـ بەلای منەوە ( ئۆ )ی دوایی ئەم ووشەیە ئامرازی بانگهێشتنە لە لەهجەی باکوریدا ، بەڵام هەروا ڕۆیشتوە و ئەسڵی ووشەکە هەرچی بوبێ لەبیر چۆتەوە . هس : ( بک. ) ئاپ ، ئاپۆ.

**ئـالۆز** ـ ( ص. ) ١ـ ( مک. ) حالەتی تێکهاڵاوی و تێکئالقاوی هەوداکانی ماشەرەبەن و کەڵافەدەزو و ... :: ئەم ماشەرە هێندە ئالۆزە بەکەس هەڵناکرێ . ٢ـ سەر و پرچی شانە نەکراوی ژنوپیاو. ٣ـ ( مج. ) کاری دژوار و گران کە سەرەودەری لێنەکرێ. ٤ـ ( سیم. سن. ) ، ( مج. ) حالەتی پیاوی توڕە و تۆسن ، توندەمیجاز. هس : ( فر. ) ئالێز = جۆتەی یەکسم.

**ئـالۆزان** ـ ( مص. لا. ) تم : ئالۆزبون ١ و ٢ و ٤ .

**ئالۆزاندن** ـ ( مص. مت. ) تم : ئـالۆزکردن :: ئێشەکەیان لێئالۆزاندین . کچێ ماشەرەکە نالۆزێنی .

**ئالۆزاو** ـ ( نمف. ، صمف. ) ١ـ چلۆنایەتی هەموشتێکی وەکو بەن ، مو ... کە ئالۆز بوبێ . ٢ـ چلۆنایەتی کارێکی گرێ و گوڵی تێکەوتبێ ، شتێکی بەسەر هاتبێ بەهاسانی جێبەجێ نەبێ و سەرەودەری لێنەکرێ . ٣ـ حالی ئینسانێکی توڕە بوبێ ، ڕقی هەڵستابێ :: بەنی ئالۆزاو هەڵناکرێ . ئێشی ئالۆزاو جیبەجێکردنی دژوارە . پیاوی ئالۆزاو جێکە بەخۆی ناگرێ ( صمف. ) ، ئەم ماشەرە بۆچی وا ئالۆزاوە . تەماشای ئەم پیاوە هێمنە چۆن ئالۆزاوە ( نمف. ) . ★ ئالۆزکاو ، ئالۆسکاو .

**ئالۆزبون** ـ [ مص. لا. ] ١ ـ تێکئالقانی داوی بەن و دەزو :: ئەم کەڵافە بۆچی وا ئالۆز بوە ؟ ٢ـ تێکچونی ڕێك و پێکی سەر و پرچی بەشانەداهاتو . :: کچێ تا پرچەکانت ئالۆز نەبون بیانهۆنەوە. ٣ـ ( مج. ) توڕەبون ، ڕق هەڵسان. ٤ـ بەرهەڵست و نارەحەتی هاتنەپێش جێبەجێبونی کارێك . :: ئێشەکەمان لێ ئالۆزبوە ★ ئالۆزان ، ئالۆزکان ، ئالۆسکان.

**ئالۆز پالۆز** ـ ( نت. ) تم : ئالۆزپلۆز .

**ئالۆزپلۆز** ـ [ ئالۆز + پلۆز ] ، ( نت. ) ١ـ ئاژاوە و هەراو هوریا. ٢ـ شێوانی چلۆنایەتی کۆمەڵ ، نارێکی . :: دنیایەکی ئالۆزپلۆزە . ئالۆزپلۆزێ مەکەن . ★ ئالۆزپالۆز . تێبـ ـ بەڕای من ، کەرتی دوەمی ئەم ووشەیە ، شێوەیکی دیکەی ووشەی کوردی ( پلۆچ )ە لە ( پێچەڵپلۆچ ) دا ، لە فارسیدا ( پەلیس ) بەمانای ( نارێك و ناهەموار ) و ( پەرێز ) بەمانای ( هاوارهاوار )ە و ئێستا لەکارکەوتون و تەنیا لەقامۆساندا ماون .

**ئالۆزکان** ـ ( مص. لا. ) تم : ئالۆزبون .

**ئالۆزکاو** ـ ( نمف. صمف. ) تم :

ئالۆزاو .
**ئالۆزكردن ـ** ( مصت مت.) ١ـ شێواندن و گرێوگوڵ خستنە ماشەرەبەن، گلۆلەمۆ، کەلافەدەزو. ٢ـ شێواندن و تێکدانی سەروپرچی شانەکراو و داهێنراو. ٣ـ (مجـ.) ، ا ) تۆرەکردن و ڕقهەلساندنی کەسێك . ب) تەگەرە و چەت خستنە پێش جێبەجێ‌کردنی کارێك و دژوارکردنی . ★ ئالۆزاندن .
**ئالۆزی ـ** [ ئالۆز + ٢ـ ئی] ، ( حمص.) ١ـ تێکئاڵاوی و تێکئالقاوی ( بۆ : مو ، بەن ، دەزو ...) ٢ـ تۆرەیی و تۆسنی ، توندەمیجازی ، ڕقهەلستاوی ( بۆئادەمیزاد ) . ٣ـ پشێوی و شێواوی ( کارو... ) ٤ـ (هەکاری) تێفۆس ، ڕەشەگرانەتی ( تم : ژابا. ل ـ ١٩ ) !؟ .
**ئالۆسکان ـ** [= ئالۆزکان ] ، ( مص. لا.) تم : ئالۆزبون .
**ئالۆسکاو ـ** ( نمف. ، صمف.) تم : ئالۆزاو .
**ئالۆش ـ** [ ؟ ] ، ( نا.) خورۆی لەشی ئادەمیزاد ، بەتایبەتی لەبەرنەخۆشی پێست کە لە لاڕان و ناوڕان دەدا و پیاو ناچاردەبێ هەر بێخورێنی و هەلێکرێنی . ★ خارشت ، خورو .
**ئالۆشاوی ـ** ( صمف.) ١ـ حالی کەسانێ کە لەبەر نەخۆشی پێست هەمێشە هەندێ جێگای لەشیان دەخورێ . ٢ـ (مجـ.) ، ا) حالی ئەوانەی خۆیان بەخو هەلکڕاندنەوە گرتوە. ★ ئالۆشدار. ب) ئافرەتی حەشەری. ★ بەئالۆش. حەکەدار ( عا. کو.) . هۆکن .
**ئالۆشدار ـ** ( صفتا.) تم : ئالۆشاوی ١ و ٢ (ا) .
**١ـ ئالو ـ** [پە : ئالوك، ئالوگ]، ( نا.) ١ـ دو لوی پچوکن بە شکلی بادام ، لەولاولای گەروی ئادەمیزاد، ئێشیان ئەوەیە گرموڵەی سپی ( کریات البیضاء ) بو خوێن سازدەکەن . ★ ( عا.) لەوزەتەین.
**تێبـ ـ** جاروبارە هەندێ میکرۆب پەلاماری ( ئالو ) دەدەن و پەکی ئەوەیان دەخەن ئێشی خۆیان بە چاکی بکەن و کێم و چڵکیان تێدا کۆدەبێتەوە ، ئەگەر چارەی نەکرێ ئەو چڵك و کێمە دەچێتە ناو خوێنەوە و گورچیلەکان دەئاوسێن، پیاو بێ هێز و لاواز دەبی . کە کار گەیشتە ئەم ڕادەیە دەبێ ( عەمەلیات ) بکرێن و دەربهێندرێن.
٢ـ دو لوی پچکۆلەی ترن لەژێر چەناگەوە ، لەکاتی ددان‌ئێشە و گوێڕەپە و ئەوجۆرە نەخۆشییانەدا دەئاوسێن . ٣ـ هەمو ئاوساوێك لە لەشدا ، کە ئەنجامی ئەوەبێ شوێنێکی تری لەش کوانی لێهاتبێ یا تۆشی نەخۆشییەك بوبی و ژان‌بکا . :: سورە کوانێکی لەشانی هاتوە ، ئالوی داوەتە بنەنگلی .
**تێبـ ـ** ئەم‌وشەیە بەگشتی مەعنای شتی خڕ و گرموڵە ( کروی )یە و ئێستا بەم مەعنایە لەبیرچوتەوە و لەشیوەی جۆربەجۆری تەرکیبیدا دەبێندرێ . هس : ئالوبالو ،

زەردەلۆ ، لۆ ، هلۆ ، هەلۆژە . . . .
**٢ــ ( ــ ئالۆ ) ــ** ( پ.) بەدوای ( ناو )ێکەوە دەلکێ و دەیکا بە ( صفەت ) . :: هێشتا خەوالۆ بۆ چاوی هەڵدەگلۆفێ . **تێب ــ أ )** ئەم پاشبەندە تەنیا ( ناوی‌مەعنا )ی دەچێتەسەر و بۆ ناوی‌ذات (ــ ئاوێ )مان هەیە . ب) ئەوەندەی پێم شك‌بێ هەر لەووشەی(خەوالۆ)دا ماوەتەوە ، ئەگەر دەگەڵ ناوی تریش بەکارهاتبێ لەبیرچۆتەوە . هـس : ئالۆدە .

**ئالۆبالۆ ــ** [ ١ــ ئالۆ + بالۆ ( ؟ ) ] ، ( نت.) ١ــ بەری دارێکی دەسچێنە هەر بەم‌ناوە ، شکلی‌خڕە، ڕەنگی سوورێکی مەیلەو ڕەشە ، تامی شیرنە و تۆزی مزرە . لەکوردستانی ئێران زۆرە و لەهەندی شوێنی کوردستانی عیراقیش هەیە. وەکو میوەیێکی هاوینی دەخورێ و لەباتی ترش دەکرێتە هەندێ چێشتان ، ڕێچاڵ و ڕوب و شەربەتیشی لێ‌دەگیرێ ، وەکو ( چا )ش دەم‌دەکرێ و دەخورێتەوە. وامەشهوورە ( سەفرا ) دەشکێنێ و ( دەغەز ) دەپەڕێنێ ، زۆر خواردنیشی کاری دەرمانی ڕەوانێ دەکا . □ « سەفراشکێنە ، دەغەزپەڕێنە ئالۆبالۆ ! » . ٢ ــ داری ئەم میوەیە بە ووشکێ و بە تەڕێ . ★ ئالۆبەلالۆك ، بەلالوك.

**ئالۆبخارە ــ** [ ئالۆ + بخارە = بوخارا ( شارێکە لە ئوزبەکستانی سوڤیێت ) ] ( نت.) ، ( مک.) جۆرێك هەلۆچەیە ، تامی‌ترشە ، ڕەش و زەردێ هەیە ، ڕەشەکەیان ئێشکە و دەنك‌دەنك ، زەردەکە شیرەدارە و جاران لەناو خێکەدا هەڵدەگیرا . هەردو جۆرەکەی لەباتی ترش دەکرێنە ناوچێشتەوە . ★هەلۆچە پاوەیی ، هەلۆچە ڕەشە ( سن. ) . هەلۆژە ڕەشە .

**ئالۆدار ــ** [ ئالۆ ( ؟ ) + دار ( درەخت ) ] ، ( نت.) دارێکی ڕاست و درێژە ، نەزۆر ئەستور نەزۆر بارێك ، بۆ دارەڕای خانۆ بەکاردێت .

**ئالۆکەوتن ــ** [ ١ــ ئالۆ + کەوتن ] ، ( مصت. لا.) ، ( سیم.) تە : ئالۆهاتن/١ .

**ئالۆگرتنەوە ــ** ( مصت. مت.) تە: ئالۆهەڵدانەوە .

**ئالۆهاتن ــ** ( مصت. + هاتن ) ١ــ ئاوسانی لۆی ناو قوڕگ یا ژێر چەناگە. ★ ئالۆکەوتن ٢ــ ئاوسانی هەندێ شوێنی لەش لەئەنجامی ئێشان و نەخۆشی شوێنێکی‌تر .

**ئالۆ هەڵدانەوە ــ** ( مصت. مت.) دەست‌پێداهێنان و داماڵینی (ئالۆ) لە دێوی دەرەوەڕا ، بۆ نیشاندنەوەی ئاوساویەکەی و چاکردنەوەی . **تێب ــ** لە کوردەوارێدا ، کە ئالۆکەوت بەم جۆرە چارەی دەکەن. ا ) چەند بەیانییەك لەخورێنێ ، بە قامکی گەورە لە دێوی دەرەوە و لەژێرڕا بۆسەرەوە دەستی پێدا دێنن و جاروبارەش پەنجەیان چەور دەکەن تا چاتر گەرمێ دابێنێ و باشتر دابماڵدرێ . ب) چەند بەیانیان لەخورێنێ پەنجەی گەورەی

دەســت دەنوشتێننــەوە و قەفــی ناوەڕاســتی بە بەرزایــی دەخەنــە نێوانی دوڕێزی ددانەوە و ماوەیێك بەمجۆرە دەیهێڵنەوە . ئەمەیان تەنیا بۆ ئالوی قوڕگە. ★ ئالوهەڵدانەوە.

**١ــ ئــاله ــ** ( نــا.) ، ( مک.) مەوجودێکــی خەیــالییە و لەنــاو کوردەواریدا باوەڕیان وایــە ، کــە دەوری ژنی زەیستان و منداڵەکەی دەدا و هەر دەرفەتی وەگیر کەوت هەردوکیان یا هەرکامیکیان کە بۆی بلوێ دەیانکــوژێ . ★ ٢ــ ئــاڵ . دایکی‌هاڵ .

**ئالەبۆك ــ** [١ــئالا/١+بــوك] ، ( نــت.) ، ( مــک.) سەرەمقەســتی چیت و هــەرتیر و هەرقومــاشێکی دیکە ، کە کچۆلان دەیکەنە جل بــۆ بوکی منالان. ★ والەبوك ( سیمە.).

**ئالەبێژ ــ** [ ١ــ ئالا/١ + بێــژ ( دابیشــتن ) ] ، ( نمصد.) ، ( مک.) کاری دابێشــتنی شــتی هــاڕاوە بەهێلەگــی زۆر وورد ، یا پــارچە قوماشێکی تەنکی شاش کە دابدا . ★ والەبێژ ( سیمە.) .

**ئالەبێژ کردن ــ** ( مصت. مت.) دابێشتنی هەندێ شتی هــاڕاوە و کوتــراو ( برنــج ، دارچــین ، بەهارات ...) بەپارچە قوملشێکی تەنکی شاش ، بۆ جیا کردنــەوەی ئەو بەشەی بــاش نەکوتراوە . ★ والەبێژ کردن ( سیمە.) .

**١ــ ئالەت ــ** [ ؟ ] ، ( نــا.) ، ( مک . ) ١ــ بەری گیبایەکــە ، لە هیندستان و شوێنی گەرم دەڕوێ ، وەکو لاولاو بــە داروبــاری دەوری خۆی هەڵــدەچێ و بەرەکەی وەکو هێشوی‌تری شوڕدەبێتەوە . دەنکی بەقەدەر دەنکی‌ماشە ، تــامی تیژ و ڕەنــگی ڕەش . دەیهاڕنــەوە و بــۆ خــۆش‌کردن و تیــژێ دەیکــەنــە چێشتان . ٢ــ (مجـ. ) پیاوی توڕە و توندەمیجاز . :: ئێستوەت . (بک .) ئێسوت .

**٢ــ ئالەت ــ** [ = عا : آلــة ] ، ( نا. ) ١ــ ئەو پارچــەدارە پچکۆلە تاشراوانەن کــە جاران پێش‌ئەوەی شوشە لەکوردســتان بلاوببێتەوە ، لەناو چوارچێوەیێکا بە نێرەومێیــە تێکدەکرانەوەو چاوەی پچوك‌پچوکیان پێ دروستدەکرا و دەبو بەپەنجەرە. مزگەوتــەکان تــا ئــەم دوایانــەش هیندێك لەم جــورە پــەنجەرانەیان پێوەمابو . ٢ــ ( سن . ) ئــەو دارە پچکولانانەن کە وەکو شێش لێــك و لوسیــان دەکــەن یــا بــە خــەرت دەیانگیــڕن و دەخرێنــە پشــتی کورسی و نێم‌تەخت ، ئێستا لەباتی ئەوانــە شــێشی مەعــدەنی (زەرد) ناوبەتاڵ بــەکاردێت . ★ ( مک . ) ئالات . ( سن.) ئالەتە .

**ئالەتاج ــ** [ ئال ؟ + ٣ــ ئە/٢ + تاج ] ، ( نت.) مــراوێکی ســپی خالخالی کێوییە ، پەلەیێکی سەوزی سێ سوچی لە توقەسەریە . تێبـ ــ بەقسەی ڕاوکەران چاکترین جسنی مراویانە و ئەو پەلە سەوزەی بــۆ بە تانج حیســاب دەکەن★ هەڵەتانج.

**ئالەتە ــ** ( نت . ) ، ( سن . ) تە : ٢ــ ئالەت .

**ئالەتەکێویلە ــ** [١ــ ئالەت+٣ــ

ئە/٢ + کێو + ئێلـە ] گیایەکە ، زیاتر لەدەم جۆگە و ڕۆباران دەڕوێ، گەڵای وەکو گەڵای ( شەدانە ) وایە و گوڵی مـۆرە و بەهێشـو ، تـامی توندوتێژە وەکو ئاڵەت ، بۆنیتوندە.

**ئاڵەفەڕەنگە ــ** [ = فەرەنسیٖ : ئالافرانك ــ بە شێوەی فەرەنگیٖ ] ، ( صت.) (مک. ، کئێر.) ١ــ کەسێکی خـۆی وەکو فەڕەنگییان لێکردبێ ، وەکو ئەوان جـل دە بەرکاو بژی و هەستانو ڕۆنیشتنی وەك ئەوان بێ. ٢ــ هەر شتێك یا کارێکی شێوەی فەڕەنگیٖ هەبێ:: جلی ئاڵە فەرەنگەی دە بەرکردوە . سەری ئاڵە فەرەنگە کردوە . ★ (کـعر.) ئەلمـۆدە . ( کئێـر.) فـەڕەنگیٖ مەعـاف ( = فەڕەنگیٖ مەئاب ) .

**ئـاڵەکۆك ــ** (نت.) گیـایەکی بەهارییە ، هـەر زۆ لە پەنـا ڕنوە بەفران سەر دەردێنێ ، لە شـنگ دەچێ ، بەڵام گەڵای پانترە و تۆکن، بستێك بەرز دەبێتەوە ، گـوڵێکی زەردی هەیە ، ڕەگی کەم لە زەویٖ دەچێتە خوار ، بنێکی خڕی هەیـە دەخـورێ . **تێب ــ** لـە فۆلکلـۆڕی کوردێدا لە زمان بەفرەوە ئاوا بـە ئاڵەکۆك کوتراوە : «ئاڵەکۆکەپرچنە، چۆڕ چۆڕەم کەوتە بنە ، چبکەم لەو مـاڵ و ژنـە . » ★ ئاڵەقـۆق ، هەڵەکۆك .

**ئاڵەم ــ** [ = عا : عالم ] ، ( نا.) تم : عالەم .

□ «بەرز بۆ بە ئاڵەم ساز بەدنامیٖ»
« دوشـــمن بـاوەران پێـش شادکامیٖ »
( خـانا ــ ٢٣٠ )

**ئـاڵیٖ ــ** ( صـ . ) ، ( مک . ) پیاوێکی گوێ لە مستی قسەی ژنی خۆی بێ ، حەزی لێ بـکا ، یا لێی بترسـێ . **تێبـ ــ** بەرامبـەر بـەم ووشەیە لە کۆیە (هۆمەر = عومەر) و ئەودوایانەش لە سلەیمانی ( یۆسف ) باوە ، جا ئەوەی کە بۆ ئەم مەبەستە هەر ناوی ( شەخس ) بە کار دێ ، دەمهێنێتە سەر ئـەم باوەڕە کـە ئەسڵی ئەم ووشەیەش ( عەلیٖ ) بێ . هس : ئارێلە .

**١ــ ئام ــ** ( نا. ) ، (زا.) برای باوکی کەسێك. ★ ئاپ ، ئاپۆ، ئامۆ مام ، مامۆ ، مامە ، هاپۆ . **تێبـ ــ** بە لای منەوە ئەم ووشەیە ( عمّ )ی عارەبییە .

**٢ ــ ( ئـام ــ )** ( پێب. ) تـم : ٢ ــ ( ئاو ــ ) .

**ئامادە ــ** ( صـ . ) حاڵی کەسێکی بۆ بەجێگەیاندنی کارێـك سـاز و حازربەدەست بێ . :: هەمو دەمێ ئـامـادەی خزمـەتم . دە خـۆتان ئامادەکەن تا بڕۆین،چونکو لە ناخافڵ دامان بە سـەر ماڵی شـێرکۆدا ، هیچیان ئامادە نەبو .

□ « یەکیٖوەن ، هەر وەخت نیشان ئامادەن »
« کێشا و بەر شیە و ، ئـەو نیشان دادەن »
( مەولەویٖ : مکب ــ ٤٦٤)

★ بەدەستەوە ، تـەیار ، حازر ، ساز .

**ئامادەبۆن ــ** (مصت . لا.) ساز و حلزربەدەست بـۆن بـۆ ڕاپەڕاندنی

فرمــان و جێبــەجێکردنی کــار و ئێش .

**ئامادەکردن ــ** ( مصت . مت . ) سازدان و حازرکردنی یــەکێك یان شــتێك بــۆ مەبەســتێك یــا بــۆ جێبــەجێکردنی فرمــانێك . :: نەرێمان خۆی ئامادەکردوە دەچێتە مەکتەب، خۆیان بۆ ڕاو ئامادەکردوە، لێژنــەی ئامــادەکردن ، ژوورەکــە ئامادەیە فەرموو .

**ئامادەیی ــ** ( حمص . ) ، (تە .)، ( کعر . ) ســازی و تــەیاری ، حازربەدەستی . :: ئامادەیی خۆی پێشان دا بۆ هاوکاری .

**ئامارات ــ** [ ئامار + ئات ( ئم. جمــع ) ] ( ؟ ) ، ( نت.) ، ( گەردی تورکیــا ، برادۆســت ) ئــامراز و کەلوپــەلی ســەنعاتێــك :: ئاماراتی دارتاشی . ئاماراتی خۆ بدە ئامۆری پێ چاکەم . هــس : ئامراز ، ئامێر .

**ئاماســان ــ** ( مص . لا. ) تە : ئاوسان .

**ئاماســیاگ ــ** ( نمف . لــە : ئاماسیان ) تم : ئاوساو .

**ئاماســیان ــ** ( مص . لا. ) ، ( جف . ) تم : ئاوسان .

**ئامال ــ** [ ٢ــ ئام + ٣ــ ئال ] ، [په : هەمەهل، هەمیمال] ، (صت.) ، ( مک . ) ١ــ هــاوتا ، هاوچەشن . ٢ــ بارە و ( حالێــك ) ، مەیلــە و ( شتێك ) :: ئــامال فەقیرە (فەقیر نیە ، بارە و فــەقیر هەلکەوتوە ) ، ئامالشێن ، ئامالسوور ( شــێن و سووری تەواو نین مەیلە و شــێن یا مەیلە و سوورن ) . هــس : ئاوال ، هاوال .

**١ــ ئامان ــ** [ سن : ئەوائیتی = هاتن، چوون . پە : ئامەتەن ] ، (مص. لا. ) ، ( هو . ) لە شوێنێکەوە خــۆ گەیاندنە جێگایەکیدی . ☐ « هەر وەزوور مەندەن ڕای ئامای نەفەس » « تای ڕێشــەی تاقەت شییەنم جــە دەس » ( مەولەوی : مکب ــ ٩ ) ★ هاتن . **ئامان و شیان ــ** (مص. لا.) ، ( هو . ) هاتن و چوون . هات و چۆ . ئاموشۆ .

**٢ــ ئامــان ــ** ( نا. ) ، ( بک . ، شن .، هل . ) قاپ و قاچاغی ناومال کە چێشتیان تێدەکری، بۆ خواردن. :: هەموویان لە ئامانێکیدا دەخۆن . **تێبـ ــ** ئەم ووشــەیە هەر بەم مەعنایە لە زمانی ئاسوری و کلدانیدا هەیە . ★ ئاوان . هــس : ( عــا ) أوانــی ( انــاء ) .

**٣ــ ئامان ــ** [ = عا : أمان ] ، ( نا. ) ١ــ بۆ داوای نەکردنی کارێك دەخرێتە سەرەتای ڕستەوە :: ئامان نەچن بەگژ مندالی خەلکیدا بچن . ٢ــ بۆ دەربڕینی بێزاری لە کاری یا شــتی :: ئــامان لــەدەس زولمی دەرەبەگ . ٣ــ بێزاری لە کەسێك :: لەدەستی ئەم مندالانەی وەئامان هاتوە. ٤ــ بۆ پەنابردنە بەرکەسی و داوای یارمــەتی لێکردنی :: قازی بەقوربانتبم ئامان لە دەســتی ئەم مێردە ڕزگارم کە . ٥ــ بۆ پاڕانەوە :: ئامان‌نەکەی ، بەئامان و زامن لە کۆلی نابێتەوە ★ ئەمــان ، پەنــا ، هانــا . ٦ ــ ( مەنگوڕایەتــی ) ناوە بۆ ئــافرەت ، وەك نیشــانەی

بێزاری لە منالی زۆر یا کچی زۆر .

**ئامانج ــ** ( نا.) ١ــ نیشانە ، مەبەست ، ویست ، ئاوات . **تێبـ ــ** ئەم ووشەیە لە لەهجەی بەکوریزا بۆ لەهجەی ناوەندی زمانی کوردی خوازراوەتەوە ، خۆی لە ئەسلا ( ئارمانج ) بوە و دەنگی (ر)یەکە زۆر زو سواوە و لە ناوچوە . لە فارسیدا بە دو شکلی (ئارمان) و(ئاماج) هەیە. لەپێشدا مانای ماددی ئەم ووشەیە ( نیشانە ) بوە کە دایان کردوە و ( تیر )یان هاویشتوە ، ئێستا لە کرمانجیدا هەم ئەو مانایەی هەیە و هەم بە ( نیشانە )ی مەعنەوی دەکوتری . ( تم : کف ــ ٤٩ ) ، بەلام لە لەهجەی ناوەندیدا لە باتی نیشانەی تیر و گوللە ، نیشانە و مەبەستی خەبات و تێکۆشانی بزوتنەوەی سیاسی دەگەیێنێ .

**ئامان خواستن ــ** [ ٣ــ ئامان + خواستن ] ، [ عا. کو. ] ، ( مصد . مت . ) داوا کردنی پەنا لە کەسێ ، داوای جێگا و ڕێگای خۆشاردنەوە کردن ، خۆخستنە پەنای یەکێ لە ترسان ( ترسی هەرچی و هەرکێ بێ ) .

**ئامان لە رزانە ــ** (نت.) هەوایەکی کلاسیکی گۆرانی کوردییە .

**ئامانەت ــ** [ = عا : امانة ] ، ( نا. ) ١ــ هەرچێکی لە لای کەسێك دابندرێ،بۆ هەلگرتن و پاراستنی و پاشانن لێی وەربگیرێتەوە . :: شێرکۆ پارەکانی بە ئامانەت لای سمکۆ داناوە . ئەوە لە کنە خۆی ئامانەتە چۆن دەستی لێدەدەی .

٢ــ هەر شتێکی بۆ کەلك لێ‌وەرگرتن بدرێ بە کەسێ و یەکجاری بۆ خۆی نەبێ . :: ئەم کتێبەم بە ئامانەت لە خەسرەو وەرگرتوە . قەلەمەکەتم تا سبەینێ بە ئامانەت بدەیە. ٣ــ ئاگا لێبوون و پاراستنی شتێك یا کەسێك و دورخستنەوەی لە دەردیسەری و زیان . :: ئامانەتی تۆ و مندالان ( ئاگات لێیان بێ ) ، ئامانەتت لێی بێ ( بیپارێزە با هیچی بە سەر نەیێ) . ● **((ئامانەت‌بەخوا))** خودات لەگەل ، خوا ئاگادارت بێ ، وەلامی مالاوایی و خواحافیزی کردنە. **(( ئامانەتی تۆ و ... ))** ئاگات لە ... بێ ، چاوەدێری بکە ، مەیەلە هیچی بە سەر بێ . **بە ئامانەت‌دان (دانان)** ( مصد . مت . ) ١ــ شتێك لە لای کەسێ دانان کە پاشان لێی وەربگیرێتەوە . ٢ــ ناشتنی مردوی شیعە لە شوێنێك تا لە هەلێکدا بگوازرێتەوە بۆ شوێنە پیرۆزەکان. **بە ئامانەت وەرگرتن** ( مصد . مت . ) خواستنەوەی شتێك لە کەسێ ، کە پاش مەیسەر کردنی کار و جێ‌بەجێ‌بونی مەبەست بیدرێتەوە. ★ ئەمانەت ( بۆ هەموی ) .

**ئامانەت بون ــ** [ عا . کو .] ، ( مصد . مت . ) ١ــ ئاگالێبون ، ئاگاداری کردن . ٢ــ پاراستن . ٣ــ چاولێبون ، چاوەدێری‌کردن . ٤ــ چاك هەلگرتن . ٥ــ وون‌نەکردن، نەفەوتاندن ★ ئەمانەت‌بون .

**ئامانەتی ــ** [ئامانەت + ٣ــ ئی] ، [عا. کو.] ، ١ــ ( حمصد.) دانانی شتێك لای‌کەسێ یا خواستنەوەی

لە کەسێ ، بۆ هەر مەبەستێ بـێ
٢ـ ( نا. ) ، ( مج . ) هەر چێکی
یەکێك لە یەکی تری داوا بـکا یـا
هەوالی بپرسێ ، ئێ خۆی بێ یا ئی
کابرا ، بەڵام تەیەوێ ئەوانەی گوێیان
لە قسەیە بزانن چیە . :: هاتوم بو
ئامانەتیەکە . برۆ لای شێرزاد بزانە
ئامانەتیەکەی چ لێـکردوە . کوێخا
دەیگوت ئامانەتیەکەی لایەتێ بـۆم
بنێرێتەوە . ★ ئەمانەتێ .

**ئاماوزێ ــ** [؟] ، (نا .) ، (سیم.)
مشەممایەکی تەنکە لـە کوردەوارێ
دەیکەن بۆ سەربرێن و کوانان. **تێب ــ**
ئەم ووشەیە تەنیا مامۆسـتا توفیق
وەهبێ نوسـتویە و لـە ووشەیێکی
کوردێ تەواو دەچێ ، مـن خـۆم
نەدەزانێ .

**ئامباز ــ** [ ٢ـ ئام + باز = بازۆ
( باسك ) ] ، ( نت.) کاری دوێ کەس
کە یەکتر لە باوەش کەن ، باسکیان
تێك‌بهاڵقێنن .

**ئامبازبـوون ــ** ( مصت . مت . )
ئاوالەکردنەوەی دەست و باسـك و
لە کەسێك‌وەرهێنانە ، بـە جۆرێك
دەستێ بە ژێر باسك و دەستێ بـە
سەرشانیدا لە تەختی پشتی کابرا
بگەنەوە یەك ، کابرای تریش هەر وا
دەکا . **تێب ــ** دوێ دۆست کە ماوەیەك
یەکتریان نەدیبێ ئامبازی یەك دەبن
یا دوێ‌کەس کە پێکەوە نیازی شەڕیان
هـەبێ .

**ئامپا ــ** [٢ـ ئام+پا (بەش) ] ،
( صـت . ) ، ( مکـ . ) جـوتێری
دەولەمەند و حالخۆش لـە دێهاتی
کوردسـتان . **تێبـ ــ** مەبەسـت
ئەوەیە کە ئەم جوتێرە دەولەمەندە
وەك هاوبەشی خاوەن ملك بێ وایە .

**ئامراز ــ** [ پە : ئەوبزار ]، ( نا.)
١ـ دەزگا ، یان مەکینە و شـتێکی
کە بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی کارێك کەلکی
لێ‌وەربگیرێ (چەقۆ، مشار ، ڕەندە،
قەلەم . . . ) :: قەلـەم و کاغەز و
مەرەکـەب ئـامرازی نوسـتێنن ،
ئوتۆمبێل و فڕۆکە ئامرازی باشن بۆ
سەفەر ، تفەنگ ئامرازی شەڕە .
٢ـ ئەدات (لە زمانەوانێ و ڕێزماندا)
:: پاشـبەند و پێشـبەند ئامرازی
داتاشێنی ووشەی تازەن لـە زمانی
کوردیـدا . ئـەلف‌وێن ئـامرازی
جەمعە . ٣ـ ( مج . ) هۆ . وەسیلە
:: ئیسـرائیل ئـامرازی دەسـتی
ئیمپریالیزمە . **تێبـ ــ** بەلای منەوە،
ووشەی ( هەوجاڕ ) شـکلێکی تری
ئەم ووشەیە . ★ ئەمراز .

**ئامڕاز ــ** [ ٢ـ ئام + ڕاز ] ،
(صتـ.) ، (هـو.) چلۆنایـەتی
کەسێکی ، لەبەر خۆشەویستی یا
ئەمێنێ لە کاروباری نهێنی یەکێ یا
کۆمەلێ ئاگاداربێ . مەحرەمی ڕاز
★ هاوڕاز .

**ئامشۆ ــ** (مصقت.) تم : ئاموشۆ .

**ئامك ــ** [ ١ـ ئـام + ئك ] ،
(نت.) خوشـکی بـاوکی کەسـێك
★ پور ، مێمك ، (بک.) مەت .

**ئاموشو ــ** [ ئام (لە : ١ـ ئامان)
+ و + شـۆ ( لە : شـیان) ] ،
(مصقت.) هاتن و چوون ، سەرلێدان ،
چونـەلا ، چونـە جێـکایەك
بەرێك‌وپێکێ . ★ ئامان و شیان ،
هات و چۆ . تم : ئام و شۆکردن .

**ئام و شۆکردن ــ** (مصد. لا.) ١ــ بە ڕێك‌وپێکی چوونە لای کەسێك ٢ــ هات‌وچۆکردنی جێگایەك یا کەسێك . ٣ــ سەر لە کەسێ یا شوێنێ دان :: قوباد ئێستا ئام‌وشۆی ماڵی خەسرەو ناکا . دەمێکە ئام و شۆیان پێکەوە نیە . ئام و شۆیان بکە ، نەکەی پێیان لێ ببڕی .

**ئام‌وشۆکەر ــ** ( نفا. ) ئەو کەسە ، یا هەموو ئەو کەسانەی بەڕێك‌وپێکی دەچنە شوێنێك یا سەر لە کەسێك و جێگایەك دەدەن. :: ماڵی فەرزندە ئام و شۆکەریان زۆرە . ئەم چاخانە ئام و شۆکەری نیە .

**ئامۆ ــ** [ ست. توئیریە ] [ ١ــ ئام + ئۆ (ئم : بگ.) ] ، ( نت. ) ، ( سن. ) تم : ١ ــ ئام تێبـ ــ ئەم ووشەیە هەر چەندە ئامرازی بانگهێشتنی بە دواوە نووساوە ، بەڵام هەر مانای ( مام ) دەدا ، مردۆخ بە هاوتای (مامۆ)ی داناوە (تم : مخ. ج٢ ، لـ٦٣٠) .

**ئامۆزا ــ** [ست : تو ئیریۆ پوتهرە (کوڕی مام)، توئیریە دوغدەر (کچی مام)]، (نت.) کوڕ یا کچی برای باوکی کەسێك ، منداڵی مام . :: مامۆزا (هل.) بنعام . ( بک.) پسمام ، دۆتمام . ( جنو.) ئاموزا . تێبـ ــ دەنگی ( ز )ی ئەم ووشەیە تۆزێ تێژە و لە نێوان ( ز ) و ( ظ )ی عارەبی‌دایە .

**ئامۆزازا ــ** [ ئامۆزا + زا ] ، (نت.) کوڕ یا کچی ئامۆزای کەسێك ★ بنامۆزا .

**ئامۆژگاری ــ** [ ئا ــ مۆژ ( ڕی . فع . ) + گار = کار + ٢ ــ ئی ] ، [ پە : ئاموژاکاریە ] ، ( نت . ) ١ــ نەسیحەت ( بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی ) ، ٢ــ تەعلیمات ( بۆ کاری سیاسی ، ئیدارە و ... ) :: ئەوەندی ئامۆژگاری دەکەن هەروەك خۆیەتی ، هێند لاسارە ئامۆژگاری کەسێ بەگوێدا ناچێ . تێبـ ــ ئەم ووشەیە لەڕێشەی فیعلێکی کۆنی کوردی ( ئا ــ موژ . مۆچ . ) وەرگیراوە کە ئێستا خۆی لەبیرچۆتەوە و ڕەگەکەی لە چەند ووشەیێکی تریشدا ( دەستەمۆ ، نامۆیی ) دەبیندرێ . ب) لە زمانی فارسیدا سێ مەصدەری : ئاموزانیدەن ، ئامۆزیدەن و ئاموختەن هەر لەو کۆنە فیعلە ماوەتەوە ، بەرامبەر بەم ووشەیەی کوردیش ( ئاموزگاری ) هەیە ، کە (حمص . )ە و مەعنای ئێستای ( مامۆستای قوتابخانەی ئیبتیدایی )یە ، جا وەکو دەبینین لە کوردیدا مەعنای ئەم ووشەیە لە جەوهەرا جۆرە ( فێرکردن )ێکی تێدایە بەڵام پێوەندی بە دەرس و خوێندنەوە نیە . ★ ئامۆژیاری ، مۆچ ، مۆچاری ، مۆچیاری ، مۆژگاری .

**ئامۆژگاری کردن ــ** (مصد. مت.) نەسیحەت‌کردن ، دەرس‌دادان قسەوەبەرنان ( تەلقین ) .

**ئامۆژن ــ** [ ئامۆ + ژن ] ، (نت.)

ژنی برای باوکی کەسێ ، براژنی باوك . ★ ( بک . ) ژنمام ، مامۆژن .
**ئامۆژیاری** ـ (نت.) ، (سنـ.) تم : ئامۆژگاری .
**ئامۆر** ـ [ ؟ ] ، ( نا . ) ، (مک .) یەکێکە لە دوو پارچە گەورەکانی ئامرازی ( جووت ) لە کوردستان. ★ ئێرەقە ، هەوجاڕ . تێبـ . ئەم ئامرازە لە دارێکی درێژی ڕاست ( باسك ـ یا ـ باسکێش ) ، کە کوتەرەدارێکی ڕەختە و سەختی ( دەندە ) بە سەرەوەیە و گاسنی دەخرێتە سەر ، دروست کراوە . دارێکی بارێکتر ( پاشبارە ) بە قیتی دە دەندە کوتراوە و ئەمیش دەسکێکی پچووکی ( دەستەدوو ، دەستوو ) ڕێ دەخرێ .
**ئامۆر ڕژدە** ـ (مک .) قیت بەستراوە بە (نێر)ەوە و تەنیا نوکی گاسن عەرز دەگرێ و باشی ناکێڵێ. **ئامۆرماڵە** ـ ( مک . ) شل و شەوێق لە نێر بەستراوە و گاسن زۆر لە زەوی دەچێتە خوار و قونی دەندە لە زەوی دەخشێ .
**ئامە** ـ [ئام + ٢ـ ئامە/١] ،[؟]، ( نت . ) ، ( سنـ . ) دایك . ( تم : مخ . جا ، لـ٢٢ ) .
**ئامەد** ـ ( نا . ) ، ( سنـ . ) بەخت ، ئیقبال ، هات ، شانس . تێبـ ـ ئەم ووشەیە لە ( موکریان ) دوو شێوەی ( ئامەت ) و ( هامەت )ی وەرگرتوە و لە قالبی ( دەرامەت ) و (نەهامەتی)دا دەبینـدرێ ، بەڵام بە تەنیایی بە کار نەهاتوە .
**ئامیار** ـ [ ٢ـ ئام + یـار ] ، ( نت . ) ، ( هو . ) ئاواڵ ، ڕەفیق ، هاوڕێ □ « چون بەی تەوردەوڵەت ئامیارتەن + ستارەت سەعدەن فەلەك یارتەن » ( خانا ـ ٢٦٥ ) .
**ئامیان** ـ [ ؟ ] ، (نا .) ، (سنـ. ، هو . ) تم : ئامێژەن/٢ .
**ئامێتە** ـ [ پهـ : ئامێختەك ] ، (صمف .) ١ـ تێکەڵاو. ٢ـ چلۆنایەتی ماددەیەك کە لە تێکەڵکردنی دوو شتی هاوچەشن پێکهاتبێ . ∴ نانی هەژاران ئامێتەیە ( لە ئاردی گەنم و جۆیە) . □ « دەردم ئامێتەی دەردی فەرهادە + منیش چون فەرهاد ڕەنجم بە بادە » (فۆلکلۆر) . «باوەس باڵێنم سێڵا و هون بو + ئامێتەی زوخاو دێك دەروون بۆ » (مەولەوی : مکبـ ، ل ـ ٤ ) . ★ ئاوێتە .
**ئامێتەبوون** ـ ( مصت . لا . ) تێکەڵاوبوونی دووشت لە خۆیانەوە .
**ئامێتەکردن** ـ ( مصت . مت . ) تێکەڵکردنی دوو ماددە .
**ئامێر** ـ [ ؟ ] ، (نا.) ، (هلـ.) تم : ئامراز □ « ... وەکو کەلوپەل و پێویستی ماڵ و لەبەرکردن و ڕازاندنەوە و ئامێری بەرهەم دەرهێنەر و ... هتد » ( سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە : نەقابەی مامۆستایان ـ لقی هەولێر، ل ـ ١١ ) هس : ئامۆر ، ئامارات .
**ئامێز** ـ [ ؟ ] ، ( نا . ) ، (مک .) تم : باوەش . ∴ ئەو چنارە هێندە ئەستورە ئامێزی تێ وەرنایە .
**ئامێژەن** ـ ١ـ ( صـ . ) ، (مک . ، سیم . ) تم : ئامێتە . ٢ـ ( نا. ) ، (سنـ .) هەوێنی پەنێر . ★ ئامیان . فرێشك ( تم : مخ . جـ ٢ لـ٢٥٢) .

**ئامێژەن کردن ــ** ( مصد . مت . ) تێکەڵاو یا تەرکیب‌کردنی دوو جۆر لە ماددەیەك یا چەند ماددەی لێك جیاواز . :: ئاردەکەمان دوو بە یەك لەگەڵ جۆ ئامێژەن‌کرد . ئەم ئاڵتونە دەو و دوودەگەڵ مس ئامێژەن‌کراوە.

**ئامین ــ** [ = عا ، لەعیبری وەرگیراوە ] ووشەیەکە پاش دوعا و پاڕانەوە لە خوا ، دەیڵێن مانای : دوعاکە قبووڵ کە ، مەبەستەکە پێك بێنە ، یا وا بێ . تێب ــ ئەم ووشەیە دەگەڵ ئیسلامەتی هاتوتە ناو زمانی کوردییەوە و بە شێوەیێکی تایبەتی پاش خوێندنی ( فاتیحا ) دەکوترێ ، مەسیحییەکانیش پاش نوێژ و دوعای خۆیان ( ئامین ) دەڵێن .

**١ــ ئان ــ** ( ئم. ) ١ــ ئامرازی کردنەسەرپشکی یەکێکە لە بەینی دوو کاراندا ، دوو شتاندا . :: ئان دانیشە ئان بڕۆ ، ئان دوو ڕۆژ ئان سێ ڕۆژت زیاتر پێ نەچێ . ٢ــ ئامرازی شەرتە . :: ئان بە گژیدا مەچۆ ، ئان کە بە گژیدا دەچی تێیدا مەیەڵەوە . ٣ــ ئامرازی گومان و دوو دڵییە لە کارێك . :: ئان ئەم کابرایە بێ ئاقڵە، ئان تۆ لێت تێکچوە . ئان ئەوەی دیوتە بەراز نەبوون ، ئان نابێ صەت بەراز بوبن. ٤ــ ئامرازی پێشاندانی ڕێگای جیاجیایە بۆ پێکهاتن و جێبەجی‌کردنی کار و مەبەستێك . :: ئەشکەوتەکەی ( زەرزی ) هێندە بەرزە ، ئان دەبێ بە پەیژە بۆی سەرکەوی ، ئان بە گوریس هەڵت‌کێشن . ★ یا ، یان . تێب ــ جیاکردنەوەی ئەو کارانەی بەم ( ووشە )بە پێکدێن ، ڕێگای ئەوە ناگرێ کە خاسیەتێکی موشتەرەك لە هەمواندا بەدی بکرێ .

**٢ــ ( ئان ) ــ** [ پە : ئان ] ، (ئم.) ١ــ پاشبەندی جەمعە بۆ ناوان :: ترکان ، کوردان ، عەجەمان، چاوانی دەردێنم . □ « سوریلەی خورتلە هەرمێیانێش دەخوا و درۆیانێش دەکا .» ★ گەل ، (ـئێل)، یەل. ٢ــ بە دوای ئەو ناوانەوە دەنوسێ کە کات پێشان دەدەن . :: ئێواران ، بەیانیان، بەرە جێژنان ، بەهاران ، خەرمانان، ڕۆژان، نوێژی خەوتنان. ٣ــ بە دوای جێگاوە دەنوسێ :: ئێران ، بەرانان ( شاخێکە نیزیکی سلەیمانی ) ، دیلمان ، سێدەکان ، سەرقەبران، شۆڕان،لەندی شێخان ( شاخێکە لە کوردستانی ئێران ) . ٤ــ نیشانەی درێژخایێنی کارێکە :: گەلاڕێزان ، مێوەگەنان . ٥ــ پاشبەندی صفەتی فاعیلیە . :: ڕەوان ، پەشێمان ، نیگەران ، هەڵەداوان . ٦ــ نیشانەی ئاهەنگ و جەژنە . :: خەتەنەسوران ، خەنەبەندان . ٧ــ بە دوای صفەتەوە دەنوسێ و دەیکا بە ناو . :: ئەستوران ، بارێکان ، نەرمان ، سورکان ، ڕاستان .

**٣ــ ئان ــ** [ = عا : آن ] ، (نا.) دەم ، کات ، زەمانێکی کورت ، وەختێکی کەم . □ « بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تێغی دوژمنتان » «هەموو ئان و زەمانێ عەینی قەڵغان و

ســوپەرتانە » ( ئـەحمەد موختــار جاف ) .

**ئانقەســـت** ــ [ عــا . ] تمــ : ئەنقەست .

**( ــ ئانە )** ــ [ ٢ــ ئان/١ + ٥ــ ئـە/١] ، ( پبـ. ) ١ــ بـــە دوای ( ناو ) و ( صفەت )ەوە دەنوسیٚ و دەیانکا بە (قەید) و مانای ( جۆری ، بە شێوەی ، وەکو ، وێنەی ، لــە کاتیٚ و لە وەختیٚ ) یان لیٚ زیاد دەکا. :: ئازایانە ، پالەوانانە ، پیاوانە ، مەردانە ، مەستانە . ٢ــ بە دوای ناوەوە دەنوسیٚ و ناوێکی تازەی لیٚ دروست دەکا ، بۆ ( کریٚ ) و هەقی ئیش و ... کە بدریٚ بە کەسیٚ . :: جێژنانــە ، رۆژانە ( .هــەقی کاری رۆژێکی کرێکار ) ، سەرقەڵەمانە ، مانگانە ( مەعاشی مانگێکی کەسیٚ ) ، کاڵەدڕانە . ٣ــ بە دوای ( ناو )ەوە دەلکیٚ و دەیکا بــە ناوێکی تازە بــۆ کۆمــەڵیٚ لــەو بــاج و پیتاکانــەی دەرەبەگەکانی کوردستان لــە جوت بەندە و مسکینانی دەســتێنن . :: پۆشانە، رۆنانە ، سوارانە، فرۆجانە، مڵکانە . ٤ــ بــە دوای ( نــاو )ەوە دەلکیٚ و دەیکا بە ( صــفەت ) . :: ئازایانە ، پیاوانە . تێبـ ــ فەرقی ( قەید ) و (صفەت) کە بەم پاشبەندە دروست دەبن بەندە بە جێگــەی دە کارکردنی ووشە تازەکەوە .

**١ــ ( ــ ئــانیٚ )** ــ ( ئمــ . ) ، (سیە .) ، ١ــ ئامرازی زەرف تەواو دەکا و (ناو) دەکەوێتە نێوانی هەردوو کەرتی ئامرازەکە . :: لە ماڵەوانیٚ بوم . لــە ژوورەوانیٚ دانیشــتبو .

٢ــ بــۆ تەحدید بــە کــار دێت :: ئەوەتانیٚ ، کامــەتانیٚ ؟ دێتەوانیٚ ، رۆیشتەوانیٚ، وەرە ژوورەوانیٚ ، برۆ دەرەوانیٚ تەماشای ئاسمان بکە .

**٢ــ ( ــ ئانیٚ )** ــ ( پبـ . ) (هل . ) تم : ئێن :: تۆپانیٚ جگانیٚ .

**( ــ ئانیٚ )** ــ ( پبـ .) ١ــ بە دوای ناوەوە دەلکیٚ و دەیکا بە صفەت . :: ژنانیٚ ( پیاوی ئاکار ژنانە ) ، سەگانیٚ ( وەکو ســەگ زێرەك ) ، ماینــانیٚ ( سەروشکڵی وەکو ماین ) . ٢ــ بە دوای هەندیٚ صفەتدا دیٚ و دەیکا بە ناو :: ووشکانیٚ ، ئاوانیٚ .

**ئانیسك** ــ ( نــا . ) ، ( مک . ) حالەتێکی وەکو نزگەرەیە بــە ســەر ئینســاندا دێت :: کوڕە بەس بکریٚ ، سەرت بە ئانیسکانەوە هەڵقەندرا؟ . تێبـ ــ أ ) لە ئەنجامی گریانی زۆر بە کوڵ و تاو ، هاتوچۆی هەناسە لە سەر دۆخی خۆی نامێنیٚ و زیاتر لە پێویست ، هەوا دەچێتە دەروونەوە و کەمتر دێتە دەر ، ئەوەش کــە دێتە دەر تەووژمی زۆرە و بەرەنگاری ئەو هەوایە دەبێت کە دەچێتە ژوور و پیاو ئەم حالەی بە سەردا دیٚ ، فەرقی دەگەڵ ( نزگەرە ) ئەوەیە کە (نزگەرە) هۆیەکی ئاشکرای نیە بەڵام ئەمە لە گریانەوە پەیدا دەبیٚ . ب) لە هەندیٚ فەرهەنگی کوردیدا ، بە غەڵەت ، ئەم ووشەیە بــە ( ئانیشك ) مەعــنا لێدراوەتەوە . هــس : نزگــەرە . نێسکە ( سەر هەڵتەکاندنی ئەسپی شۆخ ) . ★ بەرەنیسك .

**ئانیشك** ــ (نا.) ١ــ ئەو جمکەیە کــە باســـك و قــۆڵی ئــادەمیزاد

تێکدەکاتەوە ، ئەو شوێنەی دەستی ئادەمیزادی لێ دەنوشتێتەوە ٢ــ ئەو شوێنەی لە قۆلی کەوا و چاکەت و ... دا دەکەوێتە بەرامبەر ئانیشکی دەست . :: ئانیشکی چۆغەکەی پینەی لێدراوە. ★ (بکە .) ئەنیشک، عەنیشک .

**ئانیشکە** ــ [ ئانیشک + ە ــ ئە/١ ] ، ( نت . ) ١ــ ( مک . سیم ) لوولە و گونج بە شکڵی زاویەی قایمە یا کەوانە ، لەسەر سوچی لوولە زۆپا یا گۆنگەی ئاو و ئەو جۆرە شتانەدا ــ بۆ ئەوەی سەری بۆ لایەکی تر وەرچەرخێنن ــ بە کار دەبرێ . ٢ــ (سیم .) ئامرازی ئاشە ، دارێکی دوو لکە بە ( خوانکە )ی ئاشەوە ، پێی ئاش بەرز و نزم دەکاتەوە ( تم : خا : ج ١ ، ل ــ ٥٩ ) ★ ( مک . ) دانوپۆ.

**١ــ ئاو** ــ [ ست . ، پە : ئاپ ] ، ( نا . ) ١ــ ماددەیێکی شلی بێ بۆنی، بێ تام و ڕەنگە ، زۆری لە شوێنێکدا کۆبێتەوە شین دەنوێنێ. لە بەشێك ( ئۆکسیژێن ) و دوو بەش (هیدرۆژێن) پێکهاتوە ، لە ١٠٠ دەرەجە گەرمایێدا دەکوڵێ و دەبێتە هەڵم و لە دەرەجەی (٠)دا دەیبەستێ . سێ بەشی زۆی زەوی ئاو داپۆشیوە و لە(هەوا)شدا بە شێوەی (هەڵم) هەیە و کە هەوای سارد کرد دەبێتە باران و بەفر و تەرزە و دێتەوە خوار . ژیانی ئادەمیزاد و گیاندارانی تری سەرزەوی بە ئاوبەندە ، گەلێ شتی وەکوو ( خوێ ، شەکر ، ... ) لە خۆیا دەتوێنێتەوە . ئەو ئاوەی بە ڕووبار و چۆم و کانیاواندا دێ گەلێ ماددەی تێدا تواوەتەوە و تۆز و خۆڵێکی لە هەوادا هەیە تێکەڵی بوە، هەر وەها میکرۆبێشی تێدایە ، بۆیە لەوانەیە خواردنەوەی ، پیاو تووشی گەلێ ئازار و نەخۆشی بکا . ئاوی خواردنەوە دەبێ بپاڵێورێ و بە دەرمانی تایبەتی میکرۆبە خراپەکانی بفەوتێنرێ ★ ( بکە . ) ئاف . ٢ــ شیرەی هەندێك میوە و سەوزێجات . :: ئاوی ترێ . ئاوی شووتی تووتن خۆش دەکا . ئاوی گێزەر بۆ حوکمی چاو باشە . ئاوی پڕتەقاڵ . نەختێك ئاوی هەنار بگرن . □ « بە گڵی سپی و ئاوی ترێ » « دۆشاوی شیرنت چۆن بۆ دەکرێ » ( مەلا . ) ٣ــ فرمێسك . :: چاوی پڕ بوو لە ئاو . پیوازپاکردن ئاو لە چاو دێنێ . ٤ــ ئارەقەی لەش . :: لە عەیبەتان ( هەیبەت ) هەموو لەشی وەسەر ئاو کەوت . هێند گەرمایە پیاو هەموو گیانی دەبێ بە ئاو ★ ١ــ ئارەق . ٥ــ ( مج . ) بریقە و درەوشانەوەی جەواهێرات ( ئەڵماس ، پیرۆزە ، یاقوت ... ) □ « ئەو گەوهەری نیکتەی کە لە نالی دەدزن خەڵق » « ئاوی نیە وەك ئاگری بێ شەوقی دزانە » ( نالی : گم ــ ٥٤ ) . ★ ١ــ ئاب. ٦ــ تۆوی ئادەمیزاد و ئەو گیاندارانەی بەچکەی خۆیان بە شیری مەمکیان بەخێو دەکەن . :: ئاوی هاتەوە ★ ( مک . ) شاوەت ( = عا : شهوة ) **ئاو بە ئاگرداکردن** ــ (مصت . مت .) ، (کن .) کوژاندنەوەی فیتنە و شەڕوشۆڕ . **ئاو بە خۆدا**

**کردن ـ** ( مصت . مت . ) ١ـ خـۆ شوشتنی بە پەلە ، بـۆ دەرکردنی ماندوێتی لەش و ڕزگاربوون لە گەرما و ئارەقە و . . . ٢ـ غوسلی شـەرعی بەجێهێنـان ، خـۆپاکردنەوە لـە لەشپیسی ، بەو جۆرەی شەریعەتی ئیسلام دایناوە . **ئاوبەسەرکشان ـ** ( مصت . لا. ) ١ـ وونبوونی زەوی و زار و هەر شتێکی تر لە ژێر ئاوا . :: بەسـتێنی چـۆمی مـەهابات ، بەهاران ئاوی بەسـەر دەکشـێ . ٢ـ خنکانی کەسێك یـا نوقم بوونی شتێك کە لە ناو ئاودا بێ و لـە پڕ ئاوەکە لەبەر هەرچی بێ ، تێکیەوە پێچێ و ببیا . **ئاو دە ئاوە ڕۆکردن ـ** (کن . ) لە ئەندازە بەدەر خراپە کردن، لە ئەندازە تێپەڕاندن . **ئاو دەگونان گەڕان ـ** ( کن . ) بـالقبوونی کوڕ ، شـەیتان پێـکەنین ، گەیشـتنە ئەو تەمەنەی کە هەسـتی پیـاوەتی دەبـزوێ . :: ئـەم کوڕە هــەر قیتەقیتێتی ، وەك ئاوی دە گونان گەڕابێ وایە . **ئاو لە ئاوەڕۆبڕان ـ** ( کن . ) ١ـ ئیشكبوون و لە جاری بوون کەوتنی ئاو . ٢ـ کوێر بوونەوەی سەرچاوەی قازانج و سوودی کارێك، بڕانی خێروبێر . **ئاولەبەردڵڕۆیین ـ** ١ـ دڵ دەخێلەکەوە هاتن و لە حالی ڕشانـەوەدا بـوون . ٢ـ (کنـ.) برسێتی زۆر ، زۆر برسی بوون . **ئاولەبەرهەڵنیشتن ـ** (مک.) مێـز دە بنەخۆ کردنی منداڵ :: ئەم منالە ئاوی لەبەر هەڵنیشتوە . **ئاولەجێ مالی (کەسـێ)نان ـ** ( کنـ . ) ١ـ وێرانکـردنی مـالی کەسـێ

( تەختکردنی جێ مالەکەی ، کە بکرێتە کێڵگە و ئاوی لێ بندرێ تا ئامادەبـێ بۆ کێـلان . ٢ـ تۆشی بەڵاکردنی کەسێك بە جۆرێ وەکو مالی وێرانی وابێ . **ئاو لەدەسکاوونگا کوتان ـ** (کن.) ، (مک.) تم : ئاو لە دینگا کوتان . **ئاو لەدەمزان ـ** (کن.) تم : ئاو لەدەم گەڕان . **ئاو لە دەم گەڕان ـ** (مصت. لا.) ١ـ ئاوکەوتنە زار ، لەبەر خواردنی شتێکی ترش یا چاو پێـکەوتنی کەسێ کە شتی ترش دەخـوا یا باسـکردنی شتی ترش . ٢ـ ئیشتیا چوونە خوارْدنێك، حەز لەشتێ کردن . **ئـاو لە دینگا (دینگدا) کوتـان ـ** (کن.) کـردنی کارێ کە کەڵکی نـەبێ . **ئـاو لێ (لەکارێ) نەخواردنـەوە ـ** (کنـ.) دەستنەگێڕانەوە و خۆ نەپاراستن لە کردنی کارێك :: تۆ بڵەی دەست بەسـەر پۆلەکانیدا بگـرێ ؟ ئەرێ وەڵڵا ئاوی لێناخواتەوە . **ئاو ـ و ـ ئاو چوون ـ** (کن.) تۆك و نەفرینە لە کەسێك دەکرێ ● « ڕەببی ئاوـوـ ئاوچێ » تۆشی بەڵایەك بێ ڕزگاری لە دوا نەبێ . تێبـ ـ بەو مانایە : ئاوێك ( ڕۆبارێك ) لە پێشدا ببیا کە خـۆی هاتەبڕانـەوە فڕێیداتـە ئاوێکی دیکەوە تا ببیا ، هەر بەو جۆرە لـە ئاوێکەوە بـۆ ئاوێك . **ئاوی ئامـۆن چێ ـ** (کن.) تـۆك و نەفرینە : بڕوا و نەیەتەوە ، چوونی بێ هاتنەوەی نەبێ . تێبـ ـ أ ) ئامۆن نـاوی چەمێکە لـە ئاسیای ناوەندی ( تم : هبێد ، لـ٢ ) . ب ) « چەمێـکە بە قەراغ شـاری

(خـوارەزم)دا دەڕوا و لـە نێـوان تورکستان و خوراسـان دایە » ، ( بوڕهان : عەبباسی ، ل‍ـ٥٢ ) . ج ) دوکتۆر معین لـە باتی ئامۆن ( ئامۆی ، ئامۆیـە ، ئامۆ دەریا ) دەڵێ و بـە چەمی ( جەیحۆن )ی دادەنێ کە لە باکوری خوراسانەوە بە دەشتی ( ئامـۆی )دا دەڕوا . (معین : فەرهەنگ ، ج ٥ ، ل‍ـ٦١).

**ئاوی بابەقەتـار ــ** (نت.) ، (مک.) ئاوی کانییەکە لە موکریان ، خەڵك لایان وایە خواردنـەوەی کۆخە و کۆخەڕەشە چـاك دەکاتەوە و لـە هەمـۆ لایێـکەوە بـۆی دەچـن و دەیهێنن . تێبـ ــ بابەقەتار خۆی (چاك)ێـکە لـە دێی (خوراسـانە) ٢٠/٣٠ کیلۆمەتر دۆر دەکەوێتەوە ڕۆژهـەڵاتی ( مەهابـــات ) و کانیاوەکە نێزیکی ئەم (شەخس)ەیە.

**ئاوی بێ لفاو خواردنەوە ــ** (کن.) کاران بە ئارەزۆی دڵی خۆکردن و گوێنەدانە هیچ کەس و هیچ شتێ . :: وادیـارە ئـاوی بـێ لفـاوی خواردۆتـەوە ، وەڵـڵا بەسەریەوە ناچێ .

**ئاویچاو ــ** (نت.) ، (کن.) تم : ١ــ ئاو/٣ .

**ئاوی چاو دان ــ** (کن.) ، ١ــ ڕۆنکردنەوە و زاخاو دانی چاو بە تەماشای شتی جوان ( ئافـرەت ، دیمـەن ، .... ) ٢ــ تم : ئاوی چاوسەندن .

**ئاوی چاو داهاتــن ــ** (کن.) کوێربۆن ، کەمبۆنی بینایی . :: هێندە چاوی بە کتێباندا چـڕ داگرتوە وەختـە ئـاوی چـاوی دابـێ .

**ئـاوی چاوسەندن ــ** (مصت. مت.) ، (کن.)، (سیم.) ترسـاندن و تۆقانـدن ، تـرس وەبـەر کەسـێك نـان ، چاوترسـێن کـردن . ★ ئـاوی چـاودان/٢ ، (سنـ.) ئـاوی چاوسەنن .

**ئاوی حەیات ــ** (نت.) ١ــ لە چیرۆکاندا گوتراوە : ئاوێکە هەرکەس لێی بخواتەوە نامـرێ .
□ « دەچمە سەر کێـوی ئاتێ ، دێنم ئاوی حەیاتێ » . ٢ــ (کن.) لێوی دڵدار (لە شیعر و ئەدەبیاتدا)
□ « ئـاوی حەیاتـە ئاتەشـی
ئەفسوردەیێ دەمت »
« تەحرێـکی تۆیە ، گـڕ ، لە
تەنۆرێش کە دێتەدەر »
(سالم : گم . ل‍ـ٦٧)

تێبـ ــ وا بـاس دەکـرێ کە ( خدر )ی پێغەمبـەر لەم ئـاوەی خواردۆتـەوە و بۆیـەش لـە کوردەوارێدا ناوی بۆتە ( خـدری زیندە) . (ئەسکەندەر)ێش بە دوای ئەم ئاوەدا ــ کە گۆیا لە مەڵبەندێکی تارێـکی دنیـادایە ( ؟ ) و نـاوی تارێکسـتان ( ظلمـــات )ە ــ هەڵوەدابوە .

**ئاوی دەم ــ** (نتـ.) لیك ، لیکاو .

**ئاویڕەش ــ** (نت.) ماکەی دەردێکە کە چاو کوێردەکا .

**ئاویڕەش داهاتــن** ( مصت. لا. ) پەیدابـۆنی ئاوی ڕەش لـە چاو ، کوێربۆن.

**ئاوی زمزم ــ** (نت.) ئاوێکە حاجیان لە ( مەککە )ڕا بۆ متفەڕك دەگەڵ خۆیانی دێنن .

**ئاوی سپی ــ** (نت.) تم : ئاوی مرواری .

**ئـاوی شەو ــ** (نت.) ١ــ ئاوێکە لە سەری شەوەوە دە گۆزە کـرابێ ، تا بۆ بەیانی سارد ببێ . ٢ــ (کن.) شتێ

که هیچ مایەی تێ نەچێ □ « لە ئاوی شەوێ پارێز دەکا » . تێب ـ لە ئیسلامەتیدا ئەوانەی هەر خەریکی عیبادەتن ، نەفسی خۆیان دەمرێنن و هەوڵ دەدەن هەرچی نەفسیان ئیشتیبای چۆیە ، نەیخۆن و نەیخۆنەوە و نەیکەن . جا ئاوی شەو لەبەر ئەوەی سارد و خۆشە و نەفس ئارەزۆی دەکا ، ئەم قسەیەی سەرەوەی لە فۆلکلۆری کوردیدا هێناوەتەدێ . **ئاوی عەینەمەل ـ** (نت.) ، (سیم.) ئاوێکە گۆیا باڵندەی عەینەمەل ( خەزایێ ) حەزی لێدەکا و بە دوایدا دێت . تێب ـ ا ) نازانم ئەم تەرکیبە (عين الأمل)ی عارەبییە یا تەرکیبێکی کوردێ و عارەبییە بە مانای ئاوی ( کانی = عەین + مەل = باڵندە ) یا خۆ هەر هیچیان نیە و وشەیێکی کوردییە و جەڕاوە . ب ) لە هەندێ شوێنی کوردستان کاتێ کوللە زۆر دەبێ و ترسی ئەوە دەکرێ کە زیان بە دەغڵان بگەیێنێ ، یەکێك ـ کە دەبێ هەندێ صفەتی تێدابێ ـ دەنێرن لە کانییەکێ کە هیچ کەس نازانێ لە کەنگێوە دەست نیشان کراوە ئاو بێنێ ، باوەڕیان وایە کە باڵندەی خەزایێ بە دوای ئەم ئاوەدا دێن و کوللەکان دەخۆن. **ئاوی قاچداهاتن ـ** (کن.) زۆر ماندۆ بۆن . ∴ ئەوەندە بە پێوە ڕاوەستاوە ئاوی قاچی داهاتوە . ئەوە چۆن ئاوی قاچی دانایە . **ئاوی گەرم لە ژێر (لەبەر) ڕۆییشتن ـ** (کن.) مێز بەخۆدا کردن ، مێز دەبنەخۆ کردن . □ « سەری وە بن کڵاوی کەوتوە ، ئاوی گەرمی لە ژێر دەڕوا » **ئاوی مرواری ـ** (نت.) یەکێکە لە نەخۆشیەکانی چاو ، تانەیێکی بۆرباو بە سەر چاوا دەکشێ و بێنایێ کەم دەکاتەوە ، یا هەر دەیفەوتێنی و پیاو کوێر دەکا . تێب ـ ئەم نەخۆشییە لەو بەشەی چاو دەدا کە لە پشتەوەی ڕەشکێنەیە و کاری زەڕرەبێنێکی بەروپشت زەق ( عدسة محدّبة ) دەکا و تیشکی نۆر لە سەری دەشکێتەوە و دەدرێ بە شەبەکەی چاو ، ئەم جێگایەی چاو ئاوێکی تێدایە کە بە زمانی عیلمێ ( ئاوی شۆشەیێ ) ناوە ، لە نەخۆشی مرواریدا ئەم ئاوە ڕەنگی لێڵ دەبێ ، وەکو ڕەنگی سەهۆڵ یا ( مرواری ) لێدێ . **بۆن بە ئاو ـ** (کن.) بە خۆدا شکانەوە ، خەجاڵەت بۆنەوە ، تەرێق بۆنەوە . ∴ وەختێ درۆکانی سۆربۆنەوە ، هەر بۆ بە ئاو . قسەی وای دەکرد پیاو دەبۆ بە ئاو . **بە ئاودا دان ـ** ( کن. ) بەتلاندن ، زایەکردن ، فەوتاندن ، لە دەستدەرکردن . **بە حەوت ئاو پاك نەبۆنەوە ـ** (کن.) زۆرپیسبۆن گلاوێدەرنەچۆن . **لە ئاودان** (مصت. لا.) لە چەم و ڕۆباران پەڕینەوە . □ « سیروان لێشت نەدەم هەر دەمبەی ؟ » ، « لە حەوت ئاوی داوە ، قولاپەی تەڕ نەبوە » ، (کن.) زۆر فێڵباز و زرینکە .

**٢ـ ( ئاو ـ ) ـ** (پێب.) لە

هەندێ ناوچــەی کوردســتان بـۆ نیشـاندانی شەریکایەتی دوٚ یا چەند کەس لە کارێکا ، لــە شتێکا ، یا وەك یەکێ ئەنــدازە و شێوەی دوٚ یا چەنـد شت ، دەخرێتە ســەر وشەی مەبەست . :: ئاودەنگی ، ئاودامان ، ئاومـاڵ . ★ ئاف ، ٢ــ ئام ، هام ، هاو ، هەو ، ئەو . (بکـ.) هاف ، هەڤ .

**٣ــ ( ــ ئاو ) ــ** (ئم.) ئامرازی دروستکردنی ئیســمی مەفعوله ، لە سیغەی رابوردوی سێیەم کەسی تاك کە فاعیلی دیار نەبێ ( المبنـی للمجهـول ) . :: بـڕاو ، پچـڕاو ، خوراو ، دڕاو ، دڕێندراو ، شکاو ، شکێندراو . خنکاو ، خنکێندراو .

**١ــ ئاوا ــ** (ص.) ١ــ تمــ : ئاوەدان . // وێـران :: ماڵتــان صەت جار ئاوابێ ٢ــ تم : ئابات . :: حەسەناوا ، قازیاوا ، هەمزاوا ، قەرەجاوا .

**٢ــ ئــاوا ــ** [ = ئاوەهــا ] ، ( بند. ، صت.) ١ــ بەم جۆرە ، بەم شێوەیە :: جا ئاوا دەبێ ؟ ئاوایان کرد بۆیە ئاوای لێهات . ئاواشمان لێپرسن هــەر باشــە . ٢ــ بـۆ دەربڕینی هەســتی بە دڵنەبـونی قســە یــا کارێــك ، بەڕاوێــژی سەرسوڕمانەوە دە کــار دەکرێ . ٣ــ بـۆ گاڵتەکــردن بە قســەیەك ( و )ەکــەی دەکرێتــە دوٚ ( و ) و ( ا )ەکەشی توزێ درێژ دەکرێتەوە ( ئاووا ) . ★ ئاوها ،ئاوەهــا ، ئەوها ، ئەهــوا ، وا ، وەهــا . ٤ــ (بکـ.) لە لەهجــەی باکوریدا ، ئەم ووشـەیە گۆڕانی زۆر بەسەردا هاتوە و ڕاستەوخۆ مانای ( شێوە ، جۆر ) دەدا :: بڤێ ئاڤایێ ( بــەو ئاوایە = بەو جۆرە ، بەو شێوەیە )، بئاڤــاکی نەڕاست ( بــە ئاوایەکی ناڕاست = بە شێوەیێکی کە ڕاست نیە ) .

**٣ــ ئاوا ــ** (ص.)حاڵی شــتێکی کــە خەرێــك بێ لەبــەر چــاوان نەمێنێ ، وونبێ . تێبــ ــ أ ) ئەم ووشـەیە بە تەنیایی دە کار ناکرێ و دەگەڵ فیعلی ( بون ) بـۆ مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە ... دەکوترێ کە لە ئاسۆی شوینێ وون‌دەبن . ب ) لە لەهجەی باکوریدا وەکو ناو بە کاری دێنن : ( تاڤك چـو ئاڤا = هەتاو چـوە ئــاوا ــ تم : ژابــا. لــ١٤ ) .

**ئاوابون ــ** [٣ــ ئاوا + بون] ، (مصــت. لا.) ١ــ وونبــــون و چونەخواری ڕۆژ ، مانگ و ئەستێرە لە ئاسۆی ناوچەیەك . :: ڕۆژ ئاوا بـو ، مانگی چــاردە درەنگ ئــاوا دەبێ □ « تا فەلەك دەورەی نەدا و صــەد کەوکــەبی ئــاوا نەبـو » « کەوکەبەی میهری موبارەك تالعی پەیدا نەبـو » ( نالی : گم ــ ٤١ ) // هەڵاتن (هەڵهاتن) ٢ــ تێپەڕین، دەربازبون ، لە بەر چاوان وونبون ( شتێ ، کەســێ ) :: ســوارەکان هێشتا ئاوا نەبون . ٣ــ مردن (لە هەندێ ناوچەی کوردســتان ، بۆ مردنی ئــەوانەی موســوڵمان نین ) :: وەســتا شــــەلەمۆ ئاوابـو ، مامێگون زۆر نەخۆشە لەوانەیە ئاوا

بێ . ★ زایەبوون ، وونبوون ( تەنیا بۆ مانای سێیەم ) .

**ئاوات ـ** ( نا . ) ١ـ مەبەستی پڕ بـە دڵ بۆ وەدەستهێنـان یـا وەدیهێنـانی شـتێك ، کـارێك و ئامانجێك . ئارەزوی بە جۆش :: ئاواتی بردەبن گڵێ . □ «بێ بابیی تۆ ، بۆ من و تۆ ، بابی فتوحـه » « بێ بابیی تۆ ، خواستەیێ من بۆ ، بە ئاوات » ( نالی : گم ـ ١٤ ) ٢ـ ناوە بۆ نێرینە . تێبـ ـ بە لای منەوە ئەم ووشەیە لەگـەڵ ( ئایەپتـه )ی ئـاوێسـتایی بـه مـانـای ( وەدەستخستن )کە لە پەهلەویدا بۆتە (ئایەفت) خزمایەتییان هەبێ . پرۆفیسۆر ئابرامیان ( ئەیەفت )ی بە ئارەزو ، مراد مانالێداوەتەوە ( تم: ئابرامیان : قامۆسـی پەهلـەوی ، فارسـی ، ئەرمەنـی ، ل ـ ٦ ) .

**بە ئاوات خواستن ـ** لە دڵەوە حەز بـە جێبەجـێبونـی کـارێك ، وەدەستهێنانی شتێ ، پێکهـاتنی مەبەستی کردن . **بەئاواتگەیین ـ** تـم : ئـاوات پێکهـاتن . **بەئـاواتگەییشـتن ـ** تـم : ئاوات پێکهـاتن . **بەئـاواتەوەبون ـ** چاوەڕێی پێکهاتن و جێبەجێبونـی مەبەسـتێك بون :: بە ئاواتەوەیـە جارێك بچن سەری لێبدەن .

**ئاوات پێکهـاتن ـ** ( مصتـ. لا. ) وەدیهـاتنی مەبەسـتی دڵ ، جێبەجێبونی ئامـانج و ئـارەزو ، مەخسوودحـاسـڵبون . □ « وەسیەت بێ کەمـن مردم ، وەرە سەر قەبرەکـەم ( قاله ) » « بلـێ ئاواتەکەت پێکهاتوە ! سـا ، بێـرە دەر خاڵە » ( ؟ ) ★ بە ئاواتگەیین . بە ئاواتگەیشتن .

**ئاواتەخواز ـ** [ ئـاوات + ٣ـ ئە/٢ + خواز ( خواستن )] ، (نفا. ، صفا.) کەسێکی بۆ وەدەستهێنانی شـتێك ، وەدیهێنـان ، یـا وەدیهـاتنی مەبەسـتێك زۆر بـە پەرۆش بێ . :: ئاواتەخوازی قومە جگەرەیەك بو ( نفـا.) ، بۆ قومـە جگەرەیەك ئاواتەخوازبو ( صفا.) ، ئاواتەخوازی جگەرە (نفا.) ، پیاوێکی ئاواتەخواز ( صفا.) .

**ئاواتەخواستە ـ** [ ئاوات + ٣ـ ئە/٢ + خواست (خواستن+٢ـئە/٦)] (نمف. صمف.) شتێك، کارێك و مەبەستێ کە بۆ وەدەستهێنانی ، زۆر هـــەوڵ درابـــێ . :: ئاواتەخواستەش وا نابێ. ٢ـ(کنـ.) هەرچێ زۆر خۆشەویست بێ و بە دڵەوە نۆسابێ. (بەتایبەتیمنداڵ).:: کوڕە خۆ تۆ ئاواتە خواستە نیت ، بۆ وازناهێنی . ★ ئاواتی .

**ئاواتی ـ** [ ئاوات + ٣ـ ئی ] ، ( صمف.) تم : ئاواتە خواستە .

**ئاوارتن ـ** [مصـ. متـ.] ، ( زا.) دەربواردنـی شـتێك لـە شـتێك ( استثناء ) ، ( تم . خا : ج ١ ، لـ ٦٠ ) ـ بێجگە لە ( فەرهەنگیخاڵ ) ئەم ووشەیەم لە هیچ قامۆسـێکی تری کوردیدا نەدیت ، ئەگەرچـی خۆی لە لەهجەی ناوەندی زمـانی کوردیدا لە بیر چۆتەوە ، بەڵام لـە شـێوەی ( هەڵاوارتـن ) و ( هەڵاواردن )دا دەبینرێ ، لام وایە

(ئاوارە)ش هەر بە بنێچە دەچێتەوە سەر ئەم مەصدەرە ، کە بەڕای من مەصدەرێکی ئەسڵی زمانی کوردییە و شایانی ئەوەیە زیندوو بکرێتەوە . هس : بواردن ، هەڵبواردن .

**هەڵاوارتن/دن** ـ [ هەڵ + ئاوارتن/دن ] ، ( مصت. مت. ) لێكجیاکردنەوەی دوو یا چەندشت. تێبـ ـ ئەم مەصدەرە بە تایبەتی بۆ بەش‌کردنی مەڕ و بزن و ... کە ئێ دوو شەرێکان بێ و بیانەوێ جودابینەوە ، یا بۆ جیاکردنەوەی ( بەرخ ) و ( کار )ی ساوا لە دایکیان بە کاردێت .

**ئاوارتە** ـ ( صمف. لە : ( ئاوارتن ) ) ، ( زا. ) جیاکراوەوە ، بەجێ‌هێڵراو، لادراو ( شتی دەربراو « مستثنی » ) . تم : خا . ج ١ ، لـ ٦٠ ) .

**ئاوارە** ـ ( صـ. ، نمف. ) سەرگەردان ، دەربەدەر ، بێ‌ماڵ و حاڵ ، کەسێکی لە نیشتمانی خۆی ، وولاتی خۆی دوورکەوتبێتەوە . □ « ئاوارەیی خاکی وەتەن و سەیر و سەفا خۆم»«پامالی غەمی میحنەت و صەد جەور و جەفا خۆم» (عارف) ★ تار . تەرا . تەرە . ڕەهەندە . هەڵوەدا .

**ئاوارەبوون** ـ ( مصت. لا. ) سەرگەردان‌بوون ، لە ماڵ و حاڵ و نیشتمان دوورکەوتنەوە . ★ تاربوون . تەرەبوون ، هەڵوەدابوون

**ئاوارەکردن** ـ [ مصت. مت. ] دەربەدەرکردن ، دوورخستنەوە لە وولات و لە ماڵ و حاڵ . □ « شێخ عەلی خۆ تۆ منت ئاوارەکرد و دەربەدەر » « چاکە هەجوێکت بکەم ئەمما موفید و موختەسەر » (ڕەزا ـ ٥٩ ) ★ تاراندن . تەرەکردن . ڕەهەندەکردن . هەڵوەداکردن .

**ئاوارەیی** ـ ( حمص. ) بێ‌خانومانی ، حاڵەتی دوورکەوتنەوە لە ماڵ و حاڵ و نیشتمان . دووری لە وولات :: ئەگەر ئەمە ئاوارەیی نەبێ ، ئەدی ئاوارەیی چۆنە . ★ سەرگەردانی ، دەربەدەری .

**ئاواز** ـ [ ست : ڤەچ (= گوتن)، پھ : ئاڤاچ ] ، [ئا + واز = واچ] ، (نا.) ١ـ کۆمەڵە دەنگێکی کەبە هەوای تایبەتی جۆر بە جۆری مۆسیقا لە دەمی ئادەمیزاد یا هەندێ باڵندە دێتەدەر . □ « ئەمە نە قازە ، نە بازە ، ئەمە بولبولی خۆشئاوازە ( خۆش‌ئاواز )» ( فۆلکلۆر ) .«وەکو یەك دێتە بەر گوێی پیاوی ئەحمەق» «سەفیری بولبول و ئاوازی لەقلەق» (ڕەزا) ٢ـ دەنگی ئامرازی مۆسیقا بە هەوای تایبەتی . ٣ـ ناوە بۆ کچان . هس : مەواچوو ، ماچێ ، ماچان ( هو. ) ، وات ، واتە .

**ئاوازە** ـ [ ئاواز + ە ـ ئە/١] ، ( نا. ) ناوبانگ ، شۆرەت . :: ئاوازەی نان‌بدەیی و جوامێری ئەم بنەماڵە بە هەموو لایێکدا بڵاو بۆتەوە.

**ئاوازەخوان** ـ ( نت. ) ، ( سن. ) ئەو کەسەی گۆرانی و مەقامان دەڵێ . ★ خۆشخوان ، گۆیندە . ( بک. ) دەنگبێژ ، ستران‌بێژ .

**ئاواق** ـ [ ؟ ] ، ( صـ. ) ، ( سن. ) ١ـ چۆڵ‌وهۆل . ٢ـ بەتاڵ ٣ـ

خانوێکی گەورەی کەسی تێدا نەبێ . ٤ـ بیابانێکی هیچ ئاوەدانی لێوە دیار نەبێ ( تم : مخ. ج ١ ، ل ـ ٢٥ ) ، هس ( هو . ) واق (= بەتاڵ) .

**١ـ ئاواکردن ـ** [ ١ـ ئاوا + کردن ] ، ( مصد. مت.) ١ـ بنیاد نان و دروستکردنی خانوو ، یا هەر جێگایێکی بۆ دانیشتن و تێدا ژیان ، دەس بدا :: چاوەخانوێکی ئاواکردوە، ئەم دێیە تازە ئاواکراوە. ٢ـ ( کن.) خۆشی و شایی خستنەماڵەوە . □ « بە خێر بێی سەر چاوان ماڵەکەت ئاوا کرد » ( ڕستەییێکە بۆ بەخێر هێنانی مێوان دەکوترێ ). ★ ئاواکردنەوە . ( بک.) ئاڤاکرن .

**٢ـ ئاواکردن ـ** [ ٣ـ ئاوا + کردن ] ، (مصد. مت.) ١ـ لەبەر چاوان وونکردن . ٢ـ تێپەڕاندن ( کەسێك لە شوێنێکەوە بۆشوێنێکی تر ) ٣ـ بردنە سەر ، رابواردن ( وەخت ) ٤ـ بردنەخوار :: هەڵیانبڕین و لێیان نەبۆنەوە تا ئاوای ئەو دێویان کردن . ڕۆژەکەمان بە خۆڕایی ئاواکرد . هێشتا پارویێکی لە گەروی ئاوا نەکردوە یەکی تر دادەگرێ .

**ئاواکردنەوە ـ** ( مصد. مت.) تم: ١ـ ئاواکردن/١ .

**ئاواڵ ـ** [ ٢ـ ئاو + ئاڵ = ئاڵی ] ( نت.) ، ( مک.) ١ـ دۆست و ڕەفیق ، دەستەبرا ( بۆ کار و باری کۆمەڵایەتی و سیاسی و خوێندن و ...) :: ئاواڵدەرس . ئاواڵزاوا . ئاواڵکلاس. ٢ـ هاوتا، هاوچەشن، شێوە. :: ئاواڵکراس. جا تۆ خۆت دەکەیە ئاواڵی خدر ؟. تۆ ئاواڵی ئەم منالەی لێیدەدەی ؟ قەڵەمەکەی تۆش ئاواڵی ئەوەکەی منە . ★ ئاوەڵ . هەواڵ . هاواڵ. ( بک.) هەڤاڵ .

**ئاواڵایەتی ـ** [ ئاواڵ + ئایەتی]، ( حمصد.) ، ( مک.) تم : ئاواڵەتی .

**ئاواڵدەرس ـ** (کو. عا.) ، ( صت.) ، ( مک.) ١ـ پێوەندی دۆ ، یا چەند قوتابی کە لە پۆلێکدا ، دەخوێنن . ٢ـ پیوەندی دۆ یا چەند فەقێ کە لە حوجرەیێك پێکەوە ( مادده )یێك دەخوێنن .

**ئاواڵزاوا ـ** ( صت.) ، ( مک.) پێوەندی خزمایەتی نێوان دۆپیاوان کە ژنەکانیان خوشکبن . ★ ئاوەڵزاوا ، هاوزاوا . ( بک.) هاڤلینگ .

**ئاواڵکراس ـ** ( نت. ) دەرپێیژنانە . تێب ـ ڕەنگە ناوهێنانی دەرپێ ( ئەویش ژنانە ) بە شورەیی داندرابێ ، بۆیە ئەم ناوەیان لێناوە . ★ ئاوەڵکراس ، ئاوەڵدامان ، دەرپێ . ( بک. ) هەڤاڵکراس ( تم: کف ، ل ـ ٣١٥ ).

**ئاواڵمنداڵ ـ** ( نت.) ، ( مک.) پەردەیەکە ، لەمنداڵدانی ئافرەتا ، بۆ ماوەیەك منالەکەی لەناودا دەبێ و پاش ئەوەی لەدایکی جیادەبێتەوە ، ئەویش فڕێدەدا . ★ ( سیم .) ئاوەڵ/٢ .

**ئاواڵە ـ** [ ؟ ] ، ( صمف.) ، ( مک.) ١ـ کراوەوە ، لەسەرپشت، دانەخراو ( دەرگا ) . ٢ـ برێنێ کە

سەری قرتماغەی نەگرتبێ ، کوانێکی دەر بووبێ و پێستی لە سەر لاچووبێ . هس : ( بکـ.) واڵا ( = بەتاڵ ) .

**ئاواڵەبوون** ــ [ مصد. لا.] ١ــ لە سەر پشتبوون (دەرگاوپەنجەرە). ٢ــ دەرخۆنە لە سەرنەبوون ( دێزە و مەنجەڵ و ...) . ٣ــ لێكنەنران ( دەمی ئادەمیزاد ) . :: لێیگەڕێ با دەرکەکە ئاواڵە بێ . با سەری مەنجەڵەکە ئاواڵەبێ تا سارد دەبێتەوە . « کابرا لەبەر هەتاو دادەنیشت و دەمی ئاواڵە بوو مێش بە ناو دەمیدا هاتوچۆیان دەکرد » . ( بیرەوەریێ خۆم ) .

**ئاواڵەتی** ــ [ ئاواڵ + ئەتی ] ، ( حمصـ.) ، ( مکـ.) ئەو خۆیەتی و ئاشنایەتییەی ، کە بە هۆی : پێکەوەکارکردن ، پێکەوەخوێندن یاریکردن ، یەکێتی بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە نێوان دوو یا چەند کەس ساز دەبێ . :: ئیتر نابێ ئاواڵەتی وسو بکەی . ★ ئاواڵایەتی . ( بکـ.) هەڤالبەندی ( کف ــ ٣١٥ ) ، هەڤالتی ، هەڤالی.

**ئاواڵەکردن** ــ [ مصد. متـ.] ١ــ خستنەسەرپشتی دەرگا و پەنجەرە و ... ٢ــ لابردنی سەری مەنجەڵ و دێزە و دەفری تر ٣ــ داپچڕینی دەم .

**١ــ ئاوان** ــ ( صـ.) ، ( سنـ.) تم : ئاوەدان . □ « یاجەگوناى من کەڕەم ئاوان تەر » « ڕەحمەت جە تاوان من فراوان تەر » ( مەولەوی : مکبـ ــ ٥٣٦ ) .

**٢ــ ئاوان** ــ ( نا.) . ١ــ (سنـ.) تم : ٢ــ ئاوونگ ٢ــ قاپ و قاچاغی ناو ماڵ ( تم : خا. ج ١ ــ ٦١ ) هس : ٢ ــ ئامان .

**٣ــ ئاوان** ــ [ ١ــ ئاو/١ + ئان (= ئانە/٢ ) ] ، ( نتـ.) ، ( مکـ.) ئەو هەقەی ئاشەوان لە باتی هاڕینی دەغڵ لە ئاشێڕی دەستێنێ ، خۆی لە ١٥ یەك و ٢٠ یەك دەدا ، بۆ گەنمە شام و هەرزن و جۆ ، لە گەنم زۆر ترە . ★ ئاواناش .

**ئاواناش** ــ [ ٣ــ ئاوان + ١ ــ ئاش ] ، ( نتـ.) ، ( مکـ.) تم : ٣ ــ ئاوان .

**ئاوانتە** ــ [ ؟ ] (نمصـ.) ، (کعر.) وەدەستخستن و دەست بە سەردا گرتنی شتێك بە فڕ و فێڵ یا بە هەر جۆرێکی تر . :: بۆچی ئاوانتەیە ؟ ★ هاوانتە ، هەوانتە .

**ئاوانتەچی** ــ ( کعر.) ١ــ (نفا.) کەسێکی بە فڕ و فێڵ و کەلەك دەست بە سەر ماڵی خەڵکدا بگرێ ::ئاوانتەچی وەكخۆی هەرنابێتەوە. ٢ــ ( صفا.) حاڵی کابرایەکی ئاوا :: تووشی کابرایەکی ئاوانتەچی بووین دەیویست هەڵمان خەڵەتێنێ .

**ئاوانی** ــ [ ١ــ ئاوا /١ + ئانی /٢ ] ، ( نتـ.) ، ( سنـ.) تم : ١ ــ ئاوەدانی .

**ئاوایی** ــ [ پە : ئاپاتیە ] ، [١ــ ئاوا/١ + ٢ــ ئی ] ، ( نتـ.) ١ــ تم : ١ــ ئاوەدانی/١ ، ٢ــ تم : ٢ــ ئاوەدانی ★ ( بکـ.) ئاڤاهی .

**١ــ ئاوبارە** ــ [ ١ــ ئاو/١ + بار + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نتـ.)

پلۆسکێکی گـەورەیە ، لـە دار یـا تەنەکە و ئەو جۆرە شتانە دروست دەکرێ ، بـە سـەر ( شـیتو ) یـا شوێنێکی نزما کە کەوتبێتـە نێـو کێڵگەوە ڕایەڵ دەکـرێ و ئـاو لـە بەرێکەوە دەبـاتە ئـەو بـەر بـۆ کشت‌وکاڵ . ★ قەمتەرە . تێب ـ أ ) ئەمەی لە سـەرەوە بـاس‌کرا ، شکلی ئەم دوایانەی دروست‌کردنی ( ئاوبارە )یە کە کەرەستەی نـوێ پەیدا بوە ، دەشـێ لە ڕابـردوودا ( شیتو ) یا شوێنە نزمەکەیـان بـە بانایێ پیویست پڕکردبێتەوە ، بـە خۆڵ یا ئیشکە کەڵەك دیوارێکیـان هەڵچنێ بێ ، تا هـاتۆتە ئاستـی زەویەکان و ئەو جار جۆگەیان بـە سەردا کێشابێ . ب ) ئەسڵی کەرتی دوەمی ئەم ووشـەیە ( بـارە )ش دوژێی دەچێتێ : یەکەمیان ئەوەیـە کە لە ( ڤـەرە )ی ئاویسـتایێ بـە مەعنای [ شوێن ، جێگا ] وەرگیرابێ کە ( وار ) ئێستـاش لە لەهجـەی باکوریدا ( تە : ژابا ـ ٤٢٩ ) و لە ( هەوار )ی ناوەندیشدا بەم‌مەعنایە بەر چاو دەکەوێ . یا خۆ لە (ڤارە)ی ئاوێستایێ کە ( بـارە ، بـارۆ )ی فارسێ لێ‌کەوتـۆتەوە بـە مـانای [ دیـوار ، قـەڵا ] ( تە : معین . فەرهەنـگ ، ج ١ ـ ٤٥١ ) و لـە ( دیوار )ی کوردیشدا دەبیندرێ ، ئەگەر ڕاستی بۆ چوبم ئەوا مانـای ووشەکە دەکـاتە (دیـواری ئـاو ، جێگای ئاو ) . دوەمیشیان ئەوەیـە کە کەرتی ( بارە ) لە ئەسڵا (بوارە) بێ و دەنگی ( و ) کەوتبـێ ، لـەم حاڵەتەدا مانای ووشـەکە دەبێتـە بواردنی ئاو ، پەڕاندنەوەی ئاو . . .

**٢ـ ئاوبـارە ـ** [ ؟ ] ، ( نت. ) ، ( سن. ) شیرەی گوڵان کـە هەنـگ دەیگرێ و دەیکا بە هەنگوێن . ( تە : مخ . ج ١ ـ ٢٥ ) .

**ئاوبردە ـ** [ ١ـ ئاو/١ + بردە ( بردن ) ] ، ( نمف. ) ١ـ کەسـێ یـا شتێ کە ئاو بردبێتی . ٢ـ ( مجـ. ) ماڵێ کە بە خۆڕایێ لە دەس چۆ بێ .

**ئاوبڕ ـ** [ ١ـ ئـاو/١ + بـڕ (بڕین) ] ، ( نت. ) ١ـ نەخۆشییەکە ، زستـانان لە ئاوخواردنـەوەی زۆر تۆشی ماڵات دێ . ٢ـ ئەو شوێنەی ئاوی لێ‌هەڵدەبـڕن بـۆ ئـەوەی ڕەوانەی شوێنێکی تری بکەن کـە مەبەستە . :: ئاوبڕی ئاش. ئاوبڕی جۆگە . ★ ئاوەشکێنە . ئاوەژنە .

**ئاوبڕبون ـ** ( مصد. لا. ) تۆشی نەخۆشی ئاوبڕهاتن .

**ئاوبەردانەوە ـ** [ ١ـ ئاو/١ + بەردانـەوە ] ، ( مـصد. مت. ) لـە ئەستێڵ یا هەر شوێنێکی تر ، کـە ئاوی تێدا کۆبۆبێتەوە ، ئاو ڕەوانەی شوێنێکی دیکـە کردن ، بـۆ هـەر مەبەستـێ بـێ . :: ئـاوەکەی بەردابۆوە و خۆی لەبن سێبەرێکدا پاڵی لێ دابۆوە ، ئەو ئاوە بەردەنەوە بۆ تۆتنەکان . ★ ئاوبەرەوەدان . // ئـاوگرتن .

**ئـاوبەرە ـ** ئـەو مێـش هەنگوێنانەی کاریان ئـاوبردنە لـە کانێڕا بـۆ کۆمەڵگـای هەنگەکـان ( چ کندوی دەستکرد یا قەڵشـتە بـەرد و دار و . . . ) تێـب ـ ئـەو

بەشەی هەنگ کە لە شوێنی خۆی وەڕێدەکەوێ ئەوەندە بەرز دەبێتەوە کە کۆمەڵگاکەی خۆیانی لێنەدیو نەبێ ، جا هەر بەو بەرزە فڕیی‌ڕا لادێیی کورد دەیناسن و لە هاتوچۆکردنێدا کۆمەڵگای هەنگی کێوی پێ‌دەدۆزنەوە .

**ئـاوبەرەوەدان ــ** ( مصد. مت.) تە : ئاوبەردانەوە .

**ئـاوبەند ــ** ( نت.) نەخۆشێکە تۆشی ئادەمێزاد دەبێ : ئاو یا هەر تراوێکی دیکە لە ووردگدا کۆدەبێتەوە و دەبێتە مایەی ئەم نەخۆشێنە ، نەخۆشەکە زۆر ئاو دەخواتەوە و تێنوێتی ناشکێ ، زگی دەئاوسێ . ئەم دەردە گەلێ جار نەخۆشی دڵ یا جەرگیشی دەگەڵە. ★ ( مک.) ئیسقایێ .

**ئاوپاچ ــ** ( نت . ) ، ( مک . ) تە : ئاوپاش .

**ئاوپاش ــ** [ ١ــ ئاو/١ + پاش] ١ــ ( نت . ) ، (مک.) دەفرێکە بە شکڵی مەسێنە ، بەڵام گەورەترە و زۆرتر ئاو دەبا ، ئەستۆرایێ سەر و بنی وەکۆ یەکە ، دۆ هەنگڵی هەیە یەکیان لە سەرەوەی و ئەوی تریان لە لای پشتەوە بەرامبەر لۆلەکەی . لۆلەی لە ئی ئافتاوە فرەوانترە و لە ئاخرێدا وەکۆ دەمی زوڕنا ئاواڵە دەبێتەوە و پارچە تەنەکەیێکی کون‌کونی لێ قایم دەکرێ تا ئاو لەم کونە پچکۆلانەی بێتە دەرەوە ، ناوماڵ‌و ژووری پێ ئاوپڕژێن دەکەن و گوڵ و باخچەی ناو ماڵێشی پێ ئاودەدەن ★ ئاوپاچ . ئاوپڕژێن .

تێب ــ بەشی دوەمی ئەم ووشەیە ( پاش ) لە مەصدەرێکی کۆن ــ کە شکڵی هەرە دوایێ ــ پێش ئەوەی بە جارێك لە بیر بچێتەوە ، دەبێ ( پاشێن ، پاچێن ) بێ ــ وەرگیراوە و ڕێشەی مەصدەرەکە لە چەند ووشەیێکدا بەر چاو دەکەوێ . لە زمانی فارسیدا دۆ مەصدەری ( پاشیدن و پاچیدن ) بە مانای ( بڵاوکردنەوە ، وەشاندن ) ماوون . ٢ــ ( نفا . ) کەسێکی ووڵات ئاو پڕژێن دەکا .

□ « من هەر جارۆکێش کێشك خانەی تۆم »
« من ئاو پاش خاك ، ئاستانەی تۆم »
( خانا ــ ٢١٩ )

**ئاوپاشێ ــ** ( حمص . ) ، ( سن . هو . ) تە : ئاوپڕژێن‌کردن .

□ «عەینەین ! وەئەسرێن، ئاوپاشێ ڕاش ، کەر »
« نەك گەرد بنیشۆ ، وە کۆنای دڵبەر »
( مەولەوێ : مکب ــ ٣٦ )

**ئاوپڕژێن‌کردن ــ** (مصد . مت .)، ( مک . )،بە ئاوپاش یا هەر ئامرازێکی دیکە ، ئاو بە سەر بان و حەوشە و ناو ژوور و باخچەوە کردن . ★ ئاوپاشێ ، ئاوڕشێن‌کردن .

**ئاوپەڕ ــ** [ ١ ــ ئاو/١ + پەڕ ( پەڕاندن ) ] ، ( نت . ) ، ( سیە . ) تۆپە دارێکە ، ناوەڕاستەکەی کون دەکرێ و دەکوترێتە زارکی لای خوارەوەی دۆڵاش ، بۆ ئەوەی تەنگی بکاتەوە و ئاو لە کونەکەی‌ڕا ، بە

تەووژم تر لە پەڕە بدات و خێرا تر بێسوڕێنێتەوە . ئاشێکی ئاوی زۆر بێ پێویستی بەم ئامرازە نیە . ★ زەمبوڕە .

**ئاوپەڕین** ـ ( صت . ) ، ( مک . ) حالی زەوییێکی کە داشتنی ناڕەحەت بێ ، بە زەحمەت ئـاو بدرێ . ★ دژاو .

**ئاوتێزان/تزان** ـ ( مصت . لا . ) پڕبوونی دەم لە ئاو . تێبـ ـ بە دیتنی کەسێ کە شتی ترش بخوا یا باسی شتی ترش و چێشتی خۆش بکا ، ( غوددە )کانی نـاو دەم داروژێن و ئاویان لێ دەردەپەڕێ . :: ئەوەندەی باسـی مزرۆکـە کـرد هەرچی لـە مەجلیسەکە بوون دەمیان ئاوی تێزا .

**ئاوجز** ـ ( نت . ، صـ . ) تم : ئاوەدز .

**ئاوجۆ** ـ [ ١ـ ئاو/٢ + جۆ ] ، ( نت . ) ، ( سن . ) خواردنەوەیێکی کەم ئالکۆلە ، ئەم زەمانە هەمو کەسێ نـاوی بێسـتوە و زۆر کەسـیش خواردویانەتەوە ★ ئابجۆ . بیرە. تێبـ ـ بۆ گرتنی ئەم خواردنەوەیە ، جۆ لە ئاوا دەخوسێنن تـا چەکەرە دەکا و پاشان دەیترشێنن (تەخمیری دەکەن) و هەوێنی بیرەکە گیـایەکی بۆنخۆشەو لە چیاکانی کوردستانیش هەیە ، لێیدەدەن و دەیپاڵێون . ٢ر٥ ـ ٥ر٤ ٪ ئالکۆلی تێدایە و کەمێك گلیسـرین و ئـەوێتری غـازی کاربۆنێك و ئاوە .

**ئاوخانە** ـ ( نت . ) تم : ئابخانە .

**ئاوخواردنەوە** ـ ( مصت . لا . ) ١ـ خواردنەوەی ئاو بـۆ شکاندنی تێنوایـەتی . ٢ـ ( کنـ . ) کـاری هاسان و بێ ئەرك . :: جا ئەوە چیە ؟ هەر ئاوخواردنەوەیە . پیاوکوشتن و ئاوخواردنەوەی لە لا وەك یەکە . چ پیاو بکوژن و چ ئاو بخۆنەوە .

**ئاوخـواز** ـ ( صفا . ) تمـ : ئاوکێش/٢ .

**ئاوخۆر** ـ ( نفا . ) ئەو کەسەی لە حالی ئاو خواردنەوەدایە یا تێنوی بـێ و بیـەوێ ئـاو بخواتـەوە . □ « ڕەحمـەت لـە ئـاوخۆر » لـە شوێنێکی خەڵکی زۆر لێ کۆبوبێتەوە (وەك مزگەوت) یەکێك ئاو دەگێڕێ و ئەم ڕسـتەیە دەڵێ ، تـا هەرکەس تێنوی بێ داوای ئاوی لێ بکا .

**ئاوخۆرێ** ـ [ ١ـ ئاو/١ + خۆر ( خواردن ) + ٢ـ ئێ ] ، ( نت . ) ، ( کئێر . ) ١ـ دەفرێکـی بلـور یا گلێنە یا هەر شـتێکی ترە کە ئاوی پـێ بخورێتـەوە ★ پـەرداغ ، شەربە/٢ ، گلاس، لیوان . ٢ـ (سن) تم : ئاوەخۆرە .

**ئاودادان** ـ [ ١ـ ئاو/١ + دا ( پیب . ) + دان ( فع. ) ] ، ( مصت . لا. ) ١ـ گیرنەبوونی ئاو بە زەوێ و کانیاوانەوە و خێرا چـونەخوارێ بە زەویدا ، لەبەر فشەڵی زەوێ کە ئاو بـە خۆیـەوە ڕانـاگرێ . ٢ـ تم : ئاولێچون. ٣ـنەخۆشییەکە، توشی قول و قاچی وولاغی بەرزە دەبێ و جومگەی دەست و قاچیان دەئاوسێ و کە دەسـتی لێبـدری وەکو ئـاوی تێدابێ وایە .

**ئاودار** ـ (صت.) ١ـ شوێنێ کە ئاوی زۆر بێ. :: شاربازێڕ وولاتێکی

ئاوداره . ٢ــ میوەی تەڕ و تازە کە ئاوی زۆر هەبێ :: بە سێ پڕتەقاڵان پەرداغێ ئاویان نەبۆ . کەچێ کابراش دەیکـــــوت زۆر ئـــــاودارن . ٣ــ جەواهێراتی چاك و بەردی بـــە قیمەت کە بریق و باقی هەبێ . :: ئەم یاقوتە زۆر جـــوان و ئاوداره . ٤ــ ڕەنــگی زەڕقێ و بـــەرقێ و بە وورشەوورش. ★ ٢ــ ئابدار .

**ئاوداشتن ــ** ( مصت . مت . ) ، ( مک . ) تم : ١ــ ئاودان/٢ :: هێشتا لە ئاوداشتن نە هاتونەوه .

**ئاودامان ــ** ( صت . ) کراس و کەوای درێژ کە بگاتە قولاپەی پێ ، زیاتر بۆ کراسی ژنانە بەکاردێت . :: کراسی ئاودامان .

**ئاودان ــ** [ ١ــ ئـــاو/١ + دان ( فع . ) ] ، ( مصت . مت . ) ئاو بۆ ماڵات و بەرزە وولاغ و ... بردن ، یـا بردنی ئـــەوان بۆ ســـەرچۆم و کانیـــاوان بـــۆ ئاوخواردنـــەوه . :: وولاغەکان ئاودەن تـــا بڕۆین . ● « دەیباتـــە ســـەرچۆمی و ئاوی‌نادا دەیهینێتەوه » ، (کن .) فرتێوێ دەدا، فێڵی لێ‌دەکا . فێڵبـــاز و زرینکە . ٢ــ بەردانـــەوەی ئـــاو بـــۆ ســـەر کشتوکاڵ ، یا بە ئاوپاش و ئامرازی تر ئاوکردنە ژێـــر درەخت و گوڵ و ئەوجۆرەشـــتانە . کارێـــکی ئاودێر دەیـــکا . :: لـــەپێرێوە باخچەکەت ئاونەداوه . ئەوشۆ ئەستێلەکە بگرن بەیانی ئـــەو پەلەتوتنـــە ئـــاودەن . شامراد دوێنێ بێســـتانی ئاودەدا . ★ ئاوداشتن . ٣ــ سەخت و ڕەق کردنی چەقۆ ، شمشـــێر ، کێرد ، گاسن ، تیر . تیغ ــ ئـــامرازەکە لە کـــورەدا ســـوردەکەنەوه و پاشـــان دەئاوی هەڵدەکێشن . شـــمشێر و خەنجەر و ... بۆ ئەوەی برینیـــان چانەبێتەوه لەباتی ئاو دە ژەهراویان هەڵکێشـــاوه .

**ئاودانـــەوه ــ** ( مصـــت . لا. ) جیابونەوەی ئـــاوێ کـــە لەهـــەندێ شـــتدا هەیـــە و کۆبونـــەوەی لـــە دەفرەکـــەی شـــــتەکەی تیـــدایە . :: ماستی‌مانگا ئاودەداتەوه .

**ئـــاودڕ ــ** ( نت . ) شـــوێنێك لە دەشت و کێو ، کە ئاوی‌باران یا لافاو دایدڕێبێ . ★ ئاودڕکە .

**ئاودڕکە ــ** (نت.) تم : ئاودڕ .

**ئاودز ــ** ١ــ ( نت . ) قەڵشت و کون و کاژێرێ کە لـــە شوێنێك‌ڕا ئاوی پێدا دەربازبێت‌بۆ جێگایەکی‌تر .

□ « مەنفـــەز و درز و ئـــاودزێ ، هەرچەند »
« دەیگرم دەیکوتم بەدەســـت و بەپێ »

( ڕەزا ــ ٥٢ )

٢ــ (صت.) ، (سیم.) تم : ئاوەدز.

**ئـــاودزکردن ــ** [ ئـــاودز/٢ + کردن ] ، ( مصت . لا. ) تم : ئاوەدز کردن .

**ئـــاودەردان ــ** [ ١ ــ ئـــاو/١ + دەر + دان ( فع . ) ] ١ــ ( مصت . مت . ) بەتـــاڵ کردنی ئـــاوی‌گۆل ، ئەستێل و حەوز یا هەرشوێنێکی کە ئاوی تێدا کۆبۆبێتەوه و ڕاوەستابێ. :: بە دۆڵچە ئـــاوی حەوزەکەمان دەردا . ٢ ــ ( مصـــــت . لا. ) وەڕۆکـــەوتن و پەیدابونی ئـــاو لـــە

مادده‌یه‌ك ، که‌خۆی ئاوی تێدابێ ، به‌لام به‌رچاو نه‌که‌وێ . :: هه‌مۆ له‌شی ئاوی ده‌ردابۆ .

**ئاوده‌ست** ــ ( نت . ) ، ( مک . ) تم : ئابخانه .

**ئاوده‌ستخانه** ــ ( نت . ) ، تم : ئابخانه .

**ئاوده‌لێن** ــ [ ١ــ ئاو/١ + ده‌لێن ( ده‌لاندن ) ] ( صت . ) ( مک . ) حالی گۆل و ئه‌ستێلێکی له‌زه‌وی خیسك و سستدا دروستکرابن و ئاو دابده‌ن .

**ئاوده‌نگ** ــ [ ٢ــ ئاو + ده‌نگ]، ( صت . ) پێوه‌ندێ دۆ یا چه‌ندکه‌سێ که به‌رێکاداده‌رۆن یا له‌جێگایه‌ك دانیشتبن و قسه‌بکه‌ن ، وه‌ڕه‌زێ یه‌کتری بشکێنن . ★ هاوده‌م . هاوده‌نگ . هه‌مده‌م .

**ئاوده‌نگی** ــ ( حمص . ) ١ــ ئاواڵه‌تی ڕێکا و دانیشتن :: حه‌مه‌ش ده‌گه‌ل خۆتان به‌رن هه‌رباشه بۆ ئاوده‌نگی . ٢ــ ( کن . ) که‌سێکی‌هه‌ر که‌لکی ئه‌وه‌ی هه‌بێ که قسه ده‌گه‌ڵ پیاو بکا و نه‌یه‌لێ له‌به‌ر ته‌نیایی وه‌ڕه‌زببێ . :: هه‌روه‌ك ته‌نیابم وابۆ ، حه‌مه هه‌ر ئاوده‌نگی بۆ . ★ هاوده‌نگی .

**ئاودێر** ــ ( نفا . ، صفا . ) که‌سێکی کشتوکاڵ ئاوده‌دا ، ئه‌وکه‌سه‌ی ئاو به‌رده‌داته‌وه بۆسه‌ر ده‌غڵودان و به پێمه‌ڕه خه‌ریکی ده‌بێ تا به هه‌مۆ لایه‌کی ڕابگه‌یه‌نێ .

□ « جه‌بباری بێ‌فتوری ، سولتانی بێ‌قسوری »
« ڕه‌زراقی مارومۆری، ئاودێری دیمه‌کاری »

( حاجی )

**ئاورنگ** ــ [ أ ] ، ( نا . ) ١ــ برێسکه و برێسقوباق . ٢ــ پڕێشکی ئاگر . ٣ــ (مج.) تۆڕه‌یێ و گوڕه‌گوڕی که‌سێ که ڕقی هه‌ڵسا بێ . ٤ــ ناوه بۆ ئافره‌تان . ★ ئاورینگ .

**ئاورنگدان** ــ (مصت. لا.) ، (مک.) ١ــ برێسکانه‌وه ، برێقه‌دان (شتێك) ٢ــ پڕێشك له ئاگربۆنه‌وه ( وه‌ك : له کاتی لێکدانی ئه‌ستێ و به‌رد ) . ٣ــ (کن.) تۆڕه‌بۆن و پرته و بۆڵه و هه‌ڕه‌شه و گوڕه‌شه‌کردن . :: جارێ وازی لێ بێنن تا سارد ده‌بێته‌وه ، هه‌ر وا ئاورنگان‌ده‌دا . ★ ئاوڕینگدان .

**ئاوره** ــ [ ئاوور + ٥ــ ئه/١ ] ، ( نت . ) ، ( مک . ) تم : ئاگره .

**ئاوره‌گڕه** ــ [ئاوور + ٣ــ ئه/٢ + گڕ + ٥ــ ئه/١ ] ، ( نت . ) ، (مک .) تم : ئاگره‌گڕه .

**ئاوری‌بن‌کا** ــ ( نت . ) تم : ئاگر ( ئاگری‌بن‌کا ) . تێب ــ به‌و جۆره‌ی که له‌م قامۆسه‌دا ڕه‌چاوکراوه ، ده‌بۆ ئه‌م ووشه‌یه له ژێر سه‌ر ووشه‌ی ( ئاوور )دا بنۆسرێ ، به‌لام وه‌ك ئاشکرایه ئه‌و ( بۆر = ضمة )ه‌ی له پاش ده‌نگی ( و ) له ئه‌سلی ووشه‌که‌دا هه‌یه ، له ته‌رکیبدا له ناو ده‌چێ و شێوه‌ی نۆسینیتشی ده‌گۆڕێ . جا بۆیه ئه‌م ووشه‌یه که‌وتۆته ئێره و هه‌ر ووشه‌یێکی دیکه‌ش له‌م بابه‌ته ئاوا جێ‌گۆڕکێ ده‌کات .

**ئاوری‌سوور** ـ ( نت. ) ، (مک.) ١ـ پۆلوی ئاگر کە ئەوەندە گەشابێتەوە هیچ سەرەبزووت یا خەلووزی تێدا نەمابێتەوە . ٢ـ (کن.) بەڵای گەورە . :: ئاوری سوور بێ خۆی تێداوێ .

**ئاوریشم** ـ [پە : ئەپەریشوم] ، (نا.) لیکاوی کرمێکە ، ناوی کرمی ئاوریشمە ، وەکوو هەودای زۆر بارێك و بریسکەدار لە دەمی دێتە دەر و قۆزاخەیێکی درێژۆکەی ( شکلی لە بەڕوو دەچێ ) لە دەوری خۆی پێ دەتەنێ و دەیکاتە هێلانە تا سەری وێك‌دێتەوە و کونی لێ دەبڕێ ، تێیدا دەمرێ . ئەم قۆزاخانە دەخەنە ناو ئاوی لە کوڵ و هەوداکانی لێك جودادەکەنەوە و دەیڕێسن . دەکرێ بە قوماش بۆ پۆشتەمەنی و کەلوپەلی تری پیاوانە و ژنانە . لە زۆر جێگای دنیا ئەم کرمە بەخێو دەکەن خواردنی گەڵای دارتووە . ★ ئارمووش . هەرمووش . هەورێشم . (بک.) هەڤرمش . هس : ئاوەڕێس . **ئاوریشمی خاو** ـ (نت.) ئاوریشمی نەڕێسراو ، بۆ چنین و تەنینی هەندێ پارچەی تایبەتی ( هەوری ، سرکەیی ) یا نەخشاندنی تەکەڵتووی زینی ئەسپ و ئەو جۆرە شتانە بەکاردێت .

**ئاوریشم دۆز** ـ ١ـ (نت.) هەرشتێکی بە ئاوریشم نەخشی لە سەر کرابێ . ٢ ـ ( صت . ) حاڵەتی هەرشتێ کە بە ئاوریشم نەخشێنرابێ . □ « وەستای سەراجم لە بۆبێنن ، تەکەڵتووی ئاوریشم دۆزم بۆ پێك‌بێنن . » (تحفە : ج٢ـ١٦٥) . ٣ـ (صفا.) کەسێکی بە ئاوریشم چتان دەنەخشێنێ . :: وەستا سەعیدی ئاوریشم‌دۆز .

**ئاورینگ** ـ ( نا. ) تە : ئاورنگ.

**ئاورینگ‌دان** ـ ( مصت. لا. ) تە: ئاورنگ‌دان .

**ئاوڕژاندن** ـ (مصت. مت. ) ١ـ بەتاڵ‌کردنی ئاوێکی لە گۆزە و .... دایە و بە عەرزیدا بڵاوکردنەوەی . :: ئەو هەموو ئاوە چیە ڕژاندووتانە . ووشیار بە ئاوەکە نەڕژێنی . ٢ـ (کن.) ئێشێك یا ڕێ و شوێنێك کردن بە باو ، داب و دەستوور داخستن ، داهێنانی بیدعەتێك . :: ئاوێکی وای نەڕژاندوە خۆشەوە بێ . ئاوێکی خراپیان ڕژاندوە .

« بێفایدەیە مەنعی من ئێستاکە لە گریان »
« بۆ عاشقی بێچارە زوو ئەم ئاوە ڕژاوە »
( نالی : گە ـ ٧١ )

تێب ـ ئەم ووشەیە زیاتر بۆ لانی خراپە و لۆمە و سەرکۆنە کەڵکی لێوەردەگیرێ . ★ ئاوڕشتن .

**ئاوڕشتن** ـ (مصت. مت.) تە : ئاوڕژاندن/١ و ٢ .

**ئاوڕشێن کردن** ـ (مصت. مت.) ، (سیە.) تە : ئاوپرژێن کردن .

**ئاوڕۆشنکەرە** ـ [ ١ـ ئاو/١ + ڕۆشن + کەر + ٥ ـ ئە/١ ] ،

( نت.) ، ( سن.) تم : ئاوڕۆنکەرە.

**ئاوڕۆ ـ** [ ١ـ ئاو/١ + ڕۆ ] ، ( نت.) تم : ئابڕۆ .

**ئاوڕۆبردن ـ** ( مصت. مت.) تم : ئابڕۆبردن .

**ئـاوڕۆچوون** ( مصت. لا.) تم : ئابڕۆچوون .

**ئاوڕۆنکەرە ـ** [ ١ـ ئـاو/١ + ڕۆن + کەر + ٥ ـ ئە/١ ] ، ( نت.) گیانداریکی پچوکـه ، لەشـی بـه ئەندازەی دەنکە جۆیێکە یا تـۆزێ گەورەتر ، چەند قاچی درێژی هەیە، لە هەندێ کانیاواندا دەبێنـدرێ ، هەمیشە بە سەر ئـاوەوەیە و زۆر خێرا دەجولێتەوە . گۆیا خلت و خاڵ و لیتەی ئاو دەخوا و کانیاوێکی ئەو گیـانداره‌ی تێـدابێ ئـاوه‌که‌ی هەمیشە ڕۆن دەبێ و لای خەڵـك پەسندە . ★ ئاوڕۆشنکەرە .

**ئاوڕێژ/گە ـ** [ ١ـ ئـاو/١ + ڕێژ + گە = جێ ] ، ( نت.) ، (سن.) تم : ئاوەڕۆ/١ .

**ئاوڕێش ـ** [ ٢ـ ئاو + ڕێش ( = ریش ) ] ، ( نت.) ، ( مک.) تم : ئاوڕێش‌بون . تێب ـ ئەم ووشـەیە بە تەنیایی‌دە کار ناکرێ، لە فارسیدا ( هم‌ریش ) ئاوال‌زاوایه .

**ئاوڕێش‌بون ـ** ( مصـت . مت . ) کتـوپڕ پـەلاماری کەسـێك دان ، بڕپێداکردن و چنـگ لێ‌قایم‌کردنی (بە جۆرێ کە ڕێشیان تێك‌بئالێ ! ) :: هەر لە دوره‌وه ئاوڕێشم بۆ ( بۆ بە هاوڕێشم ) .

**ئـاوڕێل ـ** [= فەڕەنسـێ : نافریل ] ، ( نا.) ، ( کێیر.) مـانگی چوارەمی سالی فەڕەنگی،دەکەوێتە نێوان مارت و مـایس ، ٣١ ڕۆژە . ★ نیسان .

**ئـاوزان ـ** ( مصـ . لا. ) تمـ : ئاووزیان ( تم : خا . ج ١ ـ ٦٣ )

**١ـ ئاوزەنگی ـ** [ ؟ ] ، ( نت . ) ، ( مک .) تم : ئاوێلکە :: لە ئاوزەنگییان دایە . ★ ئاوزینگ ، ئاوەزینگ .

**٢ـ ئاوزەنگی ـ** [٢ـ ئاو + زەنگ + ٢ ـ ئی ] ، ( نت . ) ئـالقەیێکی مەعدەنە بە هۆی ( لوقمە )وە بـەو لاولای زێنی ئەسپدا شۆڕ دەبێتەوە و تانێزێکی بـەرزگی وولاغ دێت ، لە کاتی سوار بونا،قاچی دەخەنە سەر و خۆهەلداوێنە سەر خانـەی زێن ، پاشـ سواربونێش سـوار لاقی تێ دەکا و بـۆ لێخوڕێنی وولاغێش بـه کاری دێنێ . ★ ڕکێف . زەنگـۆ ( بک.) . ووزەنگی . تێب ـ (زەنگ) کـە لـە تـەرکیبی ئـەم ووشـەیەدا دەبینێن، لە ووشەی (زەنگاڵ)یشدا هەیە ، هەر ( زەنگ )ی پەهلەوێیە کە مانای پـۆز و بەلـەکە ( تم: د . فرەوشی : فەرهەنگی پەهلـەوێ ـ ٥٠٩ ) .

**ئاوزەنگی پێداهێنان ـ** ( مصت. مت . ) تم : ئاوزەنگی لێدان .

**ئاوزەنگی تێ‌تەقاندن ـ** ( مصت . مت . ) تم : ئاوزەنگی لێدان

**ئاوزەنگی تەقین ـ** ( بنت . ) تم : ئاوزەنگی کوت .

**ئاوزەنگی دار ـ** ( صت . ) حالی قاچی پشت زەق و دەرپەڕیو ، قاچێ کە پشتی لە قاچی ئاسـایی زۆرتر بەرز بێ ، قاچی کەوانی .

**ئاوزەنگی داگرتن** ــ(مصت. لا.)، ( کن . ) پێداگرتن لە سەر قسەی خو ، پێ لێ دەکەوش کردن ، پێ لێ دەپێسوڵێ کردن ( لە کەسێ ... بۆ کارێ ) ، ئیسرارکردن . :: ئاوزەنگی داگرت تا پارەکەی لێ نەستاند وازی نەهێنا . ★ سم چەقاندن . تێبـ ــ قورسایی خستنەسەر ئـاوزەنگی ( داگرتنی ) بۆ وەستاندنی وەڵاغە ، ئاشکرایە کە وولاغ وەستا،سواریش هەر وەستاوە ، بە سوارێ وەستان نیشانەی بە پـەلە بونـە کـە دەبێ مەبەستەکەی زۆ جێبەجێبکرێ ، جا بۆیە ئەم ( کینایە ) لە زمانی کوردیدا پەیدابوە .

**ئاوزەنگی‌کوت** ــ [ ئـاوزەنگی + کوت (کوتان) ] ، (بنت.) ١ــ جۆرێك لێخوڕینی وەڵاغە کە هەر خێرا خێرا ئاوزەنـگی لێ بـدرێ بـۆ ئـەوەی ڕانەوەستێ . ٢ــ ( کن . ) خێرایی . :: ئاوزەنگی کـوت خۆیان گەیـاندە سەنگەرەکـان . ★ چـوارناڵە . ڕکێف کوت .

**ئاوزەنگی لێدان** ــ (مصت . مت .) ١ــ بە کار هێنانی ئاوزەنگی بۆ خێرا لێخوڕینی وولاغ . :: کوڕە ئاوزەنگی لێدە بـا بڕوا . ٢ــ ( کن. ) خێـرا ڕۆیشتن. ★ ئاوزەنگی پێدا هێنان، ئاوزەنگی تێ‌تەقاندن . رکێف لێدان.

**ئاوزینگ** ــ [ ٤ ] ، ( نت . ) تە : ئاوێلکـە .

**ئاوساگ** ــ ( نمف . لە : ئاوسان) تە : ئاوساو .

**ئاوســـــان** ــ ( مصـ . لا . ) بەرزبونەوە و هەڵمسـانی شوێنێکی لەشی ئادەمیزاد یا گیاندارێکی تر ، لەبەر نەخۆشی ، یان هەر هۆیەکی دیکە . :: هێندەی ئاو خواردۆتەوە زگی ئاوساوە . بزنێك لەو دەشتە مندار ببۆوە ئاوسـابۆ ، نەخۆشی گورچیلە ، لەش دەئاوسێنێ . ★ ئاماسان . ئاماسیان . ئاووسیان . ئەستوربون . باکردن . پـەنمین . هەڵامسان . هەڵمسـان . هـس : ئاووس .

**ئاوساندن** ــ ( مصـ . مت . ) بونە هۆی باکردن و ئەستوربون .

**ئاوساو** ــ ( نمف . لە : ئاوسان) لەشی ئادەمیزاد یـا گیاندارێکی تر ( هەموی یا شوێنێکی ) کە ئەستور بوبێ . :: ئەوە چاووت بۆ ئاوساوە ! ★ ئاماسیاگ. ئاوساگ. ئاووسیاگ پەنماو . هەڵمساو .

**ئاوساوی** ــ ( حمصـ) . ئەنجامی ئەســتوربون . :: ئاوسـاویەکەی هێشتا نەنیشتۆتەوە .

**ئاوسێ** ــ [ ٢ــ ئـاو + سـێ ( نیسێ ) ] تە : دراوسێ .

**ئاوشار** ــ [ ١ــ ئـاو + شـار ( ند. ) ] ، ( نت.) ١ــ ئەو شوێنەیە کە ئاوی چەم و ڕۆباران ، لەبەرزیڕا ڕژد و بە خـوڕ دەڕژێنـە خـوار ، هەڵدێرانی ئاو لە شوێنێکی بەرز و ڕژدەوە . :: ئـاوشاری بێخـاڵ لە کوردستانە. ئاوشاری هەرە گەورەی دنیا ، نیاگاڕایە . ★ ئابشـار. بافڵ. ( بک . ) تاڤگە . تـاف . تـافگە . قەلبەزە . تێبـ ــ ئەم ووشەیە مردۆخ نۆسیویە و لە ( آبشار )ی فارسیڕا شـێوەی کوردی دراوەتـێ ، ئـەو

هاوتایانەی کە بۆی نووسراوون هەمۆی بۆ ئەم مەبەستە بە کار دێن کە ئاوشار پێشانی دەدا ، بەڵام شەرت نیە ئاوشاری ( نیاگارا ) و ( بێخاڵ ) بن .

**ئاوشکان** ـ( مصت.لا.) کەلەبەر کەوتنە ئەو جۆگەیەی کە ئاوی پێدا بەر دراوەتەوە سەر کشتوکاڵ و ڕۆیشتنی ئاوەکە بەلایێکی ترا . :: کوڕە بە سەر ئەم جۆگەیە دابڕۆ بزانە ئاوەکە لە کوێ شکاوە .

**ئاوشکاندن** ـ ( مصت . مت . ) لادانی ئاوێ کە بەردرابێتەوە بۆ سەر کشتوکاڵ ، بۆ لایەکی دیکە .

**ئاوشنگ** ـ [ ؟ ] ، ( صت . ) حاڵەتی وەشێرهاتنەوەی مەڕ یا بزنێ... کە بێچوی مردبێ و شیری ئیشکی کردبێ .

**ئاوفرۆش** ـ ( نفا . ) کەسێکی لە ناوبازاڕ و کوچەو خەیابان و...دا ئاو بە خەڵك دەفرۆشێ . ☐ « پیاوێکی ئاوفرۆش لە شاری ( غەزنە )یدا ئاو فرۆشی دەکرد . » ( تحفە : ج ١ ـ ١٨٥ ).

**ئاوفرۆشی** ـ ( حمص. ) کاری کەسێکی ئاو دەفرۆشێ .

**ئاوقە** ـ [ ٢ـ ئاو + قە (قەد) ]، ( نت . ) پەلامار . ئاوڕێش . تێب ـ ئەم ووشەیە فەرقی دەگەڵ (ئاوڕێش) لەوەدایە کە لەوێدا ( ڕێش ) دەبێتە یەك و لێرەدا (قەد) ، بۆیە پەلامارەکە بە گوڕترە ★ ( سن. ) ئەوقە .

**ئاوقەبوون** ـ ( مصت . لا. ) پەلاماردانی کەسێ ، چنگ لێ قایم کردنی بە جۆرێکی وەکو یەك کەس

بێنە بەر چاوان .

**١ـ ئاوکردن** ـ ( مصت . مت . ) ڕشاندنی ئاو لە هەندێ شت ( نان ، توتن ، ... ) بۆ نەرم بونەوە و خاو بونەوەیان . :: نانەکە ئاوکە و داپۆشە ، توتنەکەیان ئاوکردوە ئیمشەو دایدەگرن .

**٢ـ ئاوکردن** ـ ( مصت . لا. ) ١ـ پەیدابونی زنچکاو لە کوان و برینانەدا . ٢ـ فرمێسك‌کردنی چاو لەبەر نەخۆشی یا هۆی‌تر ، بە جۆرێ کە هەر لە چاوا قەتیس بمێنێ و وەك فرمێسکی گریان بە ڕومەتا نەیەتە خوار .

**ئاوکێش** ـ ١ـ ( نفا . ) ئەو کەسەی لە چەم و ڕوباران ، بە کرێ ئاو بۆ ماڵان دەبا . کەسێکی پێشەی ئاوکێشی بێ . ٢ـ ( صت . ) خواردەمەنی و چێشتێکی پاش خواردنی پیاو زۆ زۆ تونی بێ و حەز لە ئاو خواردنەوە بکا . :: پەنیر ئاوکێشە . کفتە ئاو کێشترە . هەمو چێشتێکی سوێر ئاوکێشە . ★ ئاوخواز .

**ئاوکێشان** ـ ( مصت . مت . ) گواستنەوەی ئاو لە چەم و ڕوبار و کانیاوان ، بە دەفر بۆ ماڵان .

**ئاوکێشی** ـ ( حمص. ) کار و پێشەیێکی ئاوکێش ئەنجامی دەدا . :: پورە فاتم ژنێکی ئازایە ، ئەو منداڵانەی هەمو بە ئاوکێشی ماڵان پێکەیاندوە .

☐ « ئەر ماچێ هەم ناخاس هەم نائیخلاسم »

« خۆ پەی ئاوکێشی مەتبەخت

خاسم »
( خانا ــ ٥٨٧ )

**ئـــاوگرتن ــ** ( مصــد . متــ . )
کۆکردنەوەی ئـاو لە ئەســتێڵ و گۆلدا ، بـۆ ئـەوەی زۆر بـبێ و کشتوکاڵی پێ بدێرن . یا بۆ هــەر مەبەستێکی‌تـر . :: ئـــاوەکەمان گرتـــوە ، ئیمشـــەو تووتنەکـــە دەدێریـن . // ئـاوبەردانـەوە .
٢ــ گوشینی هەندێ میـوەی ئاودار ( ترێ ، پرتەقاڵ ، هــەنار . . . ) و جیاکردنـەوەی ئاوەکـــەیان بـــۆ خواردنەوە .

**ئاوگرتنەوە ــ** ( مصد . متــ . )
بەری جارێ بوونی ئاو گرتن ، پـاش ئەوەی کە بەردرابێتەوە بـۆ ســەر شوێنێك .

**ئاوگەردان ــ** [ ١ــ ئـاو/١ + گەردان ] ، ( نت . ) **کەوچکێکی مسی** ( یا هەر مەعدەنێکی تر ) **گەورەیە** ، بە ئەندازەی جامێـك ، دەســکێکی درێژی هەیە . **ئاو یا شتی تری پێ لە مەنجەڵی گەورەوە هەڵدێنجن** . بۆ شیو و کوڵ و چێشت لێنانی زۆر بـەکـەڵك دێت . ★ ( ســنـ . ) کەوجێز .

**ئاوگیر ــ** ( نت . ) ئەو کەسەی لە حەمام خزمەتی خەڵکی دەکا ، ژن بێ یا پیاو .

**ئاولەمــە ــ** [ ؟ ] ، ( نتــ . ) ، ( سنـ ) ١ــ منداڵ ، کە هێشتا لە زگی دایکی‌دا بێ و گیانی وەبەر نەهاتبێ ، (عا .) جنین . ٢ــ منداڵی لە بارچوو ، منداڵێ کە لە خۆیەوە ، یا بە هۆی داو و دەرمان و شتی تر بە مردوویی لە زگی ئافرەت بێتە دەر . ٣ــ بەرخ و کاریلەی وە ڕوح نەهاتوو ، کە پاش سەر بڕینی مەڕ و بزن ، لـە زگی دایکیـــان دەیانهێننـــــە دەر . ★ نەبەکام .

**ئاولێچوون ــ** [ ١ــ ئاو/١ + لێ ( لە + ی ) + چوون ] ، ( مصد . لا. ) بەند نەبوونی ئاو بە دەفرانـەوە . :: ئافتـــاوەکە ئـاوی لێدەچێ بیبـەن لەحێمی کەن. گۆزەکە ئاوی لێدەچوو پنجمان‌کرد .

**ئــاولاوێ ــ** [ ئاولە/١ + ٢ ــ ئاوێ ] ، ( صد . ) کەسێکە ئاولەی دەرداببێ و چاك بووبێتەوە و شوێنی پۆرگەکانی بە دەم و چاو یا جێگای تری لەشـیەوە مابێ . ★ کونج . کرۆێ .

**ئاولە ــ** ( نا . ) ١ــ نەخۆشییەکە زیاتر منداڵ دەیگرن، تەشەنە دەکا و یەك لە یەکی دەگرنەوە . تێبـ ــ ئەم نەخۆشییە بە هۆی ( ڤیرۆس )ێکی تایبەتی پەیـدا دەبـێ ، نیشانەکانی ئەوەیە کە لە پێشدا تایەکی قورس لەشی پیـاو دادەگرێ و تیغەرەی پشت ژان دەکا ، پاشان هەموو لەش یا هەندێ جێـگای پـۆرگی پچـووك ( ئاولــە ) دەردەدا کـە زنچکاویان تێدایـە . نەخۆشـــێکی گـران و کوشندەیە و هەر لە صەت کەس کە دەیگرن پازدەیان مەترســی مردنیان لێدەکرێ . لە حالی چاك بوونەوەش دا ، گەلێ جار شوێنی پۆرگەکان کە ئیشك دەبن بە چـالێ دەمێننەوە و پیاو گرۆێ دەکا . بۆ پێشگرتن بەم نەخۆشییە،ئێستا ماکی (واکسێن//

لقـاح ) تایبـەتی هەیـە ، منـاڵ و گەورەی پێدەکوتن . پێش ئەوەی ئەم دەرمانە تازەیە لە کوردستان بڵاو ببێتەوە ، زنچکاوی پۆرگی ئاوڵەیان کۆدەکردەوە و بـە نـوکی نەشـتەر جێگایەکی لەش ( زیـاتر باسـك و قۆڵ)یان دەڕۆشاند و لەم زنچکاوەیان تێدەکرد. گا و مەڕ و بزن و هەندێك باڵندەش تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن ★ خروێکە ، خروێلکە . ( بک . ) : خرۆکـە ، خـوری ، خورێـك . ٣ـ ئەو پۆرگانەی ئینسانێ کە تووشی نەخوشیێ خورێکە دەبی، دەرێ‌دەدا. هەوڵـە ، هاوڵـە . ٣ـ پۆرگێکە لەئەنجامی بەپێ‌ڕۆیشـتنی زۆر ، لەبەرێ‌پێ و یا لەبەر سووتانی لەش بە ئاوی لەکوڵ و ئاوور لەشوێنـە سووتاوەکە ، پەیدا دەبێ و ئەگەر دڕا ئاوی لێدێ .

☐ « لـەب وەتەمـای دڵ چەنـد
حەسرەتش بەرد »
« پێش ئاوڵە کەرد ، فرسەتش
نـاوەرد »
( مەولەوێ : مکب ـ ١٥٧ )

★ بلۆق . تلۆق . گۆزاوڵە .

**ئاوڵەدەردان** ـ [ ئـاوڵە/١ + دەردان ] دەرهاتنی پۆرگی خروێکە لە لەشی کەسێ . :: ئـەم منـاڵە بەسـتەزمانە ئەوەنـدەی ئـاوڵە دەرداوە هەر چاوی بە دەرەوە ماوە.

**ئـاوڵەکوت** ـ [ ئـاوڵە/١ + کوت ] ، ( صفا. ، نفا.) ئەو کەسەی پیشەی ئەوەیە مـاکی دژی ئـاوڵە لەخەڵك دەدا:: مەمەندی **ئاوڵەکوت** چۆتە شار مـاکی ئـاوڵە بێنـێ ، ( صفـا . ) . ئـاوڵەکوتێکمـان دەس‌کەوتایە منداڵەکانمان دەکوتا ، ( نفا. ) .

**ئـاوڵەکوتان** ـ [ ئاوڵـە/١ + کوتـان ] ، ( مصـت. لا. و مـت. ) بەکارهێنانی ماکی دژی‌ئـاوڵە بـۆ ئەوەی منداڵ یا گەورە تووشی ئـەم نەخۆشـییە نەبـن . :: شێرکـۆ ئاوڵەی‌کوتاوە باسکی ئاوساوە (لا.). لە شارەوە هاتوون ئـاوڵە دەکوتـن ( مت.) . تێبـ ـ أ ) بە دەمی نەشتەر، یا تێغێکی تایبەتی جێگایێکی لـەش ( زیاترباسـك و قـوڵ ، هەنـدێ جاریش ڕان ) چێغدەکەن و ماکەکەی تێدەکەن.ب) ئەم مەصدەرە ئەغلەب کورت دەکرێتەوە و تەنیا (کوتـان) مەبەسـتەکە دەگەیێنـێ :: خـۆی کوتاوە . منداڵەکان دەکوتن .

**ئاوماڵك** ـ [ ١ـ ئاو/١ + ماڵ ( ماڵین ) + ئك ] ، ( نت.) ١ـ هەر شتێکی ئاو لە شوێنێکەوە هێنابێتیە شوێنێکی تر . ٢ـ پۆش و پەڵاش و کوتەرەدار و لق و پۆپی داران کـە پاش نیشتنەوەی لافاوی بەهاران لە بەستێنی چۆمان بە جێ دەمێنـێ .

★ ئاوماڵە .

**ئاوماڵە** ـ [ ١ـ ئاو/١ + ماڵ + ە ـ ئە/١ ] ، ( نت.) ، ( سن.) تە: ئـاوماڵك .

**ئـاونە** ـ [ ١ـ ئاو/١ + نـە ( = نەی ـ قامێش ) ] ، ( نتـ. ) ، ( سن.) ئامرازێکە وەکوو دارجگەرە وایـە سـەرێکی دەخرێتـە کونـی ( داری‌نێرگەلە) و سەرەکەی تریشی دەچێتە نـاو شووشـەی ئـاوەکە ،

دۆکەڵی تەماکۆ ڕادەکێشێتە ناو ئاو لەوێشڕا دەچێ بۆ دەمی نێرگەلەکێش . ★ (مک.) مێلاو .

**ئاووتاو** ـ (نت.) ، (سن.) تە : ئاب‌وتاب .

**ئاودۆ** ـ (نت.) دۆیە ، کە بۆ ئەوەی سارد بێ یا ئەگەر خەست بۆبێتەوە ، ئاوی تێکەڵ دەکەن .

**ئاوور** ـ (نا.) ، (مک.) تە : ئاگر .

**ئاوورپەرست** ـ (نفا.) تە : ئاتەش‌پەرست .

**ئاوورپەرستی** ـ (حمص.) تە : ئاگرپەرستی .

**ئاوورتێ‌بەربوون** ـ (مصت. لا.) تە : ئاگرتێچوون .

**ئاوورتێ‌بەردان** ـ (مصت. مت.) تە : ئاگرتێ‌بەردان .

**ئاوورجا** ـ [ئاوور + جا (جێ)]، (نت.) تە : ١ـ ئاگردان/١

□ « واتش ئاوورجای نیشاتش کامەن »
« عەزمش سەیر کام جاگە و مەقامەن »
(خانا ـ ٥٩ ).

**ئاوورخانە** ـ (نت.) ، (مک.) ١ـ تە : ئاتەشخانە/٢ ، ٢ـ تە : ئاتەشخان ، ٣ـ تە : ئاگرخانە/١ .

**ئاووردۆ** ـ [ ئاوور + دۆ ] ، (نت.) ، (مک.) سۆتەمەنی کە لە کوردستان باو بوە ، تەندوری پێداخەن یا ئاوری پێ‌بکەنەوە (چرپێ ، تەپالە ، پشکەڵ ، ... ). ★ (بک.) ئاردۆ (تە : ژابا ـ ٤ ، کف ـ ٤٨ ) .

**ئاوورکردنەوە** ـ (مصت. مت.) تە : ئاگرکردنەوە .

**ئاوورگ** ـ [ ئاوور + گ ( = گا ) ] ، (نت.) ، (مک.) ١ـ شوێنێکی تایبەتیە لەماڵان ئاگری تێدا دەکەنەوە چێشتی لەسەر لێدەنێن . تێب ـ لە سوچێکی ئاشپەزخانە لە سێ لاوە بەخشت یا بەرد بە بەرزایی ٢٠/٣٠ سانتیمەتر دیوارۆکەیەك دروستدەکەن ، مەنجەڵ یا دیزەی دەخرێتە سەر و لە ژێرەوە بە دار یا هەر سوتەمەنێکی تر ئاگر دەکەنەوە ، دوکەڵکێشی لەسەربانی خانو دەردەچێ . ٢ـ تە : ١ـ ئاگردان/١ .

**ئاووڕ** ـ [ أ ] ، (نا.) وەرگێڕانی سەر بە خێرایی ، بۆ تەماشای کەسێك یا شتێك . :: « ئاوڕێکی پاشەوە » کتێبێکی مێژوی کوردە ، حوزنی موکوریانی دایناوە .

**ئاووڕدانەوە** ـ (مصت. لا.) بە خێرایی سەر بۆ لای تەنیشت یا پشتی خۆ ، وەرچەرخاندن و تەماشاکردن . :: تا ئاوڕم دایەوە خۆی وونکرد . بە لاماندا تێپەڕی هەر ئاوڕیشی نەدایەوە .

**ئاووڕلێدانەوە** ـ (مصت. مت.)، (کن.) ١ـ چاوەدێریکردنی کەسێ ، بە تەنگ کەسێکەوە بون : ٢ـ بە لوتف بون لەگەڵ کەسێ ★ ئاووڕوێدان .

**ئاووڕوێدان** ـ (مصت. مت.) ، (کن.) ، (مەنگوڕایەتی) تە : ئاووڕلێدانەوە .

**ئاووزیاگ** ـ (صفا.) ، (سن.)

١ــ پێگەیشتوو ( لە باری لەش و ئەندامەوە ) :: منالەکە ئاووزیاگە. ٢ــ تێگەیشتوو ( عەقڵی بەشت دەشکێ ) ٣ــ بە توانست ( توانای کردنی کارێکی هەیە) . تێبـ ــ ئەم وشەیە تەنیا مردۆخ نوسیویە و هەر چەند لە شکڵی ( نمف. ) دایە وەکو : هەڵکیریاگ ، کریاگ ئاووسیاگ . . . بەڵام ئەو مەعنایانەی مردۆخ بۆی داناوە ( تم : ج ١ ــ ٣١/٣٠ )وای لێکردم بە ( صفا.)ی بزانم .

**ئاووس ــ** [ ست : ئەپوتهرە ، پە : ئاپوستەن ] ، ( صە.) ١ــ ژن کە منداڵی لەزگی دابێ . ★ دوو گیان. زگپڕ . ( عا.) حاملة. ٢ــ مێیینەی گیانداران ( ئەوانەی بەچکەی خۆیان بە شیری مەمکیان بەخێو دەکەن ) ، کاتێ بەچکەکەیان لە سکدایە . :: ماینەکە حەوت مانگ ئاوسە.مەڕەکە هەراش ئاوسە . ٣ــ حاڵی دار و درەخت ، وەختی بوژانەوە و گوپکە دەرکردن ، گەڵا دەرکردن و گەشانەوەیان :: داراوسان (مانگ) ٤ــ ( کنـ.) ، أ ) حاڵەتی توڕەیی و ڕقی زۆر کە کەسێ لەشتێ یا لە یەکێکی هەڵکرتبێ :: وەختە ئاووس بێ لە داخی ئەم هەتیوە . ب ) حاڵەتی بەغیلیبردن بە کەسێ لەبەر هەر هۆیەك بێ . :: ئەوە بۆچی دەڵەی لە . . . ئاوسن .

**ئاووس‌بوون ــ** ( مصد. لا.) ، ١ــ زگپڕبونی مێیینەی ئادەمیزاد و گیاندارانی مەمکدار ، گۆرانی ( نطفە ) لە منداڵدانیاندا. ٢ ــ هاتنەسەر پشکوتن و گەڵا.دەرکردنی دارودرەخت . ٣ــ (کنـ.) توڕەبوون، ڕق هەڵستان (لە کەسێ ، لە شتێ)، بەغیلیبردن ( بە کەسێ ) .

**ئاووس‌کردن ــ** ( مصد. متـ. ) ١ــ زگپڕکردن ٢ــ توڕەکردن . تێبـ ــ کەمدەکاردەکرێ .

**ئاووسیاگ ــ**(نمف. : ئاووسیان) تم : ئاوساو .

**ئاووسیان ــ** ( مصـ. لا.) تم : ئاوسان .

**ئاووگڵ ــ** ( نتـ.) ، ( کنـ. ) ، أ ) ئەجەل ، مەرگ . ب ) ئەوشوێنەی پیاوی لێ‌دەمرێ . ئەوشوێنەی لێی دەنێژرێ . :: ئاو و گڵ‌ناڵێ بردۆتە ئەستەمبوڵ . ئاو و گڵ هێنابوی . کەس نازانێ ئاو و گڵی کوێی بەنسیب دەبێ .

**ئاووگۆشت ــ** ( نتـ.) ، (کئێر.) چێشتێکی شلەی گۆشتە ، لەتکەنوکی تێدەکرێ و نانی تێدگوشرێ . چەند جۆری هەیە ★ شۆرباو گۆشت ، گۆشتاو .

**١ــ ئاوونگ ــ** ( نا.) دڵۆپە ئاوێکە شەوی بەهاران ، لە بەرەبەیانا دەنیشێتە سەر گژوگیا و هەرشتێکی تر کە لەبەر هەوای ئازاد داندرابێ .

□ « لەب پڕ لە تەبەسوم بە نەسیمێکی بەهاران »
« ئاوونگی‌بەیانانی بنیشێ لە کەناران »
( ئەدەب : گە ــ ٤٤ )

★ خوناو . شەونم. (سنـ.) قەراو.

**٢ــ ئاوونگ ــ** [ ست : هافەنە ،

پە : هاڤەن ] ، ( نا. ) دەفرێکە لە ( زەرد ) دروستدەکرێ و لەمالآن، داوودەرمان ، قاوە ، ئالەت . . . و جۆرە شتانەی تێدادەکوتن ★ دەسکاوونگ ، هاوونگ ، هەوونگ.

**٣ـ ئاوونگ** ـ ( نا. ) هێشوی ترێ ، کە لەهیندێك شوێنی کوردستان داوەبەنی تێدەبەستن و بە مێچی خانۆوە هەلی داوەسن بۆ زستانان ★ ( مک. ) مێلاق (= عا : معلاق ) . تێب ـ أ ) ئەم ووشەیە فارسییە و ئەسلەکەی (ئاوەنگ)ە و دەگەڵ ( آویختن) بەمانای هەلواسین خزمایەتییان هەیە و بێجگە لەوەی کە لەسەرەوە باس‌کرا هەرشتێکی بەهۆی داوەبەنێکەوە بەجێگایەکەوە هەڵاوەسرێ ، دەگوترێ . ب) لە قامۆسەکانی کوردیدا تەنیا مردوخ نوسیویە ( ج ١ ـ ٣٣ ) و (خال)یش ( ج ١ ـ ٦٥ ) بۆ مانای سەرەوەی هەر لەوێ وەرگرتوە .

**ئاووهەوا** ـ ( نت . ) هەمو ئەو کارەساتە تەبیعییانەی ( گەرما ، سەرما ، ئەوشاری ئاتمۆسفوز ، باوبڕ و گەردەلول ، بەفروباران و تەرزە )کە زانستی هەواناسی ( علم الانواء الجوية ) دەیانگرێتەوە و خۆشی و ناخۆشی ووڵاتێك یا شوێنێکیان پێ دیاری دەکرێ . :: ئاووهەوای عەرەبستان گەرمە . ئاووهەوای کوردستان خۆشە .

□ « یاخۆ پەلە بەفرێکی کە ئەسلا نەشکابێ »
« قەندیلی مونیری گوزەری ئاووهەوابێ »

( نالی :گە ـ ٨٩ )

**ئاوها** ـ [ = ئاوەها ] ، ( بنت.، صت . ) تە : ٢ـ ئاوا .

**ئاوهاتنەوە** ـ ( مصت . لا. ) ، ( کن . ) هاتنە دەری ( مەنی ) لە ئامرازی نێرینەیی ئادەمیزادو هەندێ گیاندارانی تر ، لە کاتی جوتبونی نێرینە و مێیینەیان یا بە هەر شێوەیێکی دیکە . ★ رەحەتبون .

□ « ئەسپەرەش هەر ئاوی هاتەوە گیانی دەرچو »

**ئاوەچۆرکردن** ـ [ ١ـ ئاو/١ + ٣ـ ئە/٢ + چۆر ( چۆرانەوە ) + کردن ] ، ( مصت . مت .) هەڵخستنی کەل‌وپەلێ کەشۆرابێ یا تەر بوبێ (لە بەر هەرچی بێ ) و ئیشك‌کردنەوەی بە کوشتن پێك نەیەت. :: بەرماڵەکە ئاوەچۆرکەن . نمەدەکەمان ئاوەچۆر کرد .

**ئاوەچۆرە** ـ [ ١ـ ئاو/١ + ٣ـ ئە/٢ + چۆر+ ٥ـ ئە/١]، (نت.) ١ـ تکانەوەی ئاو لە شتێك کە دە ئاو هەڵکێشرابێ یا کەوتبێتە ئاوەوە ٢ـ ( کن . ) جاری‌بونی ئارەقە بە لەشی ئینساندا . :: بەرەکەمان هەڵخستوە لە دوێنێوە هەر ئاوەچۆرەیەتی .

**ئاوەخانە** ـ [ ١ـ ئاو/١ + ٣ـ ئە/٢ + خانە ] ، ( نت . ) ، ( مک. ) قوتوێکی تەنەکەیە بە ژێر بێشکەی منداڵەوە هەڵداوەسرێ و بلوێری دێتە ناو ، کە مناڵەکە مێزی کرد بە بلوێردا دێتە ناو ئەو قوتوە .

**ئاوەخۆرە** ـ [ ١ـ ئاو/١ + ٣ـ ئە/٢ + خۆر ( خواردن ) + ٥ـ

ئە/١ ] ، ( نت . ) ١ــ مەغزی دار و درەخت ، کە لە ناوەڕاستیدایە و پاش توێکڵ و بەشە سەختەکەی دێت ، هەر لە جسنی دارە بەڵام تۆزی فشەڵە ، ئێتسی ئەوەیە ئاوێکی ڕەگ و ڕیشەی درەخت لە زەوی وەریدەگرن ئەویش هەڵی دەمژێ و لق و پۆپی دارەکەی پێ تێراو دەکا . ٢ــئەو لولە قەفقەفەیە کە خواردن و خواردنەوەی لە ناودەمڕا پێدا دەچێتە ناو وورگی گیاندارنەوە. ★ سوریچکە ، سورێنە ، قورگ . گەرو . ٣ــ جۆرێك ڕاوەکەوە ، ڕاوەکەو لەو کاتەدا کە بۆ ئاوخواردنەوە دێتە سەرکانی . ★ ( هو . ) ئاوەوەرە . ڕاوەسەرکانی .

**ئاوەدان ــ** [پە : ئاپاتان] ، [ئاوەد + ٢ــ ئان/١ ] ، ( صت . ) ١ــ حاڵی شوێن و جیگایەك ، کە بۆ دانیشتنی خەڵك و نیشتەجی بونیان تەرخان کرابێ و چۆل نەبێ . :: ئەم دێیە ئاوەدانە ( خەڵکی لێیە ، چۆل نیە ). وەك ئاوەدان نەبێ وایە ( دیارە خەڵکەکەی ڕوییشتون چۆلیان کردوە). ماڵتان ئاوەدان بێ (هەمیشە خەڵکیتێدابێ ، ڕەچەڵەکتان نەبڕێتەوە ) . ١ــ ( مجـ. ) زۆر لە شوێنێ ، قەلەبالغێ ، أ ) کۆبونەوەی خەڵکی :: ئەم ڕەمەزانە مزگەوت ئاوەدان بون ( خەڵك هاتوچۆیان دەکرد ) چاخانەکە ئیمشەو ئاوەدانە . ب) زۆرزانێ ، بە تایبەتێ بەو کەسانە دەگوترێ کە پێیانەوە دیار نەبێ شتێك بزانن یا لەشتێ بزانن :: وای مەبێنە ! لە دڵی خۆیدا ئاوەدانە (زۆر دەزانێ) . ★ ١ــ ئاوا/١ . ١ــ ئاوان .

**ئاوەدانبونەوە ــ** ( مصت . لا . ) سەر لە نوێ کۆبونەوە و نیشتەجێ بونی خەڵك لە شوێنی کۆنە دێ یا کۆنە شارێك :: ئەم دێیە کوێرا وا زۆ ئاوەدان بوە . بابل پاش خاپور بونی ئیتر ئاوەدان نەبۆتەوە .

**ئاوەدانکردنەوە ــ** (مصت. مت .) ١ــ سەر لە نوێ بنیات نانەوەی شار یا دێیەك ، کە ماوەیەك وێران و چۆل بوبێ . ٢ــ خانو دروستکردن و کۆکردنەوە و نیشتەجێکردنی خەڵك لە شوێنێكو کردنی بە گوند یا شار. :: (سەڵماس ) لە شوێنی (کۆنەشار) ئاوەدان کراوەتەوە کە بولەرزە وێرانی کرد . ( موسل ) لە نێزیك کاولەکانی ( نەینەوا ) ئاوەدانکراوەتەوە . ( مەهابات ) بداغسولتان ئاوەدانی کردۆتەوە . وا خەریکن ( بابل ) ئاوەدان دەکەنەوە .

**ئاوەدانێ ــ** [ئاوەدان + ٢ــ ێ]، (نت .) ١ــ جێگایەك خەڵکی زۆر تێدا نیشتەجێ بێ ( شار ، دێ ، ... ) □ « ڕۆی کردە چۆلێ و پشتێ دە ئاوەدانیان کرد » . ٢ــ ( مجـ . ) قەرەبالغێ ، کۆبونەوەی خەڵکی زۆر لە شوێنێ □ « هەی داد ، هەی بێداد ، ئەی ئاوەدانێ + قەبرم بۆ بکەنن ، لە ڕێگەی ، کانێ » ( فۆلکلۆر ) . ٣ــ ( حمصـ . ) جێگای ئاوەدان ، شوێنێ کە وێران نەبێ . // چۆلێ ، وێرانێ .

**ئاوەدز ــ** [ ١ــ ئاو/١ + ٣ــ ئە/٢ + دز ] ، ( نت . ، صنـ . ) ،

( مک . ) برینێکی ئـاوی تێچووبێ و وەبنی دابێ . ★ ( سنـ . ) ئاوجز . ( سیم . ) ئاودز/٢ .

**ئاوەدزبـوون** ــ ( مصتـ . لا . ) ئاوتێچـوون و ئاوسـانی برینـان :: دەستت تەڕ نەکـەی دەنا برینەکەت ئاوەدز دەبـێ . ★ ئـاوەدز کردن

**ئاوەدزکردن** ــ ( مصـتـ . لا. ) تم : ئاوەدزبوون .

**ئاوەڕۆ** ــ [ ١ ــ ئـاو/١ + ٣ــ ئە/٢ + ڕۆ] ، (نتـ.)، (مک.) ١ــ باری ڕەوت و شـوڕ بوونـەوەی ئـاو لـە ناوچەیەکڕا بـۆ ناوچەیەکی تر . :: ئـاوەڕۆی ناوشـــوان دەچێتـەوە کەرکوك . ئاوەڕۆی مەیـدان بەڵەك دێتەوە مەهابات . ئاوەڕۆی هەندێ شوێنی شارباژێر دەچێتـەوە سـەر دەشتێ . تێبـ ــ ئەم ووشـەیە بـۆ بەشـس‌کردنی مڵـك و زەویوزار و بڕینەوەی گیرە و کێشـە لەسـەر مڵکایەتی جێگایەك بە کاردێت ، هەر جێیەکی ئـاوەڕۆی جێگایـەکی تری بچێتەوە سەر ، ئەگەر هێچ قەباڵە یا شاهیدێ لە گۆڕێ نەبـێ کە مڵکـی یەکێکی ترە ، بە بەشێك لەو شوێنە دادەندرێ کە ئاوەڕۆی لێ دێتـەوە سـەر . ★ ( سـنـ . ) ئاوڕێـژ ، ( سیم.) ئاوەڕێژ . ٢ــ کونێکە لـە دیواری خانووی گونـد و شـارەکانی کوردستان ، ئاوی باران و چڵکاو کە لە ناو حەوشە دا کۆدەبێتەوە پێیدا دەڕواتـە دەر. تێبـ ــ ئێسـتا لـە شارەکانی کوردستان زۆر کەم بـوە یا هەر هێچ نەماوە . ★ ( سـنـ. ) ئـاوڕێکە .

**ئاوەڕووت** ــ ( نمصــ . ) تمــ : ئاوەڕووت‌کردن .

**ئاوەڕووت‌کردن** ــ [ ١ــ ئاو/١ + ٣ــ ئـە/٢ + ڕووت + کـردن ] ، ( مصتـ . متـ . ) داڕنینی تووك و پەڕی ئەوپەلەوەرانەی گۆشتیان دەخورێ. تێبـ ــ پاش کوشتنەوەیان ، دە ئاوی لە کوڵیان هەڵدەکێشن و بە دەست پەڕەکانیان دەڕننەوە. :: هەر دەست بەجێ‌مرێشـــکێکی کوشـــتەوە و ئاوەڕووتی کرد و سـووری کردەوە . تادێینـەوە قەلـەکەت ئـاوەڕووت نەکردبێ خودا هاوار ! .

**ئاوەڕێژ** ــ [ ١ــ ئـاو/١ + ٣ــ ئە/٢ + ڕێژ ( ڕشتن ) ] ، ( نتـ . ) ، ( سیم . ) تم : ئاوەڕۆ/١ .

**ئاوەڕێس** ــ [ ١ــ ئاو/١+٣ــ ئە/٢ + ڕێس (رسـتن) ] ، (نتـ.) جۆرێکە لـە جـۆرەکانی ڕستنی خوریی لە کوردەواریی ، بە دانستە زۆر بـارێك و لـوس بـۆ ( کر )ی تایبـەتی دەیڕێسـن و لـە کـاتی ڕستنیدا پێش ئەوەی بە تـەواوی بایان دابێ ، نـاوبەناو دەسـتێکی تەڕی پێدا دێنن . هس : ئاوریشم

**ئاوەز** ــ [ ؟ ] (نا.) ئەقل‌وفام .

☐ « لە دنیادا ڕەفیقی پیاوی کەر
هەرگیزنەکەی ئەحمەد »
« لە دەس ئینسـانی بێ ئاوەز
هەتا ئاخر سەرا ڕاکە »
( ئەحمەد مختار جاف )

**ئاوەزا** ــ [ ١ــئـاو/١ + ٣ــ ئە/٢ + زا (زایین) ] ، (نتـ. ، صتـ.) (سنـ.) تم : ئاوەزێ .

**ئاوەزێ** ــ [ ١ــ ئاو/١ + ٣ ــ

ئە/٢ + زێ (زایین) ] ، (نت. ، صت.) جێگایەکە ( زەوێ یا هەر شوێنێکی تر ) ، کە لە خۆیەوە و بێ ئەوەی ئاوی لێ نـرابێ ، نـم و شـەی هەبێ و هەمیشە تەڕبێ. ★ئاوەزا . زەناو . (بکـ.) ئاڤزێم .

**ئاوەزێڕ** ـ [ ١ـ ئاو/١ + ٣ـ ئە/٢ + زێڕ ] ، (صمف.) ، (مکـ.) هەر مەعدەنێکی بـە توێژالێك زێڕ ڕۆکێش کرابێ :: ئـەم گەردانەیە زێڕ نیە ئاوەزێڕە (ئاوەزێڕکراوە) .

**ئاوەزێڕکردن** ـ ( مصت. مت. ) (مکـ.) ڕۆکێش‌کردنی خشڵ یا هەر شتێکی تر کە لە مەعدەن دروست کرابێ ، بە توێژالێکی ئاڵتون .

**ئاوەزیو** ـ (صمف.) (مکـ.) هەر مەعدەنێـك بـە توێـژالێکی زیـو ڕۆکێش کرابێ .

**ئاوەزیوکردن** ـ (مصت. مت.) ، (مکـ.) ڕۆکێش‌کـردنی خشـڵ یـا هەرچێ لە مەعدەن دروست کرابێ بە زیو .

**ئاوەزینگ** ـ [ ١ـ ئـاو/١ + ٣ـ ئە/٢ـ + زینگ (زیندوو ?) ] ، (نت.) تم : ئاوێلکە .

**ئاوەژۆ** ـ [ ئاواژ + ٢ـ ئۆ ] ، ( صمف.) ، ( مکـ.) ١ـ پێچـەوانەی بـاری ئاسـایی ، هەڵگـەڕاوەوە ( بو هەمو شتێ ) . (عا.) مقلوب ، معکوس . ٢ـ بەروپشـت‌کراو ( بۆ جل و پۆشـاك ) . **بە ئـاوەژۆ** ـ ( بنت . ) بە شێوەیێکی پێچەوانـە .

**بەراوەژۆ** ـ ( صت. ) حاڵی جـل و پوشاك کە دێوی ناوەوەیان خرابێتە دەرەوە ، بەروپشـت‌کرابن :: ئەوە بۆ چێ کەواکەت بەرئاوەژۆ دەبـەر کردوە ★ (سیمـ. ، هلـ.) بەرەواژ . ( بکـ.) واژێ . واژی‌ڕۆیـن : لـە جێ‌چـوون ، وەرگەڕانـی جمکـەی دەست و قاچ (تم : ژابا ــ ٢٩ ٤ ) .

تێبـ ـ أ ) بە لای منەوە کەرتی یەکەمی ئەم ووشـەیە ( ئاواژ ) لە ووشـەی ( ئەپـانك ، ئەپـاك ، ئەپاچ ) ی ئاوێستایێ کەوتۆتەوە کە بە قسـەی د . معێن ( تم : بوڕهـان . ج ١ ــ ٢١٧ ، پەراوێـز/٩ ) لـە قـاڵبی (ئەپاچ)دا بە مـانای ( بـۆ دواوە ، دێسـان ) چۆتە ناو زمانی پەهلەوێ و ( باز ) ی فارسێ تازەی هەر بـەم مانایانە و چەند مانـایەکی تر لـێ کەوتۆتـەوە . ( ئـەواژ )ی بـن لەهجەکانی سلەیمـانێ و هـەولێر وەچی ڕاستە و خۆی ( ئەپـاچ )ی ئاوێستایین و ( ئاواژ )ی موکوریانێ قۆناغێکی تازەتری گۆڕانی ووشەکە حیسـابە . ب ) بـە وەیـڕا کـە ( ئـاوەژو ) لـە قـاڵبی صفەتـی مەفعوڵێدایە من وای بۆ دەچم کـە دەبێ ( ئەپـاچ )ی ئـاوێستایێ لەو قۆنـاغەدا کە چـۆتە نـاو زمـانی پەهلـەوێ قـاڵبی ( مصـدر )ی وەرگرتبێ و زیاتر لەوە دەکـا ئـەم مەسدەرە لە شێوەی ( ئەپاچتەن ) یا ( ئەپاچێتەن )دا بوبێ بەڵام نە لە کوردێ و نە لە فارسێدا مصدرێکی ئاوام بەرچاو نەکەوتوە ڕێگەی ئـەوە بدا بڵێین وەچـی ئـەو مەسـدەرە کۆنەیە کە (ئاوەژۆ)ی لێ بە جێماوە.

**ئـاوەژۆکردن** ـ ( مصت. مت.) تم : ئاوەژوکردنەوە .

**ئاوەژۆكردنەوە ــ** ( مصت. مت.) ١ــ هەلگێڕانــەوەی شــتێك لــە بارێكــەوە بۆ بــارێكی تــر . ٢ــ بەروپشت‌كردنی جلك و پۆشــتەنێ :: لە كوردەوارێ كە صەگێ بلۆرێنێ لینگە كەوشێك ئاوەژۆ دەكەنەوە . ★ ئاوەژۆكردن .

**ئاوەژەنە ــ** [ ١ــ ئاو/١ + ٣ــ ئە/٢ + ژەن ( ئاژنین ) + ٥ــ ئە/١] ( نت.) ، ( هو.) . تم : ئاوەشكێنە.

**١ــ ئاوەسۆ ــ** [ ١ــ ئاو/١ + ٣ــ ئە/٢ + سۆ = سواو (سوان) ] ( صمف.) ، ( مك.) ١ــ حالی شتێ كە زۆر لە ژێر ئاوا مابێتەوە ، یا زۆر ئاوی بە سەردا ڕوێشتبێ و لێك و لۆس بۆبێ . :: خێزی بن چۆمــان ئاوەسۆ دەبن . ٢ــ حالی شتێك بە ئاو تەڕ بكرێ و لە بەردەزۆرە یا هەر شتێكی تر بخشێندرێ تا ســاف و لۆس ببێ . :: هەلماتەكەی ڕەشۆ ئاوەسۆ كراوە . ٣ــ ( كن.) ، (سن.) ئینســانی بــێ شــەرم ، پیــاوی چاوقایمی بێ چــاوڕۆ . هــس : چەقاوەسۆ .

**٢ــ ئاوەسۆ ــ** [ ؟ ] ، (صت.) ، (سن.) ١ــ ئافرەتێ كە زگ نەكا و مندالی نەبێ . ★ نەزۆك ، نەشۆر. ٢ــ گیانداری مێیێنە كــە بەچكەی نەبــێ . ★ قسر . ئەســتەوێر . ئەستێوور . تێب ــ بە لای منــەوە ئــەم ووشــەیە دەچێتــەوە ســەر ( ئاووس ) و لەگەل ( ١ــ ئــاوەسۆ ) پێوەندێ نیە .

**ئاوەسەر ــ** [ ١ــ ئاو/١ + ٣ــ ئە/٢ + سەر ] ، ( نت. ، صت. ) ، ( سن.) زەویەكی ئاو قۆت نــەدا و كە ئاویان لێ نا لەسەری بمێنــێ و پێیدا نەچێتە خوار . ★ ڕەقەن .

**ئاوەشكێنە ــ** [ ١ــ ئــاو/١ + ٣ــ ئە/٢ + شكێن ( شكاندن ) + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نت.) ١ــ كەلەبەرێكە ، كــاتێ ئــاش دەخەوێنــن دەیكەنــە جۆگەی ئاشەوە ، تا ئاوەكە نەچێتە سەر دۆلاش و بەلایــەكی دیكــەدا بڕوا . ٢ــ بەرهەلستێكی پچۆكــە ، لەبەردەمی جۆگە و بەندان بە خۆل دەیكەن تا ئاوەكە زۆ بكاتە ئەولایەی مەبەستە . ★ ئاوبڕ/٢ . ئاوەژەنە.

**ئاوەشێ ــ** [ ؟ ] ، (مك.) ، ١ ــ ( نا.) نەخۆشییەكە تۆشــی مــەڕ دەبێ و گوانی دێشێ . ٢ــ ( ص.) حالی پەلە دەغلێكی لەبەر بارانی زۆر یا داشتنی زۆر چلچل یا جێ‌جێی ئیشك بۆبێ .

**ئاوەشی‌بۆن ــ** ( مصت. لا.) ، ( مكـ.) ١ــ تۆشــی نەخۆشــێ گوانئێشەهاتنی‌مەڕ. ٢ــ ئیشك‌بۆنی هەندێ شوێن یا چلی پەلە دەغلێك كە زۆر ئاودرابێ یا بــارانی زۆری بەسەردا باریبێ .

**١ــ ئاوەكێ ــ** [ ١ــ ئاو/١ + ١ــ ئــەك/١ + ٣ــ ئێ ] ، ( صت.) ١ــ هەر شتێكی وەكۆ ئاو شل بێ ، ( عا.) مایع . ٢ــ ( سن.) تەڕ .

**٢ــ ئــاوەكێ ــ** [ ؟ ] ، (صــ.) حالی مەڕ و مــالاتی دۆركــەوتە و تاربۆ لە ڕان :: هەر دەلەی گێسكی ئاوەكییە بەم لاولادا دەڕوا .

**ئاوەكی‌بۆن ــ** ( مصت. لا.) تم : ئاوەكێ كەوتن .

**ئاوەکێ‌کەوتن ـ** [ ٢ـ ئاوەکێ + کەوتن]، (مصت. لا.) دوورکەوتنەوە و تەرا بوونی مەڕ و ماڵات لە مێگەل ، یا چوونە ناو مێگەلێکی تر .

**ئاوەڵ ـ** ( نت. ) ، ( سیم. ) ١ ـ تم : ئاواڵ . ٢ـ تم : ئاواڵ منداڵ.

**ئاوەلانە ـ** [ ؟ ] ، (نا.)، (سیم.) خەلاتێکی خاوەن مەڕان ، دەیدەن بە شوان ، کاتی بەکەم بێچووی کە لە دەشت بووبێ ، بیهێنێتەوە بۆ ماڵ . ( تم : هبێد ـ ٤ ، خا ـ ٦٧ ، معر ـ ١٩ ) .

**ئاوەڵدامان ـ** ( نت. ) ، ( هل.) تم : ئاواڵ‌کراس .

**ئاوەڵزاوا ـ** ( نت. صت.) ، ( سیم.) تم : ئاواڵزاوا .

**ئاوەڵ‌کراس ـ** ( نت. ) ، (سیم.) تم : ئاواڵ‌کراس .

**ئاوەڵە ـ** ( ص. ) تم : ئاواڵە .

**ئاوەڵەبوون ـ** ( مصت. لا.) تم : ئاواڵەبوون .

**ئاوەڵەکردن ـ** ( مصت. مت.) تم: ئاواڵەکردن .

**ئاوەنیا ـ** [ ١ـ ئاو/١ + ٣ـ ئە/٢ + نیا (دانیان)] ، (نت.، صت.)، ( سن. ، سیم. ، هل.) ١ـ شێوەیێکی کشتوکاڵە بۆ چاندنی گەنم و جۆ . ٢ـ دەغلێکی بەم شێوەیە چاندرابێ . تێب ـ پاش نێوەی هاوین ، زەویەکی مەبەست بێ بەم شێوەیە دایچێنن ، ئاوی لێ دەنێن و هەر کەشی هاتەوە دایدەچێنن و ئاوی دەدەن ، ئەو ساڵە هەندێ شین دەبێ و زستان لە ژێر بەفرا دەمێنێتەوە ساڵی ئایندە زۆرتر لە دەغلی دیکە پێدەگا.

★ ڕەپستە . کوڵەپەست .

**ئاوموەرە ـ** [ ١ـ ئاو/١ + ٣ـ ئە/٢ + وەر (خواردن) + ٥ ـ ئە /١ ] ، (نت.) ، (هو.) تم : ئاوەخورە /٣ .

**ئاوەها ـ** [ ٢ـ ئا + وە (=وەك) + ها (= هەیە ) ] ، (بنت. ، صت. ) تم : ٢ـ ئاوا .

**ئاوهەڵکردن ـ** ( مصت. مت.) ، ( سن.) تم : ئاوهەڵگرتن .

**ئاوهەڵگرتن ـ** ( مصت. مت. ) جاریێ کردنی ئاو بۆ هەر لایەکی مەبەست بێ و خۆش‌کردنی ڕێگای ئەم جاریێ بوونە . :: کوێخا مارف خەرێك بوو ئاوی هەڵدەگرت .

**ئاوهەڵێنجان ـ** [ ١ـ ئاو/١ + هەڵ (پێبف.) + هێنجان (فع.) ] ، ( مصت. مت.) ١ـ بە دۆڵچە ئاو لە کارێز و چاڵاو هەڵکێشان :: چاڵاوکە مشکی تێکەوت دەبێ حەوت سەتڵ ئاوی‌لێ‌هەڵێنجن (هەڵهێنجن) ئینجا پاك دەبێتەوە . ٢ـ بە قاپ یا ئاوگەردان ئاو لە دەفرێك بەتاڵ‌کردن . :: ئاوی سەر مەنجەڵی گوڵاو ، کە گەرم بوو ، بە ئاوگەردان هەڵی‌دێنجن .

**١ـ ئاوهێنان ـ** ( مصت. مت. )، ( مک . ) تم : ئاوکێشان .

**٢ـ ئاوهێنان ـ** ( مصت. لا. ) ، ( مک.) ١ـ توشی نەخۆشیێ ( ئاوی سپیێ ، یا ئاوی ڕەش ) بوونی‌چاو . :: بارام چاوی ئاوی سپیێ هێناوە حەکیم پێی گوتوە دەبێ ڕاوەستێ تا دەگا ئەوجار عەمەلیاتی دەکا . ٢ـ

خڕبون و ئـاو تێـدا کۆبونـەوەی ڕەفتیسکەی یەکسم .

**ئاوهێنانەوە ــ** ( مصت . مت . ) ، ( کن . ) بەدەست یا هەر جۆرێکی تر ڕەحەتکردن .

**ئاویاری ــ** ( حمص . ) ، (سن . ، هو . ) تە : ئاوداشتن .

☐ «وە قەترەی منیچ ئاویاری کەر»
« مەست بۆ تامەحشەر ، سەر
بارۆ ئەوبەر »
( مەولەوی : مکب ــ ٢٤١ )

**١ــ ئاویە ــ** ( ص . ) ، ( سن . ) تر : ١ــ ئاوی/١

**٢ــ ئاویە ــ** [؟] ، (نا.) ، (سن .) قوڕ ، کە بـە شێوەیێـکی تایبەتی گیرابێتـەوە و کـای لێـدرابێ و شێلدرابێ ، تا بۆ سـاف و لێك و لوسـکردن دە دیـواری ژورەوەی خانوی هەلسـون ، یا بە سەربان و دیواری دەرەوەیدا پـان کەنەوە بۆ ئەوەی باران نەیانشواتەوە و دلۆپە نەکا ★ تەڕاو ، سواخ ، سـواغ ، شمشە ، لەپە ، بانەناو .

**٣ــ ئاویە ــ** [ ؟ ] ، ( نـا . ) ، ( سن . ) ئامرازێکە بـۆ پێکـە وە جۆشدانی دوو مەعدەنان بە کاردێت . تێب ــ شتێشێکی ئاسـنە ، سەرێکی مشتوی داری تێگیراوە و سەرەکەی تری ( هەرەم )ێکی سێ سـوچە بە لایەکدا شکاوەتەوە . بـۆ جۆشدانی دوو مەعدەن پێکەوە ، سـەری ئـەم ئامرازە لـە کورەدا سوردەکەنەوە و ئەو دەرمان و ماددەیەی کـە شـت پێکەوە جۆش دەدا ( قەلایی ، زەرد ، نۆشاتر . . . ) پێی هەلـدەگرن و چەند جارێك بە جەمسەری هەر دوو پارچە مەعدەنەکانیـدا دەخشێنن تا لێك قایم دەبن ★ ( مک . ) هاویە .

**ئاویەدان ــ** [١ــ ئاویە + دان ] ، ( مصت . مت . ) ، ( سن . ) دە دار و دیوار هەلسونی قوڕ (ئاویە) ، لێك و لوسـ کردنی دیـواری ناومـاڵ ★ سواغدان .

**ئاوێر ــ** ( نفا . ، صـفا . ) ، ( هو . ) تە : ئاودێر .

**ئاوێز ــ** ( نـا. ) ، ( سـن . ) شتێکی پچوك کە بۆ مەبەستێك بـە شتێکی گەورەترەوە هەڵاوەسرابێ و پێیداشوڕ بوبێتەوە و بلەرێتـەوە . :: ئاوێزی گوارە ، ئاوێـزی لالە . هس : پەراوێز . تێب ــ ئەم وشەیە لەئەسلا ڕیشەی مصدرێکە کە ئێستا لـە زمـانی کوردیـدا شـێوەی : ( هەڵاوەسـتین ، هەلواسین )ی بـە خۆیەوە گرتوە . ★ ( مک . سیم . ) ئاوێزە . (سن .) دالوچکە، دالوچە، دلۆزکە ، دالوسکە .

**ئاوێزان ــ** [ئاوێز + ٢ــ ئان/٥]، ( صفا . ) حالی کەسێ یا شتێ کە بـە جێگایەکەوە یـا بـە کەسێك و شـتێکەوە هەڵاوەسـرابێ .

☐ « وەرگـەڕێ ئاوێـزانت بـم ، شۆرابەی گوارەی جوانت بم » .

**ئاوێزانکردن ــ** ( مصت . مت . ) هەڵاوەسینی شـتێك بە شـتێکەوە

☐ « چون نەسیم یاوا بە جەختێ »
«ئاوێزانش کرد نە پای درەختێ»
( خانا ــ ٦٠ )

**ئاوێزە ــ** [ئاوێز + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نت . ) ، ( سیم . ، مک . ) ١ــ تە :

ئاوێز. ٢ــ چلچرا. **ئاوێزەی گوارە ــ** ( نت . ) پۆلەکەی پچوکی زێر ، زێو یا هەر شتێکی تر کە قولاپێ تێدەخرێ و بەگوارەدا شۆردەبێتەوە.
★ پڕپرە ، پلپلە ، شۆڕابە .

**ئاوێنــە ــ** [ پھ : ئاپکێنــەك ، ئاپەکێنەك ، ئاپێنەك ] ، (نت .) تەبەقە شوشە یان مەعدەنە کـە ڕویەکێ مشت و مـاڵکراوە یـان دەرمانی تایبەتێ تێدراوە ، وێنەی ئینسان و شتی تر دەخۆیدا دەنوێنێ .

□ « یـەك زەررە عەکسی پڕتـەو دەرکەوت و (تور)ی سـوتاند »
« ئاوێنە سەخت ڕوبو ، لـەم عەکسە تابی هێنا »

( سالم : گم ــ ٣٥ )

★ ئەینێ ( زا ) . جام . نەینك ، قودێك ( بک . ) . هاوێنە ( مک . ) . تێبـ ــ لە زەمانانی کۆنـدا ، تەبەقە مەعدەنێکیان ( زیاتر زێو ) دەهێنا و ڕویـەکیان لێـك و لوس دەکرد و مشت و مالیان دەدا ، تاوێنەی دە خۆیدا دەنواند ، بۆ گەلێ مەبەست کە یەکیان خۆئاڕایش‌دان (بە تایبەتێ ژنان ) بو . بەلام ئێستا شوشەیان بلور جێگەی ( مەعدەن )ی گرتوتەوە کە ڕویەکی (نیترانیزێو) یا (قەلایێ) و جیوەی بـە سـەردا دەکرێ و بـو ئەوەش کـە ( هـەوا ) خراپی نەکا ڕەنگی دەکەن. ڕەنگە کۆنترین جوری ( ئاوێنە )کە ئادەمێزاد وێنەی خوی تێدا دیتبێ ( ئاو) بێ و پاشان هەولێ داوە شتێك لە وێنەی ئاو دروست کا و لەوە دەچێ کە ناوەکەشی لـە ( ئـاو ) و ( وێنـە ) تەرکیب‌بوبێ ، ئەوەش مەعلومە کە هەرتك وشـە گۆڕانێکی زۆریان بەسەردا هاتوە تا گەیشتونە شـێوەی ئێسـتایان . ئاوێنەی ئاسایێ لە شوشـەی تەخت دەکرێ ، بەلام بۆ هەندێ کاروبار و پێویستی عیلمێ جورە ئاوێنەیەك لە شوشـەی ( کوڕ ) دەکەن ، کە ئەگەر دەرمانەکە لە دیوی زەقایێ شوشـەکە بدەن وێنەی شت پچوك دەکاتەوە و ئەگەر لە دیوە قولەکەشێ بدەن ئەوا گەورەی دەکا ، لـە فیزیادا دور و درێژ باسی ئـەم جـورە ئـاوێنانە دەکرێ . **ئاوێنەی بالا بەژن ــ** (نت .) پارچـە ئاوێنـەیەکی گـەورە و چوارگوشـەی درێژوکـەیە کـە دە چوارچێـوە گیرابـێ ★ ئاوێنـەی بالاڕوان، ئاوێنەی بالا نوان، ئاوێنەی بالانوێن. تیبـ ــ جاران لە کوردستان، کە بوکیان بە سواری ئەسپ ، یا بە پێیان دەگوێزتەوە،ئاوێنەیەکی ئاوایان ڕو بە ڕوی ڕادەگرت تا دەیان‌گەیاندە مـالێ زاوای . **ئاوێنەی بالاڕوان ــ** ( نت . ) تم : ئاوێنـەی بالابـەژن . **ئاوێنەی بالانوان ــ** ( نتـ . ) تمـ : ئاوێنەی بالابەژن . □ « وەیوەی چەند جوانە ، ئاوێنـەی بالانوانە » ( فولکلـور ) . **ئاوێنەی بالانوێن ــ** ( نت . ) تم : ئاوێنەی بالابەژن .

**ئاوێنەبەند ــ** ( صت . ) تالار یا وەتاغێـکی دارودیـواری پارچـە ئاوێنـەی تێ‌گیـرابێ :: کوشـکی مێرزێندینی هەموی ئاوێنەبەندبو . تێبـ ــ جاری وا هەیە کە ئەم وشەیە لە باتێ ( صت . ) دەبێتە ( نتـ . ) ئەوێش وەختێـکە ئـەو شـوێنەی

مەبەستە ، زۆر مەشهور بوبیّ و ناوبانگی بڵاوبوبێتەوە . :: ئاوێنە بەندەکەی شێخ حەمە صەددیقی نەهریّ جێگای صەت کەسی زیاتر تێدا دەبێتەوە .

**١ــ ئاویّ ــ** [ ١ــ ئاو/ + ٣ــ ئیّ] ، (صت .)، (سن .) ١ــ زەویّ و زاریّ کە بە ئاوی ڕۆبار و ئەستێڵ و ... کشتوکاڵی لیّ بکریّ. ★ ١ــ ئاویە . بەراو .. // **دێم** ٢ــ ڕەنگی ئاو کە زۆر لە جێگایەك کۆبوبێتەوە ( گۆم ، بەحر ... ) ★ ( مک . ) عابیّ . ٣ــ ئەو گیاندارانەی لە ئاوا دەژین . :: ماری ئاویّ .

**٢ــ ( ــ ئاویّ ) ــ** (پب.) بەدوای ناو ( ئیسمی ذات )ەوە دەلکیّ و دەیکا بە ( صفەت ) :: تۆزاویّ ، خوڵاویّ، ڕێپوقاویّ ، قوڕاویّ ، ماستاویّ .

**ئاوێتن ــ** ( مصت . مت . ) تە : ئاوێشتن . ★

**ئاوێتە ــ** (صمف .) تە : ئامێتە.

**ئاوێژتن ــ** ( مصت . مت . ) تە : ئاوێشتن .

**ئاوێژە ــ** [ ١ــ ئاویّ + ژە ( = چە ؟ ) ] ، (صت .) ، (مک .) زەویّ و زاریّ کەپاییز و بە هاران ئاوی هەبیّ تێبـ ــ کوردوییف ( ئاڤێژە )ی بە دوّ جار نوّسیوە أ) شکانەوە (انعکاس)ی دەنگ و نوّر،بریقە بریقی (سەراب). ب) ئاوەکی ، ئاویّ ، ئاودار ، و هیدرۆژین . گومانی تێدا نیە کە مانای ( هیدرۆژین ) تازە داتاشراوە (تە : کف ــ ٥٣) .

**ئاوێشتن ــ** ( مصــ . متــ . ) ١ــ بەقەوەت فڕێدانی شتێك بوّ ئەولاولا ، بە جۆرێکی وا کە بەسەر زەوێدا نەڕوا :: تێرێکی ئاوێشت ، ئەو تەسبیحەت بوّ چی وا ئاوێشت وەختە بوّ کوێرمانەکەی ، ئێسقانیّ بوّ صەگەکە باوێژە. ٢ــخستنەکار و بەکارهێنانی چەك :: توّپێکی ئاوێشتە سەنگەرەکە لێی نەدا ، پەنجا کەس زیاتر بە جاریّ لە زەماوەندەکەدا تفەنگیان داوێشت . ٣ــ ( کێێر . ) حیساب کردن بە چوّرت ( ئامرازێکە بوّ حیساب ) :: ئەوە چەند جاری ئاوێشتوە هەر دەکا ٣٢٥ تمەن و دوّ قڕان . ئەوی داومانەتیّ بیّئاویّ و ئەوی داوێشێتیّ لێی دەرکە بزانە چەندیّ لە سەر دەمێنیّ . ٤ــ فڕیّدانی شتێك بوّ کەسێك . :: هەر جفارە بوّ دەیئاوێشت . ★ ئاوێتن ، ئاوێژتن . ( بک . ) ئاڤێتن . هاوێتن، هاوێشتن . تێبـ ــ وا دەزانم ئەسلی ئەم مەصدەرە ( ئاوێژتن ) ە و دەنگی ( ژ ) یەکە لە جێرانەتیّ دەنگی (ت)دا بوّتە (ش). لە سەرف‌کردنا بوّ زەمانی ڕابردوّ (ش) و بوّ حاڵ و ئایندەش دەبێتەوە (ژ) :: ئاوێشتم ، داوێژیّ، باوێژە . **تیّئاوێشتن ــ** [ تیّ (پێبف.) + ئاوێشتن ] (مصت . مت .) ، (مک.) ١ــ شتێك‌خستنە ناو شتێك یا جێگایەکەوە . :: بەردێکی دە چاڵاوەکە ئاوێشت تا بزانیّ چەند قوّلە ، خوّی دە باوەشی دایکی ئاوێشت ، لە ترسان خوّی دەپشت پیروّتی ئاویشت . ٢ــ ئاگر و ئاو کردنە ناو سەماوەرەوە و سازکردنی بوّ چا لێنان . سیّ جمە

سەماوەریـان تێداوێشت . ئـەوە هێشـــــتا ســـــەماوەرەکەتان تێناوێشـتوە ؟ ★ تێخســتن ، تێناوێتـــن **دەراوێشــــتن** ــ [ دەر ( پێبف . ) + ئاوێشتن ] ، ١ــ ( مصت . لا. ) هاتنە دەری ( تۆ )ی دەغلی چاندراو لــە زەوێ بە هۆی سارد و سۆڵێ و بەستەڵەکەوە . :: ئەوساڵ گەنمەهەمۆی دەرێئاوێشت . ٢ــ ( مصت . مت . ) کەم کردنەوە و فڕێدان لە کێشانەی ئـەو شتانەی بە تەرازۆ دەکێشرێن ، بـۆ هــەر مەبەســتێ بێ . :: دۆ کێلۆی بـۆ ( دۆك )ەکـەی لێ دەرئاوێشـــت . جێگای ئەم ماستە بکێشەوە و لێێ دەراوێ . ★ لـــێدەرکــــردن ، لێداشکاندن (تەنیا بۆ مانای دوەم). دەراوێتـــن ( بۆ هەمــۆ مانــاکان ) **هەڵاوێشتن** ــ [ هەڵ ( پێبف . ) + ئاوێشـــــتن ] ، أ) ( مصـــت . مت . ) ١ــ بەقەوەت شتێك بەرەولای ژۆرەوەی خــۆفڕێدان . ● « تفت هەڵاوێشتبا دەیبەســت » ( کن . ) زۆر سەرمابۆ . « بەرد هەڵاوێژە و سەری خۆتی وەبەردە » ، ( کن . ) هەرچێ بکەی فایدەی نیە . ٢ــ بە باکردنی خەرمان ، شەنکردن . :: ئیمـرۆ گەنمــەکە هــەڵاوێژن . ٣ــ تەتەڵەکردنی هەندێ شت ( بـۆ خاوێنکردنەوەی ) :: تۆتنـەکەی وا هەڵاوێشتوە ، هیچ دەماری پێـوە نەماوە . ب ــ ( مصت . لا. ) ١ــ بە توندێ لاق لە عەرزیدان و بە گوڕ خۆ بۆ حـەوا بەرزکردنـەوە ( لـە هەڵپەڕکێدا ) :: هەڵیاوێ لە کاکت کـەوێ ، ٢ــ هەڵبـەزێنـــەوە و جۆڵانەوەی هەندێ جێـگای لەشــی ئینسـان :: هــەرچێ دەمــاری لــە لەشدابۆ هەڵێداوێشت . نێر هەیە ســەری دڵــی هەڵبـــاوێ . ★ هەڵاوێتن .

**ئاوێلکە** ــ [ ؟ ] ، (نت.) ، (مک .) دوا پــەلە قــاژەی ئینســـان دەگەڵ مەرگ ، کە ئێدی دەنـگی دەرنایە و چەند جار دەم دادەچەقێنێ و تەواو دەبێ ★ ١ــ ئاوزەنگی ، ئاوزێنگ ، ئاوەزێنگ. سەرەمەرگ، گیانەسەر، گیانەڵڵا . تێب ــ لە ناو کوردەوارێ کە ئینسانێك گەیشتە ئەم حاڵەتە ، ئاوی بە دەمەوە دەکەن ، زۆرتر لۆکە دە ئاو هەڵدەکێشن و دەیچۆڕێننەوە ناو دەمی ، ڕێی تێدەچێ ئەم ناوە و هاوتاکانی کە ( ئاو ) لە تەرکیبیاندا هەیە لەو کارە کەوتبنەوە ، ئـەمە گومانێکە بـەڵام بـەلای خۆشـمەوە سستە .

**ئاهـ** ــ ( ند . ) ١ــ تم : ١ــ ئاخ.

□ « وەك ئاهەکەم دەوان بــە هەتا خاکی کۆیی یار »
« وەك ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی شێوەسۆر »
( نالێ : مقبل ــ ١٦ )

★ ١ــ ئاخ ، ئـۆف ، ـاخ . ٢ــ هەناســەیەکی درێــژە ، لــە قوڵایێ ســینگەوە بـۆ نیشــاندانی خەم و خەفەت و دەربڕینی ئازاری جێگەیەکی لەش ، هەڵدەکێشرێ . ٣ــ (مجـ.) ماوە و مەودایەکی زۆر کەم . :: هەر ئاهێکی مابۆ بخنکێ ، ئاهێکی مابـۆ بکەوێتـە خـوار .

**ئــاه تێدانــەمان ـ** (مصـت. لا.) ١ـ هێچ تێــدانەمان ، لــە کەڵك کەوتن . :: کراسەکەت ئاهی تێدا نەماوە . ٢ـ (کن.) مــردن . **ئاه دەبەردانــەمان ـ** ( مصـت. لا. ) بێ هێزبوّن ، بێ خاسـیەتبوّن . :: ئەم باترییانە ئاهیــان دە بەردا نەماوە بیــانگۆڕە . پێــرۆت ئەو جارێش کفنی دڕێ بەڵام هێچ ئاهی دە بەردا نەماوە .

**ئاه و ناڵه ـ** (نمصـ.) کڕوزانەوە بە دەنگ و هەناســە ، بەدەم (ئاه) کوتنەوە لە سینگێشــڕا هەناســە هەڵکێشان . داد و فیغــانکــردن

**ئاه و نزا ـ** (نمصـ.) بــە دەم ئاخهەڵکێشان و کڕوزانەوەوە ، لە خواپاڕانــەوە و توك و نفــرێن لە کەسێككردن . ★ ئاه و نزوّله .

**ئاه و نزوّله ـ** (نمصــ.) تم : ئاه و نزا . تێبـ ـ کــەرتی دوەم ( نزوّلــە ) وەکو مــن تێی دەگــەم پچــوّك کــراوەوەی ( نزا )یــە و پێوەندێ دەگەڵ ( نزوّل )ی عارەبێ نیــە . :: ڕەببی ! ئاه و نزولــەی هەتێوان بیانگرێ .

**ئاهوّ ـ** ، ( نــا.) ١ـ (مکــ.) نەخۆشــی سوّکەڵە ، کــە تەشەنە دەکا و گــەلێ کەس لە ناوچــەیەك توّشی دەبن . :: ئەم ئاهوّیە هەموّ شــارەکەی داگرتــوە . ٢ـ هــەر نەخۆشییەکی تەشەنە بکا ( وەبا ، تاعــوّن .... ) ٣ـ موتڵــەقی نەخۆشی . ٤ـ (سن.) شــێتی ، فێ . ٥ـ (سن.) عەیب ، عیللەت (تمـ : ١ـ ئاهــوّ) . ٦ـ (مجــ.) خراپ ، ناپەسند . ★ پەتا ، درم ( بو : ١ و ٢ و ٣ ) .

**١ـ ئاهوّ ـ** [ ست : ئــاهو . ، په : ئاهــوّك ] عەیب و عیللــەت ، کەمایەسێ و نقص ( لە شتێکدا ، لە کەسێکدا ) .

□ « ئازێز شوّخشەنگ شێرین
تارەنێ »
« ئاهــوّی بــێ ئاهــوّی وەش
ڕەفتارەنێ »
( مەولەوێ : مکبـ ـ ١٦٥ )

★ ئاهــوّ/٥ . تێبـ ـ ئاهوّکی پەهلەوێ لە ووشــەی ( ئاهو )ی ئاوێستایێ هــەر بەو مانــایەی کە لەسەرەوە باسکرا ، وەرگیراوە .

**٢ـ ئاهوّ ـ** [ په : ئاهــوّك ] ، [ فر . ] ، ( نا. ) تم : ئاســك .

**ئاهەڕا ـ** [ ئاه + ٣ـئە/٢ + ڕا ( = ڕێ ) ] ، (نتــ.) ، (هو.) ڕێگایــەکی بارێکی لەوانــەبێ ، بە زەحمەت پێی بووترێ ڕێگا و هەر ناوی ڕێگا بێ .

□ « وەروێ بــەرد ئەو بەست
گرد گوزەرگایێ »
« دوّی ئازێزشـــــــەن دڵ
ئاهەڕایێ »
( مەولەوێ : مکبـ ـ ٥٣٨ )

**ئاهەك ـ** (نا.) ، (سن.) قسڵ .

**ئاهەنگ ـ** [ په : ئاهەنــگ ] ، (نا.) ، (سیم.) ١ـ کوّڕی بەزم و گــوّرانێ و خوّشڕابواردن کــە بە بوّنەی شــەوارەی منــداڵ ، یــا خەتەنەسوّران و شــتی تری لــەم بابەتە دەگێرێ . ٢ـ هەموّ کوّڕێکی بەزمی گوّرانێ و موّســێقا . (عا.)

حفلـة . ٣ــ (كئێــر.) نەغمـەی ڕێكوپێك ، ئاوازی گۆرانێ . (عا.) لحن . :: ئاهەنگی سێکا . ئاهەنگی دەشت .

□ « نەوای ئاهەنگی (قد قامت) تەرێقی جەمعی زوهادە »
« قەد و قامــەت بە لەهجەی ڕاستێ ، تۆبایی عوششاقە »
( نالی : گم ــ ٥١ )

٤ــ دەنگ ، ئـاواز □ « ووردە ئاهەنـگی دوای كۆكـە نیشـانەی ئەجەلە » (رەزا ــ ٦٤) ٥ــ قەست، نیاز ، عەزم . تێب ــ بە مانـای ( ٥ )ەم لـە فارسێڕا هاتۆتـە ناو زمانی كوردییەوە و لـە قسەكردنا زۆر كەم دەكاردەكرێ .

**ئاهەنگ‌كردن** ــ ( مصتە. متە. ) تە : ئاهەنگ گێڕان .

**ئاهەنگ‌گرتن** ــ ( مصتە. متە. ) تە : ئاهەنگ گێڕان .

**ئاهەنگ گێڕان** ــ ( مصتە. متە. ) ١ــ بەرپاكـردنی كـۆڕی بـەزم و مۆسێقا و گۆرانێ ، بە بۆنەی لە دایك‌بۆنی منالّ یا خەتەنەسۆران و شـــتی وا . ٢ــ كۆبـــۆنەوەی دەستەیێك بۆ رابـواردن و گۆڕانێ كوتن ★ ئاهەنگ‌كردن،ئاهەنگ‌گرتن، حەفلە ، شەونشێنێ .

**ئاهیر** ــ (نا.) ، (هـو.) تە : ئاگر .

□ « ئازیزم ! ئاهیر دوریێ باڵای تۆ »
« جەستـەم كەرد وە بـوڵ ، شەماڵ بەرد پەیكۆ »
( مەولەوێ : مكب ــ ٢٥ )

**ئاهیرێن** ــ [ ئاهیر + ئێن ] ، (صتە.) ، (هو.) تە : ئاگرێن .

□ « نامەكەت یـاوا ، كۆسـم كەفتەوە »
« دڵەی ئاهیرێن دا وە نەفتەوە »
( مەولەوێ : مكب ــ ٤٣٦ )

**ئاهین** ــ (نا.) ، (هـو.) تە : ئاسن

□ « جەزبەی ئاهینم دەماخ‌دان پەرداخ »
« میقناتیز تۆی جام كەردەن وە یاتاخ »
( مەولەوێ : مكب ــ ٤٥٢ )

**ئاهینگەر** ــ (نتە.) ، (هو.) تە : ئاسنگەر .

□ « نـە ئاهینـــگەرێ ، نـە ئاهینگەرێ »
« ئـارۆ ڕاگـەم كـەفت نـە ئاهینگەرێ »
( مەولەوێ : مكب ــ ٤٤٤ )

**ئای** ــ (ند.) بۆ چەند مەبەست بەكاردێت . ١ــ بـۆ پیشاندان و دەربڕینـی هەست‌كردن بـە هەمۆ ئێش و ئازارێـكی ماددێ كـە بە لەشی ئینسـان دەگـا . ٢ــ بـۆ دەربـڕینی هەسـت بـە ئـازارێ مەعنەوێ . تێبـ ــ لەم حاڵەتەدا ( ئا )یەكە درێژ دەكرێتەوە و پاش ( ی )كەش نێمچە دەنگێكی ( شە ) بەر گـوێ دەكـەوێ . :: ئـای ! بابەڕۆ لەو كۆستە گرانە . ٣ــ بۆ دەربڕینی هەسـتی واق وورمان ، سەرسوڕمان یا خۆشییەكی تێـكەڵ بەوانە . :: ئای دنیا سەیرە ها ! ، ئای بابە ! لـەو بەزمە ، ئـای ،

کارت‌کرد ، ئـای لەو خۆشـییە .
٤ــ بۆ گاڵتەپێکردن ( بە کەسێ ، بە شتێ ) :: ئای بە لاقی خێوی . **ئای ترّحێو** . ★ ئاخ ، ئۆف ( بۆ ١ ، ٢ ، ٣ ) ، ١ــ ئەی/٢ ( بۆ ٣ ) های ( بۆ ٣ و ٤ ) هەی ( بۆ ٤ ) .

**١ــ ئای ئای ــ** (نـد.) بـۆ سەرسوڕمانێکی زۆر بەکـاردێت . :: ئای ئای !! خـۆ لێشـم مـۆڕ دەبێتەوە . ئای ئـای خۆ هێشتا ئەوێش ناڕازییە .

**٢ــ ئای‌ئای ــ** (نت.) هەوایەکی کلاسـیکی گـۆرانی کوردیـیـە ، سەربەندەکانی بـەم ووشەیە دەس پێدەکا و بەندەکانیشی کرۆزانەوە و لاواندنەوەیان تێدایە .

**ئایا ــ (ئم.)** تم : ئاخوا .

□ « زارم وەکو خیلال و نەحێفم وەکو خەیاڵ »
« ئایا دەکەومـەزار و بە دڵدا دەکەم ختور »
( نالی )

★ ئایاکو ، ئایەکو

**ئایاکو ــ** [ئایا + کو ؟ ] ، ( ئم.)، ( سیم.) تم : ئـاخوا .

**ئـایر ــ** ( نـا.) ، ( هو.) تم : ئـاگر .

□ «نە نەیخانەی تەن ئایر هۆرێزان»
« بزیسـکەی چەخمـاخ کـام شەشخان خێزان »
( مەولەوی : مکب ــ ٤٤٢ )

**ئایرێن ــ** [ ئـایر + ئێـن ] ، ( صت.) ، ( هو.) تم : ئاگرێن .

□ « نامەی ئایرێن دلسۆزێت یاوا»
« بلێسـەم نە سای ، گەردوێن سەر ساوا »
( مەولەوی : مکب ــ ٤٣٤ )

**ئایش ــ** ( ند.) تم : ئای/٢ .

**ئایشـەگوێدرێژ ــ** (نت.) ، ١ــ (مک.) یەکێکـە لـەو مەوجـودە خەیاڵییانـەی کە لـە فۆلکلـۆری کوردێدا باس دەکرێ. ئەمەیان لـە موکوریـان دایکـان منـاڵی پـێ دەترسێنن ، رەنگە هەر لەبەر نـاوە سـەیرەکەی بـێ . :: ڕۆڵـە بنـو ئایشەگوێدرێژ هات . ٢ــ (سیم.) ، (کن.) کەر .

**ئاین‌ئۆین ــ** [ ئاین = ئایین + تو : ئۆین = فێـل ] ، [کو. تو.] ، ( نت.) فڕوفێڵ ، حێلە و حـەواڵە :: کەس سەری لە ئـاین و ئۆینی خدر دەرناچێ .

**ئایە ــ** ( ند.) تم :ئای/٢ .

**ئایەت ــ** [= عا : آیة ] ، (نا.) هەر ڕستەیەك لە قسەکانی قوڕئان کە لە سـەری ڕادەوەسـتن . □ «... الحَمْدُ لِلهِ رَبِّ العالَمین

★ تێبـ ــ ئـەم ووشـەیە بەهـۆی ئیسلامەتـی و خوێنـدنی قوڕئـان کەوتۆتـە زمـانی کوردییـەوە ، ئەگەرچـی لـە عـارەبێدا بە مانای ( نیشـانە ) و ( بەڵگـە ) و ئـەو جـۆرە شتانەش هـاتوە ، بەڵام لە زمانی ئێمەدا هەر ئەو مانایەی هەیە کە باس‌کرا . ★ بـەند . **ئـایەتە لکورسێ ــ** (= عا : آیة الکرسي ) ، ( نت.) چەند ئایەتێکـی قوڕئـانە ، موسوڵمانـانی کورد پـاش هەمـو نوێژێك و لە وەختی مەترسێشدا بـۆ دوورخسـتنەوەی ( بـەڵا )

دەیخوێنن . □ « ... اللهُ لا الهَ الاّ هُوَ * الحَيُّ القَيُّوم ...»
(قورئانی پیرۆز : سورەتی البقرة).

**( ـ ئایەتی ) ـ** (پب.) ١ـ بە دوای ناوێکەوە ( زات یا مەعنا ) دەنوسێ و ناوێکی تر ( مەعنا )ی لێ دروست دەکات کە **بەیانی حاڵەتی** کەسێ یا شتێ دەکا . :: ( کورد ) کوردایەتی ، ( عەبد ) عەبدایەتی ( خوشك ) خوشکایەتی . ٢ـ دەلکێ بە دوای ناوی عێل و عەشیرەتانەوە و دەیکا بە ناوی نیشتمانی ئەوان :: ( باڵەك ) باڵەکایەتی ، ( سوێسنێ ) سوێسنایەتی (شینکی) شینکایەتی ، (گەوورك) گەوورکایەتی ، (مەنگوڕ) مەنگوڕایەتی . تێب ـ ئەسڵی ئەم پاشبەندە ، بەلای منەوە ، لە نێزیکترین قۆناغی پێش ئێستایدا ( هایەتی )بوە کە لە ( ها = هەیە + ئەتی = پاشبەندی وجود ) پێکهاتوە . ها ، لە هەندێ بن لەهجەکانا ( جافی و ... ) بەم مەعنایە دەگوترێ : « **خاڵێ ( ها )** وەبان سەر گۆنای پیرۆز ، وەك چرای تۆڕەن وەبان (نەکەرۆز) ».

**ئایەکو ـ** ( ئم . ) ، ( سیم . ) تم : ئاخوا .

**ئاییا ـ** [ ؟ ] ، ( نا. ) ، ( سن . ) خۆشکی باوك ( تم : مخ . ج ١ ـ ٣٧ ) . ★ پور ، مێمك ، مێمێ.

**ئاییەی ـ** [ ئای + ئەی ] ، (ئم.) بۆ سەر سوڕمان لە کارێك یا شتێك بەکاردێت و دوپاتەکردنەوەی کەرتی دوەمی سەر سوڕمانی زیاتر دەگەیێنی . :: ئایەی لەو درۆیە ، هەر بە پێی خۆی دەڕوا .

**ئایندە ـ** [ فر . ] ، (نا. ، صە.) ئەو زەمانەیە کە لە مەوپاش دیت،ئەو وەختەی دادێ ، ڕۆژگارێکی هێشتا ( لە وەختی لێدوانیدا ) نەهاتوە . :: بەهاری ئایندە ، ساڵی ئایندە .

**ئایینە ـ** ( نا. ) تم : ئاوێنە .

□ « نەزمی نالی میسلی ئاو و
ئایینە ڕەنگی نیە »
« دوو ڕووە بۆ سەیری خاتر :
یەك خەفی یەك ئاشکار »
( نالی : مقبل ـ ١٥ )

**( ـ ئست ) ـ** (پب.) تم : ئشت.
:: زانست . بڕست . توانست .

**( ـ ئایی ) ـ** ( پب . ) ١ـ بە دوای صفەتەوە دەنوسێ و دەیکا بە ناو ( حاصل مەصدەر ) :: ( درێژ ) درێژایی ، (سور) سورایی ، (ڕوناك) ڕوناکایی . ٢ـ دەگەڵ هێندێك ناوان تەرکیب دەبێ و ناوێکی تازە (حاصل مەصدەر )ی لێ دروست دەکا . :: ( ترۆسکە ) ترۆسکایی ، ( دەشت) دەشتایی ، ( گۆڕ ) گۆڕایی .

**ئایێسان ـ** ( مص . لا. ) ، (مکـ.) سوتانی شتێك بە گڕەوە ، چ بۆ ڕوناکی وەکو چرا ، چ بۆ گەرمایی وەکو ئاگرێ کە بە دار و سوتەمەنی تر بۆ چێشت لێنان و مەبەستی دیکە دەکرێتەوە . :: ئاگرت نایێسێ ( نەئایێسێ ) ،بزانە ئاگرەکە دایێسێ (دەئایێسێ) ؟، تا درەنگ چرایان هەر دایێسا (دەئایێسا) . **هەڵاییسان ـ** [ هەڵ ( پێبف . ) + ئاییسان ] ( مصت. لا.) ( کن.) پەیدابونی

شەڕوشۆڕ و هەرا لە نێوان دوو یـا چەند کەس ، یان دەوڵەتاندا .

**ئایسـاندن ـ** ( مصـ . مت . )
١ـ داگیرساندنی ئاوور و چرا و.. و نەکوژاندنـەوەیان . :: تـا ڕۆژ سـۆبەمان دایسـاند گـەرممان نەدەهاتـەوە . ٢ـ سـووتاندنی سوتەمەنی :: نەوت زۆر دایسێنن .

**هەڵایسـاندن** [ هـەڵ ( پیبف . ) + ئایسـاندن ] ، ( مصـ . مت . )
١ـ داگیرساندنی ئاگر ، چرا ...
□ « دەڵێن فەرمۆیە یـار ، بێتـە
مەتاڵای خەتتی ڕێحانی »
« بڵێن با شەمعی ڕوخسـاری
هەڵایسێنێ ! ئەوا هاتم »
( حەریق ) .
٢ـ ( کن . ) سـازکردنی فیتنـە و شەڕوشۆڕ . :: لە سەرەتای ئـەم چەرخەوە ئەڵمان دوو شەڕی گەورەی لە دنیادا هەڵایساند .

**ئایین ـ** [ پھ : ئایین ، ئایێن ] ، ( نا . ) ١ـ مەزهەب ، ڕێوشوێنی دینێ . □ «زەعیف بێ خوانەخواستە
ئیعتیقادت »
« بە ئایین و بە ئەرکان و
بە ئەتوار »
( ڕەزا ـ ٢٣ )
٢ـ ڕێ وشـوێن بـە موتڵـەقی ، داب‌ودەستوور .

**( ـ ئستان ) ـ** [ پھ : ئێستان ]، ( پب. ) ١ـ بـە نـاوی : نەتـەوە و عەشیرەتان و هەندێ ناوی شتەوە دەنوسێ و دەیکاتە نـاوی وڵات ، مەڵبەنـد و نـاوچە و شـوێن ( ئیسمی‌مکان ) . :: کوردستان ، عەجەمسـتان ، فەڕەنگسـتـان ، دارستان ، چنارستان، مێروستان.
٢ـ بـە دوای هەنـدێ ( ئیسمی زەمان )ێشەوە دەبینرێ :: زستان، زمسـان ( جنو. ) ، زڤسـتـان (بک.). تاوسان ( جنو. ) .

**( ـ ئش ) ـ** ( پب. ) تە : ئشت.

**(ـ ئشت) ـ** [پھ : ئیشن]، (پب.)
بە ڕێشـەی فیعلـەوە دەنوسـێ و دەیکـاتە ئیسمـی مەصـدەر :: کوششت ، بڕشـت ، تابشـت ، خۆرشت ، خارشت ، خوارشت .
تێب ـ هەندێ جـار و لـە هەنـدێ وشـەدا ، دەنگی (ت) یەکە لەبـەر قورسی دەرناکەوێ . ★ ئست ، ئش .

**( ـ ئـك ) ـ** [ پـھ : ئـەك ] ، ( پب. ) بـە دوای نـاوەوە دەلکـێ و پچکۆلەی دەکاتەوە . :: دەسـك ، گرتك ، ئەنگوتـك . تێب ـ أ ) ئـەو ناوانەی بە هـۆی ئـەم پاشـبەندە پەیدادەبن ، کـاتێ بە تەنـێ لە دەم دەردەچن لەنێوان ئەسـڵی ناوەکە و پاشبەندەکەدا هەسـت بە دەنگـی ( هەمزە ) دەکرێ کە بە دەنگی پێش خۆیەوە نوساوە ، بەڵام لە ڕستەدا ئەم دەنگە نامێنێ و هەر گوێمان لە دەنگی ( ك ) دەبێ کە چۆتە سـەر پیتـی پـاش خـۆی :: دەسـك : « (دەس‌کـی) لـە دوو نـەدەکرد » ، چەپك : « (چەپ‌کێ) گـوڵ چەپکێ نێرگز». ب) ئەو ناوانەی ئیمڕۆ ئەم پاشبەندەیان بە دواوەیە ، شەرت نیە پاش لێکردنەوەی پاشـبەندەکە مانایەك ببەخشن بەڵام لە ڕابردوودا

ڕەنگەمانایان بۆبێ .
**( ــ ئگ ) ــ** ( پبـ.) لە هەندێ بن لەهجەی ، لەهجەی ناوەندیدا وەك: شـارەزووری ، جـافی ، سـنـەیی نیشانەی مەفعوولە :: مردگ (مردوو)، بردگیە ( بردوویـە ) ، دیگمەسـەو (دیومەتەوە) ، کریـاگ ( کـراو ) ، برياگ ( براو ). ★ ٢ــ ئو.
**١ ــ ئـم ــ** ( ئـم . ) بـۆ بەڕاستزانین و تەئکیدی قسـەی کەسێك ★ بەلـێ ، ئـا. تێـب ــ بەکـارهێنانی ئـەم ووشـەیە ، نیشانەی بە کەم زانینی ئەو کەسـە دادەندرێ کە قسە دەکا و دوورە لە ئەدەب .
**٢ ــ ئـم ــ** ( نـد . ) دەگـەڵ چەمبـۆڵە لێنـاندا دەگـوترێ و چەمبۆڵەشی دەگەڵ نەبـێ ، ئـەم ووشەیە جێگای پڕ دەکاتەوە . :: ئم ! مەرگیبێ. ئم ! لە چڕوچارەی.
**( ــ ئـن ) ــ** ( پبـ.) بـە دوای ناوێکەوە دەلکێ و دەیکا بە صفەت. :: چڵکن ، ڕشکن ، لێکن ، نەوسن. ★ ( ــ ئین ) .
**( ــ ئنده ) ــ** ( پبـ.) بـە دوای ڕیشەی فیعل یا ناوەوە دەنووسێ و دەیکا بە ئیسمی فاعیل یا **صفەت** . :: بالندە ، بڕندە ، دڕندە، ڕەهەندە سازندە ، شەرمنـدە ، گۆینـدە ، زەڕندە .
**ئوتو ــ** [ ڕووسی : ئوتیۆگ ] ، ( نا.) ئامرازێکی ئاسنە ، گەرمـی دەکەن و بە سەر جلکی شۆراویدا دێنن تا چرچ و لۆچەکانیان سـاف کات . تێب ــ جاران ئەم ئامرازە یا هەر پارچە ئاسنێکی بن ساف بـۆ بە جۆرێك گـەرم دەکرا یـا وەکـو قوتوێکی پچووك وابوو ئاگری تێدەکرا، بەڵام ئێستا جۆرێکی تری داکەوتوە کە شکڵی هەر وەکو پێشوو وایە بەڵام لە باتی ئاگر بە کارەبا گەرم دادێ .
**لـە ئوتـوودان ــ** ( مصـد. مـتـ.) سافکردنی جل و بەرگ بە ئوتووی گەرم کراو . :: کراسەکەی شێرکۆ لە ئوتـو بـدە . ★ ئوتـووکردن ، ئوتووکێشان .
**ئوتوچی ــ** ( صتـ.) ، (کعـر.) تم : ئوتووکێش .
**ئوتووکردن ــ** ( مصد. مت.) تم : ئوتو ( لەئوتوودان ) .
**ئوتووکێش ــ** ( نفا. ، صفا.) ، ( کئێر.) ئەو کەسەی کار و پێشەی جلك لە ئوتودانە بۆ خەڵك .
**ئوتووکێشان ــ** ( مصـد. مـتـ.) تم : ئوتو ( لەئوتوودان ).
**ئوڕووپا ــ** ( نـا.) ، ( کئێـر.) یەکێکە لە پێنج ئیشکانیە گەورەکانی دنیا ، لە هەموان پچووکترە ، بەڵام لە چـاو خۆی نفووسـی زۆرە ، دە میلیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشە پانە و ٦٢٠ میلیۆن خەڵکـی تێـدا دەژێ ( ١٩٦٩ ). (تم : لاڕووس ــ ١٢١٣ ). ★ ( کعر.) ئەورووپا .
**ئوزەنگی ــ** ( نا.) ، ( مکـ.) تم: ٢ــ ئاوزەنگی .
**ئوسا ــ** [په : ئوستات] ( نا.) ، ( سنـ.) ئەو کەسەی لە پێشەیێکدا شارەزابێ و لەوانە بێ بتوانی خەڵکی فێر بکا . ★ وەستا .
**ئوستره ــ** ( نا.) ، ( هلـ.) ١ــ

چەقۆی سەرتاش ٢ـ ( تە.) ئەو تیفە پچکۆلانەی دەخرێنە مەکینەی تراشەوە . تێب ــ بە لای منەوە ئەم وشەیە لە مەصدەری ( ئەستڕین، سڕین) داتاشراوە . ★ گوێزان . ( کئێر ) تیغ ( بۆ مانای دوەم ) .

**ئوستورلاب ــ** [= یۆنانیـ : ئاسترولابۆس ] ئامرازێك بوە ، لە زەمانی کۆندا ، ئەستێرە ناسەکان بەرزایی ئەستێرانیان لە ئاسۆی شوێنێك پێ دیاری کردوە (تە : لارۆس ــ ٦٤) و بۆ کاروباری تری ئەستێرەناسی بەکارهاتوە (معێن : فەرهەنگ. ج١ ــ ٢٦٦) . تێب ــ چونکو قەدیم، گەلێ ئیش و کار کە ڕوی دەدا ، لە ئەستێران دەناسرا و لایان وابو هەر ئینسانەی تالع و ئەستێرەیەکی هەیە کە چارەڕەشی و بەختەوەری بەستە بە گۆرانی ئەستێرەکەی بوە ، بۆیە (ئوستورلاب) کە ئامرازێکی زانستی ئەو زەمانانە بوە ، لای خەلك بۆتە ئامرازێکی ئەفسانەیی کە چارەنوس و بەسەرهاتی ئینسانان و نهێنیکانی دنیای پێ دیاری دەکرێ. لە کوردستان هەندێ مەلا بۆ دۆزینەوەی ( ئاو )ی ژێر زەوی و هەلبەستنی بەنداوان و جاریکردنی ئاو کەلکیان لەم ئامرازە وەرگرتوە. □ «... وەزیر تەماشای ئوستورلابی کرد و گوتی ئەو کەسەی لێی دەگەڕێن ، لە ناو بەحرێکی خوێندا لە سەر کێوێکی زێڕ دانیشتوە ... » ( چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی ) .

**ئوسلوب ــ** [ = عا : لسلوب ] ، (نا.) ڕێوشوێن و جۆری کارکردن ، شێوەی لابەلاکردنی مەسەلەیەك ★ شێوە، ئاوا . :: ئەوە ئوسلوبی قسەکردن نیە ، ئوسلوبی کارتان نەگۆڕن هیچتان بو ناکرێ ، کۆنەپەرستان و ئیمپریالیستەکان هەرچی ئوسلوبی دڕندانە هەیە بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ ئازادیخوازان بە کاری دێنن .

**ئوسوڵ ــ** [ = عا : اصول ] ، ( نا. ) ١ـ داب و دەستوری کۆمەلایەتی ، ٢ـ شێوەی جل و بەرگ و دەبەرکردنی ، ٣ـ (کئێر .) سەرەتاکان ، مەبادی سیاسی :: ئوسوڵ وایە کە چوێتە لای نەخۆش شتێکی دەگەڵ دەستی خوت بۆ بەری . شەرواڵ و ستارخانی ئوسوڵی سلەیمانییە . ئاخر نابێ توزێ ئوسوڵ بزانی ؟ تێب ــ مەعنای سێیەمی ئەم ووشەیە لە فارسیڕا پەڕیوەتە ناو زمانی کوردی .

**ئوسوڵی ــ** [ عا. ] ، ( صە . ) ، (کئێر .) ١ـ کەسێکی دەربەندی ڕێك و پێکی کاران بێ و بە پێی ڕێ و شوێنی پێویست جیبەجییان بکا و مەبەستی ئەوە نەبێ هەر چۆنێ بێ کارەکە ڕاپەڕێنی ، بەلکو بەو جۆرە ئەنجامیدا کە دیاری کراوە . :: هەلمەتەکاسە دەگەڵ پیاوی ئوسوڵی فەرقیان زۆرە. ٢ـ کاری حیسابی و ڕێك و پێك :: کاری ئوسوڵی هەر دەچێتە سەر . ★ مەبدەئی .

**ئوفە ــ** (نا.) ، (مک .) نەخۆشی ئەسپ و مایە، ڕەفتیسکەی پاشویان

خۆ دەبێ و ناو دێنێ .
**ئوقیانۆس ــ** [ = لاتینی : ئۆسێئانۆس ] ، (نا.) دەریای زۆر گەورە و پان و بەرین . تێب ــ أ) لە دنیادا پێنج ئوقیانۆس هەن : ١ــ ئوقیانۆسی گەورە ( کەبیر ، هادی، ساکن، ئارام) ٢ــ ئوقیانۆسی ئەتلەس ( محیتی ئەتلەسی ، ئاتلانتیك ) ٣ــ ئوقیانۆسی هیند . ٤ــ ئوقیانۆسی سەهۆڵ بەندی باکوٙر. ٥ــئوقیانۆسی سەهۆڵبەندی جنوٙب . ب) ئوقیانۆس و دەریاکانی تر ، تێکڕا لە دە بەش حەوت بەشی ڕوٙی زەوییان داپۆشیوە . ج) ئەم وشەیە لە لاتینیڕا چوٙتە ناو زمانی یوٙنانێ و بوٙتە ( ئۆکێئانۆس ) ، ئەو جار عەرەب وەریان گرتوە و کردوٙیانە بە (ئوقیانۆس) وبەم شێوە عارەبییەی هاتوٙتە ناو زمانی فارسێ و کوردێ و زمانانی ترەوە . ★ بەحری محیت .
**ئوقیانۆسیە ــ** (نا.) ، (کێیر.) یەکێکە لە پێنج بەشەکانی دنیا لە قارەی (ئوستڕالیا) و لەچەند کوٙمەلە دوٙرگەیەك پێکها توە ، کە لە ئوقیانۆسی ئارامدا پەرش و بلاون . هەشت میلیوٙن و ٩٧٠ هەزار کیلوٙمەتری چوارگوٙشەیە و ١٩ میلیوٙن نفوسی هەیە (١٩٦٩) ، تم : ( لاڕوٙس ــ ١٤٤٤ ) .
**ئولفەت ــ** [ = عا : الفة ] ، ( نمص . ) هوٙگرێ ، ئالوٙدەیی .
**ئولفەت دەگەڵ ... هەبوٙن ــ** پەیوەندێ و دوٙستایەتێ دەگەڵ کەسێ یا شتێ ، حەز لە شتێك یا کارێك کردن . :: ئولفەتی دەگەڵ نوٙستن نیە بەلام دەگەڵ چیڕوٙك خوێندنەوە لە تام بەدەرە . دەگەڵ خواردنەوە ئولفەتتان چوٙنە ؟ .
**ئولفەت پێوەگرتن ــ** [ عا. کو.]، ( مصت . مت . ) ١ــ خوٙگرتن بە شتێکەوە یا بەکارێکەوە. ٢ــهوٙگری کەسێك ، شتێك یا چلوٙنایەتێك بوٙن ٣ــ عادەتکردن ، گیروٙدەبوٙن ، ڕاهاتن ( بە .... ) :: ئولفەتی پێوە گرتوە بوٙی تەرخ ناکرێ ، ئولفەتی بە ڕاوە کەوەوە گرتبوٙ بە زوٙر وازمان پێ لێهێنا .
**ئولفەت گرتن ــ** [ عا. کو. ] ، ( مصت . لا. ) هوٙگربوٙن ، عادەت کردن ، خوٙگرتن . :: سەگ زوٙ ئولفەت دەگرێ .
**ئومێد ــ** [ پە : ئوٙمێت ] ، (نا.) ١ــ ئارەزوٙ ، ئاوات .
□ « نالێ بە ئومێدی زەفەری تەوقی تەلیسمت »
« ماری سەری زولفت لە مل و گەردنی ئالاّ »
( نالێ : گم ــ ٦ )
٢ــ چاوەڕوانێ جێبەجێ بوٙن و پێکهاتنی ئاوات .
□ « شێخ ئومێدێکی وەهای دابوٙ بە من »
« من لەبوٙیە سەری خوٙم خستە پەتی »
( مەلا : گم ــ ٣٨ )
٣ ــ پشتبەستن ، پشت ئەستوٙرێ :: بە ئومێدی خودا و پێغەمبەر ، بە ئومێدی توٙ خودایە . ★ ئەمەل ، هومێد ، هیوا . (بکـ.) هێڤێ .
**ئومێدپێ‌بوٙن ــ** [ ئومێد + پێ

( بە + ی ) + بوّن ( هـەبوّن ) ] ، (مصت. لا.) پشتبەستن بە کەسێك بوّ کارێك یا مەبەستێك، چاوە نوازّی جیّبەجیّ بوّنی کارێك بـە دەسـتی کەسێك :: قەت ئومێدت بە پیاوی دروّزن نەبیّ .

**ئومێدەوار** ــ [ئومێد + ٣ــئە/٢ + وار ] ، (صت .) کەسێکی ئاواتێکی هەبیّ و چاوەنوازّی جیّبەجیّ بوّنی بکا . :: ئومێدەوارم هەموّ لایەکتان ساغ و سلاّمەتبن . // نائومێد .

**( ــ ئـوّ )** ــ ( ئم . ) ، ( بک . ) ئـامرازی بانـگکردنە لـە لەهجەی باکوّرێدا و بەئاخری ناوانەوە دەلکیّ . :: کورّوّ ، بابوّ ، یوّسـفوّ ، کـورّو حەسەنوّ هەرّە ئەڤی هەسپی بگرە . تێب ــ ئەم ئامرازە لە هەندیّ ووشەی لەهجەی ناوەنـدیّ زمـانی کوردیدا دەبیّندریّ :: لالوّ ، خالوّ ، ماموّ .

**ئوّباڵ** ــ [ = عا : وبال ] ، (نا.) سزا و مەسئوّلیەتی ئەنجامی خراپ کە لـە کردن یـا نـەکردنی کارێك دەوەشـێتەوە . ● « ئـوّباڵت بـە ئەستوّم رّوّژ بازارّی قیامەتیّ» (رّوّژی قیامەتی مەسـئوّلیەتی گوناحەکانت رّوّ بکاتە من ) .

□ « کوشـتەی فیرّاقی توّیـە
عیلاجی ئـەگەر نـەکەی »
« ئـوّبالّی بـەو ملـەت
کە دەلّیی نیرکـەکاردوە »
( رّەزا ــ ٤٠ )

★ وەباڵ .

**ئوّبە** ــ [ تو . ] ، ( نا . ) کوّمەلّە رّەشماڵی کوّچەران کە لـە شوێنێك هەلّیان دابیّ . تێب ــ ئـەم ووشەیە ئەسـلّی تورکییـە و دەق مـانـای (چادر)ە ، بەلاّم لـە کوردیـدا ئـەم مەعنایەی وەرگرتوە کە باسیّ کرا و زیـاتر بـوّ خێـلاّتی عـەرەب بـەکاردێت و دەگوتـریّ ( ئـوّبەی عەرەبان ) و بوّ خێلّی کورد دەبێژریّ ( مالّەکورد ) . ★ هوّبە .

**ئوپوّرّتونیست** ــ [ فرەنسیّ ] ، (صـ .) ، ( کئێر . ) تم : ئینتیهازیّ.

**ئوپوّرّتونێسم** ــ [ فرەنسیّ ] ، (حمصـ .) (کئێر.) تم : ئینتیهازێتیّ.

**ئوّپێرّا** ــ [ فرەنسیّ : لە ئیتالی وەرگرتـوە = کـار ] ، ( نـا. ) ١ــ تێکەلاّوێکی شیعر و موّسـێقا و نومایشتە بە هەر دوّ باری (درّام) و (کومێدی)دا . ٢ــ ئەو تالار و شوێن یا جێگا تایبەتییە کە ئەم ئیشـەی تێدا ئەنجام دەدریّ .

**ئوّت** ــ [ فرەنسـیّ : ئوّت ] ، ( نا . ) ، ( کئێر . ) هەشتەمێن مانگی سالّی فەرّەنگیّ (مێلادیّ) ، سیویەك رّوّژە . ★ ئاب ، ئاغستوّس .

**ئوتوّماتیـك** ــ [ فرەنسـیّ ] ، (صـ.) ، ( کئێر . ) ١ــ ماکینە یـا چەکی ئاگر کە لە خوّیەوە ئیش بکا :: تەلـەفوّنی ئوّتوّماتیـك ( ئـەوەی پێویست ناکا لە شوێنێـکی تایبەتیّ داوای کەسیّ بکریّ بوّ قسەکردن ) ، سـەعاتی ئوّتوّماتیـك ( ئـەوەی قورمێتشی ناویّ ) . ٢ــ هەر کارێکی لە خوّیەوە رّوّ بدا یا سەر بگریّ . :: :: پاش کوّرانی ( کەنەدیّ) جوّنسوّن بە ئوّتوّماتیکی جێیگرتەوە، ئیشـەکان ئوّتوّماتیکی دەرّوّن .

**ئوّحە** ــ ( ند . ) لە کاتی جوّت

کردن و کێلانی زەوێدا گای پێ دەنگ دەدرێ ( بــۆ هاندانــە ) □ « ئۆحە وەرەوە سەر خەتی خــۆت » . // وەحە .

**ئۆخ ــ** ( ند. ) ١ــ بۆ دەربڕینی بێزاریێو نارازێتی،بە هەناسەیەکەوە کە نیمچە دەنگێکی ( ھ ) لــە نێوان (هەمزە) و ( ئۆ )یەکەدا دەبیسترێ ، بەکار دێت . :: ئــوخ ! دەوازی لێ بێنە بابــڕوا . ٢ــ بــۆ پێشاندانی سەرسوڕمان . لەم حاڵەتەدا گوێی بۆ هەڵدەدرێ ، ئینجا ووشە کە لە دەم دێتە دەر . دەنگی (ئۆ)یەکە وەکو دەنگێ لە نێوان ( ئۆ ) و ( ئو )دا دێتە بەرگوێ :: ئۆخ ! لەوهێ عاجباتێ ، وەرە عیسان بچێتە سەر مانگێ .

**ئــوخژن ــ** [ = ئۆخیشــن ] ، ( نمصـ . ) ، ( مکـ. ) ١ــ ئاسوودەیێ ، سۆکنایێ ، حەسانەوە ، ڕەحەتێ . ٢ــ ڕەزامەندێ ، دڵنیایێ :: هــەتا هەرچێ دەگێرفانیدایــە نەیدۆزێنی ئۆخژنی ناکەوێتێ . تێبــ ــ أ) وەکو لە سەرەوە دیارێ کرا ، ئەسڵی ئەم ووشەیە ( ئۆخێشن )ە کــە سیفەی ( نمصـ . )ی زمانی ( پەهلەوێ )یە و دەبێ ئێستا شکڵی ( ئۆخشت ) یــا ( ئۆخست ) وەرگری ، هەروەکو لە زۆر ووشــەی کوردێدا دەبێنــدرێ ( تم : ئشت ) . ب) دەنگی (ش) لەم ووشەیەدا لەبەر جیرانەتێ دەنگەکەی دوایێ بۆتە ( ژ ) و ئەمە کارێك نیە لە ووشەکانی کوردێدا کەم ڕێ بدا. ج) چەند ووشەیــەکی تریش هــەر وەکو ئەم ووشەیە بە شێوەی کۆنی دەوری زمــانی پەهلەوێ مــاون :: بۆڵژن ( بۆڵــە ) زێڕژن ( زێڕە ) . شەقڤژن ( شەقە ) . بەڵام ســەیر ئەوەیە کە هەمو ئەوانە لە دەنگە ناو ( اسم الصوت ) وەرگێڕاون . د) بە پێی قاعیدە ئــەم ووشــە ئیســمی مەصدەرە بــەڵام ئێمڕۆ لــە زمــانی کوردێــدا مەصــدەری ( ئــوخێن و ئۆخاندن) نابێندرێن ــ ئەوەش نازانم ڕۆژێك هەبون یــان نا ــ جــا هەر بۆیەشە ئەم ووشە کاری (ناو) دەکا. ★ ئۆخژە ، ئۆخە .

**ئۆخژە ــ** [ئۆخش + ە ــ ئە/١]، (نت .) ، ( مک . ) تم : ئۆخژن .

**ئۆخە ــ** [ ئۆخ + ە ــ ئە/١ ] ، ( نت. ) ، ( مک . ) تم : ئۆخژن .

**ئۆخەی ــ** ( نت. ) بۆ دەربڕینی خۆشەوێستی بــەرامبەر کەســێك بەکار دێت ، هاندانی تێدایە بۆ کردن یا نەکردنی کارێك. :: ئۆخەی ! وەرە لای مــامی خــۆت دانێشــە . ★ ئۆخەیچ ، ئۆخەیش .

**ئۆخەیچ ــ** [ ئۆخەی + چ (ئم : پچووکی ) ] ، ( نت . ) ، (سن .) تم : ئۆخەی . تێبــ ــ دەنگی (چ) بۆ پچوك کردنەوەیــــەکی ئامێتـــــــەی خۆشەویستییە بــۆ ئەو کەســەی قسەی دەگەڵ دەکرێ و دەنگێشی لە نێوان (چ) و (ش) دایە .

**ئۆخەیش ــ** [ ئۆخەیچ ] ، (نت.) ، تم : ئۆخەی :: ئۆخەیــش کچێ من ئاقڵە ! هەر ئێستا هەڵدەستێ دەم و چاوی دەشوا .

**ئودکلۆن ــ** [ = فرەنسێ : ئۆ ، دوێ ، کۆلۆنی ] ، ( نا . ) ، (کئێر.) ئاوێکی بۆندارە ، پاش ڕێش تاشێن

ده دەم و چاوی دەدەن. ★ قولۆنیا، کۆلۆنیا . تێبـ ــ مەعنای ئەم ووشەیە له فرەنسیدا ( ئـاوی کۆلۆنی )یە ، کۆلۆن یا کوێلن شـارێکی کۆنه لـه ئەلمانیا دەگەڵ ( بـۆن ) ئەوەندەیان بەین نیه . لـه چەرخی هەژدەهەما ( فارینا ) ناوێکی خەڵکی ئەو شاره ، ئەم ئاوه بۆندارەی داهێنا ، پاشان له وولاتانی تر لاسایان کردەوه . ( تم : معیّن . فەرهەنگ ، ج ١ ــ ١٨١ ) .

**ئۆرته ــ** [تو : اورطه = وسط] ، (نا.) مـافۆرەی گـەوره کـه لـه ژۆرا رایدەخـەن و دەورەی بـه ڕایەخی دیکه یا قەنەفه پڕدەکەنەوه . :: ئۆرتـەیێکی ٣ به ٤ی کاشـانیان کڕیوه . // کەناره ، لاکێش .

**ئۆردۆ ــ** [ تو . مەغۆلی] ، (نا.) ١ــ هەمـۆ ئـەو شەڕکەرانـه یـا چەکدار و سەربازانەی سـەر بـه دەولەتێـك یـا فەرماندەیەکن . :: ئوردۆی نادرشا ، ئوردۆی سمکۆ ، ئوردۆی سۆر . ٢ــ (مج) کۆمەڵێکی زۆری خـەڵك کـه پێکەوه جۆره پەیوەندێکیان هـەبێ . :: ئوردۆی پێشەنگی ( کەشـفی ) ★ هوردۆ ، لەشکر ، قۆشەن . (عـا.)جیـش . ( کئێر.) ئەڕتەش .

**ئۆردۆ بازاڕ ــ** [ تـو. کو. ] ، (نت .) ١ــ بازاڕێکی له زەمانی کۆندا دەگەڵ ئوردۆ لـه شـوێنێکەوه بـۆ شوێنێکی تر دەچـۆ . ٢ــ ( کن. ) شوێنی به ئاژاوه و هەرچی و پەرچی که کەس ئاگای له کەس نەبێ .

**ئۆردۆبـەز ــ** [ تـو. کـو. ] ، (مصـ.) دابەزینی ئوردۆ له شوێنێك بۆ حەسانەوه یا ماوەیێکی کەم . :: نادرشا کەدەچۆ بۆ گرتنی هیندستان لـه کرمـان ئوردۆبەزیکرد . ★ لەشکربەز .

**ئۆردۆگـا ــ** [ ئـۆردۆ + گـا (جێـگه) ] ، [ تو. کو.] ، (نتـ.) ١ــ جێگای کۆبۆنـەوەی لەشکر ، شوێنێـکی چەکـدار ئـۆردۆبەزی لێدەکـەن . ٢ــ شـوێنی کۆمەڵی خەڵکی هاوپێشه ، بۆ مەبەستێك لێی کۆبۆبنـەوه . :: ئـۆردۆگای هاوێنی قوتابیان ★ لەشـکرگا . (عا.) معسکر .

**ئۆڕانیۆم ــ** [ فرەنسـی ] ، ( نـا.) ، ( کئێـر.) یەکێکـه لـه عنصرەکانی خۆڕسکاو ، له ڕێزەی (فلزّات) حیسابه و ڕەمزی کیمیایی ( U ) ه ، سەنگی تایبەتی (١٨٫٧)ه ، له کاندا به شکڵی ئۆڕان (ئۆکسیدی ئۆڕانیـۆم) دەستدەکـەوێ کـه (اشعاع)ی زۆر نیه ، ئەگەر ئاتۆمی ئۆڕانیۆم بشکێنن هێزێکی گەورەی لێ پەیـدا دەبـێ کـه بـۆ گـەلێ ئیشوکاری ژیانی ئیمڕۆ کەلکی لێ وەردەگیرێ ، بۆمبای ئاتۆم ئەنجامی تەقانـدنی ئاتـۆمی ئۆڕانیـۆمه . ★ یۆڕانیۆم .

**ئۆغر ــ** [ = تـو : ئوغـور ] ، (نا.) ١ــ سەفەرت خێـری پێوه بـێ ، تۆشـی چاکـه ببـی لـەم سەفەرەدا .

□ « کلاّولار گورجی کەوڕەفتار ،
نەزەر ناکەی ئەڕۆی ، ئۆغر »
« له تیـری ئاهی ناکامێـم ،
حەزەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر »

( گۆران )
٢ــ لە كاتی ڕۆیشتنی كەسێك بۆ شوێنێ بە شێوەی پرسیار : ئۆغر ؟ ، ئۆغربێ ؟ مانای : بۆ كوێ ؟ بۆ كوێ دەچی ؟ دەدا كە ناواخنی داوای خێر و چاكەی تێدایە بۆ ئەو كەسەی پرسیارەكەی لێدەكرێ .
□ « مام ڕێویێ ئەوە ئۆغربێ ؟ » ( لەسەر خێران بۆ كوێ دەچی ؟ ) ، « دە بڕۆ بڕۆ ! بۆچی ناڵەی حاجی ڕێوێ ئۆغربێ ! » ( چیرۆكی فۆلكلۆرێ ) ٣ــ تم : ئۆغركردن . تێبـ ــ ئەم ووشەیە لە توركی و فارسیشدا هەر بەو مەعنایانە بەكاردێت .

**ئۆغركردن** ــ [تو. كو.] ، (مصت. لا.) سەفەركردن ، لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێك ، چوون ، ڕۆیشتن . :: دوێنێ ئۆغریان كرد ، ئەوە هێشتا ئۆغرتان نەكردوە ، بۆ كوێ ئۆغردەكەن .

**ئۆغەن** ــ [ ؟ ] ، (نا.) ، (هل.) ناوی هەفتەی هەشتەمی زستانە بە حیسابی كوردەوارێ لە ناوچەی هەولێر . دەكەوێتە نێوان (مەیرەم) و (پێت) .

**ئۆف** ــ (ند.) بۆ دەربڕینی خەم و خەفەت و بێزارێ ، هەر وەها بۆ نیشاندانی ژان و ئێشی ماددێ و مەعنەوێ بەكاردێت .

**ئۆقرەگرتن** ــ [عا. كو.] ، (مصت. لا.) ئارامبوون ، لە جموجۆڵكەوتن ، بێ دەنگ بوون . تێبـ ــ بەشی یەكەمی ئەم مەصدەرە (ئۆقرە)یەوە بە لای منەوە لە (وقرة)ی عەرەبێ بە مانای : ویقار و گرانی و سەنگینی وەرگیراوە و لە كوردیدا دەگەڵ فیعلی گرتن ئەم مەصدەرەی لێ پێكهاتوە . دیارە جوڵەجوڵ و هەرا و هوریا پێچەوانەی ویقار زاندراوە .

**( ــ ئۆك )** ــ (پبـ.) ١ــ دەگەڵ ڕیشەی فیعل تەركیب دەبێ و دەیكاتە صفەتێ كە هەندێ جار (مبالغە)شی تێدا بەدیدەكرێ . :: خەفۆك ، گرینۆك ، گەڕۆك ، لەرزۆك . ٢ــ دەگەڵ ناو تەركیب دەبێ و پچوكی دەكاتەوە . :: بەگۆك ( بەگی پچوك ) ، خدرۆك ( خدری پچوك ) ، چنارۆك ، صەگۆك .

**ئۆكتۆبر (بەر)** ــ (فڕەنسی) ، (نا.) ، (كێر.) مانگی دەیەمی ساڵی فەڕەنگی ، سی‌ویەك ڕۆژە ★ تەشرینی یەكەم .

**ئۆكسیجین** ــ [ ئینگلیزێ ] ، (نا.) ، (كمر.) تم : ئۆكسیژین .

**ئۆكسیژین** ــ [ فرەنسێ ] ، (نا.) ، (كێر.) یەكێكە لە عنصرە خۆڕسكاوەكان (شێوە فلز = لافلز) حیسابە ، لە تەبیعەتدا زۆرە ، هەوا ، كە كورەی زەوی گرتۆتە ناو خۆی و گیانلەبەرانی سەر زەوێ ، بێ ئەو ، دەخنكێن ٢١٪ی لەم عنصرە تێدایە ، گازێكە لە سەرمای ١١٨ دەرەجە و ئەوشاری (ضغط) ٥٠ ئاتموسفۆڕدا دەبێتە تراو ڕەنگ و بۆن و تامی نیە و لە هەوا قورس ترە .

**( ــ ئۆكە )** ــ (پبـ. ) بە دوای ناو و صفەتانەوە دەنوسێ و بچوكیان

دەکاتەوە ، واش هەڵدەکەوێ لە ئاخری ناوێکەوە دێت ، بێ ئەوەی چکۆلەیی پێشان بدا . :: بارۆکە ، جندۆکە ، شەکرۆکە ، گێلۆکە مەنجەڵۆکە .

**( ـ ئۆل ) ـ** (پب.) تم : ئۆڵ . :: مچۆل ، پچکۆل .

**( ـ ئۆلکە ) ـ** (پب.) تم : ئۆلکە . :: گردۆلکە .

**( ـ ئۆڵ ) ـ** (پب.) بە دوای ناو یا صفەتێکەوە دەلکێ و صفەتێکی لێ دروست دەکا کە بۆنی (مبالغە)ی لێدێ . :: پێتۆڵ ، خانمۆڵ ، سەهۆڵ ، شڕۆڵ ، فرتۆل ، کرمۆڵ ، گەڕۆڵ . ★ ئۆل .

**( ـ ئۆڵکە ) ـ** (پب.) بە دوایی ناوەوە دەنوسێ و پچۆکی دەکاتەوە . :: تەپۆلکە . ★ ئۆلکە .

**( ـ ئۆڵە ) ـ** (پب.) ١ـ بە دوای صفەتەوە دەنوسێ و صفەتێکی تازە دروستدەکا ، کە چکۆلەییێکی ئامێتە بە نازداری پێشان دەدا . :: تەنکۆڵە ، ناسکۆڵە ، نەرمۆڵە ، خەپەتۆڵە . ٢ـ بە دوای ناوەوە دەلکێ و ناوێکی تازە پەیدا دەبێ کە پچۆکی تێدایە . :: بابۆڵە ، چەمبۆڵە ، کچۆڵە ، کێژۆڵە ، گلۆڵە .

**ئۆمەت ـ** [ = عا : امة ] ، (نا.) ١ـ هەمو ئەو خەڵکانەی دینی پێغەمبەرێکیان قبوڵ کردوە . ئۆمەتی موسا پێغەمبەری ، ئۆمەتی عیسای ، ئومەتی پێغەمبەری . □ « زێنەبێ وەی زێنەبێ ، زێنەب دو ددانی زێڕە ، ئۆمەتی محەممەدیم ، لە دینم وەرمەگێڕە . » ٢ـ خەڵك ، جەماوەر ، گەل . □ « دەس‌بەجێ بێ حاڵ دەبو زمانی شکاوە ، چاوی هەڵنەهات هۆشی ئۆمەتیی نەماوە » (تحفه : ج١ ـ ٢٤٠) . تێب ـ ئەم ووشەیە لە عەرەبیدا چەند مەعنایەکی هەیە ، بەڵام لە کوردیدا هەر ئەوانەیە کە باسکران .

**ئۆمی ـ** [ = عا. امیّ ـ نەخوێندەوار ] ، (صە.) ١ـ ئەو کەسانەی بنەچەکەیان ناگاتەوە سەر پێغەمبەری ئیسلام . // سەید . (سن.) ئەو کەسەی نازانی بنوسێ و بخوێنێتەوە ، نەخوێندەوار ( تم : مخ . ج١ ـ ٨١ ) (مانای دوهەمیان دەق مانا عەرەبیەکەی ئەم ووشەیە ) .

**ئۆنکیڕەم ـ** [ ئۆنکی ( = ئۆن‌ئیکی=١٢) + رەم (= درەم )] ، [تو. کو.] ، ( نت.) (کعر.) سەنگێکە بۆ کێشانی شت ، بەشێکە لە ٣٢ بەشی حۆقەیەك ، بە حۆقەی سلەیمانی دەکاتە ١١٠ گرام .

**ئۆوەی ـ** [ ئۆ + وەی ] ، ( ند.) بۆ دەربڕینی ترس و خۆف و شەرم و شکۆ بەکاردێت . □ « گوتیان ئۆوەی ئابڕومان چو هێچمان بە خۆماندا نەداوە . » ( تحفه : ج ٢ ـ ٩٣ ) .

**ئۆی ـ** ( ئم.) ١ـ خەم و خەفەتی پێ هەڵدەڕێژرێ و دەگەڵ هەناسەیێك بە ووچان لە گەرو دەردەکشێ . :: ئۆی ! دەڵێم گەڕێ با بنوم . ٢ـ بۆ ڕەت کردنەوەی

قسـەیەك دەخرێتـە سـەرەتـای ڕستەوە ، هەندێ جار سوێندێشی بە دوادا دێت . :: ئۆی بە سەری ئەو بابەت ئەم قسـەیە بێ و مـن نەم‌کردوە . ئۆی جا من بێـژم دی باسی ئەو کابرایە بکەم ؟ .

**ئۆیمە ــ** [تو.] ، ( نا.) ، (مک.) کراسێکی ژنانەیە ، دەگاتە خـوار ئەژنۆ لە قوماشێکی ئەستوور (زیاتر مەخمـەر) دروسـت‌دەکرا و نـاو قەدەکەی بە پزمە تەنگ دەکرایەوە. :: ئۆیمە و گێیمەی دە بەردا بۆ .

**ئۆین ــ** [ تو : ئویون = یاری ، هەڵپەڕکێ ] ، ( نـا.) ١ــ فێـڵ ، تـەدبیر :: ئۆینێـکی بـە سـەر هێنـاوێن نەبێتـەوە . ٢ــ کـار و کردەوەیێکی خەڵك وەپێکەنێن بخا و دلخۆشیان کا، یاری و دەمەلاسکێ. ٣ــ دەسـتێکـی ( نەردێـن ) کـە بردنەوەی بە (یەك) حیساب دەکرێ. // مەرس .

**ئۆینباز ــ** ( نفا. ) ئەو کەسەی کردەوەی وا دەکـا خەڵـك پێـی ڕابوێرن . ٢ــ فێلبـاز ، کەسـێکی کـارەکـانی ئـاڵۆزبن و خەڵـــك سەرەودەری لێ‌نەکەن .

**ئۆین دەرهێنان ــ** [ تو. کو. ] ، ( مصت . لا. ) یاری یا هەرکارێکی تر کردن بـۆ ڕابـواردن و وەپێـکەنێن خستنی خەڵك . □ « ... کوڕە ! ئەوە ئـۆین دەرتێری ( دەردێنـی ) هەی ... ، ئەوا بۆم بۆی بە مدرّس» ( بیرەوەری خۆم ) .

**ئۆیە ــ** [ ؟ ] ، ( نا. ) تێزماڵێکی درێژی تۆڕە ، بـە مێل لـە دەزوو دەچندرێ ، پوولەکە و پلپلەی پێوە هەڵداوەسن ( یـا هــەر دەگـەڵی دەچنن ) و بـۆ جوانی بـە لێواری کولێجە یا دەسماڵی سەری ژنانەوە دای دەدروون .

**١ــ ئــۆ ــ** ( ز. ) ، ( مکـ . )

١ــ زەمیری نەپچڕاوی (ملکـی)یە ، بۆ دووەم کەسی جەمع . :: ماڵتۆ خرا نەبێ . چۆنتۆ توانی هەڵیکرن .

□ « لە هەر کوێ موغ بەچێکۆ دی دە گوێی نۆسێن و بێهێنن» (ئەدەب: گم ــ ١١٢ ) ، « ... ئەگەر قەرز بدەن بە ئەوانەی کە هومێدۆ هەبێ لەوان بستێننەوە ! منەتۆ چیە ...» (ئینجێل : لۆقا ــ ١٦٣). ٢ــ زەمیری نەپچراوی (شەخسـی)یە بـۆ دووەم کەسی جەمع لە زەمانی رابردوّدا. :: خواردۆ ! ؟ بۆچێ سۆتاندۆ ؟ تێبـ ــ ئەم زەمیرە لە پـاش (بزوێـن)ەکان دەبێتە (و)ی بە زەنە :: عەبایەکە و چ لێکرد ، کابراو بـۆ نـەهێنا ؟ ، برسیتو نیە ؟ ، هەمۆیان خۆزگە و پێ دەخوازن ★ تان .

**٢ــ ( ــ ئۆ ) ــ** (ئم .) بە دوای ڕێشـەی هەنـدێ مەصـدەرانەوە دەنۆسێ و دەیکا بە صفەتی مەفعوولێ :: نوسـتۆ ( نوسـتن ) ، خەوتـۆ (خەوتن) ، کەوتۆ ، ڕاکردۆ ، بابردۆ، مردۆ ، دانیشـتۆ ، مانـدۆ . ★ ٢ــ ئە/٦ ، ئگ ، راو، دراو، پاگ. تێبـ ــ بۆ ئەو مەصدەرانەی بە ( ین ) دەبڕێنەوە ئەم ( ــ ئۆ )ە دەبێتە (و)ی بە زەنـە :: بڕێن ( بڕیـۆ ) تۆپـین ( تۆپیو ) .

**( ــ ئۆچکە ) ــ** ( پبـ . ) بە دوای

( ناو )ەوە دەلکێ و بچوکبونەوەی پیشان دەدا :: جوچکە . خانوچکە . قاپوچکە .

**( ـ ئۆکە ) ـ** ( پب.) بە دوای ناو یا صفەتەوە دەنوسێ و صفەت یا ناوێکی تازەی لێ دروست دەکا ، کە ڕەنگی پچوکی لێدراوە. ::ئەوەندوکە ئێروکە ، بالوکە ، درێژوکە ، دێوەلوکە ، سێوەلوکە ، گێژەلوکە هۆوەندوکە .

**( ئۆلکە ) ـ** ( پب . ) دەگەڵ (ناو) تەرکیب دەبێ و چکۆلەیی پێ دەبەخشێ. :: جاشولکە، قاشولکە، ماسولکە .

**( ـ ئۆلە ) ـ** ( پب . ) ( ناوی دەچێتە سەر و پچوك دەبێتەوە . :: جاشولە ، جوانولە ، دانولە ، مێشولە ، گرمولە .

**( ـ ئۆلەکە ) ـ** ( پب . ) بە دوای ناوانەوە دەلکێ و پچوکیان دەکاتەوە.

**١ـ ئە ـ** ( فع . ) پاشماوەی فیعلێکە ، کە مەصدەرەکەی لە لە بێرچوتەوە ، دەبێ ( هەیین ) بوبێ (تم : ژابا ـ ٤٥٨) ،خۆی لە صیغەی سێیەم تاکە کەسی غایبدایە و مانای ( هەیە ) دەدا . :: زۆر زوناکە ، زوراب کوڕێکی ئازایە. هس : هەم، هەی ، هەیە .... هەس . ★ ها . هە .

**٢ـ ئە ـ** ( ئم . ) ١ـ ئامرازی بانگکردنە و لە دوای ناوان دێت و دەگەڵ دوامین پیتی تێکدەکرێتەوە. :: دا وەرە کوڕە ! . بابەگیان ! با ئیمڕۆ پچینە ماڵێ خالم . هۆ مامەکە بەجێم مەیەلە . □ « دایە ! مەمدە بە گورگێ ، ڕۆڵە عیلاجم نیە » ، « خزمێنە ! مەدەن پەنجەلەگەڵ عەشرەتی جافا » ( رەزا ـ ٣ ) . ★ ( بک . ) ئۆ ( مک . ) هۆ ، هۆی ( لە پێش ناودا دێت ) . ٢ـ ئامرازی ئیشارەیە و زەمیری ئیشارە ( ئەم ، ئەو ، هۆو )ی دەچێتە سەر ، **ئەگەر** ئەو شتەی ئیشارەی دەکرێتێ (گیاندار و بێ‌گیان) مەعلوم بێ ئەوا (مشار الیە) دەکەوێتە نێوان زەمیری ئیشارە و ئەم (ئامراز)ە . :: ئەم پیاوە ، ئەو ئەسپە ، هۆو کتێبە . □ « ... ئە ئەو هەی دەلێی ... » ٤ـ لە هێندێك شوێنی کوردستان لە پێش زەمیری شەخسیدا دێت ، لە موکوریان ئێستاش زەمیرەکان بەبێ ئەم ئامرازە ناگوترێن ، بەلام لە زۆر شوێنی ( کعر . ) سواوە و لە ناو چوە . :: ( مک . ) ئەمن ( من ) ، ئەتۆ ( تۆ ) ، ئەو ، ئەمە ( ئێمە ) ، ئەنگۆ ( ئێوە ) ، ئەوان . تێب ـ مامۆستایان توفیق وەهبی و ئێدمۆنس ئەمەش هەر بە ئامرازی تەئکید دادەنێن ( تم : هبێد ـ ٤٣ ). ٥ـ ( بالەکایەتی ، خۆشناوەتی ) لە پێش صفەتەوە دێت و مێیێنەبونی ( موصوف ) پێشان دەدا :: کچەکە ئەجوانە ، بزنەکە ئەلەڕە ★ (برادۆست)، یە. //ئێ. ٦ـ بەدوای ڕیشەی هەندێ مەصدەرانەوە دەلکێ و دەیانکا بە صفەتی مەفعوڵ □ « باب‌کوشتە خەوی لێدەکەوێ ، دالمردە خەوی لێدەکەوێ، لە برسا مردە خەوی لێناکەوێ» (پەند : خا ـ ٧٤ ) ، « کردە پەشیمان بە ، نەکردە

پەشیمان مەبە» (پەند : خا ــ ٣٢٧) .
**٣ــ ئە ــ** ( تب. ) صفەت و ناوێك تێكدەكاتەوە ، ئەم ووشە تازەی لێیان پەیدا دەبێ : أ) ئەگەر بە تەنیایێ دە کارکرێ یا بکەوێتە سەرەتای ڕستەوە (ناو)ە . ب) ئەگەر شیوەی ( مضاف )ی ناوێکی تر وەرگرێ ئەوا صفەتە .
:: پێرەمێرد : پیرەمێردێکی نورانێ لەوێ دانیشتبو ( نا. ) ، کابرای پێرەمێرد هەر لێیڕاپەڕێ و یەخەی گرت (صـ . ) ، شۆڕەسوار ، سورەگوڵ ٢ــ دو ناو ، ناویك و صفەتێك ، ناوێك و پاشبەندێك و ناوێك و ڕێشەی مەصدەر تێك دەکاتەوە ، ووشە تازەکە ( ناو )ە و ( معرفة )یە . :: صەگەزەرد ، منداڵەوورکە ، چاوەگا ، کلکەکەر ، کەرەگەورە ، دەسکەگوڵ، کەڵەگەت، مانگەشەو . تێب ــ هیندێك لەو ناوانەی بەم جۆرە پەیدا دەبن بۆ ئەوە دەشێن وەکو صفەت دە کاربکرێن :: زۆر کەڵەگەتە . ٣ــ لە ڕستەیەکدا ( مسند و مسند الیه ) پێکەوە دەبەستێ . :: ئەحە دەبێتە پیاو ، سوارەکان چونە ناودێ ، خۆی هاوێشتە ماڵێ .
**٤ــ ئە ــ** ( پێبف . ) ، ( سیم .)
١ــ ئامرازی زەمانی ( حاڵ ) و (مضارع)ە بۆ سەرفکردنی فیعل :: **ئەچم** ، **ئەخۆم** ، **ئەنوسم** . ٢ــ ئامرازی زەمانی رابردوی ناتەواوە :: **ئەچوین** ، **ئەمان** نوسی ، **ئەیان** کوشتێن . ★ (مک.) دە .
**٥ــ ئە ــ** ( پب. ) ١ــ بە دوای ناوێکەوە دەلکێ و ناوێکی تازەی لێ دروست دەکا . :: جەنگە (جەنگ) ، خاکە (خاك) ، تیرە ( تیر ) ، ددانە (ددان) ، قەڵەمە (قەڵەم) . ٢ــ بە دوای صفەتەوە دەنوسێ و دەیکا بە (ناو) یا صفەتیکی دیکەی لێپێك دێنێ . چاکە (چاك) ، سورە (سور) کوڵە ( کوڵ ) ، کوێرە (کوێر) ، ئیشکە (ئیشك) ، ووردە ( وورد )، درشتە ( درشت ) . ٣ــ ( سیم . ) بەدوای کورت کراوەوەی ناوی ئینسانان دادێ :: بلە ( برایم ) ، قالە (قادر) ، سەعە ( سەعید ) سوعە (سوعاد) ، شەفە (شەریف) ، فاتە (فاطمە) . تێب ــ ناوی ئینسانان لە کوردەواریدا گەلێ گوڕانی بەسەردا دێ ، کورت دەکرێتەوە و لە ئەسڵی ناوەکە کەرتێك دەمێنێتەوە،جاروبارە ئەوێش هەروەکو خۆی نامێنێ و بە جارێك دەجەڕێندرێ ( تەحریف دەکری ) :: مەحمود ( خولە ) .
**ئە ئەوە ــ** [ ٢ــ ئە/٣ + ئەوە ] ، (بنت.) تم : ئەوە تێب ــ بەشی یەکەمی ئەم ووشەیە ( ئە )ی تەئکید و تەحدیدە ، یەعنی : ئەو (ئەو)ەی کە لەو کاتەدا باسیکرابێ یا ئیشارەتی بۆ کرابێ .
**ئەئێرانە** [٢ــ ئە/٣ + ئێرانە]، (نت . ، بنت . ) هەر ئەم دەوربەرە ، تەنیا ئەم شوێنانەی لەم نێزیکانەن .
**ئەئێرە ــ** [ ٢ــ ئە/٣ + ئێرە ] ، (نت . ، بنت .) هەر ئێرە و هیچ جێگایەکی ترنا .
**ئەبرۆ ــ** [ فر . ] ، ( نا.) تم : برۆ .

□ « شێوەیی ئەبرۆیێ تاقت هەمە
جـا دێتــە نــەزەر »
« دەگەڕێ دڵ بە تەڕەف تۆوە ،
وەکو قیبلــە نومــا »
( سالم : گم ــ ٣٤ )

**ئەبرەش ــ** [ ؟ ] ، ( ص . ) حاڵی مەڕ و بزن کە پاش ئـەوەی دەزێن شێریان ئیشکی دەکا. ★ عەبرەش.

**ئەبعاد ــ** [ = عا : أبعاد (بعد) = دووری ] ، ( نـا . ) ١ــ درێژایی ، پانایی و بلیندایی ( یا : ئەستوورایی و قوڵایی ) جیســمێك ( هەندەســە ) ٢ــ ( کمر . ) مەودای تەشەنەکردنی کارێ یا ڕوداو و بەســەرهاتێك و کارێکەرێ لەسەر دەوروبەری خۆی. ::ئەبعادی شەڕی وێتنــام دنیــای گرتبۆوە . تێب ــ مانای دوەم زۆر تازەیە لە زمــانی کوردیدا و تــەنیا خوێندەوار بە کاری دێنن .

**ئەبلە ــ** [ = عا : أبله ] ، (صە.) ئەقڵسوك، بێئەقڵ، تێنەگەیشتو . ★ حۆل ، دەبەنگ ، گێژ ، نەزان ، نەفام .

□ « مەنعی ســوتانم دەکـا ئــەبلە
لە عشقی تەلعەتت »
« چــۆن نەســوتێم ئــەو بــە
ئـاگر ، من بە بارێ نەوتەوە »
(ئەدەب : بەشێرمشێر ــ ١٠٦ )

**ئەبلە خەرج ــ** ( صت . ) (مک.) کەسێکی پوڵی خۆی بە بێ جێ خەرج دەکا ، دەستبڵاو :: ئەوەندەی ئەبلە خەرجی کرد تا وا ڕوت و ڕەجاڵ بو . تێب ــ هەر دو کەرتی ئـەم وشەیە عەرەبێن ، بەڵام شێوەی تەرکیب ، جێگــەی بــەکارهێنان و مــەعنای کوردییە و لە عەرەبیدا هیچ مانایەك نابەخشێ .

**ئەبلەڕەنج ــ**(صت.) حاڵی کەسێکی لەبەر تێنەگەیشتویــی زەحمەتی بە خۆرایــی دەروا ★ ڕەنــج بــە خەســار .

**ئەبلەق ــ** ( صــ . ) ١ــ هــەر شــتێکی دوڕەنگ . :: تەســبیحی قەزوانی ئەبلەق شــتێکی نــایابە . ٢ــ هەر شتێکی ڕەنگی ڕەش و سپی بێ . ٣ــ ئەسپ یا ماین کە ڕەنگیان ڕەش و سپی یا سور و ســپی بێ . ٤ ــ چاوێکی لەبەر تورەیی یا ترس و هــەر هۆیەکیتــری لەمبابەتــانە دەرپەڕیبی .

□ « کە زینیــان خســتە پشــتی
ماینــە ڕەشــی کــوێت »
« گــەڕا چاووم لــــە تــاوان
زەرد و ئــەبلەق »
( ڕەزا ــ ٢٨ )

تێب ــ ئەســـڵی ئــەم وشـــەیە (ئەبلەگ)ە و « بە هەمو شتێکی دو ڕەنگ بە تایبەتی بە ڕەش و ســپی دەڵێن و ئەبلەق ( معرب )ەکەیەتی» (عەبباسی : بوڕهان ــ ٦١) ★بازگ، بازو ، بازە ، بەڵەك ، هەبڵەق .

**ئەبەد ــ** [= عا : أبد] ، ١ــ (نا.، صە .) زەمانێکی دوایی نەبێ ، زەمانێ کە نەبڕێتەوە .

□ « بــە دەمتا ناوی من هــات و
دەبێ سککەی ئــەبەد لێــدەم »
« دەمێنــێ تــا ئــەبەد نــاووم،
لــە نــاو ئــاوی بــەقادا بــو »
( سالم : گم ــ ١١١ )

// ئەزەل . تێب ــ ئەم وشەیە

لەم مانایەیدا شێوەی عەرەبی خۆی ڕاگرتوە . ٢ـ ( بن . ) ، أ) هەمیشە، دایم و دەرهەم ، بەدایم ، هەموو کاتێك .

□ « مەنزلی عەقرەبی زولفە قەمەری چیهرەیی تۆ »
« لەم دەرە بۆ منی غەمدیدە ، ئەبەد نەحسە سەفەر »
( سالم : گم ــ ٦٥ )

ب) هێچ وەختێك ، قەت .

□ « وەها پایەی بینای هەستیم لەبن هات »
« قبوڵ ناکا ئەبەد ئەعمیری میعمار »
( سالم : گم ــ ٥٨ )

**ئەبەدەن** ــ [ = عا : أبداً ] تم : ئەبەد/٢ ب . :: ئەبەدەن وا نیە ، ئەبەدەن ئەم پیاوە شتی وای لە دەم دەرنایە .

**ئەبەدی** ــ [ = عا : ابدی ] ، (صـ.) هەر شتێکی دوایی نەیێ و نەبڕێتەوە ، هەرچی تا سەر بمێنێ . :: بژی بە ژیانێکی ئەبەدی .

□ « بەو خودایەی کەم ئەزەلی و ئەبەدییە » .

**ئەترەش** ــ [ ؟ ] ، ( نا . ) ، (مکـ.) ئازایی مەعنەوی ، زەندەق تێبـ ــ نەدێتراوە ئەم ووشەیە بە تەنیایی دەکار بکرێ . تم : ئەترەش چوون .

**ئەترەش چوون** ــ (مصتـ. لا.) ، (مکـ .) ترس ڕێنیشتن ، زەندەق چوون ، ترسانی زۆر . :: سێلاوێکی وایە پیاو ئەترەشی دەچێ . تێبـ ــ ئەوەندەی بێستراب، هەر بۆ ترسان لە ئاو ، ئاگر ، جێگای بە سام (ئەشکەوت ، .... )دە کاردەکرێ .

**ئەتراف** ــ [ = عا : اطراف ] ، (نا.) ئەولاولا ، دەوروبەر . :: لە ئەترافی شاری ( شنۆ )یە نەوت هەیە . لە دێی ( ئاغەڵان )ی ئەترافی سەردەشتی مەعدەنی زێڕ هەیە . نەکا بەم ئەترافانەدا بچی . تێبـ ــ ئەم ووشەیە خۆی لە قالبی جەمعدایە و جەمعی ( طرف )ە ،بەڵام لەکوردیدا وەکوو ( مفرد ) بەکاردەهێنری و لە کاتی پێویستدا بە شێوەی کوردی جەمع دەکرێتەوە .

**ئەتك** ــ [= عا : هتك=دادڕین]، ( نا . ) ڕیسوایی ، سووکایەتی بێئابڕوویی .

**ئەتك پێ کران** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصتـ . متـ . ) ، ( فع . مەجهوول ) بە هاندانی خەڵك وەسەر هەڵەپەڕین و کارێکی وا کردن کە بە خۆدا شکانەوە و شەرم و شوورەیی بە دواوە بێ. :: ئەتکێکیان پێ کراوە هەر باسی ناکرێ .

**ئەتك پێ کردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصتـ . متـ . ) هاندانی کەسێك بۆ کردنی کار و کردەوەیێکی ئەوتۆ ، کە لەئەنجاما تووشی خەجاڵەتی بێ و بە خۆیدا بشکێتەوە :: ئەو ئەتکە چ بۆ پێتان کرد ، ئەتکێکی وایان پی کردوە تا دنیا دنیا بێ لە بیری نەچێتەوە .

□ « پێی ئەکا ئەتك و سیاسەت ، هەرکەسێ خۆی حەزبکا »
« قاتلی ڕۆحی ( حەمە ) و جەلالدی (وەسمان) هاتەوە »

( ڕەزا ـ ٤٥ )

**ئەتك‌كردن ـ** [ عـا. كـو. ] ، (مصتـ . متـ . ) ڕیسواكردنی یەكێك ، سوكایەتی بە سەر هێنان ، ئابڕوی كەسێك بردن . ( بە هۆی ئێشێكی ماددی ) :: دەم و لوتیان دەبڕین و ئەتكیان دەكـردن . هێندە ناپیاوە هـەر دەبـێ سـمێلی بتاشـن و ئەتكی‌كەن .

**ئەتلەس ـ** [ یۆنانی : ئاتلاس ] ، (نـا.) ١ـ جۆرێـك قوماشـی ئاوریشمە و لەبەر بریق و باقی خۆی مۆنج دەداتەوە .

□ « لالەن بە بەدەن ، ئەتلەسی
ئەخزەر ، كـە لەبـەركەن »
« نەوڕەسـتەو و گوڵ بەستە
لەگـەڵ دەسـتە گیـاهن »

( نالی : گمـ ـ ٣٤ )

٢ـ هەر كتێبێكی، كۆمەڵی نەخشەی دەربارەی زانسـتێك ، بـەتایبەتی نەخشە ( خەرێتـە )ی جوغڕافیای وولاتـان ، تێـدا كۆكرابێتـەوە . ٣ـ ( كنێر ) تمـ : ئەتلەسی/٣ .

**ئەتلەسی ـ** ١ـ ( صـ. ) هـەر شتێكی شێوەی ئەتلەس بدا ، چ لە باری نەرم و نۆڵی یا ڕەنگ و بریق و باقەوە .

□ «وەختی سبحەینێ كـە داوێنی
فەلەك ئەتلەسی بۆ »
« هەر لەجێ ڕاسـتەوە بـۆ ،
دامەنی گرتم وەك هـار »

( ڕەزا ـ ١٧ )

٢ـ (نا.) ، (مك.) گیایەكە، بۆ جوانی لە باخچـەی مـالان دەیچێنـن ، گوڵێـكی هەیـە وەكو شـێپوڕ ، تەنك و ناسـكە ، بۆنی خۆشـە ، ڕەنگی : سپی ، سوور ، عابی . بنەوش و ئەبلەقە. ٣ـ (نا.)،(كعر.) یەكێكە لە پێنج ئوقیانوسەكەی دنیا.

**ئەتوار ـ** [ = عا : اطوار ] ، (نا.) ١ـ داب و دەستوور ، خو و خدە ، ڕەووشت . :: ئەرێ ئەم منداڵەتـان بۆ ئەوەنـدە بەدئەتوار فێركردوە . دەڵێن .... ئەتواری باش نیە .

□ « شێخ عەلی ئەتواری بـاوكت
تێك مەدە »
« قل هو الرحمن آمنا به »

( ڕەزا ـ ٧٥ )

٢ـ (مكـ.) بزوتنـــــەوە و هەڵسـتان و ڕۆنیشتنی جلفـانە . :: ئـەو ئـەدا و ئەتـوارانە چـن دەریان دێنێ .

**ئەتۆ ـ** [ ستـ : تـو ، تـوم ، تڤەم ، تەڤە ، توم ، تڤێم . ، پە : تـو ] ، (ز.) ، (مكـ.) زەمێـری نەلكاوە (منفصل) بـو دوەم كەسی مفـڕەد ( ئەوەی قسـەی دەگەڵ دەكرێ ) □ « ... بە وێ گوت : ئەرێ ! ئەتۆی ئـەوێ كە دێ یان چاوەنۆڕی یەكی دیكە ببین ؟ ... » (ئینجیل : مەتی ـ ٢٧) ★ (كعر. ، سنـ.) تو ، (بكـ.) تە .

**ئەتەر ـ** [ = : اثر ] ، (نا.) ، (سنـ.) نیشانەیێكی لـە شتێك یا كەسێ بە جێ دەمێنـێ ، هس : (مك.) هەتەر .

**( ـ ئەتی ) ـ** (پبـ.) بـە دوای ناوەوە دەلكێ و حاصل مەصدەری لێ‌دروست دەكا . :: برایـەتی ،

پاشایەتی ، پیاوەتی ، جیرانەتی .
تێب ـ أ ) کاتێ دوامین پیتی (ناو)ەکە (دەنگ)ێك بێ ، دەگەڵ پاشبەندەکە ئێك دەکرێنەوە و دەنگی (هەمزە)کە لە ناو دەچێ .
ب ) بەڵام ئەگەر ناوەکە بە یەکێ لە دەنگ بزوێنەکان بڕابێتەوە ، ئەوا (هەمزە)کە دەگۆڕێ بە ( ی ) و ئەو جار تێك دەکرێنەوە .

**ئەجر** ـ [ = عا : اجر ] ، (نا.) ١ـ پاداشتی چاك . □ « خودا ئەجرتان بداتەوە ، ئەجری خێرتان بداتەوە » ٢ـ (مج.) حەق ، پاداشتی حەقیقی مەعنەوی کە کەسێك بە سەر یەکێکی ترەوەی هەبێ . :: ئەجری دایك و باب لە سەر ئەولاد زۆرە ، ئەوا ئەجری دایکت دایەوە .

**ئەجزا** ـ [ = عا : أجزاء ] ، (نا.) ١ـ پارچە و لەت و کوتی شتێك .

□ « پەی چیش خالۆکەی دەرۆن
جەهۆن کەیل »
« خەیلێن ئەجزای مەیل ، لە
ملەکەی پڕ مەیل »
( مەولەوی : مکب ـ ١٩٨ )
« دۆدی بن میچی گولنکی
لەتلەتی دەسرازە کۆن »
« بان و دیواری بە میسلی
لانکی ئەجزا شکاو »
( نالی )

٢ـ ( کئێر. ) کاربەدەستی دایرەیێکی دەولەت . :: ئەجزای دارایی ، سەعیدخان ئەجزای گومرگی بۆ ★ ئەعزا/٢ . ٣ـ هەمۆ ئەو ماددە پلاستیکیانە تازە پەیدا بۆن :: ڕەشو تەسبیحێکی ئەجزای باشی هەبو ، ئەم دارجگەرەیە ئەجزایە شقارتەی پێوەنێ گڕدەگرێ . تێب ـ ئەم ووشەیە جەمعی ( جزءِ ، جزو )ە وشکم هەیە کە (جزءِ) یا (جزو) عەرەبی ڕەسەن بێ و لام وایە دەگەڵ گۆش ، گۆشە ، گۆشت و گوێ خزمایەتێکی هەیە .

**ئەجزاچی** ـ [ ئەجزا + چی ] ، (صفا.) ، (کمر.) ئەو کەسەی پیشەی دەرمان فرۆشتن بێ . :: ئەسکەندەری ئەجزاچی لە سلەیمانی ئەجزاخانەی هەبو . ★ (کئێر.) دەوافرۆش .

**ئەجزاخانە** ـ [ ئەجزا + خانە ] ، (نت.) ، (کمر.) ١ـ ئەو دوکانەی دەرمانی نەخۆشی لێ دەفرۆشرێ . ٢ـ صندوقێکی پچکۆلەیە کە هەندێ دەرمانی پێویستی تێدا دادەندرێ بۆ ناومال و شوێنی گشتی . ★ (کئێر.) دارۆخانە ، دەواخانە . (کمر.) صەیدەلیە .

**ئەجندە** ـ (نا.) ، (مک.) مەوجودێکە ، گۆیا هەیە و بەرچاوی ئادەمیزاد ناکەوێ ، پێشۆنیان بڕوایان وا بۆ دەست لە هەرکەس بوەشێنن شێتی دەکەن . :: ئەجندە دەستیان لێوەشاندوە ، ئەم ژۆرە ئەجندەی تێدایە . ٢ـ (مج.) ئینسانی زۆر زیرەك بە تایبەتی کە بالای پچکۆلەبێ . :: هەردەلەی ئەجندەیە . ★

جنۆکە ، جنـدۆکە (بکـ.) مەچێتر ( لە ئێمە چاکتر ) .

**ئەجەل ــ** [ = عـا : اجـل = وەختی شـتێك ] ، (نا.) وەعدەی مردن ، ئەو دەمەی ژیانی کەسێك تێیدا تـەواو دەبێ . □ « بـزن ئەجەلی هـات تێشـۆی شـوانی دەخوا » . **ئەجەلی‌خـۆ ــ** مـردنی تەبیعی ، مردن بـە بێ هۆیەکی لە لاوە :: نەوەڵڵا ! هەر بە ئەجەلی خۆی مرد . **ئەجەلی هاتوە ــ** (کنـ.) کاری وادەکـا دەبێ ببێتــە هۆی مردنی ★ ئەنجەل ، عەنجەل .

**ئـەح ــ** (ند.) نیشـانەی بـە سۆكزانێنی ڕۆداوێك و بە چاوی سۆك و بێ ئەهمیەت تەماشاکردنی کـار و کــردەوە و کەسێکە . □ « ئەح ! پـەکم بـەوە کەوتـوە وسواغا ئەمن دەبێنێ یا نام بێنێ » (تحفه : ج٢ ــ ٩٣) .

**ئەحباب ــ** [= عـا : احباب ] ، (نـا.) دۆسـتان ، یـاران ، خۆشەویستان :: کۆمەڵێ دۆست و ئەحباب پێکەوە دابنیشێن .

□ « گوتم شێرن دوو لێمۆیێکە مەمکت لێم ترش ڕۆبوو »

« کوتی نازی حوسن نەقدی تورنجێ دەستی ئەحبابە »

( ئەدەب : گم ــ ٨٧ )

**ئەحسەن ــ** [= عا : احسنت] ، ( ئم.) ، ( کئێـر.) چـاکت‌کرد زۆر باشە ، ئافەرین .

**ئەحمەدومەحمودکردن ــ** (کنـ.) ١ــ لەم‌لا و لا و بە دەردی‌سەرێ ، بژێوی‌ خۆ پەیداکردن . □ « ... تا مێـردەکەشم نەگێـرابو ، هەر باشتربو ، ئەحمەد و مەحمودێکی بــو ئەکردێــن ... » ( ــ : ژان ــ ١٩٢ ) ٢ ــ پـەل‌کوتـان بــو هەمــو لایــەك ، لـە هەمــو دەرگایـەك‌دان ، هەڵپەهــەڵپ‌کردن ( بۆ هەر مەبەسـتێ بێ ) ٣ــ بە فێـڵ و درۆ و دەلەسـەکاری خۆ مەیسەرکردن .

**ئەحمەق ــ** [ = عا : احمق ] ، (صـ.) تێ‌نەگەیشتو ، گێل و نەفام .

□ « وەکـو یەك دێتە بەرگـوێی پیاوی ئەحمەق »

« بـەفیری بولبول و ئـاوازی لەقلەق »

( ؟ ) .

**ئەحمەقانە ــ** [ عـا. کـو.] ، ١ــ [ ئەحمــەق + ئانــە /١] ، (بنـ.) وەکو نەزانان ، بە شێوەی گێل و نەفامـان . :: ئەحمـەقانە دەجوڵێتەوە ، هێنـدە ئەحمەقانە قسـە دەکـا پیـاو بـە خۆیـدا دەشکێتەوە . ٢ــ [ ئەحمــەق + ئانە/٤ ] ، (صـ.) کارێکی لە پیاوی ئەحمەق بوەشێتەوە . :: ئەم کارە ئەحمــەقانەیە چ بــو کــردێ ، کردەوەکـانی هەمـو ئەحمەقانـەیە گوێی مەدەیە .

**ئەحمەقی ــ** [ ئەحمەق + ٢ــ ئـی ] ، [ عا. کـو. ] ، (حمصـ.) حالـەتێ کـە پیـاوی ئەحمـەق هەیەتی ، نەزانی و تێ‌نەگەیشتویی . :: بە ئەحمەقی خۆی ببەخشن .

**ئەحواڵ ــ** [ = : احـوال ] ، (نا.) ١ــ چلۆنـایەتی کەسێك لە

باری نەخۆشێ و ساغی‌یەوە . :: ئەحوالتان چۆنە ، دیارە شوکور چاترێ . ٢ـ چلۆنایەتێ باری گوزەران و ژیان . :: ئەحوالی زۆر باشە ئەو ساڵ دەغڵەکەی باشی هێنابۆ .

☐ « پرسیویە زاهیرا لە ڕەفیقانی یەك جیهەت »

« ئەحوالی ئەهلی شار و ڕەفیقانی سەربەسەر »

( سالم : گم ـ ٦٧ )

**ئەحواڵپرسی** ـ [ عا. کو. ] (حمص.) ١ـ پرسیار لە ساغ و سلامەتێ و نەخۆشێ کەسێك . ٢ـ پرسیار دەربارەی چۆنێتێ ژیان و کار و گوزەرانێ یەکێك ☐ « ... شێخ کە ئەحواڵپرسێ و خۆش‌هاتنی مەلا جەلالی کرد ... » (قزلجێ : پێکەنین ـ ٦٢) .

**ئەخبار** ـ [ = عا : أخبار ] ، (نا.) ١ـ دەنگ و باسێ ڕۆداوێکی سیاسێ ، کۆمەڵایەتێ و .... ٢ـ دەنگ و باسی سەفەر و هاتوچۆ و کار و کردەوەی کەسێك یا کۆمەڵێك .

**ئەختوچار** ـ (نتـ.) ، (مکـ.) هەوڵ و تەقەلای زۆر . :: هەرچەندی ئەخت و چارم کرد ، بێ فایدە بۆ دەگەڵم نەهات و نەهات . تێبـ ـ وەکۆ دەبینین ئەم ووشەیە لە دۆ کەرت پێکهاتوە ، کەرتی دوەمیان (چار) ڕۆن و ناسراوە . بەڵام (ئەخت) ووشەیێکە تەنیا لە موکریان و ئەوێش هەر لەم ووشە (مرکب)ەدا بیستراوە و زۆرێش بە کار دەهێنرێ ، جا لەبابەت ئەسڵەکەیەوە دۆ ڕێی دەچێتێ : ١ـ لەوانەیە ( عهد )ی عەرەبێ بێ و جەڕابێ ، کە ئەمەیان بە لای منەوە ئیحتیمالێکی کز و بێ هێز و پێزە . ٢ـ لە کوردستانی تورکیا (ئەختێ ، ئاختێ ) ناوە بۆ پیاوان ، حاجی نەختێ ( محەممەد ئەفەندێ مەحامێ ـ باڤێ تۆژۆ ـ ) یەکێك بوە لە ناودارەکانی شۆڕشی شێخ سەعید [تم : دۆزا کوردستان: زنارسلۆپێ ( خوالێخۆش‌بۆ : قەدرێ‌بەگ جەمیل‌پاشا ) ـ لاپەڕە ٨٢] ، قەدری‌جان دەڵێ : « دەستێ کو ئەختێ هەڵدایە سەردار + چاڤا تە هەژاند ئەو دەستێ گەمار » . ٣ـ « .... دەپشکی ٨١ی (ئابان‌یەشت) داهاتوە کە (یۆئیشتە) لە بنەماڵەی (فریانە) قوربانی بۆ (ئەناهیتە) کرد و لێی پاڕایەوە کە بەسەر (ئەختییە)ی سەرکێش‌دا زاڵی کا » (تم : پد ، یگـد. ج ٢ ـ ٣٩٣) ، هەر لە پەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا پرۆفسۆر ( پۆرداوود ) ئاوا دەڵێ : « داستانی (یۆشت فریان )و (ئەخت) مەوزۆعی کتێبێکی پچۆکی پەهلەوییە . ( ئەخت )ی جادۆباز بە سوپایێکی زۆرەوە هاتە شارێك و گوتی شارەکە خاپور دەکەم ئەگەر کەسێك نەبێ بتوانێ ٣٣ مەتەڵی من هەڵبێنێ . یەکێ لە پیاوچاکان کە (یۆشت‌فریان) بێ وەڵامی هەمۆ پرسیارەکانی دایەوە و (ئەخت) لە لە وەڵامی سێ پرسیاری ( یۆشت

فریـان )دا ، دامـا و کـوژرا » . (ئەختییە) کە لە (ئاوێستا)دا ناوی جادوگەرێـك بوە ، ئێـستاش لە کوردستان هەر نـاوە ، جا ئەگەر بڵێین هەرتکیان یەکن لەوانە نیە لە ڕاستیَ لامان دابیَ . (ئەختییە) خۆی لـە قالبـی صـفەت و ئیسـمی مەنسوبدایە و دوور نیـە لە کاتی خۆیدا وەکـو لەقەب بە مـانای : زۆرزان ، لێـزان ، فێڵباز و ... درابیَ بـەو (جادوگەر )ە ئێسـتا خۆشـی و ماناکـەشی لە بێـران چۆنەوە و (ئـەخت)ی موکریانییان لیَ بەجێماوە .

**ئەختـەر** ــ [فـر.] ، (نـا.) ١ــ تم : ئەستێرە .

☐ « عالەم بە یەکا دێن و دەچن هەروەکو مەحشـەر »

« یەك یەك بەمەسەل مانگ و یەکیَ هەروەکو ئەختەر »

( قانیع : گوڵاڵەی مەریوان ــ ٣٠)

٢ــ ناوە بۆ ئافرەتان .

**ئەختەرشناس** ــ ( صفا.) تم : ئەستێرەناس .

☐ « جەو دما ئەصحاب (زیج) و ( ئوستوڕلاب ) »

« ئەختەرشناسان ، ئەڕستو خیتاب »

( خانا ــ ٢٠ )

**ئەختەرشناسیَ** ــ (حمصـ.) تم : ئەستێرەناسیَ .

**ئەخلاق** ــ [ = عا : اخلاق ] ، (نا.) ڕەووشت و خو .

☐ « کانی ئەخـلاق و سـیمای جوانم ڕۆ »

« قالەڕۆ ، قالەی ئایشە خانم ڕۆ »

( سەلام ــ ١٨٥ )

**١ــ ئەدا** ــ (نا.) ١ــ شێوە و جۆری هەسـتان و ڕۆنیشـتن . ٢ــ لەنجە و لار ، ناز و عیشوە .

☐ « دلێـــکی غەمـزەدەم بـو مەحرەمی ڕاز »

« ئەوێشـت لێم بـە صەد شێوە و ئەدا سەند »

( ئەدەب : گم ــ ٣٥ )

**٢ــ ئەدا** ــ [ = عـا : اداء ] ، (نا.) ١ــ بە جیَ‌گەیاندن ، جیَ‌بەجیَ کـردن ، بەجیَ‌هێنـان . ٢ــ تم : ئەداکردن/١ .

☐ « هەرچەنـد بـە مەسـەل خەنجەری ئەڵماسە زبانم »

« نابڕیَ سـەری مـوییَ لە ئەدای شوکری نیعمەتان »

( ڕەزا ــ ٣١ )

**ئەدادەرهێنان** ــ [ ١ــ ئەدا + دەرهێنـــان ] ، (مصتـــ. لا.) ١ــ جوڵانەوەی نائاسایی . ٢ــ خو بادان و دەمخوارکردنەوە ، لاسای یەکێك کردنـەوە . ٣ــ بە قسە و ئاکـاری سـەیر خەڵـك هێنـانە پێکەنین .

**ئەداکردن** ــ [٢ــئەدا + کردن] ، ( مصت. لا.) ١ ــ بەجیَ‌گەیـاندنی پێویستەکانی دینی ئیسـلام لـەو کاتانەدا کە بۆیان داندراوە ( کردنی پێنج فەرزەی نوێژ و گرتنی ڕۆژوو لە ڕەمەزانا ) // قەزا . ٢ــ دانەوەی قەرز . ٣ــ ( کعر.) بەجیَ‌گەیاندنی پێویستەکانی کۆمەلایەتیَ . ٤ ــ

دەربڕین ، وەڕۆخستن .
□ « نە قسە نە ڕاز بۆم نەکرا ئەدا»
« سینەمایێ بۆم خۆم نیشان ئەدا »
( سەلام ــ ٨١)
**ئەدرەس ــ** ( نا.) ، (کعر.) تم :
ئادرێس .
**ئەدنا ــ** [= عا : أدنى ] ، (صـ.)
نیزیکتر ، نزمتر، پچوکتر:: شەرقی ئەدنا . ئەدنا خراپەیەکی بەسەرەوە مەچن .
**ئەدوا ــ** ( نا.) ، (مـک.) ١ــ داوودەرمانی تام و بۆنخۆش کە دەکرێنە ناو چێشت و هەندێ خواردەمەنی دیکەوە . ٢ ــ زەردەچێوەی هاڕاوە :: ئیستوەت و ئەدواتان لە بیرنەچێ. هس: ئەزوا، ئەزبیە . تێب ــ لام وایە ئەم ووشەیە ( أدویه )ی عەرەبییە و جەڕاوە .
**١ــ ئەدەب ــ** [ عا.] ، ( نا.)
شەرم بە خۆیی ، سەنگینێ و گرانێ لە هەستان و دانیشتنی ناو مەجلیسان ، حورمەتگرتنی گەورەتر لە خۆ ٢ــ (مجـ.) ، أ ) ئەو شوێنانەی لەشی ئادەمیزاد کە ناو هێنانیان شوورەییە . ب ) تم : ئابخانە . ★ عەدەب .
**٢ــ ئەدەب ــ** [ عا.] ، ( نا.)
یەکێکە لە زانستەکان کە لکی زۆرن : ڕێزمان ، بەیان و بەدیع ، عەرۆز و قافیە ، شیعر و نوسین ( معین : فەرهەنگ . جـ ١ ــ ١٧٨ ) :: ئەدەبی یۆنانێ ، ئەدەبی عەرەبی
□ « لە (ژین)ەوە ئەمە شاباشی ڕێی ( گەلاوێژ )ە »
«لە پایەی ئەدەبا نوکتە بێژ و هەمگوڵڕێژە »
( پیرەمێرد ــ ١٦٠ )
**ئەدەبخانە ــ** ( نـ.) تم : ئابخانە
□ « ئەدەبخانەکە و حەوزی تێکەوتن »
« پڕیانە لە ئاو ، هێندە بێ بەختن »
( پیرەمێرد ــ ٢٦٥ )
**ئەدەبکردن ــ** [ ١ــ ئەدەب + کردن ] ، [ عا. کو.] ١ــ (مصـ. لا.) شەرمکردن لە کردنی کارێك :: قوربان ئەدەب دەکەم عەرزتانکەم
□ « ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر تەقویەتی سەبەب دەکا»
« عارفی وەحدەتئاشنا لەم قسەیە ئەدەب دەکا»
( نالی : گم ــ ٩ )
٢ ــ ( مصـ. متـ.) تەنبێکردنی کەسێك (بە لێدان و جنێو ... ) تێب ــ دەبێ بەممانایە لە ئەسڵا (بەئەدەبکردن)بێ، چونکو بێ ئەدەب بە ئەدەب دەکرێ .
**ئەدەبیات ــ** [ ٢ــ ئەدەب + ئات ] ، ( نـ.) ١ــ هەمو کەلەپوری ئەدەبی نەتەوەیێك ، وولاتێك یا زەمانێك . :: ئەدەبیاتی کوردێ ، ئەدەبیاتی چەرخی شازدەهەمی فەڕانسە ، ئەدەبیاتی شوڕەوی ، « شیعر و ئەدەبیاتی کوردێ » یادگاری مامۆستا ڕەفیق حیلمییە. ٢ــ هەمو بڵاوکراوەکانی پارتێکی سیاسێ .
**ئەدەبی ــ** [عا.] ، ( صـ.) هەر کار یا شتێکی پێوەندێ بە ئەدەبەوە ( ٢ــ ئەدەب ) هەبێ . :: گەلاوێژ

گوڤارێکی ئەدەبی بوو . (دایک) شاکاری ئەدەبیِ ماکسیم گۆرکییە.

**ئەدێ ــ** ( ئم.) ، (مک.) ١ــ لە وەڵامی پرسیارێکا بە ڕاست زانینی قسەی پرسیارکەرەکە دەگەیێنی . :: باش خەوتن ؟ ــ ئەدێ. ئەرێ منداڵەکان چونە مەکتەب ؟ ــ ئەدێ، چەند لەمێژە. ٢ــ ڕستەی پرسیاری تێکەڵ بە سەرسوڕمانی پێ دەست پێدەکرێ و ئەم مەبەستانە دەگەیێنێ: کەوایە، کەوابوو، ئەگەر بەم جۆرە بێ، مەگەر . :: ئەدێ ئەوە بۆ کوێ دەچن. ئەدی تۆ نەتگوت نانت خواردوە . ئەدێ لە کنە خوّی دوێنێ دەڕۆیشتن . ئەدی نەدەبوو لە سەری ڕاوەستن تا دێتە دەر . □ « ئەدی چ بکەم لە ڕۆی دنیایە؟ » ( تحفه : ج ٢ــ٢٥٨) . ★ (سیم.) ئەی ، ئەیێ . هس : بەدێکردن ، وەدێهاتن تێب ــ ئەگەر دەنگی (د)ە کە بگیرێ (تەشدیدبکرێ) و دەنگی (ی)ش توزی زیاد لە پێویست درێژبکرێتەوە ، نیشانەی گاڵتە پێکردنە . **ئەدێچۆن ــ** (شر.) ١ــ لە حاڵێکا بەکێک ڕای لە قسەی کەسێك نەبێ و بەو جۆرە دە مەسەلەیەك نەگا کە ئەو کەسە باسی دەکا ، بە راوێژی پرسیار بە ( مخالف )ەکە دەگوترێ و مانای ئەوەیە : ئەگەر ئەو مەسەلەیە یا ئەو قسەیە وا نیە کە من دەیڵێم ، بە ڕای ئێوە چۆنە . ٢ــ کاتێك کەسێ کارێکی سەرەڕای ئەوەی کۆسپیشی لە سەر ڕێ بوە یا هەیە ئەنجام داوە یا دەدا دەگوترێ ، جا یا بە تەنیا و بە شێوەی پرسیار یا لە سەرەتای ڕستەیێکی پرسیارێدا . :: بەفرێکی زۆر بارێوە هەموو ڕێگای گرتوە ؟ ــ ئەدی چۆن دەچن ؟. **ئەدێنا ــ**(شر.) بۆ داوای ڕای موافق لە کەسێ دەگوترێ :: ئەو هاوێنەی دادێ شێرکۆ دەچێتە ماڵی خاڵی ، ئەدێنا ؟ .

**ئەدیب ــ** [=عا : ادیب ] ، (نا. صـ.) ئەو کەسەی دەستی ( ٢ــ ئەدەب )ی هەبێ ، شارەزای نوسین و شیعردانان بێ :: کتێبی «ئەنجمەنی ئەدیبانی کورد» لە ئەستەمبوڵ چاپ کراوە . پیرەمێرد ئەدیبێکی گەورەی کورد بو . تێب ــ ئەم ووشەیە ئەگەر لە پێش (ناو)ە و بێ ( ناو )ە و ئەگەر بە دوای (ناو)یشدا هات ، ئەوا صفەتە . :: ئەدیبێکی کورد. کوردێکی ئەدیب

**١ــ ئەر ــ** ( بن.) تم : ئەگەر

□ « سەڵاح هەر ئێدەن ، ئەر تۆش زەرۆرەن »
« ئەر جە عەشق تو ، دیدەش بێ نورەن »
( خانا ــ ١٧٣ )

**٢ (ــ ئەر) ــ** ( ئم.) ئامرازی داتاشینی ئیسمی فاعیلە : ١ ) دەگەڵ ڕیشەی مەصدەران تەرکیب دەبێ و ئیسمی فاعیل پێكدێنێ :: نوسەر ، خوێنەر ، کوژەر ، بڕەر. تێب ــ ئەم شێوە داتاشینە ، ئی ئەم ٢٠ ــ ٣٠ ساڵەی دواییە و گەلێ ووشەی پێ داتاشراوە . ٢) بە دوای ستیفەی موفرەدی ( ئەمر )ەوە دەنوسێ و پاش فرێدانی ئامرازی

ئەمر (ب) ، پاشبەندێك پێك‌دێنێ
کە ئەگەر بە دوای ناوێکەوە
بلکێندرێ دەیکاتە ناوی فاعیل ::
بکە ( لە : کردن ) ــ ب +(ــ ئەر)
= ــ کەر + کار = کارکەر
بدە ( لە : دان ) ــ ب + ( ــ ئەر )
= ــ دەر + بانگ = بانگدەر

**ئەرباب** ــ [عا.] ، (نا.) ١ــ (سن.) خاوەن‌ملك ، پیاوی گەورە ئەعیان و ئەشراف . ٢ــ (مك.) ، أ ) بازرگانی گەورە کە کالاّ بە دوکاندار و کاسبان دەفرۆشێ ، نیسبەت بەو کەسانەی سەودای لێدەکەن . ب) خاوەنی‌کار نیسبەت بە دەست و پێوەندی خۆی ( میرزا ، شاگرد ، خزمەتکار ...) ٣ــ ئەهلی هەر کارێك :: ئەربابی قەلەم ، ئەربابی ڕابواردن ، ئەربابی شەڕ

☐ « لەبەر قاپێ سەرا سەفیان
دەبەست شێخ و مەلا و زاهید »
« مەتافی کەعبە بۆ ئەربابی
حاجەت گردی سەیوان بێ »
( ڕەزا ــ ٣٨ )

٤ــ ( صە.) ، ( مك.) پیاوی خۆش مەشرەف و ڕۆخۆش ، ئەو کەسەی بێ ئەوەی گوێ بداتە خوی یا عادەتی خۆی بۆ ئەوەی مەجلیس لە خەڵك تێك نەدا دەگەڵیان دەگونجێ .

**ئەرامەندە** ــ [ئەرام + ئەندە (ــ ئندە ) ] ، (صت.) ، (هو.) حاڵی کەسێکی تووشی گێروگرفتێ بووبێ و سەری‌لێ‌شێوابێ ، متحیربێ .

☐ « جەواتەی شێرۆ
سەرەفکەندەبێن »
« جەسەودای گەردوون
ئەرامەندەبێن »
( خانا پـ ٦٧٩ )

تێب ــ ئەم ووشەیە لە (ئەرام) و پاشبەندی (ئەندە) ــ کە شێوەیێکی تری (ئندە) یەو زیاتر فارسییە تاکوردێ ــ پێکهاتوە . (ئەرام) خۆی ووشەیێکی پەهلەوییەو مەصدەرکەی (ئەرامێتەن) و (نمصد.) یشی ( ئەرامیشن ) ە کە مانایان : (نائاسوودەیی و ئۆقرەنەگرتن )ە و تەواو پێچەوانەی ( ئارام ) ە کە بەمانای ( دامەزران و ئۆقرەگرتن ) هاتوە . (ئەرام)ی پەهلەوی تەرکیبێکە لە ئامرازی نەفی (ئە = نا ) و (رەم)ی ئاوێستایی بە مەعنای ئیسراحەت‌کردن و ڕۆکەوتن . بەتێکرایی ئەرامەندە [ئە + رام + ئەندە ] دەبێتە ئەوکەسەی ئیسڕاحەتی لێ‌هەلگیرابێ .

**ئەرخەوان** ــ ( نا.) ١ــ دارێکە، گەڵاکانی خڕن ، گوڵی‌سووری هەیە، لە سەرەتای بەهارا دەپشکوێ و سەرتاپای دەبێتە گوڵ ، گوڵەکانی تۆزی شیرنایییان تێدایەوە هەندێ کەس دەیخۆن .

☐ «کارێزی شەرێف ئاوی‌نەماوە»
«ئەرخەوان لق و پۆپی شکاوە»
( پیرەمێرد ــ ١٠٨)

٢ــ ناوە بۆ ئافرەت . :: مامە حەسەنی ئەرخەوانێ کەبابچێ بوو لە مەهاباد .

**ئەرخەوان‌سوور** ــ ( نت. ) ، (سیە.) فەسڵی لافاوی بەهاران . تێب ــ دوو هۆی هەیە کە ئەو فەسڵەیان وا ناو ناوە ، یەکەم چونکو

دەکەوێتــــە وەختـــێ کـــە داری ئەرخەوان گوڵ دەکـا ، دوەمێـــش لەبەر ئەوەی کە ئاوی ڕۆبارا'ن سوۆر دەبێ و شێوەی ڕەنگی ئەرخـــەوان دەدا .

**ئەرخەوانی ــ** ( صـ. ) ڕەنگـی وەکو ڕەنگی گوڵی ئەرخەوان،سوری مەیلە و بنەوش ، سوۆرێکی ڕەش‌باو.

**ئەرخەیان ــ** [ تو. ] ، ( صـ. ) ، ( مک. ) دڵنیا ، خاترجەم :: ئەرخەیان لێی بنو ، ئەرخەیان بن هیچی بەسەر نەهاتوە . ★ ئارخەیان .

**ئەرد ــ** ( نا. ) تە : ئەرز .

**ئەردەلان ــ** [ ئـاردەڵ + ٢ ــ ئــان/٣ ] ، (نتـ.) ١ ــ نــاوی ئەمـارەتێکی کوردە لە کوردســتانی ئێران پاتەختیان شـاری (سنە) بوە. ٢ـ ناوێکی تری ئەم مەڵبەندەیە کە لە تەشکیلاتی ئێراندا پێی دەڵێـن : ( استـــان کوردستـــان ) . ★ ئاردەلان .

□ « تەختــی تەخــت بۆ ، بـابـا ئەردەلان »
« کـەلاوەی کـاول ، پەیکوڵ بەردەلان »
( پیرەمێرد ــ ٢٢٨ )

**ئەرز ــ** [= عا : أرض] ، (نا.) ١ـ کورەی زەوی ، ئەو ئەستێرەی کە ئادەمیزادی لە سەر پەیدابوە . ٢ـ پارچەیــەك زەوی کە تــەرخان کرابێ بکرێتە خانوبەرە :: ٨٠٠ مەتر ئەرزێ لە کارێزی مەجیدبەگ هەیە. ٣ـ هەمو خاکی وولاتێك :: ئەرزی عێراق . ٤ـ هەمـو زەوی‌وزاری ســــەر بــــە گـوندێـــك :: ئـەم دێیـە ئـــەرزێ کەمـــە ، هەندێ جوتیری ئەم ئاوایە ئەرزیان بەرناکەوێ . ٥ـ تەختی ژوورەکانی خانو // میچ ★ ئەرد ، زەمین ، زەوێ ، عـــەرد ، عەرز . **ئـەرزی مقەددەس ــ** (نتـ.) ١ـ جێـــگا پیرۆزەکانی هـــەر دین و ئایینێك :: **مەککە ، مەدینـــە ، قدوس .** ٢ـ (کنـ.) شــوێنێکی یەکێــك بۆ لێدانیشتن و هاتوچۆ هەڵبژاردبێ و زۆری دڵ پێــوەبێ :: ئەوە بۆچێ دوکانی مامە حەمەت لێکردوێن بە ئەرزی مقــەددەس . هەمو دنیای لێ بوتە ئـــەرزی مقەددەس و هەر دەو قوژبنە دەخزێ ( گویا جێگاکانی تـــر پیـــرۆزن نـــابێ لێیـــان دانیشـــێ . ) . **بە ئەرزدا چون ــ** (مصـ. لا.) ، (مک.) لەبــەر چاوان وون بــونی شــتێ یا کەســێ بە جۆرێــکی پیـاو لە گومبونـــەکەی سـەری سوڕبمێنێ :: نەمانزانی بە ئەرزدا چو ؟ ئاسمان هەڵیکێشا ؟ **بە ئەرزدا دان ــ** (مصـ. متـ.) ، (مک.) ١ـ کەسێك یا گیاندارێك بە زۆر ( بۆ هەر مەبەســتێ بێ ) لەسەر زەوێ درێژکردن :: مامــە زاخــە چوارپــەلی گایەکەی بەست و بــە ئەرزیــدا دا و جێبــەجێ ســەری بڕی . ٢ـ لەزۆرەوانیــدا بە سەر کەســێکدا زاڵبــون . :: کابــرای لەسەر سـەری خۆی سوڕاند وەك شــوتێ بە ئەرزێــدا دا . ٣ـ بە توندێ و تەووژم شتێك یا کەسێك بۆ سەر ئەرد فــڕێ دان . :: کە تورە بو هەرچێ قاپ و قاچاغی بەر

دەست کەوێ بە ئەرزیدا دەدا . **بە ئەرزا کوتان ـ** (سیم.) تم : بە ئەرزدا دان . **خۆ بە ئەرزیدا دان ـ** (مصد. لا.) ١ـ خۆ خستنە سەر ئەرز . ٢ـ خۆ گیرۆکردن لە شوێنێك :: ئەوە دوو سەعات دەبێ لێرە خۆی بە ئەرزیدا داوە بە ئامان و زامن هەڵناستێ . **لە ئەرزێ دان ـ** (مصد. مت.) تم : بە ئەرزدا دان .

**ئەرك ـ** [ ؟ ] ، (نا.) ١ـ ئەنجامی هەر کار و کردەوەیەك ، کە یەك یا چەند کەسێك توشی ماندوبون و نارەحەتێ بکا . زەحمەتی مەعنەوێ :: بە ئەرکی مەزانە دەگەڵ دەستی خۆت ئەو کتێبەم بۆ بێنە ، ئەرکی بە خێوکردنی منداڵ ئەوەند گرانە هەر بە دایك قبوڵ دەکرێ ، **ئەرکی** جێبەجێ کردنی پێویستەکانی کۆمەلایەتێ لە شانان سوکە . ٢ـ (مج.) زەحمەت ، تەکلیف . □ « ... هێچ ئەرکێکم لەسەر تۆ نیە بۆچێ دەرم دەکەی ؟ » (قزلجێ : پێکەنێن ـ ٩٤) . **ئەرك بەسەرەوەبون ـ** حاڵەتی بەرەورۆبونی کەسێك یا کۆمەڵێك دەگەڵ کار و فرمانی زۆروزەبەندی خەڵك :: ئەرکی ئەم دێیە **هەموی** بەسەر ماڵی برایمی حاجێیەوەیە و هەرچێ مێوانە رو دە ماڵی وان دەکا .

**ئەرکان ـ** [ عا. ] ، (نا.) ١ـ پایە و کۆلەکەی هەمو شتێك ، هەر شتێکی بە بێ ئەو ، کارێك یا مەسەلەیێك جێبەجێ نەبێ و سەر نەگرێ . :: ئەرکانی نوێژ ، ئەرکانی دەولەت . □ « زەعێف بێ خوانەخواستە ئیعتیقادت »
« بە ئایین و
بە ئەرکان و بە ئەتوار »
( رەزا ـ ٢٣ )
٢ـ ئەرکانی حەرب و کورت کراوەتەوە . :: سالی ئەرکانی ( سالێکە کە ئۆردوی عوسمانێ لە ژێر فەرماندەیێ برایم پاشای ئەرکانی حەربدا ، لە مەلبەندی مەهابات دەگەڵ عروسان شەری کردوە ) . ٣ـ ناوە بۆ پیاوان . :: ئەرکانە شەلێ نانەوا لە کانێسکان بو . **ئەرکانی جەیش ـ** [عا.] ، (نت.) ، (کعر.) ئیدارەیەکە لە وزارەتی جەنگ یا بەرگرێ وولاتاندا ، لە وەختی شەر و ئاشتیدا فەرمان دەدا بە بەشەکانی هێزی چەکدار و چاوەدێری جێبەجێ کردنیان دەکا . ★ ئەرکانی حەرب ( لە دەوری عوسمانیدا ) ، (کێر.) ستادی ئەرتەش . **ئەرکانی حەرب ـ** [عا.] ، (نت.) ١ـ تم : ئەرکانی جەیش . ٢ـ هەر ئەفسەرێکی بە دانستە بۆ هەلسوراندنی ئیشی دایەرەی ئەرکانی حەرب پەروەردە کرابێ . □ « ئەرکانی حەربی هوردوی شەشەمین »
« وەزیری عێراق محمد امین »
( سەلام ـ ١٩٥ )
★ (کێر) ئەفسەری ستاد .
**ئەرككێشان ـ** (مصد. لا.) جێبەجێ کردنی کار و پێویستێك

لەباتی کەسێك یا بۆ خۆ . :: ئەو ئەرکەمان بۆ بکێشە و تا مالی حەمەحەسەن بچۆ پێی بلێ با سەرێکمان لێبدا ، ئەگەر لەپێشدا تۆزێ وورد با ئێستا ئەو ئەرکەی نەدەکێشا لەسەرڕا بێنۆسێتەوە .

**ئەرەقگێر** ــ (نت.) تم : ئارەقگێر/١ .

**ئەرێ** ــ (ئم.) ١ــ بۆ پرسیارە و لە سەرەتای ڕستەی پرسیارەوە دێت . :: ئەرێ ئەوە شەوێ دێ بۆ نەهاتی ؟ ئەرێ تۆ نەتگوت کتێبەکەم بۆ دێنی ؟ هس : ئایا . تێب ــ ئەم ووشەیە بۆ پرسیارێکی تێکەلاو بە گلەیی و گازندەیە ، بەلام (ئایا) هەر بۆ پرسیاری ڕۆتە . ٢ــ بۆ تەئکید . ☐ « ... ئەرێ وەللا ... کوڕم بە قەدەر تۆکی سەرت . » ( قەفتان : چیرۆك ــ ١٧ ) ★ ئاری/١ . ٣ــ بۆ سەرسوڕمان ( لەم حالەدا لە پاش ( ێ )کەوە سۆکە دەنگێکی (هەمزە) ( دێتە گوێ ) .

☐ « ئەرێ ئەی شێخە پێسی بۆری چلکن »
« ئەرێ ئەی زگ هەمانەی غازی بۆگەن »
( مەلا : گە ــ ١٩ )

**ئەرێونەرێ** ــ [ ئەرێ + و + نە + ئەرێ ] ، (کن.) دۆدلی ، ڕاڕایی :: ئەم ئەرێ و نەرێیەت لە چیە ؟ زۆ ئێشەکە ببڕەوە .

**ئەڕاگێل** ــ (صت.) ، ( هو.) حالی کەسێکی بە شوێن کەسێکا یا شتێکا وێلبێ .

☐ « ئەرصاحێب شبەرتی ، شێرین ، وێلّ تۆم »
« بەیتەور موێنی ئەڕاگێل تۆم »
( خانا ــ ٢١٦ )

تێب ــ ئەم ووشەیە لە دۆکەرتی (ئەڕا) و (گێل) پێکهاتوە . بەلایمنەوە یەکەمیان (ئەڕا) دەبێ (هەرا)ی ئاوێستایی بێ کە بەمانای کێوە و لە زمانی کوردیدا (هەلەت) و ( هەردە ) ی لێکەوتۆتەوە ، دوەمیشیان ( گێل )ە لە مەصدەری (گێلان) بە مانای گەڕان و سۆڕانەوە، بەتێکڕایی مانای ووشەکە دەبێتە : وێلی چۆل و بیابان .

**ئەڕتەش** ــ [= فر : ئەڕتێش] ، (نا.) تم : ئوردۆ .

**ئەڕجۆ** ــ [ = عا : ارجو (تکادەکەم) ] تکا ، خواهیشت .

☐ « ئەوەند ئەڕجۆ دەکا نالی کە جارجار »
« بکەن یادی موحیببی بێ ڕیاتان »
(نالی : کوڕ ــ ٣٢٠)

☐ « ... شا بەسم لەسەر بکە ناز و ئەڕجووان ...» (تحفە : جا ــ ٢٠٤) .

**ئەڕزاق** ــ [= : ارزاق (رزق)] ، (نا.) تم : ئازوقە .

**ئەڕە** ــ (نا.) (جنو.) ئامرازێکی دارتاشییە ، لە ئاسن دروست دەکرێ ، دەمێکی ددان ددانی هەیە ، بۆ بڕینەوەی دار و تەختە و شتی تر بە کەلك دێت ، گەورە و پچۆك و جۆر بە جۆرە . ★ مشار ، هەڕە ، (بک.) بڕەك (تم : ژابا ــ ٤٥ ،

کف ــ ١٢٠) .
**ئەز ــ** [ ست : ئەزێم ، پە : ئەز ] ، (ز.) ، (بکـ.) زەمێری پچڕاوە بۆ یەکەم کەسی مفرەد . تێبـ ــ أ ) « تەنیا لە حاڵەتی فاعیلێدا ، بەڵام بۆ زەمانی (ڕابردوو)ی فیعلی متعدی دە کارناکرێ [ هبێد ــ ٤٧ ] ، ب ) زیاتر لە حاڵەتی فاعیلێدا بە کاردەبرێ ، پەهلەوێ ئەشکانییە [ فرەوشێ : پفا ــ ٦٣ ] ج ) لە مەلبەندی لەهجەی ناوەندێ زمانی کوردیدا لە ناوچەی ڕەواندز و شنۆیە و دەوروبەریان هێشتا ئەم زەمێرە ، کەم و زۆر لە برەودایە و وەکو ناوچەکانی دیکە لە بیرنەچۆتەوە . د ) غەزەلێکی نالی کە شەش شیعرە ، قافیەکانی ( ئەز )ە و لە هێندێك مەتەڵۆکە و قسەی پێشینیانیشدا دەبێندرێ . □ « ئەزم هەڵدەبەزم » ، « ئەگەر دیتی ئەزم ، نەیدی دزم » .
« خاوی بێ خاوی دوو زوڵفی
خاووم ئەز »
« چاوە چاوی یەك غەزالە
چاووم ئەز »
( نالی : گم ــ ٢١ )
**ئەزبۆلە ــ** [ ئەز = ئاز + بۆ (بۆن) + لە (ئم : پچووکی ) ] ، (نتـ.) تم : ئەز بێ .
**ئەزبەنێ ــ** [ ئەز + بەنێ (بەندێ) ] ، (نتـ.) ، (بکـ.) من بەندەی تۆ . تێبـ ــ ووشەیەکە بۆ ڕێزلێگرتن و بە گەورەزانینی کەسێك ، لە قسەکردنا بەکار دەهێنرێ . ★ ئەز خولام ، ئەز گۆڕی ، قوربان .
**ئەزبێ ــ** [ ئەز = ئاز + بێ = بێن = بۆن ] ، (نتـ.) (سنـ.) گیا و گوڵ و داو و دەرمانێ کە بۆ خۆش کردنی تام و بۆن دەکرێتە ناو چێشتانەوە ★ ئەزبۆلە ، هەزبێ ، هەزبێلە ، بەهارات. هس : ئازۆقە ، ئەزوا .
**ئەزخولام (غولام) ــ** (نتـ.) ، (بکـ.) من غولامی تو تم : ئەزبەنێ .
**ئەزگۆڕێ ــ** [ ئەز + گۆر + ا ــ ئی/٢ ] ، (نتـ.) ، (بکـ.) تم : ئەزبەنێ .
**ئەزمان ــ** [ پە : ئوزفان ] ، (نا.) ، (مەنگوڕایەتێ ، بکـ.) تم : زمان . (جنو.) زوان .
**ئەزموو ــ** (نمف : ئەزموون) تەجرەبەکراو ، تاقێکراوەوە . □ « دۆی ئەزموو لە ماستی نائەزموو چاترە » .
**ئەزموون ــ** [ ست : ئائیزما ، پە : ئازمووتەن ] . (مصتـ. متـ.) ، (باڵەکایەتێ) تەجرەبەکردن ، تاقی کردنەوە . □ « ... بێ ئەوەی بمئەزمووی ، چۆن دەڵەی بەکار نایەی ؟ » .
**ئەزوا ــ** (نا.) ، (کێر.) جەوێ یا شێرەی گیایەکە ، لە شوێنی گەرم دەڕوێ ، ڕەنگی زەرد یا زەردێکی مەیلە و ڕەشە ، تامی تاڵ و ناخۆشە ، بۆ دەرمانی(ڕەوانێ) و (کرم) و نەخۆشی جەرگ بەکاری دێنن ، بۆ ڕەنگ کردنی خورێ و ئاورێشم کەڵکی لێوەردەگرن ، ئەم گیایە لە تیرەی گوڵە سوێسنەیە .

تێبـ ــ جـاران لە کـوردەواری بە ئەندازەی دەنــکە نۆکێکیان دەپەڕە سێفارەوە دەپێچا ، وەکو (حەب) بۆ (ڕەوانی) و (سەفرا) قوتیان دەدا.
★ عا : صبر .
**ئەزەل ــ** [ = عا : أزل ] ، (نا.) زەمانێکی بێ سەرەتا ، ڕۆژگارێکی بێ ئەندازە کۆن . // ئەبەد .
□ « بڕۆ ببێنە : سەر لەوحەی قەزا »
« چی بو لە ئەزەل ، نوسی بەز لەبۆن »
(سەلام : خەییام ــ ١٠٢)
□ « سیاهەی دەفتەر ، میرزای ئەزەلەن »
« زیادی و نوقسان ، ڕزق و ئەجەلەن »
(مەولەوی : مکبـ ــ ٤٢٤)
**ئەزەلی ــ** [ عــا. ] ، (صــ.) ١ــ صفەتێکە لە صفەتەکانی خودا :: بەو خودایەی ئەزەلی و ئەبەدییە.
٢ــ هەر شتێکی پەیدابونی سەرەتای نەبێ .
**ئەزیەت ــ** [ = عــا : اذیة ] ، (نا.) ڕەنــج ، ئازار ، زەحمــەت
★ ئەزێت ، عەزێت .
**ئەزیەتخواردن ــ** [ عا. کو ] ، (مصد. لا.) تم : ئەزیەت کێشان .
**ئەزیەتدان ــ** [عـا. کـو.] ، (مصد. مت.) ١ــ ئێشاندنی لەشی کەسێك یا گیاندارێك بە لێدان و دارکـاری و ئـەو جۆرەشــتانە .
٢ــ ماندو کردنی ئینســان یا هەر گیاندارێــك ، بە کار پێکـردن و هاتوچــــــــۆ پێکـــــــردن .
٣ــ چەوساندنەوەی کەسێك بە هەر جۆرێك بێ .
□ « جارێك من پێم ووت خۆتم نیشان دە »
« فەرمـوی نام بێنی خـوێ، ئەزیەت مەدە »
( پیرەمێرد ــ ٤٢١ )
★ ئەزێتدان ، ئەزیەتکردن ، عەزێتدان .
**ئەزیەتکردن ــ** [ عا. کو. ] ، (مصد. مت.) تم : ئەزیەتدان .
□ « وە یادت مەیـو شەوەکەی لێو جۆ »
« ئەزیەتکردن من ، مەکە و لاوەی تۆ »
( [illegible] ( فۆلکلۆر )
**ئەزیەتکێشان ــ** [عـا. کو.] (مصد. لا.) قبوڵکـردنی ڕەنـج و ئازار ، ماندوبون ، خۆ ماندوکردن بە کارێــکەوە یا بە کەســێکەوە . :: تـۆ خــوا ئەزیــەت مەکێشــە بگەڕێوە . ★ ئەزیەت خواردن ، ئەزێت کێشان ، عــەزێت کێشان
**ئەزێت ــ** [عا.] ، (نـا.) تم : ئەزیەت □ « ... لە پاشا لەوانە بۆ بشمزانیایە ئاگادارم نەکردنایە ، بۆ ئەوەی تۆشی ئەزێتــی بە پیرەوە هاتنتان نەکەم . » (ــ : ژان ــ٢٧) .
**ئەزیز ــ** (صـ.) تم : ئازیز .
□ « یا ڕەب گـوزەران کا بــە سەفا وەختی ئەزیزت »
« پەیوەستە لە دەوری چەمەن و گەردشی باغا »
( ڕەزا ــ ٣ )
**ئەژدەها ــ** [ستـ: ئەژیدەهاکە] ،

(نــا.) ١ــ مــاری زۆر گــەورە . :: مارێــکمان کــوشت ئەژدەهایەك بۆ بۆ خۆی . ☐ « مار ماری نەخوا نابێتە ئەژدەهــا » ٢ــ مەوجوودێکی خەیالییە لە چیرۆکەکانی کوردیدا زۆربــاسی دەکرێ ، وەکو مــارێکی یەکجار گەورە وایە ، شاخی هەیە ، چاوی وەکو ئاگر دایێسێ ، کە دەم دەکاتەوە گڕی لێ دێتە دەر ، لــە دوورەوە پیــاو هەڵدەلووشێ ، گۆیا پاســەوانی خەزێنــــە و گەنجــی شاراوەیە ☐ « ... ئەژدەهایــەك بەری ئاوەکــەی گرتبــوو ، پاتشــا کوتی هەرکەس بیکوژێ کچی خۆمی دەدەمێ ... » ، « ڕەببی ئەژدەهای حەوت سەر بچتە خەوێ » .

« حەلقــە حەلقــە زولفــی بەر فوبەی هەیاسەی کەوتوە »

« مەحــرەمی سیڕرە ، بــەڵێ گەنجوری گەنجە ئەژدەها »

(نالی : گم ــ ١١ )

٣ــ (مجـ.) ، أ ) ئینسانی زۆر خۆر . ب ) ئافرەتی دڕ و بێشەرم . ج ) پیاوی زۆر ئازا ★ ئەژدیها ، هەژدەهــا ، هەژدیهــا . تێبـ ــ ئاوێستاییەکەی ئەم ووشەیە لە دوو کەرت پێکهاتوە : (ئەژی) بە مانای مار کە هەر بەم شکڵە و مانایەش هاتوتە نــاو (پەهلەوی) . کــەرتی دوەم (دەهاکە) لە ڕێشــەی ( دەھ ) بە مانای : ئەوەی ئازار دەگەیێنێ ، پێوەدەدا . (تم : معین ، بوڕهان ، جا ــ ١١٦ ) .

**ئەژدیها ــ** (نا.) تم : ئەژدەها .

**ئــەژمـــار ــ** ( نــا . ) کــــاری دیاریکردنی چەندێتی هەر شتێك بە گوتنی : یەك ، دوو سێ ....و.... ، ئەنجامی ژماردن . :: گونیەکانی بە ئەژمار تەسلیم کەن، لەشکرێکی هێند زۆرە دە ئەژمار نایە . ★ ژمــار ، ژمارە/١ ، ئــەژمارە ، هــەژمار ، حیســاب ، حیساو ، حیسێب .

**ئەژماردن ــ** [ پە : ئوشمورتەن ، ئوشــمارتەن ] ، ( مصــ . متــ . ) دیاریکردنی چــەندێتی شــتێك ، حیسابکردن ، گوتنی یەك ، دوو ، سێ ....و.... هــەر جــارە لادانی پارچەیەك لەو شتەی مەبەســت بێ بزانن چەندە. ::هێشتا نەتئەژماردوە دەڵەی ئەوەندەیە ، ئەوە سێ جارە دەیئەژمێرم یەکێکــی هەر کەمــە . ☐ « خــاڵم ئــەژماردن ضــەت و بیســـت و نــوّ »

« هیــچ خــاڵم نــەدی لـــە گوێن خــاڵی تــوّ »

( فۆلــکلۆر )

★ بژاردن/١ ، ژمــاردن ، (بکـ .) هەژمارتن ، حیساب ، حیسێب ، حیسێو (کــردن) ، (جنو.) ژمارە کردن . حەساوکردن

**ئەژمارە ــ** [ئەژمار+ ەــ ئە/١]، (نتـ.) تم : ئەژمار . ☐ « ... بە پێی ئــەژمارە بۆ گشــت مامرێــکی سەرە ، پانزە هێلکە لە ڕەشاییەکان ئەسێنێت...» (قزلجی : پێکەنین ــ ١١٨ ) .

**ئەژماردە ــ** ( نمفـ : ئەژماردن ) شــــتێکی زانــدرا بــێ چــەندە ، حیســابکراو . :: پــارەکەی بــە ئەژماردە لێوەرگرن . ★ بژاردە ،

ژمارده .

**ئەژنۆ** ــ [ پھ : شنوك ، زانوك ] ، (نـا .) ئەندامێکێ لەشـی هـەندێ گیاندارانه ، ئەو جمگەیه کـە ڕان و لاق پێکەوه دەبەستێ . ★ چۆك ، زرانێ ، زەنگۆڵ ، ووژینگ ، هەژنۆ . ( ستێ : ژنو . تم : ژابا ــ ٨ ) .

**ئەژنۆپێدادان** ــ (مصتـ . متـ .) ، (کنـ.) بەردەسـت‌کردن ، ڕام‌کردن هێنانەبەربار . :: سـوك و هاسان ئەژنۆی پێ‌دادا ، ئۆردوی سـوڕ لـە ستالینگراد ئەژنۆی بەهیتلەر دادا★ چۆك‌پـێ‌دادان . هـس : ئـەژنۆ دادان/٢ .

**ئەژنۆدادان** ــ ( مصـتـ . لا. ) ١ــ بە نیشانەی ئەدەب ، لای یەکێك یا لەمەجلیسێك لەسەر چۆك‌دانیشتن :: ئەژنۆی دادا و نامەکەی دا دەستێ ٢ــ (کنـ.) تێ‌شکان ، مـەغلوب‌بون . تێبـ ــ لـە پێشدا بـۆ زۆرانبـازێ داکەوتوه و ئەژنۆ کەوتنە سەر ئەرز، هـەروەها پشـتیش نیشـانەی ژێرکەوتنه ، پاشان بۆ هەمو جۆره تێ‌شکانێك بۆته باو ★ چۆك‌دادان .

**ئەژنۆشکان** ــ ( مصـتـ . لا. ) ١ــ شکانی چۆك . ٢ــ (کنـ.) بێ‌هێز بون، بێ دەستەڵات بون،بێچاره بون ● « ئەی ئەژنۆ شکاو خۆ ... » ، بێچاره ، بێ دەستەڵات خـۆ ... ( زیاتر کەس و کاری مردو بە کاری دێنن ) ، « ئەی بـە ئەژنۆی شکاو بێتەوه » نەیێتەوه . ( یەکێك چوبێتە شوێنێك و زۆری پێ‌بچێ ، ئـەوی لەم درەنـگ هاتنـەوەیە تـوڕه بێ دەیڵێ ) .

**ئەژنەفتن** ــ [ پھ : ئاشنوتەن ] ، ( مصـ . متـ . ) ، ( جنـ. ) تم : بیستن ★ ئەژنەوتن، ژنەفتن . تێبـ ــ (ژ)ی ئەم ووشـەیه لە ئەسلا (ش)ە و لەبەر جیرانەتی (ن) دەنگی (ژ) دەدا .

**ئەژنەوتن** ــ ( مصـ . متـ . ) تم : بیسـتن .

**ئـەژێ** ــ ( فعـ . ) ، ( جفـ . ) دەهێنێ ، دێنێ ، بایێ ئەوەندەیه . تێبـ ــ ئەم ووشـەیه سیغەی مفرەدی غایبی مەصدەرێکه ، که لە لەهجەی ناوەندیدا لەبیر چۆتەوه و تەنیا ئەم سیغەیه و شـێوەی ( نەفیی )شی (نائژێ = نائەژێ) لێ‌بەجێ‌ماوه ، له لەهجەی باکوریدا وەك (نفا.،صفا.) لـە قـالبی (هێـژا ، نەهێـژا )دا دەبینرێ و مەصدەرەکەی (هێژیان، هیژیان ، هیژێـن )ە ( تم : ژابـا ــ ٤٤٣ و ٤٥٧ ) ، بەم پێیه دەبێ لـە لەهجەی ناوەندیدا (ئەژیان) بوبێ و دوریـش نیـه (ئەرژیـان)بێ کـە ئێستاش له لەهجەی جنوبیدا لـە قالبی ( ئەرزیـان )دا دەی‌بینێـن ، ئاوێستـایێ ئـەم مەصـدەره (ئەرێجـەت) و پەهلەویەکەشـی ( ئەرژێتەن)ە (تم : پد ، یگد، ج ٢ ــ ٣٤٢ ) .

☐ « هەریەك پەلی فرزەندێ دەژێ (دەئەژێ) شیمری حەرێقـی »
«تۆ بۆچی له کێس خۆتی دەدەی مشتەری نـادان »
( حەریق )

**ئەسارەت** ــ [=عا : اسارة] ، ( مصـ. متـ.) تم : ئێخسیری .

**ئەساس** ــ [=عا : اسـاس ] ،

(نا.) پایە ، بناغە .
□ « دڵـە بۆ شـتیوەن کـانگە و
ئەساسی »
« بـە بـێ کـۆس کەوتـن
بازاڕکەساسی »
( سەلام ــ ١٨٧ )
**ئەساسێ ــ** [ عا. ] ، ( صە. ) ١ــ هەر شتێکی پەیوەندێ بە بنـاغەی کارێك یا شتێکەوە هەبێ :: قانونی ئەساسێ ٢ــ بەشێك لە کارێ یـا مەسـەلەیێ کە لە بەشەکـانی تـر کارێگەرتر بێ ، موهیم تر بێ .
**ئەساسییە ــ** [ عا : اثـاث ] ، (نا.) ، (کئێر.) کەلوپەلی ناوماڵ ، هەرچێ بۆ ئاوەدانکردنەوەی مـاڵ پێویست بێ ( ڕایەخ ، پێخـەف ، ... ، ... ) ★ ئەسپاب/٣ .
**ئەسپ ــ** [ ستە : ئەسپە ، پە : ئەسپ ] ، ( نا. ) ١ــ گیاندارێکـی چوارپێی، بەرزی ، یەکسمی، کلك و یاڵ درێژی ، شۆخ و شەنگی ژیرە . لە زۆر کۆنـەوە کەوێکراوە ، بـۆ سـواری و بارهەلگرتـن و غـارە ئەسپ و گۆیێن بەکاردێت ، ٢٥ ــ ٣٠ سـاڵ دەژێ ، هـەر پـاش کەوێکردن هاتۆتە ڕێزی ئـامرازی شـەڕی نێـوان خێـڵ و عەشێرەتەکانەوە، ئێستاش لەشکری دەوڵەتەکـان بەشـێك سەربـازی سوارەی هەیە ، ڕاگرتنی ئەسپ لە کوردستان دەگەڕێتەوە ڕۆژگـارێکی کـۆن ( دەوریمادەکـان ) و بەخێوکردنی سەرچاوەی داهاتێکی باشە بۆ خاوەن ڕەوە ئەسپان، گەلێ ڕەنگی هەیە : کوێت ، شێ ، ڕەش بۆر ، سورخن ★ (بکە.) هەسپ ، هەسپێ نێر ( تم : کف ــ ٣١٤ ) . ٢ــ یەکێکـە لە داشەکـانی یـارێ شەترنج . **ئەسپی باوبۆران ــ** (نت.) ئەسـپێکی خەیاڵییـە لە چیرۆکـە فۆلکلۆریەکانی کوردیدا باسی کراوە، گۆیا وەکو (با)و (بۆران) بە تەووژم و خێرایە . **ئەسـپیبەحرێ ــ** ( نت. ) مەوجودێکی خەیاڵییە شـکڵی وەکو ئەسپ وایە ، لە هێندێك چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیدا ناوی دێ ، گۆیا لە بەحرا دەژێ و بۆ هەندێ پاڵەوانی ئەم چیرۆکانە دێتە دەر و سـواری دەبن ، زۆر خێرایـە دەگـەڵ ئـەو گیاندارەی کە زانسـتـی ئیمڕۆ بـە ئەسپی ئاوی دادەنێ [=هیپپۆپۆتام] لێكجودان . **ئەسپی ڕەش ــ** ( نت. ) بەیتێکـە لە بەیتـە فۆلکلۆرێکـانی کوردێ ، بە دوو لەهجەی ناوەندێ و باکورێ . **ئەسپیحدود ــ** ( نت.) ، ( مکە.) ئەسپی ڕەسـەن ، ئەسـپێ ڕەگەزی بچێتـەوە سـەر ئەسپـی عـەرەبێ ★ (سیمە.) عوبێـدە . کەحێلە ، کەحێلان .
**ئەسپاب ــ** [= عـا : اسبـاب ( سبب )] ، (نا.) ١ــ تم : ئامراز/١
□ « جۆشێك بدەن وەکو هەنگ ،
تەگبیر بکەن بە بێ دەنگ »
« ئەسپابی شـەڕ پەیاکـەن ،
تۆپ و تفەنگ و هـاوان »
( حاجێ : گم ــ ٥٢ )
٢ــ مایەی جێبەجێبون و نەبون یا ڕودانـی کـار و بەسـەرهاتێك :: ئەسپابی ئەم تێشکانە دەبێ چێ بێ ؟ . ئەسـپابی زێزبونەکەی تێ

نەگەیشتێن ★ سەبەب ، عیللەت ، هـۆ . ٣ـ تمـ : ئەساسییە . ٤ـ (مکـ.) هەمـوو ئەو کاڵایـەی لە دوکانێـکدا دادەنـدرێ بۆ فـرۆتن ★ خرتوپرت . ٥ـ (مجـ.) (مکـ.) ئامـرازی پیـاوەتی ئادەمیـزاد . ★ ئـامراز ، (سـنـ.) ئەسـپاو ، **ئەسپاو ــ** [ نا.] ، ( سنـ.) تم : ئەسپاب .

**ئەسپاردن ــ**[پهـ: ئەپەسپارتەن]، ( مصـ. متـ.) ١ـ کارێك حەوالـەی کەسێك کردن بۆ جێبەجێ‌کردنی . ☐ « قوربانت بم چاو ئەسـتێرە » « خزمەتێکمان پـێ بسپێرە » ( فۆلکلۆر )
٢ـ تەسلیم‌کردنـی شـتێك بـە کەسێك، کە بەئەمانەت هەڵی بگرێ و ئاگای لێ بـێ . ☐ « بـە خـودام ئەسپاردن » ، «تۆ دەڕۆی ئێمە بەکێ دەسپێری» ٣ـ تەمێ‌کردنی کەسێك بۆ کردن یا نەکردنی کارێك. :: بـە دەرکەوانەکەی ئەسپاردبو ڕاگێرمان نەکا ، ئەسپاردوویە هەر کەس بچێ بڵێـن لـە مـاڵ نیـە . ☐ «... ئەسپـاردی لە پێشخـانە ، یـەك دوبەڕەیان ڕاخست ...» (قزڵجی: پێکەنێـــن ــ ١٤١ ). ٤ـ (مجـ.) شاردنەوەی مردوو :: بە خاکیمـان ئەسپارد . ★ تەسلیم‌کردن . هس: ئەسپاردن/٢ . ★ سـپاردن ( بۆ هەر ٤ مانـاکە ). **ڕائەسپـاردن ــ** [ ڕا (پێبـ.) + ئەسپاردن ] ، (مصتـ. متـ.) ١ـ ناردنی پەیام یا خەبەرێ ، بە کەسێك‌دا بۆ یەکێکـی تر :: بـە خدردا ڕای‌ئەسپارد بۆ سەرێکی لێ بدەین . بـە دەمیـش تۆفێقمـان ڕائەسپاردوە ، ڕادەسپێرێن بە مام کوێخـــا بڵێـــن . ٢ـ داوای جێبەجێ‌کردنی کارێك لە کەسێك :: پێرۆتمـان ڕائەسپـارد لە شـار غەزەتەمان بۆ بێنێ . ★ ڕاسپاردن.
تێبـ ــ کەرتی یەکەمـی ئەسـپاردن (ئە) زۆر شل و شەوێقە هەندێ جار لە قسـەکردنا دەردەکەوێ و هەندێ جاریش وون دەبێ و شێوەیێکی‌تری مەصدەرەکە ( سپاردن ، ڕاسپاردن) پەیدا دەکا ، بـەڵام ئەسـڵ هـەر ( ئەسپاردن )ە.

**ئەسپاردە ــ** (نمفـ. صمفـ.) هەر شـتێکی بە کەسـێك درابـێ بـە ئەمانەت. :: ئەسپاردەی‌خوابن ★ ئەسپەردە ، ئەسپێراو ، سپاردە ، سپێراو ، سپێرپاگ .

**ئەسپایێ ــ** [ئەسپا + ٢ـ ئێ] ، (حمصـ.) بێ هەست و خوست ، بێ تەقە و ڕەقە ، لەسەرخۆ ، بێ دەنگ . تێبـ ــ أ ) ئـەم ووشـەیە هەمیشـە ( بە ) ی لە پێشـەوە دێت و بە تەنیایێ مانای نایە . ب ) ئەسپا لە (ئاوێستا)دا لە دوکەرتی : (ئـە = ئامـرازی نـەفی ) و (سـپا) پێکهاتوە ، (سپا) بە تەنیایێ یەعنی : خۆشێ ، بەختـەوەرێ ، لێ زیاد کردن ، بردنـەپێش ، فرێـدان ، تۆڕدان لە گەڵێ شوێنی (ئاوێستا)دا دەکار کراوە و لە بەندی ٩ی هاتی ٤٥ی (یەسنە)دا ، سپا و ئەسپا بە مانای بەختـەوەرێ و چـارەڕەشی پێکەوە هاتون و (ئەسپا) بە مانای ئێش و ژان هاتوە (تم : پد . یگد ــ

١٩٦) . **بە ئەسپایی ـ** (بنت.) بە بێ دەنگ ، بە لەسەر خۆیی . . . :: بە ئەسپایی دەرگاکە پێوەدە با منداڵەکە وەخەبەر نەیێ ، بە ئەسپایی بە گوێیدا چرپاند ، بە ئەسپایی هاتە ژوور .

□ « بۆ سەر ئەم خاکە پێ بە ئەسپایی »
« دانێ ، چاوەکەم ، چاوی یارێ بۆ »
(سەلام : خەییام ـ ٨)

★ ئاسپایی ، بەئاسپایی .

**ئەسپسوار ـ** (صت.) کەسێکی سواری ئەسپ بێ ، نەك وولاغی تر .

□ « من پلاوخۆرم بە دۆ تێر نابم »
« من ئەسپ سوارم بە کەر فێر نابم »
(پیرەمێرد ـ ٢١٤)

**ئەسپنگ ـ** (نا.) تم : ئەسپینگ .

**ئەسپۆن ـ** (نا.) گیایەکە لە نوالآن دەڕوێ ، لق و پۆپی باریك و ساقەتی ئەستوورە ، **مالآت** نایخوا . ڕەگەکەی ووشك دەکەنەوە و لە **دەستاڕی** دەکەن جلی پێ دەشۆن .

□ «کوردە ! ئەسپۆنەکەت وووردە ؟»

هس : صابوون ( لە بەشێکی زۆری زمانە ئوڕۆپاییەکانیشدا ) .

**ئەسپەئاسنینە ـ** (نت.) تم : ئەسپەدارینە .

**ئەسپەدارینە ـ** [ئەسپ + ٣ـ ئە/٢ + دار + ئینە ] ، (نت.) ، (مکـ.) مەکینەیەکە ئینسان سواری دەبێ و هاتوچۆی پێدەکا ، دوو تەگەر (تایە)ی هەیە بە هۆی زنجیرێکی تایبەتی کە چەرخێکی ددانە داری پێوەیە ، دەسووڕێنەوە . تێب ـ لە چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیدا باسی ئەسپێك دەکرێ کە لە دار دروست‌کراوە ، یەکەم جار کە ئەم مەکینەیە هاتوتە موکریان ، لە ( مەهابات ) پێیان کوتوە : ئەسپەدارینە ، هەروەکو کتێبەکانی پێش شەڕی دووەم کە لە عێراق بۆ خوێندنی کوردی چاپ‌کراوون بە (ئەسپەئاسنینە)یان ناوبردوە . ★ (کعر.) پایسکل ، (کئیر.) دوچەرخە .

**ئەسپەر ـ** (نا.) ، (سن.) تم : ئەسپەرە .

**ئەسپەردە ـ** (نمف. ، صمف.) ، (سن.) تم : ئەسپاردە .

**١ـ ئەسپەرە ـ** [ ؟ ] ، (نا.)

١ـ پارچە دارێکە (٢٠) سانتی مەتر درێژ و پێنج سانتی مەتر ئەستوور دەبێ ، پاش لێك و لووس کردن و تاشینی ڕۆییەکی پان و ڕاست و لایەکەی تری لە ناوەڕاستا ئەستوورە ، ووردە ووردە بە ڕاست و چەپا تەنك دەبێتەوە ، کونێکی خڕی تێدەکرێ و دەخرێتە سەر دەسکەبێڵ و پێمەڕە ، لە وەختی ئێشا قاچی دەخرێتە سەر تا پێمەڕەکە هاسانتر و خێرا تر لە زەوی بچێتە خوار و ئەوەندەش پێویستی بە هێزی دەست نەبێ .

٢ـ پارچە دارێکە دەخرێتە بەینی مێچ و کۆلەکەی خانوو ، تا ئەو

شوێنەی مێچی دەکەوێتە سەر تۆزێ پانتر بێ و قورسایێ مێچەکە دابەش ببێ . تێب ــ وا دیارە ئەسڵی ئەم ووشەیە (ئەسپارە) بێ و لە (ئەسپاردن) داتاشرابێ . ژابا ( ئەسپارەبۆیین ) ئاوا مەعنا لێدەداتەوە : پاڵدانەوە بە سەر کەسێکدا ، کۆمەگ و پشتیوانیکردنی یەکێک ، هەڵپەساردنی شتێك بە شتێکیترەوە ، قەوەت و زۆر خستنە سەر شتێك . (تم : ژابا ــ ٨ ) .

**٢ــ ئەسپەرە ــ** (نا.) ، ٢(سن.) گیایەکە بەنی پێ زەرددەکەن (تم : هبێد ــ ٤٥ و مخ ــ ٥٢ ) . هس : (فر.) ئەسپەرەك هەر بەم مەعنایە ★ زەرتك ، گێنۆ .

**ئەسپەشێنە ــ** [ ئەسپ + ٣ــ ئە/٢ + شێن + ٥ــ ئە/١ ] ، (نت.) ، (سیم.) « باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگە ، لە کەڕەواڵە گەورەترە ، لە کاتی هەڵفڕینا دەنگێکی لێوە دێ لە حیلەی ئەسپ ئەچێ » (خا : جا ــ ٤ ) ، « زەردەواڵەخۆر ــ باڵندە » (هبێد ــ ٤٥ ) ★ (مک.) کاسەلەشێنکە .

**ئەسپەك ــ** [ ؟ ] ، (نا.) زێپکە و ( لێر )ێکی بەهۆی نەخۆشیێ کەوتۆیێ (تیفۆس) لەشی ئادەمیزاد بەتایبەتی سەر ، دەریێدەدا . هس : (ست.) ئەسپا = دەرد ، ئازار . **ئەسپەك لەسەر (ی کەسێ) دان ــ** شێتبوون بەهۆی نەخۆشیێ ڕەشەگرانەتێ . تێب ــ ڕەشەگرانەتا

کە تووشی یەکێك بۆ ، کار لە هەمو دەزگاکانی لەشی دەکا ، یەکێك لەوانە سەر و مێشکێتی ، لەو حاڵەدا نەخۆشەکە قسان دەڕاوێنێ و ئەگەر نەیکوشت شێتی دەکا ، ئەو وەختە دەڵێن : « ئەسپەك لە سەری داوە » .

**ئەسپەناخ ــ** (نا.) ، (کعر.) تم : ئەسپەناغ .

**ئەسپەناغ ــ** (نا.) ، (مک.) گیایەکی بەهاریێ دەشتەکییە ، گەڵای پانە و لاسکی بارێك و شلکە ، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە چۆتە ئەوروپا (تم : لارۆس ــ ٣٨٨) ئێستا دەسچێنێتیشی هەیە . تێب ــ لە کوردستان ئەم گیایە بە گەڵێ جۆر دەخورێ : دەگەڵ هێلکە دەڕۆنا سوری‌دەکەنەوە ، زەردی‌دەکەن و ماستی بەسەردا دەکەن ، دەگەڵ گۆشت خۆرشتی لێدروست‌دەکرێ . (کعر.) ئەسپەناخ .

**ئەسپەندەر ــ** [ ئەسپەند + ٢ــ ئەر /٢ ] ، (نت.) گیایەکی دەشتەکییە گەڵای خڕ و پچکۆلەیە و لاسکی بەقەد قامکێك ئەستورە ، ڕەنگی زیاتر (کەوە)یە تا سەوز ، بەرێك‌دەگرێ هێندەی دەنکە نۆکێ ، ناوەکەی پڕە لە تۆوی ڕەشی وورد. تێب ــ ١) بەری ئەم گیایە بە شێنێ کۆدەکەنەوە و بە دەزوێەوە دەکەن و بەناو ماڵا هەڵێداوەسن هەم بۆ ڕازاندنەوەی ژوور و هەم بۆ ئیشك‌کردنەوەی. ئەم دەنکانە دەگەڵ (کوندر) و (هۆشە) یا بە تەنیا دەخەنە سەر هەندێ پشکۆی ئاگر و بەناو

ماڵا دەبگێڕن تا دوو کەڵ و بۆنی دەماڵ بگەڕێ ، دەڵێن بۆ (چاووزار) باشە و گۆیا مار و دووپشکیش لە بۆنی گیایەکە و دووکەڵی دەنکەکانی دەڕەونەوە . ب) بە لای منەوە ئەم وشەیە لە (سپێنتە)ی ئاوێستابی بە مانای : پاك ، مقەددەس ، ( تم : پد . یگد . ج٢ ـ ١٤٥) و (ئەر) ئامرازی فاعیلی پێکهاتوە کە بە تێکڕایێ ماناکەی دەبێتە (پاك‌کەرەوە ـ مطهر) ، وەکوو باس‌کرا ئێستاش لە کوردەواری خۆمان بۆ دوورخستنەوەی زیانی چاووزار (خاوێن‌کردنەوەی ماڵ لە چاوی پیس ، بەکاری‌دێنن) . ج) زۆر بۆ ئەوە دەچم کە لە پێش ئیسلاما ئەم گیایە لە ئاتەشگەدەکانی دینی زەردوشتی وەکوو ( بخوور ) بەکارهێنرابێ .

**ئەسپیندار** ـ [ئەسپێن + دار]، (نت.) جۆرە دارێکە ، تویکڵ و دارەکەی سپییە ، درێژ و ڕاست هەڵدەچێ ، گرێ‌وگۆڵ و خوار و خێچێ تێدا نیە ، بۆ کاروباری دارتاشێ و دارەڕای خانوو کەڵکی لێ‌وەردەگیرێ و کاغەزیشی لی دروست‌دەکرێ . هس : ئەسپێن .

**ئەسپینگ** ـ [ ؟ ] ، (نا.) ، (مک.) گیایەکی دەشتەکیێ بەهارییە ، گەڵای باریك‌ودرێژ و گرنج‌گرنجە ، لە چیا و دەشتی کوردستان زۆرە ، بە خوێوە دەخوری . ★ ئەسپنگ . (کعر.)شنگ .

**ئەسپێ** ـ [ستـ. و پهـ: سپیش]، (نا.) ١ـ زیندەوارێکە لەبەر پیس‌وپۆخڵێ لە لەشی ئینسان و هەندێ گیانداری تر وەکوو (مەیموون و ...)دا پەیدادەبێ ، ژیانی بە خوێنی ئادەمیزادە ، زۆر جێگەی مەترسییە ، چونکوو میکرۆبی هەندێ نەخۆشی وەك (تیفۆس) دەگەڵ خۆی ڕادەگوێزێ ، دووسێ میلێ مەتر درێژدەبێ ، قاچی زۆر و کورتن ، سەری درێژووکەیە ، دووجۆری هەیە، یەکیان لەناو (مو)دا وئەوێتریان لەناو جلکاندا دەژێ . ئێ ناو جلکان گەورەترە لە هێ توك ، گەرای هەر دووك جۆری وەکوو یەك وایە (ڕشك)ی پێ‌دەڵێن کە لە بنی تووك یا درزی دروومانی جلك‌دا دای‌دەنێ ، پاش چەند ڕۆژێ بەچکەکانی (مێتوولکە) لە گەرا دێنەدەر و دوای ٢٠ ڕۆژێك وایان لێ‌دێ خۆیان گەرا دابنێن . ٢ـ زیندەوارێکی پچووکە لە گەنم و جۆ ، برنج و ئارد و ئەو شتانە دەدا، بێ‌پێزیان دەکا و کەڵکی خواردنیان پێوە نایەڵێ . ٣ـ جۆرێك زیندەوارە لەژێر پەڕی مریشك و کۆتر و هەندێ باڵندەی تریشدا پەیدادەبێ و خوێنیان دەمژێ ★ مۆریان ، زیندەوار . ( بکـ. ) سپێ . ( هو. ) هەشپشێ . ● **ئەسپێی چەنگی گول** ـ (کنـ.) پێسکەیێ ، ڕژدێ ، ڕەزیلێ . :: هەر دەڵەی ئەسپێی چەنگی گولیە لە دەستی دەرنایە . هەرچێ کەوتە دەست ئەحە دەبێتە ئەسپێی چەنگی گول . **ئەسپێ لە گیرفانیدا ( باخەڵیا ) سەوزەڵە گیانم دەڵێ** ـ (کنـ.) هێچ

پارە و پوٚلی لە باغەلٚیدا نیـە ، زوٚر فەقیر و نەدارە . تیٚب ــ دەلٚیٚن ئـەو کەسانەی توٚشـی نەخوٚشـی گولیٚ دەبن، ئەسپیٚ هەلٚناهیٚنن، جا ئەگەر کابرایەکی گوٚل ئەسپیٚیەکی لە خوٚیدا دیٚت بوٚ ئەوەی پیشانی بدا گول نیە یا چـاك بوٚتەوە ، ڕای دەگری و لـە چەنگی نایەتەدەر .

**ئەسپیٚ تیٚ دان ــ** (مصد. لا.) ، (کمر.) پەیدابوونی ئەسپیٚ لە لەشـی ئینسـان و ... دانەویٚلـەدا :: چالەگەنمەکەی مالٚی کوێخا شەریٚف ئەسپیٚ تیٚیداوە ( ئەسپیٚی تیٚداوە )، ئـەم کابرایـە بوٚتـە کەولەسـپیٚ (کەولەئەسـپیٚ) بروٚشـی ئەسـپیٚ تیٚیداوە . ★ ئەسپیٚ هەلٚهیٚنان .

**ئەسـپیٚراو ــ** (نمف. ، صمف : ئەسپاردن) تم : ئەسپاردە .

**ئەسپیٚ کوژە ــ** [ئەسپیٚ + کوژ (کوشـتن) + ٣ــ ئە/٢] ، (نتـ.) . پەنجەی هەرە ئەستوور و لە هەموان کورتتری دەسـتی ئینسـان . ★ قامکە گەورە ، پەنجەی گەورە .

**ئەسپیٚون ــ** [ئەسپیٚ + ئـن] ، ( صت.) ئەو کەسەی ئەسـپیٚی لـە لەشیٚ دابیٚ .

**ئەسپیٚ هەلٚیٚنان ــ** [ ئەسپیٚ + هەلٚ (پیٚبف.) + هیٚنـان ] ، (مکـ.) تم : ئەسپیٚ تیٚ دان .

**ئەسپیٚن ــ** [أ] ، (نا.) ، (بـا.) ١ــ پارچەدار یا ئاسنیکی نوك تیژە بە شکلی دەمەتەور ، بوٚ قەلٚاشتنی دار و بڕینـەوەی تەختـە و ... بەکاردیٚت ، کاری ئەوەیە نایەلـیٚ قەلٚشـتی دار و تەختەکـە ویٚك بیٚتەوە و ڕیٚگای ئیٚـشکردنی تەور یا مشار بگـری . هەروەهـا کەوشدروو بوٚ لیٚـك دوورخسـتنەوەی لەتـەکانی قـالٚبی کەوشـی کـەلٚکی لیٚ وەردەگرن . هس : أ) سپینج = دەمەشیٚر یا چەقوٚ ( عا : نصـل ) ، (تم : ژابا ــ ٢٣٤) ب) سفین (اسفین) عارەبیٚ هەر بە مەعنای (ئەسپیٚن)ی کوردیٚ ، لە یوٚنانیٚ وەرگیٚراوە ( تم : المنجد ــ ٣٣٨) ، ج) سپیٚنای لاتینیٚ = دڕك . ★ پـواز ، سـپیٚنە ، هـوٚرە . ٢ــ کوٚلەکەیەکـە وەبـەر دیواری شکستی دەدەن تا نەیەلـیٚ بڕووخیٚ .

**ئەستاندن ــ** [ پە : ستەتەن] ، ( مصد. متـ.) ، (مکـ.) شـتیٚك بـە زوٚر وەرگرتن :: هەردەی ئەستیٚنیٚن بوٚ کویٚ دەچیٚ،دەمیٚکە ئەستاندوویە و دەنگـی نەکـردوە . ★ سـاندن ، سەندن ، سەنن . **لیٚ ئەستاندن ــ** ( مصد. متـ.) شـتیٚك بە زوٚر لـە کەسیٚك وەرگرتن ، بە توٚبـزیٚ لـە دەسـت دەرهیٚنـان :: هینـد فیٚرسیچمەیە بە زوٚر و بەخواهیشت شتیٚکی هەر لیٚ دەسـتیٚنیٚ ، زوٚری هاوارکرد فایدەی نەبوو ئاغـاصەت تمـەنی هـەر لیٚ ئەسـتـاند . ★ لیٚ ساندن ، لیٚ سەندن ، لیٚ سـەنن .

**ئەستاندنەوە ــ** [ئەستاندن + ــ ئەوە ] ، (مصد. متـ.) ، (مکـ.) ١ــ وەرگرتنەوەی شتیٚك لە کەسـیٚك . تیٚب ــ ئەم مەصدەرە نیٚمچە زوٚریٚکی لە مەدلوولەکەیـدا بەدی دەکریٚ . :: هەر هەلٚنەستام تا تەسبیٚحەکـەم ئەستاندەوە . تا پارەکەت نەستیٚنیٚوە

وازنەهێنی . ٢ـ گرتنەوەی شار یا هەر شوێنێکی‌تر کە دوژمن داگیری‌کردبێ . :: ئۆردوی سوور هەموو ئوروپای لە دەست نازیەکان ئەستاندەوە . **بۆ ئەستاندنەوە ـ** ( مصت. لا.) ١ـ وەڵام‌دانەوەی گۆرانی‌بێژێك لەلایەن گۆرانی‌بێژێکی تر ، بە گۆرانی . ( گۆرانی‌بێژی یەکەم بەندێك دەڵێ و بێدەنگ دەبێ ئەوجار ئەوی‌تر دەست‌پێدەکا ... تا گۆرانییەکە تەواودەبێ) ٢ـ دووپاتەکردنەوەی سەربەندی گۆرانییەك لەلایەن چەندکەسەوە (کارێکی کۆرس دەیکا) .

**ئەستری ـ** [ست : ئەستره] ، (نا.) ، (بکـ.) وەچێکی ڕەقی کورتی نوك تیژە کە هەندێ گیا و گوڵ (گوێنی ، ووشترخۆڕە و ... ) دەری‌دەکەن . ★ دڕك ، دڕوو ، ستری . هس : ئوستره .

**ئەستڕین ـ** (مصد. متـ.) ، (مکـ.) ١ـ پاك‌کردنەوە ، خاوێن‌کردنەوە . :: هەموو شووشەی پەنجەرەکانی ئەستڕیوە ، قاپ‌وقاچاغەکان بستڕە (بئەستڕە) ٢ـ ئیشك‌کردنەوەی دەست‌ودەم و چاو پاش شووشتن :: ها ئەوە خاولی دەم‌وچاوت بستڕە ، بارام پاش نان‌خواردن دەستی ناشوا هەر دەیئەستڕێ . ٣ـ جیاکردنەوە و لێکردنەوەی هەر شتێکی بە لەشەوە ، بە ... نووسابێ :: چڵمت بستڕە ، ئەرێ ئەوە بۆ لووتی منالەکە ناستڕێ . ★ سڕین .

**ئەستڕینەوە ـ** [ئەستڕین + ئەوە] ، (مصت. متـ.) ١ـ خاوێن کردنەوەی جێگایەك یا شتێ کە شتێکی پێداڕژابێ ، بەبێ‌شووشتن . هەموو بەخەت ماستە یاللابێستڕەوە ٢ـ کوژاندنەوە (خەت ، نووسراو) ە لەناوبردن (بێرەوەرێ ، ناو ، ...و ...) یەکێکتان ئەوەی لە تەختەڕەشەکە نووسراوە بستڕنەوە ، ناوی لە ناو ناوان ئەستڕاوەتەوە ★ سڕینەوە ، پاك‌کردنەوە ، خاوێن‌کردنەوە .

**ئەستوند ـ** (نا.) تم : ئەستوون.

**ئەستوندەك ـ** [ ئەستوند + ١ـ ئەك/١ ] ، (نتـ.) تم : ئەستوون

☐ « لە داوێنی چیا بۆ خەرمەنی
گوڵ خێوەتی خارا »
« بە دوو ئەستوندەکی زێوین
تەنافی زوڵفی هەڵداوە »
( حاجی : گم ـ ٩١ )

**ئەستۆ ـ** (نا.) ئەندامێکی لەشی ئادەمیزاد و گیاندارانی چوارپێ و باڵندانە ، سەلك و لەشیان تێك‌دەکاتەوە ★ گەردن ، مل ، (بکـ.) ستۆ ، ستۆکور . **خستنە ئەستۆ (سەرئەستۆ) ـ** (کـنـ.) ١ ـ هەڵاوەسینی دەستێ کە شکابێ و هەڵبەستڕابێتەوە ، بەملدا

☐ « دەستم کە لە صەد جێگە بە
صەد وەعدە شکاوە »
« جەبری نیە ئەم کەسرە هەتا
نەیخەیە ئەستۆ »
(حەریق)

٢ـ سەپاندنی کار ، تاوان ، ... بەسەر کەسێکدا :: گوناهی دزییەکەیان خستە ئەستۆی ، پاش قڕە و هەرایەکی زۆر دەدێناریان

خستە ئەستۆی ، هێندەیان کار خستۆتە ئەستۆی لە ژێری دەرناچێ . **دەست دە ئەستۆکردن ـ** (کن.) ١ـ ئاشتکردنەوەی یەکێك ٢ـ ئاشتبونەوە دەگەڵ کەسێك :: دەستێ دە ئەستۆی کە با هێچی دە دڵێدا نەمێنێ ٣ـ نیشانەی خۆشەویستییە :: دەستیان دە ئەستۆی یەککردبو دانیشتبون . **گرتنە ئەستۆ ـ** (کن.) قبوڵکردنی کار و فرمانێك بۆ جێبەجێکردنێ ، (عا : تعهّد) :: نوسینەوەی کتێبەکەی گرتۆتە ئەستۆ ، ئێوە ئەم کارە بگرنە ئەستۆ ، پەنجا دینار قەرزداری فەرهاد بۆ گرتمە ئەستۆی خۆم ★ وەئەستۆگرتن . **١ـ لە ئەستۆدان ـ** (کن.) ، ئیعدامکردن ، سەربڕین :: بێبەن لە ئەستۆی دەن . تێب ـ جاران سەرپەڕاندان بە شێر ، شێوەیێك بوە بۆ ئیعدامی کەسێك ، جا چونکو مێرغەزەب شمشێرەکەی بە دوودەست دەگرت و بە هەمو هێزی خۆی دایدەهێنایەوە و لە ملی کابرای دەدا، ووتراوە : (لە ئەستۆی دەن) . **٢ـ لە ئەستۆ دان ـ** ( کن.) بەڕاست زانینی قسە یاکردەوەی کەسێك ، تەئیید کردن ، شایەتی بۆ دان :: لە ئەستۆی دا و کوتی باپیر ڕاستدەکا ، هێندە پیاوی چاکە هەرچێکی بێکا و بێڵێ خەڵك بۆی لە ئەستۆ دەدەن . تێب ـ سەر بۆ لای شانی ڕاست لاردەکرێتەوە و بە لەپی دەستی ڕاست دەکێشری بە لا ملی چەپەدا ، لەوانەیە سەرچاوەی ئەم کارەش هەر بچێتەوە سەر (١ـ لەئەستۆدان) وەك بیەوی بڵێ ئەگەر قسەکەی ڕاست دەرنەچو ئامادەیە لە ئەستۆی بدرێ . **وەئەستۆگرتن ـ** (کن.) تم : گرتنە ئەستۆ :: نوسینەوەی کتێبەکەی وەئەستۆگرتوە ، ئێوە وە ئەستۆتان گرت ، من کاری وا وە ئەستۆ ناگرم.

**ئەستۆخوار ـ** (صت.) ، ( مک.) ١ـ حاڵی کەسێکی لەبەر هۆیەکی فێزیکی ملی ڕاست هەڵنەچوبێ ★ ملخوار ٢ـ (مج.) عاجز و پەرێشان ، مات و مەلول □ « نۆکەر و تابیعەی کوڕی من پاکی ئەستۆخوارە » (تحفه : ج٢ ـ ٢٢١) ★ ملخوار ٢ ـ (کن.) عاجز و کەچ /١ .

**ئەستۆشکان ـ** (مصت. لا.) ، (کن.) مردن ، لەناوچون :: دەك بە ئەستۆی شکاوبێتەوە (نەیێتەوە) .

**ئەستۆشکاندن ـ** (مصت. مت.)، (کن.) زیانگەیاندن بە خۆ، یا خەڵك، وەسەر تەڵە پەڕاندن :: ئەوە حەمەیە و دۆغرێ ، ساڵی بە هەزاری چوبێ ئەستۆی خۆی دەشکێنێ ، وادەکەی تا ئەستۆمان بشکێنێ ، هەستن بابڕوین تا لە خشتەی نەبردوین و ئەستۆی نەشکاندوین .

**ئەستۆ کەچ ـ** (صت.) ، (مک.) تم : ئەستۆخوار/٢□ «ئەستۆ کەچە ڕاوەستاوە ، حەزرەتی عیسا بۆی پاڕاوە » (تحفه : ج٢ ـ ٢٤٢ ).

**ئەستور ـ** [په : ستەور ، ستەپر ] ، (صـ.) ١ـ هەر جیسمێکی

(بعد)ی سێیەمی هەبێ // تەنك ، بارێك :: ئەم چنارە هێندە ئەستورە باوەشی تێوەرنایە . ئەم دزوە ئەستورە بە کونی دەرزیەکەوە ناچێ، کتێبێکی ئەستوری پێ بو ، تەختەکەی هێنابوی زۆر ئەستور بو . ٢ـ (مج.) زۆر ، گەورە :: حەمە قددۆی مۆسلێ دەولەمەندێکی ئەستور بۆ ، لە پێنجوێن بەفرێکی ئەستور باریوە ، ئەو ساڵە سێلاوێکی ئەستور لە مەهابادێ هات □ « ... ڕۆی‌کردە کۆلانی سێهەم ، لەوێ تەماشای کرد دۆکەلێکی ئەستور بە هەوادا دەچێ» (قزلجی : پێکەنێن ـ ١٨) . تێب ـ ژابا ئاوێستایێ ئەم ووشەیەی بە (ستەبرە) نوسیوە (تم : ژابا ـ ٩) و مۆبەد ئازەر گوشەسب لە ( بخشی از فرهنگ اوستا و تطبیق آن با فارسی و کردی )دا (ل ـ ٦٦) بە (ستەئورە)ی دەزانێ .

**ئەستوران** ـ [ ئەستور + ٢ ـ ئان/٧ ] ، (نت.) ١ـ ڕێسی ئەستور (لۆکە ، خورێ ، و ...) کە بۆ شتی هەڕەمە (گوریس، تووربێن...) بڕیسرێ و گوێ نەدرێتە سافێ و بێ‌گرێ و گۆلێ :: کچم تۆ جارێ نازانێ هەر ئەستوران بڕێسە تافێردەبێ . // بارێکان. ٢ـ (مج.) قسە و کاری نارێك و ناپوخت و بێ‌ڕێ و جێ . :: ئەم کابرایە ملی لێناوە ئەستوران دەڕێسی خۆشی نازانێ دەڵێ چێ .

**ئەستورایێ** ـ [ ئەستور + ئایێ /١ ] ، (نت.) ١ـ دوری دۆ ڕۆی گەورە و پانی هەمۆ جیسمێك لە یەکتر (پچۆکترین ـ بعد ـ لە نیوان دۆڕۆی جیسمێکی پتەو ) . ٢ـ محیطی هەمۆ جیسمێکی ئەستوانەیێ (دار ، کۆلەکە ، لۆلە ...) ٣ـ ئەو شوێنەی کە شوێنەکانی تری جیسمێك لە چاویا باریکتر یا تەنکتر بن :: ئەستورایێ ئەم کتێبە ١٢ سانتیمەترە ، بە ئەستورایی باوەشێك ، کونی ئەسپەرە دەبێ لە قەدەر ئەستورایێ دەسکی پێمەڕەبێ .

**ئەستۆربۆن** ـ (مصت. لا.) ١ ـ ئاوسان و هەڵمسانی لەش یا ئەندامێکی لەشی ئادەمێزاد و هەندێ گیاندارانی تر ، لە ئەنجامی نەخۆشێ دەرونی و کوان و ئەو جۆرە شتانەدا:: جێرانەکەمان زۆر نەخۆش بۆ ئیمڕۆ ئەستورێش بوە ، ئەو ساڵە نەخۆشێ ماڵاتدا کەوتبۆ هەر مەڕبۆ ئەستور دەبۆ و بە لادا دەهات. تێب ـ لە کوردەواریدا وا بڵاوە کە ئەگەر لەبەرچاوی یەکێکی چلێس و نەوسن شتێ بخۆن و بەشێ نەدەن ئەستور دەبێ. ٢ـ (کن.) قەڵەوبۆنی ئادەمێزاد :: تەماشای ! دەتگوت شەمی شایێ بایێبە ، چۆن ئەستور بوە .

**ئەستۆرك** ـ [ئەستور + ئك ] ، (نت.) جۆرە نانێکی ئەستورە
□ « بەگیان و دڵ لە ڕەببی خۆت دەخوازی »
« زگت پڕبێ لە ئەستورك و پیازی »
( مەلا : گە ـ ٣٠ )

**ئەستۆرکە** ـ [ئەستۆرك + ە ـ ئە/١ ] ، (نت.) تم : ئەستۆرك .

**ئەستۆری** ـ [ ئەستۆر + ٢ ـ ئی ] ، (نت.) ١ـ ئەستۆرایی مطلق . تێبـ ـ جیاوازی ئەم ووشەیە دەگەل (ئەستۆرایی) لەوەدایە کە ئەمەیان ( مطلق )ە و ئەویان (معین و محدود)، ٢ ـ نەخۆشییەکە ( وەکو لەکوردەوارێدا مەشهوربو ، بەلام لەراستیدا نەتیجەی هەندێ نەخۆشی دەرونییە دیاری‌دەدا ) تم : ئەستۆر بون .

**ئەستۆکوردە** ـ (نت.) ، (مک.) ملەقۆچە . هس : أ ) ستۆکور ، ستۆکورد (بک. = ئەستۆ ) ب ) گوردە (فر = پشتەمل) .

**ئەستون** ـ [ ست. : ستەئونە . پە : ستون ] ، (نا.) ١ـ دارێکی ڕاست و ئەستورە وەبەر مێچی خانو دەدرێ ★ ستون ، کۆلەکە ، هەستون ، هەسون . ٢ـ دارێکی ڕاست (یا حەیزەران)ە وەبەر خێوەت و ڕەشمال دەدرێ ★ ئەستوندەك ، چەلاگ/٢ ، تیرەك ، دیرەك .

**ئەستونەزێڕینە** ـ [ ئەستون + ٣ـ ئە/٢ + زێڕ + ئین + ە ـ ئە/١ ] ، (نت.) کەوانەیێکی ڕەنگاورەنگە (سور ، نارنجی ، زەرد، سەوز، عابی، خمی، بنەوش) و کاتێ تیشکی ڕۆژ لە دلۆپەی باران دەدا و دەشکێتەوە ، لە ئاسمان پەیدا دەبێ (تم : گم . فەرهەنگی مەهاباد ـ ٤٠) ★ (کیـ.) پرچی ئایشە و فاتمان ، پەلکەزێڕینە ، کۆلکەزێرینە ، (بک.) کەسکەسور . هەسارەزێرینە،(جنو.) زەڕینەوسێمێنە ، دوێت‌وکوڕ .

**ئەستەخفیرولللا** ـ [ـ عا : استغفرالله ] ڕستەیەکە ، گوتنی لە کوردەوارێدا باوە مانای (داوای بەخشین دەکەم لەخودا )یە . ١ـ ئەگەر کەسێ قسەیێکی ( بەتایبەتی کفر ) لەدەم بێتەدەر یا گوێی لێبێ یەکێك قسەی لەم بابەتە دەکا ، بۆ دەربڕینی پەشێمانی و دورخستنەوەی گوناحی کفرەکەی خۆی ، یا نارەزایی لەوەی بێستویە دەیلێ:: خوایە تۆبە و ئەستەخفیرولللا ٢ ـ بۆ حاشاکردن لەکارێك دەگوترێ .

□ « من بەگوناهکار ئەدەنە قەلەم »
« ئەستەخفیرولللا پادشای ئەفخەم »
( سەلام ـ ١٦٤ )

**ئەستەم** ـ [ پە : ستەهم ] ، (نا.) دژوار ، زەحمەت ، نارەحەت . :: زور ئەستەمە ( گەلێ دژوارە )

□ « ئەم چەرخە کونە ماشێنەکەی ژەنگی گرتوە »
« چەوری نەکا بەخوێنەکی سوڕانی ئەستەمە »
( شێخ ئەحمەدی سریلاوایی )

هس : ئاستەم ، ستەم .

**ئەستەوێر** ـ (صـ.) ، ( هل.) تم: ئەستێوور .

**ئەستێ** ـ (نا.) ، (مک.) پارچە پۆلایێکە پڕیشکی ئاگر لە (بەردئەستێ) دەکاتەوە . تێبـ ـ ئەم پارچە پۆلایە وەکو ئالقەیێکی شێوە سێ‌سوچ وایە ، کەمێك

(پۆشوی‌دار)یان لەسەر (بەردەستێ) دادنا و بەوپۆلایە یەك دۆ جار لە بەردەکەیان دەدا ، پڕیتشکی ئاگر ، ئاگری دەپۆشۆ بەردەدا و دەیان خستە سەر سەبێلە و قەننە ، ئەو وەختەش کە هێشتا تفەنگی تازە و (چەشنێ) لە کوردستان دانەکەوتبۆ ، پۆشۆیان ئاگر تێ بەردەدا و دەیان‌خستە سەر تێسکەی تفەنگە کۆنەکان ــ کە بارۆت و گوللەیان تێ کردبۆ ئاخنێ‌بۆیانەوە ــ و پێ‌یان ئاگردەدا ★ (بکـ.) هەستە ( تە : کف ــ ٣١٤ ، ژابا ــ ٤٤٤ ) .

**ئەستێر** ــ (نا.) ، ( مکـ.) تە : ئەستێل .

**ئەستێرك** ــ [ ئەستێر + ئك ]، (نتـ.) تە : ئەستێل .

**ئەستێرە** ــ [ ستـ : ستەر ، پە : ستەر ، ستار ، ستارەك ] ، (نا.) ١ــ هەمۆ ئەو جیسمانەی کە شەوانە وەکۆ خاڵێکی بچۆکی ڕۆناك لەئاسمان دەدرەوشێنەوە، بەگشتی دۆجۆرن: گەڕۆك ، نەگەڕ. ٢ــ تە : ئەستێرەی بەخت :: ئەستێرەی‌گەشە ، ئەستێرەی بڵیندە ، ئەستێرەیان لەکزیە ★ (سنـ.) ستارە ، (هو.) هەسارە (بکـ.) ستێر ، ستێرك . ئەختەر . **ئەستێرەی بەخت** ــ (نتـ.) ئەستێرەیەکی چارەنۆسی ئینسانێکی پێوە بەندبێ ★ ئەستێرە/٢ ، ئەستێرەی تالع . تێبـ ــ بەشێکی زانستی ئەستێرەناسێ کۆن وای دادەنا کە چارەنۆسی دنیا و هەمۆ خەڵکی دنیا پەیوەندێ هەیە دەگەڵ حەوت ئەستێرەی گەڕۆك (تە : ــ ) کە تا ئەو کاتە ناسرابۆن ، بەپێی حیساباتێکی دۆرو درێژ دەیان‌دۆزیەوە کە فلان ئینسان لەژێر سێبەری کام ئەستێرەدایە و کەی لەدایك بوە ، ئەو ئەستێرەیە لە کامە ( بورج )دابوە ، ئەوسا چارەنۆسی کابرا لەڕۆی گەڕانی ئەو ئەستێرەیە دیاری‌دەکرا ، پاتشایانی کۆن بۆ ئەم مەبەستە و گەلێ مەبەستێ‌تر ، ئەستێرەناسی تایبەتییان لە بارەگاکانیان ڕادەگرت . **ئەستێرەی بەیان** ــ (نتـ.) تـ : ئەستێرەی ڕۆژێ. **ئەستێرەی تالع** ــ (نتـ.) تە: ئەستێرەی بەخت

□ « ئەستێرەی تالع ڕۆی‌کردە نەهات »

« بێ شنە و سروەی شەماڵ کزومات »

( پیرەمێرد ــ ٣٢٠ )

**ئەستێرەی ڕۆژێ** ــ ( نتـ . ) ئەستێرەیەکە دەگەڵ سپێدە سەر لە لە ئاسۆ دەردێنی □ « چاووت ئەستێرەی ڕۆژێ ، سۆفیان پێی دەچنە نوێژێ » ( فولکلۆر ) ★ ئەستێرەی بەیان . **ئەستێرەی سەرشان** ــ (نتـ.) ، (تتـ.) شتێکە لە مەعدەنێکی زەردیاسپێ ، لە شێوەی ئەستێرە دروست‌دەکرێ ، ئەفسەرانی لەشکری هەر دەولەتێك بەپێی گەورە و پچۆکییان و بەو جۆرەی قانۆنی وولاتەکەیان دایناوە چەند دانەیێکی لەسەر شان یا جێگای‌تریان دادەدرۆن . :: ئەم ئەفسەرە سێ ئەستێرەی لەسەر شانە ، بێ‌قەزابی خۆ ئەستێرەمان

لەسەرشان دانادرۆی ( نامانکەی بە ئەفسەر ) منەتی چمان بەسەرەوە دەکەی ؟ **ئەستێرەی سیوەیل** (نت.) ١ــ یەکێکە لە ئەستێرە نەگەڕەکان،لە جەنگەی گەرما و کاتی گەیشتنی میوەجاتا هەڵدێ ، زۆر بە وورشە و گرشەیە. تێبــئەم ئەستێرەیە دوای نیوە شەو سەر لە ئاسۆی کوردستان دەردێنێ و دەگەڵ ئەستێرەی بەیان کەمتر فەرقی دەکرێ بۆیە کورد ناویان ناوە ( کاروانکوژە ) ٢ــ (کن.) نایاب ، کەمدیار ، کەسێکی کەم بیێندری :: خۆی لێ کردوێنە ئەستێرەی سیوەیل

☐ « عاشق بوم بە ڕوی ئەستێرەی سیوەیل »

« شۆرێ کەوتبوە ، دلەکەی پڕ مەیل »

( پیرەمێرد ــ ١٥١ )

**ئەستێرەی کلکدار ــ** (نت.) جۆرێك ئەستێرەن کە کلکێکی کەموزۆر درێژیان هەیە و ناوبەناو لە (منظومە شمسی) نێزیك دەبنەوە و دەبێندرێن ، کلکەکەیان لە (غاز) و ( هەڵم ) پێکهاتوە . ★ ( بک . ) ستێرکی بدۆ ( تم : ژابا ــ ٩ ) ، ستەیر دۆف ( تمــ : کف ــ ٦٨٩ ) ، (گەڕۆسی ، کرماشانی) ئەسارەی دومدار ( تمــ : دۆمۆرگان ، لێکۆڵینەوەی زمانەوانی لەهجەکانی کوردی ــ١١١). **ئەستێرەی گەڕۆك ــ** (نت .) ، (تت .) ئەو ئەستێرانەن کە بە دەوری ڕۆژا دەخولێنەوە، خۆیان هیچ ڕۆناکییان نیە و نوری هەتاو ڕۆناکیان دەکا ، زەوی یەکێکە لەوان

کە تا ئێستا (نۆ)یان ناسراوون و تێکڕا پێیان دەڵێن ( منظومەی شمسی ) و بەپێی نیزیکی و دوریبان لە ڕۆژ ئەمانەن : عطارد ( لە هەموان نێزیکترە لە ڕۆژ ) ، زوهرە ، ئەرز (زەوی) ، مریخ ، مشتەری ، زحل ئورانوس ، نیپتون . هێندێ لەو گەڕۆکانە یەك یا چەند ئەستێرەیان هەیە کە بە دەوریاندا دەخولێنەوە و پێیان دەڵێن ( مانگ ) ، زەوی یەك ( مانگ )ی هەیە . **ئەستێرەی مانگی** (نت .) ئەستێرەیەکە دەگەڵ مانگ دەردەکەوێ و لە سەرەتای مانگدا زۆر لێی نیزیکە هەتا مانگ گەورەتر دەبێ،ئەویش زیاتر دوردەکەوێتەوە. **ئەستێرەی نەگەڕ** (نت .) ، (تت .) ئەو ئەستێرانەن کە لە جێگەی خۆیان نابزون (لە مەدارێکدا ناسوڕێنەوە) ، ئەمانە خۆیان ڕوناکییان هەیە ، وەکو گەڕۆکەکان نەك هەر سارد نەبونەوە، بەڵکو گەرمایێشیان زۆرە و سروشتیان وەکی هەتاوە . ئەوانەی زۆر لێك نێزیکن ( نسبیاً ) لە شەوا کە ئاسمان ساف و بێ هەور و هەڵابێ ، وەکو پەڵە هەورێکی سپی ڕوناك دیاری دەدەن . ( کاکەشان ) یەکێکە لەو پەڵە هەورە مەزنانە کە ١٨ میلیون ئەستێرەی گەورە و بچوکی تێدا کۆبوتەوە و هەر چەندێکیان دەورەی ئەستێرەیەکیان داوە و بونە (منظومە)یەك چوارسالی پێ دەوێ تا ( نور )ی نێزیکترین ئەستێرەی نەگەڕ بگاتە زەوی ، لە کاتێکا دەزانین کە لە هەرسانیەیەکدا نور ٣٠٠ هەزار کیلۆمەتر ڕێگا

دەبڕێ .

**ئەستێرە ڕاکشان** ـ ( مصد . لا. ) بزوتنەوە و جوڵانی ئەستێرەی ( نەگەڕ )ە لە شوێنی خۆی و خوشێنی بەئاسمانا بەخێرایی :: چاووت لێ نەبو ئەو ئەستێرەیە ڕاکشا. تێب ـ ئەو ئەستێرەی ڕادەکشێ لە جاذبەی منظومەی خۆی دەردەچێ ، وێلێ ( فضا ) دەبێ و هەرچێ هاتە پێشی دەیداتە بەر ، تا دەگاتە ئاتمۆسفۆری زەوێ پەڕش و بلاو دەبێتەوە دەسوتێ ، جاروبارە کە ئەستێرەکە زلبێ ـ یا لەبەر هەرچێکیتر ـ بتوانێ بێتە ناو ئاتمۆسفۆری ئەرز ، جاذبەی ئەرز ڕایدەکێشێ و لە شوێنێك دەدا قوڵێ دەکا ، ئەوەی پێیان دەڵێن ( بەردی ئاسمان ) پاشماوەی ئەمکارەن .

**ئەستێرەناس** ـ [ ئەستێرە + ناس ( ناسین ) ] ، (صفا .) ، (تت.) ئەو کەسەیە سەری لە گەڕان و هەڵاتن و ئاوابونی ئەستێران دەردەچێ ★ ئەختەرشناس ، حیسابگەر ، منجم .

**ئەستێرەناسی** ـ ١ـ (نا.) . لێكدانەوە و حیساب کردنی هاتوچۆ و هەڵاتن و ئاوابون و بەرز و نزم بونەوەی ئەستێرەکانو هەڵدانو هەڵێنانی ئەو کارەساتانەی بەپێی ئەم حیسابانە ڕودەدەن . تێب ـ ئاشکرایە ئامانجی ئەم زانستە لە ڕابردودا دەگەڵ ئێستا لێكجیاوازن. ٢ـ ( حمص . ) کاری زانایەکی ئەستێرەناس . ★ ئەختەرشناسی، حیسابگەرێ .

**ئەستێ لە باخەڵ** ـ ( نت. ) ، (سیم.) یاریەکی بە کۆمەڵە لە کوردەوارێ تێب ـ خەڵکەکەی یارێ دەکەن دەبن بە دودەستە ، دەستەیەکیان ( ئەستێ ) یەك لە باخەڵی یەکێك لە خۆیاندا دەشارنەوە و دەستەکەیتر دەبێ بگەڕێ بیدۆزێتەوە ، ئەمیاریە شێوەیێکیتری گۆرەوێ بازێ (جۆرابێن) و زەرفێن (فینجانێن)ە .

**ئەستێڵ** ـ ( نا. ) ، ( سیم. ) گۆلاوێکە لەبەر کانێ و کارێزان دەکرێ و ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە ، بۆ ئاودانی کشتوکاڵ ★ ئەستێر ، ئەستێرك ، گۆل .

**ئەستێڵگرتن** ـ ( مصد . مت .) پەڕۆوپاڵ یا تۆپەوانەی تایبەتێ دەگونجی ئەستێڵ ئاخنێن ، بۆئەوەی ئاوەکەی بۆی دێ لەبەری نەڕوا :: ڕۆڵە ئیمڕۆ نۆرە ئاومانە بچن ئەستێڵەکە بگرن .

**ئەستێوبەرد** ـ (نت .) دەزگای ئاگر کردنەوە بۆ قەننەو سەبێلە و تفەنگ ، بەشێوەی کۆن . (تمـ : ئەستێ ) .

**ئەستێ و پۆشو** ـ (نت.) ١ـ دو پارچەن لە دەزگای ئاگرکردنەوە ٢ـ (کن .) حاڵی دو کەس کە پێکەوە هەڵنەکەن و کۆبونەوەیان ببێتە مایەی ئاژاوە :: ئەم منداڵانە هەر دەڵەی ئەستێ و پۆشون هەمیشە شەڕیانە . ★ کێردوپەنێر ، مشك و پشیلە .

**ئەستێوور** ـ [ پە : ستەرڤەن ]،

(صـ .) ، ( مك . ) ١ـ حـالی مەڕ ، بزن یا مانگایەك، كە ساڵێك نەزابێ و شیری نـەبێ ٢ـ دارێـكی بـەرێ نەگرتبێ □.« ... داره بـه نەكان ئەسـتێوربوون بنیشـتێكی زۆریان دەردەدا ... » (قزلجی : پێكەنین ـ ٨١) ★ ئەستەوێر، (بك.) ئەستەور، ستەوره ( ژابا ـ ٩) ، ستەور (كف ـ ٦٨٨ ) هس : ( هینـدیی كـۆن ) سەتەر = بێحاسل . ( فرەنـسی ) ستێرێل = بێبەر (دارودرەخت) ، نەزۆك (گیاندار) ،بێحاسڵ (زەوی). تێبـ ـ من نەمبێستبوو ئەم ووشەیە بۆ دارودرەخت بگوترێ بەلاّم دڵنیام كاكە قزلجی تا نەزانێ شتێك ڕاستە نایـنوسێ .

**ئەستێوولك** ـ [ ئەستێ + ووڵ ( لە : تێووڵین ) + ئلك ] ، (نتـ .) شێشێكی ئاسنە ٢٠/٣٠ سانتیمەتر درێـژه سـەرێكی پانكراوەتەوه ، سـەرەكەی دێكەشـی یـان وەكـو قولاّپ و قەلاّنگ وایە، یان دەسكێكی داری ڕێ دەخرێ . بـۆ كاروباری ئاشپەزخانـە و چێشـت لێنـان و نانكردن بە كاردێت . **ئەستێوولكی تەندوور** ( نتـ . ) شـكڵی هـەروەك ئەستێوولك وایە ، درێژترە و نانی پێ لە تەندوور دەكەنەوە، ئەگەرنانیش لـە خۆیەوە كەوتە نـاو تەنوورەوە ، بەسـەرە قولاپدارەكـەی دەری دێننـەوە و ئـاگری تەندووریشـی پـێ خـۆش دەكـەن تێبـ ـ كەرتی دووەمی ئـەم ووشـەیە ( ووڵ ) هەروەكو نیشاندراوە بەلای منەوە لە مەصدەری (تێ ووڵین ) كە ئێستا مانای ( تێ‌گوشـتین ) دەدا ، وەرگیراوە، واتێدەگەم كە (تێووڵین) شـێوەیێكی كۆنتری ( تێ‌گێـڕان ، تێوەردان) بێ و ئەم ئامرازە لەپێشدا هەر بۆ تەنـدوور و نانكردن بوە لـە پاشان چۆتە ئاشپەزخانە. سەرەرای ئەوەش ڕێی دەچێتێ ئەم ووشەیە لە (ئەستێ) و (ئۆلك) پێكهاتبێ كە بەشی دووەمیـان پـاشـبەندی پچوككردنەوەبیـت ، لەم حـاڵەتەدا هـس : (هەسـتێ) لە لەهجـەی باكوریدا و (ئەست) لە ئاوێستاییدا بە مانای ئێسقان .

**ئەسر** ـ ( نا. ) ، ( سـنـ.) تم : ئەسرتین .

**ئـەسرۆ** ـ ( نـا.) ، (مكـ.) شاخیمەڕ و بزن ، قۆچ □ « ... ساحێبی دوازده بەران و حـەوت نێری بە ئەسرۆمە ...» ( تحفـە : ج ٢ ـ ١٧٩ ) . تێبـ ـ ( سرو ) یـا (سرڤه) لە ئاوێستـاییدا بە مانـای شاخ و چنگی گیانداران هاتوه و لـە زمانی پەهلەویدا بۆتـە ( سروڤ ، سروب ) لە (یەسنە)دا كە بەشێكی ئاوێستای زەردوشتە ( هـای ٩ . بەندی ١١ ) ووشـەی ( سرڤـەرە) وەكو صفەت بۆ هەژدیها باسكراوە (تم : پد : یەسنە ، جا ـ ١٦٢ ).

**ئەسرێلك** ـ (نا.) ، (مك.) ١ ـ گیایەكە ، گوڵـی جوانـە ، بنێكـی ئەسـتوری هەیـە كە مـاددەیەكی نوسەكی تێدایە ، لە گەڵێ شوێنـی كوردستان شین دەبێ ٢ـ كوتراوی بنی ئەم گیایە كە لە كاروباری ژیانا وەكو چەسپ (صمـغ) بۆ پێكـەوە

نۆساندنی کاغەز و گەلێ شتی دیکە. بەکاردێت ★ چرێش ، سرێش .

**ئەسرین** ــ [ ســت : ئەسرەڤ ، ئەسرۆ . پە : ئەرس ] ، (نا.) ئاوێکی سوێرە لە ژێر پێلوی چاوان دەزێتەوە و کاتی گریان دێتە خوار .

□ « خەفەت وادەتەن ، مەینەتان سادەی »
« وەخت بارانەن ئەسرین !
دەی پەیکەی ؟ »
(مەولەوی : مکب ــ ١٧٠)
« گەر وەفایێ لەو دەرەدێت و
دەچێ مەنعی مەکە »
« سورمەیێ خاکی دەرت بۆ
چاوی پڕ ئەسرین دەبا »
(وەفایی : گم ــ ١٣)

★ ئەسر ، فرمێسك . (بکە.) ڕوندك . و ، ستر ، ئیستر ، هیستر (تم : ژابا ــ ٣٢٥) .

**ئەسڕار** ــ [ = : اسرار ] ، (نا.) ١ــ قسە یا کارێکی پێویست بێ هەمو کەس نەیزانێ ، ئەو قسە و کارانە کە بێجگە لە شوێنی خۆیان ، نابێ دەگەڵ کەس باس بکرێن . نهێنیەکان ٢ــ کار یا قسەیەك هەمو کەسێ سەرەودەری لێ نەکا .

□ « دڵ سیری ژینی ئەگەر ئەزانێ »
«ڕێی بۆ ئەسڕاری مەرگیش ئەهانێ »
(سەلام : خەییام ــ ١٧٢)

**ئەسکڵ** ــ (نا.) خەڵوزی گەشاوەوە ، ئاگرێکی لە داری سوتەنێ کەوتبێتەوە و هیچ ڕەشایێ نەمابێ ★ پۆلو ، ١ــ پەرەنگ ، پشکۆ، پەنگر ، سکڵ. (بکە.) پەل . تێبـ ــ ئەم ووشەیە زۆرکەم بەکار دەهێنرێ و سکڵ کە ( ئە )یەکەی سواوە جێگەی گرتۆتەوە .

**ئەسکنجە** ــ [؟] ، (نا.) ( مکە.) شوێنی پێکەوە نوسانی ئێسقانی ڕانی ئادەمیزاد دەگەڵ بەشی سەرەوەی لەشی (سیمـ.) ئەشکنج.

**ئەسکوند** ــ [ ؟ ] ، (نا.) باری وەستانی جگ بە قیتی لە یاری جگانێدا .

**ئەسکوێ** ــ ( ؟ ) ، (نا.) کەوچکێکی گەورەیە لە دار دروست دەکرێ دەسکی درێژە ، تەنیا بۆ چێشت لێنان دەبێ . ● « لە هەمو دیزەیەکا ئەسکوێیە » (کنـ.) خۆی لە هەمو ئیشێك هەڵدەقوتێنێ .

★ (بکە.) هەسکو ، هەسکە ، هەسك (تم : ژابا ــ ٤٤٤ و کف ــ ٣١٤) هس : ئوسکرە (فر.) گلێنەی ئاو خواردنەوە .

**ئەسکەلە** ــ [لە ئیتالی : سکالۆ] ١ــ ئەو شوێنەیە لە کەناری دەریا ، کە کەشتی لەنگەری لێ بەردەداتەوە و ڕادەوەستێ ★ (کئیر.) بەندەر ، (کعر.) مینا . ٢ــ هەمو ئەو (خانو ، عەمبار و بارەنداز)انەی بۆ ڕاپەڕاندن و هاسانکردنی کاروباری لەنگەرخستنی پاپۆڕ (دابەزین و سواربونی خەڵك ، بارکردن و بارداگرتن) لە قەراغ بەحر دروست کرابێ .

**١ــ ئەسکەمل** ــ [ ؟ ] ، (نا.) ، (کعر.) یەکێکە لەو یاریانەی بە

پـەڕی قومار دەکـرێ . ٢ــ تم : ئەسکەملە .

**٢ــ ئەسکەمل ــ** [ ؟ ] ، (نا.) ، (کعر.) تم : ئەسکەملێ .

**ئەسکەملە ــ** [ ؟ ] ، (نـا.) ، (مک.) قومارێکە بە پارەی مەعدەن دەکـرێ . ★ ١ــ ئەسـکەمل ، (سن.) بەرزێلان ، شێر و خەت .

**ئەسکەملێ ــ** [ ؟ ] ، (نـا.) ، (کعر.) کورسـییە بـۆ لە سـەر دانیشتن لاجامەیێکی هەیە پشتی وێ دەدرێ . ★ (کعر.) ٢ــ ئەسکەمل ، (کئێر.) سەندەڵێ .

**ئەسکەناس ــ** (نا.) ، (سنـ.) تم : ئەسکیناس .

**ئەسکەنجەبێن ــ** [ ئەسـك + ئەنـگەبێن ] ، (نتـ.) ، (کئێـر.) شەربەتێکی مـزرە لـە سـرکە و هەنگوێن سازدەکرێ . تێبـ ــ ١ ) ئەم ووشەیە لە پێشدا (سکەنگەبێن) بوە و کراوە بە عەرەبێ ، چونکۆ لە زمانی عەرەبێدا (ابتـداء بساکن ) نابێ کردۆیانەتـە ( أسکنجبین ) و سەر لەنوێ گەڕاوەتـەوە ناو زمانی کوردێ و فارسێ ، لـە فارسێدا ( أ )ەکەیـان دیسـان لێ فڕێداوە بەڵام لە کوردێدا هـەروەك فارسێ دەنگی ( گ ) بۆتە ( ج ) و ( أ )ەکەش هەر ماوەتەوە . ب ) ژابا (٢٤٠ و ٢٤٢) و معێن (فەرهەنگ : ج٢ ــ ١٩٠٠) ووشـەی (سـك)یان بـە (سرکە) مەعنا لێداوەتـەوە . ج) حەوت بەش هەنگوێن (ئێستا قەند و شەکریش) دەگەڵ چوار بەش سرکە تێـکەڵاو دەکـەن و دەیکوڵێنـن ، ناوبەناو تۆزێکی دەخەنە نێوان دۆ پەنجـەوە و نەختێك دەیسـۆنەوە ئەگەر هەودا هەودابۆ (کێشێ هات) ئەوا دایدەگرن و پاش ساردبۆنەوە دەیکەنە شۆشە یا هـەر دەفرێکی تـرەوە و هەڵێ دەگـرن ، وەختـی خواردنـەوە بـە دڵخـواز ئـاوی تێدەکـەن ، لەگـەڵ (کاهـۆ)ش دەخورێ . ★ ئەسکەنجەمێن .

**ئەسکەنجەمین ــ** (نتـ.) ، (مک.) تم : ئەسکەنجەبێن .

**ئەسکەنە ــ** [ئەس ( ؟ ) + کەن (هەڵکەندن) + ە ــ ئە/١] ، (نتـ.) ئامرازێکی دارتاشانە ، بۆکۆڵێن و هەڵکەندنی دار و تەختە بەکاردێت . تێبـ ــ شـێشێکی پـۆڵای چـوار پاڵـوەوە ، ١٠ ــ ١٢ سـانتیمەتر درێژە ، هەر پاڵوێکی سانتیمەترێك یا زیاتر پانـە ، سەرێکی دەسـکی داری زێدەخرێ و سەرەکەی تری وەکـو قەڵەمی قـامێش دادراوە و و چەشنی چەقۆ تێژدەکرێ ، ئەو جێگایەی بیانەوێ بیکۆڵن لەسەرێ دادەنێـن و بە کوتکێـکی دار لـە دەسکەکەی دەدەن ، پارچە پارچە تـەڵاش و تەڵـەزم لـە تەختـەکە هەڵـدەکا ، هەر بەم جـۆرە چۆنی پێویـست بێ شوێنەکە گەورە و پان و قوڵ دەکرێ .

**ئەسکیناس ــ** (نـا.) ، (مک.) پـارەی کاغـەز . ★ (سنــ.) ئەسکەناس . (کعـر.) بانقەنۆت .
☐ « نازت بۆ ، نازت بێ + صەت تمەن ئەسکیناس پایەندازت بێ » ( فۆلکلـۆر ) . :: گیرفانی پڕ بۆ لـە

ئەسکینناس ، جاران ئەسکینناسی سەد دینارێش هەبوو . تێب ــ وەکو دەزانن پارە لە پێشدا مەعدەن (مس ، زێڕ ، زیو ....) بوو ، لە شۆڕشی فەڕەنسادا پارەی کاغەز (حەواڵە بۆ سەر خەزێنەی میللی) داهێنرا کە پێیان دەکوت (ئاسسیگنات) ئەم ووشەیە لە ڕێگای زمانی عروسی‌ڕا ( تە : معین : فەرهەنگ . جا ــ ٢٧١ ) هاتوتە ناو زمانی فارسی و لەوێش‌ڕا بۆ کوردی . لەوانەشە بە هۆی بازرگانی ڕاستەوخۆی نێوان بەشێك لە کوردستانی ئێران و عروسیات ، هەر ڕاستەوخۆ لە ڕوسی‌ڕا هاتبێتە ناو زمانی کوردی .

**ئەسلەحە** ــ [ = عا : اسلحة ] ، (نا.) تە : ١ــ چەك .

☐ « ئەسلەحەی هەر میللەتی ، سا ، دەست و بازوی گەنجیەتی »

« ڕۆژی شوعلە بەخشی ئومێد، فیکر و کاری گەنجیەتی

(دلدار : گە ــ ٢٦)

**ئەسڵ** ــ [ = عا : أصل ] ، (نا.) ١ــ ڕێشە ، بناغە ، بنج‌وبناوان ٢ــ ڕەگەز ، بنەچەکە ، توخم (بۆگیانداران) ٣ــ مەبدەء (سیاسی) ٤ــ چاك ، ڕەسەن ، نەجیب // خراپ ، بەدەڵ :: ئەم کارە لە ئەسلا وا نەبو ئێوە واتان لێکرد ، ئەسڵی نەتەوەی کورد دەچێتەوە سەر ( ماد )ەکان ، ئەم ئیستیکانە عروسی ئەسڵە ☐ « یەکێك لە نیشانەکانی قیامەتی سەرداری بەد ئەسڵانە » .

« بێت و ئەسپی چەند ئەسڵ بێ ، سواری چالاکی نەبێ »

« قابیلە دەرچێ ؟ لە مەیدانی جیدال و جێگەڕەوت »

(دلدار : گە ــ ١٩)

**ئەسڵزادە** ــ [عا. کو.] ، (صت.) نەجیب‌زادە ، ئەو کەسانەی لە بنەماڵەیێکی ناوداربن // بۆرە پیاو .

**ئەسڵ‌وفەسڵ** ــ [عا.] ، (نت.) ١ــ ڕێشە و بناغەی کارێك ، حەقیقەتی شتێك . ٢ــ باوباپیری کەسێك یا بنەماڵێك :: ئەمەی خەسرەو باسی دەکا هەر ئەسڵ و فەسلێشی نیە ، کەس نازانی ئەسڵ و فەسلی چیە و لە کوێ‌ڕا هاتوە ؟

**ئەسڵەن** ــ [ = عا : أصلاً ] ، (بن.) ١ــ ئەوی ڕاست بێ ، هەر بەڕاستی ، لە حەقیقەتدا ☐ « ... ئەسڵەن هەمو شتێك لەبەر یەك ڕەویوەتەوە ... » ( قزلجی : پێکەنین ــ ٣٦ ) ٢ــ هیچ کاتێ ، بە هیچ چەشنێ :: ئەسڵەن هەر سەرێشی لێ‌دەرناچێ ، ئەسڵەن وا نیە ، ئەسڵەن ئەو کوڕە حەزی لە خوێندن نیە .

**ئەسمەر** ــ [ = عا : اسمر ] ، (صە.) پیاو یا ژنێکی ڕەنگی پێستی وەکو ڕەنگی گەنم بێ ، گەنم ڕەنگ . ★ سەوزە ، گەندمی . تێب ــ ئەم ووشەیە لە عەرەبی‌دا صفەتی نێرینانە و بۆ مێیینە (سمراء) دەلێن ، بەلام لە کوردیدا ئەم فەرقە ناکرێ و بۆ هەردو جسن

بەکاردێت . ٢ـ (مجـ.) جوان ، خوێنشیرن ، ژیکەلە. ٣ـ ناوە بۆ ئافرەت .

**ئەسمەرپێچ ــ** [ عا. کو. ] ، (صت.) چێفێکی بە بەنی ڕەنگاوڕەنگ چندرابێ و نەخشێن بێ .

□ « چێخی ئەسمەر پێچ ڕەشمالانی جاف »

« ڕۆپۆشی شێوەی شای مشکین کەلاف »

(سەلام ــ ٩١)

**ئەسنـــاد ــ** [= عـا : اسنـاد (سند) ] ، (نا.) ١ـ هەمو کاغەزێکی شتێکی لێنوسرابێ ، کـە لە بـاری قانونی و مێژوییەوە بۆ هەمو جورە کاروباری مالی و حقـوقی نرخـی هەبێ . ٢ـ هەمو جورە نوسراوێکی بۆ ئیسپاتی مافێك یا ڕەت کردنەوەی داوایەك بە کەڵك بێ .

**ئەسناف ــ** [= عـا : اصنـاف (صنف) ] ، (نـا.) ١ـ کۆمـەڵی ووردەسـەنعاتکـار و کاسـب و دوکانداران // تاجر ، بازرگان .

□ « گەرچی عەدلی ئێستە وایـە ، شێر لە ڕێویێ ڕەم ئەکا »

« حاجییە ، ئەسنافە ! ئیمڕۆ ئیدیعای جەم جەم دەکـا »

( سەلام ــ ١٥٦ )

٢ ــ جۆر ، چەشن ، شکڵ ( هەر بە مەعنا عەرەبییـەکەی ) تێبـ ــ ئـەم ووشەیە بۆ مەعنای یەکەم هەر بـە شێوەی جەمعەکەی دەکاردەکرێ ، بەڵام بۆ مانـای دوەم لـە جیگـای جەمع ، جەمع و لە جێگای موفرەد، موفرەدەکەی (سنف) بەکاردێت .

**ئەسەر ــ** [= عا : اثر ] ، (نا.) ١ـ نیشانە و بەڵگەیەکی بونی شتێك لەوەختێکا لە شوێنێك پێشان بدات

□ « دیدەم هەمـو شـۆڕاوە بـە شوراوی سرێشکم »

«لەم لەوحە نیگارێنە، نەعەین و نە ئەسـەر ما »

( نالی : گم ــ ٩ )

٢ـ شوێن پێ ، چێ پێی ئینسان و گیانداری تر

□ « وەك نافە کە بۆبێ لە غـەزالی خۆتەنی گوم »

« خۆی بێ ئەسەر و ماوە لـە ئاهو ئەسەری سوم »

( ئەدەب : گم ــ ٤٤ )

٣ـ ئەنجام و نەتیجەی کارتێکردنی شتێ یا کارێ لە کەسێ یا شتێکـی دیکە . :: هـەرچی نەسـیحەتی دەکەین بێ ئەسەرە ★ هەتەر .

**ئەسەرلێکردن ــ** [عا. کو.] ، ( مصت. مت.) کـارتێکردن :: ئـەم کارەساتەشی بەسەر هات کەچـی هێچ ئەسـەری لێنـەکردوە . ★ تەئسیر .

**ئەسەف ــ** [= عا : اسـف ] ، (نا.)، (کمر.) پێناخۆشی، دلگرانی،

□ « حەسرەت و داخ و ئەسەف ، سەد نالەو و ئاهـ و فغان »

« بۆ ڕەئیسی شێخ و سادات و ئەمیری کوردەکان »

( سەلام ــ ١٥٧ )

:: زۆر جێگەی ئەسـەفە تـۆ ئـەم قسەیە دەکەی . ★ ئەفسـوس ، داخ .

**ئەسەفکردن ــ** [عـا. کو.] ،

( مصت. لا.) ، (کعر.) دەربڕینـی داخ و ئەفسـوس ، نیشـاندانـی پێناخۆشـی لە کـار و کـردەوە و ڕوداوێك . :: ئەسەف دەکەم کـە هێشتـا نەمتوانیوە تێی بگـەیەنم ، ئەسەفی دەکرد کە هەرچـی دەکـا بۆی حیساب ناکرێ .

**ئەسیر ــ** [= عـا : اسـیر ] ، (نا. وصـ.) تە : ئێخسیر .

□ « ئەگـەر بێ یـادی زولـف و چاوەکەت یەك لەحزە سابیر بم »
« ئەسـیری بەنـدی کـافر ، کوشتەیی بێدادی ساحیر بـم »
( وەفایی : گمە ــ ٤٤ )

**ئەسـیری ــ** [ئەسـیر + ٢ ــ ێی ] ، [عـا. کو.] ، ( حمصـ.) تە : ئێخسـیری

□ « لە حەق لا مەدە ، هەر حەق بێژە »
« ژاری ئەسـیری و دیلـی مەچێژە »
( سەلام ــ ٦٢ )

**ئەشخاس ــ** [= عا : اشخاص (شخص) ] ، (نا.) کەس ، کەسان ، کەسەکان :: ئەو جۆرە ئەشخاسە کەلکی ئەم کارانەیان پێوە نیە .

□ « پەندی پێشـینیـان ، ڕۆحـی مەولەوی »
« تاریخ و ئەشخاس کـوردی دڵ قەوی »
( سەلام ــ ١٤٦ )

**ئەشرەفی ــ** [عا. کو.] ، (نتـ.)، (کنێـر.) ١ ــ پـارەیێکـی زێڕی دەوڵەتـی ئێرانـە ئـی زەمـانی قاجارەکان ، لە کوردستان زیـاتر بۆ خشـڵی ژنان دەکار کراوە ، سێ جۆرە : دە هـەزاری (یەك‌تمەنـی) مسقالێك زێڕ ، پێنج هەزاری نێـو مسقاڵ زێڕ ، دو هەزاری ، چارەگە مسقـالێك .

□ « هەرگا دێم هیلال ئەو ئەبرۆی سی‌وەنگ »
« یەسـێتم ئـەسرێن ، یـە ئەشرەفی‌ڕەنـگ »
( مەولەوی : مکبـ ــ ٢٤٧ )

★ سوڕەشایی . ٢ــ ناوی گوڵێکی دەستچێنـە ، گوڵەکـانی زەرد و خڕن وەك ئەشرەفی زێـڕ دەچن . ٣ــ (هل.) گوڵەباغ ، گوڵی گوڵاو . ٤ــ ناوە بۆ ئافرەت .

**ئەشڕاف ــ** [= عا : اشـراف (شریف) ] پایەبەرز ، پیاوماقوڵ لە ناو کۆمەڵدا، نەجیب‌زادە،خانەدان.

□ « صەت پیاوی گەورەی لێ لە نـاو بردێن »
« دو صـەت ئەشڕافـی لـی دروست کردێن »
( سەلام ــ ٧٠)

**ئەشغاڵ ــ** [= عـا : اشغـال ( شغل ) ] ، (نا.) ، (کعر.) نـاوی وەزارەتێکە لە حکومەتـی عیراقـدا ( ئێستا بۆتە ئەشغال و ئیسکـان ) سەرپەرشتی کاروباری ڕێگاوبان و پردان دەکا و بەسەر دروست‌کردنی خانوبەرەی دەوڵەتی ڕادەگا .

□ « تا لە ئەشغالا بە صەد مننەت بە ڕۆژی شـەش قران »
« ئێشی جادەم پی سـپێرا ، مولتەجی و بێچارە بوم »
( سەلام ــ ١٠٥ )

**ئەشقیا ــ** [ = عا : أشقیاء ( شقیّ ) ] ، (نا.) ١ــ درّ و بێحەیا ٢ــ شلّتاغباز ، شەڕفرۆش ٣ ــ خۆبەئازازان ، ملهوڕ ٤ ــ ئەوەی گوێ نادانە دابی کۆمەڵایەتی و هەرچی ویستی دەیکا و خۆی بەسەر خەڵکیدا دەسەپێنێ ٥ــ دز و ڕێگر . :: دەك بە زیادی خێرێ نەبێ خۆ ئەم هەتیوە پێسەی کوێخا بارامیش لێمان بۆتە ئەشقیا ، ئەم دنیایە بۆ وای لێهاتوە هەر دەمڕۆتێ دۆعانەی لە باخەڵی خۆیدا دێت دەبێتە ئەشقیا و جادە نایکێشێ .

□ « غەرەز لەم جرت و پرت و فاك و فێکە »
« ئیتاعەی ئەشقیایە و دەفعی ئەشرار »
( ڕەزا ــ ٢٢ )

**ئەشقیایی ــ** [عا. کو.] ، ( حمص.) کارێکی پیاوی ئەشقیا دەیکا ، ئەوەی لە ئەشقیایان بوەشێتەوە :: ئەشقیایی پێشەی ئەوانە نیە کە شەرمیان بە خۆیانە.

**ئەشك ــ** [ فر.] ، (نا.) تم : ئەسرین . تێب ــ ئەم ووشەیە هەرچەندە فارسی ڕۆتە بەلام لە شیعری کلاسیکی کوردیدا زۆر دەکار کراوە

□ « هێندە ڕاوەستا لە داوێن ،
ئاوی فرمێسکی فیراق »
« بۆیە ویستا ئەشکی دیدەم ،
قەترەیێکە و صەد حوباب »
( ئەدەب )
« لە دڵدا چونکە هەر خوێنم
دەخوا غەم »
« بە تەدرێج ئەشکی خوێنینم
دەکا کەم »
( سالم : گە ــ ٨٦ )
« ئەشکم کە لەگەڵ عەشقمە
تفلێکی فەهێمە »
هۆشم کە لەگەڵ خۆشمە
پیرێکی نەزانە »
( نالی )

**ئەشکنج ــ** ( نا.) ، (سیە.) تم : ئەسکنجە . □ « ... هەستی گەرمایییەکی کرد لە ئەشکنجیا... » ( ــ : ژان ــ ٢٠ ) .

**١ ــ ئەشکنجە ــ** [ پە : شکەنجەك ] ، (نا.) ١ــ ئازار و ناڕەحەتی ماددی و مەعنەوی .
□ « لە ئەشکنجەی شکنجی زولفی
ئەو بێ وەعدە موڕغی دڵ »
« دەناڵێنێ وەکو بولبول لە
صوبحی کازیبی شەودا »
( نالی )
٢ ــ تم : ئەشکەڵە /٣ .

**٢ ــ ئەشکنجە ــ** ( نا.) ، (سنە.) ١ــ ئامرازێك بۆ ، بۆ جزۆبەندی کتێبان ، جاران لە تەختە دروستدەکرا و ئێستا ئی ئاسن هەیە . تێب ــ دۆ پارچە تەختەی ئەستور ، نیزبکەی ٢٠ سانتیم پان و ٥٠ ش درێژ ، یەکێکیان دۆ میلی ئاسنی بڕغۆی مارپێچی ( جاران داری لەلەکراو )ی لێ قایم دەکرا و ئەویتری بە سەردا دەگیرا ، کتێبیان دەخستە نێوانی هەردۆ تەختەکەوە و بە سەرەبڕغۆ توندیان دەکرد و کتێبەکەی ڕێك دەگوشی ★ ماووش، مەنگەنە، ئەشکەڵە/١.

٢ ــ ئامرازێکە لە ئاسن دروستکراوە و دارتاش و ئاسنگەر و ... بەکاری دێنن بۆ توند وەستاندنی شتێك ، تا بە بڕبەند لێك و لۆسی کەن یا بە مشار بیبڕنەوە یا هەر مەبەستێکی تر . ★ گیرە ، مەنگەنە .

**ئەشکنجەدان ــ** [ ١ــ ئەشکنجە/١ + دان (فعـ.) ] ، (مصد. متـ.) تم : ئەشکنجەکردن .

**ئەشکنجەکردن ــ** ( مصد. متـ.) ١ــ ئازاردانی کەسێك بە ئامرازی تایبەتی . ٢ــ نارەحەتکردنی کەسێ بە قسە و توانج . ★ ئەشکنجەدان.

**ئەشکنجەکێشان ــ** [ ١ــ ئەشکنجە/١ + کێشان ] ، ( مصد. لا.) تۆشی ئازار و نارەحەتیبۆن.

**ئەشکەفت ــ** ( نا.) ، (سن.) تم: ئەشکەوت .

**ئەشکەلە ــ** [ ؟ ] ، ( نتـ.) ، (سن.) ١ــ تم : ٢ــ ئەشکنجە/١ ، ٢ــ پارچە دارێکە ٧/٦ سانتیمەتر درێژە لە ناوەڕاستا لەلە کراوە ، پەتی تێدەخرێ و تەختەی دەوار و ڕەشماڵ و پارچەکانی خێوەتی پێ تێك دەکرێتەوە و لێکیان قایم دەکا. هس : ئیشکێل/١ ، ٣ــ ئامرازێك بوە لە زەمانی کۆندا بۆ ئازاردانی بەندی و تاوانباران . تێبـ ــ حەوت پارچە داری پچکۆلەیان دەهێنا کونیان دەکردن و بە پەت جەلەدەکران ، بۆ ئازاردانی یەکێك دەیانکردە پەنجەی دەستی ، بە جۆرێك کە هەر قامکێکی دەکەوتە نێوان دۆ پارچە دارەوە و پەتەکانیان توندەکرد . ★ ١ ــ ئەشکنجە/٢ ، چێوجەلە .

**ئەشکەنە ــ** [ ئەشك + ئەنە ] ، ( نتـ.) ، ( مکـ.) ١ــ گوشتاوێکی خەست و خۆلە کە جاروبار پێوازێشی تێدەکرێ و هێچی تر ، ٢ــ ( سنـ. ) پیازاو ، کاروانئاشی ( تم : مخـ. ج ١ ــ ٥٨ ) . تێبـ ــ بەشی دوەمی ئەم ووشەیە (ئەنە) ، بە لای منەوە هەر ( ئێنە )یە کە دەبێتە پاشبەندی ناوی گەلێ چێشتان : ترخێنە ، لەپێنە ، ماشێنە ، نیسکێنە و ... و ... و بەشی یەکەمێشی ( ئەشك ) ڕەنگە دەگەڵ ( ٢ــ ئاش/٢ ) پێوەندێکیان هەبێ .

**ئەشکەوت ــ** [ ؟ ] ، ( نا.) ١ ــ هلۆلایی سروشتی شاخ و چیا کە لە ئەنجامی گۆڕانەکانی (جیۆلۆجی) لە زۆر کۆنەوە هەن و ئادەمێزاد پێش ئەوەی فێری خانو دروستکردن بێ ، تێیاندا ژیاوە. :: ئەشکەوتی شانەدەرێ بە ناوبانگە ، ئەشکەوتی کەرەفتو لە کوردستانی ئێرانە . ٢ــ ئەو شوێنانەی ئادەمێزاد ، لە ڕەوەز و زەرد و ماهان وەکو وەتاغ دروستیکردۆن :: ئەشکەوتی ( فەقرەقا ) لە نێزیکی مەهابات دەستکردی ( ماد )ەکانە ، ئەشکەوتی قیسقەپان لە دێی ( زەرزی ) نیزیکی (چەمیڕەزان)ە . ★ ئەشکەفت ، (بکـ.) شکەفت ، غار ، (هو) مەڕ .

**ئەشکەولەت ــ** [ ؟ ] ، ( نتـ.) ، ( مکـ.) بنەگۆزە و دێزەی شکاو کە

هێشتا ئەوەندەی پێوە مابێ ئـاو یا شتێ تری تێبکرێ بۆهەر مەبەستێك بێ . هس : سوالەت .

**ئەشیـا ـ** [ = عـا : اشیـاء (شـیء) ] ، ( نـا.) شـتومەك ، کەلوپەل . :: پارەمان نـاردوە بـۆ شار هەندێ ئەشیامان بۆ بێنـن ، تۆفیق لیستەکەی لە مەلا سـەعید وەرگرت و ئەشیاکانی کڕی .

**ئەصحابە ـ** [ = اصحاب ] ، (نا.) ١ــ هاوڕێیـانی پێغەمبـەری ئیسلام ، ئەو کەسـانەی بەزەمانی پێغەمبەر ڕاگەییشتون :: ئەصحابەی سپی سـەیرانگایە کـە لە نێـزیك شـاری مەهـابات . ٢ ــ ( مجـ.) پیاوی‌چـاك :: هەردەلـەی ئەصحابەیە .

**ئەعزا ـ** [ = عـا : اعضـاء (عضو) ] ، (نا.) ١ــ تە : ٢ــ ئازا . ٢ــ تە : ئەجزا/٢ .

**ئەعلا ـ** [ = عـا : اعلی ] ، (صـ.) ، (کئێر.) ١ــ بڵیند ، بەرز (مەعنەوی) :: شێخ خودا دەرەجەی ئەعلا کا دەیفەرمو . . . ٢ ــ چـاك ، باش (مـاددی) :: کیهـە فاسـونیا لەهەموان ئەعلاترە بۆمان بێنە .

□ « بۆ عیشقی مەجازی‌تۆ ، بۆ مەحرەمی ڕازی‌تۆ »
« شەوگـاری درازی تۆ ، ئەعلا کوڕ و ئەحلا کچ »
(نالی)

★ (کعر.) عال ، عالی .

**ئەعیان ـ** [= عا : اعیان (عین) ]، (نا.) ، (کئێر.) تمـ : ئەشڕاف .

□ « . . . . گوتی : تـۆ ئێژی‌چە ! ئەی نایدەین چئەکەین ، هادی‌خان ئەعیانە و مالی لەشارە و هەر خۆی حەساوە . . . » (قزلجی : پێکەنین ــ ١١٩) .

**ئەعیانی ـ** [ ئەعیان + ٢ــ ئی] ، [عا. کو.] ، ١ــ (صـتـ.) ئەوەی پێوەندی بەپیاوی ئەعیانەوە هەبێ . :: خانوبەرەیەکی ئەعیانی کردوە . ٢ــ (حمصـ.) ئـاکار و خـوی ئەشـڕاف و گەورەپیـاوان ، ئەعیانـەتی . :: لافـی ئەعیـانی لێدەدا و لێشی نایە .

**ئەغز ـ** [ = عا : اخذ ] ، (نا.) ، (سـیمـ.) ١ــ هـەوەسی دەسـت بەسەر مـالی خەڵـكدا گـرتن . ٢ــ بێ ئـەوەی خـاوەنی ڕازی‌بێ مالی کەسێك بۆ خۆبردن . :: هەر بە ئەغـز قەڵەمـەکەی شـێرکۆی داگیرکرد ، فێربوە هەرچی بەرگیری کەوت دەستی بەسەردا دەگرێ و بە ئەغزی دەزانی .

**ئەغلەب ـ** [ = عا : اغلب ] ، (صـ.) زۆر ، زۆرتـر ، زیاتـر . :: ئەغلـەب ئەوکەسـانەی زۆر قسـەدەکەن کەمتـر تێـدەگەن ، ئەغلـەب دەی‌بێنـم سـەری بەرداوەتەوە ئاگای لـە دنیا نیە .

★ ئاغلەب . ئەغلەبە . ئەکسەر

**ئەغلەبە ـ** [ محـر. عـا. ] ، (صـتـ.) ، (مکـ.) تمـ : ئەغلەب .

**١ــ ئەغیـار ـ** [ ؟ ] ، (صـ.) (مکـ.) حـالی کەسـێکی هۆشـی لەسەرخۆی بێ ، سەرخۆش نەبێ . // سەرخۆش ، مەست . تێبـ ــ ئەم ووشەیە هەر بۆ دژی مەستی

بەکاردێت .

**٢ـ ئەغیار ـ** [= عا : اغیار (غیر) ] ، (نا.) بێگانە ، کەسانێکی نامەحرەم حیساب دەکرێن بۆ مەسەلەیێك . // خۆمانە ، یار .

☐ « نە ڕێی حەسحەس بۆ ، نە بەد ، نە ئەغیار »

« تەنها سەعاتێك ، تەنها من و یار »

(پیرەمێرد ـ ١٦٧ )

☐ « هەروەختێ خەرگای شای ستیمێن عوزار »

« خالی بێ جەخۆف ، ووجوود ئەغیار »

(خانا ـ ٧٨)

**ئەغیاربوونەوە ـ** [ ١ـ ئەغیار + بوونەوە ] ، (مصت. لا.) وەهۆش هاتنەوەی کەسێکی سەرخۆش .

**ئەغیاری ـ** [ ١ـ ئەغیار + ٢ـ ئی ] ، (حمص.) ووشیاری ، لەسەر هۆش بوون . // مەستی ، سەرخۆشی .

**ئەفریقا ـ** ( نا.) ، ( کئیر.) یەکێکە لە پێنج ئیشکانییە گەورەکانی دنیا ، ٣٠ ملیون و ٢٢٤ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە پانە و لەسالی ١٩٦٩دا نێزیکەی ٣٢٠ ملیون نفوسی هەبوە ( تە : لارۆس ـ ٩٩٧ )

★ ( کعر.) ئەفەریقا .

**ئەفسانە ـ** ( نا.) ١ـ چیرۆکێکی ڕوداوی کۆنی وا بگێڕێتەوە نەچێتە مێشکەوە و ئاقل نەیگرێ ★ حەکایەت ، داستان ، نەقل ، ( هو.) ڕاز ، هەقایەت . ٢ـ (مجـ.) قسەی ناڕاست ، قسەیەك بە مەبەستی خەلەتاندن بکرێ

☐ « میهری ڕوخی زێبات ، بە ئەفسانەیی زاهیر »

« دەرناچێ لەدڵ ، زەحمەتی بێهوودە چلازم »

( ئەدەب : گم ـ ٥٩ )

« نەا ، ئەو دەبدەبە و سەر ئەو سەراوە »

ئێستە ئەفسانە و نەخشی سەراوە »

( پیرەمێرد ـ ١٢٥ )

« شەش مانگ بەم ئەفسانە گلێ دامەوە لای خۆی »

« نەمزانی ملم بشکێ تێدا چوم زەرەرم کرد »

( ڕەزا ـ ١٣ )

**ئەفسووس ـ** [ پە : ئەپەسۆس]، (نا.) داخ و حەسرەت ، حەیف .

☐ « صەدهەزار ئەفسووس بۆ ئەهلی بیلادی مە ئەدەب »

« قەت نەبو فەرقی بکەن ، کێ زەڕگەرە ، کێ کورەتاب »

( ئەدەب )

**ئەفسووس خواردن ـ** (مصت. لا.) ئاخ هەلکێشان و خەم و خەفەت خواردن بۆ شتێك کە لەدەس چوبێ، بۆ کەسێکی مردبێ یا بۆ ڕوداوێکی ناخۆش .

**ئەفسوون ـ** [ پە : ئەفسۆن ] ، ( نا.) ١ـ ئەو قسانەی جادوباز لەبن لێوەوە دەیکا★ ئیسم/٢ . ٢ـ قسە یا ئەدا و ئەتوارێك کە پیاو لە خشتە دەبا و هەڵیدەخەلەتێنێ . ☐ « هەزار ئەفسوون و جادوی پێوە ئاوێزانە ئەم ڕێشە » ( ڕەزا ـ ٤٦ )

« شێوەی شێرێنی نێرگس لەو
ڕێیـە »
« ئەفسوونی شێوەی شـیرێنی
پێیـە »
( پیرەمێرد ــ ١٣٧ )
تێب ــ وەکو ژابا نوسیویە ( لاپەرە ــ ٤٤٧ ) هەفسوون بـە کەسـێك دەووتری کە (هاریی) و ئێش و ژانی گران چاكدەکاتەوە .

**ئەفسوونباز ــ** [ ئەفسوون + باز (ر.. فع.) ] ، (صفا.) ، (سن.) ١ ــ کەسێکی کاری ئەفسوون کردن بێ . ٢ــ خەلك خەلەتێن ★ جـادوباز ، سیحرباز ، فێڵباز ، ئەفسوونگەر ، ئەفسوونساز .

**ئەفسوونبازی ــ** [ ئەفسوونباز + ٢ــ ئی ] ، ( حمص.) ١ــ بەکـار هێنـانی سـیحر و جـادوو ٢ ــ خەلەتاندن و لەخشتەبردنی خەڵـك بەقسەی لووس . ★ ئەفسوونسازی، ئەفسوونگەری .

**ئەفسوونخوێندن ــ** ( مصد. لا.) ١ــ وورتەوورت کردنی سیحربـاز لەژێر لێویەوە . ٢ــ ( کن.) قسەی لووس کردن .

**ئەفسوونساز ــ** [ ئەفسـوون + ساز ( ر.. فع. ) ] ، (صفـا.) تم : ئەفسوونباز .

**ئەفسوونسازی ــ** [ ئەفسوونساز + ٢ ــ ئـی ] ، (حمـص.) تمـ : ئەفسوونبازی

□ « خـوسرەو رەزاشـــەن بـە ئەفسوونســازی »
« بە دەس شاپوور بدەروٚم بازی»
( خانا ــ ٣٢٩ )

**ئەفســوونگەر ــ** [ ئەفسوون + گەر ( پب.) ] ، (نفا. ، صفـا.) تم : ئەفسوونباز .

□ «خەستەیی موژگان خەدەنگێکم ،
نیگاهی دڵ بەرە »
« بەستەیی گێسوو کەمەندێکم ،
دەڵەی ئەفسـوونگەرە »
( ئەدەب )

**ئەفسوونگەری ــ** [ ئەفسوونگەر + ٢ــ ئـی ] ، ( حمـــص.) تمـ : ئەفسوونبازی .

**١ــ ئەفسەر ــ** [په : ئەپیسـەر]، ( نا.) تانجی پاتشـایان ، کڵاوێکـی شایان بە گەواهێرات دەڕازێننەوە و لەسەری دەکەن .

□ « بە ڕەفتار جە باد سەبوكخێز
تەرەن »
« شایستەی شاهان ساحێب
ئەفسەرەن »
( خانا ــ ٤٨ ).
تێب ــ « لە ئاوێستایی ( ئەئیـوی ) پێشـبەند ( = لـە ، لەسـەر ) + (سەرە) = سەر ، یەعنـی : ئەوەی لەسەری دەکەن . . . تم : هەوسار» (معێن : بورهان . ج ١ــ ١٤٨) .

**٢ــ ئەفســەر ــ** ( نا.) ، (تب.) ئەو کەسەی لە ئۆردووی دەوڵەتاندا، دەرەجـەی لـە ( نـایبزابت ) بەرەژوورە . □ « . . . باپیراغا بـە کا حسێنیدا وەڵامێکـی زۆر توند و تیـژی بۆ ئەفسـەری عوسمـانی ناردەوە . . . » (قزلجی : پێکەنین ــ ٤٣ ) تێب ــ ئەم ووشەیە لە فارسیڕا هـاتۆتە نـاو زمـانیکوردی ( فەرهەنگستان ) لە ( ئوفیسیە )ی

فرەنسی و ( ئۆفیسەر )ی ئینگلیسی وەرگرتوە . (تم : معین . فەرهەنگ . جا - ٣١٦) ، ئەوانیش لە (ئۆفیسیۆم)ی لاتینی بە مانای ( فەرمانبەری گشتی )یان وەرگرتوە (تم : لارۆس - ٦٣٤) ★ (کعر.) زابت ، زاووت . (کئێر.) گەورە .

**ئەفلاك** - [ = عا : افلاك (فلك) ] ، (نا.) ئاسمان ، ئاسمانان .

□ « منجم کەرگەس و لاشەی لە لا ، شەیئێکە نازانی »

« کە ئەم ئەفلاکە چەند لاکە ،
کە ئەم گەردونە چەند دونە »

(نالی)

**ئەفەرۆز** - [ نا. ] ، (کعر.) تم : ئەفەرۆزکردن .

**ئەفەرۆزکردن** - (مصد. مت.) پاش‌گوێخستن ، حیساب بۆ نەکردن ، تەرك‌کردن ، ئیهمال‌کردن، بەلاوەنان (ی کەسێك ) :: دەبوایە هەر زو ئەفەرۆزی‌کەی بۆ دۆستایەتی نابی ، دەمێکە ژنە گەورەکەی ئەفەرۆزکردوە ، هەر خۆمان بچین و ئەم کابرایە ئەفەرۆز کەین باشە . تێب - بەلای منەوە ئەم ووشەیە لە دەوری عوسمانیدا هاتۆتە ناو زمانی کوردی ، ئەوانیش لە ( ڕێفوزی Refuser ) فرەنسی‌یان وەرگرتوە کە هەر بەم مانایانەیە هس : (عا : رفض) .

**ئەفەریقا** - (نا.) ، (کعر.) تم : ئەفریقا .

**ئەفەندی** - (نا.) ، (کعر.) ١- لەقەبێکە بۆ ڕێزلێنان بە پیاوە گەورەکانی عوسمانی کوتراوە . ٢- بۆ ڕێزگرتن دەخرێتە دوای ناوی پیاوانەوە □ « ... لە حەواشەوە عبدالقادر ئەفەندی سنوری ملکی خۆی دیاری‌کردوە ، تەنانەت هەتاویش بەخۆڕایی ناتوانی ڕێی بکەوێتە ئەوێ » (قزلجی : پێکەنین - ٢٥) . ٣- هەر کەسێکی چاکەت و پانتۆلی دە بەردابی . ٤- بۆ تەوس و پلار بە ڕاوێژێکی تایبەتی دەکوترێ . :: ئەفەندی ! ئەوە لە کوێ بوی . هۆی ئەفەندی فەردە ئەوە بۆ واز لەم قسە زلانەت ناهێنی . تێب - دوکتۆر معین دەڵی : ئەم ووشەیە لە (ئۆتانتیکۆس)ی یونانی وەرگیراوە و ئاوای مەعنا لێداوەتەوە ( ئەو کەسەی بۆ خۆی ئیش دەکا ، مستقل بذاته ) ، (تم : فەرهەنگ . جا - ٣١٩) .

**ئەقتاعی** - [ = عا : اقطاعی ] ، (نا.) تم : دەرەبەگ .

□ « داری ئەقتاعی لەبن ئەهێنین »

« لە مەکری ئینگلیس دنیا ئەبی چۆڵ »

تێب - ئەم ووشەیە لە کوردیدا زۆر تازەیە .

**ئەقسات** - [ عا : اقساط (قسط) ] بەش ، بەشەکان :: ئوتۆمبێلەکەی بە ئەقسات فرۆشت ، ئێستا پیاو دەتوانی ناومالی تەواو بە ئەقسات بکڕێ .

**ئەقل** - (نا.) تم : ئاقل/١ .

**ئەقەللەن** - [ = عا : اقلا ] ،

(بن.) بە لانی کەم ، بەلای کەمێ ، هێــچ نەبێ :: هــەر وا بێ دەنــگ دانێشــتوی نــاوی دەنێــی چــی ئەقەللەن تۆش قسـەیەك لەم کارەدا بــکە . ئەقەللــەن پێنج دینــاری تێدەچێ .

**١ــ ( ــ ئەك ) ــ** [ پھ : ئەك ] ، (پب.) ١ــ بە دوای هێندێ ناوانەوە دەلکێ و ناوێکی تازە دروست دەکا :: سەرەك (سەر) ، کەپەك (کەپ) ، تیرەك ، دێــرەك (تیر) ، کرمــەك (کرم) ، پەشمەك (پەشم) ، ناخونەك (ناخون) . ٢ــ بە دوای هەنــدێ صفەتانەوە دەنوســێ و دەیانکا بە ناو :: خامەك (خام) ، کالەك (کاڵ) ، کورتەك (کورت) ، گشتەك (گشت// خــاو) . ٣ــ بــە دوای ڕێشــەی مەصدەرەوە دەنوسێ : ا ) دەیکاتە ناو :: بەستەك (بەستن) ، پەستەك (پەستاوتن) ، ڕنەك (ڕنین) . ب ) دەیکاتە سیفەی موبالەغە :: بڕەك (بڕیــن) ، زەنــەك (زەن) نوســەك (نوسان) . ٤ــ بە ئاخری صفەتێکەوە دەنوســێ و صــــفەتێکی نــوێ پێكدێنێ :: زیرەك (ژیر) ، کوێرەك (کوێر) ، پیرەك (پیر) = (بک.) ژن . ٥ــ ا ) بــە دوای ناوی دێهاتــەوە دەلکێ :: سێتەك ، چەمەك . ب) لە لەهجەی باکوریدا (٢ــ ئان/٣)شی بە دوادادێت ، بەلام (ن)ەکە زۆر کەم لــە دەم دەردەکــەوێ و شــێوەی (ئەکا) وەردەگــرێ :: کەمەکا (کەم + ئــەك + ئــان) گوندێــکە لــە نێزێك دهۆکێ ، سێدەکا (سێد ؟ + ئــەك + ئــان ) گوندێکــە لــە

برادۆســت . ٦ــ لــە تەرکیبــی کۆمەڵێــکی زۆر (نــاو)ی زمــانی کوردیدا دەبینرێ ، ئەگەر بێت و جودابکرێتــەوە ڕەگــەکان هێــچ مەعنایەك نا بەخشــن :: دەلــەك ، مەچەك ، کۆمەك (گك) ، جەندەك ، تۆلەك ، نێفەك (نافەك) . گومــانی تێدا نیــە ئەم ڕەگانــەی کە ئــەو ناوانەیان لێ دروست بوە وەختێك (ڕەنگەزۆرکۆن) مەعنای ســەر بــە خۆشیان هەبوبێ و لە بیران چونەوە.

تێب ــ ا ) ئەم پاشبەندە لە حاڵەتــێ کە دەبێتە مــایەی پێکهــاتنی نــاو جاروبارە حاڵەتێکی پچوکــایەتیش تێکەڵ بە نــاوە تازەکــە دەکــا . :: ڕنــەك . ب) وەکــو دەزانێــن ئــەم پاشبەندە لە زمــانی پەهلەویــدا بە دوای گەلێ ناوانەوە هەبوە کە ئیمڕۆ (ك)ەکەی سواوە و پاشبەندی (ئە)ی بەجێ‌هێشتوە :: نامەك ( نــامە ) ، بەندەك (بەندە) ، هەلیلەك (هەلیلە) ، لوتەك ( ڕۆتە ) ، سایەك ( سایــە ) ، ڕۆچانەك ( ڕۆچنە ) .

**٢ــ ئەك ــ** ( ئم.) بۆ دەربڕینی هەست و ویست ( زیاتر بێزاری و ناڕازیتــی ) بەرانبــەر بە کــار و کردەوەی یەکێك :: ئەك نــەژێ بــۆ درۆی دەیکا ★ دەك ، هەك .

**ئەکسەر ــ** [= عــا : اکثــر ] ، (ص.) تم : ئەغلــەب :: ئەکســەر وەختــی لە چاخــانە بــە دۆمینــە ڕادەبوێرێ .

**ئەککــــو ــ** ( ئــم.) ، (مــک :ــ مەنگوڕایەتی) بۆ دەربڕینی خەفەت و خەم لە بەر ڕوداوێکی ناخۆش یــا

سەر سوڕمان لە کارێك ، بەکاردێت ★ پەك ، پەککو .

١ـ ( ـ ئەکە ) ـ (پب.) بە دوای ناوی نەناسراو (نکرة)ەوە دەنوسێ و دەیکا بە ناسراو (معرفة). :: کوڕەکە، منداڵەکە ، پیاوەکە . تێب ـ ١ ـ ئەگەر ئەو ناوەی بەم پاشبەندەوە دەلکێ بە (دەنگبزوێن)ێك دوایی هاتبێ کار دەکاتە سەر بەکەم کەرتی پاشبەندەکە (ئە) : آ) ئەگەر ناوەکە بە دەنگ بزوێنەکانی ( ا ) ، (ۆ) یا (ێ) دوایی هاتبێ (ئە)ی پاشبەندەکە دەبێتە (یە) :: چرا (چرایەکە) ، درۆ (درۆیەکە) ، تەشوێ (تەشوێیەکە) ، دەشکرێ (یە)کە فڕێبدرێ :: چراکەی هێنا ، درۆکەی سوربوەوە، تەشوێکە دەمەزەرد بکەن . ب) ئەگەر دوایی ناوەکە بزوێنی (ۆ) بۆ ئەوا دەگەڵ (ئە)ی پاشبەندەکە دەبێتە (ۆ) :: بۆزۆ ( بۆزۆکە ) ، بردۆ ( نردۆکە ) ، مردۆ (مردۆکە) ج) کاتێ ناوەکە بەبزوێنی (ێ) بڕابێتەوە (ئە)ی پاشبەندەکە لە پێشدا دەبێتە (یە) و پاشان بە هەردوکیان (ێ + یە) بزوێنی (ێ) دروستدەکەن :: برسێ : برسییەکە.ـ پیاوە برسێکە چوار کولێرەی خوارد . پشتێ : پشتییەکە ـ پشتێکە بخەرە بن شانت . د ) ئەگەر دوایی ناوەکە (ئە)بێ دەبێتە هۆی لەناوچونی (ئە)ی پاشبەندەکە :: دەستە (دەستەکە) ، ڕستە (ڕستەکە) ، کفتە ( کفتەکە ) . ٢ـ ئەگەر ناوەکە صفەتێکی بە دوادا هات پاشبەندەکە لە باتێ ئەوەی بە دوای ناوەکەوە بنوسێت بە ئاخری صفەتەکەوە دەلکێ . :: پیاوە ئازایەکە ، درۆ گەورەکەی ، منداڵە زیرەکەکە ، گایە قەشکەکە . ٣ـ ئەو ناوانەی ئەم پاشبەندەیان چوبێتە سەر لە حاڵەتی جەمعا (ئە)ی دوایی پاشبەندەکە فڕێدەدرێ و ( ئان ) جەمعی پێوە دەلکێندرێ . :: کوڕ ، کوڕەکە ، کوڕەکان . چرا ، چراکە ، چراکان منداڵە زیرەکەکان . ٤ـ لە وشەیێکدا کە بەم پاشبەندە پێکدێ، قورسایی تەلەفوز دەکەوێتە سەر ئاخر کەرتی ناوەکە . هس : ٢ـ ئەکە .

٢ ( ـ ئەکە ) ـ [ ١ـ ئەك/١و٢ + ٥ ـ ئە/١ ] ، (پب.) بۆ بچوككردنەوە و وێکچواندن (تەشبیه)بە دوای هەندێ ( ناو ) و ( صفەت )ەوە دەنوسێ و دەیکاتە ناوێکی تازە :: پۆلەکە ( پۆل ، قوچەکە ( قوچ ) ، کوژەکە (کوژ) ، تورەکە ( تور ). تێب ـ قورسایی تەلەفوز لە وشەیێکدا بەم پاشبەندە دروستبوبێ دەکەوێتە سەر کەرتی هەرە دوایی . هس : ١ـ ئەکە .

( ـ ئەکێ ) ـ (پب.) ١ـ بە دوای بەندی کات و شوێن (قەیدی زەمان مەکان )ەوە دەنوسێ و قەیدێکی تازە یا صفەتی لێپێکدێنی :: ئێجکارەکی ، پێشەکی . ٢ـ بە دوای هەندێ صفەت و ناوانەوە دەلکێ و صفەتێکی لێدروست دەکا :: خێلەکی، دەشتەکی، سەرسەرەکی، کەرەکی . ٣ـ بە هەندێ ناوی مرکبەوە دەنوسێ ، وشەیێکی لەم

تەركيبە پێك دێت بەیانی حاڵەت دەكا :: دۆپشتەكێ ، سێجرتەكێ ، چوارمەردەكێ ، پێنج‌خشتەكێ . تێب ـ أ ) لە هەمۆ حاڵەتەكاندا ئەم پاشبەندە مانای (بەشێوەی) لە مانای ووشەكە زیاد دەكا . ب ) ئەگەر دوایێ ئەو ناوەی دەگەڵ ئەم پاشبەندە تەركیب دەبێ (بزوێن) بێ، لە تەركیبدا دەڕوا .

**ئەگرە ـ** (نا. و بن .) ، (سن .) تم : ئێرە . ☐ «ئەرێ ماڵ مەلا عەولای لۆت‌دافزیاگ ئەگرەس ؟ »

**ئەگرێجە ـ** [ ئەگرێ + جە = چە ] ، ( نت. ) چەپكە مۆی سەری ئافرەتانە كە بە لاجاینگیاندا شۆڕدەبێتەوە و لە حاستی كولمە هەوداكانی بە مقەست هەڵدەپاچن تا بە قەدەر یەكیان لێ بێ .

☐ « گوارە كەوتۆتە ژێر ئەگرێجەی خاو »
« هەڵاوەسراوە ·لە خوێندا گیراو »
( پیرەمێرد ـ ١٥٦ )

تێب ـ ( ئیگرێ) ئامرازێكی مۆسیقایە كە (ژێ)ی زۆرە ( تمـ : معێن . فەرهەنگ ، ج ١ ـ ٣٣٤ ) ، جا لەوانەیە ( ئەگرێجە ) دەگەڵ ئەم ووشەیە پێوەندێكی هەبێ ، فارس (ئەگرێجە) بەكارناهێنن و لە هیچ قامۆسێكی فارسیدا نەنوسراوە و ( ئیگرێ )ش بەكار ناهێندرێ و تەنیا ووشەی ناو قامۆسە .

**ئەگرێجە بڕین ـ** (مصد. مت. ) ١ـ بڕینی ئەگرێجەی ئافرەتێك ، وەكو سزایەك بەرامبەر تاوانێكی كردبێتی . ٢ـ (كن .) شۆرەیی بەسەرهێنان ، ڕیسواكردن (هەر بۆ ژنان ) . هس : سەرتاشین .

**ئەگرێجە برینەوە ـ** (مصد. لا.) جوداكردنەوەی هێندێك لە پرچی ئافرەت و كورت كردنەوەی و بەردانەوەی بە لاجانگا ( كردنی بە ئەگرێجە ) .

**ئەگەر ـ** [ په : هەكەر] ، (تب. و بن.) بۆ ئەم مەبەستانە دەكار دەكرێ ١ـ ئامرازی شەرتە :: ئەگەر چۆی بۆ بەغدا ئاگادارم كە، ئەگەر نەخۆش بۆی بچۆرە لای دوكتۆر

☐ « ئەگەر دەمزانی لە كوێ دەنوستی »
« سینگم دۆشەگ بۆ بۆم ڕادەختی »
( فۆلكلۆر )

٢ـ لە پێش ڕستەیەكدا كە (خەبەر)ەكەی بە شێوەی پرسیار بێ گومان و دۆدڵێ لە ڕاستی قسە ( ئیددیعا )یەكی لە (مبتدا)كەدا باسی كراوە پێشان دەدا . ☐ « ئەگەر كوێستان + ( زەمیرێك بە دوایدا دێت) وا خۆشە ، كوا دۆگ + ( زەمیرێك وەك زەمیرەكەی پێشۆ ) مانای ( كوێستانی خۆش نیە ) . ٣ـ لە پاش سوێند دێ و مانای ئەو ڕستەیەی كە بە دوایدا دێ هەڵدەگێڕێتەوە :: بە سەرێ تۆ ! ئەگەر ئەم قسەیە وابێ ( وانیە ) وەڵلاهی‌ئەگەر كتێبت لێك كردبێتەوە ( لێكت نەكردۆتەوە ) ، ٤ـ جاروبار مانای (كە) دەبەخشێ :: جا ئەگەر

تۆ دەگەڵ خـۆت نەیبەی چی بـۆ دەکرێ ( جا کە تۆ ... )

**ئەگەر تێخستن** ـ (مصت . متە.)
١ــ گومان خستنە سـەر قسـە و باسێك . ٢ــ بەرهەڵسـت هێنانە سەر ڕێگای جێبەجێبوونی کارێك . :: تۆ خوا ئەگەر ئەگەری تێبخەی . هێچ ئـەگەری تێمەخە لـە بەیانی زوترنیە بچۆ . ئەوە چیتـە هەرچی پێت دەڵێن ئەگەرێکی تێدەخەی ؟

**ئەگەرچی** ـ ( تبـتە . وبنتە. ) هەرچەندە ، لەگەڵ ئەوەشـدا کە .... □ « .... ئەمە ، ئەگەرچی جوامێر هـەر هێچی لە کۆسـتی کەوتۆشـیان نەئـەزانی » (بلـە : ژان ــ ٥٢) .

**ئەگەرکو** ـ (بنتە.) ، (مکـ.) تە : ئەگەرێکو .

**ئەگەرنا** ـ (بنتە.) تە : ئەگینا .

**ئەگەرنە** ـ (بنتە.) ، (سنە.) تە : ئەگینا .

**ئەگەرێکو** ـ [ ئەگەر + یێك + ئو (عطف) ] ، (بنتە.) تە : ئەگەر :: جا باشە ئەگەرێکو لەوێ نەبو چیبکەین ★ ئەگەرکو . تێبـ ـ ئەگەرچی ئەم ووشـەیە هەر کاری ئەگەر دەکا ، بەڵام (ئەگەر) موتڵەقە و ئەمە (مقید) کـراوە بە (یەك) بۆیە دەلالەتی لە هی (ئەگەر) سوك ترە .

**ئەگین** ـ (بنتە.) تە : ئەگینا .

**ئەگینا** ـ [ ئەگین ( محر : ئەگەر + نا ] ، (بنتـ.) ، (سـیمـ.) ، دو ڕسـتە پێـکەوە دەبەسـتێتەوە و پێشـان دەدا کە ڕسـتەی یەکەم (مەعلول)ی ئەو (عیللەت)ەیە کە دە ڕسـتەی دوەمـدا باسکـراوە . □ « ... لام وایە هەر بۆ تۆقاندن و ئازاردانی خەڵك دایانناوە ، ئەگینا دەستە و دایەرەیەکی باشیان لەسەر دائـەنا ... » (بلـە : ژان ــ ٩٢) ★ ئەگەرنا ، ئەگـەرنە ، **ئەگین** ، دەنا ، وەئیللا .

**ئەلحەد** ـ [ = عـا : لحد ] ، (نا.) ئـەو شـوێنەیە کە لـە بنی قەبردا ، مردوی تێدا درێژدەکرێ . ★ گۆڕێچە .

□«قەبرم بۆ بکەنن ئەلحەدم خەیلێ»
«شلشل بمپێچن وە زولف لەیلێ»
(فۆلکلۆر)
«ئەوی ڕێگای لە کوردەکان گۆڕێ»
«لەعنەتی خوای لە ئەلحەد و گۆڕێ»
(مەلا : گم ــ ٣٠)

**ئەلحـەملای** ـ [ = عـا : الحمدلله ] ، (ڕسـتە) سوپاس بۆ خولای . لە حاڵی پێخۆشبون (بۆ چـاکی یـا خـراپی) بەکـاردێت □ « حوکمی خاریجەگەری بە وی دراوە ، ئەلحەملای کارمان تەواوە » (تحفـە : جا ــ ٣٨٩) :: زۆر لە خۆی بـایی ببو ئەلحـەملای وای لێهات ★ ئەلحەمێلا .

**ئەلحەمێلا** ـ (رستە) ، (جفـ.) تە : ئەلحەملای .

**ئەلعان** ـ [ محـ : عـا. الآن ] ، (بنـ.) ، (مکـ.) تە : ئێستە □ « بابە گیان ئەلعان و بیلفەرز دەبێ ژنم بۆ بخوازی » (تحفە جا ــ٢٤٢) .

**ئەلف** ـ (نا.) ١ــ ناوی یەکەم پیتی ئەلف و بێتـکەی عارەبییە ، چونـکو کوردیش زیاتـر هەر بەم

ئەلف و بێتکەیە دەنوسرێ بۆیە یەکێکە لە بزوێنەکانی ئەلفوبێی کوردیش ، لە نوسینا دوو شکلی هەیە : أ ) بە تەنیایی :: دا ، زار ، واز ، جێران . ب ) لە حالی لکان بە دوای پیتێکی دیکەوە :: با ، کا ، خۆتان . ٢ـ (کن.) هەر شتێکی ڕاست هەلچوبێ .

□ « لەسەر لەوحی دلم ئەلفی قەدت بێ »

« وەهای نوسی مەلا بۆ من لە مەکتەب »

(سەلام ـ ١٠٠)

**ئەلفوبێ ـ** (نت.) تم : ئەلف و بێتکە .

**ئەلفوبێتکە ـ** (نتـ.) ، (مک.) ١ـ هەموو ئەو پیتانەی بۆ نیشاندانی دەنگ و بزوێنەکانی زمانێك داندراوون . □ « ... لە ئەلفوبێتکانەوە سەتخی بوە » . ٢ـ سێپارە یا کتێبێك کە منداڵان لە ڕۆی فێری خوێندنەوە و نوسینی پیتەکان دەبن ★ ئەلف و بێ .

**ئەللیرەم ـ** [ ئەللی (پەنجا) + رەم (درەم) ] ، [ تو. کو. ] ، (نتـ.) ، (کعر.) سەنگێکە بۆ کێشانی شت ، بەشێکە لە هەشت بەشی حۆقەیەك ، بە حۆقەی سلەیمانی دەکاتە ٤٥٠ گرام .

**ئەلمۆدە ـ** ١ـ (نت.) ، (کعر.) ژنێکی جل و بەرگی فەرەنگی دەبەرکا و چارشێو (عەبا) بەسەردا نەدا .

□ « مێخەكبەند ئەخشێ لە ناو مەمکانی »

« هەزار ئەلمۆدە بێ بە قوربانی »

(پیرەمێرد ـ ٢١٠)

٢ـ (صت.) هەموو شتێکی جیا لە داب و دەستوری کوردەواری ، کە لە فەرەنگان وەرگیرابێ . :: کەوشی ئەلمۆدە ، کراسی ئەلمۆدە ، ژنێکی ئەلمۆدە . هس : مۆد ، مۆدە . تێب ـ وا دەزانم ئەم ووشەیە لە ( ئالامۆد )ی فرەنسی وەرگیرابێ و لە ڕێگای زمانی تورکییەوە هاتبێتە ناو زمانی کوردییەوە .

**ئەلوات ـ** [ = عا الواط (لوطی) ] ، (ص.) ١ـ بێشەرم ، سەرسەری ، هیچوپوچ . ٢ـ دڕ و ملهوڕ ، شەڕانی . ٣ـ (مج.) دەستبلاو .

**ئەلواتی ـ** [ئەلوات + ٢ـ ئی] ، [عا. کو.] ، (حمصـ.) ١ـ بێشەرمی سەرسەرێتی ، هەرزەیی . ٢ـ کاری پیاوی ملهوڕ و شەڕانی ، شەڕ و گێچەڵ بە خەڵك فرۆشتن ، تەشقەلە . ٣ـ دەستبڵاوی و سەخاوەتێك کە سەرچاوەکەی فێز و ئیفادە فرۆشتن بێ نەك پارەداری :: نازانم ئەو ئەلواتییە چیە ئەم کوڕە دەستی داوەتی شەرم مەعنا نایزانی ، بابە گیان لە باتی ئەو ئەلواتییەی بە سەر ئێمەوە دەیکەی منداڵەکانی خۆت تێر و پۆشتەکەی باشترە .

**ئەلوەدا ـ** [ = عا : الوداع ] ، (صـ.) ١ـ وێڵ ، سەرگەردان

ئاوارە . ٢ــ بەتەمای ... ، لەبێری ... لە هەوڵ و تەقەلای ...
☐ « بەلگش نە درەخت زایف و زەردەن »
« ڕۆحش ئەلوادەی ئاداب و دەردەن »
(خانا ــ ٦٨٣)
★ (مک.) هەڵوەدا .
**ئەلەتریــــك** ــ (نــا.) تمــ : ئەلەکتریك .
**ئەلەکتریسیتە** ــ [ فڕەنسی : لە (ئێلێکترۆن)ی یۆنانی ] ، (نا.) ، (کئێر.) هێــزێکە کــە لەئەنجــامی لێکخشانی دوو جیسمدا پەیدادەبێ و شتیسووك ( ووردە کاغــەز ، کا ، سوتو ، .....) ڕادەکێشێ ، وەکو چۆن تەسبێحی کارەبا لەپارچــەی خــوری بخشێندرێ ، یــا شانەی باغــە پــاش ئــەوەی ســەری پێ داهێنــــرا ، شــــتی ســـوکەڵە هەڵدەگــرن . ئەمــــە ســادەترین چەشنێتی . ئێستا بەهۆی کاری دوولانە (تفــاعل)ی کیمیایی کــە لە (پێل)دا پێکدێ و هەروەها بەهۆی کــاری مەکینــە (داینــەمۆ) ، بــۆ پێویســـتەکانی جۆربــەجۆری ژیانی ئیمڕۆی ئادەمیزاد ، سازدەکرێ و کەلکی لێ وەردەگیرێ ★ (کئێر.) بەڕق . برووسکە . (کعر.) کارەبا .
**ئەلەکتریك** ــ [ = فڕەنســی : هەرشتێك و کارێکی پێوەندی بــە ئەلەکتریسیتەوە هەبێ ] ، ( نا.) ، (کئێر.) ١ــ لەباتی ئەلەکتریســیتە بەکاردێت . ٢ــ دەزگای تەلوگڵۆپ کە لەباتی چرا ناوماڵ و خــانوی پێ ڕۆناك دەکرێتەوە . ٣ــ چرای‌دەستی کە بە (پێل) کاردەکا .
☐ « ڕەهنومای گوم‌بۆی هــەردەی هەوایێ »
« ئەلەکتریکی تەلێ بێنایێ »
( پیرەمێرد ــ ٣٦٦ )
★ ئەلەتریك . عەلەتریــك . تێبـ ــ ئەم ووشــەیە زیــاتر لە گفتوگــۆی زانســـــتی و ناوخوینـــــدەواران دەبێــرێ ، خەڵك بەگشتی شــێوە کوردییەکانی بەکاردێنن .
**ئەلەکتــرۆن** ــ [ = یۆنــانی : ئێلێکترۆن ( کارەبــای‌زەرد ) ئەوەی تەسبیح و ... لێ دروست دەکرێ ( لەبەر ئەوهێــزە شت‌ڕاکێشــەی تێیدایە ) ] ، (نــا.) ئــەو (زەررە) زۆرزۆر پچوکــانەی کــە بەچــاو نابێندرێن ، کارەبای سارد (سالب) یان تێدایە و ئەستێرە چۆن بەدەوری (خۆر)دا دەسوڕێنەوە ، ئەوانیــش بەخێرایی ٤٨ هەزارکیلــۆمەتر لــە ســانیەیێکدا بــە دەوری‌نــاوکەی (ئاتۆم)دا دەسوڕێنەوە ( تم : معێن . فەرهەنگ ، ج ١ ــ ٣٤١ ) ژمارەی ئەلەکتــرۆن لــە هەرجیســمیکدا فەرق‌دەکا و هەر ئەلەکترۆنەی لــە مەدارێکدا دەسوڕێتەوە .
**ئەلەم** ــ [= عا : الم] ، ( نــا.) ئێش ، ئازار ، ژان .
☐ « جل‌شڕ و ملخوار و سەرکز ، هاودەمم دەرد و ئەلەم »
« عاجز و زار و زەلیل و مات و هەم دلپــارە بوم »
( سەلام ــ ١٠٥ )
هس : عەلەم .

**ئەلەنگە** ــ [؟] ، (نـا.) ، (مکـ.) زمانەچکۆلـە . ● « بەئەلەنگـەی نەنکییەوە » جنێوێکی دۆستانەیە کە کەس لەدڵی گران‌نایە . تێبـ ــ من ئەم وشەیە و رستەکەشم بێستبۆ بەڵام نەم‌دەزانی مانای‌چی . تا کاك هێمـن تێی‌گەیاندم .

**( ــ ئەڵ )** ــ (پـ.) ۱ ــ بەدوای ناوانەوە دەلکـێ و نـاوێکی تـازە دروست‌دەکا . :: تۆپەڵ ( تۆپ ) ، کۆمەڵ ( کۆم ) ، پاشـەڵ ( پـاش ) ۲ــ صفەتێکی دەچێتەسەر دەبێتـە صفەتێکی تازە . :: پۆچەڵ (پـۆچ) گەندەڵ ( گەند ) .

**ئەڵبەت** ــ [= عـا : البتـة ] ، (بنـ.) بەڕاستی ، بێگومان ، یەقین ، وادیارە . :: ئەڵبەت ئەوێش شتێکی بەخەیاڵدا هاتوە ، بۆیە ئەوقسەیەی کردوە .

□ « ڕۆژێ بەمرادی منیش ئەڵبەت
دەگەڕێ چـەرخ »
« ئەم مێچە قەراری‌نیە ، گاهێ
جگە ، گەه بۆك »
( رەزا ــ ۲۹ )

★ هەڵبەت ، هەڵبەتە .

**ئەڵقاوێز** ــ [ ئەڵـق (= عـا : حلق ) + ئاوێز ] ، [ عـا. کو. ] ، ( صمف.) ، (سـنـ.) هـەڵاوەسراو ، کەسێکی لە سێدارە درابێ ، ئەوەی ملی بە پەتەوە کرابێ .

**ئەڵقاوێزکردن** ــ ( مصتـ. متـ.) (سنـ.) لە سێدارەدان، بەدارا کردن. هەڵاوەسێن ، ئیعدام‌کردن .

**ئەڵقە** ــ [= عا : حلقة ] ، (نا.)، (سنـ.) تم : ئاڵقە .

**ئەڵقە بە گۆش** ــ [ ئەڵقە + بە + گۆش ] ، [ عا. کو. ] ، ( صتـ.) ، (سنـ.) تم : ئاڵقە لە گوێ .

**ئەڵقەڕێز** ــ [عا. کو.] ، ( نتـ.)، ( سنـ.) تم : ئاڵقەڕێز .

**ئەڵقە ڕێز کردن** ــ [ عا. کو. ]، ( مصتـ. متـ.) ، ( سنـ.) تم : ئاڵقـە ڕێز کردن .

**ئەڵقە لە گوێ** ــ [ عا. کو.] ، ( صتـ.) ، (سنـ.) تم : ئاڵقە لە گوێ.

**ئەڵڵا** ــ [= عا : الله ] ، ( نـا.) ۱ــ ، خودا ، خـوڵا . ۲ــ بـۆ دوور کردنەوەی خراپە و بەڵا لە کەسێك دەگوترێ : گرتیمـان یەکێك لاقی هەڵەنگوت و کەسێکی‌تر ئاگای لێ‌بۆ، دەست‌بەجێ هاواردەکا ( ئەڵـڵا ! ) مەعنای ئەوەیە کە : خوایە ئاگاداری بە و بێگرەوە با لەم هەڵەنگوتنـەدا قاچی ئازاری نەگا .

**ئەڵڵاوەیسـی** ــ [؟] ، ( نتـ.) ، (کمر.) یەکێکە لە هەواکانی کلاسێکی مۆسیقای کوردی. تێبـ ــ ئەم هەوایە یەکێکە لە هەواکانی پێش ئیسلام ، ناوەکەی جەڕاندراوە . پرۆفسـۆر (گل‌سرخی) مۆسیقازانی ئێرانی لـە ئاخروئـۆخری سـاڵی ۱۹۷۲دا ، لەسەر ئەم هەوایە دوورودرێـژ لـە رادیۆی تارانەوە قسەی‌کرد ، ناوە کۆنەکەشی گوت ، بەداخەوە حـاڵی نەبوم .

**ئەڵڵاهوئەکبـەر** ــ [= عـا : الله‌اکبر ] ، رستەیێکی عەرەبییـە و مانای ( خواگەورەترە ) ۱ــ لە بانگ و نوێـژ و گەلـێ ڕێوشـوێنی‌تری ئیسـلامەتیدا دەگـوترێ ۲ــ بـۆ

نیشـانداني سەرسوڕمـان یـا توڕەیی ، بە شـێوەیێکی تایبەتـی دەیلێین . :: ئەللاھو ئەکبەر ! بۆ ئەمشــــۆخی و نــــازداریيە . ئەللاھوئەکبەر ! کوڕە ئاخر دەلێـم وازی لیٚبێنە .

☐ « ئەللاھوئەکبەڕ ، بەریٚبەیانە »
« تاریك و لێلی ڕۆی ئاسمانە »
( گۆران )

**ئەڵماس** ــ [ پھ : ئەلماست ] ، (نا.) ١ــ بەردێکـی سـەختی بـە وورشـە و گرشـەی بەقیمـەتە ، ئەسڵەکـەی ڕەژیٚ ( کـاڕبۆن )ە . تێب ــ لەبەر سەختی و ڕەقی هێـچ مادەیێك کـار دە ئەڵمـاس نـاکا و خۆی هەمۆ ماددەیێك دەڕۆشێنیٚ و شوێنی دەکا ، بۆیە بۆ کونکردنـی هەندێشت و بڕینەوەی شۆشـە ، لە سەنعاتا کەلکی لیٚ وەردەگیریٚ . بۆڕازاندنەوە و خشڵی ژنان بەکـار دەهێنریٚ . ڕەنگی سەوز و سوور و شین و ڕەشی هەیە ( مەیلە و ئـەو ڕەنگانەیە ) ، لە هەموان گرانتـر و پەسندتری ئەوەیە کە هیچ ڕەنگی‌نیە وەکو بلوور . کاتیٚ لەکان دەریٚ دێنن پارچەکانی ناقۆلا و کڕیٚژاویـن بـۆ لێك و لوس‌کردن و بریقەدارکردنی بە خاکەی خۆی دەیسۆنەوە . کانی لە هیندستان ، ئەفریقای‌جنۆبی ، ئوستراليــا و جێگـای دیکـەش دوزراوەتـەوە . لـە کـوردەواری دەکوترا هەر شـوینیك برۆسـکی ئاسمانی لیٚبدا ئەلماسی تێدایـە . ٢ــ ( مجـ.) ، أ ) زۆر تیژ :: «پردی سیڕاتیٚ لە مۆ باریکتر و لە ئەڵماس تیـژترە » ، گوێزانەکـەی وەهـا تیژکردوە دەلەی ئەڵمـاسە . ب ) هەرشتێکی بریقەدار و ڕۆن .

☐ « ئەوا سامالی کرد ڕۆژ کەوتە
سەرشاخی گڵەزەردە »
« بەسەر ئەوبەفرەدا تیشـکی
هەتاو ئەلمـاسی خواکردە »
( پیرەمێرد ــ ١٣٦ )

٣ــ ناوە بۆ ئافرەتان .

**ئەڵماسە** ــ [ ئەلماس + ە ــ ئە/١ ] ، (نتـ.) ، (سنـ.) دڵۆپی ئاوە کە لە هەوادایە و بەیانانی سـاردی پاییز وەکو توێژالێکی سپی لە سەر دار و دەوەن و زەویٚ دەنیشـیٚ . تێب ــ هەر شەونمی بەهـارانە کـە پاییزان لەبەر ساردیٚ دەیبەستیٚ . ★خۆس ، خۆسار، خوێز ، زوقم، سێخوار ، وەڕەق . (بکـ.) قڕاڤ .

**( ــ ئەڵە ) ــ** (پبـ.) ١ بـەدوای صفەتانەوە دەنۆسیٚ و دەیـانکا بـە صفـەتێکی تـازە کە پچۆکـایەتێکی ئـامێتە بە خۆشەویسـتی تێـدا بەدیٚدەکـریٚ . :: خڕەڵە ( خـڕ ) ، ژیرکەڵـە ( ژیـرك ) ، قیتەڵـە ( قیت ) ، کورتەڵە (کورت) ، گردەڵە ( گـرد ) . ٢ــ بـەدوای نـاوانەوە دەلکـیٚ و مـانای پچۆکی دەخاتـە مەدلۆلەکەیان . :: پردەڵە ( پـرد ) ، تۆپەڵە ( تۆپ ) ، تێخەڵە (تیغ) .

**ئەم** ــ [ستـ : ئیم ، ئیمە . ، پھ: ئیـت ، ئین ] ، ( ز. ) ، زەمیـری ئیشارەیە بۆ نیزیك . :: ئەم کتێبە ، ئەم پیاوە ــ مەبەسـت کتێب یـا پیاوێکە لە هەمۆ کتێب و پیاوێکی دیکەی ( لەبەرچاو ) نیزیك‌تر بن ــ

□ « ... چاوێك ، چاوێك... ئەم هەمو دنیایەی گرتوتەخوی ... »
( مەم : چیرۆکەکان ـ ١٣٨ ) ★
(مک.) ئەو ، (بک.) ئەڤ ، (هو.)یە .
**ئەمارەت ـ** [ = عا : امارة ]
١ـ ( نمصـ.) حوکمداری کردن ، میرێتی کردن . :: دەوری ئەمارەت لە کوردستان مێژوی تایبەتی هەیە .
٢ـ ( نا. ) ئەو مەلبەندەی دەبەردەستی میرێك دایە ، ★ میرنشین . :: ئەمارەتی بوتان ئەمارەتی سوران .
**١ـ ئەمان ـ** [ ئەم + ٢ـ ئان ]، ( ز.) زەمیری ئیشارەیە بو نیزێك ، جەمعی ( ئەم )ە و تەنیا بو ئادەمیزاد بەکاردێ . :: « ... نەخێر ئوتموبیل وەستاو لە دەرگای ئەمانیشیاندا ...» ( بلە : ژان ـ ٨٠ ) .
**٢ـ ئەمان ـ** [= عا : امان ] ، ( نمصـ.) ١ـ هێمنی ، بێترسی . :: دنیا ئەمن و ئەمانە دلتان هیچ غاییلە نەکا . ٢ـ تە : ٣ـ ئامان/١ . □
« ووتی یا شێخ ئەمان مەکە مەنعی »
( رەزا ـ ٤٤ ) .
**ئەمانە ـ** [ ١ـ ئەمان + ٢ـ ئە/٢ ] ، ( ز.) زەمیری ئیشارەیە . :: «...ئێمە ئەمانە بە خو ئەزانین و لە خومانیان جیا ناکەینەوە ... » ( بلە : ژان ـ ١٥٨ ) ★ ( مک.) ئەوانە .
**ئەمانەت ـ** [= عا : امانة ] ، ( نمصـ.) ١ـ راستی و دەستپاکی. ٢ـ تە : ئامانەتی .
□ « زورکەم ئەمینی نوێژ و جەماعەت »
« لە ئەمانەتیش ئەکەن خیانەت »
( پیرەمێرد ـ ٢٥٧ )
٣ـ ( مجـ.) گیان ، روح . :: خوا هەروەختێ حەزی کرد با ئەمانەتی خوی بەرێتەوە .
**ئەمانەتی ـ** [ عا. کو. ] ، (نا.) ، (مک.) تە : ئامانەتی .
**ئەمبار ـ** [ پە : هەنبار ، لە ( هامپەر )ی ئاوێستایی بەمانای ئاخنین پرکردن و داگرتن وەرگیراوە] ( نا.) ، ( مک.) تە : عەمبار. □«... کە بیژینگی دەدەستی خویدایە و جوختینی خوی پاك دەکا و گەنمی خوی دەئەمبارێدا خردەکاتەوە...» ( ئینجیل : مەتی ـ ٦) .
**ئەمجا ـ** ( بند.) ، ( کعر.) تە : ئەمجار
□ « ئەمجا دەچوێتە شارەوە
ناومالی عاسیمە »
« بێت و بنوسرێت نابیتە خوێی
چێشت ئەمەکەمە »
( پیرەمێرد ـ ٢٥١ )
**ئەمجار ـ** (ند. و بند.) ،(کعر.)
١ـ ئەم کەرەتە ، ئەم دەفعەیە . :: ئەم جارەش لەبەر خاتری عەبە وازی لێبێنە . ئەمجارە نورەی ئەم بەزم و رەزمەمانە
□ « ووتیان ، هەرچەند خوێن
کەوتە بەینەوە »
« ئەمجارە هاتوین ئاشتت
کەینەوە »
( پیرەمێرد ـ ١٨٤ )
٢ـ پاش ئەمە ، دوای رووداوێك .
□ « ... ئەمجار پیرۆتیش هەر

چەندە وەیسە تەقەلای دەدا نەهێڵێ کاربکا کەلکێ نەدەگرت ... »
( قزلجێ : پێکەنێن ــ ٨٠ ) . ٣ــ تم : ئەوجا . ★ ئەمجا ، ئەوجا ، ئەوجار، ئینجا، ئینجار، ئینجارەکە، ئینجارەکانێ ، ئینجاکۆ ، ئینجاکونێ .

**ئەمر ــ** [= عا : امر ] ، ( نا. ) حوکم ، فەرمان
☐ « پیاو بەئەمرێ ژن ئەچێت بەڕێوە »
« لە مەجلیسدا نان ئەخۆن بەپێوە »
( پیرەمێرد ــ ٢٥٧ )
★ عەمر . ● **ئەمریخوا (خودا) بەجێهێنان** ( کن. ) ١ــ جێبەجێکردنی ئەو فەرمانانەی خوا کردویە . ٢ــ تم : ئەمریخواکردن
**ئەمریخوا ( خودا ، خولا ) کردن** ( کن. ) لەدنیاچونەدەر ، مردن . ★ عەمریخواکردن .

**ئەمرپێکردن ــ** [ عا. کو. ] ، ( مصت. مت. ) بۆ جێبەجێکردنی کارێك فەرمان ( بەکەسێك ) دان . :: ئەمری پێکرد کە دانیشێ ، ئەمریانپێکردین ، ئەمریانپێدەکەن.

**ئەمرکردن ــ** [ عا. کو. ] ، ( مصت. لا. ) فەرمان‌دان ، داوای کردن یا نەکردنی کارێك . :: ئەمرکە چامان بۆ بێنن ، ئەمرکراوە بەشەو کەس لە ماڵی خۆی دەرنەکەوێ .

**ئەمریکا ــ** ( نا. ) ، ( کئێر. ) یەکێکە لە پێنج بەشە ئیشکانیەکانی سەرزەوێ ، یەکەم جار ساڵی ١٤٩٢ کریستۆف کلۆمب دۆزیویەتەوە ، ٤٢ میلیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشەیانە ، لە ساڵی ١٩٦٩ چوارصەت و شێصت ملوێن نفوسی هەبوە ( تم : لارۆس ــ ١٠١٦ ) . دەکرێتە سی بەش : ئەمریکای باکوری ، ئەمریکای ناوەندێ ، ئەمریکای جنوبی . ★ ( کعر. ) ئەمەریکا .

**ئەمڕۆ ــ** [ ئەم + ڕۆ = ڕۆژ ]، ( نت. و بنت. ) تم : ئیمڕۆ .

**ئەمشەو ــ** ( نت. و بنت. ) تم : ئیمشەو .

**ئەمما ــ** [= عا : امّا ] ، ( بن. ) بەلام . ☐ « .. مەجیدبەگ گوتی باشە بێ‌هێنە . ئەمما ناوی مەبە »
( قزلجێ : پێکەنێن ــ ٣٩ ) .

**ئەمن ــ** ( ز. ) ، ( مک. ) زەمێری نەلکاوە بۆ یەکەم کەسی **مفرەد** ( ئەوکەسەی قسەدەکا ) ☐ « ... ئەمن ئیحتیاجم هەیە کە لە تۆ تەعمید بکرێم و ئەرێ ئەتۆ بۆ کن ئەمن دێی ؟» (ئینجیل : مەتێ ــ٦).
★ من ، ( بک. ) ئەز .

**ئەمن ــ** [= عا : امن ] ، (نمص.) بێ‌ترسێ ، هێمنایەتێ . :: دنیا ئەمن و ئەمانە . ئەمن و ئاسایش لەم وولاتەدا نەماوە .

**ئەمنیە ــ** [ عا. ] ، ( نا. ) ، ( کئێر. ) ١ ــ سەربازێکە بۆ پاراستنی ئاسایش لە دیهات تەرخان کراوە . ★ ژاندارم . ٢ ــ دایەرەیێکی ئەم سەربازانەی لەژێر فەرماندایە . ★ ژاندارمێری . ☐ « ... هەر لە پشتی ئاواییەوە مەیتی ئەمنیەیێك بەقەی ڕەشکەیێ

ماسیِ بۆ ... » ( چیرۆکی ئازیەتیِ گشتیِ : ؟ چاپ نەکراوە ) .

**ئەموست** ــ ( نا.) تم : ئەنگوست .

**ئەموستبەستە** ــ [ئەموست + بەستە ] ، ( نت.) دەستخەرۆ ( خا : ج ١ ــ ٨٠ ) .

**ئەموستەچاو** ــ [ ئەموست + ٣ــ ئە/٢ + چاو ] ، ( صت.) تم : ئەنگوستەچاو .

**ئەموستەوێلە** ــ [ ئەموست + ٣ــ ئە/٢ + وێلە = ئێلە ] ، (نت.) تم : ئەنگوستێلە .

**ئەموستێلە** ــ [ ئەموست + ئێلە ] ، ( نت.) تم : ئەنگوستێلە

□ « هەناسەی ! دەوای دڵەی پڕ خەمە »

«بە ئەموستێلە ! ناویِ خاتەمە»

( پیرەمێرد ــ ١٧٣ )

**ئەمۆنیاك** ــ [= فرەنسیِ : ئاممونیاك ( لە یۆنانیِ وەرگیراوە ) ]، ( نا.) غازێکە بیِ ڕەنگ ، تامیِ تێژە و بۆنێکی زۆر توندی تایبەتیِ هەیە ، دەگەڵ ئاو تێکەڵدەبیِ ، یەکێکە لە تەرکیباتی ئازۆت ( نایترۆجێن ) ، چاو دێنێتە فرمێسك ، لە هەوای ناو ئەدەبخانانەدا هەیە بەتایبەتیِ ئەگەر هەتاوی تیِبکا . لە تەجزیەی ( یۆرە )ی ناو ( مێز )و هەروەها لە تەرکیبی نۆشاتر و قسڵ دروست دەکریِ . بۆ ساردکردن و کوتان و تەقەمەنی لە سەنعات و پزشکیِ و کشتوکاڵدا کەلکی لیِوەردەگیریِ . تم : ( لاروس ــ ٣٥ ، معتین : ج ١ ــ ٩٢ ) ★ ڕۆحی نۆشاتر .

**١ــ ئەمە** ــ [ ئەم + ٢ ــ ئە/٢]، (نت.) ناوی ئیشارەیە بۆ نێزیك :: ئەمە چ زەنازەنایەکتانە منداڵینە ؟ □ « ... ئەمە کیِیە جوێن بە چاوساغەکە دەدا ... » ( بیرەوەری خۆم ) ، « ... باشە دەیفەرمو ئەمە قەڵەم و کاغەز ... » (قزلجیِ: پێکەنین ــ ٧٣ ) ★ ( مک.) ئەوە . (بک.) ئەڤ ، ئەڤا ، ئەڤە .

**٢ــ ئەمە** ــ [ ست : ئەهما . پە: ئەماە ] ، ( ز.) ، ( مک.) زەمیری نەلکاوی یەکەم کەسی جەمعە ( ئەوانەی قسە دەکەن ) . □ «... قەرزی مە ببەخشە چلۆنێکی ئەمەش قەرزدارانی خۆمان دەبەخشین.» ( ئینجیل : مەتیِ ــ ١٤ ) . ★ ئێمە ، مە . ( بک.) ئەم ، مە .

**ئەمەتا** ــ [ ١ــ ئەمە + تا ] ، ( شر.) وەڵامی پرسیاری : کامەتا ، کوا ؟ ی پیِ دەدرێتەوە . ( جم : ئەمەتان ) . :: کامەتا کتێبەکە ؟ ــ ئەمەتا لێرەیە . تێب ــ ڕەنگە پارچەی دوەمی ئەم وشەیە، دەگەڵ ( تا ) و ( تە )ی ئاویستایی کە مانایان ( ئەم )ە ( تم : پد . یگد . ج ٢ ــ ٣٦٧ ) پێوەندیِ هەبیِ ، لەم حاڵەدا دۆپاتەکردنەوەی ( ئەم ) دەشیِ بۆ تەئکیدبیِ . ڕێشی تیِ دەچیِ کە ( تا ) لە ( ستا )ی ئاوێستایی وەرگیرابی کە لە پەهلەویدا بۆتە ( ئێستاتەن ) . بە مانای: بۆن، هەبۆن (تم : فرەوشی : پفا ــ ١٤٤ ) ، هەڵسەنگاندنی دەگەڵ شێوەی سنەیێەکەی ( ئەمەسە )

بۆمان دەردەخا کە ڕای دووەم لە ڕاستی نیزیکترە . ★ ئەمەتانێ ، ئەمەتە ، ئەمەسە، ئەوەتا، ئەوەتانێ . ( بکـ. ) ئەڤە ، ڤایە .

**ئەمەتانێ** ـ [ئەمەتا + ١ـ ئانێ]، ( شر. ) تم : ئەمەتا .

**ئەمەتە** ـ [ ئەمەتا + ١ـ ئە ] ، ( شر.) تم : ئەمەتا .

**ئەمەریکا** ـ ( نا.) ، (کعر.) تم : ئەمریکا .

**ئەمەسە** ـ [ ١ـ ئەمە + سا ] ، ( شر.) ، ( سنـ.) تم : ئەمەتا .

**ئەمەگ** ـ [ ؟ ] ، ( نا.) ١ـ کاری سەخت و قورس کە پیاو ماندوو بکا. هس : ئەرك . ٢ـ ئەو هەقەیە کە دایك و باب لەبەر ماندوویەتی پێگەیاندن و بەخێوکردن ، دەیان‌کەوێتە سەر منداڵی خۆیان . :: کوڕ قەت لە ئەمەگی دایك و باب دەرناچێ ، ڕۆڵە ڕەببی ئەمەگم بتگرێ . ٣ـ ( مجـ .) هەقێکی لەئەنجامی ماندووبوون بە کەسێکەوە ( جێبەجێکردنی کارێکی ، ڕزگارکردنی لە تەنگانە ، لەکۆڵکردنەوەی گیروگرفت و ...) بۆ یەکێك ساز دەبێ . :: **ئەوەندەی** ئەمەگی زۆراب بەسەرەوەیە نەبێتەوە . تێبـ ـ أ ) لە هەندێ قاموساندا ئەم وشەیە ( ئەمەك ) نووسراوە ، ئەوی ڕاستبێ بەسەر زمانانەوە بێجگە لە دەنگی ( گ ) شتێکی تر نابیسترێ . بۆ ئەوەی (ك) تەلەفوزبکرێ پێویستە قورسایی زیاد بخرێتە سەر شەوێلاکە . ب) هیندیك بە وشەیێکی تورکی دەزانن ( تم : ژابا ـ ٢٠ ) و لە زمانی ئازربایەجانیشدا بەکاردێت .

**ئەمەگ بەجێهێنان** ـ ( مصتـ. لاَ. ) پاداش‌دانەوە ، خزمەت‌کردنی کەسێك بەرامبەر بە ماندووبوونی بەکارێکەوە ، وەفا بەجێگەیاندن . □ « ... زۆری نەخایاند دایکیشی ئەمەگی بەجێهێنا و دوای باوکی کەوت بۆ شاری خامۆشان ... » ، ( قزلجی : پێکەنین ـ ١٠١ ) .

**ئەمەگ بەسەرەوە بوون** ـ ژێرباری کەسێك بۆ کەسێکی تر لەبەر ئەوەی کە پێیەوە ماندوو بوە. □ « ڕەفیقێنە ئەمە زۆرمان ئەمەگی ئەو پیاوەی لەسەرە ... » ( تحفە : ج ١ ـ ١٩٨ ) .

**ئەمەگ دەگەڵ کێشان** ـ ( مصتـ. متـ.) ١ـ خۆ ماندووکردنی دایك و باب بۆ پێگەیاندنی منداڵ □ « چیدی ئەمەگی ناکێشم بە خۆڕایی دەگەڵ هەتیوی خەڵقییە » ( تحفە : ج ٢ ـ ٨٨ ) . :: ئەم هەموو ئەمەگەی دەگەڵ کێشاوون ، کەچی ئێستا یەکێکیان لەو دایکە فەقیرەیان ناپرسنەوە . ٢ـ خەرێك بوون و خۆ ماندووکردنی کەسێك بە جێبەجێکردن و ڕاپەراندنی ئیش‌وکاری یەکێکی ترەوە .

**ئەمەگ بەخەسار** ـ [کو. عا.] ، ( صتـ.) ١ـ حاڵی دایك و بابێکی منداڵیان ناڵەبار و نەعاملاوبێ . :: دایەگیان بەهومێدی خودای نایەڵم ئەمەگ بەخەساربێ . ئەمەگ بەخەسار خۆی منداڵەکانی یەکێکیان باش دەرنەچوون. ٢ـ حاڵی کەسێکی سەرەڕای ماندووبوون بەکارێکەوە

هێچی بۆ حیساب نەکرێ .
**ئەمەگ‌دانەوە ــ** ( مصد. لا. )
تە : ئەمەگ (.ئەمەگ بەجێ‌هێنان ).
**ئەمەل ــ** [= عا : أمل ] ، (نا.)
تە : ئومێد . :: هێچ ئەمەلی نەماوە ڕوحمی خوا نەبێ ، ئەمەلت بەم کابرایە نەبێ .
□ « خستییە ناو قەفەس ، بڕا ، ڕێی ئەمەل »
« هێچ چارەی نەما ، بێجگە لە ئەجەل »
( سەلام ــ ١٤٠ )
**ئەمەند ــ** [ ئەم + هەند ] ، ( بنت. ) تە : ئەمەندە .
**ئەمەندۆچکە ــ** [ ئەمەند + ئۆچکە ] ، ( بنت.) میقدارێکی کەمتر لە ئەمەندۆکەی پێ دیاریێ دەکرێ .
★ ئەمەندۆسکە ، ئەوەندۆسکە .
**ئەمەندۆسکانە ــ** [ ئەمەندۆسکە + ئانە/١ ] ، ( بنت.) تە : ئەمەندۆکانە .
**ئەمەندۆسکە ــ** [ ئەمەند + ئۆسکە = ئۆچکە ] ، ( بنت.) تە : ئەمە ندۆچکە . تێب ــ دەنگی (چ)ی ئۆچکە لەسەر زمانان بۆتە (س) .
**ئەمەندۆکانە ــ** [ ئەمەندۆکە + ئانە/١ ] ، ( بنت.) بۆ موبالەغە لە پچوك نیشاندانی شتێکدا.:: هێشتا ئەمەندۆکانەیە ، وایە ! گەورەتر بێ چۆن دەبێ . ★ ئەمەندۆسکانە .
**ئەمەندۆکە ــ** [ئەمەند + ئۆکە] ، (بنت.) میقدارێکی کەمتر لە (ئەمەندە) پێشان‌دەدا .
**ئەمەندە ــ** [ ئەم + هەند (هێند) + ٢ــ ئە/٢ ] ، ( بنت.) ١ــ بە شێوەیێکی نامەحدۆد میقدارێك پێشان‌دەدا ( جاروبارە بە ئیشارەی دەست یان بەراوەردکردن دەگەڵ شتێکی‌تر تەحدید دەکرێ) . :: مارێکمان کوشت ئەمەندە درێژ بوو نەبێتەوە ، ئەمەندەی بەرچێفێکیش ئەستوور بوو . قەت وولاغم نەدیوە ئەمەندە بەرز و شۆخ . ئافرەتی ئەمەندە جوان هەر نابێتەوە . ٢ ــ وەلامی پرسیاری ( چەند ) و ( چەندە )ی پێ‌دەدرێتەوە . :: مارەکەی کوشتتان چەندە درێژبوو ؟ــ ئەمەندەی پشتێندێك . ★ ئەمەند ، ئەمەنە ، ئەوەند ، ئەوەندە ، ئەوەنە ، هێندە .
**ئەمەنە ــ** (بنت.) ، ( سن.) تە : ئەمەندە. تێب ــ لە قسەکردنا (ن)ەکە توزێك دەگیرێ ، هەروەکوو (ن)ێکی سووکی لە پێشەوەبێ وایە .
**( ــ ئەمەنی ) ــ** ( پب.) بە دوای ڕەگی هەندێ فیعلی ڕابردووە دەنووسێ و ناوی شتێکی لێ پێکدێنێ کە ( فیعل )ەکە بەبێ ئەو سەرناگرێ ( تمـ : هبێد ــ ٤٤ و ٤٥ ) . :: سووتەمەنی ( ئەو شتەی سووتان بێ ئەو نابێ ) ، خواردەمەنی ( ئەو شتانەی بۆ خواردن دەشێن). تێب ــ لەم ساڵانەی دوایدا ووشەی ( چاپەمەنی ) لەباتی ( مطبوعات )ی عەرەبی داتاشراوە . ئەمە بە دوو سەران هەڵەیە ، یەکیان پاشبەندەکە خراوەتە سەر (ناو)ێك و ناوێکی‌تری پێ دروستکراوە ، کە دەگەڵ ڕەوتی زمانی کوردیدا ڕێك نیە . دوەمیان ئەوەیە ئەگەر چاومان لەو

هەڵەیەش قۆچاند دەبوایە ووشــە تازەکە مانای ( کەرەستەی چاپ ) یا ( نوسراوێکــی بــۆ چــاپکردن ) ئامادەکراوە ، بدات کەچێ دەبینین لەباتی چاپکراو بەکار دەهێنرێ .

**ئەمیانە** ــ [ ئــەم + یە ( یەك ) + ئانــە/١ ] ، ( بنت.) ، ( جــف. ) ئەمەیان . وەڵامی پرسیاری (کامیان، کیهەیان ؟ )ی پێ دەدرێتەوە :: لەم کراسانە کامیان باشن ؟ ئەمیانە .

**ئەمێتر** ــ [ ئــەم + ١ــ ئــێ/٢ + تر ] ، ( نت.) تم : ئەمێکە .

**ئەمێکە** ــ [ ئەم + ١ــ ئێ/٢ + کە ( دێکــە ) ] ، ( نت.) ، ( ســیم.) ناوی ئیشــارەیە بۆ دیــاریکردنی شــتێك لەنــاو کۆمــەڵێ شــتێ هاوچەشن . :: کوڕە ئەم کتێبەیان نــاڵێم ، ئەمێکــە . ★ ئــەمێتر ، ئەوێدێ ، ئەوێدێکە .

**ئەمیە** ــ [ ئــەم + یە ( یــەك ) + ٢ــ ئە/٢ ] ، (نت.) تم : ١ــ ئەمە. وەڵامی پرسیاری ( کامە ، کامیە )ی پێدەدرێتەوە .

□ « بیستومە خانم لۆتێ بەزێنە »
«ئەمیەی بۆ خاسە . . . تەزێنە»
( فۆلکلۆر )

**ئەمێ** ــ [ ئەم + یێ ] ، (بنت.) تم : ئێرە . تێب ــ بەلای منەوە کەرتی دوەمی ئــەم ووشــەیە (یێ) دەگەڵ (یاگە)ی هەورامی بــە مانای (جێ ، جێگە) پەیوەندێ هەیە .

**ئەمێستا** ــ [ ئەم + ئێست + ئا (= ٥ ــ ئە/١ ) ] ، ( بنتــ . ) ، (کعر.) تم : ئێســتە .

**ئەمێستە** ــ [ ئەم + ئێست + ٥ ــ ئە/١ ] ، (بنت.) ، (کعر.) تم : ئێستە .

**ئەمێیانە** ــ [ ئــەمێ + ٢ــ ئان/١ + ٥ــ ئە/١ ] ،.(نت .) ناوی ئیشارەیە : ئــەم جێگایانە ، ئــەم دەوروبەرە . جەمعی (ئەمێ)یە .

**ئەمیر** ــ [=عا: امیر (ئەوکەسەی ئەمردەکا) ] ، (نــا.) ، (کعر.) ١ــ شازادە ، کوڕی پاتشا . ٢ــ لەقەبە بۆ ئەو کەسانەی لە بنەماڵەی پاتشان

□ « پەردە و تارای ســور بــەرن
بۆ ئەمیر »
« بڵێن پاش کوشــتار هێشــتا
تۆی دڵگیر »
( پیرمێرد ــ ١٠٢ )

٣ــ پلەیەکە لــەخوار پاتشــایەتێ ، فەرمــــانڕەوا و حوکمــــداری ئەمارەتێك . :: ئەمیری بەحرەین ، ئەمیری کوێت ، ئەمیری مۆناکۆ . هس : میر . ٤ــ ناوە بۆ نێرینە // ئەمیرە .

**ئەمیرە** ــ [ = عا : امــیرە ] ، (کعر.) ١ــ لەقەبە بۆ ئافرەتێ کە لە بنەماڵەی پاتشا بێ . ٢ــ نــاوە بۆ کچان .

**ئەمین** ــ [ = عا : امین ] ، (صـ.) ١ــ ڕاست و دروســت ، دەسپاك :: شاگردێکی ئەمینە بــە ئانقەست پوڵمان فرێداوە هــەڵێ نەگرتوە . ٢ــ حاڵی ڕێگاوبان کە ترسی دز و جەردە و خراپــەیتری لێنەکرێ ، حاڵی شوێنێکی پیاو ترسی ئەوەی نەبی لەوێ شتێکی بەســەربێ یــا تۆشی بەڵایەك ببێ . :: ڕێــگا زور ئەمینە شەوێش هاتــوچۆ هــەیە ،

جێگای وا ئـەمێن هـەر نابێتـەوە شەیتانیش شکێ ناکا . ٤ـ بارگێنی ئارام و لەسەرخۆ . :: کوڕە وەیسە وولاغێکی ئەمێن بۆ مـیرزا زین کەن

**١ـ ئەمێن بـوون ـ** (لەکەسی ، لەشوێنـێ ، لەخـۆ ) [ عـا. کو. ] (مصد. لا. ) ١ـ نەترسان . :: ئەوە هێندە لەو شوێنە ئەمێنن وا پاڵتان لێ داوەتەوە ؟ ٢ـ دڵنیابوون ، خاتر جەم بوون . :: لـەم زەمانەدا نابێ پیاو لەکەس ئەمێن بێ ، ئەمێن بـە ئەو کوڕە من بێناسـم درۆت لەگەڵ ناکا . ٣ـ (مج .) دەخـۆڕادێتن ، بەخۆ ڕاپەرموون ، بڕوا بەتوانای خـۆ هەبوون بۆ جێبەجێ کردنی کارێك .

**٢ـ ئەمێن بوون ـ** [ عا. کو.] ، (مصد. لا.) دەس پاك بوون، دز نەبوون. :: کوڕم پیاو کە ئەمێن بـوو دەبێتە شەرێکی خەڵك .

**ئەمێندار ـ** [ ئەمێن + دار ] ، [عا. کو.] ، (نفا. ، صفا.) کەسێکی شتێکی بە ئەمانەت لەلا دابنێن ، بۆ ڕاگرتن و پاراسـتن و چـاوەدێری کردنێ . :: مام عەوڵای سەوزێچی ئەمێنداری باغی مکایلێ بوو .

**ئەمینداری ـ** [ ئەمیندار + ٢ـ ئێ ] ، ( حمص . ) پێشـەی کەسێك کە خەڵك شتێ بە ئەمانەت لا دانێن. :: بـە ئەمێنداریێ لـە ماڵـەکەیان دانیشتوە، بە ئەمێنداریێ ناردوویانەتە سەر خەرمانەکان .

**ئەمین کردنەوە ـ** [ عا. کو. ] ، (مصد. مت.) ١ـ ترس ڕەواندنەوەی کەسـێکی ( لەبـەر هـەرچێ بێ ) ترسابێ و خـۆی شاردبێتەوە یـا هەڵاتبێ . :: دزەکانیان ئەمێن کردەوە پاشان گرتیانن ، دە بچن ئەو کوڕە ئەمێن کەنەوە با بێتەوە . ٢ـ (مج.) گرتنـەوەی بـارگێن و ئێسـتری بەرهەڵبوو .

**ئەنام ـ** (نـا.) ، (سـن .) تم : ئەندام .

**ئەنتیکە ـ** [= فڕەنسێ : ئانتیك. لاتینی : ئانتیکوس=کۆن، قەدیمی]، (نا. و صـ.) ١ـ هەرشتێکی کۆنینەی زەمانەکانی پێشـوو کـە لەژێرخاکا بدوزرێتـــەوە :: دریـاز دێیـەکە لەنێزیك مەهابات شـتی ئەنتیکەی زۆر لێ دەدۆزنەوە ، هەندێ قەبری کۆن لەکوردستان شـتی ئەنتیکەیان تێدایە . □ « ... ئەم ماوەیە شتی ئەنتیکەم زوردێ ... » ( قەفتان : چێرۆك ـ ٣ ) ٢ـ (مج.) ، أ) هەموو شتێکی نایاب . ب) سەیر وسەمەرە. :: ئـەم پیـاوە زۆر ئـەنتیکەو قسەخۆشـە . ج) بەتوڕێیەوە ـ نالەبار ، نـاقولا ، کـەمفام ... :: کوڕە خـۆ ئـەم پیـاوە هـەر زۆر ئەنتیکەیـە . ★ عەنتیکە . تێبـ ـ ئەوی ڕاست بێ ئـەم ووشەیە کەم دەکـاردەکرێ و خـەڵـکی لادێ و نەخوێندەوار هەر (عەنتیکە) دەڵێن.

**ئەنجام ـ** [ پە : هەنجام ] ، (نا.) دوایێ ، نەتیجـە ، عاقیبـەت . :: ئەمکارە ئـەنجامێکی چاکی نـابێ ، دیاربوو ئێشەکەیان ئەمە ئەنجامێتێ . **بەئەنجام گەیاندن ـ** بردنەسـەر ، تەواوکردن ، گەیاندنەنەتیجە . :: هێچ ئێشێك بەئەنجام ناگەیێنێ ★ گەیاندنـە ئـەنجام . **بەئـەنجام**

**گەییشتن ــ** تم : گەییشتنە ئەنجام . **گەیاندنە ئەنجام ــ** تمـ : بەئـەنجام گەیاندن . :: لەوباوەڕەدا مەبە کـە ئەم‌ئیشە بگەیەننە ئەنجام. **گەییشتنە ئەنجام ــ** ١ــ ( کەسێك ) نەتیجـە وەرگرتن لەکار و کردەوەو قسەو . . :: بـەم جـۆرە باسـێ زۆژی‌تریش نەدەگەیشتە ئـەنجام . ٢ــ ( کار ) فایدە بەخشین، نەتیجە لێ پەیدابوون :: کاریوا بێ سەرەو بـەرە چۆن گەیشتە ئەنجام ! .

**ئەنجامە ــ** (نت.) ، (کعر. سن .) پارچە ئاسنێکی دۆلەتە کە بەسەریەکا دەنوشتێتـەوە ، دەرگاو پەنجـەرە بەچوارچێوەوە دەبەستێتەوە ،گەلێ جۆرێ هەیە ★ (مک.) لاولاوە. تێبـ ــ ئەم ووشەیە لـە زمانی فارسـیدا ئەوێش هەر لەقامۆساندا ( ئاهـەن جامە )یـە کـە شـکلێکی کۆنتری ووشـەکەیە و لـەزمانی کوردیـدا پلەیێك زیاتر لێك و لۆس بوە و دەنگە سستەکانی سەنگ و سۆك کراون . یەکەندەردۆ وا دێتـە بەرچاو کـە ( ئاهەن‌جامە ) لە دۆ کەرتی : (ئاهەن = ئاسـن) و (جـامە = کـراس ) پێکهـاتبێ سـەرەڕای ئـەوەی کـە (کراسی ئاسـن ) هیـچ پێوەندێکی دەگەڵ ئەو شتەنیە کە نـاوی نراوە (ئەنجـامە یا ئاهەن‌جامە) ، ئـەگەر لەڕاسـتیدا کـەرتی یەکـەم وەك بەڕوالەت دەردەکەوێ (ئاهەن) بوایە دەبوایـە ووشـەکە بێ‌سـێ و دۆ لەکوردیدا ببێتە ( ئاسنجامە ) . من واتێدەگەم پارچەکانی ئـەم ووشەیە ئاوابن : [ ئەن ( ئا + هەن ) + جام + ٢ــ ئە/٢ ] کە هەریەکەیان بەجیا باس دەکەین. أ) ــ ئا ــ پێشبەندێکی ئاوێستاییە « مانای : بە ، لەکن ، دەگەڵ ، لەسـەر و سـەرەوەیە و هەندێ‌جار لەپێش ووشەیێکدا دێ بەڵام کارناکاتە سەرمانای . . . بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم پیشبەندە بۆ بە هێزکردنی مانای هەندێ ووشەیە » تم : ( ئەوڕەنگ : بەهرام ــ١٧٥ ). ب) ــهەنــ : « . . . پێشـبەندەو مانای : پێکەوە ، دەگەڵ ، هـاو ، دەدا » ( سـەرچاوەکەی پێشـو ــ ٢٤٧ ) . ج) ــجامــ ئەم ووشەیە لە ( گـەم ، گـام )ی ئاوێسـتاییڕا جەڕاندراوە کە « . . . گەم (= جەس) بەمـەعنای هـەنگاو هـەڵێنان ، ــ گەیشتن . . . و نیزیك‌بونەوەیە » تم : (پد : یگد، ج٢ــ٥). لەموکریان (گاو) بە پارچـە ئاسـنێکی پچکۆلە ( بەقـەدەر بزمـارێ ) دەڵێن کـە لەت‌وکوتی (چینێ) شکاوی پێ‌پێکەوە دەلکێنن .

بەم‌جۆرە ووشـەکە بـەتێکڕایی مانای : پێك‌گەیشتن ، پێك‌گەیاندن دەدا و پڕ بە پێستی ئـەو ئامرازەیە کە دەرگاو چوارچێوە پێك‌دەگەیێنێ و ئەم ووشەیەی بۆ کراوە بە ناو .

**ئـەنجندراو ــ** (صمف. نمف. : ئەنجنین ) پارچەپارچە کراو ، لەت‌و پەت‌کراو، وورد ووردکراو، لەشێکی زۆر خەنجەر لێدراو ★ ئەنجنراو ، جندراو ، جنراو .

**ئەنجنراو ــ** ( صمف. نمف. ) تم : ئەنجندراو .

**ئەنجنین ــ** [ ئەن + جنین ] ،

( مصت . مت. ) ، ( مک. ) ١ــ وورد وورد کردنی گۆشتو پیوازو ئــەم جۆرەشــتانە . :: فاتــە خێراکــە پیوازەکە بنجنە ( بئەنجنــە ) . ٢ــ برینی زور لە کەسێك کردن ( بــە خەنجەر ، چەقۆ . . . و . . . ) . :: بە خەنجەران ئەنجنیبۆیان ★ جنین، هەنجنین . تێبـ ــ ئــەم ووشەیە هەروەك لەسەرەوە پێشاندراوە لــە دوّ پارچەی ( ئەن = هەن ) و (جنین) پێکهاتوە کە هەردوّکیان دەگەڕێنەوە سەر ئاوێستایی و یەکەمیان لەباسی ووشەی (ئەنجامە)دا شیکراوەتەوە، دەمێنێتەوە دوەمیان ( جنین )ە کــە لە زمانی کوردی ئێســتادا شــکلی مەصدەری بەخۆیەوە گرتوە ، لــە فیعلیکی کۆنی ئاوێستایی ( جــەن ) وەرگیراوە : « جەن بەمانای لێدان ، کوشتن و لەناو بردن ، لەئاوێستادا زۆر هــاتوە ، ووشەکانی کــە لێی کەوتۆنەوە زۆرن » تم : ( پد : یگد ، ج٢ ــ ١٦٦) بەمجۆرە مانای تەرکیبی ووشــەکە دەبێتە ( پێکەوە لێدان ) کە ئێستاش هەر ئەو مــانایەی هــەیە (زۆرجار چەقۆ لەشــتێك دەدرێ و لێدانی ناپسێتەوە ــ پێکەوە ــ یە ).
**ئەنجن ئەنجن کردن ــ** (مصت. مت.) ١ــ وورد ووردکردن ، لەتوپــەت کردن ، پارچەپارچەکردن . ٢ــ تم : ئەنجنین/٢ . ::هەموّ گیانیان ئەنجن ئەنجن کرد .
**ئەنجومەن ــ** [ ست : هەنجەمەن، پە : هەنجەمەن]،(نا.) ١ــدەزگایەکی هەمیشــەییە کــە لــەچەنــدکەس پێکهاتبێ،بۆ هەلسوڕاندنی کاروبار و ناوبەناو کۆببێتەوە بۆ تەگبیر کردن . :: ئەنجومەنی وەزیران ، ئەنجومەنی ئاشــتی ، ئەفراســیاو ئــەندامی ئەنجومەنی شــارە . ٢ــ جێگایێکی بۆ کۆبونەوەی ئەو چەشنە دەزگایانە تەرخان کرابێ . :: ئەنجومەنی شار لە خانوّی میرزا ڕەحمەتی دایــە . تێبـ ــ بەلای منەوە ئەم ووشەیە لــە سێ کەرت [ هەنگ + ئو + مان ] پێکهــاتوە و کونتــرین شــێوەی ئاوێســتاییکەی (هەئێن (گ) یۆ دێمانە) یا (تهەنگیۆ دێمانە) بوە کە هەردوّکیان بە کەلکی ئــەم لێکۆلینەوەیە دێن : أ) هەنگ لە ( هەئێنا )ی ئاوێستایی وەرگیرابی کە بەمانای ( دەستە ، کۆمەڵو جەماعەت)ە تم : (ئەوڕەنگ: بەهرام ــ ٢٤٤ ) و پەهلەوێش هەر بەومانایانە لەئاوێستایی وەرگرتوە ، ئیستاش لە بن لەهجەی موکریانی و هەندێ بن‌لەهجەی باکوریدا لەقالبی (ئەنگۆ) ، هەنگۆ ، هنگ ، هوّن = ئێوە ) دادەبێندرێ و زمانی فارسی زیندوّی کردوّتەوە و لەباتی (فەوج) بــەکاری دێنێ . ب) هــەنگ لــە (تهــەنگ)ی ئاویســتایی بەمانــای (تێگەیشتن ، زانایی ) داتاشــرابێ تم ( فرە : پفــا ــ ٢٠٦ و معین : فەرهەنگ ، ج٤ ــ ٥٢١٠ ) کە ئێستا لەووشــەی ( فەرهەنگ)دا دەبیتنین . ج) ئو : ئامرازی ئیزافەیە ، ئێستاش (ئو) لە لەهجەی هــەورامیدا هــەر ئامرازی ئیــزافەیە . د) مان : لە (دێمانە)ی ئاوێستایی داتاشراوە و مانای ( ماڵ ، خانوّ ) دەدا تم : (پد : یگد ، ج٢ ــ ١٢٦ ) لە ( خانومان) و

(نیشتمان)دا هەر بەو مانایە ماوە . جا ئێستا ئەگەر هەمو ئەوانە تێک بکەینەوە بۆ ووشەی (ئەنجومەن) دو مەعنامان دێتە دەست : ١) خانوی جەماعەت، مالی کومەل . ٢) خانوی زاناو تێکەیشتوان ، خانوی زانین و تێکەیشتن .

**ئەنجەت** ــ [محر. عا : حجة] ، (نا.) ، (مک.) تم : ئینجەت .

**ئەنجەل** ــ [محر. عا.] ، (نا.) ، تم : ئەجەل .

**١ــ ئەنداز** ــ [ = ئەندازە ] ، (نا.) تم : ئەندازە/١ :: لەئەنداز بەدەرە .

**٢ــ (ــ ئەنداز)** ــ ( رێ. فە. ) کاری پاشبەند دەکا و بە دوای ناوێکەوە دەلکێ و ناوێکی تازە دروست دەکا . :: بارەنداز (بار ئەنداز ) ، پایەنداز (پائەنداز) ، تێرەنداز ( تیرئەنداز ) چاوەنداز (چاوئەنداز)،خاکەنداز (خاکئەنداز). تیب ــ ئەم ووشەیە ڕیشەی مەصدەرێکە کە لەفارسیدا بوتە (ئەنداختەن) و لە سەرفکردنا بو زەمانی ئایندەو . . . دەبێتە (ئەنداز) بەرامبەری ئەم مەصدەرە لەکوردیدا (ئاویشتن) هەیە .

**ئەندازە** ــ [ پە : هەنداچەک ] ، (نا.) ١ــ حەجم یا میقداری هەرشتێک بە کێشانە یان پێوانە . :: بەئەندازەی شەشگەز فاسونیایان بوبکرە، بەئەندازەی سێ کیلو دەبێ، ئەندازەی قاچی چەندە؟ ٢ــ نەگەورە نەپچوک ، پڕبەپێست، لەقەدەرحال، حەددی مەعمولی هەرشتێک .

□ « بوره نەبێ بازەبێ ، کلکی لە ئەندازە بێ » . ٣ــ مقیاسە هەندێ لە سەنعاتکار (بەنا ، جلدرو . . .) بو هەندێ کاروباری پیشەی خویان تەرخانی دەکەن و بەپێی مەبەست شکلی دەگوڕێ و گەورە و پچوکیش دەبێ . :: ئەندازەی بەنایان ، ئەندازەی بەرە تاسکلاو ، ئەندازەی وولاغان ( بو پێوانی بەرزی و نزمی ) .

□ « قەت بەیەک ناگەن لەیەکجا
ئەم خەزانو ئەو بەهار »
« ڕاستی شمشاد و قەددی
تو بەئەندازەی یەکن »
(سالم : گم ــ ٦٠)

**زیاد لە ئەندازە** ــ تم : لەئەندازە بەدەر . :: ئەم پالتویە زیاد لەئەندازە گەورە و دەلبە دەلەی بوتو نەکراوە . **لە ئەندازە بەدەر** ــ حالی شتێک کە لە حەددی مەعمولی تێپەڕێبێ .

□ « . . . دانەکانی ڕەش هەلکەڕاون ، هەمو ، هوی جگەرەکێشانی لەئەندازە بەدەرە . . » (قەفتان : چێڕوک ــ ٧٠) ★ زیاد لە ئەندازە ، بێئەندازە .

**ئەندازەگرتن** ــ (مصد. متـ.) ١ــ پێوانی درێژی ، پانایی ، قولایی ، بەرزایی یا ئەستورایی شتێک . ٢ــ دیاری کردنی میقیاسی جلوبەرگی ئینسان . :: بچو لای خەیاتەکە با ئەندازەت بگرێ .

□ « . . . هادیخان بو ئەندازەگرتنی هێلکەکان ، کونێکی خڕی کردوتە تەختەیەک . . . »

(قزلجی : پێکەنین ــ ١١٨) .

**ئەندام ــ** [ ست : هەنـدامە . پە : هەنام ، هەندام ، هەننام ] ، (نا.) تم : ٢ــ ئـازا . ٢ــ (تتـ.) کەسێکی لـە پارتێکی سـیاسی ، ڕێکخراوێکی پێشەیی یا لیژنەیێکی تایبەتی و ... و ... کـاردەکا . :: ئەنـدامی پـارتی دێمـوکراتی کوردسـتان ، ئەنـدامی یەکێتـی نوسـەرانی کـورد . ٣ــ (تتـ.) دەوڵەت یا وولاتێك کە لە یەکگرتنی چەنـد دەوڵەتدا بـو مەبەستێکی تایبەتی یا بو یەکێتـی و پێکهێنانی دەولەتێکی فیدڕالی ، بەشداردەبی . :: دەوڵەتی ئازربایەجان ئەندامە لە یەکێتی شوڕەویدا ، عێراق ئەندامی جامیعەی عەرەبییە .

تێبـ ــ أ ) وەك ژابا نیشانی داوە دەنگی ( ن ) لە ئاوێستایی ئەم ووشـەیەدا (ن)ێکی گنە و سـوکە دەنگێکی (گ) لە پاش (ن)ەکەوە هەیە، هەروەك لە بن لەهجەی سلەیمانیدا بەدیدەکری . ب) ژابا ( تمـ : ــ ٢٢)ش و دوکتـوڕ معینێش ( تم : فەرهەنگ . جا ــ ٣٧٢ ) جگە لـە ئازای لەش ئەم ووشەیان بە ئامرازی نێرینەیی مانا لێداوەتەوە. ★ (سنـ.) ئەنام .

**ئەندو ــ** [ پە : هەندوهـ ] ،(نا.) خەم و خەفەت ، پەژارە

□ « ئەوەند زاری کەرد جە ئەندوی
دەڕون »
« خوڕوش کەرد نـە سـەنگ
قوڵلەی بێستون »
( خانا ــ ٤١٣ )

**ئەندەر ــ** [ ست : ئەنتەری . پە : ئەندەر ] ، ( ئم . ) مانای ( دە ... ، لەناو ... ) دەبەخشی و لە لەهجەی ناوەندیدا بێجگە لە یەك دو کینایەدا نەبی بەرچاو ناکەوی و بە تەنیاییش نەبێستراوە . بـەڵام لـە لەهجەی باکوریدا ( هوندور ، هوندرو ) بـە مانای ( ژورەوە ، داخڵ ) ماوە . ● یەکەندەر دو ( یـەك ئەندەر دو ) ، (کنـ.) کتوپڕ ، لە ناکاو .

**ئەندەرون ــ** [ پە : ئەندەرون ] ، (نا.) ، (کنیز.) ١ــ ژوری ماڵ ، ئەو بەشـەی مـاڵ کـە ژن و منداڵی لێدادەنیشن ★ حەرەم // بیرونی.

□ « یارم لە ئەندەرون هات دەستی
ڕەقیب لە دەستا »
« غەمناك و شادمانم ڕەحمەت
عەزابی هێنا »
( سالم : گمـ ــ ٣٥ )

٢ــ ناوەوەی هـەمو شـتێك ، ★ داخڵ. :: لە ئەندەرونی ئەشکەوتەوە هاتـــە دەر // دەری ، دەرەوە . ٣ــ ناوزگ ، دەرون . □ « میرزا تەها ! میرزاتەها ئەگەر ئـەمە ئـەو ئاوەمان خواردباوە و ئـەو عەقڕەبە چوبا دە ئەندەرونمانەوە ئەندەرونی وەبـــەر نێشــــان دابـــاین تـــەکلیفی مـــە چ بـــو . »
( حوسێن ئاغای حـاجی خوشـی )

تێبـ ــ ئـەم ووشـەیە لـە دوکەرتی ( ئەندەر ) و ( رون ) پێکهاتوە بەشی دوەم ( رون ) لە پەهلەویدا بە مانای ( لا ، تەرەف ... ) وەکو پاشبەند بە کارهاتوە ، تم : ( فرە : پفا ــ ٣٨٩)، بەم پێیـە مانای ووشـەکە دەبێتە :

لای ناوەوە ، ژوورەوە .
**ئەندێش ــ** ١ــ ( نا . ) **تم ــ :** ئەندێشە . □ « هەر چەند دەکەم فکر و ئەندێش، تەوەلابوم لە قەوم و خوێش » ( فۆلکلۆر ) . ٢ــ ( رێ . فع . ) وەکو پاشبەندێك لە تەرکیبدا صفەتی فاعیلی دروست دەکا . :: دوورەندێش ( ئـەو کەسـەی قوڵ تێدەفکرێ ، وورد لێك دەداتەوە ). تێب ــ ئـەوەندی پێم شـك بێ لـە کوردیدا هەر ئەو تەرکیبە هەیە .
**ئەندێشە ــ**[پە : هەندێشیشن]، ( نا. ) ١ ــ بیـر ، خەیـالات . ٢ ــ ترس ، غایلە ، مەترسێ ، واهیمە . □ « ئای سلـەیمان‌بەگ عەدالـەت پێشـە »
« لە دێوی کێـوی قـاف بـێ ئەندێشە »
( پیرەمێرد ــ ٣٣٨ )
« فەرقـی ئینسـان و ، وولاغ ئەندێشەیە ، ئەندێشـەیە »
« بۆ نەمانی عەقڵ و ئیـدراك ، مەی ، دزێکی کـاریە »
( دلدار : گم ــ ٢٥ )
★ ئەندێش/١ تێب ــ هەر چەنـدە ئەم ووشـەیە لـە ئەدەبیـات و فۆلکلۆری کوردیدا بەکارهاتوە بەلام بە لای منەوە ووشەیێکی فارسیە .
**ئەنـزەڕوت ــ** [ ؟ ] ، ( نـا. ) مادەیێکـە وەکو جـەوێ ، ڕەنـگی سوور ، زەرد یا سپییە ، تامی تـاڵە لە دارێکی دڕکـاوی کە گـەلای وە گەلای مۆرد دەچێ دەگیـرێ . **تم :** (معین : فەرهەنگ ، ج ١ ــ ٣٧٨ ) و زیاتر لە هەتواناندا دە کاردەکرێ .
★ عەنزەڕوت ( معرّبە ) .
**ئەنعام ــ** [= عا : انعام] ، (نا.)، (کێر.) خەلات . ★ بەخشیش .
□ «کوتی : ئافەریم وەزیر ، ئەنعامی بدەن‌بە وەزیری » ( **تحفـە :** ج١ ــ ٢٤٥ ) :: ئەوەندە زیرەکە تا ئێستا چەند جار ئەنعامی وەرگرتوە .
**ئەنفلۆنزە ــ** [ ئیتالێ ] ، ( نـا. ) نەخۆشییەکە ، بە هۆی (ڤیرۆس)ی تایبەتێ توشـی ئینسـان دێـت و (تا)لە پیـاو دێنێ ، هەنـدێ جـار هەلامەتێشی دەگەلـە و خەڵك لـە یەکتـری دەگرنـەوە . تێب ــ ئـەم ووشـەیە کە لەم نێزیکانەدا ــ لام وایە لە ساڵەکانی ١٩٥٠دا ــ هاتوتە ناو زمانی کوردێ ، ئەسـڵی خۆی بـە مەعنای ( کارتێکردن ، تەئسـیر ، نفوز ) هاتوە و هێچ پێوەندێ دەگەڵ نەخوشێکە نیە ، کەچـی لە هـەموو دنیادا هەر ئەم ناوە لە سەر زارانە و ( گریپ )کـە نـاوی عیلمـێ ئـەم نەخۆشییە بە زمانی کەسدا نایەت.
**ئەنقەست ــ** [= عا : عن قصد]، (بنت.) ١ــ بە ئارەزوو ، بە هـەوەس بە تایبەتێ . □ « ... وەکـو بـە ئەنقەست بـۆ من وەسـتا بێـت چاوەڕوانێ ئـەوە بێت بزانـێ ئـەو کارەی من ئەنجامی بە چێ ئەگات » (قەفتان : چێڕۆك ــ ٣٣ ). ٢ ــ بە عەمدێ ( یەکێك کارێك بکا و بزانێ نابێ بێکـا و هـەر سوورێـش بـێ لەسەرکردنـی ) . :: دوو سەعـاتە لەوێ چەقیوە بە ئەنقەست نـاڕوا ★ ئانقەست .
**ئەنگافتن ــ** ( مصتـ. متـ.) ،

( کیـ.) تم : ئەنگاوتن .
**ئەنگافتە ــ** ( نمف.) ، (کیـ.) تم : ئەنگاوتە .
**ئەنگامە ــ** (نـا.) ، (مکـ.) ١ ــ زۆر و زەبەنـد ، کۆمەڵێکی زۆری خەڵك . □ « چـەند لەشـکرێکی ئەنگامەیـە ، بە قۆشـەن و بـە زەمزەمەیە » ( تحفە : ج١ ــ ٢٠٦ ). ٢ــ کار و کردەوە یا هەرا و هۆریای زۆر و سەرنج ڕاکێش (چ تاقە کەسێ بەرپای کا یا کۆمەڵە خەڵکێ ) . ★ هەنگامە ● تێبـ ــ من ئەم ووشـەیەم هەر بە ( هەنگامە) بیستوە .
**ئەنگاوتن ــ** ( مصتـ . متـ . ) ١ــ بـەرد ، تێـر ، گوللـە و . . . لـە نیشانەدان . :: فێشـەکی بە خەسار نەدەچۆ هەر دەستی لـە پەلەپێتکە بـەردەدا یەکێکـی دەنگـاوت ، ( دەئەنگاوت ) . ئەو هەمۆ بەردەت هاوێشـتێ نەتئەنگـاوت . هـەر دەیئەنگێوم بۆ کوێ دەچێ . ٢ ــ بە نەفەس و هێـزی ڕۆحی کەسـێك تۆشی نارەحەتێ و گیروگرفت کردن. :: لێمان بۆنە شێخڕەش و شێخمەند هەر لەوەی ئازان یەکتری بنگێـون ( بئەنگێون ) ، باسی ئەم شەخسـە مەکە زۆر تۆڕەیە تا ئێستـا چەنـد کەسی ئەنگاوتوە ٣ــ ( مجـ.)دیتـن ، بەدێکردن . □« برایم خۆ من بـە قسـەی شەیتانانم دەگەڵ نەکردێ ، لە رازی کانییـەم بۆ خـۆم بەچـاو ئەنگاوتی » ( تحفە : ج ١ ــ ٣٧٦ ).
★ ئەنگافتن ، پێکـان ( مـاددێ و مەعنەوێ ) ، هەنگـاوتن . ( بکـ.) هەنگافتن . تێبـ ــ مانـای تەرکیبـی ئـەم ووشـەیە دەبێتـە : لێكنیزیكکردنـەوە ، پێکەوەبەنـد کردن. تم : ئەنجامە. **خۆئەنگاوتن ــ** ( مصتـ. لا.) لە کاتی ڕۆیشتنـا بە پاژنەی کەوشی لاقێك لـە گوێزینگی قاچەکەی تر دان و برێندار کردنی.
**ڕائەنگـاوتن ــ** [ ڕا ( پیـبف.) + ئەنگـاوتن ] ، ( مصتـ. متـ.) درێژکردنەوەی : پەت ، تەنـاف ، گوریس ، تـەل و . . . لە نێـوان دۆ یا چەند کۆڵەکـەی چەقـاو یـا سینگی داکوتراو یا هەر شتێکی تری لەم بـابەتە . :: خێـرا تەنـافەکە ڕانگێوە ( ڕائەنگێـوە ) و جلەکـان هەڵخە ، هێشتا تەلی کارەبایان بۆ گەڕەکی ئێمە ڕانەنگاوتوە . تێبـ ــ بۆ تەلـی کارەبـا و تەلەفـۆن و . . . ڕاکێشـان ( کعر.) و کێشان ( کئێر.) دەکوترێ کە لە فارسێ و عەرەبیڕا تەرجـەمەکراوە ، بـە لای منـەوە ( ڕانگاوتن ) زۆر لـە گوێنتـرە تـا کێشـان یا ڕاکێشـان .
**ئەنگـاوتە ــ** ( نمفـ. صمفـ. : ئەنگاوتن ) ، ( مک.) شتێ یا کەسێ کە هۆیەکی غەیرە ماددێ پێکابێتێ . :: ڕەببی ڕۆڵە ئەنگـاوتەبێ . کچێ دایکم حەکیمێ چێ ئەوە ئەنگـاوتە بـوە خێری بۆ لە خۆ بگـرن . ★ ئەنگافتە. هس: ئەنگواو ،ئەنگێوراو.
**ئەنگاوتەبـوون ــ** ( مصتـ. لا.) ، ( مک.) کتوپڕ نەخۆشکەوتن ، تۆشی بەلایەك بۆن ( بێ ئـەوەی هـۆیەکی دیارێ هەبێ ) .
**ئەنگران ــ** [ ؟ ] ، ( مصـ. لا.) ،

( مکـ.) لە خۆبایی‌بوون ، لە پێستی خۆدەرچوون ، پڕ بوون . ئەم کابرایە هێند دەوڵەمەند بوە ئەنگڕاوە . هس : ــ أ ) ستـ : ئەنگرە ، بە مانای ئاڵۆز و ڕق ئەستوور و دوژمن لە ووشەی ئەنگرۆ مەئینیەڤەدا = ئەنگرەمێنو = ئەهرێمەن . ب) ستـ : ئەنەغرە . پهـ : ئەنەغران بە مانای: پان و بەرین ، بەرفرەوان ، سەروبن نەدیار . تم : معێن ( فەرهەنگ : ج ۱ ــ ۳۹٦ ، فرە : پفا ــ ۱۸ ) .

**ئەنگوان ــ** ( مصد. لا.) ، ( مکـ.) بەرد ، تیر ، گوللە و . . . وێ‌کەوتن ، پێکران بە شتێکی ماددی . :: لە شەڕەکەی دوێنێ تەنیا دوو کەس ئەنگوان . تێبـ ــ ئەم مەصدەرە لەوانەیە کە فاعیلی دیارنیە .

**ئەنگواو ــ** ( نمف : ئەنگوان ) ، ( مکـ.) تم : ئەنگێوراو .

**ئەنگوتك ــ** [ ؟ ] ، ( نا.) ، (مکـ.) بەشی نانێك هەویر کە جیاکرابێتەوە و تۆپەڵ کرابێ بۆ ئەوەی پان‌کرێتەوە و بکرێ بە نان . ★ ( بکـ.)پەپك ، پەپکە . گونك ، گونتك .

**ئەنگوتك‌گرتن ــ** (مصت. متـ.) ، ( مکـ.) بەش‌بەش‌کردنی هەویر ، هەر بەشەی بۆ نانێ ، کولێرە و . . . یەك و ئامادەکردنێ بۆ پان‌کردنەوە و کردنی بە نان . :: خێرا ئەنگوتکەکان بگرە تا تەندوورەکە دادەمرکێتەوە ، ئەوە ئەنگوتکت نەگرتوە .

**ئەنگوچك ــ** [ ؟ ] ، (نتـ.) ، (مکـ.) پارچەقوماشێکی سێ‌سووچی درێژۆکەیە ، بە قۆڵی کراسی پیاوانە و ژنانەی کوردییەوە دادەدروێ ، بۆ پێچانی سەردەست بەکاردێت . ★ ئەنگوچکەسۆرانێ ، فەقێیانە ، قۆچکە ، قۆچکەسۆرانێ ، لەوەندێ . تێبـ ــ زەمانی قەدیم کە شەڕی تەن‌بەتەن باو بوە پیاوانی زۆر ئازا ئەنگوچکی کراسەکانیان ( چ بە سواری چ بە پیادەیی ) تێك‌گرێداوە و بەر بوونە گیانی یەکتر ، ئەمە نیشانەی ئەوە بوە کە تایەکیان نەکوژرێ دەست لێك هەڵنەگرن . هس : ئەنجامە .

**ئەنگوچکەسۆرانی ــ** [ ئەنگوچك + ۳ ــ ئە/۱ + سۆرانێ ] ، ( نتـ.) تم : ئەنگوچك .

**ئەنگوس ــ** ( نا.) ، ( سنـ.) تم : ئەنگوست .

**ئەنگوست ــ** [ پهـ : ئەنگوست ] ، ( نا.) ، ( مکـ.) ۱ــ هەریەك لەو پێنج ئەندامەی کە بە ئاخری دەست و قاچی ئینسانەوە بەندن . □«ئەنگوستی داکی خوازێم بە ڕێشە ئەنگوستی هەروەك درێشە » ( بەردەشانێ : ووردێ ــ ۳۸ ) ۲ ــ واحیدێکە بۆ دیاریکردنی ئەستوورایی و پانایی شت. :: بە قەد ئەنگوستی گەورە ئەستوور بوو ، با دوو ئەنگوست پانتر بێ . ★ ئەموست ، ئەنگوس، پەنجە ، قامك، ( بکـ. ) تلی ، تبل ، ( جنو. جفـ.) کلك .

**ئەنگوستەچاو ــ** (صتـ.) ، (کنـ.) زۆر تارێك . □ « . . . نەدەچوە تیلەکۆ بە شەوی ئەنگوستەچاو سینگی خۆی بەگوللەوە نێت و

تاووس بۆ من بدزێ » ( قزلجی : پێکەنین ــ ٥٢ ) . ★ ئەموستەچاو.

**ئەنگوستەویلە ــ** [ ئەنگوست + ٣ـ ئە/٢ + ویلە ( ئیلە ) ] ، ( نت.) تم : ئەنگوستیلە .

**ئەنگوستیلە ــ** [ ئەنگوست + ئیلە ] ، ( نت. ) ئالقەیێکی مەعدەنیە ( زیاتر : زێر یا زیو ) نەقیمێکی بەردی بە نرخ ( یاقوت ، پیرۆزە ، ئەلماس ... ) یا هەر بەردێکی دیکەی تێ دەگرن و بۆ جوانی دەکرێتە پەنجەوە .

□ « تا بینە هەوالی دیدەمەستان »
« ئەنگوستیلە دەرخران لە دەستان »
( هەژار : مەم وزین ــ ٢٩ )

★ ئەموستیلە ، ئەنگوستەویلە ، کلکەوانە . **ئەنگوستیلەی دروومان** (نت.) ، (مک.) پارچە مەعدەنێکە لە شێوەی کلاوی بەرزو ، بەلام قولترە دیوی دەرەوەی کونج کونجە ، لە کاتی درومانا دەیکەنە سەری قامکەوە و پالی پێ بە دەرزییەوە دەنێن ، نایەلێ قامکیان دەرزی تێ رابچێ . ★ قوچەکە .

**ئەنگۆ ــ** [ ٢ـ ئە/٤ + هنگ + ئۆ ( ئە.) ] ، (ز.) ، (مک.) زەمیری نەلکاوە بۆ دوەم کەسی جەمع (ئەوانەی قسەیان دەگەل دەکرێ ).

□« ئەنگۆ چی فکر دەکەن ؟ ئەگەر کەسێك صەد مەڕی هەبێ و یەکێك لەوان وون ببێ ئەرێ ئەو نەوەت و نۆی دە کێواندا بەجێ نایەلی ... » ( ئینجیل : مەتی ــ ٥٠ ) . ★ ئێوە، هەنگۆ . (بک.) هنگ ، هون ، ڤە ،

هەوە . هس : ئەنجومەن .

**ئەنگۆرە ــ** [ ؟ ] ، (بنت.) ، (مک.) ١ـ ئەو کاتە ، ئەو دەمە ، ئەوسا پاشان ، دوای ئەو دەمە ، بەو پێیە.

□ «مەسلەحەت ناکرێ بە زۆرە ، ئێوارە دابێ ، ئەنگۆرە تێی دەبێنێ مەسلەحەتێ . » ( تحفە : ج ٢ ــ ٣١٤ ) تێب ــ ژابا ئەم ووشەیەی بردۆتەوە سەر ( ئۆناگوێرە )ی ترکی تم ( ل ــ ٢٣ ) بەلام کوردویێف ( ئەنگۆرێ ) هەر بەو مەعنایانەی کە ژابا نوسیویێتی وەك ووشەیێکی کوردێ پێشان دەدا . تم : ( کف. ــ ٤٧ ) .

**ئەنگوتن ــ** ( مص. لا.) ١ ــ سەردەرهێنان ، لە ئاسۆ دەرکەوتن :: گەلاوێژێش ئەنگوت کەچێ هێشتا گەرمایە . نەخێر هێشتا نەنگوتوە ( نەئەنگوتوە ) ، سێ رۆژی دیکەی ماوە بنگوێ ( بئەنگوێ ) . ٢ـ دەستپێکردن ، هەلکردن ( با ) .

□ « وا زولفی لەسەر گەردنی لاچوو بە هەناسەم »
« شەو فەجری بەیان بوو کە نەسیمی سەحەر ئەنگوت »
( وەفایی : گم ــ ٢٦ )
« هەناسەم زولفەکەی لادا و و مەیلێکی نەکرد چاوێ »
« نەسیم ئەنگوت و شەو رابرد و نێرگس هەر لە خەودایە »
( نالی : گم ــ ٦٩ )

تێب ــ ئەم مەصدەرە هەر بۆ ئەم دوو حالەتە بیستراوە بەکارهێنرابێ ، نەگوتراوە ( کو ) ــ ئەویش هەر ئەستێرەیە ــ ئەنگوت ، هەروەها

نەبیسراوە بڵێن ( شەماڵ ئەنگوت .

**تێك‌هەڵەنگوتن** ـ [ تێك ( دە + یەك ) + هەڵەنگوتن ] ، (مصتە. لا.)، ( مکە.) تۆشی یەکتر هاتنی دوو یا چەند کەس و دەستە و لەشکر .

**تێ‌هەڵەنگوتن** ـ [ تێ ( دە + ی ) + هەڵەنگوتن ] ، ( مصتە. لا.) ، (مکە.) ١ـ تۆشی کەسێك بۆن :: لەسەری کۆچەی خۆیان دە بارام هەڵەنگوتم . ٢ـ دەشتێك هەڵەنگوتن ( تمـ : هەڵە نگوتن ) :: لاقی دە بەردێك هەڵەنگوت هەر چابۆ ملی نەشکا ، ئەوە دەچی هەڵەنگوتوی ؟ ، دارێك لەوێ بۆ تێی‌هەڵەنگوتم .

**هەڵەنگوتن** ـ [ هەڵ ( پێبف. ) + ئەنگوتن ] ، ( مصتە. لا.) لە ڕێ ڕۆیشتنا تۆشی بەرد یا هەر جۆرە کۆسپێکی تر بۆن ، کە پێش بە خێرایی لاق بگرێ و لای ژۆرەوەی لەش هەر لەسەر خێرایی خۆی بمێنێتەوە و بەو بۆنەیەوە سەرەنگرێ بۆن . :: چاوتان لەبەر پێی خۆتان بێ با هەڵنەنگوون ( نەئەنگوون ) ، وەیسە دوێنێ زۆر خراپ هەڵەنگوت ، یاخوا ئەو جارە هەڵبنگوێ و لە ئەژنۆ بەرەژێری وورد و خاش بێ . ٢ـ ( مجـ.) ، أ) تۆشی بەلا بۆن ، خراپە بەسەرهاتن، گیروگرفت بۆ پەیدابۆن . ب) لە کاراندا بە سەهو چۆن ، لە قسەدا بەسەرچۆن .

**ئەنگێز** ـ ( ر.ی. فعە.) ، ( فر.) دەگەڵ هەندێ ووشەی کوردی تەرکیب دەبێ و حالەتی فاعیلی دەداتێ . :: شەڕئەنگێز ، فیتنەئەنگێز ، تێب ـ ئەو ناوە فاعیلانەی بەم ووشەیە دروست دەبن لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا کەم نین بەڵام ئەوی ڕاست بێ هەروەك مەصدەرەکە ( ئەنگێزیدن ـ ئەنگیختن) فارسییە ئەم تەرکیبانەش هەر فارسین .

**ئەنگیزە** ـ ( نا.) هەر شتێکی کە سێك هان بدا بۆ کردنی کارێك. باعث ، دافع ( عا. ) . هس : نەقیزە .

**ئەنگێو** ـ ( ر.ی. فعە.) ١ـ شکڵی ( مضارع )ی ڕیشەی مەصدەری ئەنگاوتنە . :: دەیئەنگێوێ ، چۆنی دەنگێوی . ٢ـ بە دوای هەندێ ناوەوە دەنۆسێ و دەیانکا بە تەرکیبێکی صفەتی فاعیلی . :: ماری شینی گائەنگێو ، خۆ ئەنگێو .

**ئەنگێوران** ـ ( مصە. لا.) تم : ئەنگوان .

**ئەنگێوراو** ـ ( نمف. صمف. : ئەنگێوران ) ، (مکە.) نەسێکی بە شتێکی ماددی ( بەرد ، گوللە . . . ) پێکرابێ و ( فاعیل )ەکەش مەجهول بێ . ★ ئەنگواو .

**ئەنگێوە** ـ [ئەنگێو + ٢ـ ئە/٦]، ( نفا. صفا : ئەنگاوتن ) ، دەستڕاست ، کەسێکی چاك لە نیشانە بدا ، ئەوەی فیشەکی بە خەسار ناڕوا :: ئەنگێوەی وەك ( سمکۆ )ی هەرنابێتەوە ، لە مەحمودکانی جاندارێك هەر بە عاستەم سەری بە دەرەوە بۆ ، لە دەستی دەرنەچۆ .

**ئەنوا** ـ [ ؟ ] ، ( نا.) ، ( مکە.)

١ـ پەنا ، جێگەیێکی پیاو خۆی تێدا بشارێتەوە ، شوێنی حەوانەوە .
٢ـ (مجـ.) مایەی بەڕێ چوون و گوزەران . □ « ... هونەرمەندە گەورەکان لانەواز و بێ ئەنوا مانەوە ... » ( هێمن ) سەرەتای ( تحفە : ج ١ ـ ١٢ ) .

**١ـ ئەو ـ** [ پھ : ئەڤێ ، ئۆئی ]، (ز.) زەمیری سێیەم کەسی مفرەدە (غایب) □ « ... کە ئەو دەستی پێکرد کە حیساب بکا یەکێك بۆ کن ئەوێ هێندرا ...» ( ئینجیل : مەتێ ـ ٥١). ٢ـ زەمیری ئیشارەیە بۆ ( مشارالیە ) دوور .
□ « ئەوڕۆژە کە تورام و لە
کەرکوك سەفەرم کرد »
« مانەندی عەقاریب لە ئەقاریب
حەزەرم کرد »
( ڕەزا )
٣ـ (مک.) تم : ئەم. ★ (بک.) ئەڤ. (مک.) هوو .

**٢ـ ئەو ـ** (نا.) ناوی ئیشارەیە بۆ ( مشار الیە )ی مفرەدی دوور :: ئەو پیاوە لەبن دارەکە نوستوە ، ئەو ئەسپەتان لە کێ کڕیوە ؟ □ « ... ئاقڵ لە مێشکتدا نەماوە ، بە دیار ئەو پیرێژنە ڕەعیەتەوە ئەم قسانە دەکەی ... » ( قزلجی : پێکەنین ـ ٣٧ ) . تێب ـ کاتێ ( ئەو ) بە ناوی ئیشارە حیساب دەکرێ کە ناوێکی ( مشار الیە ) بەدوودا بیت ، ئەگەر وانەبوو (زەمیر)ە

**٣ـ ( ئەو ـ ) ـ** ( پیب . ) تم : ٢ـ ( ئاو ـ ) .

**ئەوا ـ** [ ئەوە + ئا ] ، ( شر. ) تم : ئەوەتا. □ «.. کەوشە کانێشم ئەوا بە حاڵ بە پێمەوە گیر دەبن..» (قزلجی : پێکەنین ـ ٣٦ ) . « ئەوا تۆ دەڕۆی بە نازەزای دڵ ، خودات دەگەڵ بێ مەنزڵ بە مەنزڵ » (فۆلکلۆر) .

**١ـ ( ـ ئەوار ) ـ** (پبت.) تم : ئەوەر . :: جۆقەوار ، خوێندەوار، هومێدەوار .

**٢ـ ( ـ ئەوار ) ـ** [ ٣ـ ئە/٢ + وار ( ئم : وێچوون ) ] ، (پبت.) بە دوای ناوەوە دەلکێ و دەیکا بە ناوێکی تازە و مانای (وەکو ، وێنەی ، چەشنی ) لێزیاد دەکا . :: دەستەوار . کۆلەوار .

**٣ـ ئەوار ـ** (نا.) تم : هەوار . تێب ـ ئەم ووشەیە وەك پاشبەند لە چەند ووشەیێکی کوردیدا دەبێندرێ. :: لێڕەوار ، شوێنەوار. (لێڕهەوار ، شوێن هەوار ) .

**( ـ ئەواری ) ـ** [ ٢ـ ئەوار + ٢ـ ئێ] ، (پبت.) ١ـ بەدوای ڕێشەی مەصدەرەوە دەنوسێ و دەیکا بە حاصلمەصدەر :: خوێندەوارێ .
٢ـ بەدوای ناو یا صفەتەوە دەلکێ و دەیکا بە ناویمەصدەر :: کۆلەوارێ، کوردەوارێ ، کوێرەوارێ ( کوێرەوەرێ ) .

**١ـ ئەوان ـ** [ ١ـ ئەو/١ + ٢ـ ئان/١] ، (ز.) زەمیری نەلکاوی سێیەم کەسی جەمعە ( ئەو کەسانەی باسیان دەکرێ) و تەنیا بۆ ئادەمیزادە . □ « ... کە ئەوان دە ڕێیەدا دەچوون کەسێك

بەوێ گوت : هەر جێیەکی بچی وەدوای تۆ دەکەووم . » (ئینجیل : لۆقا ـ ٣٩ ) . تێب ـ ئەم وشەیە وەکو جەمعی (١ـ ئەو/٢)ش بۆ غەیری ئادەمیزاد ، تەنیا وەکو ناوی ئیشارە ، ئەوێش لە هەندێ شوێنی کوردستان بەکار دێت . :: ئەوان کتێبانەم بۆ بێنە ، ئەوان ئەسپانە وەبەستە .

**٢ـ ( ـ ئەوان ) ـ** [ ٣ـ ئە/٢ + وان ] ، ( پبت . ) بە دوای ناوانەوە دەلکێ و دەیانکاتە ناوێکی تازە یا صفەت کە مانای پارێزگاری و ڕاگرتن لە ناوەکەی پێشو زیاد دەکەن . :: باغەوان ، بەرخەوان ، توتنەوان ، دەرکەوان ، ڕۆژوەوان ، دەشتەوان،

**ئەوانە ـ** [ ١ـ ئەوان + ٢ـ ئە/٢ ] ، (ز.) زەمیری ئیشارەیە بۆ جەمع:: ئەوانە کێ بون لە ماڵی ئێوە، ئەوانە بۆ کوێ دەبەی .

**ئەوتۆ ـ** [٢ـ ئەو + تۆ (طور) ]، [ کو. عا. ] ، (بنت.) ١ـ جۆرێك ، چەشنێکیوا ، شێوەیێك . ٢ـ (مجـ.) ، (صتـ.) شایانی باس . □ « ... وەکو هەوری بەهار بە گوڕ ئەهاتن بە خێرایێ تێ ئەپەڕین و یادێکی ئەوتۆی پاش خۆیان بەجێ نەئەهێشت . » ( قەفتان : چیرۆك ـ ٤ ) . ★ وەتۆ .

**ئەوج ـ** (نا.) ١ـ بەرزێ ، بڵیندێ . ٢ـ بەرزترین شوێنی جێگا یا شتێك ، باڵاترین پایە .

□ « لە عەرسەی ئەوجی عەشقت
بازی دڵ هەڵسا لە دەورانا »
« بە بەرقی پەرتەوی حوسنت
پەڕێ سوتا لە طەیرانا »
( سالم : گم ـ ٣٥ )

«سیابازێك بۆم سیابازێك بۆم»
« لە ئەوجی گەردون تێژ
پەڕوازێك بۆم »
( پیرەمێرد ـ ٢٣١ )

تێب ـ ئەم وشەیە لەسانسکرێتیدا ( ئوچچە )یە تم : ( معین : فەرهەنگ، جا ـ ٣٩٩ ) و لە پەهلەوێدا بۆتە (ئۆج)و ئەوجار عەرەبێ وەری گرتوە و کردویەتە ( ئەوج ) و سەرلەنوێ هاتۆتەوە ناو کوردێ و فارسێ . هس : (تو.) ئوجا .

**ئەوجا ـ** [ ١ ـ ئەو/٢ + جا (جار) ] ، (بنت.) ، (کیـ.) ١ـ کەوابو، کەوابێ ، لەو حاڵەتەدا ، لەحاڵێکی وادا . ٢ـ پاشان ، لەپاشان . □ « ... دەوجا ( دەئەوجا ) یا دەبێ ڕەخنەنەگرێ و بە تەواوێ خامۆش بێ ... » ( مەسعود : حاجێ ، ب١ ـ ٧ ) ★ ئەوجار ، ئەو جارەکە ، ئیمجا ، ئیمجار .

**ئەوجار ـ** ( بنت ) تم : ئەوجا . :: ئەوجار نۆرەی ئەو بەزم و ڕەزمەیە .

**ئەوجارەکە ـ** ( بنت . ) تم : ئەوجا .

**ئەوجاڕ ـ** [ ؟ ] ، ( نتـ. ) ، ( سەردەشت ) نیسبەت و پێوەندێ دو ژنان دەگەڵ یەکتری ، کە شویان بە دوبرایان کردبێ . ★ هەوگیان هێوەرژن . تێب ـ من بۆ ئەوە دەچم کە ( جاڕ ) عەرەبێ بێ کە بە مانای هاوسێیە .

**ئەوڕاق ـ** [ = عا : اوراق

(ورق) ] ، (نـا.) ١ـ گـەڵای دار و درەختان .

□ « مەیلێ بکە بە سەوزە درەختانی مەدرەسە »
« ئەوڕاقیان مقدمـەیێ شـتینە یانەسوور »
( نالێ : مقبل ـ ١٧ )

٢ـ کاغەزی نوسین ، کاغەزەکان . ٣ـ کومـەڵێ کاغەز کـە دەربارەی کەسێ شتێ یـا کار و مەسەلەیەك نوسرابن . :: ئەوڕاقەکانیان ناردوە بـۆ بـەغدا هێشـتا نەهاتوتەوە . باشچاوەش ئەوڕاقەکانی ئەم کابرایە بێنە . **ئەوڕاقی ئیعتیماد** ـ ( نتـ . ) تە : ئیعتیبارنامە .

**ئەوڕوپا** ـ (نا.) ، (کعر.) تە : ئورۆپا .

**ئەوزاع** ـ [ = عـا : اوضـاع (وضع) ] ، (نـا.) ١ـ چلونایەتێ ، حاڵ و ئەحواڵ ٢ـ (مجـ.) چلونایەتێ ژیان و دارایەتێ کەسێك . :: لـە سایەی خواوە ئەوزاعی باشە .

**ئەوسا** ـ [ ١ـ ئەو/٢ + سـا (؟) ] ، (بنتـ.) ١ـ ئەو کاتە ، ئـەو دەمە . □ « ... ئەوڕەحمان تـۆ ئەوسـا گوتت ماسـتم هێنـاوە بێفرۆشم ...» (قزلجێ : پێکەنین ـ ١٢٠ ) ، ٢ـ پاش ئەوە ، پاشـان ، پاش حاڵێ کە لـە پێشـدا باسـی لێکرابێ . □ « ... منالەش ئەیدا زریکە و ژێر نەئەبۆوە هـەتا دایکە ئەیگرتـە بـاوەش ، ئەوسـا خێرا فرمێسکی ووشك ئەبو . » (قەفتان : چێرۆك ـ ٣ ) .

**ئەوشار** ـ (نمصـ.) ڕێك گوشین .

تێبـ ـ ئەم ووشـەیە دەگەڵ مەصدەری ( ووشـتین ، کوشـتین ، گوشـتین ) ڕێشـەیان یەکە ، وەك ووشـەیێکی سەربە خۆ لە کوردێ ئێستادا دەکار نـاکرێ لـە تـەرکیبی : تـەڵای دەسـتەوشار ، گوزەوشـاردا دەبیندرێ . رەنگە لەباتێ (ضغط)ی عەرەبێ خراپ نەبێ .

**ئەوشۆ** ـ [ ١ـ ئەو/٣ + شۆ (شەو) ] ، (مکـ.) تە : ئیمشەو .

**ئەوصاف** ـ [ = عا : اوصاف ( وصف ) ] ، (نا.) چلونایەتێ شتێ ، ئەو نیشانانەی شتێك یا کەسێکیان پێ دەناسرێتەوە. :: توزێ ئەوصافی باس بکە ، بەو ئەوصـافانەی تـۆ دەڵەی هەردەبێ (سەعە) بێ .

**ئەوقاف** ـ [ = عـا : اوقـاف ( وقف ) ] ، (نا.) ١ـ هەمو مڵك و زەوێ و زار و شتێ تر کە بـە پێی ڕێ و شـوێنی ئیسلامەتێ بـۆ مزگەوت و تەکیە و خانەقایان یا بۆ خێر و خێراتیتر تەرخان کرابێ . :: مزگەوتی سـور ، لە دەوری بۆکان ئەوقافێکی زۆری هەبـو ، ئەوقافی غەوس دە حیساب نایە. ★مەوقوفە وەقف . ٢ـ دایەرەیێکی دەوڵەتییە لە ووڵاتانی موسوڵمان بە ئێـش و کاری مەوقوفە ڕادەگا .

□ « وەزیری ئەوقاف شێخ ئەحمەد داوود »
« چاخانەی داخست ، چایەچێ نابود »
( پیرەمێرد ـ ٢٧٠ )

**ئەوقە** ـ (نتـ.) ، ( سنـ. ) تە : ئاوقە .

**ئەوك ــ** ( نـا . ) ، ( مك . ) ١ــ شوێنێکە لە نێـوان دەم و گەرووی ئادەمیزاد ، زارکی گەرو . :: پاروی دە ئەوکی گیرا ، درۆی ماسـی دە ئەوکی مابو . ٢ــ (مج.) بەرانبەری ئەو شوێنە ( ئەوك/١ ) ، بـەڵام لە دێوی دەرەوە کـە دەکەوێتە نێوان قوڕقوڕوچـکە و ژێرچـەنە . :: دەستی دە ئەوکی نابو هێندەی نەمابو بێخنکێنێ . تێب ــ لای پێشـەوەی ئـەوك زمانەچکۆلەیە و ئـەو لاولای ( ئالۆ )ن ، لای سەرەوەشی دەگاتە دوایی کونە لوتان و لولەی هەناسە ( قصبة الرئة ) و ئـەو لولەی کـە خواردنی پێـدا دەچێتـە وورگەوە دەکەونە لای خوارەوەی .

**ئەولاد ــ** | = عا : أولاد (ولد) | ، (نا.) ١ــ رۆڵە،منداڵ. ٢ــ نیسبەتی منداڵ دەگەڵ دایك و بابی خـۆی
☐ « دێم ڕژا خـوێنی ئەولادەکەی
خۆم »
« بەسەرما ،ووتی جگەرگۆشەی
تۆم »
( سەلام ــ ١١٨ )
« لە پاش ئەو، ئەرشەدی ئەولاد
شێخ ئەحمەد لە جێی دانیشت »
« بعەینـە وەك سـلەیمان
جێنشـینی حەزرەتی داوود »
( ڕەزا ــ ١٥ )
★ عەولاد .

**ئەولیا ــ** |= عا : أولياء (ولي) |، (نا.) ١ــ پیاوچاك ، پیاوی خـوا ، شێخیدین ، شێخی بەرماڵ .
☐ « ئەی لـە شەوقی جـەنەتی
ڕۆت ، ئەولیا و ئەنبیا »

« ڕۆح لەسەر لێون وەکو پەروانە
بۆ دیداری شەم »
( وەفایی : گم ــ ١٥ )
٢ــ (مج.) هەمو پیاوێکی ڕەووشت چاکی بێ ئازار . :: جێی لێ نـەبێ هەر دەڵەی ئەولیایە .

**ئەونە ــ** ( بنت . ) ، ( سن . ) تم : ئەمەندە .

**١ــ ئەوە** [١ــ ئەو + ٢ــ ئە/٢]، (ز.) ١ــ زەمیری ئیشـارەی دیارە (معرفة) بۆ مفرەدی گیاندار و چتی دوری غایب . :: ئەوەکێ بۆ تەقەی کرد ، ☐ « ... ئەوەشم پێسەیر بۆ !! چونکی ڕێبوارێش بەم جۆرە شەوانە... » (مەم : چێرۆکەکانی ــ ٨٧ ) « ... من عـادەت و مادەت نازانم هەر ئەوەیە پێم گوتی ... » (قزلجی: پێکەنین ــ ٣١). ٢ــ (مك.) تم : ١ــ ئەمە .

**٢ــ ( ــ ئەوە ) ــ** (پبف .) ١ــ بە دوایی هەنـدێ مەصـدەرانەوە دەنوسـێ و مەصـدەرێکی تـازە دروستدەکا ،کە پێچەوانەی کارێکی پێشو، یا دوپاتەکردنی کارێك پێشان دەدا . :: گەڕانـەوە ( پێچەوانەی ڕۆیشتن) ،ناردنەوە (هاتن و هێنانی لە پێشدابوە ) ، نوسینەوە (نوسین لەبەر شـتێکی نـوسراو ) ٢ ــ بـە دوای هەنـدێ مەصـدەرانـەوە دەبێنـدرێ ، وەکـو بەشـێکی مەصـدەرەکە وایـە و ئـەگەر لێی بکرێتەوە یا مەعنای دەگۆرێ یا هەر هێچ مەعنایەك نادات . :: پاڕانەوە، لاڵانەوە ، شەکانەوە ، خواردنەوە ، چەماندنەوە ، شـکاندنەوە . تێب ــ

أ) ئـەم پاشـبەندە لـە لەهجـەی باکوریێ و بن‌لەهجەی ( مەنگوڕێ )دا بە شکڵی ( ڤە ، وە ) لـە پێشەوەی فیعل دێت . :: ڤەخۆ ، وەگەڕێ ، وەی‌بەستە ، وەی خوێنـە . ب) من وای دەبینم کە ئـەم پاشبەندە لـە ( ئەپاچ )ی پەهلـەویێ بـە مانای : دیسان ، دوبارە ، پاش ، کەوتوتەوە کە لە فارسی‌دا بوتە ( باز ) .

**٣ــ ئـەوە ــ** ( ئمـ. ) کـەرتی تەواوکەری ئامرازە . ١ــ دەگـەڵ ( بە ، دە ، لە ) بەکاردێت و نـاوی مەبەست دەکەوێتە نێوانی هـەردوێ کەرتی ( بە ... ئەوە ) ئـامرازەکە □ « مەمکت سێوە بە دارەوە ، خودا داویە مەیشارەوە . » ، «ڕاوەستاوە بە پێوە ، پاڵێ داوە بـە جێـوە » ، « ڕێوی خوی دە کونێـوە نەدەچـو قانگەلاشکێ وەدو خوی دەدا» ، «لەو روژەوە ڕویشتوە توراوە داڵی من» .

٢ــ دەگەڵ (پێ، تێ، لێ) بەکاردێت . أ ) ئەگەر مەفعوڵ دیار بێ، دەکەوێتە پێشەوە هەردو کەرتی ئامرازەکـە تێك‌دەبنەوە و شکڵی ( پێوە ، تێوە، لێوە ) وەردەگرن . :: کونی دەرزێکە پچوکە دەزوی پێوە ناچێ ، لە لادێ کە سەمەنێ دەکـەن هـەر مـاڵەی چەنگە ئاردی خوی تێوەدەدا ، کوا هەرچی تەماشا دەکەم هێچم لێـوە دیار نیە . ب ) ئەگەر مەفعوڵ دیار نەبێ زەمیرێکی شەخسێ دەچێتـە نێوان دو کەرتـی ئـامرازەکە . :: پێیەوە دیـار نیە ، تێمەوە ڕامـا و قسـەی نەکرد ، لێتـانەوە دورە . تێبـ ــ أ ) لە بن لەهجەی سلەیمانیدا هەندێ جار [ ١ــ ( ــ ئانێ ) ]شـی وەك تەواوکەرێکـی دوەم بـە دوادا دێت . :: لە مـاڵەوانێ بوم ، بـە دەستەوانێیـە بچێـن . ب ) بـە پێویستی دەزانم کە ڕونی‌کەمەوە : پێ ، تێ ، لێ یەك بـە دوای یەکـا تەرکیبێکن لە ( بـە +ی ) و ( دە + ی) و ( لە + ی ) کە (ی) زەمیـری سێ‌یەم کەسی مفرەدە .

**ئەوەتا ــ** [ ١ــ ئـەوە + تـا ]، ( شر. ) تمـ : ئەمەتـا . □ « ... ئەوەتا گێژێکی گەورە دە بەحرێـدا بو وەهـا کە گەمێ لـە شـەپولان دادەپوشرا ...» ( ئینجیل : مەتێ ــ ٢٠ ) . « ... ئـاخری مـانگێ ئەفەنـدێ گوتی : کـوا دەفتـەری ماڵەوە ؟ ــ ئەوەتا . » ( قزلجـێ : پێکەنێن ــ ٢٦ ) . ★ ئەوەتـانێ ، ئەوەسا ، ئەوەسە .

**ئەوەتـانێ ــ** [ ئـەوەتا + ١ ــ ئانێ ] ، ( شر. ) تم : ئەوەتا .

**ئەوەتەی ــ** [ئەوەتە + ی (ز.)]، ( شر. ) لەو کاتەوە کە ... ( رستەی دوایێ کـاتەکە دیـاری دەکـا ) :: ئەوەتەی لە بەندێخانە هـاتوتە دەر کەم دوێ بوە . ئەوەتەی هەیە وای بە خویەوە نەدیوە . تێبـ ــ أ ) گەلێ جاران (لە)ی لە پێشـەوە دێ . ب) لە زمـانی ئـاویستایێ‌دا ( ئەڤـەتە ، ئەڤەتهە ) بە مانـای : ( ئەوەنـدە ، هێندەزور و ئاوا ، ئەوجورە ، بـەو چەشنەی ) هاتوە . تم : (ئەوڕەنگ: بەهرام ــ ١٨٧ ) . هەروەها (یەوەت) مانای ( تـاوەختێکی ، هەرچەنـد ) دەدا . تم : ( پد : یگد ، ج٢ ــ ٢١٧)

★ ئەوەتێ ، لەوەتەی ، لەوەتــێ ، لەوەتا .
**ئەوەتێ ــ** (شر.) تە : ئەوەتەی.
**ئەوەجە ــ** [= عـا : حــوج ] ، (نـا.) ، (ســنـ.) پێویســـتێ ، پێداویستێ ، ئیحتیاج ، حەوجێ .
**( ــ ئەوەر ) ــ** ( پـ.) بە دوای ناوانەوە دەلکێ و دەیانکا بە ناوێکی تازە یا صفەت و مانای ( خاوەن )یان لێزیادەدەکا. :: بەختەوەر (بەخت)، پەلەوەر ( پەل ، پەڕ ) ، جـانەوەر (جان) ، چەنەوەر (چەنە) ، دەمەوەر ( دەم ) .
**ئەوەسا ــ** [ ١ــ ئەوە + سا ]، (شر.) تە : ئەوەتا .
**ئەوەسە ــ** [ ١ــ ئەوە + ســە (سا) ] ، (شر.) تە : ئەوەتا .
**ئەوەکە ــ** [١ــ ئەو + ١ــ ئەکە]، (ز.) زەمیری ئیشارەیە بۆ شتێکی وا کە ئەوانەی بـاسی دەکەن لە نێــو خۆیاندا دەزانن چیــە یا پێشــوتر ناویان هێناوە . :: ئەوەکــەی تــۆ هێنابوت زۆر خراپ بۆ ، ( جمـ. ) ئەوەکان .
**ئەوەڵ ــ** [= عا : اوّل ] ، (نا.) ١ــ سەرەتای هەمــۆ شــتێك . :: ئەوەلی پایێز ، هێشتا ئەوەلی کارە. □ ئەوەڵ شام و ئاخر شام » . ٢ــ یەکەم ، لە پێش هەمۆ شتێکــدا . :: ئەوەڵ جار نیە کە جوامێر شتی وا دەکا ، جـاری ئەوەلێ پێم گوتــی وازی لێبێنە . هەر ئەوەلێ نەدەبۆ دۆستایەتێ بکــەی . ★ هــەوەڵ (بکـ.) عەوەل .
**١ــ ئەوەند ــ** (بنتـ.) تە : ١ ــ ئەوەندە .
**٢ــ ئەوەند ــ** (نتـ. بنتـ.) ، (مکـ.) تە : ٢ــ ئەوەندە .
**ئەوەندۆسکە ــ** [ ١ــ ئەوەند + ئۆســکە ] ( بنتــ.) ، (مکــ.) تمــ : ئەمەندۆچکە .
**ئەوەندۆکە ــ** [ ١ــ ئەوەنــد + ئۆکـــــە ] (بنتــ.) ، (مکــ.) تمــ : ئەمەندۆکە .
**١ــ ئەوەندە ــ** [ ١ــ ئەو/٣ + هەند + ٢ ــ ئە/٢ ] ، (بنتـ.) ، (مکـ. سیمـ.) تە : ئەمەنــدە . □ « ... دەسا من ئەوەندە لە واقیع بێزارم وەختە ســوێم بێتــەوە بۆ خەوێکی خۆش ...» ( بلــە : ژان ــ ٩٧ ) ، «... حەز لە کچێك دەکــەم بەلاّم ئەوەندەی دەکەم و دەکرێنم جوابم ناداتەوە ... » ( قزلجێ : پێکەنێن ــ ١٠٧ ) ● **ئەوەندەی بلّەی یەك و دۆ** (کنـ.) خێرایێ زۆر . **ئەوەندەی مســت لە چــاواندەی ــ** ( کنــ.) خێرایێ ، توندوتۆلێ .
**٢ــ ئەوەندە ــ** [ ١ــ ئەو/٣ + هەندە ( هەندەر = جێگا ) ] ، ( نتـ ، بنتـ. ) ، (مکـ.) شــوێنیکیِ دیــاری نیزیــك :: دەلــەی داری چــاکییە لەوەندەی چەقیوە // هۆوەنــدە . هس : هەندەران ، ئەوێنــدەرێ ، کوێندەرێ .
**ئەوها ــ** (بنتـ. صتـ.) تە : ٢ ــ ئاوا .
**ئەوهە ــ** [ ١ــ ئەو + هــە ] ، (ز.) ، ( مکـ.) تە : ١ــ ئــەوە . □ « وەللاّهی شەیتان رمۆزنە ، ئەمــن بە دەستی ئەوهەی دەچم .» ( تحفە:

ج ٢ ـ ٧٤ ) . تێبـ ـ ١ ) کـەرتی دووەمـی ئـەم ووشـەیە ( هـە ) تەحدێدێکی زیاتر لە ( ١ـ ئـەوە ) زیاددەکـا و بۆ ( مشـارالیە )ێکی نێزیکتر بەکاردێت . ب) هە ، خۆی لە ئاوێستادا زەمێری سێیەم کەسی غـایبی مێیێنـەیە و نێرێنـەکەی ( ها )یە . تم : (پد : یگـد ، ج٢ ـ ٣١٩ ) .

**ئەوەی ـ** [ ١ـ ئـەوە/١ + ی (ز.) ] ، ( نا.) ناوی ئیشارەیە بـۆ شتێك یا کارێك . □ « ئەوەی لـە مشـك ببـێ هەمبـانە دەبـڕێ » (فۆلکلۆر) ، « ... بەڵام پێش‌ئەوەی من دەم هەڵبێنمەوە ، زابتێکی لاوی کەڵەگەت لە ژوورەکەی تەنیشـتمەوە هاتەدەرێ ...» (بلە : ژان ـ ١٢٨).

**ئەوەیان ـ** ( نت.) تم : ئەویانە .

**ئەوێ ـ** [ ٢ـ ئەو + ٤ ـ ئێ ]، (ز.) زەمێری ئیشارەیە بۆ شوێنێکی دوور . // ئـەمێ □ « ... بـۆ کاروباری ئەوێ دایرەکیان دانا بـە ناوی ...» ( قزلجی : پێکەنێـن ـ ٤٩ ) .

**ئەوێستا ـ** [ ٢ ـ ئەو + ئیست + ئـا ( ٢ ـ ئە/٢ ) ] ، ( بنتـ.) ، ( مک.) تم : ئێستا □ « ئەو وەختێ هاتە کن شاگردان و بەوانی گـوت : ئەوێستا بنۆ ن و بحەسێنەوە ...» ( ئینجیل : مەتێ ـ ٧٩ ) .

**ئەوێستاکە ـ** ( بنت.) ، ( مک.) تم : ئێستاکە .

**ئەوێستـاکێ ـ** (بنت.) ، ( مک.) تم : ئێستاکێ .

**ئەوێندەرێ ـ** [ئەوێ + هەندەر + ٤ ـ ئێ ] ، (بنت.) ، (مک.) تمـ : ئەوێ . تێبـ ـ ١ ) بەشی دووەمی ئەم ووشەیە ( هەندەر )ەکە لە وشـەی ( هەندەران )ی موکریانێدا بەمانەای ( جێگایان ) دەبێنرێ . ب) جەمعی ئەم وشەیە ( ئەوێندەرانـێ )یـە ، وشـەیکی ترێـش هەیـە کـە ( ئەواندەران )ە .

**ئەویـانە ـ** [ ١ ـ ئـەو + یـە (یەك) + ئـانە/١ ] ، (نت.) نـاوی ئیشارەیە بو (ئەو)ێك لەناو کۆمەڵێ (ئەو)دا ، ★ ئەوەیان

**ئەوێتر ـ** [ ـ ١ ـ ئەو + ١ ـ ئی/١ + تر ] ، (نت.) ، (کعر.) تمـ : ئەوێکە .

**ئەوێدێ ـ** [ ١ـ ئـەو + ١ ـ ئی/١ + دێ ] ، (نت.) ، (مک.) تمـ : ئەمێکە .

**ئەوێدێکە ـ** [ ئەوێدێ + ١ ـ ئەکە ] ، (نت.) ، (مک.) تم : ئەمێکە .

**ئەوێکە** [ ١ ـ ئەو + ١ـ ئە/١ + ١ـ ئەکە ] ، (نت.) ، (کعر.) ناوی ئیشارەیە بۆ شتێکی معینی دوور ، کە لە ناو چەند شتێکی هاوچەشنی خۆیدا بە ئیشارە دیاریدەکرێ . ★ ئەوێتر .

**ئـەهـ ـ** (ند.) ، (ئم.) بێزاری لـە کـاروکردەوە یـا ڕۆداویـك دەگـەیێنێ . :: ئـەهـ ! دەوازێ لێبێنە کەیفی خۆیـەتی چ دەکـا با بیکا .

**ئەهـا ـ** (نـد.) ، (ئمـ.) بـۆ راکێشانی سەرنج بەکاردێت . :: ئەها ! وەڵلاهی شکاندێ . ئەهـا ! ئەگەر تۆشی بەڵایەك نەبۆی من هێچم

نەزانێتوە .
**ئەهـالی ـ** [ = عـا : اهـالي (اهل)] ، (نا.) ١ـ هەمو دانیشتوانی ئاوەدانییەك :: ئەهـالییەکەی لێمـان کۆبونەوە ، هەریـەکە صەتپرسیاری لێدەکردێن .
□ « ئەوشاهی ماهی میسرە ئەهالی
لە ریی سجود »
« قورئان دەلێ کە بەندە ئەو ،
ئەم بەندە پەروەرە »
( نالی )
٢ ـ (کعـر.) ئـەو کەسـانەی کاربەدەستی حکومەتێن .
**ئەهاو ـ** [ ٢ـ ئە/٣ + هاو ] ، (ئم.) ، (سنـ.) تم : ئەهۆی .
**ئەهای ـ** [ ٢ـ ئە/٣ + های ] ، (ئم.) ، (سنـ.) تم : ئەهۆی .
**ئەهـرام ـ** [ = عـا : اهـرام (هرم) ] ، (نـا.) سێ خـانوی لـە نێزیك شاری قاهیرە فیرعەونەکانی ( میـسر ) وەکـو قـەلاغ دروستیانکردون و دەوێدانێژراوون
**ئەهل ـ** [= عا : اهل ] ، ( نـا.) ١ـ دانیشتوی جێگایەکی ئاوەدان : مەلبەند ، شـار ، دێ ، مـاڵ . :: ئەهلی کەرکوك ، ئەهلی مەهابات ، ئەهلی شارباژێر رەزەوانی چاکن .
□ « ئەهلێکی وای هەیە کە هەمـو ئەهلی دانیشن » ( نالی : گم ـ ١٩).
٢ـ لێوەشاوە ، لایق ، ئەو کەسەی بەکـەلکی جێبەجـێ کردنـی کارێكبێت. :: ئەهلی ئەم کارە نیە ، بۆ ئەم ئیشە لە شێرکو ئەهلتریان دەسـت ناکـەوێ . ٣ـ نـاوێکی بەشێوەی (ئیزافە) دەخرێتە سەر و بەتێکڕایـی مانـای ( تەرخـان بـۆ مضافەکە ) دەبەخشـێ :: ئەهلـی بازار ، ئەهلی کەیف ، ئەهلی خێـر ( تم : ـ ) . **ئەهلی ئیمان ـ** ( نتـ. ) خوا پەرست ، ئیماندار .
□ « خۆمـان بە ئەهـلی ئیمـان
ئەناسێن »
« کەچـێ ، کەچڕەوێـن بۆیـە
کەساسێن »
( پیرەمێـرد ـ ٣٨١ )
**ئەهلی بـازاڕ ـ** ( نتـ. ) ئەوانەی لە بازاڕ کاسبی دەکـەن ، **بازرگـان و** دوکاندار و . . .
□ «دەستەیەکی تر ئەوێش تجاڕە»
«سیلکی کاسبی و ئەهلی بازاڕە»
( پیرەمێرد ـ ٢٦٢ )
**ئەهلی تەقوا ـ** (نتـ.) ئەو کەسـەی ملکەچی فەرمانی خوایـە ، ئەوەی لە کـار و کـردەوەی پێچەوانـەی ئامۆژگاری دێن خۆی دەپارێزێ .
□ « لە سایەی تۆ گەلێ کەس بون
بە عارف ڕێی خودایان گرت »
« دریغا عارفی ڕێگەی خوداو و
ئەهلی تەقواکـەم »
( وەفایی : گم ـ ٣٨ )
**ئەهلی حـاڵ ـ** ( نتـ. ) ئەو کەسـەی لەبـەر خواناسـی ، جاروبـارە دەبوڕێتەوە و گۆیا لەو حالەدا لـەو شتانە ئاگـاداردەبێ کە لە بـارێکی ئاسایێدا نازاندرێن ، شێخ ، پیر .
□ « گەر ببێنێ لێوی ئاڵ و چاوی
کاڵی مەستی تۆ »
« مەسـت و بێپـەروایە بیللا
پیری کامڵ ئەهلی حاڵ »
( سەلام ـ ٧٥ )

**ئەهلی‌خێر ــ** ( نت. ) ئەو کەسەی لەبەر موسوڵمانەتی و پیاوچاکی ، پاش مردنی خوا بیبەخشێ و پاداشتی چاکی بداتەوە . :: ئیشاڵڵا ئەهلی خێرە . **ئەهلی دڵ ــ** (نت.) تم : ئەهلی حاڵ .

□ « قوڵلابی موژەت گرتمی ڕۆی کردمە ئەبرۆت »
« یەعنی کە ئەوە قیبلەنومای ئەهلی دڵانە »
( وەفایی : گم ــ ٧٨ )

**ئەهلی‌شەڕ ــ** ئەوەی لەم دنیایە گوێ‌نەداتە فەرمانەکانی دین و لە بەزەیی خوا بێ‌بەری بێ // ئەهلی خێر. **ئەهلی عەمامە ــ** (نت.) ئەوانەی مێزەر لەسەر دەبەستن ، زانای دینی ، مەلا و قازی و . . .

□ « ساقی وەرە تێکە سوڕاحی بدە ساغەر »
« بێ‌مۆیی دەماغی لە صەفی ئەهلی عەمامە »
( ئەدەب : گم ــ ٩٦ )

**ئەهلی قەناعەت ــ** (نت.) ئەو کەسەی ڕازی بێ بەوەی دەستی دەکەوێ .

□ « شاهی کە نەبێ ڕادەبوێرین بە فەقیری »
« بۆ ئەهلی قەناعەت لە پلاو خۆشترە داندۆك »
( ڕەزا ــ ٢٩ )

**ئەهلی کەیف ــ** ( نت. ) ئەوەی هەمیشە حەزی لە بەزم و خواردنەوە و رابواردنی دیکە بێ . **ئەهلی وەفا ــ** (نت.) ئەو کەسانەی چاکەی خەڵکیان لەبەرچاوە و لە بیریان ناچێتەوە .

□ « قیبلەی ئەمەلی ئەهلی وەفا تاقی برۆتە »
« هەر چەندە لە خوێنڕێژیی عاشق نیەتی جوتی »
( ئەدەب : گم ــ ٢٧ )

تێب ــ أ) ئەم جۆرە تەرکیبە دە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا زۆرن . تەنیا ئەوانە باس‌کراوون کە بەسەر زمانی خەڵکیشەوە هەن . ب) هەمو (ئەهل)ەکان لە بن لەهجەی (سنەیی)دا دەبنە (ئال) :: ئالی‌کەیف (ئەهلی کەیف) .

**ئەهمیەت ــ** [ = عا : اهمیة ] ، (نا.) گرینگی ، بایەخ . :: ئەو جۆرەکارانە ئەهمیەتێکی ئەوتۆیان نیە ، جا ئەهمیەتی چیە با هەر قسەبکەن . **بە ئەهمیەتەوە سەیرکردن ــ** ( کەسێ ، کارێ ، شتێ ) تم : ئەهمیەت پێدان .

**ئەهمیەت پێدان ــ** [عا. کو.] ، ( مصت . لا. ) ١ــ بەهیندگرتن ، بایەخ پێدان ٢ــ (کن.) قەدر و حورمەت گرتنی کەسێ . :: وا دیارە ئەهمیەتێکی زۆریان پێداوە ، لەوە دەچێ ئەهمیەتی پێ‌بدرێ . **ئەهمیەت پێ‌نەدان ــ** ( مصت . لا. ) بە هیچ زانین ، بێ‌قیمەت تەماشاکردن ، حورمەت نەگرتن . :: هەر ئەهمیەتیشی پێ‌نەداو نەیهێشت بچێتە ژورەوە ، ئەم جۆرە قسانە ئیمڕۆ باویان نەماوە کەس ئەهمیەتیان پێ‌نادا .

**ئەهۆ ــ** [ ٢ــ ئە/٣ + هۆ ] ، (ند.) ، (ئم.) بۆ دەربڕینی ناڕەزایی لە کاروکردەوە یا قسەی یەکێك . ::

ئەهۆ ! دەبڕۆ وازمان لێبێنە، ئەهۆ ؟ کوڕە دەبێبڕەوە . ★ ئەیهۆ .

**ئەهۆی** ــ [ ئەهۆ + ی (ز.) ] ، (ئم.) بۆ بانگکردن. :: ئەهۆی کابرا ئەوە خەریکی چیی؟ ، ئەهۆی جوامێر تا ئێرە وەرە . ★ ئەهاو ، ئەهای ، هۆی/٢ .

**ئەهێو** ــ (ئم.) بۆ نیشاندانی باوەڕنەکردن ، یان گاڵتە بە قسەی یەکێك کردن . :: ئەهێو ! بە خوا بابە تەڕێ تێنەگەیشتوی ، ئەهێو ! نامە خوا قسە لەوە باشتر هەرنایێ .

**١ــ ئەی** ــ (ئم.) ١ــ بۆ بانگ هێشتن و لەپێش ئەو ناوەدا دێت کە بانگی لێدەکەن .

□ « ئەی بولبولی بێدانە من و ئێوە هەژارێن »
« هەر دوو وەکو یەك مونتەزیری فەسڵی بەهارێن »
( قانیع : گوڵاڵە ــ ٥٨ )

«... دەڵێن ئەی ڕەب : کەنگێ ئەتۆمان برسی دی ، یان تینو یان دە بەندیخانانددا و خزمەتمان بە تۆ نەکرد ؟ » ( ئینجیل : مەتی ــ ٧٥ )

٢ــ بۆ بانگکردنێکی تێکەڵ بە مەترسی ، خەفەت و سەرسوڕمان. :: ئەی ماڵی وێرانم ، ئەی بابە ڕۆ ئەی لەو درۆیە. ★ ئای/٣ ،هەی.

**٢ــ ئەی** ــ (ئم.) ، (سیم.) تم : ئەدی. تێبـ ــ ئەم وشەیە هەر (ئەدی) یەکەیەو لەبن لەهجەی سلەیمانیدا (د)ەکەی کلۆربوە و بۆتە (ئەیێ) و ئەوجار بە جارێك سواوە و کەوتوە.

□ « ... ئەی چۆن ، کەس هەیە ئەوە نەزانێت کە تۆ سەرکردەیی ..» (بلە : ژان ــ ١٢٢)، «... دێوەخان چۆڵوهۆڵ و ڕوت و قوت ، ووشترخانە ، ئەی چیە؟ » (قزڵجی : پێکەنین ــ ٣٨ ) .

**ئەیار** ــ (نا.)، (کعر.) پینجەمین مانگی ساڵی فەڕەنگی ڕۆمییە ، دەکەوێتە نێوان نیسان و حوزەیران، سیویەك ڕۆژە. ★ (کعر.) مایس، (کئێر.) مێە .

**ئەیاغ** ــ [ = تو : أیاق (قاچ) ] ، (ص.) شتی خراپ و گەندە ( کاڵا ، مێوەو ...) کە لای دوکاندار بمێنێتەوە و نەفرۆشرێت. ٢ــ (نا.)، (کئێر.) زێرابی ئەدەبخانە .

**ئەیڕۆ** ــ (ئم.) تم : ئەیەڕۆ . :: ئەیڕۆ نەکەی شتیوات کوتبێ .

**ئەیلۆ** ــ [ ١ــ ئەی/٢ + لۆ (؟) ] ،(ئم.) ١ــ بۆ دەربڕینی هەستی خۆشەویستی و لاواندنەوەی منداڵی پچوك . :: ئەی لۆ ڕۆڵە گیان چەند ژیرکەڵەیە ! ٢ــ بۆ گاڵتەپێکردن و بەڕاست نەزانینی قسەیە . :: ئەیلۆ ! تۆخوا بزانە گەزەگەزەی دەزانێ . ★ ئەیەلۆ .

**ئەیلول** ــ [سوریانی] ، (نا.) ، (کعر.) مانگی نۆیەمی ساڵی فەڕەنگی ڕۆمییە دەکەوێتە نێوان ( ئاب ) و (تەشرینی یەکەم) ، سیڕۆژە . ★ (کئیر.) سێپتامبر .

**ئەیوان** ــ (نا.) تم : هەیوان .

**ئەیهۆ** ــ [ ١ــ ئەی/٢ + هۆ ] تم : ئەهۆ . :: ئەی هۆ چی بەسەر چێوەیە تێبـ ــ دوپاتەکردنەوەی بێزاری زۆرتر پێشاندەدا .

**ئەیهۆ** ــ [ ١ــ ئەی/٢ + هۆ ]،

(ئم.) بۆ دەربڕینی بێباوەڕێ و ناڕازیێتی :: ئەیهۆ « کەر لە کوێ کەوتوە و کوندە لە کوێدڕاوە » .
تێب ـ دۆپاتە کردنەوەی نیشانەی بێباوەڕێ و ناڕازیێتی تێکەڵ بە تۆڕەییێیە . :: ئەیهۆ ، ئەیهۆ ! من چێ پێدەڵێم و ئەو چم جواب دەداتەوە .

**ئەیەڕۆ** ـ [ ١ـ ئەی/٢ + ٣ـ ئە/٢ + ڕۆ ] ، (ئم.) بۆ دەربڕینی داخ و کەسەری تێکەڵ بە سەرسوڕمانەوە . □ « ... ئەیەڕۆ ڕەشید ! ئەوە چیێت کرد ، چۆن ئەو فێڵەت دۆزیەوە ...» ( قزلجی : پێکەنین ـ ١٠٨ ) :: ئەیەڕۆ بابانت خرابێ چۆن لە ڕۆت هەڵدێ قسەی وادەکەی . ★ ئەیڕۆ .

**ئەیلۆ** ـ [ ١ـ ئەی/٢ + ٣ـ ئە/٢ + لۆ ] ، (ئم.) تم : ئەی لۆ .

**ئەیێ** ـ (ئم.) ، (سیم.) تم : ئەدێ . هس : ٢ ـ ئەی .

**ئیبتیدا** ـ [ = عا : ابتداء ] ، (بن.) لەپێشدا ، لە هەوەڵەوە ، پێش هەمۆ شتێك ، سەرەتا .
□ «ئەوەڵ ئیبتیدا بە ئیسمی ئەڵڵا»
« پەس حەمد و سەنا
ئەلحەمدو لیللا »
( عەقیدەی شێخ سەمیع )

**ئیبتیدایێ** ـ [ = عا : ابتدائی ]، (صە.) حاڵی شتێك کە لە ڕیزا پێش هاوچەشنەکانی خۆی بێت . :: خوێندنی ئیبتیدایێ ، مەدرەسەی ئیبتیدایێ .

**ئیبلیس** ـ [ عا. لە یۆنانێ وەرگرتوە : دیابۆلۆس = درۆزن ، دۆزمان ] ، (نا.) ١ـ شەیتان . ٢ـ (مجـ.) ، أ) ئەو کەسەی بە فێڵ‌ودرۆ و دەلەسە خەڵکێ هەڵخەڵەتێنی . ب) پیاوی زیرەك و زۆر زان کە زیرەکێ خۆی زیاتر بۆ خراپە دەکارکا .

**ئیتاعەت‌کردن** ـ [ عا : اطاعة + کو : کردن ] ، (مصـ. لا. ) بە قسە کردن ، بەگوێ‌کردن ، مل‌کەچبۆن بۆ فەرمان . :: عەولاد دەبێ ئیتاعەتێ دایك‌وبابیان بکەن ، هێندە چەوتە ئیتاعەتێ خواش ناکا .

**ئیتتیحادکردن** ـ [ عا : اتحاد + کو : کردن ] ، ( مصـ. لا.) ١ـ یەککرتن ، بۆنەیەك ، پێکهێنانی یەکێتی . ٢ـ خۆکردنەیەکی چەند کەس یا چەند هەیئەتی کۆمەلایەتێ و دەولەتان .

**ئیتتیفاق** ـ [ = عا : اتفاق ] ، (نا.) ، (کنێر.) ١ـ ڕێکەوت ، صدفە . ٢ـ ڕۆداو ، حادیسە :: ئیتتیفاقێکی سەیرە .

**ئیتتیفاق‌کردن** ـ [ عا. کو. ] . (مصـ. لا. ) ١ـ قسەکردنەیەکی دۆ یا چەند کەس لە مەسەلەیەکدا . ٢ـ ڕێککەوتنی دۆ یا چەند کەس یا هەیئەتی کۆمەلایەتێ و دەولەت بۆ مەبەستێك .

**ئیتتیهام‌کردن** ـ [ عا. اتهام + کو : کردن ] ، ( مصـ. متـ. ) تاوان وەپاڵ کەسێك‌دان .

**ئیتقات** ـ [ محر. عا : اعتقاد ] ، (مکـ.) تم : ئیعتیقاد :: جا کەنگێ حەمە شەل ئیتقاتی بە سوێند و تەلاقێ هەبوە ؟ ڕۆژی بیست جار

سێ تەڵاقەی فڕێدا کەمە .

**ئیتمینان‌دان** ــ [ عا : اطمئنان + کو : دان ] ، (مصت . مت . ) ١ــ خاترجــەم کردنی کەســێك یــا کۆمەڵێــك ، دڵنیــاکردنیان . ٢ــ ئەمێن‌کردنەوەی کەســێك لە مەترسێ .

**ئیتمینان‌کردن** ــ [ عا. کو.] ، (مصت. لا. ) باوەڕکردن بە کەسێ ، دڵنیــابوّن ، خــاترجەم‌بوّن . ★ ئیتمینان هەبوّن .

**ئیتمینان‌هەبون** ــ [ عا. کو. ] ، (مصت. لا.) تم : ئیتمینان‌کردن .

**ئیجارە** ــ [ = عــا : اجــارة ، ایجار ] ، (نا.) ، ( کئیر. ) ١ــ کاری ڕوّبــەڕوّکردنەوە یا ڕوّبەڕوّبوّنــەوە دەگەڵ کەڵك وەرگرتن لە مڵك (خانوّ، باغ، دێ . . .) ٢ــ هەقێکی ئیجارەدار دەیدا بە خاوەن‌مڵك .

**ئیجارەدار** ــ [ عا. کو. ] ، (نت.)، ( کئیر. ) کەسێکە کە مڵکێــك بــوّ ماوەیێك لە خاوەنی بە کرێ دەگرێ .

**ئیجارەکردن** ــ[عا. کو.] (مصت. مت. ) کاری بەکرێ‌گرتنی مڵکێك لە خــاوەنی بوّ ماوەیــەك ، بەرامبــەر میقدارێك پارە ( حاصڵاتیش ئەگەر باغ ، بێســتان و . . . بێ ) ★ بە ئیجارەگرتن .

**ئیجارەنامچە** ــ [ ئیجارە + نامە + چە ] ، [ عــا. کو. ] ، ( کئیر. ) تم : ئیجارەنامە .

**ئیجارەنامە** ــ [ ئیجارە + نامە ]، [ عا. کــو. ] ، ( نت. ) ، ( کئیر. ) سەنەدێکە لــە نێوان خاوەن‌مڵك و ئیجارەدارا ئاڵوگوّڕ دەکرێ و تێیدا دەنوّسرێ کە مڵکەکەی بــوّ ماوەی چەندساڵ یا چــەند وەرز بەدەست ئیجارە دارەوە دەبێ و چەند و چوّن پارە و حاصــڵات دەدا بە خــاوەنی مڵك . ★ ئیجارەنامچە .

**ئیجازە** ــ [ = عا : اجــازة ] ، (نمصــ.) ١ــ ماوەی‌کردنی کارێك بە کەسێك‌دان ، بە ڕەوازانێنی کارێك بوّ کەســێك . :: ئیجازەی هەیــە دانێشێ ، ئیجازەی ئارەق‌فروّشتن هەر بوّ مەسیحییەکانە ، ئیجازەمان بدە با بڕوّین ، قوربان ئیجازە بفەرموّ ســبەینێ بێینــەوە . ٢ــ ڕێــگەی کارنەکردن و نەچوّنە سەر ئێش بوّ ماوەیێك،کە دەدرێ بە کاربەدەست و کرێــکار و ســەربازان و . . . ★ مەرەخەسێ ، مەرەخەســتێ . :: شێرکوّ حەوت ڕوّژی ئیجازە هەیە ، چەنــد ڕوّژێ ئیجــازە وەربگرە و ئیشــەکانت تــەواوکە . **ئیجازەی مارگرتن** ــ ( نت. ) کارێکە شێخێکی تەریقەتی قادرێ دەگەڵ دەروێش یا هەر کەســێکی‌تر دەیــکا ــ دەدەمی دەتفێ ، یا پەنجەی دەدەمــێ خوّی دەنــێ و پاشــان دەیخــاتە دەمــی دەروێشەکەوە . . . ــ و ئەمە بوّی دەبێتە ئیجازە ، پاشان دەروێش یا ئەو کەسە بەبێ‌ترس ماران دەگری و پێیەوە نادەن . **ئیجازەی مەلایەتێ** ــ (نت.) کاغەزێکە مەلایەك دەیــدا بەو مەلایەی کــە قوتابێ خــوّی بــوە و دەرسی پێ‌گوتوە ، شایەدێ بوّ دەدا کە خوێندنی تەواوکردوە و بوّتە مەلا (لێ‌بوّتەوە) .

**ئیجبار** ــ [ = عــا : اجبار ] ،

(نمصـ.) ناچاریی ، زۆریی ، تۆبزیی .
**ئیجبارکردن** ـ [ عـا. کو. ] ، ( مصتـ. متـ. ) ناچارکردن، به تۆبزیی کارێك به کەسێك‌کردن .
**ئیجباریی** ـ [عا. کو.]، ۱ـ (صـ.) کاریبەزۆر ، کارێکی کەسیی لەژێر پالەپەستۆی یەکێکیتر دەیکا . ۲ـ (نتـ.) ، (کئێر.) خزمەتی سەربازیی کە بەپێی قانۆن دەبێ هـەمو کەس بۆولاتی خۆی ئەنجامیی بدا □ «... قەت بوە ئیجباریی لە کوردی بگرێ».
**ئیجلاس** ـ [= عا : اجلاس] ، ( نـا.) ، ( کئێـر.) کۆبۆنــەوەی هەیئەتێکی رەسمیی یا کۆمەلایەتیی و ... بۆ وتووێژ دەربارەی کارێك یا چارەسەرکردنی گێروگرفتـیی . :: ئیجلاســی کۆمیتــەی ناوەنـدیی ، ئیجلاسی سالانەی کۆمەلـی نەتەوە یەکگرتوەکان .
**ئیجماع** ـ [ = عا : اجمـاع ] ، (نمصـ.) ۱ـ کۆبۆنەوە و رێك‌کەوتنی چەند کەسیی لەسەر کارێــك . ۲ ـ هاوڕابۆنی کۆمەلیی خەلك لەســەر مەسەلەیەك :: ئیجمـاعی مـەلاکان لەسەر ئەوەیە کە سەید زەکاتیـان پیینـاشی ، ئیجمـاعی نەتـەوە یەکگرتوەکان لەســەر ئەوەیـە کـە ئیسرائیـل دەبێ خـاکی عەرەبـان چۆلکا ، بە ئیجماع ڕەئیان‌دا .
**ئیجماع‌لێکردن** ـ [ عا. کو.] ، ( مصتـ. متـ.) ، (کئێر.) گەلەکۆمەکی کردن لە کەسیی یا جەماعــەتیی . :: خــەلکی مەهابـاد ئیجماعیـان لـە مەنگـوڕان کـرد و لـە شـارەکە وەدەریان‌نان .

**ئیحتیڕام** ـ [= عا : احترام ] ، ( نا . ) رێز ، قەدر ، حـۆرمەت .
**ئیحتیڕامی خـۆڕاگرتن** ـ [ عـا . کو.] ، (مصتـ. لا.) ۱ـ رەفتارکردنی کەسیی بەجۆریی کە خەلـك قەدری بزانن و حورمەتیبگرن ۲ـ ( کنـ.) بیئەدەب نەبۆن . :: با ئیحتیڕامـی خۆی راگرتبا و هینـدەی قسـەی زیادی نەکردبا تا وای بەسەرنەهاتبا.
**ئیحتیڕام‌گرتن** ـ [ عا. کو.] ، ( مصتـ. متـ.) قەدرگرتن ، رێزلێنان حورمەت‌گرتن ، قەدرزانیــن ، بـە گەورەزانینی کەسێك و بە ئەدەبەوە دەگەلی رەفتارکردن .
**ئیحتیلام‌بۆن** ـ [ عــا. کو. ] ، ( مصتـ. لا.) شەیتانیبۆن ، لە خەوا ئاوهاتنەوە .
**ئیحتیمال** ـ [= عا : احتمال ] ، ( نمصـ.) ڕیتێچۆن :: ئیحتیمـالی هەیە ئەو سالی زستانی ســارد بێ ، ئیحتیمالە هەر ئاگاشی لێ نەبــێ ، بە هەمـو ئـەو ئیحتیمالانەشــەوە هێشتا کردنی باشترە لە نەکردنی .
**ئیحتیمال‌دان** ـ [ عـا. کو.] ، ( مصتـ. لا.) بۆ جیبەجیبۆن ( یـا نەبـۆن ) ، ڕۆدان ( یـا نـەدان )ی مەسەلەیەك ، کارێك و ... لە نێوان گومان و یەقین دا بـۆن . :: لـەم بابەتەوە هیچ ئیحتیمالێك مـەدە ، ئیحتیمال نادەم لە توانایان دا بێ .
**ئیحتییات** ـ [= عا : احتیاط] ، (نمصـ.)۱ـ دوڕئەندێشیی لە کاراندا، حیساب بۆ پاشەڕۆژکردن . ۲ـ بە ووریایی و پارێز کارێك کردن .
**ئیحتییاتکار** ـ [ عـا. کـو.] ،

( صت.) ١ـ دوڕئەندێش ، ئەو کەسەی بە پارێز کاران دەکا ، ئەوەی بیر لە پاشەڕۆژی کاران دەکاتەوە . ٢ـ ( مجـ.) ترسەنۆك ( چونکو زیاد لە پێویست لێکی دەداتەوە و لە ترسی دوارۆژ و ئەنجامی کارەکە ، دەستی ناچێتێ و لەبەری ڕاناپەڕێ.)

**ئیحتیباتکردن** ـ [عا. کو.] ، ( مصت. لا. ) ١ـ دوورتێفکرین ، بە وورپایێ و پارێزەوە کارکردن . ٢ـ خۆپاراستن لە هەڵەشەیێ ، تالۆکەنەکردن . ٣ـ کارقایمێ پاشەڕۆژکردن .

**ئیحتیباتێ** ـ [= عا : احتیاطی] ، ( نا.) ، (کعر.) هەر شتێکی بۆ دوارۆژ و ڕۆژی تەنگانە و مەبادا هەلگیرابێ . :: وەکو دەلێن ئیحتیباتێنەوتی دنیا خەرێکە تەواو دەبێ .

**ئیحتیباج** ـ [= عا : احتیاج ] ، (نا.) پێداویستێ ، پێویستنی شتێك . :: ئەگەر ئیحتیباجت پێنەماوە کتێبەکەم بۆ بنێرەوە ، ئیحتیاجی بە خۆماندوکردن نیە . ★ ئاتاجێ ، ئەوەجە . ئیحتیاجێ .

**ئیحتیباجبۆن** ـ [ عا. کو. ] ، ( مصت. لا.) ١ـ هەستکردن بە کەمایەسێ بۆ شتێك . ٢ـ ( کنـ. ) فەقیربۆن ، نەداربۆن ★ موحتاجبۆن .

**ئیحتیباجێ** ـ [ عا. کو. ] ، ( نا.) تە : ئیحتیباج .

**ئیحڕام** ـ [= عا : احرام ] ، (نا.) ، (مجـ.) دو پارچە قوماشی سپێ نەدرواوە ، موسولمانان لە وەختی حەجدا یەکێکیان لە ناوقەدی خۆیان گرێدەدەن و لە ناوك بەرەژێریانی پێ دادەپۆشن ، ئەوی دیکەش بەشانیاندا دەدەن .

**ئیحڕامبەستن** ـ [ عا. کو. ] ، ( مصت. لا. ) دەبەرکردنی ئەو جلکانەی شەریعەتی ئیسلام بۆ حەج داپناوە . تێبـ ـ پاش دەبەرکردنیان ، هەندێ کار هەیە ( سەرتاشین ، نینۆککردن ، ... ) لە حاجییان حەرام دەبێ و نابێ بیکەن .

**ئیحساسات** ـ [ = عا : احساس ] ، (نا.) ، (کئێر.) ڕەدفیعلی ئینسان بەرامبەر قسە ، کارەسات و ڕوداوەکان . ★ (کعر.) عاتیفە .

**ئیحساساتی** ـ [ عا. کو. ] ، ( صـ.) ، (کئێر.) ئەو کەسەی کارەسات و ڕوداوەکان زۆ کاری تێدەکەن و هەلدەچێ ، ئەوەی زیاتر بە دەنگی هەستەوە دەچێ تا عەقل . ★ (کعر.) عاتیفێ .

**ئیحساسکردن** ـ [ عا. کو. ] ، ( مصت. لا.) هەستکردن بەو کارەساتانە کە لە لاوە ڕودەدەن و لە دەرونی ئینسانا دەنگ دەدەنەوە و کاری تێدەکەن :: قاچی سڕبوە ئیحساسی گەرما و سەرما ناکا ؛ کە لەسەر پشت ڕادەکشێ ئیحساسی ژان دەکا . ★ هەستپێکردن .

**ئیحسان** ـ [= عا : احسان ] ، ( نمصـ. ) ١ـ چاکە . ٢ـ خێر و خێراتێ کە لە ڕێگای خودادا دەکرێ . :: خالە لە ڕای خوادا

شتێکمان بدەیە ئیحسانە. ٣ــ (کەر. کتو.) ناوە بۆ نێرێنە.

**ئیحسان‌کردن** ــ [ عا. کو. | ، ( مصد. متە. ) ١ــ چاکەکردن . ٢ــ یارمەتی‌دانی فەقێر و نەدار و سوالکەران بە پارە و . . . :: هەقی خۆمانە کەچێ دەڵەی ئیحسانمان پێدەکەن .

**ئیحیاکردنەوە** ــ [ عا : احیاء + کو : کردنەوە ] ، ( مصد. متە. ) ١ــ زیندوکردنەوەی مەعنەوی .

□ « مەلا سەعیدە وا سەلا ئەکا »
«ڕۆحی (بلال)مان بۆ ئیحیا ئەکا»
( پیرەمێرد ــ ٢٦٦ )

٢ ــ ( کئێر. ) ڕەونەق‌دان بە جێگە یا شتێك . □ « ماڵت ئاوەدان بێ باغەوان بۆ ئالوبالوت بازاڕت ئیحیاکردەوە » ★ بوژاندنەوە ، ژیاندنەوە .

**ئیحیانە** ــ [ محر ، عا : احیاناً]، (بن.) ئەگەر :: ئیحیانە چوی و لەوێ نەبۆ دانیشە تا دێتەوە . **ئیحیانەن** ــ (عا.) ، ( بن.) هەندێ جار ، جاروبارە، جارجار.:: ئیحیانەن پیاو وا لێ‌دەکا سەری لێ بشێوێ .

**ئیخباری‌کردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصد. متە.) ، (کەر.) ئاگادارکردنی مێری لە کارێك یا دەربارەی شتێك. :: ئیخبارییان‌کردوە کە ماڵی شێخ لەتێف پڕە لەوانەی لە کۆمەڵە ڕایان‌کردوە . ★ ( کئێر. ) ڕاپۆرت‌دان ، گوزاریش‌دان .

**ئیخباری‌لێ‌کردن** ــ [عا. کو.]، (مصد. متە.) ، (کەر.) ئاگادارکردنی مێری دەربارەی کەسێ یا کەسانێ یا هەڵسان و دانیشتنیان . □ « بە مێرزا قادر بڵێن ئیخبارییان لێ‌کردوە خێرا بگەڕێتەوە سێتەك .» تێب ــ ئەم ووشەیە و ئەوی پێشەوەشی تەنیا بۆ مەبەستی خراپە بەکاردێن .

**ئیخبارییە** ــ [= عا : اخباریة]، (نا.) ، (کەر.) نامە یا هەر جۆرە نوسراوێکی بۆ ئاگادارکردنی مێری لە کار و چالاکی و هەستان و دانیشتنی کەسێ یا کەسانێ بنوسرێ . ★ ( کئێر. ) ڕاپۆرت ، گوزاریش .

**ئیختیلاف** ــ [= عا : اختلاف] ، (نا.) ، (کئێر.) ١ــ یەكڕانەبونی دو یا چەند کەس یا هەیئەت دەگەڵ یەکتری . ٢ــ جیاوازی چەندی و چۆنی دو یا چەند شت دەگەڵ یەکتر .:: ئەم ئیختیلافەی مەنگوڕ و مامەشان هەر نابڕێتەوە ، ئەمە لە کوێ و خەنجەری مام پیرۆتی لە کوێ هێندەی ئەرز و ئاسمان ئیختیلافیان هەیە . تێب ــ جەمعی ئەم ووشەیە ( ئیختیلافات )ە :: ئەو هەمو ئیختیلافاتەی ناو دەوڵەتان هەروا بە هاسانی لابەلاناکرێ .

**١ــ ئیختییار** ــ[= عا : اختیار]، (نا.) ١ــ دەستەلات ، توانست و دەست‌بەرەڵلایی بۆکردن و نەکردنی کاران . :: پاشام ئیختییارتان هەیە دەتوانن بشمان‌کوژن . ٢ ــ سەرپشك‌بون . :: ئیختییاری خۆتە چۆنت پێ خۆشە وا بکە . بە ئیختییاری خۆت کامەت بە باش زانی ئیمەش ڕازین . تێب ــ لە کوردستانی ئێران ، ئەم ووشەیە ئەگەر بە ڕاوێژێکی مەیلەوگاڵتە و بارەوسەر

سوڕمانەوە بگوترێ ، مەبەستەکـە پێچەوانـە دەکا و بۆ ئەو کەسـەی قسەی دەگەڵ دەکرێ بێدەستەڵاتی دەگەیێنێ . **ئیختییارات** ــ ( جم . ) هەمۆ ئەو دەسـتەڵاتەی لە لایـەن دەولـەت یا هەیئـەت و کەسـانی دەستەڵاتدارەوە بۆ جێبەجێکردنـی فەرمـانەکان دەدرێ بە هەنـدێ کاربەدەسـتان . :: فەرماندارەکان ئیختییاراتی تەواویان هەیە .

**٢ــ ئیختییار** ــ ( نا. ) ، ( کمر. ) ١ــ پێـر ، بـە سـاڵاچۆ . ٢ ــ ڕیشسپێ ، کەیخودا □ « هەر لە گەورەیان هەتا منداڵان ، هـەر لـە منداڵان هەتا ئیختییاران » ( **تحفه** : ج٢ ــ ٢٦٢) :: ئیختییار و موختاری دێیەکە شـایەتێ بۆ دەدەن . تێبـ ــ وا دیارە ئەم ووشەیە لە تەشکیلاتی عوسمانێ کەوتۆتەوە ڕەنگە لە پێشدا هەر بەو کەسـانە گوترابێ کە بـۆ پێوەندێ دەگـەڵ کاربەدەسـتان و ڕاپەڕاندنی ئیـش و کاری خەڵـك دەستنیشاندەکران ، جـا چونکـە ئەوانە زۆریان بە ساڵاچۆبۆن بۆیـە مانـای ( پێر و ڕیشسـپێ )شـی لێکەوتۆتەوە .

**ئیختییاردار** ــ [ ١ــ ئیختیار/١ + دار ( پـ. ) ] ، [عا. کو. ] ، (صت.) ئەو کەسەی دەسـتەڵاتی هـەبێ ، ئـەوەی هەقـی کردن و نەکردنـی کارێکـی هەبـێ . :: خۆتـان ئیختیارداری ئێمە و ئەوانیشـن . باوك ئیختییارداری کچێ خۆیەتێ . □ «بای‌خەزاڵ ، عەمرم ، کێ لەسەر وولاتی سۆرچێ و زراران دەکەیـە سۆرباش و ئیختییاردارە » ( **تحفه** : ج ١ ــ ٣٥٠ ) .

**ئیختییارکردن** ــ [ ١ــ ئیختییار /٢ + کردن ] ، [ عا. کو. ] ، (مصتـ. متـ. ) هەڵبژاردن و پەسـندکردنی شتێك یا کارێك ... :: خۆتان ئەم ژیانەتان ئیختییارکردوە گلەیێ لـە کەس مەکەن. بە من بایە زەردەکەتان ئیختیار کردبا لەم شتێنە چاتر بۆ .

**ئیخڕاجکردن** ــ [ عا : اخراج + کو : کردن ] ، (مصتـ. متـ. ) ١ــ دەرکردن ، وەدەرنان . ٢ــ (کئێر.)، أ) دەرکردنی کار بە دەستی دەوڵەت، کریکار و... لەئێش. ب) وەدەرنانی شـاگرد لـە مەدرەسـە . ج ) بەرەڵلاکردنی سەربـازی ئیجبـاری پاش تەواوکردنی ماوەی قـانۆنی . (عا.) تسریح :: دۆ مانگێش لـە دۆ سـاڵەکە تێپەڕیـوە کەچـێ هـەر ئیخڕاجیـان نـاکەن . ٣ــ (کمر.) دەرهێنانی کاڵا لە گومرگ .

**ئیخفالبۆن** ــ [ عا : اغفـال + کو: بۆن]، (مصتـ. لا.) فریوخواردن، هەڵفریوان . ★ (بکـ.) هاتنەخاپێن.

**ئیخفالکردن** ــ [عـا. کـو.] ، ( مصتـ. متـ.) فریـودان ، هەڵفریواندن ★ (بکـ.) خاپاندن .

**ئیخلاس** ــ [= عا : اخلاص ] ، (نا.) ١ــ دڵپاکێ و دڵسـۆزێ لـە دۆستـایەتیدا ٢ــ ڕاسـتێ و جگەرسۆزێ لە کار و کردەوەدا . :: ئیخلاسمان هەیە بۆتان . ئەم کابرایە هەر ئێشێکی پێی بسپێرن بەوپەڕی ئیخلاسەوە دەیکا .

**ئیداره** ــ [= عا : ادارة] ، (نا.)،

( کئێر.) بەشێك لە بەشەکانی هەر وەزارەتێ کە دەستەلاتی جێبەجێکردنی کارانی هەیە . :: ئیدارەی شارەوانێ ، ئیدارەی گومرگ . ★ (کعر.) دایرە .

**ئیدارەکردن** ــ [ عا. کو.] ، ١ــ ( مصت. مت. ) هەلسوڕاندنی کار و بار . بەڕێوەبردنی ئیش و کاری شوێنێك . :: کەسێ ئیدارەی مالی خۆی پێنەکرێ ، ئیدارەی وولاتێکی چۆن پێدەکرێ . ٢ــ ( مصت. لا. ) هەلکردن ، بەڕێوەچۆن . :: قوربان جەنابی قازێ بەم جۆرە ئیدارە ناکەم بفەرمۆ با تەلاقم‌دا . دەلەی بەرازە نازانم بەم سەرمایە چۆن بێ سۆبە ئیدارە دەکا . هێند فەقیرە بە نانی ووشکیش ئیدارە دەکا .

**ئیدارەدەگەل‌کردن** ــ [ عا. کو. ] ( مصت. مت. ) بەڕێوەچۆن دەگەل کەسێ ، هەلکردن و سازان دەگەل خەلك . :: هێندە دڕ و بێ حەیایە کەس ئیدارەی دەگەل ناکا .

**ئیدارێ** ــ [ عا.] ، ( صـ.) ١ ــ هەر شتێکی پێوەندێ بە ئیدارەوە هەبێ . :: کاروباری ئیدارێ . ئەمری ئیدارێ . ٢ــ ا ) ئەو کەسەی لە هەلسوڕاندنی کاری ئیدارە شارەزا بێ. :: قەت متصرفی وا ئیدارێ نەهاتۆتە کەرکوك . ب ) کەسێکی لە هەلسوڕاندنی کاری ئیدارەدا ووشك و ڕۆتینێ بێ .

**ئیدیعا** ــ [= عا : ادّعاء ] ، (نا.)١ــ داوا :: ئیدیعای گەورەیێ. ئیدیعای مەزنایەتێ مەنگوڕان کێشە و هەرایەکی دروستکرد نەبێتەوە . ٢ــ بە نابەجێ خۆ بە شتێك زانین . فێشال..

**ئیدیعاکردن** ــ [ عا. کو.] ، ( مصت. لا.) ١ــ داواکردن . ٢ــ وێستن یا وێستنەوەی شتێك لە کەسێك . ٣ــ بەنۆسین یا بە قسە ، لە دادگا داوای شتێ ( قەرز ، نەفەقە، خوێن...) لە کەسێ‌کردن. :: بچۆ لای قازێ ئیدیعای نەفەقەی خۆت و مندالەکەت بکە .

**ئیدڕاك** ــ [ = عا : ادراك ] ، ( نمص. ) تێگەیشتن ، حالێبۆن ، ◻ « پەی چێش‌هەرکەسێ دەرۆنش پاکەن »
« نەجیبەن بێ عەیب ، صاحێب ئیدڕاکەن »
( خانا ــ ١٧٠ )

**ئیرادە** ــ [ = عا : ارادة ] ، (نا.) وێست ، خواست ، مەیل . :: ئیرادەی خوایە چێ دەگەل ناکرێ.

**ئیرادەت** ــ [عا.] (نا.) ، (کئێر.) دلسۆزێ و ئیخلاس لە دۆستایەتیدا، دۆستایەتێ ڕاست تێکەل بە بچۆکایەتێ . :: ئیرادەتمان هەیە ، عەرزی ئیرادەتێ تەقدیم بکەن .

**ئیرادەتمەند** ــ [ عا. کو. ] ، (صت.) ، (کئێر.) ئەو کەسەی زۆر دلسۆز بێ بەرامبەر دۆست و ئاشنای خۆی . :: قوربان پیاوی وا ئیرادەتمەندم کەم دیوە .

**ئیرادەکردن** [ عا. کو. ] ، (مصت . لا. ) ١ــ بڕیار هاتنەسەر کران و نەکرانی کارێ یا بۆن ونەبۆنی شتێ ، وێستن تێکەل بە دەستەلاتی جێبەجی‌کردن . ٢ــ لێبڕان ،

بڕیاردان ، مەیل هاتنە سەر .
**ئیرس ــ** [ = عا : ارث ] ، (نا.)
١ــ ماڵ و دارایەت و هەمو شتی ماددیَ کە لە پاش مردو بۆ کەس و کاری بەجیَ دەمێنی . ★ میرات .
٢ــ ڕی و شوێن ، ڕەووشت و خو یا هەر شتێکی‌تری مەعنەویَ کە پشتاوپشت لە پێشونیانەوە بۆ بنەماڵ و خێزانیَ، هۆز و عەشیرەتیَ یا نەتەوەیێك دەمێنێتەوە . ★ کەلەپور .

**ئیڕتیجاع ــ** [عا.] ، (نا.) ، (کئیڕ.) ١ــ بۆ دواوە گەڕانەوەی شتێك ، وەکو پێشو لێهاتنەوەی . تێب ــ لە فیزیا و کیمیادا باسی هەندیَ ئامراز و ماددە هەیە کە ئەگەر لەبەر یەکیان بکێشنەوە (سپرینگ ، لاستێك ...) یا ڕێکیان بگوشن (ئیسفەنج ...) هەرکە دەستیان لیَ‌بەردرا دەگەڕێنەوە دۆخی پێشویان . جا ئەم وەکو خولێهاتنەوەیە پێی دەڵێن ئیرتیجاع. ٢ــ (مجـ.) ، ( تـ . ) بەربەرەکانیَ شۆرشی کۆمەڵایەتیَ و پێشکەوتنی کۆمەڵ و هەوڵ و تەقەلا بۆ ئەوەی ڕێژیمی سیاسیَ و سیستێمی ئابوری کۆن لە جێی خۆیان بمێنن . ★ (کعر.) رجعیەت ، کونەپەرستیَ .

**ئیڕتیجاعیَ ــ** [عا. کو.] ، (صـ.) ١ــ حالیَ ئەو شتە ماددیانەی ئەگەر ڕابکێشرێن یا ڕێك‌بگوشرێن ، بە لاچونی ئەو هێزەی وای لێکردون ، وەکو خۆیان لیَ‌بێتەوە . :: لاستێك ماددەیێکی ئیڕتیجاعییە . ٢ــ (مجـ.)، ا) ئەو کەسەی دژی پێشکەوتن و شۆڕشە و بۆ ڕاگرتن یا گێڕانەوەی ڕێژیمێکی کۆن تێدەکۆشیَ ★ (کعر.) ڕیجعیَ ، (کئیڕ.) مورتەجیع . کونە پەرست . ب) ئەو بیروباوەڕانەی ڕێگای پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیَ و ڕێژیمی نویَ دەبەستن . ★ کونەپەرستانە .

**ئیزافە ــ** [ = عا : اضافة ] ، (نا.) حاڵەتێکی ڕێزمانییە لە نێوان (٢) ووشەدا کە بە هۆی ئامرازی ئیزافەوە پێکەوە دەلکێن ( مضاف ومضاف الیە) ئەوجار مەعنایان تەواو دەبیَ . :: کوڕی کیَ ، خانوی شێرزاد ، گوارەی ئافتاو . تێب ــ ئامرازی ئیزافە لە کوردیدا (ئی) و (ئەی)ە کە بەدوای ووشەی یەکەمەوە دەلکێن و ( هەمزە )کەیان دەسویَ و دەنگی دەرناچیَ .

**ئیزافەکردن ــ** [ عا. کو. ] ، ( مصـ. متـ. ) لیَ‌زیادکردن ، خستنە سەر ، زیادکردنی شتێك لە شتێکی‌تر . :: پارەی ئەم کراسەش ئیزافەی حیسابی کون بکە. لە صەتا دو قازانجی ئیزافە بکە بەسە ، ئیزافەی سەر ئەوانی ترێکە .

**ئیزڕائیل ــ** [ محر . عیبریَ ] ، (نا.) ١ــ ئەو فرشتەیەی گیانی ئادەمیزاد دەکێشیَ . ٢ــ (مجـ.) ، ا) پیاوی بە سام، ئەو کەسەی یەکێك یا زیاتر لێی بترسن. ب) ئەو کەسەی لەبەر دلی کەسیَ یا کەسانیَ ناخۆشەویست و دزێو بیَ . :: وەك ئیزڕائیل ببینم وایە ، هەر دەڵەی ئیزڕائیلە . تێب ــ ئەویَ ڕاست بیَ ئەو خوێندەوارانەی دەنگی (ع)یان

له زمانی کوردیدا به دڵ نیــه ، ئهم ووشهیــان بهم دهرده بردوه دهنــا خهڵکی لادێ ههر (عیزڕائیل) دهڵین ★ عیزڕایل . مهڵکهمۆت ( ملك الموت ) .

**ئیزڕاب ــ** [ = عا : اضراب ] ، ( نمصـ . ) ، (کعر) ١ــ ڕۆ وهرگێڕان ٢ــ (مجـ.) دهست له کار ههڵگرتن و کۆبونــهوهی کۆمــهڵێ خــهڵك بــۆ دهستخستنی ههندێ داوا ، یا وهدێ هێنانی هیندێ ئامانج ( ئازادێ ، کهم کردنهوهی سهعاتی ئیشی کرێکاران، زیــادکردنی ڕۆژانــه و .... ) یا دهربڕینی نــاڕهزایی بهرامبهر بــه شــتێك ، کارێك یا ڕوداوێ . ★ مانگرتن . (کئیرـ .) ئیعتیساب .

**ئیزن ــ** [=عا : اذن] ، (نا.) ئیجازه، دهستور . :: له ئێمهوه ئیزن به ، تۆ ئیزنت به دهستی خۆته ، بــه بێ ئیزن بۆ هیچ کوێ نهچێ □ « ... مهرکهبی سهگلاوێ له ئێختهخانهی دێنــا دهرێ بــه ئیــزنی خــولاَ و پێغهمبهری لێدهبۆسواره » ( تحفه : ج ٢ ــ ١٩٦ ) .

**ئیزن خواستن ــ** [ عا. کو. ] ، (مصـ. لا. ) ١ــ داوای ئیجازهکردن بــۆ کردنی کارێك :: ئیزنمــان لــه مامۆستا خواســت و هاتینــهوه ، دهبوایه ئیزن بخوازی نهك سهربهخۆ لێدهی بڕۆی . ٢ــ داوای ئیجازهی ڕۆیشــتن لــه خانــهخوێکردن ، خــواحافیزیکردنی میــوان لــه خانهخوێ . :: ســێ ڕۆژ میوانیان بوین ههر ئیزنمان دهخواست ئیزنیان نهدهدایین .

**ئیزندان ــ** [عا. کو.] ، (مصـ. متـ.) ١ــ ئیجازهدان ، ڕێگادان بــه کهسێ بۆ کردنی کارێك.::باغهوانهکه خۆی ئیزنی داین ئهم تووه بتهکێنین. ههرچــهندی بههانــهی هێنایــــهوه مامۆستا هــهر ئێــزنی نهدا . ٢ــ بهرهڵلاکردنی قوتابی و کرێکار و... له قوتابخانه و لهسهر ئێــش پاش تهواوبونی خوێندن و کاری ڕۆژانه. ٣ــ دهرکردنی کرێکار و کاربهدهست لهسهر کار . □ « قــادر ! بزانه و تاوزهند ، چهند ڕۆژی ئێش کردوه پارهکهی بدهیه و ئیزنی ده » . ٤ــ ڕازیبونی خانهخوێ بــه ڕۆیشتنی میوان . :: ئهوه بۆ هێنده پهلهتانه ؟ یهكدوڕۆژی دیکهش لێره بن ئــهو وهختــــی ئیزنتــــان دهدهیــــن و خواحافیزتان بێ .

**ئیزهارکردن ــ** [ عا : اظهار + کو : کردن ] ، ( مصــتـ. متـ. ) ١ــ ئاشــــــکراکردن ، خــــــستنهڕۆ ، وهڕۆخستن. ٢ــ گوتن، بهیانکردن.

**ئیزهارنامه ــ** [عا. کو.] ، (نتـ.)، (کئیرـ.) کاغهزێکه بازرگان و کاسب چلۆنایهتی کار و کاسبی ، قازانج و زیانی خۆیانێ تێدا دهنوسن و دهیدهن به ئیدارهی مالیــات بــهردهرامهت ( ضريبة الدخل ) ، یا دهربارهی ئهو کالاَیانهی له دهرهوه بۆیــان هــاتوه دهیدهن به گومرگ .

**ئیسپاتبون ــ** [ عا : اثبات + کو : بون ] ، [ عا. کو. ] ، ( مصـتـ. لا. ) ڕۆنبونــهوهی ئیددیعایهك بــه دهلیل و بهلگه . :: بۆمان ئیسپات بۆ که قهرزداره .

**ئیسپات‌کردن** ـ [ عا. کو. ] ، (مصد. مت. ) دەرخستنی ڕاستی ئیددیعایەك . :: دەفـەرموو بزانین چۆنمان بۆ ئیسپات دەکەی .

**ئیســــتڕاحەت** ـ [ = عـا : استراحة ] ، (نا.) تم : ئیسڕاحەت.

**ئیســـــتیخارەکردن** ـ [ عـا : استخارة + کو : کردن] ،(عا. کو.)، (مصد. مت.) فاڵ گرتنەوە بە قورئان یا تەسبیح یا هـەر شتێکی‌تر بـۆ ئەوەی بزانن کردنی کارێك باشە یان نا .

**ئیســـتیخبارات** ـ [ .عـا. ] ، (کعر.) ، ( مصـد. مت. ) خـەبەر وەرگرتن ، گەڕان بە شوێن دەنگ و باساندا ٢ـ ( نـا. ) دایرەیێکە بو کۆکردنەوەی دەنگ‌وباس و پاراستنی سوپای هەر دەوڵەتێك . ★ (کئێر.) ڕوکنی دوو . ٣ـ (مجـ.) ئەو کەسەی لەم دایرەیەدا ئیش دەکا .

**ئیســـــتیخدام‌کردن** ـ [ عـا : استخدام + کو : کردن ] ، (مصد. مت.) ڕاگرتنی کەسێ بۆ کردنی کارێ، ڕاگرتنـی یـەکێ و کردنـی بـــە کاربەدەستی دەوڵەت .

**ئیستیشهاد نامچــه** ـ [ عـا : استشهاد + کو. فر : نامچه ] ، (نت.)، (کئێر.) تم : ئیستیشهادنامە.

**ئیستیشهادنامە** ـ [عا. کو. ] ، (نت.) ، (کئێر.) کاغەزێکە چەند کەس مــۆری دەکـــەن و دەربـــارەی مەسەلەیەك یا کارێك شایەتی دەدەن ★ (کعر.) مەزبەتە .

**ئیستیعداد** ـ [= عا : استعداد]، (نمصـ .) ئـامادەیی ، ســازی :: ئیستیعدادی هەیە تابەیانی دانیشی، ئیستیعدادم نیـە هـەر قسەشیان دەگەڵ بکەم .

**ئیستیعفادان** ـ [ عا : استعفاء + کو : دان] ،(مصد. لا.) ، (کئێر.) تم : ئیستیقالەکردن .

**ئیستیعمار** ـ [= عا : استعمار = ئاوەدان کردنەوە] (نا.) سیاسەتی داگیرکەرانەی دەوڵـەتە سـەرمایە دارەکانە بۆ تاڵان کردنی دارایـەت و سـامانی ووڵاتانی دیـکە و کـەڵك وەرگـرتن لـە بـاری ئابـووری و ئیستڕاتیژی ئەوان ووڵاتانە . ئـەم سیاسەتە لـە دەورانی ئیمپریالیزما دەگاتە دواپلەی خـۆی . ( کورتەی قاموسی سیاسی ، موسـکۆ ، ل ـ ١٠٩). دەستەڵاتی ووڵاتێکی زۆردارە بە سەریەکی بێ زۆردا ، بۆ کەڵـك وەرگـرتن لـە ســـەرچاوە خـــۆ ڕســکاوەکان و دارایــەت و هێزی ئینسانی خەڵکەکەی ، بـە بەهانەی نابەجێی ئاوەدانکردنەوەی ووڵات و پێشخستنی نەتەوەکەی ( معیـن : فەرهەنگ، جا ، ل ـ ٢٥٣ ). ڕێ و شوێنێـکی ئیمپریالیستییە کـە بۆ خۆشی ژیانی نەتـەوە ئیسـتیعمار چییەکان نـەبێ هێـچ گوێ ناداتـە ئاوەدانکردنەوە ( لاڕۆس : ١٩٦١ ، ل ـ ٢٢٧ ) . تێبـ ـ ا) ئەم ووشەیە کە دەق بە مەعنای ( کۆلۆنیالیزم )ی فەڕەنگییە تا ئەم ساڵانەی دواییش بۆ ( کۆلۆنیالیزم ) و ( ئیمپڕیالیزم ) هەردوکیان بـەکار دەهێنرا ، بەڵام ئێسـتا فەرقیـان دەکرێـت . ب) تەحدیدی وورد و عیلمی ئیستیعمار

تەنیا لە لایەن مارکسیستەکانەوە و لەنوسینی ئەواندا بەرچاو دەکەویٚ و خەلکیٚتر موتلەقی داگیرکردن و چەوساندنەوەی وولات و نەتەوەیەك لە هەمو دەور و زەمانیٚکدا ـ نەك هەر لە قوناغی سەرمایەداریدا ـ بە ئیستیعمار دادەنیٚن ، جاداگیرکەر کیٚ دەبیٚ ببیٚ و چ ناویٚك لە کردەوەکەی خوی دەنیٚ و چ بر و بیانویٚك دینیٚتەوە بو تالانکردنی سامانی نەتەوەکە ، کەیفی خویەتی .

**ئیستیعمارچی ـ** [ عا. تو. ] ، (صفا) ، (کئیر.) ئەو دەولەتەی وولاتیٚکیٚتر داگیردەکا و نەتەوەکەی دەچەوسیٚنیٚتەوە و داراییەت و سامانی بە تالان دەبا . :: دەولەتە ئیستعمارچییەکان لە ٢٥ سالاندا ئاگری دو شەری گەورەیان هلگیرساند .

**ئیستیعماری ـ** [ عا. کو. ] ، ( ص. ) ١ـ هەر شتیٚکی پیٚوەندی بە ئیستیعمارەوە هەبیٚ . :: سیاسەتی ئیستیعماری، پیلانیٚکی ئیستیعماری، بیٚروڕای ئیستیعماری. ٢ـ هەرکەس یا هەیئەت یا دەولەتیٚکی بە پیٚی سیاسەت و ڕیٚ و شوێنی ئیستیعمار بجولیٚتەوە . :: ئەلمانیای نازی دەیەویست جیٚگەی ئەلمانیای ئیستیعماری پیٚش شەڕی یەکەم بگریٚتەوە .

**ئیستیعمالکردن ـ** [ عا : استعمال + کو : کردن ] ، (مصت. مت. ) دەکارکردن بەکار هیٚنان . :: ئەو دەرمانانە ئیستیعمالکە و کە تەواوبون وەرەوە لام . ئەری خو تو ئەم ڕادیویە ئیستیعمال ناکەی دە بیٚدە بەشیٚرکو . ئیٚمە ڕونی گیا ئیستیعمال ناکەین .

**ئیستیفادەکردن ـ** [عا : استفادە + کو : کردن ] ، (مصت. مت. ) ١ـ کەلك وەرگرتن ، فایدە وەرگرتن (لە کەسیٚ یا شتیٚ ) . ٢ـ قازانج کردن (لە سەودا و مامەلە،وەزیٚفە و هەمو جورە چالاکیٚکی لەم بابەتە ، بە ڕەوا و ناڕەوا ) . :: ئەم هەمو دەرمانەم خوارد هیٚچ ئیستیفادەشم لیٚنەکرد ، لەم دەستەکریٚ و لەو دەستە فروشتیەوە صەد دیٚناری ئیستیفادەکرد .

**ئیستیقالەدان ـ** [ عا : استقالة + کو : دان ] ، ( مصت. لا. ) (کعر.) تە : ئیستیقالەکردن .

**ئیستیقالەکردن ـ** [ عا . کو. ] ، (مصت. لا. ) ، (کعر.) ١ـ واز لە وەزیٚفە و ئیشی دەولەت هیٚنان . ٢ـ واز لە ئەندامەتی کوڕ و کومەلەی سیاسی و کومەلایەتی و ... هیٚنان . ★ ئیستیمفادان ، ئیستیقالەدان .

**ئیستیقبال ـ** [ = عا : استقبال ] ، ( نمص ) تە : ئیستیقبال کردن

☐ « مەزانو مەیو بە ئیستیقبالت »
«زەروڕەن بە دیٚن جەمیٚن لالت»
( خانا ـ ٨٧ )

**ئیستیقبالکردن ـ** [ عا. کو.] ، ( مصت. مت. ) ١ـ بەرەوپیٚرچون پیٚشوازکردن . ٢ـ بە خوشی وەرگرتنی قسە یا کاری کەسیٚك .

**ئیستیقلال ـ** [ = عا : استقلال]

(نا.) سەربەخۆبۆن و ئازادیی تەواوی وولاتێك لە كاروباری سیاسیی و ئابوریی و ... بێ ئەوەی بێگانە ( چ بە ئاشكرا چ بە نهێنیی ) دەستەلاتێكی هەبێ و دەست دە كاران وەربدا .

**ئیستیكان** ـ [ لەڕوسیی : ستەكان ] ، (نا.) دەفرێكی پچوكە لە شوشە دروست دەكرێ و چای پێ دەخورێتەوە .. ★ (كعر.) پیالە .

**ئیستیلاح** ـ [= عا : اصطلاح]، (نا.) ، ( كئێر. ) ووشە یا رستەیێكە كە بۆ مەبەستێكی تایبەتیی تەرخان دەكرێ :: زاویەی قایمە ئیستیلاحێكی هەندەسەیە، تەقاندنی ئاتۆم ئیستیلاحی فیزیكییە ، دەستنوێژ ئیستیلاحی دینیی ئیسلامە . **بەئیستیلاح** ـ ( كئێر. ) گۆیا ، هەروەك دەڵێن ، وەكو دەگوترێ . تێبـ ـ زیاتر بۆ گاڵتەكردن بە قسەی كەسی یا بەڕاستنەزانینی بەكاردێت . :: بە ئیستیلاح تۆبەی كردوە ئیتر قومارناكا .

**ئیستینتاق‌كردن** ـ [ عا : استطاق + كو : كردن ] ، ( مصت. مت.) ، (كئێر.) وە قسە هێنان ، پرسیار لێكردن،سوال و جواب‌كردن دەگەڵ كەسیێ ( بۆ ڕۆن‌كردنەوەی مەسەلەیێك ) ، قسە لێ دەركێشان. ★ (كعر.) ئیفادە وەرگرتن .

**ئیستینكاف‌كردن** ـ [ عا : استنكاف + كو : كردن ] ، ( مصت. لا. ١ـ بەعەیب زانینی كاریێ . ٢ـ سەر كێشیی‌كردن ، نەكردنی كارێك :: هەر ئیستینكاف دەكا قسەشیی دەگەڵ بكا ، كەوایی ئیستینكاف دەكەی ؟

**ئیستیئناف** ـ [ = عا : دەست پێكردنەوە ، تێ‌هەڵچونەوە ] ، (نا.) ١ـ ( كئێر. ) قۆناغی دوەمی دادگا ، دادگایەكە بۆ جاری دوەم تەماشای كێشەیەك دەكاكە دادگایەكی‌تر لە پێشدا حوكمی تێدا دابێ. ٢ـ (كعر.) قۆناغی پاش قۆناغی دادگای تەمێز .

**ئیستیئناف‌كردن** ـ [ عا. كو. ] ، (مصت. مت.) ١ـ ( كئێر. ) داوای تەماشاكردنەوەی كێشەیەك كە لە پێشدا بڕیاری دادگای لە سەر دەرچو بێ . ٢ـ ( كعر. ) داوای‌تەماشاكردنەوەی بڕیاری دادگای تەمێز لە سەر مەسەلەیەك .

**ئیسحال** ـ [محر. عا : اسهال]، (نمص) تم : ئیسهال .

**ئیسڕاحەت** ـ [ = عا : استراحة ] ، ( نمص. ) حەسانەوە ، ئاسودەیی :: ئەم مندالە ئیسڕاحەتی لێ هەڵگرتوین شەو تا ڕۆژ هەر دەگریێ .

**ئیسڕاحەت‌كردن** ـ [عا. كو.] ، (مصت. لا.) ١ـ ماندویی دەركردن ٢ـ ماندویی دەرچون . ٣ـ (مجـ.) دڵنیابون ، خاترجەم بون ، دامركان.

**ئیسڕاركردن** ـ [ عا : اصرار + كو. : كردن] ، (مصت. لا.) پێ‌داگرتن سوربون لە سەر كاریێ ، لە سەر (مەسەلەیێ) ڕۆیشتن .

**ئیسڕاف‌كردن** ـ [ عا : اسراف + كو : كردن] ، (مصت. لا.) ١ـ زۆر خەرج كردن ، بێ‌جیێ خەرج‌كردن (پارە) . ٢ـ لە حەد تێپەڕاندن ،

زیادڕۆیشتن ( بۆکار و قسە )
۳ـ زۆر خواردن .
**ئیسفەند ـ** [ فر. ] ، ( نا. ) (کئیر.) مانگی دوازدەهەمی سالی ئێرانی (ـ۲۱ی شوبات ـ ۲۱ ئازار)، ئاخر مانگی زستان . ★ ڕەشەمە تێب ـ ئەم مانگە ۲۹ ڕۆژە و هەر بە چوار سال جاریَ دەبێتە سیَ ڕۆژ.
**ئیسقات ـ** [ = عا : اسقاط ] ، (نا.) خێراتێکە پاش مردنی کەسێك و پێش ناشتنی بۆی دەکریَ و بە دەستوری ئیسلامەتی جێگەی ئەم نوێژانە دەگرێتەوە کە کابرای مردو بە زیندیَ سەری خۆی نەیکردون و ئەو ( ڕۆژو )انەی خواردونی . :: وەسێتی کردوە ئیسقات و تەلیلەی بۆ بکەن .
**ئیسقا (یَ) ـ** [ محر. عا : استسقاء ] ، (نا.) تم : ئاوبەند
□ « کیَ بە کەدوی ئەو نوشا ئاو سەرد »
« نەوی جە ئیسقا وێنەی کەدو زەرد »
( خانا ـ ۱۵۱ )
:: ئەوە بۆ هێندە ئاو دەخواتەوە دەلەی ئیسقایی گرتوە .
**ئیسکارپێن ـ** [ ئیتالیَ ] ، (نا.) ، (سیم.) جۆرە کەوشێکی ژنانەیە لە دار دروست دەکریَ و تێزمالکە چەرمێکی لێدەدریَ کە سەر پەنجەی دەچێتە ناو . ★ پانی بەرز . تێب ـ ئەم وشەیە لە (سکارپێنا)ی ئیتالیَ وەرگیراوە بە مانای کەوشی پچوك یا جوانکیلە ، لە کاتی دەستەلاتی عوسمانیدا لە ڕێگای زمانی تورکیَڕا هاتوتە ناو زمانی کوردیَ . □
«بالابەرز و پچکولە پیَ و ئیسکارپێن»
« گورەویَ و پوز سفت و سپیَ و ئاورێشمێن »
(گۆران) .
**ئیسکلێت ـ** [فرنسیَ] ، ( نا.) ، (کئیر.) ۱ـ هەمو ئێسقانی لەشی بنیادەم و گیاندارانیتر کە تێفەرەی پشتیان هەیە ( ئی بنیادەم ۲۰۸ پارچەیە) بەو شکلەی تەبیعەت ڕێکی خستوە و تێکیخستونەوە ، هەیکەلی عەزمیَ . ۲ـ أ) شکل و قەوارەی خانوبەرە ، کە لەسەر ڕیَوشوێنی تازەی دروستکردن لە پێشدا پایە و کولەکەکانی هەلدەستێنن . ب) هەیکەلی هەندی مەکینەی گەورە کە نیشان بدا لە پێشدا چون بوە یا لە پاشان چ شکلیَ بە خۆیەوە دەگریَ . :: ئیسکلێتی چەند ئوتومبیلی سوتاو لەو دەشتە کەوتبون . ۳ـ ( مجـ.) ئادەمیزادی لەغەر و لاوازی ڕەق و تەقی بیَگوشت . تێب ـ زمانی فرەنسیَ ئەم وشەیەی بە شکلی ( ئێسکلێت ) لە ( سکێلێتوس )ی یونانیَڕا کە مانای(ئیشك هەلاتو)دەدا، خواستوتەوە ( تم : لاڕوس ـ ۸۷۸) وفارسێش لە فرەنسیَ وەرگرتوە و لە سەرەتای ئەم چەرخەدا لە ڕێگای زمانی فارسییەوە هاتوتە ناو زمانی کوردیَ .
**ئیسلاحبون ـ** [عا : اصلاح + کو : بون ] ، (مصت.) ۱ـ چاکبونی مەعنەویَ . ۲ـ چاکبونەوەی شتێکی خراپبوبیَ .
**ئیسلاحکردن ـ** [ عا. کو. ] ،

( مصت. مت. ) ١ـ چاك‌كردن ، چاك‌كردنەوە ( مەعنەوی‌وماددی ) . ٢ـ نەهێشتنی کەم و کوڕیێ ( لە ئینسان یا لە دەزگایەکی ئیداری و ...دا) ٣ـ لابردنی خراپیێ و شکاویێ و لە کارکەوتەییێ (لەماکینە و ...دا) ٤ـ ( مجـ.) ، ( کئیر. ) ڕیش‌تاشین، چاك‌کردنی سەر لای سەرتاش .

**ئیسلام ـ** [= عا : اسلام ] ، (نا.) ١ـ دینێکی حەزرەتی محەممەدی کوری عەبدوللای قورەیشیێ ( د.خ. لێبی ) پێغەمبەرێتی ٢ـ ( مجـ.) مسولمان .

**ئیسلام‌بوێن ـ** [ عا. کو. ] ، (مصت.لا.) قبوڵ‌کردنی دینی حەزرەتی محەممەد ( د. خ. لێبی ). ★ مسولمان‌بوێن .

**ئیسلامەتیێ ـ** [ ئیسلام + ئەتیێ ] ، [ عا. کو. ] ، (حمصـ.) ئاکار و کردەوە و ڕەووشتی دینی ئیسلام بە تێکڕاییێ .

**ئیسم ـ** [= عا : اسم ] ، (نا.) ١ـ تم : ناو . ٢ـ تم : ئەفسوێن/١ :: ئیسمێکی لێ‌خوێند کردیێ بە بەرد . **ئیسمی‌ئەعزەم ـ** [= عا : الأسم الأعظم ] گەورەترین ناو . تێبـ ـ لە ناو ئەو ناوانەی کە خوا هەیەتی ، یەکێکیانە ، وەکوێ دەڵێن هەر کەس بیزانیێ هیچ کارێکی لە بەر عاسیێ نابیێ . **ئیسمی‌شەریف ـ** ( کئر.) ڕەستەیەکە پرسیاری ناوی کەسێکی پیێ‌دەکری ، لە ئەسڵا ( ئیسمی شەریفتان چیە ؟ )یە و کورت‌کراوەتەوە ، بەکارهێنانی نیشانەی ئەدەب و ئیحتیڕامە . :: قوربان ئیسمی شەریف (... تان چیە ؟ ) . **ئیسمی‌فاعیل ـ** [عا.] ناوێکە نیشان دەدا کە کەسیێ کاریێ دەکا یاحاڵێکی تایبەتیێ هەیە . :: بکوژ ، بڕ ، بخۆر ، خوێنەر ، جوێتیڕ . **ئیسمی مەصدەر ـ** [عا.] ووشەیەکە لە فیعل دادەتاشریێ و دەلالەت‌لەسەر مەعنای مەصدەر دەکا ( نەمەصدەرێشە و نەڕیشەی فیعل) :: بڕشت ، تابوشت ، توانست ، خواست ، خوارشت ، خۆرشت ، خارشت، زانست. **ئیسمی‌مەفعوڵ ـ** [ عا.] ناوێکە ، پێشاندەدا کەسێك یا شتێك کاری‌تێکراوە (فیعلی واقیع بوێتە سەر) :: بڕاو ، بڕیاگ ، پاڵاوتە، پا ڵێوراو، خەوتوێ، نوستوێ، کوژیاگ، مردگ ، مردوێ . **بەئیسمی‌خودای ـ** شێوە ڕستەیەکە بوێ سوێند خواردن :: بە ئیسمی خودای ئاگا و خەبەرم لیێ نیە .

**ئیسم‌وڕەسم ـ** [عا.] ، (نت.)، (کن.) ناو و شوێرەت ، ناوبانگ ، ئاوازە . :: هێندەی باس دەکەن ، کوا ؟ خوێ چ ئیسم و ڕەسمێکی ئەوتوێی نیە .

**ئیسهال ـ** [= عا : اسهال ] ، (نا.) نەخوێشیێ زگ‌چوێن . ★ ئیسحال ، زگ‌چوێن ، زگەشوێرە ، زەحیریێ ، دیزەنتریێ .

**ئیسهال‌بوێن ـ** [ عا. کو. ] ، (مصت. لا.) تم : ئیسهال‌گرتن .

**ئیسهال‌گرتن ـ** [عا. کو.] ، ( مصت. لا. ) توێشی نەخوێشی زگەشوێرەبوێن .

**ئیشارە ت ــ** [ = عا : اشارة ] ، (نا.) کارێکە بێ قسەکردن مەبەستی پێ ئەدەکرێ . □ «دەمێ تۆ نەیئیی دەم وەبان دەم ، خودا بێبژێ ئیشارەت وەچەم » . :: بە ئیشارە تێم گەیاند کە قسە نەکا .

**ئیشارە (ت) کردن ــ** [عا. کو.]، ( مصد. لا. ) ١ـ بە دەست و چاو یا برۆ قسەدەگەڵ کەسێ کردن . ٢ـ دەربڕینی مەبەست بە بێ قسە کردن ٣ـ نیشان‌دانی کەسێ یا شتێ بە پەنجە لە دوورەوە ، پەنجە بۆڕاکێشان .

**ئیشاعە ــ** [ = عا : اشاعة ] ، (نا.) ، (کعر.) خەبەر یا قسەیەك (ڕاست‌یادرۆ) کە لە ناو خەڵکا بڵاو ببێتەوە و دەماودەم بڕوا . :: دوێنێ ئیشاعە وابو دز کاروانەکەیان ڕوت‌کردوە . ★ (کئێر.) شایعە .

**ئیشاڵڵا ــ** [ = عا : انشاءالله ] ، ( رستە ) ئەگەر خوا بیەوێ ، ئەگەر خوا حەز کات . :: ئیشاڵڵا بەیانی دەچمە شار ، ئیشاڵڵا کتێبەکەت بۆ هێناوم .

**ئیشتیبا هـ ــ** [= عا : اشتباه] ، (نا.) . ١ـ (کئێر.) سەهو ، غەڵەت . :: میرزازەشید هەمیشە لە حیسابدا ئیشتیباهی هەیە. ٢ـ (کعر.) شك، گومان ، دودڵی .

**ئیشتیبا (هـ) کردن ــ** ، [ عا. کو. ] ، (مصد. لا.) ، ( کئێر. ) ١ـ لە حیسابدا سەهوکردن . ٢ ــ لەکاراندا بە هەڵەچون .

**ئیشتیباه لێکردن ــ** [عا. کو.] ، ( مصد. لا. ) ، ( کعر. ) ١ـ شك‌کردن لە کەسێ کە ڕەنگە کارێکی کردبێ :: ئیشتیباهی دزییان لێکردوە بۆیە گرتویانە . ٢ـ شك لە نەخۆشی‌یەك کردن کە تۆشی کەسێك بوبێ . :: دوکتۆر دەیگوت ئازاد ئیشتیباهی سیلی لێدەکرێ .

**ئیشتیڕاك ــ** [ عا : اشتراك ] ١ـ (نا.) هاوبەشی ، بەشداری ٢ـ (نمص.) تم : ئیشتیڕاك‌کردن .

**ئیشتیڕاکات ــ** [ = عا. جمی : اشتراك] هەمو ئەو پارەیەی ئیدارەی ڕۆژنامەیەك لە کڕیارەکانی ، یا ڕێکخراوێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، لە خەڵکی سەربەخۆی وەری دەگرێ .

**ئیشتیڕاك‌کردن ــ** [ عا. کو. ]، (مصد. لا.) ١ـ بەشداربون لە کارێکدا ٢ـ کڕینی ڕۆژنامە و گۆڤار و ... بە ڕێك و پێکی ، ڕاستەوخۆ لە ئیدارەکەیان. ٣ـ بونە ئەندام لە ڕێکخراوێکدا ، بەشداربون لە کۆبونەوەیەکدا .

**ئیشتیها ــ** [ = عا : اشتهاءِ ] ، (نا.) تم : ئیشتیبیا .

**ئیشتیبیا ــ** [محر. عا: اشتهاءً] ، (نا.) ١ـ ئارەزوی خواردەمەنی ٢ـ مەیل ، ڕەغبەت .

**ئیشتیبیاکردن ــ** [ عا. کو. ] ، (مصد. لا.) ئارەزوی خواردەمەنی و چێشتێکی تایبەتی‌کردن :: لە پاڵەوە دانیشتوە و وردە ئیشتیبیایان دەکا ، لە ئەوروپا پیاو ئیشتیبیای قبوڵی دەکا .

**ئیشتیبیالی‌بون ــ** [ عا. کو. ] ، ( مصد. لا.) ١ـ زۆر حەز لە

خواردنێکی معیەن کردن . :: هەتا دەچمە ماڵی نەوزاد دۆڵمەیان هەیە ، دیارە زۆری ئیشتیبا لیێەتی . ٢ـ مەیل بە کردنی کارێ یا دەگەڵ شتێ :: ئەوە چیە هێندەت ئیشتیبا لە قسانە ، سەربەست ئیشتیبای لە سەفەران نیە .

**ئیشتیبیانەبردن** ـ [عا. کو.] ، (مصد. لا.) ١ـ حەز لە خواردنی خواردەمەنیێکی معیەن نەکردن . :: خەڵکی شار ئیشتیبیایان چەنگ سۆتەکە و ئەو جۆرە چێشتانە نابا . ٢ـ (کن.) تێرخواردن لە چێشتێك ، کەم خواردن و ئارەزۆ بەسەرچۆن لە خواردەمەنیەك ، حەز بە خواردن نەکردن . :: وەرە بە زیادێ کە ئیشتیبیام نابا .

**ئیشغاڵکردن** ـ [عا : اشغال + کو : کردن] ، (مصد. مت.) (کئێر.) ١ـ خەریككردنی کەسێ ، لەکارکردنێ :: پیاوی چاك بە ئیشغاڵمان مەکە کارمان هەیە . ٢ـ داگیرکردنی شارێ یا وولاتێ یا جێگایەك بە زەبری لەشکر . :: هیتلەر هەمۆ ئەوڕۆپای ئیشغاڵ کرد . ★ (کعر.) ئیحتیلال . ٣ـ (کعر.) پڕکردنەوەی شوێنێك (بە دانیشتن یا وەزیفە) :: خۆیەتی و لینگی ژنی ئەو خانوە زلەی ئیشغاڵ کردوە . چەند وەزیفە هەبۆ تا خۆم گەیاندێ هەمۆی ئیشغاڵ کرابۆ .

**ئیشك** ـ [ست : هوشکە ، پە. هوشك] ، (صە.) ١ـ شتێك یا جێگایەك ئاوی نەبێ ، شەی نەبێ ، نمی نەبێ . :: کانێ ئیشك ، دەشتی ئیشك ، تفی لە زارێدا ئیشك بۆ . ٢ـ حاڵی شتێکی لە پێشدا تەڕایێ تێدا بۆبێ ، پاشان نەی مابێ . :: گیبای ئیشك ، داری ئیشك ، هەنجیری ئیشك □ «دارێکی بە تەڕێ دانەیە بە ئیشکی دانایێ» . ٣ـ (مج.) ئینسانی لاسار و دۆر لە مجامەلە . :: پیاوی هێندە ئیشك هەر نابێتەوە . ٤ـ (مج.) دانیشتنی دۆست و برادەر بە بێ خواردنەوە . :: هەروا بە ئیشکی دانیشتن ناخۆشە با پێکێ بخۆینەوە . ٥ـ (مج.) بێپێخۆر . :: نانی ئیشکی ، سێ نانی بە ئیشکێ خوارد و چوارێش بە دۆوە . ★ ووشك ، ویشك ، هیشك .

**ئیشکارۆ** ـ [ئیشك + ئارۆ (؟)] ، (نت.) ، (مکـ.) مەڵبەندی بێ ئاو و گیبا . تێب : بۆ کەرتی دوەمی ئەم ووشەیە (ئارۆ) هس : ئاران .

**ئیشکال** ـ [= عا : اشکال] ، (نمص.) ، (کئێر.) دژوارێ ، ئاڵۆزێ ، نارەحەتێ . :: زۆری ئیشکال تێدایە ، ئیشکالێکی گەورەیە ، ئیشکالی تێ خستوە . ★ (کعر.) موشکیلە .

**ئیشکالتراش** ـ [ئیشکال + تراش] ، [عا. کو.] ، (نفا.) ، (کئێر.) ئەو کەسەی کاران وەگران دەخا ، ئەوەی کۆسپ دێنێتە بەر کاران . :: ئیشکالتراشی وەك خدری هەر نابێتەوە .

**ئیشکالتراشی** ـ [ئیشکالتراش + ٢ـ ئێ] ، [عا. کو.] ، (حمص.) ، (کئێر.) کۆسپ هێنانە سەر ڕێی جێبەجێبۆنی کاران ، تەگەرە

تێخســـتن . :: ئەوەنـــدەی ئیشکاڵتراشێ کرد یەکجارێ وازم لە کارەکە هێنا .

**ئیشکانێ ــ** [ ئیشك + ئانی/٢]، (نت.) ١ــ هەر شوێنێکی ئیشك کـە دەور و بەری قوڕ و چڵپاو بێ . :: ڕۆڵـە بە ئیشـکانییەکەدا بـڕۆ بـا کەوشەکانت قـوڕاوێ نەبـن . ★ ئیشکایێ . ٢ــ جێگا ووشکەکانـێ سەر زەوێ // دەریا :: پاش حەوت ڕۆژان ئیشـکانێ دەرکـەوت . ٣ــ [ ئیشك + ئانی/١ ] ، ( صت.) ئەو حاڵەی پاش تەواوبوونی تەر و قوڕی زستان بە سەر زەویدا دێ . :: لە باران بڕانەوە ئیتر ئیشکانێ دەست پێدەکا .

**ئیشکاو ــ** [ ئیشك + ١ــ ئاو ] ، ( نت.) ، ( مج.) دوایێ کاران یا شتێ

**ئیشکاووزــ** [ئیشك+١ــ ئاو+ وەز ] ( صت.) ، ( هلـ.) دەغلێکـی پێش بارانی پەلە چاندرابێ . تێبــ کەرتی سێیەمی ئەم ووشەیە بە لای منـەوە (وەرز)ەکـە یەکێـك لــە مەعنـاکانی بە زمـــانی پەهلـەوێ (چاندن)ە (تم: فره، پفاــ٤٥٤) و هەر ووشەی (وەرز)ی ئیستای خۆمانـە کە بە مانـای ( حـول )ی عەرەبـی بەکاردێت .

**ئیشکاوهاتن ــ** ( مصـت. لا. ) ١ــ بڕانەوە و جارێنەبوونی ئاو بـە جۆگەدا . ٢ــ ( مج.) دوایێهاتن ، بڕانەوە و تەواوبوونی هەر شتێکی تر □ « وەکو کەو لە فڕە چۆ ، دارم لە گونجێ »

« قسەی ڕاکرد و هات ئیشکاوی دەنگێ »
ر ( هەژار )

**ئیشکایێ ــ** [ ئیشك + ئایی/١]، ( نت.) تم : ئیشکانی/١ .

**ئیشكبوون ــ** ( مصت. لا.) ١ــ بڕان و بڕانەوەی ئـاوی ڕووبـار و کانیاوان :: هەموو ساڵێ لەم مانگەدا کانێ ( پیرمەلەك )ئیشك دەبێ . ٢ــ نەمانی نم و شەیتەبێتی لە شتێکدا :: بڕانە ! توتنەکە ئیشك بوە ؟ داری شەخسەکانی سێتەك هەموو ئیشـك بوون کەس نەیدەوێرا دەستیان بۆ بەرێ . ٣ــ مردنی گیاو گوڵ و دار و درەخت و کشتوکاڵ لەبەر بێ ئاوێ یا هەر هۆیەکی‌تر :: ئـەم بێســتانە بۆچێ ئیشك بوە ؟ پەڵـە توننەکەی کوێخا توفیق ئیشكبوە . ٤ــ (مج.) لە جوڵەکەوتن :: کابرا وەها حەپەسا هەر لە جێی خۆی ئیشك بو .

**ئیشكبوونـەوە ــ** ( مصت. لا. ) ١ــ نەمانی شوێنەواری تەڕی لە هەر شتێکا کە خۆی لە ئەسـڵا تەڕایـێ نەبێ و لە لاوە تەڕبوبێ ( شـۆرابێ ، ئاو یا شـتێکی دیکەی پێدارژابێ ، کەوتبێتە ئاوەوە . . .) :: کراسەکەت بەرە هەڵێخە هەر ئێستا ئیشـك دەبێتەوە . ٢ــ پەیدابوونی ئیشکانی لە سەر زەوێ :: دنیا هەموی ئیشك بوتەوە کەچێ ئەم دێبـەرەی ئێمـە هەروەکو خۆیەتێ .

**ئیشك‌کردن ــ** ١ــ (مصت. مت.)، ا ) نەهێشتنی تەڕایێ لە شتێکدا کە خۆی تەڕایێ هەبێ ، بە هەر هۆیەکی لەلاوە. :: لە کوردستان گەلێ میوە و

گیا و گوڵ ئیشك دەکەن و هەڵیدەگرن بۆ زستانێ . ب) بە کارێکی مەعنەوێ (بەدقەدەمێ ، چاوپێسێ ، بێشانسێ ...) خێر لە کارێك یا شتێك بڕێن ، کەلك پێوە نەهێشتن □ « بچێتە سەر ستێروان ئیشکی دەکا » . ٢ـ (مصت. لا.) ، أ ) تم : ئیشك‌بوون/١ :: هەموو ساڵێ لەم مانگەیدا کانی پیرمەلەك ئیشك ( ئیشکی ) دەکا . ب ) بڕانی شیری مەڕ و بزن و مانگا و ... :: مانگاکەی ماڵی حاجی شەریف ئیشکی کردوە .

**ئیشك‌کردنەوە ـ** ( مصت. متە.) نەهێشتنی تەڕایێ لە سەر شتێکی کە لە لاوە تەڕکرابێ یا تەڕ بووبێ . :: دە وەرنە نێزێك سوبەکە خۆتان ئیشك کەنەوە ، ها ! ئەوە خاولێ دەم و چاوتێ پێ ئیشك‌کەوە . ٢ـ ( کنـ. ) پاشەکەوت‌کردن ، دەست‌پێوەگرتن ، لەچەرێ‌کردن. :: بە قوربانە ! لیرەکان دەست لێ مەدە هەر ئیشکیان کەوە . هێچ خەرج ناکا هەر خەرێکە پارەکانی ئیشك دەکاتەوە، ئەم منداڵانەی لە برسان ئیشك‌کردووتەوە. تێب ـ بە کارهێنانی ئەم ووشەیە بەم مانایانە، سەرکۆنەی تێدایە .

**ئیشك و برینگ ـ** [ ؟ ] ، (صتـ.) هەر شتێکی هێچ تەڕایێ تێدا نەبێ . :: کچێ بڕۆ هەی مەکرباز ! قوڕی چی ؟ دنیا ئیشك و برینگە .

**ئیشکە ـ** [ئیشك + ە ـ ئە/٢]، (صتـ.) ١ـ مەڕ و بزن یا مانگا یەکێ نەزابێ . ٢ـ پارەیێکی لە لاوە دانراوبێ و نەخرێتە سەوداوە . :: دە هەزار دینار پارەی ئیشکەی لە ماڵێ هەیە .

**ئیشکەدۆ ـ** [ ئیشکە + دۆ ] ، (صتـ.) ، (کیـ.) حەیوانێکی نەزابێ و شیری هەبێ

**ئیشکەڕن ـ** [ ئیشك + ٣ـ ئە/٢ + ڕن ( ڕنینەوە ) ] ، ( نتـ. ) ١ـ کاری ڕنینەوەی خورێ و موی کەوڵێ مەڕ و بزن کە بە زیندوویێ نەبڕابنەوە . ٢ـ (مکـ.)یەکێکە لە عناصری یارێ ( میرمیرێن ) کە تا بیست سێ ساڵ لە مەوپێش لە کوردەوارێدا باو بو. تێب ـ ئیشکەڕن زەلامێك بو جلکی سەیری دە بەردەکرا ، ڕێشێکی گەورەیان لە خورێ بۆ دەکرد ، کولەکە ئاوییەکی درێژۆکەشی لە باتێ کڵاو دەکردە سەر و گۆپاڵێکی گەورەی بە دەستەوە دەگرت ، ئەم پیاوە دوو ئیشی هەبو ، یەکیان جێبەجێ‌کردنی هەموو فەرمانێکی میر ، دوەمیان وەپێکەنین خستنی میر تا بەپێی ڕێ و شوێنی یارییەکە لە میرێتێ بکەوێ .

**١ـ ئیشکەڕۆ ـ** [ ئیشکە + ڕۆ ( ڕۆیین ) ] ، ( صتـ. ) ووڵاغی بەرزە کە خێرا نەڕوا ، گران بڕوا و دەست و قاچی خراپ باوێژێ . // خۆشڕۆ .

**٢ـ ئیشکەڕۆ ـ** [ ئیشکە + ڕۆ = ڕۆبار ] ، ( صتـ.) حاڵی ڕۆبارێکی هەندێ وەخت ئاوی پێدادێ و کاتێکیش وشکێ دەکا .

**ئیشکەسوڤی ـ** [ ئیشك + ٣ـ

ئە/١ + سۆفیَ] ،(نتـ.) ١ـ سۆفیێکی زۆر بە تەنگ جیَبەجیَکردنی داب و دەستووری سۆفیاتیەوە بیَ ، سۆفیَ متعصب □ « زەمزەمەی بولبولی بەهارانی ، ئیشکەسۆفیَ دەخاتە گۆرانیَ » (؟) ٢ـ کەسێکی وا پیشان دەدا کە سۆفییە و ئاکاریشی سۆفیانە نەبیَ . تیَبـ ـ بەم مانایە وەکو لاتاو بەکاردیَت .

**ئیشکەسەرما** ـ [ ئیشك + ٣ـ ئە/١ + سەرما ] ، ( نتـ. ) سەرمایەکی بەفر یا بارانی دەگەلّ نەبیَ . :: ئیشکە سەرمای کەرکوك لە مۆخی ئیسقان کاردەکا .

**ئیشکەکەلەك** ـ [ ئیشك + ٣ـ ئە/ + کەلەك ] ، (نتـ.) دیواری بەرد ، کە بەردەکان چین‌چین لە سەریەك داندرابن بیَ ئەوەی قوڕیان لە بەیندا بیَ . :: بەردەمی ئەشکەوتەکەی (خلەگەر)مان بەئیشکە کەلەك هەلّچنیَ .

**ئیشکەلّ** ـ [ ئیشك + ئەلّ/٢]، (نتـ.) لق و پۆپی ئیشکبۆی دار و درەخت .

**ئیشکەلوا** ـ [ ئیشك + ٣ـ ئە/١ + هەلوا ] ، (نتـ.) هەلوای ئیشك : تیَبـ ـ خواردنیَکە لە ئاردوروَن و دۆشاو یا شیرەی شەکر ساز دەکریَ ، زیاتر بۆ سەفەری دوور ( حەج و ... ) دەگەلّ خۆیان دەبرد .

**ئیشکەمس** ـ [ ئیشك + ٣ـ ئە/ + مس = مز ] ، ١ـ ( نتـ. ) مۆچەی کریَکار کە نان‌خواردنی دەگەلّ نەبیَ ( زیاتر مەبەست نانی نیوە رۆیانە ) ، ٢ـ ( صتـ. ) ، أ) کریَکاریَکی بە رۆژانەی رووت کار دەکا و نان لە سەر حیسابی خاوەن‌کار ناخوا . ب) کاریَکی بەم شیوەیە بکریَ :: بە ئیشکەمس ئەو پەلە دەغلە بدروونەوە، ئیشکەمس ئەو دیوارەمان بە چەند بۆ دادەنیَن ، کاری ئیشکەمس هەروا دەبیَ .

**ئیشسكهەلاتن** ـ [ ئیشك + هەلّ + هاتن ] ، ( مصتـ. لا.) ، ١ ـ رەق‌بوون و شکلّ تیَکچوونی هەندیَ شت ( پیست ، نان ، کەشك ، ... ) ٢ـ ( کنـ. ) رەق و تەق و باریك‌بوونی گیاندار ( بە تایبەتیَ ئینسان ) لەبەر نەخۆشیَ یا برسیَتیَ و نەخواردن .

**ئیشك هەلّیَنان** ـ [ ئیشك + هەلّ + هیَنان ] ، ( مصتـ. متـ. ) ، (کنـ.) برسیَ‌کردن و گرتنەوەی خواردن لە کەسیَ یا کەسانیَ و بوونە مایەی نەخۆشییان :: ئەو مندالانەی ئیشك‌هەلّیَناوە هیَچیان ناداتیَ بخۆن، هیَندەی نان و دۆ دەرخواردددا تا بە جاریَك ئیشکی هەلّیَنا .

**ئیشکیل** ـ (نا.) ، ١ـ (مکـ.) پارچە تەختەیەکی شیَوە سیَ سوچیَ دریَژۆکەیە ، بە تاقە بزماریَك لە لای سەر و خواری پەنجەرە دادەکوترا بۆ ئەوەی نەهیَلیَ بکریَتەوە . ★ شەیتانۆکە ٢ـ ( سنـ. ) پیَوەند یا هەر شتیَکی‌تر کە دەست و قاچی وولاغی بەرزەی پیَ دەبەستنەوە . ٣ـ ( مجـ. ) ، ( سنـ. ) فەرمان ، حوکم ، دەستەلات .

**ئیشکێل‌کردن ـ** ( مصت. مت. )، (سن.) ، ١ـ پاشبەند و پێشبەند کردنی وولاغی بەرزە :: بەم گوریسە ماینەکە ئیشکێل کە با ڕانەکا . ٢ـ بەستنەوەی دەستێك و قاچێکی وولاغ بۆ هەر مەبەستێ بێ .

**ئیعادەکردنەوە ـ** [عا : اعادة + کو : کردنەوە ] ، ١ـ ( مصت. لا. ) دوپاتەکردنەوەی قسە ، سەرلەنوێ خوێندنەوە یا گوتنەوە . :: چەند جارمان لێ ئیعادەکردەوە ، ئەوجار تێنەگەیشت . زۆر سەیرە دەجار قسەیەك ئیعادە دەکاتەوە . ٢ـ (مصت. مت.) ، أ) ڕەت کردنەوەی شتێك بۆ خاوەنی . :: کتێبەکەم بۆ ئیعادەکردەوە ، هێشتا پارەکەی شێرکۆی ئیعادە نەکردۆتەوە . ب) گەڕاندنەوە و ناردنەوەی شتێك بۆ شوێنێ . :: ئەوڕاقەکانیان ئیعادەی بەغدا کردۆتەوە .

**ئیعاشە ـ** [ = عا : اعاشة = ژیاندن ] ، ١ـ ژیان ، گوزەران :: ئیعاشەی بە چییە ؟ ★ مەعیشەت. ٢ـ ( کعر. ) دایرەیێکی حکومەتییە بە کاروباری ئازوقە ڕادەگا (**مدیریة الأعاشة العامة** ) . :: نانی ئیعاشە بە پێنج فلسانە .

**ئیعانە ـ** [ عا : اعانة = یارمەتێ دان ] ، ١ـ (نمصد. ) یارمەتێ دان ، کۆمەگ کردن . ٢ـ (نا.) پیتاك .

**ئیعانەکۆکردنەوە ـ** [ ئیعانە/٢ + کۆ + کردنەوە ] ، [ عا. کو.] ، ( مصت. مت. ) خڕکردنەوەی پارە یا هەر شتێکی دیکە لە خەڵك ، بۆ یارمەتیدانی کەسێك یا هەیئەتێکی کۆمەڵایەتێ یا بۆ کاری خێر . :: مزگەوتەکە ڕۆخابو ئەهلی گەڕەك ئیعانەیان کۆکردەوە و چاکیان کردەوە .

**ئیعتبار ـ** [= عا : اعتبار ] ، (نا.) ١ـ نرخ ، بایەخ :: قسەی ئەم پیاوە ئیعتیباری بۆ نیە . ئەوەندەیان درۆ کردوە قسەیان ئیعتیباری نەماوە . ٢ـ باوەڕێ ، بڕوا ، بە حیساب هاتن . :: ئیعتیباری پێ مەکەن . پیاوی هەلمەتەکاسە بە هێچ ئیعتیبار ناکرێ. ٣ـ ( کئێر. ) ، أ ) ئەو باوەڕەی بازرگان یا بانك بە کەسێکی دەکا و پارە یا کاڵای بە قەرز دەداتێ :: ئیعتیباری ملیۆنێکی لە بازاڕ هەیە. بانك ئیعتیبارێکی صەت هەزار تمەنێ بۆ کردۆتەوە . ★ ( کعر. ) ئیعتیماد . ب) میقدارێك پارەیە لە بودجەی دەولەتێدا بۆ مەبەستێك تەرخان دەکرێ . :: ئیعتیباری سۆتەمەنێ مەدرەسەکانی مەهابات سالێ ٢٥٠ تمەن بۆ . **بە ئیعتیباری...** ( کعر. ) لەبەر ئەوەی ...، بەو حیسابەی کە ... :: بە ئیعتیباری ئەوەی ئێوە لە کۆنگرەکە بون باش دەزانن بڕیارەکانی چن . **لە ئیعتیباری ... وە ـ** ( کعر. ) لە ... وە بەدواوە . :: لە ئیعتیباری ئەم سەعاتەوە ئیتر من قسە لەم مەسەلەیە ناکەم .

**ئیعتیبارپێ‌کردن ـ** [عا. کو. ] ، ( مصت. لا. ) ، ( کئێر. ) باوەڕکردن بە کەسێ لە هەر بابەتێکەوە بێ .

**ئیعتیبارکردن ـ** [ عا. کو. ] ،

( مصت. لا.) ، (کعر.) بە حیساب هێنان ، لە قەڵەمدان . :: ئیعتیباری‌کەن من هەر نەبوم، وای ئیعتیبارکە پیاوێکی کوشتوە و خۆی هاویشتۆتە ماڵت .

**ئیعتیبارنامە** ــ [ عا. کو. ] ، ( نت.) ، ( کئێر.) ١ــ کاغەزێکە تێیدا دەنوسرێ کە کەسێ بۆ نوێنەرایەتی پەرلەمان یا کۆنگرەی پارتێکی سیاسێ هەڵبژێردراوە و ئەندامانی ئەنجومەنی هەڵبژاردن ئیمزای دەکەن . ٢ــ نامەیەکە باڵیۆزی دەوڵەتێك لە سەرۆکی دەوڵەتی خۆیەوە بۆ سەرۆکی ئەو دەوڵەتەی دەبا کە لە وولاتەکەی‌دا بۆتە باڵیۆز و بە پێی ڕێ و شوێنێکی تایبەتێ تەسلیمی دەکا . ( عا.) ئەوڕاقی ئیعتیماد .

**ئیعتیڕاز** ــ [= عا : اعتراض ] ، ( نمص.) ڕازی‌نەبون بە کارێ یا قسە و کردەوەیێك . :: ئیعتیڕازم هەیە . هێچ ئیعتیڕازێکی نەبو . ئیعتیڕازی پێشان نەدا .

**ئیعتیڕازکردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصت. لا.) دەربڕینی ناڕازێتێ بەرامبەر کار و قسەی کەسێ یا هەیئەتێ. :: ئەو هەمو ئیعتیڕازەشی کرد گوێ‌یان نەدایە .

**ئیعتیڕازگرتن** ــ [ عا. کو.] ، ( مصت. مت.) دەربارەی کار و کردەوە ، یا قسە و بڕیار ، لە کەسێ یا هەیئەتێ وەدەنگ‌هاتن . لێ‌ڕاست بونەوە و پێشاندانی ناڕەزایێ . قبوڵ‌نەکردنی بڕیار .

**ئیعتیڕاف** ــ [= عا : اعتراف ]، ( نمص.) ئیقرار ، دان بە شتێکدانان. :: بە ئیعتیڕافی خۆی پەنجا دینار قەرزدارە .

**ئیعتیڕاف‌پێکردن** ــ [ عا. کو.]، ( مصت. مت.) ١ــ بەڕاست زانێن ٢ــ بەڕەسمێ‌ناسێنی دەوڵەت یا هەر هەیئەتێکی کۆمەڵایەتێ ، سیاسێ و . . . ٣ــ بە زۆر و زەبری لێدان یا هەر هۆیەکی دیکە ڕاستی کارێ یا ڕوداوێ بە کەسێ ئاشکراکردن .

**ئیعتیڕاف‌کردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصت. لا.) ١ــ ئیقرارکردن دان‌پێداهێنان . ٢ــ ڕاستێ‌گوتن ، سەلماندن . ٣ــ ئاشکراکردنی ئەندامەتی خۆ و خەڵك لە پارتییەکدا لای کاربەدەستانی مێرێ یا دەرخستنی نهێنییەکانی ئەو پارتییە.

**ئیعتیساب** ــ [= عا : اعتصاب]، ( نمص.) ، ( کئێر.) تم : ئیزڕاب .

**ئیعتیقاد** ــ [= عا : اعتقاد ] ، (نا.) باوەڕێ :: ئیعتیقادت بێ درۆت دەگەڵ ناکەم . بە ئیعتیقادی من ئەم ئێشەنابێ وا بێ . ★ ئاقیدە ، ئیتقات .

**ئیعتیماد** [= عا : اعتماد ] ، ( نمص.) پشت‌پێ‌بەستن ، ئەمێن‌بون دڵنیایێ . :: زۆری ئیعتیماد لە سەردەکرد . نازانم چۆن ئیعتیمادی پێدەکەی ، ئیعتیمادێکی زۆری پێ هەبو . جێگای ئیعتیمادە .

**ئیعتیناپێکردن** ــ [ عا : اعتناء + کو : پێکردن ] ، ( مصت. مت.) ١ــ گوێ‌پێدان ، ئەهمیەت‌پێدان . ٢ــ ئاوڕلێدانەوە . :: ئیعتینا بەم جۆرە شتانە ناکا . هەر ئیعتیناشی

پێ نەکرد . دەبێ ئیعتینای پێ بکەی .

**ئیعدام** ــ [= عـا : اعـدام] ، ( نمصـ.) تـم : ئیعـدام‌کردن . :: حوکمی ئیعدامی دراوە . حوکمیان دابــوو بـە ئیعـــدام تەمێـــز هەڵی‌وەشاندەوە . □ « ئیعدامم بۆ سادیر بێ ، دەم لە خاڵ ناگوێزمەوە » ( فولکلۆر ) .

**ئیعدام‌کردن** ــ [ عـا. کو. ] ، ( مصـ. مـ.) کوشتنی کەسێ لەسەر بڕیاری دادگایەك ، جا بە هەڵاوەسێن بێ یا گوللەباران‌کردن و . . .

**ئیعلان** ــ [= عـا : اعـلان ] ، (نا.) دەنگ و باسێکی کەسێك یـا دایرەیێـك لە ڕادیۆ و ڕۆژنامـەدا یا لەسەر کاغەزێکی جیا ، دەربارەی شتێك یا کارێك بڵاوی دەکاتەوە .

**ئیغراق** ــ [= عـا : اغراق ] ، (نا.) ١ــ زیادپێوەنـان ، موبـالەغە ٢ــ فێشال ، قسەیێکی زیـاتر لـە درۆ بچێ تا ڕاست .

**١ــ ئیفـادە** ــ [ ؟ ] ، (نـا.) ، ( مکـ.) فێــز ، دەعیــە . تەکەبــور

**٢ــ ئیفادە** ــ [= عا : افادة ] ، (نا.) ، (کعر.) هەموو ئەو وەڵامانــەی کەسێك دەربارەی مەسەلەیێك لــە ســوال و جوابێـــکی ڕەســـمێدا دەیانداتەوە .

**ئیفادەدان** ــ[٢ــ ئیفادە + دان]، [عا. کو.] ، (مصـ. لا.) ، ( کعر.) قســەکردنی کەسـێك بۆ یەکێـکی ڕەسـمێ کـە لــە مەســـەلەیەك دەکۆڵێتەوە .

**ئیفادەلێدان** ــ [ ١ــ ئیفادە + لێدان ] ، (مصـ. لا.) ، (مکـ.) ناز و فێــز کردن بە ســەر خەڵـکا . □ « بای دەدا ، بای دەدا ، نێو تۆنەکەی بادەدا + هێشتا نەبوە بە حــاکم ، ئیفادە چۆن لێدەدا » ( فۆلکلۆر ) ★ پۆزلێدان .

**ئیفادەوەرگرتن** ــ [ ٢ــ ئیفادە + وەرگرتن ] ، [ عا. کو. ] ، ( مصـ. مـ. ) ، ( کعـر.) پرسیـارکردن و قسـەدەرکێشـانی یەکێکی ڕەسـمێ ( محقق ) لە کابرایـەك دەربـارەی مەســـەلەیەك . ★ ( کئێــر. ) ئیستینتاق‌کردن ، بازجۆیێ .

**ئیفاقە** ــ [= عـا : افـاقة ] ، ( نمصـ.) چاك‌بوونەوە لە نەخۆشێ . :: ئیفاقەی هاتوە . ئیفاقەی بوو .

**ئیفتادە** ــ [= فر : ئوفتادە ] ، ( نمف. صمف.) پێر ، لەکارکەوتــوو ، پەك‌کەوتە . :: پێرێــکی ئیفتـادەی حەفتا هەشتاساڵێ لەوێ بوو . □ « . . . خۆی‌کردە سۆفێکی ئیفتادە ، دەشـــاری مەدینــەی گــەڕاوە » ( تحفە : ج ٢ ــ ٢٢٣ ) .

**ئیفتار** ــ [= عـا : افطـار ] ، (نا.) وەختـی شـەرعێ ڕۆژوو شکاندن :: هێشتـا ئیفتار نەبـوە چـۆنێ ئـاو دەخۆیەوە ؟ . بۆ ئیفتارێ بانگهێشتنی کردبووین ★ بەربانگ . ( با.) فتارە.

**ئیفتارکردنەوە** ــ [ عا. کو.] ، ( مصـ. لا.) ڕۆژوو شـــکانـدن . بەربانگ‌کردنەوە .

**ئیفتیخار** ــ [= عا : افتخار ] ، (نا.) شانازێ . سـەربەرزێ . :: صـلاح‌الدین مـایەی ئیفتیخـاری کوردانە .

**ئیفتیخارپێکردن** ــ [ عا. کو. ]،

( مصت. لا.) شانازیِ بە کەسێ یا بە شتێك کردن . :: ئیفتیخاری پێدەکەم کە تێکۆشەرێکی کوردە . ★ ئیفتیخار پێوەکردن . شانازیِ پێوەکردن .

**ئیفتیخارپێوەکردن** ــ [عا. کو.]، ( مصت. لا.) تم : ئیفتیخارپێکردن .

**ئیفتیخارکردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصت. لا.) شانازیِکردن . بەخۆفشێن .

**ئیفتیرا** ــ [= عا : افتراء ] ، (نا.) تم : بوختان . :: ئەم قسەیە ئیفتیرایە .

**ئیفتیراپێکردن** ــ [عا. کو.] ، ( مصت. مت.) تم : بوختانپێکردن :: ئیفتیرایانپێکرد .

**ئیفتیزاح** ــ [= عا : افتضاح ] ، ( نا.) ، ( کئێر.) ڕیسوایی . بێئابڕوِیی . بەدناویِ . :: عەجەب ئیفتیزاحێکە . ئیفتیزاحێکی ناوەتەوە نەبێتەوە .

**ئیفلاس** ــ [= عا : افلاس ] ، ( نمصد.) ، ( کعر.) نەداریِ ، نابوتیِ .

**ئیفلاس کردن** ــ [ عا. کو.] ، ( مصت. لا.) ، ( کعر.) ١ ــ نابوتبونی بازرگان یاکاسبێکی ناوبازار . نەداربون . لە مایەکەوتن ٢ــ دۆڕاندنی زۆر لە قومارا . ٣ــ لەدەستدانی باوەڕی خەڵك بەخۆ ، لە ئیش و کاری سیاسیِ و کۆمەلایەتیدا .

**ئیفلیج** ــ [ عا.] ، ( صـ.) حالی کەسێکی هەمو لەشیِ یا لایەکی یا هەندێ جێگای لە کارکەوتبێ و نەجوڵێ . □« لە خوام تەڵەبە ڕۆڵە گۆج و ئیفلیج بی » .

**ئیفلیجبون** ــ [ عا. کو.] ، ( مصت. لا. ) لەکارکەوتنی لایەك یا هەمو لەش یا بەعزێ ئەندامی کەسێك . ★ شەپلەلێدان .

**ئیفلیجیِ** ــ ( نا.) ، ( کئێر.) نەخۆشیِ شەپلە . تێب ــ کەسێ ئەم نەخۆشییەی گرت ئیرادەی لەسەر دەمارەکانی لەشی کەم دەبێتەوە یا هەر بە جارێك لە دەستی دەردەچێ بە جوریِ کە ناتوانێ بە ئارەزوِی خۆی هەندێك ئەندامی ( دەست ، لاق ، ...) خۆی بجوڵێنێ یا ڕایانوەستێنێ و بێ ئەوەی حەزی لێبێ لە خۆیانەوە دەلەرزن . :: تۆشی ئیفلیجی بوە ، تۆشی ئیفلیجیهاتوە . ★ ( کعر.) شەلەل.

**ئیقامە** ــ [ = عا : اقامة ] ، ١ــ ( نمصد.) ، ( کعر.) نیشتەجێ بونیِ خەڵکی وولاتێك لە وولاتێکیتر بە ئیجازەی حکومەتی ئەم وولاتە و بە پێی ڕێ و شوێنی تایبەتیِ . :: بە ئیقامە لە عێراق دانیشتوە . ★ (کئێر) ئیقامەت. ٢ــ (نا.) بەڵگەیێکی ڕەسمییە دەدرێ بەو کەسانەی کە لە وولاتێکی ترا نیشتەجێ دەبن . :: ئیقامەکەیان بۆ تازە نەکردەوە دەریانکرد . ٣ــ (نا.) دایرەیێکی ڕەسمییە لە هەمو دەولەتێکا ، بە ئیش و کاری هاتوچۆ و دانیشتنی خەڵکی بێگانە ڕادەگا . **ئیقامەی دەعوا کردن** ــ شکایەت بردنەبەر دادگا بە شێوەیێکی قانونیِ .

**ئیقامەت** ــ [ عا. ] . ( نمصد. و نا.) ، (کئێر.) تم : ئیقامە .

**ئیقبال** ـ [ عا : اقبال = ڕۆتێکردن ] ، (نا.) بەخت ، تالع :: چبکەم ئیقبالی منیش ئاوایە . □ « هەمو شتێك بە ئیقبالە » .

**ئیقتیدار** ـ [ = عا: اقتدار ] ، (نمصـ.) توانایی ، دەسەلات :: ئەوەند ڕوت و ڕەجالە ئیقتیداری نانی شەوی نیە .

□ « حسب الأمر شای گەردون ئیقتیدار »
« نەقیبان بەزم خەرگەی زەڕنیگار »

**ئیقتیصاد** ـ [ = عا : اقتصاد] ، ( نا. ) زانستێکی کۆمەلایەتییە دەربارەی هەمو ئەو چالاکییانە دەدوێ کە پێوەندیان بە داهات و خەرجی ئەفرادەوە هەیە و باسی چۆنێتی پێوەندی مالی ئەوان دەکا کە لەناو کۆمەلدا دەگەل یەکتری هەیانە ، ، هەر وەها ئەو قانونانە دەخاتە بەر چاو کە خۆیان بەسەر چالاکیەکانی مالی ناو کۆمەلدا دەسەپێنن و ئەو ڕێگایانەش پێشان دەدا کە پێدا ڕۆیشتنیان دەبێتە هۆی بەختیاری ، پێشکەوتن و خۆشی ژیانی میللەت . لە دنیای ئێمڕۆدا ئەم زانستە دو لکی گەورەی هەیە : ئیقتیصادی سۆسیالیستی و ئیقتیصادی سەرمایەداری . پێڕەوی کردنی هەریەکی لەم دوانە لە کاروباری وولاتێکدا شێوەیێکی تایبەتی دەدا بە کۆمەل کە دەگەل ئەوتریان بە تەواوی جیاوازە .

**ئیقتیصادکردن** ـ [عا. کو.] ، (مصتـ. لا.) ١ـ دەست بە مالی خۆوەگرتن . ٢ـ کەم خەرج کردن ، دەس گێڕانەوە لە سەرفکردن . ٣ـ (مجـ.) خەرج و مەسرەفی بێهودە نەکردن ؛ پاشەکەوت کردن .

**ئیقتیصادی** ـ [ عا. کو. ] ، (صـ.) هەر شتێك یا کارێکی پێوەندی بە ئیقتیصادەوە هەبێ . ٢ـ (مجـ.) هەر کارێ یا شتێکی ، لە کردن یا بە کارهێنانی قازانجی ماددی چاوەڕوان بکرێ . :: ئوتومبێلێکی فولکس‌واگن بکڕە زۆر ئیقتیصادیە هەر بەنزین سەرف ناکا .

**ئیقدام** ـ [ = عا : اقدام ] ، (نمصـ.) ١ـ ئازایەتی ، دلێری ٢ـ نەترسان ، وێران ( فعـ. ) :: پیاوێکی بە ئیقدامە ، چ کەسی هێندە بێ ئیقدامم نەدیوە .

**ئیقدام‌کردن** ـ [ عا. کو. ] ، (مصتـ. لا.) ١ـ دەست‌بەکاری کردن، پڕ بەکارێکدا کردن . ٢ـ ئازایەتی و دلێری نواندن . :: ئەو ئیقدامەی ... کردی بە کەس ناکرێ .

**ئیقرار** ـ [ = عا : اقرار ] ، (نمصـ.) تم : ئیعتیڕاف . :: بە ئیقراری خۆی هێچی لای شێرکو نەماوە .

**ئیقرار پێ‌کردن** ـ [عا. کو. ] ، ١ـ(مصتـ. لا.) تم: ئیعتیراف کردن. ٢ـ (مصتـ متـ.) تم : ئیعتیڕاف پێکردن/٣ .

**ئیقرارکردن** ـ [ عا. کو. ] ، (مصتـ. لا.) تم : ئیعتیرافکردن .

**ئیقلیم** ـ [ یونانی : کلیما ]، (نا.) ١ـ بەشێك لە زەوی کە لە باری ئاووهەوا و چلونایەتی تەبیعی دەگەل

بەشەکانی‌تر جیاوازی هەبێ و ناوێکی تایبەتیشی هەبێ . جوغرافی زانانی کۆن هەمو ڕۆی زەوییان بە حەوت ئیقلیم دانـاوە . ٢ــ وولات . ٣ــ مەڵبەند . :: ئیقلیمی ڕۆم ، ئیقلیمی شام ، ئیقلیمی کوردستان ، ئیقلیمی چوارەم .

**ئیقناعبوون ــ** [ عا : اقناع + کو : بوون] ، ( مصد. لا. ) ١ــ قبوڵ کردنی بیروڕایەك دەربارەی مەسەلەیەك ، پاش ئەوەی لە لایەن کەسێکی ترەوە شی دەکرێتەوە ، یان ئینسان خۆی بە بیری خۆیدا دەچێتەوە. ٢ــ ڕازی بوون بەکردن یا نەکردنی کارێك . :: ئەوەندی کردی و کراندی هەر ئیقناع نەبو . من چۆن بەو قسانە ئیقناع دەبم . بەڵکو تۆش هەوڵێکی دەگەڵ بدەی بۆ من ئیقناع نابێ .

**ئیقناعکردن ــ** [ عـا. کو. ] ، ( مصد. متـ. ) ١ ــ ڕازی‌کردنـــی کەسێ بە قسە و بیروڕای خـۆ . ٢ــ پێ قبوڵ‌کردن . :: توانستێکی سەیری هـەیە لـە ئیقناع‌کردنا . ئیقنـــاعم‌کردوە واز لە ســەفەرەکەی بێنێ . بۆی ئیقناع نەکرا .

**ئیکسیر ــ** (نـا.) ، ١ــ داو و دەرمانێ کە پێشـــونیان لایان وا بو (عناصر) دەگۆڕێ ، وەك (مس بکا بە ئاڵتون و ... ) ، ٢ــ (مجـ.) هەر شـــتێکی کەم دەســت کەوێ . ☐ « ئیکسیرە خاك و خۆڵی دەرماڵی گەورە ماڵان » ( حاجی ) . تێبـ ــ ئەم ووشـــەیە لە ( کســـیریون )ی یۆنانی‌ڕا خوازراوەتەوە بـــۆ زمانی عەرەبی و بۆتە ( الاکســـیر ) ، ئەو جار لە عەرەبی‌ڕا خوازراوەتەوە بۆ زمانانی فرەنسی و ئینگلیسی و کراوە بە ( ئێلیکسیر ) .

**ئیکلام ــ** [ محر. عا : اکرام ] ، (نا.) ، (مک.) ڕەســـمی حوڕمەت ، ڕێ و ڕەســمێکە بـۆ نیشـــاندانی حوڕمەت و ڕێز بەرامبەر کەسـێ ئەنجـــام دەدرێ . تێبـ ــ دەســت بەســـینگەوە دەگیـــرێ و بـــە پێی گـــەورەیی ئـــەو کەســـە یا ئـــەوان کەسانەی نیاز وایە ڕێزیان لێ‌بندرێ، لای ژۆرۆی لـــەش بـــۆ پێشـــەوە دەچەمێنرێتەوە .

**ئیکلامکردن ــ** ( مصد. لا. ) ، (مک.) ڕەسمی حوڕمەت بەجێ‌هێنان. تەعزیم‌کردن . ★ ئیکلام کێشـــان

**ئیکلامکێشان ــ** ( مصد. لا. ) ، (مک.) تم : ئیکلام‌کردن . ☐ «دەچونە خزمەت مـــام غەلێفەی ئیکـــلامیان کێشاوە » ( تحفە : ج ٢ ــ ٧٧ ) .

**ئیکمالبوون ــ** [عا : اکمال + کو : بوون ] ، ( مصد. لا.) ، (کعر.) لـــە ئیمتیحانا لە یەك یـــا چەند دەرس دەرنەچون و نـــاچار بـــە ئیمتیحان دانەوەیان‌بوون .

**ئیگرەم بێژرەم ــ** [ ئیگـــرەم = ئیگرمی (٢٠) + بێژ = بێش (٥) + رەم = درەم ] ، [ تو. کو. ] ، (نتـ.)، (کعر.) سەنگێکە بۆ کێشانی شت ، بەشێکە لە شازدە بەشی حۆقەیەك، بە حۆقەی ســـلەیمانی دەکاتە ٢٢٠ گرام .

**ئیلاقەکردن ــ** [ ئیلاقە = عا : علاقـــە + کردن ] ، [ عا. کو. ] ، (مصد. متـ.) ١ــ دەســـت درێـــژی

کردن ، خۆتێگەیاندن . ٢ـ (مج.) ئازاردان □ «نابێ ئیلاقەی فەرخی بکەن ئەمەگم دەچێ بە زایە » (تحفە : ج ٢ ـ ١٢١) . ٣ـ (مج.) پێکهێنانی کاری جنسیی نێوان ژن و پیاو □ « چوار ساڵ بۆ شەمێی هێنابۆ ، ئیلاقەی نەدەکرد . کوتی : بۆچی ئیلاقەی من ناکەی ؟ کوتی : هەتا بە دەستی خۆت دۆخێنم نەکەیەوە..» ( تحفە : ج ١ ـ ٣٣٤ ) .

**ئیلتیفات ـ** [ = عا : التفات ] . (نا.) ، (کێر.) ڕۆخۆشی ، ئاوڕی لوتف و مەرحەمەت، میهرەبانی. :: ئیلتیفاتتان زیاد بێ . زۆر ئیلتیفاتی دەگەڵ کرد . قوربان بێ ئیلتیفاتی مەفەرموو . دەگەڵ بێ ئیلتیفاتیمان نەکردوە . □ « دەڵێن : قوربان بە سایەی ئیلتیفاتی تۆوە هاتین بەکارە» ( تحفە : ج ٢ ـ ١٢ ) .

**ئیلحاح‌کردن ـ** [ عا : الحاح + کو : کردن ] ، ( مصت. لا. ) زۆر لەسەر ( شتێ ، کارێ ) ڕۆیشتن .

**ئیلزام‌دان ـ** [ عا: الزام + کو : دان ] ، (مصت. مت.) بێ دەلیل‌کردنی کەسێ لە گفتوگۆیەکدا ، ڕێگا لی بڕینەوە . تێب ـ زیاتر بۆ مجادەلەی عیلمی ، مەلا و فەقێ بەکاری‌دێنن.

**١ـ ئیللا ـ** [ ؟ ] ، ( نا . ) ، (مک.) باری هەڵکەوتنی (جگ)ە لە یەکێ لەو یارییانەی بە مێچ دەکرێن. تێب ـ جگەکە لەسەر پشت دەکەوێ و لا زەقەکەی لەسەرەوە دەبێ . ★ سۆفی ( لەیارییەکی‌ترا ) .

**٢ـ ئیللا/ن ـ** [ = عا : الا ] ، (بن.) بۆ دیاری‌کردنی فەرق و جیاوازی ، بێجگە لە ... :: بەفر هەمو لایێکی گرتۆتەوە ئیللا سلەیمانی نەبێ . ئیللا بە قسەی خۆی نەبێ بە قسەی کەس ناکا .

**ئیللان و بیللان ـ** [ = عا : الا و بالله ] ، (کن.) هیچ مومکین نیە ، هەروا دەبێ ، غەیری ئەوە نا . :: دە بەرێدا شل و کوت بۆن کوتی ئیللان و بیللان هەر دەڕۆم .

**ئیلهام ـ** [ = عا : الهام ] ، (نمص.) کارێکی چاك یا مەبەستێ خستنە دڵی کەسێکەوە ، فێرکردن بە (هۆ)یەکێ کە بە چاو نابێندرێ . :: نازانم ئیلهام بۆ چی بۆ دۆ دەقیقەی نەکێشا ئەو مەسەلە گرانەی حەل‌کرد .

**ئیلهام بۆ هاتن ـ** [ عا. کو. ] ، (مصت. لا.) کارێك یا مەبەستێك کەوتنە دڵی کەسێکەوە .

**ئیلهام وەرگرتن ـ** [ عا. کو. ]، (مصت. مت.) بە تەئسیری کەسێ یا شتێ کارێ کردن . کردنی کەسێ یا شتێ بە سەرچاوەی بیرکردنەوە و مەبەست لێ‌ئەستاندن . :: نالی لە حەبیبەی مالیاوا ئیلهامی وەردەگرت، خانی بۆ ( مەم‌وزین )ەکەی لە بەیتی (مەمی ئالان) ئیلهامی وەرگرتوە .

**ئیم ـ** [ ست : ئیم ] ، ( نا . ) شێوەی کۆنی ( ئەم )ە و لە چەند ووشەیێکدا ماوە و لەهەندێ ناوچەی کوردستان دەکوترێ . :: ئیمڕۆ ، ئیمساڵ ، ئیمشەو .

**ئیمام ـ** [ = عا : امام ] ، (نا.) ١ـ پێشەوا و ڕابەری دینی :: بە مەزەبی ئیمامی حەنەفی مارەی‌کەن .

٢ــ ئەو کەســەی پێش نوێژێ ، نوێژی جەماعەت دەکا . :: ئیمامی مزگەوتی هەباساغای . ٣ــ أ) هەر بەکــر . ئیمامی عومبــەر ، ئیمامی جەعفەرێ ( شیعە )کــە یەکەمیان (ئیمامی عەلێ)و ئاخریان (مەهدی)یە. ب) هەریەك لەو چوار کەسەی کە پاش پێغەمبەر ( د. خ.) خەلیفەبێ ئیســلامیانکرد . :: ئیمامی ئەبێ بەکر . ئیمــامی عومبــەر ئیمــامی عوسمان . ئیمامی عەلێ . ٤ــ تم : ئیمامە .

**ئیمامە ــ** [ عا : امام + کو : ٥ــ ئە/١ ] ، ( نت .) دەنکــە مۆرویێکی درێژۆکەیە بە ســەری تەزبێحەوە دەکرێ . ★ ئیمام / ٤ .

**ئیمامەت ــ** [ = عا : الأمامة ] ، ( نمصـ.) تم : ئیمامەتی .

**ئیمامەتی** [ عا : امام + کو: ئەتی] (نمصـ.) ١ــ پێشــەوایێ و رابەرێ کاروباری دینێ موســوڵمانان . :: قوربان ئەو ڕەمەزانە تەشریف بێنە ئیمامەتییەکەمان بۆ بکە . ٢ــ یەکێکە لە ئەرکانی ئیمان لە ئایینی شیعەدا ★ ئیمامەت .

**ئیمان ــ** [ = عا : ایمان ] ، (نا.) تم : ئیمان . تێبـ ــ ئەم ووشەیە کە دەگەڵ بڵاوبێنەوەی ئیســلامەتێ لە کوردستانا هاتۆتە ناو زمانی کوردێ هەندێ جــار دەنگ بزوینەکەی (ێ) هەروەك عەڕەبییــەکەی درێــژە و هەندێ جارانیش ( بە تایبەتێ لــە تەرکیبدا ) کورت دەبێتەوە و دەبێتە ( ژێر = کەسـره ) ، بۆیــە وەك ووشەیێکی تەنیا (ی)ەکەی بە درێژ (ێ) داندراوە و لە شــوێنی خۆی نوسراوە .

**ئیماندار ــ** [ ئێمــان + دار ] ، [ عا. کو. ] ، ( صفا. ) تم : ئێماندار

**ئیمپڕاتۆر/تۆر ــ** [ لاتینی ] ، (نا.) پاتشــایەکی چــەند وولات و میللەتی لە ژێر فەرماندابێ، پاتشای پاتشایان . :: کاتێ شۆرشی مەزنی ئۆکتۆبــەر هەڵگیرســـا ( نێگــەڵە ) ئیمپڕاتۆری ڕۆسیابۆ. ★ شاهەنشا تێبـ ــ ئەم ووشە لــە قەبێك بۆە بۆ سەردارەکانی ڕۆمای کۆن .

**ئیمپڕاتــۆ ( تــۆ ) رێ ــ** ١ــ [ئیمپڕاتۆر + ٢ــ ئێ ] ، ( صت ) هەر شــتێکی پێوەندێ بــە ئمپڕاتۆرەوە هەبێ . :: تاجی ئیمپڕاتۆری لەسەر نا. فەرمانی ئیمپڕاتۆری بۆ دەرچۆ . ٢ــ [ئیمپڕاتۆر + ٣ــ ئی] ، (حمصـ.) تم : ئیمپڕاتۆرێتــی . تێبـ ــ بــەم مەعنایە شێوەی داڕشتنەکەی زیاتر فارسییە تا کوردێ .

**ئێمپڕاتۆ (تۆ) رێتی ــ** ( حمصـ.) ڕژێیمێکی پاتشایەتی و دەوڵەتییە کە سەرۆکەکەی ئیمپــراتۆر بــێ . :: دوای شەڕی دوەم ئیمپڕاتــۆرێتی ژاپۆن گەلێ گۆڕانی بە سەردا هات . ٢ــ أ ) بە تێکڕایێ هەمۆ ئەو خاکانەی کە لە ژێر دەستەڵاتی ئیمپڕاتۆرێکدا بــن ، مەیدانــی فەرمــانڕەوایێ ئیمپڕاتۆرێك:: ئیمپڕاتۆرێتی بریتانیا جاران ڕۆژی لێ ئاوا نەدەبــۆ . ب) گشت وولاتانێ کە دەوڵەتێکی توانا و بە زێپــك بــە ســەریان ڕادەگــا ، سەرۆکەکەی هەرچێ دەبــێ ببێ .

**ئیمپڕیالیزم** ــ [ فرەنسی : ئیمپڕیالیسم ] ، (نا.) سیاسەتی دەوڵەتانی گەورەی گەشەکردوە ، ئامانجی داگیرکردنی وولاتانی پاشکەوتە و پەرەپێدانی هەمو چەشنە دەستەڵاتێکی خۆیانە لەوان وولاتانەدا . تێب ــ ئەم جۆرە ووشانە بە پێی جۆری بیرکردنەوە و بیروباوەڕی سیاسی ، لە لای خەڵکی جۆر بە جۆر مەعنایان کەم و زۆر دەگۆڕێ . مارکسیستەکان لە هەمو کەس زیاتر سەر و کاریان دەگەڵ ئەم چەشنە ووشانە هەیە و بە کاریان دێنن ، لە هەمو کەسێش زیاتر بە تان و پۆیاندا دەچنە خوار و ڕۆنیان دەکەنەوە . (لینین) لەم بابەتەوە زۆر دوور و درێژ دواوە دەڵێ :«ئیمپڕیالیزم بەرزترین قۆناغی سەرمایەدارییە » و کتێبێکیشی هەر بەو ناوە نوسیوە و ئیمپڕیالیزم بەو جۆرە کورت دەکاتەوە : « . . . ئیمپڕیالیزم سەرمایەدارییە وەختیکی دەگاتە ڕادەیێکی ( تطور ) کە لە سایەیدا دەستەڵاتی (ئیحتیکارات) و ( سەرمایەی‌ماڵی ) دروست بوە و ناردنەدەرەوەی سەرمایە ( تصدیر الرأسمال ) ئەهمیەتێکی زۆری پەیداکردوە و دابەش‌کردنی دنیا لە نێوان ( تروست )ەکانی عالەمی دەسی پێکردوە و دابەش‌کردنی گشت وولاتانی جیهان لە نێوان دەوڵەتە زلە سەرمایەدارەکان بڕاوەتەوە . . . » ، ( لینین ، هەڵبژاردەکان «ئیمپڕیالیزم بەرز ترین قوناغەکانی سەرمایەداری» ، بەرگی ١ ، بەشی ٢ ، چاپی مۆسکۆ ( عەرەبی ) ل ــ ٣٩٢).

**ئیمپڕیالیست** ــ [ فرەنسی ] ، ( ص. ) کەسێك یا هەیئەتێ یادەوڵەتێکی سیاسەتی ئیمپڕیالیستی پەیڕەوێ بکا .

**ئیمپڕیالیستی** ــ [ئیمپڕیالیست + ٣ــ ئی ] ، (صت.) هەر کارێ یا شتێ پێوەندی بە ئیمپڕیالیزمەوە هەبێ . :: پیلانێکی ئیمپڕیالیستی لە کارایە .

**ئیمپڕیاڵ** ــ [لاتینی] ، (نا.) ، (کئێر.) سکەیێکی زێڕی ڕۆسیای کۆنە ، بە ئەندازە پێنج لیرەیێکی عوسمانی .

**ئیمتیحان** ــ [= عا : امتحان ] ، ( نمص. ) ئەزمون ، تاقی‌کردنەوە .

**لە ئیمتیحان دەرچون** ــ ١ ــ بە باشی وەڵامی پرسیاردانەوەی قوتابیان و سەرکەوتنیان لە کلاسێکەوە بۆ کلاسێکی باڵاتر . ٢ــ چاك‌هاتنەبەرچاو لە تاقی‌کردنەوەدا ( بۆ هەر مەبەستی بێ ).

**ئیمتیحان‌دان** ــ [عا. کو. ] ، ( مصت. لا. ) ١ــ لێبونەوەی قوتابیان لە وەڵامدانەوەی هەمو ئەو پرسیارانەی بە نیازی تاقی‌کردنەوەی ڕادەی فێربون و تێگەیشتنی دەرسەکانیان لێیان دەکرێ . ٢ــ تم: ئیمتیحان ( لە ئیمتیحان دەرچون/٢) :: ئیمتیحانی خۆی داوە پێویست بەم قسانە ناکا .

**ئیمتیحان‌کردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصت. مت. ) ١ــ پرسیارکردن لە قوتابیان ، ساڵی چەند جارێك بە نیازی ئەوەی بزانن ئەوەی

خوێندوویانە بە چاکی فێری بوون یان نا . ٢ـ تاقی‌کردنەوەی کەسێك بۆ هەر نیازێك و بە هەرشێوەیێك بێ .

**ئیمتییاز ـ** [= عا : امتیاز ] ، ( نمصـ.) ١ـ جیاوازی و فەرق و جودایی نێوان دوکەس یا دو شت ( بە لای چاکتریدا بۆ یەکێکیان ) ، بە سەرداهەبون . :: ئیمتییازی چی بە سەر خدردا هەیە . ئەو ئیمتییازە چیە بۆ شێرکۆ ؟ . ٢ـ ئیجازەیێکی دەوڵەت بۆ دامەزراندنی کارگە ، دەرهێنانی مەعدەن ، بلاوکردنەوەی رۆژنامە و گۆڤار و ... دەیدا بە کەسێ یا کەسانێ .

**ئیمجار ـ** [ ئیم + جا (جار) ] ، ( بنـ.) تم : ئەوجا .

**ئیمچون ـ** [ ؟ ] ، ( نا.) ، (مکـ.) دەستێك ناڵ بۆ چوارپەلی وولاغی یەکسم (ئەسپ، ئیستر، گوێدرێژ) : **نیوئیمچون ـ** ( نتـ.) ناڵی دوپەل **خڕئیمچون ـ** ناڵی هەر چوارپەل . :: ماینەکە بەرە لای وەستا کەریم خڕ ئیمچون ناڵی کە .

**ئیمزا** [= عا : امضاء ] ، ( نا.) نیشانەیێکە لە کوتایی نامە و ...دا دەندرێ ، نوسێنی ناوی نوسەری نامەیە بە شێوەیکی تایبەتی لە پای کاغەزان بۆ ئەوەی بزانن کێ نوسیویە .

**ئیمزا کردن ـ** [ عا. کو. ] ، ( مصـ. لا.) دانانی نیشانەی ناوی خۆ لە ژێر نامە و نوسراوان و ...

**ئیمکان ـ** [= عا : امکان ] ، ( نمصـ.) ١ـ رێ‌تێچون . ٢ـ توانایی و زۆر بە سەر کارێکدا هەبون ، قەوەت بە ئیشێك شکان . :: ئیمکانی هەیە وابێ کە ئێوە دەفەرمون . ئیمکانی دە دینارى نیە خانو بە چی دەکا .

**ئینتاج ـ** [= عا : انتاج ] ، ( کعر.) ١ـ ( نمصـ.) رەنێوهێنان (بۆ شتی کشتوکاڵی) ، بەرهەم‌هێنان (بۆ شتی صناعی ) ، دروست‌کردنی کەلوپەل لە کارگاکان . :: ئینتاجی ساڵانەی ٣٠٠ فرۆکەیە ، ماڵی پیرۆت ئینتاجی رۆنیان ٢٥٠ کیلۆیە . ٢ـ ( نا.) بەر و بوی کاری دەست یا مێشك . :: نوسەری چاکە و شاعیریشە بەلام ئینتاجی کەمە . ★ ( کئێر.) تەولید .

**ئینتەلا ـ** [= عا : امتلاء ] ، ( نا.) ، ( کعر.) باکردنی‌زگ لەبەر زۆر خواردن ، تێکچونی تەبیعەتی ئینسان لە ئەنجامی زۆر خواردن و خواردنی زۆر چەور . :: هێندەی خواردوە ئینتەلای کردوە . ★ ( مکـ.) تەعبون .

**ئینتیحارکردن ـ** [ عا : انتحار + کو : کردن ] ، ( مصـ. لا.) خۆکوشتن بە دەستی خۆ بە هەر جۆرێ بێ .

**ئینتیخاب‌کردن ـ** [ عا : انتخاب + کو : کردن ] ، ( مصـ. متـ.) ١ـ هەڵبژاردن و پەسندکردنی شتێ لە ناو کومەڵێ هاوچەشنی خۆی . ٢ـ دیارکردنی کەسێ بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی کارێ لە لایەن کەسێ یا هەیئەتێکەوە . ٣ـ هەڵبژاردنی کەسانێ بۆ نوێنەری لە پەرلەمان و

کۆمیتەکانی پارتە سیاسییەکان و..

**ئینتیزار** ــ [= عا : انتظار ] ، ( نمصـ.) ١ــ چاولەڕێیی . ٢ ــ چاولەدۆیی .

**ئینتیشار** ــ [= عا : انتشار ]، ( نمصـ. ) پەرش و بڵاوی .

**ئینتشارات** ــ ( نا.) ، ( کئێر.) هەمو ئەو شتە چاپکراوانەی ڕێکخراوێکی دەوڵەتی یا ئەهلی بڵاویان دەکاتەوە. ★ ( کعر.) نەشریات .

**ئینتیشاردان** ــ [ عا. کو.] ، ( مصتـ. متـ.) ، ( کئێر. ) بڵاوکردنەوەی کتێب ، ڕۆژنامە ، قسە ، ..

**ئینتشارکردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصتـ. لا.) ١ــ بڵاوبونەوە ( هەرچی بێ ) ٢ــ تەشەنەکردن ( نەخۆشی ، قسە و دەنگە و باس و ...) .

**ئینتیقام** ــ [= عا : انتقام ] ، ١ــ ( نمصـ.) تۆڵەئەستاندن ، تۆڵە ئەستێنی . ٢ــ ( نا.) تۆڵە .

**ئینتیقامئەستاندن** ــ [ عا. کو.]، ( مصتـ. متـ. ) تۆڵەئەستاندن ، تۆڵەکردنەوە . ★ ئینتیقامکێشان.

**ئینتیقامکێشان** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصتـ. متـ.)، تم : ئینتیقامئەستاندن

**ئینتیهازێتی** ــ [ عا. کو. ] ، ( حمصـ.) ، ( کعر.) کارێکی ئینسانی هەڵمەتەکاسە و فرسەت تەڵەب دەیکا . ★ ( کئێر.) ئۆپۆرتونیسم .

**ئینتیهازی** ــ [= عا : انتهازي] ، ( صـ.) ، (کعر.) کەسێکی لە فرسەت بگەڕێ و چۆنی بۆی هەڵسوڕێ ئامانجی خۆی وەدیبێنێ . کەسێکی مەبەستی هەر جێبەجێبونی کاریخۆی بێ بە هەر وەسیلەیێك بێ . ★ ئۆپۆڕتونیست . هەڵپەرست ، هەڵمەتەکاسە .

**ئینجا** ــ [ ئین + جا (جار) ] ، ( بنتـ.) تم : ئەوجا/٢ ، ئەمجار/٢ □ « ... ئەو حەوزە پڕ ئەکەن لە ئاو و بۆنی خۆش ، ئینجا خۆیانی پێ ئەشۆن » ( بلە : ژان ــ ٣٨ ) . تێبـ ــ کەرتی یەکەمی ئەم ووشەیە ( ئین ) شێوەیێکی دیکەی ( ئیم )ی ئاوێستاییتیە .

**ئینجار** ــ (بنتـ.) تم : ئەمجار/٢، ئەوجا/٢ .

**ئینجارەکانێ** ــ [ ئینجار + ٢ــ ئە/٢ + کە ( ئم : تەعریف ) + ٢ ــ ئان/٢ + ٤ ــ ئێ ] ، ( بنتـ.) تم : ئەمجار/٢ ، ئەوجا/٢ .

**ئینجارەکە** ــ [ ئینجار + ٢ــ ئە/٢ + کە ( ئمـ.) ] ، (بنتـ.) تمـ : ئەمجار/٢ ، ئەوجا/٢ .

**ئینجاکو** ــ [ ئینجا + کو = کەوا ] ، ( بنتـ.) تم : ئەمجار/٢ ، ئەوجا/٢ .

**ئینجاکونێ** ــ [ ئینجاکو + ٢ــ ئان/٢ + ٤ ئێ ] ، ( بنتـ.) تمـ : ئەمجار/٢ ، ئەوجا/٢ . تێبـ ــ وا دێتە بەر چاو کە ( ئینجاکو ) بۆ حاڵەتی ( مفرەد ) و ( ئینجاکونێ ) لە حاڵەتی ( جەمع )دا بەکارهاتبێ ، ئەگەرچی ئیستا هیچ فەرقیان ناکرێ .

**ئینجانە** ــ [ ؟ ] ، ( نا.) ، (کعر.) قاپێکی سواڵەتە بنەگوڵی تێدادەچینن . ★ ( کئێر.) **گوڵدان**.

**ئینجەت** ــ [ محر . عا : حجة ]، (نا.) بەهانە ، بیــانو ، پەڵپ . □ « ئەگەر پیاو پیاوی بکوژێ ، ئەگەر چوە ماڵێی نابێ دەگەڵێ بە ئینجەت بــێ » ( تحفــه : ج ۲ ــ ۱۲٦ ) ★ ئەنجەت ، حەنجەت ، هەنجەت .

**ئینجیل** ــ [ یۆنانێ ] ، ( نــا. ) کتێبی ئاسمانی عیســا پێغەمبەرە و چوار بەشە : ئینجیلی لوقا ، ئینجیلی مەتێ ، ئینجیلی مەرقوس ، ئینجیلی یوحەننا و زانایــانی دینی ئیســلام باســی یەکێکی تریــش دەکــەن کە ئینجیلی ( بەرنابا ) یە . هەر چــوار بەشــەکەی لە مەهابات بە موکوریانێ کراوە بــە کوردێ و هەروەهــا بــە لەهجەی باکوری و جنــوبێ زمــانی کوردیش هەیە . تێبـ ــ ئەم ووشەیە لە (ئێڤانگێلیۆن)ی یۆنانیێڕا بە مەعنای ( مزگێنی ، خەبەری خۆش )کراوە بە عەرەبێ .

**ئینحیسار** ــ [= عا : انحصار ]، ( نــمصـــ. ) ۱ــ دەورەدران ، دە تەنگانەکەوتن . ۲ــ تەرخــان کردنی دروست کردن یا فرۆشتنی شتێــك بۆ کەسێك یا دایرەیێکی دەوڵەتێ . :: [ کئێر. ] ئینحساری دوخانیات. ( کعر.) ئینحیساری توتن .

**ئینساف** ــ [= عا : انصاف ] ، ۱ــ ( نمصـ.) بە عەدالەت جوڵانەوە ، حەق بە لای کەسێدا ، دان . ۲ــ ( نا.) عەدالەت ، دادپەروەری .

□ « بێ قەباحەت لێم زویری چاکە
ئینسافت هەبێ »
« بۆ بەلاگەردانی بالات ، قوچی
قوربانم وەرە »

( أ )

**ئینسان** ــ [= عا : انســان ] ، ( نا.) ۱ــ گیاندارێکە کە لە ئەنجامی گۆڕان و تــەکامولی مێشــکیدا لــە گیــاندارەکانی تــری ســەر زەوێ جیابۆتەوە و تاکە گیاندارێکە بە هۆی قســەکردن و نوســینەوە توانــی دەربڕینی بیری خۆی هەیە و تەنیــا گیانداریکیشە دەستی شت دەگرێ و لە سەر دو پێ دەڕوا ★ ئادەمی ، ئادەمیزاد ، بنیادەم ، بەشەر . ۲ ــ ( مجـ.) کەسێکی خاوەنی ڕەووشت و خۆی باش بێ ، کەســێکی بەرامبەر خەڵکێ تر پیاوەتێ و چــاکە بکا . :: ئینسـانی وا لە کوێ دەست دەکەوێ ئینســـانی وام هەر نەدیــوە ، زۆر ئینسانە .

**ئینســانەتێ** ــ [ ئینســــــان + ئەتێ ] ، [ عا. کو. ] ، ( حمصـ.) ۱ــ ڕەووشت و خۆی چاك کە ئادەمێزاد لــە گیــــاندارانی تر هەڵــداوێرێ ( ممیزاتی ئادەمیزاد ) ۲ــ ( مج . ) پیاوەتێ ، چــاکە . :: ئینســـانەتێ دەگەڵ زۆر کەس کردوە .

**ئینشا** ــ [= عــا : انشــاء ] ، ( نمصـ.) ۱ــ بەرپاکردن ، دامەزراندن ۲ــ ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی قسە بە نوسین . ۳ــ نامەی ئەدیبــانە و میرزایانە . :: میرزا ڕەشیدی قازێ ئینشــای باش بو ، خۆی بە مــیرزا دەزانــێ و ئینشــــاشێ ئینشــای مندالانە . ٤ــ ( نــا.) ، ( کئێــر.) کتێبێــکە نمونەی نــامەی نوسراوی تێداکۆکراوەتەوە و قوتابیــان فێری نامەنوسین دەکا .

**ئینشـابەند ــ** [ ئینشـا/٢ + بەند ] ، [ عا. کو. ] ، ( نفا. صفا.) ١ــ ئەو کەسەی نامە و مەقالە و... بە ڕێك و پێکی دەنوسێ . ٢ــ کەسێکی بە کەسێ یا شتێ هەڵدەڵێ. □ « ئینشابەند شـەرح شـێرتین ئەرمەن »
« بەی تـەور کەرد ئینشـای حاڵات کۆکەن »
( خانا ــ ٣٥١ ) .

**ئینشیعاب ــ** [= عا : انشعاب]، ( نمصـ.) ، ( کئێـر.) ١ــ لـق و پۆپلێبونەوە ، پارچەپارچە بون . ٢ــ کەرتبونی پارتێکی سیاسێ ★ ئینشیقاق .

**ئینشیقاق ــ** [= عا : انشقاق]، ( نمصـ.) ، ( کعر.) ١ــ قەڵەشان ، درزبردن . ٢ــ تم : ئینشیعاب/٢ .

**ئینفیساڵ ــ** [= عا : انفصال ]، ( نمصـ.) ، ( کعر.) ١ــ جـودایی ، جیابونەوە لە ... ، لێكپچڕان . ٢ــ جیابونەوەی پارچەیەکی خاکی وولاتێك لە دەوڵەتی ئەم وولاتە .

**ئینفیساڵی ــ** [ عـا.] ، ( صـ.) ئەو کەسەی لایەنگری جیابونەوەی پارچەیەك لە خاکی دەوڵەتێك بێ . ★ جوداییخواز .

**ئینقیڕازکردن ــ** [ عا : انقراض + کـو : کردن ] ، ( مصـتـ. لا. ) لەناوچون ، پوچبونەوە ، فەوتـان ، نەمان .

**ئینقیلاب ــ** [= عا : انقلاب ] ، ١ــ ( مصــ. لا. ) وەرگــەڕان ، سەرەوژێربـون ، هەڵگەڕانـەوە ، قلپبـونەوە . ٢ــ ( نمصــ.) ، ( أ ) پشێوێ ، نائارامێ. ب ) ، ( کئێر.) شۆرش بۆ هەڵگێڕانەوە و تێکدانـی ڕێژێمـی سیـاسێ و سـیستێمی ئـابوری وولاتێـك و بنیـاتنانی ڕێژێمێکی کامڵتر و پێشکەوتوانە تر. :: ئینقیلابی مەشرۆتەی ئێـران . ئینقیلابی مـەزنی ئۆکتۆبـەر . ★ ( کعر.) سەورە ( عـا : ثـورة ) ، شورش . ج) ، ( کعر.) پێلانگێڕێ و ڕاپەڕینی کتوپڕی هەندێ لە سوپای وولاتێـك بۆ ڕوخـاندنی دەوڵەتی قانونێ ★ ( کئێر.) کودتا .

**ئینقیلابێ ــ** [ عا. کو.] ، (صـ.) ( کئێر.) ١ــ ئەو کەسەی شـۆرش هەڵدەگیرسێنێ ، ئەوەی بە جۆرێ لە جۆران پشتی شۆرش دەگرێ . ★ شورشگێر ، ( کعر.) ، سەورێ. ٢ــ هەر کارێ یا شتێ کە پێوەندی بـە شۆرشـەوە هـەبێ . ★ شورشگێرانە .

**ئینـکار ــ** [ = عـا : انـکار ( حاشاکردن ) ] ، ( صـ.) کەللەڕەق، کەسـێکی قسـەی کەسـێ بە گوێدانەچێ و لە سەر قسەی خۆی سور بێ . :: ئەرێ قـالە ! خـۆ تۆ جاران هێندە ئینکار نەبوی ئەوە بۆ وات لێهاتوە . تێبـ ــ ئەم ووشەیـە صفەتێکی سەلبیە و تەنیا بۆ باری خراپێ بەکاردێت ، هێچ کاتێ بـە کەسێکی لەسەر ئێشێکی چاك پـێ دادەگرێ ناڵێن : پیاوێکی ئینکارە .

**ئینکارکردن ــ** [ عـا. کو. ] ، ( مصـتـ. لا. ) حاشاکردن لە کارێ ، شتێ یا لە ڕوداوێ . ٢ــ پـاشگەز بونەوە لە قسـەیەك . ٣ــ لە ژێر

کاریّ یا مەسەلەیەك دەرچوّن . :: هەر بە جاریّ ئینکاریّ کرد ووتیّ من قەت قسەی وام نەکردوە . پێم ووت قەرزی ... بوّ نادەیتەوە ئینکاریکرد و گوتی هێچی پیّ قەرزدار نیم .

**ئینکاریّ** ــ [عا. کو.] ، (حمصد.) کەللەڕەقیّ ، سوّریّ لە سەر قسە و ... :: بوّ ئەوەندە ئینکاریّ دەکەی. دە بەریّدا شل و کوت بوّن هەر ئینکاریّ کرد . ★ ئینکیڕیّ .

**ئینکەبەریّ** ــ [؟] ، ( حمصد.) بەربەرەکانیّ، ڕقەبەریّ، لەجاجەت، سەرسەختیّ. □ «... لەبەیتەکەدا گەورە پیاو و هاوشانی قەرەتاژدێنە، ئینکەبەریّ دەگەڵ قەرەتاژدێن دەکا» ( هێمن ، تحفە : ج ١ ــ ٨٢ ) .

**ئینکیڕیّ** ــ [ محر. عا. ] ، ( حمصد.) تم : ئینکاریّ .

**ئیهانە/ت** ــ [= عا : اهانة ] ، ( حمصد. ) ، ( کعر.) بیّحورمەتیّ ، سوکایەتیّ . :: کە هاتە ژوّریّ هێچ کەس پێینەکوت کەرت بە چەندیّ ، جا ئەوەی بوّ خوّی بە ئیهانە زانیّ هەڵستا لێیدارڕوّیشت . ★ ( کئێر.) تەوهێن .

**ئیهانەکردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصتد. متد. ) ١ــ بە قسە یا کردەوە ڕەزیلکردنی کەسیّ . ٢ــ بە چاوی سوّك تەماشاکردن . ٣ ــ حورمەتنەگرتن ، سوکایەتیّ بە سەر کەسیّ هێنان . :: ئەوە بوّچیّ ئیهانەی ئەم کابرایەت کرد . ئەوە بوّچیّ ئەم کابرایەت ئیهانەکرد هێچ نەبا بەخێرهاتنت کردبا . ★ تەوهێنکردن ، تەوهێنپێکردن .

**ئیهتیمامپێدان** ــ [ عا : اهتمام + کو : پێدان ] ، ( مصتد. لا.) بە تەنگەوەبوّن ، بە توندگرتن ، بە هێندگرتن ، خوّپێوەماندوّکردن ، دەخەمدابوّن ( بەشتیّ ، بەکەسیّ ، بەکاریّ ... ) .

**ئیهمال** ــ [= عا : اهمال ] ، ( نمصد.) کەمتەرخەمیّ .

**ئیهمالکردن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصتد. متد. ) ١ــ گویّنەدانەکاران . کەمتەرخەمیّکردن . ٢ــ بیّئەهمیەت سەیرکردن . ٣ ــ وێڵکردن ، تڕوّکردن . ٤ــ هەڵبواردن ، بەلاوەنان ، خوّتێنەگەیاندن .

**١ــ ئیّ** ــ ( بند.) ١ــ بەڵیّ ، ئا. :: ئیّ ، گوێم لێتە دە قسە بکە دەی. ٢ــ وەلامی پرسیارە بە ئێتجاب . :: ئیمڕوّ چوّنە بازاڕ ؟ ــ ئیّ . ٣ ــ سەرسوڕمانێکی تێکەڵ بە پرسیار دەگەیێنیّ . :: ئیّ ! جا کابرا هێچ قسەی نەکرد ؟ □« ... ئیّ چیە... زوّر سەیرە من ئەخوّمەوە کەچیّ ئێوە پەست ئەبن ! » ( قەفتان : چیڕوّك ــ ٤٣ ) تێب ــ لەم حاڵەدا هەندیّ درێژ دەکرێتەوە و بە شێوەی سەرسوڕمان دەگوتریّ . ٤ــ سەرسوڕمانی ڕوّت دەگەیێنیّ ، پاش بیستنی خەبەر و قسە یا دیتنی کارێکی سەیر . تێب ــ لەم حاڵەتەشدا هەر توّزیّ درێژ دەکرێتەوە ، فەرقی دەگەڵ بڕگەی (٣) ئەوەندەیە کە لێرەدا هێچ قسە یا پرسیاری بە دوّدا نایەت .

**٢ــ ئــێ ــ** ( ئه.) ئــامرازێ بانگ‌کردنه بۆ مێیینه و دەخرێتــه دوای ناوەوە . :: هۆ کچێ تا ئێره وەرە . کچەکێ بابانت خرا نەبێ... □« ... خەزالێ هەی خەزالێ ، گەردن‌بلیند و لێوئالێ » (فۆلکلۆر) .

**٣ــ (ــئێ) ــ** (پب.) به ئــاخری ناوانەوە دەلــکێ و نیشــان دەدا که مەبەست یەك دانه و له عەینی حاڵدا نەناسراوی ئەو شتەیه . :: ئەسپێ (یەك ئەسپ) ، کوڕێ (یــەك کوڕ) . □« ... کاورایێ سەقزێ بۆ ناوی لالۆ هەواس بۆ ... » ( قزلجــی : پێکەنین ــ ٦٦ ) . تێبـ ــ ئەم پاشبەندە هەر ووشــەی (یەك)ه ، له زمــانی پەهلەوێشــدا ( ئــێ )به مانــای (یەك)هاتوه. تم : (فره : پفا ــ ١٤٠).

**٤ــ ( ــ ئێ )ــ** ( پب.) ، (مک.)به دوای هەندێ لەو ناوانەوە دەنوسێ که جێگه و کــات (زەمــان‌ومەکان) پێشــان دەدەن ، له کۆنێنــەدا به ئاشکرا مانای ( وەخت ) و (شوێن)ی لێ‌زیــادکردوّن . :: ئێــــوارێ ، بەهارێ ، خوارێ ، دوێنێ ، ژۆرێ، سەرێ . لەمەهابادێ‌بۆم ، دەچمــه تەورێزێ ، چۆتەدەشــتێ ، ســاڵ دوازدەی مانگێ سەرمایەتی ، ئێستا له کەرکوکێ نەماوە ، لەوێ نەبۆ . □ «غەرێب ماووم له تارانێ، فرمێسکم دێن وەك بارانێ» . تێب ــ ١ ) به لای منەوە ئەم پاشبەندە هەر ووشــەی (جێ)یه که له هەورامیدا (یاگه) و له ئاوێستاییدا (یەئۆنه) و له پەهلەوێدا (گێڤاك و جێڤاك)ه ( تم : پد : یەسنا، ج ١ ــ ١٢٢ ) و له هەندێ قۆنــاغی گەشــەکردنی زمــانی کوردێــدا به شکڵی ( گا ، گه ، گێ )به مەعنــای (جێگا)ش و (وەخت)یش ، دەگــەڵ ناوی تر بۆ دروســت‌کردنی نــاوی (جێــگه و کــات) تەرکێــب‌کراوە ، ئێســتاش هەندێ ووشــەی کوردێ دەبێنێن که ئەم پاشبەندەیان پێوەیه و ئەگەر لێشیان کرایــەوە مەعنــایان ناگۆڕێ . :: جۆگه (جۆ) . ڕێگه ، ڕێگا (ڕێ) . جێگه ، جێــگا (جێ) . هەوارگه (هەوار) . کــانگا (کان) . ســــەرێنگا ( ســـەرێن ) ب) لــه ووشەکانی : (کەنگێ، کەینێ، کەی) و (هەنگێ ، هەینێ)ڕا زۆر چاك دیاره که ئەم (ئێ)یه هەر (گێ)یه و تطوّری کردوه . ج ) له حــاڵێکا لەهجــەی باکوری و بن‌لەهجەی موکریانێ توند دەستیان بەم پاشــبەندەوە گرتوه و به کاری دێنن :: ئەز دچم دهۆکێ ، ل جزیرێ بۆم ، هەڕه شامێ ، پێرێ له ماڵه مامم بۆم ، له شارەزوّرێڕا هاتوه، دەبێنێن بن‌لەهجەی سلەیمانێ به جارێ وازی لێهێنــاوە و دەڵێ : دەچمه کەرکوك ، له بەغا بۆم .

**٥ــ ئــێ ــ** ( ز.) ، ( مکــ.) ١ــ زەمێری سێیەم کەسی مفرەدە لــه تەسریفی هەندێ فیعلدا بۆ زەمــانی حاڵ . :: دەکــوژێ ، دەخــەوێ ، دەزانێ ، نــازانێ ، دەچــێ ، دێ ، دەفڕێ . ٢ــ زەمێری ئیشارەیه بــۆ شتێکی مفرەدی غایب . :: « دڵــم ڕاناوەستێ لەبەر ئەوێ غەمێ لەبەر ئەوێ ژانــێ » ، « دەڵێــن : ڕۆژی قیامەتێ ، خولاّ دەماندا‌تێ ئیمانێ » ( تحفه : ج ١ ــ ٢٠١ ) .

**( ــ ئێتیَ ) ــ** ( پب.) تم : ئەتیَ . :: کچێتیَ ، ژنێتی ، مـالّیدزێتیَ □« برسێتیَ ڕەگی هاریَ پێوەیە ».

**ئێجگار ــ** ( بنت.) ، ١ــ زۆر ، بیَئەندازە . ٢ــ تا ئەم ڕادەیە . □ « حەلّوای گەزۆ ئەبـاریَ »
« ئیچگار لێوی خـالداری »
( پیرەمێرد ــ ١٦٢)
:: بیَ قەزا بیَ ئێجگار واش نـا . تێبـ ــ ئەم ووشەیە ئەسلّی خۆی لە [ یەك ، یێك + جـار ] پێکهـاتوە ، جێرانەتیَ (ج) دەنگی (ك)ی کردوە بە (گ) و بۆتە (ئیگجار) کە لە هەنـدیَ شوێنی کوردستان هـەر ئەمەیـان دەبێژریَ ، بەلاّم چونکو دەنگی (گ) لە پێش (ج)ەوە قورسە ، بەرەبەرە ئەم دوَ دەنگە جیَگۆڕکیَیان کردوە و ئەم ووشەیە پەیدابوە . ★ ئێگجار ، یێگجار ، یێجگار ، یەجگار .

**ئێجگاریَ ــ** ١ــ (بنت.) بە تەواویَ بۆ هەمێشـە ، بە جـاریَ . :: بـە ئێجگاریَ وازی لە خوێندن هێناوە. ٢ــ (صت.) هەمێشـەیی ، دایمیَ :: ڕۆیشـتنی ئێجگاریَ بـیَ . ★ ئێگجاریَ ، یێجگاریَ ، یەجگاریَ .

**ئێجـگارەکیَ ــ** [ ئێجـگار + ئەکیَ/١ ] ، ( صت.) بە شـێوەیێکی تەواو بە جارێك :: ئێجگارەکیَ وازی هێنا . ★ یەگجارەکیَ .

**ئێختە ــ** [ تو.] ، ( ص.) ١ ــ ئەسـپێکی گونیـان دەرهێنـابیَ ( خەساندبێتیـان ) . ٢ــ ( مجـ.) پیـاوی غللـوَر و بە گـوڕەگوڕ کە هەلّسوکەوتـی بـە ڕەبـەڕەب و زرموکـهوت بـیَ . ٣ــ ( نمفـ. ) ( ئێختــەکراو )ە و کورتبۆتــەوە . ★ یەختە ، یێختە .

**ئێختەخان/نە ــ** [ تو. کو. ] ، ( نت.) ، ١ــ تەویلەیێکی تایبەتییە کە لە سـەردەمی دەرەبەگایەتیـدا پاتشا و مێر و بەگەکان بۆ ئەسـپە یەختە کراوەکانی خۆیان تەرخانیان دەکـرد . ٢ــ موتلّەقـی تەویلـە . □ « دەچـوە ئێختەخانـان دەری دەهێناوە جوانۆلێکی نۆزێنی سـیَ سالیَ » ( تحفـە : ج ٢ ــ ١٩٦ )، « لە بۆ ئێختەخانەی ڕاکێشاوە » ، ( تحفە : ج ٢ ــ ١٦٥ ) . ٣ــ نـاوی دێیـەکە لە موکریـان و شـوانی سەرخاسە ★ یەختەخان (خانە) ، یێختەخان ( خانە ) .

**ئێختــەرمە ــ** [ تو.] ، ( نا.) ١ ــ چەك و کەل و پـەلی دوژمـن کە پاش کوشتنی دەستی بە سـەرا دەگیریَ ( معین : فەرهەنگ ، ج ١ ــ ١٦٦ ) . □ « بـە دوَ تیرانچـوار سـواری دە چەلیپـانم کـردوَن ئێختەرمە » ( تحفە : ج ٢ ــ ١٨٣ ) ★ یەختەرمە . ٢ــ ئەسپێکی سوار بە دوَ خۆیـدا ڕای دەکێشـی ★ یەدەگ .

**ئێختــەکردن ــ** [ تو. کو. ] ، ( مصت. مت.) ١ــ دەرهێنـانی گونی ئەسپ (بەتایبەتیَ) و هەر حەیوانێکی تـر ( بەگشـتیَ ) . ٢ــ ( مجـ.) بەیدەستکردن ، ژێردەستکردن ، هێنانەبەربار ، ڕامکردن ، لە هەڕ و گێف و گوڕەگوڕخستن . :: هـەر دەلّـەی ئێختەیـانکردوَن هـەرا و هۆریای جـارانیان نەمـاوە . ★

بەختـــەکردن ، یێختـــەکردن ، خەساندن .

**ئێخسیر ــ** [ محە. عا : اسیر ] ، ( نـا. صە.) ١ــ سەربـاز یا هــەر شەڕکەر و چــەکدارێکی تر کە لــە شــەڕا بە زیندوێی دەکەوێتــە دەس دوژمــن . ٢ــ ( مجــ.) ، أ ) هــەر کەسێکی خرابێتە بەندیخانەوە . ب) ئینسانی فەقیر و بێدەســتەڵات و دەست و پێ سپێ . ★ ئەسیر ، دیل ، یەخســیر ، یێخسیــر . :: ئێخسـیرێکی زۆرمــان گرت ، لــە ستالینگراد گەلێ سەربازی هیتلەر ئێخســیرکران ، تەمـاشای هــەر دەڵــەی ئێخســیری ڕۆمێیـــە ( زورفەقیرە ) .

**ئێخسیری ــ** ( حمصە.) ١ــ لــە شەڕا کەوتنەدەست دوژمن . ٢ ــ ( مجە.) بێدەستەڵاتی ، دەســت و پێسپیلکەیێ . :: ئێخسـیرێ گەلێ لەم حاڵە باشترە ، حەوت ساڵان بە ئێخسیرێ ڕابوارد . ★ ئەسیرێ ، یەخسیرێ ، یێخسیرێ .

**( ــ ئێر ) ــ** ( ئــە.) تــە : ٢ ــ ( ــ ئەر ) :: پشکنێر ، دلێر .

**ئێرانە ــ** [ ئێرە + ٢ــ ئـان/١ + ٥ ــ ئە/١ ] ، ( نتە. بنتە. ) جەمعی ئێرەیە ، ئەم جێگایانەی نێزیـك و دەوروبەر،ئەم شوێنانە (مبهم‌ونکرة) . تێبـ ــ لەم ووشـەیەدا پاش ئــەوەی ئامرازی جەمع دەلکێ بە ووشـــەی ( ئێرە )وە و ( ٥ ــ ئە/١ )یشی بــە دوادا دێت دەبێتە ( ئێرەئانە ) ئەوجار دەنگ‌بزوێنــی دوایــێ ( ئێــرە ) و ( هەمزە)کەی ئامرازی جەمع یەکتر

دەخۆن ، لە هەمۆ حاڵەتێکی ئاوادا هەر وا دەبێ .

**ئێرووکانە ــ** [ ئێرەُ + ئۆکە + ٢ــ ئـان/١ + ٥ــ ئــە/١ ] ، ( نتە. بنتە. ) تمــ : ئێرەکانــە . تێبـ ــ لــە ڕاستیدا ئەم ووشـــەیە شـــوێنێکی بچۆکتر و نێزیکتریش پیشان دەدا .

**ئێرە ــ** [ ســت : ئیتهرە. پە : ئێتەر ] ، ( نتە. بنتە.) هەمۆ جێگایەکێ پیاو لە کاتی باس‌کردنیدا لێیەتی . :: ئێمە لە ماڵی شێرکۆین‌تۆش وەرە جا لێرەڕا ( لەئێرەڕا ) دەڕۆیـــن . ★ ( سنە .) ئەگرە .

**ئێرەکانە ــ** [ ئێرە + کە ( ئم : تەعریف) + ٢ــ ئان/١ + ٥ــ ئە/١]، ( نتە. بنتــ.) ئــەم جێگایـــانە ، ئەم‌شوێنانە . ( معرفة ومعیّن ) ☐ «. . . ئەمە کاکە مەم مان نەگەیاندەوە ئێرەکانە . . .» ( تحفە : جا١ــ٢٢٧) . ★ ئێرەکانێ .

**ئێرەکانێ ــ** [ ئێرە + کە (ئم : تەعریف ) + ٢ــ ئان/١ + ٤ــ ئێ] ، (نتە. بنتە.) تم : ئــیرەکانە . تێبـ ــ ئەگەرچی ئەم ووشـەیە هــەر مانای ( ئێرەکانە ) دەدا بــەڵام جیاوازێکی هەیە ، هــەرچێ (ئێرەکانە)یە هەر جیگاکان دیار دەکا ، بەڵام ئەمەیان بە هۆی پاشبەندی (٤ــ ئێ) حصر و تحدیدی تێدا دەخوێندرێتەوە .

**ئێرەڤ‌بــوون ــ** ( مصــتە. لا. ) ڕەپ‌بۆنی ئاڵەتی نێرینەیێ ئینسـان و یەکسم . :: لێی ئێرەڤ بۆ . ★ یەرەڤ‌بۆن .

**ئێرەڤە ــ** [؟] ، (نا.) تم : ئامۆر .

**ئێرە و ئــەوێ ــ** (کنە.) جێگا و

شوێنی نامەعلوم. :: ڕەحەت دانیشە هێندە ئێرە و ئەوێ مەچۆ . بەس ئێرە و ئەوێ بکە .

**١ـ ئێرەیی ــ** (نمص.) ، (مک.) حەسوودی ، بەغیلی . :: هەموویان ئێرەیی بە وەتمان دەبەن .

**٢ـ ئێرەیی ــ** [ ئێرە + ٣ـ ئی ]، (صت.) خەڵکی شار یا ئاوایی یا هەر شوێنێکی کە پیاو لە وەختی قسەکردندا لەوێ بێ ، خەڵکی (ئێرە) . :: لەوە ناچێ ئەو کوڕە ئێرەیی بێ ، بزانن خەڵکی کوێیە .

**ئێزنگ ــ** [ ست : ئەئێسمە. پە : ئێسم ، ئێزم ] ، (بک.) ، (نا.) داری سووتەنی بۆ سۆبە و تەندوور و ... ★ (زا.) ئەئێزێمی ، (هو.) هێزم .

**ئێسا ــ** (بن.) ، ( سن. ) تم : ئێستە .

□ « ئێسا هەر کەسێ گەوهەر فرۆشەن »
« جە وەسڵ شێرین وێش شەربەت نۆشەن »
( خانا ــ ٣ )

**ئێساکە ــ** (بنت.) ، (سن.) تم : ئێستە .

**ئێستا ــ** (بنت.) تم : ئێستە . تێب ــ ئەم ووشەیە هەر (ئێستە)یە کە لە ژێر تەئسیری شوێنی بەکار هاتنیدا ( ٢ــ ئە/٢ ) دەبێتە دەنگ بزوێنی ( ئەلف ) .

**ئێستاکۆنی ــ** [ئێستە + کۆن+ ٤ــ ئی] ، (بنت.) ، (مک.) تم : ئێستە تێب ــوای بۆ دەچم کە کەرتی دووەمی ئەم ووشەیە قۆناغێکی تری ووشەی ئاوێستایی (نو) بێ کە لە لەهجەی باکوریدا (نها) و لە مەڵبەندی ڕەواندزێ ( هەنوکە ) و لە پەهلەویدا (نون)ە و لە فارسی ئیمڕۆدا بۆتە (کنون) و ( ئەکنون ) .

**ئێستاکە ــ** [ ئێستە + کە (ئم : تەعریف ) ] ، ( بنت. ) تم : ئێستە .

**ئێستاکی ــ** [ ئێستاکە + ٤ـ ئی ] ، ( بنت. ) تم : ئێستە .

**ئێستر ــ** [پە : ئەستەر] ، (نا.) گیاندارێکی بەکاری چوارپەلقایمە ، لە جوتبوونی نێرە کەرو ماین پەیدا دەبێ ، لە شاخ و ڕێگەی سەختا لە وولاغی دیکە چاتر بڕ دەکا ، لە کوردستان بۆ سواری و بارەبەری کەڵکی لێ وەردەگیرێ. ★ هێستر، قاتر، (بک.) قانتر . **ئێستری ماچە ــ** (نت.) ئێستری مێ :: ئێستری ماچە ئاووس نابێ . **ئێستری نێرەکی ــ** (نت.) ئێستری نێر . :: ئەرێ ئێسترێکی نێرەکی باشتان پێ شک نایە بۆ فرۆشتن .

**ئێسترسوار ــ** ( صت. نت. ) ، ١ــ کەسێکی سواری ئێستر بێ . ٢ــ (کعر.) جەندەرمەی دەوری عوسمانی . تێب ــ لەبەر ئەوەی وولاغیان ئێستر بو لە کوردستان دەسوڕانەوە ، ئەم ناوەیان بە سەردا بڕاوە . ★ قاترسوار .

**ئێسترەبالانی ــ** [ ئێستر + ٣ــ ئە/٢ + بالانی ؟ ] ، (نت.) ئێسترێکە بە پێچەوانەی ئێستری ئاسایی ، ئەسپ لە ماکەر دەپەڕێ و ئەمەی لێ دەکەوێتەوە ، وەکو ئەسپ دەحیلێنێ و لە ئێستری دی پچوکترە .

**ئێسترەگایێلکە ــ** [ ئێستر + ٣ــ ئە/٢ + گا + ئێلکە ] ، (نتە.) جۆرە ئێسترێکی پچوکە ، وەکو دەڵێن لە جوت بونی (گا) و (ماکەر) پەیدا دەبێ .

**ئێستك ــ** (نا.) تم : ئێسك .

**ئێستە ــ** [ئێست + ٢ــ ئە/٢]، (بنتە.) ئەم دەقیقە و لەحزەیەی کە تێیداین ، ئەم کاتە ، ئەم زەمانە . ☐ « ... ئێستە ئێمە شارە و شار بە دوای ئەوا بگەڕێین یان ...» ( قزلجی : پێکەنین ــ ١٢٠ ) ★ ئەمێستا ، ئەمێستە ، ئەوێستا ، ئەوێستاکە ، ئەوێستاکێ ، ئێسا ئیساکە ، ئێستا ، ئێستاکونێ ، ئێستاکە ، ئێستاکێ ، ئێستەکانێ ، ئێستەکە ، ئێستەکێ ، ئێستێ ، ئێستێکانێ ، ئێستێکێ ، ( سنە. ) ، ئێسە ، ئیسەتێ ، (هل.) هەنوکە . (بکە.) نها ، نهو ، نوکە . تێب ــ أ) وەکو دەبێنن ئەم ووشەیە و ووشەکانی ( ئێرە ) و ( هێشتا )ش کە هەرسێکیان پێوەندیان بە ( زەمان و مەکان )ەوە هەیە ، گەلێ وەچەیان دەرکردوە کە لە هەر سێ ووشەدا زۆر وێك دەچن [ ئەسڵی ووشەکە + کا ، کە ، کێ ، ... ، ...] بێ ئەوەی گۆڕانی شکڵ کارێکی کردبێتە سەر مەعناکەیان و لە حاڵی حازردا هەمو وەچەکانی ئەم سێ ووشەیە وەکو ( مرادف )ی ووشە ئەسڵییەکان بەکاردەهێنرێن . ب) ووشەی (ئێستە) و لك و پۆپەکانی هێچ ئەو پەیوەندیەیان دەگەڵ ( نو )ی ئاوێستایێ و (نون) پەهلەوێ نیە کە ( نها ، نهو ، نوکە )ی باکورێ و ( هەنوکە )ی هەولێرێ هەیانە . جا ئەم ووشەیە یائێ دەورێکی پێش زمانی (ئاوێستا)یە یاخۆ هی زەمانێکە کە زمانی پەهلەوێ لە سك و زاکەوتوە کە ئەمەش دەکەوێتە دوای بڵاوبونەوەی ئیسلامەتێ لە کوردستانا . بە لای منەوە ئەمەیان لە ڕاستێ نیزیکترە و پێش پەیدا بونی ئەم ووشەیە بۆ مەدلولەکەی ووشەی تر لە ڕێشەی ئاوێستایێ ( ئەوانەی لەهجەی باکورێ و هەنوکەی ناوەندێ ) بەکارهاتون .

**ئێستەکانێ ــ** [ ئێستە + کە ( ئم : تەعریف ) + ٢ــ ئان/١ + ٤ــ ئی ] ، ( بنتە. ) تم : ئێستە .

**ئێستەکە ــ** [ ئێستە + کە (ئم.) ] ، (بنتە.) تم : ئێستە .

**ئێستەکێ ــ** [ ئێستەکە + ٤ــ ئێ ] ، ( بنتە. ) تم : ئێستە .

**ئێستێ ــ** [ ئیست + ٤ــ ئێ ]، (بنتە.) تم : ئێستە .

**ئێستێکانێ ــ** [ ئێستێ + کە (ئم.) + ٢ــ ئان/١ + ٤ــ ئێ ] ، (بنتە.) تم : ئێستە .

**ئێستێکێ ــ** [ ئێستێ + کە (ئم.) + ٤ــ ئێ ] ، ( بنتە. ) تم : ئێستە .

**ئێسخوان ــ** [پە : ئۆستەخوان]، (نا.) تم : ئێسك .

☐ « کالآی گۆشت و پۆست بەرگ بەدەن چاك »

« مۆرەی ئێسخوانش ڕێزا نە
ڕۆی خاك »
( خانا ــ ٧١٤ )

**ئێسقان ــ** (نا.) ، (کعر.) تە : ئێسك . □ « ... دەستێ کە هەر ئێسقانی ڕۆت بۆ تەقەی لــە قاپێ هەستاند ... » ( قزلجێ : پێکەنێن ــ ٢١ ) . **ئێسقانی ڕەش بێ ــ** (کنـ.) بمرێ . جوێنە و ژنان بە یەکترێ دەدەن .

**ئێسك ــ** [ ستـ : ئەستێ . پھ : ئەستەك ] ، (نا.) ١ــ ئــەو شــتە ڕەق و سـەختەیە کە هەیکەلی لەشی ئادەمێزاد و گیاندارانی تری خاوەن تێفەرە پشتی لێ پێکهاتوە و نەرمایێ لەش ( گۆشــت و ... ) بــەوەوە ڕاوەســتاون لــە ( فۆســفات ) و ( کاربۆناتی کالیسیۆم ) دروستبوە ، دەرەوەی ئێشك و ســەختە و لــە ناوەوە بەشێکی تەڕ و نەرمتر (مۆخ) هەیە .

□ « دوعا خوازێت کە کردئێسکم
بــە جارێ کەوتە نالە نــاڵ »
« لە نــاو ئەو نالــەدا بالۆلی
دلخــۆش نــەی ســـوارێکە »
( پیرەمێرد ــ ٢٠٣ )

٢ــ (مجـ.) شکڵ و شێوەی ئینسان ★ ئێستك ، هێستك ، (هو.) پێشە . ئێسخوان ، ئێســقان . ( بکـ. ) هەستێ ، هەســتۆ ، ( هەکارێ ) هێستە . ● **ئێســکی خواتەوە ــ** (کنـ.) بمرێ . جنێوێکە لە ناو ژناندا باوە ، پیاو نایڵێن ★ ئێسقانی ڕەش بێ . ئێسکی ڕەش بێ، ئێسکی مرێ. **ئێسکی ڕەشبێ ــ** (کنـ.) تە : ئێسکی خواتەوە . **ئێسکی فیل ــ** (نتـ.) ، (مکـ.) ١ــ شفرەی فیل ، عاج . ٢ــ (مجـ.) کاڵایــەکی لــە دوکانــا زۆر بمێنێتەوە و نەفرۆشرێ . **ئێسکی مرێ ــ** (کنـ.) تە : ئێسکیخواتەوە .

**ئێسك سوك ــ** [ ئێسك/٢ + سوك ] ، (صتـ.) ئینسانی لە بەردڵان، کەسێکی شکڵ و شێوە یا جوڵانەوە و ئاکاری لە بەر چاوانی نــەخا . ★ ڕەزاسوك، ڕەزاشیرن، خوێن شیرن ( شیرین ) .

**ئێسك قورس ــ** [ ئێسك/١ + قورس ] ، ( صتـ. ) کســێکی لەبەر شکڵ و شێوە یا جۆری هەڵسان و دانیشتنی نەچێتــە دڵانــەوە . ★ ئێسكگران، ڕەزاقورس، ڕەزاگران، خوێن تاڵ .

**ئێسكگران ــ** [ ئێســك/٢ + گران ] ، ( صتـ.) تە : ئێسكقورس.

**ئێسكوپڕۆسك ــ** [ ئێسك + و ( عطـ. ) + پڕۆسك ؟ ] ، (نتـ.) ١ــ پاشماوەی مردوی نێژراو کە ڕزێ بێ و مشتێ ئێســقانی نێوەڕزێوی مابێتەوە . ∴ ئەوە تۆ دەڵەی چێ بە خوا ئێسك و پڕۆسکێشی نەماوە . ٢ــ هەمۆ ئــەو ئێســقانانەی پاش خواردنی گۆشتی مریشك و باڵندەی تر دەمێنێتەوە. ∴ ئەگەر مریشکتان نەخواردوە ئــەی ئــەم ئێســك و پڕۆسکانە چن ؟ .

**ئێسە ــ** (بنـ.) ، (ســنـ.) تە : ئێستە .

**ئێسەتێ ــ** (بنتـ.) ، (سنـ.) تە : ئێستە .

**ئێش ــ** [ ستـ : یەسکە ] ، (نا.)

ئـازار و ژانی لـەش ( فیزیکی و ماددی) ، ئازاری گیان ( ڕۆحیّ و مەعنەویّ ) ..

□ « لێرەش وا کەوتـوم بـە دەم دەردەوە »

« لـە ئێشــی دوری و ئـاهی سەردەوە »

( پیرەمێرد ــ ١١٧ )

تێب ــ ژابا (یەسـکە )ی ئاوێستایی بەرامبەر بە (ئێش) دەزانیّ (تم : ل ــ ٣٠ ) ، بەڵام ئەوڕەنگە بە بیماریّ و نەخۆشـیّ داناوە ( تم : بەهرام ــ ٢٥١) و لە بن لەهجەی (هەویرکی)دا (ئێشان) بە نەخۆشیّ دەڵێن : پچەکی دێشم = تۆزیّ نە خۆشم .

**ئێشان ــ** (مصد. لا.) ١ــ هەست کردن بـە ژان و ئـازار ( ماددیّ و مەعنەویّ ) :: پێیـان بلیّ پشـتی دێشـیّ ( دەئێشــی ) ناتوانیّ بیّ . منداڵەکان هـەمو چاویان دێشـا ( دەئێشـا ) . دڵـیّ ئێشـاوە . ٢ــ پەیدابونی ئازار لـە ئەندامێکی لەش :: چۆن پشت لە خۆڕا دێشیّ دەبیّ سەرما کاری لێکردبیّ .

□ « ئەمان مردم لە داخی دڵ لەبەر گریان و هاواریّ »

« درێغ سوتام لە قرچەی ئاگری ئێشان و ئازاریّ »

( دلدار : گم ــ ٦٠ )

**ئێشاندن ــ** ( مصد. متد. ) ١ــ پەیـداکردنی ئـازار لـە لەشـی کەسـێکدا . :: زۆریـان لیّدابـو تەواوێك ئێشـاندبویان. ٢ــ ئازاردانی کەسی بە قسـە یا هەر وەسیلەیێکی تری غەیرە ماددیّ .

**ئێش پێگەیاندن ــ** ( مصد. متد. ) تم : ئێشـاندن .

**ئێشك ــ** (نا.) ، ( کعر. ) کاری ئاگالێبوّن و پارێزگاریّ کردنی شتیّ. ★ ( کئێر. ) کێشـك . تێب ــ بە لای منەوە ئەم ووشەیە لە (ئێشیك ئاغاسیّ ) تورکی دەوری عوسمانیّ بە مەعنای ( پاسەوانی حەڕەمسـەرا ) وەرگیراوە .

**ئێشــکچیّ ــ** [ تو. ] ، ( نفا. صفا. ) ، ( کعر. ) ١ــ ئەو کەسەی بۆ پاراسـتنی شـتیّ شـەو ڕۆژ دەکاتەوە . ٢ــ ئـەو کەسـەی لە لە سـەربازخانە و . . . بە پێی فەرمان بە نۆرە ڕادەوەستیّ . :: ئێشکچیّ بەر دەرگای سـەرا . ئێشـکچیّ بەندیخانە . ★ حەرەس (عـا.) ، (کئێر.) کێشکچیّ ، قەرەووڵ .

**ئێشکچێتیّ ــ** [ ئێشـکچیّ + ئێتیّ ] ، [ تو. کو. ] ، ( حمصد. ) ، ( کعر. ) کارێکی ئێشکچیّ دەیکا . (عا.) حەڕاسـەت . □ « . . . بە زۆرە ملـیّ هـەوڵی ئـەدا خـەو نەیباتـەوە و ئێشـکچێتیەکەی بـە ووریایی تا ڕۆژ بەرێتە سـەر . » ( بلە : ژان ــ ) .

**ئێشــك‌گر ــ** [ ئێشـك + گر ( گرتن ) ] ، [ تـو. کو. ] ، ( نفا. صـفا. ) ، ( کعر. ) ، ( تد. ) تم : ئێشکچیّ .

**ئێشك‌گرتن ــ** ( مصد. متد. ) ، ( کعر. ) ١ــ ئاگالێبوّن ، پاراستن ، پاس‌کردن . ٢ــ بە دیار شـتێك و کارێك یا کەسێکەوە بوّن .

□ « ماندوی سەر خەوێك بشكێنە
لە لام »
« ئێشكت ئەگرم ، مەترسە ،
ئازام »
( پیرەمێرد ــ ٤٢٠ )
٣ــ بە دیار ژنی زەیستان و مندالەکەیەوە شەو تا ڕۆژ دانیشتن تا ( ئالە ) و ( شەوە ) دەستیان لێ نەوەشێنن .
□ « ئێشكت ئەگرم نەك چل شەو
چل سال »
« لە ترسی شەوە و ترسی دایكی
هال »
( سەلام ــ ١٤٤ )
★ ( كئێر. ) كێشك كێشان .
**ئێق ــ** ( ند. ) دەنگێ کە لە حالی ڕشانەوەدا لە گەروو دەبیسترێ .
**ئێقدانەوە ــ** ( مصد. لا. ) ١ــ گەڕانەوەی ئاو بەرەو سەرچاوە ، پاش ئەوەی لە ئەستێل و... پۆنگ نەخواتـەوە . ٢ــ بلاوبونـەوەی خەلك و حەشامات بۆ ئـەو لاولا ، پـاش ئەوەی لە شـوێنێك پۆنـگ دەخواتەوە و جێگەی نابێتەوە . :: حەشامەتەکە هێندە زۆر بـو لەبەر دەرکی سەرا جێی نەدەبۆوە و ئێقی دابۆوە لای جادەی صـابونکەران و مزگەوتی گەورە .
**ئێقکردنەوە ــ** (مصد. لا. ) ، ١ــ بەتالکردنی ئەوەی لە ناو (مەعدە) دایە ، بە ڕێگای گەروودا . ڕشانەوە. ٢ــ ( مجـ . ) ڕەتکردنـــەوە و گەڕاندنەوەی شتێ (پارە،...،...) بـە نـاچاری . تێبـ ــ لـە حالێکا دەگوترێ کە ئەو کەسەی شتەکەی هابـەلاوە ، وا بزانێ تـەواو قوتی داوە و خەیالی دانەوەی نەبێ . :: نەیدەدایەوە بەلام پێمان ئێقکردەوە. بۆ کوێی دەبا هەر دەبێ ئێقی کاتەوە.
★ یەقکردنەوە .
**ئێك ــ** ( پـ. ) ، تم : ٣ــ ئێ .
**ئێکجار ــ** ( بند. ) تم : ئێجگار .
**ئێگزۆز ــ** ( ئینگلیـسی ) ، (نا.) ئامرازێکە ( لولـە ) لە ئوتومبێـل و ماکینەی ترا کە بە نەوت و بەنزیـن ئێش دەکەن ، دوکەلـی موتـوڕی پێدادێتەدەرێ .
**١ــ ئێل ــ** ( نا. ) عەشیرەت ، تایەفە ، قەبیلە .
□«نەکەرۆز گەڕام وادێ بە وادێ »
«شوێنی هەوارگەی ئێلی مرادێ»
( پیرەمێرد ــ ١١٥ )
تێبـ ــ معین ئەم ووشەیەی بە تورکی داناوە ( فەرهەنگ : ج ١ ــ ٤١٨ ) بەلام هس . ٢ــ ئێل . ★ عێـل . خێل .
**٢ــ ئێل ــ** (ئە.) ئامرازی جەمعە لە لەهجەی جنوبێ و هـەندێ بن لەهجەی ناوەندێ زمانی کوردیدا . :: کوڕ ( کوڕێـل ) ، کچ (کچێل) ، ئەسپ (ئەسپێل) . □ « کوڕە هەی مرێشـك خوڕێل لێرەش وازمـان لێنایەرن » ( کابرایەکی جاف لـە دەوری کەلار ) ★ یەل ، یێل ، گەل، تێبـ ــ بە لای منەوە ئەم ووشـەیە و ( ١ــ ئێل ) و ( گەل ) هەرسێکیان یەکن ، چونکو دەلالەت لە ( جەمع ) دەکە . هس : خێل .
**ئێلاخ ــ** [ محر. تو : یایلیق ، یایلاق ] ، (نـا.) هاوینە هەواری

عێل و عەشیرەتی مەڕدار کە گەرمێن و کوێستانێ دەکەن .
□ « دەستکردی شیرین لەیلی ئێلاخان »
« چێخی پشت پۆڕك پەردەی دیواخان »
( سەلام ـ ٩١ )
★ لێلاخ، کوێستان (مج.)، هەوار، (بک.) زۆزان (مج.) .

**ئێل بەگی** ـ [کو : ١ـ ئێل + بەگ + تو : ئێ ( ئە : نسب. ) ] ، [ کو. تو. ] ، (نت.) گەورەی عێل ، سەرۆکی خێڵ
□ « کۆچ خێرت بۆ ئیمساڵ چون ساڵان »
« تالای ئێل بەگێ ئێل نەوهاڵان »
( مەولەوێ : مکب ـ ٤١٧ )
★ سەرئێل ، سەرخێل ، سەرکۆمار/١ .

**ئێلجاڕی** ـ [ ١ـ ئێل + جاڕ + ٣ـ ئی ] ، (نمص.) ١ـ دەنگدانی هەمۆ عەشیرەت بۆ بەرامبەری دوژمن یا بۆ هەر کار و فرمانێکی تر کە پەیوەندێ بە عەشیرەتەکەوە هەبێ . ★ عێلجاڕێ . ٢ـ کۆکردنەوەی خەلکی زۆر دژی کەسێك یا هەیئەتێکی کۆمەلایەتێ یاخود دژی کردەوەییکیان . ★ ئیجماع لێکردن ، گەلەکۆمەگێ .

**ئێلچێ** ـ [ ١ـ ئێل + چێ ] ، [ کو. تو. ] ، (نت.) کەسێکی پەیام و قسە و ڕاسپاردەی کەسێ یا هەیئەتێکی ئیجتیماعێ بۆ لایەکیتر دەبا . □ « ئەگەر هەڵنەستێ نەبێ بە ئێلچێ لە دۆی من ، نەیە شاری وێرانە چزێرێ ... » ( تحفە : ج ١ ـ ٢٣٧ ) ★ بالیۆز ، سەفیر ، قاسید .

**ئێلچێگەری** ـ ( حمص. ) پەیام گەیاندن ، هێنان و بردنی قسەی کەسێ یا هەیئەتێ بۆ لایەکیتر. □ « مێتوانێنە ! مێتر ئەمنی ناردۆتە کن ئەنگۆ بە ئێلچیگەرێیە . » (تحفە : ج ٢ ـ ٩ ) .

**ئێمە** ـ (ز.) ، ( کعر. سنذ. ) تم : ٢ـ ئەمە .

**ئێمەگەل** ـ ( نت. ) ، ( سنذ.) ( جەمعی ئێمە ) تم : ئێمەمانان .

**ئێمەمانان** ـ [ ئێمە + مان (ئم : وێچواندن) + ٢ـ ئان/١ ] ، (نت.) ، (کعر.) خەلکی وەك ( ئێمە ) ، ئەوانەی وە ئێمە دەچن ، ئەو کەسانەی حالیان وەك حالی مەیە . ★ ( مک. ) مەمانان . ئێمەومانان . (سنذ.) ئێمەگەل .

**ئێمەومانان** ـ ( نت.) ، (کعر.) تم : ئێمەمانان .

**( ـ ئێن )** ـ ( پب. ) دەلکێ بە دوای ناوەوە و ناوێکی تازە بۆ گەلێ لەو یاریانە دروست دەکا کە لە کوردستان باون و پێویستە پتر لە تاکە کەسێ تێیاندا یاری بکەن . :: تۆپەڕاکردێن ، تۆپێن ، جگێن ، جەغزێن، زەرفێن، فینجانێن،ماتێن، مۆشێن ، نەردێن ، هەلۆکێن . ★ ئانێ . تێب ـ بە گشتێ ئەم پاشبەندە مانایێکی ( ئالوگۆر )ی تێدایە و دەتوانی بەرامبەری پێشبەندی لاتینێ Co بێ لە هەندێ ووشەی ئینگلیزێ و فرەنسیدا وەکو :

تعاون : ، هاوكاری cooperation
یا تعایش ، هاوژیانی coexistence

**( ـ ئێنه ) ـ** ( پب. ) به دوای صفەتێكەوە دەلكێ و دەیكا بە ناو . :: ترخێنه ( ترخ = ترش + ئێنه )، ڕەشـكێنه ، زەردێنه ، سـپێنه ، شلكێنه .

**( ـ ئێنی ) ـ** ( پب.) بـه دوای ناوی (ذات)ەوە دەنوسێ و دەیكا بە ناوی مەعنا . :: كچێنێ ( كچ ) ، كوڕێنێ ( كوڕ ) ، چاوێنێ ( چاو ) ، بۆكێنی ( بۆك ) ، ڕەببێنێ ( ڕەب ، خودا ) .

**ئێوار ـ** (نا.) تم : ئێوارە . :: ئەوە دنیائێوارە با بڕۆینەوە مالێ . ★ (بك.) ئێڤار ، هێڤار . **ئێوارێكی درەنگ ـ** (نت.) كاتی زەردەپەڕ ، ئەو دەمەی ڕۆژ نیزیكی ئاوا بونە .

**ئێـواران ـ** [ ئێـوارە +٢٠ـ ئـان/٢ ] ، (نت.) هەر ئـەو كاتەی كەپێی دەكوترێ (ئێوارە) و كاتێكیتر نا. :: ئێوارانێش پچێتـه مەكتەب هەر باشترە لە نەخوێندن .

**ئێوارە ـ** [ پھ : ئێڤـارەك ] ، [ ئێڤار + ٥ـ ئە/١ ] ، (نا.) ئاخر وەختی ڕۆژ ، كـه دەكەوێتە پاش نێوەڕۆیێكی درەنگ و ئاوابونی ڕۆژ. ★ ( ھو . ) ڤێرەگا .

**ئێوارە بازاڕ ـ** (نت.) ١ـ بازاڕی چۆل و كەم كڕیار لەبـەر درەنگە وەختێ . :: وەرە وەرە هەڵیگرە هەر چەند زەرەرێش دەكا بەڵا ئێـوارە بازاڕە قەیـدێ ناكا . ٢ـ ( كن. ) بازاڕی كەساد و بێ برەو . :: ئەوە ئەم بازاڕە بۆ وای لێهاتوە هەر دەلەی ئێوارە بازاڕە .

**ئێوارە وەخت ـ** ( نت. ، صت. ) ١ـ كاتی ئێوارە . ٢ـ (مج.) درەنگ وەخت . □ « ئێوارە وەختە ، جرپن بە بەختە » ( خا. پەند ـ ٧٢ ) . تێب ـ ئەم ووشەیە ئەگەر ( مبتدا ) بۆ ناوە و ئەگەر بە دوای ناوێكیشەوە هات صفەتە . ★ ئێوارە وەختە .

**ئێوارە وەختە ـ** [ ئێوارە وەخت + ٥ـ ئە/١ ] تم : ئێـوارە وەخت :: ئێـوارە وەختەیێكی درەنگ بـه دێر و ژوانەوە گەڕایەوە مالێ .

**ئێوارێ ـ** [ ئێوار + ٤ـ ئێ ] ، (بنت.) لە كاتی ئێوارێدا . :: ئێوارێ وەرە دەچێنە لای سمكۆ .

**ئێوە ـ** (ز.) ، ( كعر.، سن. ) تم : ئەنگۆ .

**ئێوەگەل ـ** ( نت.) ، ( سن.) تم : ئێوەمانان .

**ئێوەمانان ـ** [ ئێوە + مان ( ئم : وێچواندن ) + ٢ـ ئان/١ ] ، (نت.) ، (كعر.) ئەوانەی وەك ئێوەن . ★ (سن.) ئێوەگەل .

**١ـ ئێ ـ** [ پھـ : ئێ ] ، (ئم.) ١ـ ئامرازی ئیزافەیە و (مضاف) و (مضاف الیه) تێك دەكاتەوە :: كوڕێ لالۆ سـەرحەد ، ئـەندامێ كوری زانیاری كورد . تێب ـ ئەم ئامرازە ئەگەرچێ لە پەهلەیدا (ئێ) بوە بەڵام ئێستا وەكو (ژێر = كسرة) تەلەفوز دەكری و بـه هەڵە لەم شـوێنە دانوسـراوە . ٢ـ ئامرازی بەیانی حالە و لە سەرەتای ڕستەدا دێت . :: ئێ دەباشم ، ئێ نەسـاغم ، ئێ

ڕەشـس . ٣ـ ( مکـ. ) ئـامرازی مأکایەتییە و دیاری دەکا کە فلانەشت ملکی فلانە کەسـێکە . □ « ... پێغەمبەری خولای لە مەدینێ بۆ ، دنیا هـەمۆ ئێ کافران بـۆ ... » ( تحفه : ج ٢ ـ ٢٢٢ ) . :: ئـەم کتێبە ئێ برزۆیە ، ئەسپە شۆخەکە ئێ دلشادی بۆ ★ هێ ٤ـ لە پێش صفەتێکدا دێت کە (موصـوف)ەکە نێرینە بێ :: ماشەللا کوڕی من ئێ گەورەیە .

**٢ـ ئێ ـ** [ پە : ئێتە. ] ، (پب.) بە دوای (نـاو) و (صـفەت)انەوە دەلکێ و حاصل مەصـدەر و ناوی مـەعنایان لێ دروسـت دەکا . :: گەورەیێ ، خۆشـێ ، شـادێ ، پاتشـایێ ، تارێـکی ، ڕۆناکێ ، نۆکەرێ .

**٣ـ ئێ ـ** [ پە : ئێك ] ، (پب.) پاشبەندێکە صفەتێکی پێ دروسـت دەبێ کـە پـەیوەندێ و نیسـبەت دەگـەیێنێ . :: زمـانی کوردێ ، ئەدەبی عەڕەبێ ، چای سـێلانێ ، هەولێرێ .

**ئێتر ـ** [ ١ـ ئێ/٢ + تر ( ئم : تفضیل )] ، ١ـ (صت. مبهم) کەسێك یا شتێکی کە لە هاوچەشنی خۆی جیاواز بێ ، هێچ نەبێ ، ئەو کەسە یا ئەو چتە نەبێ کە باسی کرابێ یـا بە هەر جۆرێـك بێ شـتێکی لـێ زاندرابێ . :: کاغەزێکی ترێشم بـۆ نوسێ ، پیـاوێکی ترێشـی لێبـۆ نەمناسێ ، هێچی تر نەلەی هـەر ئەوەندە بەسە . ★ ئێدێ ، ئێکـە ، ئێدیکە . ٢ـ ( تب. ) أ ) ـ (مبتدا) و (خەبەر)ی ڕستەیەك تێکدەکاتەوە و پێشـان دەدا ( خەبـەر )ەکـە ( مەعلوول )ی ئەو ( عیللەت )ەیەکە لە ( مبتـدا )کەدا بـاس‌کراوە و ئـەو مانایانە دەبەخشێ : بۆیە ، پاشان ، ئەو جار ، لەمە زیاتر ، بەم حاڵە . □ « ... مێردە بێ ئارامێ گەیشتە ئەوپەڕی ئێتـر خـۆی پێ ڕاگێـر نەکرا ...» ( بله : ژان ـ ١٢ ) ، « ... هەر ئەوەندە بۆ باڵێ نەدەگرت گوتی ئێتـر دەحەسـێمەوە ... » ( قزلجێ : پێکەنێن ـ ٨٤ ) ٢ـ لـە وەڵامـی پرسـیارێکا دەگـوترێ و دەگەیێنـێ کە ئەو کەسـەی وەڵام دەداتەوە نـایەوێ وەڵامـەکەی ( تەعلیل‌کراو )بێ و تۆزیکیش تۆڕەیێ پێشان‌دەدا :: ئەدێ کەوابۆ بۆچـێ نەچۆیـەوە سـەرێکی لێ‌بـدەی ؟ ـ ئێتر ! .

**ئێجـاب‌کردن ـ** [عـا. کو.] ، ( مصت. مت.) ، (کمر.) پێداوێستی کارێك یا شـتێ بە ( هـۆ )یەك یـا شتێکی تر . :: هێچ ئێجابی نەدەکرد ئەو قسـەیە بکەی . ئێجـاب بـە هاتنیان ناکا. ئێجاب بەوە ناکا خۆتان ئەزیەت‌مەدەن .

**ئێجادکردن ـ** [ عـا. کو. ] ، ( مصتـ. متـ. ) ١ـ داهێنـان ، دروست‌کردن ، هێنانە وجود .

□ « نـایبی رەئێـس مەجـلیسی ئەعیان »

« ئێجـاد کوننـدەی تـارێخی کوردان »

( سەلام ـ ١٩٥ )

:: لەوەتــی خــودا ئەم دنیــایەی ئێجــاد کردوە شــتی وا نە بوە و نە دەشبێ . ٢ــ (مجـ.) پەیداکردن ، وەدەستهێنان. :: لە بن ئەرزیشبێ بۆت ئێجاد دەکا هەر تۆ و فەرێــکە کەشك .

**ئێدیَ ــ** [ ١ــ ئیَ/٢ + دیَ ] ، ( تبـ.) ، (مکـ.) ١ــ تم : ئێتر /١ :: نامەیەکی دیتشم بۆ نوسیَ . ٢ ــ تم : ئێتر ٢ و ٣ :: « . . . بەلاَ ئەگەر خویَ بیَتــام بیَ بە چــیَ خویَ دەکریَ . ئێدی هێچ چتێك فایدەی نیە . . .» (ئینجیل : مەتی ــ ٩) . تێبـ ــ بەشی دوەمی ئەم وشــەیە (دیَ) دەگــەڵ (دیت)ی پەهلــەویَ هەر بە مانــای (ئێتر) و (ئێدیَ) یەکن . ( تم : فرە ، پفا ــ ١٢٢ ) .

**ئێدیکە ــ** [ئێدیَ + کە (ئمـ.) ]، ( صتـ. مبهم ) تم : ئێتر . □ « . . . بەدەستێکی خەنجەری دەبانە ، بــە ئێدیکەی کێردوَکە . » ( تحفە : ج ٢ ــ ١٨٥ ) :: کاغەزێکی دیکەشم بۆ نوسیَ .

**١ــ ئێراد ــ** [عــا.] ، (نــا.) ، (مکـ.) عەیبــە ، ڕەخنــە . :: زۆر ئێرادە پیاوی گەورە قسەی ناشێرن بکا . بەئێرادی مەزانە . ئەوەشیــان لێکرد بە ئێراد . تێبـ ــ ئەم وشــەیە ئەگەرچیَ عەڕەبییە ، بــەلاَم ئــەو مەعنایانەی لە کوردیدا وەرییگرتوە فڕی بەسەر مەعنا عەڕەبییەکەیەوە نیە . هس : ٢ــ ئێراد .

**٢ــ ئێراد ــ** [ عا.] ، ( نــا.) ، ( کعر.) ١ــ داهات ، حاصڵ ، گشت ئەو پارەیەی لە کاروکاسبیَ ، یــان کشتوکاڵ دەست کەتیَ دەکەویَ . □ « یەك دوَ دێی داوەتی سوڵتان پەیی ئیتعامی تەعام »
« هەر یەکێکی بەقەدەر خەزنەیێ ئێرادی هەیە »
( رەزا ــ ٣٨ )
٢ــ هەموَ ئەو پارە و پوَلانەی کە لــە ڕێــگای جۆربەجــۆرەوە دەڕژێنــە خەزێنەی دەوڵەتێك .

**ئێرادگرتــن ــ** [ ١ــ ئێــراد + گرتن ] ، [ عا. کو. ] ، ( مصتـ. لا.)، عەیبوعار دەرخستن ، ڕەخنەگرتن، ئیعتیڕازکردن . :: ئەوە چیــە هەر لە خۆڕا ئێرادان‌دەگرن .

**ئێرادلێگرتن ــ** [ ١ــ ئێراد + لیَ ( لە + ی ) + گرتن ] ، [ عــا. کو.] ، ( مصتـ. متـ.) ١ــ عەیب لــە کارێك دەرخستن ، لە کاروکردەوە و قسەی کەسێك ڕەخنەگرتن . ٢ ــ بەڕاستنەزانینی کار یا قسەیەك . :: ئێرادی لیَمەگرە هەر ئەوەنــدەی ئاقڵ پێدەشکیَ ، دەتــوانیَ صــەت ئێــرادی لێبــگریَ ، سەعــــاتێکە قسەدەکا شتێکی وای نەگوت ئێرادی لێبگیریَ .

**ئێبــروَ ــ** ( نــا.) ، ( مکـ. ) ، پیتوبــەرەکەت ، خێروخۆشــیَ ، حاڵخۆشی تێروتەسەلیَ . تێبـ ــ أ) لە زمانی پەهلەویــدا : هێرێــە . ( هێر + ئێە ( پبـ : بەیانی حالەت ) بە مانای دەوڵەت و دارایەت هاتوە. تم : ( فرە : پفا ــ ٢١٦ ) ب) لە بن لەهجەی هەولێریدا ( هێر ) مانــای بەخــت لەیــارێدا بەتــایبەتیَ لــە ( جگێن )دا دەبەخشیَ .

**ئێزرەم ـ** [ تو : ئێز = یوز = ١٠٠ + كو : رەم = درەم ] ، ( نتە ) ، ( كعر . ) سەنگێكە بۆ كێشانەی شت ، چواریەكی حۆقەیەكە ، بەحۆقەی سلەیمانی ئێزێكەی ٩٠٠ گرام دەبێ .

**ئێست ـ** ( نا . ) ، ( مك . ) وێستانێكی كەم ، راوەستانێكی پچوك . و'زهێنان لەكارێ بۆ ماوەیێكی كەم :: ئیستێك بگرە تا دەگەڕێمەوە ، ئیستێكی پێ نەچو دەورەیان‌دان و هەمویان چەك كردن . (عا.) لەحزە ( لحظة ) .

**ئێستوەت ـ** [ ؟ ] ، ( نا . ) ، ( مك.) تە : ١ـ ئالەت/١ و ٢ . هس : ( بك.) ئیسوت ( بێبار ) . تێب ـ زۆر لەوە دەچێ ئەم وشەیە ئەسلی توركی بێ و لە وشەی ( ئیستی ) ئازربایەجانی بەمانای گەرم و تیژ و ( ئوت = گیا ) پێكهاتبی كە بەسەریەكەوە دەكاتە ( ئیستی‌ئوت )یانی ( گیبای‌تام‌تیژ ) ، ئازربایەجانی خۆشیان وشەی (ئیستوت) بەمانای ئالەت بەكاردێنن .

**١ـ ئێش ـ** ( نا . ) ، (كعر . ، سنـ.) ١ـ كۆششتێكی سەرفدەكرێ ( بەهێزی مێشك ، دەست‌وبازوی ئینسان یا هەر سەرچاوەیێكی دیكەی هێز ) بۆ بەرهەمهێنان ، دروستكردن ، سازكردن ، ڕێكخستن و ... ی ماددەیەك ، شتێك یا مەسەلەیەك و ... ٢ ـ هەر كۆششتێكی ئینسان بۆ وەدەست‌هێنانی بژێوی خێزانی خۆی‌دەیكا . :: ئەم كابرایە لەوەتی هەیە ئێشی دارتاشییە ، خدر گوێ‌ناداتێ هەر ئێشێكی دەست‌كەوێ دەیكا .

□ « هەمو بێ‌ئێشن و بێ‌كار و تەوەززەل »
« ورگ پان و مل ئەستور و سەلك زل »
( مەلا : گم ـ ١٣ )

٣ـهەر مەسەلەیەكی جێ‌بەجێ‌كردنی پێبوێ . □ « ... كاوە بە ئیشێك چوە دەری ژورەكە ... » ( بلە : ژان ـ ١١١ ) .

□ « بەڕێشی گرژ و پرچی پڕ لە ئەسپێ »
« بناغەی ئێشی كوردان چۆن ئەچەسپێ »
( مەلا : گم ـ ١٣ )

٤ـ كردەوە . « بەئێشی تۆش ناشێ بەلام چارنیە ، « بە قوربانی ئێشی خوابم كەسێ تێ‌ناگا » . ★ كار ، ( بك.) خەبات ، (با) شول .

**ئێش بە دەست ـ** ( نتە . ، صتە . ) ١ ـ ئەو كەسەی بەكارێكەوە خەریك‌بێ . ٢ـ كەسێكی كاری لە دەست بێ ، بتوانی لە دەزگایەكی دەولەتێدا كاران ڕاپەڕێنی .

**ئێش لە دەست‌هاتن ـ** ١ـ تین و توانی كاركردن لە كەسێكدا هەبون . هەمو ئێشێكی لە دەست دێ و قەت دانامێنێ . ٢ـ ( مجـ.) دەستەلاتدار بون . :: زۆر ئێشی لە دەست دێ ئەم ئێشە هەر بە وی دەكرێ . تێب ـ توركێش ئەم وشەیە بەكاردێنن و بۆیە هەندێ كەس واتێدەگەن كە لە توركی وەرگیراوە ، بەلام ئەمە

ڕاستنیه و دەگەڵ (ئێش) لـەیەك ڕێشەن .

**٢ــ ئێش ــ** [ ؟ ] ، (نا.،) (مک.) زللەیە ، کە لە پشت مل دەدرێ ★ ( کعر.) تەوقـات . ( کیـ ) دۆق . تێبـ ــ ئەم ئێشە نیشانەی بەسوك زانێنی ئەو کەسەیە کە لە پشت ملی دەدرێ ، جاروبارەش بۆ گاڵتـە و گـەپدەکرێ و بەســتراوە بـە کەسەکانەوە .

**٣ــ ئێش ــ** ( ئم.) بـەدوای وشەیێـکەوە دەلکێ و ئەو مانـایانە دەخـاتە نـاو رستەکەوە : ١ــ هەروەها :: ئێوە بڕۆن منێش‌دێم . ٢ــ وەك یەکـێ لەلانـی حـاڵ و میقدارەوە لە نێوان دۆ شـتـا یا دۆ کەسـاندا . :: کوڕەکەی خاڵندێش لەوێ بۆ . ٣ــ تەنانەت . :: «... ئێسـتاکە لـە قەندیـلێش بـەفر نەکەوتـوە . قامۆستێـش تەمـاڵ ناگرێ ...» ( قزلجێ : پێکەنێن ــ ٥٤ ) . ٤ ــ ئەگەرچـێ ، هـەر چەندەکە :: نانەکە ڕەشێـش بـۆ بەلام برسێ بوین هەرخواردمان . سێ گوللەشێ بەرکەوت بەلام هێچی لێ‌نەهات . ٥ــ با . دەبا . بـلا . □ « بش‌فڕێ هـەر بزنـە » . :: چاوێشی دەرێ بەلام ئەم قسەیە وا نیە . ★ (هو.) ئێـچ . (بکـ.)ژێ . تێبـ ــ ١ ) ئەم وشـەیە دەگەڵ فیعلدا بەشێوەی خوارەوە بەکاردەهێنرێ : أ ) لە فیعلی ( ماضی )دا دەخرێتـە نێوان رەگی فیعل و زەمێرەکەیـەوە. کوشتێشم ، خواردۆشمە . ب ) لە ( ماضی‌نەقلێ ) و (مضارع)دا بەدوای نیشانەی ( مضارع )ەوە دێت . :: دەشێ کوشـتم . دەشـێ‌کۆژم و هێچێش‌نابێ . ج) لەو فیعلانەدا کە مەصدەرەکەیـان ( مـرکّب )ە یـا پێشبەندی فیعلیان هەیە دەخرێتـە دوای کەرتی یەکەمی مەصدەرەکەوە. :: لێشمدا، هەڵێشی گرت، بەرێشی دایەوە کەچێ نەشکا . لێشێ دەدەم، هەڵێشـی دەگـرێ . بەرێشـی دەداتەوە. د) لە د ۆسێفەی (ئەمر ( و ( شـەرتێ )دا دەکەوێتـە دوای نیشانەی ( ئەمر )ەوە . :: ئالێك بکە بەر ئەسـپەکە و بشی‌بەسـتەوە . ئەگەر بشمکۆژن . بشی بردبا کەس نەبۆ دەستێ بگرێ . ٢) لە کاتێـکا بەدوا ی وشەیێکدا بێت کە بەیـەکی لە دەنگ‌بزوێنـەکان دوایی هـاتبێ تەنیا ( ش )ەکەی دەمێنێتەوە . :: میرزاش قسەی‌کرد. حەمەش هات. ئالو بالۆش مێوەیێکی کوردستانە . نان و دۆشـمان چنـگ‌نەکەوت . گەنمەشامێـش دەکـرێ بەنـان . پێرێش چـۆم هـەر لەوێ‌نەبـۆ . جاروبـارە بەم حالەشـەوە تەنیـا دەنگی (هەمـزە)کە دەسـوی . :: مێرزایش ، ئالوبالۆیش ، دۆیش . ٢ــ ئەم وشـەیە ، بە قسەی ژابا لە زمانی ئاوێستایێدا (زی)یە کە هەر (ژی) ئێستای لەهجـەی بـاکۆرێ خۆمانە ( تم : ژابا ــ ٢٣١ ) و لـە زمـانی پەهلەوێـدا وەك ئێسـتـای هەورامێ ( ئێچ ) بوە کە لە ( ئێ = ئامرازی تێك‌بەستن ) و دەنگی (چ) پێکهاتوە . ( تم : فرە ، پفا ــ ٨٧ ).

**ئێش‌کردن ــ** ( مصد. لا. ) ١ــ

کارکردن ، بەکارێکەوە خەریك‌بوٚن ، بێ‌کارنەبوٚن . ٢ـ بەجێ‌گەیاندنی ئەو پێویستەی بوٚ ئەندامێکی لەش یا مەکینە یا دەزگایەکی کوٚمەلایەتی ڕەچاوکراوە . :: مێشکی ئێش ناکا ( ناتوانێ‌بیربکاتەوە ) . سەعاتەکەی شێرکوٚ باش ئێش‌دەکا. بزانە ئوتوٚمبێلەکە ئێش دەکایان نا ؟ تەلەویزیوٚن بەڕوٚژئێش ناکات . دابیرەکانی دەولەتی ڕوٚژی هەینوٚ ئێش ناکەن .

**ئێش‌تێداکردن** ــ ( مصت. مت. ) ١ ــ خەریك‌بوٚن بەسازکردن و دروست‌کردنی شتێك. :: ئەوە شەش مانگە ئێشی تێدادەکەن هێشتا دوٚ چاوە خانوٚیان پێ تەواونەکراوە. چاکەتە تەواوبوە و پانتوٚلەکەش ئێشی تێدا دەکەن . ٢ـ خەریك‌بوٚن بە چاك‌کردنەوەی شتێکی لە کارکەوتوٚ . :: دیواری حەوشەکەیان ڕوٚخاوە ئێشی تێدادەکەن . ئەوە خوٚ هێشتا ئوتومبێلەکە هەر لەوێ کەوتوە هێچ ئێشتان تێدا نەکردوە .

**ئێشکەر** ــ ١ـ ( نفا.) ئەو کەسەی بوٚ پەیداکردنی بژێوی خوٚی و خێزانی توانست و هێزی کارکردنی خوٚی دەخاتە گەڕ . ٢ ــ ( صفا. ) کەسێکی چاك هەلدەسوٚڕێ و کاران ڕادەپەڕێنێ . **ئەوەی حەزی لە ئێش‌کردنە** . :: ئێشکەری وەك خوٚی هەر نابێتەوە . ئێشکەرمان زوٚرە بوٚیە حالمان وا خوٚشە .

**ئێکە** ــ ( تب. ) ، ( سیم. ) تە : ئێتر/٢ .

☐ « کورد ئەوەند کوردن بە صەد شەیتان لە کوردێ ناکەون »
« ئێکە خەلقێ بوٚچی بوٚ خوٚی دەردی سەرپەیدا ئەکا »
( کوردێ )

**( ــ ئێلکە )** ــ ( پب. ) بە دوای ووشەوە دەنوٚسێ و گیانی پچکوٚلەیێ بەبەردا دەکا . :: چاوێلکە . بەرگایێلکە . تراوێلکە .

**( ئێلە )** ــ (پب. ) بەدوای وشەوە دەلکێ و پچکوٚلەی دەکاتەوە . ☐ « خالێلەی ڕێبوار ڕێم لێ‌گوٚڕاوە ، دەچمە ئەو مالەی یارم توٚراوە » ( فوٚلکلوٚڕ ) :: بابێلە . مامێلە . نەرمێلە .

**ئێمان** ــ [= عا : ایمان ] ،(نا.) باوەڕ ، بڕوا ( دینێ و کوٚمەلایەتێ ) ☐« ... زولمەت دنیای داگرتوە خوا رەحم بە ئێمانەکەمان بکا . ( قزلجێ : پێکەنێن ــ ٦٦ ).
«فەرموٚی نیشانەی تێکچوٚنی جیهان»
«بێ‌باوەڕیە و زەعیفی ئێمان»
( پیرەمێرد ــ ٢٥٦ )
:: خوا ئیمانت داتێ ، ئێمانت سلامەت بێ ، ئێمانت لێ نەستێنێ، ئێمانم بە خەباتی میللەتی کورد بەقەوەتە ..

**ئێماندار** ــ [عا. کو.] ، ( صفا.) ١ـ کەسێکی باوەڕێ بەدینی ئیسلام هەبێ . :: خوا عافوێ‌کا ئیشاللا لە ڕیزی ئیماندارانە و دەچێتە بەحەشتێ. ٢ـ کەسێکی باوەڕی ( بەهەرچێکی‌بێ ) بەهێزبێ .

**ئێمان‌هێنان** ــ [عا. کو.] ، ( مصت. لا.) ١ـ پەیداکردنی

باوەڕی بە ڕێوشوێنی دێنــێ یــا بیروباوەڕێکی سیاسیێ و کۆمەڵایەتیێ ( بەگشتیێ ) . ٢ــ موسوڵمان بوونی یەکێــکی غــەیرە موسوڵمــان ( بەتایبەتیێ ) .

**( ــ ئێــن ) ــ** ( پ. ) بــەدوای صفــەت و نــاوانەوە دەلــکێ و صفەتێکی تازەیان لیێدروستدەکا . :: ڕەنگین ، زێڕیــن ، دێریــن ، نەخشین ★ ئن . تیب ــ هەرچەندە پاشــبەندی ( ئــن ) و ( ئێــن ) هەردوکیان پاشبەندی صفەتسازن ، جیاوازی لە نیوانیاندا هەیە، هەرچیێ ( ئێن )ە صفەتی چاکەی پیێسازدەبیێ لە حالێکا ئەو صفەتــانەی ( ئــن ) دروستیاندەکا صفەتی خراپەن . بن لەهجــەی سلەیمــانیێ بــە وردی چــاوەدێری ئــەم جیــاوازیەی تێدادەکریێ ، بــەلام ( موکریــانیێ ) تیکەلیاندەکا ، بۆ نمــونە لە بــاتی ( زێڕین ) و ( شیرین ) دەگــوتریێ ( شیرن ) و ( زێڕن ) .

**١ــ (ــ ئێنە ) ــ**( ئم . ) ئامرازی بانگکردن و ڕویقســە تێــکردنە ( خطاب و نداء ) بۆ جەمــع ، بــە دوایێ صفەت و ناوەوە دەنوسیێ ، گەلیێ جار ئامرازێکی تریش ( ئەی ، هۆ، هەی) دەخرێتە پێش ووشەیێکی کە بەم ئامرازە دروست دەبیێ . :: هۆ خەڵکینە ، هەی جوامێرینە .

☐ « ئــەی کوردینـــە ، ئــەی مەردینە . . . » .

☐ « خزمینە مەدەن پەنجە لەگەل عەشرەتی جافا »
« مێرولە نەچیێ چــاکە بە گژ قوللەیی قافا »
( ڕەزا ــ ٣ )

**٢ــ ( ــ ئێنە ) ــ** ( پ. ) بەئاخری ووشــەیێکەوە دەلکیێ و دەیــکا بە صفەت بۆ ووشەیێکی تر ، کە بــە هەرتکیان (صفت و موصوف) ناوێکی تازە پیێکدێنن . :: ئەسپەدارینە ، شیرە بەفرینە ، کالەمۆینە (مۆیینە)، کتکــە نەوتینــە ، کولکەزێرینــە ، مێرگەنەخشینە . تیب ــ هەم ئــەم پاشبەندە و هەم (١ــ ئێنە )ش کاتێ بە ووشەیێکەوە دەلکێن کە بە یەکیێ لە دەنگبزوێنــەکان دوایێ هــاتبیێ ئەوادەنگی ( هەمزە ) بــاتی ئەوەی بسویێ و لەناوبچیێ دەبێتە دەنــگی (ی) :: برایینــــە ، مۆیینــــە ، دۆیینە و ئەوجار دەنگبزوێنی (ێ) لەبەر قورسیێ تەلەفوز فڕیێ دەدریێ :: براینە ، مۆینە ، دۆینە .

★ ★ ★

**هێندێ سەرچاوەی دیکە کە بۆ ئەم‌بەشە کەلکیان لێ‌وەرگیراوە**

١/٨١ ـ **ئاسك** : (شانۆگەریەکی شیعرییە لە پێنج تابلۆدا) ، شێرکۆ بێکەس، لە (چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد) بەغدا ، ١٩٧٨ [ئاسك] .

٢/٨٢ ـ **ئاگر و گوڵ** : خالید دلێر ، بەغدا ، ١٩٧٠. [ ئاگر ] .

٣/٨٣ ـ **دیوانی مەحوی** : (مەلا موحەممەدی کوڕی مەلاعوثمانی بالخی) لێکدانەوە و لێکۆلێنەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و محمدی مەلا کەریم ، لە (چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد) بەغدا ، ١٩٧٧ [ مەحوی ] .

٤/٨٤ ـ **دیوانی وەفایی** : (میرزا عەبدوڕڕەحیمی سابلاخی) ، لێکۆلێنەوەی محەممەد عەلی قەرەداغی ، لە (چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد) ، بەغدا ، ١٩٧٨ [ وەفایی ] .

٥/٨٥ ـ **فرهنگ لری** : (فەرهەنگی زمانی لوڕی) ، گردآوردەء حمید ایزد پناه (انجمن فرهنگ ایران باستان) ، تهران ، ١٣٤٣ [ لوڕی ] .

**هێندێکی دیکە لە کورتە نیشانەکانی ناوی : سەرچاوە ، دانەر و بڵاوکەرەوە کە لەم بەرگەی « قاموس » زیادکراون .**

| | | |
|---|---|---|
| **نیشانە** | ناوی سەرچاوە ... و ژمارەی لە لیستەی سەرچاوەکاندا | |
| **ئاسك** | شانۆگەریەکی شیعرییە لە پێنج‌تابلۆدا | ٨١/١ |
| **ئاگر** | کۆمەڵە شیعری مامۆستا خالید دلێر | ٨٢/٢ |
| **بیکس** | مامۆستا شێرکۆ بێکەس ( شاعیرو ئەدیب ) | ـ |
| **دلێر** | مامۆستا خالید دلێر ( شاعیرو ئەدیب ) | ـ |
| **قزلجی** | مامۆستا حەسەنی قزلجی ( نوسەر و ئەدیب ) | ـ |
| **لو** | لوڕی (یەکێك لە بن لەهجەکانی لەهجەی جنوبی زمانی کوردی) | |
| **لوڕی** | فرهنگ لری ـ فارسی | ٨٥/٥ |
| **مەحوی** | دیوانی مەحوی | ٨٣/٣ |
| **نێو** | لەهجەی ناوەندی زمانی کوردی | ـ |

# ب

**١ ـ ب ـ** یەکێکە لە دەنگەکانی زمانی کوردیٚ ، لەو ئەلفوبێتکەیەدا کە ئێستا کوردیٚ پیٚ دەنوسریٚ بە چوار شێوە خوٚ دەنوێنیٚ : ١ ) لە سەرەتای ووشەدا ( بـ ) ، ٢) لە نێوەڕاستا ( ـبـ ) ، ٣ ) لە دوایی ووشەدا ( ـب ) ، ٤ ) بە سەربەخوٚیی (ب) ، ناوی پیتی نیشانەی ئەم دەنگە ( بیٚ )یە .

**٢ ـ ب** ـ (پێبف .)١ـ دەچێتە سەر ڕەگی فیعل و فیعلی ئەمری لیٚ دروست دەکا :: بخوٚ ، بچوٚ ، بلیٚ ، بنوٚسە ، بڕوٚین ، بنوٚین . □ « ئەوە جلان دەشوٚی دە بشوٚ بشوٚ ! » . تێب ـ لە جیرانەتیٚ هەندیٚ دەنگاندا ، دەنگی (پ)ی لێوە دێت . پخوٚ ، پشوٚ . ٢ ـ دەچێتە سەر ڕیشەی هەندیٚ مەصدەران و (ناو)یا (صفەتی فاعیلی)یان لیٚ پێکدێنیٚ :: بگێڕ ، لە ( گێڕان ) ، بگر ، لە ( گرتن ) ، بخوٚر ، لە ( خواردن ) ، زوٚربلە ، ڕەشبگیر ،(بلوێر) (بلوٚر)، بکوژ . تێب ـ ئەو صفەتانەی بەم ( پێبف . )٥ دروست دەبن ڕەنگی ( مبالفە )یان پێوەیە .

**١ ـ با** ـ ( بن . ) وەلامێکی ئێتجابییە بوٚ پرسیارێکی بەشێوەی ( سەلبیٚ ) بکریٚ :: ئەریٚ نەچوٚیە مالی خالت ؟ ـ با . **بابا** تەئکیدێکی زیاتری تێدایە هەر بەو شێوەی سەرەوە :: هەر نەچوٚیە لای دوکتوٚر ؟ ـ با با چوٚم . ٢) وەلامێکە قسەیەکی پیٚ ( نفی ) دەکریٚ کە ( نفی ) کارێکی کردبیٚ :: توٚ بیٚ و ئەو کتێبەم بوٚ ناهێنیتەوە ! ـ با با بوٚت دێنمەوە مەترسە ! .

**٢ ـ با** ـ ( ئم . ) ئامرازی سوٚربوٚنە لەسەر شتیٚ ، کاریٚ ، ... ... و ئەم مانایانە دەبەخشیٚ : بهێلە، لیٚبگەڕیٚ ، بهێلن ، لیٚبگەڕێن، :: با بڕوٚین ، با بچن ، با سبەینیٚ بێتە لام ئیشەکەی بوٚ جێبەجیٚ دەکەم،جا با واشی گوتبیٚ قەیدیٚ ناکا . ٢ ـ ئامرازی شەرتە :: با بابیٚبێنم خوٚم دەزانم چیٚ پێدەلێم ( ئەگەر دێتم .. هتد ) . **دەبا** ـ ( ئمت . ) بوٚ تەئکیدە لە هەردوٚ حالەتەکەی سەرەوە دا :: دەبا بڕوٚین ، دە با بیٚبێنم ★ ( مک . ) بلا/٢ .

**٣ ـ با** ـ [ ست : ڤاتە ، پە : ڤات ] ، ( نا . ) ١ ـ ئەنجامی بزوٚتنەوە و جولانی هەوایە ، کە لە ناوچەیەکی ئەوشار( ضغط ) بەرزەوە بوٚ لایەکی ئەوشار نزم ڕەوانە دەبیٚ ★ ( بک . ) با ، بیٚ . (فیـ.) باگ ( لو . ) بای . **بایوادە** ـ ( نت . )

تم : بای وەعدە . **بای وەشت** ـ ( نت . ) بایەکی سوکە کە بارانی بە دوادا دێت . **بای وەعدە** ـ [ کو . عا . ] ، ( نت . ) بایەکە هەژدە رۆژی بمێنێ بۆ نەورۆز هەڵدەکا و بەفر دەتوێنێتەوە □ « بای وەعدە بەفری بردەوە یەخبەندی کردەوە + خەملیوە گوڵ ، وە شەڕاڕاتی جەمرە مردەوە » ، ( حاجی : گم ، ل ـ ٣٣ ) ● **بە بایە و بە بارانێ لە عومرێ بەفرێ کەم دەبێتەوە** ـ ( کن . ) بە هەر بارێکدا بێ هەر زیان دەبێنێ ، کارێکی لە هەمو سەرێکەوە زەرەربێ .

**نە بای دیوە و نە باران** ـ (کن .) وەك هێچی لێ ڕونەدابێ و هێچی بەسەر نەهاتبێ تەمبێ‌گرتو نەبوە. **هەتا با لەم کونەوە بێ** ـ ( کن . ) تا حال بەو جۆرە بێ کە هەیە ، تا وەزع ئاوابێ . **بای باڵدان** ـ ( مصت. لا. )پیاسە و ڕۆیشتنی لەسەرخۆ و بە نیازی ئیسڕاحەت و هەوا خوری . ٢ ـ بەرهەمی جولاندنی هەوا بە ئامرازێکی دەسکرد :: بای پانکەش هەر گەرمە. ٣ـ گاز (غاز)ێکی لە زگی ئادەمیزاد و هەندێ گیانداری ترا ، لە دەروونی ( دەزگای عەزم )دا کودەبێتەوە تێب ـ ئەم ( غاز )انە ئەگەر لە ( مەعدە )دا بن بە ڕێگای گەرودا ( قرپ و قرقێنە )و ئەگەر چوبنە ناو ( ڕیخوڵە ) کانیش ، ئەوا بە ڕێگای خوارەوەدا ( تڕ ، تس ) دەر دەچن :: منداڵەکە بایەکی لێ بووە دایکی چەپۆکێکی پێدا دا . ٤ ـ یەکێکە لەو چوار ( عنصر )ەی کە زانایانی پێشو وایان دانابو هەمو شتێکی ئەم دنیایە دەچێتەوە سەر ئەوان ( خاك ، ئاو ، ئاگر ، با ) . ٥ ـ لوت‌بەرزێ ، غروڕ ● **بای ڕەگوییان نێشتوە** ـ ( کن . ) خۆی لێ‌گوڕاوە ، مەغرور بوە . **خۆ بادان** ( مصت. لا. ) ، أ) فێز و ئیفادە لە خۆ دیاری‌کردن ، دەعیە و تەکەبور فرۆشتن ، . ب) ڕاسان و توڕەبون بۆ پەلاماردانی کەسێ . ٦ ـ ئێش و ئازارێکی لە لەشی ئینساندا جێ‌گۆڕکێ دەکا و هەر جارە لە شوێنێکی سەر هەڵدەدا ( تم : باداری). **بای مەمبارەك** ـ (نت.)، (مک.) تم : بای سور :: موری محەممەدی خات بە سێ بای مەمبارەکێتی . **بای سور** ـ (نت.) ، (مک.) نەخۆشێکە توشی پێستی لەشی ئادەمیزاد دێت و دەی‌پەنمێنێ و ڕەنگی سورێکی مەیلە و مور هەڵدەگێڕێ ، ئاوساویەکەی تا توێژی بنەوەی پێست دادەخزێ ، زیاتر لە دەم و چاو دەدا و یەك لەیەکی دەگرێتەوە، مێکرۆبی ئەم نەخۆشیە (سترێپتوکوك Streptocoque )ە و بە زاراوەی بزیشکی نەخۆشییەکە ( ئێریسیپێل Erysipele )ی ناوە . ★ بای مەمبارەك . ( سن .) بنەوشێ. (جنو.) بای سور . تێب ـ لە کوردەوارێدا بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە ( چاك )ی تایبەتی لە گەلێ شوێنی کوردستان هەن ، نەخۆش لە ڕۆژێکی چوارشەممودا

دەچێتە سەر (چاك)ی و گیسك یا
کەڵەبابێ لە ناو ( قسن )ەکەیدا
دەکۆژێتەوە و هەندێ لە گڵی
سەر (چاك)ەکە تێکەڵ بە خوێنەکەی
دەکا و دەو جێگایانەی لەشی دەدا
کە بای سۆری گرتوە . ٧ــ ( مجـ. )
، أ ) هیچ . ب ) بێ‌فایدە .
□«ئەگەرچی قەنەنەکەی تۆ کارەبایە»
« بەڵام تەرکی بکە ، ئەم کارە بایە »
( نالی : گـ ــ چـ )
:: با هەر قسە بکا وەبزانە بای دێ.

**٤ ــ با** ــ ( نا . ) پێچ ، خول ،
باد □ « بای دەدا و بای دەدا » ::
بەنەکەی باداوە .

**٥ ــ با** ــ ( نا . ) قیمەتی شتێك ،
نرخ :: ئەم‌کتێبە بایی چەندە ، ئێمڕۆ
بایی نێو دینار هەر ماستیان کڕیوە
★ ( بك . ) بەها .

**٦ ــ با** ــ ( نا . ) ئارەزۆ و
هەوەسێکە لە ( دێل ) ی هەندێ
گیانداری چەشنی ( سەگ ) دا پەیدا
دەبێ و هەوای جۆت‌بۆن دەگەڵ
( گۆڵ ) دەکەوێتە سەری :: باغەباغە
وەبا هاتوە . تێب ، لە زمانی فارسێ و
عەرەبێدا ( باە ) بە مانای ( هێزی
جنسێ ) بۆ ئینسان بەکاردێت ،
بەڵام ئەم وشەیە لە زمانی کوردیدا
بۆ هەندێ گیانداری وەکۆ سەگ و بە
تایبەتێش بۆ سەگ بەکاردێت
★ ( سن . ) هۆك . هس : ( لو . )
هۆك = وازوازی .

**١ــ باب**(نا.)، (مك.) ١ــ نێرینەی
ئادەمیزاد کە ژنی هێنابێ و مندالی
بۆبێ ، دەبێتە بابی مندالەکان . ٢ ــ
( مجـ . ) هەر ئەو حالەتەی ژمارە
(١) بۆ هەندێ گیانداری کەوێ وەکۆ
ئەسپ و . . . □ « لە ئێستریان
پرسێ بابت کێیە ؟ کوتی، خالم
ئەسپە » ، ( فۆلکلۆر ) . تێب ــ
ئاوێستایێ هاو مانای ئەم ووشەیە
زۆر گۆڕانی بەسەر هاتوە : پەتەر
پیتەر ، پتەر ، پیتهەر ، فیذر ( تم :
یكد ، پد . جـ ٢ ، ل ــ ١١) و تەنیا
لە لەهجەی جنۆبێ زمانی کوردیدا لە
قالبی ( پیەر ) و لەبن لەهجەی
سلەیمانێشدا لە ووشەی
( باوەپیارە ) دا دەبێندرێ ، کەچێ
زمانی فارسێ ( پدر ) و فڕەنسێ
( پێڕ ) و ئینگلیسێ ( فاذر )یان
پاراستوە.بەڵام ئەم ووشەیە (١ــباب)
لە ( پاپ )ی پەهلەوێ کەوتۆتەوە
( تم : ژابا ــ ٣٣ ) . هس : پاپەك،
پاپەکان ، بابەك ، بابەکان ( بك . )
باڤ . ( کمر . ) باوك ، باو .
( جنو . ) پیەر ، بۆوە .

**٢ ــ باب** ــ ( ص . ) ، (کئیز.)
١ ــ شایان ، لایق ( بۆ شتێك ).
٢ ــ ڕێ‌وشوێن . ٣ ــ دەستە ،
جەماعەت :: نۆکەرباب

**بابی ددان** ــ (سن.) هەر خواردنێکی
بە دڵی ئینسان بێ ، هەر شتێکی
دەگەڵ سەلیقەی کەسێ ڕێك بکەوێ
★ باو ، مۆد .

**٣ ــ باب** ــ [ عا . ] ، ( نا . )
١ ــ دەرگا ، دەروازە . ٢ــ بەشێکی
کتێب .

**بابا** ــ ( نا . ) ، ( كك ) ١ ــ تم :
باپیر . ٢ ــ کەس ، شەخس ::
بابایەکی وەکۆ شێرۆ چێ بەسەر ئەو
جۆرە کارانە داوە . ئێمە بابایەکی

فەقیرترین دانومان دەگەڵ ئــەوان نــاکوڵێ . ٣ ــ تمــ : بــابە / ٤ .

**بابان** ــ [ ١ ــ باب ١ + ٢ ــ ئان /١ ] ، (نت.) ماڵە باوکی ئافرەتێك تێبـ ــ ١ ) ئەم ووشــەیە ئەگەرچی لە باری زمــانەوانییــەوە جەمــعی ( باب )ە ، بەڵام قــەت بەم مانایە دەکار ناکرێ و ناگوترێ : ( بابانــی ئەفراسیاو هەمۆی پیاوی چــاك بۆن ) و بۆ ئەم مەبەستە ( بــاب و باپیر ، بەکار دێت . ب ) ئەم ووشەیە بەم مانا مەجازیەشی کە بە تــەواوێ وەکۆ حەقێقی لێهاتوە ، تەنیا بــۆ ئــافرەت دەگوتــرێ . ★ باوان ● **بابــانت خــرا ( پ ) بــێ** (کن .) تۆك و نزایە و تەنیا لە نــاو ژناندا باوە ، گەلێ جار هەر وەکـۆ قسەیەکی ئاسایی دەگوترێ و لــە دڵان گران نایە ، بــەڵام لــە کاتــی دەمەقاڵێ و شەڕە دندۆکێدا بــە (جنێو) حیساب دەکرێ و شەڕەکــە بەتێن‌تر دەکات. ★ بابانت شێوێ ، بابانت کوێربێتەوە . **بابانت‌شێوێ ــ** (کن.) تم : بابانت خرابێ . **بابانــت کوێربێتەوە** ــ ( کن.) تم : بابانــت خرابێ .

**بابان وێران** ــ ( صمف.) کەسێکی ماڵە بابی وێران بۆبێ . تێبـ ــ ئــەم ووشەیە لە نــاو ئافرەتــاندا دەکار دەکرێ و شەرتێش نیە کە ئــەو ژنەی بــەم صفــەتە ڕۆی قســەی تێدەکرێ بە ڕاستی تۆشی بەڵایەکی وا بۆبێ .

**بابابردۆلە ــ** [بابابردۆ+ئەڵە/١]، ( صمف .) تم : باب‌ردەڵە . تێبـ ــ لەم ووشەیەدا ( ۆ )ی ووشەی (بابردۆ) دەگەڵ (ئە)ی (ئەڵە/١) ڕەرکێــب بوە و (ئۆ)ی لێ پەیدا بوە . تەنیــا خوالێخۆش‌بۆ مامۆستا گیــو ئــەم ووشەیەی لە (مەهاباد)ا نۆسیوە .

**بابردۆ** ــ [٣ ــ با/١ + بردۆ] ، ( صمف.) ، (مجـ.) هەر شتێــکی لەدەس دەرچۆبێ . ● **دوای کڵاوی بابردۆ** (کەوتن ...) ، (کن.) کاری بێ نەتیجەکردن ، هەوڵدانێکی نەگاتە ئەنجــام .

**بابردەڵە** ــ [ بابردۆ + ئەڵە/١]، ( صمف.) ، (مک.) ١ــ هەر شتێکی سۆکەڵەی با بتوانێ ڕایڕفێنێ . ٢ــ (مجـ.) ئینســانی بــێ تاقــەت و کزەڵۆکە . ☐ « منێش بابردەڵەی بەر گێژەڵۆکەم + دەمێك لەو قۆلکە، تاوێك لەو چلۆکەم » ، (هێمن) . تێبـ ــ لەم ووشەیەدا (ۆ)ی ئــاخری (بابردۆ) دەگەڵ (ئە)ی سەرەتــای ( ئەڵــە/١ ) تێــك هەڵەنگــۆتۆن و (ئە)یەکە (ۆ)یــەکەی داپۆشێــوە و لەناوی بردوە .

**بابڕ** ــ [٣ ــ با/١ + بڕ (بڕین) ]، ( صفا.) حاڵی سمێڵی زۆر گەورە و ئەستۆر .

**بابنە پێچ** ــ ( نتــ .) ، (مکـ.) گیایەکی بۆنخۆشی لاسك ســەوزی بارێکی گەڵا ووردی بەهاریبە ، گوڵی سپییە و لە ناوەڕاستیــا تــۆزێ زەردە و بۆنی خۆشە ، بۆ هەندێ داودەرمان بەکاردێــت ، زیــاتر گوڵەکەی ئیشك دەکرێ ، وەکۆ (چا) دەمی دەکەن و دەیخۆنەوە یارمــەتێ (هەزم) دەدا و ئەگەر خەست‌بێ ،

بۆ (ڕەوانیٚ) باشە . ★ بابونە .

**باب و باپیر** ــ (نت .) چەند پشتی ئینسانێك . ★ باووباپیر .

**بابۆ** ــ [ ٥ــ با/٦ + بۆ (بۆن)] ، ( صت .) ، (مکـ.) حالی گوڵە صەگێکی بەشوێن دێلــە بەبادا هەڵوەدابێت . // بەبا .

**بابۆلە** [٤ــبا + ب ؟ + ئۆلە/٢] (نت.) ١ــ (مک.) نانی لوولدراو کــە پێخۆرێکی زیاتر ( ماست ، پەنیر ، ڕۆنی کەرە ، ...) و ئەو جــۆرە شتانەی دە ناودا بێت . ساندویچی کوردیٚ . ٢ــ (سنـ.) مندالی ساوا کە دە پارچەیــەکەوە پێچرابــیٚ و بەسترابیٚ ★ (مـک.) قۆنداغــە ، مەلۆتکە . (لو .) قۆناغە . ● **کردنە**

**بابۆلە** ــ أ ) دانانی هیندیٚ پێخۆر لە ناو نان و پێچــانەوەی :: کوڕم ڕۆنەکە دە نانەکە هەڵسوٚ بێــکە بابۆلە و بیخۆ . ب (ــ کەسێك) ، (مجـ.) تێکەوەپێچان و زاڵبون بــە سەرێدا :: کوڕە لەسەر پــەت و سینگی خۆت دانیشــە، دەنا هەڵستم ددت‌کەمە بابۆلە . **بابۆلەی باسك** ــ (نت.) ، (کـ .) ئەستوراییٚ قۆلی ئینســان ★ (سیمـ.) بازۆلە .

**بابۆلە پێچ** ــ (نتـــ.) ، (سنـــ.) تێزمالکە پەڕۆیەکە مندالی ساوای پیٚ دەپێچنەوە .

**بابۆلە پێچ‌کردن** ــ (معتـ. متـ.) ، (سنـ.) پێچانەوەی منــدالی ســاوا بە شکلی مەلۆتکە .

**بابە** ــ [١ــ باب /١ + ٢ــ ئە /١]، ١ــ ووشــەی (باب)ە و لە حالەتــی بانگهێشتن دایە ، مندالانی باوکێكــ بۆ (خطاب) و (نداء) بەکاری دێنــن ★ باوکە ، باوە (بک.) بابۆ . ٢ ــ (مجـ.) گەورەش بۆ ڕۆی قســە دە کەســیٚ‌کردن بــەکاری دێنــیٚ :: بابەگیان ئەو قسانەی تۆ ئاسمان و ڕێسمانێش نێــن . ٣ــ (مـجـ.) جاروبارە خــۆی دەبێتــە ئــامرازی بانگهێشتن :: بابە ! خەڵکینە، بابە! عالەمێنە ، بابە ئەی خەڵکی گەڕەك ئەوە چەند ســاڵە خراپەیەکتان لەم کابرایە دیــوە ؟ ٤ ــ نازناوێـــکە دەکەوێتە پێش نــاوی شــێخ و دەروێش و چاك و پیــران :: بــابە قەتار ، بابە گوڕگوڕ ، تەکیەی بابە غەلیفەی لە گەڕەکی سیٚ ئاشان بوٚ ★ بابا/٣ ، باوە .

**بابەت** ــ [= عا : البابة] ، (نا.) ١ــ جۆری کاڵا ، نەوعی شتومەك . :: ئەم مەغازەیە هەموٚ بابەتێکــی تێدایە . ٢ــ هەر شتێکی بۆ کاریٚ یا کەسیٚ دەس‌بدا ، لایقی ئــەو کەسە بیٚ ، بە کەڵکی ئەو کارە بێت . :: ئەم جلکانە بابەتی ئێوەمانانن ، فڕنی بابەتی بیٚ ددانیە . □ «پاڵان قەجەریەکی باش بابەتی کوێخــا سجیللی موحتەڕەم » ، (کابرایەکی سەقزیٚ) ٣ــ لە باتیٚ ، لە جێگەی ، دەربارەی . :: ئەو دە تەغار گەنمــە بابەتی دەو و دوٚ ئەدیٚ زەکاتەکە ؟ تێبـ ــ بە مانای سێیەم لە فارسیٚ‌ڕا پەڕیوەتە نــاو کوردیٚ ★ (سـنـ.) باوەت .

**بابەڕۆ** ــ (شر.) ، (مک.) تـم : باوکەڕۆ .

**بابە عەمرە** ــ [ بابە /٤ + عەمر

(عومەر) + ە– ئە/١] ، (نت.) ، (سیم.) ئادەمیزادی بە دیمەن منداڵی بە تەمەن پیر . تێب – ئەم حاڵەتە هۆی فیزیۆلۆژیی هەیە و زیاتر ئینسانی وا کۆسە دەبێ .

**بابەگەورە** – [ ١–باب /١ + ٣ – ئە /٢ + گەورە ] ، (نت.) ١– تم : باپیر . ٢– منداڵان بۆ بانگکردن و ڕۆی قسەتێکردن ، دەگەڵ باوکی باوکیان بەکاری دێنن . :: بابە گەورە گیان منیش دەگەڵ خۆت بەرە . تێب – لەم حاڵەتەدا ( ٢–ئە/١ ) دەگەڵ دەنگی ( ە )ی دوایی ووشەی گەورە تێکەڵ بوون ★ باپیرە .

**بابەلێ** – (شر.) ، (مک.) تم : باوکەلێ .

**بابێ بابێ** – [ ؟ ] ، (نت.) ، (کمر.) یاریەکی منداڵانەی کوردەوارییە . تێب – منداڵەکان دەبنە دوو دەستە و هەر دەستە یەکیان ( تێکەوت ) سەر بە دیوارەوە دەنێن و دەستەکەی تر بە پرتاو دێن خۆ داوێنە سەر شانیان ، ئەوجار هەریەکەیان چەند پەنجەی دەستی جیا دەکاتەوە و لەوەی تێ کەوتوە دەپرسێ : « بابێ بابێ ، چەند بابێ » ، ئەگەر هەڵیهێنا چەند پەنجەیە هەڵدەستێتەوە و بەو جۆرە یاری درێژەی پێدەدرێ .★ (مک.) کەری سوری پشت درێژ .

**با پشکێو** – (نت.) ، (مک.) زیپکەیەکی پچکۆلەی نێرتکدارە لە قولینچکی چاودێت . ★ (کمر.) قینچکە سلاوە . (سن.) قنچکە سەلام . ( لو. ) سیتکە سەلام . تێب – لەکوردەواریدا وا باوە ئەگەر چاوێك ئەم زیپکەیەی لێبێ ، چاوەکەی دێ بە (کل) دەڕێژن ، گۆیا لە داخی ئەوەی نەیان ڕشتوە چاك دەبێتەوە تا کلی تێکەن .

**باپەڕبون** – [ ٣ – با/ + پەڕ + بون ] ( مصد. لا.) حاڵەتێکی نەخۆشی سەرمابونە پاش ئەوەی مرۆڤ ئارەق دەکاتەوە و هەوا لێی دەدا ئارەقەکەی سارد دەبێتەوە و لەرزی لێدێ .

**با پەسێو** – [٣– با/١ + پەسێو] (نت.) ، (مک.) تم : با پەنا .

**با پەنا** – (نت.) شوێنێکە با نەیگرێتەوە // باگر . ★ (مک.) با پەسێو .

**١– باپێچ** [٣ – با/١ + پێچ] ، ( نت .) ئەو شوێنەیە کە (با) لەبەر ئەوەی توشی بەرهەڵست ( کێو ، شێو ، دۆڵ و ...) دەبێ لە ڕێگای خۆی لادەدا و بە لایەکی دیکەدا دەڕوا و دەیکاتە گێژەڵوکە و گەردەلول .

**٢– باپێچ**– [ ٣ – با/ ٣ + پێچ]، (نت.) ١– سوڕان و خولخواردنی باوبژی ناو زگی ئادەمیزاد ٢– ژانەزگێکی لەم کارە پەیدا دەبێ . ★ (مک.) پێچ .

**باپیر** – (نت.) ١– باوکی دایك یا باوکی بابی کەسێك . ★ بابا ، باوا، بابەگەورە ، باپیرە . تێب – ئەم ووشەیە لە دوو کەرتی [ با = باب ] و [ پیر ] پێکهاتوە بە لای منەوە ئەم [ پیر ]ە هەر (پیەر)ی لەهجەی جنوبی زمانی کوردیە کە بە مانای

باوکه ( تم : باب ، تێب ــ ) . ٢ ــ ناوه بۆ پیاوان .
**باپیران** ــ [ باپیر + ٢ ــ ئان/١] ، ( نت.) تم : ئاژداد .
**باپیره** ــ ١ ــ [ باپیر + ٥ ــ ئه /١ ] ، (نت.) تم : باپیر/١ . ٢ ــ [ باپیر + ٢ ــ ئه/١] ( باپیر )ه له حاڵەتی بانگ‌کردنا ، تم : بابه گەوره / ٢ . تێب ــ جیاوازییەك له نێوان مانای ئەم ووشەیه و هاوماناکەیدا هەیه ، هەرچی (بابەگەوره / ٢ )ه تەنیا منداڵ کاتی ڕۆی‌قسه دەکەنه باوکی باوکیان یا بانگی دەکەن ، بەکاری دێنن و هەرچی ( باپیره/ ٢ )شه ، هەم منداڵ بۆ مەبەستی سەرەوه دەکاری دەکەن و هەم باوکی باوکیشیان بۆ دەربڕینی خۆشەویستی خۆی بەرامبەر نەوەکانی دەیڵێ .
**باپیرەگەوره** [ باپیر / ١ + ٣ــ ئه/٢ + گەوره ] ، (نت.) باوکی باپیری کەسێك ، باپیری بابی کابرایەك ، پشتی سێیەم ، ئەگەر له باوکی کەسێكڕا دەست‌پێ‌بکرێ و چوارەم ئەگەر لەخۆیەوه حیسابی کەین .
**باپیری** ــ [ باپیر/٢ + ٣ ــ ئی]، ( نت . ) ، (کعر.) جۆره هەنارێکی ترش و شیرن (مزر)ه .
**بات** ــ [ ؟ ] ، (نا.) هەرشتێکی جێگای شتێ‌تر بگرێتەوه یا پێی بگیرێتەوه ، هەر کار یا شتێکی وەبەر شتێ یا کارێکی دیکه بکەوێ یا وەبەری بخرێ . □ « له باتی خوێنی خۆم ڕازیم به ماچێ + دەسا بێده هەتازیندۆم و ماوم » :: لە باتی ئەوەی وا دەستەوئەژنۆ دانیشتوی هەڵسته بڕۆ هەوڵی بده . تێب ــ ئەم ووشەیه هەمیشه (له)ی له پێشەوه دێت و به تەنیایی دەکار ناکرێ . ★ له جیاتی ، له بری ، له برێتی . (عا.) عوضا عن ... ، بدیلا ل ... .
**باتسکه** ــ [٣ ــ با/١ + تس ( = تز = تیژ (خێرا) + ئك + ٥ ــ ئه /١ ] ، (نت .) تم : با هەنجیر . تێب ــ أ ) مانای حەرفی ئەم ووشەیه بەو جۆرەی کەرتەکانی نیشانی دەدەن ، دەبێته : شتێکی (با) پەلەی له پێکەیشتنی کردبێ و زوتر له وەختی ئاسایی گەیاندبێتی . ب ) ووشەی (تەز) له زمانی فارسیدا به مانای گیایەکه تازه سەری دەرهێنابێ و له زمانی (پەهلەوی)شدا یەکێك له ماناکانی (تیز) خێرا ( سەریع )ه ( تم : فره ، پفا ، ل ــ ٤٣٢ ) . ج) تەنیا (معر.) ئەم ووشەیەی نوسیوه ( تم : کشت ، ج ١ ، ل ــ ٢٥) . هس : تیزه تیز ( = پەلەپەل ) ، تیزه ( تیزکه ، تیسکه )ی تفەنگ .
**باتمان** ــ [بات + مان؟] ، (نت.) ١ــ سەنگێکه بۆ کێشانەی شت و له هەرشوێنه و ناوچەیەکی ( کعر.) دەگۆڕێ و تا ٢٨ کێلۆ دەڕوا ، بەڵام له (کئیر.) هەروەك (بادینان) ناگۆڕێ و ١٦ کێلۆیه ، □ « ... ناردی بیست باتمانی پەمبۆ بۆ کڕێ ، میر شێخیان دەنێونا ... » ( تحفه ، ج١ ، ل ــ ٣٧٣ ) . تێب ــ

بە لایمنەوە (مان)ی دوایی ئــــەم وشەیە هەر ( مەن ، من )ە کـــە ئەویش سەنگێکە و لە گەلێ ناوچە و مەلبەندی کوردستانا باوە ، لـــە زمانی سانسکریتیدا (مانە) بە مانای « سەنگێکی دیاریکراو »ە و لە زمانی ( ئاکەدی )شدا ( مەنە ) هەر بـــەو مانایە هاتوە ( تە : معین ، فەرهەنگ، ج ٤ ، ل ــ ٤٣٦٦ ) . ٢ ــ ناویشارێکە لە کوردستانی تورکیا.

**باتۆ** ــ [ ؟ ] ، (نا.) ، ( مک.) گونی ئادەمیزاد :: ئەو منداڵـــە باتۆی ئاوساوە .

**باتێدان** ــ [ ٣ ــ با/٦ + تێ (دە + ی) + دان] ، (معت. لا . ) ، (کعر.) تۆشی نەخۆشیی باداریی بۆن :: شێرکۆ قاچی باتێیداوە .

**باجئەستاندن** ــ ( مصت. متە.) ١ــ پارە ، زێڕ ، زیو یا هەر شتێـــکی بەقیمەت کە پاتشایەکی تێشکاو لە شەڕا ( بەپێی ڕێککەوتن و پەیمان ) دەبۆ بیدا بە پاتشای سەرکەوتو . ٢ ــ ئەو پارەیـــەی لـــە دەوری دەرەبەگایەتیدا ، هەر دەرەبەگێك لە ناوچەی دەستەڵاتی خۆیا لەو کاڵا و ڕێبوارانـەی دەستاند کـە بـــە مەلبـــەندی حوکمڕانیی ئـــەوا تێدەپەڕین . تێب ــ لە کوردستانیش ئەم ڕەسمە هەبـوە و لە جەنـگەی شەڕی دوەمـدا سەرلەنـوێ لـە کوردستانی ئێران بۆژاندرایـەوە . ٣ــ ئەو پارەیەی دەوڵەتان لە بـــەر دەروازەی شاران ، لەو کاڵایانەیان دەستاند کە لە دێهاتەوە بۆ شارەکان دەهات . ★ بارانە ، ڕادارانە .

٤ ــ ئەو پارەیەی کە ئێستا دەوڵەتان لە کاسب و بازرگان و شەریکە و . . . ( بەپێی دەسکەوتیان ) دەی ئەستێنن ★ ( کئێر. ) مــالیات . ( کعــر.) زەریبە . ٥ ــ ( مج . ) هەرپارەیەکی بە زۆر و ناهەق یەکێکی دەستەڵاتدار لــە بێدەستەڵاتێـکی بستـێنێ ★ ( کعر. ) خاوە ، ( کئێر.) سەرانـە ( مج . ) . (جنو.) قووە ● **بارلەباج ناناڵێ** ــ ( کن.) کەسێك مەبەستێکی هەبێ ، لە پێناو جێبەجێکردنیـدا نابێ گوێ بداتە چەرمەســەریی و گێرە و کێشە و پارە .

**باجئەستاندن** ــ (معت. متە.) ١ ــ کۆکردنەوەی مالیات ، وەرگرتنـی باج ★ باج سەندن . باجوەرگرتن ٢ــ ( مج . ) بە زۆریی و بە ناهــەق شتێ لە کەسێ ئەستاندن :: باجە و لێت دەستێنم چت لە دەســت دێ لێی ڕامەوەستە .

**باجئەســتێن** ــ [ بـــاج /٣ + ئەستێن (ئەستاندن) ] ، ( نت. ) تە : باجگر .

**باجسەندن** ــ(مصت.متە.) (سیم.) تە : باجئەستاندن .

**باجگر** ــ [باج/٣ + گر (گرتن) ]، ( نت.) ئەو کەسەی بە فەرمـــانی دەوڵەت دەستەڵاتی وەرگرتنی باجی هەبێ . □ « ڕێی نەوتـــەکە زۆڕ باجگری گەر زۆرە دەفەرموێ+ڕێی خاسە بە شەو خالیە بابێ بە بلاغا ( رەزا ــ ٣ )

★ باجئەستێن . (سن.) باجەوان .

**باجگرتن** ــ ( صــت . مــت .) باجئەستاندن .

**باجلێگرتن** ـ ( صت. مت. ) باج لە کاڵایەك ئەستاندن .

**باجەوان** ـ [ باج/٣ + ٣ ـ ئە/٢ + وان ] ، ( نت . ) ، ( سـنـ . ) تە : باجگر .

**باجی** ـ [ = تو : خوشك ] ، (نـا.) ، ( کـمـر . کـئـێـر . ) . ١ ـ لەقەبێکە ژنێـکی لـە خـۆ گەورەتری پێ بانگ دەکرێ :: باجی گوڵێ . بـاجی وەنـەوش . ٢ ـ لەقەبێـکە خوشـك و بـرای بچوك بۆ ڕێزلێگرتن ، خوشکی لـە خۆیان گەورەتری پێ گاز دەکەن :: باجێم چۆتە ماڵی پۆرم ★ ( مک. ) داد . دێد .

**باخ** ـ ( نـا. ) ، ( کـمـر .) ، سنـ . ) ١ـ تمـ : بـاغ ٢ـ تمـ : باخچە/١ .

**باخچە** ـ [ باغ + چـە ( ئە . بچوکی ) ] ، ( نت . ) ١ ـ ( کئێر . ) پارچە ئەرزێکە لە ناو حەوشـەی ماڵ ، بۆ چاندنی گوڵ و شێناوەرد تەرخان دەکرێ . ٢ ـ ( کمر . ) پارچەیەك زەوییە کە سەوزە و گیا و گوڵی خواردەمەنی لێ دەچێنرێ . ★ ( کئێر . ) سەوزێخانە . تێبـ ـ دەنگی ( غ ) لە جێرانەتی دەنـگی ( چ ) بۆتە ( خ ) .

**باخلـــە** ـ [ ؟ ] ، ( نت . ) ، ( سنـ . ) ١ ـ دوکانی کشتوکاڵ کە بۆ شەتلی هەندێ شێناوەرد و گیا و گوڵ وەکـو ( باینجـان ، تەماتە ، ڕەیحانە ، تۆتن و . . ) تەرخان دەکرێـت و پاشـان دەگوێزرێتەوە بۆ جێگای تایبەتی .

( عا. ) مەشتەل . ٢ـ قۆلکەیـەکە لە دەوری نەمامی دار یا بڕکـەی شێناوەردێك دەکرێ تـا ئاوی تێدا ڕا بوەستێ و دار یا گیایەکە ئـاو باش بخواتەوە . ٣ ـ تۆرەکەیەکە جۆتێـــران تـۆوی تێـــدەکەن و دەیـوەشێنن ★ (مک.) تۆمەدان . تێبـ ـ تەنیا مردۆخ ئەم ووشـەیـەی نوسیوە و من بۆ ئـەوە دەچـم کە بەم جـورە [ بـاخ + ئەڵـە/٢ ] پێکهاتبێ و کەم کەمـە ( ئـە )ی ( ئەڵە/٢ ) سوابێ و ( باخڵە )ی لێ کەوتبێتەوە .

**باخۆش** ـ [؟] ، (مک.) گەورەتر لەچاو شتێکی دیکە :: ئەو کەوشە تۆزێ بە پێم بچوکە ئەگەر هەوایەك باخۆشـتربێ باشترە . شـێروان تۆزێ لە نەرێمان باخۆشترە .

**باخەڵ** ـ ( نا . ) ، (مک.) تمـ : باغەڵ .

**باخەوان** ـ [ باخ + ٣ ـ ئە/٢ + وان ] ، ( نت. ) ، ( کمر. ، سـ. ) تە : باغەوان .

**باخەوانی** ـ [ باخەوان + ٢ ـ ئی ] ، ( حمصـ . ) ، ( کمر . ) تە : باغەوان .

**باد** ـ ( نا. ) ، (مک.) تە : ٤ ـ با ☐ « دەسماڵەکەی دۆ بـادە + ماڵی بابم سەیزادە » ( فۆلکلـۆر ) . تێبـ ـ وا دێتە بەرچاو کـە ئەسڵی ئەم ووشـەیە ( بادراو )بێ و کـورت بۆبێتەوە .

**بـــادار** ـ [ ٣ ـ بـا/٦ + دار ( پـ . ) ] ، ( صت . ) حاڵی کەسێکی تۆشـی نەخۆشی ڕۆماتیزم بێ ، ئەو

کەسەی لەشی ( با )ی تێدایە .

**بادارێ** ـ [ بادار + ٢ ـ ئێ ] ، ( نتـ . ) نەخۆشێ ڕۆماتیزم . تێبـ ـ نەخۆشییەکە تۆشی ئادەمیزاد دەبێ و لە جمگە و ماسۆلکە و ئەندامەکانی دەروون ( جەرگ ، دڵ ، . . ) دەدات، چونکو ژانی ئەم نەخۆشییە لە جێیەك ڕاناوەستێ و هەڵدەکشێ و دادەکشێ، پێشونیانی کورد وایان زانیوە ( با )یە و لە لەشی ئینساندا دەگەڕێ و ناویان ناوە ( بادارێ ) .

**بادام** ـ [ پهـ : ڤاتام ] ، ( نا .) میوەیەکە دەخورێ ، دارەکەی دەسچێنە ( کێوێشی هەیە ) ، لە کوردستان زۆرە ، هەر دەنکێکی دەناو قاپێلکێکی سەخت دایە (هەڵدەکەوێ دوویان دە قاپێلکێکدابن)، پڕە لە مادەی چەورێ و شەکری میوە ، بە فەرێکێ قاپێلکەکە شێن و نەرم و توکنە و ناوکەکەشی سپێ و نەمەیوە و بە خوێوە دەخورێ ، بەڵام کە ووشك بێ قاپێلکەکە سەخت و زەرد و کونکون و ناوەکەشی ڕەق دەبێ ، لەو دەمەدا ناوکەکەی توێکلێکی زەردی پێوە نوساوە و دوو (لەپە)ی بادامەکەی توند پێکەوە نوساندوە ، لە کوردستان بۆ خواردن و داوودەرمان بەکاری دێنن و بۆ کاروباری بژیشکێ ڕۆنی ائێدەگرن ★ ( سیمـ . ، ککـ. ) بائام ( بەو جۆرەی دەنگی ( د ) لە سلەیمانێ بە دەما دێت ) ، ( هلـ . ، کیـ. ) باوێ . ( بکـ. ) بایێف ، بەهێف . ( لو . ) بایم .

**بادامە تاڵە** ـ [بادام + ٣ ـ ئە/٢ + تاڵ + ٥ ـ ئە/١ ] ، ( نتـ . ) بەری دارێکی کێوییە لە جنسی بادام،خۆش دەکرێ ( بە شێوەیێکی تایبەتی تاڵێ لێ دەبڕن ) و دەیخۆن

**بادامی** ـ [بادام + ٣ ـ ئێ ] ، ( صتـ . ) ١ ـ هەر شتێکی لە دروستکردنیدا ( بادام )ی تێکەڵ بکرێ . :: باقلاوەی بادامی . ٢ ـ هەر شتێکی شکلی وەکو بادام وابێ

**بادان** ـ [٤ ـ با + دان (فعـ.) ]، (مصتـ. متـ. ) ١ ـ سوڕاندن و پێچدانی بەن و دەزو و ئەو جۆرە شتانە بەدەوری خۆیاندا بۆ ئەوەی زیاتر کرژبن . ٢ ـ سوڕاندنی هەر شتێکی دیکە بە دەوری خۆیا بۆ هەر مەبەستێك بێ :: ئەو بورغییە لوولێ بادە با توند بێ . کچێ خێرا ئەم بەنە دوولاکەوە و بایدە ● بەنی ( کەسێکە ) بەمن با نادرێ ( کنـ. ) دەرەقەتی . . . نایەم ، پێی ناوەستم، سەر لە فرۆفێڵی . . . دەرناکەم .

**بادانەوە** ـ [ ٤ ـ با + دانەوە ] ، ( مصتـ. لا. ) ١ـ پەشێمانبونەوە ، هەڵگەڕانەوە . □ «بادانەوە عەیب نیە». ٢ـ ڕێگاگۆڕێن و بە ڕێگایەکی ترا (چ ماددێ چ مەعنەوێ) ڕۆیین. :: هەر سەری ئەسپەکەی بادایەوە و بە غار ڕوی کردە ماڵی کوێخا . ٣ ـ هەر بە ڕێگای خودا ڕۆیین بەڵام بە کەوانەیەك یا زاویەیەك کەوتنە سەر اتجاهێکی پێچەوانەی پێشو □ « ساقیا وا بادەوە ، وا بادەوە » « ڕو دە لای من کە بە جامێ بادەوە » ( هێمن )

**بادانەوەسەر** . . ( کـ . )

وازهێنان له شتێ ، له کارێ یا له کەسێ و گـەڕانەوە سەر ئـەی دوێنێ حـەمـەم دێت دێسـان بایداوەتە سەر کەبابچێتێ .

● **بادکێش** ــ [ فر. کو . ] ، [ باد (فر.) + کێش ( کێشان ) ] ، ( نت . ) ، (کئێر.) تم : باکێش /٢ . تێب ــ ئەم ووشەیە له ( بادکەش )ی فارسیڕا شێوەی کوردێ دراوەتێ

**بادە** ــ [په : باتەك]، (نا.) شەڕاب □ « به جامێ بادە تێرنـابم ئەگەر مەیلت هەیە ساقێ + گڵێنەی خۆم دەنێرمە خزمەتت بۆم تێکە تا بێبا» ( هێمن ، تارێك و ڕۆن ، ل ــ ١٣٩ )

**بادەرکردن** ــ [٣ ــ با/٦ +دەر+ کردن ] ، ( مصت. متە. ) ١ ــ بـە دەستوری کۆنی کوردەوارێ ، چۆنە سەر چاك و پیران بۆ چارەکردنـی نەخۆشێ باداری ( ڕۆماتیزم ) :: هەمۆیان چۆنە سەر پیری شەوکێل با له خۆیان دەرکەن . ٢ ــ کردنەوەی زارکی هەمبانە و کونـدە و . . ی فۆکراو بۆ ئەوەی هەواکـەیان لـێ بێتەدەر و بپۆچێتەوە .

**بادەڵێن** ــ [ ٣ ــ با/١ + دەڵێن (دەڵاندن) ] ، ( نت. ) کەلەبـــەر ، درزو قەڵشتی پچکۆلە کە له دەرگا و پەنجەرە و دیوارانداا ( با )ی پێدا بێتـە ژۆرەوە :: هەمۆ بادەڵێنـی ژۆرەکەمان ئاخنیوە ، ئەو سەرمایە به کوێدا دێتەژۆر ؟

**بادەوە** ــ [ ٣ ــ با/١ + دەو ؟ + ٥ ــ ئە/١ ] ، ( نت . ) ، (مکـ.) کاغەزێکی چوارگۆشە یا درێژۆکەیە، چەند کەوانەی قامیشـی لێ قایـم دەکەن و کلکێکی پەڕۆ یا ئاڵقەکاغەزی تێدەخرێ ، چوار پارچـە دەزۆش له چوار قولنچکی دەبەستن و پێکەوە گرێ دەدرێن،ئەوجار هەندێ دەزۆی تێدەخەن و کاتێ ( با ) هەڵدەکـا ، مندالان هەڵێدەدەن بۆ حـەوا ★ ( کعر . ) کۆلارە . ( سنـ . ) بازێ هەوایێ ، بەرزە هەوایلە /١ ، بەرزە حەوایلە .

**بادیە** ــ [ = عا : باطیة ]، (نا.) (مکـ.) جامی مسی گەورە . تێب ــ أ ) ئەم قاپە بنی تەختە و دەنێشێتە سەر زەوێ و بەرەبەرە دەمی فرەوان دەبێتەوە تاوەکۆ (شێوە مەخرۆت)ێکی لێدێ کە له هەر دۆ سـەران لێـی بڕابێتەوە ، لـە کوردەوارێ زیـاتر ( دۆ ) یا ( ماستاو ) یا (شەربەت)ی تێدەکرێ و لەسەر سفرە دادەندرێ. ب) باطیەی عەرەبێ کە ئەم ووشەی لێ وەر گـیراوە ، گڵێنەیـەك بـوە شەڕابیان تێکردوە .

**بادیهەوا** ــ [٣ ــ ٣ــبا/٥ + ٣ــ ئێ + هەوا ] ، ( صت.) ، ( مکـ. ) لەخۆگۆڕاو ، کەسێکی نابەجێ و هەر له خـۆڕا (بە هـەوا) مەغـرۆر بـێ □ « بەوەی بادیهەوایە + جێـرانی میرزا بابایە » (فۆلکلۆر) ★ باغر . بوغڕا . بایێ . غەڕڕە .

**بادیهەوایێ** ــ ( حمصـ.) ، (مکـ.) لەخۆگۆڕان . (عا.) غرور ، تکبر .

**١ــ بار** ــ [ په : بار ] ، (نا.) ١ــ کاڵا و کەلوپەل یا هەر شتێکیتر کە دە دەفرێکەوە پێچـرابێ یـا تونـد بەسترابێ تا له ووڵاغ ( کەر ، ئێستر، بارگێن ، ووشتر ) یا هەر هۆیـەکی

دێکەی ئازوگوێز ( گارێ ، عارەبە ، لۆرێ ، ...) بندرێ و لە شوێنکەوە بۆ شوێنێکی‌تر ( دۆر یا نێزیك ) بگوێزرێتەوە :: بارەتۆتن ، بارەدار ، بارەگوێنی . ٢ـ قورسایێ شتومەکێ کرابێتە بار و ئەوەندە گران‌بێ وولاغێکی بارێ هەڵێبگرێ :: باری ئێسترێ گەنممان ناردۆتە شار ، ئەمە هەر باری کەرێك دەبێ . ٣ـ (مجـ.) ئەرك و قورسایێ مەعنەوی کارێك :: ئەو بارە بەمن هەڵناگیرێ ( ئەو کارە بەمن ناکرێ ) . ٤ـ ئازار ، ئەزێت ڕەنج ● « لەش‌بەبار بێ »ـ (کن.) دۆعایەکی ژنانەیە بە مانای : نەخۆش بکەوێ **« لەش‌بەبار خۆم »** ـ (کن.) قسەیەکە ئافرەتان لە حاڵێدا کە هەست بە نارەحەتێ ( ماددێ یا مەعنەوێ ) دەکەن دەیڵێن . ٥ـ (کعر.) تم : ٥ـ بەر :: منداڵی لەبار چوە .

**٢ـ بار** ـ ( نا .) ١ـ چلۆنایەتێ و شێوەی هەڵکەوتنی شتێکی ماددێ :: فەرشەکە بە باری خۆیدا ڕاخەن. ٢ـ حالەتێکی کارێك بە خۆیەوە دەگرێ :: ئەم ئێشە بە بارێکدا بخەن. ٣ـ (نمصـ.) ئامادەبێ ، قابیل‌بۆن بۆ ...، بەکاری ... هاتن :: ئەوەی لەباراندا هەیە دۆ و دۆشاو تێکەڵ کا . هێچی لەباراندا نیە .

**٣ـ بار** ـ [ ؟ ] ، (نا.) توێژێکی سپێ زەرد باوە ، لە ئەنجامی هەندێ نەخۆشێ ( لەرزو تا ، قەبزێ ...) لەسەر زمان و لێو دەنێشێ :: زمانی دەرهێنا باری لەسەر نێشتبو ، ئەو هەمۆ بارە چیە بە لێوتەوە ؟ ★

(کعر.) بەڵغ / ٢ .

**٤ـ بار** ـ [ ؟ ] ، (نا.) لەباتی ،ـ لەجێگەی ، بەرامبەربە ... تێبـ ـ ئەوەندەی پێم شك‌بێ ئەم ووشەیە تەنیا لە ووشەی ( باری کەللا ) و ( بارمتە )دا دەبیندرێ ، بەلای منەوە ڕەنگە ووشەی ( بات ) یا (بەر)بێ کە لە ( وەبەرخستن )دا دەبینین و جەڕابێ یا بە مەعنای (هاوسەنگ) دەگەڵ (کەللا) و ( متە )دا تەرکیب کرابێ .

**باری‌کەللا** ـ [ ٤ ـ بار +١ ـ ی/١ + کەللا ] ، (نت.) ، (مکـ.) ئەو (متە)یە کە لە هێندێ یارێ منداڵاندا بۆ کەسێکی دادەکەن کە هەمۆ (مایە)ی دۆڕاندبێ و تەنیا دەسکەلای مابێ . تێبـ ـ لە هەندێ یارێ کوردەوارێدا وەکو (مۆشێن) ، ( ماتێن ) ، ( جەغزێن ) و ... و ... کە هەر یاریکەرێ ( دەسکەللا ) و ( مایە )ی خۆی هەیە ، ئەگەر هاتو یەکێکیان هەمۆ ( مایە )کەی دۆڕاند و بیەوێ هەر یارێ بکا،بە یەکێ لە یارێکەرەکان دەڵێ ( باری‌کەللا ) م بۆ داکە و دەبێ بۆی داکا ، ئەگەر ئەم جارەش دۆڕاندی ( کەللا )کەی لەباتی ( قەرز )ەکە هەڵدەگرن و لە یارێ وەلادەکەوێ ، خۆ ئەگەر بردێشیەوە ئەوا دەکەوێتەوە ( مایە ) قەرزەکەی دەداتەوە .

**٥ـ بار** ـ ( پـ.) ئەم ووشەیە پاشبەندی جێگایە و ئەوەندەی من پێم شك‌بێ تەنیا لە ووشەی ( ڕۆبار ) و (جۆبار)دا دەبێنرێ . تێبـ ـ ئەم ووشەیە لە زمانی

پەهلەویدا ( بار )ە و چەشنی ووشەیەکی سەربەخۆ مانای (کەنار ، لێوار ، قەراغ و ساحیل ) بوە (تم : فره ، پفا ، ل ـ ٦٩) و لە زمانی سانسکرێتیدا ( ڤاره ) هەر ئەو مانایانەی هەیە ( تم : معین ، فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ـ ٤٤٥ ) . واتێدەگەم ووشەی (وار) و (هەوار) بەمانای جێگای‌دابەزێن ، کەمپ مصسکر ، مەنزڵ ، قۆناغ ، هەروەها ووشەی (وار)ی قومار کە مانای ( هەقی جێگا )ی وەرگرتوە و لە (ڤەره)ی ئاوێستایی وەرگێراون ئەسڵی ( ٥ بار ) بن . هس : دەوار ( ڕەشماڵ ) .

٦ ـ **بار** (پ. ) بەدوای هەندێ ناوانەوە دەلکێ و دەیکاتە؟ صفەتێك و پێشانی دەدا ( موصوف ) مەدلوولی ئەو ناوەی تێدایە یا هەیەتی کە ( صفەت )ەکەی لێ دروست بوە :: گوناجبار ، هەتیوبار . **تێب ـ دوور** نیە ئەم ( پ. ) **هەر (١ ـ بار) بێ و مەبەست ئەوەبێ** ( موصوف ) ئەو ناوەی لێ بارکراوە .

**باراش** ـ [ ١ـ بار/١ + ١ـ ئاش /١ ] ، (نت.) ١ـ دەغڵ (گەنم ، جۆ) کە ئامادە کرابێ تا بێنێرنە ئاش و بیکەنە ئارد . ٢ـ (مجـ.) ـ أ ) ئەوەندە دەغڵەی کە بە یەکجار دەچێتە ئاش و دەکرێتە ئارد . ب) ئەو دەغڵەی کە چۆتە ئاش و کراوە بە ئارد جا یا لە ڕێگایە و یا کە هاتبێتەوە ماڵێ هێشتا بەتاڵ نەکرابێ . :: بچن لە ماڵی کوێخا تۆفیق مشتێ ئارد قەرزکەن تا باراشەکەمان دەگەڕێتەوە .

**باراش‌لێکردن** ـ(مصت.مت.) بردنی ( باراش ) بۆ ( ئاش ) و کردنی بە (ئارد) ★ باراش‌هاڕین .

**باراش‌هاڕین** ـ (مصت. مت.) تم : باراش‌لێکردن .

**باران** ـ [پە : ڤاران] ، (نا . ) ١ـ (نم) و (شە)یەکی لە حەوا کۆبۆتەوە و بە شکڵی (دڵۆپ) لە ئاسمانێڕا دەڕژێتە سەرزەوێ . ★ ( بک. ) باران . (جنـو.، هـو.) واران . (زا) ڤاران . (مک.) بارانە ٢ـ دەگەڵ هێندێ ناوان تەرکیب دەبێ و ناوێکی تازە پێکدێنێ کە دەگەیێنێ میقدارێکی زۆر لەو شتەی (ناو)ەکەپێشانی دەدا (وەکو باران ) لە شوێنێکەوە (بەتایبەتی لە بەرزاییڕا ) بەسەر کەسێ ، شتێ یا جێگەیەکدا فڕێ دەدرێ . :: گولباران ، بەرد ( ، ) باران ، بۆمباباران ، تیر ( ، ) باران .

**بارانـاو** ـ [ باران/١ + ١ـ ئاو/١] ، ( نت.) موتڵەقی ئاوێ کە لە باران پەیدا دەبێ ٢ـ ئاوی باران کە لە شوێنێکدا کۆبۆبێتەوە .

**باران‌بارین** ـ[باران/١+ بارین]، ( مصت. لا.) هاتنەخوارەوەی باران لە هەورانڕا بۆ سەرزەوێ ★ باران‌دادان ، دادانە باران (نە) ، کردنەباران ● **باران بباری ئاشم دەگەڕێ ، باران نەباری جۆتم دەگەڕێ** ـ (کن.) دنیا هەرچۆنی بسوڕێ کاری من پەکی ناکەوێ .

**باران‌بڕان** ـ (نت.) ئەو مانگەیە ئیتر باران نابارێ ، سێیەم مانگی

بەهار ★ جۆزەردان .

**بارانْدادانْ** ــ [ بـــاران/١ + دا (پێبڤ) + دان (فعە)]، (مصت.لا.) تم : بــاران بــارین . :: تــۆزێ خێراکەن خەرێکە باران دابــــدا . کەمێ پێ هەڵگرن خەرێکە بـــاران دایدەدا .

**باراندن** ــ (مصت. مت.) بۆنەهۆی هاتنەخــوارەوەی بـــــاران . ٢ــ بەردانــــەوەی یەکلەدوای‌یـــەکی ( چەشنی باران ) شتێــك بەســـەر جێگایەك یا کەسێکدا □ « بـــاران باراندت خوێیەکەت شوشتمــەو ، تەرزە باراندت کەرەکەت کوشتمەو، چراخ هەڵ مەکەی خۆم ئەدۆزێتەو» (فۆلکلۆر) .

**١ــ بارانە** | باران/١ + ە ــ ئە /١ ] ، ( نت.) ، (مک.) ١ــ تمـــــ : باران/١ . ٢ــ هەوایەکی گۆرانـــێ کوردیە □ « بارانە و بارانــــــە ، هەوای بارانەی تازە ، ...» .

**٢ــ بارانە** ــ [١ــ بار/١ + ئانە /٢ ] ، (نتـــ.) ١ــ پارەیێـــــکە کاروانسەرادار و خـــانچێ لــەو ( بار )انەی دەستێنن کە بۆ ماوەیەك ( شەوێ یا زیاتر ) لە ( خان )ەکانیان دەخرێـــن ، بەپێـــی ژمـــارەی ( بار )ەکان و ئەو (شەو)انـــــەی دەمێننەوە زیاد و کەم دەکا . ٢ ــ باجێکە دەرەبەگ و دەستەڵاتداران بە ژمارەی بـــار لەو کاڵایانەیـــان دەستـــاند کە بـــە مەڵبەنـــــدی دەستەڵاتیاندا تێدەپەڕێ .

**بارانێ** ــ [باران /١ + ٣ــئێ]، ١ــ (صت.) هەرچی و هەرشتێـــکی پێوەندێ و نیسبەتی دەگەڵ (باران) هەبێ . □ . « موبەددەل بۆ بـــە چەندین لەحزە ئاوی سافی بـــارانێ بە یەك دەریایی عوممانێ کە هێـــچ تاریخ نیشان نادا » ( مەلا مـــارفی کۆکەیێ ) ٢ــ (نت.) سەر بەرگێکـە ئاو دانادا و ڕۆژانی بەفر و بـــاران دەبەردەکرێ ★ ( کعر . ) مشەمما.

**باربردن** ــ [١ــ بار/١+بردن] ، ( مصت . لا.) پەیدابۆنی توانایێ لە وولاغێـــکدا بـــۆ ئـــەوەی بـــاری لێ‌بندرێ . :: ئەم ئێسترە بار نابا ( توانـــایێ هەڵگرتنی بـــاری نیـــە ، یا ناکرێ ــ لەبەر هەر هۆیەك‌بێ ــ باری لێ بندرێ) . ★بارهەڵگرتن/١ .

**باربۆ** ــ [ ؟ ] ، (نت.) ، ( مک. ) پێشکێش‌کردنی شتومەك، کەلوپەلی ناو ماڵ، پارە، یا هەر شتێکی دیکە، لەلایەن چەند کەسێکەوە بە یەکێـــك بـــۆ هەڵســـوڕاندنی کارێـــکی وەکۆ ژن‌هێنـــــان ، مـــاڵ‌پێـــکەوەنان و خانۆدروست‌کردن و ...و... ★ باروبۆ .

**باربەست‌کردن** ــ [ ١ ــ بار/١ + بەست ( بەســـتن ) کردن ] ، ١ــ (مصـــت. مت.) تم : باربەســـتن ٢ــ (مصت. لا. ) خۆســـازکردن بـــۆ ئەنجـــام‌دانی کارێ. :: باربەستی خۆیان کردوە شەوەکی وەڕێ‌دەکەون

**باربەستن** ــ (مصت. مت.) ســـاز کردن و پێچانەوەی ( بار ) بۆ ڕەوانە کردن و گواســـتنەوەی :: بارەکان بەستراون و لـــە (خان)ەکەن . ★ باربەست‌کردن/١ .

**باربەند** ــ [١ــ بار/١+ ٢ــبەند]،

(نت.) • (كنێر.) بارێکه گورێسێکه لە ( گوش ) یا لە ( مۆ ) دروستدەکرێ و پاش پێچانەوەی بار بەم گورێسەش دەیبەستن تا قایمتربێ و لە ڕێگا هەڵنەوەشێ.

**بارتەقا** ـ (نت.) ١ـ هاوتا ، هاو سەنگ . ( عا. ) معادل . ٢ـ لەباتی ، لەبری . ٣ ـ بەئەندازە ، بەقەدەر :: بارتەقای دە پوتێك دەبوٚ نازانم چوٚنی بوٚ هەلگیرابوٚ . تێب ـ أ ) بەلای منەوە زیاتر لەوەدەچێ ئەم ووشەیە لە (١ـ بار/١) وەرگیرابێ ، سەرەڕای ئەو ڕێ تێچوٚنانەی لە (ب)دا باس دەکرێن . ئەگەر باری بارەبەرێك تەواو نەبوٚبێ بوٚ ئەوەی (تا) کانی بارەکە هەرتکیان بە یەك ئەندازە قورس بن شتێکیان خستوٚتە سەر (تا) سوٚکەکە و ئەم ووشەیان بەمانای (وسیلة التعادل) بوٚ داهێناوە و بەرەبەرە بوٚ شتی دیکەش غەیری (بار) بەکارهێندراوە ، بەلاٚم بوٚچێ لە (تا) قورسەکەیان دەرنەهێناوە و نەیان خستوٚتە سەر (تا)یە سوٚکەکە؟ کارێکی وانیە کە بە هاسانێ بدوٚزرێتەوە و زوٚر ڕێی تێدەچێ یەکەم جار کە ئەم کارە ئەنجام دراوە و ئەم ووشەیەی بوٚ داتاشراوە هەردوٚ (تا)ی بارەکە یەك جسن نەبوٚبن و تێکەڵ کردنیان مومکین نەبوٚبێ و.... ب) ڕێی دەچێتێ ئەم ووشەیە لەم کەرتانە پێکهاتبێ : ١ـ [ ١ـ بار/١ + دەق + ٥ـ ئە/١ ] ، ٢ـ [ ٢ـ بار + تەقا (؟) ] ، ٣ـ [٤ـ بار + دەق + ها].

**بارچەوت** [٢ـ بار/١+ چەوت ]، (صت.) (مج.) حاڵی کەسێکی قسەی کەسی بەگوێدا نەچێ ، کەسێکی کردەوەی پێچەوانەی باو و نەرێتی کوٚمەڵ بێ .

**بارچەوتی** ـ (حمص .) ئەنجامی کار و کردەوەی ئینسانی بارچەوت

**بارخانە** ـ [١ـ بار/١ + خانە] ، (نت.) ، (مک.) ١ـ کاتی پێگەیشتنی هەندێ حاسلاٚتی کشتوکاڵ :: بارخانەی توٚتنێ ، بارخانەی خورێ، بارخانەی لوٚکەی . ٢ـ موتڵەقی پێگەیشتنی توٚتن و هاتنە بازاڕی بوٚ فروٚتن :: میرزا گیان هێندێك شتمەك هەڵدەگرم بە وەعدەی بارخانەی . ٣ـ لەسەریەك هەڵچنینی کوٚمەڵێ بار :: توٚتنەکان بارخانە بکەن ، ئەو بارانە لە هوٚو بەرهەیوانە لە بارخانە بدەن. تێب ـ أ) وەکوٚ دەزانن (خانە) بە مانای ماڵ و زوٚر هاتوە ، ئەم ووشەیە ـ وەکوٚ هەندێ ووشەی دیکە کە دەگەڵ (خانە) تەرکیب بوون وەکوٚ (نانەواخانە ، ئاتەشخانە ، چاخانە ، ... ، ...) بەپێی ڕێزمانی کوردێ پێکهاتوە . ٢ـ دەبا ئەم ووشەیە ماناکەی ( جێگەی بار ) بێ بەلاٚم دەبێتێن ماناکانی ، هێچکامێکیان دەلالەتێکی ئاوایان نیە ، بوٚیە من وای بوٚ دەچم کە مەبەستی ئەم ووشەیە لە پێشدا هاتنەوەی باری حاسلاٚت لە دەشتەوە بوٚ ماڵ (خانە) بوٚبێ و ڕێی دەچێتێ لە قوٚناغی پێش ئێستایدا ( باربەخانە ) بوٚبێ . ب) بوٚ مانای سێیەم ( هەڵچنێتێ

بارلەسەریەك ) چونکو ماڵ ( خانە ) تەنگەبەرە و جێگای باری زۆری لە چاو شتیتردا تێدا نابێتەوە ، باریان کە هێناوەتەوە ماڵ لەسەریەکیان داناون ، جا دەبێ مەدلوولی ئەم ووشەیە لە (تایبەتی)ڕا بۆ ( گشتی ) گەشەی کردبێ و موتڵەقی هەڵچنینی بارلەسەریەك بۆتە مەدلوولی ( بارخانە ) .

**بارخانەکردن** ــ [ بارخانە/٣ + کردن ] ، ( مصد. مت. ) ، (کئیر.) هەڵچنینی فەردە و بار ( هەرچێکی بێ ) لەسەریەك ، لە عەمبار یا هەر جێگەیێکیترا .

**بارخستن** ــ(مصد. مت.) داگرتنی بارەکانی کاروانێك لە پشتی ووڵاغان، لە (خان) یا هەر جێگایەکیترا بۆ ووچان و ماندوو حەسانەوە★ خستن . // بارکردن/١ .

**بارداگرتن** ــ (مصد. مت. )هێنانە خواری ( بار ) لە پشتی ووڵاغ یا هەرجۆرە بارەبەرێکیتر بە یەکجاری :: خێرا بارەکان لەو لۆرییە داگرن.

**بار ڕاستکردنەوە** ــ (مصد . مت.) ١ــ یارمەتی کاروانی یا هەر کەسێکی دیکە بۆ ڕاستکردنەوەی بارێکی لاسەنگ بووبێ . ٢ــ (کن.) یارمەتی دانی کەسێکی تووشی گیروگرفت و نارەحەتی بووبێ بەتایبەتی لە لانی پارە و پووڵەوە :: ئازاد حالی شڕبوو شێرکو فریایکەوت و باری ڕاستکردەوە.

**بارست** ــ [ پە : بالیست = بلیندترین ، بەرزایی ] ، (نا.) ، (کی.) **تە** : بانە/٢ .

**بارستایی** ــ [پە : بالیستیە.] ، [ بارست + ئایی/٢] ١ــ بەرزایی شوێنێ یا شتێ کە لەچاو دەورو بەری خۆی بەرزتربێ . لە نزمایی دەوروبەریڕا حیساب دەکرێ تا دەگاتە پۆپەی بەرزایی خۆی . :: بارستایی دوو پەنجە زیاتر تۆز لەسەر قەنەفەکان نیشتوە ٢ــ هەر شتێکی سێ (بعد)ی هەندەسی هەبێ :: بە بارستایی ئەم کێوە خەم لە دڵم بارە . (عا.) حەجم . تێب ــ بەلایمنەوە کەرتی دوەمی ئەم ووشەیە هەر ( ستا )ی ئاوێستاییە کە صفەتە و ئێستا ووشەی (ڕاوەستاو = قائم ، عامودی )مان بەرامبەری هەیە ، بەمپێیە مانای ووشەکە دەبێتە ( الوضع العامودي لشییء ) .

**بارسووك** ــ [١ــ بار/١ + سووك]، (صت.) ١ــ حالی ئینسانی بێئەرك، حالی کەسێکی کە چوە شوێنێ ، خەڵکی ئەم جێیە زۆر بەخۆیەوە ماندوو نەکا . ٢ــ (مج.) پیاوی فەقیر و نەدار . تێب ــ بەو مانایەیە کە ئەگەر هات و ماڵی بارکرد ئەوەندەی نیە قورسایی بخاتە سەر پشتی بارەبەر ● **کەرکوڵ و بارسووك** ــ (کن.) ، أ‌ــ هیچ ئەرکی بەسەر کەسەوە نیە . بــ نەدار و بێسامانە .

**بارسووككردن** ــ ( مصد. مت. ) ١ــ کەمکردنەوەی قورسایی باری ووڵاغ یا هەر هۆیەکی تری گواستنەوە . :: ئەم سەربارە داگرێ و هەندێ باری گوێدرێژەکە

سوك کەی باشە ، دەنا لەم هەورازە سەرناکەوێ . ٢ـ کار لەکۆڵ کەسێ کردنەوە ، تەکلیف لەسەر لابردن ئەرك کەمکردن . :: ئەگەر ئەم دەفتەرەیان تۆ بێنوسێتەوە بارم سوك دەکەی،خۆزگە دەڕۆیشتن و باریان سوك دەکردێ .

**بارسوکی** ـ [بارسوك +٢ـ ێ]، (حمصـ.) ، (کنـ.) ١ـ بێ ئەرکی ، بێ تەکلیفی . ٢ـ بێ زەحمەتی ، بێ دەردیسەری :: ئەگەر ئیمڕۆ ئیشەکانت تەواوکەی بارسوکییە بۆ بەیانی . چابۆ ئەمەش بارسوکییەکە بۆ شاسوار .

**بارشت** ـ (نمصـ.) ، تم : بارێن :: وادیارە ئەو شۆ هەوای بارشتی هەیە .

**بارکردن** ـ (مصت . لا. ) ١ـ خۆسازکردنی کاروان و (بار) خستنە سەر پشتی وولاغان★ بار لێنان . ٢ـ کۆچ کردنی ماڵێك یا خەڵکی شوێنێك لە جێگەیێکەوە بۆ جێیەکی دێ :: ماڵی مام برزۆ دوێنێ باریان کرد . دە ڕۆژی تر باردەکەین دەچێنە هەواری . □ « ماڵم لێرە باردەکا ، دەچمە دار و بێداری + هەرکەس تۆی ناوێ بەردی لێباری » ( فۆلکلۆر ) ٣ـ (مجـ .) موتلەقی گواستنەوە و ڕۆیشتن . ٤ـ (مصت . مت .) ، (کنـ .) زیاد لە توانستی خۆی کار بە کەسێ ئەسپاردن بۆ جێبەجێ کردنی .

**بارکەوتن** ـ ( مصت . لا. ) ١ـ کەوتنەخوارەوەی بار لەسەر پشتی وولاغ. ٢ـ (مجـ.) تۆشی ناڕەحەتی (ماددێ و مەعنەوێ) و بەڵابۆن و لە ئەنجاما لەناو کۆمەڵدا بێ قەدربۆن .

**بارکەوتۆ** ـ [١ـ بار/١ + کەوت (کەوتن) + ٢ـ ئۆ ] ، (صمف .) کەسێك باری کەوتبێ ( تم : بارکەوتن/٢ ) ★ بارکەوتە .

**بارکەوتە** ـ [١ـ بار/١ + کەوت (کەوتن) + ٢ـ ئە/٦ ] ، (صمف. ) تم : بارکەوتۆ .

**بارگران** ـ [١ـ بار/١ + گران]، (صت .) ١ـ حاڵی بارەبەرێکی باری قورس بێ . ٢ـ ( مجـ. ) ، أ) ئادەمیزادی تەمبەڵ . ب) ژنی زگپڕ .

**بارگرانایی** ـ [ بارگران +ئایی/١] ، (حمصـ ) ئەو ئەنجامەی بارێکی گران ( ماددێ و مەعنەوێ ) لە ئینسان یا گیانلەبەرێکدا بەدێ دێنێ .

**بارگرانی** ـ [ بارگران + ٢ـ ێ ] ، ( نمصـ.) ١ـ کەلوپەلی زۆر دەگەڵ خۆ بردن بۆ سەفەر و ... :: کوڕە جا بۆ دۆ ڕۆژ ئەم هەمۆ بارگرانییەی بوچییە ؟ ٢ـ کاری ئەرك و تەکلیفی زۆر خستنە سەر کەسێ :: ئەگەر بۆتان نابێتە بارگرانی ئەم جانتایەم بۆ دەگەڵ خۆت ببە بۆ فەرامەرز .

**بارگە** ـ [ ١ـ بار/١ + گە (جێگە) ] ، (نتـ.) کەلوپەلی سەفەر، ڕاو ، شەڕ و ...و... چەشنی ئازوقە ، نوێن ، جلوبەرگ ، تفاقی چێشتلێنان و ...و... کە جاران دەخرایە ناو خورجێنێکی گەورەی

تایبـــەتی و بـــارزگان و پیـــاوی دەســـــتڕۆیو و میرەکـــــانی کوردستان، دەگەڵ خۆیان دەیانبرد

**بارگەتێکنان** ــ [ بـارگە + تێك ( دەیەك ) + نان (فعـ.) ] ، (مصد. مت.) سازکردن و پێچانەوەی ئەو کەلوپەل و شتومەکانەی دەگەڵ خۆ دەبرێن بۆ سەفەر. □ «کە بارگەت بـۆ هەوار تێکنا عەزیزم + شـکا ئەستوندەکی تاوڵی مرادم »
(هێمن)

**بارگەچی** ــ [ کو : بارگە + تو : چی ] ، ( نت. ) ، کەسـێکی کاری ئـــەوەبێ بارگـــە ســـــازکا و بێپێچێتەوە و کە گەیشتنە مەنزڵ کەلوپـــەلی پێویســـــت دەربێنێ ، خاوەنی بارگە هەرچی لازم بۆ لەوێ داوادەکا و مشوری ئەو شتانەش دەخوا کە دەبڕێنەوە . تێب ــ لـــە دیوەخـــانی دەرەبـــەگ و میرەکانی کوردستـان ، یەکێك بە تایبەتی بۆ ئـــەم کـــارە تـــەرخان دەکرا ، کاربەدەســـــتان و گەورەپیـــــاوانی دێوان و پیـــاوانی دەولەمـــەند و دەستڕۆیویش بارگەچیان هـــەبوە ، ئاشکرایە ئێستـــا ئـــەم کارە بەلاوە نراوە .

**بارگەوبنە** [بارگە + و + بنە /٢]، (نت.)، (مک.) هەمو کەلوپەلی پێویست بۆ سەفەرێـکی کاتـــی هیندێك دوورودرێژ ، کە کەسێ یا کەسانێ دەگەڵ خۆیان دەیبەن .□ «بابم حاکم بۆ لـــە ئیسفەهـــانێ ئەمنێتیان تەڵەب دەکـرد حوکمـم دەهاتەوە سەرە ، تەدارەکم دەگرت بارگە و بنـــە ، چـــەندم ڕەنگیـــن دەکردنەوە نۆکەرە » ، (تحفە ، ج ٢، ل ــ ٢٨٠ ) .

**بارگیر** (نت.) ، تم : بارگین .

**بارگین** [ ١ ــ بـار/١ + گـــین (گیر) ] ، (نت.) ، (مک. ، سن. ، کمر.) ١ــ ئەسپێکی یەختە کرابێ و بۆ بارهەڵگرتن کەلکی لێ وەربگیرێ. ٢ــ ئەسپ . ٣ــ (مجـ.) جنێوە بـــە مانای : بـــێ ئەقـــڵ و حـــەیوان ، پەخمە و بێکارە و ئەگەر بە توڕەیی نەگوترێ لە دڵان زۆر گران نایێت . :: ئەم کابرایە هەر دەڵەی بارگینە کوڕە بڕۆ هەی بـــارگین ★ (بکـ.) بەرگیر . بارگیر ( تم : ژابا ــ ٣٤). (جنو.) یابو .

**بارلینان** [١ــ بار/١ + لێ ( لە + ی ) + نان (فعـ.) ] ، (مصد. مت.) تم : بارکردن/١ .

**بارمتە** [٤ــ بار + متـــە ؟ ] ، (نت.) ئەو شتەیە کە لەباتی هەقیلای کەسێ بە گرێو دادەندرێ ، یا یەکێك لەباتی هەقی خۆی لـــە کەسێـــکی ئەوســـــا لێی وەردەگیرێتـــەوە یـــا گلدەداتەوە ، تا هەقەکە دەدرێتەوە ئەوســـــا لێی وەردەگیرێتـــەوە یـــا دەیداتەوە .تێـــب ــ ئەم ووشـــەیـــە وەکو لە سەرەوە نیشان دراوە لـــە دو کەرت پێکهاتوە ، کەرتی دوەمیان کە (متە)یە لە موکریان بەو (گوێز) یا ( پارە )یە دەڵێن کە لـــە یـــاری ( مێشێن = موشێن )دا دادەکرێ ، من بۆ ئەوە دەچـم ئەسڵـــــەکەی (متاع)ی عەرەبی بێ و جەڕاوبێ .

**بارنامە** [١ــ بار/١+نامە]، (نت.)،

(کنێر.) نامە یا کاغەزێکی چاپکراوی تایبەتییە ، ئەوەی (بار) بەڕێ دەکا بۆ ئەو کەسەی دەنوسێ کە بارەکانی بۆ دەچێ ★ ( کعر.) سەرتەمێ . تێب ـ ئەم کاغەزە دەدرێتە دەستی چاروێدار یا شۆفێر و تێیدا دەنوسرێ کە چەند باری بۆ ناردوە و بۆ هەر (واحیدێکی کێش ) دەبێ چەندێ کرێ بدرێتێ و چەندێشی پێشکرێ دراوەتێ .

**بارنەبردن ـ** (مصت. لا.) ١ـ قبوڵنەکردنی وولاغێك کە باری لێ بندرێ ، جا لەبەر چەموشێ بێ یاخۆ لەبەر لاتێ و کەنەفتێ . ٢ـ (مج.) بە کەڵکی کار نەهاتنی ئینسانێك .

**بارنەبەر ـ** [١ـ بار/١ + نە (ئم : نەفی) + بەر (بردن) ] ، (صت.)، ١ـ حاڵی وولاغێکی قبوڵ نەکا باری لێ بندرێ یا لەبەر لاتێ و لەغەری باری پێ هەڵنەگیرێ. ٢ـ حاڵی کەسێکی تەمبەڵ و بێکارەبێ . ★ بارنەوەر.

**بارنەوەر ـ** (صت.) تم : بارنەبەر.

**باروبارخانە ـ** (نت.) ، (مک.)هەمو ئەو بارە کاڵا و شتومەکەی بە کاروان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك دەگوێزرێتەوە و زیاتر بە ناوی خاوەنەکەی هەڵدەدرێ . :: باروبارخانەی میرزا حاجی لە مەسکەوێڕا گەیشتە جێ . باروبارخانەی حمە قەددۆی مۆسڵێش وانابێ .

**باروبنە ـ** [ ١ـ بار/١ + بنە/٢]، (نت.) ، (مک.) تم : بنەوبارخانە .

**باروبۆ** (نت.) ، (کعر.) تم : باربۆ.

**بارۆگ ـ** [١ـبا/١ + ڕۆگ ؟ ] ، (نت.) ، (مک.) شوێنێکە (با) زۆر بێگرێتەوە . تێب ـ ڕێی دەچێتێ کەرتی ( ڕۆگ )ی ئەم ووشەیە یا ( ڕۆگە ) بێ یا لە ( ڕۆشاندن ) وەرگیرابێ .

**بارهەڵگر ـ** [١ـ بار/١ + هەڵگر ( هەڵگرتن ) ] ، (صت.) ١ـ حاڵی وولاغێکی بار قبوڵ کا یا وەختی ئەوەی هاتبێ باری لێ بنێن . ٢ ـ (مجـ.) کەسێکی نازەحەتێ و زەحمەتێ بۆ قبوڵ بکرێ ، دەنازەحەتیدا هەڵبکا.// بارنەبەر.

**بارهەڵگرتن ـ** [١ـ بار/١ و ٣ + هەڵگرتن]، (مصت.لا.) ١ـ تم : باربردن . ٢ـ (مج . ) توانابونی کەسێك بۆ جێبەجێکردن و ڕاپەڕاندنی فەرمانێك و کارێك. :: ئەم بارە قورسە چۆن بەو منداڵە بەستەزمانە هەڵدەگیرێ ( ئەم ئیشە گرانە چۆن بەو منداڵە دەکرێ ) .

**بارە ـ** [٢ـ بار+٥ـئە/١] ،(نت.) تم : بابەت/٣ . تێب ـ ئەم ووشەیە بە تەنیایێ دەکار ناکرێ ، یا (لەبارەی . . ) دەوێژرێ یا (**دەربارەی** . . .) کە ئەمەی دوایێ زیاتر فارسییە تا کوردێ . :: دەربارەی شێرکۆ دڵتان هێچ خەتەرە نەکا . لە بارەی ( خانێ ) شاعیری گەورەی کورد زۆر شت نوسراوە .

**بارەبەر ـ** [١ـ بار/١ + ٣ـ ئە/٢ + بەر (بردن)] ، (نت.صت.) ١ـهەر وولاغێ کە باری لێ بندرێ .::

بارەبەرمان هەر ئەو گوێدرێـــژەیە
**١ــ بارەپێمەڕە** [١ــ بار/٢ +٣ــ ئە/٢ + پێمەڕە] ، (نتـ.) ، ( مکـ. ) ئەوەندە قوڕ یا خۆڵە کە بە جارێك ( پێمەڕە ) هەڵیدەگرێ . :: چەند بارەپێمەڕە قوڕ دەو قوڵکەیەکەن بـا پڕبێتەوە .
**٢ــ بارەپێمەڕە** [٢ــ بار/١ + ٣ــ ئە/٢ + پێمەڕە ] ، (نتـ.) ، (مکـ.) بچێتە خوارەوە . :: قوڵکەیەك لـە هۆ و قولینچکە هەڵقەنن دوو ســێ بارەپێمەڕە قوڵ بێ .
**بارەقەڵلا** [ محر. عا.] ( ڕستە )، (مکـ.) تم : بارەکەڵلا .
**بارەکەڵلا** [ = عا : بارك‌الله ] ، ڕستەیەکە بە مانای ئافەرینی خوات لێبێ ، بۆ هاندان و قەدرزانـــین بەکاردێت . ★ بارەقەڵلا .
**بارەکێ** [١ــ بار/١ + ١ــ ئـەك /١ + ٣ ئێ ] ، (صـتـ.) حـــاڵی وولاغێکی هاتبێتە ئەوەی بتـوانــێ بار هەڵگرێ ، بـــەڵام هێشتـــا نەهێنرابێتە بەربار . :: ئێـــسترە زەرد بارەکێ بوە ( وەختی ئـــەوەی هاتوە باری لێ بندرێ ) .
**بارەگا**
[ بار + ٣ــ ئە/٢ + گا (جێگە)]، (نتـ.) ، ١ ــ کۆشـك و ســەرای پاتشایان. ٢ــ دیوەخانی پاتشایان و ئەمیران ، کە وەزیر و کاربەدەستانی گەورە لەولاولای پاتشا دادەنیشتن و هەرکەسێ کارێکی هەبا و پاتشـــا ئیجازەی دابا ، دەهـــاتە ژوورێ و قسەی خـۆی دەکرد ★ ( کئێر.) دەربار . ( کمر.) بیلات (بلاط) ٣ــ ( نتـ. ) جێگای پارتی سیـــاسێ و نەقابە و یەکێتێ و تیپی وەرزش و یاریێ (فوتبۆل و . . ) . تێب ــ ئەم ووشـــەیە بـــەلای منەوە ئەســـلی فارسییە و ( بارگاه )ە و وای بۆ دەچم کە لــە ڕێگەی (شـــانامە) و ( ئەســـکەندەرنامە ) و ئـــەو جۆرە چیرۆکانە هاتبێتە ناو زمانی کوردیێ و شـــێوەی کوردیێ وەرگـــرتبێ . ووشـــەی ( بـــار ) لە تەرکیبی ئـــەم ووشـــەیەدا فارسیێ بە مانای (ئیجازە، ئیزن ، ڕوخســـەت ) دەکاری دەکا ، بە دوورێشی نازانم کە لــە ئەسلی پەهلەویێ بە مانای ( بەرز ، بلیند )ە وەرگـــیرابێ ، ئـــەگەر ئـــەوەیان قبـــوڵ‌کەین ووشـــــەکە دەبێتـــە ووشـــەیەکی کە فارسیێ لــە کوردیێ وەرگرتوە ، تەنیا شتێك وام لێدەکا کەمتر بۆ ئـــەم لایـــەی داشـــکێنم ئەویش ئەوەیە کە نـــەمدیوە زمانی پەهلەویێ ووشـــەی (بارگا) یا (بارەگا)ی تێدابێ .
**بارەنداز** ــ [ ١ــ بار/١ + ٢ــ ئەنداز] ،(نتـ.) ، (کئێر.) بەربێلایەکە لە خـــان و کاروانســەرایان دروستێ دەکەن ، کاروانچێ بارەکانیان لەوێ دەخەن ، تا بەفر و باران و هەتاو لێیان نەدا . تێب ــ کەرتی (ئەنداز) لــە مەصــدەری ( هـــەنداختەن ) پەهلەویێ وەرگێراوە ، کە لە زمانی کوردیدا شکلی گۆڕاوە ، و بە مانا پەهلەوییەکەیەوە بۆتە (هاوێشتن ، ئاویشتن ) ، زمانی (فارســـێ )ش ئەم ووشـــەیەی بـــە شـــێوەی (ئەنداختەن) وەرگرتوە . ئـــەم بڕە

ووشـــەیەکە لـــە تـــەرکیبی چـــەند ووشـــەیەکی دێـــکەی کوردیشـــدا وەکو : تیرەنـــداز ، چاوەنـــداز ، سەرەنداز و....و.... دەبێندرێ .

**بارەنگێو** ــ [١ــ بار/١ + ئەنگێو (ئـــەنکاوتن) ] ، ( صت. ) ، (مک.) چلۆنایەتی شوێنێکە لە ڕێوبانان کە بەردێکی گەورە ، بەرزایی زەوی ، قەدپاڵی کێو یـــا لقوپۆپی داران لە باری وولاغ بدات .

**بارێ** ــ [= فر : بارێ (جارێك)] ، (بنت.) ، (کئێر.) ، هەرچۆنێ بێ ، کەوابو ، بە هەرحاڵ .

**بارێك** ــ [ پە : بارێك ] ، (صت.) ١ــ حاڵی هەر شتێکی پانایی کەم و درێژایی زۆربێ // پان . □ « پردی سیڕاتی لە مو بارێکتر و لە ئەڵماس تیژترە » . ٢ــ حاڵی هەرجیسمێکی قوتر ( قطـــر )ی پچـــوك بـــێ // ئەستور . □ « کوچەی فـــەیزاوا تەنگوتارێکە + ماتیشقەی ڕوسی ناوقەد بارێـــکە » (فۆلکلـــۆر) . ● **مل لە مو بارێکتر** ــ (کن.) زۆر گوێ لە مست و مطیع . ٣ــ (مج.) لاواز ، لەغەر ★ (بکـ.) زراف .

**بارێکان** [بارێك/٢ + ٢ــ ئان/٧]، (نت.) بەنێکی بەدانستە و بـــارێـــك ڕێسرابێ . ● **بارێـــکان دەڕێسێ** ــ ا) بە تەشی خوری دەکاتە بەنێکی بارێك . ب) ، (کن.) قسەکانی زۆر درێژ دەکاتەوە، هەر لێی نابڕێتەوە، زۆر ڕێنگەڕێنگ دەکا .

**بارێکـــایی** [ بارێك ٢/١ + ئـــایی /١ ] ، (نت.) ئەو شوێنەی شتێ کە لە جێگاکانی تری کەمتر ئەستـــور بێت . :: دارەکە لە بارێکاییەکەیڕا ببڕنـــەوە .

**بارێك و بنێسێ** (نتم) ، (کمر.) ، ١ــ لاوازێکی لەبەر نەخـــۆشی زۆر درێژ کە تـــوشی کەســـێك دەبێ و ڕۆژبەڕۆژ کزتر و زەبۆنتری‌دەکا . :: خدر لێی پێسی‌کردوە و داویەتە بارێك و بنێسێ . ٢ــ تە : ١ــ ئازار ( ئازاری سیل ) ★ ( مک. ) بنێسێ . صەبنێسێ . ( جنو . ) بارێکو .

**بارێکە** [ بارێك/١ + ٥ــ ئە/٢]، (نت.) ١ــ درۆمـــانی پـــەڕاوێزی جلوبەرگ . ٢ــ(مج.) خۆشاردنەوە، خۆدزێنەوە ، پێدزکێ . :: بارێکەی دایە و بـــۆی دەرچو . ٣ــ نـــاوی دێیـــەکە لـــە دەوروبـــەری شـــاری سلەیمانی .

**بارێکەڕێ** [ بارێك + ٣ــ ئە/٢ + ڕێ ] ، (نت.) ، ڕێگایەکە تەسك و خۆش‌نەکراوبێ بەلام هاتوچۆی پێدا بکرێ

**بارێکی** [ بارێك + ٢ــ ئی ] ، ( نت. ) موتڵەقی بارێکایی . ( تە : ئەستوری ــ تێب. ) .

**بارین** [ پە : ڤارێتەن ] ، (مص. لا.) ١ــ هاتنەخوارەوەی بـــاران ، بەفر و تەرزە لە هەورانڕا بـــۆ سەر زەوی . ٢ــ (مج.) هـــاتنە خـــوارەوەی هـــەر شـــتێك لە بڵیندایێکی نیسبی‌ڕا بۆ سەر شوێنێ یا کەسێ . :: گوللە وەك تەرزە بـــە سەرماندا دەبارێ ★ ( بکـ. ) بارین . تێب ــ لە زمـــانی ئاوێستـــاییدا ( ڤارێنگتی ) بە مانای ( دەبارێ )

هاتوە ( تم : ژابا ــ ٣٤ ) .

**باریە** [ ؟ ] ، (نا.) ، ئامرازێکە بۆ جوڵاندن و بەرزکردنەوەی شتی قورس لە شوێنی خۆی . تێب ــ ئەم ئامرازە لە ساکارترین حاڵەتیدا تێلایەکیدار ، یا ئاسنێکی ئەستورە کەسەرێکی تۆزێ دەکوترێتەوە و هێندێ پان دەکرێ و برێکیش دەشکێندرێتەوە بە جۆرێکی ئەوتۆ زاویەیەکی کراوەوە (منفرجة) دروستدەکات . تێب ــ لە کاتی تێشپێکردندا سەرە پانەکەی دەخرێتە ژێر ئەو شتە قورسەی کە مەبەستە بجوڵێندرێ . لەو کاتەدا دێوی دەرەوەی زاویەکە دەبێ لەسەر جێگایەکی پتەو ڕاوەستێ ــ لە (فێزێك )دا بەم شوێنە دەگوترێ ( نقطة انکاء ) ــ ئەوجار باسکە درێژەکەی بۆ لای خوارەوەدادەگرن و بە هێزێکی کەم قورساییەکی زۆر دەجوڵێنێ . ئارشیمیدۆس زانای بەناوبانگی یۆنانی گوتویە : « ئەگەر ( نقطة اتکاء )یەکم دەستکەوێ ، زەوی لە جێی خۆی دەبزوێنم » . ★ (کێێر.) ئەهرەم ( فارسییە ) . (سنـ.) چلمێردە ، لۆسە ( هس . لەوازە ) . نوێڵ .

**١ــ باڕ** [ ؟ | ، (صـ.) ناکامڵ ، پێنەگەیشتو . جحێڵ . تێب ــ ا ) ئەم ووشەیە تەنیا بۆ پەلەوەر و باڵندە بەکاردێ کە دەوری ( زەڕنەقۆتەیێ ) تەواوکردبێ بەڵام هێشتا نەبۆبێتە باڵندەیەکی کامڵ و سەر :: باڕەکەو ، باڕەهەوێردە ، باڕۆکە . □ « قەل بە صەت ساڵ باڕە » . ب) وا دەزانم ئەم ووشەیە دەگەڵ ( پورنای ) زمانی پەهلەوی خزمایەتێکی هەبێ کە بە مانای جحێڵ و ناباڵقە .

**٢ــ باڕ** [ ئینگلیسی ] ، ( نا. ) ئەو شوێنەیە کە بۆ فرۆشتنی خواردنەوەی ئالکۆلدار (مشروبات) بەرخاندەکرێ و خەڵکی لە بەردەم پێشخوانێك بە پێوە ڕادەوەستن و دەخۆنەوە و هێندێجاریش لەسەر کورسی بڵیندی تایبەت دادەنێشن .

**باڕاندن** [ ند.] ، (مصـ. لا.) دەنگی خۆدەرخستنی ئاژاڵ :: بزنەکە دەباڕێنێ . ★ باعاندن . ( سنـ. ) باقاندن .

**باڕن** [ ٢ــ با/١ + ڕن (ڕنین )]، (نتـ.) کرێوەی بەفر بێ ئەوەی لە هەوران بباریێ ، بەڵکو بایەکی بە قەوەت لە شوێنێکەوە بەفر هەڵدەگرێ ( دەیڕنێ ) و بۆ بەرزایی دەبا کاتێ دەگاتە جێگایەکی وا کە بایەکە تەووژمی کەمە دەبارێتەوە سەر زەوی و چەشنی کرێوە دێتە بەرچاوان . :: بەرخی بابم ئەمە کرێوە نیە باڕن دەکا .

**باڕۆکە** [ ١ــ باڕ + ئۆکە ] ، ( نتـ. ) مریشکێکی هێشتا گەورە نەبۆبێ ، فرۆجێکی کەوتبێتە هێلکەکردن . □ « ... بۆکە بەبارانی دەوێ ، هێلکەی باڕۆکانی دەوێ » ( فۆلکلۆر ) .

**باڕۆت** [ ؟ | ، (نا.) ، ١ــ ماددەیێکی ووشکی ڕەشە کە ئاگری وێکەوت کڵپە دەکا ، بۆ هاوێشتنی گوللەی تۆپ ، تفەنگ ، تاپۆ و ...

و . . . بەکاردێت . تێبـ ــ أ ) ئــەم ماددەیە گەردوتۆزێـکی ڕەشــە ، جاران نێچیرەوانـانی کورد لــە ( شۆرە ) و ( گۆگرد ) و (ڕەژی) دروستیان دەکرد ، چاکترین خەڵوز بۆ ئەم کارە (ڕەژی دارەبی)یــە . ب) بۆ تاقیکردنەوەی چاکی و خراپی بارۆت ، تۆزێکی لەسەر لەپی دەست یا پەڕە سپیفار زۆ دەکەن و ئاگری جگەرەی لێ نێزیك دەکەنەوە ، کڵپە دەکا و دەچێ بە عاسمانا ، ئــەگەر پەڕە سپیفارەکە یا بەری دەســتی نەسووتاند ئەوا بارۆتی چاکە . ★ (مک.) دەرمان . بارۆتی ڕەشۆکی . ٢ــ ( مجـ.) پیاوی توندە میجاز کە زۆ تۆرە دەبــێ و هەڵــدەچێ .

**بارۆتی بێ دوکەڵ** ــ ( نتـ.) جۆرێك بارۆتە کە لە فابریقــە دروســت دەکرێ و ڕەنگی سپی واشە . تێبـ ــ ئەو ماددانەی کە ئەو جۆرە بارۆتەیان لێدروست دەکرێ هەر ئەوانەن کە بۆ دروستکردنی بارۆتی ڕەشۆکی دەستدەدەن ، لە باتی شــۆرە جەوهەری شۆرە (ئەسیدنیترێك) و لە باتی گۆگرد جەوهەری گۆگــرد ( ئەسیدسۆلفۆرێك ) و لە بــاتی خەڵوزێش ماددەیەکی (سیلۆلــۆز)ی لە بابەتی ( لۆکە ) دەکاردەکرێ ★ بارۆتی سپی . **بارۆتی ڕەشۆکی** ــ [ بارۆت /١ + ١ــ ئی/ + ڕەش + ئۆك/١ + ٣ــ ئی ] ، ( نتـ.) ، ( مک.) تم : بارۆت /١ **بارۆتی سپی** ــ (نتــ.) ، (مکــ.) تم : بــارۆتی بێدوکەڵ .

**بارۆتپێژ** [ بارۆت /١ + پێــژ ( پێژتن ) ] ، ( صفا.) ( بکـ.) ئــەو کەسەی بــارۆت دروســتدەکا . تێبـ ــ لە لەهجــەی ناوەنــدی و بن لەهجەکانێدا هــــاوتای ئــەم ووشەیەم نەبیستوە .

**بارۆتخــــانە** ( نتـ. ) ، ( کمر. ) جێگایەکی تایبەتییــە چــەك و تەقەمەنی و کەرەستەی شەڕی تێدا دادەنێن ، عەمباری تەقەمەنی . ★ ( کئێر.) جبەخانە ، قۆرخانە .

**بارۆتی** [ بارۆت /١ + ٣ــ ئی]، ( صتـ.) ، (مک.) تۆچــای وورد ، چایەکی وەکو بارۆت ووردبێ .

**بارۆشــــە** [ ٣ــ با/١ + ڕۆش ( ڕۆشاندن ) + ٥ــ ئە/١ ] ( نتـ. ) ، ( سنـ.) تم : باوەشێن .

**بارە** [ ند. ] دەنگی مەڕ و بزن ★ باعە . بالە .

**بارەبار** [ ند.] ، ١ــ دەنگی یــەك لە دوای یەکی ئاژاڵ . ★ باعەباع، بالەبال . ٢ــ (مجــ.) قێژەقــێژ و هەرای زۆری ئادەمیزاد . :: بــە بارەبار کابرایان لە ماڵی دەرهێنا و کوشتیان . هەر بارەباری بۆ کەس گوێی نەدەدایە .

**بارەش** [ ٣ــ با/١ + ڕەش ] ، ( نتـ. )؛( کمر.) تم : ڕەشەبا .

**بارەکەو** [١ــ بار + ٣ــ ئە/٢ + کەو ] ، ( نتـ.) بەچــکەی کەو کــە هێشتا سەرنەبــوبێ ، کــەوی پچوك ساڵ .

**١ــ بارێزە** [ ؟ ] ، ( نتـ.) ، (هلـ.، خۆشناوەتی ) ، گیایەکە لاســکی درێژ و ڕەش باوە ، گەڵای وورد و سێ گۆشەیە ، وە کەرەوز دەچــێ ،

لە شاخان لەو شوێنانەی کەمێ ئاویان هەیە ، شێن دەبێ . تێبـ ـ لە کوردستان ئەم گیایە بۆ نەخۆشی (مێزگیران) کەڵکی لێ وەردەگیرێ و دەڵێن یەکاو یەکە . □ « بارێزە شێنبۆن بە شاخانەوە + با گوڵە بمرێ بە داخانەوە » ( فۆلکلۆر ) . ★ خاڵەڕەش ، خاڵەڕەشە .

**٢ـ بارێزە** [ ٣ـ با/١ + ڕێز ( ڕێژ ) + ٥ـ ئە/١ ] ، (نت.) ، (مک.) بارانێکی بە ( با ) بباریێ :: وەکو بارێزە فرمێسکی بە چاواندا دەهاتە خوار .

**١ـ باز** [ پە : باچ ، باج ] (نا.) باڵندەیەکی گۆشتخۆری زوریای خێرایە ، نێزیکەی سێ چل سانتیمیتر درێژ دەبێ ، باڵی کورت و بارێکە ؛ دندۆکی خوارە و بەرسینگی پەڵەپەڵەی ڕەشی تێدایە . □ « سیا بازێك بۆم ، سیا بازێك بۆم لە ئەوجی گەردۆن ، تێژ پەروازێك بۆم» . ( پیرەمێرد ـ ٢٣١) تێبـ ـ أ ) ئەم باڵندەیە دەتوانێ مەلانی تر بە عاسمانەوە ڕاوکا ، بۆیە پاتشا و گەورە پیاوانی قەدیمی وەکو یەکێك لە کەرەستەی نێچیرەوانێ بەخێویان دەکرد و لە بارەگا و دیوەخانەکانیان کاربەدەستی تایبەتێ بۆ نیگاداریێ و خزمەتێ تەرخان دەکرا . ب) باز چەند جۆرێکی هەیە : تەوار ، تەڕلان ، جوڕڕە ، تۆلك ، فەرخ . ( تە : سجادیێ ، کوردواریێ ـ ١٥٦) ج ) «باز (باڵندەی ڕاویێ) و باشە (واشە) کە ئەویش باڵندەییێکی دیکەی ڕاوییە ، هەردۆکیان یەك مەعنایان هەیە و دەبێ لە (ڤەزە) بە مانای ( بڕندە )وەر گیرابێ کە ئەویش لە مەصدەری ئاوێستایی (ڤەز) یانی (بڕین) وەرگیراوە . » ( تە : معین ، بورهان ، ج ١ ، ل ـ ٢١٧ ، پەراوێزی ژمارە ٧ ) دوکتۆر معینیش ئەمەی لە ( پۆرداوود ) فەرهەنگی ئێرانی باستان ، ج ١ ، ل ـ ٣١٤ خواستۆتەوە ) . ★ قوش .

**بازی دەوڵەت** ـ (نت.) ، (باز)ێك بوە کە بە پێی چیرۆکە کۆنەکانی کوردەواریێ بۆ دیاریکردن و هەڵبژاردنی حاکم ، میر یا پاتشا هەڵیان داوە و لەسەر هەر کەسێ نیشتبێتەوە کردۆیانە بە گەورە و حوکمدار . ★ بازی یەقین .

**بازی هەوایێ** [ ١ـ باز + ١ـ ئێ /١ + هەوایێ ] ، ( نت.) ، (سن.) تە : بادەوە . **بازی یەقین** ـ (نت.)، (مک.) تە : بازی دەولەت . □ « سبحەینێ کە ڕۆژ کراوە ، مەجلیسی تاقیقی گیراوە ، بازی یەقینیانهێناوە ، هەردۆك چاوی بەستراوە ، هەڵیان ئاوێت ڕاوەستاوە ، لە هەوای لەنگەر بەستراوە ، سەربەرەژێر هات گەڕاوە ، ئیکلامی فەرخی کێشاوە » ( تحفە ، ب٢ ، ل ـ ١٤١/١٤٢) .

**٢ـ باز** [ پە : ڤاز ] ، (نا.) ، ١ـ بەگوڕ بەرزبۆنەوە لە شوێنێك و خۆ فڕێدانە شوێنێکی دیکەی دۆرتر . ئەنجامی بازدان . ٢ـ تە: سێباز ★ (مک.) بازد . (زا.) ڤاز.

( جنو.) واز . تێبـ ــ بە لای منەوە ئەسڵی ووشەکە (بازد)ە و دەنگی ( د ) یەکەم لەبەر قورسێ لەم شوێنەدا و دوەم چونکو دەگەڵ مەصدەری ( دان ) سەرف دەکرێت ، لەسەر زمانان سواوە.

**٣ــ باز** [ ؟ ] ، ١ــ (نا) ڕێگای تایبەتێ کە دەستەبەك بۆ ئێشێکی دیار پێیدادەڕۆن :: بازی بێریان ، بازی پاڵان (پاڵە) ٢ــ ( پـ.) بە دوای هەندێ ناوانەوە دەلکێ و مەدلولی تێپەڕین و عبور لە ماناکانیان زیاد دەکا. :: ڕێباز ، دەرباز ، بەردەباز، پردەباز . **بازیبێریان** ــ [ ٣ــ باز /١ + ١ــ ئێ/١ + بێری + ٢ــ ئان/١ ] ، (نت.) ئەو ڕێگایەی هەمۆ ڕۆژێ ( بێریێ ) بۆ مەڕدۆشێن پێیدا دەڕۆن . □ « بازی بێریان دۆرەدێیە + بێرێ دێن شێر مەشکیان پێیە » ( فۆلکلۆڕ ) .

**٤ــ (ــ باز)** ، (پـ.) ، ١ــ بە دوای هەندێ ناوانەوە دەلکێ و دەیانکاتە ( صفا. ) یا (نفا.) و نیشان دەدا ئەو کەسەی ئەم صفەتەی وەپاڵ دەدرێ یا ئەم ناوەی لێ دەنرێ ، لەو ئێشەدا کە مەدلولی ناوەکەیە ماهیر و لێزانە یا خۆی پێوە گرتوە :: حیلەباز ، جادۆباز ، فێڵباز ، قوماربـاز ، کۆترباز ، مێباز . ٢ــ بە دوای هێندێ ناوانەوە دەنوسێ و مانای دۆڕاندن ، بەخت‌کردن و فیداکردنیان لێ زیاد دەکا .:: سەرباز ، (ئەو کەسەی سەری خۆی بەخت‌دەکا . ) گیانباز (ئەو کەسەی گیانی خۆی لە پێناو شتێکا فیدادەکا ) .

**بـازاڕ** [ پھ : ڤاچار ] ، ١ــ جێگای کڕین و فرۆتنی کەڵوپەل و کاڵای جۆراوجۆر . تێبـ ــ شوێنێکە وەکو کۆڵان ئەوبەرەوبەرەکەی دوکان و موغازەی زۆری لێ دروست‌کراوە ( ئەگەر سەری داپۆشرابێ پێی دەڵێن قەیسەرێ ) بازرگان و کاسبکار یا ووردە سەنعاتکاری وەکو جلدرۆ ، چەخماخساز ، ئاسنگەر و ... و ... هەریەکە لە دوکانێکدا کاڵای خۆیان دادەنێن و دادەنیشن تا خەڵکێ بچن لێیان بکڕن یا خەریکی سەنعاتەکەی خۆیان دەبن . لە شارانی گەورەدا هەر سنفەی بازاڕی تایبەتێ خۆی هەیە :: بازاڕی شێرگەران ، بازاڕی کەوشفرۆشان بازاڕی بەزازان . ٢ــ مەیدان یا هەر جێگایەکی بەرین لە شاران کە لادێیی هەمۆ ڕۆژێ کاڵای لادێییانەی خۆیان وەکو : دار ، خەڵوز، ماست، ڕۆن، سەوزەگیای خواردن ، ئاژەڵ و پاتاڵ دێنن و لەوێ دەیفرۆشن . تێبـ ــ ئەم جۆرە شوێنە زیاتر بە مەیدان ناودەبرێن. :: مەیدانی ئاردی ( لە مەهابات ) ، مەیدانی ماستفرۆشان ( لە سلەیمانێ ) و ... و ... بەڵام وەبەر مەدلولی بازاڕ دەکەون و لە ڕاستیشدا هەر ( بازاڕ )ن . ٣ ــ هەمۆ ووردە بازاڕەکانی لە شارێکدا هەبن :: بازاڕی بەغدا ، بازاڕی تاران ، بازاڕی تەورێز ٤ ــ (مجـ.)

سەودا و موعامەلە ، کاری کڕین و فرۆشتن :: ئیمڕۆ بازاڕ نیە ، خولاّ بازاڕت بدا . ٥ـ جێگایەکی لە نێوان چەند گوندانداا کە ناوبەناو ( هەفتەی جاریّ ، ١٥ ڕۆژ جاریّ . . . ) لادێیی دەوروبەر و کاسبکارانی شارێکی نێزیك ، بە خۆیان و کالاّ و کەلوپەلیانەوە لەویّ کۆدەبنەوە و لە بەیانی‌ڕا هەتا ئێواریّ خەریکی کڕین و فرۆشتن دەبن و ئێواریّ هەرکەسە دەگەڕێتەوە جێگای خۆی ، لەو جۆرە بازاڕانەدا گۆڕینەوەی کالاّ بە کالاّ ( المقایضة )ش شێوەیەکی کڕین و فرۆتنە کە وێرای کڕین بە پارە ، باوە . تێب ـ أ) دوکتۆر معین دەربارەی ووشەی بازاڕ دەلّیّ : « لە پەهلەویدا ( ڤاچار ) ، لە پارسی کۆنا ( ئەباجاری )یە کە پێکهاتوە لە ( ئەبا ) لە سانسکریتیدا ( سەبهە ) بە مانای ( شوێنی کۆبونەوە ) و کەرتی دوەم مەصدەری ( جەڕی )یە بە مانای ( لەوەڕان ) ، » تم : معین ، بورهان ، جـ ١ ، ل ـ ٢١٨ ، پەراوێز ) . ب ) ئەو چەشنە بازاڕەی لە ژمارە (٥)دا باس‌کرا ، بە لای منەوە ئیّ ئەو سەردەمانەیە کە هێشتا (شار) دروست نەبون و ڕەنگە بیری کۆبونەوەی خەلّکی هەمە ڕەنگە لە جێگایەك و پێکەوەنانی ئاوەدانییەك بە ناوی شار ، هەر لەم چەشنە بازاڕانەوە پەیدا بوبیّ و پاش سازبونی ( شار )انیش ، بازاڕەکان هەروا مابنەوە ، لە لەهجەی باکوری زمانی کوردیدا ( باژێڕ ) بە ( شار ) دەلّێن . ج) لە مێژوودا هەندیّ بازاڕانی ژمارە (٥) ناوبانگیان دەرکردوە : سوق عکاظ ( لە مەککە ) ، سوق الاهواز ( لە ئەهواز ) ، بازاڕی مەکارە ( لە ڕۆسیای قەیسەریّ ) . د ) لە کوردستان خۆشمان ئەو جۆرە بازاڕە هەبون و تا شەڕی دوەمیش لە دەوروبەری شاری مەهابات ( بازاڕی قەباکەندیّ ) و ( بازاڕی مەحمەد یار )ی هەر مابون . هـ ) ئێستا پێشانگەکان ( المعارض )ـکە هەمو سالیّ ئەغلەب دەولەتان دایدەنێن و دەولەتانی دیکەش هاوبەشیّ دەکەن و کالاّی خۆیانی تێدا پێشان دەدەن تا ئەندازەیەك جێگای شێوەی سەرەتایی (بازاڕ /٥ )یان گرتوتەوە . :: پێشانگەی دەولیّ بەغدا ( عێراق ) . پێشانگەی دەولیّ دیمەشق ( سوریا ) . پێشانگەی لایپزێك ( ئەلمانیای دیموکرات ) . ★ (بکـ. ، جنو. ) بازاڕ . ( هلـ.) باژێڕ . **بازاڕی خۆش** ـ (نتـ.) بازاڕێکە سەودا و مامەلەی زۆری تێدا بکریّ ★ بازاڕی گەرم . **بازاڕی کەساد** ـ [ کو. عا. ] ، ( نتـ.) بازارێکی کڕین و فرۆتنی کەم بیّ ، بازاڕیّ ڕمێنی‌لەسەر نەبیّ **بازاڕی گەرم** ـ ( نتـ.) ١ ـ تم : بازاڕیّ خۆش . ٢ـ هاتوچۆی زۆری خەلّك بۆ شوێنیّ . تێب ـ ئەم مانایە تەوس و تانوتی تێدایە و بۆ مەبەستی ( سەلبیّ ) بەکار دێت. :: حەمەشەل

ئیمڕۆ بازاڕەکەی گەرمە . **بازاڕی مردوو** ـ ( نت. ) بازاڕێکی سەودا و مامەڵەی ئەوەندە کەم بێ وەك نەبوون وابێ .

**بازاڕخۆشی** ( حمص. ) کڕین و فرۆتنی زۆر لە بازاڕا ، دەستاودەستکردنی کاڵا و کەلوپەل بە خێرایی ★ بازاڕگەرمی .

**بازاڕکردن** [ بازار/٤ + کردن ]، ( مصد. لا.) قسەکردنی کڕیار و فرۆشیار لەسەر نرخی کاڵا ، هەوڵدانی کڕیار بۆ سوکیکردن لە نرخی کەلوپەلدا . ★ سەوداکردن .

**بازاڕگەرمی** ـ ( حمص .) تم : بازاڕخۆشی .

**بازاڕی** ـ [ بازاڕ/١ + ٣ـ ئی] ، ( صت.) ١ـ کاڵای خراپ ، کاڵایەکی بە دانستە دروست نەکرابێ ★ جەلەبی . ٢ـ ( مج.) ئادەمیزادی سوك و هەرزە بەتایبەتی ئافرەت.

**بازبازانی** ـ [٢ـ باز + ٢ـ باز + ئانی ] ، ( نت.) ، (هل.) تم : بازبازێن .

**بازبازۆکێ** ـ [٢ـ باز + ٢ـباز+ ئۆك / ٢ + ٥ـ ئێ /٢ ] ، ( نت.) تم : بازبازێن .

**بازبازێن** ـ [٢ـ باز+٢ـ باز + ئێن ] ، (نت.) ، (سیم.) یاری مندالانە کە بۆ خۆخافلاندن و کەیف لە جێیەکی بەرز ( نسبیا ) خۆیان فڕێ بدەنە نزمایی. تێب ـ ئەم یارییە دوڕاندن و بردنەوەی تێدا نیە . ★ بازبازانی ، بازدبازدێن، بازبازۆکێ، بازدبازدۆکێ .

**بازبردن** ـ [ ٢ـ باز/١ + بردن]، ( مصد. لا.) ، (سیم.) **بازد** تم :

**بازد** ـ(نا.)، (مک.)تم : ٢ـباز/١

**بازدبازدۆکێ** ـ [بازد + بازد + ئۆك/٢ + ٥ـ ئێ /٢ ] ، (نت.) ، (مک.) تم : بازبازێن .

**بازدبازدێن** ـ [ بازد + بازد + ئێن ] ، (نت.) ، (مک.) تم : بازبازێن.

**بازددان** ـ ( مصد. لا. ) ، (مک.) تم : بازدان/١ .

**بازددان** (مصد. لا.) ، (مک.) بازدان /١ و ٣ .

**بازدان** ـ [ ٢ـ باز/١ + دان] ، ( مصد. لا.) ١ـ گوڕبەستنەوە و خۆکۆکردنەوە و خۆهەڵاوێشتن و بە تاو خۆفڕێدانە شوێنێکی دوورتر. ٢ـ لە بەرزاییڕا خۆهەڵداشتنە شوێنێکی نزم ٣ـ (بک.) هەڵاتن و ڕاکردن ( زیاتر لە دەست کەسێ یا لە ترسان ) .

**بازرگان** ـ [فر.]، (نت.) ١ـ (سیم.،کعر.) کوتاڵ فرۆش، ئەو کەسەی قوماش دەفرۆشێ . ★ (کئێر.) بەزاز. ٢ـ (کئێر.) تاجر. تێبـ ـ أ) ئەم ووشەیە شێوەی داتاشێن و داڕشتنی بە لای فارسیدایە ، ئەگەر کوردیبا ، بە لای منەوە دەبوو پاشبەندەکەی کە بۆ (نسبة و اتصاف)ە دەبوو (وان) بێ و بە (٣ـ ئە/٢) بە (بازاڕ)ەوە لکابا ، ئەوسا ووشەکە دەبوو بە (بازاڕەوان) هەروەکو دەڵەین ( دەشتەوان ) یا ( تووتنەوان ) . ب) فەرهەنگستانی ئێران چەند ساڵێ پێش شەڕی دووەم ئەم ووشەیەی لە جیاتی

( تاجر ) بۆژاندەوە و لەوساوە خۆی و لکوپۆپی لە کوردستانی ئێران وەبرەو کەوتون .

**بازرگانی** ــ [ بازرگان + ٢ــ ئی ] ، ( فر. کو. ) ، ( نمصـ.) ١ــ ( کئێر.) کاری کڕین و فرۆتنی کاڵای جۆراوجۆر . ( عا. ) التجارة . ٢ــ ( سیمـ. ، کعر.) کۆتاڵ فرۆشی، قوماش فرۆشی . ★ ( کئێر . بەزازی .

**بازرەقە** ــ [ ؟ ] ، (نتـ.) ، (سیمـ.) تم : بازرەقەبەستن .

**بازرەقەبەستن** ــ ( مصتـ. لا. ) ، ( سیمـ.) ١ــ تم : بازرەکردن /٢ . ٢ــ دەرپەڕینی شتێك یا کەسێ بە خێرایی و لە نەکاو . :: مارەکە بازرەقەی بەست . ٣ــ فیچقەکردنی خوێن و ئەو جۆرە شتانە . ( عا.) فوران .

**بازرەکردن** ــ [بازرە ؟ + کردن]، ( مصتـ. لا.) ، ١ــ ( مکـ.) خۆدزینەوەی کەروێشك لە ناو تەماڵ بێ ئەوەی ڕاوکەر پێ بزانێ. ٢ــ ( سنـ.) هەڵبەزینەوەی شتێ ( گوللە ، بەرد ، ...) لە ئەرزێ و لە شوێنێکی دیکە وەزەوی کەوتنی . ★ کەوانەکردن . ( سیمـ.) بازرەقەبەستن /١ .

**بازگ** ــ ( صـ.) ، (جفـ.) تم :١ــ بازە .

**بازگەشت** ــ [ فر. ] ، ( نمصـ.)، ( مکـ.) پەشیمانی .

**بازگەشتبونەوە** ــ [ فر. کو.]، (مصتـ. لا.)،(مکـ.) پەشیمانبونەوە، پاشگەزبونەوە :: خوایە تۆبە لە گوناحی خۆم بازگەشت بومەوە .
تێبـ ــ أ) فارسی ( بازگەشت ) بە مانای گەڕانەوە لە شوێنێك دەکار دەکا . ب) لە نێوان (پاشگەز)ی سلەیمانی و ئەم ( بازگەشت )ەدا پێوەندی هەیە و بە لای منەوە ( بازگەشت ) بۆتە ( باشگەزت ) و لە پاشان (پاشگەز)ی لێ کەوتۆتەوە.

**بازن** ــ (نا.) ، (سیمـ.، سنـ. ) تم : بازنە/ ١ هس : ( بکـ.) بازان = چۆڵەمە . لای پێشەوەی شان ( تم : کف ــ ٦٥ ) و هس : (مکـ.) بازند .

**بازند** ــ [ ؟ ] ، (نتـ.) ، ( مکـ.) ١ــ تم : باسك/١ . ٢ــ هێندێك بە ڕەژۆری جمگەی دەست ، ئەو شوێنەی بازنەی تێدەکرێ .

**بازنە** ــ [ ؟ ] ، ( نتـ.) ، ( مکـ.) ١ــ ئاڵتەیەکە بە شکڵی جۆراوجۆر لە زێڕ ، زێو یا شوشەواڵە و... دروست دەکرێ و ئافرەت بۆ جوانی دەیکەنە دەستیان ★ ( سنـ. ، سیمـ.) بازن ( تم : مردۆخ ، ب١ ، ل ٧٦٤ . (بکـ.) بازن ، بازند . ٢ــ تۆقێکی ئاسن یا هەر مەعدەنێکی ترە ، بۆ قایمی یا بەرگری لە زیادبونی شکاوی یا پێکەوەبەستنی دو شت تێیان دەکرێ :: گۆچانەکەی درزی بردبو بازنەیەکی لای وەستا مهێدین تێکرد .

**بازۆکا** ــ [ ئینگلیسی : بازوکا| ، ( نا.) ، ( کعر.) چەکێکی ئاگرینە دژی تانك و زرێپۆش و ... ، فیشەکە شێتە ( سارۆخ = مۆشەك )ی پێ داوێژرێ ، بۆ یەکەم

جار لە شەڕی دوەما دەکارکراوە .

**بـازۆڵە ــ** [ ١ــ بـازۆ + ٢ــ ئۆلە ] ، (نت.) ، (سیم.) ئەستۆرایێ باسك :: ئەوە بازۆڵەی باسکی‌بۆ . هس : ( مک.) بابۆڵەی باسك .

**١ــ بازۆ ــ** [ ستە : بازۆ. پە : بازۆك ] ، ( نا.) ، ( سیم.) یەکەم بەشی دەسـتی ئینسـان لە لای شانی‌ڕا ، ئەو بەشەی دەست کـە دەکەوێتە نێوان شان و قـۆڵ ★ باهۆ . ( مک.) باهۆ . باسـك ::

« بازۆ هەم جەتار ، بلۆر ڕەخشان »
« مەیگۆن لەب چو لەعل ، دانـەی بەدەخشان »
( خانا ــ ٧٦ )

**٢ــ بازۆ ــ** ( صـ. ) ١ــ ( مک.) حالی گایەك کلك و لاقی سپی بن. ٢ــ ( جف.) تم : ١ــ بازە تێبـ ــ (بـاز) لە لەهجـەی جنۆبیێـدا ( بن‌لەهجەی لوڕی ) بـۆ گایـەك دەگوتـری نێوچـاوان و کلـکـی پەڵەپەڵەی سپی تێدابێ .

**بازۆبەن ــ** ( نت.) ، ( سنە.) تم : بازۆبەند .

**بازۆبەند ــ** [ ١ــ بازۆ + بەند ]، ( نت.) ، (مک.) ١ــ نوشتە و دوعـا کە بۆ مەبەسـتی جۆربەجـۆر دە بەرگێکی چەرم دەگیـرێ ولـە باسکی دەبەستن . ٢ــ بازنەیەکە لە باتی ئەوەی دە قۆڵ بکرێ لە پشت ئانێشکەوە ژنان دەیکەنە باسکیان . ★ ( سنە.) بازۆبـەن ، قۆڵبـەن ، قۆڵەوان ، بـازێوەن . ( مک.) بازێبەند . ( بک.) بازبەند . ( جنو.) بازۆوەن .

**١ــ بازە ــ** [ ؟ ] ، (صـ.) ١ــ حالی هەر شتێکی پەڵەپەڵەی لـە دوو ڕەنگی ڕەش و سپی یـا ڕەش و بۆر پێکهاتبێ . ٢ــ حـالی هـەر شتێکی خەت‌خەتی ڕەنگی ڕەش و سپی بێ . ★ ئەبلەق . بەڵەك . ( سنە.) پلپلـی ، ڕەش‌کەووگ ، ڕەش‌کەوە ، پلپلێن ( تم : مردۆخ ، ب ١ ، ل ــ ١٩٩ ، ٣١٠ و ب ٢ ل ــ ٨٨٠) ، ( جف.) بازگ ، ٢ــ بازۆ/٢ ( هو.) بێڵا . هس : (مک.) ٢ ــ بازۆ/١ و (باچکە) و (باسکە) لە قەلەباچکە و قەلەباسکەدا .

**٢ــ بازە ــ** [ ؟ ] ، ( نا.) ، (کمر.) کۆتاڵێکە لە پەمبۆ دروست‌دەکرێ و دیوێکی تۆزێ تێسکنە . ★ (کئێر.) بەمبازێ .

**بازەبەران ــ** [ ٢ــ باز + ٣ــ ئە / ٢ + بەر (بردن) + ٢ــ ئان /١ ] ( نت.) ، (مک.) هەفتەی دوایێ زستان کە هەتـاو هەمـو ڕۆژێ جێگەی ئاوابۆنی خۆی دەگۆڕێ . تێبـ ــ بەپێی ئەو نیشانە و کەڵـەکە بەردانەی لە هێنـدێ شـوێنی کوردستان بۆ ڕاگرتنی حیسابـی ساڵ و فەسڵەکان دروست‌کراون ، بێجگە لەم هەفتەیە ، باقی وەختەکان هەتاو لە کاتی ئاوابۆنا هەمۆ ڕۆژێ جێگۆڕکێ ناکا و چەنـد ڕۆژێـکی یەك لەدوای یەك هەر لەیەك نوختە ئاوادەبێ .

**بازەڵە ــ** [ ؟ ] . ١ــ ( نت.) تم : بزەڵە . ٢ــ (صت.) حالی مندالی چاوقایمی خۆتێ‌هەڵقرتێن و فێڵباز کە وەختێ قسەدەکا ، ئاشکرا دیارە

دەیەوێ گەورەتر لەخۆی بخەڵەتێنێ .

**بازەڵە خوێندن** ـ ( مصت. لا.) ، ( کعر. ) زۆرزان و فێڵباز بوونی منداڵێك ، چاوقایم بوونی .

**بازەڵێن** ـ [ بازەڵە ؟ + ئێن ] ، ( نت.) ، ( مک.) یاریەکی منداڵانەیە لە کوردەدارێدا زیاتر کچۆڵە دەیکەن . تێب ـ ئەم یاریە بە چەند کەسان دەکرێ ، هەر یەکەیان سێ یا پێنج پارچە زیخی پان دێنێ و پاش ئەوەی بە ( لێك داهێنان ) یا ( تەڕوویشك کردن ) دیاری دەکەن کێ لەپێش هەموان یاری دەکات ، پارچە خێزەکانی دەدەنەدەستی و ئەویش لەسەر بەری دەستی ڕێزیان دەکا و بە تەکانێکی سووك هەڵیان داوێ و خێرا دەستی وەردەچەرخێنێ و هەوڵ دەدا هەموویان بکەونە سەرپشتی دەستی و لەوانەیە هێندێکیان بکەونە سەرزەوێ و هەندێکیش سەرپشتی دەستێ ، لەم حاڵەتەدا دەبێ بە دوو قامکی گەورە و شادەی ئەوانەی سەرعەرزی بچنێتەوە ، کە ئەم کارەی تەواوکرد ئەوجار ئەوانەی سەر پشتی دەستی هەڵداوێ ، ئەگەر هەمووی بە لەپی دەستی گرتنەوە ئەوا بەردێك لادەدا و سەرلەنوێ دەست پێدەکاتەوە تا تێدەکەوێ بەردەکانی ماون دەدا بە یەکێکیتر . لەم یاریەدا بە سێ جۆر یاریکەر تێدەکەوێ : ١) ئەگەر ئەو کاتەی بەردەکانی سەر بەری دەستی هەڵداوێ هیچیان نەکەونە سەر پشتی دەستی ٢) ئەگەر ئەو کاتەی خەریکە بەردەکانی کەوتوونەتە سەرزەوێ دەچنێتەوە یەکێ لە بەردەکانی سەرپشتی دەستی بکەوێتە خوار ٣) لەو کاتەدا کە بەردەکانی سەرپشتی دەستی هەڵداوێ بۆی نەلوێ هەموان بە لەپی دەست بگرێتەوە . یاری هەر بەم جۆرە دەڕوا تا هەموو بەردەکان لە یاری دەردەچن و لای یاریکەران کۆدەبنەوە و تەنیا تاقە بەردێك دەمێنێتەوە . لەسەر شێوەی یاری کردن بە تاقە بەردی دوایی ، لە پێشەوە قسەدەکرێ کە هەروەکوو ئەوانیتر یا بە شێوەی ( قامچێ ) یاری پێدەکەن . کە ئەمەش تەواو بوو ئەوجار دێن حیساب دەکەن کێ هەموو بەردەکانی خۆی نەهێنابێتەوە بە قەد بەردە کەمەکان سزای دەدەن . سزاکانی ئەم یاریە ئەمانەن : پلاو ، ماری کوێ ، قوزبزن ، ناوی باڵندەیەك و سزایەکی دیکەش ئەو کەسەی سزا دەدا خۆی لە یاری دەکا ( شێوەی ئەم سزایانە لە شوێنی خۆیان باس دەکرێ ) . بۆ دیاری کردنی ئەوەی ( دۆڕاو ) دەبێ کام سزا وەربگرێ بەردەکانی دۆڕاندوویەتی هەرچەندێکی بن لەسەر پشتی دەستی دادەنێن ( بە ئانقەست لە شوێنی ئاستەم دادەندرێن ) و هەر بەردەی بە ناوی یەکێك لە سزاکانی یاری دەکرێ ، ئەوجار هەڵیان داوێ و دەبێ بە بەری دەستی بیان گرێتەوە هەر کامێکیان کەوتە

خوار یا بۆی نەگیرایەوە ، ئەو سزایەی دەدرێت .
**بازەوان** ــ [ ١ــ باز + ٣ــ ئە /٢ + وان ] ، ( نتە. ) کەسێکی لە بارەگای پاتشا و ئەمیر و گەورەپیاوانی قەدیمی‌دا خزمەتی ( باز )ی دەکرد و لە وەختی ڕاوا دەچوون و بازی دەدا دەست پاتشا و ... بۆ تێبەردان یا بە فەرمانی ئەو خۆی تێی بەردەدا □ « ... بازەکە بازەوانێکی هەبوە ، بازەوانەکە دەستکێشی قایشی لە دەست ئەکرد ...» ( سجادی ، کوردواری ــ ١٥٥ ) ★ قوشچی .
**بازی** ــ ( نا. ) ، ١ــ (کک.) بە شتێکەوە خەریك‌بوون یا خۆخەریك‌کردن و خافڵاندن ★ گاڵتە ، گەپ ، گەمە ، کایە ، وازی، یاری. ٢ــ (کئێر.) قومار. تێبـ ــ بەم مانایە لە فارسی‌ڕا هاتوتە ناو کوردی ★ ( کعر. ) یاری . ●
**بازی‌بازی ، بە ڕیشی باباش بازی؟** ــ ( کن. ) بە ڕدێنی ( بابا ) یاری ناکرێ ، تۆ ناتوانی فێڵ لەمن بکەی . تێبـ ــ ( بابا )ی عەیار لە چیرۆکی ئەسکەندەرنامەدا ، پیاوێکی زۆرزانی فێڵبازە و کۆسەیە ، چەند داوە مو نەبێ بە چەنەگەیەوە نیە بۆیە یاری پێ‌ناکرێ .
**بازێبەند** ــ [ بازی = ١ــ بازو + بەند ] ، ( نتە. ) ، (مک.) تم : بازوبەند . □ «... ماڵ‌ماڵ کوتی کاکە ناسر ، بە خولای چاك دەڵێن ، ئەوان لەمە بە غیرەت‌ترن ، بازێبەندیان لە قۆڵی خۆیان

دەرهێنا ...» ( تحفە ، ب٢ ، ل ــ ٥ ) .
**بازی‌وەن** ــ (نتە.) ، (سنە.) تم : بازوبەند .
**باژەڵە** ــ [؟] ، (نا.) ، (کعر.) تم : باژێلە .
**باژۆر** ــ [ ٣ــ با/١ + ئاژۆ ( ئاژۆتن ) + ٢ــ ئە/٢ ] ، ( نتە. ) ، ( مک. ) ئەم ووشەیە تەنیا لە مەصدەری ( وەباژۆرکەوتن )دا دەبێندرێ و نەبێستراوە بە هێچ جۆرێکی‌تر دەکار بکرێ ، لە کەرتەکانی ئەم ووشەیە من واتێدەگەم کە مانای ( ئەوەی ( با ) دەی‌ئاژوێ ) بێ .
**وەباژۆرکەوتن** ــ ( مصت. لا. ) هەوا و کەلکەلەی‌کردنی کارێ کەوتنە سەری کەسێ :: نازانم نەوزاد بۆچی وەباژۆر کەوتوە هەر دەیەوێ بچێتە شار . ئەم کچە وەباژۆر کەوتوە بۆ مێردکردن .
**باژێلە** ــ [؟] ، (نتـ.) ، (کعر.) « نەخۆشێکە ئەدات لە بەر مسولدانی ساوا بەتایبەتی نێرێنە و مێزی پێ‌ناکرێ» (تم : معر ، کشت، ب١ ، ل ــ ٢٨ ) . تێبـ ــ مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەم ووشەیەی بە نەخۆشییێکی پێست تایبەتی منداڵان داناوە . ( تم : هبێد ــ ٦ ) .
**باژێڕ** ــ (نا.) ، (هلـ.) تم : بازاڕ.
**باس** ــ [=عا : بحث ] ، (نا.) ١ــ قسە لەسەر شتێك ، دەربارەی کەسێك ( ناوهێنانی بە چاك یا خراپ ، بەدەم یا بە نوسێن ) :: ئەم نامەیە هێچ باسی تۆی تێدا نیە .

ڕۆژنامەکان پڕن لە باسی شۆڕش . □ « هەباسە ! لە دیوانان چ باسە ؟ » . ٢ــ لێکۆڵینەوەی ووردی گشت لایەنە ، لەسەر مەسەلەیێك ، کارێك یا شتێك . :: باسێکی دوورودرێژم لەسەر کۆلێرا خوێندۆتەوە . □ « باسی زوڵفی درێژ و چاوی بەخەو + نەبڕاوە بوە تڕی خوسرەو » .
( حاجی ، کم ــ ٧٥ ).

**باستان ــ** [ پە : باستان ] ، ( نا. صە. ) ، ( کئێر. ) کۆن ، قەدیم . تێب ــ مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەم ووشەیەی لە ( فەرهەنگی کوردیـ ئینگلیزی )دا نوسیوە ، وەکو لە سەرەوە نیشان درا ئەسڵەکەی (پەهلەوی)یە و بە مانای (هەمیشە و دایم ، قەدیمی و بێ پسانەوە ) هاتوە ، من هەر ووشەیەکی لە بنج و بناوانی ( پەهلەوی ) بێ ، بێئەوەی لێی بپرینگیمەوە بە کوردی ڕەسەنی دەزانم با زمانی (فارسی)ش زۆری بەکاربێنێ وەکو ئەم ووشەیە و دەبێ وا حیساب بکرێ کە (فارسی) لە ( کوردی ) خواستۆتەوە .

**باستاناس ــ** ( نت . ) زانای ئاساری کۆن ( العالم الاثری ) .

**باستاناسی ــ** ( حمص. ) زانستی ئاساری کۆن ( علم الآثار ) .

**باستانی ــ** ( صت. ) هەر شتێکی پێوەندی بە زەمانانی کۆنەوە هەبێ ، کۆنینە ، قەدیمی .

**باسترمە ــ** [ تو. ] ، ( نا. ) ، ( کعر. ) گۆشتی کوڵاوی پوختەکراو ، کە بەهارات و داودەرمانی دیکەی تێکەڵکرابێ و لەناو ڕیخۆڵەدا ئاخندرابێتەوە ، لە کاتی پێویستا دە ڕۆنا سوری دەکەنەوە و هێلکەی بەسەردا دەکەن ، بە ساردی و برژاویش دەخورێ . ★ ( کئێر. ) گالباس . تێب ــ ئەم ووشەیە تورکییە و مانای ئاخنراوە و پەستێوراو دەدا . هاوتاکەشی لە (کئێر.) لە زمانی ڕوسی وەرگیراوە.

**باسریشك ــ** [ ٣ــ با/١ + سریشك ( = فرمێسك ) ] ، (نت.)، ( مک. ) کزێوە و باران بە ( با )وە .

**باسقەندە ــ** (نت.) ، (کعر.) تم: باسقەننە .

**باسقەننە ــ** [ باس (باسك) + قەننە ] ، (نت.) ، (مک.)١ــ سەبێلەیەکە دارێکی ئالوبالوی درێژی ڕاستی بۆ سمرابێ و خرابێتە سەرێ . ٢ــ هەر ئەو دار بەڵالۆکە بە تەنیایی و بێ ئەوەی سەرە سەبیلەی وەسەر خرابێ . ★ (کعر.) باسقەندە ( تەنیا بۆ مانای دوەم ) . تێب ــ ئاشکرایە لەبن لەهجەی سلەیمانێدا دەنگی ( د )ەکە کلۆر دەکرێ و دەنگی سوکە ( گ )ێکی لێ دەردەکەوێ .

**باسك ــ** ( نا. ) ، ١ــ تم : ــ بازو . ٢ــ ئەو شوێنەی شاخ و کێو کە بەرەو نزمایی لێژ دەبێتەوە. ★ ( نو. ، جنو. ) یاڵ . ، کلکە . ( سن. ) باهو . ٣ــ تم : باسکێش.

**باسکردن** [ عا. کو. ] ، ( مصت. لا. ) ١ــ کۆلینەوە و دوان لە شتێ یا مەبەستێ . ٢ــ قسەکردن دەربارەی کەسێ یا هەرچێ .

**باسكلاو ــ** [ ؟ ] ، ( نت.) ، (مك.) ڕێواسی نێرتك .

**باسكەصەگ ــ** [ باسك + ٣ــ صەگ ] ، (؟) ، ( نت.) ، (مك.) صەگی ناوقەد بارێك .

**باسكەمەلە ــ** [ باسك/١ + ٣ــ ئە/٢ + مەلە ] ، ( نت.) ، ( كمر.) یەكێكە لە جۆرەكانی ( مەلە ) كــە پیاو بە هێــزی باسكهــاوێشتن دەكەوێتــە سەرئــاو . ★ ( مك.) مەلەباسكە .

**باسكەوجاڕ ــ** [ ( باسك /٣ + ٥ ــ ئە/١ ) + هەوجاڕ ] ، ( نت.) ، ( كمر.) تم : باسكێش .

**باسكێش ــ** [ بـاســـك /٣ + هێــش ] ، ( نتــ.) ، (مكــ.) ، پارچەیەكە لە ( ئامۆر ) ، دارێــكی درێژی ڕاستە سەرێكی لە ( نێر ) دەبەسترێ و سەرەكەی دێـــكەی ( دەندە ) و (پاشبارە)ی ڕێدەخرێ. ★ ( مك.) مژان ، باسك ، ( كمر.) باسكەوجاڕ . تێب ــ هێـش لــە تەركیبی ئەم ووشەیەدا ووشەیەكی پەهلەوییە و هێچ نەگۆڕاوە و بــە مانای ( گاسن )ە .

**باسوخ ــ** ( نا.) ، (سن.) تمــ : باسۆق .

**باس‌وخواس** [ عا.] . (نت.) قسە دەربارەی چلۆنایەتێ ڕۆداوەكانی ناو دەوڵەتان ، ووڵاتان ، زانـــست و هونەر و چلۆنایەتێ كۆمەڵایــەتێ و ... ★ دەنگ‌وباس . (عا.) خەبەر، ئەخبار . :: باس‌وخواسی لوبنان چیە ؟ ڕۆژنامەكانی ئیمڕۆ باس و خواسێكی ئەوتۆیان تێدا نەبۆ .

**باسۆق ــ** ( نا.) ، ( ســیمە.) جۆرێك شیرینـاتە نیشـــاستە و شیرەی ترێ پێكەوە دەكوڵێنن تا پەیت دەبێتەوە ئەوجار دایدەگرن و لێی‌دەگەڕێن ئیشك بێتەوە . تێب ــ أ ) بە لای منەوە ئەم ووشەیە و هاوتا سنەیی‌یەكەشی ( باسوخ ) هەرتكیان لە مەصدەری ( باسمق ) بە مانــای توركێن لە مەصدەری ( باسمق ) بــە مانای شــیرن و پەســتاوتن ، وەرگیراون . ب) لە هێندێك شوێنی كوردستان وەكۆ ( سلەیمانێ ) پاش ئەوەی ( شیرە )كە پەیت بــۆوە لەسەر ستێنێ ڕۆی دەكەن و كــە ئیشك بۆوە بە چەقۆ پارچەپارچــە دەبڕن و لە ( كێیر.) كاكڵە گوێز یا بادام بە بەنەوە دەكەن و ئەم شیــرە پەیتــەی لە دەور لــوڵ‌دەدەن و هەڵێداوەسن تا تــەواو ئیشـــك دەبێتەوە و لەناو ئاردا هەڵێدەگرن بۆ زستان . ★ (سن.) باسوز .

**باسەر ــ** [ ٣ــ با/١ + سەر ]، ( نت.) ، ( مك.) بای توند و بەرز .

**باسەڕە ــ** [ پــە : ڤاســتر ، ڤاستەر ] ١ــ چێمەن ، لەوەڕگە . تێب ــ ئەو مانایــانە ئێ ووشــە پەهلەویەكەیە و ئێستــا لە زمــانی كوردێدا لەبێر چۆنــەوە ڕەنــگە بۆڕاندنەوەیان بێ‌كەڵك نەبێ هــەر بۆیەش ئەم ووشەیەم نۆسێ . ٢ــ ناوە بۆ دەربەند و ڕۆبارێك لــە كوردستانی عیراق ناوچەی سەنگاو .

**١ــ باش ــ** [ ؟ ] ، ( صــ.) ١ــ سروشتی چــاكە لە شــتێ یــا كەسێكدا . :: پیــاوێكی بــاش ،

قەڵەمەکەت باش نانوسێ ، باشت نەکرد تۆزە بۆی . ★ چاك ، قنج . (بک.) قەنج . (جنو.) خاس ، خۆ . ٢ــ ( مجـ.) زۆر ، گەلێك . :: دوێنێ چوینە باخی ئاشێ ترێی باشمان خوارد . خەڵکێکی باش هاتبونە سەر قەبران .

**٢ــ باش ــ** [ = تو = سەر ] ، سەرۆك ، گەورە . تێب ــ ئەم وشەیە لە پێشمەوە و دوایێ دەگەڵ وشەی کوردێ تەرکیب دەبێ و مانای ( سەرۆك و گەورە)یان لێ زیاد دەکات . :: باشچاوەش ، تاجرباشێ ، باشدەوڵەمەندی شار.

**باشارکردن ــ** [ تو : باشار + کر : کردن ] ، ( مصد . مت. ) دەرەقەت‌هاتن . دەروەست‌هاتن . چارەپێکران ( کارێ یا کەسێ )! :: ئیمپڕیالیزم بە هەمو هێزیەوە باشاری خەباتی میللەتان ناکا. هەرچەند ئەم پەلە تۆتنە بژار دەکەین باشاری گیاکەلە ناکرێ□ « ... سوڵتانی ئەستەمبوڵێ دەسەرێ کردوم بۆ فەڕشێکی ، سەد کەسم هێناوە ، کەس باشاری ناکا ...» ( تحفە ، ب١ ، ل ــ ٣٨٧ ) .

**باش‌بون ــ** [ ١ــ باش/١ + بون ] ، ( مصد. لا.) ١ــ گۆڕانی حاڵی شتێ یا کارێ لە خراپیێ‌ڕا بۆ چاکێ :: ئێستا دنیا زۆر باش‌بوە جاران کێ دەیوێرا بەم ڕێگایانەدا بڕوات . ٢ــ بەرەو چاکبونەوە یا هەر چاکبونەوەی کەسێکی نەخۆش :: دۆر لە گیانت حەمەی کوڕم دوێنێ زۆر نەخۆش‌بو بەڵام شوکر ئێمڕۆ باش‌بوە .

**باشتر ــ** [ ١ــ باش/١ + تر ]، ( صت.) ١ــ حاڵی هەر شتێکی یا هەر کەسێکی لە لانی چاکییەوە بەسەر هاوچەشنی خۆیدابێ :: قەڵەمەکەی کنێر لە ئێ ئەستێ باشتر دەنوسێ. ★ چاتر. چاکتر. قنجتر خاستر . ( جنو.) خۆوتر . ٢ــ حاڵی هەر شتێ یا کەسێ کە بۆ کەسێ یا بۆ کارێ لە هاوچەشنێکی خۆی زیاتر دەست‌بدا :: هۆو قاتە شتینەی ئەولایان بۆ تۆ باشترە .

**باشترین ــ** [ باشتر + ئین ] ، ( صت.) سروشتی شتێ یا کەسێ کە لە هەمو هاوچەشنانی خۆی چاتربێ . لە هەموان چاکتر . :: باشترین ڕێگا بۆ ئازادێ میللەتان ڕێگەی خەباتە .

**باش‌کردن ــ** [ ١ــ باش/١ + کردن ] ، ١ــ ( مصد.مت. ) گۆڕینی حاڵی شتێك ، کارێك یا کەسێ لە هەر بابەتێکەوە بێ ، لە خراپیێ‌ڕا بارەو چاکێ :: حوکمی زاتێ ( ئۆتۆنۆمێ ) لە کوردستانی عێراق، حاڵی نەتەوەی کورد باش دەکا . یاسای چاککردنی کشتوکاڵ ژیانی جوتیاران باش دەکا . ٢ــ (مصت. لا.) ئەنجام‌دان یا نەدانی کارێك کە بە لای کەسێکەوە ئەوەی کراوە مەسلەحەت بوە :: باشت‌کرد وەلامت نەدایەوە دەنا لێتان دەبو بە شەڕ . باشت‌کردوە سەرت‌لێدا ئەگینا گلەیێ نەدەبڕایەوە .

**باشۆکە ــ** [ باشێ + کە ( ئم :

پچوٚکیٚ ) ] ، ( نتـ. ) ، ( سیـمـ. )
« باڵندەیەکی دەنوٚك کەوانەییــە ،
لە واشە پچوٚکترە ، ڕاوە چوٚلەکەی
پێدەکرێ. » ( خا. ب١ ، ل ـ١٠١ ).

**باشوٚ** ـ [ باش+٢ـ ئوٚ ] ، (نتـ.)،
(مکـ.) باڵندەیەکی ڕاوکەری بچکوٚلەیە
کە درێژایی دەوری سێ سانتیمیتر
دەبێ ، چاوی زەردن ، پشتی
کەوەڕەنگ و بەرزگی سپییە
پەڵەپەڵەی زەردی تاریکی تێدایە ،
لە حەوا باڵندەی‌تر دەگرێ و
جاروبارەش هێلکەی پەلەوەران
دەخوا ، لە کوردستانی خوٚمان
هەیە . ★ ( کعر. ، سنـ. جنو. )
واشە . تێبـ ـ ١ ) بوٚ کەرتی یەکەمی
ئەم ووشەیە ( باش ) تم : ١ـ باز ،
تێبـ ـ ج . ب) ئەگەرچی لە بەرگی
یەکەمدا ( ٢ـ ئوٚ ) بە ئامرازێك
داندراوە کە دەگەڵ ڕێشەی هەندێ
مەصدەران صفەتی مەفعوڵێ
دروستدەکا ، بەڵام لەبەرچاو
ڕاگرتنی ( تێبـ ـ ج )ی ووشەی
( ١ ـ باز ) وامان لێدەکا بڵەین ئەم
ئامرازە صفەتی فاعیلێش پێکدێنێ.

**باشە** ـ [ ١ـ باش/١ + ١ـ ئە]،
(شی.) بوٚ قبوڵکردن با
بەڕاستزانینی قسەی کەسێك
بەکاردێت :: ئێواری بچوٚ لای
دوکتوٚر ( ـ باشە ) . لە بیرت نەچێ
نامەیەك بنوٚسە بوٚ عەزیز (ـ باشە).
٢ـ وەڵامی پرسیارە دەربارەی
کەسێ یا شتێ :: نەخوٚشەکەتان
ئیمڕوٚ چوٚنە ؟ ( ـ باشە ) . دەگەڵ
شێرکوٚ نێوانتان چوٚنە ؟ (ـ باشە )
★ چاکە ، خاسە ، قنجە . (جنو.)

خووە .

**باعاندن** ـ [ ند. ] ، ( مصتـ. لا. )
تم : باڕاندن .

**باعە** ـ [ ند. ] تم : باڕە .

**باعەباع** ـ [ ند. ] تم : باڕەباڕ/١ .

**باغ** ـ [ ستـ : باغە . ، پە : باغ]،
( نا. ) ، ( مکـ. ) پارچە ئەرزێکە داری
میوەی لێ نێژرابێ ( جمی ) باغات .
★ ( بکـ. ) باغ . (جنو. ، کعر.)
باخ .

**باغبڕین** ـ ( مصتـ . متـ . )ـ
هەڵپەرتاوتنی لقوپوٚپی زیادە و
زوٚڵەکی دار و درەختان پێش
ئەوەی بکەونە گوڵەوە و بپشکوێن.
بەبێ ئەم کارە دارەکان یا بەرناگرن و
میوە نادەن یا بەریان خراپ و کەم
دەبێ .

**باغچە** ـ [ باغ + چە ( ئمـ :
پچوٚکی ) ، (نتـ.) ، (مکـ.) تم :
باخچە/١ .

**باغر** ـ [ ؟ ] ، (صتـ.) ، (کعر.)
تم : بادیهەوا .

**باغربوون** ـ [ مصتـ. لا. ] ، (کعر.)
تم : بایێبوون .

**١ـ باغە** ـ [ ؟ ] ، ( نا. ) ، (مکـ.)
نەخوٚشییە توٚشی سمی ووڵاغی
یەکسم دێت و کاسەی سمێ درێژ
دەکا و کەڵکی سواریێ پێوە نامێنێ.

**٢ـ باغە** ـ [؟] ، (نا.) ماددەیێکی
نەرمە وەکو هەوێر ، لە
( نیترۆسێلۆلۆز ) و (کافوور)
دروستدەبێ ، بە هەر شکڵێکی
ئارەزوٚ کەلوپەلی ژیانی ئیمڕوٚی لێ
دروست دەکەن ، ئەگەر بە ئاگری
ڕابدێرن نەرم دەبێتەوە ، زوٚر زوٚ

گڕ دەگرێ :: تەسبیحی باغە ، دارجگەرەی باغە ، بازنەی باغە .

**باغەڵ** ـ [؟] ، ( نا.) ، ( مک.) ١ـ بەتاڵایی نێوان کەوا یا مرادخانی و لەشی ئادەمیزاد کە لای خوارەوەی بە پشتێند دەبەسترێ و دەبێتە گیرفانێکی زل ، جاران وەکو گیرفان شتی تێدەخرا . ٢ـ (مج.) باوەش :: وەرە باغەڵی بابی خۆت ، بچۆ لە باغەڵی دایکتدا بنو . ☐ « ... لەشکری شاعەبباسی هاتنە سەری ، کاغەزەکەیان لە باغەڵی دەرهێنا ... » .

( تحفه ، ب١ ، ل ـ ١٨١)

★ باڵ (کمر.) باخەڵ . (سن.) بەخەڵ . **دەباغەڵی کەسێدابون** ـ (کن.) خێزانی ئەوکەسە بون ، ژنی کەسێ بون :: کچە کەی مام برزۆ دەباغەڵی ئەحەی رۆستەمدایە .

**کەسێك دەباغەڵدابون** ـ ( کن.) مێردی ئافرەتێ بون :: ئەحەی ڕۆستەم کچەکەی مام برزۆی دەباغەڵدایە .

**باغەوان** ـ | باغ + ٢ـ ئەوان |، ( نت.) . ( مک.) ئەو کەسەی سەرپەرشتی باغێ دەکا ★ ( کمر.، سن. ) باخەوان .

**باغەوانی** ـ | باغەوان + ٢ـ ئی |، ( حمص.) ١ـ کار و پیشەی ئەو کەسەی ئاگای لە باغ دەبێ و سەرپەرشتی دەکا :: ئەو ساڵ بێتەوە ئیدی من بێ و باغەوانی ناکەم. ٢ـ سەرپەرشتی کردنی باغ ، نیگاداری کردن و ئاگا لەباغ بون .

**بافته** ـ | فر. | ، ( نا. ) تیسماڵکیکە پانایی سانتیمیترێك یا زیاتر ، لە ئاورێشم یا دەزو چندراوە ، بۆ ( کوبە )ی هەندێ شوێنی جلوبەرگ دەکاردەکرێ و نایەلێ قوماشەکە هەلوەشێ یا ڕێشالی لێ هەلبێ . تێب ـ ( أ ) گەلێ جار لەباتی ئەمە هەر لە قوماشەکە خۆی یا قوماشێکی تر بۆ ئەم مەبەستە کەڵك وەردەگرن . ب) ئەم ووشەیە سیغەی مەفعولی مەصدەری فارسی ( بافتەن )ە بە مانای ( تەنین ) و (چنین ) و ( هۆنینەوە )ی کوردی .

**بافل** ـ [؟] ، (نا.) ، (قەلاسێوکە) ١ـ تم : ئاوشار . ٢ـ ناوە بۆ نێرینە :: بافلەکەی چەمی ڕەزان سەیرانگایەکی خۆشە .

**بافیش** ـ [ ٣ـ با/٧ + فیش |، ( نت.) ئەنجامی خۆڕانان و گورەگوڕێکی بێ کردەوەیی پێوە دیاربێ . تێب ـ بۆ مانای کەرتی دوەمی ئەم ووشەیە هس : فیشاڵ، فیز .

**بافیش کردن** ـ ( مصت. لا. ) خۆهەلکێشانی درۆزنە ، خۆڕانانی بێ جێ .

**باقاندن** ـ | ند. | ، ( مصت. لا.) تم : باڕاندن .

**باقان** ـ | ند. | ، ( سن.) تم : باڕاندن .

**باقر** ـ | محر. تو : پاکر = مس | ، ( ص.) . ( مک.) حالی حاجەتی لە مس دروستکراو کە ( قەلایی ) لێ بو بێتەوە و ڕەنگی سوری ( مس )ەکەی دیاری دابێ .

**باقربۆن** ــ [ تو. کو.] ، (مصت. لا.) ، (مکـ.) لیٚبۆنەوەی قەلاییٚ لە قاپ و قاچاغی مس ، دەرکەوتنی ڕەنگی سۆری ( مس ) لەو جۆرە دەفرانەدا .

**باقلاوە** ــ [؟] ، ( نت.) ١ــ جۆرێك خـواردنی کوردەوارییـە . ٢ــ جۆرێك شیرنیاتە لە ئارد و شەکر و ڕۆن و بادام یا بستە یا گرێزی کوتراو دروستدەکریٚ . تێب ــ من وایبۆدەچم کە ئەم ووشەیە لە [ باقل ؟ + ٣ــ ئـە/٢ + وا ] پێکهاتبیٚ ، کەرتی دوایی ( وا = با)یە کە لە ووشەی ( دۆغەوا ) و (شۆروا = شۆربا ) و ناوی هێندیٚ چێشتی ترا دەبێندریٚ .

**باقلە** ــ [ ئیتالیٚ = باچیٚلی ، یۆنانی = باکیلۆس ] ، ( نـا.) ، ( کئێر.) ١ــ گیایەکە سالەوسـال دەچێندریٚ ، هاوچەشنی (لۆبیا)یە ، جار هەیە گەزێـك بەرزدەبێتـەوە ، خواردنی بەری ئەم گیایە ئینسانی پیٚ تێردەبیٚ ، هەر بۆیەشە مێـژۆی دەستچێنیٚ دەچێتـەوە چاخەکانـی بەر لە مێژۆ ( تم : لارۆس ، چاپی عـاریٚ ١٩٦٠ ، ل ــ ٤٣١ ) ٢ــ بەری ئەم گیایە ، کە هەرچـەند دەنگی دە ( کەلو )ێك دایـە . ★ ( کەر.) پاقلە (سنـ.، جنو.) باقلە. ( بکـ.) باقلا .

**باقل** ــ [ بە + ئاقل/١ ] ، [کو. عا.] ، ( بنت.) تم : ئاقل .

**١ــ باقۆ** ــ [؟] ، (نا.) ، (مکـ.) جۆرێك ماسیٚ زلی بیٚ پۆلەکەی بیٚ دڕکە ، دەمی لە باتی ئەوەی وەکـو ماسیٚ دیکە لە لەشی باریـکتربیٚ پانترە و جۆتیٚ سمێلی یـەك داوی ئەستۆر کە لە هەر لایـەکەوە دە سانتیمیتر درێـژ دەبیٚ لەولاولای لغاوەی ڕواوە ، گۆشتی زۆر خۆشە بە شەرتیٚ پارچەیەك چەورابیٚ کە لە سەلکیٚڕا بەسەر تیفەرەی پشتیدا تا سەر کلکی گرتوە ، فڕیٚبدریٚ تا بۆنی نەمێنیٚ . شیعە خواردنـی گۆشتی ئەم ماسییەیـان بـەلاوە حەرامە . ( عا.) جـوڕڕیٚ . ★ نەققە .

**٢ــ باقۆ** ــ [؟]، (نا.) هەنجیرێکی پێش ئەوەی بە چاکیٚ بگا ، وەرێبیٚ.

**١ــ باقە** ــ [ ند.] ، ١ــ دەنگی گێسك و کارێلە . ٢ــ (مجـ.) دەنگی گریانی مندالی ساوا .

**٢ــ باقە** ــ [؟] ، (نا.) ، (مکـ. ، سنـ. ، سیمـ. ) هێندێك گەنـم ، جۆ یا گیا کە پـاش درۆنـەوە بەسـترابیٚ . ★ ( بـکـ.) بـاق . (جنو.) باقە .

**باقەباق** ــ [ ند.] تم : باڕەباڕ .

**باقەبەس** ــ [ ٢ــ باقە + بەس ( بەستن ) ] ، ( نت.) ، (سنـ.) تم : باقەبێن .

**باقەبێن** ــ [٢ــ باقە + ٢ــ بێن]، ( نت.) ، ( مکـ.) چلە گیایەکی درێژی ئەستۆر یا چـەند چلە گیـای پێکەوەیە ، کە لە ناوەڕاستی ( ٢ــ باقە )ی دەهالێنن و گرێی دەدەن ــ ئەوەی باقەی پیٚدەبـەستن . ★ ( سنـ.) باقەبەس .

**باقیٚ** ــ [ = باقیە = بەخیە ] ، ( نا.) ، ( مکـ.) جۆرێك درۆمانـی

ووردە ، بۆ جل‌وبەرگ و ئارەخچن و ... :: کەژاڵ ئارەخچنێکی بە (قرمە) و (باقی)ی دروە شتی وا جوان هەر نەبوە . کەوشەکەت بەرە لای عەولا چاولەحەوا بۆت جوت‌باقی‌کا .

**باقی** — [ عا.] ، ١ـ ( صە.) پایەدار ، بەردەوام .

□ «بێبەنە خزمەت عەرشی عێراقی»
«بڵێن یار باقی و هەم سوحبەت باقی»
( پیرەمێرد ـ ١٠٢)

٢ـ هەر شتێکی کە لە شتی مابێتەوە ، پاشماوە :: دە دینار باقی حیسابەکەی پێشتوش ماوە . ٣ ـ فەرقی نرخی دوو شتان کە پێکیان دەگۆڕنەوە :: سەعاتەکەی دایە و پێنج دیناریشی باقی دایەوە و ڕادیۆکەی لێ وەرگرت .

**باقی‌وساقی‌کردن** — ( مصت . لا .) ئاڵوگۆڕکردنی شتان پێکەوە و لەسەردانەوە یا لەسەر ئەستاندنەوەی . :: ئەم کابرایە ڕۆژێ هەزار باقی‌وساقی دەکا ، کەس تێی‌ناگا خەریکی چیە .

**باك** — [؟] ، ( نا.) پەروا . ترس.
★ ( جنو. ) باك .

**باکردن** — [ ٣ـ با/٣ + کردن] ، ( مصت. لا.) ئاوسانی زگی ئادەمیزاد لە ئەنجامی خواردنی هەندێ خواردەمەنی کە زگ دەئاوسێنن وەکو بامی و پیواز و ... یا هەر لەبەر زۆر خواردن و خواردنەوە . :: ئەوەندەی خوارد بای‌کرد و لەجێی خۆی لێی تخێڵ بو .

**باکور** — [ ستـ : ئەپاختەرە . ، پهـ : ئەپاختەر ] ، ( نا.) یەکێکە لە چوار (لا)ی جوغرافیایی . تێبـ ـ ئەگەر وا ڕابوەستین کە دەستی ڕاستەمان دەلای ڕۆژهەڵاتی بێ و دەستی چەپەشمان دەڕۆژاوایە ، ڕوبەڕومان ( باکور )ە . ( عا.) شیمال . // جنوب .

**باکوری** — [ پهـ : ئەپاختەریك ]، [ باکور + ٣ـ ئی ] ( صت.) حاڵی هەر شتێ کە پێوەندی بە لای ( شیمال )ەوە هەبێ . :: کوریای باکوری ، ئەمریکای باکوری .

**باکێش** — [ ٣ـ با/١ + کێش ( کێشان ) ] ، ( نت.) ١ـ دەلاقە یا کەلەبەرێکە لە دیواری ژور و خانودا (با)ی لێڕا دێتە ناو ماڵەوە و فێنکی دەکا . ٢ـ ( کئێر. ) پیاڵەیەکی تایبەتیە لە شێوەی ئیستیکان بۆ لابردنی ئێش و ئازاری هێندێ شوێنی لەش بەکاردێت . تێبـ ـ بە ئیسپیرتو یا دەنکە شقارتەیەکی هەڵکراو هەوای ناو پیاڵەکە دەسوتێنن و خێرا دەینێن بەو شوێنەوە کە ژان دەکا ( بە تایبەتی ژانی سەرمابون و ... ) جا چونکو خۆی هەوای تێدا نەماوە هەوای ژێر پێستی لەش هەڵدەمژێ و کەمێك لە پێست دێتە ناو پیاڵەکەوە و گەرم دادێ . پێش ئەم ئامرازە پچکۆلە فەڕەنگیە لە کوردستان ( کوپە )یان بەکارهێناوە و هێشتاش ( کوپەگرتن ) لە باو نەکەوتوە . ئەگەر لە جێیەك باکێشی تایبەتی نەبو ئیستیکانی چای

بەكاردێنن . ★ بادكێش ، بانكە/٢: ( جنو.) بای کەش .
**باگر** ـ [ ٣ـ با/١ + گر (گرتن)]، ( نت.) ، ( مک.) جێگایەکی لە هەر لایەکەوە ( با ) هات بیگرێتەوە . ★ باگیر .
**باگردان** ـ [ با (بان) + گردان (گەردان) ] ، ( نت.) ، ( مک.) بەرد یا کوتەرە دارێکە لە شکڵی ئوستوانە ، لێك و لوس و بێ گرێ و گۆڵ ، لە نێوەراستەوە بە بای درێژاییدا سەرانسەر کونەودێو کراوە یا ئەو سەرەوسەرەکەی دو قوڵفی ئاسنی تێدەخرێ و گوریسێك دەکونەکە یا قوڵفەکان هەڵدەکێشن، بۆ کوتانەوە و درزبڕین لە سەربان تلی دەدەن . ★ ( مک.) باگردێن . ( سیە.) بانگردێن . ( سن.) بانگلێن ، بانگلێر . ( بک.) بانتلێن . ( جنو.) بۆ گلۆو .
**باگردێن** ـ [ با (بان) + گردێن ( گەردان ) ] ،( نت.) ، ( مک.) تم : باگردان .
**باگونە** ـ [ ٣ـ با/٦ + گون + ٥ـ ئە/١ ] ، ( نت.) « بایەکە ئەدات لە گونی ئادەمیزاد یا حەیوان هەڵیئەئاوسێنێ بە هۆی غرۆریەوە. » ، (معر، کشت، ب١، ل ـ ٢٩ ) .
**باگێژە** ـ [ ٣ـ با/١ + گێژ + ٥ـ ئە/١ ] ، ( نت.) بایەکە بە دەوری خۆیا گێژ دەخوا و دەسوڕێ . ★ ( مک.) گێژەلۆکە . ( سیە.) گەردەلول ، گەردولول . ( سن.) گەردەبا ، گەردەلول ، گێجەبا . ( بک.) باهۆز . ( جنو .) بادغێژە ، بادگێژە .
**باگیر** ـ [ ٣ـ با/١ + گیر (گرتن) ] ، ( نت.) تم : باگر .
**باللۆرە**ـ ( نت.) ، ( مک.) تم : بالۆرە .
**بالۆرە** ـ [ ٣ـ با/٤ + لۆرە ( ند. ) ] ، ( نت.) ، (کعر.) جۆرێ گۆرانیی کوردییە . تێب ـ ژنانی کورد ، کاتێ لە چیا و شاخ و داخان بە دەم ئێش ، ڕۆیشتن یا دانیشتن و ماندوحەساندنەوەدا ، گۆرانیی دەڵێن گەردنی خۆیان دەکەنە ئامرازی مۆسیقا و پەنجەکانی دەستیان گرد دەکەنەوە و بە هەوای گۆرانیەکەی دەیڵێن لە دەمارەکانی ملیان دەدەن و لە ( گەرو )شیان هەر بە عەینی هەوا دەنگی (ئەوەوەوە ، ... ، ...) دەردەخەن و لە نێوان پەنجە لە گەردندان و ( ئەوەوەوە)دا ووشەکانی گۆرانیەکەیان درێژ دەبێتەوە و پیاو کەمتر تێیدەگا . جاروبارەش کە دو دەستە کچ یا ژن لەوشانەوشانی شاخێ یا ئەوبەرەوبەری دۆڵ و دەرەیەك تێك هەڵدەنگون ، دەستەیەکیان دەس دەکا بە ( بالۆرەلێدان) و ئەوێ دیکەشیان بۆی دەگێڕێتەوە و لە ناویانا دەبێتە بێن بڕکێ و هەر دەستەیەی تێدەکۆشێ ( بالۆرە )ی درێژتر و خۆشتر بێ . ٢ـ ( مج.) قسەی بەقەو کە کەس تێینەگا .
**بالۆرەلێدان** ـ ( مصت. مت.) بە شێوەی بالۆرە گۆرانیکوتن .
**بالۆکە** ـ [ بال (؟) + ۆکە ] ،

( نت.) ، (مک.) زێپکەیەکی پچـوکی ڕەقە لە دەستوپل و جێگای تـری لەشی ئینسان دێت . ( تێبـ ـ ١ ) کەرتی ( بال ) لەم ووشەیەدا بـەلای منـەوە ( بـەل )ە کە بـە مانـای ( قیت ) هـاتوە . (ب) لەنـاو کوردەوارێدا وا قاوبۆ کە هەرکەسێ دەستی وە ( بۆق ) کەوێ یا (بۆق) وە جێگایەکی لەشی بکەوێـت ، بالۆکەی لێدێ . ) بۆ چارکردنی بالۆکە چەند شێوەیەك لە کوردستان باوبۆ : ١ـ حـەوت دەنکە گەنـم و حەوت کلۆ ( خوێ)یان دەهێنـا و حـەوت ( قل هو الله )یان بەسەردا دەخوێند و دەپەڕۆیەکیانـەوە دەپێچا و لە شوێنێـکی شـەدار دەیانخستە ژێر خاکەوە ، دەگوترا هەر دەمایەکی ئەو گەنم و خوێیـە ڕزێن بالۆکەکەش هەڵدەوەرێ . ٢ـ گیایەکی سـاقەت ئەسـتورە لـە کوردستان هەیـە ( تێـرۆك ) یـا (داربالۆکە)ی پێدەڵێن ، ئەوکەسەی بالۆکەی لێهاتبا دەچۆ پەلێکی ئەو گیایەی بادەدا و لایان وابۆ بەم کارە بالۆکەکەی ئێشك دەبێ . ٣ـ بـە جەوهەری گۆگـرد ( ئەسـید سۆلفۆرێك = حامض کبرێتیـك ) دەیانسۆتاند . ★ ( سیم.) بالۆکە. ( بک. ، سن.) بالۆك .

**بالۆك ـ** ( نت.) ، (سن. ، بک.) تە : بالۆکە .

**بالۆکە ـ** ( نت.) ١ـ (سیم.) تە : بالۆکە . ٢ـ ( مک.) بالۆکەیە ، لـە شوێنی بێ تۆکی یەکسمان دێت .

**١ـ باڵە ـ** [ ند.] تە : بازە .

**٢ـ باڵە ـ** [؟] ، (نا.) ، ( سن.) دەستەوانەیەکی چەرمە ( بازەوان ) لە وەختی عاملاندن و چەشتکردنی بازی تازەگیراو ، یا لە کاتی ڕاوا بۆ هەلگرتنی بازی ڕاوکەر دە دەسـتی دەکا ، تا پەنجەی باز دەستی برینداز نەکات .

**باڵەباڵ ـ** [ ند.] تە : بازەباز .

**باڵیبۆنەوە ـ** [ ٣ـ با/٣ + لێ ( لە + ی ) + بۆنەوە ] ، ( مصت. لا.) غاز و هەوای ناوزگی کەسێك بە ڕێگای خوارەوەدا دەرچۆن . □ «... منداڵەکە بایەکی لێ بـۆوە ، ژنـەکە چەپـۆکێکی پێدادا ... » ( فۆلکلۆر ) .

**باڵیف ـ** [ پە : بالین ] ، ( نت.) ، (ھل.) کیسـەیەکی خامە پڕدەکرێ لە: لۆکە ، پـەڕ یا وورده خـورێ و دەخرێتە ناو بەرگێکی قومـاشی جوانەوە ، بۆ پاڵوێدان و ئانیشك لەسەر دادان بەکاردێت و لە وەختی نوستنا سەری وێدەکرێ ، شکڵی بە پێی داب و دەسـتوری هـەر ناوچەیەك دەگۆڕێ ، پان و درێژۆکە، ئوستوانەیێ ، پانی چوارگۆشـە و گەورە و پچۆك . ★ ( مک.) سەرێن، سەنێر . ( سن.) پاڵشت . (سیم.) پشـتێ . (کك.) سەرەنـگیا ، سەرینگا . ( بک.) باڵیف ، باڵیفك ، باڵگە ، باڵگێ ، باڵگێف . ( جنـو.) باڵشت . ( زا.) باڵیشنە .

**باڵیفە ـ** [ باڵیف + ١ـ ئەك/١]، (نت.) ، (مک.) دۆشەکەڵەیەکە لەناو لانکیدا بۆ منداڵی ساوا ڕادەخرێ. تێبـ ـ دەنـگی (ك)ی (١ـ ئەك/ )

کەوتوە و دوایێ ئەم ووشەیە وەکو ( ٥ـ ئە/١) دێتە بەرچاوان .

**١ـ باڵ ـ** [ ست : پەرێنە . ، پە : پەر ، پەرەك ] ، (نا.) ١ـ ئامرازی فڕینی مەل و پەلەوەر و حەشەڕات . تێب ـ باڵی مەل و شەمشەمەکوێرە لەشوێن دەستیانە و ئێ مێش و مەگەزان بە یەکێ لە دوو ئالقەی دوایێ سینگیانەوەیە . ★ ( بک.) پەڕ . (زا.) پەل ( هس : پەلەوەر ) . ( هو.) باڵێ ٢ـ دەستی ئادەمیزاد لە سەرشانیڕا تا دەگاتە سەری قامکان ★ ( جنو.) باڵ . ( هس : پێل ) . ٣ـ هەریەك لەو دوو پارچە پانانەی کە بۆ لەنگەرڕاگرتنی فڕۆکە بە لاتەنیشتەکانیەوە نوساون □ « سمێڵ باڵی تەیارێ + بە دەرویێدا دێتە خوارێ » ( فۆلکلۆڕ ) . ٤ـ واحیدی پێوانەی درێژایێ ، لە سەری لوتەوەیە تا سەری پەنجەی ناوەڕاست :: ئەو گوریسە حەوت باڵ درێژە . تێب ـ ووشەی ( پەرێنە )ی ئاوێستایێ بە مانای ( فڕین )یش و ( باڵ )یش هاتوە .

**باڵ بەسەرکێشان ـ** ( کن.) ١ ـ بلاوبونەوەی شتێك بەسەر شوێنیدا :: تاریکایێ باڵی بەسەر هەمو لایەکدا کێشاوە . ٢ـ تم : خستنە ژێر باڵ /٢ :: وەکو جوامێران باڵی بەسەر ئەو هەتیوانەدا کێشا و نەیهێشت پەرتەوازەبن .

**چونەبن‌باڵ ـ** ( کن.) ١ـ شانی خۆخستنە بنەنگلی کەسێکی ناتوانێ لە جێی خۆی هەڵستێ ٢ـ خۆدانە پەنای کەسێك . ٣ـ تم : دەستدانە باڵ ★ چونەژێرباڵ . **چونەژێرباڵ ـ** (کن.) تم : چونەبن‌باڵ .

**خستنەبن‌باڵ ـ** (کن.) تم : خستنەژێرباڵ . **خستنەژێرباڵ ـ** ( کن.) ١ـ پەنادانی یەکێك . ٢ ـ پاراستنی کەسێك لە مەترسێ یا لە دەستدرێژێ خەڵك ★ باڵ‌بەسەرکێشان /٢، خستنەبن‌باڵ، گرتنەبن‌باڵ ، گرتنەژێرباڵ .

**دەستدانەباڵ ـ** ( کن. ) بارمەتی‌دان ★ چونەبن‌باڵ /٣ .

**گرتنەبن‌باڵ ـ** ( کن.) تم : خستنەژێرباڵ . **گرتنەژێرباڵ ـ** ( کن. ) خستنەژێرباڵ . **لە شەقەقەی‌باڵدان ـ** (کن.) هەڵفڕینی بە گوڕی باڵندە و پەلەوەر بە جۆرێ کە دەنگی وێك‌کەوتنی سەرباڵیان دەبیسترێ □ « ... کچی شامەڵشای پەریان جلەکانی خۆی دەبەرکردەوە و بۆ بە کوترێك و لە شەقەقەی‌باڵانی‌دا ...» ( فۆلکلۆڕ ) .

**٢ـ باڵ ـ** ( نا.) ، (مک.) ١ـ تم : پاڵ :: لەو حەوشەدا چەند ماڵ دەباڵ یەك‌دان . خۆیان جێیان نابێتەوە ماڵێکیشیان دەباڵ خۆیان ناوە . ٢ـ تم : باغەڵ /٢ :: ئەرێ ئازاد کچی کێی دەباڵدایە ؟ .

**بالا ـ** [ پە : بالاد = بەرزایێ ] ، ١ـ ( نا.) درێژایێ بەژنی ئادەمیزاد □ « ... بالای بە بالای گرتوە ، دوو پەنجە کورتێ دێنێ » (فۆلکلۆڕ) . ٢ـ ( ص.) سەر ، بەرەژور ، درێژ :: دەستێکی بالای لە کێمیادا هەیە.

**بالآبسته** ــ [ بالآ/١ + بست + ەــ ئـه/١ ] ، (صـــتـ. ، نتـ. ) ئادەمیزادی کورتەبالآ ( بالآی بـــه قەدەر بستێکە ) ، ( عا.) قزم .

**بالآبەرز** ــ ( صتـ.) ١ــ حـــالی ئینسانی درێژ ، حالی کەسێـــکی بالآی درێژبێ ★ کەلـــەگەت ٢ــ ( کنـ.) ئادەمیزادی شۆش و باریك و بەژن ڕێك و پێك . ☐ « خاستەر جە زومڕەی ئەو بالآ بەرزان + بـــە ڕێزەی ڕازان شەکەر کەرد ئەرزان» ( خانا ــ ٢٠٦ ) .

**بالآبەرزە** ــ [ بالآبەرز + ەــ ئـه /١ ] ، ( نتـ.) ، ( سیمـ.) پەنجـــەی هەرە درێژی دەستی ئادەمیزاد ، قامکی ناوەڕاستی دەست .

**بالآبەژن** ــ (نتـ.) ، (مکـ.) تم : ئاوێنە ( ئاوێنەی بالآبەژن ) .

**بالآپۆش** ــ (نتـ.) ، ١ــ [ بالآ/١ پۆش ( پۆشین) ] هەر جلوبەرگێکی سەرتاپاخواری مـرۆڤ داپۆشـێ ☐ « ئەگەر مەیلەکەت فەرامۆشـــم بێ + سفێدی کەفەن بالآپۆشم بێ» ( فۆلکلۆڕ ) .

**بـــالآدەس** ــ ( صتــ.) تمــ : بالآدەست .

**بالآدەست** ــ [بالآ /٢ + دەست]، ( صتـ.) ، ( مکــ.) دەســتڕۆیبو ، دەستڕۆیشتو ، حالی کەسێکی دەستی بڕوا و خاوەن دەستەلآتبێ ☐ « مــن قـاپێ جـەو بــۆن جە تۆ نەبەستم ! + یانی بزورگم ، یا بالآدەستم » .

(خانا ــ ٥٠٨)

**بالآدەستە** ــ [ بالآ / ١ + دەستە ( نەگەورەنەپچۆك ) ] ، (صتـ.) ، ( مکـ.) حالی منداڵێکی خەرێكبــێ هەڵبدا ، بالآی دەستیکردبێ بـــه درێژبۆن .

**بالآدەســـــتی** ــ ( حمـــصـ. ) دەستڕۆیشتویی ، دەستەلآتداری ، بە دەستەلآتی .

**بالآڕوان** ــ [ بـــالآ /١ + ڕوان (ڕوانـــین) ] ، ( نتـ.) تم : ئاوێـــنە ( ئاوێنەی بالآڕوان ) .

**بالآشمه** ــ ( نا.) ، ( سنـ.) تمــ : بالیشمە .

**بالآفڕ** ــ [ بالآ /٢ + فڕ (فڕین)]، ( نتـ.) ، ( بکـ.) فڕۆکە ، تەیـارە . تێبـ ــ ئەم ووشەیە لە جەنـــگەی شەڕی دوەمـــــدا ، کە ڕادیـــۆی ( بێڕۆت ) دەنگ‌وباسی بە زمانــــی کوردێ بلآودەکردەوە ، داتاشراوە.

**بالآکردن** ــ ( مصتـ. لا.) ، (مکـ.) ١ــ زیادبۆنی درێـــژایێ بەژنـــی درێژایێ بەژنی ئادەمیزاد . ٢ــ ( کنـ.) گەورەبۆنی مەعنەوێ :: زۆرم پێخۆش‌بۆ تەشرێفتان هێنا ، باوەڕ فەرمۆن گەز گەز بالآم کرد . ٣ــ بەرزبۆنەوەی گژوگیا ، هەڵچۆن و گەشەکردنی شێناوەرد .

**بالآگرتن** ــ ( مصتــ. لا.) تمــ : بالآکردن . تێبـ ــ بالآکردن وەختێك دەکـــاردەکرێ کە گەورەبـــۆن ، درێژبۆن و گەشەکردنەکە ، شتێکی پێویست و تەبیـــعێ بێ ، بــەلآم بالآگرتن بۆ کارێـــکی چـــاوەڕوان نەکراوە .

**بالآنشین** ــ (نتـ.) کەسێکی جێگای لەلای سەرۆی مەجلیســـان بێ ،

پیاوی گەورە و ماقوڵ □ « ئەمێستەش شێخ عەلیێ بالأنشێنی ئەوجی ئیرشادە + ئەویێش وەك باوك و باپیری لە زومرەی ئەولیا مەعدوود » ( شێخ رەزا ــ چاپی ئەنجومەنی ئەدیبان ) .

**بالأنشینی ــ** ( حمـصـ . ) ١ــ لەلای ژوروی مەجلیسان دانیشتن . ٢ ــ ( کنـ . ) ماقوڵی ، گەورەیی .

**بالأنوان ــ** [ بالأ/١ + نـوان ( نواندن ) ] ، ( نتـ . ) تم : ئاوێنە ( ئاوێنەی بالأنوان ) .

**بالأنوێن ــ** [ بالأ/١ + نوێن ( نواندن ) ] ، ( نتـ . ) تم : ئاوێنـە ( ئاوێنەی بالأنوێن ) .

**بالباز ــ** [؟] ، ( نتـ . ) ، ( کعر . ) سەرباز ، عەسکەر . هـس : بلباس ( ناوی عەشیرەتێکی کوردە ) .

**باڵبەستکردن ــ** [ ١ــ باڵ /٢ + بەست ( بەستن ) + کردن ] ، ( مصتـ . متـ . ) تم : باڵـەبەستن . تێبـ ــ ووشەی ( بەست ) لـەم ووشەیەدا ( بەستە )یە بە مانـای ( بەستراو ) کە سیفەی مەفعولە لـە مەصدەری ( بەستن ) .

**باڵبەستن ــ** [ ١ــ بـاڵ/٢ + بەستن ] ، ( مصـتـ . متـ . ) هەردوو دەستی کابرایـەك لە پشتـەوە بەستن . :: خێرا باڵی ئەو دیلانـە بەستن و بیانبەن بۆ چـەم . ئەمنیە باڵی ( عەولای ئـاغا )یـان بەستبوو هێنایـانە لای ئاغـای ( مادرۆج ) . ★ باڵبەستکردن .

**باڵچوغە ــ** [؟] ، ( نـا . ) ئەو جێگایەی شێر کە دەستی پێدەگرن . دەسکی شمشێر . □ « . . . دەستت بۆ باوێمە سەر باڵچوغەی شێران ، کێلانانت بۆ بەجێ بێڵم لە بنەبانیی (دمدمییە) .

( تحفە ، ب١ ، ل ــ ٢٠٢ )

**باڵدار ــ** [ ١ــ باڵ/١ + ٢ــ دار ( پب . ) ] ، ( نتـ . ) ئەو گیاندارانەی باڵیان هەیە و دەفڕن . ● **باڵدار هاتوە باڵی وەرانـدوە ، نـاڵدار هاتوە ناڵی وەرانـدوە ــ** ( کنـ . ) جێگایەکی پڕ مەترسییە کە هەرکەس ڕووی تێکردوە ڕزگاری نەبـوە ★ باڵندە ، پەلەوەر ، مەل . ( جنـو . ) باڵونە . ( سنـ . ) باڵنە .

**باڵشکان ــ** ( مصـتـ . لا . ) ١ــ توانستی فڕینەمانی بـاڵندەیەك لەبەر ئەوەی باڵی ئازارێکی پـێ گەیشتبێ یا شکابێ . ٢ــ ( کنـ . ) تووشی بەدبەختیبون ، بێچارەبون ، سەرنەکەوتن .

**باڵشکاندن ــ** ( مصتـ . متـ . ) ١ــ شکاندنی باڵی پەلـەوەرێك . ٢ــ ( کنـ . ) بێچارە و بێ دەستەڵاتکردنی کەسێك ★ لەباڵدان .

**باڵشـکاو ــ** ( صمـفـ . ) ١ــ پەلەوەرێکی باڵی شکابێ . □ « هەر دەڵەی لەگەڵگی باڵشکاوە » ٢ ــ بێچارە ، تێشکاو ، سەرنەکەوتوو .

**باڵق ــ** [ محر . عا : بالـغ = پێگەیشتوو ] ، ( صـ . ) ، ( مـکـ . ) حاڵی کوڕ یا کچێکی شەیتـانی پێکەنیبێ ، کوڕێکی هـەوەسی ژن بکا ، کچێکی هەوای شوی کەوتبێتە سەر . تێبـ ــ ١ ) بەگشتیێ لە دەوری ١٥/١٤ ساڵیدا هـەوای (ژن) و

(پیاو) دەکەوێتە سەری ( کوڕ ) و (کچ) . ب ) لە کوردەوارێدا باوبوو بۆ ئەوەی بزانن کوڕێك بالق بوە یان نا ، لێیان دەپرسی : ( خوێ ) قورسترە یا ( گەنم ) ؟ ئەگەر ووتبای (خوێ) ، ئەوا دەیانگوت بالق بوە و دەزنوێژی لێ دەشکێ .

**بالق‌بۆن** ــ [ عا. کو. ] ، ( مصد. لا.) پێگەیشتنی کوڕ یا کچ ، گەیشتنە تەمەنێکی ئینسان هەوەسی ژن‌هێنان یا مێردکردن دەکا .

**باڵ‌گرتن** ــ [ ١ــ باڵ/١ + گرتن ] ، ( مصد. لا.) ١ــ فێرە فڕین‌بۆنی بەچکەی باڵندە :: ئەم بێچوە چۆلەکەیە تازە خەریکە باڵ دەگرێ . ٢ــ ( کن.) خێرا ڕۆیین :: ئای‌ئای ! خۆ وەتمان هەر دەلەی باڵی‌گرت ، چ زۆ دەرپەڕێ . ★ باڵ‌گرتنەوە .

**باڵ‌گرتنەوە** ــ ( مصد. لا.) ١ــ هەلفڕینی مەل لە شوێنێکی کە بۆ ماوەیێکی کەم لێی نیشتبێتەوە :: کۆترێك لەسەر ئەم دارە بۆ پێش پێی تۆ باڵی‌گرتەوە . ٢ــ تە : باڵ‌گرتن /٢ .

**باڵنج** ــ [ پە : بالێن ] ، ( نت.) ، ( مک.) سەرێنێکی چوارگۆشەی درێژۆکەیە لەکاتی نوستنا دەخرێتە بان سەرێنی خڕ ، یا لە دانیشتنا شانی ( ١ــ باڵ /٢ ) لەسەر دادەدەن . تێب ــ ١ ) دەنگی (ج) لە دوایی ئەم ووشەیەدا بەلای منەوە یا ( چە )ی ئامرازی پچۆکییە و گۆڕاوە یا ووشەی ( جێ )یە و کورت بۆتەوە . ب ) ناواخنی باڵنج زیاتر پەڕە مرێشکە و دەکرێ لۆکە یا وورده خورێش‌بێ .

**باڵندە** ــ [ ١ ــ باڵ /١ + ئندە]، ( نت.) تە : باڵدار .

**باڵنگ** ــ [ پە : ڤاترەنگ ] ، ( نت.) ، ( کئێر.) مێوەیەکە لە جسنی پرتەقاڵ و نارنج ، توێکڵی زر و ئەستور و زەردە، درێژۆکە و گەورە و قورسە ، بۆنی خۆشە ، دەکرێتە مرەبا و شەربەت. ( عا.) کەباد . ★ تورنج .

**باڵویز** ــ ( نا.) تە : باڵیۆز .

**باڵویزخانە** ــ ( نت.) تە : باڵیۆزخانە .

**١ــ باڵەبان** ــ [؟] ، ( نا.) باڵندەیەکی ڕاوکەرە ، لە بناز پچۆکترە ، باڵی و کلکی درێژن ، ڕەنگی کەوەیە و پەلەپەلەی ڕەش و سپی تێدایە ، تیژباڵ و خێرایە ( عا.) صقر . ★ چەرخ ، ( سن.) باڵەوان .

**٢ــ باڵەبان** ــ [ ڕۆسی : بارابان]، ( نا.) ١ــ تەپڵی گەورە ٢ــ ( مج.) پیاوی زەبەلاح و ناقۆڵا . ٣ــ (مج.) ئێستری زەلام . ★ ( سن.) باڵەوان

**باڵەتەپە** ــ [١ــ باڵ/١ + ٣ــ ئە /٢ + ٢ــ تەپ ( ند.) + ٥ــ نە/١ ] ، ( نت.) ، ( مک.) باڵ‌لێکدانی پەلەوەرێك کە تەقەلای فڕینێتی و توانستی نیە . تێب ــ ئەم باڵندەیە یا هێشتا ساوایە و فێرە فڕین نەبوە ، یاخۆ باڵی ئازارێکی پێگەیوە و پەکی فڕینی خستوە ، بۆیە باڵەکانی لێکدەدا و

نەپەتەپی لێوە دێ . ★ باڵەتەپێ ، باڵەفڕکێ . باڵەفڕێ .

**باڵەتەپێ** ــ [ ١ــ باڵ/١ + ٣ــ ئە/٢ + ٢ــ تەپ + ئێ ] ، ( نت.) (سیم. ، سن.) تم : باڵەتەپە . :: ئەم قەلەباچکەیە هەر باڵەتەپێی ( باڵەتەپەی ) بۆ منێش گرتم . تێب ــ ١ ) وا وێدەچێ (ئێ)ی دوایی ئەم ووشەیە و گەلێ ووشەی تری لەم چەشنەش ، یا ئەسلی (ئێن) بێ یا لە ئەسلا ( ئێن ) بوبێ ، کە ووشەکە دەبێتە ( باڵەتەپێن ) بە مانای تەپەتەپ بە باڵکردن . ب) من لە بەرگی یەکەمی ئەم قامۆسەدا (ئێن)م نۆسیوە بەلام هەستم بەم کارەی کە لەم ووشەیە و هاوچەشنەکانیدا، (ئێ) دەیکا ، نەکردوە و نەمنۆسیوە.

**باڵەخانە** ــ [ بالا/٢ + خانە ] ، ( نت.) ، ( مک. ، سیم.، سن.) ، ژور یا چەند ژورێ کە لە سەرەوەی خانۆ دروست دەکرا ( چونکو خانوی کۆنی کوردەواری زیاتر یەك نهۆم بون ) . □ « ... جا ناردیە کن کوری خۆی : رۆلە تەدارەکم بۆ گرتوی ، رۆلە رۆژی جومعەی دەبێ واریە ببی بە کۆشك و باڵەخانەی خۆت » ( تحفە ، ب١ ، لــ ٢٢٥). ★ ( سن.) ، سەرخان ( جنو.) بالاخۆنە .

**باڵەشۆرە** ــ [ ١ــ باڵ/١ + ٣ــ ئە/٢ + شۆر + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نت.) ، (مک.) دەردێکە تۆشی مریشك و جوجەلە دێت ، باڵیان فش دەبێتەوە و بەلادا دێن . ★ ( سن.) باڵەشۆرێ . پەلەپسکێ

**باڵەشۆرێ** ــ [ ١ــ باڵ/١ + ٣ــ ئە/٢+شۆر + ئێ ] ، ( نت.) ،(سن.) تم : باڵەشۆرە . تێب ــ بۆ کەرتی ( ئێ ) تم : باڵەتەپێ ( تێب ــ ب ) .

**باڵەفڕکێ** ــ [ ١ــ باڵ/١ + ٣ــ ئە/٢ + فڕ (فڕین) + ٥ــ ئە/١ ]، (نت.) فڕینی کەمماوەی مەلێکی تازە باڵی گرتبێ . هس : باڵەتەپە .

**باڵەفڕێ** ــ [١ــ باڵ/١ + ٣ــ ئە/٢ + فڕ + ئێ ] ، (نت.) تم : باڵەتەپە . تێب ــ بۆ کەرتی (ئێ) تم : باڵەتەپێ ( تێب ــ ب ) .

**باڵەکەو** ــ [ بالا/١ + ٢ــ کەو ] ، (نت.) ، (مک.) لە (کەو) و بێژینگدانی خەرمان پاش سورکردنی بۆ ئەوەی ( چەت )ی لێ جودابێتەوە . تێب ــ ئەم کارە بە پێوە دەکرێ و ( کەو )ەکە بەقەد بالا بەرز دەکرێتەوە .

١ــ **باڵەوان** ــ [؟] ، (نا.) ، ( سن.) تم : ١ــ باڵەبان .

٢ــ **باڵەوان** ــ ( نا.) ، ( سن.) تم : ٢ــ باڵەبان .

**بالۆن** ــ [ لەفرەنسێ : بالۆن کە لە (پالۆن)ی ئیتالی وەرگیراوە]، (نا.) ، (کثیر.) تم : بالافڕ تێب ــ ئەم ووشەیە لە هێندێ زمانانی ئوروپایێدا بە مانای ( کورە )یەکی گەورەیە کە لە قوماشی تایبەتی دروستدەکرێ و پڕی دەکەن لە ( غاز )ێکی سوکتر لە هەوا و بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان ، بەلام لە موکریان ناوێکە بۆ ( فڕۆکە ) وادەزانم چونکو بۆ یەکەمجار فڕۆکە لە جەنگەی شەڕی یەکەمدا هاتۆتە

ئاسمانی موکریان و ئەوکاتە لەشکری عوسمانیَ لیَ بوە ، ئەم ناوە بە مانای فڕۆکە لە زمان ئەوانەوە کەوتۆتە سەرزمانی کوردان ، ئاشکرایە کە لە باری زانستەوە جیاوازیَ زۆر لە نێوان ( باڵۆن ) و ( فڕۆکە )دا هەیە .

**باڵیۆز** ــ ( نا . ) ١ــ نوێنەری دەولەتێك لەلای دەولەتێکی دیکە . ٢ــ بەگشتیَ هەرکەسێك لە دەولەت یا کەسێکەوە پەیامیَ بۆ دەولەت یا کەسێکی تر بەریَ . ★ ئێلچیَ ، باڵوێز ، سەفیر ، قاسید . تێبـ ــ عوسمانیَ ئەم ووشەیان لە قالبی ( بالیۆس)دا لە زمانی ئیتالیَ یا یۆنانیَ خواستۆتەوە و بە شکڵی ( باڵوێز ، باڵیۆز ) هاتۆتە ناو زمانی کوردیَ .

**باڵیۆزخانە** ــ (نت.) ، (تت.) ئەو خانوبەرەیەی دەزگا و دایرەی سەفیری دەولەتێکی لە وولاتێکدا ، لیَ دادەمەزریَ . :: باڵیۆزخانەی عێراق لە مۆسکۆ . ★ باڵوێزخانە (کعر.) سەفارەت . (کئێر.) سەفارەتخانە .

**بالیشمە** ــ [؟] ، (نا.) داریَ یا دارانێکن کە بەسەر دیواری خانودا درێژ دەکرێن و ئەوسەرەوسەری دارەکانی دارەڕای خانونیان دەخرێتە سەر ، تا ڕاستەوخۆ قورسایی نەکەوێتە سەر دیوارەکە . تێبـ ــ بەلای منەوە ئەم ووشەیە دەگەڵ (بالیشنە )ی زازایی بە مانای بالێف، سەرێن ( تم : ژابا ــ ٣٦ ) یەکن ، لە ڕاستیشدا داری دارەڕا سەردەکەنە سەر ( بالیشمە ) هەروەکو مرۆڤ سەر وەسەرێن دەکا .

**باڵیَ** ــ [محر. عا : بلی ] ، (بن.)، ( مک.) تم : بەڵیَ . تێبـ ــ هەرچەندە ئەم ووشەیە هەر ووشەی (بەڵیَ)یە، بەلاَم شێوەی تایبەتیَ بەدەمدا هاتنی وای لێکردوە کاری ( بەڵیَ ) نەکا و سەرسوڕمان و گاڵتەپێکردن بگەیێنیَ .

**بام** ــ ( ئە . ) ، (سیم.) تم : ٢ــ با/١ .

**بامجان** ــ (نا.) ، (سن.) تم : باینجان /١ــب .

**بامجانفەرەنگی** ــ (نت.) ، (سن.) تم : باینجان /٢ــ ب .

**بامیَ** ــ [؟] ، (نا.) ١ــ گیایەکی دەسچێنی گەلاَ پانی یەکسالەیە ، گەلاَکانی وەگەلاَی گوڵە هێرۆ دەچیَ، گوڵێکی جوانی سپیَ مەیلەو زەردی شینباوی هەیە ناوەڕاستەکەی قاوەییَ مەیلە و سورە . ٢ــ بەری ئەم گیایە کە درێژۆکە (وەکو بەڕۆ)و پڕتوو ، نوك تیژ و تراشە . دەگەڵ گۆشت و تەماتە دەکرێتە خۆرشت ( شلە ) یا شۆربای گۆشت . ٣ ــ جۆرێك شیرنیاتە بە شکڵی بامیە /٢ ، لە ماست و نیشاستە دروست دەکریَ و دەڕۆنا سوردەکرێتەوە و دەشیرەی شەکر یا هەنگوینی قالکراو هەڵدەکێشریَ .

**١ــ بان** ــ [ پە : بان ]، ( نا.) ١ــ تەختاییَ سەرەوەی خانو لە دیوی دەرەوە ، پاش ئەوەی دارەڕا و گلەبان دەکریَ و سواغ دەدریَ .

ئەو شوێنەی خانوکە هاوێنان خەڵك لەبەر گەرما لێی دەنوون . ★ (مکـ.) سەربان. (بکـ.) بان ، سەربان بانێ. (جنو.) بوّ ، سەربوّ ● **بانێکە و دوو هەوا** ــ (کنـ.) فەرق و جیاوازیی لە تاقە شتێکا بوّ کەس یا بوّ دوو مەبەست . ٢ــ دەشتایێکی لەچاو دەوروبەری خوّی بڵیندتر بێ :: بانی هوّبەتوو ، بانی مەقان ★ (مکـ.) بانوو ، (بکـ.) بانی . ٣ــ سەر ، ژوور :: « بێخەرە بانی » ، کڵاوەکەی نایە بان سەری ، تانجیەکە نێشتە بان کەروێشکەکە ، کتێبەکە وا لە بان مێزەکە . ٤ــ ( ئمـ.) بوّ نیشاندانی حاڵی دوو شتان کە لەچاو یەکتریی لە حاڵەتی بەرزیی و نزمیدابن ، یەکیان لەوی دیکەیان بەرزتر بێ .

**٢ــ بان** ــ [؟] ، (ریـ. فعـ.) ، ( مکـ.) کاری وەخوّگرتنی بەرخ و کارێلە لەلایەن مەڕ و بزن . ● **بە سەر دەبانێ ، بە قوون نابانێ** ــ أ ) بە مەڕێ دەگوترێ کە بەرخ وەخوّ بگرێ و بێلێسێتەوە بەڵام نەیەڵێ بێمژێ . ب) ، ( کنـ.) ژنێکی تەواو ڕام نەبوبێ و خوّ بە دەست مێردەوە نەدات . تێبـ ــ أ ) ئەم ووشەیە بەو شێوەیەی کە لە مەتەڵەکەی سەرەوەدا دەکارکراوە ، دەبێ لە مەصدەرێکەوە هاتبێ ، هەروەکوو دەڵێن دەنازێ لە مەصدەریی ( نازین ) یا دەبارێ لە مەصدەری ( بارین ) ، کاتێ دەشڵەین ( دەبانێ ) یا ( نابانێ ) بەو جوّرەی لە مەتەلەکەدایە ، دەبێ بڵەین دەبانێ لە مەصدەری ( بانین ) هاتوە ، بەڵام ئەم مەصدەرە لازمە قەت نەبێستراوە ، ب ) ئەوەندەی پێم شك بێ لەو مەصدەرە نەبێستراوە یا گومبوە ٢ ووشەی ( بانوك ) و (نەبان) کەوتونەوە و لە مەتەڵەکەشدا لە حاڵەتی مضارعی ( دەبانێ ) و (نابانێ)دا دەیبینین .

**بانئەنو** ــ [ ١ــ بان + ئەنو ] ، ( نتـ.) ، (هو.) تم : بانەناو . تێبـ ــ کەرتی ( ئەنو ) ڕێشەی مەصدەری ( هەنوون )ە کە لە (هەندوتەن)ی پەهلەوی کەوتوتەوە .

**باناندن** ــ [؟] ، (مصتـ. متـ. ) کارێلە و بەرخی ساوا وەبەر بزن یا مەڕ ( غەیری دایکیان ) خستن . کارێکی ( بانوك ) دەیکا . تێبـ ــ تەنیا خوالێخوّش‌بو ماموّستا ( گیو ) ئەم ووشەیەی نوسیوە ( تم : مەهاباد ــ ٦٢ ) و ئاوای مانا لێداوەتە : معاینه. تعطيف الحيوان على غير وليده . هس : ٢ــ بان ( تێبـ ــ أ ) .

**بانبارگە**ــ [ ١ــ بان/٣+بارگە ] ، (نتـ.) بەربوك یا هەر ژنێکی دیکە ، کە لەسەر بارگەی جیازیی بوکەوە سوار دەبێ و لە ماڵی بوکێڕا دەچێتە ماڵی زاوا .

**بانبانك** ــ [؟] ، (نتـ.) ، ( مکـ.) گیاندارێکی کێویە لە شێوەی ( سموّرە ) ، دەستەکانی لە قاچی کورت‌ترن ، ڕەنگی بەپێی فەسڵی ساڵ دەگوڕێ ، کەوڵەکەی بوّ هێندێ شتی وەکوو ( کیسەباخەڵ) و ( بەرگەکالان ) بەکەڵك دیت ، بوّیە لە زستانا کە ڕەنگی سپێ و جوان دەبێ زیاتر هەوڵی ڕاوکردنی

دەدرێ ، لەناو (غەڵ)ە بەردانـــدا دەژێ ، لەناو کوردەوارێ دەڵێـن ئەم گیاندارە پارەی زێڕ دەدزێ و دەیشارێتەوە .

**بان‌بانەگا** ــ [ ١ــ بـــان/٣ + بانەگا ] ، (نتە.) ، ( سـنە.) تمـ : بەسولدان .

**بان‌پۆشێن** ــ [ ١ــ بـان/٣ + پۆشێن ] ، ( نتە.) خشڵێکی ژنانەیە، لە ئاڵتون یا زێو دروست دەکرێ و لەسەر ( هەورێ ) دەبەسترێ . ★ ( مکـ.) لاگیرە .

**بان‌تلێن** ــ [ ١ــ بان/١ + تلێن ( تلاندنەوە ) ) ، ( نتە.) تمـ : باگردان.

**بانجیلـە** ــ [ ١ــ بـان/١ + جێلە ؟ ] ، ( نتە.) ، ( سنە.)١ــ تمـ : بانێژە /١ و ٢ . ٢ــ سەکۆیەکە لە بەردەمی خانوەدا دەکرێ ( تمـ : مردۆخ ب ١ ، ل ــ ١٠٩ ) .

**بـــان‌دان** ــ [ ١ــ بان/٣ + دان ( فعـ.) ] ، (مصتـ. متـ.) شـــتێك بەسەر شتێـــکی دیـــکە دادان ، وەســـەرکردن ، وەســەردان ، پێدادان :: ناشتمان و خۆڵمـــان بان‌دا ، «بخەفە بانت دەم » بخەوە تا لێفەت پێدادەم یا دات‌پۆشـــم ، دوێشەو بان خۆی نەدابۆ سەرمای بوە .

**باندرۆڵ** ــ [ فرەنسێ ] ، ( نا.)، ( کئێر.) تێزمالــکە کاغەزێـــکی درێژۆکەیە، دێوێکی هەندێ نەخشی لەسەر چـاپ دەکرێ و دێوەکـەی دیکەشی چرێشـی لێ دەدرێـت ، میقدارێك پارە ( دە فلس ، پێنـج قران ، ... ، ... )ی لەســـەر دەنوســـن و بە هەنـدێ شتـەوە ( پـاکەتی جـگەرە ، شوشـەی ئـارەق و ... ، تریـــاك و ... ) دەنوسێندرێ و نیشـــان دەدا کە دەوڵەت ( ڕەسم )ی خۆی لەم شتە وەرگرتوە . تێبـ ــ ئەم ووشەیە لـە فرەنسێ ڕا بۆ زمـــانی فارســـێ خوازراوەتەوە و لەم ڕێگایەشــەوە هاتۆتە ناو زمانی کوردێ و پاشان فەرهەنگستانی ئێران ، لە ســاڵانی پێش شەڕی دوەمـدا ووشـــەی ( نەوارچەسپ )ی بەرامبەر داناوە. ★( کعر.) عا : مەکس ، مەکۆس .

**بان‌سەرە**ــ [ ١ــ بان/٣ + ١ ــ سەر + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نتە.) خشڵی ژنانەیە ، دراوی زێڕ یا زێوە کە لە تەپڵەسەری تەقێلە یا تاسکڵاو ... بۆ جوانێ دایدەدروون .

**بانق** ــ ( نا.) ، (کعر.) تمـ : بانك /١ .

**بـــانقۆ** ــ (نا.) ، (کعر.) تمـ : بانك /٢ و ٣ .

**بانك** ــ [ فرەنسێ ] ، ( نا.) ، ( کئێر.) ١ــ ڕێکخراوێکی ئابوری ، دەوڵەتی یا تایبەتییـــە کە خەڵـکی پارەوپوڵی خۆیانی بە ئەمانەت لـێ دادەنێن و لەکاتی پێویستا چـەك ( صەك ) دەنوسن و چەندی بیانەوێ خۆیان یا ئەو کەسەی چـەکەکەی بەناوەوە نوسرابێ وەریدەگرنەوە . هەر وەها بەپێی بـڕوای خـــۆی ( ئیعتیبـــار ) بۆ هێنـــدێ کەس دیاری‌دەکا ، ئەو کەســانە ئـەگەر پارەی خۆشیان لە بانـــکا نـەبێ دەتوانن تا ئەو ئەندازەیەی بانك بۆی

داناون ، پارە وەربگرن . کاری بانکەکان ئێستا زۆر لقی لێ بۆتەوە ، بۆ گەلێ لایەنەکانی ژیانی ئابوری وولاتێك بانکی جیاجیا پەیدا بون . :: بانکی کشتوکاڵ . بانکی ڕەهنێ بانکی عەقاری و . . . و . . . ★ (کعر.) بانق. ، ( عا. ) مصرف.
٢ــ قومارێکە بە پەڕان دەیکەن .
٣ــ ئەو پارەیەی کە لەو یاریەی لە ژمارە دۆدا باس‌کرا کۆدەبێتەوە و یاریکەرێ بە ڕێکەوت هەموی بەجارێ دەباتەوە . ★ ( کعر.) بانقۆ ( بۆ ٢ و ٣ ). تێبـ ــ ئەم ووشەیە لە ڕێگای زمانی فارسی‌ڕا هاتۆتە ناو زمانی کوردێ لە کوردستانی ئێران و هاوتایەکەشی ( بانق ) لە دەوری دەستەڵاتی عوسمانیدا بەهۆی ئەوانەوە هاتۆتە ناو زمانی کوردێ لە کوردستانی عێراق . زمانی فرەنسێش ئەم ووشەیەی لە ووشەی ( بانکا )ی ئیتالێ بە مانای (پێشخوانی سەڕافان ) خواستۆتەوە ( تم : لاڕۆس ــ ٨٨ ) .

**بان‌کوتان ــ** ( مصد. مت.) تم : بان‌کوتانەوە .

**بان‌کوتانەوە ــ** [ ١ــ بان/١ + کوتانەوە ] ، ( مصد. مت.) شێلانی بانی خانۆ بە قاچ و پێ‌لەقە ، لە وەختی باران و دلۆپەی کەمدا ★ بان‌کوتان .

**بانکە ــ** [ ڕۆسێ ] ، (نا.) ، (مک.)
١ــ کۆپەلەیەکی شۆشەیە لە شێوەی ئوستوانە دروست‌کراوە ، شێرینات و مرەبا و ئەو جۆرە شتانەی تێدا هەڵدەگیرێ . ٢ــ تم : باکێش /٢ تێبـ ــ ئەم ووشەیە لە ڕێگەی زمانی ئازربایەجانێ یا بازرگانی ڕاستەوخۆی کوردستان دەگەڵ ڕۆسیای پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر هاتۆتە ناو زمانی کوردێ .

**بانگ ــ** [ پە : ڤانگ ] ، ( نا.)
١ــ دەنگی بەرز :: کچێ دە بێبڕەوە ئەم بانگ و هاوارەت لە چیە ؟ ★ ( بك.) بان ، بانگ . ( زا.) ڤێنگ ( تم : ژابا ــ ٣٧ ) . هاوار ، قاو . هس : (هر.) وانا : خوێندن . ٢ ــ ئەو دوعا و قسانەیە کە بەپێی ڕێ‌وشوێنی ئیسلامەتێ ، شەو و ڕۆژێ پێنج جاران لەسەر بانی مزگەوتان یا لەسەر منارە ( ئێستا بە میکرۆفۆن) ، یەکێك پڕ بە دەنگی خۆی دەیانخوێنێ و مسولمانان ئاگادار دەکا کە وەختی نوێژە . ★ ( جنو.) ئەزۆ ( لە عارەبێ : اذان )

● **بانگی محەمەدی بە ئاشکرا خۆشە ــ** ( کنـ.) کاری چاك پێویست بە شاردنەوە ناکا .

**بانگ بەگوێدادان ــ** ( مصد. مت. ) خوێندنی ئەو دوعایانەی کە لە دینی ئیسلاما بۆ ( بانگ /٢ ) دیارکراوە ، لەبن سەری منداڵی ساوای تازە لەدایك‌بۆ . تێبـ ــ ئەم کارە چەند ڕۆژێ پاش بونی منداڵ دەکرێ ، شەوێك بەپێی حاڵ خێزانە خاوەن منداڵەکە ، دۆست و خزم و کەسی خۆیان و مەلایەك بانگ دەکەن بۆ نانخواردن و ناونانی مناڵەکەیان قۆنداغەی منداڵەکە لە شوێنێك دادەنێن و ( مەلا ) لەلای ڕاستی سەرێ‌ڕا دەوەستێ و بانگ

دەدا ، پاشان بە دەنگێکی بەرز ئەو ناوە دەڵێ کە دایك و بابی منداڵەکە پەسندیـــان کردوە و دەبێــژێ : « ئەوە ناومان نا ...» . **بـانگی بێ واده** ــ (نتـ.) ئەو بانگەیە (بانگ /٢) ــ کە لە وەختی گیرانی مانــگ و ڕۆژ ، بڵاوبونەوەی کۆلێرا و تاعون یا هەر بەڵایەکی تری لەم بابەتە بـە نیازی دورخستــنەوەی بـــەڵا و دورکەوتنەوەی خەڵك لەو شوێنەی بەڵا لێیداوە دەدرێ ، هەروەها لـە کاتی سوتمان و لافاو ... و ... بۆ ئاگادارکردنی خەڵك کە بچن بـە هاوارەوە . چونــکو بانگی نوێژان وەختیان دیارە ، هەر بانگێکی لـــە غەیری ئەم وەختانە بدرایە سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشا ، هەر بۆیەش ئەم نـــاوەی لێنـــدراوە . ★ بـــانگی بێ‌وەخت ، بانگی ناوەخت . **بانگی بێ‌وەخت** ــ (نتـ.) تم : بانگی‌بێ‌وادە. **بانگی ناوەخت** ــ ( نتـ.) تم : بانگی بێ‌وادە . ● **بانگی محەممەدێ بـە ئاشکرا خۆشە** ــ ( کنـ.) کاری چاك پێویست بە شـــاردنەوە نـــاکا . **کەڵەبابێکی بێ‌وادە بـانگ بــــدا سەری دەبڕن** ــ ( کنـ.) کارێکی لـــە وەختی خۆیا نەکرێ زیـــانی بـــــە دواوەیە . تێبـ ــ پێشونیـــان کە کەڵەشێرێکی ئاوایـــان سەربڕیوە ، لەوە ترساون کە هەستی بە بەڵایەکی لابەلا کردبێ !! بۆیە بانگ دەدا .

**بانگ** ــ [ ١ــ بان/٣ + ئگ ] ، ( صتـ.) ، (جفـ.) حاڵی هەر شتێکی لەسەرەوە . تێبـ ــ لە نێوان دەنــگی (ن.) و (گ)ی ئەم ووشـــــەیەدا ، بزوێنە کوردێ هەیە .

**بانگ‌دان** ــ [ بانگ /٢ + دان ( فعـ.) ] ، ( مصتـ. لا.) ئاگادارکردنی خەڵکێ لە وەختی نوێژان ، بـــەو جۆرەی ئیسلامـــەتی داینـــاوە □ « ئەڵلاهو ئەکبـــەڕ مەلابانگدانـــە + تاریك و لێــڵێ ڕوی ئاسمـــــانە » ( گۆران ) ★ ( جنو.) ئەزۆهەن .

**بانگ‌دەر** ــ [ بانگ /٢ + دەر ] ، ( نفا.) ئەوکەسەیە تەرخان دەکرێ شەو و ڕۆژ پێنج جاران لەســـــەر بانی مزگەوتان خەڵــکێ لە وەختی پێنج فەرزەی نوێژ ئاگادار دەکا . ٢ــ هەرکەسێکە کە ئەم کارە بکا با تەرخانێش نەبێ و هەمۆ وەختێکیش نەبێ ★ ( جنو.) ئەزۆچی . تێبـ ــ بۆ کەرتی ( دەر ) تم : ٢ــ ئە /٢ .

**بانگەری گاڕان** ــ (نتـ.) ، (کنـ.) گوێدرێژ .

**بان‌گردێن** ــ ( نتـ.) ، ( سیمـ.) تم : باگردان .

**بانگ‌ڕاهێشتن** ــ [ بانگ /١ + ڕا ( پێبفـ . ) + هێشتن ] ، (مصتـ. لا. ) ١ــ بە دەنگی بەرز مەبەستێــك بە جەماوەری خەڵکێ ڕاگەیاندن ★ جاڕکێشان، جاڕدان. بانگەوازکردن ٢ــ ( مجـ.) تم : بانگ‌لێدان .

**بانگ‌کردن** ــ [ بانگ/١+کردن]، (مصتـ. متـ.) ١ــ بە دەنگی بـــەرز ناوی کەسێ هێنـــان و داوایـــەك لێکردنی :: ئەوەندەی بانگیـــان‌کرد گوێی لێ‌نەبو . بڕۆ ماڵی شاسوار بانگی کە تا ئێرە بێ . ★ بانگێشتن. گازکردن . قاوکردن . ٢ــ مێمانی کردنی کەسێ ، دەعـــوەت کردنی

یەکێك بۆ نانخواردن لە شوێنێك ★ بانگێشتن‌کردن چڕین .

**بانگ‌کردنەوە** ــ ( مصت. متە. ) ١ــ تـم : باوەخـــون . ٢ ــ گەڕاندنەوەی کەسێك کە دەستی کردبێ بە دوورکەوتنەوە لە شوێنێك :: خێرا بانگی‌کەنەوە با ئەو نامەیەش هەر دەگەڵ خۆی بەرێ .

**بانگ‌لێدان** ــ [ بانگ/١ + لێ ( پێیف.) + دان ] ، ( مصت. لا.) هاوارکردن ، بەدەنگی بەرز نارەحەتی و پەژارەی خۆدەربڕین . □ «... چۆنە مالی هەیدەر گۆرانی ، جەنازەی برایان هەڵدەگرت و دەیانهێناوە ، بانگ لەسەر بانگیان لێداوە ، دەڵێ : « هیچ کەس وای لێ نەقەوماوە. » ( تحفە ، ب٢ ، ل ــ ٢٦٩ ) . ★ بانگ‌ڕاهێشتن/٢ . ( سن . ) هەڵدان .

**بان‌گلێر** ــ ( نت.) ، ( سن. ) تم : باگردان .

**بانگوش** ــ [ ١ــ بان/١ + گوش ( گوشێن ) ] ، ( نفا.) ، ( سیم.) تم: بانگێر .

**بانگ‌هەڵدان** ــ [ بانگ/١ + هەڵ ( پێبف.) + دان ] ، ( مصت . لا. ) ، (سن.) تم : بانگ‌لێدان .

**بانگەشە** ــ [ بانگ/ ١+ ١ــ ئاش/١ + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نت.) ١ــ بانگێکی فرۆشیاری هەندێ کالای لادێیی و کشتوکالی ( وەکومێوەو ...) لە ئاوایێدا دەیکا بۆ ئەوەی خەلك بزانن کە ئەو کالایە هاتۆتە ناو دێیەکەیان . ٢ــ ( تت. ) پڕۆپاگەندە ، دیعایە ، تەبلیغات . تێب ــ أ ) من وا تێدەگەم کە ئەم ووشەیە لە کوردەوارێدا بۆ ئەو مەبەستە بەکارهاتوە کە لە مانای یەکەمدا نیشانم داوە ، چونکو تەبلیغات و دیعایە کارێکی گەلێ تازەترە لەوەی لە زمانی کوردێدا ووشەیەکی ئاوا پەتی بۆ داندرابێ . ب) خوالێخۆش بۆ مامۆستا گیو ئەم ووشەیەی بە شکلی ( بالگاشە ) و ( بانگاشە ) بە مانای پڕوپاگەندە نوسیوە ( تم : مەهاباد ، ل ــ ٦١ و ٦٢ ). مامۆستا (مەلا ئەسعەد بانیخێلانی )ش بەهۆی مامۆستا محەممەدی مەلاکەریمەوە ئەم ووشەیەی بە شکلی ( بانگەشە ) هەر بەو مەعنایەی کە مامۆستا گیو نوسیویتی ، دەگەڵ کۆمەلێ ووشەی تری ناوچەی ( بانسێروان ) بۆ ناردبوم . ج ) بەلای منەوە (بانگەشە) شکلێکی ووشەکەیە کە لە (بالگاشە، بانگاشە ) زیاتر گەشەی‌کردوە ( متطورترە ) ، هەروەکو لە ووشەی ( بانگەواز )دا دەبینین ( ئا )ی ئاواز بوتە ( ئە ) لەم ووشەیەش‌دا (ئا)ی ئاش بوتە ( ئە. ) .

**بانگەواز** ــ [ بانگ/١ + ئاواز ]، ( نت.) ١ــ دەنگێ کە بۆ گازکردنی کەسێ لە دوورەوە ، بەرزدەکرێتەوە ٢ــ تمـ : بانگ‌ڕاهێشتن . :: بانگەوازێکی لە شاسوار بکەن با بێ چای بخواتەوە . بانگەوازیان کرد ، ئیمڕۆ کەس لە مالی خۆی دەرنەچێ . ★ جاڕ ، قاو ، هاوار . ( سن.) هەڕالە .

**بانگێڕ** ــ [ ١ــ بان/١ + گێڕ ( گێڕان ) ] ، (نفا.) ، ( مک.) ئەو کەسەیە کاری ئەوەبێ بە کرێ سەربانی مالآن بە باگردان دەگێڕێ. ★ بانگوش .

**بان‌گێڕان** ــ ( مصت. مت.) گلێرکردنەوە و سوڕاندنەوەی باگردێن لەوسەری بانی خانوَ بوَ ئەوسەری، بوَ پەستاوتنەوەی درز و قەلشتەکانی و ئیشك‌بوَنی دلوَپەی ناو مال .

**بانگێشتن** ــ [ بانگ /١ + هێشتن ] ، ١ــ ( مصت. مت.) تم : بانگ‌کردن / ١. ٢ــ ( نت.) مێمانی، دەعوەت ، زیافەت :: ئەوشوَ مالی کاویسی بانگێشتنیانە .

**بانگێشتن‌کردن** ــ [ بانگێشتن/٢ + کردن ] ، ( مصت. مت.) ، (مک.) ئاگادارکردنی کەسێ یا کەسانێ بوَ چوَنە مال یا هەر شوێنێکی‌تر بوَ : نان‌خواردن ، خواردنەوە ، شایێ و خەنەبەندان یا هەر جوَرە کوَبوَنەوەیەکی لەم بابەتانە . ★ دەعوەت‌کردن . (کعر.) زیافەت . (مک.) مێمانی‌کردن . ( سنـ.) میرفانی .

**بانگێن** ــ [ ١ــ بان/٣ + ئگ + ئێن ] ، ( صت.) ( سنـ.) حالی شتێکی لە سەرەوە یا سەروَی هاوچەشنەکانی خوَی بێت . :: ئەو کتێبەی بانگینم بوَ بێنە . تێب ــ لە نێوان دوَ دەنگی (ن) و (گ)دا ، بزوێنە کوردێ هەیە .

**بانمال** ــ [ ١ــ بان/١ + مال ( مالێن ) ] ، ( نت.) ، (سنـ.) بێلێکە لە چەند پارچە تەختە دروست‌کراوەو ئەوسەرەوسەرەکەی دەتەختەیەکی ( أفقی ) دەگیرێ ، بەفری لەوسەری بانەوە پێ ڕادەدەن بوَ ئەوسەر . ★ ( کعر.) بەفرمال ( خوَشناوەتی ) شپاروَخ. ( مک.) وەرووەرە .

**بانوَك** ــ [ ٢ــ بال + ئوَك ] ، ( صفا.) ، ( مک.) ، ئەو کەسەیە کە بەرخ و کارێلە دەگرێ و دەیانخاتەوە بەر دایکیان کە لێیان ( نەبان ) بوە ، یا بەر هەر مەڕ و بزنێکی دیکە .

**١ــ بانوَ** ــ [ پە : بانوَك ، بانوَی]، (نا.) ١ــ ژنی گەورەپیاوان ، ژنی بەڕێز و لە خانەدانی گەورە

□ « بانوَی پڕ تەمکێن صاحێب سایەی فەڕ »
« بە جای تەخت نیا پەرێش تەختەی زەڕ »
( خانا ــ ١٢٤ )

★ خاتوَن ، خانم . ٢ــ ناوە بوَ ئافرەت تێب ــ ئەم ووشەیە لە زمانی کوردێدا بەلاوە نرابێ ، تا ئەم ١٥/٢٠ سالەی دوایێ لە چەند ووشەیەکی مرکبدا ( کەیبانوَ ، ئاغابانو ، ... ) نەبێ نەدەبێندرا ، هێشتاش بە مانای یەکەمی هەر زوَر کەم دەکار دەکرێ ، ئەگەرچی ئەدەبیاتی گوَرانیێ ( خورشیدی‌خاوەر ، شیرێن و خەسرەو ، بەدیعولملك و بەدیعولجەمال ... ) پڕن لەم ووشەیە .

**٢ــ بانوَ** ــ [ ١ــ بان/٢ + ئوَ ] ،

( نت.) ، ( مك.) تم : ١ــ بان/٢ . تێبـ ــ ١ ) کەرتی دووەمی ئەم ووشەیە بەلای منەوە ( ئــۆك ) ئــامرازی پچکۆلەکردنەوەیە ( هەروەکو لــە ووشەی ــ پچۆك ــ دا دەبێندرێ) و (ك)ەکەی سواوە و کەوتوە . ب ) فەرقێك لە نێــوان مەدلــولی ئــەم ووشەیە و ( ١ــ بان/٢ )دا هەیە ، هــەرچی ( ١ــ بــان/٢ )ە بــە دەشتایێکی بەرزی نسبتــا گــەورە دەگوترێ ، بــەلام ( ٢ــ بانــۆ ) دەشتایێکە لەچاو دەوروبەری خۆی بەرزترە و لە ( ١ــ بان/٢) پچۆکتر .

**بانە ــ** [ ١ــ بان /٢ + ٥ــ ئـە /١ ] ، ( نت.) ، ١ــ پارچەیێــکی زەوێ کە جۆتێر پێش دەستکردن بە کێلان یا تــۆوکردن بــە گــاس جەغزی بە دەورەدا دێنێ بۆ ئەوەی دیارێ بکا کە ئەوێ ڕۆژێ چەندەی کێلاوە یا تۆوی پژاندوە ★ ( مک.) لات ، گاوەخــان . ٢ــ بــەرزایێ نێوان دۆ دێراوی بێستان ★ (مک.) بەستە ، پشت دێراو ( پژدێراو ) ، ( کیـ.) بارست . ٣ــ ناوی شارێکە لە کوردستانی ئێران .

**بانەگا ــ** [ ١ــ بان /٣ + ئە/٢ + گا ( جێگا ) ] ، (نت.) ، (سنـ.) تم : بەرگەدە .

**بانەمەڕ ــ** [ ١ــ بان/٣ + ٣ــ ئە/٢ + مەڕ ] ، (نت.) ، ( مک.) ١ــ کاتێکە کە مەڕداران لە کوردستــان بۆ لەوەڕانــدنی جەیوانەکانیــان سەردەکەون بۆ کوێستانان ، فەسلێ چۆنە هەواران . ٢ــ مانگی دووەمی بەهار (لە ٢١ی) نێسانەوە تا ٢١ی مــایس ) ٣١ ڕۆژە ★ (کئێــر.) ئوردیبەهێشت ( فر. ) .

**بانەناو ــ** [ ١ــ بان/١ + ئەناو]، ( نت.) ، ( سنـ.) تم : ٢ــ ئاویە . تێبـ ــ کەرتی دووەمی ئەم ووشەیــە ( ئەناو ) بە ڕای مــن دەبێ لــە مەصدەرێ مابێتەوە کە ئێستــا لە قالبی ( هەنۆن )دا دەبێندرێ و لەبن لەهجەی هەورامێشدا ( بانئەنۆ ) شکلێکی دێکەی ئەم ووشەیە .

**بانی ــ** [ ١ــ بان/٢ + ٣ــ ئێ ]، ( نت.) تم : ٢ــ بانۆ .

**بانێژە ــ** [ ١ــ بان/١ + ئێژە = ئێچە ( ئم : پچــۆکی ) ] ، ( نت. ) ١ــ سەربانێکی پچــۆکە ، کە بــە تەنیشت بانێکی گەورەتر و تــۆزێ بلیندترەوە بێ . ٢ــ بانی ژۆرێکی کە لەبەردەمی ژۆرێکی بەرزتــرەوە کرابێ و بۆ ژۆرە بەرزەکە بۆبێتــە هەیوان . ★ ( سنـ. ) بانجێلە /١ . ٣ــ شوێنێکی تەختە لە ( ئــاش ) دەکەوێتــە ژۆر بەرداشــەکانەوە ، دانی لەسەر ڕۆ دەکەن و لەوێڕا دەڕژێتە کونی بەرداشی سەرەوە و لە نێــوان دۆ بەرداشــەکاندا وورد دەبێ .

**١ــ باو ــ** (نا.) تم : ١ــ باب/١ .

**٢ــ باو ــ** [؟] ، (نا.) هەر ڕێ و ڕەسمێکی ژیان و کۆمەلایەتێ و ... کە برەوی بــۆبێ یــا هــەبێ . :: دەرەبەگایەتێ و سەرمایەدارێ لــەم زەمانەدا باویان نەماوە . ڕێــژیمی پاتشایەتێ لە دنیای ئیمڕۆدا لە باو کەوتوە . جاران کەوای شــۆڕ و سەلتە لە کوردستان باو بۆ . ★

نەرێت . ☐ «کەمەرلاڵ کەی سەر هۆردەر جە خاو + خاو سەرای سەنگ ، بە تۆنیەن باو »
( خانا ــ ٧٧١ )

**٣ــ باو ــ** [؟] ، ( نا. ) ، (مک.) ١ــ پاڵێکە بە ( جۆلانە )وە دەندرێ بۆ ئەوەی دەستبکا بە هاتوچۆ :: کچێ کنێر وەرە باوێکم پێوەنێ جا کە تۆش سواربوّی من باوت پێوە دەنێم . ● **باوەلێ باوێکی بەسە ــ** ( کن. ) هەر تەکانێکی پێ بدە و بێخە جۆلەوە ئێتر ناوەستێتەوە . ٢ ــ وشەیەکە لە یاریێ ( باوباوێن )دا وێژای لارکردنەوەی سەردەگوترێ.

**٤ــ باو ــ** [؟] ، ( پە. ) بە دوای ناوی ڕەنگانەوە دەلکێ و بۆ هەر شتێ کرا بە صفەت وادەگەیێنی کە ئەو شتە تەواو ئەو ڕەنگە نیە و نیزیکێتی :: شینباو ، سوورباو ، ڕەشباو ( مەیلەو ، شین ، مەیلەو ... و ... ) .

**باوا ــ** ( نا. ) ، ( کک. ، جف. ) تە : بابەگەورە/١ تێبـ ــ ئەمە هەر وشەی ( بابا )یەکە لە (با)ی دوەمدا دەنگی (واو) بە شێوەی کۆنتری ماوەتەوە و نەبۆتە (ب) .

**باوان ــ** [ ١ــ باو + ٢ــ ئان/١]، ( نت. ) ، (کعر. ) تە : بابان :: بەرەو باوان بۆتەوە .

**باوانێ ــ** [ باوان + ٣ــ ئێ ] ، ( نت. ) ، ( سن. ) کەلوپەل و ئەسپابی ناوماڵ و دیارێ و ... کە بوّك لە ماڵی باوکێڕا دەگەڵ خۆی دەیباتە ماڵی مێرد . ★ ( سن. ) ناوتێلانە (مک.) جیاز . (جنو.) باو ، ونێ.

**باوباران ــ** ( نت. ) بایەکی بارانی دەگەڵ ببارێ :: هەلێکردە با و بارانێکی نەبێتەوە .

**باوباوێن ــ** [ ٣ــ باو/٢ + ٣ــ باو/٢ + ئێن ] ، ( نت. ) ، ( مک. ) یاریە ، گەورە دەگەڵ منداڵی ساوا دەیکا ، تێبـ ــ لەم یاریەدا گەورە دەم و چاوی خۆی لە پشت شتێك دەشارێتەوە تا منداڵەکە نەیبێنێ ، پاشان لە لایەکەوە سەری خۆی دەردەخا و بانگی منداڵەکە دەکا و دەلێ : باو ! کاتێ منداڵە سەری وەردەچەرخێنێ تا بزانی دەنگەکە لە کوێوە دێت ، کابرای گەورە لە لایەکی ترەوە سەری دەردێنی و بانگ دەکا ( باو ! ) ، ئەم کارە چەند جارێ دوّپات دەکاتەوە و منداڵەکەی پێ دەخافلێنێ .

**باوبژ ــ** [ ٣ــ با/١ + و + بژ ؟]، ( نت. ) بایەکی توّز و خوّلی دەگەڵ بێ . **باوبژ لە زگی خۆ دەرکردن ــ** ( کن. ) توّڕەبوون و هەڕەشە و گوڕەشەکردنی بە قسە :: لێیگەڕێن با هەرچێ باوبژی لە زگیدایە دەرێکا . تێبـ ــ ئەم کینایەیە لە ئەسڵا بە مانای ( تڕکەندن )ە ( تە : ٣ــ با/٣ ) ، بەڵام ئێستا ئەم مانایەی لە دەست داوە و تەنیا بۆ بەسووك حیسابکردنی کەسێك بەکار دێت، هەروەکو هەڕەشە و گوڕەشەکانی بە ( تڕکەندن ) دابنێن .

**باوك ــ** ( نت. ) ، ( کعر. ، سن. ) تە : ١ــ باب/١ .

**١ــ باوکە ــ** [ باوك + ٥ــ ئە/١]، ( نت. ) ، (مک.) نێرەی باڵندە و

پەلەوەری وەکو چۆلەکە و پاساریێ و پەڕەسلێرکە و ... و ...

**٢ـ باوکە** ـ [ باوك + ٢ـ ئە/١]، ١ـ تم : بابە/١ و ٢ و ٣ ٢ـ هێندی جاران دایك و باب بە منداڵی خۆیانی دەڵێن ( هەروەك بڵێن باوکەکەم ) .

**باوکەڕۆ** ـ [ ٢ـ باوکە/١ + ڕۆ ] ، (شر.) ، ( کعر.) ١ـ شێوە ڕستەیەکە لە شین و شەپۆڕی کاتی باوكمردن یا خۆشەویستێکا بەکاردێت :: ئەی باوکەڕۆ پشتت شکاندم . ٢ـ ( مج.) لە دەربڕینی خەم و خەفەتدا بەکاردێت . تێب ـ وا تێدەگەم کە کەرتی ( ڕۆ ) ڕیشەی مەصدەری ( ڕۆیین ) و (ڕۆیشتن) بێ . ★ ( مک.) بابەڕۆ .

**باوکەلێ** ـ ( شر.) ، (کعر.) حاڵەتی بانگ‌هێشتنی تێکەڵ بە خۆشەویستییە بۆ باوك ، بە مەجاز بۆ بانگ‌کردنی هەموو خۆشەویستێکیش بە تایبەتی منداڵ بەکاردێت . ★ باوەلێ . (مک.) بابەلێ .

**باوك‌برا** ـ ( صت.) نیسبەت و پەیوەندێ هەر منداڵێکی نێرینەی پیاوێك دەگەڵ هەموو منداڵەکانی کە لە دایکێك نەبن و هەر باوکیان یەك‌بێ . // دایك‌برا .

**باو و نەریت** ـ [ ٢ـ باو + و + نەریت ] ، ( نت.) ، ( کعر.) ڕێ و شوێن و داب و دەستووری کۆمەڵایەتی . .

**باوە** ـ [ ١ـ باو + ٢ـ ئە/١ ] ، تم : بابە .

**باوەخولە** ـ [ ٣ـ باو/١ + ٣ـ ئە/٢ + خول + ٥ـ ئە/١ ] ، (نت.) تم : باوەگێژە .

**باوەخولێ** ـ [ ٣ـ باو/١ + ٣ـ ئە/٢ + خول + ئێ (ئێن) ] ، (نت.)، ( کعر.) تم : باوەگێژە .

**باوەخوێن** ـ [١ـ باو + ٣ـ ئە/٢ + خوێن ] ، ( جف. ، سن.) ، ( نت.) یەکەم مێوانداریێ کە بۆ کچێکی تازە بە مێرد درابێ ، لە ماڵی باوکی دەکرێ . ★(مک.) بانگ‌کردنەوە/١ . تێب ـ کەرتی ( خوێن ) لەم ووشەیەدا، ریشەی مەصدەری خوێندنەوەیە بە مانای ( بە سەرکردنەوە ) .

**باوەر** ـ [؟] ، (نا.) ، ( سن.) بەرزاییێ دەوری دوکانی کشتوکاڵ ، کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئاو لە (کەردۆ)دا ڕابوەستێ و ڕێگایەکیشە خەڵك هاتوچۆی بە سەردا دەکەن ( تم : مردۆخ ، ب١ ، ل ـ ١١٣ ) . هس : بانە/٢ .

**باوەرێن** ـ [ ٣ـ با/١ + وەرێن ( وەراندن ) ] ، (مک.) ١ـ ( صت.) حاڵی مێوەیێکی بەهێزی (با) لە درەخت بوەبێتەوە و کەوتبێتە خوار. تێب ـ ئەو جۆرە مێوەیە پەسند نیە و لە مێوەیەکی بە دەست لێکرابێتەوە هەرزانتر دەفرۆشرێ ، بۆیە مێوەفرۆشان ئەگەر بیانەوێ بڵێن مێوەکەیان هەرزانە هاوار دەکەن : « وەرە هەڵێگرە بە نرخی باوەرێنی » ٢ـ ( نت.) هەر مێوەیێکی بەم جۆرە لە دار بوەبێتەوە.

**باوەڕ** ـ [ پە : ڤاڤەر ] ، ( نا.) کاری بە ڕاست زانینی شتێ ،

مەسەلەیێ و .... و .... :: باوەڕکە ئەم کارە وانیە کە تۆ تێیگەیشتوی. باوەڕت بێ دروّت دەگەڵ ناکەم . ★ باوەڕی، بڕوا ، یەقین، ئاقیدە. تێب ـ أ ) ئەم ووشەیە هەروەکو نیشاندراوە ، وەچی ڕاستەوخۆی ( ڤاڤەر )ی زمانی پەهلەوییە کە ئەوێش لە « دو کەرت پێکهاتوە ، کەرتی دوەم لە پەهلەویدا ( ڤەر ) و لە ئاوێستایێدا ( ڤەرەنە )یە لە مەصدەری ئاوێستایێ و پارسی ـکۆن (ڤەر) بە مانای ( ناسێنەوە و بڕواکردن ) ، ( تە : معین ، بورهان، ج ١ ، ل ـ ٢٣٠ ) . (ب) ڤەر لە دێنی زەڕدوشتا تەجرەبەیەك بوە بۆ دیاری‌کردنی ڕاست و درۆیی ئیددیعا ، یاگوناحباری و بێ‌گوناهی کەسێك و « ... دو جۆرە ( ڤەر ) هەبوە : ڤەری سارد، ڤەری گەرم. لە ڤەری گەرمدا بۆ ئیسپات‌کردنی بێ‌گوناحی کەسێ ( ئاگر ) و (ڕۆنی داغ‌کراو ) و ... بەکارهاتوە و لە ڤەری ساردا شێرەی گیا و ژەهر و ... کەڵك وەرگیراوە . » ( تە : فرە. پڤا، ل ـ ٤٥٠ ) . ج) ووشەی (باوەڕ) کە یەکێك دەیڵێ بەم مانایەیە کە ڕاست دەکا و ئامادەیە (ڤەر)ی لەسەر تەجرەبە بکرێ و هەروەك وتبێتی : ( وەڤەر ) راست دەکەم وەکو ئێستا دەڵەین : وەسەری تۆ ، وە ...

**باوەڕپێبوون ـ** ( مصت. مت. ) تە : باوەڕپێکردن .

**باوەڕپێکردن ـ** (مصت. مت.) ١ـ قسەی کەسێ بەڕاست‌زانین و هەرچی بێڵێ بەحەقیقەت دانان . ٢ـ قبوڵ‌کردنی قسە ، خەبەر ، ... ، ... و بەڕاست‌دانانی . ★ باوەڕپێبوون ، بڕواپێ‌کردن .

**باوەڕکردن ـ** ( مصت. لا. ) ١ـ بەڕاست‌زانین :: باوەڕ ناکەم ئەم ئیشە وابێ چونکو ئەم پیاوە درۆزنە ٢ـ تەقدیرکردن ، دوودڵ‌بوون لەڕودان یا نەدانی کارێك :: باوەڕ ناکەم هێشتا هاتبێتەوە ماڵێ ٣ـ دانان ، بە خەیاڵداهاتن . :: قەت باوەڕم نەدەکرد ئەم کابرایە وابێ زۆر بەزێرەکم دەزانی . ★ بڕواکردن .

**باوەڕگومان ـ** ( نت. ) کەسێکە دەربارەی کارێ یا مەسەلەیەك لە نێوان شك و یەقیندابێ ڕاستی کار یا مەسەلەکەی بۆ ڕوننەبوبێتەوە ★ دوودڵ . ( عا. ) متردد ، متشکك.

**باوەڕگومانی ـ** ( نمص. ) لە نێوان شك و یەقیندابون ★ دوودڵی، ( عا. ) تردید ، تردد ، تشکك .

**باوەڕی ـ** ( حمص. ) ١ـ ئەنجامی باوەڕکردن . ٢ـ تە : باوەڕ .

**باوەژن ـ** [ ١ـ باو + ٣ـ ئە/٢ + ژن ] ، ( نت. ) ، ( کعر. ، سن. ) ژنی دوەمی هەر پیاوێ بە نیسبەتی منداڵەکانی لە ژنی یەکەمی . ژنانی پیاوێ کە لە ژنێك زیاتری هەبێ ، بە نیسبەت منداڵەکانی لە ژنەکانی دیکەی ★ . زڕدایك // باوەپیارە .

**باوەش ـ** [ نا. ] ، ١ـ شوێنێکە دەکەوێتە نێوان سینگ و دەستێك یا هەردودەست ، کە لە شانەوە بۆ پێشەوە ڕاکێژابن و لە ئانیشکا

نیشەوە بۆ بەرسینگ نوشتابنە .
٢ـ ئەوەندە گیا، دار یا هەر شتێکی تری لەم بابەتە کە پڕ بەو شوێنە بێ لە ژمارە (١)دا باسکرا . :: باوەشێك وێنجە بەرە دەبەر ئەسپەکەی کە . کا غەفوور هەموو رۆژێ دەچوو سێ چوار باوەش داری دەهێنایەوە ★ ( مک.) ئامێز . ( بک.) هەمێز ، هەمبێز .

**دەباوەش گرتن** ـ ( مصت. مت.) دەست دە ناو قەد یا سەروتری کەسێ وەرهێنان تێب ـ ئەمەیان بۆ دەربڕینی هەستی خۆشەویستیە بەرامبەر کەسێ و زیاتر لە نێوان دلداران و دۆدۆستیش کە دەمێك بێ یەکتریان نەدیتبێ ، باوە و ڕۆدەدا.

**لەباوەش کردن** ـ (مصت. مت.) هەلگرتنی یەکێك و بەسینگی خۆوە نوساندن و بە دەستێ یا هەردوو دەست ڕاگرتنی تا نەکەوێتەخوار . :: کچی خانمۆڵ ، برۆ ئەو منداڵە لەباوەش کە و بیهێنە با هێندە نەگری .

**باوەش پێدا (پێبا)کردن** ـ (مصت. مت.) بە هەردوو دەست و بە گورجوگۆلی پڕ بە شتێ یا کەسێکدا کردن :: هەر باوەشی پێداکرد و ختیە سەر شانی ، باوەشی پێبا کرد و دای بە ئەرزا .

**باوەشێن** ـ [ ٣ـ با/١ + وەشێن ( وەشاندن ) ] ، (نت.) ئامرازێکە بە هێزی دەست یا هەر هێزێکی تر بەم لاولای خۆیدا دەجوڵێندرێ، ئەویش هەوای دەوروپشتی خۆی دەجوڵێنێ و فێنکی دەکا . تێب ـ سادەترین جۆری پارچە مقەبایەکە ، بە دەست بە ڕاست و چەپا دەیجوڵێنن ، جۆرێکی دیکەی هەیە لە پۆشی خورما دەیچنن و دەسکێکی ڕێ دەخەن ، بەڵام ئێستا باوەشێنی کارەبایی پەیدابوە ، جاران حەسیر یا شتێکی تری لەم بابەتەیان بە میچی خانووە هەلداوسی و پەتێکیان تێدەخست کەسێك دەیجوڵاند ★ ( سن.) بارۆشە . پانکە .

**باوەگۆ** ـ [ باو / + ٣ـ ئە/٢ + گۆ ( گۆتن ) ] ، (بنت.) ، ( هل .) لە نێوەڕاستی قسەی کەسێکا ، قسەیەك‌کردن بە نیازی بەڕاستزانینی قسەکەی یا زیاتر ڕۆن‌کردنەوەی . ( عا.) تعلیق .

**باوەگێژە** ـ [ باوە (بابە) + گێژ + ٥ـ ئە/١ ] ( نت.) ، (مک.) یاریێ منداڵانە لە کوردەوارێدا . تێب ـ هەردوو دەستیان بەولاولادا بە ( أفقی ) ڕادەگرن و بە دەوری خۆیاندا دەسوڕێنەوە و دەڵێن : « باوەگێژە گێژم مەکە ، گێژت ناکەم » هەرکەسێ درەنگتر گێژبێ یارێ دەباتەوە . ★ باوەخولە ، باوەخولێ . (سن.) مامانەگێجێ .

**باوەڵ** ـ [ ؟ ] ، (ص.) ، (مک.) حاڵی بزن یا مەڕێ کە تووشی نەخۆشێ ( باوەڵێ ) بۆبێ .

**باوەڵێ** ـ (نا.) ، (مک.) نەخۆشییە تووشی مەڕ و بزن دەبێ و گۆدیان‌دەکا و پەکی ڕۆیشتنیان دەکەوێ :: ئەم بزنە باوەڵبوە ، مەڕەکە تووشی باوەڵێ بوە .

**باوێشك** ـ [؟] ، ( نت.) داپچڕانی دەمی ئادەمیزاد لە خۆیەوە . تێب ـ حاڵەتێکە لەبەر حەزلەخەوکردن ، خەواڵوویی یا خوماریی بەسەر ئینساندا دێت و دەمی لە خۆیەوە بەش‌دەبێتەوە . ئەگەر لەبەر خەو یا خەواڵوویی بێ ، پیاو خۆی لەبەریەك دەکێشێتەوە و دەستەکانی بەملاولادا لەبەریەك بڵاودەکا و دەیانهێنێتەوە سەر سینگی و هەندێ جار مستەکۆڵەیێکیش لە سینگی خۆی دەدا .

**باوێشکدان** ـ ( مصد. لا .) ، ( کمر.) تووشی حاڵەتی باوێشك‌بوون ★ باوێشك‌هاتن . :: مچۆل بەم نیوەڕۆیەش هێشتا خەواڵووە و باوێشك ئەدا .

**باوێشك‌هاتن** ـ (مصد. لا.) ، ( مکـ.) تم : باوێشك‌دان :: باوێشکم دێتێ ، باوێشکی دەهاتێ ، باوێشکم دێنێ .

**باویێ** ـ ( نا.) ، ( هل. کیـ.) تم : بادام .

**باویلکە** ـ [ ٣ـ با/١ + ئیلکە]، (نت.) ، (سیمـ.) تم : بایلکە .

**باوێتلێ** ـ [ ٣ـ با/١ + ئێلە + ئێ/٢ ] ، ( نت.) ، ( سیمـ.) تم : بایێتلکە .

**باهاتن** ـ [ ٣ـ با/١ + هاتن ] ، ( مصد. لا.) ١ـ دەست‌پێکردنی با. :: بایەکی وا توندێ دەهات پیاوی دەفڕاند . ٢ـ ( کنـ.) بە هیچزانینی قسەی کەسێ . :: لێی‌گەڕێ با هەر قسەبکا وە بزانە بای دێ .

**باهۆ** ـ ( نا.) ، (مکـ.) تم : باهۆ .

● بە شان و باهۆی ( کەسێ )دا هەڵکوتن ـ بە چاکەباس‌کردنی . باسی ئازایەتی و پیاوەتی و ... کردنی ..

**باهۆز** ـ [٣ـ با/١ + هۆز ؟ ] . ( بکـ.) بایەکی زۆر توند کە شت لە جێی خۆی هەڵدەگرێ . ( عا.) عاصفە .

**باهۆ** ـ ( نا.) ، ١ـ ( سنـ . . سیمـ .) تم : بازۆ

□ « ئەلا ئەی نازەنێن ئاهۆ . بە باهۆ »
« دڵی صەیادی خۆت ، هێنایە لەرزە »
( نالی ، کوڕ . ل ـ ٤٤٩ )

٢ـ ( سنـ.) ئاسن یا دارێکی ڕاستی درێژە ، کاسەی تەرازوی پێوە هەڵداوەسرێ ، یا دەخرێتە سەری ( بە پێی شکڵی تەرازوو ) ★ (مکـ.) شەهێن . ( سنـ.) شایێن . ٣ـ ( سنـ.) ئەو دوو دارەیە کە لەولاولای دەرگای ( زۆر ) و ( ماڵ )و .. بە قیتی دەچەقێندران . یەکێکیان دەرگاکەی ڕێدەخرا و ئەویتریش ئاڵقەڕێز و دوولایێ لێ‌دادەکوترا بۆ داخستن . تێب ـ ئەم تەرتیبە ئێستا کەم بۆتەوە و یا هەر نەماوە ، چوارچێوەی هاتۆتەشوێن . ★ ( مکـ.) لاشێپان . ٤ـ ( سنـ.) تم : بانە/٢ ( مردۆخ ، جا ، ل ـ ١١٤) ٥ـ ( سنـ ـ ) تم : باسك/٢ (مرووخ، ج ١ ، ل ـ ١١٤) ( تێب ـ أ ) ئەم ووشەیە لە سانسکریتیدا (باهو) و لە ئاوێستایێدابۆتە (بازو) ـ دەنگی ( و ) لەهەردووکیاندا کورتە ـ و

کوردی و فارسی بە واوی درێژ ( بازۆ ) بەکاری دێنن . (تم : معین ، فرهنگ . ج ١ . ل ــ ٤٧٠) ئەم ووشەیە لە قۆناغی پەهلەویدا بۆتە ( بازۆك ــ بازاك ) ، (تم : فره ، پنا . ل ــ ٧٤ ) . بەلام لە کوردیدا ( باسك )یشی لێ کەوتۆتەوە . ب) لە زمانی فارسیدا ئەم ووشە تەنیا بە مانای ( تیلا ) و ( گۆپال ) ئەویش لە قامووساندا ماوە .

**باهەلکردن ــ** ( مصت. لا.) تم : باهاتن . :: بایەکی توند هەلیکرد و سەیرانەکەی لێ تێکدان .

**باهەنجیر ــ** ( نت. ) ، جۆرەهەنجیرێکەزوتر پێدەگا و بێ‌تام و ناخۆشە . ★ باتسکە . کەلبەهەنجیر .

**بای‌باڵدان ــ** ( مصت. لا.) ، ( کن . ) ١ــ دەست لە بەریەك بلاوکردنەوە و خۆلەبەریەك‌کێشانەوە و ماندوویی‌لەخۆدەرکردن . ٢ــ ( مجـ.) پیاسەیەکی پچوك لە شوێنێك هەوای پاکی هەبێ ( دەرەوەی شار ، ناو باخ و بێستان ) :: ئێواران تۆزێ بای باڵی خۆت بدە . چۆینە توی مەلێك بای باڵی خۆماندا .

**بایوق ــ** ( نا.) ، (سنـ.) تم : بایەخ .

**بایەخ ــ** [؟] (نا.) ، (کعر.) ١ــ تم : ئیعتیبار ١ ، ٢ . ٢ــ (مجـ.) ئەهمیەتێکی ئینسانێك لەبەر چاوی خەلکی هەیەتی . هس ــ ٥ــ با ، ( بکـ.) بەها . ★ (سنـ.) بایوق (تم : مردۆخ ، ج ١ ، لــ ١١٥) .

**بایەخ‌پێدان ــ** (مصت. لا.) تم : ئەهمیەت‌پێدان .

**بایەخدار ــ** ( صت. ) حاڵی هەرکەسێ یا شتێ ئەهمیەت و ئیعتیباری هەبێ .

**بایەقوش ــ** [ = تو . بایقوش ]، (نا.) تم : کوندەبەبۆ □

« بایەقوش بەرشێ جە شێن و زارێش »

« بلبل بێزاربێ جە بێ‌قەرارێش»

( خانا ــ ٦٦٧ )

**بایینجان ــ** [؟] ، (نا.) ١ــ أ ) گیایەکی دەسچێنی ساقەت ئەستورە ، گەلای پان و درێژۆکەیە گوڵی‌وورد و بنەوشە ، سالە و ساڵ بۆ خاتری بەرەکەی دەچێندرێ ، تۆوێکی‌زەردی ووردی هەیە . ب) ، (کعر.) بەری ئەم گیایە کە زیاتر درێژۆکەیە بە شکلی خەیار، ڕەنگی پێستەکەی بنەوشێکی مەیلە و ڕەشە و بە شێوەی جۆربەجۆر ــ چێشت ، سوورکراوەوە ، ترشیات ، مرەبا ــ دەخورێ . ★ ( مکـ. ) باینجانی ڕەش ــ ( بکـ.) باجان ، باجانێ ڕەش . ( سنـ.) بامجان . ٢ــ (مکـ.) أ ) گیایەکی دەسچێنی‌یەکسالەیە گەلای گرنج‌گرنج و بۆنخۆشە . ب) میوەی ئەم گیایە ، سوور و گۆشتن و خڕە ( هەندێ جار بە ڕەنگی زەردی کارەبایی و بە شکلی هەرمێ دەبیندرێ ) تامی ترشە ، دەکرێتە چێشتەوە ، بە کاڵی و بە برژاوی دەگەل کەباب و هەروەها بە زەلاتەش دەخورێ . ★ ( مکـ.)

باینجانی سوور . ( بک.) باجانێ سوور . ( کعر.) تەماتە . ( سنە.) بامجـان فەرەنـگی . **بایینجـانی ڕەش** ــ ( نتە.) ، (مکـ.) تە : بایینجان/١ــ ب.

**بایینجانی سوور** ــ (نتە.) ، (مکـ.) تە : بایینجان/٢ ــ ب . **میوانی**

**بایینجانی** ــ (نتە.) ، (مکـ.) کەسێکی لە مەجلیسێکدا ڕۆی نەدرێتێ یـا بانگ‌نەکرابێ لە خۆیەوە چـوبێ . ( عـا : طفیلی ) :: ئەوە بـۆچی وا گرژبوون خۆ ئێمە میوانی بایینجانی نین .

**بایینجانێ** ــ [ بایینجان/١ ــ ب + ٣ــ ئێ ] ، ( صتە.) ، ( مـکـ.) ڕەنگی بە ڕەنگی توێکڵی بایینجانی ڕەش . بنەوشی تارێك .

**بایێ** ــ [ ٣ــ با/٥ + ٣ــ ئێ ] ، ( صتە.) ، (کعر.) تە : بادیهەوا .

**بایێبوون** ــ ( مصتە. لا.) ، (کعر.) خۆلێگۆڕان ، بەدەعیەبوون :: ئەوەندە لەخۆیبایێبووە لـە بیری‌چۆتـەوە دوێنێ چبوو .

**بایێلکە** ــ [ ٣ــ با/١ + ئێلکە ] ، ( نتە.) ، ( سیهـ.) گوڵی گیـایەکی دڕکاوییە ( گۆیا ــ کەڵەوی ــ یە ) ، پاییزان لە گیایەکە دەبێتەوە و بـە شکڵی ( گۆ )یەکی بچوك کە هەمۆی هەودا هەودای باریکە و لە ناوکێکی ڕەقی وەکو ئاڵقە هەڵچەقیون بـە دەشت و چۆڵاندا بڵاودەبێتەوە ★ ( مکـ. ) پشتیاڵەپاییزە ، پەپولە پاییزە . ( سیهـ.) باویلکە ، باوێلێ . ( هلـ.) پشتێلۆکە ، گەورەگڵـە . ( سنە.) شەلەمێن‌کەرە .

**بڕ** ــ [ ٢ــ ب/٢ + بڕ (بڕین) ] ، ( نفا. ، صفا. ) : ئەو شتە یـا ئەو کەسـە یاخۆ حـاڵی ئەو شتـە و کەسەی کە توانایێ بڕینی هەبـێ . □ « بکوژ و بڕ هەر خۆیەتی » . ★ بڕنـدە .

**بڕای‌بڕای** ــ [ بڕ + ئای + بڕ + ئای ] ، (بنت.) هیچ کاتێ ، قەت . :: بڕای بڕای من بـم و جارێکی تر سەفەر ناکەم . ( عا.) قطعا . ابدا .

**بت** ــ ( نا.) ، (کعر.) تە : بوت .

**بت‌پەرست** ــ ( ننا.) ئەو کەسەی ( بت ) دەپەرسـتێ ★ ( کێر.) بوت‌پەرست .

**بت‌پەرستی** ــ ( حمصـ.) ١ــ بەخۆدازانیـنی ( بـت ) وا عیبـادەت‌بۆکردنی . ٢ــ ( کـنە.) مل‌کەچ‌بوون بۆ کەسـێکی هیـچ لـەدەس‌نەهاتو .

**بتخانە** ــ ( نتە.) ئەو شـوێنەی ( بت )ی تێداداەندرێ و بت‌پەرست بۆ عیبادەت دەیچنێ . ★ بوتخانە .

**بچکۆلانە** ــ [ بچکۆلە + ٢ــ ئان ٧/ + ٥ــ ئە/٢ ] ، (صتە.) ، (مکـ.) تە : بچوك . □ « بێنیەماچت‌کـەم دەم‌بچکۆلانە . »

( فۆلکلۆر )

**بچکۆلە** ــ [ بچك + ئۆلە ] ، (صتە.) تە : بچوك بچکۆلە ، بچـکۆلە ، بچکۆلـە .

**بچکۆلانە** ــ ( صتە.) تە : بچوك .

**بچکۆڵە** ــ (صتە.) تە : بچوك .

**بچوك** ــ [ بچ + ئوك ] ، (صتە.) ١ــ حاڵی شتێکی لەهەر بابەتێکەوە ( ئەندازە ، قـەدر و قیمـەت ،

تەمەن و ...) گەورە نەبێ :: ئـەم خـانوە بچـوکە جێی ئێـوەی تێدانابێتەوە . ئەو کراسە دەبەرکە بزانە بە بەرت بچـوك نیـە . ★ بچکۆلە . بچکۆلانە . بچـکۆلانە ، بچـوك . پچکولـە ، پچکۆلـە ، پچکـۆلانە ، پچکۆلانە ، چکۆلـە ، چکۆلە ، چکۆلانـە ، گچـکە ، گچکەلانە . ( سنـ . جنو.) بۆچك. ٢ــ ( مجـ.) کەمـتر لە کەسـێ ، خزمەتکاری کەسێ . :: تا ئێسـتا بچوکتان‌بوم لەمەودوا نابـم . ٣ــ ( بکـ.) منداڵ . تێبـ ــ أ) وەکو دەبینن دەنگی (ب( و (ل) لەم ووشـەیەدا دەبنە (پ) و (ل) ، هۆی ئەم گۆڕانە جێرانەتی دەنگەکانە کە کار دەکەنە سەریەك و دەگۆڕێن . ب) بەلای منەوە ماکی ئەم ووشـەیە لە قۆناغی ئێستای زمانی کوردیدا ( بچ )ە کـە دوای تێپەڕێن بە دوو سێ قۆناغـدا لە ( ڤەچەك )ی پەهلەوی بە مانـای (منداڵ) کەوتۆتـەوە . ووشـەی ( ودچ ) بۆ گیاوگوڵ و ( بەچ ) لـە ووشەی ( بەچکە )دا لە ( بوچك )ی بن‌لەهجەی سنەیی و لەهجـەی جنوبیـدا ئەو قۆناغانەمـان پێشان‌دەدەن .

**بچوکی ــ** [ بچوك + ٢ــ ئی ] ، ( حمصـ.) ١ــ کەمتری لە بـاری ئەندازە و قەدر و قیمەت و تەمەن و ... ٢ــ ( مجـ.) خزمەتکاری . ★ بچوکی .

**بخواز ــ** [ ٢ــ ب/٢ + خـواز ( خواستن ) ] ، ( صفا.) حالـی کەسێکی زۆر داوای شت لە خەڵکی بکات ★ خوازەڵۆك .

**بخۆر ــ** [ ٢ــ ب/٢ + خـۆر ( خواردن ) ] ، ( صفا.) ١ــ حالّی کەسێکی زۆر بخوا ★ خـۆرا . زۆرخۆر . ٢ــ ( مجـ.) حـالّی کەسێکی زۆر حەز لە خواردن بکا. ★ نەوسن . (مکـ.) چلێس .

**بخۆر ــ** [ عا.] . (نا.) هـەر ماددەیەکی بەسەر ئاگرەوە بکرێ و بۆن‌وبەرامەی خۆش بلاوبکاتەوە . تێبـ ــ أ ) لە کوردەواریێ ئەسپەندەر، کوندر . ووشە و مەستەکێ بـاوە. ب) لە ئەدەبیـات و چیـرۆك و داستانانـدا ( عود ) و ( عەمبەر ) و (میشك) وەکو بخور باسکراون . ج ) ئێستا هەندێ ماددەی بۆنخۆش بە چیلکە پێکەوە دەلکێنن و ئاگری پێوەدەنێن ★ بخورد ، بخـور ، بوغرد .

**بخۆردان ــ** (نتـ.) دەفرێـکی تایبەتییە ، زەمـانی پێشو لـە دیوەخانی پاتشـایان و ئەمـیر و گەورەپیاوان دایان‌دەنا و بخۆریـان تێدادەسوتاند .

**بخۆرکردن ــ** ( مصـتـ. مـتـ. ) سوتاندنی ماددەیێکی بۆنخـۆش لەسەر ئاگر . تێبـ ــ ئەم کارە لـە ئەسلاّ بۆ بۆنخۆش‌کردنی هـەوای دیوەخان و مەجلیسان بوە ، پاشان لە کاروباری جادوبازێ و نوشـتو نوسینیشدا باوی سەندوە .

**بـدەر ــ** [ ٢ــ ب/٢ + دەر ( دان ) ] ، ( صفـ .) حالّی کەسێکی شتێك بدا ، بەخشێ . تێبـ ــ أ ) ئەم ووشەیە زیاتر بۆ کاری جـوت

بۆنی ژن و پیاو و بە تایبەتی بـــۆ ئافرەت دەکاردەکرێ . ب ) بـــۆ کەرتی ( دەر ) تە : ٢ــ ئەر ★ حێز . گاندەر .

**بر ــ** ( نمص .) تە : بڕێتی .

**برا ــ** [ ست : براتەر ] (نا.) ، ١ــ ئەولادی نێرینە کە دەگەڵ ئەولادی نێرینە و مێینەی دیکە دایك و بابیان یا یەکێك لەو دوانەیان یەکبێ . ٢ــ ( مج.) بە نیشانەی خۆشەویستی و ڕێزلێنـــان ؛ لـــە قســـەکردن و نامەنوسێنـا بۆ خەڵـــکی تریـش بەکاردێت . □ « دەزانی کە حاڵمان چلۆن بۆ برا + لە پێشدا چ زوڵمێك لە کوردان کرا » ( حافیدی ) **برای باب** ــ ( حافیدی ) . (نت.) ، (مک.) تە : ١ــ ئام (مام) □« خزم برای بابێش بێ هەر باشە » (فۆلکلۆر) .

**برای دایك و بابێ ــ** ئادەمێزادێکی نێرینە کە دەگەڵ ئادەمێزادێـــکی دیکە لە دایك و بابێك بن . **بـــرای دایکی** ــ ئادەمێزادێکی نێرینە کـــە دەگەڵ کەس یا کەسانێکی تر دایکیان یەکبێت . ★ دایکبرا . **بـــرای دینێ** ــ هەمو ئەو کەسانەی پەیڕەوی دینێکبن . :: مسولمان برای دینی یەکترین .

**براباب ــ** ( نت.) ، ( مک.) دو کەس کە باوکیان یەکبێ و لە دایکێك نەبن .

**برابەش ــ** ( نت.) ١ــ کەسێکی لە ملکایەتی شتێکدا دەگەڵ کەسێ یا کەسانێ شەریك بێ . ٢ــ (مج.) کەسێکی ماڵی خەڵکی لـــەلابێ و نەیداتەوە ( هەروەکو برای بـــێ و بەشی خۆی لێوەرگرتبـــێ .) :: ئەرێ کابرا ئەم قەرزانـــــەم بـــۆ نادەیەوە ، خۆ تۆ برابەشی من نی ؟

**براتۆتە ــ** (نت.) ، (مک.) چوارەمێن قامکی دەست لە پەنجەی گەورەڕا .

**برادەر ــ** ( نا.) تە : ئـــاواڵ :: شاماری برادەری شاسوار : دوێنێ لە بەغدا هاتۆتەوە .

**برادەرایەتی ــ** [ برادەر + ئایەتی /١ ] ، ( حمصـ.) ، (مـك.) تە : ئاواڵەتی .

**برادەری ــ** [ برادەر + ٢ــ ئی ]، ( حمصـ.) تە : ئاواڵەتی :: دەگەڵ نەوزاد برادەریمان خۆشە .

**برازا ــ** [ برا/١ + زا ( زاگ . نمف . لە زان یا زایـین ) ]، ( نت.) کوڕ ، کچ ، ژن یا پیاوێکی ئەولادی برای کەسێ بن ، ئەو منداڵانـــەی باوکیان دەگەڵ پیاوێکی دیکە بـــرا بن . □ «ڕۆمکردە بەزمی خاســـی برازا ئەزیزەکەم + ئەمشەو بە صەد تەوازوع و ئیخلاس و سەرکزی »، ( ڕەزا ــ ٥٤ ) .

**برازازا ــ** [ برازا + زا ] ، (نت.) منداڵانی برازای کەسـێك ، ئـــەو منداڵانەی کە باوکیـــان بـــرازای کەسێك بێ .

**برازاوا ــ** [ برا + زاوا ] ، ( نت.) ئـــەو کەســـەیە شەوی گواستنەوەی بوك دەچێ و پشـــتێندی بـــوکێ دەبەستێ و لە تەنیشتیەوە دەڕوا تا دەیگەیێنێتە مـــاڵی زاوا . تێب ــ دەشێ ئەو کەسە برای ڕاستی زاوا بێ یا هەر دۆست و برادەری بێ .

**براژن ــ** ( نت.) ١ــ نیسبەتـــی

ژنێك دەگەڵ خوشـــك و بـــرای مێردەكەی خۆی . ★ (بكە.) ژنبرا. ٢ـ(مجـ.) ووشەیێكە لە كوردەوارێدا دۆســـت و برادەری كەســـێك ، خێزانی هاوڕێكەیانی پێ‌بانگ‌دەكەن.

**براگەورە ـ** ( نتـ.) ١ ـ نیسبەتی كوڕی هەرە گەورەی ژن و مێردێك دەگەڵ منداڵەكانی‌تریان . ٢ـ ئەو كەسەی چەند دۆست و برادەر یـــا بنەماڵێك ( لەبەر هەر صفەتێكی بێ) لە ناو خۆیاندا بە گەورەی خۆیـــانی دادەنێن و ڕێزی لێدەگرن و لـــە قسەی دەرناچن .

**براڵە ـ** [ بـــرا + لە ( پـ.) ] ، (نتـ.) بۆ دەربڕێنی خۆشەویـــستی كاتی بانگهێشتنی كەسێك دەگوترێ، هۆ برای خۆشەویست . □ « ... كاكە و براڵـــەی خۆیـــان كرد و ئێشەكەیـــان ئاواڵێـــكرد كە كردیان ... » .

**برایانە ـ** [ برا/١ + ئانە/١ ] ، ( بنتـ.) وەكو برا ، بە شێوەی برا .

**برایەتی ـ** [ برا/١ + ئایـــەتی /١ ] ، ( نـــتـ.) ، (حمـصـ.) ١ـ پێوەندی نێوان ئەو كەسانەی دایك و باب یا یەكێك لەو دوانەیان یەك بن . ٢ـ (مجـ.) پێوەندی دۆستانەی نێوان دوو یا چەند كەس یا نێوان میللەتان و نەتـــەوەكان :: برایـــەتی كورد و عەرەب ★ برایی .

**برایی ـ** [ برا/١ + ٢ـ ئی ] ، ( حمصـ.) تم : برایەتی .

**بـــرج ـ** (نـــا.) ، (سیهـ.) ١ـ ژوورێكی خڕی ئوســـتوانەیی یـــا چوارگۆشەیە كە جاران لەســـەر شوورەی شار و ئاوایی و كۆشك و قەڵاتی مێـــران دروســـتدەكرا و سەرباز و چەكدار بۆ پاسەوانی یا بەرگری هێرشی دوژمـــنان تێیـــدا دادەنیشتن . ★ (مكـ.) بـــورج ، قوللە . ٢ـ هەر بەشێـــك لە ١٢ بەشی دایرەی (منطقة البرج) كـــە بە ڕای ئەستێرەناســـانی كـــۆن ، ( هەتاو ) هەر مانگەی بە یەكی لـــەم ١٢ بەشەدا تێدەپەڕێ ، هەر بەشەی ناوێكیشیان لێنـــاوە كە مانگێـــكی تەقویمـــی شەمسیـــیە . تێب ـ ئەستێرەناســـەكانی كۆن ئـــەم ١٢ برجانەیان بەســـەر چـــوار عنصری (خاك، با ، ئاو، ئاگر)دا بەش‌كردوە و هەرسێ برجیان داوە بە یەكێك لـــەو عنصرانە . ناوی ١٢ برجەكان بـــەو جۆرەی كە دابـــەش‌كراون بـــەم جۆرەیـــە : أـ برجی ئـــاوی كـــە میجازیان سارد و تەڕە : سەڕەتان ( قرژاڵ ) ، عەقرەب ( دووپشك ) ، حووت ( نهەنگ ) . بـ برجی ئاگری كە گەرم و ئیشكن : حەمەل (بەرخ)، ئەسەد ( شێـــر ) ، قەوس (كەوان). جـ برجی بای كە گەرم و تـــەڕن : جەوزا (جمكە) ، مێزان (تەرازوو) ، دەلو (دۆڵچە) . دـ برجی خاك كە سارد و ئیشكن : ســـەور ( گا) ، سونبولە ( گوڵەگەنم ) ، جـــەدی ( گیسك ) . ★ ( مكـ.) بورج ٣ـ هەر بەشێك لە بەشەكانی ئاخرمانگی زســـتان تێب ـ لە كوردەوارێـــدا ئاخرمانگی زستان دەكەنە چەنـــد بەش و هەر بەشـــەش ناوێكیـــان لێناوە ، ژمـــارەی بەشـــەكان و

ناوەکانیان بە جێگا دەگۆڕێ ، لە موکریان بەم جۆرەیە : خاتوزمەهەرتیز ــ یا ــ شینی برایان . سێ شەشی هەیاسی ( سێشەش ) . گیسکی بەلەس . سەرمای پیرێژنێ ــ یا ــ پیرێژن ( بەردەلعەجۆز ) ★ ( مکـ.) حساب . بورج . هس ١ــ بۆ ووشەی ( برج ) بە گشتێ ، بۆرگ لە زمانەکانی فەرەنگیدا بە تایبەتێ ئەلمانێ کە بە دوای ناوی شارانەوە دێت : پیترسبۆرگ ، هامبۆرگ ، ماگدبۆرگ ، لوکزامبۆرگ . ٢ــ لە ووشەی ( بۆرژوا ) یا ( بۆرجوازێ)دا کە مانای ( خەلکیشار )ە دەنگی (ژ) بەپێی دەستوری زمان لە دەنگی ( گ ) پێکهاتوە .

**بردن** ــ [ سـ : بەر . ، پە : بورتەن ] ، (مصد. مت.) ڕاگواستن و گواستنەوەی شتێك یا کەسێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك :: کتێبەکە دەگەل دەستی خۆت بەرە ( سە ). کوڕەکە بەرە بۆ مەکتەب . ئەوە ئەم ڕادیۆیە بۆ کوێ دەبەی . ئاگام لێبۆ قەلەمەکەی برد ★ (بکـ.) برن.

**بردنەسەر** ــ [ بردن + ٤ــ ئە ٣/ + سەر ] ، ( مصد. مت.) ١ــ تەواوکردن ، جێبەجێکردن ، بەجێگەیاندن . ٢ــ (مجـ.) سەپاندن :: ئاخری قسەی خۆی بردەسەر .

**تێبردن** ــ ( مصد. مت.) ١ــ داخلکردنی شتێ دە شتێکی دیکەی هاوجسنی خۆی . ٢ــ لەناوبردن ، وونکردن .

**دەربردن** ــ ( مصد. لا.) ئیدارەکردن دەگەل کەسێ :: جا تۆ چـۆن دەگەل ئەم دەمشـڕە دەردەبەی . **ڕابردن** ــ (مصد . لا.)، (مکـ.) تێپەڕین ، گوزەرکردن .

**بردن** ــ (مصد. مت.) شتێ یا کەسێ لە جێگەی خۆی هەلگرتن و دورخستنەوەی :: بەیانی تا دێم ئەم مێزە لەم ژوورە لابەرن . خۆزگە ئەم کاربەدەستە خراپەیان لادەبرد .

**لێبردن** ــ (مصد. مت.) ١ــ شتێك بە زۆر دە شتێك پەستاوتن. تێبـ ــ ئەم مەصدەرە زیاتر بۆ حالەتی تایبەتێ جوتبونی نێرومێی گیانداران بەکار دێت . ٢ــ شتێك لە دەست کەسێ دەرخستن ە زۆر، یا بە دزێ و ... تێبـ ــ بەکارهێنانی ئەم مەصدەرە بەم مانایە زۆر کەمە و زیاتر بۆ گالتە دەکوترێ و مەبەست مانای یەکەمێ :: گوچانەکەشیان لێبرد .

**بردنەوە** ــ (مصد. مت.) ١ــ گێڕانەوەی شتێکی لەشوێنێکەوە برابێتە جێگایەك بۆ جێگەی پێشوی :: ئەم کتێبە بەرەوە بۆ کتێبخانە . ئەم ڕادیۆیەی مالی شاباز بۆچی نابەنەوە . دوێنێ هاتن بردیانەوە.

**برژان** ــ ( مصد. لا.) ١ــ ئامادەبونی هەندێ خواردەمەنێ کە ڕاستەوخۆ بە ئاگر ڕادێرابن . :: ئەم مریشکە باش برژاوە . ٢ــ ( مجـ.) زۆر کارتێکردنی گەرما :: ئەم هاوینە هێندە گەرم بو خەلك وەختابو ببرژێن . ★ ( سنـ.) برژیان .

**برژاندن** ــ [ پە : بریشتەن ] ، ( مصد. مت.) ئامادەکردنی هەندێ

خواردەمەنی بە خستنەسەر ئاگر و پێڕاداشتنی :: خێراکەن دوو سێ فڕۆج سەربڕن و بۆمان ببرژێنن . وەستا گیان کەبابەکەی من باش ببرژێنە ★ ( بک.) براشتن ، ( سن. ) برژانن .

**برژاندنەوە ـ** (مصت. مت.) ڕاگرتنی خوێن لە شوێنێکی لەشی ئادەمیزاد کە بە شتێکی تیژ (چەقۆ، خەنجەر ، شوشە ...) بڕابێ یا بە گوللە و هەر شتێکی دیکە برینداربوبێ و خوێنی لێ بێ . تێب ـ ئێستا دوکتۆران ئەم کارە بە داوودەرمانی تازە ( تەنتوریۆد ، مێرکورکرۆم ، ...) دەکەن. جاران لە کوردستان ، پەڕۆ و پالیان دەسوتاند و سوتوەکەیان دەخستە سەر برینەکە یا ڕۆنی داغیان بەسەردا دەکرد خوێنی ڕادەوەستا. بۆ برینی پچوك سوتوی جگەرە و گلەسوریش بەکارهاتوە . ★ (سن.) برژاننەوە .

**برژانگ ـ** [ پە : موزەك ] ، (نا.)، ( سیه.) دوو ریزە (مو)ی کە لە کەنارەکانی دوو پێلوی چاوان دەبینارێن . ★ (مک.) مژۆڵ بژۆڵ . ( سن.) بژانگ ، موژە . ( بک.) مژگان ( تم : کف ـ ٥٣٨ ) تێب ـ ژابا ( مژانگ )ی لەباتی ( برژانگ ) نوسیوە و (مژگان )ی بە جەمعی داناوە ( تم : ژابا ـ ٣٩٧ ) .

**برژانن ـ** (مصت. مت.) ، ( سن.) تم : برژاندن . تێب ـ دەنگی (ن)ی یەکەم لەم وشەیەدا و لە هەمو مەصدەرێکی دیکەشا کە لە ناوچەکانی بێجگە لە ( سنە ) بە ( ئاندن ) دوایی دێت و لە بن‌لەهجەی سنەییدا دەبێتە ( ئانن ) ـ تۆزێ دەگیرێ ( مشدد )ە ، لە ڕاستیدا هەر دەنگی (د) ، کەی برژاندن دەچێتە ناو دەنگی (ن)ەکەوە ( دەغم دەبێ ) و ئەو گیراویە پەیدادەکات. ئەمەش بە لای منەوە شێوەیەکی دیکەی (د)ی کلۆری بن‌لەهجەی سلەیمانیە کە لە بن‌لەهجەی سنەییدا لەباتی ئەوەی وەکو سلەیمانی دەنگی (گ)ێکی سوکی لە دوای ( ن )ەوە لێ‌دەربچێ . بە جارێك کلۆردەبێ و دەفەوتێ .

**برژاننەوە ـ** (مصت. لا.) ڕاوەستانی خوێنی برینی لەشی ئینسان . ★ ( سن.) برژیانەوە .

**برژاو ـ** ( نمف . لە مصد. برژان)، ( مک. سیم . هل. کک.) ١ـ هەر شتێکی خواردەمەنی کە ڕاستەوخۆ بە هۆی ئاگرەوە لە حالەتی کاڵی و خاوی هاتبێتەدەر و بۆ خواردن ئامادەبوبێ :: گۆشتی برژاو . ماسی‌برژاو ★ برشتە ( تەنیا بۆ نان ) . ( سن.) برژیاگ . (بک.) براشتی . ٢ـ زۆر شارەزا و لێزانبونی کەسێك لە کارێکا . ★ کوڵار . سوتاو .

**برژیاگ ـ** ( نمف. لە : مصد. برژیان ) ، (سن.، جف.) تم : برژاو.

**برژیان ـ** ( مصد. لا.) ، (سن ، جف. ) تم : برژان .

**برسیایەتی ـ** [ برسی + ئایەتی /١ ] ، (حمصد.) ، ( مک.) تم :

برسێتی .

**برسێتی** — [ برسی + ئەتی ] ، ( حمصد. ) حاڵەتێکە کە ئینسان پێویستی بە خواردن هەبێ . □ « برسێتی ڕەگی هاری پێوەیە » ( پەندی‌پێشونیان ) ★ برسیایەتی . ( بکە. ) برچێتی . برسێتی .

**برسی** — [ پە : گورسەك ] ، ( صد. ) حاڵی ئەو کەسەی هەست دەکا پێویستی بە خواردن هەیە . ★ ( بکە. ) برچی. (جنو.) وورسی. // تیر. **لەبرسان** — ( شر. ) لەبەر برسێتی ، بە هۆی برسی‌بونەوە ، لە ئەنجامی پێویستی بە نان و خواردن □ « گەر لە برسان و لەبەر بێ‌جلکی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم + نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر عەردم ئەمن »

(هێمن)

:: کچێ ئەم منداڵە لە برسان خەوی لێناکەوێ ، ڕۆژێ مەمکی دەزاری نێ .

**برش** — [؟] ، ( نا. ) ، (مکە.) ١— توێژێکە ڕەنگی مەیلە و شینە — هێندێ جار هەر شین شینە و جار جارەش شینێکی کاڵی مەیلە و سپی — وەکو کوڵکە یا لۆکەیەکی زۆر شی‌کرابێتەوە ، وایە . لە شوێنی نمدار ، لەسەر نان ، پەنیر، ماست و هەندێ میوە پەیدا دەبێ . ★ کەڕژ . تێبـ — أ) زانستی تازە ئەم مادەیە لە ڕێزی کۆمەڵێ گیای بێ‌ڕەگ و ڕیشە بە ناوی قارچك دادەنێ و پەنسیلین لەم مادەیە کە بە زمانی فڕەنسی ( پێنسێلیۆم )ی پێدەڵێن ، دەگیرێ ( تە : لاڕۆس — ١٩٦٨٠ ) ب) لە زۆر کۆنەوە لە کوردستان، بۆ چاکردنەوەی برین و کوان لە برشی نان کەڵك وەرگیراوە. دەگێڕنەوە مەحمود پاشای جاف ئەسپێکی زۆر باشی هەبوە ، شانی بریندار دەبێ و هەرچی دەرمانی دەکەن چانابێتەوە ، ڕۆژێ کابرایەکی کوردی خێڵەکی دێ کە چاوی پێدەکەوێ دەڵێ : چەند نانێك بە گەرمی بکەنە (نردو) داپۆشن تا برش هەڵدێنێ و ئەوسا نانەبرشاوییەکان لە برینی شانی ئەسپەکە دەنێ ، بە ماوەیەکی کەم چادەبێتەوە. ٢— (مجـ.) نارەحەتی و تەنگەنەفەسی لەبەر گەرما یا تەنگی جێگا .

**برشاوی** — [ برش /١ + ٢— ئاوی ] ، ( صتـ. ) حاڵی هەر شتێکی کەڕوی هەڵێنابێ . :: ئەم نانەبرشاویانە چن داتان‌ناوە ؟ . پرتەقاڵەکان هەمویان برشاوین کەڵکی خواردنیان پێوە نیە . ★ کەڕواوی .

**برشتە** — [ پە : بریشتەك ] ، ( صد. ) ، (مکە.) نانێکی باش برژابێ و گوڵی کردبێ . تێبـ — أ ) ئەم ووشەیە لە مەصدەری (براشتن = براژتن )ەوە هاتوە کە لە لەهجەی باکوریدا ماوە و لە لەهجەی ناوەندیدا بوتە برژاندن . ب) لە موکریان ، تەنیا وەکو صفەت بو (نان) دەگوترێ ، بەڵام لە لەهجەی باکوریدا ( براشتی ) وەکو ( بریشتەك )ی پەهلەوی بۆ هەمو

شتێ لە شوێن ( برژاو )ی ناوەندی بەکاردێت :: گۆشتی براشتێ ، مریشکی براشتێ .

**برش‌هەلاتن** ـ [ برش/٢ + هەڵ + هاتن ] ، (مصد. لا.) ، (مک.) تەنگەنەفەس و نارەحەت‌بۆن لە گەرمان و تەنگەبەرێ جێگا . ★ پێش‌هەلاتن .

**برش‌هەلێنان** ـ [ برش/١ + هەڵ + هێنان ] ، (مصد. لا.) ، (مک.) پەیدابۆنی برش لەسەر نان و شتی دیکە . ★ کەڕۆهەلێنان .

**برك** ـ [؟] ، (نا.) ، (مک.) ژانێکە لە ناوقەدی پیاو ( ئەو شوێنەی پشتێندی لەسەر دەبەسترێ ) بە دێوی ( پشت )دا دەوەستێ . ژانی ناوقەد و مۆرەگەی لای خوارەوەی پشت .

**بركدان** ـ ( مصد. متـ.) ، (متـ.) تۆڕهەلدانی شتێ فڕێدان و هاوێشتنی شتێك .

**برككردن** ـ (مصد. لا.) تۆشی ژان و ئازاری تیغەرەی پشت‌بۆن . :: برکی کردوه . برکی کردبۆ خوێمان بۆ گەرم کرد و لە پشتمان بەست .

**بركه** ـ [ = عا : برکة ] ، ( نا.)، (مک.) تم : ئەستێل .

**١ـ برنج** ـ [ سنـ : بیرێجیه . ، پهـ : ڤیرینج ] ، ( نا.) جۆرێك دانەوێلەیە کە لە زۆر کۆنەوە ناسراوە و بۆ خواردن کەلکی لێ وەرگیراوە ، گیایەکەی دەبێ ئاوی لەبن نەبڕێ ، بە شتێ کە هێشتا نەدرواوەتەوە ( مەرەزە )یە و زۆر بەرزدەبێتەوە ، بڕشتی زۆرە . دەنکەکانی لە ناو توێکلێکدان و پێش کڕەکردن و لە توێکڵ دەرهێنان ( چەلتۆك )ە ، دەنکەکانی بە شێوەی گشتێ ڕەنگیان لە ڕێزی (سپی)دایە . چەند جۆری هەیە : سەدرێ ، گردە ( نەگازە ) ، گەرجە . ساردە ، عەمبەربۆ . لە چین . هیندستان ، ئێران ، عێراق ، کوردستان ، یەکێتی سۆڤیەت ، بۆرما و تایلاند و گەلێ وولاتی دیکەش دەچێندرێ . تێب ـ ژابا ( تم : ل ـ ٤٦) و مۆبەد فیرۆز ئازەرگشەسب ( تم : بخشی از فرهنگ اوستا ، ل ـ ٢٥ ) ئاوێستایێ ئەم ووشەیان وەکۆ لەسەرەوە نیشاندراوە نۆسیوە ، بەلام دوکتۆر معین ( تم : بورهان، ج ١ ، ل ـ ٢٦٥ ) بە ( ئورڤینج)ی داناوە . ★ ( مک.) برینج .

**٢ـ برنج** ـ [ فرەنسێ : بڕونز] ، ( نا.) مەعدەنێکی دەستکردی ڕەنگ‌زەردە . لە تێکەڵ‌کردنی دۆ مەعدەنی ( مس ) و (قەلایێ) پەیدادەبێ . سەماوەر ، ئافتاوە و لەگەن و هەندێ خشڵی ژنانەی کەم‌قیمەتی لێ‌دروست‌دەکرێ . ★ ( مک.) زەرد . ( هل. کک.) تونج . ( سنـ.) برنجە ( بک.) برنج . پرینکۆك .

**برنججاڕ** ـ ( نتـ.) ، (کمر.) تم : برنجەجاڕ .

**برنج‌کوت** ـ [ ١ـ برنج + کوت ( کوتان ) ] ، ١ـ ( نتـ.) ئامرازێکی تایبەتییە ، لە کوردستان برنجی پێ‌دەکوتن ( توێکلی چەلتۆك

لێدەکاتەوە و دەیکاتە برنج ) . ★ دنگ. دینگ. ٢ـ ( صفا.) کەسێکی پێشەی ئەوەبێ ، بەو ئامرازە تایبەتییە چەڵتوك سپی کا و بیهێنێتە حالی برنجی . ★ دینگچی .

**برنجەجاڕ** ــ [١ـ برنج + ٣ـ ئە/٢ + جاڕ ] ، (نت.) ئەو مەزرایەی برنجی لێچێندراوە پاش دروێنەوەی مەرەزە. ★ برنججاڕ . مەرەزەجاڕ.

**١ـ برنجۆك** ــ [ ١ـ برنج + ئۆك /٢ ] ، ( نت.) ، (کعر.) کوانێکی سەخت و بە ئێشە لە جێگای زۆر نارەحەت (بە تایبەتی لە پەنجە ) دێت ★ ٢ـ مۆ ( کە.) تێبـ ــ تەنیا مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەم ووشەیەی نوسیوە .

**٢ـ برنجۆك** ــ [؟] ، ( نت.) ، ( کعر.) ، « شتێکی تەنکی کونکونی جوانە ژنان ئەیکەن بە کراس و دەسماڵ . » تم : خا. ج ١ ، ل ــ ١١٦ ) .

**برنگ** ــ ( نا.) تم : برینگ .

**برۆ** ــ [ سن : بروفاز. ، پە : بروك ] ، ( نا.) کەوانەیەکی تووکە لەسەر ئێسقانی کەوانەیی لای خوارەوەی ناوچاوان بە دەوری نێوەی لای سەرەوەی چاواندا کشاوە . ★ ( بک. ) برو . ئەبرۆ ( فر.) **برۆی سێتاق** ( نت.) ئەو برۆیەیە کە لە نێوانی هەردوو برۆیاندا ( لەو جێگایەی لووت دەبڕێتەوە و ناوچاوان دەستپێدەکا ، ئەوەندە تووك هەبێ هەردووکی تێکەڵ کردبنەوە . ☐

« دلبەرا ! پەی ڕۆی فێراقت دڵ دەناڵێ وەك ڕوباب + بەو دوو ئەبرۆیی سێتاقت بەندی جەرگم بۆ کەباب . » (؟) .

**برۆتێکنان** ــ ( مصت. لا.) گرژکردن و وێكهێنانەوەی هەردوو ( برۆ )یان بە نیشانەی نارازیتی لە کردەوەیێ یا پێخۆشنەبونی قسەیەك . ∴ قسەکانی بە کەیفی نەبو برۆی تێکنا . هەتا دەیبینی برۆی تێکناوە .

**برۆسك** ــ ( بک. . مک.) ١ـ ڕوناکاییکی زۆر گورج و خێرا کە لە کاتی هەور و هەڵا و باراندا لە ئاسمان پەیدادەبێ . ★ ( قد.) بریسو . برێسك . ( سن. ، کعر.) چەخماخە ، بروسکە . ٢ـ ( مج.) خێرا . گورج . ٣ـ ( مج.) ئازارێکی کتوپڕ کە خێرا لە شوێنێکی لەشی ئینسان ( زیاتر لە سێبەندەی پشت ، سەر ، کەلەکە) پەیدادەبێ و لە شوێنێکی تر دەبڕێتەوە و لەش لە نێوانی ئەم دوو جێگایەدا هەست بە ئێش و ژان دەکا . **تێبـ** ــ زانستی تازە دەریخستوە کە هەوران کارەبا ( ئەلەکترێسیتە )یان تێدایە ، هێندێکیان کارەبای سارد ( نێگاتیف ــ سالب ) و هێندێکیان ئی گەرم ( پۆزێتیف ــ موجب ) ، جا هەروەکو تێلی سارد و گەرمی کارەبا ئەگەر وێككەون ــ پڕیشکیان لێدەبێتەوە و ڕوناکاییکی خێرا ــ دەبینرێ و ( قرچەقرچ )ێکیشمان گوێ لێدەبێ ، هەورەکانیش وەختێ

وێكدەكەون ( برۆسك )یان لێ‌پەیدا دەبێ ، چونكو كارەبای ناو هەوران یێگجار زۆر بە هێزترە لەو كارەبایەی كە لە ماڵان كەڵكی لێ‌وەردەگرین — ڤۆڵتی كارەبای ماڵان زۆر زۆر ٢٢٠ ڤۆلتە و ئی هەوران صەت هەزاران ڤۆلت — بۆیـــە پزیشكیشـــیان گەورەترە و لەباتێ قرچە قرچێكی بچۆكی وێكەوتنی دۆ تەلی كارەبا، گوێمان لەو گرمە زل و بەســامەی هەوران ( هەوردتریشقە ) دەبـێ . هێندێ جاران هەورێكی كارەبـای گەرمی تێدایــە دەگــەڵ كارەبـای ساردی ( زەوێ ) لێك‌دەدەن ، ئەو كاتەیە كە برۆســكە لە جێگایــەك دددا و هـــەرچی بـــەرێ كەوت دەیسوتێنێ . هس : ( فرەنسێ ) بروســك . ئیتـــالی بە مانـــای ( توندەمجاز ) .

**برۆسكانن** — ( مصدَ. لا. ) ١— پەیدابۆنی ( برۆسك/١ ) لە ئاسمان :: هەروا دەبرۆسكێنێ و ناشبارێ ★ برۆسكەدان . ٢— پەیدابـۆنی ( برۆسك /٣ ) لە شوێنێكی لەشی ئادەمیزادا :: لە دوێنـێوە پشـتی دەستی كردوە بە برۆسكاندن . ★ ( سنـ.) بروسكانن .

**برۆســكانن** — ( مصـدَ. لا. ) ، ( سنـ. ) ، تم : برۆسكاندن .

**برۆسكانەوە** — [ بروسك/١ + ٢— ئان/٤ + ٢— ئەوە/٢ ] ، (مصدَ. لا.) تم : برێسكانەوە .

**برۆسكە** — [ برۆسك/١ + ٥— ئە/١] ، (نتـ.) ١— تم : برۆسك/١. ٢— (نتـ.) تێلگراف . (كعر.) برقیة.

**برۆسكەدان** — [ برۆسكە/١ + دان ( فعـ. ) ] ، تم : برۆسكاندن/١ :: هەر برۆسكە دەدا .

**برۆسكەلێدان** — [ برۆسكە/٢ + لێ ( پیبفـ. ) + دان] ، ( مصدَ. متـ.) بە تێلگراف مەبەسـتێ بە كەسـێ ڕاگەیاندن . :: برۆسكەیان بـۆ لێدابۆ كە دایكی نەخۆشە بە پەلـە زۆی .

**برۆسكیان** — (مصدَ. لا.)، (سنـ.) تم : برێسكانەوە .

**برۆشە** — [ ؟ ] ، (نا.) ، (مكـ.) جۆرێكە لە جۆرەكانی كلۆی بەفر . تێبـ — پێویستە ئەم ووشەیە دەگەڵ ( پرۆشە ) كە جۆرێك بارینی بەفرە، فەرق بكرێ .

**رۆقە** — ( نا. ) ، (مـكـ.) تـم : بریسكە .

**بردو** — ( نا. ) ، ١— زمێن ( بۆ بازاڕ ، كاڵا و شتومەك ) // كەساد. ٢— ڕێز و حورمەت ( بۆ ئینسان ).

**برەوپێدان** — ( مصدَ. متـ.) ، ( سیهـ.) ١— وەرەواجخستـــنی كاڵایەك . ٢— گەرم‌كردنی بـازاڕ ، وەڕمێن‌خســتن و لەكەســادێ رزگاركردنی بازاڕ ٣— وەگەڕخستنی كەسێ ، ڕێز و حورمەت بۆ كەسێ سازكردن ★ ( مكـ.) وەبرەوخستن.

**برەوسەندن** — ( مصدَ. لا. ) ، ( سیهـ . ) ١— ڕەواج پەیـداكردنی كاڵایەك . ٢— گەرم‌بـونی بـازاڕ و زۆربۆنی سەودا و مامەڵە تێیدا . ٣— قـەدر و حورمـەت‌پەیداكردنی كەسێ . ★ ( مكـ.) وەبرەوكەوتن .

**بریا** — [؟] ، (ئمـ.) ، (مكـ.) بـۆ

دەربڕینی دەرد و داخ و ئاوات و ئـاردزۆ لەسەرەتـای مەبەستـا دەگوترێ . :: بریـا بە بریـایێ خولآی با ئـەو سـەفەردم هـەر نەکردبا . ★ ( مـک. ، سیه .) خـۆزگە . ( بک. ، هل.) خـۆزێ ( سیه. ) کاشکە ، کاشکی .

**بریان** ــ ( ص. ) تم : برژاو .

**بریانێ** ــ [ بریان + ٢ــ ئێ ] ، ( نت.) ١ــ مرێشك ، قەلەمـۆن ، بەرخ و مەڕ کە ناوزگیان پڕکرابێ لە برنـج و بـادام و بەهـارات و کشمیش و ... و ... و لە ڕۆنا سـۆرکرابنـەوە ٢ــ گۆشـتێ کـە دەگەڵ پـیـاز و ڕۆن کرابێـتە ناو دێزە و ( پاش نانکردن ) خرابێتە تەندۆرەوە ( ئێستا فڕنیـش ) و لەسەرخۆ پیشـابێ . ٣ــ مەڕ یـا بەرخ و ... و ... کە بە ساغێ بە شێشەوە کرابن و دوور و نێزیـکی ئاگرێکی خۆش ڕابـگیرێن و بـە هـەوای ئـاگرەکە ببرژێـن . ٤ــ (مک.)، (مج.) چەوەندەری لە تەنورا پێشاو . تێب ــ أ) دەنـگی (ی)ی هەنـدێ ووشەی ئاوێـستایێ لـە قۆنـاغەکانی دوایێ گەشەکردنیـانا بۆنە (ج) : ١ــ ( سن.) یەڤە ، (پە.) یەڤ = جۆ . ئێستاش بنلەهجەی هەورامێ (یەو) و بە (جۆ) دەڵێـن . ووشەی ( جەژن ، جێژن )ی کوردێ لە ( یەسنە )ی ئاویستایێ بە مانای عیبادەت و پەرستن پەیدابوە . ٣ــ ( یـاتوك )ی پەهلـەوێ لە کوردێ ئیمڕۆدا بۆتە جادۆ . ب) لە زمـانی پەهلەوێدا ( بریج ، بریز ) بە تەندۆر گوتراوە ( تم : پفا ، فره ، ل ــ ٨) و (بریجەن ، بریزن) سوێنەیەکە ( تاودی گڵ وەکو معین نوسیویە ) نانی لەسـەر دەپێـژن ( تر : فەرهەنگ ، معین ، ج ١ ، ل ــ ٥١٨ ) . ج) جا ئەگەر بێتو ئـەو دەسـتۆردی کە دەنـگی (ی)ی ئاوێستایێ لـە قۆناغـانی دوایـێ ( پەهلەوێ ، کوردێ )دا بۆتە (ج) لەبەر چاو ڕابگرێن و لە ( بریج ) و ( بریجەن ) وورد ببێنەوە ، بۆمان هەیە بڵەین کە ئەسڵی ئەو ووشە پەهلەویانە لە قۆناغی ئاوێستـادا ( بـرێ ــ ی ) و (برێیەن)بـوە و بۆمـاندەردەکەوێ کە ووشـەی ( بریانێ ) شکڵی ئاوێستایێ خـۆی ڕاگرتوە و لەو کاتەدا بە مانـای ( تەندورێ ) یا ئەو شتـەی لـە تەنورا دەپێشێـندرێ گوتـراوە و پاشان ئەو مانایانەی بۆ پەیدابـوە کە لەسەرەوە باسمان کردن

**برێ** ــ ( نمص.) تم : برێتێ .

**برینج** ــ ( نا.) ، (مک.) تم : ١ــ برنـج .

**١ــ برینگ** ــ [؟] ، (نا.) ، (هل.) ئەو بەشەی خورێ مەڕان لەسـەر پێستیانەوە تا چەند سانتیمەترێك لە خورێ دێکە نەرم و نیانترە و چەورایێکی هەیە .

**٢ــ برینگ** ــ [؟] ، (نا.) ، (مک.) ئامرازێـکە وەکو مقەسـت بـەڵام گەورەترە ، دەمەکانی لەباتێ ئەوەی وەك ئێ مقەست لە ناوەڕاستا بـە بزمـارێك لێـكداکوترابن ، لێكجودان و کاتی ئیشپێکردن وەکو

نێره و مێیه دەخرێنه سەریەك . ئەم ئامرازه بۆ بڕینەوەی مەڕ و بزن بەكاردێت ★ برنگ ، ( هـ‌ـ. ) دوێرد ، جەو ، دڕكارد . (سنـ.) هەورینـــگ . ( بك.) جـــەو ، جـــەور ، جـــەهرێ . تێبـ ـــ من واتێدەگەم ئـــەم ووشەیه لـــه (بڕ) ڕیشـــەی مەصدەری (بڕیـــــن ، بڕینەوه ) و (ئینـــگ) پاشـــبەندی دروستكردنی نـــاوی ئـــامرازان ( ئیسمی ئالەت ) پێكهاتبێ .

٢- برینـگ ـــ [؟] ، (صـــ.) ، « ئیشك ، بە گشتێ له تركیبـی ( ئیشك و برینگ )دا » ، ( هبێد ـــ ١٧ ) .

برینگێ [گو. تو.] ـــ [ ٢- برینگ + چی ] ، ( صفا.) تم : برینگەوان.

برینگەوان ـــ [ ٢- برینگ + ٣- ئه/٢ + وان ] ، ( صفا.) ، (مك.) ئـــەو كەسەی بـــه ( هەورینـــگ ) خۆرێ و مەڕ و بزنان دەبڕێتەوه ★ برینگچێ ، جەوبڕ .

برێتێ ـــ [ بر + ئێتێ ] ، (نمصـ.) شتێ بخرێته بەر شتێكی تر ، هەر شتێكی له جێگەی شتێ دیـــكه دابندرێ یا بدرێ بـــه كەسێ یـــا كەلكی لێوەربگیرێت ، ( عا.) بدیل. :: ئەم قەڵەمه له برێتێ قەڵەمەكەی خۆت هەڵگره . لویسی شازدەهەم بە خەڵكی فرەنسای گوت له برێتێ نان با كێك بخۆن ★ له باتێ ، لـــه برێ ، ( مك.) له جیاتێ ، ( سیهـ.) بر ، برێتێ . تێبـ . ا) ئەم ووشه و هاوتاكانی بە تەنیایێ و بەبێ ( له ) له پێشەوەیان دەكارناكرێن . ب) زۆر ڕێی دەچێتێ ئەســـڵی ئـــەم ووشەیه ( عبارة )ی عەرەبێ بـــێ و جەڕێنداوابێ . برێتیبوون له ... شامل‌بوون ، پێكهاتن له ... تێبـ ـــ كه دەڵەین فلانه شت برێتییه لـــه فیساره شت مەبەست ئەوەیه كـــه ( فـــلان )ەكـــه لـــه (فیســـار)ەكـــه دروستبوه و پێكهاتوه . :: كتێب برێتییه له چەند لاپەڕه كاغـــەزێ مەبەستێكی لەســـەر چـــاپكرابێ و جزوبەندكرابێ و بەرگی تێ‌گیرابێ .

برێشـكه ـــ [ برێژ + كه ( تم : پچـــوكێ ) ] ، (نتـ.) ١- گەنـــم و گوڵەپێغەمبەره ( گەنمه شامێ )ی ئیشك كه لەسەر ساج برژابێ . ٢- (مجـ.) هەر شتێكی زیاتر لەوەی پێویستە لەسەر ئاگر بمێنێتەوه و ببرژێ .

برێسك ـــ ( نا.) تم : برۆسك .

برێسكانەوه ـــ [ برێسك + ٢- ئان/٤ + ٢- ئەوه/٢ ] ، (مصتـ. لا.) درەوشانەوه و پڕشـــنگدانی شتێك لەبەر تیشكی زۆر یا هـــەر ڕۆناكاییەكی تر . ☆ بروســـكانەوه بریسكیـــان ، بریســـكەدان ، بریقانەوه ، بریقەدان ، بریقەهاتن . :: هێچ نیه ، شوشـــەیه له نـــاو خۆڵەكەدا دەبرێسكێتەوه ، ئـــەوه نەقێمی ئەنگوستیلەكەت ئەڵماســـه وا دەبرێسكێتەوه ؟

برێسكه ـــ [ برێسك + ٥- ئه /١ ] ، ( نتـ.) پڕشنگی درەوشانەوەی زۆر گورج و خێرا . تێبـ ـــ هەندێ شت ( ئاو ، ئاوێنه ، جەواهێرات ، شوشه ، هەندێ مەعدەن ، ... ،

...) ئەگەر تیشکی هەتاو یان ڕۆناکایی دیکەیان لیبدا ، تیرێژ ( اشـعة )ی نوور لە سەریان دەشکیتەوە و ئەو شوێنەی بەر تیشك کەوتوە بەولاولای خۆیدا پرشنگ دەدات . ★ برۆقە ، بریقە ، بریق‌وباق .

**بریسکەبریسك** ــ ( نت . ) بریسکەی یەك‌لەدوای‌یەك ؛ بریسکانەوە ★ ئەوە چیە لەوێ کەوتوە هەر بریسکەبریسکیتی .

**بریسکەدان** ــ ( مصت. لا. ) تە : بریسکانەوە .

**بریسق** ــ [أ] ، (نا.) ، (مک.) تە : بریسك/١ .

**بریقانەوە** ــ [ بریقە + ٢ــ ئان /٤ + ٢ــ ئەوە/٢ ] (مصت. لا.) تە : بریسکانەوە . :: ئەری ئەو شتە چیە دەبریقیتەوە ؟

**بریق‌وباق** ــ(نت.) تە : بریسکە .

**بریقە** ــ [ی. عا کو.] ، [بریق ( عا.) + ٥ــ ئە/١ ] ، (نت.) تە : بریسکە . تێب ــ هەرچەندە ئەم وشەیە مانای بریسکە دەدا ، بەلام فەرقێکیان هەیە کە بریسکە زوو دەبڕێتەوە ، کەچی ( بریقە ) درێژخایەن‌ترە .

**بریقەبریق** ــ ( نت.) بریقەی یەك‌لەدوای‌یەك .

**بریقەدار** ــ [ بریقە + دار ( پب. ملکیت ) ] هەر شتێکی بریسکەی هەبێ و بدرەوشێتەوە . □ « بزمارە و بزمارە ، سوولی بریقەدارە » ( فۆلکلۆر ) .

**بریقەدان** ــ ( مصت. لا.) تە :

بریسکانەوە . :: لە دوورەوە بریقەدەدا .

**بریقەهاتن** ــ ( مصت. لا.) تە : بریسکانەوە :: وەکو ئەلماس بریقەی دێ .

**برین** ــ [أ] ، (نا.) ، ( مک . ، سن. ، هل. ) ١ــ بەروبوی کاری بڕانی ئەندامێکی لەشی گیاندارانە بە دار و تیلا ، بە ئامرازێکی بڕندە ( چەقۆ ، خەنجەر ، شیر ... ) ، بە گوللە یا بەربونەوە و کارەساتی لەم بابەتە . ★ زام ، ڕیش ، (بک.) برین . ٢ــ ئاوساوێکی ڕەق و خڕە لە ئەنجامی کارتێکردنی هەندێ میکرۆب یا ئالوزی دەروونی ئینسان، لە شوێنێکی لەشی ئادەمیزاد سەرهەل‌دەدا و ( کێم ) و (هەوا)ی تێداکۆدەبێتەوە ، پاش ماوەیەك ( لە خۆیەوە یا بە داوودەرمان ) سەری زەرددەبێ و هەوا و جەراحەتەکەی دێتەدەر و کەم کەمە خۆش دەبێتەوە . ★ کوان .

**برین‌پێچ** ــ ( نفا.) ، (نت.) ئەو کەسەیە برینان خاوێن دەکاتەوە و خوێنیان دەوەستێنێ و دەرمانیان دەکا و دەیان‌بەستێ . (عا.) مضمد.

**برین‌پێچان** ــ ( مصت. مت. ) ، ( تت. ) خاوێن‌کردنەوە و بڕژاندنەوە و دەرمان‌کردنی برینان. ( عا.) تضمید .

**بریندار** ــ [ برین /١ + دار ] ، ( صت. ) حالی ئەو کەسەی بە جۆرێك لە جۆران ئەندامێکی لەشی ( برین/١ )ی لێ‌پەیدابوبێ . تێب ــ ئەم وشەیە بۆ ( برین /٢ )

ناگوترێ و دەڵێن دەستم برینی لێهاتوە . ★ زامدار ، ( سنـ . ) زامار .

**برینداربوون** ـ [ مصد. لا.] ١ـ پەیدابوونی ( برین/١ ) لە لەشی ئادەمیزاد :: دەستی شامراد بە چەقۆ برینداربوو . ٢ـ وجوودی ( برین/١ و ٢ ) لە شوێنێکی لەش :: چوینە سەری هەموو گیانی برینداربوو ( برینی لێبوو ، برینی پێوە بوو ) .

**بریندارکردن** ـ ( مصد. متـ. ) دروستکردنی ( برین/١ ) لە شوێنێکی لەشی ئینسانێك . ★ برینلێکردن .

**برینداری** ـ ( حمص. ) ئەنجامی برینداربوون .

**برینلێکردن** ـ ( مصد. مت.) تم : بریندارکردن :: وەبەرخەنجەرانی دا تا توانیمان دەستی بگرین هەژدە برینی لێکرد .

**برتوبرتو** ـ ( نت. ) ، ( مک. ) ، قەرەباڵغی و ئیزدیحام .

**بڕ** ـ ( نا.) پارچەیەك لە شتێکی گەورە . کەمێ لە شتێکی زۆر . :: مامە گیان بڕێکم مێوژ بەش بدە ، بڕێ چەڵتووك بەرن کرەیکەن ، بڕێکی تر لەم قوماشە بکرە ، بڕێ دار بخە ئەم زۆپایە . ★ ٢ـ توز، توزاڵ ، توسقاڵ (توزکاڵ) ، نەختێ، کەم ، هێند ، هەند ، ( سنـ . ) چك . تێبـ ـ أ) بە لای منەوە ئەم ووشەیە لەئەسڵا ( بڕدراو ) سیفەی مەفعوولی مەصدەری مورەککەبی ( بڕدان ) بوە و کورتبۆتەوە . ب ) ئەو هاوتایانەی بۆ ئەم ووشەیە دیار کراون ، ئەگەرچی دەقاودەق مانایان یەکە بەڵام شوێنی دەکارکردنیان یەك نیە ، ناتوانین بڵەین : توسقاڵێ دار بخەرە ئەم زۆپایە .

**بڕادە** ـ ( نا. ) . ( کئێر.) وورده و خاکەیێکی کە بە کوتانەوە و سونەوە و تاشین و بڕبەندکاری لە مەعدەن ( فلز )ێك دەکەوێتەوە . :: بڕادەی ئاسن ، بڕادەی مس ، بڕادەی زێڕ .

**بڕان** ـ ( مصد. لا.) ١ـ تەواوبوون ، پەككەوتن :: ڕادیۆکە قسەی دەکرد لە خوڕا دەنگی بڕا . کە وای پێگوت کابرا قسەی بڕا . ٢ـ پەیدابوونی برین /١ بە چەقۆ و ... لە شوێنێکی لەش . لەتبوون دوکەرتبوونی هەندێ شت :: تەلی تەلەفۆنەکەمان بڕابوو . ئەوە دەستت بە چی بڕاوە ؟ **پێبڕان** ـ (مصد.لا.) [پێ = ( بە + ی = ز. ) + بڕان ] ، بەشبەرکەوتن . □ « کاڵەم دڕا و چم پێ نەبڕا » . :: ئەوساڵ ٢٠٠ دینـاری هەر لە توتنێ پێبڕاوە .

**دابڕان** ـ [ دا + بڕان ] ، (مصد. لا .) جودابوونەوە ، دوورکەوتنەوە . :: لە ڕێگا خدرمان لێدابڕا، دوستی چاك قەت لێكدانابڕێن ، ئەم حەوشەیان لەو خانوە دابڕیوە ★ بڕبوون . **لێبڕان** ـ [ لێ ( لە + ی) +بڕان]، (مصد. لا.) ١ـ بڕیاردان، سووربوون لەسەر کارێك :: جوامێر

لێبڕابێ ئەو سەفەرە هەر بکا . پیاو لێ‌ببڕێ هەمێ کارێك دەباتەسەر. ٢ــ تەواوبوونی شتێك لە شوێنێ یا لە کەسێ . :: ئەودێیە زەلکاوی زۆرە مەلاریای لێ‌نابڕێ . کورد خەباتکاری لێ‌نابڕێ . چوینە ماڵێك (چا) بخۆینەوە شەکر و چایان لێبڕابێ .

**بڕاندنەوە** ــ ( مصت. مت.) تم : بڕینەوە/٥ :: پێویستە ئەم شەڕە ببڕێندرێتەوە . هەر بە دوێ قسە بڕاندیانەوە .

**بڕانەوە** ــ [ بڕان + ٢ــ ئەوە/٢]، ( مصت. لا.) کۆتایی‌هاتنی شتێك :: ئیتر ئەم باسە بڕایەوە ، قسە لە شتێکی دی بکەین . کوڕە دەبەسە ! نەبڕایەوە ، بۆ هێندەی‌لێ‌دەلەی . ماڵی جوکلی بە جارێك بڕانەوە کەسیان لێ‌دەرنەچو □ « باسی زولفی درێژ و چاوی بە خەو + نەبڕاوە ! بوە تڕی خەسرەو » ( حاجی قادر )

**بڕاو** ــ ( نمف : بڕان ) ١ــ بڕین‌لێکراو بە تیخ و چەقۆ ٢ــ لەت‌کراو . جودابووە .

**بڕبڕاگە** ــ [ بڕبڕە + گە ] ، ( نت.) ، ( سیه.) تم : بڕبڕە . تێبـ ــ لەم ووشەیەدا ( ٥ــ ئە/١ )ی دوایی ( بربرە )بوە بە (ئەلف) .

**بڕبڕە** ــ [ بڕ + بڕ + ٥ــ ئە/١]، (نت.) تیفەرەی پشتی ئادەمیزاد و ئەو گیاندارانەی بەچکەی خۆیان بە شیری مەمکان بەخێودەکەن ، ئی ئادەمیزاد لە پشت ملی/١ تاسەرکلێنچکەی ٣٣ مورەگەی هەیە. بێجگە لەوەی کە کۆلەکەی ئیسکلێتی بەدەنی ئینسانە ( نخاعی شۆکی )شی تێداپارێزراوە . □ « بڕبڕەی پشتم ، دار عەسای دەستم » ، ( فۆلکلۆر ) . ★ تیفەرەی پشت ، ( سیه.) تیرەغە ( عا.) العامود الفقري .

**بڕبوون** ــ ( مصت. لا.) تم : دابڕان .

**بڕبەند** ــ [ بڕ ( بڕین ) + بەند؟]، ( نت.) ، ئامرازێکی پۆڵای کونجر کونجرە ، بۆ ڕنین و لێك و لوس‌کردنی مەعدەنان و دار و تەختە بەکاردێت. چەشنی زۆرە : گردەبڕ، سێ‌سو ، چوارپالو ، پشتەماسی، کلکەمشك ، کارتێخ ( تێغ ) ، چێوەسان ( چێوهەسان ) و هەریەك لەوانە گەورە و پچوك و ئەستور و بارێکی هەیە و هەر چەشنەی شوێنی دەکارکردنی جیایە ★ ( سن.) بڕبەن ، سوان ، مورەد ( لە مبرد عارەبی ) ، ( بکر.) مەبڕەد.

**بڕدان** ــ [ بڕ + دان (فد.) ] ، ( مصت. مت.) جوداکردنەوە :: شەوێ دێ گورگ لە ڕانەکەی دا و چەند سەرێکی بڕداوە .

**بڕس** ــ ( نمص.) ، ( سن.) تم : بڕست .

**بڕست** ــ [ بڕ (بڕین) + ئست]، ( نمص.) ١ــ توانایی هەلگرتنی ( تحمل ) ناخۆشی و قورسایی ئەوشاری مەعنەوی . ٢ــ ( مج.) هێز ، تاقەت . :: کوڕە دە نەختێك بکشێوە بڕستت بڕیم .

**بڕسکاندن** ــ [ ؟ ] ، ( مصت. مت.)

تە : بزرِکاندن .

**بڕشت** ــ ( نمصـ : بڕین ) ، ١ــ جیاوازیِ نێوان بنەتۆوی دانەوێڵە کە دادەچێنرێ و ئەو حاصڵــەی لێیهەڵدەگیرێ . :: ئەم گەنمــە یەکودە بڕشتی دەبێ هەر کیلۆیەك تۆو دە کیلۆی لێهەڵدەگیرێتەوە ) ★ ( مـک.) ڕێـــژە و . ٢ــ أ ) سەرمقەستی قوماش کە بــەرگدرۆ بۆ دروونی جلك لەت و کوتی دەکەن و پارچەپارچەی پچوکی لێدەکەوێتەوە بە کەڵکی هێچ نایە و فڕێی دەدەن . ب ) تیزماڵکی کاغەز کە لە کتێب و دەفتەران پاش جزوبەنــدکردن و لێكولوس کردنی قەراغەکانیــان ، یا هەر کارێکی تر لەسەر کاغــەز ، دەکەوێتـــــەوە . ٣ــ ( مـجـ.) لێهاتویێ و لێوەشاوەیێ و توانایێ بۆ ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنی کاران. :: پیاوی وا بە بڕشـــت وەك ئەم کابرایە هەر نابێتەوە .

**بڕشتلێدان** ــ ( مصـ. مـتـ.) تە : بڕین/٤ .

**برغـۆ** ــ ( نـا . ) ، ( کئێـر.) بزمـارێکە نەختێـکی بە شـــێوەی مارپێچی لەلــەکراوە ، بۆ لێــك تونـدکردنی دوو شـــت پێــکەوە بەکاردێت . تێبـ ــ أ) ئەو جـۆرە بزمارە سەرەڕای ئەوەی کە لەباری گەورە و پچوکی گەلێ شکلێ هەیە . بە شێوەیەکی گشتیێ دوو چەشنە ، یەکێکیان لە باتیِ ئەوەی وەکو بزمار دابکوترێ ، ڕاستەوخــۆ لەو دوو شتانەی مەبەستە لێكتوندبکرێن ، بــــادەدرێ و بــــە جەڕبــــادەر توندیدەکەن . دوەمیان ئەوەیــە شوێنێــکی تایبــەتیێ بــۆ کراوە و تێی هەڵــــدەکێشرێ و پاشـــان ( مۆرۆسەممون )ی لە ســەرەکەی بادەدرێ . ب) ئەگەر لــە جـۆری یەکەمیان بۆ ئاسن دەکاربکرێ دەبێ جێگاکەی بە شـێوەی لەلـــەکانی بزمارەکە بۆ لەلەکرابـێ . ج) بــە لای منەوە ئەم ووشەیە لە (بورمق)ی تورکیێ بە مانای ( بادان ) وەرگێراوە. ★ ( کعر.) بـورغیێ . ( کئێـر.) پێچ ، جەڕ .

**بڕکردن** ــ ( مصـ. لا.) بڕینـی ڕێــگا ، لـــە شوێنێـــکەوە گەیشتنەجێگەیەکی تر . :: ئــەم کابرایە نەخۆشە بڕناکا بــە پێیـان پچێتە کەرکوك ، ئــەم بارگێنــە لەکەنتەیە چۆن بڕدەکا بۆ پێنجوێن .

**بڕکە** ــ [ بڕ + ئك + ە ــ ئـە /١ ] ، ( نـ.) بنجی هێندێك گییـا و شێنـاوەرد کە (بەر)یـان هەیـە و بەرزنابنەوە و لە شوێنی خۆیـــان بەولاولادا تەرز داوێـژن . :: بڕکە شوتیێ ، بڕکە ترۆزیێ ، بڕکە خەیار.

**بڕگە** ــ [ بڕ + گە ] ، ( نـ.) ١ــ هەریەك لە ٣٣ پـارچە ئێسقانـی تێفەرەی پشتی ئادەمێـزاد . ★ مۆرگە ، ( سنـ. ) ترەختە ، مرۆخە، مۆرتخە . ٢ــ ( تـ.) پارچەیێـکی سـەربەخۆ لە نـوسراو ، قـانون ، مەقەلە و ئەو جـورە شتـانە ★ ئەقەرە ، مادده . تێبـ ــ وای بـۆ دەچم کە ئەسڵی ئەم ووشەیە (بڕکە) بوبێ و پاشان دەنگی (ك)ەکەی بۆتە (گ) .

**بڕنده ــ** [ بڕ ( بڕین ) + ئنده ]، ( نفا. ، صفا. ) تم : ببڕ .
**بڕنۆتی** ( ممر. تو : = بـوڕون ئۆتی = گیپای لۆت ] ، ( نـتـ. ) ، ( مک. ، سـنـ. ، سیه .) هەنـدێ داوودەرمانی بۆنخـۆشن تێـکەڵ دەکرێن ، بە پتە وەبـەر لـووتی هەڵدەدەن ، ئینســان وەپشمێـــن دەخا و بۆرە ( کەیف )ێکێش لەسەر سازدەکا . ( عا.) انفیة .
**بڕوا ــ** ( نا.) ، ( مک.) تم : باوەڕ.
**بڕواپێکردن ــ** ( مصتـ. متـ.) تم : باوەڕپێکردن .
**بڕواکردن ــ** (مصتـ. لا.) تـم : باوەڕکردن .
**بڕوایــی ــ** ( حمـــصـ.) تـم : باوەڕێ .
**بڕوێش ــ** [؟] ، (نا.) ١ــ (مک.) دانـەوێڵەیێکە لە نێوان ( گەنم ) و (برنج)دا ، ڕەنگی لە گەنم سوورترە و چەشنی برنجڕۆنە ، دەنکەکانی وەکۆ برنج لە ناو کێفێکدایە (پەڕش)، بە زۆرێ لە کوردستانی ئێران ناوچەی موکریان دەچێندرێ ، وەکۆ برنـج دەکرێ بە ( قبـۆڵێ ) و (پـلاو) ، وەکۆ ( ساوار )یش بـە ( شلـە ) لێدەنرێ : ( شلەبڕوێش ) ، دەگەڵ گۆشت یا قاوورمـەشدا دەکرێتـە ناو دێزە و کشمێـش و پێـوازی تێدەکرێ و پاش نانکردن دەیخەنـە تەندۆرەوە ( تەنـدۆرپلاو ) . ٢ــ ( کعر . ) أ) گەنمی بە دەستاڕ یـا ئاش قەڵت و بڕکرابێ ، بۆ چەند جۆرە چێشتێك بەکاردێت . ب ) ووردەی ســاوار . ٣ــ ( سنـ.) بەفرێکی ووردی ڕەقە کە (دانە)کانی وەك بـەفری تر نـەرم نیـە . ★ ( سنـ.) تەرزەلۆکە ، گژنێژە . هس : ( ملك.) بڕۆشە ، بڕوێشـە . ٤ــ ( مجـ.) قسـەی بێ سەرەوبـەرە . قسـەی نازێك کە هێچی بە هێچەوە نەنوسێ .
**بڕوێشە ــ** [ بڕوێش + ەــ ئە /١ ] ، (نتـ.) ، (مک.) پرۆشـەی بەفر . هس : ( سنـ. ) بڕوێش/٣.
**بڕوێش‌کردن ــ** (مصتـ. متـ. )١ــ باش ئیش نەکردنی ( ئاش ) کە لـە باتێ ئەوەی گەنم بکا بە ئارد ، هەر قەڵت‌وبڕی‌کا ( تم : بڕوێش/٢ ) :: ئاشەکە ئیمڕۆ بڕوێش‌دەکا ( بـاش ناهـــاڕێ ) . ٢ــ قســـەی بێ ڕێ‌وجـــێ‌کردن :: کوڕە کابـــرا دەبێبڕەوە ، ئەو بڕوێش‌کردنـــەت لە چیە ؟ بۆچێ قسەکانت هیچیـان بەسەر هیچەوە نیە ؟ .
**بڕوێشین ــ** [ بڕوێش + ئین] ، ( نتـ.) ، ( سنـ.) چێشتی شلـەی بڕوێش ، شـۆربای بڕوێـش ★ ( مک.) شلەبڕوێش . تێـبـ ــ لـە بەرگی‌یەکەمدا هەر چەندە بـۆ دۆ پاشبەندی ( ئین ) و (ئینە) ووتراوە کە لە ( ناو ) و ( صفەت ) ناوێکی تازە پێکدێنـن ، بـەڵام لەبـیرچوە ئیشـەکە تۆزێ زیاتر ووردکەینەوە و بڵەین کە ناوی گەلێ چێشتی شلەی کوردەواری بەمانە دروست دەبێ : نێسکێـن ، نیسکێنە ، ماشێـن ، ماشێنە ، ترخێنە .
**بڕۆسکێك ــ** [ بڕ + ( ــ ئۆچکە) +( ــ ئێك ) ] ، (بنتـ.) ئەندازەیەکی

کەم ، هێندێك . تێبـ ــ دەنگی (چ)ی پاشبەندی ( ئۆچکە ) لێرەدا بۆتە ( مس ) و لە هەندێ ووشەی تریشا دەبیندرێ ، لەوانەیە پێش ئەوەی ببێتە (س) بۆببێتە (ز) ★ بڕۆکێك، بڕێك ، بڕێ .

**بڕووکێك ــ** [ بڕ + ( ــ ئۆکە ) + ( ــ ئێك ) ] ، (بنتـــ.) تمـــ : بڕۆسکێك . تێبـ ــ هەرچـــەندە ووشەگەلی ( بڕێ ) ، (بڕێـــك) ، ( بڕۆکێك ) و ( بڕۆسکێك ) ئێستا مانایان یەکە ، بـــەڵام لە ڕاستـــیدا هەریەکەیان لە ئی پێـــش خـــۆی بچکۆلەیی زیاتر پێشان دەدات .

**١ــ بڕە ــ** [ بڕ ( بڕین + ٥ــ ئە/١ ) ] ، ( نتـ.) کەلـبەی بەراز . ★ ( مکـ.) شفرە . تێبـ ــ وا دەزانم ئەسلی ئەم ووشەیە [ بڕا = بڕ + ٦ــ ئا] و صفەتی فاعیلی مەصدەری ( بڕین ) بـــوە و بەرەبـــەرە (٦ــئا) کورتبۆتەوە و بۆتە ( ٥ــ ئە/١ ) .

**٢ــ بڕە ــ** ( نا. ) ، ( سنـ.) ١ــ بەرزایی نێوان دوو هێڵی جووت کە لە ئەنجامی کێڵانی زەوی بە گاسن ، پەیدادەبێ . ★ ( سنـ.) ناوگرە . ٢ــ تم : بڕیە/١ و ٢ .

**بڕەبڕ ــ** [؟] ، ( نتـ.) هەراوهوریا، قاووقیژ ( تم : گم ، مەهاباد ، ل ــ ٩٠ ) .

**بڕەبڕە ــ** ( بنتـ. ) کەمکەمـــە ، تۆزەتـــــۆزە ، نەختەنەختـــــە ، ووردەوردە .

**بڕەك ــ** [ بڕ ( بڕین ) + ٣ــ ئە /٢ + ١ــ ئەك /٣ ب] ، ( نتـ.) ، ( مکـ.) نێرەی بەراز ، گۆلەبەراز .

★ یەکانە ، خۆگ . // مالۆس .

**بڕیـــار ــ** [ بڕ ( بڕین ) + ئـــار /٣ ] ، ( نتـ.) ١ــ ( هلـ.) شـــێوەی بڕینی جلوبەرك بە تایبەتی کراس و دەرپێی کوردی پیاوانە . ٢ــ ( تتـ.) گەیشتنە نەتیجە لە ئیشێکدا کە دوو یا چەند کەس ، دەولـــەت و ... خیلافیان لەسەری هەبێ و کۆتایی پێهێنانی و دیـــاریکردنی ئـــەوەی کە چیلێدەکرێ :: چین و سۆڤیەت بڕیاریان داوە ناکۆکی خۆیـــان بـــە ووتووێژ لابەلابکەن . ٣ــ گەیشتنە حەللێك بۆ هەر مەسەلەیـــەکبێ :: بڕیـــار دراوە زەویوزار بەســـــەر جوتیـــاراندا دابەشبـــکرێت . ٤ــ قەراردان لەسەر کردن یا نەکردنـــی کارێ . :: شێرکۆ بڕیـــــاری داوە جگەرەنەکێشێ .

**بڕیە ــ** ( نتـ.) ١ــ نرخـــیکردنی کارێك لەسەر تەواوبـــوون، بەبـــێ حیسابی ئەو وەختەی پێویستە :: لە بڕیە ئەم خانووەمان بە چەند بـــۆ تـــــەواو دەکەی . ★ مەختـــــە ( مەقتوع ) ، ( سنـ. ) ٢ــ بڕە/٢ . ٢ــ نرخی شتێك بەبێ کێشـــان یا هیچ جـــۆرە ئەندازەگرتـــنێ . ★ گۆترە . ( سنـ.) ٢ــ بڕە/٢ .

**بڕێ ــ** [ بڕ + ٣ــ ئێ ] ، (بنتـ.) تم : بڕێك .

**بڕێك ــ** [ بڕ + ئێك ] ، ( بنتـ.) ئەندازەیەکی کەم لـــە شتێ . ★ بڕێ ، تۆزێ ، نەختێ ، هێندێ ، تۆزێك ، نەختێـــك ، هەندێـــك ، هێندێك .

**بڕین ــ** [ ستـ : برای . ، پە :

برِیبەن.، سانسکریتی: بهدێنانی].
( مصت.مت. ) ١ـ جیاکردنـەوەی پارچەیەك لە شتێك بە ئامرازێـکی بڕندە ( چەقۆ ، مقەست ، ... ) :: کوڕە ئەوە کێ ئـەو چنـارانەی بڕیوە ؟ ئـەو گوریـســـە چیــە شۆڕبۆتەوە بزانە نایبڕی . با ئارام دانیشێ دەنا سمێلی دەبـڕم ٢ـ بریندارکردنی جێگایەکی لەش بـە چەقۆ و کێرد و ... :: ووشیاربە چەقۆکە زۆر تیژە دەستی خـۆت نەبڕی،ئەو شۆشەیە فڕێدە دەستت دەبڕێ . ٣ـ ڕۆیشتن ( بە ڕێگادا ) :: ئەو ڕێگا دوور و درێژەمان بڕێ و هیچیشمان بە هیچ نـەکرد . ٤ـ ( کعر. ) تێکەڵکردنی پەڕی قومار ، بۆ ئەوەی گزێ دە یاریدا نەکرێ :: فەرموون کێ دەیبڕێ بیبڕێ پاشان نەڵێن فێڵتکرد . ★ ( کنێر . ) بڕشتلێـــدان . ٥ ـ توانــــایی لەتلەتکردنی و پارچە لە شـتێ کردنەوە دە ئامرازێکی بڕنـدەدا :: کوره ئەو چەقۆیە زۆر کولە هیـچ نابڕێ . ٦ـ توانایی سەرکەوتن و زاڵبوونی شتـێك بەسـەر شتێـکی دیکەدا :: جا خۆ قسەی من قسـەی تۆ نابڕێ . **تێبڕین** ـ (مصت. مت. ) بە زۆر شـتێك پەستـاوتنە نـاو شتێکەوە :: سینگێکیان تێبڕێ . دەلەی داریان‌تێبڕیوە وا لاجـەولاج دەڕوا .

**دابڕین** ـ ( مـــصت. مـــت.) ـ جیاکردنەوە یـــا دوورخستنەوەی بەشێکی شتێ لە ئەسلی خۆی . :: نیوەی خـانووەکەی بۆ خــۆی دابڕیوە و هێشتـاش چـاوی لـە نیوەکەی دیکەیەتی . پۆلیس کەوتنە ناو خۆپیشاندانەکە و بەشێکیـــان دابڕی .

**هەڵبڕین** ـ ( مصت. مت.) ١ـ بەرزکردنەوەی شتێ لـە شـوێنی خۆی . □ « دار هەڵبڕە صـەی دز دیارە» :: وا خەریکی خوێندنەوە بۆ هەر سەری هەڵنەدەبڕی . چاوی هەڵبڕی پڕبوو لە فرمێسك . ٢ـ دوورخستنەوەی گیاندارێـك لـــە شـوێنێ و دەرکردنی بــــە زۆر و ناچارکردنی بەڕاکردن بە جۆرێ تـا ماوەیەك وا تێبگا ئەو کەسە یا ئەو شتەی بۆتە هۆی ئەم حاڵەی هــەر بە دواوەوەیەتی.:: صەگان کابرایان هەڵبڕی . بە بەردان هەڵیان بڕی تا لە ئـاوایی دەریـــانکرد . ٣ـ لەتکردنی شتێك ( گوریس ، تەل ، تەناف ، ... ، ... ) بە ئامرازێکی بڕندە ، بە جۆرێ کە لە لای خوارەوە هێز بدرێتە ئـامرازەکە بـــۆ لای سەرەوە . :: چۆ بۆ تەلی کارەبـا هەڵبڕێ گرتبوی و کردبـوی بــە خەڵۆز .

**بڕینەوە** ـ [ بڕین/١ + ٢ـ ئەوە /٢ ] ، ( مصت. مت.) ١ـ لەتکردنی دار و تەختە و ئاسن ، ... بە مشار ٢ـ جوداکردنەوەی دار و درەختی بە پێوە لە ڕیشەی خۆیـان ، بـە مشار و تەور و بێور و ئامرازی لەم بابەتانە . ٣ـ دەرهێنانی هەنـگوین لە کەندوو ـ تێب: لە پێشدا بە هـۆی دووکەڵ ( هەنـگ ) لـە ( کەنـدوو ) دووردەخەنەوە و ئەوجار هەنگوینەکە

دەردێنن :: هێشتا هەنگەکانمان نەبڕیوەتەوە بەڵام وا دەزانم ٨ ــ ٩ حۆقەیێ هەنگوینمان دەبێ . ٤ــ لێکردنەوەی خوریێ و مۆی مەڕ و بزنان بە برینگ :: خێرا مەڕەکان ببڕنەوە تا ساڵ درەنگ نەبوە . ٥ــ کۆتاییھێنان بە ئیش و کاران ، دوایێپێهێنان ، :: ئەوە چیە ئەم شەڕەتان هەر نابڕنەوە ؟ کوڕە دە بیبڕنەوە مێشکی سەرمان چوو . وەسمان و پیرۆت لە دەمێکەوە قسەیان پێکەوە بڕیوەتەوە .

**١ــ بز ــ** (نا.) ، (هو.) تم : بزن.

**٢ــ بز ــ** [؟] ، (صـ.) ١ــ دەرپەڕیو ، زەق ( تەنیا بۆ چاو ) :: ئەم کابرایە چاوی بزە ، لە ژێر لێفەکەدا چاوی بز دەچوو . ٢ــ قیت ، قوچ . هس : دوبز ( شارۆکەیەکە لە دەوری کەرکوك )، بستوو ( بزتو ؟ ) .

**٣ــ بز ــ** ( نا.) ١ــ ئەنجامی بزپێوەکردن ★ ( مک.) جوز . ٢ــ پەنجە . قامك . تیب ــ أ) ئەم ووشەیە بە مانای دوەمی ، ئەوەندەی من پێم شك بێ تەنیا لە ( مصد.)ی بزپێوەکردندا ماوە و لە هەموو لەهجەکانی زمانی کوردیدا لەبیرچۆتەوە . ب ) ژابا لە باسی ووشەی ( بازن )دا ئاوای نوسیوە : « هەروەکو لە زمانی ( بریتۆنێ )دا ( بیزۆن )بە مانای ( ئالقە )یە ، لە ( بز ) بە مانای پەنجە ( تم : ژابا ــ ٣٥ ) لەوانەیە کەرتی (بز) یا (بزم) لە ووشەگەلی بزمار ، بزماتە ، بزمكدا هەر ئەم ووشەیەبێ . هەروەها ( بز ) و ( پژ )ی بە مانای درەوشە هێناوە ( تم : ژابا ــ ٤٩ ، ٧٨ ) . ج) ١ــ زمانی « بریتۆنێ » کە ژابا باسی دەکا زمانی دانیشتوانی کۆنی خەڵکی ( ئارمۆریك )ە کە لە بریتانیا و ئیرلەندەوە کۆچیان کردوە و لە چەرخی پێنجەمەوە لەو شوێنە کە ئیستا پێی دەڵێن ( بریتانێ ) و دەکەوێتە ڕۆژاوای فرەنسا نیشتەجێ بوون . ( تم : لارۆس ، چاپی ١٩٦٠ ، ل ١٢٢٥ و ١١٦٢ ) .

**بزافتن ــ** (مصد. متـ.) ، ( کیـ . ، بک . ) تم : بزاوتن .

**بزاوتن ــ** ( مصد. متـ.) ١ــ جوڵاندنی شتێك لە شوێنی خۆی بۆ جێگەیەکی دیێ ، بێ ئەوەی بەرزبکرێتەوە . ٢ــ ( مجـ.) هاندانی یەکێك ، بە توڕەکردنی ، بۆ ئەوەی لە حاڵی خۆی دەرپچێ و کارێك یا قسەیەك بکات . :: مەیبزێوە با دەستەکا بە قسەی حەڵەق و مەڵەق . ★ بزواندن . ( کیـ . ، بک .) بزافتن .

**بزپێوەکردن ــ** ( مصد. متـ. ، بزپێوەکردن ــ ( مصد. متـ. ) ( کعر.) ١ــ پەنجە دە پاشەڵی کەسێ ڕاکردن ، بۆ توڕەکردن یا گاڵتەپێکردنی . ٢ــ ( مجـ.) هەڵفریواندن . جوزپێوەکردن .

**بزر ــ** [؟] ، (صـ.) ، ( کعر. ، سیه .) حاڵی کەسێکی لەبەر چاوان نەبێ :: دوو سێ ڕۆژێکە جوامێر بزرە . شازاد ئەوە لە کوێی ماوەیەکە بزری . ★ (مک.) وون .

( سنە . ، سیھ . ) گوم ، ( بک . ) بەرزە ، وونداه .

**بزربۆن** ـ ( مصت. لا . ) ، ( کمر . ) ۱ـ لەبەر چاوان نەمانی شتێ یا کەسێ :: ھەبماس سەعاتەکەی لێ بزربوە . ۲ـ ( مجـ . ) ڕێ لێ تێکچوون ، ڕێگاھەڵەکردن :: شەوێك لە چۆلی ( قورفە ) دوو سێ سەعات بزربوین ڕێگاکەمان نەدەدۆزیەوە . ★ ( مک . ) وونبوون . ( سنە . ، سیھ . ) گوم بوون . ( بک . ) بەرزەبوون ، وونداببوون . ( لو . ) گوم بییە .

**بزرکردن** ـ ( مصت . متـ . ) ، ( کمر . ) ۱ـ لەدەست دەرکردنی شتێ بێ ئەوەی ئینسان ئاگای لێ بێ :: قەڵەمەکەی بزر کردوە . ۲ـ ھەڵبزانی کەسێ لە کۆمەڵێ بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن . :: زۆر نەڕۆیشتبوین پێرۆتمان بزرکرد ★ ( مک . ) وونکردن . ( سنە . ، سیھ . ) گوم کردن . ( بک . ) بەرزەکرن ، ووندا کرن . ( لو . ) گوم کردە .

**بزڕبزڕ** ـ ( صت . ) ، ( مک . ) حاڵی شیر یا ماستێ کە تێکچوبێ . ھس : لیندۆلیندۆ . تە : بزڕکان .

**بزڕکان** ـ ( مصت . لا . ) ، ( سیھ . ) ۱ـ تەفاعولی کیمیایی شیر و ماست لە ناو خۆیاندا ، لە ئەنجامی گەرمکردنیان لەسەر ئاوور و تێکچوونی فیزیکی شکلی دەرەوەیان جیابونەوەی « ئاو » لێیان و لیندۆلیندۆبوونی باقی ئەو شتانەی لە تەرکیبیاندا ھەیە . ★ ( مک . ) ھەڵکەڕان . ۲ـ شێوان و سەرلێ تێکچوونی ئینسان و پەڕینی ڕەنگی دەموچاوی لە ترسان ★ ( مک . ) پەشۆکان .

**بزڕکاندن** ـ ( مصت . متـ . ) ۱ـ قسەپەڕاندن لە وەختی نوستوبێ و نەخۆشیدا ، ھەروەھا لە کاتی سەرەمەرگا . ۲ـ ( مجـ . ) قسەی بێ ڕێ وجێ کردن لە حاڵی ئاسایی دا :: قسان دەبزڕکێنێ . کوڕە ئەوە چتە دەبزڕکێنی . ★ ڕاواندن . ووڕێنەکردن .

**بزڕکاو** ـ ( نمف . بزڕکان ) ۱ـ شیر یا ماستێکی تێکچوبێ ۲ـ ئینسانێکی ڕەنگی پەڕێ بێ . :: ئەم ماستە بزڕکاوە چیە کڕیوتە ؟ ئەوە بۆ وا بزڕکاوی .

**بزگوڕ** ـ [أ] ، ( نت . ) ۱ـ پارچە قوماشی کۆنی بێ کەڵك . ۲ـ ( مجـ . ) ھەر پارچەیێکی جلك . :: ھەموو جلەکانی لەبەر خۆی داڕنێ و بزگوڕێکی دەبەر خۆیدا نەھێشت .

**بزماتە** ـ [أ] ، ( نا . ) ، ( ھـا . ) توێژێکی ئەستورە لە ئەنجامی ئێشك ھەڵاتنی خوێن لەسەر برینی لەشی ئینسان دەبیەستێ و نیشانەی خۆشەوەبوونی برینەکەیە . ★ ( مک . ) قرتماغە . ( سیھ . ) قرتماخە ، قەتماخە .

**بزمار** ـ [أ] ، ( نا . ) ، ( کئێر . ، کمر . ) شێشێکی پۆڵای بچکۆلەیە ( نسبیا ) ، سەرێکی تۆزێ پانکراوەتەوە و نوکەکەی تیژکراوە ، تەختە چەرم و ئەو جۆرە شتانەی پێ لێك قایم دەکەن ، لە دار و دیواریش دادەکوترێ و شتی

پێوەهەڵداوەسن . زۆر جۆری هەیە : خڕ ، چوارسوچ ، سێسوچ ، وورد و درشت . ★ ( سنـ . ) بسمار . ( بکـ . ) بسمار ، بزمار . ( جنو . ) مێخ . تە : ٣ــ بز/٢ .

**بزمارڕێژ ــ** ( صتـ . ) حاڵی هەر شتێکی بزماری زۆر لەسەر داکوترابێ .

**بزمارکوت ــ** ١ــ ( نتـ . ) هێشوی ترێ کە بۆڵەکانی زۆر تێکچرژابێ . ٢ــ ( صتـ . ) تە : بزمارڕێژ .

**بزمارلێدان ــ** ( مصتـ . متـ . ) ١ــ ( بزمار ) لە شتێك داکوتان . :: وەستا گیان یەك دوو بزمارم بۆ لەو کەوشە بدە . ٢ــ ( کنـ . ) فێڵ لە کەسێ کردن ، فریودان و دەستبەزاخاکردنی یەکێك .

**بزمارە ــ** [ بزمار + ٥ــ ئە/١ ] خرابونی شوێنێکی پێستی ئینسان ( زیاتر بەری پێ ) و ڕەقهەڵاتن و ڕێشاڵڕێشاڵبونی . ★ ( سنـ . ) بسمارە . ( مکـ . ) مێخەکە .

**بزمك ــ** ( نتـ . ) ، ( باڵەکایەتێ ) تە : بزمۆك . تێبـ ــ ئەم ووشەیە کاتێ لە دەم دێتەدەر دەبێتە دوکەرتی (بز) و (مکـ .) و لە نێوان دەنگی (ب) و (ز) و هەروەها نێوان (م) و (ك)دا بزوێنە کوردێ هەیە .

**بزمۆك ــ** [ بزم + ئۆك/٢ ] ، ( نتـ . ) ، (هلـ .) دارێکی پچکۆلەیە بە ئەندازەی قامکێك درێژ و ئەستور دەبێ بەنی دەوسەرەوسەری دەخەن و دەیکەنە دەمی کارێلەی ساوا و بەنەکانی لە شاخی دەبەستن ، بۆ ئەوەی دایکی نەمژێ .

★ بزمك ، بزمەك . (مکـ .) ، (سیهـ .) بلامك . ( سنـ . ) دەمبەس ، ( جنـ . ) بلۆمە . تێبـ ــ ژابا ( بزمك )ی بە (دانەلغاو) مانالێداوەتەوە ( تە : ژابا ــ ٥٠ ) . هس ٣ــ بز/٢ .

**بزمەك ــ** [ بزم + ئەك/٦ ] ، ( نتـ . ) تە : بزمۆك .

**بزن ــ** [ ستـ : بوزە . پە : بوچ . بوز ] ، (نا . ) گیاندارێکی گیاخۆری کاوێژکەرە ، دو شاخی هەیە بەرەو دواوە دەشکێنەوە ، ڕدێنێکی درێژ و کلکێکی کورتی هەیە ، لە زۆر کۆنەوە کەوێ کراوە . گۆشتی دەخورێ ، شیر دەدا و لەشی (مو) داپۆشیوە .

**بزنانە ــ** [ بزن + ئانە/٣ ] ، ( نتـ . ) جۆرە باجێکی ئاغایەتییە بە پێی سەری بزنان لە خاوەنی دەستێندرا .

**بزنترێنە ــ** ( نتـ . ) ، «گیایێکە بەهارێ ، سەلکی بە قەد پیازێکی پچوك ئەبێ ، بزن ئەیخوات و لەبەر تێژێ ئەترێ . » . تێبـ ــ باسی ئەم گیایەم لە « فەرهەنگی کشتوکاڵ ( ج١ ، ل ــ ٣٥ )ی مامۆستا شێخ مارفی قەرەداغی وەرگرتوە .

**بزنمژ ــ** ( نتـ . ) ، ( سنـ . ) تە : بزنمژە .

**بزنمژە ــ** [ بزن + مژ ( مژین ) + ٥ــ ئە/١ ] ، (مکـ .) ، گیاندارێکە چوار دەست و قاچی هەیە و پەنجەکانی درێژن ، دەستی وە دەستیئینسان دەچێ ، کاوێژدەکا ، لەشی بە قەد پشیلەیەك گەورە و

ئەستورە ، بە کلکە درێژەکەیەوە نیزیکەی میترێك درێژ دەبێ . لە دەشت دەم بە گوانی بزنانەوە دەنێ و دەیانمژێ ، هەر بزنێکی ئەم دەعبایە بیمژێ گوانی لە کەرەم دەکەوێ و شیرنادا ، لە کوردستان کەوڵەکەی دەکەنە بەرگی کالانی خەنجەر . ★ ( سنە ، سیهە.) بزنمژ . بزنمشك . ( سنە.) تیڕتیڕە قومقومە . (جن .) بوزمژنەك .

**بزنمشك** ــ ( نت.) ، ( سنە. ، سیهە. ) تم : بزنمژە . تێب ــ بەلای منەوە ئەم ووشەیە لە پێشدا بزنمژە [ بزن + مژ (مژین) + ١ــ ئەك/٣] بوە ، وورده وورده (ئە)ی ( ١ــئەك /٣ ) سواوە و بۆتە (بزنمژك) ، ئەوجار دەنگی (ژ) لە جیرانەتی دەنگی (ك)دا بۆتە (ش) . بەڵام لە ووشەی ( بزنمژە )ی موکریانیدا دەنگی (ك)ی ( ١ــ ئەك/٣ ) کەوتوە .

**بزنەدۆخە** ــ [ بزن + ٣ــ ئە/٢ ( نت.) ئەو بزنەیە کە هەر خاوەن بزنێك بۆ (ئاغا)ی دەنارد تا شیر و ماستی بخوا و پاش ئەوەی ووشکی دەکرد وەریدەگرتەوە .

**بزنەقسر** ــ ( نت.) بزنێکی کە ساڵێك نەزابێ .

**بزنەکوڕانە** ــ [ بزن + ٣ــ ئە/٢ + کوڕ + ئانە/٣ ] ، ( نت.) ئەو بزنەیە کە کاتێ ( ئاغا ) کوڕی دەبۆ ، دەبوایە مسکێنەکانی گوندەکەی سەروبزنی پێشکێش کەن .

**بزنەکێوێ** ــ [ بزن + ٣ــ ئە/٢ + کێو + ٣ــ ئێ ] ، ( نت.) ١ــ گیاندارێکی گیاخۆرە ، وەکو ئاسك دەچێ ، نوکی شاخەکانی خوارە ، لە جێگای سەخت دەژی و بە ( ڕەوەز ) و ( زەرد ) و ماهان هەڵدەگەڕێ ، ڕەنگی زەردێکی کاڵە، تیسکی (مو)ی زۆر کورتە بەر پەنجە ناکەوێ لە چیاکانی کوردستان زۆرە و نێچیروان بۆ خاتری گۆشتی ڕاوی دەکەن . ٢ــ ( مج.) أ) ئادەمیزادێکی بتوانێ بە جێگای سەخت هەڵگەڕێ ، شاخەوانیچاك . ب ) کەسێکی زۆر لەسەر دیواران و شوێنی بەرز هەڵوەستێ . ★ ( بك.) بزناکوڤێ .

**بزنەگەل** ــ [ بزن ــ ٣ ــ ئە/٢+ گەل ] ، ( نت.) ، (مك.) کۆمەڵێ بزن پێکەوە . ڕانی بزن .

**بزنەمەرەز** ــ [ بزن + ٣ــ ئە/٢ مەرەز ] ، ( نت.) چەشنێك بزنە . لەباتی ( مو ) مەرەزی بە لەشەوەیە.

**بزواندن** ــ ( مصت. مت.) تم : بزاوتن . تێب : ئەمە دوەمین مەصدەری متعدیيە .

**بزواندنەوە** ــ ( مصت. مت.) جوڵاندنەوەی لەسەرەخۆی شتێ بێ ئەوەی لەو شوێنەی لێیەتی بگوازرێتەوە . :: مەیبزوێنەوە با نەکەوێتەخوار . □ « دەستم لێمەدە و مەمبزوێنەوە .

**بزۆز** ــ ( نفا. ، صفا.) ١ــ کەسێکی ئارام ناگرێ ، ئەوەی هەر دەجوڵێتەوە . ٢ــ (مج.) ، (صفا.) ئادەمیزادی هار و هاج.:: منداڵێکی بزۆزە ★ بزێو/١ . ( سنە.) بزۆك . تێب ــ أ) ئەم ووشەیە لە ڕێشەی ( مصت. مت. )ی بزوتن

داتاشراوە . بەلای منەوە داتاشرانی ئەم ووشەیە دوّ ڕێی تێدەچێ . یەکەم لە ڕێشەی مەصدەری بزوّتن ( بزوّ ) و ووشەی ئاوێستایی (ڤەز) کە یەکێك لە ماناکانی ( جولان و بزوّتن )ە داتاشرابێ کە مەصدەری ( بزوّتن )ی ئێستای زمانی کوردیش دەبێ هەر لەو ووشە ئاوێستاییە کەوتبێتەوە . دووەم ــ دیسان هەر ڕێشەی مەصدەری بزوّتن ( بزوّ ) دەگەڵ ووشەی پەهلەویی ( ئوّج ) بە مانای : هێز ، زوّر ، توانست تێکەڵاوبوّبن و دەنگی (ج) بوّبێتە ( ز ) ، لەوانەشە لە قوّناغێکی پێش ئێستادا بوّبێتە (ژ.) .

**بزوّك** ــ [ ٢ــ ب/٢ + زا (زان، زایین ) + ئوّك/١ ] ، ( صفا.) ، ( سنـ.) ١ــ حالی ئافرەتێکی سكوزا زوّر . ٢ــ حالی هەرگیانداریکی هەموو سالێ بەچکەی ببێ . // نەزوّك . قسر . تێبـ ــ بە پێی ئەو کەرتانەی کە ئەم ووشەیان لێ پێکهاتوە ، دەبێ ئەسلی ووشەکە لە پێشدا ( بزائوّك ) بوّبێ و قوّناغ بە قوّناغ گوّڕانی بەسەرا هاتوە .

**بزوّت** ــ [؟] ، (نا.) ، ( مکـ.) بزە دارێکە خرابێتە ئاوورگ و تەندوورەوە و هێندێکی سوّتابێ و گڕی دامرکابێتەوە و هەندێ جێگای هێشتا ئاگری مابێ و بسوّتێ و دوکەڵی لێ هەڵبستێ . ★ سەرەبزوّت . سەلکەبزوّت . تێبـ ــ من وا تێدەگەم ئەسلی ئەم ووشەیە لە قوّناغی پێش ئێستایدا (بسوّت)بێ و لە [٢ــ ب/٢ُ + سوّت (سوّتان) ] پێکهاتبێ و پاشان دەنگی (س) بوّبێتە (ز) .

**بزوّتن** ــ ( مصد. لا.) ١ــ چوونی کەسێك لە شوێنێکەوە بوّ شوێنێکی تر . :: ئەم هەموو تەق و توّقە بوّ لە جێگای خوّشی نەبزوّت . ٢ــ گوّڕانی جێگای شتێك :: ئەو ڕادیوّیە لە جێی خوّی بزوّتوە کێ دەستی لێداوە . ★ جوّلان . ٣ــ ( مجـ.) دەستپێکردن :: گەرما بزوّت . ڕاوەستە با سەرما ببزوێ دەیانبێنینەوە .

**بزوّتنەوە** ــ ( مصد. لا.) ١ــ جوّلانەوە بێ ئەوەی جێ گوّڕکێ تێدابێ ، حەرەکەت کردنی شتێ هەر لە شوێنی خوّی . :: لق و پوّپی دارەکان هەموو دەبزوّتنەوە . لە دوورەوە ڕەشاییەکمان دێت دەبزوّتەوە . ٢ــ ( تنـ. ) حەرەکەی سیاسی :: بزوّتنەوەی دژی ئیمپریالیزم. بزوّتنەوەی کوردایەتی، بزوّتنەوەی گەلی فەلەستین بزوّتنەوەی ئازادیخوازانە .

**بزوّك** ــ [ بزوّدبزوّتن + ئوّك (پـ.) ] ، ( سنـ.) ، ١ــ ( صفا.) تە : بزوّر ٢ــ (صـ.) حالی پیاوی کارلەدەستهاتوو ، ئەوەی لە کاراندا بە دەست و بردبێ . ★ زرنگ . چالاك .

**بزە** ــ [؟] ، ( نا.) پێکەنینی بێ دەنگ ، زەردەخەندە . تێبـ ــ ئەم جوّرە پێکەنینە ، جاروبار بوّ گالتەپێکردن و گالتەپێهاتن بە کەسێ و بە کردەوەیێ ڕوّدەدا . □

« نرخی بزەیەك بارە لەسەر لێوانم »
« پارسەنگە دڵی گەرم و هەناسەی سەردم »
( خەیامی هەژار – ٢٣ )

**بزەڵە –** [ بز ؟ + ئەڵە/٢ ] ، (نت.) بەچکەی بەراز ★ (مک.) کودەڵە . ( جف.) چۆخەبازەڵە .

**بزێ –** [ ٢– ب/٢ + زێ (زان ، زایین) ] ، (صفا.)، (مک.) مانگایەکی کەوتبێتە چوارساڵییەوە .

**بزێو –** ( صفا : لەبزاوتن ) ١– ئەوکەسەی زۆر دەجوڵێ و نسارەحەتێ بۆ دەوربەری خۆی سازدەکا . ★ بزۆز . بزۆك /١ . ٢– (پب.) بە دوای ناوێکەوە دەلکێ و ( صفا.) دروستدەکا.:: سەربزێو، بنبزێو ، دەستبزێو .

**بژ –** [ ست : بەریشە . ، پە : بوش ، بۆش ] ، (نا.) ، (مک.) ١– یالی ئەسپ و ماین و ... ★ ( بک.) بژێ . ٢– (سیە.) لاسکە بارێکەکانی گوڵی گەنم و جۆ و گیاوگژی تری وەکو ئەوان ، کە وەکو دڕۆ تیژ و ڕەقن ★ ( سن.) ، ( سیە .) بژ/١ . ( مک.) داسۆ . هس : ( بک.) بز و پژ . ژابا ئەم دوانەی بە مانای ( درەوشە ) هێناوەتەوە ( تە : ژابا ٤٩ و ٧٨ ). ٣– ( صە.) حاڵی هەر شتێکی (گیا، تۆك ...) کە سەرێکی بە بنجی خۆیەوە بەندبێ و سەرەکانی دیکەی بەولاولای خۆیدا بڵاوبۆبێتەوە :: تۆکی سەری ئەم منداڵە بژبۆتەوە . ★ پرژ ، پەرش ، پژ/٢ ، هس : فش .

**بژار –** ( نا. ) ١– کاری خاوێنکردنەوەی کشتوکاڵ و شێناوەرد ، لە گیا و گوڵی بە زیان. ٢– ( سن.) ئەنجامی خۆدۆزێنی ئینسان و مرێشك و پەلەوەری دیکە . ٣– (مج.) ، (مک.) گیا و گوڵی زیاندار کە لە ناو شێناوەردا ڕوابێ :: ئەم باخچەیە بژاری زۆربوە ★ ( سن.) بژارە/٢ . هس ( جن.) بژەر : ئەوەی بێژنگ دای‌نادا .

**بژاردن –** ( مصت. مت. ) ١– تۆڵەکردنەوەی زەرەر و زیانێکی لە کەسێ کەوتبێ . ( عا.) تعویض :: ئەسپەکەی شامراد لە ژێر کوێخا تۆفیقدا سەکەتبۆ . بۆی بژارد . ٢– خاوێن‌کردنەوەی دانەوێڵە لەو شتانەی هاوجسنی خۆی نین :: برنجەکە بژێرە. ساوار بە بژاردن پانابێتەوە دەبێ بەردەشۆرکرێ . هس : ( فر.) بۆجارێ = لە بێژینگدانی دەغڵ و دانەوێڵە . ٣– ( مج.) ئەژماردن لە هەندێ بنلەهجەی موکریانێدا . ★ ( بک.) بژارتن . **پێبژاردن** – ( مصت. مت.) تۆڵەی زەرەر و زیانی خۆ لەو کەسەی زەرەرەکەی داوە ئەستاندن :: نەرێمان قەڵەمەکەی فەرهادی وونکردبۆ پێی‌بژارد .

**هەڵبژاردن –** [ (پیبف.) + بژاردن ] ، ( مصت. مت.) ١– جوداکردنەوەی هەندێ شت لە ناو کۆمەڵێ هاوجسنی خۆی . ( عا. ) انتقاء . :: خۆت کیلۆیەك ترێی چاکم بۆ هەڵبژێرە . ٢– ( تت.) دیاریکردنی نوێنەری کۆمەڵێ خەڵك

بۆ کۆڕ و ئەنجومەنان :: هەڵبژاردنی نوێنەر بۆ پەڕلەمان مافی میللەتە . ( عا.) انتخاب .

**بژاردنەوە ــ** ( مصت. لا.) ، ( سنـ.) گێڕانەوەی خەو ( تم : مردۆخ ، ب١ ، ل ــ ١٦٧ ) .

**بژاردە ــ** ( نمف : لەبژاردن ) ، ( محر.) ، (مکـ.) تم : ئەژماردە :: نەچێ هەروا بێدەیە دەستێ ، بژاردە تەسلیمی کە . **هەڵبژاردە ــ** ١ــ شتێ کە لە ناو کۆمەڵێ هاوجسنی خۆی جیاکرابێتەوە . ٢ــ کەسێکی کە بۆ کار و مەبەستێ ئینتیخابکرابێ . □ « بەڵام ئەی هەڵبژاردەی خۆم + ئەم ڕێگایەم گرتوە و ئەگرم » ، (دلێر ، ئاگر ، ل ــ ٧٢ ) .

**بژارکردن ــ** ( مصت. متـ.) ١ــ هەڵکێشانی گیای هەرزە و بە زیان لە باخچە و کشتوکاڵ . ٢ــ خاوێنکردنەوەی هەموشتێ لەو شتانەی هاوجسنی خۆی نین. (عا.) تطهیر ، تنقیح .

**بژارە ــ** [ بژار/٢ + ٥ــ ئە/١ ] ١ــ ( نمصـ.) ، (مـکـ. ) لێکجوداکردنەوەی ڕایەڵ و پۆی تێکاڵاو یا پاشوپێشکەوتەی (کر). ٢ــ (نمصـ.) ، (سنـ.) وەرگێڕان لە زمانێکەوە بۆ زمانێك . تەرجەمە (تم : مردۆخ ، ب١ ، ل ــ ١٦٧ ) تێبـ ــ مردۆخ بەرانبەر بەم ووشەیە چەند ووشەیەکی فارسێ : (پەچۆ، نۆرەند ، دەستێ دازە ، پایخوان و هەمسیراز )ی نوسیوە ، لە « بورهانی قاتیع »دا هەمو ئەوانە بە مانای ( وەرگێڕان لە زمانێکەوە بۆ زمانێك ) نوسراون ، بەڵام « معین » یەکێکیشیانی نەنوسیوە . ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ووشەی ( پەچۆ )ە کە لە لەهجەی باکورێدا دپاچڤە ، هەیە بە مانای تەرجەمە .
٣ــ ( نا.) ، ( سنـ.) تم : بژار/١و٢.
٤ــ ( نا.) ، ( سنـ.) تۆڵەی زەرەر و زیان کە بۆ کەسێ دەکرێتەوە ، ئەنجامی کاری بژاردن/١ .

**بژاڵ ــ** [ بژ + ٣ــ ئاڵ ] ،(نتـ.)، (سنـ.) ١ــ ئیشکەڵی دار و درەخت. ٢ــ پوش و پەڵاش کە پاش دارەڕای خانو دەخرێتە سەربان و لە پاشان گلەبان دەکرێ و سواغدەدرێ . ★ هەژگ ، بژاڵ ، هەژگەڵ .

**بژانگ ــ** ( نا.) ، (سیهـ. ، سنـ.) تم : برژانگ .

**بژوێن ــ** [أ] ، ( صتـ.) ، (مکـ.) ١ــ گیای زەمەند و چڕ . ٢ــ لەوەڕگەیێکی گیای زۆربێ . :: لەوەڕەکەی بژوێنە . ★ ( بکـ. ) بژۆن . ( تم : ژابا ــ ٥١ ) . هس : (با.) بژۆن = خاوێن ، پاك. وهس: (مکـ.) دژوێن = چلکن ، پیس .

**بژۆڵ ــ** (نا.) تم : برژانگ .

**بژیشك ــ** [ ب/٢ + ژێ (ژین) + شك ( چکـ.) ] ، (بکـ.) دوکتۆر ، حەکیم ئەو کەسەی نەخۆشان چاكدەکاتەوە . تێبـ ــ بەلای منەوە ئەم ووشەیان لە ( پزیشك ) کوردیترە .

**بژیوی ــ** [ ٢ــ ب/٢ + ژێ ( ژین + ٣ــ ئی ) ] ، (نتـ.) ، (مکـ.) هەرچێ بۆ ژیان پێویست بێ ،

هەرچی پێوەندیێ بە ژیانەوە هەبێ :
★ ( سنە. ) ژێوار .
**بست ـ** [ ستـ : ڤیتاستی ] ، ( نا. ) ، (مکـ.) ئەندازەیێکە بۆ پێوانی درێژیێ شت ( واحد طول ) کە بە شێوەیەکی نێونجی ٢٢ سانتیمتر دەبێ و لەسەری قامکە گەورەی دەستی ئادەمیزادڕا دەستپێدەکا و دەگاتە دوایێ پەنجەتۆتە و پەنجەڕگانی دیکەی دەست. لێك‌بلاّودەکرێنەوە و تێردەکرێن . ★ بۆست . ( سنە. ) بنگیس ، ( هو. ) بنگۆس . ( بکـ. ) بهۆست ، بۆست ( جنـ. ) بکس .
**بستۆ ـ** [ بست + ٢ـ ئۆ ] ، ( نتـ. ) ١ـ تەپۆلکەیەکی بەرزایێ و درێژایێ کەمبێ . ٢ـ کلکەی شاخ کە هێندەی نامێنێ دەگەڵ دەشتایێ تێکەڵ‌بێتەوە ★ پاڵ .
**١ـ بستە ـ** [بست + ٥ـئە/١]، (نتـ.) ، (مکـ.) ١ـ شیشێکی ئاسنی درێژ و پانە ، لە بەرداشی بنەوە دێتە دەر و دەچێتە ناو (تەوەرە)وە و بەرداشی سەرەوە دەسوڕێنێتەوە. ★ ( سیهـ. ) بلۆسك . بلسك ، بلۆسك . ٢ـ پارچە ئاسنێکی پانە ( ٤رە سانتیمتر ) و درێژایێ بە پێی پێویست ، بەسەر ئاوورگ و تەندورا ڕایەڵ‌دەکرێ و مەنجەڵ و دیزە و ئەو جۆرە شتانەی دەخرێتە سەر . ٣ـ ئەنجامی کاری بستەلێدان . هس : « بستـ ، بستەك »ی باکۆریێ ( تم : ژابا ـ ٥١ ) و « بلۆسك »ی فارسیێ ( تم : معین ، فەرهەنگ ، ب١ ، ل ـ ٥٦٧ ) بە مانای شیشی

گۆشت‌برژاندن .
**٢ـ بستە ـ** ( محر : یۆنانیێ = پێستاکیۆن ] . ( نا. ) ، ( مکـ. ) بەری دارێکەو دەخورێ ، وەکۆ بادام و.. وایە ، لە هەندێ شوێنی کوردستان دەچێندرێ و لە داری قەزوان موتوربەی دەکەن . ★ ( کئێر. ) پستە . ( کعر. ) فستق .
**٣ـ بستە ـ** [؟] ، (صـ.) حالی کەسێکی باکی بە هیچ نەبێ ، :: بڕۆ لە ئێمەوە بستە بە چدەکەی بکە ★ بەرەڵلاّ ، ئازاد ، سەربەست .
**بستەلێدان ـ** [ بستە ؟ + لێدان ] ، ( مصتـ. لا. ) بە دوو پەنجەی دۆشاومژە ( قامکی شادە )ی هەردوو دەستان ، یا بە قامکەگەورە و دۆشاومژەی دەستێك ، لەسەر هەوای مۆسیقا و هەڵپەڕکێ دەنگ‌دەرخستن . ★ ( مکـ. ) چەقەنەلێدان . (سنە.) پلتەقاندن .
**بسك ـ** ( نا. ) ، ( مکـ. ) تمـ : ئەگرێجە . تێبـ ـ ژابا ئەم ووشەیەی بە مانای ( مۆی‌لول ) و هەروەها بە مانای ( کلك ) هێناوە ( تم : ژابا ـ ٥١ ) و دوکتۆر ( معین )یش لە باسی ووشەی بۆسۆك )دا ( تم : فەرهەنگ ، ج١ ، ل ٥٣٥ ) ، ووشەی ( بسك )ی کوردیێ وەکو شایەد هێناوە و دەڵێ مانای( مۆی لول )ە و ( بشك )یشی بە کلك مانا لێداوەتەوە .
**بسکە ـ** [ بزە + کە ] ، ( نتـ. ) نیشانەی دلخۆشیێ و بە دەماغیێ و سەرکەوتن کە لە دەم‌وچاوی ئادەمیزادا دەردەکەوێ ●

**هەربسکەی سمبێڵی دەهات** ـ (کن.) کەیفی خۆش بۆ ، دەماخی سازبۆ . ★ تۆکە .

**بسکەبسك** ـ ( نت.) دڵخۆشی و بەدەماغی ، نیشانەی کەیف خۆشی .

**بخورد** ـ [ عا. محر.] ، ( نا.) تم : بخۆر .

**بخۆر** ـ [عا. ممر.] ، (نا.) تم : بخۆر .

**بق** ـ ( ند.) ووشەیەکە ، منداڵی ساوای زمان نەپشکوتوی پێ لە شتێك دەترسێندرێ تا دەستی لێ نەدا .

**بقە** ـ [ بق + ە ـ ئە ١/ ] ، (ند.) ١ـ ووشەیەکە منداڵی ساوای زمانپشکوتو دەیڵێ و گەورەی پێ لە ژان و ئێشی جێگایەکی لەشی ئاگادار دەکا . ٢ـ گەورە بە منداڵی دەڵێن بۆ مەنع کردنی لە کارێك . ٣ـ ( مج.) گەورەش جاروبارە هەر بە مانای مەترسی بەکاری دێنن .

**بکوژ** ـ [ ٢ـ ب/٢ + کوژ ( کوشتن ) ] ، (صفا.) ١ـ کەسێکی خەڵك بکوژێ . ٢ـ تابخێکی چاك ڕاوبکا . ٣ـ ( مج. ) بەدەستەڵات ، دەستڕۆیو . □ «بکوژ و ببڕ هەر خۆیەتی » .

**بگار** ـ [؟] ، ( نا.) ، (سن.) تم : بوار . تێبـ ـ بە لای منەوە ئەم ووشەیە شێوەیەکی کۆنتری (بوار)ە.

**بگاردن** ـ ( مصت. مت.) ، (سن.) تم : بواردن ، ڕابواردن ، هەڵبواردن ★ ( سن.) بگیرانن .

**بگارە** ـ [ بگار + ە ـ ئە ١/ ] ، ( نت. ) ، ( سن.) تم : بوارە . تێبـ : بگار ( تێبـ. ) و هس : (بیارە) کە وا تێدەگەم شێوەی تازەتری (بوارە) بێت .

**بگربگر** ـ ( نت.) ، ( مک.) تم : بگرەوبەردە .

**بگردگ** ـ ( نمف.) ، ( سن. ) تم : ڕابوردو ، تێپەڕیو .

**بگردن** ـ (مصت. لا.) ، ( سن.) تم : بوردن .

**بگرە** ـ [ ٢ـ ب/١ + گر (گرتن) + ئە (ز.) ] ، (شر.) وای دابنێ ، وا بزانە ، فەرزکە .

**بگرەوبەردە** ـ (نت.) هەراوهۆریا، هەراوبگر ، پیشێوی ★ بگربگر .

**بگێڕ** ـ [ ٢ـ ب/٢ + گێڕ (گێڕان) ] ، ( نفا. ، صفا.) ، (مک.) ئەو کەسەی نمەد دروست دەکا . ★ ( سیە.) کارگەچی ، ( مک.) نمەرماڵ . ( سن.) نەووگ ماڵ .

**بگێڕی** ـ ( حمص. ) کارێکی نمەدماڵ دەیکا . کارگەچیتی .

**بگێربگێر** ـ [ فر. ] [ ٢ـ ب/٢ + گێر (گێران) ] ، (نت.) ، (کثیر.)، گرتنی خەڵك بە ژمارەی زۆر بۆ هەر مەبەستێکی بێ .

**بلا** ـ ( سیفەی ئەمرە) ، ( سن.) تم : بلاّ .

**بلانە** ـ ( سیفەی ئەمرە ) ، (سن.) ، تم : بلاّ . □« بلانە بەندەی خوا » .

**١ـ بلاو** ـ [؟] ، (نا.) ، ( سن.) دانە لفاو . (تم : مردۆخ ، ب١ ، ل ـ ١٧٨ ) .

**٢ـ بلاو** ـ [ ٢ـ ب/٢ + لاو ( لاواندنەوە ) ] ، (صفا.) ، ( سن.)

ئەو کەسەیە مردۆ دەلاوێنێتەوە و پێی‌هەڵدەڵێ ( تە : مردۆخ ، ب١ ، ل ـ ١٧٨ ) .

**بلبل ـ** ( نا . ) ، (کمر .) تە : بولبول .

**بلچ ـ** [؟] ، (نا.) ، (هو. ، سنـ.)، بەری دارێکە لە لێڕەوارەکانی کوردستان زۆرە ، دارەکەی زۆر گەورە نیە و تۆزێ دڕاویە ، گوڵی سپێ و بۆنخۆش دەکا . بەرەکەی دەخورێ هێندێك مزرە ، سوور و زەردی هەیە ، پایێزان پێدەگا . ★ ( کمر .) گوێیژ ، (مک.) گێوژ .

**بلچەزەردە ـ** [ بلچ + ٣ـ ئە/٢ + زەرد + ٥ـ ئە/١ ] ، ( نت.) ( سنـ.) گێوژی زەرد .

**بلچەسوورە ـ** [ بلچ + ٣ـ ئە/٢ + سوور + ٥ـ ئە/١ ] ، ( نت.) ، ( سنـ.) گوێژی سوور .

**بللوور ـ** ( نا . ) ، ( مک.) تە : بلوور.

**١ـ بلوێر ـ** [ ٢ـ ب/٢ + لوێر (لوراندن) ] ، ( نت.) ئامرازێکی مۆسیقای کوردییە ، لە قامیش دروستدەکرێ ، حەوت کونی تێدایە ـ بە ئەندازەی حەوت پێتی ـ نۆتەی مۆسیقای کە تازە دۆزراونەوە ( دۆ ، رێ ، می ، فا ، سۆل ، لا ، سی) ـ و هەموو هەوایەکی پێ لێدەدرێ .★ (بک.) بلوور، بلۆل. (سنـ.) بلوور ، لوولە ( تە : مردۆخ ، ب١ ، ل ـ ٣١١ و ب٢، ل ـ ٦٠٠). ( جنـ.) بێك .

**٢ـ بلوێر ـ** (نا.) ، (مک.) لوولەیێکی دارە ، بستێك درێژ دەبێ و سەرێکی تۆزێ لە لاسکەکەی دێتە پێشەوە . لە باڵێفەی بێشکەی منداڵ ـ هەڵدەکێشرێ ، تا کاتێ منداڵەکە مێزدەکا بە ( بلوێر )دا بچێتە ناو ( ئاوەخانە )کە بە ژێر لانکەکەوە دەبەستن . بە پێی شکڵی ئەو بەشەی کە لە لاسکەکەی دێتە پێشەوە دەبێتە کوڕانە و کچانە .

تێبـ ـ من وا دەزانم کە (١ـ بلوێر) و ( ٢ـ بلوێر) یەك ووشەن و دووەم لەبەر نیمچە و وێکچوونێکی شکڵی لە یەکەمیان خوازراوەتەوە و من بە ئانقەست کردوومنە دوو ( واحید )ی سەربەخۆ . (کک.) ★ بلوتین .

**بلوێربەزێن ـ** [ ٢ـ بلوێر + بەزێن (بەزاندن) ] ، (صتـ.) ، (مک.) ١ـ حاڵی منداڵێکی کە لە بێشکەدا زۆر دەجوڵێتەوە و خۆی لە (بلوێر) رزگار دەکا و (مێز)ەکەی دەکاتە بن خۆی . ٢ـ (مجـ.) پیاوی چەقاوسوو . ئادەمێزادی پەتپسێن و بێ چاو و ڕوو . ★ (سنـ.) بلەربەزێن .

**بلوێرپێچ ـ** [ ٢ـ بلوێر + پێچ ( پێچان ) ] ، ( نت.) ، (مک.) پارچە (پەڕۆ)یەکە لە لێواری ( بلوێر )ی دەپێچن تا ناوگەڵی منداڵ ئازار نەدات .

**بلوێرژەن ـ** [ ١ـ بلوێر + ژەن ( ژەندن ) ] ، ( نت.) کەسێکی بلوێر لێدەدا ، کەسێکی بزانێ هەوای جیاجیای مۆسیقا بەم ئامرازە لێبدات .

**بلوێرلێدان ـ** ( مصتـ. متـ.) دەرهێنانی دەنگ لە ( ١ـ بلوێر ) بە هەوای مۆسیقا . ئەم کارە بە (فوو) پێداکردن و پەنجەبزاوتن و

گواستنەوە، لەسەر حەوت کونەکانی ( ١ـ بلوێر ) جێبەجێدەبێت . ●

**بلوێربۆگالێدان** ـ (کن.) قسەکردن بۆ کەسێ کە هێچی تێنەگا .

**بلوێن** ـ (نا.) ، (کک.) تم : ٢ـ بلوێر .

**بلۆق** ـ [؟] ، (نا.) ، ( مک. ) هەڵتۆقینی شوێنێکی لەشی گیاندارە ( ئاددمیزاد و . . . ) کە لە ئەنجامی سوتان یا لەبەر زێ ڕۆیشتنی زۆر، پەیدادەبێ و زنچکاوێکی زەردباوی ڕۆنـــی تێداکۆدەبێتـــەوە . ★ تلۆق . ( سن. ) گۆزاولە .

**بلۆك** ـ [ فرەنسێ ] ، ( نا. ) ١ـ کۆمەڵێ دەوڵەت کە لە یەکێتیەکدا کۆبۆبنەوە و یەك ڕێبازی سیاسیان هەبێ :: بلـــۆکی رۆژاوا ، بلۆکی ڕۆژهەلات ، بلۆکی کۆمەنوێلس ٢ـ ( کعر. ) خشتی چیمەنتۆ .

**بلۆر** ـ | ممر . یۆنـــانی : بێریللۆسی | . (نا.) ١ـ ماددەیەکی تەبیعییە . وەکو شوشـــە ڕۆنـــە و شتی لەپشتەوەڕا دیار دەبێ ، لـە کان دەری‌دێنن و دەیتاشن و شتی جۆر بە جۆری لێدروستدەکەن . ٢ ـ ماددەیـــەکی دەســـتکردە ، لاســـاکردنەوەی مـــــاددەتە تەبیعییەکەیە و هەر ئەو کەڵـکەی هـــەیە ، کە لـــە تەبیعییـــەکە وەردەگیرێ . ★ (مک.) بللور . کریستاڵ . ٣ـ (کعر.) بـــۆڕی شوشە کە بەسەر لامپای نـەوتیدا دەکرێ و گڕی چراکەی لەناودا دیارە . ★ ( کئیر. ) شوشەلامپا ، شوشەچرا .

**١ـ بلۆریٚ** ـ [ بلۆر /١ و ٢ + ٣ـ ئیٚ ] ، ( صتـ. ) ١ـ هەر شتێکی لە بلۆر دروستکرابێ :: کاســەی بلۆریٚ . ٢ـ هەر شتێکی وەکـو بلۆر ، ورشەدار و ڕۆن و بێگەرد وابێ .

**٢ـ بلۆریٚ** ـ [؟] ، ( نا. ) ، (کعر.) قوماشێکی سپیـــە لـــە لـۆکە دروستدەکرێ و لە کوردستان بۆ کراس و دەرپێ و بـەرگە لێفـە و کفنی مردو و . . . بەکاردێت . ★ ( کئێر. ) مەڕمەڕشا ، هومـــایێ ، هومایل .

**بلۆسك** ـ ( نا. ) ، ( سیهـ. ) تم : ١ـ بستە/١ .

**بلۆك** ـ [؟] ، (نا.) ، ١ـ (کئێر) ، کۆمەڵە دێیەك لە مەڵبەندێکا ٢ ـ (کعر.) کۆمەڵە خەڵك ، واحیدێك بوە لە سوپای عوسمانیدا .

**بلەوز** ـ (صـ.) ، ( مکـ. ) ١ـ کەسێکی زوڵم لـە خەڵکی‌بکا ٢ـ ئەوەی کاران هەر بە قسەی خۆی دەکا و گوێ ناداتە ڕا و تـەکبیری کەس . ★ دیکتاتۆر . مستبد . ملهوڕ . تێبـ ـ أ) بـە لای مـــنەوە ئەسڵی ئەم ووشەیە ( بو الهوس)ی عارەبییە و خـۆی و مانـــاکەشی جەڕێندراوە . ب) لەو قامۆسانەی لەبـــەر دەستم بـۆن ، تەنیـــا خوالێخۆشبۆ ، مامۆستا گیو ، ئەم ووشەیەی نۆسیوە و بە (کسلان)ی مانالێداوەتەوە . ( تم : مهاباد ـ ٩٧ ) .

**بلێت** ـ ( نا. ) ، ( کعـر. ) تم : بلیت . تێبـ ـ ئەم ووشـەیە لـــە

ڕێگای زمانی ئینگلیسیڕا هاتوتە کوردستانی عیراق و پەڕیوەتە ناو زمانی کوردیَ .

**بلیمەت** ــ ( نا. ، صـ. ) ١ــ ( سیھ. ، کعر.) پیاوی زۆر بەکار و لیھاتوَ ، ئادەمیزادی کارزان و زۆرزان . ( عا.) نابغه ، داهیه . ٢ــ منداڵیکی لەچاو تەمەنی تیگەیشتن و فامینی زۆربیَ . ★ ( مکـ.) سۆدره ، سەرەسۆدره (بەنیا بۆ کچۆلان ) . ٣ــ (سنـ.) هەر شتیکی سەیر و عاجباتیَ ( تم : مردۆخ ، ب١ ، ل ــ ١٨١ ) . تیب ــ من وا تیدەگەم کە ئەسلی ئەم ووشەیە ( بو الهمة )ی عەرەبییە و بە ماناکەیەوە جەڕاوە .

**بلَ** ــ ( صـ.) ١ــ حاڵی کاڵەك و شەمامە و هەنار و پرتەقاڵ و ... کە زۆر گەیبن و لە دار و بڕکە کرابنەوە و لەناوەوە کەمیان کردبیَ و توێکلەکەیان پڕنەکەنەوە و کاتیَ ڕێك بگوشرێن . لە لەلایەکەوە بقوپێن و کەمکەمە لە خۆیانەوە وەکو خۆیان لیَبیتەوە . ٢ــ حالی مەمکی ئافرەت کە تورتیَ و شەقی خۆی لە دەست دابیَ . :: ئەم کاڵەکە هیندە بلَ بوە کەلکی خواردنی پیوەنەماوە. مەمکی ئەو کچە ئەوەندە دەستکاریَ کراوە بلَبوە .

**بلا** ــ [= بھیلە ، بیلە . سیغەیَ موخاتەبی ئەمرە لە مەصدەری ( میلان ) ] ، ( سیھ . ، سنـ.) تم : ٢ــ با. ★ (بکـ.) بلا، بلانیَ. (مکـ.) بەلاَ ، ( سنـ.) بلا ، بلانە ، بلانە ، بیلا ، بیلانە .

**بلامك** ــ ( نتـ.) ، ( مکـ.) تم : بزمۆك . تیب ــ لە نیوان دەنگی (م) و (ك)دا بزۆینە کوردیَ هەیە و دەبیَ ( بلام ، ك) تلفظ بکریَ. هس: دەمامك .

**بلانە** ــ ( سنـ.) ، تم : بلا .

**بلاو** ــ [أ] ، (حمصـ.) حالی کۆمەڵیَ شت یا گیاندار کە لە شوێنیك بن بەلام بە تەنیشت یەکەوە نەبن ، لیكدوربن . // کۆ، پڕ ، چڕ

□ « زولفت بە قەدت داکە پەڕیشان و بلاوە »
« ئیمڕۆ لە منی شیفتە ئالۆز و بە داوە »
( مکب ، نالیَ ، ل ــ ٥٣٢)

★ ( بکـ.) بەلاڤ .

**بلاوبونەوە** ــ ( مصتـ. لا. ) ١ــ لیكدورکەوتنەوە :: شوانەکە نوستبو مەڕەکانیش لەو دەشتە بلاوببونەوە . قەرەچیَ بە هەمو دنیادا بلاوبونەوە . ٢ــ تەشەنەکردن ( قسە ، دەنگوباس ، نەخۆشیَ و درم و پەتا .) :: دەنگی شکانی ئیسرائیل لە شەڕا دەگەڵ عەرەبان بە هەمو دنیادا بلاوبۆتەوە . ئەنفلوانزایەکی گران بلاوبۆتەوە . ناوبەناو کۆلیرا لە هەندیَ شوێن بلاودەبیتەوە . ٣ــ ( تتـ.) دەرچونی ڕۆژنامە ، کتیب ، بەیاننامە و...و گەیشتنەدەستی خەلك .

**بلاوکراوە** ــ ( نمفـ.) ، (تتـ.) نشریات ، منشورات . تیب ــ ئەم ووشەیە تەنیا لە کاروباری سیاسیَ و چاپکردنی کتیب و ڕۆژنامە و ...

بەکاردێت ، و دەبێ لە مەصدەری تێکەڵی ( بلاوکردنەوە ) داتاشرابێ ، بۆیە دەبێ ئەسڵەکەی ( بڵاوکراوەوە) بێ و لەبەر ئەوەی بەم شکڵە لـــە سەر زمان زۆر قورسە ، هەر زۆر زوو بە چەند ساڵێك خۆی کـورت بۆتەوە و پیاو وا دەزانـێ کە لـە مەصدەری ( بڵاوکردن ) داتاشراوە.

**بڵاوکردن** ــ (مصتـــ. متـــ.) لێكدوورخستنەوە ، لێكجیاکردنەوە :: شانە توکی سەر لێكبڵاودەکا .

**بڵاوکردنەوە** ــ (مصت. مت. ) ١ــ بەشینەوەی شتێ بەسەر خەلکا :: پارەیەکی زۆری بە ناو مەنگوڕاندا بڵاوکردۆتەوە زۆنی لێسەلەمکردوون. ٢ــ ( تت.) دابەشکردنی رۆژنامە و بەیاننامە ... :: لەوەتێ دەوڵەتی عێراق دامــەزراوە ، گەلێ کتێب و رۆژنامەی کوردێ بڵاوکراوەتەوە . ڕادیۆ دەنگ و باسان بڵاودەکاتەوە. ( عا.) ، نشر ، اذاعة .

**بڵاوە** ــ [ بڵاو + ٥ــ ئە/٢ ] ، ( نت.) لێكدوورێ ، جودایێ .

**بڵاوەپێکردن** ــ [ بڵاوە + پێ ( بە + ی) + کردن ] ، (مصت. مت.) بــە کۆمەڵێ خەڵك لێکتر یا لە شوێنێ دوورخستنـــــــەوە . :: پۆلیـــــس خۆپیشـــاندانەکەی بڵاوەپێـــکرد ، لەشکرەکەیان بڵاوەپێکرد .

**بـــــڵاوەکردن** ــ ( مصـــــــت. لا.) بەولاولادا ڕۆیشتنی کۆمەڵێ خەڵك کە لە شوێنێکا کۆبۆبنەوە :: کابرا قسەکانی هێنـــــدە بێڕێوجێبــوون خەڵکەکە زوو بڵاوەیـــــانکرد . ★ بڵاوەلێکردن .

**بڵاوەلێکردن** ــ ( مصت. لا.) تم : بڵاوەکردن .

**بڵح** ــ [؟] ، (ص.) ١ــ ( مـــك.) حالی کەسێکی کردەوەی سەیربێ ، ئەدا و ئەتواران دەرێنێ ، بە فێز و ئیفادە بڕوا ، هەر لە خۆیەوە بداتە قاقای پێکەنێن . :: کچێ بڵمێ ئەو ترترێقەتریقەت لە چیە ؟ ٢ــ (سنـ.) حالی ئەو کەسەی درەنگ تێدەگا .

**بڵحانە** ــ [ بڵــح + ئانــە/١ ] ، ( بنت. ) بە شێوەی بڵح ، وەکــو بڵح ، بە بڵحێ . :: وەها بڵحانە بە ڕێدا دەڕوا پیاو بێزی هەڵدەستێ .

**بڵحێتێ** ــ [ بڵح + ئێتــێ ] ، ( حمصـ.) ئەنجامی کردەوە و ئاکاری کەسێکی بڵح :: ئاخر بڵحێتێش ــ ئەندازەی هەیە ! . ★ بڵحێ .

**بڵحێ** ــ [ بڵــح + ٢ــ ئــێ ] ، ( حمصـ.) تم : بڵحێتێ .

**بڵسك** ــ [؟] ، (نا.) ، (سیهـ.) تم : ١ــ بستە/١ .

**بڵق** ــ [ ند.] ( نـــا.) ، (مك. ، سیهـ.) پۆرگی پچکۆڵەیە : ١ــ بــە زەبری قورسایێ تنۆکی باران لەسەر ڕووی ئاوی چۆم و حەوز ، یــا هەر ئاوێکی لە شوێنێکا کۆبۆبێتــەوە ، سازدەبێت . ٢ــ لە ئەنجامی کوڵینی ئاو یا هەر تراوێکی دیکە ، بە زەبری هاتنەدەری هەوایــەکی لە نــاو تراوەکەدایە بەدێ دێت.★ (سنـ.) بلقاو .

**بڵقاو** ــ ( نتــ.) ، ( سـنـ.) تم : بڵق .

**بڵــــۆدان** ــ ( مصـــــــت. لا.) وەکوڵهاتنی ئــاو یا هــەر تراو و

چێشتیکی شل به جۆرێ له هه‌مو لایه‌که‌وه ( بلق )ی له‌سه‌ر په‌یدابێ. :: کچێ خێراکه ئه‌و مه‌نجه‌ڵه داگره، هه‌روا بڵقاندەدا .

**بڵقه** ــ [ بلق + ه‌ ــ ئه‌/١ ] ، ( نت.) دەنگێ که له بڵقدانی ئاو یا هه‌ر شتێکی‌تر دەبیسترێ .

**بڵقه‌بڵق** ــ ( نت.) ١ــ دەنگێ که له ئه‌نجامی چوونه‌خواری ئاو به خوڕ، به لوله‌یه‌کی ته‌نگدا و هه‌والێ دەرخستنی په‌یدادەبێ . ٢ــ دەنگێ که کاتی پڕکردن یا به‌تاڵ‌کردنی گۆزه‌یه‌کی زارته‌نگ دەبیسترێ . ٣ــ دەنگێ که کاتێ ئینسانێك خه‌ریکه له ئاوا دەخنکێ ( ئاو دەچێته دەروونییه‌وه و هه‌وای لێ‌وەدەردەنێ) دەگاته گوێ .

**بڵقه‌دەره** ــ [؟] ، ( نت.) جۆره مارمێلکه‌یه‌که . تێب ــ خوالێخۆش‌بو مامۆستا گیو به گیاندارێکی ژەهرداری دەزانێ ( تم : مه‌هاباد ، ل ــ ٩٨ ) .

**بڵمه‌بڵم** ــ ( ند.) ، ( نت.) قسه‌ی له‌خۆوه که ئه‌وانه‌ی گوێیان لێیه تێی‌نه‌گه‌ن ، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی که دەنگه‌کان به چاکێ له ( خانی دەنگ) نایه‌نه‌دەر .

**بڵن** ــ ( صد. ) ، ( سند.) تم : بڵند . تێب ــ دەنگی (ن) له‌م وشه‌یه و لقوپۆپه‌کانی‌دا تۆزێ دەگیرێن .

**بڵنایی** ــ ( حمصد.) ، ( سند. ) تم : بڵندایی .

**بڵند** ــ [ په : بوله‌ند ] ، ( صد.) ١ــ حاڵی شتێکی که له شوێنی خۆیه‌وه قیت‌بوبێته‌وه و هێندێك له ( فضا )ی به‌ره‌ژوور خۆی داگیرکردبێ . :: ئه‌م خانوبه‌ره‌یه پازده گه‌ز بڵنده ، شاخی (ته‌ره‌غه) له کوردستانی ئێرانه و زۆر بڵنده . ★ ( بک.) بلند . ( جند.) بولنگ . ( مک.) بڵیند . ( کعر. ، بک.) به‌رز. ٢ــ حاڵی شتێکی که له زەوێ‌ڕا به‌رەو ئاسمان چوبێ و تا ئه‌ندازه‌یه‌ك له زەوێ دوورکه‌وتبێته‌وه . :: ئه‌م فڕۆکه‌یه هێنده بڵنده به قه‌د له‌گه‌گیل دیاره . ٣ــ حاڵی (مانگ) و ( ڕۆژ ) که له ئاسۆی ڕۆژهه‌ڵات دوورده‌که‌ونه‌وه . :: مانگی یه‌کشه‌وه وا بڵند نابێ . تا ڕۆژ به قه‌د مله ووشترێك بڵند ئه‌بێ ، نابێ نوێژی جێژن بکرێ .

**بڵندایی** ــ [ بڵند + ئایی/١ ] ، ( نت.) ، ( سیم.) ١ــ ئه‌ندازه‌ی به‌رزێ شتێك به باری قیتی‌دا ، له زەوێ‌ڕا تا دوایی‌شته‌که . (عا.) ارتفاع . :: چیای هه‌ڵگورد ڕەنگه بڵندایی سێ هه‌زار میتر ببێ . ٢ــ جێگا و شوێنی به‌رز . :: له بڵندایی ٥ میتر که‌وته خواره‌وه و هێچیشی لێ‌نه‌هات . تێب ــ مانای ئه‌م ووشه‌یه مه‌حدوده و نیسبێ ، به‌ڵام ئێ ( بڵند ) موتله‌ق و نامه‌حدود . ★ ( کعر.) بڵندێ بڵیند ( بڵ + ئیند ) بڵ = به‌رز = له‌پاش په‌یدابونی دەنگی (لام) له زمانی کوردیدا ( ئاوێستایی ) + ئیند ؟ ، به‌رزایی . ( سند.) بڵنایی. ( مک.) بڵیندایی ، بڵیندێ ، ( بک.) **بلندایی** . ( جند.) بوله‌نێ .

**بلندبون** ــ (مصت . لا.) ١ــ دەرکەوتنەوەی ( ڕۆژ ) و (مانگ) لە ئاسۆی خۆرهەلاتەوە . :: مانگ زۆر بلندە . ٢ــ ڕاستبونەوەی کەسێکی دانیشتو لە جێی خۆی بۆ ڕێزگرتنی کەسێ یا هەر مەبەستێکی دیکە . :: هەر هاتەژورێ خەلکەکە یەکێ لەبەری بلندبون . ★ لەبەهەستان . لەبەرهەلسان.

**لێبلندبون** ــ ( مصت. مت.) ، ( کن.) تورەبون لە کەسێ و لە شوێنی دانیشتنی خۆ کەوتنە جموجۆل و هەرەشە و قسە بە توندکردن . ★ لێدەرپەڕین ، لێدەرهەلبون ، لێڕاستبونەوە .

**بلندبونەوە** ــ (مصت. لا.) هەلبەزینەوەی شتێ پاش ئەوەی وە عەرزێ دەکەوێ. ★ هەلستانەوە .

**بلندکردن** ــ ( مصت. مت.) ١ــ هەلگرتنی شتێك و لە شوێنی خۆی بەرەو حەوا بردن یا جولاندنی . :: کەمێك سەری ئەو دارە بلندکەن . دەستێکی دەگەل بدەنێ و تێرەکەی بۆ بلندکەن . ٢ــ هەلچنینی دیوار و خانوبەرە و... :: خانوەکەی وەها بلندکردوە مالی مەی خنکاندوە . ئەو دیوارەتان بۆچی وا بلندکردوە . ٣ــ هەلبڕینی دەست و قاچ و سەر و ... :: تۆزێ قاچت بلندکە . کورە دەستت بلندکە . ٤ــ (کێر.) ا) دزینی شتێك، سوکەدزێ:: کیفی کابرایان بلندکرد ( جزدانەکەیان دزی ) . ب) سازکردن و هەلگرتنی ئافرەت بۆ کەیف و ڕابواردن . تێب ــ بەم دو مەعنایە ، ئەم دوایانە لە (فارسێ)ڕا پەڕیوەتە ناو زمانی کوردێ .

**بلندێ** ــ [ بلند + ٢ــ ئێ ] ، ( نت.) ، (حمص.) تم : بلندایێ .

**بلۆسك** ــ [؟] ، (نا.) ، ( سیم.) تم : ١ــ بستە/١ .

**بلیند** ــ (ص.) ، (مک.) تم : بلند.

**بلیندایێ** ــ ( نت.) ، (مک.) تم : بلندایێ .

**بلێسە** ــ [ بل ؟ + ئایس ( ئایسان ) + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نت.) ١ــ گەرمایێ ئاگر کە لە دەوروبەری ئاگردان و .. هەست بە بزوتنەوە و زیاد و کەمبونی دەکرێ . تێب ــ سوتەمەنێ ( دار ، نەوت ، ڕەژێ ... ) لە کاتی سوتانیاندا هەندێ ( غاز ) دروستدەکەن کە وێرای سوتەمەنێ ئەوانیش هەر دەسوتێن و گەرمایەکی ( متمرك ) لە دەوری خۆیان پەیدادەکەن کە هەندێ جار کەم و هەندێ جاریش زۆر دەبێ ــ بە پێی ئەندازەی ئەو (گاز)انەی لە سوتانی سوتەمەنێ و تەرکیببوبن دەگەل هەوای دەوروبەر ــ ئەوەیە کە ئەو کەسانەی لە نیزیك ئاگردان ، سۆبە و ... دادەنیشن ، وا هەستدەکەن کە تینی گەرما هێرشیان بۆ دێنێ . ٢ــ ( مج.) تەووژمی گەرمای زۆری هاوین کە ( با ) دەیجولێنێ . ★ ( جن.) بلێز . (مک.) پێت .

**بلێت** ــ ( نا.) ، (کێر.) پارچە کاغەزێکە بە چاپ شتی لێدەنوسن و بۆ چونە ناو سینەما ، تەماشاخانە ( تیاترۆ ) و سواربونی ( پاس ) و

شەمەنەفەر و ... دەیفرۆشن ★
( کعر.) بلیت ، بیتاقە ، تیکت .
تێب ــ فارسەکان ئەم ووشەیان لە
فرەنسۍ وەرگرتوە و لە ڕێگای زمانی
فارسۍڕا هاتۆتە ناو زمانی کوردۍ
لە کوردستانی ئێران .
**بلێمانە ــ** [؟] ، ( نت.) ، ( مک.)
کیم و جەڕاحەتێکە بە هۆی هەندۍ
نەخۆشۍ مەعدە و ڕێخۆڵە ، لە
ئەندەرۆنی ئادەمیزادا دروستدەبۍ و
بە شکڵی گرمۆلەگرمۆلەی تۆزۍ
سەخت و ڕەق کۆدەبێتەوە و بە
ڕێگای پاشەوەدا دێتەدەر .
**بن ــ** [ ست : بۊنە ، پە : بون ] ،
( نا.) ١ــ لای خوارەوەی ئەوان
شتانەی کەم یا زۆر قوڵن . ( بە
دیوی ناوەوەیاندا ) . :: بنی
هەمبانەکەی هێنایە دەرەوە (دەستی
دە هەمانەکە ڕۆکرد هیچی تێدانەبۊ ،
بۆ ئەوەی نیشانی بدا لە دیوی
ڕایکێشایە دەرەوە ) ، بنی کۆم
( ئەو شوێنەی کە دەگاتە سەر
خێزی . ) ٢ــ لای خوارەوەی
هەندۍ شت ( لە دیوی دەرەوەڕا )
کە دەکەوێتە سەر زەوۍ :: بنی
کەوش ★ بنک ● **لە بنی کوڵەکەی‌دا ــ**
(کن.) هەرچۍ هەبۊ ئاشکرای کرد.
تێب ــ بە گشتۍ جیاوازۍ نێوان
ئەو دۊ مانایە ، بە شوێنی
دەکارهێنانی ووشەکە دەردەکەوۍ
کە مەبەست دیوی دەرەوەیە یا
ژۊرەوە . :: چۆڕۍ ئاو بکە بنی
ئەم جامەوە ( دیوی ژۊرەوە ) ، بنی
جامەکە لەسەر زەوۍ دامەنۍ (دیوی
دەرەوە ) . ٣ــ مەودای نێوان
زەوۍ و هەر شتێکی تری وەکو
مێچی خانۊ ، بەرزایۍ کەم بۍ یا
زۆر :: خۆمان هاویشتە بن پردەکە
تا فڕۆکەکان ڕەتبۊن . با لە بن
ئەم ساباتە دانیشین تۆزۍ ماندۊمان
بحەسێتەوە . ٤ــ دوایۍ هەر
شتێکی بە پێوە ، لەسەر زەوۍ
وەستابۍ . :: بن دیوار ، لەبن
ئەودارە دانیشین تا شێرکۆش
دەمانگاتۍ . ٥ــ پەردەیەکی تەنکە
لە ناودەشەرمی کچاندا . ★ (مک.)
کچێنۍ . ( جن.) دوخترۆنۍ ،
( بک.) کچانۍ ( سن. ) کەنیشکۍ .
٦ــ ئاخری هەندۍ شت . :: بچێتە
بنی دنیاش دەستم هەر دەیگاتۍ .
٧ــ ڕەگی هێندۍ گیا و سەوزە کە
زۆر یا کەم گەورەدەبۍ و هێندێکیان
وەکو : ( تۊر ، گێزەر ، شێلم و...)
بە کەڵکی خواردن دێن . ٨ــ ژێر .
:: لەبن لێفەکەوە چاوی زێت
دەچۆوە . پارەکانم لەبن دۆشەگەکە
داناوە بۆمبێنە . تێب ــ ئەم مانایە
دەگەڵ ئۍ (٣) تۆزۍ لێکجیاوازن ،
لێرە ئەو شتەی دەکەوێتە ( بن )
شتێکەوە دەنۊسێن بەڵام لە مانای
سێیەمدا لێکدۊردەبن .
**بناچە ــ** [ بن/٦ + ئاچە ؟ ] ،
( نت.) تم : بنەچەکە .
**بناخە ــ** [ بن/٦ + ٢ــ ئاخ/١
+ ٥ــ ئە/١ ] ، ( نت.) ١ــ ئەو
بەشەی دیوار کە دەکەوێتە خوار
ئاستی زەوی . تێب ــ بۆ دانانی
بناخە ، زەوۍ هەڵدەقەنن تا دەگاتە
سەر ( خار ) و ئەوجار بە بەرد و
قسڵ ( ئێستا چیمەنتۊ و ... )

دایدەڕێژن تا دەیگەیێننەوە ئاستی زەویی ، پاشان دیواری لەسەر بەرزدەکرێتەوە . ★ ( گک. ) تەمەڵ، ( مک. ) بناغە ، بنەڕەت . ( سیم. ) بنچینە . ( بک. ) بنگە . ( جن. ) پیی. ٢ــ ئەساسی هەر ئیش و کارێك . ★ بنیات ، بنیاد .

**بنار ــ** [ بن/٤ + ئار/٥ ] ، ( نت. ) ئەو شوێنەیە کە چیا و کێو دەگەڵ زەوی لێكدەدەنەوە و پێدەشت دەس پێدەکا . :: سلەیمانی لەبناری گۆیژەیە . بنارگل مەڵبەندێکی کوردستانە لە گەرمیان. ★ ( جنو. ) **بنەتار** . هس : (جن.) بنار . بناری ، هەوراز ، سەربەرەوژوور .

**بناغە ــ** ( نت. ) ، ( مک. ) تم : بناخە .

**بناغەدانان ــ** (مصت. مت. ) ، ( مک. ) ١ــ دامەزراندن و داڕشتنی ئەو بەشەی دیوار کە لە ئاستی زەویی نزمترە و ئەرزی بۆ هەڵکەندراوە . ٢ــ ( مج. ) دەستکردن بە دامەزراندن و بنیاتنانی هەر کارێك و هەر شتێ :: تۆ جاری بناغەی کارەکەت دانەناوە قازانجەکەی بەشدەکەی ؟ ئەم کچۆڵەیە تازە بناغەی مەمکی داناوە . ★ بنیاتنان . بنیادکردن.

**بناغەدانەوە ــ** ( مصت . مت . ) ( مک. ) هەڵکەندنی زەویی و گەیاندنیە سەر ( خار ) و ئامادەکردنی بۆ هەڵچنینی ئەو بەشەی ( دیوار ) کە لە ئاستی زەویی نەویترە .

**بناگوێ ــ** [ بن/٦ + ئا ( = ٣ــ ئە/٢ ) + گوێ ] ، ( نت. ) ، ( سیم. ) تم : بنانگوێ .

**بنانگوێ ــ** [ بن/٦ + ٢ــ ئان/١ + گوێ ] ، ( نت. ) ، ١ــ پشتی گوێچکە ، نێوانی لالەی گوێچکە و کاپۆلی سەر بەلای پشتەوەدا . ٢ــ ( مج. ) زۆر نیزێك . :: مردن لە بنانگوێیانە . لە بناگوێی دەنگی دایەوە . ★ ( سن . ) بناگوێچکە . بنگوێ ، بنگوێچکە . ( سیم . ) بناگوێ . (بک.) بناگوه .

**بناو ــ** [؟] ، (نا.) دارێکی پڕلق وپۆپە ، گەڵاکانی خڕ و درێژۆکەن . دەورەیان ددان ددانە ، وەکو چەتر رادەوەستن . دارەکەی پتەوە و شلکە ، لە دارتاشیدا بەکاردێت و بۆجوانیش لە کەناری چۆگە و خەیابانانیش دەنێژرێ .

**١ــ بناوان ــ** [ بنە/١ + وان ( ئم : ڕاگرتن ) ] ، ( نت. ) ، (مک.) ئافرەتێکە ئیش و کاری ماڵ رادەپەڕێنێ و دەگەڵ پیاوی خاوەن ماڵ مشوری دەخوا ، جا حەزدەکا ژنی بێ یا دایك و خوشکی یا هەر ئافرەتێکی دیکە ، بێجگە لەوەی کە پێی دەگوترێ کارەکەر یا کلفەت. ★ ( سن.) بنەوان .

**٢ــ بناوان ــ** [بن/٦+١ ــ ئاو/١ + ٢ ــ ئان /١ ] ، ( نت . ) ، ئەو ئاوەیە بە هۆی هەڵبەستن (بەند) لە شوێنێك پۆنگ دەخواتەوە و بۆ کشتوکاڵ کەڵکی لێوەردەگیرێت.

**بناوانهەڵبەستن** ـ [ ٢ـ بناوان + هەڵبەستن ] ، ( مصتـ. متـ. ) ، ( مکـ. ) دروستکردنی دیوارۆکەیێك ( بە هەر جۆرە کەرەستەیەك بێ ) لەبەردەمی ئاوێکی ڕەوان بۆ کۆبونەوە و بەرزبونەوەی ئاستی تا لابدرێ بە جێگایەکی ترا بڕوا ، لە کوردستانی خۆمان ئەمە هەر بۆ کشتوکاڵ دەکرێ .

**بناوبون** ـ [ بن/١ + ١ـ ئاو/١ + بون] چونەخواری شتێك بە ئاوی چۆم و ڕوبار و ....دا و لەبەر چاوگومبونی ( گرینگ نیە چەندە بە ئاودا دەچێتەخوار ، هەر ئەوەندە بەسە ئاوی بەسەر بکشێ و وونبێ.

**بنباخەڵ** ـ ( نتـ. ) ، ( کعر. ) تـم : بنەنگل .

**بنبار** ـ ( نتـ. ) تەمبەڵیتێکە لە ژێربارەوە دەخرێتە سەر پشتی وولاخ . // سەربار .

**بنباڵ** ـ [ بن/٨ + ١ـ باڵ/٢ ]، ( کعر. ) ١ـ تم : بنەنگل :: « هەر دەستیدایە بن باڵی کابرا ، ڕاستیکردەوە و داینیشاند و پێیگوت یاللا نانەکەت بخۆ » . ٢ـ تم : خالگە .

**بنبڕکردن** ـ ( مصتـ. متـ. ) ١ـ ڕیشەدەرهێنانی گیاوگوڵ و دارودرەخت . ٢ـ ( مـجـ. ) دوایێهێنانی کار و مەسەلەیەك ، بڕینەوەی کێشە و هەرایەك بە یەکجاری ★ ( سیمـ. ، سنـ. ) بنەبڕکردن .

**بنبزیو** ـ ( صتـ. ) ، (مکـ. ) تەبیعەتی گۆرانێ و بەستەی سۆك

کە ئادەمیزاد بە بیستنی لە شوێنی خۆی دەکەوێتە جموجۆڵ .

**بنپاڵ** ـ [ بن/٨ + پاڵ ] ، (سنـ.) تەنیشت بە تەنیشتەوە ★ ( مکـ. ) بنچغ ، تەنیشت . ( سنـ. ) بنتەك .

**بنپژان** ـ [ بن/٥ + پژان ] ، ( مصتـ. لا. ) ، ( کعر. ) تم : بنڕژان.

**بنپژاندن** ـ [ بن/٥ + پژاندن ]، ( مصتـ. لا. ) ، ( سنـ. ) ، ( کعر. ) ١ـ دڕاندنی پەردەی کچێنێ کچێکی مێردی نەکردبێ . ٢ـ ( کنـ. ) جوتبونی پیاوێك دەگەڵ کچێك . تێبـ ـ ئەم مەصدەرە وەختێ بەکاردێت کە مەسەلەی ژن و مێردایەتێ لە گۆڕێ نەبێ ★ (مکـ.) بێبـن کردن . ( سنـ. ) کەنیشکێ هەڵگرتن .

**بنپشك** ـ ( صتـ. ) کچێکی بە منداڵێ ژن بەژنەی پێکرابێ و بۆ برای یا هەر کەسێکی خزمی خۆی درابێ بە ژن .

**بنپەرگ** ـ ( نتـ. ) ڕێزێك چنینە لەسەر بنی کەلاشی کوردێ ، وەکو بناغەیەك دەیچنن پاشان ئەسڵی کەلاشەکەی لەسەر دەچنن ★ پەرگەما .

**بنپەل** ـ ( نتـ. ) گەلای توتنە کە لەبن گەلای ئەسڵێ دەردەچێ و لە پێش شکاندنەوەی توتنا لێدەکرێتەوە .

**بنپێل** ـ ( نتـ. ) ، ( مکـ. ، کیـ.) تم : بنەنگڵ .

**بنتێك** ـ [ کو. تو . ] ، [ بن/٦ + تێك ] ، ( نتـ. ) ، تم : بندرێ .

**بنج** ـ [ بن/٤ + ج ؟ ] ، (نتـ.)،

( کعر. ، سنـ.) ١ــ ڕەگ و ڕیشەی گژوگیا . ٢ــ لق و پۆپی ئەو گیاوگژانەی بەرز نابنەوە و هەرسەریان لە زەوی دەرهێنا بەولاولای خۆیاندا دەشکێنەوە ★ ( مکـ.) بنج .

**بنج‌داکوتان** ــ ( مصتـ. لا. ) ، ( کعر.) ١ــ گۆڕانی شەتڵی هێندێ گیا و گژ و شین‌بون و لق و پۆپ‌دەرکردنیان :: فرێزەکە بنجی‌داکوتاوە . ٢ــ ( کنـ.) سەرگرتن و چەسپانی کارێک . جێ‌قایمبونی کەسێک لە کارێک یا وەزیفەیەکدا :: ئەم شەریکەیە بنجی‌داکوتاوە . ٣ــ ( کنـ. ) زۆردانیشتنی کەسێ یا کۆمەڵێ خەڵک لە شوێنێک . :: هەرهەڵناستن دەڵەی بنجیان‌داکوتاوە . ★ ( مکـ. ) بنج‌داکوتان ، ڕیشەداکوتان .

**بنجۆ** ــ [ عا. کو. ] ، [ بن = ابن + جۆ ] ، ( کعر.) ، ( نتـ.) ، ( صتـ.) حاڵی کەسێکی بنەچەکەی جولەکەبن و خۆی مسوڵمان بوبێ. ★ ( مکـ.) بنەجۆ .

**بنچاڵ** ــ ( نتـ.) دەغڵ و دانێ کە دوای دەرهێنانی چاڵی گەنم یا جۆ، لەبنەوەدا دەمێنێتەوە و تێکەڵ بە کاوکۆتی چاڵەکە بوە و پێویستی بە خاوێن‌کردنەوەیەکی باش هەیە.

**بنچغ** ــ [ بن/ ٨ + چغ ؟ ] ، ( نتـ.) ، (مکـ.) تم : بنپاڵ . :: کوڕە دە لاچۆ لە بن‌چغم .

**بنچك** ــ [؟] ، (نتـ.) ، ( سنـ.) داری بێ‌بەر کە زۆر کەم بەرزدەبێتەوە و بۆ سوتاندن و ... کەڵکی لێ‌وەردەگیرێ ★ ( مکـ.) بنچك . ( سنـ.) متك تـ ( سیمـ .، سنـ. ) دەوەن .

**بنچینە** ــ [ بن/٨ + چین (هەڵچنین) + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نتـ.) تم : بناخە/١ .

**بنخەرمان** ــ ( نتـ.) ئەو دەغل و دانەیە کە پاش هەڵگرتنی خەرمان، لە جێ‌خەرمان دەمێنێتەوە و بۆ کۆکردنەوەی جێ‌خەرمانەکە دەماڵن و خاك و خۆڵی تێکەڵاودەبێ . ★ ( مکـ.) بنەپێت .

**بندرخە** ــ [؟] ، ( نتـ.) ، ( هلـ.) هەفتەی شەشەمی زستانە بە حیسابی کوردەواریێ لەمەڵبەندی هەولێر ، دەکەوێتە نێوان (بەند) و (مەیرەم) .

**بنڕۆ** ــ [ بن/٨ + درۆ (درۆن ــ یا ــ دروێنە ) ] ، (صتـ.) ١ــ شێوەیەکی درۆنی زارکی جەواڵ و تێڕ و ئەو جۆرە دەفرانەیە ، کە ڕاست لەسەر ئەو شوێنەی شتی ناو دەفرەکە دەبڕێتەوە ( ئەگەر بلوێ ) دەیدرۆن تا بارەکە قایمتربێ . ٢ــ جۆرێك دروێنەی دەغڵ و دانە کە بەشی زۆری ساقەتی گەنم و جۆی دەگەڵ دەدرۆنەوە بۆ ئەوەی ( کا )ی زۆر بێ .

**بن‌دانەوە** ــ ( مصتـ. متـ.) ، (مکـ.) هەڵقەندن و دەردانی خاك و خۆڵی دەوری بنجە گیایەك یا دارێك بۆ ئەوەی بە بنە هەڵکەندرێ .

**بن‌دیان** ــ [ عا. کو.] ، [ بن =

[بن + دیان ] ، ( نت. ، صت. ) ، ( هل.) ١ـ هەر کەسێکی بنەچەکەی عیسایی و خۆی مسولمان بوبێ . ٢ـ ناوی عەشیرەتێکی کوردە لە پارێزگەی هەولێری کوردستانی عێراق مەڵبەندی ئۆتۆنۆمی (حوکمی زاتی ) .

**بنڕدێن** ـ (نت.) ، (مک.) ئەو شوێنەی دەکەوێتە ژێر چەنەی پیاوان ، ئەوەندەی مۆی لێ دەردێ.

**بنڕدێن‌هەڵدانەوە** ـ ( مصت. مت.) تاشینی مۆی ئەو شوێنە تا حاستی چەناگە .

**بنڕژان** ـ [ بن/٥ + ڕژان ] ، ( مصت. لا.) ، ( مک.) نەمانی کچێنی کچێك ـ کە شوی نەکردبێ ـ لە ئەنجامی هەر زەبرێکی بەو شوێنەی ( بێجگە لەجوت‌بون دەگەڵ پیاو ) :: کچێ ئەو بازبازێنەت لە چیە بنت دەڕژێ . ★ ( کعر. ) بنپژان .

**بنڕێسمە** ـ ( نت.) ، ( مک.) پارچە دارێکە ( تەختە یا کۆتەرە ) قوڵی‌دەکەن (یا کونەودێو) ، زمانەی خوارەوەی لاشێپانەی دەرگای دەچێتە ناو و دەبێتە هۆی کرانەوە و پێوەدرانی دەرگا . // سەرڕێسمە.

**بنژێل** ـ [ بن/٨ + ژێل ؟ ] ، ( نت.) ، ( مک.) کالای خراپ و دەغڵ و دانی ئاشاغە کەپاش‌فرۆشتنی چاکەکانی ، لە بنی عەمبار و دوکاندا دەمێنێتەوە ★ ( سن. ، جن. ) بنجوڵ .

**بنك** ـ [ بن + ئك ] ، ( نت. ) تم : بن/١ و ٢ . ٢ـ تم : ئاغزە . تێب ـ لە نێوان دەنگی (ن) و (ك)دا بزوێنە کوردی هەیە .

**بنکڕ** ـ [ بن/١ + کڕ (کڕاندن)]، ( نت.) ١ـ ئەو بەشەی قبوڵی و پلاو کە بە بنی مەنجەڵەوە دەنوسێ و سوردەبێتەوە . ٢ـ بەشێك لە هەمو چێشتێکی‌تر کە وای بەسەر هاتبێ :: بنکڕێ فرنێ خۆشە .

**بنکۆڵ** ـ ( نا.) ، (مک.) تم : بنکۆڵ‌کردن .

**بنکۆڵ‌کردن** ـ [بن/٤ کۆڵ (کۆڵین) + کردن ] ، ( مصت. مت.) ، (مک.) ١ـ کۆڵینەوە و هەڵکۆڵینی بنی شتێ ( دار ، دیوار ...) بە نیازی هاسان‌کردنی خستن و ڕوخاندنی. ٢ـ ( مج.) کنەکردن و پیلان‌گێڕان دژی کەسێ یا هەیئەتێکی کۆمەلایەتی ، بە شێوەیەکی ئەوتۆ تا بە خۆی دەزانێ پرزەی بڕابێ . ★ ( سیم . ، سن.) بنکەن ، بنکەنەند ( کردن ) .

**بنکە** ـ [ بنە/١ + کە ( ئم : پچوکی ) ] ، ( نت. ) ، ( تد. ( ئەو شوێنەیە لە شەڕی پێشمەرگەییدا ( پارتیزانی ) ، پارتیزانەکان ( پێشمەرگەکان ) لێی‌کۆدەبنەوە و پاش پەلاماردانی دوژمن دەگەڕێنەوە ئەوێ . ( عا.) القاعدة العسكرية .

**بنکەجفارە** ـ ( نت.) ، ( مک.) تم : ئاغزە .

**بن‌کەڵێشە** ـ [؟] ، ( نت.) ، (مک.) ١ـ دەروونی ئادەمیزاد ، ناو قەپێلك و قالبی ئینسان . ٢ـ ( مج.) ناو بیرو هۆش . ● **شەیتان چوتە بن کەڵێشەی** ـ ( کن.) ، هانی‌دەدا بۆ کردەوەی نالەبار .

**بنکەن ــ** ( نت.) ، (سیه. ، سن.) تە : بنکۆڵ .

**بنکەند ــ** ( نت.) ، (سیه . ، سن.) تە : بنکۆڵ .

**بنکەن (د) کردن ــ** ( مصت. مت.)، ( سیه . ، سن.) تە : بنکۆڵ‌کردن.

**بن‌کەوش ــ** [ بن + کەوش ؟ ]، ( نت.) ، ( هل. ، کیـ.) تە : بنکەنگڵ.

**بنگۆس ــ** ( نت.) ، ( هو.) تـە : بست .

**بنگیس ــ** ( نت.) ، ( سن.) تە : بست . تێبـ ــ لەوە دەچێ ئـەم وشەیە و ( بنگۆس ) هەورامێ و ( بکس )ی لـوڕێ ( جنـوبێ ) هەرسێکیان لە ( بن ) و (ئەنگوست) پێکهاتبن .

**١ــ بنۆك ــ** [ بن/٨ + ئۆك/٢] ، ( نت.) ، (مک.) ١ــ تیسکی کورتـی خورییە کە پاش بەشانەکردنی خورێ بە بنی ( شانە )وە دەمێنێ و بـۆ گوریس و گۆرەوێ خراپ و ... بەکاری‌دێنن .

**٢ــ بنۆك ــ** [؟] ، ( نت.) «گیایەکی دەشتییە وەك توێسێ وایە ، بـە ووردێ ئەکرێتە برێنـی ئاژاڵـەوە چاکی ئەکاتەوە . » ( تە : خا. ، ب١ ، ل ــ ١٢٩ ) .

**بنە ــ** [ پە : بونەك ] [ بـن/٧ + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نت.) ١ــ ماڵـی ئەسڵێ ئەو کەسانەی لە ماڵێـك زیاتریان هەیە . ماڵی ناو ئاوایـێ ئەوانەی هاوێنان بۆ خاتری مەڕ و ماڵاتیان دەچنە هەوارێ . :: بنـەی تیرەی ( ڕۆغزایێ ) جافـان لـە ( گامەخەڵ )ە . ٢ــ کەلوپەلی ژیانی تایبەتێ ئەوانەی بـە کاروان لـە وولاتێکەوە بۆ وولاتێك یا شارەوشار بـۆ سەوداوکڕێـن و فرۆتـن دەڕۆیشـتن . ٣ــ نوختـەی ناوڕاستی خەرمانێك کە بە ( گـا ) گێرەدەکرێ ٤ــ یەك دۆ گونـدن . لە دەوری چەمچەماڵ لە کوردستانی عێراق :: بنەوبنەکان .
تێبـ ــ گایەکی بەتێن و توان دەخرێتە ناوەند و (گا)کانی دێ بەسـەر ( کلـۆش )دا بڵاودەکرێنـەوە و دەستدەکەن بە سوڕان لەسـەر خەرمانەکە ، بـەلاّم ( گا ) یـەکەی نێوەڕاستێ هەر بە دەوری خۆیـا دەسوڕێتەوە و جێـگۆڕکێی زۆر کەمە ( هەروەك نەبێ وایە ) ، جـا بۆیە ووتراوە « دەڵەی گای بنەیـە هەر نابزوێ » . ٤ــ ا) کوختەیەکە ، ڕاوکەر بە پـوش و پـەلاش و چڕوچێلکە دەیـکەن و لـەوێ‌ڕا تفەنگ دەتەقێننە نێچیر . ب) هەر بن پنچك و دەوەنێك کە بۆ مەبەستی خۆشاردنەوە لە نێچیر ، ڕاوچـێ کەڵکی لێ‌وەربگرن . ★ (مکـ.) سێپە/١ . حاشارگە .

**بنەبان ــ** [ بن/٦ + ٣ــ ئە/٢ + ١ــ بان/٣ ج ] ، ( نت.)ئاخریـن شوێن لە جێگەیێکی مەحدوّدا . :: تا بنەبانی ئەشکەوتەکە چوین . ئەو کتێبەی بنەبانێم بۆ بێنە .

**بنەبڕکردن ــ** ( مصت. متـ.) ، ( سیه. ، سن.) تە : بن‌بڕکردن .

**بنەپێت ــ** ( نت.) ، ( مک.) تە : بنخەرمان .

**بنەتا ــ** ( نت.) ، میقدارێـك

( کالاّ )کە لە نێوەی لاباریك کەمتـر جێگا بگرێ و لـە بنـی گونیـە و جەوالّ و ...دا دابنـدرێ . :: تونەکەمان داگرت پێنج فەردە بۆ بە قەدەر بنەتایەکێش ماوەتەوە .

**بنەتار** ــ ( نت. ) ، ( جـف. ) تە : بنار .

**بنەتۆ** ــ ( نت. ) ، تە : بنـەتۆو

**بنەتۆم** ــ ( نت. ) ، تە : بنەتۆو.

**بنەتۆو** ــ [ بن/٧ + ٣ــ ئە/٢ + تۆو ] ، ( نت. ) ، (مک.) ئەوەندە گەنم و جۆ ( یا دانەوێڵەی تر ) کە دەکرێ بە ( تۆ ) و دادەچێندرێ . :: ئەم گەنمە بنەتۆوی سێ تەغارە . ★ بنەتۆ . بنەتۆم . بنەتۆ . (جنو.) بۆتۆم .

**بنەتۆ** ــ ( نت. ) تە : بنەتۆو .

**بنەجۆ** ــ [ عا. کو. ] ، ( نت. )، ( مک.) تە : بنجۆ .

**بنەچە** ــ [ بن/٦ + ٣ــ ئە/٢ + چە (چەك) ؟ ] ، (نـت.) تـە : بنەچەکە .

**بنەچەکە** ــ [ بن/٦ + ٣ــ ئە/٢ + چەك ؟ + ٥ــ ئە/١ ] (نت.) ، (مک.) **ئەسڵێکی** خێزانی کەسێـکی دەچێتەوەسەر . پشتاوپشتی کەسێ یا خێزانێ . :: بەبنەچـەکەیدا چوەخوارێ ( ناوی چەند پشـتی هەڵدا ، جوێنی بە چەند پشتیدا ). ★ بناچە ، بنەچـە ، بنێچـە ، ڕەچەڵەك . ★ ( جنـ. ) بنچێنـە ، ڕچڵەك .

**بنـەدار** ــ ( نت. ) کوتـەرەو پاشاوەی دارێـکی بڕابێتـەوە و هێندێکی مابێ .

**بنەڕەت** ــ [ بن/٦ + ٣ــ ئە/٢ + ڕەت ] ، ( نت. ) ( مک. ) ١ــ تە : بناخە . ٢ــ ڕەگ و ریشەی دارانە.

**بنەگرتۆ** ــ [ بنە + گرتۆ ( نمف : گرتن ) ] ، (صمت.) حاڵی هەر شتێ یا کەسـێ یـا کارێ کە ڕەگـی داکوتابێ و سەریگرتبێ . :: ئەوەی میللەت نەیەوێ قەت بنەگرتۆ نابێ.

**بنەگۆگەم** ــ [ بن/٧ + ٣ــ ئە/٢ + گۆگەم ] ، (مک.) ، ( نت. ) ١ــ بنی گیای گۆگەم بە کەڵکی سوتاندن دێ و ئـاگری درەنگ دەکوژێتەوە، دەیکوتن کەفێکی لێپەیـدا دەبـێ دەیکەنە گۆمەوە ماسێ دەکوژێ . ٢ــ پیاوی کورتەبنەی تێكسمڕاو.

**بنەماڵ** ــ [ بنە + ماڵ ] ، ( نت. ) ١ــ خیزانی ئەشراف و نەجیـب . ٢ــ هەر ئینسانێکی لە خێزانێکی ئاوا کەوتبێتەوە ★ خانەدان .

**بنەماڵە** ــ [ بنەماڵ + ٥ــ ئە/١]، (نت.) ، (مک.) کۆمەڵێ خزم و قەومی یەکتر ( دوور و نیزیك) کە بنەچەکەیان دەچێتەوە سـەر کەسـێك . :: بنەماڵەی شێخان گەلێ لق و پۆپی لێبۆتەوە . بنەماڵەی ئەردەلاّن چەند پشـت لە سنە والێ بـون . ★ ( بک. ) ماڵبات .

**بنەمێو** ــ [ بن/٨ + ٣ــ ئە/٢ + مێو ] ، ( نت. ) تاکە دارێکی ترێ . :: ڕەزی مەلا قادری سێتەك هەزار بنەمێو دەبێ .

**بنەنگڵ** ــ [ بن/٨ + هەنگڵ ] ، ( نت. ) ، (مک.) ئەو شوێنەیە کە لە ژێر شانی ئادەمیزادەوە دەکەوێتە نێوان ( باسك ) و ( تەنیشت ) . ★

( سیە.) بن‌باڵ ، بن‌باخەڵ . ( هل. ، کیـ.) بن‌کەوش . (مکـ.) بن‌پێل .
**بنەوان ـ** [ بنە/١ + وان (ئمـ.)]، ( نتـ.) ، ( سنـ.) تە : ١ـ بناوان .
**بنەوبارخانە ـ** [ بنە/٢ + و + بارخانە/٣ ] ، ( نتـ.) بار و بارخانەی ( تە : ـ٢ بازرگانێ دەگەڵ کەل و پەلی ژیانی تایبەتێ خۆی و چاروێدار و کاروانچیەکان . ★ ( مکـ.) باروبنە .
**بنەوش ـ** ( نا. ، صـ.) ، (مکـ. ، سیە. ) ڕەنگێکە لە تێکەڵبونی دوو ڕەنگی‌شین و سور پەیدادەبێ . تێب ـ ئەم وشەیە لە ناوی گوڵی ( وەنەوشە ) وەرگیراوە ★ ( مەنگوڕایەتێ ) مور . (سیە.) بنەوشەیێ . ( سنـ. ) وەنەوش . ( بکـ.) بنەفش . ( جنـ.) بنۆوش .
**بنەوشان ـ** [ بنەوش + ٢ـ ئان/٧ ] قەزوانە کە دەوری‌فەریکێ بەسەر چوبێ و تەواویش ڕەق‌هەڵنەهاتبێ و هێشتا شنکایێ و ناسکێ تیدابێ ، لەو وەختەدا توێکڵەکەی دوڕەنگ دەبێ هێندێکی بنەوشی مەیلەو شین و تۆزێکیشی سوری بارە و زەرد .
**بنەوشەیێ ـ** [ بنەوشە + ٣ـ ئێ ] ، ١ـ (صتـ.) هەر شتێکی پێوەندێ و نیسبەتی دەگەڵ گوڵی ( وەنەوشە هەبێ ، هەر چێکی ڕەنگی وەکو گوڵی وەنەوشە وابێ . ٢ـ ( نا.) ، (سیە.) تە : بنەوش .
**بنەوشێ ـ** [ بنەوش + ٢ـ ئێ ]، (نتـ. ، سنـ.) تە: ٣ـ با/٦ (بای‌سور)
**بنیات ـ** [ پە : بوندات] ; ( نتـ. )
تە : بناخە/ ٢ .
**بنیاد ـ** ( نتـ.) تە : بناخە/٢ .
**بنیات‌نان ـ** (مصتـ. متـ.) تە : بناغەدانان .
**بنیادکردن ـ** ( مصتـ. متـ. ) تە : بناغەدانان .
**بنیادەم ـ** [ = عا : بنی‌آدم = کوڕانی ئادەم ] ، ( نتـ.) تە : ئادەمیزاد .
**بنێسك ـ** [ بن/٨ + ئێسك ]، ( نتـ.) پاشماوەی صابون ، پارچەیێکی بچکۆلەی صابون کە دوای دەست‌پێ‌شوشتن یا شێو و کوڵ دەمێنێتەوە و دەست نایگرێ. تێب ـ وشەی ( ئێسك ) لەم وشەیەدا بە مانای ( ڕەق )ە کە هەر بۆیەش بە ( ئێسقان ) گوتراوە .
**بنێسێ ـ** [أ] ، (نا.) ، ( مکـ. ) تە : بارێك و بنێسێ .
**بنێشت ـ** [ بەن + ئێشت أ ] ، ( نتـ.) ( جەوێ )یەکی زەردباوە کە لە دارەبەن دەتکێتەوە و بۆ خۆش‌کردنی تامی دەم دەیجون . تێب ـ لە چەند شوێنێك دارەبەن ( دارقەزوان ) برین‌دار دەکەن و لە قوڕێکی کوجێلەیەك سازدەدەن و بە جێگا برینداره‌کانیانەوە دەنێن پاشان کە پڕبون لێیان‌دەکەنەوە و بەتالیان دەکەنە ناو مەنجەڵەوە ، ئەو جەویە لەم کاتەدا ڕەنگی بۆرزەرد و ڕەگەڕەگی ڕەشی تێدایە و تامی تاڵە ، دەیکوڵێنن تاڵایەکەی دەڕوا و ڕەنگی سپێ مەیلە و زەرد دەبێ . بێجگە لە جاوێن بۆ داوودەرمان و سەنعاتیش

بەکاردێت و یەکێکە لەو کاڵایانەی کە لە کوردستان دەنێردرێتە دەرەوە ★ ( سنە.) جاچك . جاچکە . ( بکـ.) بەنۆشت ( تم : ژابا ــ ٥٧) بەنێشت ( تم : کف . ٧٣ ) (هو.) وێــژەن . ( جن.) جاچك . ● **کردن بـــە بنێشتەخۆشەی ژێردان ــ** ( کن.) ، ( سیــم.) زۆر دۆپاتەکردنـــەوەی قسـەیەك . زۆر باسی شتێ‌کردن .

**کردن بە بنێشتی مەلای مەزبورە ــ** ( کن.) ، (مکـ.) ئـــاگاداریێ‌کردن و پاراستنی ماڵی‌خۆ . تێبـ ــ گۆیا مەلای مەزبورە بنێشتی جاوتیوە و کاتێ زاری شل‌بوە دەری هێناوە و بەر ەری لوتیـەوە نوســاندوە ، گوتۆیانە مەلا ! ئەوە بۆ وا دەکـەی ؟ گوتۆیە دەمەوێ ماڵی خۆم هەمیشە لەبەر چاوم بێ .

**بنێشت‌خۆش‌کردن ــ** (مصد. ، متـ.) ١ــ کولاندن و پــالاوتن و قاڵ‌کردنی بنێشت . ٢ــ جاوێن و نەرم کردنـەوەی بنێشــتی ڕەق . تێبـ ــ بنیشت پاش کولاندنی ڕەق و تورت دەبێ و منداڵ نازانن بیجاون ، هەر لە دەمیــاندا ووردبـو قۆتێ دەدەن، بۆیە یەکێك ( دایکـیان ، خوشکی گەورەیان لە پێشدا بۆیـان دەجوێ تا نەرم‌دەبێتەوە و لەبــەر یەك دەکشێ .

**بنێشتەتاڵ ــ** (نتـ.) بنێشتێ کە هێشـــــتا نەکولێنـــــدرابێ و خۆش‌نەکرابــێ . جاچـــکەی نەکولێندراو ، بنێشتی خاو . تێبـ ــ لە کوردەوارێ ئەم جورە بنێشتــە بۆ گەیـاندنی هێنـدێ ( کـوان ) بەکاردێنن . ★ ( سنـ.) جاچکەتاڵە.

**بنێشتەخۆشکە ــ** (نتـ.) ، ( مکـ.)، ( کن.) تم : بنێشت ● کردن بـــە بنێشتەخۆشەی . . .

**بنێچە ــ** [ بن/٦ + ئیچە ؟ ] ، ( نتـ.) تم : بنەچەکە .

**بوار ــ** [ ؟ ] ، (نـا.) ، (مـکـ.) تەنکایێ نیسبێ لەو چەم و ڕوبارانە، کە پیادە دەتوانێ پێیاندا بپەڕێتەوە. □ « هەتا مەلا ، مـەلا بۆ ئێــرە بواربۆ . » ★ ( سنــ. ) بگــار . ( بکـ.) بۆر .

**بواردان ــ** [ ١ــ بوار + دان ]، ( مصد. لا.) تەنك‌بونی هێنـــدێ جێگەی چۆم و ڕۆبارانە کە ماوەی لێدانی بۆ ئینســـان هەبــێ . ∴ « جەغەتو » قــەت بوار نــاذا . « خاسە » و «ئاوەسپێ» بەهــاران بوار نادن .

**بـــواردن ــ** (مصـــ. متـــ. ) بەجێ‌هێشتنی شتێ و بـــە حیساب نەهێنانی ، بە هیچ‌دانانی ∴ هــەر دوان بژمێرە و سێ‌یەمینیان ببوێرە لەو مەجلیسەدا کەسی نەبـوارد و قسـەی بە هەمــویان گــوت . ★ هەڵبواردن .

**پێ‌ڕابواردن ــ** [ پێ ( بە + ی = پێبف.) + ڕابواردن /١ ] ، ( مصد. متـ.) ١ــ گاڵتەکردن بە کەســێ . ٢ــ سـەرخستـنەسـەر یەکێــك . ٣ــ خۆخافلان بە شتێکـەوە . ∴ کابرایان بەگیر هێنـــابۆ پێیــان ڕادەبوارد . وازی لێ بێنـن پێــی ڕامەبوێرن . ئەم ڕۆژانــە بەچــێ ڕادەبــــوێرن . **ڕابـــواردن ــ** [ ڕا

( پێبف.) + بواردن ] ، (مصتـ. لا.) ١ـ وەخـــت دەربــازکردن . ٢ـ کەیفکردن :: وەختەکەی بە هێچی ڕادەبوێرێ . ئەمە کەی ژیانە ئێمە ڕایدەبوێرین . ٣ـ ( نتـ. ) کەیف و خــۆشی . :: □ «... ســـــەری سوڕما لەو شوێنەی نەك لە مـــاڵ ، لە ڕابواردنێشا پڕی کردبۆوە ...» ( بلە ، ژان ، ل ـ ٧٥ ) .

**هەڵبواردن ــ** [ هەڵ (پێبف.) + بواردن] ، (مصتـ.متـ.) تم : بواردن.

**بوارە ــ** [ بوار + ەـ ئە/١ ] ، (نتـ.) ماوە ، دەرفەت . (عا.) مجال. ( سنـ.) بگارە .

**بوارەدان ــ** (مصتـــ. متـــ.) ڕێگاپێدان ، ماوەدان بە کەسێ بـۆ کردنی کارێ :: دە بوارەی ئێمـــەش بدەن با دوو قسە بکەین . ★ (سنـ.) بگارەدان .

**بوت ــ** [ ستـ : بوئێتی = خوای درۆزنە ] ، (نا.) ، (کئێر.) ١ ــ هەیکەلێکە بە شێوەی ئینسان یـــا گیانداریك لە بەرد، دار، مەعدەن و ...، ... دروستیـــان دەکرد و دەیانڕازاندەوە و بە خوایان دەزانی و دەیانپەرست ٢ـ (مجـ.) یـــار ، دلدار ، مەعشووقە □ « هەر ئــەو بوتی فەرخارە هەر ئەو دولبـەری پارەم + هەر ئەو گوڵ و گولـــزار و هەر ئەو تازە بەهارەم » (ئەدەب ، گمـ. ، ل ـ ٣٩ ) . ★ (کعر.) بت.

**بوتپەرست ــ** (نفا. ، صفا. ) ، (کئێر.) تم : بتپەرست .

**بوتپەرســـتی ــ** ( حمـصـ.) ، (کئێر.) تم : بتپەرستی .

**بوتخانە ــ** (نتـ.) ، (کئێر.) تم : بتخانە .

**بوتری ــ** [ محر. بوتل ] ، (نا.)، ( کئێر.) تم : بوتڵ .

**بوتڵ ــ** [ = ئینگلیسی : بوتڵ] ، (نا.) ، (کعر.) دەفرێکی شووشەیە بە شکڵی ئوستوانە دروستکراوە و پاشان تەنگ دەبێتەوە تا زارکەکەی بە قەدەر ( تەپەدۆر )ێـــکی لێـــدێ، تراوی جۆربەجۆری تێدەکەن . :: بوتڵێك ئاوی سارد . بوتڵێك نەوت. بوتڵێك ویسکی ★ (کئێر.) بوتری. ( سیهـ. ) قاپ .

**بوختان ــ** [ محر. عا : بهتان ] ، (نا.) کردەوە یا قسەی ناڕاست کە وەپاڵ کەسێك بدرێ . ★ . (بکـ.) بوختان. (جنـ .) بۆخت ، بۆختۆم.

**بوختان پێکردن ــ** (مصتـ . متـ.) بە ناڕاست قسەیەك یا کارێك دانە پاڵ کەسێ . :: بوختانی پێدەکەن . بوختانی پێکرد گوتی هەزار تمەنم قەرزدارە .

**بوختـــان کردن ــ** ( مصتـ. لا. ) قسەی ناڕاست وەپاڵ خەڵکی دان، کردەوەی وەها وەپاڵ خەڵـــکی دان کە نەیان کردبێ . ★ (بکـ.) بوختان کرن . (جنـ.) بۆختڕختە .

**بوخچە ــ** ( نــا. ) ١ـ پارچـــە قوماشێکی چوار گۆشەی گەورە یا پچووکە بۆ ئەم مەبەستانەی خوارەوە بەکاردێت . أ) لە ماڵی، کوردەواریدا ژنان جلوبەرگی تێدەدەپێچن و لەسەر تاقەی دادەنێن یـــا دەنێو یەغدانـــی دەنێن . ب) ئـــافرەت کەلوپـــەلی حەمامی تێدەنێن و دەگەڵ خـــۆیانی

دەبەن . ج- بۆ هاتوچۆ و سەفەران پێداویستی کەمی تێ‌دەبەستن . د- فەقێیان کەلوپەل و کتێبی تێدەخەن . ٢- ئەو قوماشە بە بە ئامادەکراوی (بە کەلوپەلەوە) بۆ هەریەك لەو مەبەستانەی سەرەوە. □ «... تەنکە هەی تەنکە ، تەنکەی شێرازێ ، بوخچەکەی هەلگرت بۆ مالی قازێ » ( فۆلکلۆر ) . تێب - ئێستاکە چلۆنایەتی ژیان و باو و نەریتی کوردەوارێ دەستی بە گۆڕان کردوە ، بوخچەش لە مۆدە کەوتوە و (چانتا) و (سپاك) و .. جێگەیان گرتۆتەوە . ★ (جنە.) بۆشخە . بوخچەی نەکراوە. (نت.)، (کنە.) کوڕێکی هێشتا ژنی نەهێنابێ.

**بوخچەبگەردانێ** - (نت.) ، (مک.) یارییەکی کوردەوارییە ، گەورە و بچۆك دەیکەن، کۆمەلێك دەورانده‌ور دادەنیشن و (پرێسکە) یێك بۆ یەکتر هەلدەدەن و یەکێکیش کە (تێکەوتوە) لە دەرەوەی کۆڕەکە بە دەوریاندا هەل دەخولێ و هەولدەدا پرێسکەکە بگرێتەوە و لە دەستی هەر کەسی قۆستەوە ؛ ئەو کەسە تێدەکەوێ و جێگەیان دەگۆڕنەوە . ★ (کعر.) بوخچە بەگەردانێ . ( سنە. ) بوخچەگەردان .

**بوخچەبەگەردانێ** - (نت .) ، (کعر.) تم : بوخچە بگەردانێ .

**بوخچە تێکنان** - (مصت. مت.) پێچانەوەی کەلەوپەل لەناو (بوخچە) یێکدا ، بۆ هەر مەبەستێ بێ .

**بوخچەگەردان** - (نت.) ، (سنە.) تم : بوخچەبگەردانێ .

**بوڕغێ** - (نا.) ، (کعر.) تم : بڕغۆ .

**بوغ** - (نا.) ، (مک.) ١- هەمۆ هەلم و دۆکەلی ووشك و گەرم کە لە سوتانی سۆتەمەنێ یا لەهەر شتێکی دیکە هەلدەستێ و گیانداران تەنگەنەفەس دەکات . ★ (سیە .، سنە. ، جنە.) بۆق. ٢- غازێکە لە سۆتانی سۆتەمەنێ وەکۆ دار و خەلۆز هەلدەستێ و ئەگەر ژۆر کونبڕ بێ ئەو خەلکەی تێدا دانیشتۆن سەریان دەکەوێتە ژان و هێندێ جار لە هۆش خۆیان دەچن و ئەگەر نوستبن و هەستی پێ‌نەکەن دەشیان‌کوژێ . تێب. ئەم ووشەیە مانای دوەمی لە موکریان کە زستانان بۆ گەرم‌کردنی ژۆر (کورسی) باوە ، بەکاردێت ناوی عیلمێ ئەو گازە (ئۆکسیدی کاربۆن)ە کە لە تەرکیبی کیمیایێ (کاربۆن) و (ئۆکسیژێن) پەیدادەبێ .

**بوغارێ** - [ بوغ/١ + ئار/٥ +١- ئێ/٣ ] ، (نت.) ، (مک.) ئاگردانێکە لە دیواری خانۆی کۆن دروست دەکرا ، زستانان بۆ گەرم داهێنانی ژۆر ئاگریان تێدا دەکردەوە ، وەکی دیش بۆ چێشت‌لێنان کەلکیان لێ وەردەگرت ، دۆکەلەکەی بە دۆکەلکێشێکی تایبەتیدا کە لەناو دیوار بۆیان دەهێشتەوە دەڕۆیشت و لەسەربان دەردەچۆ . ئێستاش لە هێندێك خانۆی تازەدا هەر بۆ جوانێ لە قولینچکێکی ژۆر دروست‌دەکرێ . تێب - من وا دەزانم ئەم ووشەیە

لـەو کەرتانـــە پێکهاتـــوە کـە نیشانم داون ، بەڵام دوکتۆر معین (تم : فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ــ ٤٧٥) ووشەی (بـوخاری) کـە لەزمـانی فارسیدا پێشان هەر مانای (بوغاری) کوردی هەبوە و پاشان کە ( کۆرەی فەڕەنگی ) جێگای بوغاری گرتۆتەوە بۆتە ناو ئەویش ، ئـەم ووشـەیە نیسبەت دەدا بە (بوخار)ی عارەبی و (ژابا)ش هەر (بوخاری) نوسیوە و دەگەڵ (بوخاری) فارسی بەراوردی کـردوە (تم : ژابـا ــ ٣٩ ) . و (مردۆخ)یش هەر بوخاری نوسـیوە (تم : ب١ ، ل ــ ١٢١) . ★ (سیهـ.) مفەیری .

**بوغرد ــ** ( محر. عا. ) ، (نا.) تم : بخور .

**بوغرا ــ** [؟]، (صـ.) ، (مکـ.) تم . باغر . □ « ماڵەکەڕە زۆر بوغڕایە، هەر وا دەڕوانێ لە کلیسایە» (بەیتی جۆلەکان ) .

**بوغڕابون ــ** (مصـ. لا.) ، (مکـ.) تم : باغربون .

**بوغز ــ** [عا : بغض] ، (نا.) ڕق، قین . :: بوغزی لـە دڵ گرتبو .

بـوغزلەزگ ــ ( صــ.) ، ( مکـ.) حاڵی ئادەمیزادێ کە ڕق لە کەسێ هەڵبگرێ و لە وەختێکا دەری‌بڕێ.

**بوغزاندن ــ** [عا. کو.] ، (مصـ. متـ. ) ، خۆش نەویستن ، ڕقلێبون :: من کەس نابوغزێنم . پیاوی دو زمان خوداش دەیبوغزێنێ .

**بوغه ــ** [ بوغ + ٥ــ ئـە/١ ] ، (صـ.) ، (مکـ.) حاڵی گای قەڵەوەی مل ئەستور :: تەماشای تەماشای دەڵەی گای بوغەیە . تێب ــ وەکو لە دۆستی شاعیرم مام هێمنم بیستوە مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی لە بابەت ئەم ووشەیە ڕای وایە کە بە گایەك ووتراوە دایانبەسـتبێ بـۆ ئەوەی بیکەنە (قوربانی) ، مامۆستا (هێمن)یش خۆی لەو باوەڕەدایە کە بە گایەك ووتراوە بـۆ (پەرسـتن) تەرخان‌کرابێ . هـس : (بـەغە) و (بەگە) لـە زمانی ئاوێسـتاییدا و (بهەگە) لە سانسکریتێدا بـە مانای (خودا) و (بەگ)ی ئێستای کوردی و (بێگ)ی ئینگلیسی بە مانای پیاوی گەورە و چتی گەورە .

**بولبـول ــ** (نـا.) ، (مکـ.) ١ــ باڵندەیێکی پچکۆلانەیە بە ئەندازەی چۆلەکەیەك ، ڕەنگی پشتی کەوەیەکی ئامـاڵ سـور و بەرزگی زەردە ، دندوکی پچوك و خۆی بـە تێکڕایی جوان و ژێکەڵەیە ، دەنـگی زۆر خۆشە، هەر بۆیە دەیگرن و دەیکەنە قەفـەزەوە . ٢ــ (صـ.) ، (مجـ.) ا ــ حـالی ئینسـانێکی بێ‌گـرێ و گوڵ و ڕەوان قسە بکا. بــ حالی کەسێکی دەمی ڕاناوەسـتێ و زۆر قسـە دەکا . زۆربڵە .

**بولفار ــ** [؟] ، (نا.) ، (مکـ.) تم : جێر . :: تـۆپی بولفـار ( تۆپـی پچکۆلەی یـارێ کە لە لاسـتێك دروست‌دەکرێ ) . هەر دەڵــەی بولفارە لەبەریەك دەکشێ .

**بووار ــ** (نـا.) ، (هـلـ.) تـم : بەهار .

**بووه ــ** ( صفـا : هەبـون ) دەولەمەند ماڵدار ، حـاڵخۆش .

**بوهار ـ** (نا.) ، (هـلـ.) تـم : بەهار .

**١ـ بۆ ـ** [ ست : بەئۆذی . پە : بـۆذ ، بۆی ] ، (نا.) غاز ( گاز )ێکە لە هێندێ شتان هەڵدەستێ ، بە چاو نابیندرێ ، بەڵام لوت ( حسی شامە ) هەستی پێدەکات . ★ بۆن، بێن . (بـکـ.) بێهـن . تێـبـ ـ أ ) هێندێك شتی تەبیعێ لە ئەنجامـی تەفاعولی کیمیایێ ناو خۆیانەوە ، بەشێك لەو ماددانـەی کە لێیـان پێکهاتون دەکەنە گازێـــك کە لـە هەوادا بڵاودەبێتـەوە و ئەگەر لـە نێزیکیانەوە بێن بە لوتمان هەستیـان پێدەکەین جا لەوانەیە بە لامانـەوە خۆش بێ یا ناخۆش . ب) بۆنی شتـــانی دەســتکرد ئەنجـامـی تێکەڵکردنی بۆنی تەبیعی‌یە دەگـەڵ ئەو ماددانەی شتەکانیان لێ دروست دەکرێ . ج) لە زمانی ئاوێستـایێدا (بەئۆذی) هـــەر بە بۆنـی خـۆش گوتراوە و ئێ (پەهلەوی)ش هەروایە.

**٢ـ بۆ ـ** (نا.) ، ( خۆشناوەتێ )، دێراوی هێندێ شێتـاوەرد وەکـو تەماتە و توتن و خەیار و ... تێبـ ـ ئەم ووشەیە لە (بێستان)دا گۆڕاوە ( تم : ـ ) .

**٣ـ بۆ ـ** ( ئم .) ١ـ ئامـرازی پرسیارکردنە و لە سەرەتای ڕستەی پرسیارەوە دێت و مانای (لەبەرچی؟) دەدات . □ «ئەی خوایە لـە کـام بادەیە دەرخواردت دان + بێهۆشن و بۆ هەتاهەتا سەرخۆشن ؟» (خەیامی هەژار ، ل ـ ٢٥) :: بۆ وات‌کرد ؟ بۆ چۆیـە لای ئـەم کابرایـە ؟ بـۆ دەرسەکەت ڕەوان ناکەی ؟ ★ بۆچ، بۆچێ ، چما ، چمان ، لۆچی ، لەبۆ . ( سنـ.) بۆچە . تێبـ ـ ئەم ئامرازە تا ئەندازەیێکیش سەرسوڕمان تێکەڵ بە پرسیارەکە دەکات . ٢ـ [ پە : بێ‌ئۆ = بۆلای ئەو ] ، أ) لای ڕێگای پـێ دیار دەکرێ :: دەچێ بۆ سەر ئێشی. دلشاد ڕۆیێ بۆ کەرکوك . □ «هەمۆ ڕێیەك ئەچێتەوە بۆ بانە » ( خـا ، پەنـــــد ، ل ـ ٤٩٤) . ب) لای دەستاودەست‌کردنی شتێ لە نێوان دۆ یا چەند کەساندا پێشان دەدا . □ «بەو قورئانەی خوا بۆ پێغەمبەری بە خەڵات ناردوە » :: حەسەن ئـەو قاموسە بەرە بۆ دلشاد. ٣ـ ئامرازی تەعلیلە بە مانای (لەبەر) ، (لەپێناو) :: بۆ کتێبەکە هاتوم ، ئەم قامۆسەم بۆ کوردان نوسیوە . ★ ( هـو.) پەرەی ، پەی . ٤ـ ئامرازی کردنـە مڵك (تملیك) :: ئەو کتێبە بۆ تۆ . « بۆ کوردستان » کۆمەڵە شیعرێکی هەژارە . ٥ـ وەکو ( پیبف.) دەچێتە سەر هێندێ مەصدەران و مانـای ( توانسـتی ) فـــاعیل بـــۆ جێبـــەجێ‌کردن و نـــەکردنـی لە (فیعل) زیاد دەکا :: خۆی بـۆی نەکرا، بۆم ناشۆرێ، ئەو هەموەم بۆ نانوسرێتەوە . تێبـ ـ ئەم ئامـرازە دەگەڵ زۆر مەصـدەران تەرکیـب دەبێ و لە هێندێکیاندا هەر کردونی بە مەصـــدەرێکی نـــوێ :: بـۆ ڕێك‌کەوتن ، بۆ لوان ، بـۆ کران ، بۆ قڕاندن ( تم : هبێد ، ل ـ ١٩ ). و لە هێندێکیشیاندا بەپێی جێگا دێتە ناو ڕستەوە .

**بۆ ئەژماردن** ــ [ ٤ــ بــۆ /٢ + ئەژمـاردن ] ، (مصــت. مــت. ) حیساب‌کردنی پارە یا هەر شتێــکی دیکەی کە دە ئەژماردن بێت لەبــەر چاوی کەسێــکی تر ، تا پاشـــان تەسلیمی بکرێ .

**بۆبا** ــ [ ١ــ بۆ + ٣ــ با/١ ] ، (نت.) ، (مک.) بۆنێکی تایبەتییە بــۆ (ڕۆن) و (پەنیر) و (کاڵــەك) و ... تێب ــ ئەم جــۆرە شتــانە ئەگــەر سەریان دانەپۆشرێ هــەوا کاریــان تێدەکا و چونکو دەگەڵ ئۆکسیژێنی هەوا تەرکیب دەبن و دەبنە ئۆکسید ( ئۆکسیدێ دەبــن ، تەئەکســود دەکەن ) و تامیان دەگۆڕێ و ئــەو بۆنەیان لێ پەیدا دەبێ .

**بــۆ بــژاردن** ــ [ ٤ــ بــۆ/٢ + بژاردن] ، (مصت.لا.) تۆڵەی شتێکی لە دەست کەسێدا زایە بۆبــێ یـــا زەرەری پێگەیشتبێ ، تۆڵە بــۆ خاوەنی شتێك کردنەوە .

**بۆ بەرامە** ــ (نت.) ، (سنە.) تمــ : بۆن و بەرامە .

**بۆپڕۆز** ــ [ ١ــ بۆ + پــڕۆز ] ، (نت.) ، (سنە. ، سیهـ.) تمـ : بۆکڕۆز.

**بۆتە** ــ [؟] ، (نا.) ، ( کنێر. ) تاپۆچکەیەکە ، لە گڵێکــی تــایبەتی ( گڵی حیکمەت ) دروستدەکرێ و زێڕنگەر ( زێڕ ) و (زێو ) و (مس)ی تێدا دەتوێننەوە ، شکڵی وەکو هێلکە وایە کە لــە سەرێــکەوە نەختێــکی خشت بڕابێتەوە . تێب ــ هەر ئــەم ووشەیە کراوە بە عارەبی و بوە بــە ( بوتقة ) و (بودقة) .

**بۆتەگە** ــ [ ١ــ بۆ + تــەگە ] ، (نت.) ، (مک.) بۆنێــکی ناخۆشــە ، پێش تێ‌بەربۆن لە نێرێ دێ .

**بۆچاڵ** ــ [١ــ بــۆ + چــاڵ ] ، ( نت.) ، (مک. ، ســیهـ. ، ســنـ .) بۆنێکە لەو گەنم و جۆیە و ئاردی ئەوان دێت کە لە چاڵێکی ( شەدار )ا ڕاگیرابن . تێب ــ گەنم و جۆ ئەگەر چاڵەکەیان نمی هەبێ و ئەوەندەش نــەبێ کــە بیـــانڕزێنێ و بــە جــارێك لــە کەرەمیــان بخا خۆیان دەخۆنەوە و کاتێ دەکرێنــە نان بۆنێکی تایبەتیان لێ دێ کە نــەك هەر بە لوت هەستی پێدەکرێ بگرە بە تــامیشیانڕا دەزانــدرێ کــە بۆچــاڵیان گرتــوە . ★ (ســنـ. ) بۆنماوێ .

**بۆچڕۆك** ــ [ ١ــ بۆ + چڕۆك ] ، ( نت.) ، (مک.) ئەو بــۆنەیە کە لــە برژاندنی گۆشت و سوتانی ڕۆن و لە هەوادا بڵاودەبێتەوە ، ئەو بۆنەی لە کەبابخــانان هەڵدەستــێ . ★ ( سیهـ.) بۆ چڕۆك .

**بۆچۆن** ــ [ ٣ــ بۆ/٢ + چۆن] ، ( مصت. لا.) ١ــ بەرەو کەسێك یــا شتێك ڕۆیشتن :: بۆیان چــۆن ڕایان کرد. ٢ــ لێکدانەوە و گەیشتنە ئەنجام لەسەر مەسەلەیەك بە جۆرێکی وا کە تەواو دڵنیایی تێدا نەبــێ :: من وای بۆدەچم کە ئەم ماستە بــێ مۆ نیە . زۆربەی زانایان بۆ ئــەوە چۆن کە زمانی کوردی ، زمــانێکی هیند و ئوروپاییە .

**بۆچەك** ــ [ ١ــ بۆ + چەك ] ، ( نت.) ، (مک.) بۆنی دیزەی چێشت لێنان کە پاش ماوەیەك دەکارکردن و

چەوری تێچوونیان ، بە بەتـاڵی دەیانخەنە ناو تەندووری پاش نان‌کردن تا چەور و چڵێکییەکە بسووتێ و دەفرەکە تازەبێتەوە (بزرینگێتەوە) . بۆنی شیشی کەباب کە کەبابچی دەیانخەنە سەر ئاگر بۆ ئەوەی چاك خـاوێن ببنـەوە . ★ ( سنـ.) بۆچەکەووڕ .

**بۆخاو** ـ ( نتـ. ) بـۆنی شـیری نەکوڵاو ، ڕۆنی بـاش نەقرچـاو ، گۆشتی کاڵ و ... □ « هێشتا بۆنی شیری خاو لە دەمی دێ » .

**بـۆدان** ـ [ ١ـ بـۆ + دان ] ، ( مصد. متـ.) شێوەیێکی برژاندنـی هێندێ خواردەمەنییە ، وەکو : نۆك، گەنم ، قاوە و ئەو جۆرە شتـانە لەسەر ساج .

**بۆدراو** ـ [ ١ـ بۆ + دراو ( مف : دان ) ] ، (مکـ.) ١ـ (صمف.) هـەر شتێکی بـۆدرابێ :: قاوەی بـۆ دراومان نەماوە . ٢ـ (نتـ.) گەنمێکە توێکڵی لێ‌کرابێتەوە و سپی کرابێ و لەسەر ساج بۆیان دابێ و پاشـان بە دەستاڕ قەڵت و بڕیان کردبێ . دەکری بە چێشتێکی شل و پیواز و ڕۆنی بۆ داغ دەکەن بـە سـەریدا دەکرێ ، یاخۆ وەکو ساوار و برنـج دەیکەن بە قبۆڵی و پڵاو .

**بۆدڕن** ـ [ ١ـ بۆ + دڕن ؟ ] ، ( نتـ. ) ١ـ بۆنی چڵکنی کە لە لەشی ئادەمیزاد و جل و بەرگی دێت. ٢ـ بۆنی ئارەقەی بنەنگل و قاچ و ... ★ ( سنـ.) بۆکڵێشـــە . (بـا.) بێهن‌قتك .

**بۆدۆکەڵ** ـ (نتـ.) بۆنێکە کە ئەگەر ئاگری بن‌چێشت لە ( گڕ ) بکەوێ و دۆکەڵ بکا و لە چێشتەکە بدا ، لە کاتی خواردنا هەم بە لووت و هەم و بە چێژتن هەستی پێ دەکرێ .

**١ـ بـۆر** ـ (صتـ.) ڕەنـگی خۆڵەمێشی ★ ( سنـ .) کەووگ . ( جـفـ.)کەوە . تێبـ ـ لە زمـانی ئاوێستاییدا (بەڤرە) و لە پەهلەویدا ( بۆر ) و لە سانسکرێتیدا (بەبهرو) بە مانـای سـوور یا سـووری مەیلەو قاوەیی هاتوە ( تە : معین ، بورهان ، ج ١ ، ل ـ ٣١٤ ) . لەبن لەهجـەی (لوڕی)دا کە یەکێکە لە بن‌لەهجەکانی لەهجەی جنوبی زمانی کوردی (بۆر) ڕەنگێکی سـپی ئامـاڵ زەردە و لە بن‌لەهجـــەی (زازا)ییدا (بوێـنـر) قاوەیی‌یە و لە زمانی (تەبەری)دا کە کۆن لە مازندەران قسەی پـێکراوە ( بور ) بە ڕەنـگی زەرد بیـژراوە و فارسی ئیمڕۆ (بۆر) بەسوور دەڵێن .

● **زۆربێ و بۆربێ** ـ ( کنـ.) چەندێتی مەبەستە جۆنێتی هەرچی بێ هـەر باشە .

**٢ـ بۆر** ـ [؟] (نا.) ناوی دەنگ بزوێنێکی زمانی عەرەبییە ( ضمة ). تێبـ ـ لـە موکریـان کەڕستەیێـکی عەرەبی بە حونجەی دەخوێننەوە ئەم دەنگ بزوێنە بە (بەر) ناو دەبەن و دەڵێن : دال ، بەر ، دو . یا دال دۆبەر دون کەچی ناوەکەی (بۆر)ە و ناشزانم بۆچی ئەو ناوەی لێ‌نراوە . فارسی بۆ ئەم دەنگ بزوێنە ووشەی ( پێش )یان هەڵبژاردوە . ★ بەر .

**بۆران** ـ [؟] ، (نا.)، (مکـ.، سیهـ.، سنـ.، بکـ.) بای توند و بە تەووژمی

زستانان کە بارانی دەگەڵ بێ یا بەفر لە شوێنی خۆی هەڵگرێ و گێژی بدا و بیباتە جێگایەکی دیکە . ∴ ئەسپی با و بۆران .

**بۆرانی ــ** [؟] ، (نتـ.) ، (مـکـ.) چێشتێکە . هێلکە یا بایینجان یا کولەکە لە ڕۆنا سوور دەکەنەوە و ماستی بۆ خاو دەکرێتەوە و دەیکەن بە سەریا و تۆزێ گەرمی دەکەن . تێبـ ــ دەشێ ئەم ووشەیە لە [ ١ــ بۆر + ٣ــ ئانی/٢ ] پێکهاتبێ .

**بۆراو ــ** [ ١ــ بۆر + ١ــ ئاو/٢]، (نتـ.) ، (سیهـ.) شۆربای برۆێش (هبێد ، ل ــ ٢٠ ) تێبـ ــ أ) مەبەست ( برۆێش /٢ ــ أ )ە . ب) بەلای منەوە ئەم ووشەیە دەبێ ( بۆدراو ) بوبێ و دەنگی (د)ەکەی لە باتی ئەوەی وەك لە لەهجە سلەیمانیدا دەبیندرێ، کلۆر بوبێ بە جارێك فڕێ دراوە .

**بۆرایی ــ** [ ١ــ بۆر + ئایی/١ ] ، ١ــ پەڵەی بۆر لەسەر هەر شتێکی بێ . ٢ــ شتێکی لە دوورەوە هەروا بۆر بچێتەوە و نەزانری چیە . ٣ــ (مجـ.) قوون □ « حێزباب چەندت ڕق لە منە + بۆرایەکەت بەو دوو گونە » (ووردی ، بەردەشانی ، ل ــ ٩٠ ) .

**بۆرباو ــ** [١ــ بۆر + ٤ــ باو ] ، ( صتـ. ) تم : بۆرەلوك .

**بۆرجوازی ــ** (نا.) ، (کعر.) ١ــ تم : بۆرژوا . ٢ــ تم : بۆرژوازی . تێبـ ــ ئەم ووشەیە لە زمانی ئینگلیسیڕا و بە ڕێگای زمانی عەرەبیدا هاتوتە ناو زمانی کوردی لە کوردستانی عێراق و دەگەڵ بۆرژوا و بۆرژوازی یەکن و جیاوازیان لە دەنگی ( ژ ــ ج) دایە کە بەرامبەرەکەیان بە خەتی لاتینی ( G ) یە و فرەنسی بە(ژ)و ئینگلیسی بە (ج)ی دەخوێننەوە .

**بۆردومان ــ** (نا.) ، (سیهـ.) تم : بۆمباران . تێبـ ــ ئەم ووشەیە (بۆمباردمان)ی فرەنسییە و جەڕاوە، وای بۆ دەچم کە لە ڕێگای تورکی عوسمانیڕا هاتبێتە ناو زمانی کوردی لە کوردستانی عێراق .

**بۆرژان ــ** [؟] ، (مصتـ. لا.) ، ( هلـ.) خەوتنێکی سوکە ، کە پیاو بە تەواوی ئاگای لە دنیا نابڕێ ، چاوی دەچێتە خەو بەڵام تا ڕادەیەك هەر ووشیار دەبێ . ∴ هەندێ بۆرژام دەنگەدەنگ نەیهێشت خەوم لێ بکەوێ . ★ (مکـ.) بێروهۆش ، بێرەخەو .

**بۆرسوار ــ** ( نتـ.) پیاوێکی سواری ئەسپی ( بۆرە ) بێ . تێبـ ــ لە لەهجەی ( دێزفولی )دا ( بۆرسوار ) بە (لوڕ)ان دەڵێن ، لەبەر ئەوەی کە (لوڕ)ەکانی خۆزستان سواری ئەسپی (بۆر) دەبوون . (تم : معین ، بورهان ، ج ١ ، ل ــ ٣١٤ ) .

**بۆرمس ــ** ( صتـ.) ، (مکـ.) حاڵی بزنێکی مووی ڕەش بێ و دێغدێغی بۆری بە لا چاویدا هاتبێ .

**١ــ بۆرە ــ** [ ١ــ بۆر + ٥ــ ئە /٢ ] ، (صتـ.) ، (مکـ.، سیهـ.) ١ــ ئەسپ ، ماین ، سەگ و تانجی کە ڕەنگیان (بۆر) بێ . تێبـ ــ بۆ یەکسمان بەپێی ڕەنگیان کە بە لای ڕەش پاشێندا بێ ، ڕەش بۆرە یا شێن

بۆرەیان پێ دەگوترێ . ٢ـ ( مجـ.) پێش ناوانەوە دێت و لە (معرفە)یێ‌را دەیانکاتە (نکرە) . :: بـۆرەزەلام ، بۆرەپیاو .

**٢ـ بۆرە ـ** (نا.) ، (مکـ.) تم : ١ـ بۆرەك .

**بۆرەبنار ـ** (نتـ.) دەمەقـالێ . تێبـ ـ تەنیا مامۆسـتـا خـالّ ئـەم وشەیەی نوسیوە و کەسی تر ، منیش هەر لەوانم وەرگرتوە .

**بۆرەپیاگ ـ** (نتـ.) ، (سنـ.) تم : بۆرەپیاو .

**بۆرەپیاو ـ** [١ـ بۆر + ٣ـ ئە /٢ + پیاو ] ، (نتـ.) ئەو کەسـەی لە بنەماڵەی ئاغا و خـان و بـەگ نەبێ . ئادەمیزادی ئاسایێ . ★ (سنـ.) بۆرەپیاك . (جنو.) بۆرەپیا ، بۆرەکە .

**بۆرەپنە ـ** [؟] ، (نتـ.) ، ( سنـ. ) قەلەصابوونێ .

**بۆرەخزم ـ** (نتـ.) خزمی دوور .

**بۆرە خزمایەتی ـ** [ ١ـ بۆرە/٢ + خزم + ئایەتی /١ ] ، ( نتـ. ) پێوەندی دووری بنەماڵەیی کە دوو یـا چەند کەس یـا خێزانـان پێکەوە دەبەستێ . خزمایەتی دوور .

**بۆرەزەلام ـ** [ ١ـ بۆرە /٢ + زەلام ] ، ( نـتـ.) ١ـ کابرایـەکی نەنـاسراو . □« وەعەلەیـکە سـەلام ، ئەی بۆرەزەلام ، ترخێنەی بێ‌تام ، لە بەرت هەڵنەستام . ٢ـ ( مجـ. ) پیـاوی‌کەتەی گـەورە . ★ (هلـ.) شێنەزەلام .

**بۆرەسوار ـ** [ ١ـ بـۆرە/٢ + سوار ] ، ( نتـ.) سوارێکی نەناسراو ، سوارێکی لات .

**بۆرەقنە ـ** [؟] ، (صتـ.) ، تم : بۆرەلۆك . (خا ، ب ١ ، ١٣١ ) .

**١ـ بۆرەك ـ** [ پهـ : بـۆرەك ] . ( نا.) خوێیەکی کیمیاییە و نـاوە عیلمیەکەی ( بۆراتی سۆدیوم )ە ، لە تەرکیبی کیمیایێ ئاسیدی بۆرێك دەگەڵ سۆدیۆم دەکەوێتەوە ، لـە ئاوی دەریادا بە حاڵی تەبیعێ هەیە و بۆ داوودەرمـان و لـە سەنعـاتدا بەکەلـك دێت ، لـە کوردسـتـان زێڕینگەران بۆ تواندنەوەی زێـڕ و زیو و مس بەکاری دێنن، چونکۆ گەرمێ کورەی ئاسایێ ئەو جـۆرە مەعدەنانەی پێ‌ناتوێتەوە . تێبـ ـ مەعلوم نیە ئەم وشەیە کەنگێ کراوە بە عەرەبێ و چۆتە قالبی (بورق)ەوە و لە زمانی عەرەبێ‌را چۆتە ناو زمانی لاتینێ و ئەوجار پەڕیوەتە زمانانـی ئێستای ئەوروپـا و لـە زمـانی فرەنسیدا بۆتە (بـۆڕاکس) . ★ ( مکـ. ) بۆرە .

**٢ـ بۆرەك ـ** [؟] ، (کمر.) جۆرە خواردنێکە . تێبـ ـ أ) هەویرێکـی تایبەتـێ لە ئاردێـکی گەنـمەکەی توێکڵی لێ‌کرابێتەوە ، دەشێلن ، ئەو هەویرە کە توزێ چێڕ دەبـێ و لەبەریـەك دەکشێـتەوە ، پـانی دەکەنـەوە و کوت‌کوتـی دەکـەن ، گۆشتی قیمەکراو ، پەنیری لـە ڕەندەدراو یـا گژوگیای کوڵاو (وەکو ئەسپەنـاغ ) لەسەر هەرکوتێـك ڕۆدەکەن و چەشنی بابۆڵە لـولێ دەدەن و لە ڕۆنا سوری دەکەنەوە . ب) زیاتر لەوەدەچێ ئەمە وشەیەکی

تورکی بێ و لە مەصدەری (بورمق = بادان ، لوولدان ) وەرگیرابێ ، هەرچۆنێ بێ ئەم ووشەیە لە دەوری دەستەلاّتی عوسمانیاندا لە کوردستانی عێراقی ئیمڕۆ کەوتۆتە ناو زمانی کوردیّ .

**بۆرەلّۆك ـ** [ ١ـ بۆر + ئالّۆك] ، ( صت.) ڕەنگێکی تەواو (بۆر) نەبێ . مەیلەو بۆر بێ . ★ (سیه.) بۆرباو. بۆرەقنە . (کک.) بۆرەواش . تێب ـ بە پێچەوانەی گەلێ ووشەی تێکەلّی کوردیّ کە بە (٣ـ ئە/٢ ) تێك دەبنەوە ، من بۆ ئەوە•چوّم کە ئەم ووشەیە لە [ ١ـ بۆر + ئالّۆك] پێکهاتوە و کەرتی دوەم (ئالّۆك) شکلّێکی تازەتری ( ئالّوتەك )ی پەهلەوییە کە زمانی فارسیّ (ئالّودە)ی خۆی لێ وەرگرتوە .

**بۆریە ـ** (نا.) ١ـ جۆرێکە لە جۆرەکانی قامیش . ٢ـ جۆرێ حەسیری تەنکە لەو قامیشە دروستدەکرێ . تێب ـ ا) لولە قامیشە کە بە درێژایێ سەرتاپا خوار دەقەلّیشن و پانی دەکەنەوە و راستوچەپ تێکیانهەلّدەکێشن ب ) زمانی ئارامیّ ئەم ووشەیەی لە زمانی سۆمەریّ وەرگرتوە و لەوێڕا لە قالبی (بوریاء ـ بۆریة)دا کەوتۆتە ناو زمانی عەرەبێ و بە شکلێ (بۆریّ = بۆریە) هاتۆتە ناو زمانی کوردیّ و (فارسیّ)ش بە ( بۆریا ) وەری گرتوە .

**١ـ بۆریّ ـ** [١ـ بۆر + ٢ـ ئیّ]، ( حمص.) حالەتی شتێکە کە ڕەنگی بۆر بێ .

**٢ـ بۆریّ ـ** [؟] ، (نا.) ، (کمر.) ١ـ لوّلە و ( گونج )ی جۆربەجۆرە لە مەعدەن یا هەر ماددەیەکی تر دروست دەکرێ و بۆ گوّاستنەوەی ئاو ، نەوت ، غاز . . . لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك و .. کەلّکی لیوەردەگیرێ . بارێك و ئەستوری هەیە :: بۆریّ ( ئێستراتیژی ) نەوتی کەرکوك دەباتە (فاو).ئەم مالّە هێشتا بۆریّ ئاویان بۆ ڕانەکێشراوە .

**بۆریّ لامپا ـ** تم : بلوّر/٣ .

**بۆرێنە ـ** [ ١ـ بۆر + ٢ـ ئێنە]، ( صت.) بەهۆی (٣ـ ئە/٢) بە دوایێ هەندێ ناوانەوە دەلکێ و مانای ( مەعهوّد ، هەر ئەوەی جاران ، ئەوی پێشوّ )یان لێ زیاد دەکا :: کلاّوە بۆرێنە ( تم : هبێد ، ل ـ ٢٠ ) .

**١ـ بۆڕ ـ** (نا.) ، (مک. ، کمر.) تێشکاویّ و ژێرکەوتەیێ لە شیعرێن و شەڕە قسە و شەڕە جنێو و هەموّ جۆرە دەمەقالێ و مجادەلەیەکدا . ★ (مک.) قژ. هس: ( جذ.) بۆر = شەرمەزار . تێب ـ نازانم ئەسلّی ئەم ووشە لەکوێڕا هاتوە ، بەلاّم ( بوّر ) لە زمانی فارسیدا هەم بە ڕەنگی سوّری مەیلە و قاوەیێ دەلّێن ( تم : ١ ـ بوّر ، تێب ـ ) و هەم بە مانای سەرشکاویّ و خەجالەتیّ هاتوە و دوکتوّر معین ( تم : بورهان ، ج ١ ، ل ـ ٣١٤ ) دەلّێ چونکوّ ئینسان کە خەجالەت بوّوە ، سوّر هەلّدەگەڕێ، بۆیە ووشەی ( بوّر ) مانای خەجالەت بوّنەوەشی وەرگرتوە .

**٢ــ بۆڕ ــ** [؟] ، (نا.) «جێگایەکە لــە زەوێدا چاك ئەکرێت و مێوەی تێدا هەڵئەگیرێت و پۆش و پەلاشی بە دەورەدا دائەنرێت . » (معر. ، کشت ، ب ١ ، ل ــ ٣٩ ) .

**٣ــ بۆڕ ــ** (نا.) ، (مک.) دەنــگی گڕ و گەورە چ ئێ ئادەمیزاد و چ ئێ ئامرازەکانی مۆسیقا . :: ئەم کوڕە دەنگی بۆڕ بوە . تێبـ ــ بەلای منەوە ئەم وشەیە ( دەنگەناو )ە . هس : بۆڕە .

**٤ــ بۆڕ ــ** (نا.) ، (مک.) گیایەکی دەشتەکییە ، گــەڵای ووردە وەکــو گەسك ، لە نیو میتــر زیــاتر بەرز دەبێتەوە ، لە پایێزا دەیدرۆن و لــە شوێنێ کۆی دەکەنەوە ، زستــانان دەیدەن بە ماڵات و گاوگۆل .

**بۆڕانــدن ــ** ( مصــد. لا. ) ١ــ دەنگی خۆدەرخستنی ڕەشــەووڵاغ :: گاڕانەکە هەر بە ڕۆکاری ئاواییدا شۆڕ بۆوە تێکڕا بۆڕاندیــان . ٢ ــ ( مجـ.) کەسێك (لەبەر هەرچێکی بێ) بە دەنگی بەرز دەنگێــکی چەشنــی دەنگی گا و ... لە خۆی دەرخا . :: دارێکیان لێدا وەك گا بۆڕاندی .

**بۆڕخــواردن ــ** [ ١ ــ بــۆڕ + خواردن ] ، (مصد. لا.) تێشکــان ، ژێرکەوتن ، قسە پێ نەمــان :: کۆنەپــەرست لــە بەرانبەر پیاوی ئازادیخوازا زۆ بۆڕ دەخوا .

**بۆڕدان ــ** [ ١ــ بۆڕ + دان ] ، ( مصد. متـ.) شکاندن و ژێرخستنی یەکێك لەو کارانــەدا کە حــاڵەتی ( بۆڕێ ) دروســـت دەکــەن . :: شێرکۆ و نەوزاد شــەڕە شیعریــان دەکرد نەوزاد شێرکۆی بۆڕ دا . پیاوی بێ مەنتیق زۆ بۆڕ دەدرێ .

**بۆرژوا ــ** (نا.) ، (کئێر.) تــاکە کەسێك لە چینی بۆرژوازی ‌‌ً تێبـ ــ أ ) ئەم ووشەیە لە زمانی فڕەنســیڕا هاتۆتە ناو زمانی فارسیٖ و لەوێشڕا کەوتۆتە ناو زمــانی کوردیٖ لــــە کوردستانی ئێــران . ب) زمانــی فڕەنسیٖ ئەم ووشەیەی لە بــورگ (Bourg) ی ئەڵەمانیٖ بە مــــانای ( شارۆکە ) داتاشــیوە و مانــای ( بۆرژوا ) دەبێتە : ( خەڵکی بورگ ، دانیشتوی بورگ ) و مانای دیکەشی هەیە ، بەلام لە زمانی کوردیدا هــەر مانا سیاسییەکەی مەبەستە . ج) لە زمــانی کوردیــــدا ووشــــەی ( شارەزا )مــان هەیــە کە لەلانــی لۆغەتەوە ماناکەی دەبێتە : ( ئــەو کەسەی لە شار ــ زاوە ــ لە دایــك بوە ) کە دەقاودەق مانای (بۆرژوا)ی فڕەنسی‌یە ، بەلام وەکو دەزانین ئەم ووشەیە ئێستا تەنیا بە مانــــای ( کەسێکی ڕێوشوێنی کارێك بزانی یا بەڵەدی جێگایەك بێ ) بەکاردێت . ★ (کعر.) بورجوازیٖ /١ .

**بۆرژوازیٖ ــ** (نا.) ، ( کئێر. ) چینی سەرمایەدار کە لــە قۆناغــی سەرمــــایەداریدا دەستــــەلاتی دەوڵەت و هەمــــو ئامــــرازەکانی دروستکردنی ( وسائل الانتاج ) بــە دەستەوەیە . ★ (کعر.) بورجوازیٖ /٢ .

**بۆڕە ــ** [ ٢ــ بۆڕ + ٥ــ ئە/١ ] ، (نتـ.) دەنگی پاتاڵ ، دەنــگی ڕەشــە ووڵاغ .

**بۆڕەبۆڕ ــ** ( نت. ) ١ ــ چەند بۆڕەی یەك لە دوای یەك ، بۆڕەی چەند پاتاڵ بەسەر یەکەوە . ٢ــ ( مج. ) دەنگی ناخۆش و نــاســازی ئادەمیزاد :: ئەرێ ئــەم کابرایــە چ بۆڕە بۆڕێکیتی ؟ .

**بۆڕیە ــ** (نا.) ، (کئێر.) ئامرازێکی مۆسیقایە قەدیم لــە ( کەڵەشاخ ) دروستیان‌کردوە ئێستا لە مەعــدەن ( بە کەمێك گۆڕینەوە ) هەر لەسەر شێوەی کەڵەشاخ دروست دەکرێ، فوی پێدا دەکەن دەنگی لێوەدێت .

★ شێپوور . کەڕەنا . ( سن. ) بوق .

**بۆڕیەژەن ــ** (نفا.) ، ئەو کەسەیە بۆڕیە لێدەدا .

**بۆز ــ** ( صن. ) ١ــ ڕەنگــێکە لــە نێوان ڕەش و سپی‌دا نێزیکە لـــە رەنگی خۆڵەکەوە ، زیاتر بۆ ئەسپ و گوێدرێژ و ئێستر بەکاردێت . :: ئەسپە بۆز . کەرە بۆز . ئێسترە بۆز . ٢ــ ( مج. ) هەر ڕەنگێکی کاڵ بۆبێتەوە و ڕەنگێکی دەڵبی لێ بەجێ مابێ . ٣ــ حــاڵی سەروڕێــش و سمێڵێ کە بەتەواوێ سپێ نەبوبێ و ڕەنگی خۆشیان لەدەست دابــێ . □ « تۆکی سەروڕێشم لە غەمـا بۆز و درێژ بۆ + بەم وەزعیەتــی ڕێشەوە ، وەك خواجە حەنا خۆم » ( عارف ) .

**بۆژۆ ــ** [ ١ــ بۆ + ئاژو (ئاژنین)]، ( صت. ) ، ( مک. ، سن.، سیە . ) ١ــ حالی ئالیکی پــاش ئــاخوڕی وولاغی بەرزە کە بۆنێکی تایبەتی لێ پەیدا دەبێ و واز لە خواردنی دێنێ و ئەگەر بکرێتە بەر وولاغێکی دیکەش نایخوا . ٢ــ (مج.) حاڵی هەمــو کارێکی کە بە شێوەیەکی ناڕاســـت دەسکاری کرابێ و لەبــەر چــاوی خەڵك کەوتبێ . ( عا. ) مبتذل . تێبـ ــ بەو جۆرەی مردۆخ ( تم : ب١ ل ــ ١٩٨ ) نوسیویە ، دەبێ ئەسڵی ئەم ووشەیە لە [ بــۆ + ئــاژۆ ] پێکهاتبێ ، من لام وایە کەرتی (ئاژۆ) ڕەگی مەصدەری ( ئاژنیــــن ) بــێ کە مانای ووشەکە دەبێتە ( بۆئاژن ) شتێکی ( بۆ ) ئاژنیبێتێ و چوبێتـە ناو هەمو کەلێنێکیەوە ( هــس : سوژناژن ، دەرزی ئاژن ) . جــا ئەگەر ڕاستی بۆ چوبم دەتوانین بڵێین کە ئەم ووشەیە ، یەکەم ووشەیەکــە لــە تەرکیبێزا ڕەگــی مەصــدەری ( ئاژنین ) لەباتی ئەوەی وەکو خۆی ( ئاژن ) ــ بمێنێتەوە گۆڕانێکی بــە سەردا هاتوە و بۆتە ( ئاژۆ ) .

**بۆسار ــ** [ ١ــ بۆ + سار ] ، ( صت. ) ، (سن.) حالی هەر شتێکی بۆنی کردبێ بە تایبەتی خواردەمەنــێ ( تم : مردۆخ ، ب ١ ، ل ــ ٢٠٢ ).

**بۆسارد ــ** (صت.) ، ( مک. ) بۆنێکی ناخۆشە کە ئینسان ئازاربدا، بۆنی گۆشتی‌کاڵ ، ماصێ ، . . تێبـ ــ دیارە کە خۆشی و ناخۆشی گەلــێ لە بۆنەکان بە پیاو کەوتوە .

**بۆسان ــ** [ ٢ــ بۆ + ئستان/١ ا]، ( نت. ) ، ( سن. ) تم : بێستان .

**بۆست ــ** (نا.) تم : بست .

**بۆسۆ ــ** [١ــ بۆ + سۆ (سوتان)]، (نت.) ، ١ــ بۆنی سوتانی لۆکە یــا قوماشێ کە لە لۆکە دروست کرابێ .

★ (با.) بیهن کەون (هل.) بۆنسۆ .

٢ـ تامی ماستێکی شێرەکەی زۆر کوڵابێ . ★ (هل.) تام سۆ . (جن.، سیە.) بوکز /٢ . (با.) بۆسێ ● **ئاگری پیوەنیی بۆسۆی لێ هەڵناستێ** ـ(کن.)زۆر ڕۆت و ڕەجاڵ و نەدارە.

**بۆسە ـ** (نا.) ، (مک.) دارێکی ئەستورە داهێنراوە و خوار کراوەتەوە وەکو ئاڵقە ، دەخرێتە ناوتێرە و بە (هیرتە قایم دەکرێ و سەری ئامۆری تێ هەڵدەکێشری . ئەو ئاڵقەیەی کە (نێر) و (ئامۆر) لێك توند دەکا .

**بۆش ـ**[تو.] ، (صە.) حاڵی هەر شتێکی لە بەر چاوان قەوارەی هەبێ و بتەو دیار بکا بەڵام لە ناوەوە هڵۆڵ بێ . :: ئێرە بنی بۆشە. ئەم تەنەکەیە بۆشە . کابرایەکی کەللە بۆشە .

**بۆشایێ ـ** [ تو. کو.] ، [ بۆش + ئایێ /١ ] ، (نت.) ١ـ ئەو جێگەیەی کە ( زەوێ ) لە ڕێزی کۆمەڵە ئەستێرەی سەر بە هەتاو تێیدا دەگەڕێ ، ( عا. ) فضاء . ٢ـ پارچە زەوێ یا جێگایەکی بەرێن . ٣ـ جێگای یەك یا چەند زەلام لە ناو کۆمەڵێ خەڵکا کە بەڕێز ڕاوەستابن. ٤ـ پلە و پایەیەکی ڕەسمێ و کۆمەڵایەتێ لە دەزگای دەوڵەت یا وولاتێکدا کە خاوەنەکەی لادرابێ یا بە هەر جۆرێکی دیکە شوێنەکەی بەتاڵ بوبێ :: مردنی جەمال عەبدوناسر بۆشاییێکی زلی لە ( میسر )دا بەجێ هێشت .

**بۆشکە ـ** [ ڕۆسێ : بۆچکا ]، (نا.) ، (کئێر.) تم : بەرمیل .

**بۆشناغ ـ** [؟] ، (نا.) ، (مک.) ئادەمیزادی کۆك و پۆشتە و حاڵخۆش کەفیز و ئیفادەش لێدەدا. تێبـ ـ واتێدەگەم ئەسڵی ئەم ووشەیە تورکێ بێ .

**بۆغمە ـ** [تو.] ، (نا.) ١ـ (سن.) نەخۆشی‌یەکە ئالۆ لە دێوی ناوەوە دەئاوسێ . تێبـ ـ دەربارەی ئەم نەخۆشییە لە ووشەی (دۆشاخە)دا باس دەکەین . ٢ـ جنێوێکی سوکەڵەیە زیاتر بە منداڵی زۆربڵە دەدرێ . تێبـ ـ مانای ئەم ووشە تورکییە ( خنکان )ە ، جا ئەو کەسەی جوێنەکەی پێ دەدرێ وەکو پێی بڵێن : یاخوا بخەنکێی و ئیتر قسەت پێ نەکرێ ، وایە .

**١ـ بۆق ـ** (نا.) گیاندارێکە لە ووشکانێ و ئاوا دەژی ، پێستێکی لینجی هەیە ، پنۆك پنۆکی ڕەش و قاوەیێ تێدایە ، لە ئاوا (گەرا) دادەنێ ، بەگەراکەی دەڵێن ( سەرمێکوتە ) . تێبـ ـ ا) ئەم گیاندارە لە نێوان گیاندارانادا بە دەستەیەك حیساب دەکرێ کە زۆر چەشنی هەیە ، بە پێودانی زانستێ تا ئێستا ١١٦ چەشنی ناسراوە . ب) ئەم گیاندارە ماددەیێك بە ڕێگای پێستی‌دا لە لەشی خۆی دەردەخا کە ( ژەهر )ە و بۆیە نابێ دەستی لێ بدرێ . ڕەنگە هەر بۆیەش بێ لە کوردەوارێدا دەڵێن هەرکەسێ دەست لە بۆق بدا دەستی (بالۆکە)ی لێدێ . ★ (سن.) قورواق . (بک.) بەق . (جن.) قۆرواق .

**٢ـ بۆق ـ** (نا.) ، (سن.) تم :

بۆڕیە .

**٣ـ بۆق ـ** (نا.) ، (سنە.) تم : بوغ/١

**٤ـ بۆق ـ** (نا.) ، (کعر.) کارێکە، کە یەکێك کەسێکی‌تر بۆلایەك ڕادەدا و لە جێی خۆی دەیڕەتێنێ . ★ ( مکـ.) پاڵ .

**٥ـ بۆق ـ** (نا.) ، (سنە.) چاوی زەق ، چاوی دەرپەڕیو .

**بۆق پێوەنان ـ** (مصد. مت.) پاڵ‌پێوەنان .

**بۆقڕاندن ـ** [ ٤ـ بۆ/٢ + قڕاندن ] ، (مصد. مت.) دەربڕینی نیازێکی خراپ بۆ کەسێ . کردنی قسەیەك دەربارەی کەسێ کە وا لێك‌بدرێتەوە ئاواتێکی خراپە بۆی دەخوازرێ . :: ئەرێ ئەوە بۆچێ هێندە بۆی دەقڕێنی .

**بۆقژە ـ** [؟] ، (نا.) ، ( مکـ. ) نەخۆشییەکە منداڵ تۆشی دەبن ، نێودەم و لێو و لچیان بلۆق‌دەکا . تێبـ ـ لە کوردستان ئەم نەخۆشییە بە مەرەکەبی ڕەش (مەرەکەبی مەلایان) چاردەکەن و دەم و لفاوەی نەخۆشەکەی پێ هەڵدەسون .

**بۆقمل ـ** (نت.) ، (سنە.) تم : بۆقەتە . تێبـ ـ ووشەی ( بۆق ) بە تەنیایێ لە بن‌لەهجەی سنەیێدا بە مانای ( چاوی زەق ) دەکار دەکرێ ، وام بۆ دەردەکەوێ کە ئەم ووشەیە خۆی بە تەنیایێ مانای : دەرپەڕیو ، هەڵتۆقیو ، زەق ... بێت . ( هس : بلۆق ) .

**بۆقە ـ** [؟] ، (نت.) حاڵەتێکە بەسەر دەغڵدا دێ و ئەو شوێنانەی کە پاشان دەبنە گوڵ تۆزێ هەڵدەمسێن . :: ئەو گەنمە بۆقەی کردوە . تێبـ ـ بۆ (بۆق) لەم ووشەیەدا . تم : بۆقمل (تێبـ ـ) .

**بۆقەتە ـ** [؟] ، (نا.) ، ( سیهـ . ) لای خوارەوەی ملی ئادەمیزاد لە پشتەوەڕا ، پشتی‌مل . تێبـ ـ أ) ئەم ووشەیە زیاتر ئیزافەی (مل) دەکرێ و دەبێژرێ ( بۆقەتەی مل) . ب) بۆ کەرتی ( بۆق )ی ئەم ووشەیە تم : بۆق مل ( تێبـ. ) ★ (مکـ.) پشت‌مل ( پژمل ) . (سنە.) بۆق‌مل .

**بۆقەمەلە ـ** [ ١ـ بۆق + ٣ـ ئە /٢ + مەلە ] ، (سیهـ.) جۆرێك مەلەوانییە کە بۆ سەرئاوکەوتن دەست و قاچ وەکو ئێ بۆق دەجوڵێندرێ ★ (مکـ.) مەلەبۆقە . ( جنـ.) قوڕواق مەلە .

**بۆکڕۆز ـ** [ ١ـ بۆ + کڕۆز ] ، (نت.) ، (مکـ. ، سیهـ.) بێنی سوتانی هەندێ شت کە لە گیانداران دەکەونەوە ـ ئەوەی لە زانستی کیمیادا پێی دەڵێن : موادی عضوی ـ وەکو : خورێ ، مو ، ئێسك، شاخی گاوگوڵ و ... ★ ( سنـ ، سیهـ.) بۆپڕۆز . (با.) بێهن زوێرهە . (جنـ.) بۆکز .

**بۆکز ـ** [ ١ـ بۆ + کز ] ، (نت.) ، (مکـ.) ١ـ بۆنی چێشتێ کە بە بنی مەنجەڵەوە سوتابێ و لە کاتی خواردنیا هەستی پێ دەکرێ . ٢ـ ( سیهـ . ، جنـ. ) تم : بۆسۆ /٢ .

**بۆکلێشە ـ** (نت.) ، ( سنـ.) تم : بۆدڕن .

**بۆگنخ ـ** [١ـ بۆ + گنخ (گنخان) ]،

(نت. ، مک.) بۆنێکە ، لە دانەوێڵەی نمدار پەیدادەبێ پاش ئەوەی لــە دەفرێکا هەڵدەگیرێ و ســەری دادەپۆشرێ خــۆی دەخواتــەوە و بۆندەکا . یان لە شوێنێکی شەدار دادەنــدرێ و بۆنــی ئــەو جــێگایە دەگرێت . ★ (هل.) بۆ گەمرخە . ( سن.) بۆنماوێ .

**بۆگەمرخە** ــ [ ١ــ بۆ + گەمرخە ؟ ]، (نت.) ، (هل.) تم : بۆگنخ .

**بۆگەن** ــ [ ١ــ بــۆ + گــەن ( گەنین ) ] ، (کەر. ، سن. ) ١ــ ( نت.) بۆی ناخۆش کە لە دەرکەوتنی باوبڕی ناوزگی گیانــداران . لــە ئاودەست ، لە ئاوێ کە ماوەیێك لە شوێنێکدا مابێتەوە و لەبەری نەڕوا ، بلاّودەبێتەوە . ★ (مک.) بۆگەنیو . (با.) بێهنگەنێ . (جن.) بۆگەن . ٢ــ (مج.) ، (صت.) ، (تن.) ، (کەر.) اــ حاڵی کەســێك یــا ڕژێرمێــکی بیروباوەڕی کۆنەپەرستانەی هەبێ . ب ـــ ـ ـالی یــەکێکی کــردەوە و ڕەووشت و خۆی خراپ بێ . تێبـ ــ لە ئاوێستادا ( بەئۆذە ، بەئۆذی) و لەزمانی پەهلەوێدا ( بۆذ ، بــۆی ) هەر بە ( بۆنیخۆش ) گوتراوە و بــۆ ئەوەی کە ئێستا لە زمانی کوردیــدا ( بۆگەن ، بۆگەنیۆ )ی پێدەڵێین ، لە زمانی ئاوێستاییدا ( گەئبینێ ) و لەپەهلەوێدا ( گەنــد ) هــاتوە . ئێستاش ووشەی ( گەندە ، گەند ) لە لەهجەی ناوەندێ زمانی کوردیــدا بە تەنیایێ و لە تەرکیــبی هێنــدێ ووشەشدا و لەبن لەهجەی ( لوڕێ و فەیلیێ )دا (گەن) بە مانای ( خــراپ ) دەکاردەکرێ .

**بۆگەننك** ــ [ ١ــ بــۆ + گەنــت ( گەند ) + ئلك ] ، (نت.،) ، (سیم.) « جۆرە بۆگەنێکە لە مێوەی ڕزێو و هێندێ شتیتر دێ . » (خا ، ب١ ، ل ــ ١٣٥ ) .

**بۆگەنکــردن** ــ (مصــت. لا.) ، ( کەر.) . ١ــ ڕزین و بۆن لێ پەیدا بوونی مێوەجــات . ٢ــ مانــەوەی گۆشت و ئەو جــۆرە شتــانە و بۆنگرتنیان . ٣ــ مانــەوەی مردوێ ئادەمیزاد و کەلاکی گیاندارانی دیکە و بۆنلێهەستانیان . ٤ــ (مــج.) ، ( کن.) بۆنی مانەوەی هەمێ شتێك و هەمێ کەسێك لە شوێنێك یــا بــێ ئەوەی گۆڕانیان بەســەردابێ . :: ڕژێرمی پاتشایەتێ بۆگەنێ کردوە و بە کەڵکی ئەم زەمانە نایەت .

**بۆگەنیــو** ــ [ ١ــ بــۆ + گەنیــو (مف : گەنین ) ] ، (نت.) ، (مک.) تم : بۆگەن .

**بۆگەنیبــوون** ــ (مصــت. لا.) ، ( مک.) تم : بۆگەنکردن .

**بۆلووان** ــ [ ٤ــ بۆ/٢ + لووان] ، ( مصت. لا.) ، (کەر.) لە کارانــدا باشهاتن ، چــاك هەڵــکەوتن ، سەرگرتن . بەختهێنان لە دەســت هاتن ، پێکران ( هەمێ بۆ کەسێ یا کەسانێ ) :: بۆی نالوێ ئێمڕۆ بچێتە لای گۆڕێن . وەك بۆتۆ لواوە بۆ کەس نەلواوە . ئەگەر بۆم بلوێ سەرێکی خاڵم دەدەم .

**بۆڵ** ــ (نا.) ، (سیم. ، سن. ) دەنکی ترێ . :: ریشی بابا بــۆڵی درێژۆکەیە. ترێ ڕەشکە بۆڵی خڕە.

★ (مكـ.) گلۆ . (سنـ.) گلە ، گلێ .
تێبـ ــ لە لەهجەی جنوبی زمانی کوردیدا : گلۆ = هەڵمات گلە = كلۆ . دەنك . گلەگلە = دانەدانە . ( تم : لوڕێ ، لـ ١٢٤) .
هس :
**بۆلاندن** ــ ( مصتـ. لا.) ١ــ لەبەرخۆوە و بەناڕازیتی بە جۆرێکی وا قسەکردن کە خەڵکی نیزیك گوێیان لێبێ بەڵام هەمۆی تێنەگەن و قسەکان بە تەواوێ و ڕێکوپێکێ لە دەم دەرنەچن . :: هەر دەڕۆی و دەیبۆلاند . ٢ ــ دەنگێکی لە دەمی وورچی تۆڕە دێتە دەر . :: هەر دەڵەی وورچە دەبۆلێنێ . ★ (سنـ.) بۆلانن بۆلەکردن ، خۆتەکردن . بۆلەبۆلکردن .
**بۆلمازۆ** ــ [ بۆل + مازۆ ] ، (نتـ.)، (مكـ . سیمـ.) جۆرە ترێیەکە، دەنکی خڕە وەکو مازۆ هەر بەقەد مازۆیێکیش گەورەیە ، هێشۆی پڕ و توێکلّی ئەستور و ڕەنگی زەردی شێنباوە . □ « (بۆلمازۆ) و (مسکێ) و (مێخێ) و (ڕەزاقێ) و (گونتولە) و (کلکەڕێوێ) و (عوشاقێ) »
( پیرەمێرد ، ل ــ ٢٧٩ )
**بۆلە** ــ (نا.) قسەی لەبەرخۆوە کە خەڵك لێی حاڵی نەبن . ئەنجامی بۆلاندن . :: پیرێژن هەر هەنگاوێك دەڕۆیشت و بۆلەیێکی لێوە دەهات . ★ (سنـ.) خوتە .
**بۆلەبۆل** ــ (نتـ.) بۆلەی زۆر ، بۆلەی یەك بە دوای یەکا . :: ئەوە چیە دەڵەی پیرێژنی دۆ لێ ڕژاوی ، هەر بۆلەبۆلتە . ★ (سنـ.) خوتەخوت .
**بۆلەبۆلکردن** ــ ( مصتـ. لا. ) تم : بۆلاندن .
**بۆلەکردن** ــ ( مصتـ . لا.) ، (سنـ.) تم : بۆلاندن .
**بۆم** ــ [ محر . فرەنسی : بۆمب]، (نا.) ، (کثێر.) تم : بۆمبا .
**بۆمادەران** ــ [؟] ، (نتـ.) ، ( مكـ.) گیایەکی دەشتەکییە ، گوڵی زەرد و سپی دەگرێ ، گەڵای وووردە ، بۆنی زۆر توندە و نیزیکەی میترێك بەرز دەبێتەوە ، لە کوردستان ڕەگ و گوڵەکەی بۆ داوودەرمانی کوردەواری بەکاردێت و بەگشتی لە لادێ قاپ و قاچاغی پێدەشۆن . ★ ( سیمـ . ، سنـ.) بۆمارانە . ( جنـ. ) برنجداس. سنـ.) تم : بۆمادەران .
**بۆمارانە** ــ ( نتـ.) ، ( سیمـ . ، سنـ. ) تم : بۆمادەران .
**بۆمب** ــ [ فرەنسی ] ، ( کثێر.)، ( نا. ) تم : بۆمبا . تێبـ ــ ئەم ووشەیە خوێندەوار دەیڵێن و لادێیی و کوردی ئاسایی هەر (بۆم) دەڵێن . **بومبی ئاتۆمی** ــ ( نتـ. ) ، (کثێر.) تم : بۆمبا ( بۆمبای ئەتۆم ) . **بۆمبی باڵدار** ــ ( نتـ.) ، (کثێر.) جۆرێك تەقەمەنییە کە لە خۆیەوە ــ بێ ئەوەی بە فڕۆکە فڕێ بدرێ یا بە تۆپ و . . . بهاوێژرێ ــ دەچێتە سەر شوێنی مەبەست و بەسەریا دەتەقێتەوە . تێبـ ــ یەکەم شتی لەم بابەتە ئەڵەمانیای نازی ساڵی ١٩٤٤ دایهێناوە و ئەوسا بە ناوی (ڤ ــ ٢) ناوبانگی دەرکرد . **بۆمبی دەستی** ــ ( نتـ.) ،( کثێر.) تم : نارنجۆك .

**بۆمبی هیدرۆژێنی** ـ ( نتـ. ) ، ( کئێر.) جۆرێك بۆمبی ئاتۆمییە ، کە لە باتی ئاتۆمی قورسی وەك ( ئۆرانیۆم ) لە ئاتۆمی سوکەڵەی هیدرۆژێنی کەڵك وەردەگیرێ و توانستی تەقینەوە و وێران‌کردنی لە بۆمبی ئاتۆمی زۆر زۆر زیاترە . ★ ( کعر.) بۆمبای هایدرۆجین .

**بۆمبا** ـ [= ئیتالی : بۆمبا ] ، ( نا.) ، (کعر.) « گوللەیێکی هلۆلە ناوەکەی پڕدەکرێ لەو شتانەی کە دەتەقنەوە یا ئاگر دەوولات بەردەدەن، جاران ( لە چەرخی ١٦ ــ ١٩ ) هەر بە تۆپ دەهاوێژرا ، ئێستا بە فڕۆکەش بەردەدرێتەوە . » ( تە : لارۆس ــ ١١١ ) تێب ــ لە کوردستان ــ ( بۆمبا ) تەنیا بەوە دەڵێن کە فرۆکە فڕێی دەداتە خوارەوە . **بۆمبای ئەتۆم** ـ ( نتـ.) ، (کعر.) بۆمبێکە لە تەقینەوەی ئاتۆمی ئۆرانیۆم پێکدێت و توانستی وێران‌کردنی لە بۆمبای دیکە گەلێ زیاترە ، بە فڕۆکە بەردەدرێتەوە . تێب ــ بۆ یەکەم جار ئەم جورە بۆمبایە ساڵی ١٩٤٥ لەلایەن ئەمریکاوە دژی ژاپۆن بەکارهێنراوە و دوو شاری ( هیرۆشیما ) و (ناگازاکی) خاپوور کرد و نیزیکەی ١٢٠ هەزار کەسی لە دانیشتوانی ئەو دوو شارانەی کوشت . **(بۆمبای دەستی** ــ ( نتـ.)، ( کعر. ) تمـ : نارنجۆك . **بۆمبای هایدرۆجین** ـ ( نتـ.) ، ( کعر.) تە : بۆمب ( بۆمبی هیدرۆژێنی ) .

**بۆمباباران** (نتـ.) ، (کعر.) تە :

**بۆمباران** ـ [ بومب + باران/٢ ]، ( نتـ.) ، ( کئێر.) بەربوونەوەی یەك لەدوای یەکی ( بۆمبا ) بەسەر جێیەکدا . ★ (کعر.) بۆمباباران . تێب ــ دەنگی (ب) یەك لەم ووشەدا لەناوچوە . بۆردومان .

**بۆمباران‌کردن** ـ ( مصتـ. متـ. ) بەردانەوەی یەك لەدوای یەکی ( بۆمبا ) بەسەر شوێنێکدا .

**بۆمباهاوێژ** ـ [ بۆمبا + هاوێژ ( هاویشتن ) ] ، ( نتـ. ، صتـ. ) ، ( نتـ.) فڕۆکەی شەڕ کە ( بۆمبا ) هەڵدەگرێ و بەسەر شوێنێکی‌دا بەردەداتەوە ( بۆمبارانی دەکا ) . تێب ــ ئەم ووشەیە ئەگەر بە تەنێ دەکار کرا ( ناو )ە :: بۆمباهاوێژەکانی عێراق . ئەگەر لەپاش ناوی ( فڕۆکە )شەوە هات ئەوا صفەتە :: فڕۆکەی بۆمباهاوێژ . فڕۆکە بۆمبا هاوێژەکان .

**بۆمچ** ـ [ ١ــ بۆ + مچ ] ، (نتـ.) بۆنی هەندێ شتی وەکوو گوێز و بادام کە ( شە ) دەکێشن و خراپ دەبن . ( تە : مردۆخ ، ب ١ ، ل ــ ٢٠٥ ) . ★ ( سنـ.) بۆمچەو ، بۆمچەوە .

**بۆمچەو** ـ (نتـ.) ، ( سنـ.) ، تە : بۆمچ .

**بۆمچەوە** ـ نتـ. ، سنـ. ، تە : بۆمچ .

**بۆن** ـ (نا.) تە : ١ــ بۆ . تێب ــ وەکوو دەبینین ئەم ووشەیە دەنگی (ن)ی زیاترە لە ( ١ــ بۆ ) کە نە لە ( ئاوێستایی ) وە نە لە ( پەهلەوی )یەکەیدا دەنگێکی وانەبوە و پێشم شك نایە کە دەنگی ( ذ )ی ئاوێستایی بوبێتە

گۆڕان و گەشـەکردنی زمانـان کـە هەمیشە بەرەو ساکاربۆنە مـاوەی ئەوە نادا بلێین ئەم دەنگی (ن)ە ، پاش ساکاربۆنەوەی ووشەکە لە (بەئۆذی) ئاوێستایی‌ڕا بۆ ( بۆذ )ی پەهلەویی و (بـۆ)ی دوا قونـاغی ووشـەکە ، هاتۆتە گۆڕێ . بۆیە من بۆ ئـەوە دەچم کە (بۆن) ، (بێن) ، (بێهن)ی باکۆری لە (بۆ) کۆنتربن و زیاتر ڕێی تێدەچێ کە ووشەیێکی ( مـادیی ) بن .

**بۆنپێوەکردن** ـ ( مصتـ. متـ .) ١ـ تە : بۆنکردن /٣ . ٢ـ شتێك لە لوتی خۆ نێزیك‌کردنەوە ، لەبـەر ئەوەی بۆنێکی خۆشـی لێدێـت :: شەمامەیێکی بەدەستەوە بۆ خێـرا خێرا بۆنی پێوە دەکرد . ٣ـ (کنـ.) دانانی شتێك و کەڵك لێ‌وەرنەگرتنی :: ئەوە ئەو باقلاوەتان بۆچی داناوە، بۆنی پێوەدەکەن ؟

**بۆنخۆش** ـ ( صتـ.) تە : بۆندار .

**بۆنخۆشکە** ـ ( نتـ.) گیایـەکی بۆنخۆشە ، لە زەویی بۆرە دەڕوێ ، نێو میترێك بەرز دەبێتەوە ، لاسـکی درێژە و لق‌وپۆپی چڕوپڕە ، گوڵی وەکو ئی بابۆنە وایە ، شیرەیێکی لـێ دەگیرێ زۆر تاڵە ، ژهرە و زەمـانی پێشـو بۆ چارکردنـی نەخۆشـی ئیفلیجی ، لۆغە، لەرزۆکی، فێداریی، نەخۆشی مەعدە و جەرگ و کـرمی ناوزگ ، کەڵکیان لێ‌وەرگرتوە .

**بۆندار** ـ [ بۆن + دار (پبـ.) ] ، ( صتـ. ) هەر شتێکی بۆنی خـۆشی لێ هەڵبسـتێ :: تـوتنی بۆنـدار ، برنجی بۆنـدار . ★ بۆنخـۆش ، بێندار . ★ (بکـ.) بیهندار تێبـ ـ لەم ووشەیەدا ( بۆن ) وەکو ( بەئۆذی ) ئاوێستایی بە موتڵـەقی مانـای ( بۆنی خۆش )ە .

**بۆنسۆ** ـ (نتـ.) ، (هلـ.) تە : بۆسۆ/١ .

**بـۆنکردن** ـ ( مصتـ. لا.) ١ـ هەسـتکردن بە بـۆن :: کەپـۆی گیراوە و بۆن ناکا . ٢ـ پەیدابۆنـی بۆنی ناخۆش لە هەندێ شت کە لـە ئەنجامی تەفاعولی ناوەوەی خۆیـان یا تەفاعول دەگەڵ هەوای دەوروبەر، بۆنیان دەگۆڕێ . ٣ـ ( مجـ.) تۆزێ ئاگاداربـۆن لە کارێـکی نهێنـی :: ئازادیخوازان گورج بۆنی پیلانەکانـی ئیمپریالیزم دەکەن . ٤ـ ( مـصتـ. متـ. ) وەبەر لوت دانی شتێ بـۆ ئەوەی بزاندرێ بۆنی لێدێ یان نا . ★ بۆنپێوەکردن .

**بۆنگ** ـ [؟] ، ( نمصـ.) ، ( هلـ.) کاری خاوێن کردنەوە و خۆش‌کردنی پێستەی هەندێ گیانداران ، بـۆ مەشـکە .

**بۆنگچـێتی** ـ [ کـو. تـو. ] ، [ بۆنگ + چی + ئەتی ] ، ( حمصـ.)، ( هلـ.) پیشەی خۆش‌کردنی پێسـتـە بۆ مەشکە .

**بۆنگچی** ـ [ کو. تو.] ، ( هلـ .) ئەو کەسەیە کە پێستە خۆش‌دەکا بۆ مەشکە .

**بۆنگ‌کردن** ـ ( مصـتـ. مـتـ.) خۆش‌کردن و ئامادەکردنی پێستـەی هەندێ گیانداران ( گا ، مەڕ ، بزن) بۆ مەشکە .

**بۆنوبەرام** ـ (نتـ.) ، (مکـ.) تە :

بۆنوبەرامە .

**بۆنوبەرامە ــ** ( نت. ) ، ( کعر . ) بۆنێکی لە شتێك هەڵدەستێ و بەدەوروبەری خۆیدا بلاودەبێتەوە :: بەیانێ چۆنیە باغی مکایلێ بۆنوبەرامەی گوڵان دەمار بە دەمار دەڕۆیێ . بۆنوبەرامەی پلاوی سەدرێ هەمۆ کۆچە و کوڵانی پڕکردوە . ★ (مک.) بۆنوبەرام . ( سنـ.) بۆبەرامە ، بەرامە . تێبـ ــ أ ) لەم ووشەیەشدا مەبەست لە کەرتی ( بۆن ) وەکۆ ( بەئۆذە )ی ئاوێستایێ ، هەر بۆنی خۆشە . ب) کەرتی (بەرامە) بەڕای من لە پێشدا ( ڤەراما ) بوبێ کە لە (ڤەر)ی پەهلەویێ بە مانای (بۆ لای سەرەوە)و ( ئاما )ی ئێستای هەورامێ بە مانای ( هات ) پێکهاتوە و مانای ووشەکە بە تێکڕایێ دەبێتە : بۆنێکی لە شتێك بۆ لای سەرەوە دێت. بۆنێکی لە شتێ هەڵدەستێ .

**بۆنە ــ** [ پە : بۆن = هۆ ، عیللەت ] ، ( نا. ) ، (کعر. ، سنـ . ، جنـ . ) لەبەر ، بۆ خاتری ، :: کورد بە بۆنەی جێژنی نەوڕۆزەوە هەمۆ ساڵێ ئاهەنگ دەگێڕن . هس : بەهانە ، بیانو .

**بۆهەڕنەهۆت ــ** [ ؟ ] ، (نت.) ، (مک.) بۆنێکی ناخۆشی نامەعلوم .

**بۆیاغ ــ** [ تو = ڕەنگ ] ، (نا.) ، ( کعر. ) ١ــ ئەو دەرمانانەی تۆکی سەر و سمێڵی پێ ڕەنگ دەکرێتەوە :: سەری بۆیاغ کردوە . خاڵۆ ڕەمەزان تۆکی ڕەشی بە سمێڵەوە نەماوە بۆیاغی دەکا . ★ ٢ــ بۆیە ٢/ . ئەو دەرمانانەی کەوشی پێ ڕەنگ دەکەنەوە . ★ (مک.) ماز . (کێر.) واکس .

**بۆیاغچێ ــ** [ تو. ] ، [ بۆیاغ/٢ چێ ] ، (نفا.) ، ( نت. ، صت.) ئەو کەسەی کەوشان ڕەنگ دەکاتەوە .

**١ــ بۆیە ــ** [ ٤ــ بۆ/١ + ١ــئە]، (شر.) لەبەر ئەوە ، لەبەر ئەم هۆیە . تێبـ ــ ئەم (شر.) وەڵامی (بۆچی ؟) پێدەدرێتەوە و بێ ئەوەی باسی ( هۆ ) بکات و کاتێك دەگوترێ کە کەسێك نەیەوێ کردەوەی خۆی تەعلیل بکا . :: ئەوە بۆچێ ریشت نەتاشیوە ؟ ــ بۆیە ! ★ بۆیەکا ، بۆیەکانێ ، بۆیەکو ، بۆیەکە.

**٢ــ بۆیە ــ** [ تو = ڕەنگ ] ، (نا.) ، (کعر.) ١ــ ئەو دەرمانانەی دارودیوار و دەرك و پەنجەرەی پێ ڕەنگ دەکەن . ٢ــ تە : بۆیاغ/١ ☐ « سمێڵی بۆزە و بۆیەی نەماوە + ئەو ڕەزا قورسە بۆیە تۆراوە.»؟

**بۆیەچێ ــ** [تو.] [ ٢ــ بۆیە/١ + چی ] ، (نت. ، صت. ) ، (کعر.) ئەو کەسەی پێشەی ڕەنگ‌کردنی دەرك و پەنجەرە و دارودیواری خانووانە ★ (کێر.) نەققاش .

**بۆیەکا ــ** (شر.) تە : ١ــ بۆیە .

**بۆیەکانێ ــ** (شر.) تە : ١ــ بۆیە .

**بۆیەکو ــ** (شر.) تە : ١ــ بۆیە .

**بۆیەکە ــ** (شر.) تە : ١ــ بۆیە .

**بوچك ــ** ( صت.) ، (سنـ. ، جنـ.) تە : بچۆك .

**بۆدڕ ــ** [؟] ، (نت.) ، ( نا.) کەلەبەر و قەڵشت لە زەویدا ، شوێنێکی وەکۆ ئەشکەوتی پچکۆلە ، لە کێوا کە دڕندە و جانەوەر خۆیانی

تێدا حاشار دەدەن . تێب ــ وا وێ دەچێ کە ئەم ووشەیە لە [ بۆم + دڕ (دڕان) ] پێکهاتبێ .

**بۆدەڵە** ــ [؟] ، (نت.) ، (مک.) . ئادەمیزادی دەست و پێ سپێ هیچ لەدەست نەهاتو ، بێ شەخسیەت . تێب ــ من وا تێدەگەم ئەم ووشەیە لە پێشدا ( نابۆتەڵە ) بوە و (نا)یەکەی کەوتوە . یاخۆ لە ( بۆتەك )ی پەهلەوێ و ( پیب. ئەڵە) پێکهاتوە کە ماناکەی دەبێتە : ( مەوجودێکی پچکۆلە ) .

**بۆر** ــ (نا.) ، (مک.) تم : پۆرە .

**بۆرانەوە** ــ ( مصت. لا.) کتوپڕ بەهۆی عاملێکی نەفسێ وەکو ترس ، خەم و خەفەت یا لەبەر هۆیەکی فیزیۆلۆژێ وەکی نەخۆشێ و برسێتێ و ... و ... لەهۆش خۆچون و ئاگا لەخۆ نەمان . ★ بوردنەوە . تێب ــ لە کوردەوارێ بۆ وەهۆش‌هێنانەوەی کەسێکی بۆرابێتەوە ( بۆسۆ )ی وەبەر لوتی هەڵدەدەن تا بێتەوە هۆش خۆی .

**بۆردن** ــ (مصت. لا.) ١ــ تم : رابوردن . ٢ــ تم : لێبوردن . :: بۆرە نەم‌توانی دوێنێ بێمە خزمەتتان . ٣ــ زۆرگەیشتنی تەڕەکارێ ( کاڵەك ، شوتێ ، هاروێ و ...

**ڕابوردن** ــ ( مصت. لا.) ١ ــ تێپەڕینی شتی ماددێ لە شوێنێکەوە یا بە شوێنێکدا . :: خدر دوێنێ بێرەدا ڕابورد . ٢ــ بەسەرچونی زەمان :: دو ساڵێش ڕابوردوە هێشتا نەگەڕاوەتەوە . ★ ( مک.) ڕابردن . ( بک.) بهورتن .

**لەخۆبوردن** ــ (مصت. لا.) فیداکارێ لە پێناو دین ، بیروباوەڕ ، نەتەوە و نیشتمان ــیا هەرشتێکی تر .

**لێبوردن** ــ ( مصت. مت. ) خۆش‌بون لە کەسێ کە خراپەیەکی کردبێ . دەست‌هەڵگرتن لە شتێ :: لێمان ببورە خۆ من لە سەعاتەکە بوردوم دەترسم شتی تریشم لێ داواکا . ★ عەفوکردن . خۆش‌بون .

**بوردنەوە** ــ (مصت. لا.) ، ( کعر.) تم : بورانەوە .

**بوردو** ــ ( حمف .) حالی تەڕەکاری زور گەیو . ( تم : بوردن /٣ ) .

**بورە** ــ [ ؟ ] ؛ (نا. ، ص.) زەوێ کە ساڵێك نەکێلدرابێ . ★ بۆر . ( جن. ) بورە = زەوێ کە هەر نەکێلدرابێ . هس : بەیار . تێب ــ وا تێدەگەم ئەم ووشەیە و هاوتاکەشی هەرتکیان عەڕەبین .

**بۆز** ــ ( نا.) ، (مک.) دارێکی خۆڕسکە لە جەنگەڵان ، گەڵای وەگەڵای ( دارتو ) دەچێ و لقوپۆپی تێکچڕژاوە ، کاتێ گەڵای هەبێ وەکو تۆپەڵێ بەسەر دارەکەوە دیار دەکا . قۆزاخەیێك دەگرێ پڕە لە مێشوولە . لە لێڕەوارەکانی کوردستان هەیە . ★ ( کعر.) بەوز . دار مێشولە . ( سن.) دارتوفانە .

**بۆزۆ** ــ [ ؟ ] ، (نا.) قوماشێکی تایبەتی کوردستانە ، جۆلای کورد لە ( مەرەز ) دەیکەن و دەکرێتە ڕانك‌وچۆغە و شاڵ وشەپك . ★ ( کعر.) شاڵ .

**بوزەڵە** ــ [ بۆز (بۆزۆ) + ئەڵە /٢] ، (نت.)، (مك.) بەرهەڵبێنەیەكە لە هێندێ مەڵبەندی كوردستان : ( شاروێران ، هەوشار ، محاڵی چارداورۆ ... ) ، لەباتی خامی سپی یا شێن ، لە بوزوی دەكەن .

**بۆژاندنەوە** ــ ( مصد. مت. ) ١ــ هێنانەوە حاڵ. ٢ــ وەباوخستنەوە. وەگەڕهێنانەوە. ٣ــ زیندوكردنەوە. :: نەتەوەی كورد دەبێ فۆلكلۆری خۆی بیۆژێنێنەوە .

**بۆژانەوە** ــ ( مصد. لا.) ١ ــ هاتنەوە حاڵی گیاندارێك، كە لەبەر نەخۆشی یا هەر هۆیەكی دیكە ، كەنەفت بوبێ :: سەرما كەسیرەی كردبو باش دامان پۆشی ، تۆزێ بـۆژایەوە . گرانەتـا پەكی ئینسـان دەخاو زۆر درەنگ دەبۆژێتەوە . ٢ــ زیندوبونەوە و وەباوكەوتنەوەی شتێك یـا ڕێوشوێنێـك كـە كزبوبێ یا هاتبێتە لەناوچون . :: نەورۆز جێژنێكی كۆنی كوردانـە و تازە بۆژاوەتەوە . ئیمپڕیالیزم تازە نابۆژێـتەوە . هـس : ( پهـ. ) : بۆژێتەن ، ڕزگاربون ، رزگاركردن.

**بۆسە** ــ [ ؟ ] ، (نا.) شوێنێكی نەدیوە ، خۆی لێ حـاشار دەدەن تا نەبیندرێن بۆ هەر مەبەستێـك بێ . تێب ــ ئەمەیان زیاتر بۆ نیازی خراپ ( شەڕ ، دزی ، ... ) و ئەو جۆرە كارانـەیە لـە حـاڵێكدا ( سێپە ) ، (حاشارگە) و ( بنە ) كە هەر بۆ خۆ تێدا شاردنەوە ، تەنیـا بۆ ڕاو دەگوترێن . ★ كەمین .

**خۆ لە بۆسەدان** ــ ( مصد. لا. ) خۆشاردنەوە لە شوێنێكی نەدیـو بە نیازی خراپ . ★ كەمین كردن .

**بۆسەدانانەوە** ــ [ ١ــ بۆسە + دانـانەوە ] ، ( مصـد. مت.) خۆشاردنەوەی كەسێ یا كەسـانێ لە شوێنـێكی نەدیـو بە نیـازی دەگیرخستن و پەلاماردانی دوژمـن ( لە شەڕا ) یا ڕێبـوار و كاروانـی ( بە نیازی ڕوتكردن ) .

**بۆك** ــ ( نا.) ١ــ كچێكی بە شو درابێ ، لەو ڕۆژەڕا كە دەسـت بە سازكردنی دەكرێ بۆ چونـە ماڵە مێرد و پاشانیش تا ماوەیەك . ( هو.) وەوی . (بك.) بویك ، (با.) بیك . (جن.) بوی . ٢ــ نیسبەتـی ژنی دەگەڵ هەمو خیزانی مێردەكەی :: بۆكی ئایشەخان ( ژنـی كـوڕی كوێخا ئایشـەخان ) ، بۆكـەكانی ماڵی كوێخـا بارام ( ژنی كوڕەكانی كوێخابارام ) . ٣ ــ داوەڵێـكی پچوكە ــ كچۆلان لە چێلكە و پەڕۆ دەیكەن و ئێستا لە پلاستێك و ئـەو جۆرە شتانەش دروسـتدەكرێ . ★ ( سن.) وەوێلە . ( جن.) بیتی . تێب ــ ئەم ووشەیە و ( بـێوە ) و ( بێوە ) لە (بێوەژن)دا و ( وەوی ) هەورامی و سنەیی لە ( ڤەذو )ی سانسكریتی كەوتوتـەوە ، لـە ئاوێستادا ( ئوپەڤـەذ ) بە مـانای ژنهێنان یا مێردكردن هاتوە .

**بۆكبردن** ــ ( مصد. مت.) تم : بۆكگواستنەوە .

**بۆكانی** ــ [ بۆك /١ + ئانی/١ ]، ( صت.) بە شێوەی بۆك ، كارێكی وا كە وەكو بۆ بۆك بكرێ . :: بۆكانی

نەنگیان دەتەقاند .

**بۆکبۆکێن** ـ [ بۆک/١ + بۆک/١ + ئێن] ، (نت.) یارییێکی کوردەوارییە، کچۆڵە دەیکەن یەکێکیان دەبێتە بۆک و یەکێکیش زاوا و لاسای گەوران دەکەنەوە .

**بۆکدابەزاندن** ـ ( مصت. مت . ) هێنانە خواری بۆک ( بوک ) لە خوانی زین پاش ئەوەی دەگاتە بەرماڵی زاوا . ● **دەڵەی بۆکی بۆ دابەزیوە** ـ ( کن.) زۆر بە پەلەیە ، ئۆقرە ناگرێ . تێب ـ بە کەسێک دەگوترێ کە لە شوێنێک بێ و پەلە بکا بۆ ڕۆیشتن ..

**بۆکسوارکردن** ـ ( مصت. مت .) بۆک لەبەر ماڵی بابی سواری (ماین) کردن تەسلیمی بۆکێنیان کردنی تابێکوێزنەوە ماڵی زاوا . تێب ـ ئەم کارە تەنیا لە ناوی شێرەتان و دەوڵەمەندانی شارانی کوردستان باوبۆ ، بۆکی فەقیر و هەژاران بە پێیان دەگوێزرایەوە .

**بۆکگواستنەوە** ـ ( مصت. مت .)ـ بردنی کچێکی بە مێرد درابێ ، لە ماڵی باوکیڕا بۆ ماڵی مێردی ، بەپێی ڕێوشوێنێکی تایبەتێ کە بۆ ئەم کارە باوە .

**بۆکگۆڕینەوە** ـ ( مصت. مت. ) پێکگۆڕینەوەی دوو بوکان کە ژنبەژنەیان پێکرابێ . تێب ـ ژنبەژنە لە کوردستان ڕەسمە ، لەناو عەشیرەتاندا باوە لە حاڵەتێکی ئاوادا هەر لایەی کچی خۆیان دەگەڵ بۆکنێ خۆی ڕەوانە دەکا و لە نێوەی ڕێگا تۆشی یەکتر دەبن و بۆکی هەر لایەک دەدرێتە دەست بۆکنێ لایەکەی تر و هەرکەسە بۆکی خۆی دەبا و بەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە ، هێندێ جار لەسەر ئەوەی کێهەلا دەبێ بۆکی خۆی لەپێشدا تەسلیم بکا دەمەقاڵێ پەیدا بوە و کار کەوتۆتە شەڕە تفەگ و ( شایێ ) بۆتە ( شێن ) .

**بۆکنێ** ـ [ بۆک/١ + ئن + ٣ـ ئێ ] ، ( صت. مت. ) ، (مکـ.) ئەو کەسانەن کە لە ماڵی زاواڕا دەچن بۆ ماڵی بۆکێ و لەوسەرەوە دەگەڵ خۆیانی دێنن .

**بۆکەبەبارانە** ـ ( نت.) ، ( سیمـ . ، مکـ.) داوەڵێکە لە کاتی بێبارانێدا مندالآن دوو داران ڕاستوچەپ لێك دەبەستن و پەڕۆ و پاڵی پێدا دەدەن بە جۆرێ شێوەی ئادەمێزاد بدا و بە ماڵانەوە دەیگێڕن و ئەو گۆرانیە دەڵێن : « بۆکە بەبارانێ دەوێ ، ئاوی بن دەغڵانی دەوێ ، دەرزی کچۆڵانی دەوێ . » و چۆنە بەر هەر ماڵێک جامێ ئاو بەسەر خۆیان و بۆکیاندا هەڵدەپڕژێنن و دیاریەکیشیان دەدەنێ . لە کوردەوارێ بڕوایان وایە کە ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی باران بباریێ . ★ ( سیمـ.) بۆکەبەبارانێ . (سنـ.) وەوڵە بارانێ .

**بۆکەبەبارانێ** ـ ( نت.) ، (سیمـ.) تە : بۆکەبەبارانە .

**بۆکەسەماکەرە** ـ [ بۆک/٣ + ٣ـ ئە/٢ + سەماکەر + ٥ـ ئە/٢ ] ، ( نت.) بۆکێکە کچۆڵان دروستی دەکەن ، پارچە قوماشێک بە شکلی

ئینسان هەڵدەدرۆن و لۆكەی تێداخنن و بە ئەندازەی خۆی جلكی ژنانەی بۆ دەدرۆن و دەبەری دەكەن.

**بۆكەشۆشە** ـ [ بۆك/٣ + ٣ـ ئە/٢ + شۆشە ] ، (نت.) ، (كمر.)، ( نت.) ١ـ بۆكی منداڵانەیە كە لە باغە و شتی وا دروست كرابێ. ٢ـ ( كن.) ئادەمیزادی ناسك و نازداری بە ناز پەروەردەكراو .

**بۆكێنێ** ـ [ بۆك/١ + ئێنێ ] ، (نت.) ، (نت. ، صد.) ئەو ماوەیەیە كە كچێكی تازەشوكردوو ، بەپێی داب و دەستور بە ( بۆك ) حیساب دەكرێ .

**بۆلەرزە** ـ ( نت.) ، (مك.) تە : بۆمەلەرزە .

**بۆڵ** ـ ( نا. ) ، (سن. ، هو. ) خۆڵێكی لە سۆتانی دار ، ڕەژێ و ئەو جۆرە سۆتەنییانە دەكەوێتەوە. ★ ( كمر. ، مك.) خۆڵەمێش ، خۆڵەكەوە . (بك.) خۆڵێ .

**بۆڵاو** ـ [ بۆڵ + ١ـ ئاو/١] ، ( نت. ) ، (سن. ، هو.) خۆڵەمێشێ كە تێكەڵ بە ئاو كرابێ . ★ (سیه.) خۆڵاو . تێبـ ـ وەكو دەزانین ـ خۆڵەمێش ماددەیێكی (قەلەوێ)یە و لە كوردستان هەر لە كۆنەوە بۆ هەندێ سەنعاتی كشتوكاڵی وەكو ڕەنیوهێنانی كشمیش و سەبزە و دروست كردنی مرەبا و ئێش و كاری ڕەنگرێزی ، دەیكەنە ئاوەوە و ئەو جۆرە شتانەی تێهەڵدەكێشن تا لە ئەنجامی گەرم كردن و كوڵاندن شكڵیان نەگۆڕێ .

**بۆڵەمڕ** ـ [ بۆڵ + ٣ـ ئە/٢ + مڕ ؟ ] ، ( نت.) ، ( سن. ، هو.) خۆڵەمێشی داغ . ★ ( مك.) زێلەمۆ . ( سیه.) ژێلەمۆ . ( كی.) ژێلە . ( جن.) بێلمر .

**بۆڵەوەرە** ـ [ بۆڵ + ٣ـ ئە/٢ + وەر (أ) + ٥ـ ئە/١ ] ( نت. ) ، ( أ ) تێژاوی خۆڵەمێشە ، بەناو ڕەزان و بندار و درەختاندا دەیڕشێنن ، بۆ لەناوبردن و قڕتێخستنی هێندێ جرۆجانەوەر ( وەكو كرم و . . . ) یا ئێشك كردن و سوتاندنی ( كیمیایێ ) گژوگیای زیانۆ . تێبـ ـ ا ) من ئەم ووشەیەم لە ( فیش )ەكاندا نوسیوە ماناشم لێداوەتەوە ، بێ ئەوەی دیارێ بكەم لە كێم بیستوە یا لە كوێم وەرگرتوە و لە چ ناوچەیێكی كوردستان دەیڵێن ، ڕوانیمە هەمو ئەو قاموسانەش كە لەبەر دەستمدان و لە هیچیاندا نەم دۆزیەوە و كە تێشی دەفكرێم بە ووشەیەكی ڕەسەنی كوردێ دەهاتە بەرچاو ، بۆیە نوسیم . ب) كەرتی (وەر) كە لەم ووشەیەدا دەیبینن لە زمانی پەهلەوێدا بە شێوەی (ڤەر) چەند مانای هەیە كە یەكێكیان (خۆڵەمێش)ە هاوتایەكی زۆر نزیكیشی هەر لە پەهلەوێدا هەیە ئەویش ( ڤەڕ )ە ( تە : فره ، پفا ، ل ـ ٤٥٠ ) دوور نیە كەرتی ( مڕ ) لە ووشەی ( بۆڵەمڕ )دا هەر ( ڤەڕ )ی پەهلەوێ بێ .

**بۆلێلە** ـ [ بۆم + لێڵ + ٥ـ ئە /٢ ] ، (نت.) ، (مك.) ماوەیێك پاش ئاوابونی ڕۆژ لە ئاسۆ ، كە دنیا

نە بەتـەواوی ڕۆنـاك بێ و نـە تەواویش تاریك . ( عا.) غسق .

**بۆلێڵێ** – [ بۆلێڵە + ٣ – ئێ] ، ( نت.) ، ( مک.) ڕەنگێ کە لە کاتـی ( بۆلێڵە )دا لە دنیا دەنێشێ ، نـە ڕەشە و نە سپێ و زیـاتر بـەلای ڕەنگی خۆڵەمێشێـکی مەیلـەو ڕەشدایە .

**بۆم** – [ ست : بـومی . ، پە : بوم ، سانسکرێتیی : بهومـی ] ، ( نا.) زەوێ ، ئەرز ، خاك ، وولات. تێب – ئەم ووشەیە لـە کوردیـدا لەبیران چۆتـەوە و بـە تەنیـایێ دەکارناکرێ ، تەنیـا لە ووشـەی ( بۆمەلەرزە )ی ( سنـ. ، کعر.)دا دەبیندرێ و لـە ( بولـەرزە )و ( بۆلێـڵە )ی موکریانیـشدا هەنکاوێکیتر چۆتە پێش و دەنگی (م) لە ئاخرەکەی کەوتوە و لە قاڵبی ( بۆ )دا دەبیبنین .

**بۆمەلەرزە** – [ بوم + ٣– ئە/٢ + لەرز ( لەرزین ) + ٥– ئە/١ ] ، ( نت.) ، ( سنـ. ، کعر.) هەژان و لەرینەوەی توند و تیژ یا سـوکی هێندێ شوێنی ( گۆ )ی زەوییە . تێب – تا ئێستا هۆی ئەم هەژانە بـە ڕاستێ نەزانراوە و لەم بابەتـەوە ڕای جۆراوجۆر لە ئارادا هەیـە . لە کاتی لەرینەوەی زەویدا گەلـێ جار دەنگێکی وەکو گرمەی هەور یـا تەقەی تۆپ دەبیسترێ . ئـەو شوێنەی کە لە کاتی بۆلەرزەدا لـە هـەمۆ شوێنێك توند و تیژتر دەلەرێتەوە ، بە زاراوەی زانستێ پێی دەڵێن ( کوانۆ – کانـۆن – ی ناوەوە ) و ئەو شوێنەش کە لـە هەمۆ شوێنێکی دیـکە کەمتـر دەلەرێتەوە ( کوانـوی دەرەوە ) ، دوری ئەم دۆ جێگەیە لێکتر لە ١٨ کیلۆمیتر تا ٦٠ کیلۆمیترە .

**بۆن** – [ ست : بەڤەئیتی . ، پە : بۆتـەن . ] ( مصـت. لا.) ١– مەوجودیەتی گیاندار یا شتێـك :: ئەم کەلاوانە جاران شار بـۆن ، ئێرە قەت ئاوەدانـی لێ نەبـوە ، ڕۆستەم پاڵـەوان بـۆ ، خـۆزگە منداڵەکەتان کوڕبـا ( بایـە ) . ☐ « ئەگەر بە چاوی خۆم نەمدیبا بۆتە ڕمۆزن ، بـاوەڕم نەدەکـرد . » ، ( چیرۆکی فۆلکلۆرێ ) . ئەم کوڕە دەبێتە زانایەکی گەورە . نابێتـە پیاو . ٢– گوران و درسانی شەتڵی گیا و سەوزە :: تۆتنەکەی شەماڵ باش بوە . هێشتا بایینجـانەکانی کوێخـا تۆفیـق نەبـوون . ٣– پێگەیشتنی هێندێ خواردەمەنێ . :: ئەم چایە هێشتا نەبوە بیخەوە سەر ئاوور . قبولیەکە زۆر بـاش لێندراوە بەڵام تۆزێکی ماوە ببێ . ٤– فیعلی مساعیدە و دەگەڵ هێندێ فیعلی دیـکەدا تـەرکیب دەبـێ و یارمەتێ ( سـەرفکردن)یان دەدا بـۆ سیغەی جیاجیا . :: دوێنێ بۆی نەکرابۆ بچێ . قەلـەمەکەی لـێ بەجێمابۆ . ڕدێنی نەتاشیبو . تارە ڕۆیشتبۆ ( ڕۆیبۆ ) . ٥– دارایێ و مالکییەت . :: بۆن و نەبۆن بە دەست خولایە ، کەسێکی کار نەکا چۆنی دەبێ . ★ هەبۆن . **بۆن بە ...** گۆڕانی گیاندار یا شتێ لە حاڵێکەوە

بـۆ حاڵێکی دێ . □ «کەوی لێبوە بە زڕەکەو . » ، « خۆی لێبوە بە شت . » ، « بوە بە ماستی مەیێو»، « گوێلکی خۆماڵی بە گا نابێ » .

**له ... بۆن** ـ وجودی گیانداریێ یا شتێ له شوێنێ :: له بەغدا بۆم ، ئەو ساڵەی له تەورێزێ بۆیـن ، ئوتـۆمبێلەکەی لەبـەر دەرکێ بۆ ، ئیمڕۆ خەڵکێکی زۆر له سەرا بۆن ، کتێبەکەی لەسـەر مێـزەکە بـو چیلێهات . تێب ـ بە قسەی دوکتۆر معێن . ( تم : بورهان ، ج ١ ، ل ـ ٣١٤ ) ئەم مەصدەرە له ( بهەڤ ، بهـۆ )ی ئاریـایێ و ( بەڤەئـیتی ) ئاوێستایێ و ( بهەڤەتی = بۆ )ی سانسکرێتێ کەوتۆتەوە .

**بۆنەوه** ـ [ بۆن + ٢ ـ ئەوه /١ و ٢ ] ، ( مصت. ) ١ ـ وەکۆ فیعلی مساعید دەگەڵ ( ناو )ێك تـەرکیب دەبێ : أ ) مەوجودیەتی دۆبارەی ئەو شتەی ( ناو )ه که نیشـانی دەدا و جارێك له مەوجودیەت کەوتـوه ، دەگەیێنـی :: زیندۆبۆنـەوه ، پەیدابۆنەوه . ٢ـ دۆپاتەیێ کار یـا ڕۆداوێـك دەگەیێـنێ . :: شەڕبونەوه ، گومبۆنەوه .

**به** ـ [ ست : ئوپه ، په : پەت] ، ( ئم . ) ئامرازه و بۆ ئەم مەبەستانه بەکاردێت : ١ـ بۆ پێشاندانی شوێنێ که پێیـدا دەربـاز دەبـن :: بـه بندیوارەکەدا بڕۆ . دوێنی بێـره ( بەئێره )دا هاتین . بەم کۆڵانـەدا بڕۆن دەگەینه مـاڵی خـاڵم . ٢ـ دەگەڵ ( نـاو ) تەرکـیب دەبـێ و دەیکاته بەند :: بە ئەسـپایێ ، بـه خێـرایێ ، بـه چـاوی سۆك ، بە گورچێ □ « ئەوەی بـه بێوەژنێ دەیکەی به کچێتێ کردبات . »

٣ـ بۆ دیـاریکردن و نیشاندانـی ڕێگا و ئامـرازێ که ئیشـێکی پـێ پێکدێت :: خەڵك ئێستا به فڕۆکه و ترومبیل دەچنه سەفەران . جاران به گوێدرێژ و بارگین له جێگایەکیرا دەچۆنـه جێیەکی تر . فەرامەرز بـه خەنجەر وورچێکی کوشت . بـه مسـت له لـوتی دا . ٤ـ بـۆ سوێندخواردن :: بەسەری کاکم . به گۆڕی شەهیدان . بەو قەبرەی جوانەمەرگەکەی تێچوه . به شەرەفی هەرچی مەردە . به پێری هەورامان. □ «سوێندەکه بـه گـوڵ بـێ . »

٥ـ دەکەوێته نیوان دۆ ناوی وەکۆ یەکەوه و شـێوەی بڕانـەوه و جێبەجێبۆنی کارێك پێشان دەدا . :: نامەکەیان دەست بەدەست برد تا گەیێشتـه خاوەنی شارەکەیان مـاڵ به ماڵ پشکنێ قسەکانی مۆ به مو بۆ گێڕامـەوه . ٦ـ بۆدیـاریکردنی ئەندازه و نرخی شتێ و پرسیار لەو ئەندازه و نرخه ، بەکاردێـت . :: ئەم کتێبەت به چەند کڕیوه ؟ ئەمـه چەندی به چەند . له لادێ دەغڵ بـه پێوانه و له شارستان به کێشان . □« هەمۆ شتێ به خوێ ، خوێش به مەعنا . » ٧ـ بۆ تێکهەڵـەنگوتن و لێك نیزیك بۆنـەوه . □ «کێو بـه کێو ناگا ، ئادەمێ به ئادەمێ دەگا . »، « چاو به چاو دەکەوێتەوه » . ٨ـ له پێش ناوێکەوه دێ و دەیکا به صفەت . :: بەجەرگ ، بەهۆش ، بـەکار ،

بەتام ، بەپێز . ٩ـ (مبتدا) و ( خەبەر ) تێك‌دەكاتەوە و نیشان‌دەدا ئەو (ناو)ەی لە (مبتدا)كەدا هاتوە خاوەنی ئەو شتەیە كە لە (خەبەر)ەكەدا باسكراوە. :: مریشكەكە هەر گارەگارێتی بە هێلكەیە . ئاردەكە بە پێزە . ١٠ـ بۆ گۆڕانی شتێك لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێك :: بۆ بە تنۆكی ئاو ، لە ئەژنۆ بەرەژێری بۆ بە بەرد ، « لەپڕێ نابێ بە كوڕێ ». ١١ـ بۆ پێشاندانی كات و جێگا :: بەو قرچە قرچی نیوەڕۆیە لە كوڵان دەسوڕایەوە . بە شەوی تارێك دەرزێ پێوە دەكا . ١٢ ـ دەستاودەستكردنی شتێك نیشان‌دەدا :: كتێبەكەی دا بە نەریمان ، ترومبیلەكەی بە خەدر فرۆشتوە . ١٣ـ پەیوەندێ ( ناو ) یا ( فیعل )ێك دەگەڵ ئەو ( زەمیر ) یا ( ناو )ە پێشان دەدا كە لە دوایەوە دێت . □ «كە من نەخلی مرادم بێ سەمەر بێ + بەمن چێ باغی عالەم جوملە بەر بێ . » ( ؟ ) . تێب ـ لەو شیعرەدا نیشانمان دەدا كە ( باغی عالەم ) هیچ پەیوەندێكی دەگەڵ (من) نیە كە لە پاش (بە)وە هاتوە .

**بە ئالـۆش ـ** ( صـت. ) تـم : ئالۆشاوی /٢ب .

**بەئەسپایێ ـ**(بنت.) تم: ئەسپایێ .

**بەئەنداز ( ە ) ـ** ( بنت. ) لە قەدەر حاڵ ، نە زۆر نە كەم ، بە حیساب . □ « نەڕۆی فەرش گوڵ ، مەست مەست بە ئەنداز + گرتشان چۆپێ وێنەی چوپێ باز ». ( خانا ـ ٦٢ ) .

**بەبا ـ** [ بە/٨ + با ] ، ( صـت. ) حالی دێڵەصەگێكی هەوەسی جۆت‌بونی دەگەڵ ( گوڵ ) تێدا پەیدا بوبێ .

**بەباچۆن ـ** [ بە/٣ + ٣ـ با/١ + چـون ] ، ( مصـت. لا. ) لەدەست‌دەرچونی شتێك بە هاسانێ ، لەكیس‌چونی شتێ ( ماددێ یا مەعنەوێ ) بە خۆڕایێ .

**بەبادان ـ** ( مصت. مت. ) زایەكردنی شتێ ، بە هێچێ شتێك لە دەست‌خۆ دەركردن . :: شێرە ئەو هەمو پارەیەی هەبو بە بای دا .

**بەباكردن ـ** (مصت. مت.) لێك‌جوداكردنەوەی ( دان ) و (كاوكوت)ی خەرمانی گەنم و جۆ . تێب ـ پاش گێرە ، بە.شەنە خەرمان بە ( شەنە ) بۆ هەوا هەڵدەدەن ، كاوكوت سوكە (با) دوری دەخاتەوە و (دان) قورسە لە شوێنی خۆی دەكەوێتە خوار . ★ شەن‌كردن . هەڵاویشتن /٢ .

**بەبارێكاخستن ـ** [ بە/٣ + ٢ ـ بار/١ + ێكا (یەك + ٣ ـ ئا/١ ) + خستن ] ، (مصت. مت.) ، ( سیم. ) لابەلاكردنی كارێك ، لە ڕاوەستاوێ ( ركود ) ڕزگاركردنی مەسەلەیەك . :: هێندە ساوەساوی لێ مەكەن و ئیشەكە هەرچێ‌زوتر بەبارێكا بخەن . ★ (مك.) بەلایەكداخستن .

**بەبالاَبڕان ـ** [ بە/٣ + بالاَ/١ + بڕان ] ، ( مصت. لا. ) ، ( كن. ) ١ـ بە قیسمەت بون ، بە نسیب‌بون :: دەیكوت من ناچم با ئەو جارە یەكێكی

تر بچێ خۆ بە بالآی من نەبڕاوە .
٢ــ کارێك کە لە هەمو کەس چاتر بە کەسێ بکرێ یا شتێ بۆ یەکێ لە هەمو کەس زیاتر دەست بدا :: ئەوە هەر بە نەوزاد دەکرێ دەڵەی بە بالآی بڕاوە .

**بەبالآبڕین** ــ ( مصدر. متد.) تە : بەبالآگرتن .

**بەبالآداهەڵکوتن** ــ ( مصدر. متد.) ، ( کذ.) باسی چاکەی کەسێ‌کردن ، پەسن‌دان ، تاریف‌کردنی .

**بەبالآگرتن** ــ ( مصدر . متد. ) جلوبەرگی درواو ، یا قوماش بە بەژنی ئینسانێك پێوان بۆ زانینی گەورە و پچکۆکێ و درێژێ و کورتێ ( بۆ جلکی حازر ) و زانینی ئەندازەی ( بۆ قوماش ) ★ بەبالآبڕین .

**بە برینگ ئەنگوتن** ــ ( مصدر. متد.)، ( مک.) تە : بە برینگ هەڵگەڕان .

**بە برینگ‌کەوتن** ــ ( مصدر. متد. )، ( مک.) تە : بە برینگ هەڵگەڕان .

**بەبرینگ هەڵگەڕان** ــ ( مصدر. متد.) ، (مک.) باش دەبڕینەوە نەهاتنی خورێ ، ئەوەش لەبەر نەخۆشێ‌یەکە، مەڕ لە وەختی بڕینەوەدا توشی دێت . ★ بە برینگ ئەنگوتن ، بە برینگ کەوتن .

**بەبڕشت** ــ ( صد.) ١ــ حالی دەغڵ و دانێ کە زۆری لێ هەڵبگیرێ :: برنج لە گەنم بە بڕشت ترە . ٢ــ حالی کەسێکی سەلیقەی بە کاران بشکێ ، سەری لێ دەربچێ .

**بەبلە** ــ [ بەبە + لە ( پب.) ] ، ( نتد.) ، ( سند.) تە : بەبە .

**بەبۆ** ــ [ ؟ ] ، (نا.) ، ( مک. )

گوێزێکە لە یارێ ( سافێن )دا دەشکێ و منداڵەکان بۆ چنینەوەی کاکڵەکانی پەلاماری دەدەن و هاوار دەکەن بەبۆیە ، بەبۆیە .

**بەبۆن‌کەوتن** ــ(مصدر. لا.) نەخۆش بونی منداڵی ساوا لەبەر ئەوەی بۆنێکی بە سەردا چوبێ . تێبــ ــ لە کوردەوارێدا وا دەزانن کە منداڵی ساوا لەبەر ئەوەی زۆر ناسکە ، بۆنی توندی صابون و عەتر و ... ئەو جۆرە شتانە کاری لێ دەکا و نەخۆشی دەخا . :: ئەیەڕۆ کچێ نیزیکی منداڵەکە نەکەوی بۆنی لاوانتەت لێدێ و منداڵەکەم بە بۆن دەکەوێ .

**بەبوك‌بردن** ــ ( مصدر. متد.) ، ( کذ. ) جنێوە و کەسێکی ئەم قسەیەی پێ‌دەگوترێ وەکو پێی بڵێن : ( ژنە و بە مێردی دەدەن ) وایە .

**بەبە** ــ ( نا.) منداڵی ساوا . تێبــ ئەم ووشە لە زمانی منداڵەوە هاتوە کە بە هاوچەشنێکی خۆی دەڵی و گەورەش وەرێ‌گرتوە و بە منداڵی دەڵێتەوە و بۆ لاواندنەوە و ژێرکردنیش بەکاری دێنێ . ★ بەبەکە . ( سند. ) بەبلە .

**بەبەرەوەهەبون** ــ [ بە/١١ + ٢ــ بەر + ٣ــ ئەوە/٢ + هەبون ] ، ( مصدر. لا.) جێگاهەبون بۆ ئیشێك بۆ شتێك ، ماوەهەبون بۆ کردنی کارێ . :: بۆچێ پەلەتانە ، هێشتا شەو زۆری بەبەرەوەیە . نەختێکی دیکەش دیوارەکە بکێشنە پێش بۆ حەوشە زۆری بەبەرەوە هەیە . زۆر

تەواو کورت بۆن هیچیان بەبەرەوە نیـە .

**بەبەکە** ـ [ بەبە + ١ ـ ئەکە ] ، ( نت.) تم : بەبە .

**بەپشت** ـ [ بە/٨ + پشـت ] ، ( صت.) ، ( مک.) حاڵی بەلەگەنمێکی پڕ دانەچێنـدرابێ بەڵام خـۆی لێکدابێتەوە و جێگای بەتاڵی تێـدا نەبیندرێ .

**بەپێ** ـ ( صت.) ، ( مک.) حـاڵی ئەوکەسەی لە ڕێڕۆینا خێرابێ ، خۆش دەڕوا . ★ ( سن. هو. ) بەلەپا . قۆچاغ . بەلەبێ .

**بەپێیفیلان** ـ ( کن.) زۆروزەبەند، ئێکجار زۆر .

**بەپیرەوەچۆن** ـ [ ؟ ]، (مصت. مت.) ١ـ بۆ بەخێرهاتن کردنی کەسێ لـە مـاڵ یا لـە شارچونـەدەرەوە ٢ـ ( مج.) دەگەڵ کارێ یا مەسەلەیـێ بـە خـۆشێ ڕۆبـەڕۆبۆن و پەسندکردنی . :: خەڵکی شار تـا تاسلۆجە بەپیریەوە چۆن . خەڵـك ئێستا بەپێر کتێبی کوردییەوە دەچن . ★ پێشوازکردن . بەرەوپێرچۆن . ( جن.) پێشوازکردە .

**بەپیرەوەهاتن** ـ ( مصت. لا. ) تم: بەپیرەوەچۆن . :: خەڵکی سلەیمانێ تا دۆزخورماتۆ بەپێر مەیتی شـێخ لەتیفەوە هاتبۆن . تێب ـ أ) جیاوازێ ئەمەیان دەگەڵ ( بەپیرەوەچۆن ) هەر ئەوەندەیە کە ئەمەیان یەکێك دەیلێ خۆی دەگـەڵ ئەو کەسـە بێ کـە پێشوازێ لێ کرابێ ، بەڵام ئەویتـر کەسێك دەیلێ خەبەرەکە بکێڕێتەوە. ب) لە هەردۆکیاندا ، پاش ( بەپێر ) یا ناوی کەسێ یا زەمێرێك دێت .

**بەتاك** ـ ( صت. ) ، ( کعر.) تم : ئاواڵـە/١ ★ ( بـک.) فـەکرێ . ( جن.) وا .

**بەتاڵ** ـ [ عا.] ، ( صت.) ١ ـ حاڵی دەفر یا هەر شتێکی دیـکەی بۆ ئەوە دروستکرابێ لە لاوە شتێکی تێبکرێ ( بۆ هەڵگرتن یا گوازتنەوە) و هێچی تێدانەبێ . :: قاپی بەتاڵ . جەواڵەکە بەتاڵە . ★ خاڵی (عا.) ، ( بک.) ڤالا . // پڕ . ٢ـ حاڵی خانۆ یا ژۆرێکی کەسی تێدانەبێ و بـۆ ئەوە دەسبدا ماڵێکی بچێتە نـاو تێیدا دانیشێ . :: بابزانین ئەم ماڵە ژۆری بەتاڵیان هەیە بە کرێی بدەن . هەر لەم گوزەرە چوار دۆکانی بەتاڵ هەیە . ★ ( مک.) چۆل . ( کعر.) چۆڵ . ( هو.) واق . (سن.) ئاواق. ٣ـ (مج.) ئادەمیزادێکی ئاقڵی بـە شـت نەشـکێ و لـەکاران سـەرەودەرنەکا . :: تەماشـای تەڵافەتی مەکەن هەر زۆر بەتاڵە . ٤ـ ( مج. ) کتێـب یـا ووتـار و نوسراوێکی ( بێر )ێکی دەرنەخا و مەعنایەك بە دەستەوە نەدا ، تەنیا ووشـە بێ و ڕێزکرابێ . :: ئـەم مەقالەیە چەنـدە دۆرودرێژە کەچێ بەتاڵە . ٥ ـ ناتەواوێ چەشنەکارێك کە ڕێ و شوێن و مەرجی تایبەتییان بۆ داندرابێ و ئـەگەر یـەکێ لـە مەرجەکانی کەل بـۆ هەمـۆ کارەکە زەدەداربێ . □ «هـەرچەند نوێژ دەکەم نوێژم بەتاڵـە + ئەلحەمد دەخوێنم تۆم لە خەیاڵە » (فۆلکلۆر) ـ یەکێك لە مەرجەکانی نوێژ ئەوەیە

کە دەبێ نوێژکەر مێشکی خۆی بۆ یادی خوا تەرخان بکا و لە کاتی نوێژا بیر لە هیچیتر نەکاتەوە ــ « کە زۆر هات قەواڵە بەتاڵە » (قابالە) بۆ ئەوەیە بە بەڵگە و دەلیل نیشانبدات خاوەن ملك کێیە، بەڵام کە کار هاتە سەر «زۆر» دەلیل و مەنتیق دەچنەوە ماڵی خۆیان بۆیەش «قەواڵە» کە «بەتاڵ»ە **بەتالآیی ــ** [ عا. کو. ] ، [ بەتاڵ + ئایی/١ ] ، (نت.) تە : بۆشایی/٢ و ٣ .

**بەتاڵبوون ــ** [عا. کو.] ، (مص. لا.) ١ــ هیچ دە دەفردانەمان :: قاوورمەمان نەماوە کوپەکە بەتاڵبوە. هەردوو شووشەکە بەتاڵبوون ئەو هەمویان چوون خواردوتەوە . ٢ــ چۆڵبونی خانو و هەر شتێکی لەم بابەتە . :: ژوورەکە سەری مانگ بەتاڵ دەبێ . ٣ــ هیچ نەزانین ، ئاقڵبەشت نەشکان . :: پەکوو لەو کابرایە ! نازانم ئینسان چۆن وا بەتاڵ دەبێ . ٤ــ بێ ناوەرۆکبونی کتێب و نوسراو . . تێب ــ پێویستە وورد ببینەوە کە مەصدەری (بون) لەم ووشەیەدا لەوانەیە بۆ زەمانی (حاڵ) و ( مضارع ) بێ .

**بەتاڵبێ ــ** [ عا. کو.] ، ( نت. ) پیاوێك کە لە جێگایەك بێ و هیچ ئیش و کارێك ڕانەپەڕێنێ . :: ئەی ئەو هەموو بەتاڵ پێیانە چن لە دیوەخان ؟

**بەتاڵکردن ــ** ( مصت. مت. ) ١ــ هیچ شتێ دە دەفرێکدانەهێشتن . :: شووشەکانیان هەموو بەتاڵکردبوو ، دەمی بە جامی دۆیەکەوە نا تا بەتاڵی نەکرد دەمی هەڵنەگرت . ٢ــ چوونەدەر لە خانو ، ژوور ، . . . و چۆڵکردنیان. :: ئەرێ ئەم خانوەمان کەی بۆ بەتاڵدەکەی ؟ ژوورەکەم هەر بەتاڵنەکرد .

**بەتاڵ و حەتاڵ ــ** [ = عا : بطّال و عطّال ] ، (صت.) ١ــ حاڵی کەسێکی هیچ پیشەیەکی نەبێ . :: زۆر هەتا ئێوارێ بەتاڵوحەتاڵ دەسوڕێتەوە. ٢ــ حاڵی دەفرێکی هیچی تێدانەبێ. :: گۆزەکە بەتاڵوحەتاڵە چۆڕێك ئاو چیە تێدا نیە .

**بەتانی ــ** [ = عا : بطّانیة ] ، (نا.) ، (کعر.) پێخەفێکی فەڕەنگییە بۆ خەوتن لە باتی لێفەی کوردەواری بە خۆیدا دەدەن . ★ ( کئێر. ) پەتو، (مکـ.) عەدیاڵ. (سن.) ئەدیاڵ، ئەبیاڵ .

**بەترپێرار ــ** [ بەتر + پێرار ] ، (نت. ، بنت.) تە : بەسرپێرار. هس: بەترپێرێ (تە : تێب.) .

**بەترپێرێ ــ** [بەتر + پێرێ] ، (نت. ، بنت.) تە : بەسرپێرێ. تێب ــ من وای بۆ دەچم کە ( بەسر ) لە (بەتر = بەرتر) بە مانای پێشتر کەوتبێتەوە و ئێستاکێ بە تەواوی برەوی سەندوە و لە مەڵبەندەکانی لەهجەی ناوەندی زمانی کوردی ئەوانەی (بەتر) بەکاردێنن زۆر نین، بەڵام لە لەهجەی باکورێدا وەکو خۆی ماوە . :: بەترپێر ، بەترپێرار ( تە : کف . ــ ل ٨٩/٨٨ و ژابا ، ل ــ ٨٧ ) و لە مەڵبەندی گەرمیانی کوردستانی عێراق ( بەسترپێرێ ، بەسترپێرار )یش دەوێژرێت .

**بەتفەڕ ــ** (صت.) تم : بەدفەڕ .
**بەتلاندن ــ** [عا. کو.] ، (مصت. مت.) ، (مک.) لەناودان ، لەناوبردن ، رایەکردن ، لەدەستخۆدەرکردن . :: نەچێ بێبەتلێنی ، لە مێژە بەتلاندوومە . چابێ بەتلانێت ئەو بارگێنە لاتە کەلکی هیچی پێوەنەبوو .
**بەتوێکڵ ــ** (صت.) حاڵی قسەیەکی سەرەڕای مانای ئاشکرای ، مانایەك یا چەند مانای دیکەشی تێدا بخوێندرێتەوە . تێب ــ زۆر جاران ئەو مانا نهێنییانە ، لاتاو یا جنێوێکی سوکەڵە دەبن کە بۆ گاڵتەوگەپ و پێکەنین دەگوترێن .
**بەتۆ ــ** [ بە/٨ + تۆ (تۆم) ] ، (صت.) ، (مک.) حاڵی ڕەپستەیەکی چڕوپڕ بێتە بەرچاو .
**بەتەقەکەوتن ــ** ( مصت. لا. ) ، ( کعر. ) بەشەرمدا کەوتن و دەسهەڵگرتن لە کارێ . بەخۆداشکانەوە لە شتێ یا لە کارێ ، وازهێنان .
**بەتەگە ــ** [ بە/٨ + تەگە ] ، (صت.) ، (مک.) حاڵی بزنێکی مەیلی جوتبوونی دەگەڵ (نێرێ) بزوتبێ .
**بەتەڵب ــ** [کو. عا.] ، [بە/٨ + تەڵب ] ، (صت.) حاڵی ئەسپێکی هەوەسی جوتبوونی دەگەڵ مایین هاتبێتە سەر .
**بەتەما ــ** [ کو. عا ] ، [بە/٨ + تەما ( تەماح ) ] ، ( صت. ) حاڵی کەسێکی کە چاوی لەوەبێ یەکێتر لەباتی ئەو ئیشێك بکا . چاوەنواڕ ئومێدەوار :: بە تەمای من مەبن ئیمشەو نایەمەوە . □ « بەتەمای فرۆی مانگا زەردە » ، « بەتەمای نیسکێ لە ئیمانی مەگەڕێ » ( خا ، پەند ، ل ــ ١٠١ ) .
**بەتەماح ــ** [ کو. عا.] ، [بە/٨ + تەماح ( طمع ) ] ، ( صت. ) تەماحکار .
**بەتەنگەوەبوون ــ** [ بە/٨ + تەنگ + ٣ــ ئەوە/١ ] ، ( مصت. لا. ) خەمڵەشتێخواردن . ئیهتیمام بەکار و مەسەلەیێ یا کەسێدان . دەربەست بوون. :: خۆی دەربازدەکا بە تەنگەوە مەبن . ئەوە چیە هێندە بۆی بەتەنگەوەن .
**بەتەوسەوە ــ** [ بە/٨ + تەوس + ٣ــ ئەوە/١] ، (بنت.) قسەکردن بە شێوەیەکی وا کە بۆنی گاڵتە پێکردن و بەسوكتەماشاکردن و تانوتی تێدابەدیبکرێت .
**بەتیسك ــ** (صت.) ، (مک.) حاڵی مەڕێکی تیسکی خوری درێژ بێ بەڵام شاش بێ .
**بەتین ــ** (صت.) ١ــ گەرم :: ئەم سۆبەیە زۆر بە تینە ، هەتاوی بەغدا هێندە بە تینە گۆشت دەبرژێنێ . ٢ــ (مج.) بەهێز . بەقەوەت .
**بەجەرگ ــ** (صت.) پیاوی ئازا و نەترس :: کابرایەکی بەجەرگە لە پەنجا سواران ناگەڕێتەوە .
**بەجەرگی ــ** (حمص.) ئازایەتی ، چاونەترسی .
**بەجێ ــ** (صت.) حاڵی کارێکی بە شیوەیێکی ڕێكوپێك ئەنجامدرابێ ، بەو جۆرەی پێویستە ، بەچەشنێکی لێوەشاوە . :: زۆر بەجێیە ئەگەر بچن لە خەستەخانە سەرێکی

لێبدەن .

**بەجێگەهاوردن ـ** (مصد. مت.) ، (سن .) تم : بەجێ گەیاندن .

**بەجێگەیاندن ـ** ( مصد. مت. ) ئـەنجامدان ، جێبـەجێکردن ، پێکهێنان :: نیەتمە دوو ڕەکات نوێژی ئـەم سـبەینەی حـازری بەجێدەگەیێنم . پەیمانێکی دابوو بە جێینەگەیـاند . ★ ( سـن. ) بە جێگەهاوردن ، (مک.) بە جێ هێنان، (سیم .) بەجێهاتین .

**بەجێمان ـ** (مصـد . لا .) ١ـ دواکەوتنی کەسێ لە هاوڕێکانی :: کوڕینە توزێ یـەواش بڕۆن مامـە حەمە هەر بەجێدەمێنێ. ٢ـمانەوەی شتێ یا کەسـێ لە شـوێنێك :: قەڵەمـەکەم لەسـەر مێزەکە بـە جێماوە . ئێمە هاتینەوە و خەسرەو لەوێ بەجێما .

**بەجێهاتن ـ** (مصد. لا.) ١ـ وەدێ هاتنی ئاوات و مەبەست و ئارەزوو. ٢ـ جێبەجێ بوونی کارێك .

**بەجێهاتین ـ** ( مصد. مت. ) ، (سیم.) تم : بەجێگەیاندن .

**بەجێهێشتن ـ** (مصد. مت.) ، (مک.) ١ـ تەرككردنی شـتێك یـا کەسـێك لـە شوێنێك و دەگـەڵ خۆنەبردنی . :: خەسرەومان بەجێ هێشت ئاگای لە ماڵێ بێ.میوانەکان بەجێنەهێڵی ، جانتاکەی لە ئوتێل بەجێ هێشتبوو . ٢ـ تێپەڕین لـە شـوێنێ ، دێـەك و ... و .. خستنەپشتسـەرێ :: کەرکووکمان بەجێهێشت ئینجا بیرمان کەوتەوە کە دەبوو بچین کەباب بخۆین ، ئەهوو چەنـد لـەمێژە ( قەمتـەرە )مان بەجێهێشتوە .

**بەجێهێنان ـ** ( مصد. مت. ) ، (مک.) تم : بەجێگەیاندن .

**بەچ ـ** (نا.) تم : بەچە . هس : وەچ تێبـ ـ بەلای منەوە هەر ئـەم (بەچ)ەیە کە ووشـەی ( بچـوك) و وەچەکانی لێپێکهاتوە .

**بەچاوەوەبوون ـ** (مصد.) لە چاوی پیسـەوە توشـی ناڕەحەتێهاتن . کارکردنی (چاوزار) لە کەسێ . ● « دوم ! بـەچاومەوەبێ » ، (مک.) ڕستەیەکە بۆ ترساندن یا توڕەکردنی کەسێ دەگوترێ . :: دایکم ! ئەم منداڵـە هێنـدە مـەگێڕە بـا خوڵانەخواستە بە چاوەوە نەبێ. ★ بە چاوی پیسەوە بوون .

**بەچاوەوەکردن ـ** ( مصد. مت.) بەهێزی ( چاوەزار) کەسێك توشی ناڕەحـەتێ یا زیـانکردن . :: هێنـدە کوتی : گوڵـدانەکە جوانـە جوانە! تا بە چاوەوەی کرد و شکا.

**بەچاوی‌پیشەوەبوون ـ** ( مصد . لا. ) تم : بەچاوەوەبوون .

**بەچکە ـ** [ بەچ + کە ] ، ( نت.) ١ـ تـم : بەچـە/١ و ٢ . ٢ـ جووجەڵەی باڵندە و پچووکی هێندێ گیانداران . :: بەچکەچـوولەکە ، بەچکەصەگ ، بەچکەگورگ . ★ بێچوو .

**بەچنگ ـ** ( صت.) ١ـ پیـاوێ کە بۆ پەیداکردنی بژێـوێ خـۆی ماندووبوون نەزانێ ، وەکـوو دەڵێن لـە بەردی ڕەق نـان پەیـداکا . ٢ـ کوڵنەدەر .

**بەچە ـ** [ پە : قەچەك ، بەچەك ]، [ بەچ + ٥ـ ئـە/١ ] ، (نـت.) ١ـ منداڵی ئادەمیزاد . ٢ـ تم : بەچكە /٢ . ★ بەچكە . (لو.) بەچ ، بەچە. ( بك. ، سنە. ، فیـ. ، هو. ، زا . ) زازۆ ، زازولە . (با.) بچۆك . ٣ـ كوڕێكی هێشتا تۆكی لێنەهاتبێ . ★ لۆسكە ، هەتیو .

**بەچەباز ـ** [ بەچە/٣ + ٣ـ باز /١ ] ، ( نفا. ، صفا.) ئەو كەسەی ئالودەی جوتبون دەگەڵ منداڵـی بێتۆك بێ . ★ هەتیوباز ، منداڵباز.

**بەچەبازێ ـ** ( حمصـ.) ئەنجامی كاری ئەو كەسەی حەز لە لۆسـكە دەكات . ★ هەتیوبازێ .

**بەچەك ـ** ( صـت.) كەسێكی تفەنگ، دەمانچە و . . . و . . . هەڵگرتبێ . :: سوارەكان بەچەكن یان نا. هەزار سواری بەچەكیان سازداوە . ★ چەكدار .

**بەحەشت ـ** ( نا.) ، (مك.) تم : بەهەشت .

**١ـ بەخت ـ** [ پە : بەخت ] ١ـ هێزێكی نادیارە ، ئادەمیزاد لە زۆر كۆنەوە بۆ خۆی ڕەچاوكردوە و لای وایە هــەر چـاكە و خراپەیـەكی بەسەری بە هۆی ئەو هێزەیـە . ● **« بەختی‌نوستوە »** ، ( كنـ.) هەمیشە تێدەشكێ و دە كاراندا سەرناكەوێ. **« بەختی وەك صەگ دەوەڕێ »** ، ( كنـ.) هەر كارێكی دەستی بداتێ ، سەردەكەوێ . **«بەختی بەستراوە»**، ( كنـ.) بە كچێـــك دەگوتـــرێ كە خوازبێنی‌كەری نەبێ . □ « دەچمە سەر سوڵتانی ، چلدانەی دەگرمەوە، بەختی خۆم و چاو جوانێ ، بە تاقێ دەكەمەوە » ( فۆلكلۆر.) تێبـ ـ ئەم وشەیە لە ( ئاوێستا )دا بە شێوەی ناوی مەفعوڵ ( بەختە ) بە مانای ( بەشدراو ، بڕیار دراو) هاتوە و لە زمانی سانسكریتیدا بـە شـكڵ ( پەهەكعا ) بە مانای شتێكی بەخشراو لە هەندێ شوێنی ئاوێستاشدا شكڵی ( بەغە ، بەغا )ی بە مانای ( بەش ) وەرگرتوە . ( تم : پە ، یگد ، ج ٢ ، ل ـ ١١٥ و معین ، بورهان ، جا ، ل ـ ٢٣٩ ) ٢ـ ( مجـ.) پەنا ، داڵدە، تێبـ ـ یەكێك كە بیەوێ كەسێكی دێ لە كارێك یا ڕوداوێكدا كۆمەگی پێبكا یا بەلایەكی لێوەدوڕخـــا ، پەنـا دەباتە بەر بەختی ئـەو كەسـە . « دەغیلی بەختتبم . » ، « خـۆم خستە بەختی‌تۆ و تۆش كەیفی خۆتە» ڕستەیێكن كە لەو جـورە كاتانـەدا دەگوترێن ، جاروبارەش پەنا دەبرێتە بەر بەختی كەسێكی‌تر لەلای كابرای مەبەست خۆشەویست بێ . « خۆم خستە بەختی بابت » ئەمە هەمـوی لەوەڕا دێت كە ئینسان ( بەخـت )ی وەكو هێزێكی ئاگادار ، بۆ خـۆی داناوە كە دەتوانێ هەمو شتێـــكی بەسەربێنێ ، جا بۆ ئەوەی (بەخت)ی خۆی لە خۆی نەتۆرێنێ لەسەر خۆی بە پێویست دەزانێ ئەگەر یەكێـك خۆی خستە بەختیەوە ، دەبـــێ ئیشەكەی هەرچێكی بێت هەوڵبدا بۆی جێبەجێ‌كات . ★ ئیقباڵ ، تالـع ، تاڵە ، چـارە ، شـانس ، نسیب ، نكێن . ( بك.) سعوّد .

**٢ـ بەخـت ـ** ( نمـصـ.) تـم :

بەختکردن . تێب ـ أ) بەلای منەوە ئەم ووشەیە و ( بەخشین ) و ( بەشینەوە ) و (پەخش) و (بەش) هەمۆیان لە سەرچاوەیەکەوە کەوتۆنەتەوە و لە ڕێگای گۆڕان و گەشەکردنا بە قۆناغی زمانی ( پەهلەوی )دا تێپەڕیون کە قۆناغی پێش قۆناغی ئیستای زمانی کوردیە و لێك ترازاون و هەر لکەی ڕچەی تایبەتی خۆی گرتۆتە پێش و مانای جۆربەجۆریان هێناوەتە گۆڕ . ئەم ووشەیە و ( ١ـ بەخت ) لە سیفەی مەفعولی ئاوێستاییدا ( بەختە ) ماونەوە و تۆزێ گۆڕانیان بەسەردا هاتوە و ماناکەشیان دژوەستاوە . ب) ئەم ووشەیە بە تەنیایی لە زمانی کوردیدا دەکارناکرێ و بە هۆی فیعلی مساعدی ( کردن ) مەصدەری (بەختکردن) لیداتاشراوە .

**بەختڕەش ـ** [ ١ـ بەخت/١ + ڕەش ] ، ( صت. ) ١ـ تم : بەدبەخت .

□« ڕەشە بەختم بە خەلك صەگ دەوەڕێ »
«ڕەشەمی بۆ ، بە من پشیلە وەڕی»
( پیرەمێرد )

٢ـ ئافرەتێکی شوی کردبێ و لە ماڵ و مێردی نارازی بێ . □ «دەك بەخت ڕەش خۆی ... بۆ مێردێ کردی . » .

**بەختکردن ـ** [ ٢ـ بەخت + کردن ]، ( مصت. مت. ) لەدەستدەرکردنی شتێك ، ماڵی خۆ بە بێ جێ تەخشان پەخشان کردن ، دۆڕاندن لە قومارا . :: ئەو هەمۆ ماڵەی بۆ بەجێ مابۆ ساڵێ وەرنەسوڕایەوە هەمۆی بەختکرد . هەزار دیناری بە پۆکەر بەختکرد . **خۆبەختکردن ـ** ( مصت. لا. ) گیانی خۆدۆڕاندن ، سەر لە ڕێگای شتێکادانان . مردن لە پێناو نەتەوە و نیشتمان یا بیروباوەڕدا .

**بەختوەرگەڕان ـ** [ ١ـ بەخت/١ + وەرگەڕان ] ، (مصت. لا.) ، ( مک. ) چەواشەبۆنی ئەحواڵی کەسێك لە باشیڕا بۆ خراپی . :: دەك ڕەببی تەخت و بەختی وەرگەڕێ .

**بەختە ـ** (نا.) ١ـ « بەرخەنێرێکی لە دۆ ساڵان گەورەتر بێ . » ( جێد ، ل ـ ١٤ ) . ٢ـ « بەران و سابرێن » ( خا ، ب ١ ، ل ـ ١٤٢). ٣ـ « بەران ، خرت ، سابرێن » ( معر. کشت ، ب ١ ، ل ـ ٤٢ ). ٤ـ ( مک.) بەرانی خەسێنراو .

**بەختەباران ـ** [ ١ـ بەخت/١ + ٣ـ ئە/٢ + باران/١ ] ، ( نت. ) مانگی ( مایس ) ، دەکەوێتە نێوانی ( نیسان ) و (حوزەیران) ، سی و یەك ڕۆژە . سێیەم مانگی بەهار . تێب ـ بۆیە ئەم ناوەی لێنداوە چونکو خۆی لەو مانگانە نیە بە شێوەیێکی ئاسایی بارانی تێدابباری ، بەلام ڕێی دەچێتێ بباری و ڕێشی تێدەچێ نەباری ، بارین و نەبارین بە بەختە .

**بەختەبەران ـ** [١ ـ بەخت /١ + ٣ ـ ئە/٢ + بەران ] ، ( نت. ) بەرخێکە لە دۆ ساڵ گەورەتر بێ و خاوەنی هەڵیبژاردبێ لە دوارۆژا ببێتە ( بەران ) ، بەلام هێشتا

نەزانێ لە کاتی خۆیـا بۆ (بـەران) دەستدەدا یان نا .

**بەختەوەر** ــ [ ١ــ بەخت/١ و ٢ + ئــەوەر ] ، ( صــت.) ، (مـکـ.) خاوەن‌بەخت ، کەسێ بەختی هەبێ. :: منداڵێ بەختەوەریە. ★ (کعر.) بەختیار .

**بەختەوەرێ** ــ [ بەختــەوەر + ٢ــ ئێ ] ، (حمصـ.) تە : بەختیارێ /١ .

**بەختیار** ــ [ ١ــ بەخت / ١ + یار ] ، (صت.) ١ــ تە : بەختەوەر :: خۆی بە بەختیار دەزانێ . ٢ــ ناوە بۆ نێرێنە .

**بەختیارێ** ــ [ بەختیار + ٢ــ ئــێ ] ، ( حمــصـ.) ١ــ حــاڵەتی کەسێکی خاوەن‌بەخت و بەختەوەر. :: بەختیارێ لەمە زیاتر چۆن دەبێ؟ ٢ــ نــاوی عەشیرەتێــکی گەورە و ئازایە ، عەشیرەتی لوڕی گەورە . تێبـ ــ گومانم لەوەدا نیە کە نــاوی ئەم عەشیرەتە هیــچ پەیوەندێــکی دەگەڵ(بەخت)و(یار)دا نیە کە ووشـەی ( بەختیار )ی ئیمڕۆ هەیەتی و باش دەزانین ووشـەیێکی تازەیە . بـەڵام بە دوری نازانم کە ئەم نــاوە لــە ( ئەپاخذیذرە ، ئەپــاختــەرە )ی ئاوێستایێ بە مانــای ( باکـور = شیمال ) کە لە زمانی‌پەهلەوی‌دا بۆتە ( ئەپاختەرە ) کەوتبێتەوە . ( تــە : معین ، بورهان ، جا ، ل ــ ٢٠٤).

**بەخزمەت** ــ [بە/٨ + خزمەت] ، ( صت.) ١ــ حاڵی کەسێــکی لــە پیــاوەتێ خۆیــەوە مشــوری خەڵك بخوا و بە خەمیانەوە بــێ و لە ئیش و کاریاندا یارمەتییان‌بدا . ٢ــ کەسێکی بە ڕۆخۆشێ مێوانداری ئەو کەسانە بکا کە ڕۆ دەکەنە ماڵی . ئەوەی زۆرخزمەتی میوان دەکا . ★ خزمەتگوزار .

**بەخشین** ــ ١ــ ( مصت. مت.) لێبوردن، لێ‌خۆش‌بون، عافوکردن. :: خودا بێ‌بەخشێ . ئەوجارەش دەت‌بەخشێن جارێکی‌تر شتــی وا نەکەی . ٢ــ (مصت. لا.) شتێك بە خۆڕایێ و بە بێ پــارە دان بــە کەسێك . :: جوامێر ئەسپەکــەی بەخشیــوە . **پێ‌بەخشیــن** ــ ١ــ ( مصت. مت.) لەبەر خاتری یەکێك یا شتێك لە کەسێ خۆش‌بون . :: بڕۆ ئەوا بە گــوڕی پێشەوامــان بەخشــێ . بــەم برادەرانــەت دەبەخشین . ئەو جارەش بە ئێمەی ببەخشە . ٢ــ (مصت. لا.) ، أ) تە : بەخشین/٢ . ب) خۆش‌بون لە قەرز :: ئەوەی ماوە پێت‌دەبەخشــم . کوڵێ پارەی لابۆ هەموی پێ‌بەخشی.

**بەخشینەوە** ــ [ بەخشین + ٢ــ ئەوە /١ ] ، ( مصت. مت.) ، (مکـ.) تە : بەشینەوە .

**بەخوێ‌کردن** ــ (مصت. مت.) ، (سن.) تە : بەخێوکردن .

**بەخۆداهــاتن** ــ ( مصــت. لا.) ١ــ پێگەیشتن و هەڵدانی گیاندارێکی زیندو ، گەورەبون و قەڵەوبونی . (عا.) نمو. ٢ــ دەست‌بەخۆداهێنان، خۆئارایش‌دان ، خۆجوان‌کردن .

**بەخۆفشــین** ــ (مصتــ. لا.) ، ( مکـ. ) شانازێ بەخۆوەکردن ، بــە دەســت و باسکی خۆنازیــن . ::

ڕۆستەمی زاڵیتیش وا بە خۆی نەفشیوە.

**بەخۆنازین ــ** ( مصت. لا.) لەخۆڕازیبون ، لەخۆبایی‌بون .

**بەخۆوە ــ** (صت.) حاڵی ئینسانی قەڵەوی تێکسمڕاو . ★ تەنومەند.

**بەخەبەر ــ** [ کو. عا.] ، (صت.)، (مک.) ١ــ کەسێکی لە ناو نوێندا بێ بەڵام نەخەوتبێ ، جا نوستبێ و هەڵستابێت یا هێشتا خەوی لێ‌نەکەوتبێ :: دوێنێ شەوێ سەعات بۆ بە چواریش هەر بە خەبەربوم . ٢ــ موتڵەقی کەسێکی نەنوستبێ :: بزانە ئاغا بەخەبەرە یا نوستوە . ★ (سنە.) خەوەر ، بێدا ر. (بک.) هشیار. (جنە.) بیار .

**بەخەم‌کردن ــ** (مصت. متـ.) ، ( کنە.) تم : بەخێوکردن .

**بەخێرگەڕان ــ** ( مصت. لا. ) گۆڕانی کارێك یا ڕوداوێك کە لەسەرەتاوە چاوەنوارێ چاکەی لێ نەکرێ ، یا هەر لە خۆیەوە دیار بێ کە خراپە، بەڵام کاتێ ئەنجامەکەی دەردەکەوێ ئاشکرا دەبێ کە باش بوە :: ئەو گرتنەی بۆ بە خێر گەڕا. ★ (مک.) وەخێرگەڕان .

**بەخێرهاتن‌کردن ــ** ( مصت. متـ.) خۆشی و بێشی‌کردن دەگەڵ میوان یا هەر کەسێکی‌تر کە دێتە ماڵێ یا شارێك و کەیف‌خۆشی پێشان‌دان لە هاتنی . تێب ــ لەم کاتانەدا ڕستەی : بەخێربێن ، بەخێر هاتن ، یا خوا بە خێر بێن ، سەر چاوان هاتن بە میوانەکە دەگوترێ. ژنانی کورد لەم بابەتەوە کەس دەسکیان لەدۆ ناکا . ★ بەخێرهێنان .

**بەخێرهێنان ــ** ( مصت. مت.) تم : بەخێرهاتن‌کردن :: کچم هەڵسە بڕۆ میوانەکان بە خێر بێتە .

**بەخێوکردن ــ** ( مصت. متـ.) ١ــ گەورەکردن و پێگەیاندنی منداڵ ، لە لایەن‌دایك ، بابیەوە . □«کوڕم بەخێوکرد بە نوقڵی شاری+ڕەزاشا گرتی و کردیەئیجباری » (فۆلکلۆر). ٢ ــ هەڵگرتنەوەی منداڵێکی فڕێ‌درابێ یا دۆزینەوەی منداڵێکی ونبوبی یا کەسی نەبێ و گەورەکردن و پێگەیاندنی :: هەتیوێکی بێ دایك و باب بۆ خات نازدار بەخێوی‌کرد . ئەوەتا ئەمەگی دەداتەوە . مام بارام بەمەلۆتکەیێ لە مزگەوت دیتبۆیەوە و بەخێوی‌کردوە . ٣ــ ڕاگرتن و خاواندنەوەی گیاندارانی دیکە . :: خواڵێخۆش‌بو نەجمەددین مەلا پشیلەی بەخێودەکردن ، لە سیتەك تۆتکە تانجیەکم بەخێوکردبو . ٤ــ ئاگاداری‌کردنی کشت‌وکاڵ و گژوگیا و پێگەیاندنیان :: کاك ئیحسانی کەرکوك هەر خەرێك‌بو گوڵی بەخێودەکرد . ★ ( سنە. ) بەخوێ‌کردن . ( بک.) خودێ‌کرن . ( سیم. ، مک.) پەروەردەکردن .

**بەد ــ** [ ست : ڤەزدەنگه ، په : ڤەت . ڤەتەك ] ، ( صت.) ، ( بک. ، نو. ، جنە .) ١ــ حاڵی کەسێك یا شتێکی چاك‌نەبێ . □« بەد نەبێ بەدخانە بە یاد ناکا » . ٢ــ حاڵی کەسێکی ئەو صفەتەی تێدا نەبێ کە

پێویستە ببێ . :: برایەکی بەدی هەیە ( یانی ئەو کەسە نیە کە ڕێ و شوێنی برایەتی بەجێ‌دەگەیێنێ . )
٣ـ ئادەمیزادی شەڕانێ کە خەزی لە خراپەکردن بێ . :: منداڵێکی بەدە خوا بیباتەوە و ڕزگارمان بێ .
٤ـ دەچێتە سەر گەلێ ووشـە و دەگەلیان تەرکیب‌دەبێ و دەیانکاتە ( صفەت ) :: بەدئەدا ، بەدپێلە ، بەدخۆ ، بەدڕەووشت . تێب ـ لە زمانی پەهلەویدا ( ڤەتـەك ) بۆ ئینسان و ( ڤەت ) بۆ شتی دی دەکارکراوە .

**بەدئەدا** ـ [ بەد /١ + ١ـ ئەدا /١ ] ، ( صت. ) ، (مک.) خـالی کەسێکی ڕەوەشت و ڕەفتـاری نەچێتە دلی خەلکەوە .

**بەدانکەوتن** ـ ( مصت. لا. ) ١ـ نەخۆش‌کەوتنی ئاژەڵ و پاتال لەبەر زۆرخواردن. (مج.) نەخۆش‌کەوتنی ئینسان لە ئەنجامی زۆرخۆریدا .

**بەدئەسڵ** ـ [ کو . عا. ] ، ( صت.) تم : بەدڕەسەن .

**بەدبەخت** ـ [ پە : ڤەت‌بەخت] ، [ بەد/٤ + ١ـ بەخت /١ ]( صت.) ئەو کەسەی دەست بۆ هەر کارێك دەبا بە دەستیەوە نایەت ، کەسێکی بەختیار نەبێ . ★ ( بک.) بێ‌بەخت. چارەڕەش بێ‌ئیقبـاڵ ، بێ‌تالـع ، بێ‌شانس .

**بەدبەختی** ـ ( حمص.) ئەنجامـی بێ‌ئیقبالی .

**بەدبێژ** ـ ( صت.) تم : بەدگۆ .

**بەدبێن** ـ ( صت.) ئەوکەسـەی عاقیبەتی هەمۆ کارێکی بە خـراپ دێتە بەرچاو . ئەوەی بـە چـاوی ناهومێدێ دەڕوانێتە دنیا .

**بەدبینێ** ـ ( حمص.) ئەنجـامی کارێ یا هەمۆ کاران بە خراپ دیتن. بـە چـاویلکەی ڕەش تەمـاشـای دنیاکردن .

**بەدپەسند** ـ ( صت.) ، ( کئێر.) ١ـ کەسێکی بە هاسـانێ هەمـۆ شتێکی وەبـەر دڵنـەکەوێ . ٢ـ کەسێکی لە هەڵبژاردنی شتێ یـا کەسێ بێ‌سەلیقەبێ و شتی خراپ یا کەسێکی خراپ هەڵبژێرێـت . ★ ( سن.) بەدپەسەن .

**بەدپەسەن** ـ ( صت. ) ( سن.) تم : بەدپەسند .

**بەدتوخـم** ـ ( صـت.) ، تـم : بەدپەسند . بەدڕەسەن .

**بەدجسن** ـ ( صت.) ، ( مک.) تم : بەدڕەسەن .

**بەدجنـس** ـ ( صـت.) تـم : بەدڕەسەن .

**بەدچارە** ـ ( صت.) خـاوەنی دەموچاوی ناشیرین . ★ ( سن . ) بەدچێرە ، بەدسەکوت . ( مک. ) ناحەز ، ناشـیرن ، ( سـیمە. ) ناشیرین ، بەدفەساڵ ، بەددیمەن . ( جن.) بەدگل .

**بەدچێرە** ـ ( صت.) ، ( سـن .): بەدچارە .

**بەدحاڵ** ـ ( صـت.) کەسێـکی گوزەرانی ناخۆش‌بێ

**بەدحیساب** ـ [ کو. عا. ]،(صت.)، (کئێر.) ئینسانێکی لـە سـەودا و مامەلەدا سـەڕاست نـەبێ ، ئەو کەسەی قەرزی خەلك ناداتەوە .

**بەدحیسابی** ــ ( کو. عا. ) ، ( حمصـ.) ناڕاستی لە سەودادا ، **قەرزکوێری** .

**بەدخوا** ــ ( صت.) ، ( مک. ) تە : بەدخواز .

**بەدخواز** ــ ( صت.) ، ( کمر .) ئەو کەسەیە خراپەی خەڵکی دەوێ. ★ ( مک. ) بەدخوا . ( جذ.) بەدها.

**بەدخو** ــ ( صت. ) ، ( مک. ) ١ــ کەسێکی عادەتی خراپی هەبێ :: ئەرێ ئەو منداڵە بۆچی وا بەدخوە. ٢ــ یەکێکی ڕەفتاری دەگەڵ خەڵك باش نەبێ ★ بەدڕەووشت .

**بەدخۆبۆن** ــ ( مصت. لا.) ١ــ گۆڕانی ڕەووشت و خۆی کەسێ لە چاکەوە بۆ خراپە . :: ئەرێ خۆ جاران وا نەبۆ ئەوە بۆچی وا بەدخۆ بوە . // بەدخۆکردن . ٢ــ کەسێکی هەر لە ئەسلا توند و تیژ و بەدخۆبێ .

**بەدخۆکردن** ــ ( مصت. مت. )١ــ گۆڕینی ڕەووشت و خۆی کەسێك لە چاکیڕا بۆ خراپی . ٢ ــ یەکێك فێری ڕەووشتی خراپکردن . :: دادە گیان ژنی چاك بە منداڵەکەمان لێ بەدخۆ مەکە .

**بەدخۆیی** ــ (حمصـ.) ١ــ ئەنجامی کاری کەسێکی بەدخۆ ، ڕەووشتخراپی . ٢ــ ( مجـ. ) فێز ، تڕزلی .

**بەددیمەن** ــ ( صت.) تە : بەدچارە .

**بەدڕا** ــ ( صت.) کەسێکی ڕێگەی خراپەی گرتبێ ، کەسێکی بێڕوڕای چەوت و ناڕاستی هەبێ جا دەربارەی هەر شتێك بێ . تێب ــ کەرتی ( ڕا ) لەم ووشەیەدا یان بە مانای (ڕێگا)یە یا بە مانای (بیروڕا) .

**بەدڕایی** ــ ( حمصـ.) بە ڕێگەی خراپەدا ڕۆیشتن ، خاوەنی بیروڕای ( لە هەر بابەتێکەوە ) چەوتبۆن .

**بەدڕەتەوە** ــ [ بەد/٤ + ڕەتەوە ] ، ( صت.) ، (سذ.) تە : بەدڕەسەن .

**بەدڕەسەن** ــ ( صت.) هەر گیاندارێکی ئەسڵ و نەسەبی باش نەبێ . ★ بەدئەسڵ ، بەدجسن ، بەدجنس ، بەدتوخم ، بەدنەژاد ، بەدڕەتەوە ، ناڕەسەن ، نانەجێب .

**بەدڕەفتار** ــ ( صت.) ، ( مک.) کەسێکی شێوەی هەستان و دانیشتن و جوڵانەوەی دەگەڵ خەڵك باش نەبێ .

**بەدڕەفتاری** ــ ( حمصـ.) دەگەڵ خەڵکی باش نەبۆن ، خراپ جوڵانەوە دەگەڵ خەڵك .

**بەدرەقەکردن** ــ ( مصت. مت . ) بۆ ڕێزلێگرتن (// پێشوازکردن) ، بۆ پاراستن لە مەترسییان ، بۆ پێشاندانی ڕێگا ، دەگەڵ کەسێ ڕۆیشتن . تێب ــ أ ) من بۆم ساغنەبۆوە کە بنج و بناوانی ووشەی (بەدرەقە) چیە و لە کوێڕا هاتوە و داخوا ووشەیەکی کوردی پەتییە یا لە زمانێکی بێگانە خوازراوەتەوە . مامۆستا تۆفیق وەهبی ( تە : هبێد ــ ١٠) وەکو هێندێ ووشەی خوازراوەیتر هێچ نیشانەیەکی لەبەردەم ئەم ووشەیە

دانەناوە ، ئەمە وا دەگەیێنێ کە ئەوان ئەم ووشەیە بە ووشەیەکی کوردێ دەزانن . مردۆخ ( تم : ب١، ل ١٢٦ ) لە هاوتا عەڕەبیەکانی ئەم ووشەیەدا ( بەدرەقە )ی نەنوسیوە و بە ووشەیەکی کوردێ داناوە . دوکتۆر معین ( تم : فەرهەنگ ، ج١، ل ـ ٤٨٢) ئەم ووشەیەی بە عەڕەبێ داناوە کەچی (المنجد)م سەنگ‌وسۆژن‌دا ، ووشەی ( بەدرەقە )م تێدا نەدۆزیەوە . ب) بەدرەقەکردنی کەسێ ئەوە ناگەیێنی کە هەتا ئاخری دەگەڵی بڕۆن .

**بەدرەمە** ـ |؟| • (نا.) جۆرێ مێش‌هەنگوینی کەوێ نەکراوە . لە هەنگی ماڵێ پچۆکترە و ڕەنگی ڕەشە، درێژتر و چالاکتریشە، زیاتر لە قەڵشتی ڕەودزەبەرداندا شانە دەکا کە بە زەحمەت پیاو دەتوانێ بیگاتێ و هەر بۆیەشە هەنگوینەکەی کە پێی دەڵێن هەنگوینی شەمەترێلکە یا شەمەتلێنکە و لە هەنگوینی ئاسایێ باشتر و خۆشترە زۆر کەم دەست‌دەکەوێ و یەکێکە لەو شتە نایابانەی کە لە کوردستانەوە بۆ هەندەران بە دیارێ دەبەن تێبـ ـ من ئەم ووشەیەم نەدەزانێ و تەنیا هەنگوینی شەمەترێلکەم بیستبۆ • ( خا . ) ، ( هبێد ) و ( معر . ) هەرسێکیان ئەم ووشەیان نوسیوە و من لەوانم وەرگرتوە و بۆ مانا لێدانەوەکەشی زیاتر لە فەرهەنگی کشت‌وکاڵی مامۆستا شێخ مارفی قەرەداغێ کەلکم وەرگرتوە . ★ (مک.) شەمەترێلکە ؟ (سیە.) شەمەتلێنکە؟.

**بەدڕەنگ** ـ ( صت.) حاڵی هەر شتێکی ڕەنگی ناشیرن و تەڵخبێ ، هەر شتێکی ڕەنگی ئاودار نەبێ ، هەر شتێکی ڕەنگەکانی مات و بێ برێسکە بێ .

**بەدڕدووشت** ـ ( صت.) تم : بەدخۆ .

**بەدڕدووشتێ** ـ ( صت. ) تم : بەدخۆیێ .

**بەدزمان** ـ ( صت.) ١ ـ ئەو کەسەیە جوێن بە خەڵك دەدا . ★ ( مک.) زمان‌پیسێ . (سن.) بەدزوان، زوان‌تاڵ . جوێن‌فرۆش . جنێوفرۆش . ( جن. ) بەدزۆ .

**بەدسرشت** ـ ( صت.) ئەو کەسەی کە بە تەبیعەت حەز لە ئازاردان ، زیان‌پێگەیاندن و ناڕەحەت‌کردنی خەڵك بکا و خراپەی خەڵکی پێ‌خۆش‌بێ .

**بەدسەکوت** ـ ( صت.) تم : بەدچارە .

**بەدشکڵ** ـ ( صت. ) ١ ـ ئادەمیزاد یا هەر شتێکی دیکە کە شکڵی ڕێك‌وپێك نەبێ و دیمەنی نەچێتە دڵەوە . ٢ـ تم : بەدقەوارە .

**بەدعەمەل** ـ [کو. عا.] ، (صت.)، ( کئێر. ) تم :بەدکار .

**بەدفەڕ** ـ (صت.) ١ـ کەسێکی بە کردەوە یا بە قسە ئازاری خەڵك‌بدا . ٢ـ منداڵی بزۆز و شەڕانێ و شەیتان . تێبـ ـ دەنگی (د) لەم ووشەیەدا بە جیرانەتێ دەنگی (ف) دەگۆڕێ بە تەواوێ وەکۆ دەنگی (ت) لە دەم دەردەچێ ، لە ووشەی ( بەدفەڕی ) و

(بەدفەساڵ)یش‌دا هەروایە .

**بەدفەڕێ** ــ (حمصـ.) ئەنجامی کردەوەی مرۆڤی بەدفەڕ.

**بەدفەساڵ** ــ [کو. عا.] ، (صتـ.)، (سیمـ.) تم : بەدچارە .

**بەدقەوارە** ــ (صتـ.) ، (کئێر.) ، کەسێکی قەد و باڵای نارێك بێ . ★ بەدشکڵ/٢ .

**بەدقەوڵ** ــ [کو. عا.] ، (صتـ.) ، (کئێر.) کەسێکی قسەی خۆی نەباتەسەر ، ئەوەی وەعدەدەدا و بە جێی ناگەیێنێ .

**بەدکار** ــ (صتـ.) ١ــ ئەو کەسەی خراپە دەکا ( لەهەر بابەتێك بێ ) . ٢ــ ئەوەی لە ڕۆی داب و دەستوری کۆمەڵایەتێ و دینێ خراپ دەجوڵێتەوە . ٣ــ ئەوەی زیان بە خەڵك دەگەیێنێ و حەز بە خراپەی خەڵك دەکا . ★ بەدعەمەل ، بەدکردار .

**بەدکردار** ــ (صتـ.) تم : بەدکار .

**بەدگومان** ــ (صتـ.) حاڵی کەسێکی لە هەمۆ کاران بە شکە و بە باری خراپەدا لێکیان‌دەداتەوە . ★ دڵپیس ، (سنـ.) دڵچەپەڵ . دڵکرمۆڵ . (جنـ.) بەدگمۆ .

**بەدگومانێ** ــ (حمصـ.) لێکدانەوەی خراپ دەربارەی کەسێ یا کارێ یا ڕۆداوێك شکی خراپەکردن .

**بەدگۆ** ــ (صتـ.) کەسێکی بە خراپە باسی یەکێك دەکا ، ئەوەی بۆ خەڵك چاکەی بەدەمدا نایە، کەسێکی زمانی بە چاکە ناگەڕێ . ★ بەدبێژ ، بەدوێژ .

**بەدگۆیێ** ــ (حمصـ.) ئەو کارەی کە ئادەمێزادی بەدبێژ دەیکا .

**بەدگۆیێ‌کردن** ــ (مصتـ. متـ.) بە خراپە باسی کەسێ یا کەسانێ یا شتێ کردن . زمان بە چاکەنەگەڕان. ★ (جنـ.) بەدگۆیێ‌کردە .

**بەدلغاو** ــ (صتـ.) ١ــ ئەسپ یا هەر ووڵاغێکی دیکەی سوارێ کە قبۆڵ‌نەکا لغاوی دە دەمی بکرێ . ٢ــ (کنـ.) ئادەمێزادی سەرکێش و کەللەڕەق .

**بەدڵ** ــ [بە/٢ + دڵ] ، (بنتـ.) بە ئیخلاسەوە ، بە خۆشێ ، بە ئارەزۆیەکی زۆرەوە . :: بە دڵ حەزم دەکرد منیش هاتبام . بە دڵ وازی لێ‌هێنا .

**بەدڵ‌بۆن** ــ (مصتـ. لا.) پەسندبۆنی شتێ یا کەسێ لە لای یەکێکی تر . :: ئەم کابرایەم زۆر بە دڵە . زۆریش بە دڵی نەبۆ بەڵام هەرچۆ .

**بەدڵ‌وداو** ــ (بنتـ.) ، (مکـ.) بە حەزلێ‌کردنێکی ئێجگار زۆرەوە ، بە پەرۆشەوە . تێبـ ــ من وا تێدەگەم (داو) لەم ووشەیەدا (داوا) بێ و دەنگی (ئەلف)ی دوایێ کەوتبێ . ★ بە دڵ و گیان .

**بەدڵ‌وگیان** ــ (بنتـ.) تم : بەدڵ و داو .

**بەدڵەونۆسان** ــ (مصتـ. لا.) ١ــ تم : بەگیان‌کەوتن . ٢ــ پەسندبۆن و قبۆڵ‌کردنی کارێ یا شتێ یا مەسەلەیەك و کەسێك لەبەر چاوی یەکێکی‌تر . :: ئەم هەراوهۆریایەی بە دڵەوە نەدەنۆسا .

**بەدم‌دادان** ــ (مصتـ. متـ.) ،

( مکـ.) ١ـ ماوەی قسەکردن لێبڕینەوە و بێدەنگ‌کردنی کەسێك . ★ دم‌گرتن . (کعر.) دەم‌گرتن . ٢ـ ( کنـ. ) کافی‌بوونی خواردەمەنی بۆ ئەو خەڵکانەی لە ماڵێك یا هەر جێگایەکی‌تر بن . ∴ جا ئەوەندە ترێیە بە دمی‌کیدا دەدەی ( بەشی ئەو هەموانە ناکا ) .

**بەدم‌دادانەوە** ـ ( مصتـ. متـ. ) ، ( مکـ.) بەرپەرچدانەوەی کەسێکی قسەدەکا و قسەکانی بە دڵی یەکێك نەبێ کە دەیانبیسێ .

**بەدمەس** ـ ( صتـ.) ، (سنـ.) تم : بەدمەست .

**بەدمەست** ـ ( صتـ.) ، (کئێر . ) کەسێکی لە کاتی خواردنەوەی ئارەق و شەراب و ... و ... دا هەراوهۆریا بکا و خەڵك ئازار بدا و قسەیان پێ‌بڵێ و شەڕوشۆڕ بنێتەوە یا دەست بوەشێنێ . تێبـ ـ دەنگی (س) لەم ووشەیەدا تۆزێ تیژە و لە (ص)ی عەرەبی نیزیك دەبێتەوە .

**بەدمەستی** ـ ( حمصـ. ) ئەو کارانەی پیاوی بەدمەست دەیانکا .

**بەدمودان** ـ ( مصتـ. لا.) ، ( مکـ.) ماوەدان بە کەسێك بۆ ئەوەی لەسەر کارێکی دەستی پێکردوە بڕوا. ★ لەدۆدان . تێبـ ـ ئەم مەصدەرە زیاتر بۆ ماوەی قسەکردن بەکاردێت و هاوتاکەی مانایەکی گشتی‌تری هەیە .

**بەدناو** ـ ( صتـ.) ، (کعر . ، سنـ.) کەسێکی ناوبانگی بە خراپە دەرکردبێ . ★ بەدنێو .

**بەدناوبوون** ـ ( مصتـ. لا.) ناوزڕانی کەسێك لەبەر کرداری خراپ ، لەهەر بابەتێك‌بێ .

**بەدناوکردن** ـ ( مصتـ. متـ.) دەربارەی کەسێك لەناو خەڵکا بە خراپ دوان و ناو زڕاندنی لە کۆمەڵگادا .

**بەدناوی** ـ ( حمصـ.) بە خراپە ناوبانگ دەرکردن .

**بەدنمەك** ـ ( صتـ.) کەسێکی چاکە و پیاوەتی خەڵکی لەبەر چاو نەبێ. تێبـ ـ لە کوردەوارێدا هەروەکو لە نێو زۆر میللەتانی دیکەشدا باوە ، ئەگەر دوو یا چەند کەس پێکەوە نانیان خوارد یا یەکێك لە ماڵی کەسێکا نانی خوارد ( نمەکی یەکتریان کرد ) دەبێ مافی ئەم نان و نمەکە بپارێزرێ و خەیانەت بە یەکتری نەکەن . ★ سپڵە . بێوەفا . پێ‌نەزان .

**بەدنمەکی** ـ (حمصـ.) کاری لەبەر چاوڕانەگرتنی هەقی نان و نمەك . ★ بێوەفایی . سپڵەیی .

**بەدنەژاد** ـ ( صتـ.) تم : بەدڕەسەن .

**بەدنێو** ـ (صتـ.) ، ( مکـ.) تم : بەدناو .

**بەدوێژ** ـ ( صتـ. ) ( سنـ.) تم : بەدگۆ .

**بەدەر** ـ [ بە/٢ + دەر ] ، (بنتـ.) تم : بێجگە .

**بەدەردخواردن** ـ ( مصتـ. لا.) تم: بەکارهاتن .

**بەدەست** ـ ( صتـ.) ١ـ دەستڕۆیو ، خاوەندی ماڵ و

دەوڵەت . ٢ــ ئازا ، دلێر .
**بەدەستگرتن ــ** (مصد. متە.) ١ــ گرتنی گیانداریکی ڕابکا بەبێ یارمەتی هیچ هۆیەك . :: ئەوەندە بەفر باری پەنجا چۆلەکەمان هەر بە دەست گرت . ٢ــ ( مجە.) چوونی زاوا بۆ لای بوك و جووتبوونی دەگەڵی وەکو ژن و مێردان . :: سێ مانگە بوکیان بۆ گواستۆتەوە هێشتا بە دەستی نەگرتوە . ★ بوونەزاوا ، بەزاوابوون .
**بەدەستەڵات ــ** [ بە /٨ + دەست + ٣ــ ئە/٢ + هەڵات ] ، (صتە.) ١ــ خاوەن زۆر و توانست (مقتدر). ٢ــ کەسێکی قسەی بڕوا ، پیاوێ کە لای خەڵك ، لێپرسراوانی دەوڵەت و ئیدارەکانی قسەی بخوا .
**بەدەستەوە ــ** ( صتە.) ١ــ ئامادە و حازر بۆ ڕاپەڕاندنی کاران . :: نیگەران مەبە ئەم پیاوە هەمیشە بە دەستەوەیە و چی پێبڵێین وا دەکا . ٢ــ بەلاوەنراو . :: سێ جار هەشت بیست و چوار ، ئەوە چوار دوو بە دەستەوە .
**بەدەستەوەدان ــ** ( مصد. متە. ) ١ــ تەسلیم کردنی کەسێك کە پەنای بردبێتە بەر کەسێکی تر . بە غەنیمەکەی :: قەت باوەڕمەکەن بە دەستمانەوە بدا . تێبـ ــ ئەم ووشەیە زیاتر بۆ کەسانێکی لە ترسی حکومەت خۆیان شاردبێتەوە ، بەکاردەهێنرێ . ٢ــ تەسلیم کردنی هەر شتێك بە کەسێکی تر :: زۆر گیان سەختە ڕوح بە دەستەوە نادا . بە دەستییەوە نەدەدا بە زۆر لێمان ئەستاند .
**بەدەستەوەگرتن ــ** ( مصد. متە.) ١ــ هەڵگرتنی شتێك بە دەست بە جۆرێکی وا کە دیار بێ . :: چەمەدانێکی بە دەستەوە گرتبو دەچو بۆ گاڕاژ . کاغەزێکی شڕی زەردی بە دەستەوە گرتبو هەرتاوەناتاوێ دەیگوت : ئەوەتا بەڵگەی تاوانت . پاشان بۆمدەرکەوت.( خەونامەی سەید ئەحمەدی مەدێنە )یە . ٢ــ ( مجە.) شتێك کردنە بەهانە بۆ کردن یا نەکردنی کارێك :: ژیرکردنی منداڵەکەی بەدەستەوە گرتوە و خۆ دە هیچ کارێکی دیکە ناگەیێنێ .
**بەدەل ــ** [ عا: بدل] ، ( نا.) ، ( کعر.) پارەیەکە ئەو کەسانەی وەختی سەربازییان دەهات ، دەیاندا بە حکومەت و لەباتی ئەوەی دوو ساڵ عەسکەری بکەن چەند مانگێك خزمەتیان دەکرد . هس : بەدەڵ .
**بەدەڵ ــ** [ عا.] ، (نا.) ، ( مک. ، سنـ.) کاڵای خراپ و بازاڕی ، کاڵایەکی بەدانستە دروستنەکرابێ . // ئەسڵ ، عەسڵ . ★ جەڵەب ، جەڵەبی . ( جنـ.) بەدەل . تێبـ ــ ئەم ووشەیە لە ( بەدەل )ی عەرەبی وەرگیراوە کە مانای ( لە جێگەی ، لەباتی )یە و هەر بۆیەش لە زمانی کوردیدا ئەو مانایەی وەرگرتووە چونکو ( کاڵای بەدەڵ ) لە جێی ئەسڵ دادەندرێت .
**بەدەم ــ** [ بە/٨ + دەم ] ، (صتە.) ١ــ ئینسانی قسەزان ، کەسێکی توانای قسەکردنی زۆربێ ★ بەدەمویل . دەمەوەر . ٢ــ قسەی

بە زاری . ڕاسپێری نەنوسراو .
( عا.) شفهی :: هەموشتێکم بۆ نوسیوە . بە دەمێش پێی‌بڵێ زۆری سڵاو لێ‌دەکردن .

**بەدەمار ــ** [ بە/٨ + دەمار ] ، ( صت. ) ١ــ حاڵی ئینسانێ کە قبوڵ نەکا لە لای ئەو کەسێك دەست بۆ کەسێکی تر درێژ بکا یا قسەی سوکی پێ‌بڵێ . ٢ــ کەسێکی گوێ‌نەداتە هێچ مەترسێ و خەتەرێك و سوکایەتێ بۆ خۆی و خەڵکی تریش لە هیچ کەس قبوڵ نەکا . ٣ــ ( مجـ.) بەشەرەف ، بەناموس .

**بەدەم‌وپل ــ** ( صت.) تم : بەدەم .

**بەدەن ــ** [ = عا : بدن ] ، (نا.) تم : ١ــ بەندەن .

**بەدیارەوەدانیشتن ــ** ( مصت. مت. ) چاوەدێری کەسێك یا شتێك کردن . :: بەدیارەوە دانیشتن مەبادا کارێکی هەبێ . ئەوە بە دیارمەوە دانیشتوی کەچێ ؟

**١ــ بەدێ ــ** [ ١ــ با + ئەدێ ] ، ( بنت.) . (مکـ.) تم : ئەدێ .

**٢ــ بەدێ ــ** [ پە : ڤەتیە ] ، ( حمص.) خراپبون ، شەڕانێبون .

**بەدێ‌کردن ــ** [ بە/٨ + دێ ( دیتن ) + کردن ] ، ( مصت. مت.) ١ــ دوردوە دیتنی شتێك ، بەرچاوخستنی ، ( عا.) مشاهدة .

**١ــ بەر ــ** [ ست : پەرە ] ، (نا.) لاوتەنیشتی هەر شتێك :: ئەم‌بەرەوبەرێ چۆمەکە هەموی بۆتە خانو . گەڕەکی ( کەرخ ) دەکەوێتە بەری ڕۆژاوای ( دەجلە ) . □

« ئەم‌بەرەووبەرە ، ناسکە دولبەرە ، لەسەر ماچێکی شەڕە خەنجەرە » ( فۆلکلۆر ) .

**بەربە ــ** ... (بنت.) جوڵان یا جوڵاندنی شتێك بۆ لایەك دیار دەکا. :: بەربە کەرکوك ڕۆیشتن ، مەڕەسورەکان بەربە چیا هەڵکشان ، بەربە ئێمە هەڵیانبڕن. ★ بەرەو...

**بەرەو ــ** (بنت.) تم : بەربە ... ٢ــ لای پێشەوە (بۆ جێگا) :: بەردەرگا . بەربۆك . بەردەست بەبەر ماڵی ئەواندا تێپەڕین . لەبەر هەتاو خۆیان هەڵخستبو . □«بەرت بابێ و پشتت کەندەڵان» (خا ، پەند ، ل ــ ١٠٩) ●

**بەری‌بابەردە ــ** (کن.) لە شوێنی خۆت هەڵستە ، جێگا چۆڵکە ، وازبێنە . ٣ــ پێش ، لە پێش (بۆکات) □ « بەر لە مەلا ئەچێتە مزگەوت » ، «بەر لە وەستا دوکان گەرم ئەکا» ، «بەر لەوەی بگاتە بوار دەرپێ دائەکەنێ » (خا ، پەند ، ل ــ ١١٢ ، ١١٣ ) **بەرلە** ... لە پێش ... :: ئیمپڕاتۆری ماد ٥٥٩ ساڵ بەر لە دایك‌بونی عیسا ڕوخاوە . **بەرلەمە ــ** (بنت.) پێش ئەو شتەی کە بۆ قسەکەر و بیسەر ڕونە . :: ئوتومبێلەکەی بەر لەمەیان تێپەڕی کێ بو .

**بەرلەوە ــ** (بنت.) پێش ئەوە . :: زۆر سەیرە بەرلەوەی دەموچاوی پشوا بەرچایێ دەخوا . ٤ــ دامێن و لای خوارەوەی هەر شتێك ، ژێر :: بەرزگ ، بەرسمێڵ ، دێبەر ، بەرەتەشێ .

**٢ــ بەر ــ** [ست : ڤۆئیری ــ یا ــ

ڤۆئورو ] ، (نا.) پانایێ شتی چندراو بە دەست یان بە مەکینە ( قوماش و ئەو جۆرە شتانە ) :: ئەم قوماشە دۆبەرە ، هەرتیری بەرپان .

**٣ــ بەر ــ** (نا.) ١ــ دیوی ناوەوەی ئەو شتانەی دۆ رۆ یا دۆ لایان هەیە و بە چاو فەرقیان دەکرێ . :: بەری دەست ، بەری پێ ، ئەم قوماشە بەر و پشتی لێك‌ناکرێتەوە . □ « وەکو نیسك وایە بەر و پشتی بۆ نیە » (مەتەڵی کوردێ) . ٢ــ تم : ئاستەڕ/١ :: بەری کەوا ، بەری کولێجە ، بەری پاڵتۆ .

**٤ــ بەر ــ** [ پە : بەر ] ، ( نا. ) ١ــ میوەی درەخت و گیاوگۆڵ . ٢ــ منالی گیانداران و ئادەمیزاد کە هێشتا لە زگی دایکیاندا بن . :: داری بەرێ (داری‌میوە) ، ڕەزەکەمان ئەمساڵ بەری نەگرتوە . کچێ تۆزێکی بەش بدەن خەریکە بەر داوێ . ٣ــ ئەوەندە میوەی کە پێگەیشتبێ و بۆ لێکردنەوە دەست بدات . گژوگیای دەست‌چێن کە چەند جار سەر هەڵدەداتەوە ، ئەوەندەی بە جارێك دەدروێتەوە :: وێنجەکە تا ئێستا دۆ بەرمان درۆتەوە و ئێستاش داشتۆمانە بەری سێیەمیشی دەدروێنەوە. تەڕەکارێ، هەر بەرێکی لێدەکرێتەوە و بەرێکی دیکەی پێ‌دەگا .

**٥ــ بەر ــ** (نا.) ، (مک.) ١ــ تم : بەرگەدە . ٢ــ (مج.) تۆکێك کە لە خوار مسولدانی ئادەمیزاد دێت . ★ تۆکەبەر ، مۆی‌بەر .

**٦ــ بەر ــ** [ ڤەر = سینگ ] ، (نا.) لەشی ئادەمیزاد :: کراسەکە بە بەری ناکا . کەواکەی هێندە تەنگە بە هەزار حاڵ دە بەریەوە دەچێ . جلکت دەبەر کە و بڕۆ بۆ مەکتەب .

**٧ــ بەر ــ** (نا.) هێزێکە، کە پاش خوێندنەوەی شتێك ( شیعر ، ووتار ، کتێب ...) لە قوژبنێکی مێشکی ئینسانا ڕاگیریان دەکا و لە کاتی پێویستیا بێ ئەوەی تەماشای کتێب و ... بکا دەیانڵێتەوە . (عا.) حافظة. تێب ــ ئەم ووشەیە لە ( بیر ) وەرگیراوە . هس : لەبەرکردن .

**٨ــ بەر ــ** (نا.) ئازاد . تێب ــ ئەم ووشەیە بەم مانایەی هەمیشە دەگەڵ فیعلی یاریدەدەری (دان) و (بوون) هاتوە و بە تەنیایێ مانا نادات . تم : بەربوون ، بەردان .

**٩ــ بەر ــ** (نا.) تم : بەرگە .

**١٠ــ بەر ــ** تم : وەبەرخستن .

**١١ــ بەر ــ** (پب.) پاشبەندێکە بە دوایێ ناوانەوە دەلکێ و دەیانکاتە ( صفا.) و مانای (بردن) لە ناوەکە زیاد دەکا . :: پێغەمبەر ، فەرمانبەر، دڵبەر ، بارەبەر . تێب ــ ئەم پاشبەندە لە مەصدەری (بردن) داتاشراوە (تم : ٢ــ ئەر/٢ ) .

**١٢ــ بەر ــ** (نا.) تم : ٢ــ بۆر .

**١ــ بەرات ــ** [عا.] ، (نا.) ١ــ جیرە و مواجبی (میرزا) و (مەلا) و ئەو جۆرە کەسانە لە ناو کوردەواریدا :: مامۆستا بیست تەغار گەنم و صەد تمەنیش بەراتت دەدەینێ وەرە لای ئێمە . ٢ــ (کنێر.) کاغەزێکە تاجران لە نێو خۆیاندا معامەلەیان پێدەکرد .

تێبـ ــ أ) بازرگانێك لە شارێك هێندێكی پارە تەسلیمی تاجرێك دەكرد ، ئەویش لەسەر پەڕە كاغەزێك بە كورتی بۆ تاجرێكی كە لە شارێكی دیكە سەودا و مامەڵەی دەگەڵی هەبو، دەینوسی: فلان‌كەس! ئەوەندەم پارە لە فلان تاجر وەرگرتوە ، تكایە كە ئەو كاغەزەتان پێگەییشت دوای ئەوەندە ڕۆژە ( یا دەست‌بەجێ ) بیدەن بە خۆی یا بەو كەسەی بۆی حەوالە دەكات . بازرگانی یەكەمیش كە ئەو كاغەزەی وەردەگرت لە پشتەوەی دەینوسی : تكایە ! تكایە پارەی ئەم (بەرات)ە بدەن بە فلانە تاجر و ئیمزای دەكرد. ب) ئەمە وەختێك بوە كە هێشتا (بانك) و (ئەسكیناس) لە كوردستان نەهاتوتە كایەوە و ئالووێر بە دراوی زێو بوە و ناردنی مەبلەغێك لە شارێكەوە بۆ شارێك دژوار بوە ، ئێستا كە ( بانك ) لە هەمو مەڵبەندەكانی كوردستاندا زۆرن ، چەك ( صەك ) جێگەی بەراتی گرتوتەوە . ٣ــ گرمۆلەیەكی پچوكە یەزیدی لە خاكی سەر مەرقەدی (شێخ عەدی) دروستی‌دەكەن و بۆ متفەڕك هەڵیدەگرن . ( تم : هبێد ، ل ــ ١٢ ، ١ــ بەرات .)

**٢ــ بەرات ــ** جێژنی بەرات ، شەوی بەراتی ، شەوی ١٥ی مانگی شابان . تێبـ ــ دەڵێن كە لەم شەوەدا ڕزق و ڕۆزی خەڵكی دیاری دەكا .

**بەراتخۆر ــ** ( صت.) ئەو كەسەیە كە ( ١ــ بەرات/١ ) وەردەگرێ و ئیشێك دەكا .

**بەراز ــ** ( ست : ڤەرازە ) ، (نا.)، (نێو . ، بك.) ١ــ گیاندارێكی بەهێز و قورسە ، لەوانەیە بەچكەی خۆیان بە شیری مەمكان بەخێودەكەن ، سمی هەیە . پێستی ئەستورە ، توكی كورت و ڕەقە ، لمۆزی هەیە ، دو ددانی لەولاولای دەمی هاتونەدەر ( شفرە ) یان پێدەڵێن ، بۆ خۆپاراستن و شەڕكردن كەلكیان لێ‌وەردەگرێ . ★ ( نێو.) خوگ ، وەراز . (جنـ.) وراز . تێبـ ــ أ ) ئادەمێزاد لە زۆر كۆنەوە بەرازی كەوی كردوە و بە (ڕەوە) بەخێوی‌كردوە ، لە دەوروبەری چەمچەماڵ ( كوردستانی عێراق) دێیەكی كۆن بە ناوی ( چەرموگ ) لە ژێر خاك دەركەوتوە زانایانی باستاناس لایان وایە یەكێكە لەو شوێنانەی ئادەمێزاد پاش ئەوەی ئەشكەوت‌نشینی بەلاوەناوە ، ئاوەدانی‌كردوتەوە و شتی وای تێدا دۆزراوەتەوە كە پێشان‌دەدەن خەڵكی ئەم (دێ) كۆنە بەرازیان بەخێوكردوە پاش بلاوبونەوەی ئیسلامەتی لە كوردستان و مسوڵمان‌بونی زوربەی زۆری كوردان و لەبەر ئەوەی كە خواردنی گۆشتی بەراز لە ئیسلامەتیدا ڕەوا نیە،توی (بەرازی كەوی ) لە كوردستانا بڕاوەتەوە و ( فەلە )ی كورد كەم تا بێشێك لە ماڵانا بەخێوی‌دەكەن ، بەلام بەرازی كێوی لە گەلێ شوێنی كوردستانا هەیە . ب) بەرازی كێوی زیاتر لە ناو زۆنگ و مێشە و دارستاناندا دەژی و شەوانە

دەردەکەوێ و زەوێ دەکێڵێ و زیان بە باغ و کشتوکاڵ دەگەیێنێ . ج) بەراز گیاندارێکی قەڵەوە و گۆشت و خەزوبەزێکی زۆری هەیە ، دەست و قاچی لەچاو گەورەیێ جەستەی کورتن ، ملی ئەوەندە نیە کە بتوانێ سەری بەم لاولای خۆیدا وەرچەرخێنێ . د) بەرازی نێر یا **گۆلەبەراز** ( بڕەك ) و (یەکانە)ی پێدەڵێن و دێڵەکەشی (مالۆس)ی ناوە . مالۆس هەر عومری گەیشتە نۆ مانگ توانایێ ئەوەی دەبێ یەکانە هەڵبگرێ و ساڵێ دوو جار ، لەسەرەتای بەهار و پایێزا دەترەکێ و هەرجارە ٦ ـ ١٢ بەچکەی دەبێ کە پێی دەڵێن ( کودەلە ) یا ( بزەڵە ) . بەراز تا پازدە ساڵان دەژی . ٢ـ ( مج. ) پیاوی قەڵەوی کورتەبنە .

**بەرازیغەزریو** ـ ١ـ بەرازێکی ڕقی هەڵستابێ و هەرچێ بێتە پێشێ پەلاماری بدا . ٢ـ (کن.) ئادەمیزادی ڕقئەستوور کە هەر پێش بخواتەوە . :: تەماشای هەر دەڵەی بەرازی غەزریوە .

**بەرازخۆر** ـ ( نت. ، صت.) ١ـ کەسێکی گۆشتی بەراز بخوا . ٢ـ لەقەبی عەشیرەتی کوردی قەڵخانییە کە لە مەڵبەندی کرماشان دادەنیشن و تا ئێستاش گۆشتی بەراز دەخۆن .

**بەرازە** ـ [ بەراز + ٥ـ ئە/١ ] ، ( نت.) دوو ددانی گەورەیە کە وولاغی بەرزە پاش ئەوەی تەخت دەبێ و لە شێلە پاك دەبێتەوە ، لە تەمەنی ٤ ـ ٦ ساڵیدا دەریدەکا .

**بەرازەوان** ـ [ بەراز/١ + ٣ـ ئە/٢ + وان ] ، (نت.) ئەو کەسەیە کە دەچێتەبەر ڕەوەی بەرازان . شوانی بەرازان :: شێخی سەنعانێ حەوت ساڵان بەرازەوانی کرد .

**بەرامبەر** ـ [ ١ـ بەر/١ + ٢ـ ئان/٣ + ١ـ بەر/١ ] ، ( صت.) ١ـ حالی دوکەس یان دوو کۆمەڵە خەڵك یان دوو شت کە هێندێ لێكدووربن و ڕوویان دە یەکتری بێ :: دوکانی باوکی شێرکۆ بەرامبەری مالی پیرۆتە . لەشکریان بەرامبەر وەستاوە . □ « بەرامبەرم دامەنیشە ، جەرگت دەرهێنام لە ڕێشە » ( فۆلکلۆر ) . ٢ـ حالی دوو شتی بە تەنیشت یەکەوەی لێكجیاواز کە بڵیندیان وەك یەك بێ :: سەری شێرکۆ بەرامبەر شانی شابازە . تەرازوەکە بەرامبەرە ( کاسەکانی لەسەر یەك خەت ڕاوەستاون ) ٣ـ لەباتێ ... ، مقابل ... لە جێگەی ... :: بەرامبەر بە پیاوەتێ فەرهاد مەگەر بیکوژێ و باقێ بداتەوە . تێبـ ـ دەنگی ( ن ) لە پاشبەندی ( ٢ـ ئان )دا بە جێرانەتێ دەنگی (ب) لە وشەی ( ١ـ بەر/١ )دا دەگۆڕێ و دەبێتە (م) .

**بەرامبەربوون** ـ (مصت. لا.) ١ـ ڕووبەڕووی یەك هەڵکەوتنی دوو شت . :: جاران مالی شێرکۆ دەگەڵ مالی نەوزاد بەرامبەربوون . دوو لەشکرەکە بەرامبەری یەك بوون و سەرلەبەیانێ شەڕ دەستی پێکرد . ٢ـ هاوسەنگبوونی دووشت . ٣ـ وەك یەك بوونی بەرزایێ دوو شت . ٤ـ

ڕاستڕاوەستانی شەیێنی تەرازو .

**بەرامبەرکردن ــ** ( مصت. متە.) ١ــ پێكگرتنی دوو شت ( نووسراو...) بۆ دەرخستنی فەرق و جیاوازیان . ( عا.) مطابقة . ٢ــ وەك یەك لێ کردنی بەرزایی ، قورسایی و ... و ... چەند شتان .

**بەرامبەرکێ ــ** | بەرامبەر+ ١ــ ئەك/٢ + ئێن | . (نت.) ، (سنە.) **تە :** بەربەرەکانێ . تێب ــ دەنگی (ن)ی پاشبەندی ( ئێن ) لەم ووشەیەدا و لە گەلێ ووشەی تری لەم بابەتەدا دەکەوێ .

**بەرامبەروەستان ــ** ( مصت. لا.) ١ــ ڕووبەڕووی کەسێك وەستان ( **تحدی کردن** ) . ٢ــ **دژایەتی** کردنی کەسێ بە کردەوە . ٣ــ جوابە جەنگێ کردن دەگەڵ کەسێ . ٤ــ هاوسەنگ‌بوون .

**بەرامبەری ــ** ( حمصە.) ١ــ وەك یەك بوون لە درێژی ، بەرزی ، قورسی و ...و... دا . ٢ــ دژایەتی . ناحەزی . نەیاری .

**بەرامبەری کردن ــ** ( مصت. لا.) ١ــ وەکوو یەك لێهاتن . هاوتابوون ، هاوسەنگ‌بوون لە هەموو بابەتێکەوە . ٢ــ دژایەتی کردن .

**بەرامپێل ــ** | ١ــ بەر/٢ + ٢ــ ئان/١ + پێل | . ( نت.) ، (هل.) **تە :** بەرهەڵبێنە . تێب ــ جیاوازێکی پچووك لە نێوان ( بەرامپێل ) و (بەرهەڵبێنە)دا هەیە ، هەرچی بەرامپێلە لە بنەنگڵەوە ڕەتدەبێ و دوو لکی لەسەر شان گرێ دەدرێ ، بەڵام شێوەی گرێدانی ( بەرهەڵبێنە ) وا نیە ( تە : ــ ) .

**بەرامە ــ** (نا.) ، (سنە.) **تە :** بۆن و بەرامە .

**بەران ــ** (نا.) شەکەنێرێکە تەمەنی لە چوار ساڵان تێپەڕیبێ و شاخ و سەر و سەکوتی جوان و ڕێكوپێك بێ . بە تایبەتی بە خێوی دەکەن و دەیڕەنگێنن و لە کاتی پێویستدا ( کاتی تایبەتی هەیە ) بەری دەدەنە ناو مەڕان بۆ ئەوەی ئاوسیان کا . ★ ( بکـ.) بەران . (جنـ.) غورچ . (سنە.) قۆچ . بەران . هس : (ڕووسی) بەران = مەڕ .

**بەرانپۆز ــ** ( صت.) ، (سنە.) حاڵی ئینسانێ کە لووتی هەر لە نێوان (برۆ)یانەوە بە زەقی هاتبێتە خوار تا دەگاتە سەر تفنگی ● کەسێکی کەپۆی کەوانەیی بێ . ★ ( مکـ. ) تەپۆزبەران .

**بەرانپێچ ــ** | ١ــ بەر/٢ + ٢ــ ئان /١ + پێچ (پێچان) | ، (نت.) **تە :** بەرهەڵبێنە .

**بەرانەکێوی ــ** | بەران + ٣ــ ئە /٢ + کێو + ٣ــ ئی | . (نت.) نێرەی مەڕەسوور .

**بەراو ــ** | ١ــ بەر/٢ + ١ــ ئاو /١ | . (نت.) تە : ١ــ ئاوی/١ . ٢ــ (مجـ.) . (مکـ.) ڕەوا . (عا.) مباح . :: باوکی کردۆتە بەراوی خەڵك ( بەلایەوە هیچ نیە ئەگەر خەڵك قسەی ناشیرن بە باوکی بڵێن ) ، بەراویان کردوە ( وایان لێکردوە کە لای ڕەوابێ جوێنی پی بدەن و قسەی پێ بڵێن و تووڕەش نەبێ ) .

**بەرئاووردکردن ــ** [ فر. کمر. | .

( مصتە. متە.) ١ــ هەڵسەنگاندنی دوو یا چەند شتان لەچاویەکتر لەلانی چەشن و جسنیانەوە . ٢ــ دیاریکردنی نرخی شتێك . ( عا.) تخمين .

**بەراوێتە ــ** [ ٤ــ بەر/٢ + ئاوێتە ( = ئاوێشتوو ) ] ، (صتە.) حاڵی مەڕ یا بزنێ کە بەچکەی بەناوەخت فڕێدابێ .

**بەرایی ــ** [١ــ بەر/٢ + ئایی /٢ ] ، (نتە.) سەرەتای کۆمەڵە خەڵکێ ، چەند کەسێك کە بۆ هەر مەبەستێك بێ وەپێش کۆمەڵە خەڵکێك دەکەون و هێندێك دوور لە پێشیانەوە دەڕۆن . :: بەرایی لەشکر گەیشتە شار ، بەرایی سوارەکان لە دێ دەرچوون (عا. ) طليعة ، مقدمة الجيش . ★ (مک.) پێشایی .

**بەراییدان ــ** ( مصتە. لا.) ماوە ، مەجال ، فتوا بۆکردنی کارێك ، ئامادەبوون بۆ جێبەجێکردنی مەسەلەیەك . :: چاو بەرایی نادا پیاو بچێتە مالیان . چۆن دڵت بەرایی دەدا قسەی وای پێ بلێی .

**بەرباد ــ** [ فر. ] ، (صتە.) خراپ ، وێران :: دار و نەداری لە قومارا بەربادکرد ، حاڵی بەربادە ● ئێجگار بەربادە ( کنە.) زۆر خراپە . تێبـ ــ لە بەکارهێنانی ئەم وشەیەدا هەمیشە ( خراپی ) یا (وێرانی) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مەبەستەی کە لە پێشدا قسەی لێکراوە . ئەگەر باسی دەولەمەندی و فەقیری بێ ئەوە وا دەگەیێنێ کە زۆر فەقیرە ، خۆ ئەگەر باسی ساغی و نەخۆشی بێ ئەوا مانای ئەوەیە کە زۆر نەخۆشە .

**بەربار ــ** [ ١ــ بەر/٤ + ١ــ بار /١ ] ، (صتە.) ١ــ حاڵی وولاغێکی هاتبێتە ئەوەی باری لێبندرێ . ٢ــ (مجە.) گوێلەمست . **هاتنەبەربار ــ** ڕامبوونی وولاغ بۆ بارهەڵگرتن . ٢ــ گوێلەمستبوونی کەسێك ، ملکەچکردنی یەکێك بۆ فەرمان . **هێنانەبەربار ــ** ١ــ ڕامکردن و ڕاهێنانی وولاغێك بۆ بارهەڵگرتن . ٢ــ ( مجە.) ڕامکردن و مطیعکردنی کەسێك بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشێ .

**بەربانگ ــ** ( نتە.) ١ــ تم : ئیفتار ٢ــ خواردنێ کە ڕەمەزانان بۆ ڕۆژوو شکاندن ئامادە دەکرێ .

**بەربانگکردنەوە ــ** (مصتە. لا.) شکاندنی ڕۆژوو . شت **خواردنی** ڕۆژووەوان پاش ئەوەی وەختی شەرعی دادێت .

**بەربوارد ــ** (نتە.) ، (هلـ.) بەردیلێکی بەرانی نەخواردبێ ، شەکەمێی ئەستیور ★ ( مک. ) بەربواردوو .

**بەربواردوو ــ** ( نتە.) ، (مک.) تم : بەربوارد .

**بەربۆرە ــ** (نتە.) ، (سیمـ.) ١ــ « توو وەشاندنە بە ئەرزەوە پێش ئەوەی بکێلرێت . بەرچێن » ( معر ، کشت ، ب ١ ، ل ــ ٤٢ ) ٢ــ هەروا لە خۆڕایی ، بێتێبینی و بیرکردنەوە. ( عا.) ارتجال . ٣ــ لە پێش هەموو شتێکدا . :: لەبەربۆرە پێیان گوتم تۆ هەر گوێبگرە . لەبەربۆرە بڕیاردەدەن .

**بەربۆسە ــ** [ ١ــ بەر /٤ +

بۆسە ] ، ( نت. ) ، ( مک. ، ها. ) ئامرازێکە ( بۆسە )ی پێ لە تیر توندەکرێ و نایەڵێ بجوڵێ و جێگای ( سەرەمژان )یش لە ناو بۆسەدا تەحدید دەکا .

**بەربۆك** – [ ١– بەر/٢ + بۆك/١ ]، (نت.) ، (مک. ، سیم. ، بک. ) ژنێکە دەگەڵ بۆك دەچێتە ماڵی زاوا و دەیکاتە پەردەوە و خەبەری (بەزاوابوون)ی زاوا و (ڕۆسووری) بۆك بە کەس و کاری هەرتکیان ڕادەگەیێنێ . تێب – لە ناو کوردەواریدا ئافرەتێ ئاوا لە هەموو شوێنێك هەن کە هەر لە خوازبێنیڕا تا شەوی بۆکێنێ دەگەڵ بۆك و زاوا و ماڵی هەردوولا خەریك دەبێ و ئەرکی بەجێگەیاندنی داب و دەستووری شایێ و خەنەبەندان و هەمام لەمیش‌کردن و ... دەکێشێ . ★ ( بک. ) بەربوو . (سیم. ، سن. ) پێخەسوو ، پاخەسوو .

**بەربۆکێ** – ( حمص. ) ١– ئەو کارەی بەربۆك دەیکا ، جێبەجێ‌کردنی کاری کوڕ و کچێك کە دەبنە ژن و مێرد . ٢– (مجـ.) ڕێکخستنی نێوانی دوو کەسان یا زیاتر ، هەڵسووڕان و چالاکێ بۆ ڕاپەڕاندن و بە ئەنجام‌گەیاندنی کارێك کە پێوەندێ ڕاستەوخۆی بەو کەسەوە نەبێ :: نازانین کاك حەمەحەسەن ئەم بەربۆکییەی لەچیە ؟ تێب – بە مانای دووەم ئانۆتی تێدایە .

**بەربوون** – [ ٨– بەر + بوون ( فعـ.) ] ، (مصد. لا.) ١– هاتنەدەری کەسێك لە زیندان ، ئازادبوون لە بەندیخانە :: گیراوە سیاسیەکان هەرچی هەبوون بەربوون . دە ڕۆژ دەبێ شێرکۆ بەربووە . ٢– پەت‌پساندنی وولاغێکی بەسترابێتەوە . :: عەوول ئێسترەکە بەربوە بەرەو باخی ئاشی چوو ، بڕۆ بزانە نایگریتەوە . ٣– تەواوبوونی مانگ‌گیران و ڕۆژگیران :: ئەو ساڵە مانك‌گیرا دوو سەعاتی کێشا ئینجا بەربوو . **تێبەربوون** – ( مصد. مت. ) کەوتنەگیانی یەکتری گیانداران کەوتنەگیانی شتێ لە لایەن گیاندارێکەوە یا زیاتر . :: گوێلکەکە تێبەربوو بڕۆ بیگرەوە ( کەوتە گیانی دایکی بۆ شیر خواردن ) **تێك‌بەربوون** – [ تێك ( دە + یەك ) + بەربوون ] ، ( مصد. مت.) چڕژانە ناو یەکتری دوو دەستەگیاندار بە نیازی شەڕ و دوژمنایەتێ . :: چوومەوە ماڵێ منداڵەکان تێك‌بەربوون . لەشکری ( مامەش ) و ( دیبۆکرێ )یان لە دەشتی ( مەحمەشە )ی تێك‌بەربوون . تێب – ئەم ووشەیە وەختێك دەکاردەکرێ کە ئەو کەسەی قسە دەکا ، لە کارەکە نارازێ بێ و بە چاوی سووك تەماشای بکا . **لێ‌بەربوون** ( مصد. لا.) ترکەندنی کەسێ . :: مەحموود ئاغا یەکێکی لێ‌بەربوو خۆی‌کرد بە نوستوو . ئاگای لە خۆی نەبوو هەر دەڕۆی و لێی‌بەردەبوو .

**بەربوونەوە** – [ ١– بەر/٤ + بوونەوە ] ، ( مصد. لا.) ١– کەوتنەخواری شتێ یا گیاندارێك لە جێگەیەکڕا بۆ جێگەیێکی دیکەی کە

لەچاو ئەوی پێشو نزمتربێ . ٢ــ بەلاداهاتن و کەوتنە سەرزەوی ئادەمیزاد لە شوێن خۆی :: کوڕە دلێر هێندە مەچوە سەر گوێسوانەکە بەر دەبیتەوە . چاوی لەبەر پێی خۆی نەبو دە بەردەکە هەڵەنگوت و بەربوەوە . ★ بەرەوەبون .

**لێبەربونەوە ــ** ( مصد. لا.) کەوتنەخواری شتێك لە شتێکی تر . :: پەرداغەکەی لە دەست بەربوەوە و شکا ، دەرپێی لێبەربوەوە ، توندی بگرە با لێت بەرنەبێتەوە . ★ لێبەرەوەبون .

**بەربەخت ــ** [ ١ــ بەر/٤ + ١ــ بەخت/١ ] ، (نت.) کچێکی وادەی مێردکردنی هاتبێ .

**بەربەر ــ** [ ئینگلیسی : باربر ] ، ( نا .) ، ( کمر. ) ئەو کەسەی پیشەی سەروڕدێن تاشین خەڵکە . (سیم. سن.) سەرتاش ، دەلاك/١ . ( کئیر.) سەلمانی . (بک.) سەرتراش، ( جن.) دەللاك .

**بەربەران ــ** (نت.) (مک.) شەکەمێیەکی گەیشتبێتە پایز و ئامادەبێ بەران بخوا .

**بەربەرەکانی ــ** [ ١ــ بەر/١ + ١ــ بەر/١ + ١ــ ئەك/١ + ٣ــ ئانی/٢ ] ، (نت.) ، (مک.) ١ــ تم : ئینکەبەری ★ ڕقەبەری، قینەبەری. ٢ــ ڕوبەڕوی یەك وەستانی دو یا چەند کەس ، هەیئەت و ڕێکخراو ، دەزگای کۆمەلایەتی یا پارتە سیاسییەکان بۆ بێهێزکردن ، تێکشکاندن و لە مەیدانەدەرکردن . ( عا.) مجادلة ، مقابلة ، منافسة :: واز بێنە تۆ ناتوانی بەربەرەکانی ئەم کابرایە بکەیت . بەربەرەکانی نەتەوەی کورد دەگەڵ ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستانە . ★ (سن.) بەرامبەرکێ . ( مک. ) ملە ، ملانی .

**بەربەڕۆچکە ــ** [ ١ــ بەرا ( بەربە ...) + ڕۆچ + کە ( ئم : پچوکی )]، (نت.) ، (مک.) پەنادیوار یا هەر باپەنایەکی دیکە کە زستانان هەتاوی تێبکا ، جا خەڵکی لێکۆدەبێتەوە و خۆیان لەبەر تاو گەرم دەکەنەوە ، یا منداڵان یاری لێدەکەن . تێبـ ــ کەرتی ( ڕۆچ ) لە زمانی پەهلەویدا بە ( ڕۆژ ) وەتراوە و هەروەکو خۆی ماوەتەوە .

**بەربەژن ــ** (نت.) ١ــ دوعا و نوشتەیەکی بە شکڵی چوارگۆشە دە بەرگدەگیرێ و ڕاست و چەپ دە ملدەکرێ و بە لاتەنیشتەوە شۆڕدەبێتەوە . ( عا.) حەمایەل . ٢ــ خشڵێکی ژنانەی کوردەوارییە بە شکڵی حەمایەل لە ئالتون و ... دروستدەکرێ .

**بەربەست ــ** [ ١ــ بەر/٢ + بەست ( بەستن ) ] ، (نت.)١ــ کاری پێشپێگرتن بە ڕۆیشتنی ئاو . ٢ــ ( مج.) کاری دروستکردنی هەر جۆرە مانعێك لە پێش جێبەجێبونی کارێك یا کەسێك ( بۆ هەر مەبەستێك بێ ) .

**بەربەستکردن ــ** ( مصد. مت. ) ١ــ دروستکردنی مانعێك لەسەر ڕێگای ئاوێکا بۆ ئەوەی لە شوێنێکدا پۆنگ بخواتەوە و زۆر ببێ یا بۆ ئەوەی بەلایەکدا نەڕوا کە مەبەست

نەبێ . ٢ــ پێکهێنانی مانعێکی ماددێ
یا مەعنەوێ لە پێش کەسێك یا
جێبەجێبونی کار و مەسەلەیەکدا .
★ (سنـ.) بەربەس‌کردن .

**بەربەس‌کردن** ــ (مصد. متـ.) ، (سنـ.) تم : بەربەست‌کردن .

**بەربەسێڵ** ــ [ بەر ( بەرخ/١) + بە/٣ + سێڵ (ساج) ] ، (نتـ.) ، (مکـ.) چێشتێکی هەندێ مەڵبەندی کوردستانە یا گۆشتی بەرخ لەسەر ساج بە ڕۆنی کەرە سوردەکەنەوە و ماستی مەڕانی بۆ خاودەکەنەوە و بە سەریدا دەکەن . ★ ( کیـ.) قوڕاو .

**بەزبێڵ** ــ (نتـ.) ، (سنـ.) تم : بەرەجوت .

**بەربێلاّ** ــ [ ١ــ بەر/٢ + بێلاّ ؟] ، (نتـ.) ، (مکـ.) شوێنێکی دانیشتنە لە شێوەی میعماریٚ کوردیدا ، سەری داپۆشراوە و سێ لای ژوورە (هەڵدەکەوێ کە هەرسێ لاش نەبێ)و بەردەمی حەوشەیە . ★ بەرهەیوان، پێش‌هەیوان . تێبـ ــ ( هەیوان ) لەوانەیە لە نهۆمی دوەمی خانوش بێ . بەلاّم ( بێلاّ ) هەر لە ئاستی حەوشەدایە .

**بەربێنکە** ــ [ ١ــ بەر/٢ + بێن (مکـ : شاروێران) تم : بەرهەڵبێینە

**بەرپابون** ــ ( مصد. لا.) (کێر.) سازبون ، دروست‌بون ، دامەزران . هەڵگیرسان . ( بۆ ئاژاوە و شەڕ و شۆڕ ) .

**بەرپاکردن** ــ ( مصد. متـ.) سازدان و دروست‌کردن ، دامەزراندن ، هەڵگیرساندن .

**بەرپان** ــ [٢ــ بەر + پان ] ، ( صتـ.) حاڵی قوماشێکی کە لە هاوچەشنەکانی خۆی پانتربێ . // بەرتەسك .

**بەرپشتێند** ــ ( نتـ.) جێگایەکە لە جلوبەرگی کوردیدا ، دەکەوێتە نێوان قەدەکانی پشتێندی کوردێ و ئەو شوێنەی لەشی ئینسان کە پشتێندی لەسەر دەبەسترێ . :: خەنجەرێکی دەسك‌ماهێ دەبەر پشتێندی دابو .

**بەرتاشتێن** ــ [ ٥ــ بەر/٢ + تاشتێن ] ، ( مصد. متـ.) ، (مکـ.) خاوێن‌کردنەوەی ( بەرگەدە ) لە ( تۆکەبەر ) بە گوێزان و چەقۆ یا هەر شتێکی تر . □ (داشتەمر)ێ ژنیان دەهێنا ، (هەمزاوا)یێ (بەرن)یان دەتاشی . تێبـ ــ ا) ئەم کارە زیاتر بە دەرمانێك کە پێی‌دەڵێن ( دارۆ ) ئەنجام دەدرێ ، لەو حاڵەتەدا مەصدەری ( دارۆگرتن ) بەکاردێت . ب) داشتەمر و هەمزاوا دۆ (دێ)ن لە ڕۆژاوای شاری مەهابات .

**بەرتاو** ــ ( نتـ.) ، (مکـ.) هەر جێگایەکی خۆری تێکردبێ . :: منداڵێنە بڕۆنە بەر تاوەکە بۆ خۆتان گەپێ بدەن . ★ بەرخۆر ، بەرڕۆژ، بەرهەتاو .

**بەرتێلانە** ــ [؟] ، (نتـ.) ، (سنـ.) دیارێ و کەلوپەلێکی لە ماڵی زاواوە بۆ ماڵی بوکێی ڕەوانەدەکەن . // ( سنـ.) ناوتێلانە = جیاز . تێبـ ــ ئەم ووشەیەم لە (مردۆخ ، ب ١ ، ل ــ ١٣٩ ) وەرگرتوە ، هەرچەندە (مردۆخ) خۆی ووشەکەی بە فارسێ ئاوا مانا لێداوەتەوە کە لەسەرەوە

نوسرا ، بەلام بە عەرەبی ووشــەی ( برطیل )ی نوسیوە کە وا دەگەیێنێ لای وابوبێ ئەم ووشەیە لە (بەرتیل) داتاشرابێ ، سەرنجێ لە ووشــەی (ناوتیلانە)ی بن‌لەهجــەی سنــەیێ بۆمان دەردەخا کە ووشەی (بەرتیلانە) دەبێ لە [ ١ــ بــەر/٣ + تیلانــە ] دروست‌بوبێ و (تیلانە)ش لە [ تیل + ئانە/٢ یا ٣ ] پێکهاتبێ . (تیل) هەر لە بن‌لەهجەی سنەیدا بە (خێل) دەڵێن و لە موکریانیشدا ( تــیلابێ چاو ). هەیە کە ڕەنگە پێوەندێکی یان بە (تیلانە)وە هــەبێ و ئــەگەر لــەم بۆچونەمدا بە هەڵە نەچوبم مانای ووشــەی ( بەرتــیلانە ) دەبــێتە ( پێش چاوپێکەوتن ) ، پێش ئەوەی زاوا چاوی بە بوکێ بکەوێ .

**بەرتیل** ــ [عــا.] ، (نا.) پــارە یا هەر شتێکی دیکە کە بۆ وەدەست هێنانی قازانجێکی ناڕەوا (ماددی و مەعنەوی ) یــا ڕاپەڕانــدنی کار و مەسەلەیەك لە دایرەکانی حکومــەت ( جاران مەحکەمەی قازیش ) یەکێك دەیــدا بە کاربەدەســتێك . ★ ڕیشودت . ( ســنـ. ) بەرتیــڵ ، ڕیشـڤەت . ( بک. ) بەرتیل ، ڕوشـەت، ڕوشڤەت .

**بەرتیل‌خواردن** ــ ( مصد. مت . ) تم : بەرتیل‌وەرگرتن .

**بەرتیل‌خۆر** ــ ( نت. ، صفــا. ) کەسێکی ئامادەبێ بەرتیل وەربگرێ، حاڵی ئەو کاربەدەستەی کاری خەڵك ڕاناپەڕێنێ ، یا گــرێ و گوڵــی تێدەخا و هەتا پارەیێك شتێــکی نەدەنــێ جێبەجێی نــاکا . :: بەرتیل‌خۆرێکی عەجاییبە . کوڕە تۆ بەرتیلخۆرت نەدیوە ، ئەمــە کــەی بەرتیلخۆرە .

**بەرتیل‌دان** ــ ( مصد. لا.) دانی پارە یا هەر شتێك بە کاربەدەستێکی دەوڵەت لە لایەن کەسێکەوە ، بــۆ ئەوەی ئیشێکی بۆ جێبەجێ‌کات .

**بەرتیل‌وەرگرتن** ــ ( مصد. لا. ) قبوڵ‌کردنی دیاری و پارە وپوڵ لە لایەن کاربەدەستێکی میری‌یەوە بــۆ ڕاپەڕاندن یا ڕەواندنەوەی گیروگرفت لــە کــاری کەسێــکدا . ★ بەرتیل‌خواردن .

**بەرتیڵ** ــ (نا.) ، (سنـ. ) تمـ : بەرتیل .

**بەرجەوەن** ــ [؟] ، (نا.) ( سنـ.) دیمەن ، چاوەنداز ( تم : مردۆخ . ب ١ ، ل ــ ١٣٩ ) . تێبـ ــ مردۆخ ئەم ووشەیەی بــەم جــۆرە مانــا لێداوەتەوە کە نوسراوە ، بەلام مــن وادەزانم کە دەگەڵ ( بەرجەوەند و بەرژەوەند ) ا یەك‌بن .

**بەرخەوەند** ــ ( نت. ) ، ( مک.) تم : بەرژەوەند .

**بەرچا** ــ ( نت. ) ، (مک.) خواردنی بەیــانان کە لەپێش چاخواردنەوەدا دەخورێ و زیاتر ماست و پەنێــر و کەرە و هێلکە و ئەو جۆرە شتانەیە . ★ بەرچایی ، بەرقەننە ، بەرقلیان. ( مک.) قاولتون . (بک.) خورێنێ .

**بەرچاو** ــ ١ــ (نت.) ئەو شتانەی کە چاوی ئادەمیــزاد دەیان‌بینــێ ، ئەوانەی کە لە نیزیــك ئینســان هەڵکەوتون :: بڕۆ لاچۆ بەرچــاوم چوڵ‌کە . □ « کــە تۆ ڕۆیــی ،

لەبەرچاوم ــ کورەی خاکێ بە ئاودا چۆ + لەپاش تۆ ئەی گوڵی نەوڕەستە خاکی کوێ بەسەردا کەم » ، ( وەفایێ ، کۆڕ ، ل ــ ٧٤ ) ٢ــ ( صت.) حاڵی هەمۆ ئەو شتانەی کە لەپێش چاوی ئینسان بن . (مج .) ئاشکرا ، دیار . (عا.) واضح . ★ ( بک. ) بەرەچاف .

**بەرچاوتەنگ ــ** (صت.) ، (مک . ، سیم. ، سنـ. ) ١ــ حاڵی ئادەمیزادێکی توند دەست بە ماڵی خۆیەوە دەگرێ و بەخشندەیێ لەسەر ناکا هێچ ، بۆ ماڵ و منداڵی خۆشی بە زەحمەت لە دڵی دەبێتەوە و لای‌وایە هەر دەستێ لێ دا و لێی خەرج‌کرد دەبڕێتەوە و لە برسان دەمرێ . ★ (مک.) لەچەر ، ڕژد . پێسکە . (سنـ.) دەس‌ووشك . ( جنـ.) چەش‌تەنگ . ٢ــ ئەو کەسەی چاوی بەرایێ نادا خەڵك لە خۆشیێدا ببینێ و حەز ناکا خەڵك هێچیان هەبێ .

**بەرچاوتەنگی ــ** ( حمصـ.) ئەنجامی کار و کردەوەی پیاوێکی بەرچاوتەنگ . ★ ڕژدی ، لەچەری، پیسکەیی .

**بەرچاوخستن ــ ١ــ** (مصت. لا.) لەپێش‌چاوڕاگرتنی شتێ یا مەسەلە و کارێك بۆ ئەوەی جێبەجێ بکرێ . ٢ــ نیشان‌دانی شتێك بەکەسێ یا کەسانێ . **لەبەرچاوخستن ــ** (مصت. مت.) بێ‌نرخ‌کردنی کەسێ یا شتێ لەلای یەکێك و بێ‌ئەهمیەت‌کردنی . بێ‌قەدر و قیمەت‌کردن .

**بەرچاوکە ــ** ( نت. ) ، (کعر.) پارچە قایشێکە هێندێکی ڕێشۆڕێشۆ کراوە و لە سەری وولاغ ( ئەسپ ، ئێستر ، گوێدرێژ )ی دەبەستن و بە نێو چاوانیاندا شۆڕدەبێتەوە بۆ ڕەواندنەوەی مێش و مەگەز . تێبـ ــ ئاشکرایە ئێ ئەسپ دەگەڵ ئێ ئێستر و گوێدرێژ فەرقێکی هەیە و بە مت‌ومۆرۆ یا زێو دەیرازێننەوە . ★ ( مک.) پێشچاوکە . ( سنـ.) بەرچاوە . (سیم.) بەرچاوگە/٢ .

**بەرچاوگە ــ** ( نت.) ، (سیهـ.) ١ــ خشڵێکی ژنانەیە لە ئاڵتون ، زێو یا مت‌ومۆرۆ دروستی دەکەن و ژنان لە نێوەی لای پێشەوەی سەریان قایمی دەکەن و بە ناوچاوانیاندا دێتەخوار . ★ ( مک.) پێشەسەر ٢ــ تم : بەرچاوکە .

**بەرچاوە ــ** (نت.) ، (سنـ.) ١ــ تم : ئافتاب‌گەردان . ٢ــ تم : بەرچاوکە .

**بەرچایێ ــ** ( نت. ) تم : بەرچا .

**بەرچنە ــ** (٤ــ بەر/١ + چن (چنین) + ٥ــ ئە/١ ) ، ( نت.) سەوەتەیێکی پچکۆلەیە بە شکڵی ( هەڕەم ) ، لە بنەوە بارێکە و هەتا دێ بەرینتر دەبێ، زیاتر بۆ چنینەوەی میوە لە درەخت بەکاردێت تا پاشان بکرێتە سەبەتەی گەورە . :: بەرچنەیەك ترێی (خەمزە)مان بۆهاتوە . کوڕینە یەکێکتان بچێتە (ئۆمەرەگەدە) لای کاك جەلالی حەمەی سەعید بەرچنەیێ هەنجیر بێنن . تێبـ ــ لەوانەشە لەباتێ [ ٤ــ بەر/١]ی ئەم ووشەیە [ ١ــ بەر/٣] بێ ئەوکاتە

ماناكەی دەبێتە ( پێش‌چنە ) .

**بەرچەپ** ـ ( نت. ، صت.) دژ ، پێچەوانە . (عا.) منافس . خصم .

**بەرچێبـــلە** ـ [ ١ـ بــەر/٤ + چێلە ؟ ] ، (نت.) ١ـ (مك.) چەرمی ملی ڕەشەووڵاغ كـە بۆ خــوارەوە دادەچۆڕێ . ٢ـ ( ؟ ) یەخە ( تم : گم ، مەهاباد ، ل ـ ٧٣ ) .

**بەرچێن** ـ ( ١ـ بەر/٣ + چێن (چاندن) ] ، (نت.) تم : بەربۆرە/١ .

**بەرچێغ** ـ ( نت.) ١ـ دارێـــكی ڕاستە بەقەدەر بـالای ئینسانێـــك ( كەمتر یا زۆرتر ) درێـــژە ، لـە ڕەشماڵ و سەربانان و . . و . . چەند دانەیەك دەچەقێنن و چێغـی بە دەوردا دەگێڕن . ٢ـ هەمـــوو دارێكی ئاوا ، جا بۆ گێڕانی چیـغ دەكاربكرێ یان نا .

**بەرخ** ـ [ پە : ڤەرەك ، ڤەڕەك ] ، (نا.) ١ـ بەچكەی نێر و مێی (مەڕ) پێش ئەوەی بۆ بڕێنەوە دەست‌بدا . ★ (بك.) بەرخ . (جن.) برە . (زا.) ڤەرێ ، ڤەرێك . ٢ـ (مج.) لەبەر خۆشەویستی یا بۆ ســەركۆنەكردن بە منداڵ و هێندێ جار بە گەورەش دەگوترێ :: بەرخم . بەرخی بابـم تۆزێك هۆشت بێنەوە بەرخۆت ٣ـ یەكێكە لە دوازدە برجی ئاسمان كە بە عەرەبی پێی دەڵێن ( حمەل ) .

**بــەرخی‌نێر** ـ ( نت. ) ١ـ تــم : بەرخەنێر . ٢ـ ( كـنـ ) منـداڵی نێرینە ● **بەرخی نێر بۆ سەربڕینە** ـ (كن.) پیاو بۆ ئەوەیە لە پێناو شتێكا خۆی بەخت‌كات . تێـب ـ ئــەوە ئاشكرایە كە مەڕداران ( بەرخی‌مێ )

سەرنابڕن .

**بەرخستن** ـ ( مصت. لا.) تـم : بەرفرێدان .

**بەرخوردار** ـ [ ٤ـ بەر/١ + خور (خواردن) + دار (ئە.) ] ، ( صفا .) ئەوكەسەی كەڵكی لە كارێ یا شتێ وەرگرتبێ ، لە كار و زەحمەتی خۆی نەتیجەی باشی دەست‌كەوتبێ (بەری لێ خواردبێ ) . ●**بەرخورداربی** ـ ڕستەیەكە بۆ چـــاكە خواســتن و دڵڕاگرتــن بە یەكێـك دەگـوترێ . جاروبارەش بەپێی جێگا و شێـوەی قـــەكردن دەگۆڕێ و بۆنێــكی تۆڕەیی و نارەزایی لێدێ .

**بەرخۆڵە** ـ [ بەرخ/١ + ئۆڵـە /٢ ] ، ( نت.) ١ـ بەرخی كە هێشتـا ساوابێ ٢ـ (مـج.) دایــك بـۆ خۆشەویستی منـــداڵی خــۆی پێ‌دەلاوێنێتــەوە . □« ئۆخـــەی بەرخۆڵەی شیرێنم ، یاخوا مەرگت نەبینم » .

**بەرخەبەبە** ـ [كو. عا.] ، ( نت.) ، (مك.) تم : بەرغەبەبە .

**بەرخەگەل** ـ [ بەرخ/١ + ٣ـ ئە/٢ + گەل ] ، ( نت.) تم : بەرخەل.

**بەرخەل** ـ [ بــەرخ/١ + ئــەل (گەل) ] ، (نت.) رانێـــكی هەمــوی بەرخ‌بێ . ★ (مكـ.) بەرخــەگەل . بەرغەل .

**بەرخەلەوان** ـ [ بەرخەل + ٣ـ ئە/٢ + وان ] ، (نت.) شوانێكی ڕانی بەرخان دەباتە لەوەڕ . ★ ( مك. ، بەرغەلەوان ، بەرخەوان . ( بـك.) بەرخ‌ڤان .

**بەرخەمێ** ـ [ بەرخ/١ + ٣ـ ئە

/٢ + مێ] ، (نت.) بەچکەی مێیینەی مەڕ .

**بەرخبەنێر ــ** (نت.) بەچکەی نێرینەی مەڕ . □« قەومەکان بەو زاتە وا حوکمی لەسەر بەحر و بەڕە + بەرخە نێرێ گەر نەنێرێ هەر کەسێ خاوەن مەڕە » ( ڕەزا ــ ١٥٠ ) .

**بەرخەوان ــ** [ بەرخ/١ + ٣ــ ئە/٢ + وان ] ، (نت.) تە : بەرخەلەوان □ « بۆ خۆت ئەحواڵی لادێ چاك ئەزانی + یەکێ جوتیار . یەکێکی بەرخەوانە » ( گم. ، مەلا ، ل ــ ٢٤ ) .

**بەرد ــ** [؟] ، (نا.) ١ــ جیسمێکی ڕەق و سەختە ، لەسەر زەوێ و ناو کان و شاخ و چیایان زۆرە ، گەورە و پچوك و کۆمای زۆر زل (شاخ)ی هەیە ، شکڵێکی سابیتی نیە و گەلێ ڕەنگی تێدا دەبیندرێ ، لە عەناسوری جیاجیای کیمیایی پێکهاتوە . ٢ــ ئەوەی لە ئەنجامی تەفاعولی کیمیایی لەناو هێندێ ئەندامی لەشی ئینساندا (گورچیلە و .. و ..) دروستدەبێ . :: ئەمە بەردی دەگورچیلەی دایە ، دەبێ عەمەلیات بکرێ . ★ سەنگ ، کوچك . ( بک.) بەر ، کەڤر . (جن.) بەرد . (زا.) بێر . ٣ــ پارچەیەك ئاسن یا هەر ماددەیێکی تری لەم بابەتە کە کێشانەی دیارە و بۆ دیاریکردنی قورسایی ئەو شتانەی کە بە کێشان دەکردرێن و دەفرۆشرێن ، دەخرێتە تای تەرازو . تێب ــ ئێستاش لە دێهاتی کوردستان گەلێ جێگای وای هەیە کە ( بەرد ) بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێت . ★ سەنگ ● **بەرد .. لێباری ــ** (کن.) تۆشی بەلا بێ . **بەردی بن‌گۆم ــ** (نت.) ، (کن.) بۆ شتێکی کە لە دەس‌چوبێ و دۆزینەوەی گران و دژوار بێ یا هەر نەدۆزرێتەوە . **بەردی سارد و گەرم ــ** ( نت.) ، ( کن.) نسکۆ و گیروگرفتی ڕۆژگار :: یا خوا قەت بەردی سارد و گەرمت وەبەر پێ نەیێت . **لەبەردان ــ** ( مصت. لا.) ، (کن.) بەفیڕۆدان و فەوتاندنی شتێك .

**بەرداش ــ** [ بەرد/١ + ١ــ ئاش /١ ] ، (نت.) تاتە بەردێکی سەختە خڕ دەتاشرێ بۆ نانەوەی ئاش ، هەر ئاشێك دو بەرداشی هەیە و لەسەر یەك دادەندرێن ، لێ ژێرەوەیان دادەمەزرێنرێ و لێ سەرەوەیان دەگەڕێ و دانەوێڵە دەهاڕێ . ★ بەرێ ئاش ، کەڤری ئاشی . ( زا.) بێری‌ئاریش .

**بەردان ــ** [ ٨ــ بەر + دان (فە.)]، ( مصت. مت.) ١ــ تە : ئازادکردن/١ :: حەپسە سیاسیەکانی عێراق لە شۆڕشی چاردەی تەموزا بەردران . ٢ــ تە : ئازادکردن/٥ :: جوامێر ژنەکەی بەرداوە و ژنێکی دیکەی هێناوە . ٣ــ ترکەندن :: هەر منداڵە کە یەکێکی بەردەدا و دایکی چەپۆکێکی پێدادەدا . ٤ــ دەست‌هەڵگرتن لە پاسەوانی باغ و بێستان ، لە پاییزاندا لەبەر ئەوەی هێچی‌تر (بەر) نادات :: بێستانەکەی ئاغا سەید جامییان بەرداوە ئیمڕۆ

منداڵان چوبون سێ چوار تریزوریان دێتبوەوە . **تێبەردان** ـ [ تێ ( دە + ی ) + بەردان ] ، (مصت. مت.) . ١ـ بەرەڵڵاکردنی کار و بەرخ و گوێلك و ... بۆ ئەوەی دایکیان بمژن:: جارێ بەرخەکان تێبەردەدەن. ٢ـ هاندانی سەگ بۆ ئەوەی بکەوێتە گیانی کەسێ یا گیانداری :: هەر بەم وڵاتەدا بێن سەگیان تێبەردەدەین . ٣ـ ڕست لە تاژی دامالێن و بەرەڵڵاکردنی بۆ گرتنی نێچیر . :: دو کەروێشکمان دێت تێمان بەردان هیچیان نەکوشت . **تێکبەردان** ـ [تێك ( دە + یەك ) + بەردان ] ، ( مصت. مت.) ١ـ هاندانی دو یا چەند کەس یا دو یا چەند دەستە ئینسان یا گیانداری تر و بەگژ یەکاکردنیان :: ئەو قسانەت بۆیەیە تێکمان بەردەی . ٢ـ ( مج.) فیتنەپێکردن .

**بەردانەوە** ـ [ ١ـ بەر/٤ + دانەوە ] ، (مصت. مت .) خستنەخوارەوەی شتێ یا کەسێ لە شوێنێکی بەرزڕا :: فرۆکە بۆمبای بەردایەوە . پەرداغەکەی بەردایەوە و شکاندی. ●**وەك لەبانێك بەر ... دەنەوە وابو** ـ (کن.) ئاگا ... لەهیچ نەبو ، لە پێشدا هیچ شتێك ... لەو کارەیا ئەو قسەیەی نەدەزانی. (عا.) موباغەتەکرا . ★ ( هل.) تۆپێك .. لەخۆ .. دێت .

**بەرداوێژ** ـ [ بەرد/١ + ئاوێژ ( ئاوێشتن ) ] ، (نت.) مەسافەیە ، ئەوەندەی یەکێك لە شوێنێکەوە بەردی بێکاتێ ، زۆرترین لە ٦٠/٧٠ میتر تێناپەڕێ :: لێرەڕا تا هۆو دارە دڕ بەرداوێژ دەبێ و نابێ .

**بەرداوێ** ـ [ بەرد/١ + ٢ـ ئاوێ ] (صت.) حاڵی زەویەکی بەردی زۆر بێ . :: ئەو مەزرایە زۆر بەرداویە جوتی لێناگەڕێ .

**بەردایی** ـ [ بەرد/١ + ئایی/٢ ]، (صت.) ، (مک.) تم : بەردەڵان/٢ .

**بەردباران** ـ(نت.) تم: بەردەباران.

**بەردبارانکردن** ـ ( مصت . مت. ) تم : بەردەبارانکردن □ « خۆم بەخۆمم کرد ، بەردبارانم کەن ، ئامۆزاگیان . » (فۆلکلۆر) .

**بەردتاش** ـ (نفا.) ، (تت.) بەردتراش .

**بەردتراش** ـ ( نفا.) کەسێکە (بەرد)ان لێك و اوس دەکا تا وای لێبێ بۆ ئەوە دەست بدا لە هێندێ شوێنی خانوبەرەدا کەڵکی لیوەربگیرێ . ★ (سیم.) نەقار. (عا.) . (کێر.) سەنگتراش .

**بەردڕکانە** ـ [٦ـ بەر + دڕ (دڕان) + ئلك + ئانە/٢ ] ، ( نت.) هەرشتێکی وەکو پارە ، جلوبەرگی کۆن کە لە کاتی دەبەرکردنی بەرگی تازە بدرێ بە کەسێ یا میواندارێکی بەو بۆنەوە بۆ دۆست و رەفیقان بکرێ . تێب ـ ئەم ڕەسمە لە نێو ئاغاوەتی کوردا باوبوە کە جلکی تازەیان بۆ خۆیان دەکرد ، کۆنەکەیان دەدا بە دەست و پێوەند .

**بەردکاری** ـ (حمصد.) هەڵچنینی دیوار یا هەر کارێکی تری (بەنایی) کە کەرستەکەی ( بەرد ) بێ . :: ئیمڕۆش بەردکاریمان ماوە .

**بەردکێش** ـ [ بەرد/١ + کێش ( کێشان ) ] ١ـ (نفا.) کەسێکە لە دەشت و چیا (بەرد) کۆدەکاتەوە بە کرێ ، یا بۆ فرۆشتن کێشەوەی دەکا بۆ ئاوەدانی . ٢ـ خەرەکێکە لە دار و تەختە دروستدەکرێ و جۆتێکی پێکەوە دەبەستن و بەسەر پشتی گوێدرێژیدا دەدەن و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك ( بەرد )ی پێ کێشەوە دەکەن .

**بەردڵکەوتن** ـ ( مصت. متـ. ) جیسمێك لە دەرەوە ( بەرد ، گوللە ...) لە دڵی کەسێك بدات . :: گوللەکە بەردڵی کەوتبۆ بۆیە لە جێی خۆی سارد ببۆود . ٢ـ شتێکی مەعنەوی ( شیعر ، قسە ، گۆرانی ، ...) یا (ئاکار، کردەوە، ڕەووشت و خو،...)ی کەسێك یاخۆ هەر خودی پیاوەکە (لەبەر هەرچێکی بێت ) جێگایەك لە دڵی کەسێ یا کەسانێدا بکاتەوە و پەسند بکرێ . ★ چۆنەدڵەوە ، وەبەردڵکەوتن .

**بەردۆخ** ـ (نتـ.) چەرخی خەرەکی خوریڕستن .

**بەردۆگ** ـ (نتـ.) ئەو پێستەیە کە دۆگی مەڕ دادەپۆشێ ، لە کوردەواری دەهێنندێ برێن و کوان و ... ئەوانەی دەگرن ★ ( بکـ.) بەردۆف .

**بەردهەڵقەن** ـ (نفا.) ، (مکـ.) تە : بەردهەڵکەن .

**بەردهەڵکەن** ـ [ بەرد/١ + هەڵکەن ( هەڵکەندن ) ] ، (نفا.) کەسێکە لەوکان و جێگایانەی خڕکە بەرد دەگەڵ گڵ و خۆڵ تێکەڵە ، بە کرێ بۆ خەڵکێ ، یابۆخۆی هەڵدەکەنێ و دەیفرۆشێ . ★ بەردهەڵقەن .

**بەردەباران** ـ [ بەرد/١ + ٣ـ ئە/٢ + باران/٢ ] ، (نتـ.) ١ـ جۆرە سزایەکە بۆ تاوانباران لە کۆنەوە لە کۆمەڵگاکانی ئادەمیزادا باوبوە . (عا.) ڕەجم . ★ سەنگەسار . ٢ـ تە : بەردەبارانکردن/٢ .

**بەردەبارانکردن** ـ ( مصت. متـ.) ١ـ تاوانبارێك بەم ( سزا )یە گەیاندن . تێبـ ـ ئەم کارە بە شێوەی جیاجیا ئەنجام دراوە ، لە هەندێك کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵاتا ، کابرای تاوانباریان تا ناوقەدی لە زەوی گرتوە و دەستیانکردوە بە بەردتێگرتنی هەتا مردوە . لە هێندێکیشیان لە دەشتایێك ڕایانگرتوە و خەڵکیان لە دەورەی کۆکردۆتەوە و بۆ هەر لایەك ڕای‌کردبێ بەردی پێدادراوە . ★ سەنگەسارکردن . ٢ـ زۆر بەرد بە جێگەیێکدا دان و تێبـ ـ ئەم کارە بە نیازی تۆڕەکردن و سوکایەتی بەسەر خاوەنی جێگەکە هێناندەکرێت .

**بەردەباز** ـ [ بەرد/١ + ٣ـ ئە/٢ + باز (بازد) ] ، (نتـ.) بەردێ یا چەند بەردێك کە لەناو جۆگە و چۆمی تەنکاودا دایدەنێن و خەڵك بەسەریاندا لە ئاوەکە دەپەڕنەوە □ « سەر بەردەبازی ڕێتە ، تەن تەختەبەندی جێتە + دڵ مەیلی خاکی پێتە ، ڕوح ماڵی خۆتە بێبە » ( مکبـ ، نالی ، ل ـ ٣٩٥ ) . ★ (مکـ.) پردەباز .

**بەردەپێ ــ** [ بەرد/١ + ٣ــ ئە/٢ + پێ ] ، (نـ.)، (مک.) جۆرێك خڕکە بەردی بێ‌سوچی سەخت و ڕەقە و لەبەر ئەوەی پتەو نیە و کون‌کونـە لەچاو حەجمی سوکە . تێبـ ــ لە کوردەوارێدا بـۆ خاوێن‌کردنـەوەی چڵکی قاچ لە حەماما (زیاتر ئافرەت) بەکاری‌دێنـن ، هەروەهـا بـۆ خۆش‌کردن و زیادە توێك لـە کـەوڵ کردنەوە کەڵـکی لێ‌وەردەگیـرێ ، بەردە مەڕمەڕ و ئەو جۆرە شتانەشی پێ دەسونەوە و پێی سافدەکەن .

**بەردەچەرخ ــ** [ بەرد/١ + ٣ــ ئە/٢ + چەرخ ] ، (نـ.) ، (کعر .) تە : بەردەچەخماغ .

**بەردەچەخماغ ــ** [ بەرد/١ + ٣ــ ئە/٢ + چەخماغ ] ، (نـ.) ، (مک.) جۆرێك بەردی سەخت و ڕەقە ، کە ئاسنی لێ‌بدرێ وەکو بەردەستێ پرێشکی ئاگری لێ‌دەبێتەوە ، لـە فابرێقە دەیتاشـن و لێك و لوسی دەکەن و دەیکەنە دانەی بچوك بچوك، لە چەرخی پوشو ، بەنزێن و غازدا بەهۆی لێ‌خشانی توپی چەرخەکەوە ئـاگر دەکاتـەوە . ★ (کعـر .) بەردەچەرخ .

**بەردەرکە ــ** (نـ.) ، (مک.) تە : بەردەرگا .

**بەردەرگا ــ**[١ــ بەر/٢ + دەرگا]، (نـ.) ، (کعر .) ١ــ نێزیکی دەرگای حەوشەی ماڵ بە دێوی کۆڵانێدا . ٢ــ گۆڕایی ( گەورە یا پچوك ) لەپێش خانوێك بەلای دەروازەی خانودا . ★ ( مک.) بەردەرکە . :: منداڵێنـە بڕونە دەرێ لەبەر دەرگا بۆ خۆتـان یاری بکەن .

**بەردەڕێژ ــ** [ بەرد/١ + ٣ــ ئە /٢ + ڕێژ (رشتن) ، (صتـ.) حاڵی جێگا و ڕێگا یا کۆڵان و خەیابانێ کە بەردی تێ‌گیرابێ تا چاڵ و چۆڵـێ تێدا نەمێنێ و ڕاست و ڕەوان بێ . یا لە کاتی بارانا نەبێتە قوڕ و زەلەق . ★ (کئێر .) سەنگچن، سەنگ‌فەڕش .

**بەردەڕێژکردن ــ** ( مصتـ. متـ. ) ڕێزکردن و قایم‌کردنی بـەرد بـە پانایێ و درێژایێ ڕێـگا و کـۆڵان و خەیاباندا :: لەسەری خەیابانێ‌ڕا تا بەرماڵی خۆمان بەردەڕێژکراوە . ★ سەنگچن‌کردن ، سەنگ‌فەڕش‌کردن .

**بەردەزۆرە ــ** [ بەرد/١ + ٣ــ ئە /٢ + زورە ] ، (نـ.) ، ( مـک . ) بەردێکی سەخت و ڕەقە ڕەنـگی سورێکی زەردباو یا زەردێکی مەیلەو سورە . تێبـ ــ ناوەکەی لەوەوە هاتوە کە بە دەست پێداخشاندن هەسـت بە زبرایێ دەکرێ و دەشکرێ بـە ( زۆرە ) و بـۆ تیـژکردنی داس و چەقـۆ و ... بەکاردێـت . ئـەو شتانەی بەم بەردە تێژدەکرێن پاشان بە ( هەسان ) دەیانساون تا دەمەکەیان کەند و کلۆیان تێدا نەمێنێ .

**بەردەس ــ** (نـ.)، (سیمـ.، سنـ.)، تە : بەردەست .

**بەردەست ــ** (نـ.) ، ( مک.) ١ــ مرۆڤێکی لە کارێـکا و لە ژێـر چاوەدێرێدا یارمەتێ کەسێك دەدا : ئەو کەسەی لە ژێر دەستی کەسێکا کاردەکا . :: بـا ئەو کچۆڵـەیە بەردەستی چێشتکەرەکە بێ . ٢ ــ ژورێکە لە ناو ماڵی دەوڵەمەنداندا ،

تەرخاندەکرێ بۆ دانیشتن و کاری ناوماڵ تێداکردن . :: پچـوٚ ژوٚری بەردەستان کتێبێك لەوێیە بوٚم بێنە. ٣ـ هەر شتێکی لە هاوچەشنەکانی خوٚی جیابکرێتــــەوە بوٚ ئــــەوەی دەمودەست کەلکی لێوەربگیرێ :: دەفتەری بەردەســـــت ، کتــێبی بەردەست ، پوٚلی بەردەست . ★ ( سیمـ. ، سنـ.) بەردەس .

**بەردەستێ ـ** [بەرد/١ + ئەستێ]، (نتـ.) جوٚرە بەردێکی سەخت و ڕەق و ساف و لوٚسە، بە(ئەستێ) لێیدەدەن پرێشکی ئاگری لێدەبێتەوە .

**بەردەستێ ـ**(حمصـ.) ١ـ کارێکی کەسێ لە ژێر چاوەدێرێ کەسێکی دیکەدا دەیکا . :: توٚ بەردەستێبکە با زوٚ تەواو بێ . ٢ـ ملکەچبوٚنـی کەسێك یا کوٚمەلـێك خـــەلّك یـا میللەتێك بوٚ کەســێ یــا کوٚمــەڵ و میللەتێکی دیکە :: ئێتــر جوٚتیـاری کورد لە بەردەستێ ڕزگاری بوە .★ ژێردەستەیێ . ( سنـ.) بەردەستێ .

**بەردەسێ ـ** ( حمصـ. ) ، ( سنـ.) تە : بەردەستێ .

**بەردەشوٚر ـ** [ بەرد/١ + ٣ـ ئە /٢ + شوٚر ( شوٚرتین ) ، (نتـ.) کاری جوداکردنەوەی بەرد و زیـخ لــە هەندێ دانەوێلّە .

**بەردەشوٚرکردن ـ** ( مصتـ. متـ.) شوشتنەوەی هێنـدێ دانەوێلــەی وەکوٚ برنج ، نیسك ، ساوار و ... بوٚ ئەوەی ووردەبەرد و زیخ و شتی دیــکەی لەم بابەتــە ، کەتێیــــاندا هەبێت جیابێتەوە . تێبـ ـ ا) ئــەم کارە بەو جوٚرە دەبێ کە دانەوێلــەی مەبەست دە ئامانێکی پەل دەکەن و ئاوی وەسەر دەگێرن و پاشان لاری دەکەنەوە بوٚ سەر دەفرێکی دیکە و دانەوێلّەکە چونکوٚ سوٚکترە لە بەرد دەگەلّ لوٚزەوی ئاوەکە زوٚتر دەڕژێتە ناو دەفری دوەم و بەرد و زیخەکە لە بنی دەفری یەکەمدا دەمێنێــتەوە ، ئەم کارە ڕەنـگە دو ســێ جــار دوٚپاتبکرێتەوە تا دانەوێلّەکە بەردی لێدەبڕێ . ب) یەکێك لە شێوەکانی جیاکردنەوەی ( زێڕ ) لە زیخ ( لەو شوێنانەی کە زێــڕ دەگەلّ زیــخ تێکەلاّوە ) بەردەشوٚرکردنە .

**بەردەعازەبە ـ** [ بەرد/١ + ٣ـ ئە/٢ + عازەب + ٥ـ ئــە/١ ] ، ( نتـ.) گاشەبەردێــکە لە لادێــی کوردستان . جحێلاّن هێزی خوٚیانی پێ تاقیدەکەنەوە . تێبـ ـ نیاز لــەم تاقیکردنەوە ئەوەیە بزانن بالّقبوون و کاتی ئەوەیان هاتوە ژن بێنن .

**بەردەقانێ ـ** [بەرد/١ + ٣ـ ئە/٢ + قانێ ( ؟ ) ] ، (نتـ.) ، (کعـر.) ئـامرازێکە لە ( بەن ) دەچنــدرێ ناوەڕاستەکەی پانــە و بەرەبــــەرە بارێكدەبێتەوە ، پاشان لە هەردوٚ لایـــــەوە نێــزیکەی ٢٠ ـ ٣٠ سانتیمترێـکی وەکـوٚ گوریسێـکی بارێـــك دەهوٚندرێتـــەوە . لــە ڕابردوٚیێــکی کوٚنــــا وەکـــوٚ ( چـەك )ێـك لـە نـاو لەشکراندا باو بوە و دەگەڵ دوژمـن شەڕیـان پێکردوە ، بەردێکیـان خستوٚتــە ناوڕاستەکەی و لاسکەکانیـان بــە دەستەوە گرتوە هەڵیان سوڕاندوە ، لەپڕ لاسکێکیان بەرداوە و (بەرد)ەکە

بە تەووژمی هەڵسوڕاندنەکەی پێشتر دەرپەڕێو. ★ ( کئێر .) قۆچەقانێ . (سنە.) قەڵماسك . ( جف. ، جنە.) قەڵماسەنگ . تێبـ ــ ئەم ئامرازە تا سەرەتای ئەم چەرخەش لە شارەکانی کوردستانا بۆ ( شەڕەگـەڕەك ) بەکاردەهێنرا ، بەڵام ئێستا تەنیا بـۆ یاری منداڵان و چۆلەکەکوشتن بەکاردێت ، شکڵێشی گۆڕاوە و لـە کوردستانی عێراق بۆ شکلی تازەی ناوی ( دارلاستیق ) و لە کوردستانی ئێران ( قۆچەقانێ جێر ) پەیدابوە .

**بەردەقسڵ** ــ ( نت.) جۆرێـك بەردە . ناوی کیمیایی ( کاربۆناتی کالیسیۆم )ە ، لە (کان) دەریدێنن و دە کوردی تایبەتیدا دەیسوتێنن ، دەبێتە ئاهەك ( قسڵ ) . بۆ پتەوێ و قایمێ لە بناغـەی دیـوار و شمشەکێشانی ناو حەمام و . . . و . . کەلکی لێوەردەگیرێ .

**بەردەگەچ** ــ ( نت. ) ، (سیە.) تە : بەردەگێچ .

**بەردەگێچ** ــ ( نتـ.) ، (مکـ.) بەردێکە لە تەبیعەتدا زۆرە ، ناوی کیمیایێ ( سولفاتی کالیسیۆم )ە کە هێندێك ( ئاو )ی تێدایە ، لە کورەی تایبەتیدا دەیپێژن ، ئاوەکەی دەڕوا و خۆی دەبێتە ( تۆز )ێکی سپێ ، بـۆ کاروباری بەنـایێ بە تـایبەتێ ــ سپێکاریێ ناو خانو بە کەلك دێت . ئەم بـەردە لە هەمـو پارچـە و مەڵبەندەکانی کوردستان بـە زۆری دەستدەکەوێ . ★ ( سـیە. ) بەردەگەچ .

**بەردەلینگ** ــ [ ٣ــ بـەر/٢ + دەلینگ ] ، (نت.) ، (مک.) تێلماسکە قوماشێکە بە دێـوی نـاوەوەی دەرەلینگی ڕانك و پانتۆڵی کوردیدا دایدەدرون .

**بەردەڵان** ــ [ بەرد/١ + ٣ــ ئە/٢ + ڵان ( پب.) ] ، (نت. ، صت.) ١ــ شوێنێکی بەردی زۆربێ . ٢ــ حاڵی جێگایەکی بەردی زۆر هەبێ . ★ بەردایێ .

**بەردەڵانێ**ــ(نت.) جێگای بەردەڵان.

**بـەردەم** ــ ( نتـ.) ١ــ لای پێشەوەی شتێك . :: بە بەردەمی دوکانی وەستا فـەرەجدا بڕۆیـن سلاوێکی لێبکەین . ٢ــ ( مج.) لـە حزوڕا ، لای کەسێ . تێبـ ــ لـەم حاڵەتەدا هەمیشە (لە)ی لە پێشەوە دێت :: لە بەردەمی قازێ ئیقراری کرد .

**بەردەمۆر** ــ [ بەرد/١ + ٣ــ ئە/٢ + مۆر ] ، (نت.) ، (کئێر.) شتێکی چوارسوچی درێژۆکە ، یا خڕە لـە گـڵی (کەربـەلا) و (نەجـەف) دروستدەکرێ و ئایەتێکی قوڕئـان یا ناوی دوازدە ئیمامانی لەسـەر دەنوسرێ ، پێڕەوانی مەزەبی (شیعە) لە کاتی (سوژدە)ی نوێژا ناوچەوانی دەنێنە بان . تێبـ ــ ئەگەر بە ڕێکەوت ( بەردەمۆر ) بە دەسـتەوە نەبێ ، تەزبێحێکی کە هەر لەو گڵە متفەڕکە دروستکراوە دەتوانـێ جێـگەی بگرێتەوە .

**بەردەمەڕمەڕ** ــ ( نت.) بەردێکە لە تیرەی ئەو بەردانەی لە (کالیسۆم) دروستبون . پـاش ئەوەی لـە (کان) دەردێنرێ بە شێوەی تایبەتێ

لێكولوس دەكرێ و برێتفەیێكی تایبەتی هەڵدێنێ ، تا ئەندازەیێك ڕۆنە ، لە كاروباری بەنایی و ڕازاندنەوە ( دێكۆر )ی دەر و ژووری خانو ، بەكاردێت ؛ زۆر ڕەنگی هەیە و گەلێ شتی دیكەشی لێ دروستدەكرێ . تێب . أ) ئەم وشەیە وەختێك دەكاردەكرێ كە باسی ( بەرد )ە كەبی لە حالەتی پێش‌سافكردن و ساوینەوەی‌دا . ب) بە قسەی ژابا ( تم : ل ــ ٣٩٥ ) ووشەی ( مەڕمەڕ ) لە (مارمارۆس)ی یۆنانی وەرگیراوە و فرەنسی پێی دەڵێن ( مارَبر ) و لاڕۆس ( تم : ل ــ ٥٥) دڵێ ئەم وشەیە لە ( مارمۆر )ی لاتینی خوازراوەتەوە .

**بەردەنوێژ ــ** ( نت.) تەڵە بەردێكی پانە یا ( چەند دانەیەك ) لە كەنار حەوزی مزگەوتان و كانیاوی سەر ڕێگا و بانان جێگەی بۆخۆش‌دەكەن و دای دەنێن ، نوێژی لەسەر دەكرێ . ★ تات ، تاتەنوێژ .

**بەردەواز ــ** ( نت.) تم : بەردەباز .

**بەردەوان ــ** [ بەرد/١ + ٣ ــ ئە/٢ + وان ] ، (نت. ، صت.) ١ــ كەسێكە كە دەتوانێ بە شاخی سەخت و زەرد و ماهان هەڵگەڕێ و سەركەوێتە سەر . ٢ــ ناوە بۆ كوڕان . ★ شاخەوان .

**بەردەوك ــ** [ ١ــ بەر/٢ + دەو (دەم) + ئك ] ، (نت.) ، (بك.) ئەو كەسەیە كە پیاوێكی گەورە ( ئاغا ، میر ، پاشا ) هەڵی دەبژێرێ و هەمیشە دەگەڵ خۆی دەیگێڕێ و دەبێتە مەحرەمی ڕازی . ( عا . ) نەدیم . ★ هاودەم ، هامڕاز . تێب ــ ژابا ( تم : ل ــ ٤٤ ) دەڵێ ئەم ووشەیە بە مانای ( مەحرەمی ڕاز)ە و مانای لۆغەتی ووشەكە ئاوایە : « ئەو كەسەی كە پیاو دەتوانێ دەمی خۆی لەلا بكاتەوە و قسە بكا .» .

**بەردێل ــ** [؟] ، ( نت.) ، (هـل.) بەرخە مێیەكی دوو سالی تەواوكردبێ و پێی نابێتە سێ سالان. ★ (مک.) شەكمەڕ .

**بەردێن ــ** [ بەرد/١ + ئێن ] ، ( صت.) حالی هەرشتێكی لە (بەرد) دروستكرابێ . ★ بەردێنە .

**بەردێنە ــ** [ بەرد/١ + ٢ــ ئینە]، ( صت.) تم : بەردێن . :: شێرە بەردێنەكەی ( بابل ) دنیای بە شكڵی ( ئافرەت ) خستوتە ژێر چنگالی خۆی .

**بەرڕۆژ ــ** ( نت.) تم : بەرتاو .

**بەرز ــ** [ ست : بێرێزە . پە : بورز ] ، ( صت.) ، (كعر. ، سن . ، بك . ، جن.) ١ــ درێژ بە باری قیتایێدا :: هەڵگورد چیایەكی بەرزە . ئێستا خانوبەرەی بەرز باوە □ « باڵاكەت بەرزە بەقەد چنارێ + هەرچێ تۆی ناوێ بەردی لێبارێ » ( فۆلكلۆر ) . ٢ــ حالەتی هەندێ شت كە لە باری ئاسایی خۆیان دەردەچن و زیاد دەكەن :: بە دەنگی بەرز قسە مەكەن . ٣ــ گەورەیی پایە و دەرەجەی كۆمەڵایەتی كەسێك و نرخی كارێ یا شتێك :: نالی شاعیرێكی بەرزی نەتەوەی كوردە . دیمۆكراتی ئامانجێكی بەرزە. ٤ــ موتڵەقی بڵیند .

**بەرزاخ** ــ [ ١ــ بەر/٤ + زاخ] ، (نت.) ، (سنە.) تم : بەرکاو .

**بەرزایی** ــ [بەرز + ئایی/١ ] ، (نت.) تم : بڵندایی .

**بەرزبوونەوە** ــ ( مصت. لا.) ١ــ بزوتنەوە و جوڵانەوەی شتێك یا گیاندارێك لە ژێرڕا بۆ لای سەرووی خۆی ، بە جۆرێکی وا کە کەم و زۆر لە شوێنی پێشووی دوورکەوێتەوە ، دەکرێ لەم حاڵەتی دوورکەوتنەوەیدا بە شوێنەکەی پێشوویەوە نووسابێ یا لێیجودابوبێتــــەوە ، جــــا جیابونەوەکەشی یێکجاری بێ یا بــۆ مـــاوەیەك :: فڕۆکـەکـــە هێندە بەرزبۆتەوە هەر بەقـــەدەر چۆلەکەیەك دیــارە . ئەم بـــارانەی دوایی زۆر باش بۆ دەغـڵ بستـێك بەرزبونەوە . ئەم دیوارە دوێنــێ و ئیمڕۆ باش کاری تێداکراوە ، دوگەز بەرزبۆتەوە . ٢ــ زیادبونی پایــە و مەقامی کەســێك :: ئێستــا زۆر بەرزبۆتەوە هێندەی نەمــاوە ببێــتە وەزیر . ئەوەی هێچی دەباراندا نەبێ کە بەرزبۆوە لە خۆی بایی دەبێ . ★ بەرزەوەبون .

**بەرزپــەڕین** ــ ( مصــت. لا.) ، ( سنە .) تم : بەرزفڕین .

**بەرزڕفین** ــ ( مصت. لا.) ، (کعر.) تم : بەرزفڕین .

**بەرزفڕین** ــ ( مصت. لا. ) ١ ــ باڵگرتنەوەی باڵــندە بۆ بڵینــدایی زۆر . ٢ــ ( مجـ.) لە هەمو بابەتێکەوە، خۆ زیاتر لەوەی کە هەیە خستنــە بەرچاو . ★ خۆهەڵکێشان . ٣ــ چـاو دە پایـــە و مەقـــامی زلی کۆمەڵایەتی . سیاسی ، . . . و . . . بڕێــن □« بەرزفــڕین ملــی پیــاو ئەشکێنێ » .

**بەرزکردن** ــ ( مصت. مت.) ١ــ تمـ : بەرزکردنــەوە . ٢ــ (مــجـ.) زیادکردنی پایە و مەقامی کەسێ .

**بەرزکردنەوە** ــ ( مصت. مت.) ١ــ شتێك یا کەسێ لە شــوێن خــۆی بەرەوژۆرتــرکردن :: منداڵـــەکەی بەرزکردەوە و کوتای بە عەرزا . ٢ــ شت بەسەریەکا کەڵەکەکردن بـــە جــۆرێ کە لە ئاســـتی زەویڕا بڵیندبێ . :: بەقەد کێوێك فــەردە شەکریان لەم دەشتە بەرز کردبوە . ٣ــ (مجـ.) تم : بەرزکردن/٢ :: نــانی سوێرە هەر کەسێ بەرزی دەکــاتەوە پاشان دەلاقی ڕۆدێت .

**بەرزگ** ــ [ ١ــ بەر/٤ + زگ ] ، ( نت.)، (مکـ.) ١ــ تم : بەرمسوڵدان . ٢ــ شوێنی لای خوارەوەی گیاندارانی چوارپێ . :: گورێسەکە بە بەر زگی وولاغەکەدا بەرە و لەولاوە بێهێنەوە سەر پشتی ★ (سیمـ.) بەرسك .

**بەرزە** ــ [؟] ، (صت.) ، (بکـ.) تم : بزر .

**بەرزەبڵێس** ــ (نت.) کەسێکی لەناو قسەی خەڵکا هەڵبداتێ و قسەکەی پێببڕێتەوە .

**بەرزەپێ** ــ [ بەرز/٤ + ٣ــ ئە/٢ + پێ ] ، ( بنت.) بە شێوەیەکی تەواو لە جێی خۆهەڵستان و لەسەر قــاچ وەستان :: هەر هاتە ژورێ هەموویان بەرزەپێ لەبەری هەڵستان .

**بەرزەجوڕە** ــ ( نتــ.) ، (سـنـ.) حەشورەیەکە وەکو ( کوللە ) وایە ،

بەلام پچوکترە و ڕەنگی شێنە ، لەناو دەغلاندا دەژیٚ ، هەمیشە زیقەزیق و جیرەجیر دەکا و دەنگی تیژە . (عا.) زیز ؛ صرار . ★ جرجـرە . بەرزەچڕە .

**بەرزەچڕە** ـ ( نت. ) ، ( شن. ) تم : بەرزەچڕە .

**بەرزەحەوایلە** ـ (نت.) ، (سن.) تم : بادەوە .

**بەرزەدەماغ** ـ [ بەرز/٤ + ٣ـ ئە/٢ + دەماغ ] ، ( صت. ) لوتبەرز ، لەخۆڕازی ، ئەو کەسەی بە خۆی دەنازیٚ ، زۆرحزل .

**بەرزەکیبانان** ـ [ بەرز + ١ـ ئەك /٢ + ١ـ ئی + ١ـ بان/١ + ٢ـ ئان/١ ] (نت.) ، (کعر.) ١ـ مەوجودێکی ئەفسانەییە ، بەو جۆرەی لە چیرۆکەکانی فۆلکلۆریدا باسی کراوە زۆر درێژ و بالابلیندە، هەر لە سەربانان قیت دەبێتەوە و خۆی پێشانی خەلکی دەدا ، یا بە پێلەقە بانەکە دەکوتێتەوە و گازی خەلکی مالەکە دەکات ، کە بۆی چون لەبەر چاوان وون دەبیٚ . ٢ـ ( مج. ) کەسێکی بیٚهەستوخوست لە گیروگرفت یا گونگەل و گیچەلان ڕزگاری دەبیٚ و بۆی دەردەچیٚ :: ئاژاوەکەی نایەوە و خۆی وەك بەرزەکیبانان بۆیدەرچو .

**بەرزەلنگ** ـ ( نت. ) گیایەکی بۆنخۆشی بەدەوامە، دەگەل جاترە و نەعنا و پنگ ، بەك ( تیرە )ن ، لە شوێنی خیسك شیندەبیٚ . گول و گەلاکەی هەرتکیان بۆنیان هەیە .

**بەرزەوولاخ** ـ [ بەرز/ ٤ + ٣ـ ئە/٢ + وولاخ ] ، (نت.) ، (کعر.) ئەسپ ، ئێستر . ★ (مك.) وولاغی بەرزە .

**بەرزەوەبون** ـ ( مصت. لا. ) ، (سن.) تم : بەرزبونەوە .

**بەرزەهەوایلە** ـ [ بەرز/٤ + ٣ـ ئە/٢ + هەوا + ئێلە ] ، (نت.)، (سن.) ١ـ تم : بادەوە . ٢ـ یارییەکی مندالانەیە ، بەرد بۆ هەوا هەلداوێژن و هەولدەدەن کە دێتەوە خوار بیگرنەوە و نەیەلن بکەوێتە عەرزیٚ .

**بەرزێتیٚ** ـ (نت.) تم : بەرزاییٚ :: پایەی کەم شاعیری کورد دەگاتە بەرزێتیٚ نالیٚ . تێب ـ هس : « هەرابێرێزەئیتیٚ » کە لە زمانی ئاوێستایدا بە ( چیای ئەلبورز ) لە باکوری تاران گوتراوە ، « هەرا » بە مانای چیاو « بێرێزەیتیٚ » بە مانای ( بەرزێتیٚ )یە .

**بەرزێلان** ـ (نت.) ، (سن.) تم : ئەسکەملە .

**بەرزین** ـ (صت. ) حالی نۆمایەکی وەختی ئەوەی هاتبیٚ بگیریٚ و زینی بخرێتە سەر پشت ، جوانوێکی هاتبێتە ئەوەی سوار هەلبگریٚ .

**بەرژەنەك** ـ [ ٢ـ بەر + ژەن + ١ـ ئەك/٣ ] ، (نت.) ، « دارێکی تەنکی پانە لەبەر دەمی (دانە) و ( گورد )ا دائەنریٚ بۆ ڕاگرتنی ئەندازەی پانیٚ تەنراوەکە بۆ ئەوەی خواروگیڕ نەبیٚ » ( خا. ؛ ب١ ، ل ـ ١٥٦ ) .

**بەرژەوەند** ـ [ ؟ ] ، ١ـ (نمص .)، (مك.) لێكدانەوەی کاران ،

ووردبوونەوە و تێوەڕامان بۆ دیاریکردنی چاکی و خراپی . ٢ـ (نا.) ، (کعر.) مەسەڵەحەت ، لێوەشانەوە .

**بەرسك** ـ (نتـ.) ، (سیە.) تـم : بەرزگ .

**بەرسمێڵ** ـ [ ١ـ بەر/٤ + سمێڵ ] ، (نتـ.) زێدە توکی سمێڵ کە بەسەر لێوی سەرەوەی مرۆڤا بەرەو ناوەدەمی دێتە خوارێ . □ « قەپۆزت دانەپۆشێ بەرسمێڵت + بەسەر ملتا نەبێ وەك یاڵی کەمتیار» ( ڕەزا ـ ٢٣ ) ★ (بکـ.) بەرسمبێل .

**بەرسمێڵ کردن** ـ (مصتـ. متـ. ) قرتاندنی زێدەموی سمێڵ و لێكولوس کردنی دەگەڵ سنووری لێوی سەرەوە .

**بەرستیلە** ـ [؟] ، (نتـ.) ، (کعر.) ترێیەکە هێشتا ئاوی تێنەگەڕابێ و شیرن نەبوبێ . تێبـ ـ ١ ) من زیاتر بۆ ئەوە دەچم کە (ستیلە) لەم وشەیەدا هاوتای ( شیرە ) بێ ، جا یا بەسەر زار و زمانانەوە وای بەسەر هاتوە یاخۆ شکڵێکی کۆنتری (شیرە)یە . ب) بەرستیلە ماددەی ( ترشێ تارتارات )ی تێدایە و ترشە، لە کوردەواری دەیکەنە هێندێ چێشتانەوە تا ترشیانبکا و بۆ دابەزاندنی پلەی گەرمای لەشی نەخۆش بەکاریدێنن . پەسیرە ، پەستیلە . (کئیر.) قۆرە . ( سنـ. ) هالە .

**بەرغەبەبە** [ ١ـ بە/٤ + غەبەب (عا. + ئە/١ ) ] ، (نتـ.) ، (مکـ.) پێستی ژێرچەنەکەی ئینسانی قەڵەو کە لەبەر قورسایی ، یا ئی پیاوی پیر کە لەبەر بێگۆشتی داچۆڕابێ . ★ بەرخەبەبە . ( زا.) بەرکور .

**بەرغەل** ـ ( نتـ. ) ، (مکـ.) تـم : بەرخەل .

**بەرغەلەوان** ـ (نتـ.) ، (مکـ . ) تم : بەرخەلەوان .

**بەرفڕێدان** ـ [ ٤ـ بەر/٢ + فڕێدان ] ، (مصتـ. لا.) تم : بەرهاویشتن :: مەڕەکانمان ئەو ساڵ لە (سەرما)ن زۆریان بەریانفڕیدا .

**بەرقلیان** ـ (نتـ.) ، (سنـ.) تم : بەرچا .

**بەرقەد** ـ (نتـ.) ، (مکـ.) تـم : بەرکاو تێبـ ـ زیاتر دەگەڵ ووشەی (شاخ) ئیزافە دەکرێ . :: بەرقەدی شاخی .

**بەرقەنە** ـ ( نتـ. ) تم : بەرچا .

**بەرك** ـ (نا.) ، (بکـ.) تم : گوللە. تێبـ ـ لە نێوان دەنگی (ر)و (ك)دا بزوێنە کوردی هەیە (بەر ، ك) .

**بەرکار** ـ (نتـ.) هەر شتێکی ئامادەکرابێ بۆ ئەوەی دەکاربکرێ یا کارێکی لەسەر بکرێ .

**بەرکاو** ـ [ ١ـبەر/٤ + کاو = کێو ] ، (نتـ.) ، (سنـ.) دامێنی چیا و کێو ★ (سنـ.) بەرزاخ ، کەمەر ( تم : مردۆخ ، ب١ ، ل ـ ١٤٩ ) ، (مکـ.) بەرقەد .

**بەرکوت** ـ [ ١ـ بەر/٢ + کوت ( کوتان ) ] ، (نتـ.) بەشێکە لە دەغڵی دروواوەی هێشتا گێرەنەکراو ، کە لەبەر پێوێستی جیادەکرێتەوە و

سڕردەکرێ .

**بەرکوڵ ــ** [ ١ــ بەر/٤ + کوڵ ( کوڵین ) ] ، (نت.) هێندێك چێشتە کە پێش ئەوەی بۆ هەمو خەڵکی ماڵ تێبکرێ ، دەکرێتە قاپێکەوە . تێب ــ ئەمە زیاتر بۆ منداڵان تێدەکرێ و دەیاندەنێ بیخۆن ، یا بۆ کەسێك ( زیاتر کابان ) کە زۆتر برسێ بۆبێ .

**بەرکوڵکردن ــ** ( مصت. لا.) خواردنی چێشت پێش ئەو خەڵکانەی کە دەبێ لێی بخۆن .

**بەرکۆ ــ** [؟] ، (نت.) ، (سنـ.) گۆپکەیێکە لە لای پێشەوەی (زین)ی کوردێ ، لە سواربونا دەستی پێدەگیرێ و لە کاتی پێویستیشا دەستەجڵەوی بەسەردا دەکرێ . ★ ( بک. ، مل.) قەرپۆز .

**بەرکۆش ــ** [ ١ــ بەر/٤ + کۆش]، (نت.) بەرهەڵبێنەی پچوك .

**بەرکەکردن ــ** [ عا. کو. ] ، [بەرکە ( برکة ) + کردن ] ، (مصت. لا. ) ، (مک.) زیادکردن و زەووزۆکردنی گیاندارانی کەوێ :: وەحە وەح یا خوا بەرکە نەکەی ، خۆشیرەکەی ڕشت. تێب ــ جاروبارە دایکان کە تۆڕە دەبن وەکو ( تۆك ) بە منداڵی خۆیانی دەڵێن .

**بەرکەڵ ــ** [ ١ــ بەر/٤ + کەڵ]، (نت.) ڕەشەووڵاغی سێ ساڵانە کە بۆ ئەوە دەستدا کەڵبگرێ .

**بەرکەمرە ــ** [ بەر ( بەرد ) + کەمرە ] ، (نت.) ، (مک.) جۆرەبەردێکە لە هێندێك شوێنی کوردستانی ئێران (ئەوەندەی من پێم شكدێت) ، وەکو خەڵوز ئاگر دەگرێ و دەگەشێتەوە و بۆ گەرمکردنی سەماوەر بەکاریدێنن . تێب ــ أ) ( بەرکەمران ) ناوی دێیەکە لە مەڵبەندی لاجانێ نیزیکی ( خانێ ) ئەو بەردەی زۆرە . ب) ئەگەر ئەم ناوە لەباتێ : ڕەژێ بەرد ، زوغاڵ سەنگ و (فحم الحجری) دەکاربکرێت جێی خۆیەتی .

**بەرکەوتن ــ** [ ١ ــ بەر/٤ + کەوتن ] ، (مصت. لا.) (سیم.) ١ــ هەڵەنگوتنی جیسمێك دەجیسمێکی دیکە :: بەردێکی بەرکەوت سەری شکا ، گوللەی بەرکەوت ★ پێکەوتن. (مک.) وێکەوتن . ٢ــ بون بەژێر شتێکەوە :: دیوارەکە ڕۆخا دوو کەسی بەرکەوت ، بەر ترومبێل کەوت و مرد . ٣ــ بەشپێبڕان ، بەنسێبون :: هەر سەری کێلۆیەك شەکری بەردەکەوێ . کوڕە داینێ ئەوەندەت بەرناکەوێ . هەر ئەوەندەم بەرکەوت . ★ ( مک.) وەبەرکەوتن . **وەبەرکەوتن ــ** (مصت. لا.) ، (مک.) تم : بەرکەوتن/٣ .

**بەرگ ــ** [ ١ــ بەر /٢ + نگ ] ، ( صمف.) ، ( سنـ. ) تم : ٢ــ بەرتین. تێب ــ أ) لە نێوان دەنگی ( ر ) و (گ)دا سوکە دەنگێکی (هەمزە) دەبیسترێ کە پاشماوەی (نگ)ە و بە تەواوێ نەسواوە ، بە کورتێ ئەوەی پێی دڵێن بزوێنە کوردێ لەم ووشەیەدا و لە ووشەی ( بەرگین )دا خۆی دەنوێنێ . ب ) هەروەکو لەسەرەوە باسکرا ( أ ) ئەم ووشەیە جۆرێك لەدەم دێتەدەر دەگەڵ ووشەی ( بەرگ ) کە هەر لە دوای ئەمەوە

دێت جیاوازە ، هەر بۆیەش ژمارەم بۆ هێچ کامیان دانەناوە و نەمکردن بە ( ١ـ بەرگ ، ٢ـ بەرگ ) ئەگەرچی هەرتکیان هەروەك یەك دەنوسرێن ، ئەمەش یەکێکە لە کەموکوڕیی ئەلفوبێتکەمان کە تا ئێستا چارەی بۆ نەدۆزراوەتەوە .

**بەرگ ـ** [ ست : ڤەریکە . پە : ڤەرك ، ڤەرگ ، ڤەلگ . ] ، (نـا.) ١ـ بەشێکە لە گیاوگوڵ و دارودرەخت ، پان و تەنکە ـ شکڵ و پانایی بە پێی دار و گیا دەگۆڕێ ـ بە ساقەتی گیا و لكوپۆپی دارانەوە نوساوە ، ڕەنگی سەوزە . سەوزاییشی لە گیاوگوڵی جۆربەجۆرا دەگۆڕێ ـ ئەم بەشەی گیاوگوڵ ئیشك دەبێ و ئێ داران زوربەیان لە پاییزا دەوەرێ . □ « مسولمانان بزانن شەو چ وەختە ، کە بولبول عاشقی بەرگی درەختە » ( فۆلکلۆر ) ★ (مکـ ، سنـ ، سیمـ.) گەڵا . ( جنـ. گیلا = گەڵای ئیشکی دار ) ، ( سەردەشت ) گەڵ . ( هلـ.) پەلك . (هو.) پەرگ . (سنـ.) پەڵگ . (بکـ.) بیرۆ ، بەلگ . (زا.) ڤێلگۆ ـ لقوپۆپ و گەڵای دار ـ ( تم : ژابا ـ ٥٥) ، ( جنـ.) بەلگ . هس : (عا.) وەڕەق ، وەڕەقە (محر : بەرگ ) ٢ـ ئەو شتانەیە کە مرۆڤ پاش جیابونەوەی لە ژیانی حەیوانی بۆ داپۆشینی لەش و بەربەرەکانی دەگەڵ سەرما و گەرما ، دایهێناوە و دەبەری دەکا . شێوەی دروستکردن و ئەو ماددەیەش کە لێی دروستدەکرێ وێڕای ژیانی ئادەمیزاد و پێشکەوتنی شارستانێتی گۆڕاوە تا وای لێهاتوە کە ئیمڕۆ دەیبینین و هەر نەتەوەیەی بەرگی نەتەوایەتی تایبەتی هەیە . □ « پاتشا بەرگی نوێت لێ مەبارەك نەبێ » ، « هەرچەندە کە ڕۆتم بە خودا مائیلی ڕۆتم + بێ بەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە » ( مکـ . نالی : ل ـ ٥٣٤ ) ★ (سنـ.) سێپاڵ . (سیمـ.) جلوبەرگ . (مکـ.) شمەك ، جل ، جلك (ککـ.) کاڵا ، کەلپەل ، کەلوپەل .

**بەرگیسەفەر ـ**(نتـ.) ئەو جلکانەی ئینسانێك بۆ سەفەر دەبەریدەکا ، سەفەرەکە دەیسەپێنێ کە دەبێ چ جۆرە بەرگێك دەبەرکات ، بۆ نمونە ئەگەر یەکێك بچێ بۆ (ڕاو) و زستانێش بێ جۆرە جلکێ دەبەردەکا و بۆ هەمان مەبەست لە هاوینا جۆرێکی دیکە و ....و... بەرگیشایی و شێنان ـ (نتـ.) دو جۆرە جلکن : یەکیان ئاڵ و والایە بۆ ( شایی ) و پیاو خۆشی دەگەڵ دەڕازێنێتەوە . ئەوی دیکەیان ( ڕەش ) یا (خمی)یە بۆ سەر پرسە و بۆ ئازیەتباری دەبەردەکرێ . **« بەرگی شایی و شێنانی هەر ئەوەیە»** ، (کنـ.) نەدارە و بۆ هەمو جۆرە ڕۆداوێك تەنیا دەستە جلکێکی هەیە . **بەرگی غەزەبی دەبەرکرد ـ** (کنـ.) ڕقی هەڵستا و تۆڕەبو . ٣ـ شتێکە لە قوماش ، کاغەز ، چەرم و ... دروستدەکرێ و بە پێی مەبەست شکڵی دەگۆڕێ ، هەمو یا بەشێ لە بەعزە شتێکی پێ دادەپۆشن

تا لە چلکن‌بۆن ، شکان ، و . . .
بیپارێزێت :: بەرگی ( کابە ) هەمۆی ئایەتی قورئانی لێنوسراوە . بەرگی ئەم سەنیرە بە جارێك چلکن بوە بیگۆڕن . ٤ـ بەشێك لە چەند بەشی کتێبێك کە لە بەشەکانی دیکەی جوداکرابێتەوە و بە جیا جزۆبەندکرابێ . :: بەرگی پێنجەمی « فەرهەنگی فارسیِ » بەرگی دوەمی « قامۆسی زمانی کوردیِ » .

**بەرگایێ** ـ [ ١ـ بەر/٢ + گا + ٣ـ ئێ ] ، (نت.) کەسێکە کە بۆ ڕاهێنان و فێرەجۆت و گێرەکردنی گاجۆتێ کە تازە ( نیر )ی خرابێتە سەر ملی ، لە پێش جۆت دەڕوا .

**بەرگاییلکە** ـ [ ١ـ بەر/٢ + گا + ئێلکە ] ، (نت.) باڵندەیەکی پچۆکە لە تێرەی چۆلەکە و کاتێ جۆتێر جۆت لێدەخوڕێ لەبەردەم جۆتەکەوە هەڵدەقونێ . ★ کلك هەڵتەکێنە ، کلك هەڵسەنگێنە .

**بەرگ‌پێداگرتن** ـ ( مصت. مت.) داپۆشینی لێفە و هەرچێ وەکو لێفە بێ ، بە (بەرگ /٣ ) . ★ ( سیم.) بەرگ‌پیاگرتن .

**بەرگ‌پیاگرتن** ـ (مصت. مت.) ، (سیم.) تم : بەرگ‌پێداگرتن .

**بەرگ‌تێ‌گرتن** ـ [ بەرگ/٣ + تێ ( دە + ی ) + گرتن ] ، ( مصت. مت.) کتێب ، دەفتەرو . . . لە مقەبیا یا کاغەزەوە پێچان .

**بەرگ‌تێ‌هەڵکێشان** ـ [بەرگ/٣+ تێ ( دە + ی ) + هەڵ ( پێبف.) + کێشان ] ، داپۆشینی سەرتین ، دۆشەگ و . . . کە (بەرگ/٣) یان

وەکو کیسە بۆ دروستدەکرێ .

**بەرگدرۆ** ـ [ بەرگ/٢ + درۆ ( دروَن ) ] ، (نفا. ، صفا.)ئەو کەسەیە کە قوماش بە ئەندازەی قەد و بالای خەڵك دەبڕێ و دەیدروێ و دەیکا بە جلك . ★ جلدرۆ . خەیات (عا.) .

**١ـ بەرگرتن** ـ [ ١ـ بەر/٢ + گرتن ] ، (مصت. مت.) ١ـ ڕێگابڕینەوە لە شتێ یا کەسێ تا نەتوانێ کارێکی دەیەوێ بیکات :: بەری ئەستێڵەکە بگرن . دەتو لاچۆ بەری مەگرە هەر ئێستا بۆ حەوت پشتی ئاقڵ دەکا . ★ پێش‌گرتن . ٢ـ ڕێگەبڕینەوە لە تەشەنەکردنی هەندێ برین و نەخۆشێ پێست ( ئاگرە ، بێرۆ . . .)بە پێی داب و دەستوری کوردەوارێ . تم : ئاگرە ( تێب .) .

**٢ـ بەرگرتن** ـ[٩ـ بەر + گرتن]، ( مصت. مت. ) ، (مک.) تم : بەرگەگرتن .

**بەرگرێ** ـ [ ١ـ بەر/٢ + گر (گرتن) + ٢ـ ئێ ] ، ( نمص . ) ، ( نت.) پێش لە پێشکەوتن و سەرکەوتنی نەیار و دوژمنان بڕینەوە، بەرامبەر دوژمن وەستان و خۆڕاگرتن . (عا.) دیفاع ، مقاوەمە :: وەزیری بەرگرێ . ئیستیعمار و کۆنە پەرستان بەرگرێ بزۆتنەوەی نەتەوایەتێ ئازادیخوازانەیان پێناکرێ . ★ (سن.) بەرگل . (بک.) بەرەوانێ .

**بەرگن** ـ [؟] ، (نت.) ، ( سیم . ؛ مک.) خورێ بەرخ کە بۆ یەکەم جار

دەبڕێتەوە ، لە خوریّ دیکە نەرم ترە ، لە کوردستان زیاتر دەستەوانە و سەرکڵاوە و ... لێ دروست دەکەن . ★ ( بکە ، جند . هل.) لوا .•(لو.) بەرگێ .

**بەرگە ـ** | ست : ڤەردنگھ . | ، (نا.) ، (مکـ.) توانستی خۆگرتنی ئینسان یا هەر گیاندار و شتێ لە پێش هێزێکی ماددیّ یا مەعنەویّ .

**بەرگەپشتێ ـ** [ بەرگ/٣ + ٣ـ ئە/٢ + پشتێ ] ، (نتـ.) ، (سیمـ.) تە : بەرگەسەرێن تێبـ ـ پشتێ جۆرە سەرێنێکە .

**بەرگەدەمانچە ـ** (نتـ.) پارچەیەك چەرمە بە شکڵی دەمانچە ، دوّ تویّ دەیدروّن و دەمانچەی دەخەنە ناو .

**بەرگەسەرێن ـ** (نتـ.) ، (کئێر.)، کیسەیەکی ئوستوانەیی شکڵە ، لە چیت یا بلوریّ دروست دەکریّ و ( سەرێن )ی دە ناو دەندریّ . ★ (مکـ.) بەرگەسەنێر . (سیمـ.) بەرگەپشتێ .

**بەرگەسەعات ـ** (نتـ.) ، (مکـ.) کیسەیێکی پچوکە لە قایش یا مەخمەر دروست دەکرا یا لە (دەزوّ) دەچندرا و سەعاتی سەرقاپداری دەخرایە ناو ، بۆ ئەوەی لە گیرفانا ژەنگ نەهێنیّ .

**بەرگەسەنێر ـ** (نتـ.) ، (مکـ.) تە : بەرگەسەرێن .

**بەرگەشت ـ** [ فر. ] ، (نمصـ.) تە : بازگەشت .

**بەرگەشتبۆنەوە ـ** [ فر. کو. ] ، ( مصتـ. لا.) ، (مکـ.) تە : بازگەشتبۆنەوە :: پیاو نابێ لە قسەی خۆی بەرگەشتبێتەوە . ☐ « یارەبیّ خولایە تۆبە و ئەستەخفیرولڵا ، بەرگەشتبومەوە » (ڕستەیێکە یەکێك دەیڵێ کە (کفر)ێکی بە دەمدا هاتبێ .

**بەرگەکتێب ـ** (نتـ.) ١ـ دوّ پارچە مقەبیا یا چەرم یا کاغەزی ئەستور و ... کە هەموّ پەڕەکانی کتێبێك (پاش جزوبەندکردن) دەگرێتە ناو خۆی و لە پەڕوتبوّن دەیپارێزیّ . ٢ـ پارچەیەك کاغەز یا هەر شتێکی دیکەی لەم باباتەیە ، لەسەر ( بەرگەکتێب /١ )ەوە دە کتێبانەوە دەپێچریّ تا چڵکن نەبێ .

**بەرگەگرتن ـ** ( مصتـ. لا.) ، ( مکـ.) ڕاوەستان ، خۆڕاگرتن ، مقاوەمەتکردن ، دەوامهێنان :: ئیمپریالیزم بەرگەی خەباتی میللەتان ناگریّ . دێزە و گۆزەی خاراو چاتر بەرگە دەگرن . چوارپێنەیەکەن بەرگەی ئەم زستانەناگریّ . لەشکری بێ بیروباوەڕ بەرگەی شەڕ ناگریّ . ئەم قوماشە عەمارەپۆیە بەرگەی شوشتن ناگریّ .

**بەرگەلێفە ـ** [ بەرگ/٣ + ئە/٢ + لێفە ] ، (نتـ.)، (مکـ.) پارچەیەك ( بلوریّ )یە بە بەری لێفەوەی دەدروّن و کە چڵکن بۆ لێی دەکەنەوە بۆ شوشتن . ★ (کعر.) متێل . ( کئێر.) مەلافە .

**بەرگەنەگرتن ـ** (مصـ. لا.) خۆ پێ ڕانەگیران لە پێش ڕوّداو و کارەسات و زەبروزەنگ و هەر جۆرە هێزێکی بە جۆرێك لە جۆران چەشنێ قورسایێ دەخەنە سەر

ئینسانێ یا شتێ و کاری تێدە‌کەن .
**بەرگێرخستن** ــ (مصد. مت.) ، ( سیم. ) تم : بەگێرهێنان .
**بەرگێرکەوتن** ــ (مصت. لا.) ، ( سیم.) تم : بەگێرکەوتن/٣ .
**بەرگێرهاتن** ــ (مصت. لا.) ، ( کعر.) تم : بەگێرکەوتن .
**بەرگێرهێنان** ــ ( مصد. مت.) ، ( کعر.) تم : بەگێرهێنان .
**بەرگێن** ــ ( ١ــ بەر/٢ + ئـگ + ئێن ] ، ( صمف.) ، (سن.) تم : ٢ــ بەرێن .
**بەرلێخواردن** ــ [ ٤ــ بەر/١ + لێ ( لە + ی ) + خواردن] ، (مصد. مت.) ١ــ خواردنی میوەی باغێك :: کوا هەر دەلەی باغم هەیە ، باغم هەیە ئێمە بەرمان لێنەخوارد . ئێستا خەرێکی باغ دەچەقێنی کەنگێ بەری لێدەخۆی ٢ــ (کن.) کەلك‌وەرگرتن لە شتێ ، نەتیجەوەرگرتن :: بەم هەمۆ ڕەنجە منداڵەکانی پێگەیاند بەری لێنەخواردن . جوانەمەرگە ! بەری لە ژیانی خۆی نەخوارد .
**بەرماغ** ــ [تو.] ، (نا.) قامێشەجگەرە .
**بەرماڵ** ــ [ ١ــ بەر/٢ + ماڵ ] ، ( نت.) ١ــ دۆتەختە (کوێن)ی گەورەیە ، کاتێ باوبژ یا باران دەنێو ڕەشماڵێ دەکا ، لەولایەی باران و . . . تێیدەکا ، بە پێشیەوە دەگرن .
٢ــ جاجمی شەقە کە جۆلای کوردستان دەیتەنن . پێخەف یا کەلوپەلی دیکەی تێوەدەپێچن وەکۆ پێخەفیش کەلکی لێوەردەگیرێ .
٣ــ پارچەیەك خام یا تەختەیەکی پچۆکی قاڵێ ، یا قوماشێکی تایبەتییە و جۆلا دەیتەنێ و پاك و خاوێن ڕادەگرن و بۆ نوێژ لەسەرکردن تەرخان دەکرێت . ★ (هل.) دۆگرد . تێب ــ وا دەزانم ئەم وشەی ( بەرماڵ ) ە لە پێش هەمۆ ماناکانی دیکەیدا بۆ مانای یەکەم ددکارکراوە و بۆ مانای سێیەمی لەبەروێچۆن ( لەباری تەنێنەوە ) داهاتوە . ● **بەرماڵی لەسەر ئاو دەگەڕێ** ــ ( کن.) پیاوی چاك و مسوڵمانە ، دەست و دڵی پاکە .
**بەرسوڵدان** ــ [ ١ــ بەر/٤ + مسوڵدان ] ، ئەو بەشەی زگی ئادەمیزاد کە دەکەوێتە خوار نێوك و ژۆر بەرگەدە . ★ (سن.) بان‌بانەگا.
**بەرمۆر** ــ [ ٦ــ بەر + مۆر (مۆرێ) ] ، (نت.) ، (مک.) خشڵێکی ژنانەیە، لە مت‌ومۆرۆی جۆربەجۆر و ڕەنگ‌مە ( لە باری ڕەنگ و شکڵەوە ) دەیهۆننەوە و کچان و ژنان دە ئەستۆیانی دەکەن . تێب ــ ژنە دەوڵەمەندان لە بەردی بە قیمەت ( کارەبا ، یاقوت ، شەوە . . . و. . . ) دروستی‌دەکەن و ژنە فەقیر لە مۆرۆی جەلەبێ . ★ (سیم.) گەردانە ، ملوانکە . (سن.) ملوەن ، ملوێنك . (کئێر.) گەردنبەند . ( مک.) ملوێنکە . (جن.) گەلۆوەن .
تێب ــ ئەو هاوتایانە کەم و زۆر لە لایەن شکڵ و ئەو شتانەی کە لێیان دروست‌دەکرێن کەم و زۆر جیاوازێکیان هەیە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە هەمۆیان بۆ ڕازاندنەوەی ( مل ) و (گەردن) بەکاردێت .

**بەرمەمکان** ـ [١ـ بەر/٤ + مەمك + ٢ـ ئان/١ ] ؛ (صت.) ئەو ماوەیەی دایکێك لە مەمکی خۆی شیر دەدا بە منداڵ ؛ ئەو ماوەیەی منداڵێك بە شیری مەمکی دایکی بەڕێدەچێ :: یەکێکی تازە پێهەڵدەگرێ و یەکێکی بەرمەمکانیشی هەیە .

**بەرمەمکانە** ـ [ بارمەمکان + ٥ـ ئە/٢ ] ، (صت.) حاڵی منداڵێکی ساوا کە هێشتا شیری مەمکی دایکی دەخوا و لە مەمکێ نەکرابێتەوە .

**بەرمێل** ـ (نا.) . (کعر.) تم : بۆشکە . تێبـ ـ ئەم ووشەیە بە ڕێگای زمانی ئینگلیسیدا ، لە کوردستانی عێڕاق هاتۆتە ناو زمانی کوردێ ، ئەسڵەکەی لە ئینگلیزیدا ( بار ـ ڕێل )ە کە ئەویش لە ( بارێل )ی فڕەنسێ وەرگیراوە (تم : قامۆسی باغەڵێ ئۆکسفۆرد ، ١٩٦١ ، ل ـ ٥٧ ) بەڵام بۆم ساغنەبۆتەوە و نازانم دەنگی (م)ی چۆن لێپەیدابوە .

**بەرنامە** ـ (نت.) ، (کئێر.) ١ـ ئەو کارانەی لە کۆبونەوەی ئەنجمەن، هەیئەتێکی کۆمەڵایەتێ و سیاسێ و ... یا ئاهەنگ و جەژنی نەتەوایەتێ و ...دا دەکرێن یا تاقە ئینسانێك لە ڕۆژێکا یا لە ماوەیێکا دەیکا :: بەرنامەیەکی باشیان بۆ جێژنی نەوروزی پار سازکردبو . کاکە دلێر ئیمشەو بەرنامەتان چیە ؟ ٢ـ کاغەزێکی سیایێ کارەکانی ( ژمارە ١ )ی لێدەنوسرێ و پێشاندەدا چ کارێك لە پێشدا دەکرێ و چێ بەدوادا دێت . ٣ـ لیستەیێکە نیشاندەدا کە قوتابیانی کلاسێك لە هەفتەیەکدا چ دەرسانێ دەخوێنن و فلانە ڕۆژ لە فلانە سەعاتا دەبێ چ بخوێنن . تێبـ ـ ( بەرنامەج = برنامج)ی عەرەبێ هەر ( بەرنامە )ی کوردییەکە ڕێگای فارسییەوە وەریان‌گرتوە .

**بەرنوێژ** ـ [ ١ـ بەر/٤ + نوێژ]، (نت.) تم : ئیمام/٢ . ★ پێشنوێژ .

**بەروبوخچە** ـ [ کو. تو.] ، [ ٤ـ بەر/٤ + و + بوخچە ] ، (نت.) هەمۆ ئەو بوخچانەی کە لە ماڵێکی کوردەوارێدا هەیە یا ئافرەتێك هەیەتی :: نازدنین خێرا دەستێ بە ناوماڵەکەدا بێنە و بەروبوخچەت لە گۆڕێ هەڵگرە .

**بەروبۆ** ـ [ ٤ـ بەر/١ + و + بۆ ] ، (نت.) ١ـ ئەوەی بە هۆی کشتوکاڵ لە زەوێ وەردەگیرێتەوە یا بە هۆی کارگە و فابریقەوە دروستدەکرێ . (عا.) مەنتوج ، سەمەر ، مەحسول . ٢ـ ( مج . ) نەتیجە و ئەنجامی هەرکردەوە و کۆششتێك چاكبێ یا خراپ :: بەروبۆی خەباتی دژی ئیمپریالیزم ئازادێ میللەتانە . تێبـ ـ بەلای منەوە ، ووشەی ( بۆ ) لە مەصدەری ( بۆن ) وەرگیراوە و لە ئەسڵا ( بو ، وە )یە کە سیغەی موفرەدی غایبی زەمانی حاڵە . ★ بەرهەم .

**بەروبۆدرێژ** ـ [ ١ـ بەر/٢ + و + بۆ (بۆن) + درێژ ] ، (صت.) حاڵی کار ، مەسەلە یا شتێ کە زۆر بخایێنێ یا وا دیاربێ کە زۆر دەخایێنێ . :: زستان بەروبۆی درێژە . ئەم کارە بەروبۆی درێژە،

بەم هاسانییانە نابڕێتەوە . تێب ــ هەروەکوو کەرتەکانی ئەم ووشەیەیان لێ پێکهــاتوە بۆمان‌دەردەخــەن ، ووشەی ( بەروبوو ) هیچ پێـوەندی دەگەڵ ( بەروبــوو )ی بە مانــای (سەمەر) نیە . ★ درێژخایێن .

**بەروبێشکە** ــ [ ٤ــ بەر/٤ + و + بێشکە ] ، (نت.) لانکی منــداڵ و هەموو ئەو کەل‌وپەلەی بۆ پێچانەوەی منداڵ دەناویدا پێویستــە ، جـا منداڵەکەی تێدابێ یان تێدانەبێ :: کچێ ئــەوە چ دەکەی وەرە ئـــەم بەروبێشکەیە لێرە لابەرە .

**بەرواپشت** ــ [ ٣ــ بەر/٢ + وا ( = واژ ) + پشت ] ، (صـت.) ، (سن.) تم : بەروپشت .

**بەروانك** ــ (نت.) ، (سن. ، بک.) تم : بەروانکە . تێب ــ لە نێوان دوو دەنگی (ن) و (ك)دا بزوێنــە کوردی نیە .

**بەروانکە** ــ [ ١ــ بەر/٢ + وان (ئم.) + کە (ئم.) ] ، (نت.) ، (مک. ، سیم.) پارچەیەك قوماشە دەیدروون و بە بەرسینــگی منــداڵی ساوایــەوە دەگرن و لە پشت مل و ناوقــەدی منداڵەکە لە پشتەوە گرێ دەدرێ بۆ ئەوەی جلکەکانی پێس‌نــەبێ . ★ ( بک. سن.) بەروانك .

**بەروپشت** ــ (صـت.) ، (مـک.) حاڵی جلك و کەلوپەل و ... کە بە جۆرێ دەبەرکرابێ یا داندرابێ دیوی ناوەوەیان ( ٣ ــ بەر ) بە دەرەوەبێت . ★ ( سن.) بەرواپشت . ( سیم . ، بک. ) بەرەواژ . (مک.) بەراوەژوو . (جن.) چۆوارشە (چەواشە) .

**بەروپشت‌ئەتلەس** ــ ( صـت . ) ، (مک.) ١ــ لێفە و هەر شتێکی دیکەی لەم بابەتە کە هەردوو ڕووی‌لە قوماشی ( ئەتلەس ) بێ . تێب ــ عادەت وایـە ڕویەکی لێفە لە قوماشێکی نایـاب دەکەن و ڕوەکەی دیکەی ( چیت ) دەبێ ، جــا ماڵــە ئەعیــان و دەوڵەمەندان هەموویان هەر ئەتلەس کــردوە . ٢ــ (مج.) سـەیدێکی دایکیشی و بابیشی هەرتك (سەیید) بن ★ (سیم.) تان و پۆ ئاورێشم .

**بەروپشت‌کردن** ــ (مصت. مت. ) هێنانەپێشــەوەی لای پشــتەوەی هەندێ پارچەی جلك ( کراس و ... ) لەبەر هەر هۆیەکی بێ .

**بەرودوا** ــ [ ١ــ بەر/٢ و ٣ + و + دوا ] ، (صت. ) جۆری جووڵان و بزووتنی چەند گیاندار یا بزوانـەی چەند شت لە شوێنێ بۆ شوێنێکی تر ، بە شێوەیــەکی ئەوتــوو کە هێندێك لێك‌دووربن یا توزێ وەخـت بکەوێتە نێوان . یەك لە دوای یـەك :: هەمووتان بەرودوا بچنەدەر ( هەموو دەرکەون بەڵام پێکەوە نا)، سوارەکان خەریکن بەرودوا دەگەنە بەر ئاوایی ( هەموویان وێکڕا ناگەنێ ) .

**بەرودواخستن** ــ ( مصت. مت . ) جێگۆڕکێ کردن بە چــەندکار یــا چەندکەس و ... کە تەرتیبێــکی تایبەتیان وەرگرتبێ .

**بەرودواکەوتن** ــ (مصت. لا.) پاش‌وپێش‌بـوونی چەنــد کارێ یا کەسانێ کە بۆجێ‌بەجێ‌بـوون یــا جێ‌بەجێ‌کردنی کار و مەسەلەیەك بە جۆرێکی تایبەت ڕێزبوبن و دەقیـان

گرتبێ .

**بەرۆك** ـ [ ١ـ بەر/٢ + ئۆك /٢] ، (نت.) پێشەوەی کەوا یا کراس لە حاستی ملڕا تا دەگاتە نێودی سینگ . ئەوەندەی لە کراسی کوردیدا بە (یەخە) دادەندرێ هس : (بک.) بەرێك (=گیرفان) . ★ یەخە .

**بەرۆك‌بەردان** ـ ( مصت. مت.) وازلە کەسێ هێنان ، شەڕلەیەکێ لادان . دەست‌لەکەسێ هەڵگرتن □ « صەد جارم گوت تۆم ناوێ ، ئێتر بەسیە و پێی‌ناوێ ، بەردە ! بەردە ! بەردە ! دەبڕۆ بەرۆکم بەردە » ( فۆلکلۆر ) . ★ یەخەبەردان .

**بەرۆك‌گرتن** ـ (مصت. مت.) شەڕ بە کەسێ‌فرۆشتن ، گێچەڵ دەیەکێ هاڵاندن . ★ یەخەگرتن .

**بەرۆ** ـ ( صمف.) تم : ٢ـ بەرێن .

**بەرۆش** ـ [؟] ، (بک.) ، (نا.) دەفرێکی مەعدەنە چێشتی تێدا لێ‌دەنێن و بۆ ئێش و کاری تری ناومالێش بە کەلك‌دێ ، گەورە و پچۆکی هەیە . ★ مەنجەڵ ( = عا: میرجەل ) ، قازان (تو.) . تێب ـ وەکۆ دەبینێن ئەو ناوانەی بۆ ئەم ئامرازە بەکاردێن یەکیان عارەبێ و ئەویتریشیان تورکییە ؛ ئەگەر چی بە پێی بەرنامەی ئەم قامۆسە دەبوایە ووشەی ( بەرۆش ) وەکو هاوتای مەنجەڵ و قازان بنوسرێت ، بەڵام چونکو ووشەیەکی ڕەسەنە ڕەنگە خراپ نەبێ لە لەهجەی ناوەندی زمانی کوردیش‌دا بێتەوە مەیدان و هەر ووشەیەکی تری لەهجەکانی دیکەی زمانەکەمان کە دەینوسم هەر بۆ ئەم مەبەستەیە .

**بەرهاویشتن** ـ ١ـ هاتنەدەری بەچکەی گیانداران و منداڵی ئادەمیزاد بە مردوێی لە زگی دایکیان پێش ئەوەی مانگ و ڕۆژی خۆیان تەواوکردبێ . :: بەری‌هاویشت . تێب ـ ئەم ووشەیە زیاتر بۆ ئادەمیزاد و ( بەرفڕێدان ) بۆ گیانداری تر بەکاردێت . ★ (مک.) لەبەرچوون . (سیم.) لەبارچوون . بەرفڕێدان . ٢ـ (کن.) سوێ‌بونەوەی کەسێك بۆ خواردەمەنییەك کە بەکێکی دێ لەبەرچاوی دەیخوا :: کچێ دە تۆزێکی بەش بدەن خەرێکە بەر داوێ .

**بەرهەتاو** ـ (نت.) ، (کعر.) تم : بەرتاو .

**بەرهەڵبینە** ـ [ ١ـ بەر/٢ + هەڵ ( پێبف.) + بێن + ە + ئە/١ ] (نت.) ، (مک.) پارچەیەك قوماشی چوارگۆشەیە زیاتر لە خامی شێن یا سپێ دروست‌دەکرێ و کابان و بێرێ کاتی ئێش و کاری ناومال و مەڕدۆشین و ... بە پێش خۆیانەوە دەگرن و لەناو قەدیانی گرێ دەدەن بۆ ئەوەی جلکیان پیس نەبێ . □ « بەرهەڵبینە و بەرهەڵبینە ، بەرهەڵبینەی خام هەلاوە،هەر دەڕۆی و دەکراوە...»، « کابانی گەورە ماڵان لە خەوی‌دا بەرهەڵبینە » (فۆلکلۆر) : ★ (هل.) بەرامپێل ، بەرانپێچ . (شاروێران) بەربێنکە .

**بەرهەڵست** ـ (نت.) ، (تت.) هەر

جۆرە مانیعێکی ماددیٖ یا مەعنەویٖ کە لە پێش جێ‌بەجێ‌بوٗن یا ئەنجام‌دانی کارێك و ڕاپەڕاندنی مەسەلەیەك و لابەلاکردنی کێشەیێ ، دروست‌دەبێ یا دروست‌دەکرێت :: ئیمپرْیالیزم بەرهەلستی گەشەکردنی ئابوریٖ وولاتە پچکۆلەکانە .

**بەرهەلستیٖ ــ** ( حمصد. ) ئەنجامی کارێکی ( بەرهەلست ) دەیکا ، پێشگرتن بە جێ‌بەجێ‌بوٗن و ڕاپەڕاندنی کاروکێشە و مەسەلەیەك .

**بەرهەلێخ ــ** [ ١ــ بەر/٢ + هەلێخ ( هەلٔیخستن ) ] ، (نت.) ، (مک.) دیوارێکە لە پێش دیوارێکی دیکەکە شکستبێ و هاتبێتە ئەوەی بڕوٗخیٖ ــ دروستی دەکەن تا ڕای‌بگریٖ هەتا ئەو دەمەی دیوارە کۆنەکە سەرلەنویٖ دروست‌دەکەنەوە یا چاکی دەکەنەوە .

**بەرهەم ــ** (نت.) ، (کعر.) ، (تت.) ١ــ تم : بەروبوٗ :: کەلاش و تەشیٖ بەرهەمی هەورامانە . بەشی زۆری بەرهەمی کوردستان ئیٖ کشتوکالە . ٢ــ ئەوەی لە کار و چالاکیٖ مێشکی ئادەمیزاد ( شیعر ، نوٗسین ، ووتار ...) دەکەوێتەوە :: « مەم و زین » بەرهەمی مێشکی شاعیری گەورەی کورد « خانیٖ »یە . تێب ــ ا) نازانم ئەم ووشەیە ، کەنگیٖ داتاشراوە و کیٖ دایتاشیوە و چۆنی داتاشیوە . ب) لە زمانی پەهلەویدا (بەرهەمەك) بە مانای : ( تێکەل ، ئامێتە ، موڕەککەب )ە (تم : فرە ، پفا ، ل ــ ٧٠) و لە فارسیدا بە مانای (کۆکراوەوە ، پەرێشان ، ئالۆز ) هاتوە . ( تم : معین ، فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ــ ٥١٦ ) .

**بەرهەم‌هێنان ــ** (مصد. مت.) ، (کعر.) ١ــ دروست‌کردنی شت لە فابریقە . ٢ــ بە هۆی کاری بیر و مێشکەوە شتێك ( شیعر ، مەقالە و کتێب ) خستنەمەیدانەوە . ٣ــ بە هۆی کشتوکالەوە دانەوێلە و ... زیادکردن . ★ (مک.) ڕەنیٖوهێنان ( تەنیا بۆ بەندی ٣ ) . (کعر.) ئینتاج (عا.)، (کئیر.) تەولید (عا.) .

**بەرهەنگ ــ** [؟] ، (نت.) ، (مک.) نەخۆشییەکە تۆشی بۆریٖ هەناسەکێشان دەبێ و پیاو تەنگەنەفەس دەکا ، ئەم نەخۆشییە زیاتر مرۆڤیٖ دەسالەوەچوٗ دەگرێتەوە . (عا.) ڕەبو .

**بەرهەنگدار ــ** (صت.) ، (مک.) کەسێکی نەخۆشیٖ (بەرهەنگ)ی هەبێ .

**١ــ بەرە ــ** [١ــ بەر/١ + ەــ ئە/١] ، (نت.) تیرەوتایەفە :: بەرەی زێڕنیٖ تیرەیەکن لە عەشیرەتی مەنگوڕ .

**٢ــ بەرە ــ** [ ١ــ بەر/٢ + ەــ ئە/١ ] ، (نت.) ئامرازێکی سیٖ لکی چەرمە ( هەندیٖ جار نەخشێنراوە و ڕازاندراوەتەوە) ، بۆ ئەوەی ( زین ) لەسەر پشتی وولاغ لەو شوێنە بوەستیٖ کە پێویستە و بۆ دواوە نەخزیٖ ، لکێکی بە ناو هەر دوٗ دەستی وولاغا تێدەپەڕیٖ و لە بەر زگیدا بە ناوەڕاستی ( تەنگە )وە دەبەستریٖ و دوٗ ( لك )ەکەی تریشی بەم‌لاولای ملی وولاغا دەقەلتاغی زین

گرێ دەدرێ .

**٣ــ بەرە ــ** [ ٢ــ بەر + ٥ــ ئە/١ ] ، (نت.) زیادە پانایی پەنجەی گۆرەوێ کوردێ . تێبـ ــ گۆرەوێ کوردێ کە داگیرسێندرا لـە ( گۆ )یەکەوە دەستپێدەکا و هەروا لێی زیاددەکەن ( بەرەی دەدەن ) تـا پانـایی بە ئەنـدازەی دڵخـوازی لێدێت و ئەوجار لەسەر ئەم پانایییە دەڕۆن تا دەگاتـە ( پـانێ )ی و دەستدەکـەن بە کەمکردنـەوەی ( گۆ )یەکانی ( ددیکوژێننەوە ) .

**٤ــ بەرە ــ** [؟] ، (نت.) (مـک .) مەودای نێوان (جۆلاّ) تا (شـە ) و ( گورد ) تێبـ ــ ئەم ووشەیە برایـەکی کوڕە جۆلاّی موکریـانی بـە هـۆی ماموستا ( هێمن )ەوە بۆی ناردبوم ، چۆنی ئەو نوسیتویە منیش لەسەرەوە نوسیتم بێ ئەوەی تێبگەم کە ئـەم مەودایە لەجۆلاّیدا چ کارێکدەکا و زیاد و کەمێ لەسـەر بەرهـەمەکە تەئسیری چیە ؟

**٥ــ بەرە ــ** [؟] ، (نت.) ، (مک.) یەکێکە لەو نەخۆشییانەی ( مـەڕ ) دەیـگرێ ، گوانـی ڕەق ددبێ و ژاندەکا .

**٦ــ بەرە ــ** [؟] ، (نا.) ، (هـو.) دەرگا . (تم : مردۆخ ، ب ١ ، ل ــ ١٥٨ ) .

**بەرەباب ــ** [١ــ بەرە + ١ــ باب /١ ] ، (نت.) هەمو ئەو کەسانەی لـە عەشیردتێکدا، لە باوکێك کەوتبنەوە، بەو حیسابەی کە هەر عەشیرەتە لە پێشدا لە چەند (برا) یـا (خـزم) پێکهاتبێ و زەووزوبان کردبـێ و زۆربوبن ، بۆ ناسینەوە یان بە نـاوی باوکێکی کۆن ( نسبیا ) هەڵدەدرێن :: عەشیرەتی دزدیی چوار بەرەبابی گەورەن .

**بەرەبەرە ــ** [٤ــ بەر/٣ + ٣ــ ئە/٢ + ٤ ــ بەر/٣ + ٥ــ ئە/١ ]، (بنتـ.) ووردە ووردە ، نەختـە نەختە ، کەمکەمە ، تـۆزە تۆزە :: بەرە بەرە هەوا سـارد دەبـێ . بەرەبەرە خۆی دوردەکاتەوە .

**بەرەبەهار ــ** [ ١ــ بەر/٣ + ئە/٢ + بەهار ] ، (نت.) ، (مک.) ماوەیەك پێش ئەوەی زستان تەواوببێ ئاخر و ئۆخری زستان . :: بەرەبەهـارە گۆشت و خوێن دەژێتەوە .

**بەرەبەیان ــ** [ ١ بەر + ٣ــ ئـە /٢ + ٢ــ بەیان ] ( نت.) .

١ــ کاتی یەکەمیـن ڕۆنـاکایی ڕۆژ تـاریکایـی شـەو دادەدڕێ . ★ شەبەقی .

٢ــ (مجـ.) سەرەتای دەستپێکردنی گەلێ شت:: باپیرانی نەتەوەی کورد لە بەرەبەیانی دێرێکا لە کوردسـتان بوە .

**بەرەبەری بەیان ــ** کاتیکە هێشتا ساغ نەبۆتەوە شەوە یا ڕۆژ .

**بەرەتەشێ ــ** [ ١ــ بەر/٤ + ٣ــ ئە/٢ + تەشێ ] ، (نت.) پارچەدارێکە وەکو سەلکەتەشێ وایـە ، خـڕ تاشراوە (جاروبار دەشی نەخشێنن)و لەنێوەڕاستیا بە قەدەر ئەستوراێی کلکەتەشێ کونێـکی تێدەکرێ و بـۆ دوو مەبەست دەخرێتە سەرتەشـێ : أ) بۆ ئەوەی لەنگەری تەشێ ڕابگرێ و یارمەتی بدا کە باش بخولێتەوە. ب)

بۆ ئەوەی هەلکردنی ڕیس لەسەر کلکەتەشی ڕێك بخات .

**بەرەتی** ـ ( نت.) ، (سنه.) تـم : بڕێتی .

**بەرەجۆت** ـ [ ٤ـ بەر/١ + ٣ـ ئە/٢ + جۆت ] ، (نت.) هەمو حاسلاتێکی جۆتێرێك لە کەژێکیدا لە جۆت و گاوکاری خۆی کۆی دەکاتەوە . ★ (سنه.) بەربێل ، بەرەجفت .

**بەرەجەژنان** ـ (نت.) ، (سیمـ.) تم : بەرەجێژنان .

**بەرەجێژنان** ـ [ ١ـ بەر/٣ + ٣ـ ئە/٢ + جێژن + ٢ـ ئان/٢ ] ، (نت.) ، (مک.) چەند ڕۆژ پێش ئەوەی ببێتە جەژن ( نەورۆز ، ڕەمەزان ، قوربان ، ...) □ «ئاغا ! مامۆستا حاجی مەلا شەفیع دەیفەرمو بەرجێژنانە ! ، چێژنانە برنج و ڕۆنمان بۆ دەنێرێ یا پوولمان دەداتێ ؟ » .

**بەرەدان** ـ [ ٣ـ بەرە + دان ( فع. ) ] ، ( مصت. مت. ) ، ( مک. ) زیادکردنی ژمارەی (گۆ)ی گورەوێ و دەستەوانە و ... ئەو جۆرە شتانە، کە لەسەر نوکی پەنجەڕا تەسکە و بۆ پانکردنی هەر ناوبەناو چەند گۆیەکی لێزیاددەکەن . ∴ دو شێشی دیکەش بچنە ئەوجار بەرەی بدە . نابێ گورەوێ پاش دوازدە شیش چێدی بەرەبدرێ . هس : ( کعر. ) بەرەپێدان .

**بەرەڕەت** ـ [ ١ـ بەر/٤ + ٣ـ ئە/٢ + ڕەت (ڕەتاندن ) ] ، (نت.) ، (سنه.) چالێکە بۆ (نێچیر) هەلیدەکەن و سەری دادەپۆشنەوە، کە نێچیریان هەلستاند ڕاوی دەنێن و هەمو ڕێگایەکی لێدەبڕنەوە ئەوە نەبێ کە بۆ لای چالەکە دەچێ ، ئەوجار لە هەمو لایەکەوە دەیڕەتێنن تا وەسەر چالەکە دەپەڕێ و تێدەکەوێ .

**بەرەژان** ـ [ ١ـ بەر/٣ + ٣ ـ ئە/٢ + ژان ] ، (نت.) وردە ژان یا ژانێکی درۆزنەیە چەند ڕۆژێك پێش ئەوەی ئافرەت بزێ ، تۆشی دێت .

**بەرەژۆر** ـ [ ١ـ بەر/١ + ٣ ـ ئە/٢ + ژۆر ] ، (نت.) ، (مک . ) ١ـ لای سەرەوەی مەجلیس و دیوەخانان ( لەچاو دەرگا ) ∴ فەرمو! فەرمو ! بەرەژۆرتر هەلکشێ . ٢ـ لای سەرەوە لەچاو هەر شتێکیتر ∴ زۆرابی لە بەرەژۆر خۆیەوە دانابو .

**بەرەژێر** ـ [ ١ـ بەر/١ + ٣ـ ئە/٢ + ژێر ] ، (نت.) لایخوارەوە // بەرەژۆر .

**بەرەگە** ـ [ ١ـ بەر/٣ + ٣ ـ ئە/٢ + گە (جێگە) ] ، (نت.) لای پێشەوە ∴ بەرەگەی لێگرتوە .

**بەرەگەل** ـ (نت.) ، (سەرددشت) ، تم : بەرەگەلا .

**بەرەگەلا** ـ [ ٤ ـ بەر/١ + ٣ ـ ئە/٢ + گەلا ] ، (نت.) یەکێکە لە (بەر)ەکانی دارمازو «... سوری سپی واشە لە گەلای مازودار دەرئەچێ » (تم : خا ، ب١ ، ل ـ ١٦٣ ) .

**بەرەلا** ـ (صت.) ، (سنه.) تـم : بەرەللا .

**بەرەڵدا ـ** [ ١ـ بەر/٢ + هەڵدا ( هەڵدراو ) ] ، (صت.) ، (مک.) تم : بەرەڵلا .

**بەرەڵلا ـ** [ = بەرەڵدا ] (صت.) (سیم. ، مک.) ١ـ حاڵی کەسێکی گوێنەداتە هیچ ڕێوشوێن و داب‌ودەستوری ناو کۆمەڵ و خۆی چی پێ باش بێ ، ئەوە بکا . ( عا . ) غیر ملتزم . تێب ـ ئەم ووشەیە بە تەنیا وەکو صفەتێکی سەلبی دەکاردەکرێت . ٢ـ حاڵی دەشتێکی پان و گەورەی چیای بەرزی تێدانەبێ ● **بەرەڵلایە ـ** گوێناداتە هیچ دەربەندی هیچ پەیمان و قەول و قەراری خۆی نیە . ★ ( سن . ) بەرەڵا ، تەرە ، وێڵ . ( مک.) بەرەڵدا .

**بەرەڵلابون ـ** ( مصت. لا.) ١ ـ هاتنەدەر و ڕزگاربونی کەسێ یا گیانداری لە بەند و داوێکی گەڕان و هاتوچۆی لێ‌بەستبێتەوە. ڕزگاربون لە بەندیخانە و دیلی :: ئەوە سێ ڕۆژە گورون بەرەڵلابوە کوڕینە ئێسترە زەرد بەرەڵلابوە بزانن نایگرنەوە . ٢ـ حاڵەتی بێ‌بەند و باری و گوێ نەدانەهیچ لە کەسێکدا :: کابرایەکی بەرەڵلابو .

**بەرەڵلاکردن ـ** ( مصت. مت.) ١ـ تم : ئازادکردن/١ . ٢ـ کردنەوەی وولاغێکی بەسترابێتەوە یا هەر نەبەستنەوەی :: شێخ ڕەزا ئەسپە ڕەش بەرەڵلاکە با بۆ خۆی لەو بەردییە بلەوەڕێ . ٣ـ وێڵ کردنی کەسێ ( مندال یا گەورە ) بە هەر نیازێ بێ یا لەبەر کەمتەرخەمی :: کچی پیرۆزخان ئەوە بۆچی ئەو منداڵەت بەرەڵلاکردوە ئوتومبیل دەیکا بەژێرەوە .

**بەرەڵلایی ـ** ( حمص . ) ١ـ ئەوەی لە ئینسانێکی بێ‌بەندوبار ڕودەدا ، کاری یەکێکی بەرەڵلا . ٢ـ چلونایەتیکی نازێك و پێك لەناو کۆمەڵدا کە کەس گوێ‌نەداتە هیچ و هیچ داب و دەستور و قانونی تێیدا فەرمانڕەوا نەبێ . (عا.) فوضی . :: نازانین ئەو بەرەڵلاییە تا کەنگێ هەر درێژدەبێتەوە .

**بەرەمەشکە ـ** [ ٤ـ بەر + ٣ ـ ئە/٢ + مەشکە ] ، (نت.) هەمو بەرهەمی ڕۆنی کەرە ( بک : نڤیشك ، نویشك )ی ماڵە کوردێك لە ڕۆژێکدا ٢ـ (مجـ.) ، (صت.) حاڵی ڕۆنی کەرە ، کە ڕۆژێك بەسەر ڕەنێوهێنانیدا تێ‌نەپەڕیبێ . تێب ـ لە کوردەواری خۆماندا ، کە ڕۆنی کەرە هاتەبەرهەم ئەوێ ڕۆژێ هەرچی لێی‌خورا و ئەوی دەمێنێتەوە خوێی ددکەن و هەڵیدەگرن بۆ قاڵ‌کردن .

**بەرەنگار ـ** [ ١ـ بەر/٢ + ئەنگو ( ئەنگوتن ) + ئار/٢ ] ، ( نمص . )، (مک.) لە پێشەوە ، سەردەرهێنان لە پێشەوە و ڕوبەڕو تێك‌هەڵەنگوتن . تێب ـ أ ) ئەمە مانای لوغەتی ئەم ووشەیە کە چ جاران بە تەنیایی دەکارناکرێ و دەگەڵ فیعلی مساعدی (بون) و جار و بارەش دەگەڵ مەصدەری ( هاتن ) تەرکیب دەبێ و مەصدەرێکی تازە دروست دەکا . ب) بە پێی ئەو کەرتانەی ئەم ووشەیان لێ‌پێکهاتوە ، دەبێ شکلی پێش

ئێستای ( بەرەنگوار ) بۆبێ ، جا دەنگی ( و ) لەبەر قورسی ( تلفظ ) سواوە .

**بەرەنگاربون** - ( مصت. لا.) ، (مک.) ١- تێك هەڵەنگوتن ، تۆشی‌یەکترهاتن . ٢- پێکاهاتنی دو کەس یا زیاتر . بەگژیەکا چون . دەگژیەکڕاچون :: بەرەنگاری بوم . بەرەنگارم بو . بۆچی لە خۆڕایی بەرەنگاری ئەم کابرایە بوی .

**بەرەوپێرچون** - ( مصت. لا.) تم : بەپێرەوەچون .

**بەرەوپێرهاتن** - (مصت. لا.) تم : بەپێرەوەهاتن .

**بەرەوە** - [ ١- بەر/٢ + ٣- ئەوە/٣ ] ، (نت.) پێشەوە ، نێزیکتر :: وەرنەبەرەوە ، چونەبەرەوە تێب - من لە باسی ( ٣- ئەوە )دا ( تم : قاموس ، ب ١ ، ل - ١٩٠ ) نەمزانیوە کە ئەم ئامرازە دەگەڵ هێندێ ناوی وەکو ( ١- بەر/٢ ، ...) تەرکیب‌دەبێ و ناوێکی تازەی لێ‌دروست‌دەکا ، بۆیە ( ٣- ئەوە) کە دو مانام لێداوەتەوە دەبێ مانای سێیەمیشی بۆ ڕەچاوبکرێ کە لە سەرەوە باس‌کرا بەم جۆرە ( ٣- ئەوە/٣ ) دێتەگۆڕێ .

**بەرەوەبون** - [ ١- بەر/٤ + ٢- ئەوە/٢ + بون ] ، (مصت. لا.) تم : بەربونەوە . **لێ‌بەرەوەبون** - ( مصت. لا. ) تم : بەربونەوە ( لێ‌بەربونەوە ) .

**بەرێ** - [ ١- بەر/٣ + ٤- ێ ] ، (بنت.) پێشان ، لەوەوپێش :: ساڵانی بەرێ زستانان بەفر زۆر دەباری .

**١- بەرتین** - [ ٢- بەر + ئێن ] ، ( صت. ) ، (مک.) حاڵی هەر شتێکی پان بێ ، ئەو شتەی تەسك و تەنگ نەبێ . ★ پان :: شاروێران دەشتێکی پان و بەرینە لە مۆکریان .

**٢- بەرتین** - [ ١- بەر/٢ و ٣ + ئێن ] ، (حمف . ) ١- زەمانێکی پێش ئێستا ، (عا.) سابق ، سالف . ٢- حاڵی هەر کەسێ یا هەر شتێ کە لە وەختێکا باسی دەکرێ لە شوێنێك بێ کەوتبێتە دواوە :: سەربازەکەی بەرتین دوگمەکەی دانەختبو ( بەلای ئەو سەربازەدا تێپەڕیوین و ئێستا کە باسی دەکەین بەجێمان هێشتوە) . ★ بەرگ . بەرگین ، پێشو ، بەرو تێب - هەر چەندە ئەم وشەیە یەکەندەردو وا دێتە بەرچاو کە هەروەکو لەسەرەوە نیشان دراوە لە [ ١- بەر/٢ و ٣ + ئێن ] پێکهاتبێ ، بەلام ئەوە ئێ ئەم قوناغەی ئێستای زمانی کوردیە و من وای بۆ دەچم قوناغی پێش ئێستای ( بەرگین BERIGîN ) بوبێ کە - ئێستاش لە بن‌لەهجەی سنەیی و جافی‌دا هەر ماوە و پێش ئەویش (بەروئێن) .

**بەرتینایی** - [ ١- بەرتین + ئایی /١ ] ، (حمص.) ، (مک.) نێوانی ئەو سەرە و سەری شتێکی پان ، نێوانی دو ( حد )ی کە پانی شتێکیان لێ‌دەبڕێتەوە . □ « لە درێژایی دەردێنێ دەبەرتینایی دەکاتەوە » ( فۆلکلۆر ) . تێب - لە مۆکریان ئەم مەتەڵە بەم جۆرەیە و لە هێندێ مەڵبەندی دیکەی کوردستان لە باتی وشەی ( بەرتینایی ) پانایی گوتراوە.

★ پانایێ .

بەڕ ــ (نا.) ؛ (سنە ، بکـ.) تم : بەڕد .

**بەڕاست ــ** (بند.) تم : بەڕاستێ .

**بەڕاستێ ــ** (بند.) لەواقیعدا ، واقعا حقیقیا :: بەڕاستێ دنیایەکی سەیرە ! تێبـ ــ ئەم ووشەیە ئەگەر بە شێوەی پرسیار بگوترێ بۆ ئەوەیە ئەو قسەی بیستراوە جەختبکرێتەوە :: جا هەر بەڕاستێ سەرتان شکاند ؟ ★ بەڕاست .

**بەڕۆژۆ ــ** (صت.) حالی ئینسانێکی بە پێی ڕێوشوێنێ کە ئیسلامەتێ دایناوە ، لە بەرەبەیانەوە تا ڕۆژاوا هێچ ناخوا و ناخواتەوە .

**بەڕۆژۆبوون ــ** (مصت. لا.) گرتنی (ڕۆژۆ) بەو جۆرەی ئیسلامەتێ ڕێوشوێنی بۆ دیارکردوە .

**بەڕوو ــ** [ پە : بەلوت ] ، (نا.) ١ــ بەری دارێکی گەورەی جەنگەلییە ، توێکلێکی تەنك بەلام سەختی هەیە کە ڕەنگی قاوەییە ، لە سەرێکەوە کڵاوەیێکی گرنج گرنجی سەخت و مەیلەو شینی پێوەیە . ئەم دارە لە لێڕەکانی کوردستان زۆرە و «بەڕوو بە کاڵێ ، بەڕوو بە کوڵاوێ ، بەڕوو بە برژاوێ» دەخورێ و لە هێندێ شوێن ( دێیەکانی دوری ناو لێڕەواری سەردەشت ) دەشکرێ بە نان . ★ (بکـ.) بەڕوو . (جنـ.) بەلێ . ( هو.) بەلو . ٢ــ یەکێکە لە بەرەکانی دارمازوو تێبـ ــ أ ) بە ڕای من (بەڕوو) شکلێکی کۆنترە لە ( بەلوت )ی پەهلەوێ کە کراوە بە عارەبێ و بۆتە (بەللوط) . ب) « لاروس »یش و «معین»یش هەرتکیان (بەڕوو) بە یەکێ لە بەرەکانی ( دارمازوو ) دەزانن . ج) بەڕووی دارمازوو لە کوردستان تەنیا ئاژەڵ دەیخوا .

**بەڕوودار ــ** (ند.) داری بەڕوو کە بڕابێ و ئیشك کرابێتەوە بۆ سووتاندن یا کاروباری دارتاشێ و بەنایێ . // داربەڕوو .

**بەڕوولە ــ** [ بەڕوو + لە ( ئم : پچووکی ) ] ، (نت.) ، (مکـ.) ١ــ خەیار و ترۆزێ کە لە حالەتی (قێسکەیێ)دەرچووبن و بۆ خواردن دەس بدەن بەڵام زۆر گەورە نەبووبن . ٢ــ سینگێکی پچکۆلانەیە لە شێوە و ئەندازەی بەڕوو دەخرێتە کونی ( شێلەپە )ی (هەوجاڕ)ەوە تا لە شوێن خۆی ڕابوەستێ و نەهێڵێ لە باسکێش بێتەدەرێ . ★ گاینجە .

**بەڕوولەخۆرە ــ** [ بەڕوولە/٢ + خۆر ( خواردن ) + ە ــ ئە/١ ] ، ( نت.)، (مکـ.) کونی شێلەپە کە ( بەڕوولە/٢)ی تێدەخرێ بۆ ئەوەی لە باسکێشی توندکا .

**بەڕە ــ** [؟] ، (نا.) ، (سیم . ، مکـ.) ڕایەخێکی ئەستورە ژنانی کوردەوارێ لە بەنی ڕەنگاوڕەنگ . بە قەوارەی گەورە و پچووك دەیتەنن . ساکار و نەخشینی هەیە و بێتێسکە ☐ « بەڕە لە لای تەنکییەوە دەدڕێ » ( فۆلکلۆر . ) . ★ (بکـ.) بەڕ ، بەڕك . (سنە . ) بەڕ . کلیم .

**بەڕێبردن ــ** (مصت. مت.) تم : بەڕێوەبردن/٢ .

**بەڕێ‌بەستن** ــ (مصـــتـ. لا.) ڕۆیشتن بۆ جێگایەك . کەوتنە ڕێگا :: بەیانی زۆ بەڕێ‌بەستین دەمەدەمی ئێواری گەیشتینەجێ . ★ ودرێ‌کەوتن .

**بەڕێ‌چوون** ــ ١ــ (نتـ.) هەمو ئەو شتانەی بۆ ژیانی کەسێك پێویستە :: ئەم بەستەزمانە خۆ کەسی نیە ، کێ ــ بەڕێ‌چوونی دەدا . ٢ــ (مجـ.) ژیان :: جا ئەگەر هیچ کارێك ناکا ئەدێ بەچی بەڕێ‌دەچێ ( دەژێ ) .

**بەڕێ‌کردن** ــ (مصتـ. متـ.) ١ــ خستنەڕێی کەسێ یا کەسانێ کە بچن بۆ شوێنێ یا لە ماڵێك میوان‌بوبن و بڕۆن :: دەگەڵ حاجی‌مەلا محەمەدی تا (ماسوێ) چوین بەڕێمان‌کرد بۆ حەج // بە پێروەچوون . ٢ــ ( مجـ.) هەبوونی توانایی ( زیاتر مەعنەوێ ) و لێهاتوێ بۆ بەجێ‌گەیاندنی ئەرکی میوانداری :: کابانی وەکو خورشید خانم هەرنابێتەوە ، ئەوەندەی بلەی یەك و دو سەت میوانیش بان هەموی بەڕێ‌دەکردن .

**بەڕێ‌وجێ** ــ ( صتـ.) حاڵی کارێك یا قسەیەك کە بە شێوەی ڕێك‌وپێك و لە شوێن خۆیدا بکرێ و ئەنجام بدرێ . // بێ‌ڕێ‌وجێ .

**بەڕێوەبردن** ــ (مصتـ. متـ.) ١ــ تم : ئیدارەکردن/٢ . ٢ــ ژیاندن و دابین‌کردنی پێداویستی ژیانی کەسێ . ★ بەڕێ‌بردن .

**بەڕێوەبەر** ــ (نفا.) ، (تتـ.) ئەو کەسەی کارێك هەڵدەسوڕێنێ . ( عا.) مدیر .

**بەڕینگاڵ** ــ [ بە/٨ + ڕینگاڵ ] (صتـ.) (مکـ.) حاڵی مەڕێکی خوری لەشی زۆر پڕنەبێ بەڵام تیسکی زور درێژبێ . ★ (هلـ.) بەڕینگۆڵ .

**بەز** ــ [؟] ، (نا.) ، ( کعـر . ، کئێر. ، بکـ. ) ماددەیێکی چەوری سپیە ، لەسەر گۆشت و لە ناو زگی ئادەمیزاد و هێندێ گیانداری دێکەدا . **بەزی‌چاو** ــ ( نتـ.) ، ( سیـ. ، سنـ. ) گۆشتە زۆنێکی لە ناوچاوی ئادەمیزاد پەیدادەبێ .

**بەزاز** ــ [ = عا : بزاز ] ، (صتـ.)، ( کئێر.) تم : بازرگان/١ .

**بەزاندن** ــ (مصتـ. متـ.) دەرپەڕاندنی کەسێ لە مەیدانێکی چالاکیدا . شکاندن و منغلوب‌کردن :: بەرەی میللەتان و ئازادیخوازان ، بەرەی کۆنەپەرستان و ئەوانەی مافی میللەتان پێشێل‌دەکەن ، دەبەزێنێ .

**دابەزاندن** ــ [ دا ( پێبفـ.) + بەزاندن ] ، (مصتـ. متـ.) ١ــ هێنانەخواری یەکێك لەسەر پشتی ئەسپ و هەمو جۆرە هۆیەکی هاتوچۆ . :: دەستی گرت و لە ئۆتۆمبێلەکە دای‌بەزاند . هەیتەیەکی وایە سواران لە ئەسپی دادەبەزێنێ . لەشکرێکی زۆریان بە پاراشوت لەو دەشتە دابەزاندوە . ٢ــ لە پایەو پلەی کۆمەڵایەتی و.. هێنانەخوارەوە :: بە جارێك چەند پلەیان دابەزاند و کردیانەوە مودیر . ★ ( کـعر.) داگرتن . **هەڵبەزاندن** ــ [ هەڵ ( پێبفـ.) + بەزاندن ] ، (مصتـ. متـ.) ١ــ شتێك یا کەسێك لە خوارەوەڕا بۆ لای سەرەوە هەڵاوێشتن و

جوڵاندن :: منـــداڵەکە هێنـــدە هەڵمەبەزێنە با ئازاری نەگا . ٢ــ ( مجـــ.) تەشقەڵەپـــێ کردن . کارەسات بەسەر هێنان .

**بەزاوابـوون** ــ (مصتـ. لا.) ١ــ ئەنجامدانی کاری ژن و مێردایەتـێ لە لایەن کەسێکەوە کە تازە ژنی بـۆ کوێزرابێتەوە . تێبـ ــ زیاتر مەبەست لابردنی کچێنێ ( بوك )ە لە لایـــەن ( زاوا )وە ، کە لە زۆر کۆمەڵگاکاندا گرینگێ تایبەتێ هەیە و بە مایـــەی ( ڕۆسوری ) بـوك دادەنـــدرێ :: هێشتا بەزاوا نەبوە . ٢ــ ( مجـ. ) ژن هێنان :: یاخوا بە زاوابێ ( یاخوا ژن بێنێ ) .

**بەزم** ــ [ پہ : بەزم ] ، (نا.) ١ــ کۆڕی کەیف و ڕابواردن و خواردنەوە :: بەزمێك بۆ ئەو سەری دیارنەبۆ « ڕۆم کردە بەزمـی خـاسی برازا ئەزێزەکەم ئەمشـــەو بە صـــەد تەوازوع و ئیـخلاس و سـەرکزێ » ( ڕدزا ــ ٥٤ ) . ٢ــ (مجـ.) بـــۆ ددربڕینی تۆڕەیـــێ و نـــازەزایێ بەکاردێت :: ئای بەزمە ها !

**بەزم‌پێگرتن** ــ ( مصتـ. متـ.) ، ( مکـ.) ١ــ شەڕفرۆشتن بە کەسێ ، شڵتاغ‌پێکردن ، تەشقەڵەکردن بـە یەکێ :: شێرکۆ بەزمێکی بە سێروان گرت مەگەر مەر خۆی بزانێ چـۆن بۆ . ٢ــ (مجـ.) وەخت‌پێ‌ڕابواردن ، دەماغ‌تەخت‌کردن بە کابرایێ :: دەبڕۆ واز بێنە بەسمان بەزم پێ‌بگرە .

**بەزم‌گرتـــــن** ــ (مصتـــ. لا.) پێکەوەنان و سازکردنـی داوەت ، گۆوەند و کۆڕی کەیف و ڕابواردن .

**بەزمگا** ــ [ بەزم/١ + گا (جێگە)]، (نتـ.) ، (تتـ.) ئەو جێگەیەی کـۆڕی شایێ و کەیفی لێدەگێرێ .

**بەزم‌وڕەزم** ــ (نتـ.) ١ــ کۆڕی بەزم کە دەنگەدەنگ و هەرا و قێژەقێژی تێـــدابێ . ٢ــ (مجـ.) هـــەرا و چەقەچەقی منداڵان لە ناو مـــاڵا :: منداڵینە ئـەم بـەزم و ڕەزمـەتان لەچیە ؟ تێبـ ــ ووشەی دووەم (ڕەزم) لە زمانی پەهلەویـــدا بە مـــانای ( جەنگ )ە و فارسێ ئێستا ئـــەم ووشەیەی هەر بە مانای خۆی لـــە پەهلەوێ خواستۆتەوە .

**بەزوبنێشت** ــ (نتـ.) ، (مکـ. ) هەتوانێکی کوردەواریـــە ، لـــە تێکەڵ‌کردنی ( بەز )ی خاوی مەڕ یـا بزن دەگەڵ ( بنێشت ) دروســـت دەبێ و دەخرێتە سەر هەندێ برێنی وەکو سۆرەکوان و دۆمەڵ و ... بۆ ئەوەی بکا و دەمی بکاتەوە و کێم و هەوایەکی تێدا کۆبۆتـەوە بێتـەدەر ( دەربێ ) .

**بەزە** ــ (نا.) . تم : بەزەیێ .

**بەزەتـــاو** ــ (نتـ.) ، (کعـــر.) کاریداغ‌کردنی هەندێ جێگای لەش کە قەڵشابێ یا بریندابێ ، بە بەزی حەیوان . تێبـ ــ کەمێ ( بـەز ) لـە پەڕۆیەکەوە دەپێچن و بە ئـــاوری ڕادەدێرن تـــا ڕۆن دەردەکـــا و دەیساوون بە شوێنێ‌دا کە مەبەستە تا دێ سـارد دەبێتەوە ، ئـەگەر پێویست بۆ هەمیـــــان گەرمـــی دەکەنەوە .

**بەزەرەك** ــ [أ] ، (نا.) ، (کئێر.) تۆوی گیای کەتان . تێبـ ــ ١ــ ئەم

تۆوە تۆزێ لە هەرزن درشتترە ، ڕەنگی قاوەییە و شکلی پانکەلەیە و چەورە . ٢ـ لە کوردەواریێ خۆمان دەیکوتن و دەگەڵ دۆشاو گەرمی دەکەن و دەیکەنە هەتوان (مەلحەم)، هەندێ کوان کە بنیان ڕەقە و دەرنابن لێیدەنێن . برێنەکە دەگەیێنێ و کێم و هەوایێکی تێدابێ دەیکێشێ . ٣ـ لە سەنعاتکارێدا ڕۆنیلێدەگرن بۆ : أ ) چێشتلێنان (ڕۆنی گیا هێندێکیان لەم ماددەیەن ـ دهن بذر الکتان ) ، ب) بۆ بۆیەکاریێ و ڕەنگکردنی دار و دێوار و دەرك و پەنجەرە ، لە پێشدا لەسەر ئاگر ڕۆنەکە تۆزێ گەرم دەکەن و ئەو شتەی ڕەنگکردنی مەبەست بێ ، بە فلچە ئەم ڕۆنەی لێدەدەن ( ڕتوبەت ) و (شە)یان دەکێشێ و ئیشکیاندەکاتەوە ، ئەوجار ڕەنگیان تێهەڵدەسوون . ٤ـ جاران ئەم ڕۆنەیان بۆ (چرا) و (چۆلەچرا) وەکو ڕۆن گەرچەك بەکارهێناوە .

**بەزەوێ** ـ (نت.) ، (هل. ، سنـ .) تم : بەزەیێ .

**بەزەیێ** ـ [ بەزە + ٢ـ ئێ ] ، (نت.) هەستی دلسوزیێ بەرامبەر گیروگرفت و ئێش و ئازاری خەلك. تێب ـ ووشەی (بەزە) لە ( بەچەك ، بەزدك )ی پەهلەویڕا هاتوە کە لەو زمانەدا بە مانای تاوان و گوناهبوە و ئیستا مانای ( ڕوحم و شەفەقەت)ی وەرگرتوە .

**بەزەیێپێداهاتنەوە** ـ ( مصت . لا . ) هەستبەهاودەردیێکردن ، نارەحەتبون بە ئێش و ئازار و گرفتاریێ کەسێك . :: کافربەزەیێ پێدادێتەوە . ★ زگ‌پێسوتان .

**بەزیادکردن** ـ (مصت . مت . ) هەلگرتنی سفرە و نان و خوان لەبەردەمی خەلکی مال و ... پاش ئەوەی تێردەخۆن :: ئافردت وەرە بە زیادیکە . تێب ـ ئەم مەصدەرە لەوەڕا پەیدابوە کە بە پێی ڕێوشوێنی ئیسلامەتیێ دەبێ پاش نانخواردن سوپاسی خوا بکرێ و لە کوردەوارێدا بە ڕستەی : (خوایە زۆر شوکر لێت بەزیادبێ ) یا ڕستەی لەم بابەتە ئەنجام دەدرێت .

**بەزیان** ـ ( مصت. لا.) ، (سنـ.) تم : بەزین/١ .

**( ـ بەزێن )** ـ ١ـ ( رب . فع.) ڕێشەی فیعلە لە مەصدەری ( بەزاندن ) بۆ سیغەی ( مضارع ) :: دەیبەزێنم . بیبەزێنە . خوا یاربێ هەر دەیان دەبەزێنێن بۆ کوێدەچن . ٢ـ (پب.) دەگەل ناوێك تەرکیب دەبێ و دەیکاتە ئیسمی فاعیل :: لۆتیبەزێنە .

**بەزین** ـ (مصت. لا.) ١ـ لەمەیداندەرچون ، شکان بەرامبەر دوژمن . کۆلدان ، وازهێنان :: کەلەبابی سێروان بەزیێ . خەباتکاری بەڕاستیێ بە لێدان و گرتن نابەزیێ . لەشکری خاوەن بیروباوەڕ بەزینی بۆ نیە . ٢ـ (بك.) جولان ، خێرا ڕۆیشتن :: ببەزە ( خێراکە ) گورجبە ، خۆشبڕۆ تێب ـ ئەم مەصدەرە لە مەصدەری (ڤازیتەن)ی پەهلەویێ کەوتۆتەوە کە ئەویش لە ( ڤەز )ی ئاوێستاییێ گۆڕاوە و لە

لەهجەی باکوریدا ماناکانی هەروەکو پەهلەوی و ئاویستایی (تم : فرە ، پفا ، ل ـ ٤٦١ ) ماوەتەوە . بەڵام لە لەهجەی ناوەندیدا ئەسڵی مەصدەرەکە مانایەکی تری وەرگرتوە ـ ئەگەرچی ئەو مانا تازانەشی بە جۆرێك لە جۆران هەوێنێکی مانای کۆنەکانی تێدایە ـ و تەنیا هەندێ وشەی کە لێی داتاشراوە ، وەکو : هەڵبەزینەوە، بازدان و ... و ... ) مانای کۆنی ڕیشەکەیان پاراستوە . ★ ( سنە.) بەزیان . **دابەزین** ـ [ دا ( پێبف.) + بەزین ] ؛ (مصت. مت . ) ١ـ هاتنەخوار لەسەر پشتی ئەسپ و هەمو هۆیەکانی لەم بابەتە :: سوارەکان هەر دو سێیەکیان لەبەر ماڵێك دابەزین ، لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزن . ٢ـ هاتنەخوار لە شوێنێکی بەرزترەوە ( نسبیا ) بۆ جێگایەك :: ئێستا بۆیان دانەبەزی گێزەر بەربای عومریان بکەی ٣ـ کەمبونەوەی پلەی گەرما و سەرما و ... :: گەرما زۆر دابەزیوە ، زستان وا خەریکە تەواو دەبێ نابینی سەرما چەند دابەزیوە .

**هەڵبەزین** ـ [ هەڵ (پێبف.) + بەزین ] ؛ (مصت. لا.) خۆهەڵاویشتن بە تەکانەوە ، لە ژێرڕا بۆ سەرەوە :: هێندە هەڵمەبەزە . ئەوە چیتە هەر هەڵدەبەزی . تێب ـ ئەم مەصدەرە زیاتر لە حاڵەتی(نەفی)دا بەکاردێت و بۆ حاڵەتی ( ئیجاب ) هەڵبەزهەڵبەزکردن یا هەڵبەزینەوەمان هەیە .

**بەزیو** ـ [ نمف . بەزین ] گیاندار یا ئادەمیزارێکی لە مەیدان ڕای کردبێ ، کەسێکی لە شەڕا ( هەر جۆرە شەڕێك بێ ) شکابێ ، کەسێکی وازی لە خەبات هێنابێ ، ئەوەی کۆڵی داوە .

**بەژ** ـ [؟] ، (نا.) ، ( بک. ) زەویەکی پشتگوێخرابێ، ئەرزێکی ئاوی نەبێ ، زەوی نەکێڵراو و بێحاسڵ ( تم : ژابا ، ل ـ ٥٠ ) ★ بەژی . تێب ـ ئەم وشەیە لە ساڵانی جەنگی دودمەوە ، لە لەهجەی ناوەندیدا بە مانای ( بر )ی عارەبی دژی ( بەحر ) دەکاردەکرێت .

**بەژن** ـ (نا.) ، ( بک. ، کعر. ، کێر.) ١ـ درێژایی لەشی ئادەمیزاد :: بەژنی دەڵەی چنارە . ★ باڵا ، قەد . ٢ـ درێژایی کراس و ... لە ملیڕا تا داوێنی :: کراسەکەت زۆر درێژە چوار پەنجەی لە بەژنی دەڕێنی باشە .

**بەژنوباڵا** ـ (نت.) ، (مک. ، سیم.) دیمەنی ئادەمیزاد سەرتاپا خوار :: دایکی دەبەر ئەم بەژن و باڵایەی مری .

**بەژەك کەوتن** ـ (مصت. لا.) . (مک.) نەخۆش کەوتنی منداڵی ساوا لە چەند ڕۆژی هەوەڵی هاتنەدنیایدا . تێب ـ لە کوردەواریدا نەخۆشی چەند ڕۆژێکی سەرەتای عومری منداڵ لە زۆر خواردنی (ژەك) دەزانن .

**بەژی** ـ (نا.) ، ( بک.) تم : بەژ.

**١ ــ بەس ــ** [ سنـ : ڤەس . بە : ڤەس ] ، ( کعر . ، کئێر ، بکـ. ) ١ــ ( نا . صتـ . ) ئەندازەی کافی لـە هەر کارێـك ، هـەر شتـێك □ « باوەلێ ! باوێکی بەسە » . بەسمە، کوڕە کەچەڵ کەسمە ، ( خا ، پەند ، ل ــ ١١٦ ) . نا شەش گەز چیت بۆ کراسی ژنانە بەسە . ٢ــ ( ش. ) لە شوێن : بەسە ، بەسیە ، بەسیەتێ، با بـەس بێ ، واز بێنـــە (بێنـــن) دەکاردەکرێ . □ « بەس بێرە و بچۆ، بەس کە تەماشا، دایکی صەت کوڕبی ، پێـت دەکەم حاشــا » ، (فۆلکلۆر) . ٣ــ (بنـ.) تەنیا ، زیاتر نا :: بچۆ هەر ئەوەندەی پێ بڵێ و بەس . تێبـ ــ ئەسڵی ئەم ووشەیە لە ئاوێستایدا بە مانای : ئارەزۆ ، ویســت و خواهیشت بـوە و لـە پەهلەویشدا بە مانای : زۆر ، زیاد. ئێستاش ئەم مانایانەی بە شێوەیەکی مەنفێ (سەلبێ)تێدا بەدێدەکرێ . ★ (جنـ.) وەس .

**٢ ــ بەس ــ** (نا.) ، (سنـ.) تم : بەست/١ تێبـ ــ دەنگی (س) لـەم ووشەیەدا تۆزێ گـیراو (مشــدد) تەلەفڤوزدەکرێت .

**بەسام ــ** [ بە/٨ + ســام] ، ( صتـ.) ماڵی کەسێ یا شوێنێ کە چاو پێکەوتنی ترسی ( ماددێ ) یـا مەعنەوێ بخاتە دڵانەوە :: ئەشکەوتە گەورەکـەی چەمـی ڕەزان هێنـدە بەسام بۆ پیاو ئەترەشی دەچۆ . تێبـ ــ کەرتی دوەمی ئەم ووشەیـە لە ( سەم ، سەمم )ی پەهلەوێ بـە مانای ترس و خۆف کەوتۆتەوە .

**١ــ بەست ــ** ( ر.ـ. فعـ.) ڕەگـی مەصدەری ( بەستن )ە ، وەکـــۆ پاشبەنـــد بە دوایێ (نـــاو)انەوە دەنوسێ و ئەو مەدلۆلانەیـان لـێ زیـــاددەکا . ١ــ تەعەهھــود و ئیلتیزام ، بە تەنگەوەبۆن بۆ کارێ ، کەســێ یــا شتێ نیشــاندەدا :: دەربەست ، ئەم کابرایـە هیـــچ ددربەست نیە . ٢ــ بێ ئیلتیزامێ و نەبەسترانەوە بە هیچ شتێ و هیـچ کەس ، دەنوێنێ :: سەربەســت : ســەری نەبەستراوەتەوە (ئازادە) . ٣ــ وەکۆ (مصتـ.) دەکـاردەکرێ ، ئەوەیان تەنیا لە ووشە گەلێدایە کە لە فارسێڕا پەڕیونەتە ناو زمانـی کوردێ لە کوردستـانی ئێـران :: بەندوبەست : تەگبیر و ڕێککەوتنی دۆ یا چەند کەسێ .

( زیاتر سەلبێ ) . تێبـ ــ ژمارەی ئەم ووشـــانەی بەم ( پاشبەنـد )ە دروست دەبن و ئەوانەش کە ودکۆ ( مصتـ. ) تێیانـدا دەکـارکراوە ، زۆر کەمن . هس : بەند/٩ .

**٢ــ بەست ــ** [ نمڤ : (بەستن) ] ئەم ناوە وەکۆ ( پاشبەند ) دەگـەڵ ناو تەرکیب دەبێ و ناوێکی تـــازە پێکدێنێ و ئەوەندەی من پێم شك بێ هەر ووشـەی ( دەربەست ) کە بۆ خانۆ بەکاردێـت بـەم پاشبەندە دروستبوە .

**٣ــ بەست ــ** (نا.) ، (هلـ. ، کیـ.) تم : بەستۆڕە .

**٤ ــ بەست ــ** (نا.) تم : بەند/١ .

**بەستران ــ** (مصتـ. لا. فجـ.) ، ( شێوەیێکی تری مەصدەری لازمی

(بەستن)ە :: دەمت بەسترابو قسەت نەکرد وا دیارە ئەم کوڕە بەستراوە بۆیە هەر نابێ بە زاوا .

**بەسترانەوە** ـ [ بەستران + ٢ـ ئەوە/٢ ] ، (مصت. لا.) ١ـ گرێدرانی گیاندارێك بە شوێنێکەوە :: ئەسپەکە بە کۆڵەکەی هەیوانەوە بەستراوەتەوە . ٢ـ بۆڕخواردن لە مجادلەی زانستێ و . . . و . . . دا .

**بەستراو** ـ ( نمف. : بەستران )

١ـ **بەستن** ـ [ ست : بەند . ، پە : بەستەن ] ، (کئێر. ، کعر . ، بک. ، سنـ . ) ١ـ ( مصد. لا.) ڕەقبوونی ماددەیێکی تراو بە هۆی سەرمای زۆر ، بونەسەهۆڵ :: ئەوشۆ هێندە ساردە هەرچی ئاو هەیە دەیبەستێ . چۆمەکە بەستویە ، تفت هەڵاویشتبا دەیبەست ، دەستی بە ئالقەڕێزی دەرکەوە بەستویە . ٢ـ ( مصد. متە.) پێکەوەلکاندن و لێكتوندکردنی دوو یا چەند شت ، بەبەن و پەت و . . . :: هەردوو دەستی دزەکەیان لە پشتەوە بەست . خێرا پشتێندت ببەستە . بارەکانیان بەستبوو . برازاوا پشتێندی بوکێ دەبەستێ . ٣ـ (مصد. متە.) مەنعی هاتوچۆکردن بە ڕێگایەکدا بۆ هەر مەبەستێ بێ :: دز ئەم ڕێگایەیان بەستوە . □ « وا ڕێگەتان دەبەسترێ عێلاتی جاف و بلباس ، گەر مردوون لەگەرمان مەمنوعە بچنە کوێستان »، ( گم : حاجی قادر ، ل ـ ٥٠) . ٤ـ ( مصد. متە.) ، (سنـ.) دەرمانکردنی برین و تێوەپێچانی پەڕۆیەك کە بۆ ئەم کارە دروستدەکرێ یا هەر قوماشێکی دیکە . (عا.) تضمید :: ئەوە کێ ئەم زامەتی بەستوە . ٥ـ ( مصد. متە.) ، (سنـ .) پێوەدان و داخستنی دەرگا . ٦ـ (مصد. متە. ) مەنعکردنی کەسێك بە هۆی نوشتە و سیحر و جادوو ـ لەوەی شەوی زاوایەتی بتوانێ دەگەڵ ( بوك ) جوتببێ .

تێبـ ـ لە ناو کوردەواریدا ئەگەر کوڕێك دڵی بە کچێکەوە بێ و بدرێ بە یەکی تر ، کاتێ دەستی لە هەموو لایەك دەبڕێ دەچێتە لای نوشتەنوس و جادووبازان ، بۆ ئەوەی ( زاوا )ی بوو ببەستێ تا نەتوانێ کچێنی بوکێ هەڵبگرێت ، جادووبازیش نالەکەرێ یا قفڵێ ژەنگاوێ دێنێ و چەند قسەیەکی کە خۆشی مانایان نازانێ و هەر لە ئەسڵیشا مانایان نیە بە سەریدا دەخوێنێ و قفڵەکە دادەخا یا نالەکەرەکە بە بزمار لە شوێنێ دادەکوتێ . باوەڕ وایە کە تا ئەم سیحرە ڕاستەوخۆ ( کردنەوەی قفڵەکە یا هەڵکێشانی نالەکەرەکە ) یا بە هۆی ( دوعای چاك ) هەڵنەوەشێتەوە ، کوڕە نابێ بەزاوا . ڕەنگە گەلێ جار وا هەڵکەوتبێ کە کوڕێك یەکەندەردوو بە زاوا نەبوبێ ، بەڵام ئەمە لەبەر ڕێ و شوێنی کۆنی بوك و زاوایێبوە کە دۆست و ئاشنای زاوا لە ژوورێك کۆدەبونەوە و کوڕەیان دەکردە پەردەوە بۆ لای بوك و خۆیان چاوەنوارییان دەکرد .

★ (جنـ.) بەستە .

**پێبەستن** ـ ( مصت. متە. )

١ـ توندکردنی شتێك، پێچانی شتێك بەشتێکی دیکە. ٢ـ توندو قایم کردنی دوو شت بە شتێکی تر . :: ها ئەم دەسڕەیە برینەکەتی پێ ببەستە .

**پێوەبەستن** ـ ( مصد. متـ. ) ١ـ لکاندنی شتێك لە لاوە بە شتێکی ترەوە :: هەر کەسێ بێرەدا ڕۆیوە ، پەڕۆیەکی بە داری ئەم (چاك)ەوە بەستوە . ٢ـ نیسبەتدانی کارێك یا شتێك بە کەسێك :: بەستەزمانە ئاگای لە هیچ نەبوو ، بە زۆر ئەم ئیشەیان پێوە بەست . ٣ـ میقدارێك پارە و پوول لە ئەستۆی ئافرەتێك بارکردن ، ئەم کارە بۆ تۆڵەلێکردنەوەیە و لە وەختێکا دەکرێ کە مێردەکەی بە نابەدڵی یا تووڕەیی تەڵاقی دەدا و تا ئەو پارەیە تەسلیمی مێردەکەی نەکات ، بە پێی شەرع ناتوانێ شوبکاتەوە . :: چوون خولا هەڵدەگرێ ، ئەم ژنە فەقیرە هەزار تمەنیان پێوە بەستوە .

**تێبەستن** ـ ( مصد. متـ. ) ١ـ شتێ یا چەند شت لە ناو پارچە قوماش یا چارشێو و چارۆکە و.. دانان و کردنیان بە پڕێسکە و بەستە و ... :: ئەم بەربێنکەیە چکۆلەیە هەموو جلکەکانی تێنابەسترێ ـ ئەو نوێنانە دە جاجمەکە بەستە . ★ تێ نان . تێوەبەستن . ٢ـ گرێدانی شتێ (پەڕۆ، بەرد، ...،...) بە شتێکی ترەوە :: پشیلەکەیان خستە ناو گونیەیەکەوە بەردێکیان تێبەست و فڕێیاندایە بنی گۆمەوە .

**تێکبەستن** ـ [تێك (دە + یەك) بەستن ] ، ( مصد. متـ. ) ١ـ گرێدانی چەند گیاندار یا شت بە هۆی گوریس ، زنجیر و ... ، :: جاران پیاوخراپ و سەگیان تێکدەبەست . ئێسترێك و گوێدرێژێکی تێکبەستوە ئەوە گۆیا جووت دەکا . ٢ـ (مجـ.) وەکو یەك حیساب کردنی دوو یا چەند ئینسان بۆ مەبەستێکی تایبەتی :: نابێ بایز و باپیر تێکبەستن . **تێوەبەستن** ـ (مصد. متـ.) تم : تێبەستن/١ .

**دابەستن** ـ [ دا ( پێف ) + بەستن ١ ] ، (مصد. متـ.) ١ـ بەخێوکردنی گیاندارێك ، (مەڕ ، بزن ، قەلەموون ، گوێلك و .. ) بە جۆرێکی تایبەتی ، بۆ ئەوەی قەڵەو بێ و پاشان سەری ببڕن :: ماڵی کاکەحەمە دوو مەڕیان دابەستوە . ٢ـ (مجـ.) ڕاگرتن و بەخێوکردنی ئینسانێك لە ماڵێك یا لە هەر شوێنێکی تر بێ ئەوەی هیچ کارێ بکات :: یا شێخ خوا سەلامەتت کا ئەم هەموو ( چەورە )یە چن دات بەستوون . ٣ـ توندکردنی خورجین و هەگبە و ئەو جۆرە شتانە لەسەر پشتی وولاغ و سەربانی ئۆتۆمبێل و .. و .. :: ئەم بەرچنە هەرمێیە لەسەر بارە دارەکە دابەستە . کەڵەبابێکیشی لەسەر سەبەتە ترێیەکانەوە دابەستبوو . ئەوە چیە لە پاشتەرکی ماینەکە دات بەستوە ؟ ٣ـ دەستکردن بە کارێك و واز لە کاری دیکە هێنان :: هەر ئێستا نوێژمان دابەست . کوڕە (گورگ نەخۆرە)ئەوە بۆ نەچوی

جۆتەکە دابەستێ ؟ منداڵێنە ئەو هەرا و زەنا زەنایە چیە داتان بەستوە ؟ ٤ـ مجادەلە و جوابە جەنگیکردن :: باش نیە ئاوا دەگەڵ ئەم منداڵە دادەبەستێ .

**لێبەستن ـ** [لێ (ل + ێ) بەستن) ] ، (مصد. متـ.) گرێدان و قایمکردنی کەسێ یا شتێ لە شتێکیتر :: دەستی بگرە و بیبە لە هۆو دارەی ببەستە و تادەتوانی دارکاریکە ☐ « سەری نایەشێ پەڕۆی لێدەبەستێ . » (فۆلکلۆر.)

**لێکبەستن ـ** [لە + یەك بەستن]، ( مصد. متـ. ) لەیەکتر توندکردنی چەند شت یا چەند کەس بە جۆرێکی مەعلوم نەبێ کێهەیان لە کێهەقایم کراوە :: هەر دوو دزەکانیان لێکبەستبو . ئەو دوو کوڵەکانە لێکبەستن و بەرمێچەکەیان دەن ، چاتری ڕادەگرن . **هەڵبەستن ـ** [هەڵ (پێف .) + بەسن ] ، (مصد. لا. ) ١ـ بەرزکردنەوەی دیوارۆکە یا هەر شتێکی تری لەم بابەتە بۆ هەندێ مەبەستان :: گۆڕێچەکەیان بە بەرد و قسڵ هەڵبەست .ئەم (بەند)ە بە هەرەوەزێ چەند (دێ) هەڵبەستراوە . ئاخوڕەکەیان باش هەڵبەستوە . ٢ـ پێچانی سەر و چاو یا دەم و لوت لەبەر نەخۆشێ (هەلامەت ، ددانئێشە و .. هتد) یا بۆنەناسرانەوە :: وەختی نوستن پێوازێك بخۆ و دەم و لوتت هەڵبەستە تا بەیانێ عەلەمەت لێدەبڕێ . ددانم کێسی کردوە بۆیە سەر و چاوم هەڵبەستوە .

٣ـ ڕێکخستن و دروستکردنی قسە و دەنگ و باسی ناڕاست :: ئەم بەند و باوە هەمۆی درۆیە و هەڵبەستراوە . خوا پێمنەگرێ ئەم قسەیە بێ و تۆ هەڵتبەستوە . ٤ـ چنینەوەی بنی ڕیشۆی دەسەسڕ و مشکێ و ئەو جۆرە شتانە بە دەرزێ و قولاپ پاشس بادانی ڕیشوەکە .

**بەستنەوە ـ** [ بەستن + ٢ـ ئەوە/٢] ، (مصد. متـ.) ١ـ گرێدانی گیاندارێك بە پەت و گوریس و .. بە جێگەیێکی سابیتەوە ( دیوار ، سنگ ، ... ) بۆ ئەوەی وون نەبێ یا هەڵ نەبێ :: ئەسپەکە لەسەر ئاخوڕەکە ببەستەوە . لە زیندان پیاوکوژەکانیان بەزنجیر دەبەستەوە. ٢ـ بۆڕدان و پەکخستنی کەسێ لە مجادەلەیێکی سیاسێ ، عیلمێ و ...دا :: ئەم منداڵە بە منالێ خۆیەوە ئەو پیاوە زرت و زەلامەی بەستەوە .

**بەستۆڕە ـ** [؟] ، (نتـ.) ، (مد.) شوێنی ڕۆبار و چۆمێکی زستانان و بەهاران ئاوی پێدا دێت و هاوینان ئیشکی دەکا و خێز و چەوی تێدادەبێ . ٢ـ شوینێکی وەختێك چەم و ڕوبار بوبێ . ٣ـ ناوی سەیرانگایەکە لە نیزیکی شاری هەولێر . تێب ـ بە ڕای من ئەم ووشەیە لە (فیستەرەك)ی پەهلەوێ کەوتۆتەوە کە مانای (جێگەی خەو ، پێخەفی ڕاخراو )دەدا و ئێستاش لە زمانی فارسیدا (پستەر) هەر بەم مانایە دەکاردەکرێ و لە لەهجەی

باکوریدا (تم : ژابا ــ ٥١) بستەر بە جلی ئەسپ دەڵێن ، بەڵام قەناتی کوردۆ ووشەی ( بستــەر )ی لــە فەرهەنگی خۆیدا نەهێناوە . فارسی (بستەری ڕۆدخانە) بــەو جێــگایە دەڵێ کە ڕۆبار و زێی پێدا دەڕوات.

**بەستۆ** : [؟] ، (نا.) ، (سـنـ.) کۆپەلەیێکە لە گڵ دروست‌کراوە ، ڕەنگێکی شیشی لێدەدەن و لە ئاگرا سۆردەکرێتەوە و ڕەونەقێــکی لێ پەیدادەبێ . ★ بەستۆکە . تێب ــ لە زمانی عەرەبێ قسەکردنا ووشەی (بەســتۆگە) و لــە فارسـیشدا (بەستۆ) هەر بەو مانایە بەکاردێت .

**بەستۆکە ــ** [بەستۆ + کە (ئم : پچۆکی) ] ،(نتـ.) تم : بەستۆ . تێب ــ وەکو دوکتۆر معین دەڵێ (تم : معین، فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ــ ٥٣١ ) لە لەهجەی تەفریشــیدا (بەســتۆلە) دەڵێن .

**١ــ بەستە ــ** [٢ــ بەست + ە ــ ئە/١] ، (نتـ.) ، (کێر .) ١ــ کەمێك کەلوپەل و کاڵا یا هەر شتێکی دیکە کە لە قوتو یا کیســەیەکی کاغەزەوە پێچرابێ :: بەســتەیەك چــا ، دۆ بەستە سێفار . ★ (کمر.) پاکەت. ٢ــ تورەکە یــا پارچە قوماشــێکی شتی تێخرابێ و سەری دروابێ . تێب ــ هەندێ جار ئەم ووشەیە بە تەنیایی وەکو (نمف .) لە مەصدەری بەستن بەکاردێت .

**٢ــ بەستە ــ** [؟] ، (نا.) ، (کمر.) گۆرانی ســوك و لەبــار کە هەوا و شــیعرەکانی مایــەی فۆلــکلۆریان هەبێ . // مەقام . :: ئاگربارانە، کراس زەردێ، کوێستانان خاڵ‌خاڵ، عەمرەکەم سەڵتەنە ، لــە بەســتە خۆشەکانی کوردێن . تێب ــ أ) من نازانم بۆچی ئــەم ناوە لــە گۆرانی نراوە . لە ئازربایەجانی سۆوێتی هەر ئەم ووشــەیە بــە عەینی مانا دەکاردەکرێ و لــەمەشــ زیـــاتر (بەستەکار)یش بەو کەسە دەڵێن کە ( هەوا ) بۆ ئەم چەشــنە گۆرانییە دادەنێ ، دیارە کە هەرتك ووشــە (بەستە) و (بەستەکار) پەیوەندێکیان دەگەڵ زمــانی ( ترکی ) نیــە کــە ( ئازربایــەجانی ) شــێوە یــا لەهجەیێکیتی . ب) دوکتۆر معــین لە باسی ووشەی (بەستە)دا دەڵێ : « ٢١ــ (شیعر) شیعرێکی‌برێتی بێ لە چوار نیوە شعر . ٢٢ــ (موسیقا) ئاهەنگێکی مۆسیقایە لە (حەسار) و (ســێگا) و (حیجاز) پێکهاتوە. » ، (تم : فەرهەنگ، ج ١ ، ل ــ ٥٣٢). ج) لە موکریان ووشەی (بەند) لەباتی بەشــێکی گــۆرانی بــەکار دێت و سەربەندیش ئەو شیعرانەن کە لە گۆرانیدا دۆپات‌دەکرێنەوە و زیاتر گۆرانی بە ناوی (سەربەند)ەکەیەوە هەڵدەدرێ . د) زمانی عەرەبیش لە عــیراق ئــەم ووشــەیەی کردۆتــە ( پەســتە ) و بــە عەینی مــانــا بەکاری‌دێنێ . ه) لەو باوەڕەدام کە (بەند)ی موکریان و ( بەســتە )ی سلەیمانی لە پێشدا هەر یەك مانایان هەبوە و پاشان هەریەکەیان مانایەکی تایبــەتی وەرگرتوە و دەگەڕێنــەوە ســەر ( بــەند )ی ئاوێســتایی و (بەستەن)ی پەهلەوی کــە دوەمیان

لە یەکەم وەرگیراوە .

**بەستەزمان** ـ[١ـ بەستە+زمان]، ( صت.) ، (مک.) پیاوی بێ دەم وپل.و دەستەوەستان . ئینسانی بێ دەسەڵات ★ (سیم.) بەسزمان ، بەسەزمان .

**بەستەك** ـ [٢ ـ بەست + ١ ـ ئەك/٣] (نت.) ، (کعر. ، بک.) پێخەفی پێویست بۆ تاقە نەفەرێك (لێفە ، دۆشەك ، . . . ، پشتی ) کە دە جاجم یا چارشێوێکەوە دەپێچرێ :: پاڵ بدە بە بەستەکەکەوە . ★ (مک.) دەستەنوێن .

**بەستەڵەك** ـ [ ٢ـ بەست + ئەڵ / ١ + ١ـ ئەك/١] ، (نت.) ، ( مک. ، سیم.) حاڵەتی دەشت و دەر و کۆچە و کۆلان ، کاتێ دەرەجەی سەرما دادەبەزێ بۆ ژێر سیفر و ئاو دەبەستێ. :: سەرما و بەستەڵەکێك بۆ ئێسترەکە بە هەزار حاڵ قاچی بە ئەرزەوە گیردەبۆ . ★ سەهۆڵ بەندان .

**بەستەنێ** ـ [٢ـ بەست + ئەنێ]، (نت.) ، (کئێر.) خواردەمەنیێکی ساردە لە شیر و شەکر و ماددەیێکی تام و بۆنخۆش دروستدەکرێت . ★ (کعر.) دۆندرمە. (مک.) حەلاوێ. تێبـ ـ أ ) شیرەکە دەکرێتە ناو دەفرێکی ئوستوانەیێ تایبەتێ و تۆزێ لە شتێکی تام و بۆنخۆش شەکرەکەی تێدا دەتاوێنرێتەوە و ( گولاو ، وانێل ، ئاوی‌میوە و . .)ی تێدەکرێ و ماددەیێکی نوسەك ( چرێش یا سەهلاب . . . )یشی لێزیاددەکرێ ، ئەوجار دەخرێتە ناو بەرمیلێکی پچوك (دار یا تەنەکە) و دەوروبەری پڕدەکەن لە (بەفر) و دەست بەسوڕاندنی دەفرەکە دەکەن تا شیر و شەکرەکە لە ناویدا دەمەیێ و وەکو سەهۆڵی لێدێت . ب ) ئەمە شێوەیێکی سەرەتایێ سازکردنی ( بەستەنێ ) بۆ لە کوردستان ، پاشان وای لێهات کە دەفری ناوەڕاست بە شێوەیێکی میکانیکی ( بەچەرخ ) بادەدرا و دەسوڕێندرا ، بەڵام ئێستا مەکینەی تایبەتێ هەیە کە بە کارەبا ئیش‌دەکا. ج ) کەرتی ( ئەنێ ) لەم ووشەیەدا پاشبەندە و کاری ( ئەمەنێ ) دەکا . من پێشان هەستم پێنەکردوە و بۆیەش لە بەرگی یەکەمی ئەم قاموسەدا نەم نوسیوە . :: سوتەنێ ( = سوتەمەنێ ) .

**بەستێن** ـ [ ٣ـ بەست + ئێن]، (نت.) ، (مک.) تیزماڵکە زەوێکی بە خێز و چەوە ، لە هێندێ فەسڵی ساڵا ئاوی چەم و ڕۆبارانی لێدەکشێتەوە ★ ( کک.) شاتی . هس : بەست . بەستۆرە . :: چوار بێستانێکی لە بەستێنی چۆمی کردوە زۆر خۆشە .

**بەسرپێرار** ـ [ نت. ، بنت. ] ، ( کئێر. ، کعر.) سێ ساڵ لەمەوپێش . ساڵێك پێش پێرار . ( بک.) بەترپێرار .

**بەسرپێرێ** ـ (نت.، بنت.) ،(کعر. ، کئێر.) دۆ ڕۆژ پێش دوێنێ ، سێ ڕۆژ پێش ئیمڕۆ . ★ بەترپێرێ ( تم. تێبـ. ) ، ( بک.) بەترپێرێ .

**بەسزمان** ـ ( صت.) ، ( سیم.)

تە : بەستەزمان .

**بەستن** ـ ( مصت.، مت.، لا. ) ، (سنە.) تە : بەستن . تێب ـ ئەم مەصدەرە و گەلێکی تریش ، لەبن لەهجەی سنەییدا ( ت )یەکەی نیزیك دەبێتەوە لە دەنگی (س)و بۆیە لەباتی دەنگی (ت) گوێمان لە دەنگی (س)ێکی تۆزێ گیراو (مشدد) دەبێ.

**بەسەراچوون** ـ ( مصت. لا.) ، ( سیە. ) تە : بەسەرداچوون .

**بەسەربردن** ـ ( مصت. مت.) ، ( مکـ.) ١ـ دەربازکردن و ڕابواردنی وەخت و هەرچێ پێوەندیێ بە وەختەوە ببێ و مانای وەختی تێدابێ . :: عومرێکمان لە بەغدایە بەسەربرد . ٢ـ بە سەهۆبردنی کەسێك لە هەر کارێدابێت :: بزانە بەم قسانە بە سەرمان نابەی. هس: سەرکردن .

**بەسەرچوون** ـ ( مصت. لا.) ١ـ تێپەڕین و ڕابردنی وەخت ، دەم ، وەعدە و کات .

□ « وەڕەقڕێزان خەزان کەوتە ڕەزان ، وەضعی چەمەن گۆڕا»
« بەسەرچۆ فەصڵی گوڵگەشت و تەماشای باغ و صەحرام کەم »
( کوڕ : وەفایی ، ل ـ ٧٣ ) .

٢ ـ سەهۆکردن لە قسە و حیساب و...و... دا بەسەردابڕین ..

**بەسەردابڕین** ـ [ بە/١٢ + سەر + دا ( = ٣ـ ئا ) +بڕین ] ، (مصت. مت.) بە زۆر شتێك بە کەسێ قبوڵکردن ، جا بۆ قازانجی بێ یا تۆشی زیانی بکا . :: خۆی بە سەردا بڕی . پاش ئەوەی کە لێی قەوما کچەکەیان بە سەردا بڕی لێم وەرنەدەگرت ، بە زۆر و بە خواهیشت بەسەریدا بڕیم .

**بەسەرداچوون** ـ ( مصت. لا.) ، ( مکـ.) گەیپشتنە لای کۆمەڵە خەڵکێك کە خەریکی کارێك بن . :: ئێمە بەسەردا چوین نانیان دەخوارد . بەسەردا نەچووباین بە خەنجەران یەکتریان پارچەپارچە دەکرد . ★ ( سیە.) بەسەراچوون.

**بەسەردادان** ـ ( مصت. مت. ) ١ـ پۆشینی عەبا و چارشێو و دەسماڵی ژنانە . :: ئافتاو عەباکەت بە سەردا دە و بچۆرە ماڵی فەریدەخان بڵێ تا ئێرە تەشریف بێنێ . دەسماڵێکی بەسەردا دابۆ دەتکوت پەڕی مێشییە . ٢ـ بە چەپۆك لەسەری کەسێكدان . :: وەها توند بەسەرێدا دا ئاوری لە چاوان دەرپەڕی . ٣ـ هێرش بردنە سەر دوژمن :: نیوە شەوێ بە سەرماندا دان نەمان هێشت جۆقەواریان لێدەرچێ .

**بەسەرداڕۆییشتن** ـ ( مصت . مت . ) سەرکۆنەکردن ، سەرزەنشتکردن :: زۆری بەسەردا ڕۆییشتین بێ فایدەبۆ ★ بەسەرداڕۆیین . بەسەرداهاتن /٢ .

**بەسەرداڕۆیین** ـ ( مصت. مت.)، (مکـ.) تە : بەسەردا ڕۆییشتن .

**بەسەرداهاتن** ـ ١ـ ( مصت. لا.) بیر و هەوەسی کردنی کارێ یا قسەیێك ، کەوتنە مێشکی کەسێکەوە :: وام بەسەردا دەهات دەمکوت هەڵستم و زللەیەکی

لێدەم . هەر بە سەرێدا هــات دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکا . ٢ـ ( مصت. مت.) تم : بەسەردا ڕۆیشتن . :: هێنـدەی بەسەرداهاتین تا وازمان پێ لە سەفەرەکەی هێنا .

**بەسەرداهێنان ــ** [ بە/١٢+سەر + دا ( = ٣ـ ئا ) + هێنان ] ، ( مصت. مت.) ، تاوانی کار و کردەوەیێك خستنە ئەستۆی کەسێ :: ئاگای لە هیچ نەبو کەچی دزیەکەیان بەسەرداهێنا . ★ بە ئەستۆداهێنان . بەملداهێنان . خستنە ئەستۆ .

**بەسەرزمانەوەگرتن ــ** ( مصت . لا. ) ، ( مک. ) زۆر گوتنەوەی قسەیێك یا باسێك :: ئەوە بۆچی باسی ئەم کابرایەت بە سەر زمانەوە گرتوە و هەردەیلێیی و دەیلێیەوە .

**بەسەرکردنەوە ــ** ( مصت. مت . )، ( مک. ) ١ـ ئەژماردن یا هەر وا بەچاو ، ووردبونەوە لەو شتانەی لە شوێنێك داندراون ، بە نیازی ئەوەی کە بزاندرێ تەواون یا وەك خۆیان ماوون . :: دە بڕۆن ئەو مەڕانە بەسەرکەنەوە .

٢ ـ **تە : بەسەرگرتنەوە** . ٣ ـ سەر لە دۆست و خزم و ناسیاودان . :: ئەوە چۆن بۆ بە سەرت‌کردینەوە.

**بەسەرگرتنەوە ــ** ( مصت. مت. ) ١ـ ناسینەوەی مەڕ و گاو و گوڵێ کە دزرابێ یا وونبوبێ . :: لە مەڕەکان حەوتیانم لای کوێخا فەرەج بەسەرگرتەوە . ٢ـ ( مج . ) دۆزینەوەی هەمو شتێکی گوم‌بو یا دزراو .

**بەسەرهات ــ** ( نت.) ، (تت.) ١ـ هەمو ئەو کارەساتانەی لە ژیانا بۆ کەسێ یا میللەتێك و کۆمەڵێك ڕۆی دابێ . ٢ـ موتڵەقی ڕۆداوێکی معین . ★ ( مک. ، سن. ) سەرگوزەشتە . ( بک.) سەربۆرێ ، سەربوهۆر .

**بەسەرهاتن ــ** ( مصت. لا . ) ڕۆداوێکی ناخۆش بۆ کەسێ یا کەسانێ هاتنەپێش . :: وەك بەسەر ئێمە هاتوە بەسەر کەس نەیێ .

**بەسەرەوەگرتن ــ** ( مصت. مت.) گرتنی پیاوێکی بێگانە دەگەڵ ئافرەتێك لە کاتی کاری تایبەتێ ژن و مێردایەتیدا :: پیاویان بەسەرەوەگرتبا ، نەك درۆی کردبا .

**بەسەرەوەگەڕان ــ** ( مصت. مت.) ١ـ سەردان لە کۆمەڵێ خەڵك کە لە چەند شوێنی دۆر لەیەکترین ( بۆ هەر مەبەستێ بێ ) . :: دە بڕۆ بەسەر مندالەکانەوە بگەڕێ مەبادا شتێکیان پێ‌بوێ . ٢ـ (مج.) مڵ و مۆکردن و خۆ بەم و بەو بەخێوکردن .

**بەسەرەوەنان ــ** ( مصت. لا.) بە یەك بین خواردنەوەی هەر شتێکی تراو (ئاو ، ماصتاو ، ئارەق و ...و ...) کە دەقاپێك‌دابێ . :: پەرداغەکەی هەڵگرت و بەسەریەوە نا . جامی دۆیەکەی بەسەرەوە نا و تا چۆڕی لێ‌نەبڕی دای‌نەنایەوە □ « پیاڵەکەی نا بەسەریەوە و پێکێکی کەی بۆ خۆی دروست‌کردەوە و وتی : » ( بلە :

ژان ، ل ــ ٩٥ ) .

**بەسەزمان ــ** ( صت. ) ، (سیمە.) تم : بەستەزمان .

**١ــ بەش ــ** [ ست : بەغا . ، پە : بەخش ] ،( نا. ) ، ( کئێر. ، کعر. ، بک.) ١ــ هەر پارچەیەك لە شتێك کە لەت و کوت کرابێ ، جا ئەم لەتانە هەمۆیان بە قەد یەکبن یا گەورە و چۆك ، قورس و سۆك ، و ... بن . هەر (جزء)ێك لە ئەجزای (کل)ێك . :: دنیا سێ بەشی ئاو و بەشێکی ووشکانییە . بەشی زۆری قسەکانی دەربارەی نەخۆشێ زەردۆیی‌بۆ . ٢ــ نەختێ لە شتێ کە بۆ چەند کەس تەرخان‌کرابێ . ئەو نەختەی بەریەکێکیان دەکەوێ . (عا.) حصة ، سهم . :: بزانن بەشی خۆی چەندی بەردەکەوێ بێدەنێ . بەشی خۆی بە زیادەوە وەرگرتوە و هێشتاش نارازییە . ٣ ــ رزق و رۆزێ . قیسمەت و نسیب . □ « بەشی قرژەی نان و گۆشتە » ، «یاخوا بەشت هەر دۆزمانێ بێ » . «خوایە رازیم بە بەشت » . ٤ــ پارچەیەك ، هێندێك و نەختێك لە شتێ کە بەشەریکایەتێ ئێ چەند کەسان بێ . :: ئەم ئوتۆمبێلە بەشی خەسرەوی پێوەیە . ئەم خانوە بەشی هەتیوی پێوەیە ؛ بێ‌ئاگاداری قازێ نافرۆشرێ . ٥ــ مەلبەند، ناوچە یان هەر هەرێمێکی وولاتێك :: شاری هەلەبجە لە بەشی شارەزورە ، بەشی جوانرۆ دەکەوێتە جنوبی کوردستانی سنە . بەشی موکریان لە کوردستانی ئێرانە .،

**بەش‌بەحالّی** ... رستەیەکە، یەکێك لە سەرەتا یا دوایی قسەی زیاددەکا تا ئەو کەسانەی گۆیان لە قسەیەتی نەیبەنە سەرخۆیان :: بەش بەحالّی خۆم دەلّێم پیاوی درۆزن رۆی رەش بێ. **بەشی‌خولاّ ــ** ( نت. ) ، ( مک. ) تم : بەشی خوا . **بەشی خودا ــ** ( نت. ) ، مک.) تم : بەشی خوا .

**بەشی خوا ــ** ( نت. ) ، ( سیمە . ) هەرچی لە لایەن خواوە بە ئادەمێزاد بگا ، وەکو : رزق و رۆزێ ، بەختەوەرێ و بەدبەختێ، بەلاّ و نەگبەتێ و نەخۆشێ ، مندالّ و ... :: بەشی خوایە و شوکرانەی دەوێ . ★ ( مک. ) بەشی خودا ، بەشی خولاّ .

**بەش‌چۆنەوە سەربەشان ــ** (کن.) بە کەسێك دەگوترێ : « رەببێ بەشت پچێتەوە سەربەشان » بە نیازی ئەوەی ئەو کەسە کەسێکی نیزیکی بمرێ و ببێتە میراتگری و هێشتا میراتەکە بەش‌نەکرابێ خۆشی بمرێ و بەشەکەی ئەو بە سەر میراتگرەکانی مردۆی پێشۆدا بەش‌کرێتەوە .

**٢ــ بەش ــ** [ ؟ ] ، ( صت. ) ئاوالەداپچراو ، لێك‌کراوەوە . :: برینەکەی دەمی بەش‌کردۆتەوە . تێب ــ ١ ) ئەم صفەتە زیاتر بۆ دەمی گیاندار و برین بەکاردێت . ب ) من وای بۆ دەچم کە ئەم ووشەیە دەگەلّ ( ١ــ بەش ) هەر یەك بن و یەکێك لە مەعناکانی ( ١ــ بەش ) بێ ،

چونکو وەختێ (دەم) دادەپچڕێ یا ( برین سەری دەکاتەوە ، ڕاستییەکەی ئەوەیە (کل)ێك دەبێتە دۆ ( جزء ) سەرەڕای ئەوەش چونکو زۆر لەم بۆچونەی خۆم دلنیانەبوم وەکو واحیدێکی سەربەخۆ حیسابم کرد و بە جیا نوسیم .

٣ـ **بەش ـ** ( صت.) (مک.) حالی گایەکی ناوچاوانی تا سەر دەمی سپێ بێ ، خۆی ڕنگی چدەبێ بێ. □ « وەك گای بەش وایە » . ★ ( هل.) قەش . ٢ـ حالی بزنی ناوچاوان سپێ . ★ (مک. ، هل.) قەشان . ٣ـ (هل.) حالی مانگایەکی ناوچەوان سپێ .

**بەشبڕان ـ** ( مصت. لا. فج. ) بێنسیب بونی کەسێ لە شتێ ( ماددێ مەعنەوێ ) کە بە هیوا بوبێ پێی بگا و دەستیکەوێ .

**بەشبڕاو ـ** ( نمف : بەشبڕان ) کەسێکی بە هەوبای شتێك بوبێ دەستی کەوێ و دەستی نەکەوتبێ

**بەشبەش ـ** ( صت.) حالی شتێك ، جێگایەك یا وولاتێك کە پارچە پارچە و لەت و کوت کرابێ .

**بەشبەشکردن ـ** ( مصت. مت. ) شتێك ، جێگایەك یا وولاتێك کردنە چەند پارچە :: گۆشتەکە بەشبەش کەن و بیبەن بۆ ئەو مالانە. ئیستیعمار نەبا کەس نەیدەتوانی ئەم وولاتە وا بەشبەشکات .

**بەشخواردن ـ** ( مصت. مت . ) ١ـ بێبەهرەکردنی کەسێك لەوەی بۆی دیاریکرابێ :: فەرزندە چوە دەرێ هەتا هاتەوە بەشەکەیان خواردبو . ٢ـ ( مج.) بە ناڕەوا دەست ، دە مالی خەلکی نان و دەست بە سەر هێندێکی یا هەموی دا گرتن . :: مامەکەیان بەشی ئەو هەتیوانەی هەر خوارد .

**بەشخواردن ـ** ( مصت. لا. فج.) بێبەهرەبون ، مەحرومبون :: منداڵینە هەرچێ دەرەنگبێتەوە بەشی دەخورێ .

**بەشخوراو ـ**(نمف : بەشخوران، کەسێکی بەشی خورابێ ، شتێکی لێداگیرکرابێ ، بە زۆر مالی زەوتکرابێ . :: ئەی بەشخوراو خۆمان .

**بەشدار ـ** ( صفا.) ١ـ حالی کەسێکی بەشی لە شتێکدا هەبێ . ● (( ئەگەر بەشە بەشدارین )) . ( کن.) ئەگەر شتێك بەش دەکەن ئێمەش بەشی خۆمان دەوێ . تێب ـ بە لای منەوە ، ئەم ووشەیە ، هەر بۆ ئەو کاتە بەکاردێت کە یەکێك بە حەقانەت و ڕاستێ بەشی دە شتێکدا هەبێ و ئەگەر ویستی وەری بگرێ ، نەك ئەوەی کە ( بەش )بخاتە ناو شتێکەوە ( ببێتە شەریك تێیدا ) . جا بۆیە وا تێدەگەم : « بەشداری خەمتانم » یا « لە خۆپێشاندانەکەدا بەشداربو » کە تازە لە ( مساهمة ) و (اشتراك)ی عەرەبێڕا تەرجەمەکراوون، لە جێی خۆیان نەبن و بۆ ئەم تەرحە شتانە : هاوبەش ، هاوبەشێ ، بە باشتر دەزانم ٢ـ (مج.) ، (مک.) صەگ . تێب ـ بەو ئیعتیبارەی کە هەرچێ لە مالێ بخورێ بەشی ئەوی تێدایە و

دەبێ بیدرێتێ .
**بەشقم** ـ [ محر : بەشـــکم ] ، ( تب . ، بنت . ) ، (مکا.) تم : بەشکە.
**بەشك** ـ [کو. عا.] ، [ بە/٨ + شك ] ، ( صفا.) حالی کەسێـکی گومانی لە کەسێ لە کارێ ، ... هەبێ :: هـەر لــە هەوەڵــەوە لێبەشكبوون . لە خۆی بەشك نەبێ قسەی وا ناکا .
**بـــەش کردن** ـ بەس‌بـــوون ، کیفایەت‌بوونی میقدارێك لە شتێ بۆ مەبەستێ :: سێ میتر فاسۆنیا بـۆ کوت و شاڵوار بەش‌دەکا. چێشتەکە زۆرە سێ کەسی دیکەش بێـن هەر بەش‌دەکا . کەوشەکەی برزۆ بەشی سێ مانـــگی نەکرد . دەســتی پێوەنەگرتبا تۆتنـــەکەی بـــەشی هەفتەیێـکی نەدەکردە ☐ « زیـاتر بـیری لـە پـارەی ســەرفترەکە دەکردەوە، چۆنی خەرج‌کات، بەشی کاسە جێژنەش بکا ، چێژنانەیەکیش بۆ ژنەکەی و منداڵەکانی بکڕێ » .
( قزلجێ : پێکەنین ـ ٧٣ ) .
٢ـ (مصد. متـ.) (کل)یێك کردن بـە چەند (جزء) سا بۆ هەر مەبەستێ بێت . :: ئێوارە کە مەڕ هــاتەوە حەیوانەکانمان بەش‌کرد . پشکیان لێ‌هاویشــــت و خانوەکەیــــان لێ‌بەش‌کردن. منداڵینە بچن نوقڵان بکڕن و بـۆ خۆتــان بەشی کەن . بەش‌ناکرێ . بەش‌نەدەکرا . بەشی دەکەین . **دابەش‌کردن** ـ ( مصد . متـ.) ١ـ تم : بەش‌کردن/٢ . ٢ـ تم : بەشینەوە . تێبـ ـ وا تێدەگەم جیاوازێکی پچوك لــە نێوان ئـەم مەصدەرە و مەصدەری بەش‌کردن /٢دا هەبێ ، ئەویش بــە لای منەوە ئەوەیـــە کە ( دابـەش‌کردن )٢ بـۆ ژمارەیێکی نـامەعلومی خەڵك دەبێ بەکاربێت و ( بەشـس‌کردن/٢ ) بـۆ ژمارەی دیار و مەحدوود .
**بەشکم** ـ [بە/٢ + شـك + ئم (زەمیری : من ) ] ، (تب. بنتـ.) تم : بەشکە .
**بەشکو** ـ [ بە/٢ + شك + ئو ( زەمیری : ئێوە ) ] ، (تب. ، بنت . ) تم : بەشکە .
**بەشکە** ـ [بە/٢ + شك + ١ـ ئــە ] ، ( تب . ، بنتـ . ( ئــەدێ ئەگەر ... ، ئەگەر هــاتوو ... ، ئەی‌کە ... ، هات‌ووا ... ، تێبـ ـ أ ) ئەم ووشەیە هاوتای زۆرە کە هەر یەکەیـــان هێنـــدێك دەنـــگیان (هێندێـــکیان‌لە ناوەڕاســـت و هەموێـــان‌لە دوایێ) لێ‌زیادکراوە ، دەنگەکانی دوایێ بـــە لای منـــەوە (زەمێر)ن ، لە ڕابوردوودا (بەشـــکم) دەگەڵ (بەشکو) بە پێی زەمیرەکەی دوایێ مـــانای جیاواز بوە ، بـــەڵام بەرەبەرە ئـــەو فەرق و جیاوازییە لەناوچووە و هەموو ووشەکان یەك مانایان بۆ ماوەتەوە . ب) تەلەففوزی ئەم ووشـــانەش گۆڕانی بەســـەردا هاتوە و بە لای منەوە لە ڕابوردوودا (بە ، شکم = بەشکی من) گوتراوە و لە قورســـایێ تەلەففوز خراوەتـــە ســـەردەنگی (ش) بەڵام ئێســـتا ئەم قورساییە هاتوتە سەرکەرتی دوایێ ووشەکە ... ج) وەکو نیشانم داوە کەرتی (شك) لەم ووشـــەیەدا هەر

(شك)ی عارەبییە ، بەلام من خۆشم لەم (شك)ە بەشـکم . ★ بەشقم . بەشکم . بەشـکێکم . بەشـکێکو ، بەشکۆ ، بەشکەم . بەشکێ .

**بەشکەم ــ** [بەشکە + ئم (زەمیری من) ] ، (تب . ، بنت .) تم : بەشکە .

**بەشکێکم ــ** [بە/٢ + شـك + ئێك ( = ٣ ــ یێ ) + ئم (زەمیری : من ) ] ، (تب. ، بنت . ) تم : بەشکە.

**بەشکێکو ــ** [بە/٢ + شك + ئێك (= ٣ــ ئێ) + ئۆ (زەمیری : ئێوە) ]، (تب . ، بنت .) تم : بەشکە .

**بەشکێ ــ** [بە/٢ + شك + ئێ (زەمیری : وێ = ئەو) ] ، (تب . ، بنت .) تم : بەشکە .

**بەشورار ــ** [بە/٨ + شـوار] ، (صت .) ، (مک .) حالی صابونێکی باش کەف بکا .

**بەشۆ ــ** (صت.) ، (کعر. ، سنـ.) حالی ئافرەتێکی کە شوی کردبێ. :: مامبارام سێ کچی بەشوی هەیە و دوانیشی لە مالەوە عازەبن . ★ ( مک. ) بە مێرد .

**بەشۆدان ــ** ( مصت . مت . ) ، ( کعر. ، سنـ . ) ١ــ ژن یا کچێ لە پیـــاوێك مـــارەکردن . ٢ــ هەلخـەلەتاندن و تۆشی بەلاکردنـی کەسێ .

**بەشـــەر ــ** [عا.] ، (نـا.) تم : ئادەمیزاد .

**بەشەرت ــ** [کو. عا.]، [بە/٨ + شەرت (شرط) ] ، (صت .) بە پێی قەرار و مەدارێکی لە پێشدا قسەی لێ کرابێ . :: بە شـەرتێ دەگەلت دێم کە تۆ هیچ قسـە نەکەی . بە شـەرت دەگەلی ئاشتبۆتەوە . خۆ تۆ بە شـەرت نەبوێتـە ئەنـدام .

**بە شەرتی چەقۆ ــ** ١ــ ڕستەیێکە شوتی فرۆش بـەکاری دێنن ، بـەو مانایە کە ئامادەیە بە چەقۆ شوتی لەت بکا و ئەگەر نەگەیشتبۆ کڕیار هەلی نەگرێ . ٢ــ (مجـ.) بە دوای بڕوبیانۆدا گەڕان بۆ ئەوەی ڕێگە لە جێیەجێ بۆنی کـار و مەســەلەیەك ببڕێتەوە . دانانی (شروط تعجیزی) لە پێش کارێك. :: ئەوەی تۆ دەلەی دۆستایەتی بە شـــەرتی چەقۆیە و سەرناگرێ .

**بەشێنەوە ــ** [بەشێن (بەخشین+ ٢ــ ئەوە/٢ ] ، ( مصت. مت. ) ١ــ دابەش کردنی شتێك بە خۆڕایی :: شیرنی دەبەشنەوە. گۆشتی قوربانی دەبەشێتەوە **ئا ! ئا ! دەبەشنەوە ــ** ڕســـتەیێکە بەسەرســـوڕمانەوە دەگوترێ . زیـاتر دۆکاندار بـــە کڕیارێکی دەلێ کە نرخێکی وا بـۆ کالایەك بلێ نەچێتە عەقلەوە . ★ بەخشێنەوە . دابەش کردن/٢ .

**بەشێنی خواردن ــ** (مصت. مت.)، (کن .) ١ــ فرۆشـتنی بەرهـەم و حاسـلاتی کشـتوکال ، بـەرلە پێگەیشتنی فرۆشتن . ٢ــ (مجـ.) هـەمۆ بەرهەمێـکی دێـکە ، بـەم دەردەبردن . تێب ــ ئەم مەصدەرە لـەوەڕا پەیـدابوە کە جـوتێرانی کوردسـتان ، لەبـەر نـەداری و دەسکورتی پێش ئەوەی حاسلاتیان پێ بگا ، لە شـاران بـە بازرگانیان دەفرۆت و پارەیان لێ وەردەگرت . ئەوجار کە حاسلەکەیان پێدەگەیێ ،

یا دەیانفرۆشت و قەرزی کابرایان دەدایەوە یا هەر حاسڵەکەیان تەسلیم دەکرد و خۆیـان هیچی وایان بـۆ نەدەمایەوە . جا لەم بەینەدا ئەگەر قسـە لـە چۆنێتی حاسـڵەکەیان هاتبایە گۆڕ ، دەیانگوت : « بەمن چی ! من بەشێنی خواردوومە » .

**« بەعاستەم و دوو بەلا »** — (بنت .)، (مکـ .) زۆرکەم :: بە عاستەم و دوو بەلا لەبەری هەڵستا .

دوو بەلا بەولاوە چوو . بە عاستەم و دوو بەلای مابوو لـە بانەکە بکەوێتە خوار . تێبـ — نازانم ووشەی (بەلا) لێرەدا هـەر ( بلاء )ی عەرەبییە یا شتێکی تر .

**بەعینوان** — [کو. عا.] ، (صت .) حالی ئافرەتێـکی جـوان و کۆك و پۆشتە و شۆخو شەنگ و لەخۆبایی، ئافرەتی بە شەخسیەت .

**بەغیرەت** — [کو. عا.] ، (صت.) ئازا و نەترس ( ماددی و مەعنەوی) □ « وەکو شـێر وەرنـە مەیدانی جەڕارەت » .

« بـەغیرەت بن ، بـەغیرەت بن ، بەغیرەت» (مگ : مەلا — ١٦) .

**بەغیل** — [ محر . عا : بەخیل ] ، ( نفا. ، ص .) کەسێکی چاوی بـە حالخۆشـی خەڵك هەڵنـەیێت . کەسـێکی حەز بـەدەوڵەمەندی ، خۆشبەختی و ... و ... نەکات . تێبـ — مانای ئەم ووشەیە لەکوردیدا، هیچ پێوەندێکی دەگەڵ مانای ئەسڵە عەرەبییەکەیـدا نیـە و مانـای (حەسوود)ی عەرەبی دەدا . بەڵام لە بن لەهجەی سـلەیمانێدا شـکڵ و ماناکەی هیچ دەستی لێنەدراوە و بەمانای (رژد)ی کوردییە .

**بەغیلی** — [بەغیل + ٢— ئی ] ، (حمص .) کارێـکی مرۆڤی بەغیل دەیکا . حەسـادەت . حەسـوودی (عا.) .

**بەغیلی پێبردن** — (مصت. لا.)بە ئاواتی حاڵناخۆشـی ، لێکەوتن و فەقیربـوونی کەسـێکەوەبوون . داواکاری ڕووداوی ناخۆش ( لە هەر بابەتێك بێ) بۆ کەسێ بوون .

**بەفاڵ** — [کو. عا.] ، [بە/٨ + فاڵ ( = فحل ) ] ، (صت.) حـالی ماکەر و ماینێکی هەوای جووت بوونیان دەگەڵ نێرەکەر و ئەسپ کەوتبێتە سـەر ● **« لە چ حاڵ بەفاڵی »** — (مکـ .) مەتەڵێکە بە کەسێ ئەووتری کە چلۆنایەتی ڕاسـتەقینەی حالی دەگـەڵ ئـاوات و کـردەوەی ڕێكنەکەوی .

**بەفر** — [ ست : ڤەفرە . ، پە : ڤـەرف ] ، ( نت. ) ١— کلـووی شەشپەڕی سوو کە بە دیمەن وەك لۆکە وایە ، زستانان کاتێك پلەی گەرما دادەبەزێتە خوار (.) هەڵمی ئاو کە لە ئاسمانا وەستاوە دەبێتەوە ئاو و دێتە خوار و لە سـەرمای نیزیك زەویدا دەیبەسـتێ . ٢— (کمر.) سەهۆڵی دەسـکرد . ★ ( بکـ . ) بەرف ، بەفـر . ( جف.) بـەرف . ( جـف . ) بـەور . ( زا . ) وەوری . (هو.) وەرو . **بـەفری یەکشەوە** — [١— بەفر + ١— ئی + یەك + شەو + ٥ — ئە/١ ] ، (نت.)

١ــ هەر بەفرێکی شەوێك بەسەر بارینیدا تێپەڕیبێ و هێشتا تۆز و خۆڵی لێ نەنیشتبێ و بۆر و چڵکن نەبوبێ. ٢ــ (کن.) ڕەنگی زۆر سپێ.

**بەفری پیرێژن** ــ (نت .) بەفرێکە لە کاتی سەرمای پیرێژنێدا (حەوتوی دوایی مانگی ڕەشەمە) دەبارێ .

**بەفرانبار** ــ [ ١ــ بەفر + ٢ــ ئان/١ + بار ( بارین ) ] ، هەوەڵ مانگی زستانی بە حیسابی نەورۆزێ سێ ڕۆژە ، (٢١ی کانونی یەکەم ــ ٢١ی کانونی دوەم) . ★ ( کئێر . ) دەی ( فر . ) .

**بەفراو** ــ (نت . ) ١ــ ئاوە ، کە هاوینان بەفری تێدکەن تا ساردبێ و بۆ خواردنەوە دەستبدا. ٢ــ ئاوێکە کە هەوا گەرم بێ لە توانەوەی بەفری شاخان پەیدا دەبێ و بۆ شیو و دۆڵان دێتەخوار . ٣ــ ( کعر . ) ئاوێکە سەهۆڵی دەسکردی تێخرابێ .

**بەفر بەسەر** ــ (صت .) حاڵی ڕێگا و بان و دەشت و دەر کە بەفر دایپۆشیبن و لەبەر سەرمای زۆر بەستبێتی و کاتێ پیاو بەسەریدا بڕوا قاچی دانەچێ . ★ (سن .) بەفرەسەر ڕچە/٢ .

**بەفرخۆرکە** ــ (نت .) پرۆشە بەفرێکە لە ئاخروئۆخری زستانا و پاش ئەوەی تەشقی زەوێ دەشکێ، لە هەورێکی ئەستوری چڵکن دەبارێ و پاش ئەوە گەلێ شوێنی پێدەشتان بەفریان لێدەچێتەوە و دەبنە ڕەشانگ .

**بەفرفرۆش** ــ ( نفا. ) کەسێکە زستانان بە بەفر لە. چاڵێکا کۆدەکاتەوە و بە هاوین دەیهێنێتەوە بازاڕ و دەیفرۆشێ .

**بەفرماڵ** ــ [ ١ــ بەفر + ماڵ (ماڵین) ] ، (نت .) ، (کعر.) شتێکە وەکو بێڵ (پانتر و گەورەتر) لە چەند پارچە تەختە دروست دەکرێ ، بەفری سەربان و حەوشە و...ی پێ دەماڵنەوە . ★ بەفرماڵك ، (مک.) وەروەرە .

**بەفرماڵك** ــ (نت.) تم : بەفرماڵ .

**بەفرودۆشاو** ــ ( نت.) ، ( مک.) بەفری داناردانای ئاخروئۆخری زستان و سەرەبەهارە کە لە هێندێ نواڵ و قەدپالان دەمێنێتەوە دەگەڵ دۆشاوی ترێ تێکەڵی دەکەن و بە چەشنی شەربەت دەیخۆنەوە .

**بەفرەچاڵ** ــ [ بەفر/١ + ٣ــ ئە/٢ + چاڵ ] ، (نت .) ، (سن .) تم . چاڵەبەفر .

**بەفرەژێلکە** ــ [ بەفر/١+ ٣ــ ئە /٢ + ژێل + کە ( ئم : پچوکێ ) ] ، (نت.) جۆرێك بەفرە، کلوی وردە ، لە حاڵەتی نێوان بەفر و تەرزەدایە. تێبـ ــ کەرتی ( ژێل ) لەم وشەیەدا، بە لای منەوە هەر ( ژێلە )ی بنلەهجەی ( لوڕێ )یە کە بە مانای تەرزەی ورد هاتوە ( تم : لوڕێ ، ل ــ ٧٧ ) ★ بەفرەلۆکە .

**بەفرەسەر** ــ ( صت.) ، ( سن.) تم : بەفربەسەر .

**بەفرەلۆکە** ــ [ بەفر/١ + ئەڵ/١ + ئۆکە] ، (نت.) تم : بەفرەژێلکە.

**بەفیز** ــ [ بە/٨ + فیز ] ، ( صت.) حاڵی کەسێکی ئیفادەی

هه‌بێ ، ته‌که‌ببور به‌سه‌ر خه‌ڵکا بکا. (ی.) مه‌غرور ، موته‌که‌بیر . ★ به‌هه‌وا .

**به‌ق** ـ (نا.) ، (هو.) نێره‌که‌و .

**به‌قا** ـ [ عا : بقاء = مانه‌وه ] ، (نا.) ١ـ باوه‌ڕ ، بڕوا :" پیاوێکی درۆزنه به‌قای پێ مه‌که . ٢ـ وه‌فا. □ «دنیا به‌قای بۆ که‌س نیه» .

**به‌قاپێکردن** ـ [عا. کو.] ، (مصد. مت.) تم : باوه‌ڕپێکردن .

**به‌قاڵ** ـ [عا = بقال] ، (نا.) دوکاندارێکه ، خوارده‌مه‌نی وه‌کو برنج و ڕۆن و په‌نیر و ماست و میوه‌جات و که‌وه‌ر و پیواز و سه‌وزی تر ده‌فرۆشێت .

**به‌قاڵی** ـ ( حمص . ) کار و پیشه‌یێکی به‌قاڵ ده‌یکا .

**به‌قبه‌قۆ** ـ [ند] ، (نت.) ، (سن.) ده‌نگی کۆتر . ★ (مک.) گمه‌گم . هس : ( هو.) به‌ق.

**به‌قنگاخستن** [ به‌/١٢ + قنگ + ٣ـ ئا + خستن ] ، ( مصد. مت.) ، ( سیم.) تم : به‌قۆنداخستن.

**به‌قۆنداخستن** ـ [ به‌/١٢ + قۆن + دا + خستن ] ، ( مصد. مت.) ، (مک.) وه‌دواخستن . وه‌دره‌نگیخستن . که‌مته‌رخه‌میکردن له جێبه‌جێکردنی کاران .

**به‌قه‌د** ـ [به‌/٢ + قه‌د ] ، (بنت.) به‌ئه‌ندازه‌ی ... ، هێنده‌ی .. □ « به‌قه‌د ئه‌و کێوه‌ی غه‌م له دڵم باره»، (فۆلکلۆر) . ●**«به‌قه‌دبه‌ڕه‌ی خۆت پێڕاکیشه»** ، ( تم : خا ، په‌ند ، ل ـ ١١٩ ) ، (کن.) له‌ ئه‌ندازه‌ی توانستی خۆت زیاتر داوا مه‌که .

**به‌قه‌ڵفه‌زچۆن** ـ [ به‌/٣ + قه‌ڵفه‌ز ؟ + چۆن ] ، ( مصد. مت.)، (مک.) دڕانی جل‌وبه‌رگ، له ئه‌نجامی لێگیربۆنی ته‌ڵه‌زمه‌دار ، بزمارێکی له‌شوێنێك داکوترابێ . به‌ردێکی نوكتیژی ده‌رپه‌ڕیو و هه‌رشتێکی تری له‌م بابه‌ته . تێب ـ أ ) ئه‌م جۆره (دڕان)ه هه‌میشه شکڵی زاویه‌ی قایمه‌ی هه‌یه و (زاویه) که ئه‌و شوێنه‌یه که ته‌ڵه‌زم یا ... ی لێگیربوه . ب ) من نه‌متوانی بزانم ووشه‌ی ( قه‌ڵفه‌ز) ئه‌سڵی چیه و له کوێڕا هاتوه ، به‌ڵام به دوری نازانم که ده‌گه‌ڵ ووشه‌ی (قه‌ڵبه)ی بن‌له‌هجه‌ی سله‌یمانی پێوه‌ندێکی نیزیکیان هه‌بێ هه‌رتکیان ئه‌سڵیان یه‌کبێ ...و ) مامۆستا خاڵ ( قه‌ڵفه‌ز )ی به ( تاڤگه ) مانالێداوه‌ته‌وه . ( تم : خا ، ب ٣ ، ل ـ ٥٦ ) .

**به‌قه‌م** ـ (نا.) ، (کعر.) ڕه‌نگێکی کاڵبێته‌وه . تێب ـ أ ) ئه‌م ووشه‌یه له ( به‌گه‌م )ه‌وه شێوه‌ی عه‌ره‌بی دراوه‌تێ و کراوه به ( به‌قه‌م ) و گه‌ڕاوه‌ته‌وه ناو زمانی کوردی . ب ) له ئه‌سڵا به دره‌ختێکی مه‌ڵبه‌ندی ئه‌مریکای جنوبی گوتراوه که به فره‌نسی ( کامپێشی ) ناوه و مادده‌یێکی تێدایه به لاتینی پێی ده‌ڵێن (هێماتۆکسیلۆن) ، ئا له‌م مادده‌یه ڕه‌نگی سور ، شین ، بنه‌وش ، بۆروڕه‌ش سازکراوه و زیاتر بۆ ڕه‌نگ‌کردنی خوری و

ئاوریشم بەکارهاتوە چونکو لــــەمانەدا درەنگ‌تر کاڵدەبێتـــەوە ، بەڵام بۆ لۆکە و کەتان زۆ دەچێتەوە. ج ) وەکو دەبینن لە زمانی کوردیـدا شێوەی گشتی دراوەتێ و بۆ هــەر ڕەنگێکی بچێتەوە بەکاردێت . ★ ( هل.) زاج .

**بەقەوەت** ـ [کو. عا.] ، [ بە/٨ + قەوەت = عـا : قوة ] ، (صت.) تم : بەهێز .

**بەقێناکەوتن** ـ ( مصت. لا.) ، ( سیم.) تم : بەقێن داچوْن .

**بەقێن‌داچوْن** ـ ( مصت. لا.) ، (مک.) ڕق‌هەڵستان لە کەسێ یـــا کەسانێ و پێ‌داگرتن لەسەر ئـــەم ڕقە و خۆدوورگرتن لە ئاشت‌بونەوە. :: لێمان بە قینداچوە و سێ ڕۆژە چۆتە ماڵی خاڵی و نایەتەوە . ★ (سیم.) بە قیناکەوتن . (مک.) بـــە قێنداکەوتـــن . بەڕق‌داچـــوْن . بەڕق‌داکەوتـــن . تێب ـ لـــەم مەصدەرەدا ووشەی (قێن) هـــەر (کین)ی پەهلەوییە کە دەنگی (ك) تێیدا لە پاش بڵاوبونەوەی ئیسلامـــەتێ گۆڕاوە و بۆتە ( ق ) .

**بەقێن‌داکەوتن** ـ ( مصت. لا.) ، (مک.) تم : بەقێن‌داچوْن .

**بەکار** ـ [ بـە/٨ + کـار ] ، ( صت.) حاڵی کەسێکی چـالاك‌بێ ، زۆر هەڵسوڕێ و تەمبەڵ نـــەبێ و خۆی لە ئیش‌کردن دوورنەگرێ .

**بەکارهـــاتن** ـ (مصتـــ.لا.) دەست‌دانی شتێك بۆ مەبەستێ . فایدەهەبوْن . بەکەڵك‌هاتن :: وازی لێ بێنن ئەم کابرایە بەکاری هێـچ نایە . ئەم هەمـــو ئاسنەواڵــەت کۆکردۆتەوە بەکاری چێ‌دێن .

**بەکارهێنان** ـ ( مصـت. مـت.) کەڵك‌وەرگرتن لە شتێ ، لە کەسێ بۆ هەر مەبەستێك بێت :: ئـــەم قەڵەمە با بۆ تۆ بێ هێشتا بەکارم نەهێناوە. ئەمانە خەڵك بۆ مەبەستی تایبەتێ خۆیان بەکاری‌دێنن .

**بەکاوەخۆ** ـ [بە/٢ + کاوەخۆ؟]، ١ـ (بند.) بەهێـــواشێ . بـــێ تاڵوکەکردن، لەسەرخۆ. ٢ـ (صت.) حاڵی ئادەمیزادێکی لـە کارانـــدا لەسەرە خۆ بێ و تاڵوکەنەکا .

**بەکرە** ـ [ = عا : بەکـــەرە ] ، (نا.) ، (کعر.) ١ـ ئامرازێکە بـــە شکڵی ئوستوانە لە تەختە دەکرێ و نـــاوقەدی بـــارێك‌کراوەتەوە ، ئەوسەرەوسەر کونەودێودەکـرێ ، دەزوی لەسەر هەڵدەکەن . ٢ ـ ئامرازێکی خڕە لە ئاسن ، وەکو دوْ پارچە ئاسن پێکـەوە نوْســابن و هێندێکی لێك‌دوْربن ، گوریـس ، زنجیر یا هەر شتێکی لەم بابەتە بەو نێوانەدا ڕەت دەبێ و لەسەرێکەوە بە دەست یا هەر هێزێـــکی تـــر ڕادەکێشرێ و ســـەرەکەی تـــری دە(بار) یا شتێکی قورس دەخرێ . بۆ داگرتن و هەڵگرتنی باری قــورس بەکاردێـــت . ★ (کئـــێر.) ١ـ غەڕغەڕە . (سن.) قرقرە .

**بەکرێ‌گرتن** ـ ( مصـــت. متـ .) وەرگرتنی هەر شتێـــك ( خـــانو ، ئەسپ ،...و...) لە خاوەنی بـــۆ ڕاپەڕانـــدن و جێبـــەجێ‌کردنی مەبەستێکی خـــۆ ، بەرامـــبەر بـــە

هێندێك پارە كە لە پێشدا لەسەری ڕێكدەكەون . :: خانوەكەی بە هەزار دینار بەكرێ گرتوە . دەگەڵ میرزا قاسمی قادری و یاهو دو ئێسترمان بە كرێ گرت و چوینە مەرگەوەڕ .

**بەكرێ گیراو** ــ (نمف.) ١ــ هەر شتێكی بۆ جێبەجێ كردنی مەبەستێ لە خاوەنی وەرگیرابێ و پارەی بدرێتێ . ٢ــ (تت.) هەر كەسێكی بە پارە یا بەرامبەر پاراستن ، پشتگرتن یا هەر جۆرە یارمەتی دانێك ، خزمەتی كەسێ یا هەیئەتێكی كۆمەڵایەتی ( دەوڵەت ، ... ، . ) بكات . (عا.) عەمیل :: بەكرێ گیراوانی ئیمپریالیزم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست . بەكرێ گیراوانی شەریكەی نەوت . تێب ــ ئەم مانایە هەمیشە بۆ مەبەستی ( سەلبی ــ مەنفی) بەكاردێت .

**بەكۆمەڵ** ــ [ بە/٢ + كۆمەڵ ] ، (بنت.) هەمو پێكەوە ، بەتێكڕایی . :: خەڵكەكە كۆبونەوە و بە كۆمەڵ ڕۆیان كردە بەر دەركی سەرا . كوڕینە وا بە كۆمەڵ مەڕۆن با فرۆكە نەتان بینێ .

**بەكەرەمنەمان** ــ (مصت. لا.) ، (مك.) لەكاركەوتن . بێ كەڵك بون . بێ خاسیەت بون .

**بەكەرەمهاتن** ــ ( مصت. لا.) ، (مك.) تم : بەكارهاتن .

**بەكەلكهاتن** ــ ( مصت. لا.) ، ( مك.) تم : بەكارهاتن .

**بەكەڵ** ــ [ بە/٨ + كەڵ ] ، ( صت.) حاڵی مانگایەكی هەوای جوتبونی دەگەڵ ( گا ) دەسەردابێ .

**بەكەڵكهاتن** ــ (مصت. لا.) ، (كعر.) تم : بەكارهاتن .

**بەكەیف** ــ [ كو. عا.] ، [ بە/٨ + كەیف ] ، (صت.) دڵخۆش . بەدەماغ . خۆشحاڵ .

**بەكێش** ــ ( صت.) حاڵی مرۆڤێكی لە كاراندا پشوی درێژبێ و لەمەیدان دەرنەچێ و واز لە جێبەجێ كردنی كارەكە نەهێنێ .

**بەگ** ــ [ ست : بغە ، بگە . پھ : بەگ = خوا ] ، (نا.) ١ــ ( كئێر. كعر.) نازناوێكە بە نیشانەی بە گەورەزانین و ڕێزلێگرتن ، لە پاش ناوی سەرۆكی هێندێ لە عەشیرەتەكانی كوردستان ( جاف ، جوانڕۆیی ، بانەیی ، فەیزوڵڵابەگی و ... و .... ) دێت . :: ڕۆستەم بەگ ، عەبدوڵڵابەگی میسباح ، داوود بەگی جاف . ٢ــ ( كعر. ) لە دەوری دەستەڵاتی عوسمانییاندا، لە عێراق و كوردستانی عێراقیش ( وەكو هەمو شوێنێكی دیكەی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی ) بە هێندێ كاربەدەستان گوتراوە و ئێستاش هەر بەكاردێت، بەڵام زۆر لە جاران كەمتربوە و شیوەی ڕەسمی بونی خۆشی لەدەستداوە . ٣ــ (كعر.) بە نیشانەی ڕێزگرتن ، لە قسەكردنا دەخرێتە دوای ناوانەوە ، بێ ئەوەی ئەو كەسە خۆی سەرەك‌عەشیرەت یا كاربەدەستێكی میری بێ . تێب ــ آ ) ئەم وشەیە بە هۆی دەستەڵاتی عوسمانییانەوە ، لە هەمو خاكی

ئیمپراتوریتی عوسمانیدا بڵاوبۆتەوە و گەلێ گۆڕانیشی بەسەردا هاتوە : لە زمانی عەرەبێ و فارسیدا بۆتە ( بێگ ) ، ترك خۆیان دەڵێن (بەی، بێی) ، لە تونس (بایْ) دەگوترێ . پ) بونە باوی ئەم وشەیە لە حکومەتی ( ترکانی عوسمانێ )دا وەکو لە قەبێکی ڕەسمێ ، وای لە هەندێکەس کردوە کە ڕەگەزی بەرنەوە سەر زمانی تورکێ ، لەوانە ـ کە بەلای منەوە زۆریش سەیرە ـ خوالێخۆشبو دوکتۆر (معین)ە ( تم : فەرهەنگ ، ج ١ ، ل ـ ٥٦٠ ، ٦٣١ ) . بەڵام مامۆستا تۆفیق وەهبێ (تم : هبێد، ل ـ ١٠ ) وەك وشەیەکی ڕەسەنی کوردێ نوسیویانە .

**بەگرتدان** ـ [ بە/٣ + گرت ( گرتن ) + دان (فە.) ] ، ( مصد. مت.) بونە مایەی گیران و بەندکرانی کەسێ .

**بەگزادە** ـ (نت.) ، ( کعر. ، کئێر.) ١ـ هەمو ئەو کەسانەی لە بنەماڵەی ( بەگ )ێك دەکەونەوە :: بەگزادەی جاف ، بەگزادەی فەیزوڵڵابەگی، بەگزادەی هەورامان.
٢ ـ ( مجـ. ) خاوەن بنەماڵە و نیشان ، نەجیب ڕەسەن . (عا.) نەبێل .
٣ـ (بک.) ئەوانەی بە دێهاتی کوردستانەوە دەخولێنەوە و دەهۆڵ و زوڕنا لێدەدەن. ( تم : ژابا ، ل ـ ٥٣ و ٥٤) . تێبـ ـ بەلای منەوە دەبێ بە نیشانەی قەدزرانین و حورمەتگرتنی هونەری ئەوکەسانە، ئەو لەقەبەیان درابێتێ .

**بەگژاچون** ـ [ بە/١٢ + گژ + ٣ـ ئا (دا) + چون (فە.) ] ، ( مصد. مت.) ، (سیم.) تـم : بەگژداچون .

**بەگژداهاتن** ـ ( مصد. لا.) ، ( مک. ) پەلاماردرانی کەسێك لە لەلایەن کەسێکی ترەوە بە نیازێکی خراپ ، جا چ بە قسە و دمەقاڵە بێ یا بە تێلا و هەر شتێکی لەم بابەتە . تێبـ ـ ئەم مەصدەرە لە حاڵێکدا دەکاردەکرێ کە ئەو کەسەی بەگژێداچون ، کارەساتەکە بۆ یەکێکی تر بگێڕێتەوە . :: هەر لە هێچ و خۆڕایێ بەگژمداهات .

**بەگژداچون** ـ ( مصد. مت.) ، ( مک. ) پەلاماردانی کەسێك لە لایەن یەکێکی ترەوە بە نیازی شەڕ و خراپە . ( هس : بەگژداهاتن ) .
★ ( مک. ) دەگژڕاچون .

**١ـ بەگوڕ** ـ [ بە/٢ + ١ـ گوڕ]، ( بنت. ) بەهێز ، بەقەوەت ، بەتوندێ ، بەتین و تاقەت . :: بە گوڕ خۆی هەڵاویشت و بەسەر دیوارەکەدا بازدیدا .

**٢ـ بەگوڕ** ـ [ بە/٨ + ١ ـ گوڕ ] ، ( صت.) حاڵی کەسێکی هێز و تاقەتی زۆری هەبێ . :: جوامێر پیاوێکی بەگوڕە .

**بەگوڕەگوڕ** ـ [ بە/٨ + ٢ ـ گوڕ + ٣ـ ئە/٢ + ٢ـ گوڕ ( ری . فە. ) ] ، ( صت.) حاڵی کەسێکی بە نەڕەنەڕ و دەنگی بڵیند و توڕەییەوە قسەبکا ☐ « مەنگوڕم بە گوڕە گوڕم ، مامەشم بە

مشەمشم » . (فۆلکلۆر.) :: کوڕە هیچ نیە ئەوە هەمیشە هەروا بە گوڕەگوڕە .

**بەگون** ــ [ بە/٨ + گون ] ، ( صت.) ١ــ نێرینەی هێندێ گیانداران کە صفەتی نێرینەیێ تێدا زۆر دەرکەوێت . ٢ــ ( مج. ) حاڵی ئادەمیزادی بەزەبروزەنگ .

**بەگوێدادان** ــ ( مصت. مت. ) بە شێوەیێکی ناڕاستەخۆ ، مەبەستێك دە کەسێ گەیاندن . :: وا دیارە هێندێ قسەیان بەگوێدا داوە .

**بەگەنکردن** ــ [ تو. کو.] ، [ بەگەن + کردن ] ، ( مصت. لا.) ، ( کک.) بەلاوە باش بونی کارێ ، شتێ یا قسەیێ . :: ئەگەر کراسەکە بەگەن ناکەی بۆی دەبەینەوە . ★ پەسندکردن .

**بەگیانکەوتن** ــ ( مصت. لا. ) ١ــ بە چاکێ و خێرایێ هەزم بونی خواردەمەنیێك :: هێندەت پەلەکرد نەتهێشت نانەکەمان بە گیانی بکەوێ . ٢ــ خواردەمەنیێك لە لایەن کەسێکەوە :: ترخێنەم بە گیان ناکەوێ ★ بەدلەوەنوسان .

**بەگیر** ــ [ بە/٨ + گیر] ، (صت.)، ( کعر. ) تم : بەگیرگە .

**بەگیرگە** ــ [ بەگیر + گە ( = ئك + ٥ــ ئە/٢ ] ، (صت.) ، (مک.) حاڵی کەسێکی لەسەر قسە و لە کاراندا زۆر خۆ ڕابگرێ ، کەسێکی بەرامبەر ڕوداوان یا خەڵکی کەمتر خۆ بەدەستەوە بدا .

**بەگیرخستن** ــ (مصت . مت .) ، (مک . سیە .) تم : بەگیرهێنان .

**بەگیرکەوتن** ــ ( مصت. لا. ) ، (کعر.) ١ــ گرفتاربونی کەسێك بە دەستی کەسێکی تر ( بە هەر شێوەیێك و بۆ هەر مەبەستێ بێ). ٢ ــ تۆشی نارەحەتی و گیروگرفتبون . ★ ( کئێر. ) وەگیرکەوتن . ٣ــ پەیدابونی شتێکی کەسێك پێویستیبێ :: خەیار بەگیر نەکەوت ترێزۆم کڕی . ★ (کئێر.) وەگیرکەوتن . (کعر.) بەرگیرکەوتن، بەرگیرهاتن .

**بەگیروەستان** ــ ( مصت . لا. ) وەژانکەوتنی ئەندامێك یا جێگایەکی لەشی ئادەمیزاد و لە کارکەوتنی ★ (مک.) ڕاگیران .

**بەگیرهاتن** ــ (مصت. لا.)، (کعر.) تم : بەگیرکەوتن .

**بەگیرهێنان** ــ (مصت. مت.) ، (کعر. ، کئێر.) ١ــ دۆزینەوەی کەسێك کە خۆی لە ڕۆبەڕۆبون دەگەڵ کەسێ یا کەسانێ بپارێزێ :: لە کوچەی ماڵی خۆیان بەگیرمان هێنا هەر چۆنێ بێ لەم دوو سێ ڕۆژانەدا بەگیریدێنین . ٢ــ پەیداکردنی شتێکی پێویست :: هەمو کتێبخانەکانی بێڕوت گەڕام کتێبێکیان ڕاسپاردبوم بەگیرم‌هێنا. ★ (مک.) وەگیرهێنان (مک. ، سیە.) بەگیرخستن سیە . بەرگیرخستن ، بەرگیرهێنان .

**بەل** ــ [؟] ، (صت .) ، (کعر .) ١ــ قیت ، قنج ، ڕاست . (عا.) قاییم ، عەمودێ . (هبێد : ل ــ ١٠) ٢ــ « بزنی گوێلول . شتێکە کە شۆڕبوبێتەوە و تەکەتەکی بێ. (زا.)

گیانداری گوێ قوت. » (تم : خا ، ب ١ ، ل ــ ١٧١ إ ) . ٣ــ (هـل :) حالی هەر شتێکی وەکو لولە وابێ (لولەتفەنگ و . . . ) کە لە شوێنێکدا لەبەر هەرچی بێ گوشاد بوبێتەوە :: ئەم تفەنگە لولەکەی بەلە .

**بەلاداکردن ــ** ( مصت . مت . ) ، (کعر.) ١ــ هەڵدانەوە و دەبەر پشتێند چەقاندنی شاقەلی کەوای شۆڕی کوردێ. ٢ــ (مجـ.) خۆ ئامادەکردن بۆ جێبەجێ کردنی کار و فرمانێ □ « بەلادابکەن چاکی مەردایەتێ ، درێغێ مەکەن گیان لە کوردایەتێ » (؟) .

**بەلاداکەفتن ــ** ( مصت . لا . ) ، (سنـ .) تم : بەلاداکەوتن .

**بەلاداکەوتن ــ** ( مصت. لا. ) ١ــ لەسەر لاتەنیشتێ ڕاکشانی ئادەمیزاد ★ پاڵ کەوتن. ڕاکشان . درێژبون. (سنـ .) بەلادا کەفتن . ٢ــ (تم : بەلاداهاتن/١ .

**بەلاداهاتن ــ** ( مصت. لا. ) ١ــ کەوتنەخواری کەسێك ( بە پێوە ڕاوەستابێ یاخۆ دانیشتبێ ) لەبەر بێخەوێ ، مەستێ ، یا نەخۆشێکی کتوپڕ و هەر هۆیەکی تری لەم بابەتانە . ★ بەلاداکەوتن/٢ .

**بەلاش ــ** [ بە /٢ + لاش ] ، (بنت .) ، (کعر.) ١ــ بەخۆڕایێ ، بێپارە . ٢ــ بێ هۆ ، بێ سەبەب . :: بەلاش و حەلاش ئەو هەمو ڕێگایەت داینەبەر ٣ــ (کنـ.) هەرزانێ نرخی کاڵایەك :: وەرەترێ ! بەلاش. تێبـ ــ بەناڕەوا گەلێ کەس (بۆ نمونە : ژابا تم ، ل ــ ٥٤ ) ئەسلی ئەم وشەیە دەبەنەوە سەر (بلاشییء)ی عەرەبێ و من خۆشم لە پێشدا هەر وام دەزانی . أ) « بورهانی قاتیع » ئەوەی ( موحەممەدی عەبباسێ ) پێیاچوتەوە لە لاپەڕەی ١٩٩دا وشەی ( بیلاژ )ی نوسیوە و بە : بێ سەبەب ، بێ هۆ ، بێ قەدر مانای لێ دەداتەوە . ب ) هەروەکو لە سەرەوە نیشانم داوە ، من ئەم وشەیە بە ( مرکب ) دەزانم کە کەرتێکی ( لاش ــ یا ــ لاژ )ە ، بۆ ئەم کەرتە لە ( ئاوێستایێ ) و ( پەهلەوێ )دا مانایەکم نەدۆزیەوە . دوکتور ( معین ) لە لاپەڕەی ٣٥٢٧ی بەرگی دوەمی ( فەرهەنگ )دا چوار وشەی ( لاش )ی نوسیوە : ١ــ لاشە ، کەلاك ، کەلەش . ٢ــ بۆ ئەم لاشەیان دو ئەسڵی داناوە یەکیان (لاش و ماش)ی فارسێ و ئەویتریان ( بلاشیی )ی عەرەبێ و ئەو مانایانەی بۆ هێناوە ، هێچ وپوچ ، نزم ، بێ ئیعتیبار ، پارەی کەم ، کەم و نرخی هەرزان . هەر لە ڕیزی ئەم ( لاش )ەیاندا وشەی (بەلاش)ی بە بێ هۆ ، بێ سەبەب ( عبث ) مانا لێداوەتەوە و ( لاش )ی سێیەم لە لەهجەی ( مەرغوز )یدا مانای ( تاڵان )ی بۆ دۆزیوەتەوە . (لاش)ی چوارەمیش مانای ( ترێ لێکردنەوە)یە . ج) وەکو دەبینن هەمو ئەو مانایانەی کە لەسەرەوە باس کران دەگەڵ مانای وشەی ( بەلاش ) کە ئێستا لە کوردستانی عێراق لە زمانی کوردیدا باوە ، ڕێك دەکەون.

**بەلان** ــ [ بەی/١ + ٢ــ ئان/٧] ، ( نت.) ئادەمیزادی کەلەگەت و هەلچو .

**بەلاوەچون** ــ ( مصت. لا.) ١ــ نیزیك‌بونەوە لە کەسێ یا لە شتێ :: بەلای ئاگرەکەوە نەچی دەسوتیێ. نەخەلەتابی جارێکی دێ بەلای ئەم کابرایەوە بچی دەتکوژم ها ) ٢. ــ تم : بۆچون /٢ .

**بەلاوەنان** ــ ( مصت. مت.) دورکردنەوەی کەسێ یا شتێ ، لە کارێك یا جێگەیەك :: ئەوە بۆچێ وا بەلاتەوە ناوین هەرلێمان ناپرسی؟ دەگەڵ دەستی خوت ئەم کورسییەش بەلاوە بنێ .

**بەلایەکداخستن** ــ ( مصت. مت.)، ( مک.) تم : بەبارێکاخستن .

**بەل‌بون** ــ [ بەل/٣ + بون ( فع. ) ] ، (مصت. لا.) ، ( هل.) هەلتۆقین و دەرپەڕینی شتێکی وەکو لولە ، لە دیوی دەرەوە و گوشاد و فرەوان بونەوەی لەناوەوە. :: ئەوە ئەو تفەنگە بە چی وا بەل‌بوە.

**بەل‌کردن** ــ [ بەل/٣ + کردن ]، ( مصت. مت.) ، ( هل.) ئاوسان و گەورەبونی قەوانی فیشەك لە لولەی تفەگەنکدا لەبەر فرەوانی جێگەی فیشەك و ئەوشاری گازی بارۆت .

**بەللێ** ــ [ محر. عا.] ، ( بن.) ، ( مک.) بەلێ تێب ــ ئەم ووشەیە هەر ( بەلێ )یە و لەو جێکایانەشدا دەکاردەکرێ کە پێویست بێ (بەلێ) بکوترێ ، بەلام دەکارکردنی هەم بەڕاستنەزانین و نارازێتی لەو قسەیە دەگەیێنێ کە یەکێك کردبێتی و هەم گالتەپێ‌کردنیش .
★ ( سن. ) بەلمێ .

**بەلوکە** ــ [ بەل /١ + ئوکە ] ، ( نت.) ، ( سن.) پارچە گوشتێکی بچوکە لە زارکی شەرمی ئافرەتا .
★ (مک.) بەلە . مێتکە . نێوەروکە. ( سیە . کک . ) قیتکە . ( جف.) نێوەر . ( بک.) چوچەلە .

**بەلە** ــ [ بە/١ + ٥ــ ئە/١ ] ، ( نت.) ، ( مک.) تم : بەلوکە ●

**دیلەبەلەقیت** ــ ( کن . ) ئافرەتی ڕوهەلمالراو کە بە هیچ بارێك لەبار نەکەوێ . هس : ( لو.) بەلە = چیلکە .

**بەلەبارێکە** ــ [ بە/١ + ٣ــ ئە/٢ + بارێك/١ + ٥ــ ئە/١ ] ، (نت.) ، ( کئێر. ، کعر.، جن.) ١ــ ئادەمیزادی بەژن‌درێژی ،لاواز و ڕەقەلە ٢ــ حالی مرۆڤێکی ئاوا :: پیاوێکی بەلەبارێکەی زەردەلەشی لەکن بو . تێب ــ ئەم ووشەیە ئەگەر دەگەل ناوێك لە حالەتی ( ئیزافە )دا بو ئەوا ( صفەت )ە ئەگینا ( ناو )ە .

**بەلەباقە** ــ [ ؟ ] ، ( نت.) ١ــ دەردێکە دوچاری بزن دەبێ ، لە بارەی دەخا و دەیکوژێ □ « یەك دانو دەیکوشت ، یەك بەلەباقە » ( سیف القضات ) .
٢ــ ( مج.) سوکە جنێوێکە ، لە وەختێکا منداڵێ بە قسە و هەرا خەلك وەڕەز بکا ، پێی‌دەدرێ . هەروەك بلێن : دە بێبڕەوە ، ووستبە ، دەنگت بڕێ .

**بەلەبەل** ــ [ بەل/٢ + ٣ــ ئە/٢ + بەل/٢ ] ، ( نت.) لەرەلەر ،

تەکەتەك .

**بەلەبەل کردن** ـ ( مصتـ. لا.) لەرینەوە ، لەرزانەوە .

**بەلەپا** ـ ( صتـ.) ، ( سنـ. ، هو.) تم : بەپێ .

**بەلەپێ** ـ ( صتـ.) تم : بەپێ .

**بەلەچەك** ـ [ ؟ ] ، ( نتـ.) ، ( مکـ.) ١ـ تاسـمە **کولـەکەی شـیرنە** . هاوینان لەبەر هەتـاو ئیشـکی دەکەنەوە و هەڵیدەگرن بۆ زستان . ٢ـ خواردنێکی کوردەوارییە لـە ( بەلەچەك/١ ) و نیسك و کشمیش دروستدەکرێ .

**بەلەدیە** ـ [ عا. ] ، ( نا.) تم : شارداری ، شاردوانی .

**بەلەسە** ـ [ ؟ ] ، ( صـتـ.) ، « گیانداری یاخی . » تم + خا : ب ١ ، ل ـ ١٧٤ .

**بەلەسەبـوون** ـ ( مصتـ. لا.) « یاخی‌بوون » تم ـ خا : ب ١ ، ل ـ ١٧٤ .

**بەلەشوانـە** ـ ( نـتـ.) ، تـم : بەناشوانە .

**بەلەفیڕە** ـ [ بەلە ( ؟ ) + فیـڕ ( فیڕاندن ) + ەـ ئە/١ ] ( نتـ.) ، ( کێیر. ، کعر.) نەخۆشی زگ‌چوونە تۆشی ئاژاڵ و پاتاڵ دەبێ . هس : ( جنـ. ) بەلەریقە = ئیسـحاڵی بە شیددەت ( بۆ ئینسـان ) تم : لوڕی، ل ـ ١٥ .

**١ـ بەلـەك** ـ [ ؟ ] ، ( نتـ.) ، (کعر. ، سنـ.) گیایەکی دەشتەکییە و تا میترێك بەرزدەبێتـەوە ، لـە کوردستان زۆرە ، ڕەگ و ڕیشـەی ئەم گیایە بۆ خۆش‌کردنی تـامی دەرمانان کەلکی لـێ وەردەگـیری . هەروەها لە شوێنـانی گـەرم شەریەتێکی لێدەگـرن کە تـۆزێ شیرنایی هەیـە و خواردنـەوەی دەروونی مرۆڤ فێنك‌دەکاتـەوە . ( عا.) عەرەق سوس ( عرق لوس ). ★ ( مکـ.) مێکوك .

**٢ـ بەلەك** ـ [ ؟ ] ، ( نتـ.) ، ( کعر. ، کێیر .) بەشێکە لـەلاقی ئادەمیزاد ، دەکەوێتە نێوان ئەژنۆ و قولاپەی پێ . لولاك و گۆشتێکـی بەدەورەوەیەتی بە تێکڕایی .

**بەلەك‌پێچ** ـ [ ٢ـ بەلەك + پێچ ( پێچان ) ] ، ( نتـ.) ، ( مکـ.) شتێکە وەکو کەژۆ ، پان تر و تەنکتر بـۆ گورج و گۆلی لە بەلەکی دەهاڵێنن . تێبـ ـ لە قولاپەی پێڕا دەسـت بە لێهاڵاندنی دەکەن و لای خوارەوەی هەر قەدێکی بەرە و ژوورتر تۆزێك دەکەوێتە لای سەرەوەی قـەدی بەرەژێرتر لە خـۆی ، تـا دەگاتـە نیزیکی ئەژنۆ دەبڕێتەوە لاسکێـکی درێژۆکەی پێـوە . . .یە پێی‌قـایم دەکەن لەباتی ئـەوەی بـە تایبەتی بێچنن لە تیزماڵـکە قوماشیشـی بەکاردێنن .

**بەلەم** ـ [ ؟ ] ، (نا.) ، (کعر.) ١ـ کەشتی زۆر پچکۆلە کە لـە تەختە دروستدەکرێ و بەهێـزی ( سەولە ) لەسەر چەم و ڕۆبـاری گەورە دەگەڕێ . ★ ( کێیر.) لوتکە ( ڕۆسـی ) . قایبق ، (ترکی) ٢ـ ( مجـ.) دەوری پەلی درێژۆکە کـە پلاو و قبـولی تێـدەکرێ . ★ ( کێیر.) بلوت .

**١ـ بەلاَ ـ** ( ئه. ) ، ( مك. ) تم : بـا .

**٢ـ بەلاَ ـ** [ عا. ] ، ( نا. ) ١ ـ شتێ یا بەسەرهـات و ڕوداوێـکی خراپ کە توشی کەسێك دێت و بە زەحمەت چارەی بۆ دەکـرێ . □ « هـەر دەلەی بـەلای خوایە » ، « بەلایەك لە ئاسمان بێتـە خـوار خەتای . . . ی تێدایە » ، «بەلایەکە بۆ خۆی » .

**بەلاَی‌لابـەلا ـ** ( نتـ. ) بـەلاَ و نارەحەتێکی پیاو چاوەڕوانی نەبێ و لەلاوە توشی بێت :: ئەم کابرایانـە وەك بەلای لابەلا وان پیـاو دەبـێ خۆیان لێ‌لادا .

**بەلاَی‌ناگەهان ـ** ( نتـ. ) بەلایـەکی کتوپڕ و لە نەکاو ( = ناگەهان ) بدا بەسەر کەسێـکدا :: فڕۆکـە وەك بەلای ناگەهان گەیشتە سەرمان . ٢ـ ( مجـ. ) ، ( صتـ. ) زۆر زرینگ و زیت ، فێڵباز ، کارلەدەس‌هاتو :: بەلایەکە بۆ خۆی ● **بێ‌بەلابی ـ** ١ ـ بۆ دەربڕینی نارەزایی و تورەیی لـە قسـه و کـردەوەی کەسێـك بەکاردێت . تێب ـ بە پێـی ڕادەی ( تورەیی ) ووشـەی ( بـەلاَ ) درێژدەکرێتـەوە :: بێ‌بەلابـی واز بێنە. ٢ـ بۆ دەربڕینی نارەزایی ڕوت بەبێ تورەیی . تێب ـ لەم حالەتەدا ڕستەکە بێ‌درێژکردنـەوەی هیـچ ووشەیەك و بێ ئەوەی قورسایـی بخرێتە سەر هیچ پیتێـك لـەدەم دەردەچێ □ « وورچە قولە بـێ بەلابێ ، لەبن داری بێ‌گەلابێ » .

**بەلاَگەردان ـ** [ ٢ ـ بەلاَ/١ + گەردان ] ، [ عا. کـو. ] ، ( نفـا. ) کەسێك یا شتێك یا ڕوداوێك کـە ئەوەی لێ‌ڕەچاو بکرێ پێشی بـەلاَ بگرێ ( وەکو : صەدەقە ، نەدر ، خێروخێرات ) و لە مـرۆڤ دوری خاتەوە . ★ بەلاگێڕ ، بەلاگێڕەوە .

**بەلاَگێڕ ـ** [ ٢ـ بەلاَ/١ + گێـڕ ( گێڕان ) ] ، [عا. کو.] ، ( نفا. ) تم : بەلاگەردان . تێب ـ بـەلای منەوە ئەسلی ئەم ووشەیە دەبـێ ( بەلاوەگێڕ ) بوبێ و کەرتی ( وە )ی لێکەوتوە . ●« **صەدەقە و بـەلاَ گێڕبێ** » کاتێ کەسێـك زەرەر و زیانێکی ( ماددیێ ) لێدەکەوێ ئـەم ڕستـەیەی بـۆ دلخۆشی‌دانەوە پێ‌دەگوترێ .

**بەلاَگێڕەوە ـ** [ ٢ـ بـەلاَ/١ + گێڕەوە ( گێڕانەوە ) ] ، [ عا. کو. ] ، ( نفا. ) تم : بەلاگەردان .

**بەلاَلێدان ـ** [ عا. کو. ] ، ( مصتـ. لا. ) ١ـ گرفتاربـون . توشـی نارەحەتی‌هاتن . ٢ـ ( مجـ. ) نەمان، فەوتان : لەناوچون :: دەك بەلاَ لەم حالەدا . بەلای لێدا ژیانی قـون دەرکان .

**بەلاَلوَك ـ** [ بەل ( بوَل ) + ١ ـ ئالو ( تێب ـ ) + ئوك ] ، ( نتـ. ) ، ١ـ ( سیم. مك. ) أ ) دەرەختێکـی کێوییە لە جسنی داری ئالوبالو ، بەرەکەشی هەر ئالوبالوە بەلاَم دەنکی وو‌ردترە و گوشتیشی کەمترە . ب ) بەری ئەم دارە تێب ـ أ ) بەلای منەوە ئەسلی درەختی ئالوبـالو هـەر ئەمەیـە و کەوی‌کراوە و بوتـە دەسچێن . ب ) لە کوردستان ئـەم

داره زۆره ، بـەرەکەی دەخورێ و ناوکەکەی دەکوتن لە باتێ دەرمانـی ڕەوانێ ( مسهل ) بەکاریدێنن . ★ ( سنـ.) بەلاّلوکە کێفیلە . ٢ـ (سنـ.) تم : ئالوبالو .

**بەلاّم** ـ [ ؟ ] ، (بنـ. ، بد.) ، (کعر. ، سنـ.) بۆ ئەم مەبەستانـە بەکاردێت . ١ـ بۆ تێك‌بەستنی دوو مەبەستی لێك‌جیاواز . :: بچـن بەلاّم زۆر دامەنیشن . ٢ـ بۆ ددان بەمەبەستێکدا هێنان،تەصدیق‌کردنی کارێك :: ئەوە ئێشە کەوایە بـەلاّم تۆش حەقتە . ٣ـ بـۆ سـەرنج ڕاکێشان یا ووریاکردنەوەی کەسێك کە کارێك نەکا :: بەلاّم نەچی بـۆی بگێڕێتەوە . بەلاّم نـەچی لـەوێ دای‌کوتی ، منداڵینە بچن بۆ خۆتان یاری بکەن بـەلاّم جلکەکانتـان پیس‌نەکەن . ٤ـ بۆ ترسـاندن و هەڕەشەلێکردن :: چی‌دەکەی بیـکە بەلاّم لە بیرت نەچێ . جارێ دەنگ ناکەم بەلاّم هەروای ناخوا . ٥ـ بۆ دیاری‌کردنی زۆر و زەبەندێ شتێ . :: جوان بەلاّم جوان . ئازا بەلاّم چ ئازایەك . ٦ـ بـۆ دیارخسـتنی سەرنەکەوتن لـە کارێـکا . زۆرم هـەوڵدا بـەلاّم دەرگاکـەم هەربۆنەکرایـەوە . زۆری دەگـەڵ خەریك بوم بەلاّم دەگەڵم نەهـات . زۆر دەخوێنێتەوە بەلاّم هیچ حاڵێ نابێ . ★ ئەمما . وەلێ . ( مکـ.) بەلاّن . ( بکـ. ) لێ .

**بەلاّن** ـ [ ؟ ] ، ( بنـ. ، تبـ. ) تم : بەلاّم .

**بەلخە** ـ ( نا. ) ، ( سنـ.) تم : بڕەك . تێبـ ـ تەنیا ( مردۆخ ) ئەم ووشەیەی نوسیوە ( تم . مردۆخ ، ج ١ ، ل ـ ١٨٣ ) هس : آپەلخ و پالاّغ ) بەچکەی گامێش و ( بەرخ ) بەچکەی مەڕ .

**بەلغ** ـ ( نا.) ١ـ ( کئێـر. ) توێژێکی سپی‌یە بەرەبەرە لـە نـاو کەتـرێ و کوپـی سەمـاوەردا کۆدەبێتەوە تا دێ ئەستورتر دەبێ. تێبـ ـ ئەمە لەو ماددانە پەیدا دەبێ کە لە ناو ئاودا تواونەوە و بەکوڵاندن هێندێـکی لێ‌جیادەبێتـەوە و دەنیشێ . ٢ـ ( کعر.) ئەو توێژەیە کە لە ئەنجامی جگەرەکێشـان و چاخواردنەوە دەنیشێتە سەر ددان و ڕەنگی دەگۆڕێ . ٣ـ ( کعر.) تم : ٣ـ بار .

**بەلغەم** ـ ( نا.) ماددەیێکی لێچقی سپی شێن‌باوە بەیانیـان لە گەرۆی پیاوی ڕۆژووەوان و ئارەق‌خۆر و ئەو کەسانەی بە هـۆی ( سەرمـا )وە توشی کۆخە و هەلاّمەت دەبـن ، دەردەکەوێ . چڵمێکە کە بەڕێگای قوڕگدا دێتەدەر . هس ، فلێـگم ( ئینگلیزێ ) و فلێگمۆن ( فڕەنسێ ) هەر بەم مانایە . **بەلغەم‌پێدانەدان** ـ ( کنـ.) بۆ بە پیاونەزانێن و بە هیچ و پوچ‌زانینی کەسێك . :: یەکێکی وایە بێ‌بێتنی بەلغەمی پێدانادەی .

**بەلك** ـ ( بنـ.) ، ( سنـ.) تـم : بەلکو .

**بەلکم** ـ ( بنتـ.) تم : بەلکو .

**بەلکو** ـ [ بەلك + ١ـ ئـو ] ، ( بنتـ.) ڕەنگە ، لەوانـەیە ، ڕێـی تێدەچێ ، تەقا بەشکو :: تۆ ئێستا

بچۆ بەلکو لەوێ بێ . بەلکو ئەم کابرایە نەیەوێ من ببێنێ . « بەلکو مریشکەکان هێلکەیان نەکرد » تێبـ ــ أ) ئەم ووشەیە هاوتای زۆرە: بەلك، بەلکم ، بەلکە ، بەلکەت ، بەلکەم، بەلکەن ، بەلکی ، بەلکین ، بەلکینا ، بەلکینێ . جا بەلای منەوە هەمو ئەوانە ووشەی ( بەلك )ن و سەرف‌کراون و زەمیرێکی شەخسییان پێوە لکاوە . دلنیام کە هەر یەکێ لەوانە لە وەختێکی رابردوودا مانای خۆی هەبوە و لە شوێنی تایبەتی خۆیدا بەکارهێنراوە ، بەلام بەرەبەرە ئەو تایبەتەی خۆیان لەدەستداوە و بونە ووشەیەك کە مانایەك و چەند شکلی هەیە . ب ) لەبەر ئەوەی کەرتی یەکەمی ئەم ووشەیە و هەمو هاوتاکانی ( بەل )ە و دەگەل (بەل)ی عەرەبی بە مانای (بەلام)ی کوردی وێك‌دەچن ، زۆرکەس یەکەندەردو وا دەزانێ کە ئەسلی ئەم ووشەیە عەرەبی بێ. ( تم : معین، فەرهەنگ، ج ۱ ، ل ــ ۵۷۱ ) بەلام مامۆستا تۆفیق وەهبی وەك ووشەیەکی کوردیەتی نوسیویانە . ★ (بک.) بەلکو ، بەلکێ .

**بەلکە ــ** ( بن.) تم : بەلکو .

**بەلکەت ــ** ( بنت.) تم : بەلکو .

**بەلکەم ــ** ( بنت.) تم : بەلکو .

**بەلکەن ــ** ( بنت.) تم : بەلکو .

**بەلکی ــ** ( بنت.) تم : بەلکو .

**بەلکین ــ** ( بنت.) تم : بەلکو .

**بەلکینا ــ** ( بنت.) تم : بەلکو .

**بەلکینێ ــ** ( بنت.) تم : بەلکو .

**بەلگ ــ** ( نا.) تم : بەرگ .

**بەلگ‌وبن‌کردن ــ** [ بەلگ + و + بن/۷ + کردن ( فع.) ] ، (مصت. مت.) ۱ــ لەناوبردن . فەوتاندن . خراکردن . ڕیشەدەرهێنان سەرەوژێرکردن . ۲ ــ ئەودیوەودیوکردن ، پشکنین . زۆرگەڕان بە دوی شتێکا . تێبـ ــ ( بەلگ‌وبن ) لەم مەصدەرەدا وەك ووشەیەکی تێکەل (مرکب) کەلکی لێ‌وەرگیراوە و بۆ هەریەك لە ماناکانی مەصدەرەکە مانایەکی بۆ ڕەچاودەکرێ . بۆ مانای یەکەم : ( بەلگ‌کردن بەڕیشەی دار و ڕیشەکردن بە گەلا ) و بۆ مانای دوەم : ( سەرتاپاخوار ، هەمو لایەك ، هەر لە گەلای دارڕا تا دەگاتە ڕەگ و ریشەی ) . ب) نەم‌بیستوە و نەم‌دیوە ئەم ووشە تێکەلە بە تەنیایی دەکارکرابێ .

**بەلگە ــ** [ بەلگ + ە ــ ئە/۱ ] ، ( نت.) ۱ــ نیشانەی مالی دزراو کە بە دەست کەسێکەوە بگیرێ . ★ ( جن.) بەلکە . ۲ــ ( تت.) دەلیل . بورهان . سەنەد . موستەمسەك .

**بەلم ــ** ( نا.) ، ( کئێر. ، کمر. ، سن. ) ، لاسك و ساقەتی گیای برنج ، پاش ئەوەی چەلتوکەکەی لێ‌جیادەکرێتەوە . ئەو بەشەی گیایەکەیە کە لە گەنم و جودا دەیکوتن و دەبێتە ( کا ) .

**بەلمەڕیش ــ** ( صت. ) حالی کەسێکی ڕدێنێکی چڕوپڕ و فشی هەبێ . □ « ڕیشی دەلێی باقە بەلمە » .

**بـــەلمێ ــ** ( بنـ.) ، ( سنـ.) تمـ : بەللێ .

**بەلەد ــ** [ = عا : بەلەد = شار ، وولات ] ، ( صـ.) حالی کەسێکی لـــە ڕێگا و بان و ناوشار یا لە ئیشێك چاك بزانێ . :: بەلەدێکمان دەگەڵ بنێرن تا ئەو دێیەمـــان بـبـا . مـــن بەلەدی ئەم ڕێگایە نەبوم .

**بەلەدبون ــ** [ عا. کو.] ، ( مصتـ. لا. ) ١ــ شارەزابونی کەسێ لـــــە ڕێگاوبـــان و ... ٢ــ فێربـــون و شارەزابون لە ڕێگاوبان و ... تێبـ ــ لەم دو مانایانە یەکەمیـــان بو ئـــەو کەســـــانەیە کـــە لـــــە وەختـــی قسەکردنا شارەزابێ و بە ڕێگاوبان بزانێ ، دوهەمیشیان بو ئەوانە کە لە کاتی باسکردنا شارەزانین . :: دو سێ جار هاتوچو بکەی بەلـــەد دەبی .

**بەلەدێ ــ** [عا. کو.] ، (حمصـ.) زانینی ڕێگاوبان، شارەزایی :: باشە بو بەلەدێ دەگەڵتان دێم . ببورن بو بەلەدێ پێشتان دەکەووم .

**بەلەك ــ** [ ؟ ] ، ( صـ.) ، (کئێر. ، کعر.) ١ــ حالی گایـــەکی ڕەنـــگی ڕەش و سپی یان سپی و سور بێ . ٢ــ هەر شتێکی دو ڕەنگی ڕەش و سپی :: بورجی بەلەکی مەم و زینان لە جزیرێیە . ٣ــ حالی کەسێـــك نەخوشی بەلەکی گرتبێ .

**بەلەکبون ــ** ( مصتـ. لا.) توشی نەخوشی بەلەکی هاتن .

**بەلەکی ــ** ( نتـ.) نەخوشییەکە ، پێستی مروڤ دەیگرێ و هێندێـــك شوێنی پەلەپەلە دەبـــێ و ڕەنـــگی دەگوڕێ ( لەچاوشوێنـــەکانی تـــری لەش سپی دەبـــێ ) . تێـــبـ ــ ئـــەم نەخوشینە ئەنجامی پشێوێ یەکە ، کە لە ئیشوکاری لوەکانی ( غـــدە ) لەشی ئادەمیزادا بەدیدێت و کاری خویـــان ( دەردانی هورمـــون ) بـــە ڕێكوپێـــکی پێ جێبەجێنـــاکرێ . لەوانەشە هێندێك ( طفیلی ) کە بە چاو نابیندرێن و لەسەر پێســـتی ئینسان دەژین ببنە هـــوی ئـــەم نەخوشییە و لە کاتێـــکی ئـــاوادا چارەکردنی هاسانترە .

**بەلێ ــ** [ محر . عا. بلی]، ( بنـ.) ١ــ بە نیشانەی ، بەڕاستزانین ،و تەئکید لەســـەر قسەیـــەك کە بـــە شـــێوەی پرســـیار یا خەبـــەردان دەگوترێ. :: ئاگات لێیە ئەم برادەرە چی پێکردم ؟ بەلێ . هـــەمو ڕوژێ بەیانی دەست و چاوتان بە صابون بشون . بەلێ . هوشەنگ چو بو مەکتەب ؟ بـــەلێ . جلکەکانت بـــو هێنایـــەوە ؟ بـــەلێ . ٢ــ وەڵامی بانگرکردنە:: پیروت! بەلێ ماموستا. ٣ــ ئەگەر بـــە شێوەی پرســـیار یا ســـــەیرپێهاتن لـــەدەم دەربچێ ، نیشـــــانەی بەڕاســـــتنەزانین و دڕدونگی‌یە لە قســـەیەکی کرابێ یا توڕەیی لەو قسەیە دەگەیێنێ . :: دەمەویست زوتر بێم بـــەڵام میوانم هات . بەلێ ! لەبیرمچو کتێبەکەت بو بێنمەوە . بەلێ ؟ **بەلێ بەلێ ــ** (بنتـ.) تەئکیدێکی زیاتر لە (بەلێ/١ و ٢ ) دەگەیێنێ .

**بەلێن ــ** [ بەلێ + ئێن ] ، (نتـ.) گفت و پـــەیمان و دەســـتەبەرێ بو

جێبەجێ کردنی فرمانێك :: بەڵێن بێ تا هەم نای دوێنم ★ بەڵێنی .

**بەڵێن دان ــ** (مصت. لا.) ڕازی بوون، وەعدەدان :: بەڵێنتان دەدەمێ تا مردن دەگەڵتان بم . بەڵێنی داوە ئیتر دەم لە جگەرە نەدا . بەڵێنمان بدەیە ئیتر قومار نەکەی .

**بەڵێنی ــ** [ بەڵێ + ئێنی ]، (نت.) تم : بەڵێن .

**بەم ــ** [ ند. ] ، (نا.) دەنگی گڕ و گەورەی ئادەمیزاد یا ئامرازەکانی مۆسیقایە لەرینەوەی لە دەنگی زیل کەمترە . هس : زێل و بەم .

**بەمبرد ــ** (صت .) ، (مک.) تم : بەشێ .

**بەمبرد دان ــ** ( مصت . مت .) ، (مک .) تم : بەشوودان/١ .

**١ــ بەن ــ** (نا.) قەزوان . تێب ــ ئەم وشەیە بە تەنیایی لەبیرچۆتەوە، بەڵام لە وشەی (بنێشت و دارەبەن)دا ماوە . هس : [پە : ڤەن. ست : ڤەن] بە مانای دار . درەخت.

**٢ــ بەن ــ** (نا.) خوری ، مەرەز و مو کە پاش بەشانەکردن ، بە تەشی ڕێسرابێ و بادرابێ، بۆ ئەوەی بیکەن بە گۆرەوێ و ئەو جۆرە شتانە . :: ئەم بەنە زۆر خاوە . ئەو ماشەرە بەنانە بەرە بۆ خمخانە . ئەم بەنە پسۆك پسۆکە چیە هێناوتە . ●

**بەنی تۆ بە من با نادرێ ــ** (کن.) لە فڕوفێڵ و کاروباری تۆ ناگەم . دەرەقەتت نایەم. تێب ــ لە قسەکردنا زەمیری ( تۆ ) و ( من ) دەگۆڕدرێن بە ناو یا زەمیرێکی تر . :: بەنی خوسرەو بە تۆ با نادرێ . خوسرەو بەنی کاوسی پێ با نادرێ . ★ ٥ــ بەند .

**١ــ بەنا ــ** (نا.) ، (کعر. ، سن.)، « گیایەکی کوێستانییە ، لاسکی وەك کەنگر و گەڵای وەك کەرەوز وایە » ( تم ، خا ، ب١ ، ل ــ ١٧٥). « گیایەکە دەخورێ وەکو کەما وایە دەیبرژێنن و دەیخۆن» (تم : مردۆخ، ب١ ، ل ــ ١٨٩ ) . « گیایەکی کوێستانیە ئەکرێت بە گزرە بۆ زستانی ئاژاڵ .» (تم : معر ، کشت، ب ١ ، ل ــ ٥١ ) . «ناوی گیایەکە» (تم : هبێد : ل ــ ١٠) . تێب ــ من خۆم ئەم ووشەیەم نەدەزانی و نەشم بیستبو بۆیە هەرچی لە قامۆسەکاندا لە سەری نوسرابێ وەکوم خۆی هێناومەتە ئێرە ، بەڵام بەلای منەوە ئەوەی تۆزێ زیاد لەسەر ئەم گیایەیان نوسیوە ، ئەوەیان نوسیوە کە لە خەڵکیان بیستوە .

**٢ــ بەنا ــ** [محر، عا : بناء] ، (نا.) ، (سیم . ، سن .) ئەوکەسەی پیشەی خانودروستکردنە . ★ ( مک . ، بک . ) بەننا .

**بەناشوانە ــ** [ ١ــ بەنا + شوان + ٥ــ ئە/١ ] ، (نت .) ، (سیم .) « گیایەکی بۆنخۆشە بۆ تام و بۆندارکردنی ماست بەکاردێت » هبێد ، ل ــ ١٠ ) . تێب ــ مردۆخ ووشەی ( مەنێ )ی وەکو هاوتای (١ــ بەنا) نوسیوە کەوا وێدەچێ (مەندێ)ی موکریانی بێ و بە پێی ئەو تاریفەش کە مامۆستا وەهبی بۆ (بەناشوانە)یان نوسیوە دەبێ ئەمەیان

مەندێ بێ نەك ( ١ـ بەنا ) کە مردۆخ نوسیویە .

**بەنایی ـ** [ عا. کو. ] ، (حمصـ.)، ( سیم . ، سنـ .) کاروپیشـەی کەسـێکی خانـو ، دیـوار و ... دروستدەکات .

**بەنبڕ ـ** [ ٢ـ بەن + بڕ ـ(بڕین) ]، (نت .) ، (کن .) چەقۆ ، تیخ و ...

●**بەنبڕم ددانە ـ** ( کن . ) بێچەك و سیلاحم ، هیچم پێناکرێ .

**١ـ بەند ـ** [ ست : ، پە : بەند ] ، ( نـا . ) ، ( مک . ، سیم . ) ١ـ دیوارۆکەیەکە بە تەیمان و چیم یا هەر کەرەستەیێکی تر لە پێش چەم و ڕۆباران دروست دەکرێ ، بۆ ئەوەی ئاوەکەی پۆنگ بخواتەوە و حەوالەی بەرزبێتـەوە تا ئەوەندەی پێویستە بەلایەکی ترا لابدرێ و بکرێتە سەر جۆگەیێکی دیـکە و بـۆ داشـتنی کشتوکاڵ کەلکی لێ وەربگیرێ . ★ ( سنـ. ) بەنگە . ٢ـ ئەو جۆگە زلە ( شەقەجۆ )یەیە کە بـەو جۆرەی سەرەوە لـە لایەکی دیـکەڕا ئاوی دەکرێتە سـەر و پێیدا دەڕوا بـۆ شـوێنی مەبەسـت. تێبـ ـ أ) ئەگەرچی ووشەی ( بەند ) لـەم قامۆسەدا وەکو چەنـد واحیدێکی جیاجیا نوسراوە ، بەڵام لەڕا ستیدا هەمۆیان هەریەکن و لە ئەسـڵێك وەرگیراون ، ئەوەی وای لە من کرد لێکیـان هەڵاوێرم ئـەو مانـا جۆربەجۆرانـە یـا ووشـەکانن کـە بـە مانـای لێـك دوور لەم ووشەیە کەوتونەتـەوە . ب ) ووشەی ( بەند )و ( ٢ـ بەن) بە ڕای من هەریەکن ، یەکەمیان بە شێوەی ئاوێستایی خۆی ماوەتەوە و مانای زۆری بۆ پەیدابوە ، دوەمیان تۆزێك گۆڕانی بەسەردا هاتوە وڕبۆتە نـاو بۆ شتێکی تایبەتی و زەووزۆشی لـە ( بەند ) کەمترە . ج) هەر ئێستا لە بنلەهجەی سنـە و سلەیمانـیدا ووشەی ( بەند ) جۆرێ لـەدەم دێتـەدەر کە بـە عاستەم و دۆبـەڵا دەنگی ( د )ەکەی دەبیسـترێ کـە شێوەیـەکی دەنـگی ( گ )ی وەرگرتوە و لە هێندێك وەچی ئـەم ووشـەیەدا بە تەواوی بۆتە (گ) :: بنەبەنگە ( بنەبەندگە ) .

**٢ـ بەنـد ـ** ( نمصـ.) ١ ـ گیرۆبۆن و وێستان لە شوێنێك . ( عا.) تەئخیربـۆن ٢ـ ( مـج. ) گیرۆدەیی و گرفتاری ، حەپس . ٣ـ ( مج.) تم : بەندیخانە .

**٣ـ بەند ـ** ( نا.) ، ( مـک. ) ١ـ پارچەیەك لە گۆرانی و بەستە و مەقام تا ئەو جێگایەی لە دوای هەمو پارچـەکانا دۆپاتەدەکرێتـەوە . :: بەندێك بارانەمـان بـۆ بڵێ . بەندێکیش بەسەر زاوایدا هەڵدە . ٢ـ گفتوگۆی نێوان ئەوینداران ، کە لە فۆلکلۆری کوردیـدا وەکـو ( بەیت )ەکانی کوردی بەناوبانگن :: بەندی ئازیزە ، بەندی گوڵێگوڵێ . ٤ـ ( سنـ.) هەریەك لەو پارچـە ئێسقانە پچوکانەی کە لە پەنجـەی دەست و قاچی ئادەمیزادا هەن . ★ ( سنـ.) بەنگە . ٤ـ ( سنـ.) قەفی قامیش، حەیزەران و قوڕغو. تێبـ ـ هەروەکو لە بنلەهجـەی سنەیـیدا

باوە ، دەنگی ( د ) لەم ووشەیەدا دەکرێ بە ژێر لێوەوە و دەنگی ( ن )یش تۆزێ دەگیرێ . ٥ـ (تد.) پارچەیەکی دیار و سەربەخۆی : قانۆن ، بەیماننامە ، قۆنتراتنامە ، پێڕەو و پڕۆگرامی پارتی سیاسێ و کۆمەڵەی جۆربەجۆر . ★ مادده .

٤ـ **بەند** ـ ( نا.) ، (کێر. ، کمر.) کۆمەڵی کاغەزی سپێ بۆ نوسێن ، ڕۆژنامە و کتێب و . . . و . . . کە بە جیا دە بەرگێکی کاغەزێ ئەستورەوە دەپێچرێ و برێتیە لە ٥٠٠ تەبەق . :: ڕۆژنامەی ( نور ) ڕۆژانە ٥٠/٦٠ بەند کاغەزی پێدەویست .

٥ـ **بەند** ـ ( نا.) هەرشتێکی وەکو هەودایەك وابێ و دۆ شتان پێکەوە ببەستێتەوە ، یا یەکێکیان بەوی دیکەوە هەڵاوەسێ :: بەندە سەعات . بەندی کەوش . بەندەخوێن . **بەندی جگەر** ـ ( تد.) تم : بەندی جەرگ و دڵ . **بەندیجەرگ‌ودڵ** ـ [ ٥ـ بەند + ١ـ ئی/١ + جەرگ + و + دڵ ] ، ( تد.) ١ـ هەر شتێکی ماددێ کە جەرگ و دڵی مرۆڤ دەگەڵ لەشی پێکەوە دەبەستێتەوە . ٢ـ ( کن.) خۆشەویستێ زۆر . تێبـ . أ ) مەبەست لە مانای یەکەم ئەوەیە ژیانی مرۆڤ بەندە بەو دۆ ئەندامە ، واش زانراوە کە ئەوانە بە هۆی هەودایەکەوە بە لەشەوە بەندکراون . ب) ئاشکرایە ژیان خۆشەویستە و هەر شتێکیش مایەی ژیان بێ خۆشەویست دەبێ ، جا بەندی جەرگ و دڵ کە بە مایەی ژیان ناسراوە مانای دوەمی بە کینایەی خۆشەویستێ زۆر و خۆشەویست لێ کەوتۆتەوە و زیاتر دایکان بە منداڵی خۆیانی دەڵێن . **بەندی دڵ** ـ ( تد.) تم : بەندی جەرگ و دڵ .

٦ـ **( ـ بەند )** ـ ( پب.) ١ـ بە دوای ناوێکەوە دەلکێ و مانای بەرهەڵستێ ( کارکردن ) یا ( کارتێکردن )ی ئەو شتە دەدات کە ( ناو )ەکە دەینوێنێ . :: تێغبەند . گوللەبەند ، دێوبەند . ٢ـ بەدوای ناوێکەوە دەنوسێ و مانای بەستنەوەی لێ‌زیاددەکا . □ «کەری شین ، کەربەندی شین ، دەیبەستیەوە ، بە گوریسی شێن»، ( کن.) شوتێ . ★ وەند . ( سن.) وەنگ‌بێن .

**( ـ بەندان ـ )** ـ [ ٦ـ (ـ بەند ) + ٢ـ ئان/٦ ] ، ( پبد.) پاشبەندێکە بە دوای هەر ناوێکەوە بلکێ ، پێشاندەدا کە مەدلولی ئەو ناوە بە کۆمەڵ پێکدێت یا بە کۆمەڵ دەگیرێ و دەگەڕێ . :: ڕێبەندان. سەهۆڵبەندان . خەنەبەندان .

**بەنداو** ـ [ ١ـ بەند/٢ + ١ ـ ئاو/١.] ، ( تد.) ئەو ئاوەیە کە بە هۆی هەڵبەستنی ( ١ـ بەند/١ )ەوە بە جۆگەی تایبەتێ ( ١ـ بەند/٢ )دا دەڕوا . هس : کانیاو ( کانێ ئاو = ئاوی کانێ ) . چەماو ( ئاویچەم ) .

**بەندبۆن** ـ [ ٢ـ بەند/١ + بۆن]، ( مصد. لا.) ( مک.) مانەوە لە

شوێنێك . گیرۆبوون . وێستان :: سەعاتێکم لەسەر بەندبن با لەسەر شێرکۆ بەند نەبین . هەرچی دەکەین خوێنی بەندنابێ .
**لێ‌بەندبوون** ــ [ لێ ( لە + ی ) + بەندبوون ] ، ( مصد. مت.) نیوە زۆر و نیوە خواهیشت ، شتێ لە کەسێ سەندن . :: ئەو قەڵەمە لە خوسرەو بەندبوم . وازی نەهێنا تا پێنج دیناری لێ‌بەندبوو . خۆت ماندوو مەکە شێرکۆ لەوانە نیە بتوانین هیچی لێ بەندبین . **پێوەبەندنەبوون** ــ ( مصد. لا.) ١ــ گیرنەبوون و ڕانەوەستانی شتێ بە شتێکی دیکەوە :: هەرچی دەکا شەدەکەی بەسەرەوە بەندنابێ . ٢ ــ ( کن.) بێ‌ئیختیار تڕ لێ‌بەربوون .
**بەندرۆ** ــ [ ٢ــ بەن + درۆ ( دروون ) ] ، ( نت.) ، ( مک.) هەودا بەنی تایبەتییە ، سازدەکرێ و دادەندرێ بۆ دروونی زارکی تێر و جەواڵ و ... تێب ــ لە لادێی کوردستان ، ئەو هەودا بەنانە وەکو کەلوپەلی ناوماڵ تەماشادەکەن ، دەخوازرێتەوە یا بە قەرز وەردەگیرێ و پاشان دەدرێتەوە بە خاوەنی .
**بەندکردن** ــ [ ٢ــ بەند/١ + کردن]، ( مصد. مت.) ١ــ قایم کردنی شتێك بە شتێکەوە. ٢ــ گیرۆکردن و پەل‌خستنی کەسێ لە شوێنێ . ٣ــ حەپس‌کردن ، خستنەزیندان .
**بەندوباو** ــ [ ٣ــ بەند/١ + و + ٢ــ باو ] ، ( نت.) قسەی هەڵبەستراو ، پڕوپاگەندەی ناڕاست و ناشیرن دەربارەی کەسێ.
**بەندوباوهەڵبەستن** ــ (مصد. لا.) سازکردن و بڵاوکردنەوەی قسە و قسەڵۆك دەربارەی کەسێ بۆ بەدناوکردنی .
**بەندوبەست** ــ ( نت.) ، (کئێر.) تەگبیرکردن و ڕێك‌کەوتنی دوو یا چەندکەس ، بۆ کردنی کارێ دژی کەسێ یا کۆمەڵێ . پیلان ، (عا.) مؤامرة . تێب ــ هەرچەندە کەرتەکانی ئەم ووشەیە کوردین ، بەڵام بەلای منەوە وەکو ( زاراوە ) لە فارسی‌ڕا هاتۆتە ناو زمانی کوردی ، ئەگەرچی زمانی فارسی ووشەکانی وەك صەتان و هەزاران ووشەی تر لە پەهلەوی ( کوردی ) خواستۆتەوە .
**١ــ بەندۆکە** ــ [ ؟ ] ، ( نت. ) گیایەکە بەهاران لە دەم جۆگا و چەمان شین دەبێ . بۆ خواردن دەس‌دەدا . :: کوزەڵە و بەندۆکە ★ بەنۆڵە .
**٢ــ بەندۆکە** ــ [ ٥ــ بەند + ئۆکە ] ، ( نت.) قەیتان یا پارچە قوماش یا هەر شتێکی لەم بابەتانەیە، تیلماسکێکی باریکی لەولاولای تاس‌کڵاوی ژنان یا کڵاوی لبادی دروێنەوانان قایم دەکرێ و دەخرێتە ژێر چەنەوە بۆ ئەوەی کڵاوەکە بەسەریانەوە ڕابوەستێ .
**بەندە** ــ [ ٢ــ بەند/٢ + ٥ــ ئە /١ ] ، [ پە : بەنداك ] ، ( نت.) ، ( کئێر. ، بک. ، سیم . ) ١ــ عەبد. خولام. نۆکەر. ٢ــ ( کئێر.) نووسەر یا قسەکەر ، لە نووسین و قسەکردنا

بۆ نیشاندانی ئەدەب و تواضع و دەربڕینی ڕێز و حورمەتی خۆی بەرامبەر ئەو کەسەی قسەی دەگەڵ دەکا ، لەباتی زەمیری ( من ) ئەم ووشەیە بەکاردێنێ :: بەندە زۆر زۆ عەرزم کردی ★ ( سنە. ، جنە.) بەننە . ● **بەندەناس هەر خودایە** ــ ( کنە.) ١ــ هیچ کەس بەو جۆرەی پێویستە هەمو شتێکی کەسێکی تر نازانێ . ٢ــ هەر خوا خەڵک دەناسێ و لە ڕۆی کردەوەی خۆیان ــ کە خەڵکی تر نایزانن ــ ڕەفتاریان دەگەڵ دەکا . **بەندەی بێ عەیب نابێ** ــ ( کنە.) ئینسانی کامڵ دەستناکەوێ و هەر کەسێ هەرچەندەی بێ عەیب بێتە بەرچاوان هێشتا عەیبی وای هەیە و لە وەختێکا لێیدەربکەوێ .

**بەندەخوێن** ــ [ ٥ ــ بەند + دەخوێن ] ، ( نتـ.) ، ( سیـم.) هەرهەودا و بەنێکی دە پزۆی دەرپێ، پانتۆڵ ، ڕانك و پێجامە هەڵبکێشرێ بۆ ئەوەی لە ناوقەدی ئینسان توندیکا . ★ ( مک. ، بک. ، زا . ) دۆخین ( مەنگوڕایەتی ) دیخۆن .

**بەندەر** ــ [؟] ، (نا.) ، (کێیر.) شوێنێکە لە قەراخ دەریا ،یان چەمی گەورە خۆش دەکرێ ، کەشتی لەنگەری لێدەخەن ، بار دادەگرن یا بار هەڵدەگرن . ★ (کمر.) مینا (عا.) . ٢ــ شار و ئاوەدانێکی لە نیزیك شوێنێکی وا دروستکرابێ. شاری کەنار دەریا .

**بەن دەمبێن** ــ [ ٢ــ بەن + دەم + ٢ــ بێن ] ، (نتـ.) ، (مک .) بەنێکە (دەمبێن)ی زاری گاگێرەی پێ دە شاخی دەبەستن .

**١ــ بەندەن** ــ [ ؟ ] ، (نتـ .) ١ــ دامێن و لای خوارۆی شاخ و چیا . ٢ــ کێوێ کە زۆر بڵیند نەبێ زنجیرەیەك لەم جۆرە کێوە.

**٢ــ بەندەن** ــ [محر. عا : بدن] ، (نا.) لەشی ئادەمیزاد .

**بەندەیەتی** ــ [بەندە/١ + ئەتی] ، (حمصـ.) تم : بەندەیی .

**بەندەیێتی** ــ [بەندە/١ + ئێتی]، (حمصـ .) تم : بەندەیی .

**بەندەیی** ــ [بەندە/١ + ٢ــ ئی]، (حمصـ.) عەبدایەتی . خولامەتی . نۆکەری . ★ بەندەیەتی . بەندەیێتی .

**بەندی** ــ [٢ــ بەند/٢ + ٢ــ ئی]، (صتـ .) ١ــ حاڵی ئەو کەسەی خرابێتە زیندانەوە . ئەوەی لە ئازادی بێبەشکرابێ . ٢ــ (مجـ.) تم : بەندە/١ تێب ــ لە لەهجەی باکوری زمانی کوردیدا دەنگی (د) لەم ووشەیە فرێ دراوە یا خۆی سواوە و (بەنی) ماوەتەوە کە لە ووشەی (ئەزبەنی)دا دەیبیسین .

**بەندیخانە** ــ [بەندی/١ + خانە] ، (نتـ .) ١ــ جێگایەکە ئەو کەسانەی تێدازادەگرن کە لەسەر تاوانێك حوکمدەدرێن و بۆ ماوەیەك ئازادیان لێزەوتدەکرێ ، یا ئەو کەسانەی پێویست دەکا تا ڕۆژی موحاکەمە لە دەرەوە نەبن :: بەندیخانەی نوگرەسەلمان لە عێراق . بەندیخانەی قەسری قەجەر لە تاران. ٢ــ (مجـ.) هەر شوێنێکی ناخۆش و تاریك و

تنۆك .

**بەن‌سامۆتە** ـ (نت .٢) ، (سیم .) تە : بەن‌سامۆرتە .

**بەن‌سامۆرتە** ـ [ ٢ـ بەن + سامۆرتە ؟ ] ، (نت .) ، (مک .) پەتێکی باریکە بە دانستە دەهۆندرێتەوە، خورجین ، هەگبە و ... پێ لەپاش تەرکی زین دادەبەستن . ★ ( سیم . ) بەت‌سامۆتە . تێب ـ وا دەزانم لە موکریان لە شێوەی (بەن‌سامۆرتکە) شدا دەگوترێ . چونکو دڵنیا نەبوم نەم‌نوسی .

**بەنکاڵە** ـ [٢ـ بەن + کاڵە] ، (نت .) ، (مک .) هەودایەکی ئەستورە (چەند هەودا بەنی ئاسایی پێکەوە بادراون ) کاڵەی خاوی پێ لە قاچ توندەکەن . **بەنکاڵە دە بەنکاڵەخستن** ـ ( بەنکاڵەلە بەنکاڵەگرێدان ) ـ (کن .) بونەبەر هەڵست بۆ کاری بەکێك . گێچەڵ و تیتاڵ بە کەسێ کردن .

**بەنکەشێ** ـ [٥ـ بەند + کەشێ]، (سن. ، جن .) تە : بەنکێشێ .

**بەنکێشێ** ـ [٥ـ بەند + کێشێ (کێشان) ] ، (حمص.) ، (مک.) کاری پڕکردنەوەی کەلێن و درزی نێوان ڕێزەکانی خشت و بەرد ، لە دیوی دەرەوەی دیوار و پایەی خانو ، بە گێچ یا چیمەنتۆ ... بۆ جوانێ و قایمێ .

**بەنگ** ـ [ ست : بەنگهە . سانسکریتێ : بهەنگا . پە : مەنگ ]، (نا .) تۆزێکی تایبەتییە لە گەڵا و گوڵی گیای (شەدانە) سازدەکرێ ، بە ئاو یا شیر دەیگرنەوە و دەیخۆنەوە ، بە نێر گەلە ، سەبێلە و سیغاریش دەیکێشن . مەستێ و سەر خۆشێ دەدا ، بەنگ‌کێش شتی پچوکی لێ‌گەورەدەبێ ، جۆگەلە ئاوی لێ‌دەبێتە زێ . ★ ( کعر . ) حەشیشە .

**بەنگ‌کێش** ـ ( صت . ) ١ـ ئەو کەسەی بەنگ‌دەکێشێ . ٢ـ (کن.) مرۆڤی گێژوویژ .

**بەنگ‌کێشان** ـ ( مصت . لا . ) بەکارهێنانی بەنگ وەکو جگەرە .

**بەنگە** ـ [ بەند + گە ] ، (نت .) ، (سن .) ١ـ تە : ١ـ بەند/١ . ٢ـ تە : ٣ـ بەند/٤ . (تە : مردۆخ ، ج ١ ، ل ـ ١٩٤ ) .

**بەنۆلە** ـ [؟] ، (نت.) تە : ١ـ بەندۆکە (معر . ، کشت ، ب ١ ، لـ ٥١ ) .

**بەو** ـ [٢ـ ب + ئەو ؟ ] سیغەی ئەمرە بۆ کەسی دوەم لە بن‌لەهجەی جافیدا □ « بەو بەو بەو خانم خاسەکەم ، پابنی وەبان دیدە ڕاسەکەم » ، (فۆلکلۆر) ★ (سن. ، جف . ) بێ ـ (مک .) ، کعر. ، بک .) وەرە .

**بەور** ـ [ پە : بەپر ] ، ( نا. ) گیاندارێکی گەورەی گۆشتخۆری دڕندەیە ، لە جەنگەڵەکانی ئاسیا و ئەمریکا و ئەفریقا هەیە ، پشت و لاتەنیشتەکان و قاچ و قولی ڕەنگێکی نارنجێ زۆر جوانە ، بەرزگ و ژێرمل و دەم و چاویشی سپییە و هەمو لەشی دێغ‌دێغی ڕەشی تێدایە .

دوَ صەت كێلوَ قورســ دەبێ و ٢٥ ساڵێك دەژێ . بە شەو ناخەوێ و لە لێڕەكان خــوٚی ماتدەكا و بــە تايبەت پەلامــاری ئادەمێزاد دەدات هەر بوٚیە لە زمانی هیندیدا ناوێكی لێنراوە كە بــە كوردی دەبێتــــە (پیاوخوٚر) . **بەوری بەیان** ــ (نتە.) ١ــ بەوری زوٚر بەهەڵمەت ٢ــ (كنە.) پیاوی زوٚر ئازا و پەلاماردەر . تێبـ ــ من نازانم ووشەی (بەیان) لێرەدا لە كوێڕا هاتوە بــەڵام ئەوەندە دەزانم كە ئەم ووشەیە بە تێكڕایی ئەم دوٚ مانایەی هەیە كە باسم‌كردن .

**بەوز** ــ (نا.) ، (سیمە.) تم : بوٚز.

**بەوش** ــ (نا.) ، (سیمە. ، سنە.) « دارێكی دانەداری پانە . ئەیخەنە ناوەندی تان و پوٚی جاجمەوە بــوٚ ئەوەی كە پێی بكوتن و سفتی‌كەن»، (تم : خا ، ب ١ ، ل ــ ١٧٨) . تێبـ ــ ئــەم تاریفــە دوٚ ئــامرازی جوٚلایی دەگرێتەوە : یــەكێ ( شــە )یە و ئەویتریــان ( دەفە)یە كــە شــەی لەناودایــە و هاتــوٚچوٚ دەكــا بــوٚ كوتانەوە و سفت‌كردنی .

**بەها** ــ [پە : ڤەهاك] ، (نا.) ١ــ نرخ ، قیمەت :: بەهای دانەیەكی نیو دینارە . بەهای ئەم كتێبە دوٚ دینارە . ٢ــ (بكـ.) اــ نرخ، قیمەتــ (عــا.) الثمن . بــ گــران . زوٚر قیمەت:: گەلەك بەهایە (زوٚرگرانە). تێبـ ــ ا) ئەم ووشەیە بــەم مانایە و شێوەی دەكاركردنە (مانای ژمارە ١) تازە لە مەڵبەندی لەهجەی ناوەندی زمــانی كوردیدا بوٚژێنراوەتــەوە . ب) ئــەم ووشــەیە لــە مەڵبەندی لەهجەی ناوندیدا شكڵ و مانای زوٚر گوٚڕانی بەســەردا هاتــوە ، لــە (ڤەهاكر)ی پەهلەویڕا بوٚتە با ( تم : ٥ــ با) و ماناشی لە نرخ و قیمەت ڕا بوٚتە معادل . ئەگەر بیانویستبا بڵێین : قیمەت ئــەم كتێبە چەندە ؛ نەدەگوترا بەهای ئەم كتێبە چەندە ؟ بەڵكو دەیانگوت : ئــەم كتێبە بایی چەندە ؟ ج) لــە لەهجــەی باكوٚری زمانی كوردیدا لــە باری شــكڵەوە قوٚناغێــكی ( تطور )ی بڕیوە و لــە (ڤەهاك)ی پەهلەوی ڕا بوٚتە (بەها) ؛ لــــە لایــــەنی ماناشــــەوە مانــا پەهلەوییەكەی پاراستوە و مانایەكی تریشی ( گران ) بــوٚ پەیدابوە. د) زمانی فارسیش ئەم ووشەیەی لــە (ڤەهاك)ی پەهلەوی خواستوٚتەوە ، زوٚریش ڕێی تێدەچێ پاش ئەوەی (ڤەهاك) لە زمانی كوردیدا تطوری كردوە و بوٚتە (بەها) ڕاستەوخوٚ لە زمــانی كوردی خواســتبێتەوە و ئێستا مانا و شكڵی بە شێوەی كوٚنی لە فارســیدا ماوە و ئــەمە كارێكی ئاساییە ، زمانێك كە ووشەیێك لە زمانێكی تر دەخوازێتەوە لە ڕێگای تطوری تەبیعی لای دەدا و لە باری شــكڵ و مانــاوە كــەمتر گوٚڕانی بەسەردا دێت . بەڵام لە ئەســڵی زمانــــەكەدا كــــە ووشــــەكەی لێخوازراوەتەوە (تطور طبیعی) بــە ڕچەی خوٚیدا دەڕوا و بوٚیە ووشەكە لە هەموٚ بابەتێكەوە گەلێ گوٚڕانی تێدا بەدی دێت .

**بەهار** ــ [ڤەهار] ، (نا.) ، (بكـ. ، نێو . ، جن .) ١ــ یەكەمین فەسڵە

لە چوار فەسڵەکەی ساڵ . بە پێی ئاو و ھەوای نیوکورەی باکوریێ زەویێ ، لەو ڕۆژەوە دەست پێدەکا کە ڕۆژ دەچێتە بورجی (بەرخ)ەوە ئەویش دەکەوێتە ٢١ی مارت (نەورۆز)و لە ٢١ی حوزەیران دەبڕێتەوە . بەھار سێ‌مانگی ٣١ ڕۆژییە و لە موکریان ناوی مانگەکان بەم جۆرەیە : خاکەلێوە . بانەمەڕ . جۆزەردان★ (ھا.) بوھار. بووار. (ھو.) وەھار . تێب ــ ژابا ووشەی (ڤەنگری) ئاوێستایێ بۆ ( بەھار ) دیاریکردوە (تم : ژابا ، ل ــ ٦١).
٢ــ لە لادێی کوردستانا لە باتێ (ساڵ) بەکاردێت . :: ئەم بەھارە دەبێتە سێ بەھار وەتمان جوانەمەرگ بوە (دوسال تەواو بوە و ساڵی سێیەم دەستی پێکردوە . بچینەوە بەھارێ ووسو عومری دەبێتە حەوت بەھار (شەش ساڵی تەواو دەکا و پێی دەنێتە ساڵی حەوتەم ) . ٣ــ خونچە گوڵی داری نارنج و لیمو و پرتەقاڵ . :: ماڵی بەگزادە جافان حەلوای بەھار و گوڵەزەرد باش دروستدەکەن .
٤ــ ناوە بۆ ئافرەتان. **بەھاری عومر ــ** (نت .) دەوری گەنجێتێ و لاوێتێ .
**بەھاری کوردێ ــ** (نت.) تم : بەھار/١ . تێب ــ وەکو دەزانین بەھار یەکێکە لە چوار فەسڵەی ساڵ و لە یەکەم ڕۆژی نەورۆزەوە ( ٢١ی مارت ) دەس‌پێدەکا . بەلام لە ناوچەی ( کرند )ی مەلبەندی کرماشان ، پاش ئەوەی بە حیسابی نەورۆز چل و پێنج ڕۆژ لە زستانی ڕابرد دەڵێن بەھارە و ناویشیان ناوە (بەھاری‌کوردێ) و سێ مانگ سێ‌مانگ حیسابی دەکەن و ھاوین و پاییز و زستان دەبەنەسەر . بەلای منەوە ئەم حاڵە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە (نەورۆز) وەکو ئێستا سابیت نەبوە (تم : نەورۆز) .
**بەھارات ــ** [؟] ، (نا.) ، (کمر.) تم : ئەزبێ . تێب ــ ئەم توانیوە بەڕاستی بزانم کە ئەسڵی ئەم ووشەیە لە کوێ‌ڕا ھاتوە ، بەلام زۆر بۆ ئەوە دەچم کە ووشەیەکی (ھیندێ) بێ و لە کوردستانی عێراق ھاتبێتە ناو زمانی کوردێ .
**بەھاران ــ** [ بەھار /١ + ٢ــ ئان/٢ ] ، (نت .) وەختی بەھار . فەسڵی بەھار □ « بەھاران چ مەحزون دەناڵێنێ بولبول ، لە عیشقی تۆیە ئەی گوڵ » ، (؟) .
**بەھاربەند ــ** [ بەھار /١ + ٦ــ بەند/٢ ] ، (نت .) جێگایەکە وەکو بەرھەیوان لایەکی بەرەڵلایە ، کاتێ تەشقی سەرما دەشکێ و بەرزە وولاخ لە تەوێلە گەرمایان دەبێ لەوێ دەیان‌بەستنەوە .
**بەھارستان ــ** [ بەھار/١ + ئستان /١ ] ، (نت .) بەھارێکی خۆش کە لە ھەموو لایەك ھەوا خۆش‌بۆبێ‌و دار پشکوتبن و دەشت و چیمەن بە گوڵان ڕازابنەوە . □ « ھەموو دنیا بەھارستانە ئیمڕۆ ، لە لای من ھەر چلەی زستانە بێ تۆ .» (؟) .
**بەھارۆ ــ** (نت .) ، (مک .) تم : بەھارە/١ .
**بەھارە ــ** [بەھار/١ + ٥ــ ئە/١]،

(نت .) ١ــ (کعر. ، بک . ، جن . ) گەنمێکە لە بەهارا تۆو دەکرێ ، بە باشێ ناوبانگی هەیە . ٢ــ کۆمەڵە شیعرێك کە بەسەر بەهارا هەڵدرابێ و پەسنی جوانێ و خۆشێ دەدا :: « لە برادەر و ڕەفیقان مزگێنێ بێ بەهارە » ، ( بەهارەی ئەحمەدی کوڕ ) . « ووتم بە بەختی خەواڵۆ ... » ، ( بەهارەی حاجێ قادری کۆیێ ) ؛ « شیرین بەهارە بەهاری شادان » ، ( بەهارەی مامۆستابرایم ) .

**بەهارەکانێ** ــ [ بەهار/١ + ٣ــ ئە/٢ + کانێ ] ، (نت.)، هەندێ کانیاو کە لەسەرە بەهارا دەتەقنەوە و زۆری پێناچێ ووشکی دەکەن .

**بەهارەکێڵ** ــ [ بەهار/١ + ٣ــ ئە/٢ + کێڵ ( کێڵان ) ] ، (صت.)، ( مک.) حاڵی زەویەکی لە بەهارا کێلرابێ .

**بەهارەوار** ــ [ بەهار/١ + ٣ــ ئە/٢ + وار (هەوار) ] ، ( نت.) شوێنێکە نێزیك (دێ)یەك ، بەهاران کە دنیا تۆزێ گەرم داهات لادێیێ و مەڕداری کوردستان لە خانوان دەردەچن و لەوێ چادر هەڵدەدەن تا وەختی ئەوە دێ بچنە کوێستانان.

**بەهارێ** ــ [ بەهار/١ + ٣ــ ئێ]، ( صت.) حاڵی هەر شتێکی پێوەندی بە بەهارەوە هەبێ . هەر شتێکی بۆ فەسڵی بەهار دەستبدات . ☐ « بڵێ پێم ، گوڵەکەی بەهارێ ، لە تۆ تا بە کەی جودابم ؟ + وەرەوە بە شەرتی جاران ، ڕۆژی صەد جارت فیدابم » ( کوڕ : وەفایێ ، ل ــ ٤٨ ) . :: سیروانم دیت دەستێ جلکی بەهاری دە بەردابێ .

**بەهانە** ــ [ پە : ڤەهان ، ڤەهانەك ] ، ( نا.) ، ( مک. ، بک.) ١ــ هەر هۆ و بەڵگە و دەلیلێکی کەسێك ئەنگێزە (دافع و ئەسباب)ی ڕاستەقینەی کار و کردەوەیێکی خۆی لە ژێردا بشارێتەوە. ٢ــ هۆ، بەڵگە و دەلیلی ناڕاست و بێجێ ، بۆ خۆرزگارکردن لە تەنگ و چەڵەمە و گیروگرفت یا وەڵامدانەوەی پرسیار . :: بە بەهانەی دژایەتێ دەگەڵ ووڵات ئازادیخوازانیان دەخستە زیندانەوە. بە بەهانەی ئاوخواردنەوە خۆی لێدزینەوە ☐ « ئێستە بەهانەم بۆ ئەدۆزنەوە » « گفتی دوژمنم بۆ ئەقۆزنەوە » « ئێژن پف ئەکەی لە هەمەدانا » « ئارد وەبا ئەدەی لە خۆراسانا » . ( هەژار : بۆ کوردستان ، ل ــ ٧٨ ) هس : أ ) بۆنە . (مک.) پەڵپ ــ ب ) ، ( پە.) ڤەهانیك : سەبەب . سەبەبکار . مەعلۆل ( تم : فرە ، پفا ، ل ــ ٤٤٧ ) . ★ ( جف.) بیانگ . ( سنە.) بیانك . ( مک. ، سیە.) بیانۆ .

**بەهانەپێگرتن** ــ ( مصت. ، مت.) تم : بیانۆپێگرتن .

**بەهانەهێنانەوە** ــ عوزری نابەجێ نیشاندان . کردەوەیێکی نابەجێ و ناڕاست بە قسەی ساختە ڕاست نیشاندان ــ (عا.) تبریر الموقف .

**بەهبەه** ــ ( ئە.) ١ــ بۆ بەچاکزانین و خۆشهاتن لە شتێ ،

کاریَ یاخود کەسێك :: بەهبەهـ لەم دەست و نەخشـه . ٢ـ بۆ سەرسوڕمـان و ناڕازیـتیَ و پیَخۆش‌نەبوَن :: بەهەهـ ! وەڵـڵا بابە تەواومان‌کرد .

**بەهرە** ــ [ لەپه : بەهـرەك ] ، ( نا. ) ، ١ــ لێهاتوییَ و قابلیەتێکی تەبیعییە کە لای خەڵکیَ پەسندە و بە چاك حسێبدەکریَ و لە هێندیَ کەسا دەردەکەویَ . :: شاعـیریَ بەهرەیە . زیرەکیَ بـە زۆر نیـە بەهرەیە . ٢ــ قازانج و دەسکەوتی ماددیَ یا مەعنەوییە کە لە سەودا و کڕین و فرۆتن یـا بەخێـوکردنی ئاژاڵ و پاتاڵ یا خزمـایەتیَ و ... دەس کەسیَ دەکەویَ . :: مەڕداریَ بەهرەی زۆرە . منداڵی ئەم زەمانـە بەهرەیان بۆ خۆیان نیـە چ جـای دایك و باب . ★ ( بک. ) بـەهر = بـەش . ( جذ. ) بەهـەرکردە = بەشکردن. تێبـ ــ لەهجەی باکوریَ و جنوبیَ زمانی کوردیَ مـانای ئـەم وشەیان بە شکڵی سەردەمی زمانی پەهلەویَ پاراستوە .

**بەهرەمە** ــ [ ؟ ] ، ( نا. ) ، (سیمـ.) ئامرازێکە دارتاشان دار و تەختەی پیَ کون‌دەکەن . ★ ( مک. ) مەتکەب. ( = عا : مثقب )

**بەهمەن** ــ [ پە : ڤەهـومەن ] ، ( نـا. ) ، ( کئیر. ) ١ــ مـانگی یازدەهەمی ساڵی ئێرانییە و دوەمین مانگی زستانە . دەکەوێتە ( ٢١ی کانونی دوەم ــ ٢١ی شوبات ) ، سیَ ڕۆژە . ★ ( مک. ) ڕێبەندان . ٢ــ ناوە بۆ پیاوان . تێبـ ــ وشـەی ڤەهومەن کە ئێستا بۆتە بەهمەن بە مانای چاکڕەووشت هاتوە و لـە ئەسڵا ناوی یەکیَ لە ئەمشاسپەندانی دینی زەڕدوشتییە. (ئەمشاسپەند)ی ئێستا لە (ئەمێشۆشپەند)ی پەهلەویَ وەرگیراوە . ئەویش لە ئاوێستاییَڕا هێناویەتە سەر ڕچـەی زمـانی پەهلەویَ . لە ئاوێستادا ( ئـە + مێشە + سپێنتە ) بوە و پارچەی یەکەمی ئەم وشەیە ئاوێستاییـە ئامرازی ( نەفی )یە و ( مێشە ) بـە مانای مەرگ هـاتوە کە ئـەم دوَ پارچەیە مانایان دەبێتە ( بیَمەرگ = ئەوەی نـامریَ ) و بە ڕای مـن وشەی ( هەمیشـە )ی کـوردیَ ئێسـتا لەم وشـە تێکەڵـە کەوتۆتەوە و جەوهـەری مانـاکەی پاراسـتوە . کەرتی سێیـەم کە (سپێنتە)یە بە مانای پاك و خاوێن و ( مقدس )هاتوە و مانای ( ئەمێشـە سپێنتە )ی ئاوێستـاییَ دەبێـتە ( ئەو مقدسەی مردنی بۆ نیە ) .

**بەهەشت** ــ [ ست : ڤەهیشتـە ( نێر ) ، ڤەهێشتا (میَ) = باشترین، چاکترین ; پە : ڤەهیشت ] ، (نا.) ١ــ جێگایەکە وەکوَ بـاغ و هەمـوَ چەشنە خواردەمەنیَ و خواردنەوە و کەیف و ڕابـواردن و کۆشـك و خانوَبەرەی جوان و ڕازاوەی لێیە . لە تەوڕات و ئینجیـل و قـوڕئانی پیرۆزا باسی‌کراوە و خوا تەرخانـی کردوە بۆ ئەو کەسانەی لە دنیـادا لە فەرمانی دەرناچن و خراپەناکەن و لە پاداشتی ئـەوەدا لـەم شوێنـە نیشتەجیَ دەکرێن . ٢ــ ( مجـ. )

وولات و شوێنێکی خۆش ئــاو و هەوا و پڕگوڵ و گوڵزار و سەوزە و شینایی . ماڵێکی ڕازاوە و ڕێك و پێــك و خــاوێن . **بەهەشــتیڕۆی زەمین** ــ ١ــ ( کن.) تم : بەهەشت /٢ . ٢ــ هێندێ جێگای دەسکردی ئادەمیزاد کە خۆیان ناوی بەهەشتیان لێناوە . تێبـ ــ دەستەڵاتدارانی پێشوو بــاسی بەهەشتــیان بیستـــوە ، هێندێکیان کە لافی خودایەتییــان لێداوە بۆ بەربــەرەکانێ دەکــەڵ بەهەشتی خوا و هێندێکیشیان بــۆ کەیف و ڕابواردنی خۆیان ئیلهامیان لەو قسە و باسانــەی دەربــارەی بەهەشت کراوە وەرگرتوە و لاسایان کردۆتەوە و جێگایەکی خــۆش و ڕازاوەیان دروستکردوە و ناویــان نــاوە بەهەشـــت :: بەهەشـــتی شەدداد .

**بەهەشتینێرەکەر** ــ ( کن.) دنیا بە نیسبەت ئەو کەســانەی گــوێ نادەنە هێچ و خەمیهێچ شتێکیــان لەبەر نیە . □ « دنیا بەهەشــتی نێرەکەرە » تێبـ ــ مامۆستا خاڵ ئەم مەتەڵەی ئاوا نوســیوە : « دنیــا بەهەشتی کەرانە » ( تم : خا ، پەند، ل ــ ٢١٨ ) . ★ (مک.) بەحەشت . جەنەت ( عا.) .

**بەهەشتی** ــ ( صت.) ١ــ کەسێکی دانیشتــوی بەهەشـــت . ٢ــ پیاوچاك ، پیاویخوایی . تێبـ ــ زیاتر ئەم ووشەیە لە باسی یەکێکی مردوودا دەکاردەکرێ ، بە نیشانەی ئەوەی کە پیاوێــکی چــاکبوە و خوابردوێیەتە بەحەشـــت و بــۆ پێخۆشبوونی خزم و کەس و کارێ .

**بەهێندگرتن** ــ ( مصت. مت.) ، ( مک.) بەچاوی حورمەت و قـــەدر تەماشای کەسێ کردن ئەهمیەتدان بە کەسێ .

**بەهەوا** ــ [ بە/٨ + هــەوا ! ، ( صت.) تم : بەفێز .

**بەهێ** ــ [ پە : بێە . ] ، ( نا.) ، ( سیم.) ١ــ بەری دارێــکە لــە چەشنی دارەسێــو ، دەسنێــژە ، ڕەنگی زەرد و گۆشتی زبر و ئاودارە، بۆنێکی خۆشی هەیــە ، پایــیزان پێـــدەگا ، بە کاڵێ دەخـــورێ ، دەپیشـــێنرێ ، دەکرێتــە دۆڵمە و مرەبا . دەنکەکەی وەکوو چایێ لــە ئاوا دەم دەکەن تراوێــکی لینجــی لێسازدەبێ بۆ بڕینەوەی کۆخــە و هەڵامەت و نەرمکردنەوەی ســینگ دەیخۆنەوە . ★ (مک.) بێ . (سن.) بەی ، ( بک.) بێە . ٢ــ داری ئــەم مێوەیە .

**بەهێز** ــ [ بە/٨ + هێز] ، (صت.) ١ــ حاڵی هەر گیاندارێك توانستی زۆربێ ، قەوەتی ماددێ یا مەعنەوێ زۆربێ :: ڕۆستەمی زاڵ پاڵەوانێکی بەهێز بوو . ٢ــ حاڵی هەر شتێکی لە چاو شتی وەك خۆی توانستــی زۆرتر بێت :: بۆمبای ئاتۆم بەهێزە. بەیانەکە زۆر بەهێز بوو . ٣ــ حاڵی هەر هەیئەتێکی کۆمەڵایــەتێ کــە توانستی ڕاپەڕاندنی ئیش و کارێك یـــا بەربـــەرەکانێ دەگـــەڵ هاوچەشنەکانی خــۆی زۆر بــێ :: سۆڤیێت لەباری چــەکی ئاتــۆمێ بەهێزە . تێبـ ــ ووشەی ( هێز )

لە ( هەزەنگهـ.)ی ئاوێستایی بە مانای بالادەست ، زۆردار و قەوەت وەرگیراوە ، ( فەزەنگهـ.)یش لە ریشەی فیعلی ئاوێستایی (هەز) داتاشراوە کە گەلێ مانای هەیە .

**بەهێ ــ** ( نا.) ، ( با.) تم : ئازیەت . تێب ــ ئەم ووشە (باکوری)یەش وەکو گەلێ ووشەی تری لەهجەکانی زمانی کوردیی ، بە هێوای برەوپێدانی لە لەهجەی ناوەندیدا ، نوسراوە .

**بەهێدار ــ** ( صت.) ، ( با.) تم : ئازیەتبار .

**بەی ــ** ( نا.) ، ( سن. ، هو.) تم : بەهێ . □ «خالێ دێم جە بەین دوو بەیانەوە + وەبانی بەیندا مەشنیانەوە » ، (بێسارانی) .

**١ــ بەیات ــ** [ ؟ ] ، ( نا.) ١ــ هەوایەکە لە هەوا کلاسیکیەکانی مۆسیقای کوردی و چەند جۆرێکی هەیە ، مۆسیقای کوردی و ئازربایجانی و فارسی لەم هەوایانەدا شەریکن . :: بەیاتی کورد . بەیاتی تورك . بەیاتی شیراز . بەیاتی ئیسفەهان . ٢ــ ناوی عەشیرەتێکە لە کوردستانی عێراق .

**٢ــ بەیات ــ** ( صـ.) ١ــ حالی نان و کولێرەی کۆن کە چەند ڕۆژی بەسەردا تێپەڕیبێ :: ئەو نانە بەیات بوە ناخوری . ٢ــ چێشت و هەر خواردەمەنیێکی شەو لێنرابێ و مابێتەوە بۆ بەیانی . ★ ( سن . ) بەزێرە . شەومەننە . ( جـ . ) شۆومەنی . تێب ــ سەروسەکوتی ئەم ووشەیە لە عەرەبی دەچێ ، بە لامەوە سەیر بۆ کە ( معین ) بە فارسی دانابۆ کە تەماشای (المنجد)م کرد زمانی عەرەبی سیفەی ( بائت )ی هەیە ، ئەویش بۆ ئاو یا شیر کە شەو داندرابێ بۆ بەیانی تا سارد بێت .

**بەیاتە ــ** [ ؟ ] ، ( نت.) ڕۆندۆك . ( تم : هبێد ، ل ــ ١٤ . خا : ب ١، ل ــ ١٧٩ . معر : کشت ، ب١ ، ل ــ ٥٢ ) .

**بەیاخ ــ** ( نا.) ، ( سیم.) تم : ئالا . هس ، بەیداغ .

**بەیاخدار ــ** ( نت. ) ، ( سیم.) ١ــ ئەوکەسەی لە ناو لەشکر و مەیدانی شەڕا ئالای هەڵدەگرت . ٢ــ ( کن.) « ئافرەتی بێ شەرمی شێرەت » ( تم : خا ، ب ١ ، ل ــ ١٧٩ ) .

**بەیادکردن ــ** ( مصت. لا.) وەبیرهێنانەوەی دۆست و خزم و کەس و کار و شوێنێك و . . .□«بەد نەبێ بەدخانە بە یادناکا » .

**بەیادیکردن ــ** ( مصت. لا. ) « بێخەوی و بێکەیفییە ، کە لە نەخۆشی یا لەڕانەهاتنی شوێنێك پەیدا ئەبێ » ( تم : خا ، ب ١ ، ل ــ ١٧٩ ) .

**بەیار ــ** ( نا. صـ.) ، ( مک. ، سن. ، سیم. ، بک.) زەویی‌یەکی ماوەیەك بێ نەکێڵدرابێ و کشتوکاڵی لێنەکرابێ . هس : بۆرە .

**بەیاز ــ** [ = عا : بیاض ] ، (نا.) دەفتەرێکی شیعری بە شێوەیێکی هەڕەمە و نازێك و پێك تێدانوسرابێتەوە ★ کەشکۆڵ/٣

هس : ( لو.) بەیاز : جێگای چۆڵ.
**بەیازە ــ** [ ؟ ] ، ( نا.) ، ( سنە. ) کلکێکی شلك و ساوای هێندێ درەختان کە لێیان دەبڕدرێ و لە جێگەیێکی‌ترا دەچەقێنرێ ( دەنێژرێ ) و خوی ڕێشە دادەکوتێ و دەبێتە دارێکی سەربەخۆ . ★ قەڵەم . ( تم : مردۆخ ، ج ١ ، ل ــ ٢١٦ ) .
**١ــ بەیان ــ** [ ؟ ] ، (نا.) ١ــ وەختێکە لە نێوان شەو و ڕۆژاندا ، دنیا ڕۆناك دەبێ بەڵام هێشتا خۆر هەڵنەهاتوە . دوایی شەو و سەرەتای ڕۆژ . ئەو کاتەی کە نوێژی سبەینانی تێدادەکرێت . لە شەبەقەوە تا خۆرهەڵات . ★ سبە . سبەینە . ( بکـ.) سپێدە ، سەب . ( فیـ.) شەوەکێ ، ( لو.) صۆ ، شۆوصۆ . تێبـ ــ أ ) وا دەزانم ئەم ووشەیە لە ووشەی ئاوێستایی ( بەمە ) بە مانای ڕۆناکایی و درەوشانەوە، وەرگێراوە کە لە زمانی پەهلەویدا بۆتە ( بام ) و بێجگە لە ماناکانی ئەسڵی ئاوێستایی ، مانای ( وەختی سبەینێ )شی بۆ پەیدابوە . ب ) دوو ئیحتیمال هەیە بۆ پەیدابونی ئەم ووشەیە . یەکیان ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ ( بەمە )ی ئاوێستایی دەگەڵ ( ٢ــ ئان/١ ) یا ( ٢ــ ئان/٢ ) تەرکیب بوبێ و بوبێتە ( بەمەئان ) و ( بەمەیان ) و ( بەوەیان ) و ( بەمان ) . دوەمیان ئەوەیە کە ( بەمە )ی ئاوێستایی بوبێتە ( بام )ی پەهلەوی و ئەوجار دەگەڵ یەکێ لە ( ئان )ەکانی تەرکیب بوبێ و (بامان) یا (بامیان)ی لێ‌سازبوبێت و لە قۆناغێکی دوایی‌ترا (باویان) و (بایان)ی لێ‌کەوتبێتەوە و لەم قۆناغەی ئێستایدا چوبێتە قالبی ( بەیان )ەوە . ج ) وەکو یەکێ لە هاوتاکانی ئەم ووشەیە لە لەهجەی مەزنی باکوریدا (سەب)م نوسیوە، ئەم ووشەیە ئێ بن‌لەهجەی ( هەفێرکێ )یە ، لەباتی بەیانی باش دەڵێن : ( سەبا فە بخێر ) لەم ڕستەیەدا ( سەبا ) لە ووشەی ( سەب ) و ( ٤ــ ئا ) کە ئامرازی ئیزافەیە پێکهاتوە . ٢ــ تم : بەیانی.
**٢ــ بەیان ــ** [ عا : بیان ] ، (نا.) ١ــ شەرح و تەفسیر . ٢ــ تم : بەیاننامە .
**بەیانان ــ** [ ١ــ بەیان + ٢ــ ئان /٢ ] ، ( بند.) تم : بەیانی/٢ .
**بەیان‌کردن ــ** [ عا. کو.] [ ٢ــ بەیان+ کردن ] ، ( مصد. لا.) شەرح‌کردن ، ئاشکراکردن ، لێکدانەوە .
**بەیاننامە ــ** [ عا. کو.] [ ٢ــ بەیان + نامە ] ، ( نت.) ، ( کئێر.) نوسراوێکە دەوڵەتان ، کۆمەڵە و پارتە سیاسییەکان و ئەو جۆرە ڕێکخراوانە ، لە کاتی پێویستدا بڵاوی دەکەنەوە و بیروڕا و هەڵوێستی خۆیانی بەرامبەر مەسەلەیێك یا ڕوداوێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی تێدادەردەخەن . :: بەیاننامەی کۆمەڵی نەتەوەیەکگرتوەکان دەربارەی مافی مرۆڤ . بەیاننامەی یازدەی ئازار دەربارەی مافی نەتەوایەتی گەلی

کورد لە کوردستانی عێــراق . ★ ( کمر.) بەیان .

**بەیانەکێ** ــ [ ١ــ بەیان + ئەکێ /١ ] ، ( بنت.) تم : بەیانی/٢ .

**بەیانێ** ــ ١ــ ( نت.) ڕۆژێــــکە ڕاستەوخۆ بە شوێن ئـەو ڕۆژەدا دێت کە تێیداین . ڕۆژێـــك دوای ئیمڕۆ . ( چوارشەممـە لـە چـاو سێشەممۆ ، بەیانییە ) :: بەیانێ بچۆ باشترە ( ئیمڕۆ مەچۆ ) بەیانێ جێژنــە ( ئیمڕۆ جەژن نیــە ) ★ سبەینێ ( بك.) سوبەهێ . ( سنـ.) سبێ ، سۆزێ . ٢ــ لـە وەختی بەیـاندا ★ بەیـانەکێ بەیانــان ، بەیانییان .

**بەیانییان** ــ [ بـەیانێ/٢ + ٢ــ ئان/٢ ] ، ( بنت.) تم : بەیانێ/٢ .

**بەیبوون** ــ ( نا.) تم : بابنەپێچ .

**بەیت** ــ [ عا. ] ، ( نــا.) ١ ــ شێوەیێکی فۆلکلۆری ئەدەبیــاتی کوردییە ، چیرۆکێکی ئەفسانەیی ، داســتانێکی دلداری ، مێژوویی یــا هەر ڕوداوێــکیترە ، شاعــیرانی نەناسراو لەسەر وەزن و قافیــەی تایبەتی کردوویــانە بە شــیعر و دەماودەم گەڕاوەتەوە و گەیوەتــە دەستی ئێمە . :: بەیتی کاکەمەم و خاتوزین ، بەیتی خەج و سیامەند ، بەیتی دمدم . ٢ــ ( کنـ.) قســەی دوورودرێژی بێ بەلگە و بناغــە :: ئەوە چیە دەلێی بەیتمان بۆ دەکەی ( قسەکانت هــەر قســەن ) . دوو سەعات بەیتی بۆ کردین (قسەی کرد) قسەیەکی نەکرد وە قسان بچێ .

**بەینیبلە** ــ (نت .) [ وادیارە بەیتێك بوە دوور و درێژ و خەلکی وەپێکەنین خستوە ، بەلام ئێستا بەیتێك بـەم ناوە لەناو بەیتەکانی کوردیدا بەرچاو نــاکەوێ ] . ( کنــ.) قســەی دوورودرێژ . □ « گوێ بکرە بـرا ئەم غەزەلەم نسحەت و پەندە + وا تێمەگە بەیتی بلەیــە ، مەیــکە بەخەندە » ( مەلامارف ) .

**بەیت و بالۆرە** ــ ( نت. ) تــم : بەندوبــاو . **بەیــت و بــالۆرە بۆهەلبەســتن** ــ ســازکردن و بلاوکردنەوەی بەندوباو دژی کەسێ یا کەسانێ .

**بەیتوباو** ــ ( نت.) تم : بەندوباو

**بەیتوبــاو بۆڕێکخســتن** ــ تم : بەیت و بالۆرە بۆهەلبەستن . □ « ... ناوونێتکەیــەکی زۆریــان داخست و هەزاران بەیت و باویان بۆ ڕێكخست . » (قزلجی پێکەنێن، ل ــ ١٠٤ ) .

**بەیچەل** ــ [بەی + چەل]، (صت.) حالی ئافرەتێکی سـكوزا نـەکا ، نەزۆك بێ . تێب ــ وەکو نیشاندراوە، ئەم ووشەیە لە دوو کەرتی (بەی) و (چەل) سازبوە . کەرتی یــەکەمیان (بەی) شێوەیەکی تری ئامرازی نەفی (بێ)یە کە لە ووشــەی (بەیدەس)ی بنلــەهجەی سلەیمانیدا دەبیندرێ، کەرتی دوەم (چەل) من وای بۆ دەچم هەر ئەو (چەل)ە بێ کە لە ووشەی (ڕەچەلەك)دایە .

**بەیداخ** ــ (نا.) ، (سنـ.) ، تم : ئالا .

**بەیداغ** ــ (نا.) ، (مك.) تم : ئالا. تێب ــ ڕەنـگە یەکەندەردوو وا بێتە

بەرچاو کە ئەم ووشەیە لە (بەیرەق، بایراق ) وەرگیرابێ کە هێندێ لـە زانایان لایـان وایـــە ووشـــەیەکی ترکییە ، بەلام من وای بۆ دەچم کە لە (بەیرەق)ی عارەبییەوە هاتوە کە یەکێك لە ماناکانی (ڕێ‌پێشاندەر)ە و خۆشی لـە ووشـــەی ( پیادەك = پیاوە)ەوە کراوە بە عارەبێ .

**بەیدەس** — [بەی (بێ) + دەس]، (صت .) ، (سیم .) حالی کەسێکی دەستەلاتی نەبێ ، توانستی نەبێ ، زەعیف و بێ‌هێز بێ ، نفوزی نەبێ. ★ بەیدەست .

**بەیدەست** — (صـ .) ، (سیم .) تم : بەیدەس .

**بەیدەست‌کردن** — (مصت . مت .)، (سیم .) تم : بەیدەس‌کردن .

**بەیدەس‌کردن** — (مصت . مت .) ، (سیم .) زالبۆن بە ســەرکەسێدا لەهەر لایەنێك بێ ، مەغلوب‌کردنی یەکێ . بە زەوێداکوتانی یەکێ لـە زۆرانێـــدا . هێــزی بـەربەرەکانێ لێ‌بڕێن ★ بەیدەست‌کردن .

**بەیرەم** — [٩] ، (نا.) ، (سنـ.) ، تم : باریە .

**بەیعـەت** — [ = عا : البیعة ] ، (نا.) عەهد و پەیمان .

**بەیعەت‌پێکردن** — ( مصت . لا. ) ڕازی‌بۆن بە سەرۆکایەتێ کەسێ و جلـــەوی کاروبـــاری خـــۆی تەسلیم‌کردن. هەلبژاردنی سەرۆکی وولات بە شێوەی ئیسلامەتێ. تێب — أ) بـۆ کردنی کەســێ بـــە خەلیفەی ئیسلام ، موسولمانان کۆدەبنەوە و تەکبیر و ڕاوێژ دەکەن تا ڕایان دێتە ســەر یەکێك بێکەن بـە خەلیفە . ئەوجار یەکەیـەکە هەلدەســتن و دەستی ئەو کەسە دەگرن و دەلێن : بەیعەتم پێکردێ . ب) خوالێخۆش‌بۆ قازێ محەممەدی شەهێد سەرەڕای ئەوە کە بـە شێوەیەکی گشـتێ و ئیمڕۆیی بۆ پێشەوایێ و سەرۆکایەتێ حکومـــەتی میللێ کوردســـتان هەلبژێردرابۆ ، تا ماوەیێکیش هەر کەس بۆ دیتنی دەچۆ داوای لێدەکرد (بـەیعەتی پێ‌بـکا) و دەیـکوت تـا سەرۆکایەتیەکەی شێوەی شـــەرعێ و ئیسلامەتێ وەربگرێ .

**بەین** — [عا.] ، (نا.) ١— دۆرێ دۆ شت لـە یەکتر :: مالی دارا و خوســرەو هــەر دۆ مالیان بەینە نێوانیـــان هێندە خۆشـــە مۆیان دە بەینەوە ناچێ . ٢— پەیوەندی نێوان دۆ یا چەند کەسان . □ « تۆ دۆر و من دۆر ، بـەنێیك ببەســتێن + بەفرمێســـکی چـــاو ، جـۆگێك هەلبەستێن » . بەینیان تێك‌چوە . ئێســـتا بەینم لـەگەلی نیـە . ٣— ئالۆدەیێ، گیرۆدەیێ شتێك :: بەینی دەگەل جگەرە نیە . ٤— وەخت ، دەم ، زەمان :: بەینێکە دیار نیە . لەم بەینانەدا چاوم پێکەوت . بەینێ لەمەوپێـــش لێرەبۆ . **بەین‌بەین** — نـاو بەناو ، جاروبارە :: بەین‌بەین سەریان لێ‌بدە .

**بەینەت** — [٩] ، (نـا.) ، (هو.) وەفا . پەیمان . □ « ئامانێ بەلکم ئێنـە چەپ‌گەردەن + هـەر پاسە شادیش نیەن بـەینەتش » ( مکب : مەولەوێ ، ل — ١٦٨ ) .

**بەیەوە ــ** [ئ] ، (نـا.) کۆمەڵـە بەفرێـکی ( نا ) لـە شـوێنانەوە هەڵیگرتبێ و دە شـوێنێکی قوڵی پەسـتاوتبێ . تێب ــ هـەمو ئـەو فەرهەنـگانەی لـەبەر دەسـتمابوون پشکنیمن ، تەنیا مامۆسـتا تۆفیق وەهبی ئەم ووشەیەی نوسیبو .



# تکایـەك

سەرەڕای ئەوەی کە زۆر هەوڵدرا ئەم قامۆسە بەبێ غەڵەت و هەڵـە بکەوێتە بەردەستی خوێنەرانی خۆشەویست ، بەڵام بەداخەوە وا دەرنەچـوو هەرچەندە باوەڕناکەم هەڵە ی مەبەست شێوێنی تێدابێ تەنیا ئەوانە نەبن کە لە خوارەوە وێڕای تکای لێبوردن دەیخەینە بەرچاوی خوێنەرانی بەڕێز :

١ـ لە لاپەڕەی ١١٨ ی بەشی (ووشە نامە) کە لە پاش دێڕی دوازدەمێنی ستوونی دوەم کە بە (هۆوکتێبـە) دەبڕێتـەوە ئەم چـەند دێڕانـە لەبیرچوون :

□ « ئەو ڕۆژە کە تۆرام و لە کەرکوك
سەفەرم کرد »
« مانەندی عەقاریب لە ئەقاریب
حەزەرم کرد
( ڕەزا ـ ١٣ )
٣ـ ئامرازی تەئـکید و حـەسر و
تەعریفە :: ئەئێرە ئە ئەوڕو . ئە ئەم
کتێبەی دەڵیم . ★ ئا .

٢ـ ووشەی (ئاتوم) لەلاپەڕەی ٥ حەوالەی (ئەتۆم) کراوە و . دەبوایە لـە لاپەرەی ١٢٢ ، ستوونی دوەمدا لەپاش ووشـەی (ئەتۆ) بنوسرایـە بەڵام لەبیرچوە .

**ئەتۆم ـ** [ محر. فرەنسی : ئاتۆم ، لە (ئـاتۆمۆس)ی یۆنـانی بەمـانای شتێکی بەش بەش نـاکرێ] . ( نا. ) پچوکتریـن (جـزء)ی (عنصر)یـکی کیمیایێ کە بە چاو نابێندرێ و لـە کۆنەوە زانایـان ناویـان نـابوو ( جزء لایتجزی ) تێب ـ ئەتۆمی هەموو عنصرێك لە دوو بەش پێکهاتوە : ١ـ ناوکەی ئەتۆم ، کە ئەوێش دەبێتە دوو بەش ، یەکیان بێکارەبـایە و نـاوی

(نوێترۆن)ە و ئەویتریان کە کارەبای
گەرم (موجب ، مثبـت)ی تێـدایە
(پرۆتـۆن) . ٢ــ ئەلەکتـرۆن کـە
کارەبای سارد (سـالب ، مەنفـی)
تێدایـە . ناوکـەی ئەتـۆم ئـەم
ئەلەکترونانە بۆ لای خۆی ڕادەکیشی
و بە توندی بە دەوریدا دەخولێنەوە.
(تم : فەرهەنگ ــ ١٣٦ و لارۆس ــ
٦٧) ★ ئاتۆم .



**تکایە خوێنەوارانی بەڕێز پێش خوێندنەوەی قاموسەکە هەڵەکانی ڕاست بکەنەوە .**

| لاپەڕە | ستوون | دێڕ | نووسراوە : | بکرێتە : |
|---|---|---|---|---|
| ٢٤٧ | ٢ | ١٧ | بابا بیبینم | با بیبینم |
| ٢٤٧ | ٢ | ٢٣ | **یە** | **پە** |
| ٢٤٨ | ٢ | ٢١ | نەخۆشیێکە | **نەخۆشیەکە** |
| ٢٥١ | ٢ | ٢٨ | سجیللی | سجیللێ |
| ٢٥٤ | ١ | ١٧ | معت . | مصت . |
| ٢٥٤ | ١ | ٢٠ | **باج ئەستاندن ـ** ( مصت . مت . ) | **باج ـ** [پە . : باژ] ، (نا.) |
| ٢٥٤ | ٢ | ١٦ | معت . | مصت . |
| ٢٥٥ | ٢ | ١٦ | ( مک . ) | (مک.) ، (صت.) |
| ٢٥٥ | ٢ | ٢٤ | س . | سن . |
| ٢٥٥ | ٢ | ٢٨ | باغەوان | باغەوانێ |
| ٢٥٦ | ٢ | ٢١ | **کەسێکە** | **کەسێك** |
| ٢٥٧ | ١ | ٥ | دوێنێ | دوێنێ :: |
| ٢٥٧ | ١ | ٢٦ | بپۆچێتەوە | بپۆچێنەوە |
| ٢٥٩ | ٢ | ٢٢ | بەرد ( ٤ ) | بەرد ( ٥ ) |
| ٢٥٩ | ٢ | ٢٣ | تیر ( ٤ ) | تیر ( ٥ ) |
| ٢٦٠ | ٢ | ٣٧ | ٢ـ بەند | ٦ ـ بەند / ٢ |
| ٢٦٤ | ٢ | ٢٦ | —— | —— |
| ٢٦٦ | ١ | ١٣ | —— | ئەوەندەی پێمەڕە دەتوانێ |
| ٢٦٨ | ١ | ٢٨ | چل مێردە ، | چلمێردە ، بەیرەم |
| ٢٧٣ | ١ | ١٥ | سۆکێ کردن | سەنگ و سۆکێ کردن |
| ٢٧٣ | ٢ | ٤ | بازد تە : | تە : بازدان/١ |
| ٢٧٣ | ٢ | ١١ ، ١٢ | —— | —— |
| ٢٧٣ | ٢ | ٣٣ | ەنۆسا | ئەوسا |
| ٢٧٤ | ٢ | ٢٦ | ل ٧٦٤ . | ل ٧٦٤ ) ★ |

| لاپەڕە | ستوون | دێڕ | نووسراوە : | بکرێتە : |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٢٧٤ | ٢ | ٣٢ | مهێدین | محێدیـن |
| ٢٧٦ | ٢ | ١٨ | تەوابۆ | تەواوبۆ |
| ٢٧٦ | ٢ | ٢٦ | لەیارێ دەکا | دیارێ دەکا |
| ٢٧٩ | ٢ | ١٠ | —— | —— |
| ٢٧٩ | ٢ | ١٢ | شیرن و | —— |
| ٢٨١ | ١ | ٢٨ | ( شی . ) | ( شڕ . ) |
| ٢٨١ | ٢ | ١٤ | هەلە | هەڵ |
| ٢٨١ | ٢ | ٣٥ | ئارەزۆ | ئارەزۆبکرێ |
| ٢٨٣ | ١ | ١١ | گرێزی | گوێزی |
| ٢٨٥ | ١ | ١٣ | بای | بـاری |
| ٢٨٦ | ١ | ١٢ | ( | ج ) |
| ٢٨٩ | ١ | ٢٣ | بالەبەستن | باڵ بەستن |
| ٢٩٠ | ٢ | ١١ | زر | زبـر |
| ٢٩٢ | ١ | ٣١ | خانونیان | خانـویان |
| ٢٩٤ | ١ | ٩ | بە سولدان | بەرمسولدان |
| ٢٩٥ | ٢ | ١٣ | ( هر . ) | ( هو . ) |
| ٢٩٥ | ٢ | | ٢٤،٢٣،٢٢ | —— |
| ٢٩٧ | ١ | ٢٢ | هەلدان | بانگ هەلدان |
| ٣٠٠ | ١ | ٣٧ | باو ، و نی | باوۆنی |
| ٣٠٦ | ١ | ١٧ | ڕەنگی | ڕەنگێکە |
| ٣٠٦ | ٢ | ١٤ | ( ینا . ) | ( نفا . ) |
| ٣٠٦ | ٢ | ١٨ | وا | ه |
| ٣٠٧ | ١ | ١٧ | ( ل ) | ( ڵ ) |
| ٣٠٧ | ١ | ٣٤ | بچوکی | پچوکی |
| ٣٠٨ | ١ | ١٨ | ( حافیدی ) | —— |
| ٣٠٩ | ٢ | ٩ | (منطقة البرج) | ( منطقة البروج ) |
| ٣١٠ | ١ | ٧ | بەلەس | بەلەمس |
| ٣١١ | ٢ | ١٨ | **برژانـەوە ــ** (مصت . لا.) | **برژانەوە ــ** ( مصت . مت . ) ، (سنـ .) تم : برژاندنەوە **برژانەوە ــ** (مصت. لا.) |
| ٣١٣ | ١ | ٣١ | [ سنـ : | [ ستـ : |
| ٣١٣ | ٢ | ٩ | گەرجە | گەرمـە |

| لاپەڕە | ستوون | دێڕ | نووسراوە : | بکرێتە : |
|---|---|---|---|---|
| ٣١٤ | ١ | ١٧ | ٢ـ مۆ (کە .) | (مک.) ٢ـ مۆ |
| ٣١٤ | ٢ | ١٧ | ( قە ) | (مک.) |
| ٣١٥ | ٢ | ١٩ | **رۆقە** | **برۆقە** |
| ٣١٦ | ١ | ٣١ | (یەو)و | ( یەو ) |
| ٣١٦ | ٢ | ٥ | ( تر : | ( تە : |
| ٣١٧ | ١ | ١٨ | **برینگی** [کو. تو] | **برینگچی** [کو. تو] |
| ٣١٧ | ١ | ٢٣ | خورێ و | خورێ و مۆی |
| ٣١٧ | ٢ | ١٤ | ( تە : | ( ئە : |
| ٣٢٠ | ٢ | ٨ | (سیە .) تیرەغە | (سیە.) تێرەغە |
| ٣٢٠ | ٢ | ٢٤ | ( بکر . | ( بک . ) |
| ٣٢١ | ١ | ١١ | سەرمقەستی | سەرەمقەستی |
| ٣٢٣ | ١ | ٥ | (مس) | ( س ) |
| ٣٢٤ | ١ | ٣ | بەهدینانی | بهرتێنانتی |
| ٣٢٤ | ١ | ٢٣ | کردنی | کردن |
| ٣٢٥ | ٢ | ٢٨ | —— | —— |
| ٣٢٥ | ٢ | ٣٢ | هەلفریواندن . | هەلفریواندن . ★ (مک.) |
| ٣٢٩ | ٢ | ٢٧ | [بزۆد بزۆتن | [ بزۆ (بزۆتن) |
| ٣٢٩ | ٢ | ٢٩ | بزۆر | بزۆز |
| ٣٣١ | ٢ | ٨ | د پاچقە ، | ( پاچقە ) |
| ٣٣١ | ٢ | ١٨ | **بژاڵ** | —— |
| ٣٣٣ | ١ | ٣٧ | تێب : | —— |
| ٣٣٣ | ٢ | ١ | بکار | —— |
| ٣٣٣ | ٢ | ٢١ | نمەرماڵ | نمەدماڵ |
| ٣٣٣ | ٢ | ٢٨ | ( سیفەی | ( سیفەی |
| ٣٣٣ | ٢ | ٣٠ | ( سیفەی | ( سیفەی |
| ٣٣٤ | ٢ | ١٢ | نیمچەو | نیمچە |
| ٣٣٥ | ١ | ٢٢ | [ ممر . | [ محر : |
| ٣٣٦ | ١ | ٣٤ | (مێلان) | ( هێلان ) |
| ٣٣٧ | ١ | ٢٧ | بە | بەزۆر |
| ٣٣٧ | ٢ | ٩ | بلمێ | بلحێ |
| ٣٣٧ | ٢ | ٣٦ | **بلۆدان** | **بلقدان** |
| ٣٣٨ | ٢ | ١٤ | لەگەگیلی | لەگلەگێ |

| لاپەڕە | ستوون | دێڕ | نووسراوە : | بکرێتە : |
|---|---|---|---|---|
| ٣٢٨ | ٢ | ١٨ | ئەبێ | نەبێ |
| ٣٢٨ | ٢ | ٣٢ ، | —— | —— |
| | | ٣٣،٣٤ | —— | —— |
| ٣٢٨ | ٢ | ٣٥ | ئیند ! | —— |
| ٣٢٩ | ٢ | ٢١ | (متمرك) | ( متحرك ) |
| ٣٤٠ | ١ | ٢٣ | ڕای | ناوەوە ڕای |
| ٣٤٠ | ١ | ٢٣ | بنی کۆم | بنی گۆم |
| ٣٤٠ | ٢ | ٢٧ | شتێکەوە | شتێکەوە ، پێکەوە |
| ٣٤١ | ١ | ١٧ | بناری ، | بناری = |
| ٣٤٣ | ١ | ١٠ | گوڕانی | گورانی |
| ٣٤٣ | ١ | ٢٢ | بنج داکوتان | پنجداکوتان |
| ٣٤٣ | ٢ | ٥ | بنچك | پنچك |
| ٣٤٣ | ٢ | ٣٦ | بەبنە | بەبنەوە |
| ٣٤٤ | ١ | ١٩ | شوێنەی | شوێنەی بکا |
| ٣٤٥ | ١ | ١٠ | بنکەنگڵ | بنەنگڵ |
| ٣٤٧ | ١ | ٩ | ( ته : ـ ٢ | ( ته : ـ |
| ٣٤٧ | ١ | ٢٤ | شنکایێ | شلکایێ |
| ٣٤٧ | ٢ | ٢٨ | قوڕێکی | قوڕێکی وورد |
| ٣٤٩ | ٢ | ٣٤ | تێدەپێچن | تێوەدەپێچن |
| ٣٥٠ | ١ | ١٧ | بوخچەی نەکراوە | **بوخچەی نەکراوە** |
| ٣٥١ | ١ | ٢٨ | بوغز لمزگ | **بوغزلمزگ** |
| ٣٥٣ | ١ | ٢٩ | تاپۆچکەیەکە | قاپۆچکەیەکە |
| ٣٥٤ | ٢ | ٢٩ | بەحونجەی | بە حونجەیێ |
| ٣٥٩ | ٢ | ١٨ | تەرکیبیڕا | تەرکیبیدا |
| ٣٦١ | ١ | ٢٦ | و دەم | دەدەم |
| ٣٦١ | ١ | ٢٨ | بێ | —— |
| ٣٦٢ | ١ | ٣١ | ( گەئبینێ | ( گەئینتێ |
| ٣٦٢ | ٢ | ٣٦ | ڕیشی بابا | ڕیش بابا |
| ٣٦٣ | ٢ | ١٩ | سن . (ته : بۆ مادەران | —— |
| ٣٦٤ | ١ | ٧ | هێدرۆژێنی | هێدرۆژێن |
| ٣٦٤ | ١ | ٣١ | شارانەی | شارانە |
| ٣٦٤ | ٢ | ١٤ | ( نت . ) | ( تت . ) |

| لاپەڕە | ستوون | دێڕ | نوسراوە : | بکرێتە : |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٣٦٦ | ١ | ٧ | چۆنیە | چۆینە |
| ٣٦٦ | ٢ | ٣ | . ئەو | . ٢ ــ ئەو |
| ٣٦٧ | ١ | ١٢ | ( پێب : ئەڵە ) | ( پب : ئەڵە ) |
| ٣٦٧ | ٢ | ٢٤ | **بۆر** | **بۆز** |
| ٣٦٨ | ١ | ٣ | **بۆزەڵە** | **بۆزەلە** |
| ٣٦٨ | ١ | ٣٥ | شاردنەوە ، | شاردنەوەن |
| ٣٦٨ | ٢ | ٢٠ | کوێخا ئایشەخان | ئایشەخان |
| ٣٦٩ | ١ | ٢١ | ناوی شیرەتان و | ناو عەشیرەتان و |
| ٣٧١ | ٢ | ٣٢ | تارە | تازە |
| ٣٧٣ | ٢ | ٢٠ | بە ( شەنە | ـــــــ |
| ٣٧٦ | ١ | ٦ | ( قاباڵە ) | ( قەباڵە ) |
| ٣٧٦ | ٢ | ١٤ | تێدانیە | تێدانیە |
| ٣٧٧ | ١ | ٦ | رایەکردن | زایەکردن |
| ٣٧٨ | ٢ | ٢٥ | **بە چاوی پیشەوەبۆن** | **بە چاوی پیسەوەبۆن** |
| ٣٧٩ | ١ | ٢٩ | بەسەری‌یە | بەسەری دێت |
| ٣٧٩ | ٢ | ٩ | ( پهەکعا ) | ( بهەکتا ) |
| ٣٧٩ | ٢ | ١٢ | **پە . ،** | **پد** |
| ٣٨٠ | ٢ | ٤ | ساڵی | ساڵی تێ |
| ٣٨٠ | ٢ | ١٨ | ( جێد | ( هبێد |
| ٣٨٣ | ٢ | ١٩ | بەدپەسند | ـــــــ |
| ٣٨٩ | ١ | ٢٢ | بەدیارەوە دانیشتن | بەدیاریەوە دانیشن |
| ٣٩١ | ١ | ٣٤ | دەکا . | دەکرێت . |
| ٣٩٣ | ٢ | ١٩ | تفنگی | تفنگی . |
| ٣٩٣ | ٢ | ٣٧ | **بەرئاووردکردن ـــ** [فر. کعر.] ، | **بەراووردکردن ـــ** [ فر. کو. ] ، |
| ٣٩٥ | ١ | ٢٠ | هەمام | حەمام |
| ٣٩٦ | ٢ | ٨ | [ ١ــ بەرا | [ ١ ــ بەر/١ |
| ٣٩٧ | ١ | ١٢ | یاگۆشتی | ، گۆشتی |
| ٣٩٧ | ١ | ١٧ | **بەزبێڵ** | **بەربێڵ** |
| ٣٩٨ | ١ | ٢٨ | ریشقەت | ریشفەت |
| ٣٩٨ | ٢ | ٢٥ | **بەرخەوەند** | **بەرجەوەند** |
| ٤٠٢ | ١ | ١٨ | یادۆ | ، دۆ |
| ٤٠٥ | ١ | ٢٤ | (سنـ.) بەردەستی | ( سنـ . ) بەردەستی |

| لاپەڕە | ستون | دێڕ | نوسراوە : | بکرێتە : |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٤٠٩ | ١ | ٩ | بەرزەچڕە | بەرزە جوڕە |
| ٤٠٩ | ٢ | ٢١ | «بێرێزەییتی» | « بێرێزەئیتی » |
| ٤١٠ | ١ | ٣٦ | عا . | ( عـا ـ ) |
| ٤١٦ | ٢ | ٧ | کەڕێگای | کە لە ڕێگای |
| ٤٢٠ | ٢ | ٢٦ | بوە | بـون |
| ٤٢٢ | ٢ . | ٢٤ | لێیخوراو | لێیخورا ، خورا |
| ٤٢٣ | ٢ | ٩ | ( حمف | ( صمف . |
| ٤٢٤ | ١ | ٨ | حقیقیا | حقیقتـا |
| ٤٢٧ | ٢ | ٢٥ | لۆتی بەزێنە | لۆتی بەزێن |
| ٤٢٨ | ١ | ١٠ | مانای کۆنەکانی | مانـا کۆنەکانی |
| ٤٢٩ | ١ | ٣ | [ سن : ڤەس | [ ست : ڤەسی |
| ٤٢٩ | ١ | ١٠ | ( ش. ) | ( شر . ) |
| ٤٢٩ | ١ | ٣٠ | مالی | حـالی |
| ٤٢٩ | ١ | ٣٦ | (سەم ، سەمم) | ( سەم ، سەهم ) |
| ٤٢٩ | ٢ | ١٥ | (مصت .) | ( مصق . ) |
| ٤٢٩ | ٢ | ٢٤ | (مصت .) | ( مصق . ) |
| ٤٣٢ | ١ | ٢٣ | + بەسن | + بەستن |
| ٤٣٢ | ٢ | ٢٥ | ( مد. ) | ( هل . ) |
| ٤٣٢ | ٢ | ٣٦ | ( پستەر ) | ( بستەر ) |
| ٤٣٤ | ١ | ٣٣،٣٢ | تۆزێ لە شتێکی تام و بۆن خۆش شەکرەکەی تێدا دەتاوێنرێتەوە و | شـــــــەکرەکەی تێدادەتاوێنرێتـــەوە و تۆزێ لەشتێکی تام و بۆن خۆش |
| ٤٣٥ | ١ | ٢٨ | صەحرامکەم | صەحراکەم |
| ٤٣٥ | ١ | ٣١ | دابەسەردابڕین | دا . |
| ٤٣٦ | ١ | ٣٣ | گاو و گۆلێ | گاووگۆلێ |

| لاپەڕە | ستون | دێڕ | نوسراوە : | بکرێتە : |
|---|---|---|---|---|
| ٤٢٧ | ١ | ٢٤ | « بەشی قڕژەی | « بەشی قڕڕەی |
| ٤٣٨ | ٢ | ٨ | **بەشخواردن** | **بەشخوران** |
| ٤٤٠ | ١ | ١٨ | **بەشورار** | **بەشووار** |
| ٤٤٠ | ٢ | ٢٩ | فرۆشتن | ـــــــ |
| ٤٤٢ | ١ | ٢٩ | بەفرە سەر ڕچە/٢ | بەفرە سەر . ڕچە/٢ |
| ٤٤٣ | ١ | ٤ | ( ی. ) | ( عـا. ) |
| ٤٤٦ | ١ | ٣٠ | نیشان ، | ناوونیشان ، |
| ٤٤٧ | ١ | ٢٥ | ٣ـ خواردەمەنی | ٣ ـ پێخۆشبوونی خواردەمەنی |
| ٤٤٩ | ١ | ٣ | [ بەی/١ | [ بەڵ/١ |
| ٤٥٠ | ١ | ١٩ | تە + خا : | تە : ( خا ، |
| ٤٥٠ | ٢ | ٥ | شەریەتێکی | شەربەتێکی |
| ٤٥٠ | ٢ | ٨ | ( عرق لۆس ) | ( عرقالسوس ) |
| ٤٥٤ | ٢ | ٢٥ | بانگرکردنە | بانگکردنە |
| ٤٥٦ | ٢ | ٣٢ | ٤ ـ (سنـ.) | ٣ ـ ( سنـ . ) |
| ٤٥٧ | ٢ | ٦ | زۆر و | زۆر و زۆر |
| ٤٥٧ | ٢ | ٢١ | وەنگبێن | وەنگ . بێن |
| ٤٥٨ | ١ | ٣٣ | پەلخستنی | پەڵخستنی |
| ٤٥٨ | ٢ | ٣٤ | [پە : بەنداك] | [ پە : بەندەك ] |
| ٤٥٩ | ١ | ٢٩ | شوێنێکە | ١ـ شوێنێکە |
| ٤٦٠ | ١ | ١٢ | بەت سامۆتە | بەن سامۆتە |
| ٤٦١ | ٢ | ٥ | (فەهاکر) | ( فەهاك ) |
| ٤٦١ | ٢ | ٨ | قیمەت ئەم | قیمەتی ئەم |
| ٤٦٤ | ١ | ٨ | [ لە پە : | [ پە : |
| ٤٦٤ | ٢ | ٧ | ( ئەمێشۆشپەند ) | ( ئەمێشۆسپەند ) |
| ٤٦٦ | ١ | ٥ | ( فەزەنگە .) | ( هەزەنگە . ) |
| ٤٦٧ | ١ | ٥ | کلکێکی | لکێکی |

| لاپەڕە | ستوون | دێڕ | نووسراوە : | بکرێتە : |
|---|---|---|---|---|
| ٤٦٧ | ١ | ٣٤ | ( بەمان ) | ( بەیـان ) |
| ٤٦٩ | ١ | ٧ | ( بەیڕەق ) | ( بەیدەق ) |
| ٤٦٩ | ١ | ١٠ | پیاوەوە | پیادەوە |
| ٤٧٠ | ١ | ٤ | ( نا ) | ( بـا ) |
| ٤٧١ | — | ٢١ | **ووشەی گەلێ (مرکب)** | **ووشەگەلی (مرکب)** |

* لە گەلێ شوێن (سیە.) کە کورتە نیشانەی بنلەهجەی ( سلەیمانی )یە بۆتە ( سیە . ) .

★ ★ ★

